# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی شەشەم

## تەفسیری سوورەتی (الأعراف)

عەلی باپیر

# تەفسیری قورئانی

# بەرز و بەپێز

عەلی باپیر

**بەرگی شەشەم**

**تەفسیری سوورەتی (الأعراف)**

ameer.maktab@yahoo.com

/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

نـووسـەر : عەلـی باپـیر.

نەخشەسازیی ناوەوە : عزالدين محمد عمر.

نۆرەو ساڵی چاپ : یەکەم ١٤٣٧ ك- ٢٠١٦ز.

تـیـراژ : ٢٠٠٠ دانە.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتی

إنَّ الحَمْدِ للّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ باللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمـران، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النسـاء، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب.

أمَّا بَعْدُ: فإنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلاَمُ اللهِ وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[1].

خوێنەرە بەرێزو خۆشەویستەکان!

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە

---

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەرێزی فێردەکرد پێش هەر قسەیەکی گرنگ بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتد، وە ئەم وتارە هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

خزمەتدابوونـدا بـێ؛ خوێندنـەوە، تێفکـرینو رامـان، فێرکـردن، کـارپێکردن ... هتـد، بەباشترین جێگرتن جێگا دەگرێو ، خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خـوا (التحـدّث بنعمـة الله) دەیخەمـەڕوو- لـەوەتی فـامم کردۆتـەوە، خـوای بەبـەزەییو بەخشـەر چاکەی لەگـەڵ کـردووم‌و، بـە فەرمایشـتی بـەرزو بـێ وێنـەی خۆیـەوە سـەرگەرمی کـردووم‌و، بـەر لـە تەمـەنی بیسـت ساڵیی‌یـەوە هیدایـەتی داوم، کـە قورئـانی بـەڕێزو پێـز لەبـەر بکـەم‌و، سـەرقـاڵی خوێندنـەوەی تەفسیرەکانی قورئانو تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانیو، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیـەش تێکـڕای کتێـبو نامیلکـەو وتـارو دەرسـەکانم، کـەم‌و زۆر لەبـەر ڕۆشـنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشـتییە؛ ئـاخر ئایا ئیسلام بێجگـە لـە قورئـان پاشـان سـوننەتی پێغەمبـەر ﷺ، کـە ئـەویش هـەر ڕوونکردنـەوەی قورئـانو چۆنیەتی جێبەجێکردنو کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجـا لەمێـژ سـاڵیش بـوو کـە بـراو خوشـکانێکی دڵسـۆزی نزیـكو ئاشـنام، داوایـان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیـرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمـەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمـەوە، کـە نـاوی خـوای لێبهێـنم‌و دەسـت بـەو کـارە گـەورەو گرنگـە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لـێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشـدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسـێ کـە بتـوانم خێرایـی تێـدا بکـەم‌و خـۆمی بـۆ یـەکلایی (متفـرِّغ) بکەمـەوەو، خـوا پشـتیوان بـێ تـەواوی بکـەم، ئەگەر تەمەن بەبەریـەوە مـابێ.

سەرچـاوەی دانـانی ئـەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشـــم وێـڕای سـەرنجدانی زۆربـەی ئـەو تەفسیـــرانەی کە بـاونو دەسـتم پێیـان گەیشـتوە، بریتیـە لـە وردبوونـەوەو تێوەڕامـانی خـۆم لە خـــودی قورئـان، چـونکە بێگومـان قورئـان هەنـدێکی هەنـدێکی ڕوون دەکاتـەوە: (القـرآن یُفَسِّـر بَعضُـهُ بَعْضَـاً)، پاشـان ســوننەتی پێغـــەمبەری خـــوا ﷺ، چـــونکە پێغـەمبـــەری خـواش ڕوونکـــەرەوە (مُبَـیِّن)ی قورئـــانە، وەك خـــوا ﷻ فەرموویـەتی:

﴿... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل، واتە: وە زیکرمان بـۆ لای تـۆ ناردۆتـە خـوار تاکـــو ئـەوەی بـۆ خـەڵکی نێرراوەتـە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیـربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێكدانەوەیەكی وا بۆ قورئان پێشكەش بە مسوڵمانانی كوردستان بكەم، كە لە قورئان بوەشێتەوەو مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش كە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزنو تەفسیرەكانیو كتێبەكانی سوننەتدا خەریكمو دەیان كتێبو بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەكانی زانستەكانی شەریعەتدا پێشكەش كردوون.

شایانی باسیشە كە ئەو بیستو دوو مانگ زیندانیی كرانەم لەلایەن ئەمریكاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاكو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێكی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی كتێبی خوا (تبارك و تعالى)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەكانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە كتێبی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)دا زۆر چاك دەروشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێمو هیچكەسیش بۆی نیە بڵێ: كە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونكە وێڕای سنوورداربوونی تواناو برستم لە بەرانبەر كتێبی لە هەموو ڕوویەكەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە كە زۆر بەملاولادا بچمو بچمە نێو هەندێك وردەكارییەوە، كە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە كاتێكدا دەیەوێ لە قورئان تێبگاتو، بزانێ خوا (تبارك وتعالى) ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە ؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووكو گورجو گۆڵو دڵسۆزە بكەم (حەزی نەكرد ناوی بهێنم)، كە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر كاغەزو، پاشان تایپكردنو دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، كە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشكەش كراون، هەروەها هەڵسا بە (تخريج)ی سەرجەم دەقەكانی سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێكراوەكانەوەو، زەحمەتو ماندووبوونێكی زۆری بە

---

١) ئەو كتێبە كە ئێستا چاپ كراوەو كەوتۆتە بەردەستی خوێنەرانو، سەرجەم هەشت بەرگو دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەكانی ئیسلام بكەمو، تاكە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەكانی سوننەت، كە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

ســەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرە کێشـاوە، خـوا بـە باشـتـرین شـێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هـەر صـاڵحو سـاغو سـەلامەتو سـەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهاوتـاش داواکارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە کوڕانو کچان لەنێو گەلەکەماندا زۆر بکات.

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسـیـرەماندا باسـی بـەش (جـزء)ەکـانی قورئـانو دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکـەین، چـونکە هـەر سـوورەتێك بۆخـۆی شـتێکی سـەربەخۆیـەو سـەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن‌و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەسـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسـیـرەشـدا، دیسان حیسـاب بـۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکـەین‌و بە گوێرەی سـوورەتەکان بەرگـەکانی دیـاریی دەکـەین.

دوا قسـەشـم ئەوەیـە کە:

ئـەم تەفسـیرە - وەك پێشـتـر گوتمـان - لـە ئەسڵدا بەشـێوەی دەرس‌و وتـار پێشـکەش کـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیـدا چوومـەوەو، بـەپێی پێویسـت دەسـتکارییم کـردوە، دیـارە هـەموو دەرسـێکیش بـەناوی خـواو ستایشـی خـوا ﷻ دەسـتی پێکـردوە، بـەڵام ئێمـە لـە سـەرەتای دەرسـەکانەوە ئەوانـەمان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبـارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سـەرەتای ئـەم پێشـەکییەوە هـاتوە، لـەجیاتی سـەرەتای سـەرجەم دەرسـەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧ هـەولێر

---

١) ئـەو بـرا دڵسـۆزە ئێسـتاش پـاش سـوورەتی (الأنفـال)، سـەرگەرمی سـوورەتی (التوبـة)ەو عەزمیشـی جـەزم کـردوە، کـە ئەگـەر تەمەنمـان بـەردەوام بـێ، هەتـا کۆتـایی ئـەم تەفسـیرە سـەرگەرمی کارەکەی بێ.

# پێشەکی ئەم بەرگە

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان !

سوپاس و ستایشی شایستە بۆ خوای خاوەنی هەموو سیفەتە بەرزەکان و سەرجەم ناوە چاکەکان ، پاش بەرگی پێنجەم کە وەخۆگری تەفسیری سووڕەتی (الأنعام) بوو لە {تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز} گەیشتینە ئەم بەرگی شەشەمە، کە تەفسیرو ڕوونکردنەوەی ماناو مەبەستەکانی ئایەتە بەهێزو پێزەکانی سووڕەتی (الأعراف) لە قورئانی بەڕێز دەگرێتە خۆی.

شایانی باسیشە کە ئێمە لە سەرەتای تەفسیرکردنی سووڕەتی (الأنعام)دا چەند شتێکمان لەبارەی سروشت و نێوەڕۆکی قورئانی مەککەیی و قورئانی مەدینەیی باسکردن، کە لێرەدا دووبارەکردنەوەیان بە پێویست نازانین، لە سۆنگەی ئەوەوە کە سووڕەتی ناوبراو بە حوکمی یەکەمین بوونی لە (مُصْحف) دا، لە ڕیزبەندیی سوورەتە مەککەیی یەکان (السور المكية) دا، هەرچی لە سەرەتای تەفسیرکدنی ئەو سووڕەتەوە باسمان کردوە، بە گشتی بەسەر کۆی قورئانی مەککەیی و سەرجەم سووڕەتە مەککەیی یەکان دا، کە دەوری دوو لەسەر سێ (٣/٢)ی تێکڕای قورئان پێك دێنێ، دەگشتێنرێ و هەموویان دەگرێتەوە.

هەڵبەتە ئێمە لە شێوازی ڕوونکردنەوە (تفسیر)ی ماناو مەبەستەکانی ئایەتەکانی سووڕەتی (الأعراف)یش دا، هەر لەسەر هەمان نەخشەو ڕێبازی پێشوومان بەردەوامین کە بە حەوت هەنگاوو لە حەوت قۆناغ دا کارەکەمان ئەنجام دەدەین، کە بریتیین لە :

١ - پێناسە.

٢ – خوێندنەوەی ئایەتەکان ( یان نووسین و تۆمارکردنیان).

٣ – مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان.

٤ – شیکردنەوەی ماناو چەمکی هەندێك لە وشەکان.

٥ - هۆی هاتنەخوار.

٦ - مانای گشتی .

٧ - چەند مەسەلەیەکی گرنگ.

چونکە سوپاسو ستایش بۆ خوای خاوەن بەزەییو بەخششی بێ سنوور، ئەوەندەی هەستم ڕاگرتوە لە خوێنەرانی بەڕێزو دڵسۆزی ئەم تەفسیرە ، بە گشتی لەو شێوازە حەوت قۆناغییەی بەندە ڕازی بوونو ، گوتوویانە کە ئەو شێوازە مایەی باش حاڵی بوونو چاك بەرچاو ڕوونبوونەوەیانە لەبارەی چەمكو واتای ئەو ئایەتانەی تەفسیریان دەکەینو پێویستە ئەوەش بڵێم : کە هەرچەندە هەموو لایەکمان قەرزداری زاناو پێشەوایانی ڕابردوومانینو لێیان بەهرەمەندین، بەلام بەندە بۆ ڕەچاوکردنی ئەو شێوازە لاسایی هیچ کام لە ڕوونکەرەوان (مُفَسِّرين)م نەکردۆتەوەو لە داهێنان (إبداع)ی خۆمەو ، هیواداریشم ئامانجم تێدا پێکابێ.

لە کۆتایی پێشەکی ئەم بەرگی شەشەمەی ئەم تەفسیرەش دا ، دەڵێم :

بێگومان هەتا خوێنەرانی بەڕێزو شەیدایانی قورئان باشتر ئەم تەفسیرە بخوێننەوەو کارلێك (تفاعل)ی زیاتری لەگەڵدا بکەنو ، بە تێبینییو سەرنجو پێشنیارو ڕەخنەکانیان بەهرەمەندترم بکەن، بەندەش بە عەزمو ئیرادەی پتەوترو وزەو دڵگەرمیی زۆرترەوە لەسەر کارەکەم بەردەوام دەبم، هەتاکو بە پشتیوانی خوا سەرجەم سوورەتەکانی قورئانی بەرزو بەپێز تەفسیر دەکەین.

سبحانك اللّهم وبحمدك ، أشهد أن لا اله الاّ أنت ، أستغفرك وأتوب إليك

١٢ ی شوال ١٤٣٦ ك

٢٨ ی تەمووزی ٢٠١٥ ز

هەولێر

## ڕێ خۆشكردن :

# پێناسەی سوورەتی (الأعراف) و بابەتەكانی

بە پێویستی دەزانم بەر لەوەی بێینە سەر ماناو لێكدانەوەی ڕاستەوخۆی ئایەتەكانی سوورەتی (الأعـراف)، سەرەتا وەك عـادەتی خۆمـان پێناسەیەكی كـورتی سـوورەتی (الأعراف) بكەینو ، ئاماژەیەك بە نێـوەڕۆكو بابەتـەكانی بكەیـن، ئەویش لـە چـوار خاڵی سەرەكیی دا:

**یەكـــەم** : ئـەم سـوورەتە كـە بـە سـوورەتی (الأعـراف) ناسـراوە، لـە ڕووی قـەبارەوە گـەورەترین سـوورەتی مەككـەییە، كـە نزیكـەی جوزئێـكو سـێیەك(٣/١)ی جوزئێـك پێـك دێنــێ، دیارە ئـەم سـوورەتە لـە ڕیزبەنـدیی (مصحف)دا بـە ڕیزبەنـدیی (٣٩) هاتوە، واتە: (٣٩)یـەمین سـوورەتە لـە ڕیزبەنـدیی دابەزینــی دا، لەسـەر ڕای زۆربـەی زانایان، بـەڵام لـە ڕیزبەنـدیی (مصحف)دا، بـە ژمـارە (٧) هـاتوە، واتـە: حەوتـەمین سـوورەتە لە ڕیزبەندیی (مصحف)دا.

وە ئەم سوورەتە لە (٢٠٦) ئایەت پێكدێ، بەڵام هەندێكیان ژمارەی ئایەتەكانیان بە (٢٠٥)، وە هەندێكیشـیان بە (٢٠٧) سـەرژمێریان كـردوون، وە زۆربـەی زانایـان ڕایـان وایــە كە هەشـت ئایـەت ـ كە ئایەتەكـانی (١٦٣) تاكـو (١٧٠)ن ـ مەدینـەیین، واتـە: لـە دوای كۆچ كـردن بـۆ مەدینــە هاتوونـە خـوار، بـەڵام مـن پـێم وایـە كـە ئـەم ڕایـە بەڵگەیەكی ئـەوتۆی لەسـەر نیـە، وە ئەگــەر سـەرنجی سروشـتی سـوورەتەكە بـدەین، هەست پێ ناكەین، هەنـدێكی لـە مەكـكەدا دابەزێنرابـێ‌و، هەندێكـیش لـە مەدینــە، بەڵكو لە یەك قۆناغدا، كە قۆناغی مەككەیە، دابــەزێنراوە.

**دووەم** : ئـەم سـوورەتە وەك سـەرجەم سـوورەتە مەككەییـەكان، لـە سـورگەی هـەر سـێ بابەتی گەورەو گرنگی : (خوا بەیەكگرتنو پێغەمبەرایەتیو ڕۆژی دوایی) (التوحید والنُّبُوَّة والْمَعَاد)دا دەسوورێتەوە، واتە: ئەو بابەتو مەبەستانەی كە ئـەم سـوورەتە ـ وەك هـەموو سـوورەتە مەككەییەكـان ـ قسـەیان لـێ دەكـەن، ئـەو سـێ بابەتـە سـەرەكییەن:

١) باسـی خـوای پـەروەردگار، خـوا بـە یـەكگرتن لـە بەدیهێنەرایـەتیی دا، لـە پەروەردگـارێتی دا، لـە خـاوەن دارێتیـی دا، لـە پەرستراوێتـیی دا، لـە نـاوو سیفەتەكانی دا ﷻ.

٢ وە باسـی پێغەمبەرایـەتییو، وەحـی پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، وە بەسەرهاتیـان لەگـەڵ گەلـەكانیـاندا.

٣) وە باسی ڕۆژی دواییو بەهەشتو دۆزەخو، وە سەرەنجامو سزاو پاداشت كە ڕوو لـە مرۆڤەكـان دەكات، بە پێی جۆری ئەو ژیـانەی كە لەسەر زەوی دەیگـوزەرێنـن .

**سێیـەم** : لەم سوورەتەدا پانتاییـەكی زۆر بـۆ بەسـەرهاتی پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لەگەڵ گەلەكانیـاندا تەرخان كراوە، بەم شـێوەیە :

١ - لە ئایـەتی (١٠ تـا ٢٥) بـۆ بەسـەرهاتی ئـادەمو حـەووا (عَلَيْهما السَّلام) لەگـەڵ ئیبلیس دا، واتـە: (١٦) ئایـەت .

٢ - لە ئایـەتی (٤٤ تـا ٥١) بـۆ وتووێـژی نێـوان بەهەشـتییانو دۆزەخییـان، وە ئـەهل ئەعراف، واتە: (٨) ئایـەت .

٣ - لە ئایەتی (٥٩ تا ٩٣) بۆ بەسەرهاتی هەر كام لە نووحو هـوودو صـاڵحو لووطو شـوعەیب (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لەگـەڵ گـەلەكانیانـدا، واتە: (٣٥) ئـایـەت .

٤ - لە ئایەتی (١٠٣ تا ١٧١) بۆ بەسـەرهاتی مووساو هارِوونی برای لەگەڵ فیـرعەون ، وە لەگـەڵ گەلەكـەیان، (بەنـی ئیسـرائیل)دا، واتـە: (٦٨) ئـایەت .

٥ - لە ئایـەتی (١٧٥ تا ١٧٧) بۆ بەسـەرهاتی زانایـەكی لادەر، واتـە : (٣) ئایـەت .

كەواتە: سەرجەم (١٦ + ٨ + ٣٥ + ٦٨ + ٣ = ١٣٠) ئایـەت لـە كـۆی (٢٠٦) ئایەتـە بـۆ بەسەرهاتەكان تەرخان كراون .

بۆیە گوتمان: زۆربەی پانتایی ئەم سوورەتە موبارەکە بۆ بەسەرهاتەکان دانراوە.

**چوارەم** : بۆ ئەوەی نەخشەی نێوەڕۆك و بابەتەکانی ئەم سوورەتەمان لەبەرچاو بێ دەڵێین : سەرجەم ئەو (٢٠٦) ئایەتەمان بۆ (٢٤) دەرس دابەش کردوون، بەم شێوەیە:

دەرسی یەکەم: ئایەتی (١ تا ٩) دەگرێتە خۆی، کە وەك پێشەکی وان بۆ سەرجەم باسو بابەتەکانی سوورەتی (الأعراف)، وە خوا باسی حیکمەتی نێردرانی قورئان بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەکات، هەروەها باسی سەرەنجامی شوومی گەلانی پێشووی لادەر لە بەرنامەی خواو ڕێبازی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، وە سەرەنجامی باشی چاکەکاران و شوێنکەوتووان و پەیڕەوانی ڕێبازی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەکات.

دەرسی دووەم: ئایەتەکانی (١٠ تا ٢٥) دەگرێتە خۆی، واتە: (١٦) ئایەت، لەم (١٦) ئایەتەدا خوا ﷻ باسی دایك و بابی مرۆڤایەتی لەگەڵ ئیبلیسدا دەکات، پاشان فریودانی ئیبلیس بۆیان {بۆ ئادەم و حەووا} (عليهما السلام)، وە دەرکرانیان لە بەهەشت، دیارە بەهۆی ئەوەی قەدەغەیان شکاندوە، وە پاشان تۆبە کردنیان و بەخشرانیان و دابەزێنرانیان بۆ سەر زەوی، ئەم شازدە ئایەتەش باسی ئەم بابەتە گرنگانە دەکەن.

دەرسی سێیەم: ئایەتەکانی (٢٦ تا ٣٦) دەگرێتە خۆی، واتە: (١١) ئایەت، کە خوای بەرزو مەزن لەم (١١) ئایەتەدا چوار جار بە (يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ) واتە: ئەی وەچەی ئادەم ! مرۆڤەکانی دواندوون، وە گەلێك هێڵی گشتی گرنگی ژیانێکی ڕاست و ساغ و شایستەی مرۆڤەکانی بۆ خستوونە ڕوو.

دەرسی چوارەم: ئایەتەکانی (٣٧ تا ٤٣) دەگرێتە خۆی، واتە: (٧) ئایەت، خوای بەرزو مەزن باسی سەرەنجامی شووم و خراپی لاڕێیان، وە پاشان سەرەنجامی باش سەربەرزانەی چاکەکاران دەکات.

دەرسی پێنجەم: ئایەتەکانی (٤٤ تا ٥٣) دەگرێتە خۆی، واتە: (١٠) ئایەت، خوای پەروەردگار باسی وتوویێژێکی تێرو تەسەلی ئەهلی بەهەشتو ئەهلی دۆزەخو ئەهلی ئەعـڕاف دەکات، کە ئێرە تاکە شوێنێکە لە هەموو قورئان دا خوای پەروەردگار باسی ئەهلی ئەعڕافی تێدا بکات.

دەرسی شەشەم: کە ئایەتەکانی (٥٤ تا ٥٨)ە، واتە (٥) ئایەت دەگرێتەوە، کە باسی پەروەردگارێتیی خوا ﷻ، وە پاشان لـێ پاڕانەوەی، واتە: بەندەکان کە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، وە پاشان باران باراندن، وە پاشان زیندووکرانەوەی مردووانو، دوایی باسی زەوی بە پیتو، زەوی بێ پیتو پێز کراوەو نموونەیان پێهێنراوەتەوە.

دەرسی حەوتەم: لە ئایەتەکانی (٥٩ تا ٦٤) پێك دێ، واتە : (٦) ئایەت دەگرێتەوەو، تێیان دا بە کورتیی باسی بەسەرهاتی نووح ؈و گەلەکەی کراوە.

دەرسی هەشتەم: لە ئایەتەکانی (٦٥ تا ٧٢) پێك دێت، واتە: (٨) ئایەت، کە خوای پەروەردگار لەو (٨) ئایەتەدا باسی بەسەرهاتی پێغەمبەر هوود ؈و گەلەکەی کە بە (عاد) ناسراوە دەکات.

دەرسی نۆیەم: کە لە (٧) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (٧٣ تا ٧٩)و خوا ﷻ تێیان دا باسی بەسەرهاتی پێغەمبەر صالح ؈ وە گەلەکەی (ثەموود) دەکات.

دەرسی دەیەم: کە لە (٥) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (٨٠ تا ٨٤)و زۆر بە کورتیی خوای پەروەردگار باسی پێغەمبەر لووط ؈و گەلەکەی دەکات.

دەرسی یازدەیەم: کە لە (٩) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (٨٥ تا ٩٣) دەگرێتەوەو، تێیان دا باسی پێغەمبەر شوعەیب ؈، وە گەلەکەی (مەدیەن) کراوەو، بەسەرهاتەکەیان خراوەتە ڕوو.

دەرسی دوازدەیەم: کە لە (٩) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (٩٤ تا ١٠٢) دەگرێتەوە، خوای پەروەردگار لەو (٩) ئایەتەدا، چەند یاسایەکی گەورەو گرنگی خۆی لە ژیانی کۆمەڵگەکانی مرۆڤدا، خستوونە ڕوو.

دەرسی سێزدەیەم: کە لە (٢٧) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (١٠٣ تا ١٢٩) خوا ﷻ باسی ڕووبەڕووبوونەوەی مووسا ﷺ فیرعەون، وە بەرەنگاربوونەوەی فیرعەون بۆ موعجیزەکانی مووسا دەکات، وە جادووی جادووگەرانی فیرعەون ئاشکرا دەکات، هەروەها باسی هەڕەشەی فیرعەونو ، ئامۆژگاریی مووسا بۆ گەلەکەی : بەنی ئیسرائیل کە خۆڕاگر بن، دەکات.

دەرسی چواردەیەم: کە لە (٨) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (١٣٠ تا ١٣٧)، خوای پەروەردگار باسی بەڵاو گرفتارییەکان کە بەسەر فیرعەونو دارو دەستەکەی هاتوون، دەکات، وە سەرەنجام فەوتاندنی فیرعەونو گەلەکەی، وە باسی دەربازبوونی مووساو هاڕوون ﷺو گەلەکەیان کراوە.

دەرسی پازدەیەم: کە لە (٤) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (١٣٨ تا ١٤١)، کە خوای پەروەردگار باسی پەڕینەوەی بەنی ئیسرائیل لە دەریای سوور، وە داواکارییان لە مووسا کە بتیان بۆ دابنێ ، وەك خەڵکی دیکە چۆن بت دەپەرستن، وە سەرزەنشت کرانیان لەلایەن مووساوە ﷺ ، کراوە.

دەرسی شازدەیەم: کە لە (٦) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (١٤٢ تا ١٤٧)، خوا ﷻ باسی دانرانی بەڵێنگەو میقاتێك دەکات، دوای (٤٠) شەوو ڕۆژ بۆ مووسا، کە بچێت لەگەڵ خوای پەروەردگاردا گفتوگۆ بکات، وە باسی داواکردنی مووسا کە خوای بەرزو مەزن ببینێ، وە وەڵامدرانەوە بەوە کە ناتوانێ خوا ببینێ، وە خوای بێ وێنە نیشانەو بەڵگەیەکی نیشانداو بۆی سەلماند، کە ناتوانێ خوای بێهاوتا ببینێ، لەم ژیانی دنیایەدا، وە باسی نووسرانەوەی لەوحەکانی تەورات کراوە.

دەرسی حەڤدەیەم: کە لە (٧) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (١٤٨ تا ١٥٤)، خوا ﷻ باسی گۆلك پەرستیی بەنی ئیسرائیل دەکات، وە پاشان گەڕانەوەی مووسا لە میقاتی خوای تاكو پاك، وە تووڕەبوونی لە گەلەکەی و، لە هاڕوونی برای و، لێپرسینەوە کردنی لەگەڵ هەموو لایەکیاندا.

دەرسی هەژدەیەم: کە لە (٤) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (١٥٥ تا ١٥٨)، خوا ﷻ تێیاندا باسی چەند مەسەلەیەك کراوە: هەڵبژاردنی (٧٠) کەس لە لایەن موساوە ، لە ڕیش سپییانو قسە بەدەستانی گەلەکەی بۆ میقاتی خوا، {واتە: کاتو شوێنێك کە لەوێ مووسا گفتوگۆ لەگەڵ خوادا بکات} بە ئامادەییو نوێنەرایەتیی ئەو (٧٠) کەسە، وە پاشان باسی تەوبەکردنیان لە گۆلك پەرستییو داواکردنیان لە مووسا عليه السلام خوای پەروەردگاریان پێشان بداو، دوایی بوومەلەرزە لێدرانیان، وە دووبارە پەشێمان بوونەوەیان، وە هەر لەم ئایەتانەدا خوای پەروەردگار پێناسەیەکی چاکەکانیان دەکات، {واتە: چاکەکانی بەنی ئیسرائیل} کە ئەوانەن ئیمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دێنن.

دەرسی نۆزدەیەم: کە لە (٤) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (١٥٩ تا ١٦٢)، خوای کاربەجێ باسی چاکەکارانی گەلی مووسا، وە نیعمەتەکانی خوا لەسەریان، وە سەرپێچییو لادانی ئەوان لە فەرمانی خوای کردوە.

دەرسی بیستەم: کە لە (٩) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی (١٦٣ تا ١٧١)، باسی شەممە شێکنان کراوە، ئەوانەی کە لە گەلی مووسا {بەنی ئیسرائیل} کە شەممەیان شأکاند، دیارە گەلی جوولەکە ڕۆژێکیان هەیە لە هەفتەدا، نابێ هیچ کارێکی تێدا بکەن، کە ڕۆژی شەممەیە، بەڵام ئەوانە کۆمەڵە خەڵکێك بوون لە نیزیك دەریایەكو ، ڕۆژی شەممەیان شکاندوەو کارو کەسابەتیان تێدا کردوە، خوای بەرزو گەورەش سزای داونو، سزایەکەشیان ئەوە بووە کە کردوونی بە مەیموون ، وەك سزادانو تەمبێکردنی بەنی ئیسرائیل، وە باسی چیا بەسەردا بەرزکرانەوەی بەنی ئیسرائیل، بۆ ئەوەی کە پەیمانیان لێوەربگرێ، کراوە.

دەرسی بیستو یەك: کە لە ئایەت (٧) پێك دێ، ئایەتەکانی (١٧١ تا ١٧٨)، خوای پەروەردگار باسی پەیمان لێ وەرگیرانی وەچەی ئادەم بۆ بیانوو بڕکرانیان، وە باسی زانایەکی لادەری کردوە، کە خوا ئایەتەکانی خۆی پێداون، بەڵام ئەو وەك چۆن مار لە کیف دێتە دەرێو، وەك چۆن کەسێك بەرگو پۆشاکەکانی لە خۆی دادەڕنێ، ئاوا ئایەتەکانی خوای لەخۆی داڕنیونو کاری پێ نەکردوون.

دەرسی بیستو دووەم: كە لە (٨) ئایەت پێك دێ، ئایەتەكانی (١٧٨ تا ١٨٦)، خوای بێهاوەڵ باسی گومڕایانو هۆكاری گومڕابوونیان، وە سەرەنجامی شوومیان دەكات.

دەرسی بیستو سێیەم: كە لە (١٢) ئایەت پێك دێ، ئایەتەكانی (١٨٧ تا ١٩٨)، خوای زاناو توانا باسی پەنهانیی‌و شێراوەیی هاتنی قیامەت دەكات، وە باسی ئەوە دەكات كە پێغەمبەری خاتەم {موحەممەد} ﷺ لە بەرانبەر خوادا هیچ كارە نیەو، هیچی لەدەست نایەت، بەبێ مۆڵەتی خوا، وە باسی هۆكارێكی سەرەكیی بۆ گیرۆدە بوون بە شیركەوە كراوە، كە بەشەر چۆن تووشی شیركو هاوبەش بۆ خوا دانان دەبن، وە ڕەخنەی گورچك بڕ ئاڕاستەی بیرۆكەی ئەفسانەی بتپەرستیی‌و شیرك كراوە.

دەرسی بیستو چوارەمو كۆتایی: كە لە (٨) ئایەت پێك دێ، ئایەتەكانی (١٩٩ تا ٢٠٦)، خوای پەروەردگار لەو (٨) ئایەتەدا چەند ڕێنماییەكی گەورەو گرنگ ئاڕاستەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، وە جێنشینانی‌و پەیڕەوانی دەكات، لە بارەی چۆنیەتی مامەڵەكردنیانەوە لەگەڵ خەڵكێكدا كە بۆ لای خوا بانگیان دەكەنو، هەوڵی تێگەیاندنو پێگەیاندنو، فێركردنیانو پەروەردەكردنیان دەدەن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یەکەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە (٩) ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە پێك دێ، کە ئایەتەکانی (١ تا ٩)ن، خوای بەرزو مەزن ڕایدەگەیەنێ : کە ئەم قورئانە ئەی موحەممەد ! ﷺ دابەزێنراوەتە سەر تۆ، هیچ سەغڵەتییەك لە بەرانبەری لە دڵتدا نەبێ، وە ئەم قورئانە وریاکەرەوەیە بۆ خەڵك، وە بیرخەرەوەیە بۆ بڕواداران.

پاشان خوا ﷻ فەرمان بە بڕواداران دەکات، کە شوێن کتێبی دابەزێنراوی پەروەردگاریان بکەون‌و پەیڕەویی لێ بکەن، وە نەکەونە دوای سەرپەرشتیاران‌و کەسانی دیکە، پاشان خوا ﷻ باسی یاسایەکانی خۆی دەکات لە کۆمەڵگاکانی بەشەردا، کە چۆن فەوتاندوونی بەهۆی لادان‌و سەرپێچییان، وە ڕاشیدەگەیەنێ کە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات لە ڕۆژی دوایی دا.

وە پاشان بە گوێرەی گرانیی‌و سووکیی تەرازووەکانیان، یاخود کردەوەکانیان لە بەهەشت، یان لە دۆزەخدا، سەرەنجامیان دیاریی دەکات.

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ الٓمٓصٓ ١ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ
وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٢ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ
أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ٣ وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ
هُمۡ قَآئِلُونَ ٤ فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا
ظَٰلِمِينَ ٥ فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٦ فَلَنَقُصَّنَّ
عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ٧ وَٱلۡوَزۡنُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّۚ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ
فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٨ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ
أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظۡلِمُونَ ٩ ﴾ .

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((بە ناوی خوای بە بەزیی خشندە، ئەلیف، لام ، میم، صاد ﴿١﴾ (ئەمە) کتێبێکە (لە لایەن خواوە) بۆ لات نێرراوەتە خوار، ئنجا با بەهۆیەوە هیچ سەغڵەتییەك لە سینەتدا نەبێ، (ئەم کتێبە هاتۆتە خوار) تاکو خەڵکی پێ وریابکەیەوەو بیرخەرەوە بێ بۆ بڕواداران ﴿٢﴾ شوێن ئەو (بەرنام)ە بکەون کە لە لایەن خوای پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێنراوە، وە جگە لەو (خوا) مەکەونە شوێن سەرپەرشتیارانی دیکە، بە کەمیی پەند وەردەگرن ﴿٣﴾ وە ئێمە (لە ڕابردوودا و بەهۆی گوناحو لادانیانەوە) گەلێك ئاوەدانییمان فەوتاندوون کە بە شەوێ، یان لە کاتی ئیسراحەتی ڕۆژێدا ، سزاو جەزرەبەی ئێمەیان بۆ هات ﴿٤﴾ ئنجا کاتێك سزای ئێمەیان بۆ هات ، داواو پاڕانەوەیان هەر ئەوە بوو کە گوتیان: بێگومان ئێمە کاتی خۆی ستەمکار بووین ﴿٥﴾ دەجا بە دڵنیاییەوە لە هەر کام لەوانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ لا نێرراونو، لە پێغەمبەرانیش دەپرسینەوە ﴿٦﴾ وە ئێمە بە زانیاریی خۆمان هەواڵەکانیان بەسەردا دەخوێنینەوە، وە هیچ کاتێکیش دوورو بێئاگا نەبووین ﴿٧﴾ وە کێشانو هەڵسەنگاندنی کردەوەکان لەو ڕۆژەدا ـ بە هەقە، ئنجا هەر کەس (کردەوە چاکە) کێشراوەکانی قورس بن، ئەوە ئەوانە سەرفرازن ﴿٨﴾ وە هەر کەس (کردەوە باشە) کێشراوەکانی سووك بن، ئەوە ئەوانەن کە خۆیان لەدەست داوە ، بەهۆی بە درۆدانانی ستەمکارانەی ئایەتەکانمانەوە ﴿٩﴾)) .

## شـیکـردنـەوەی هـەنـدێ لـە وشـەکـان

(حَـرَجٌ ): (أَصْلُ الحَـرَجِ وَالحِـرَاجِ مُجْتَمَـعُ الشَّـيْئَيْنِ، وَتُصَـوِّرَ مِنْـهُ ضِـيقُ مَـا بَيْنَهُمَـا، فَقِيـلَ لِلضَّـيِّقِ حَـرَجٌ) واتــە: لــە بنەڕەتــدا وشـــەی (حَـرَج وحِـرَاج) بــە شـــوێنی کۆبوونەوەی دوو شـتان دەگوترێ، ئنجـا لەبــەر ئـەوەی کە دوو شـت کۆدەبنـەوە، وا مەزەندە دەکرێ کە بـەینەکەیان تـەنگ بـێ، بۆیـە بـە هـەموو تەنگییـەك گوتـراوە (حَـرَج).

(وَذِكْرَىٰ ): (الذِّكْرَى: كَثْرَةُ الذِّكْرِ وَهُوَ أَبْلَغُ مِنَ الذِّكْرِ) واتـە: وشـەی (ذِكْرَى) یانــی: زۆر یـادکــردن، یـان زۆر هێنانـە بیـرخـۆ، کـە لـە وشـەی (ذِكْر) زێـدەڕۆیی زیاتری تێدایـە، واتە: (ذِكْرَى) بـەهێـزتره لە ڕووی ماناوە لە (ذِكْر).

(تَذَكَّرُونَ ): واتــە: بیــر دەکــەنەوە، یــان پەنــد وەردەگــرن، (الـذِّكْرُ ذِكْرَانُ: ذِكْـرٌ بِالقَلْبِ وَذِكْرٌ بِاللِّسَانِ، وَكُلٌّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا ضَرْبَانِ، ذِكْرٌ عَنْ نِسْيَانِ ، وَذِكْـرٌ لا عَنْ نِسْيَانِ بَلْ عَنْ إِدَامَةِ الحِفْظِ) واتە: وشـەی (ذِكْر) دوو جۆرە: یـادکـردن بـە دڵ هەیـە، یاد کردن بـە زمـان هەیـە، وە هـەر کـام لـە یادکردن بـە دڵو یـادکردن بـە زمـانیش، دوو جۆرن: یـادکردنێك کە لە دوای لەبیـرچوونەوەیـە، واتـە: تـۆ شـتێکت لەبیـرچووە، دوایـی یادی دەکـەی، وە یـادکردنێك کە لـە دوای لەبیــرچوونەوە نیـە، بـەڵکو بـەردەوامی لەسـەر باس کردنو یـادکردنی ئەو شـتە، ئنجـا یـان بــە دڵ، یـان بـە زمـان باسی دەکـەی.

(قَرْيَـةٍ ): (القَرْيَةُ: اسْمٌ لِلْمَوْضِعِ الَّذِي يَجْتَمِعُ فِيهِ النَّاسُ وَلِلنَّاسِ جَمِيعَاً، وَيُسـتَعْمَلُ فِي كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا) واتـە: وشـەی (قَرية) هەم ناوە بۆ شـوێنێك کـە خـەڵك تێیـدا کۆدەبێتــەوە، وە هــەم بــۆ خەڵکــێك کــە کۆبوونەتــەوە، دیســان پێیــان دەگــوترێ: (قَريـة)، دیــارە پێشــتــریش باســـمان کــردوە، وشـــەی (قَريـة) لــە بــەکــارهێنانی قورئــاندا، واتــە: ئــاوەدانیی گـــەورە، شــاری گــەورە، بـــە پێچــەوانەی مانـا بـاوو

عورفییەکەی کە (قریة) واتە: گوندو لادێو، لە بەرانبەریدا (مدینة) هەیە، واتە: شار، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئاندا وشەی (قریة) واتە: شارێکی زۆر گەورەو ئاوەدان ، بۆیەش بە مەککە گوتراوە (أُمّ القُرى) چونکە ئەو کاتە دایکی شارەکانو دایکی ئاوەدانییەکان بووە.

(بَأۡسُنَآ ): (البُؤْسُ وَالبَأْسُ والبَأْساءُ : الشِّدَّةُ وَالمَكْرُوه) هەر سێ وشەی (بُؤْس وَبَأْسُ وبَأْساءُ) بە مانای توندیی و سەغڵەتیی و شتێك ئینسان پێی ناخۆش بێ ، دێن.

(بَيَٰتًا ): (بَاتَ فُلاَنٌ يَفْعَلُ كَذَا ، عِبَارةٌ مَوضُوعَة لِمَا يَفْعَلُ باللَّيْلِ) واتە: کە دەگوترێ: (بَاتَ فُلاَنٌ يَفْعَلُ كَذَا) واتە: فلان کەس بە شەوێ بەردەوام ئەو کارەی دەکرد، یانی: وشەی (بَاتَ) عیبارەتێکە دانراوە بۆ هەر کارێك کە بە شەوێ دەکرێ، وەك چۆن وشەی (ظَلّ) بۆ هەر کارێکە کە بە ڕۆژێ دەکرێ ، کە بڵێی : (ظَلّ يَفْعَلُ كَذَا) واتە : بە ڕۆژێ کارەکەی کرد ، بەڵام ئەگەر بڵێی : (بَاتَ فُلاَنٌ يَفْعَلُ كَذَا) واتە : بە شەوێ کارەکەی ئەنجام دا .

(قَآئِلُونَ ): کۆی (قَائِل) دەڵێ: (قِلْتُ قَيْلُولَةً : نُمْتُ نِصْفَ النَّهَارِ ، مَقِيل مَصْدَرٌ أَوْ مَوْضِعُ القَيْلُولَة) دەگوترێ: (قِلْتُ قَيْلُولَةً) واتە : لە نیوەڕاستی ڕۆژێدا خەوتم، وشەی (مَقِيل)یش یاخود، چاوگە، یان ناوی ئەو شوێنەیە کە ئینسان تێیدا دەخەوێ، لە کوردەواریی خۆشمان دا دەگوترێ : سەرخەو شکاندن ، واتە: ئەو خەوەی کە بە ڕۆژێ دەکرێ لە ماوەیەکی کەمیدا .

(دَعۡوَىٰهُمۡ ): (الدَّعْوَى: الإدِّعَاءُ، قَالَ : ﴿... فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ ... ﴿٥﴾﴾ الأعراف، وَالدَّعْوَى: الدُّعَاءَ، قَالَ: ﴿...وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾﴾ یونس، واتە: وشەی (دَعْوَى) بە دوو واتایان هاتوە: بە مانای (إدِّعَاء) هاتوە، کە کەسێك داوای شتێك بکات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿... فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ ... ﴾، واتە: (فَمَا كَانَ إدّعَائُهُم)، وە هەروەها (دَعْوَى)

بەمانای پاڕانەوەش هاتوە، وەك خـوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ ... ﴾، واتە: كۆتـا پاڕانەوەیـان ئەوە بوو كە ئەوەیان گـوت.

( فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم ): بێگومان وشـەی (ل) لامو وشـەی (ن) بۆ تەئكیـدن، كـە دەفەرموێ:

﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ ﴾، واتـە: بێگومـان بەسـەریاندا دەخـوێنینەوە بـە زانیاریی، واتە: ئەو هەوالانەی ژیانی دنیایان بەسەردا دەخـوێنینەوە، بـە زانیـاریی خۆمـان، دەڵـێ: (القَصّ تَتَبُّعُ الأَثَرِ، القَصَصُ : الأَثَرِ، وَالأَخبَار الـمُتَتَبَّعَةُ وقَصَّهُ حَكـاهُ، رَوَاهُ)، واتە: وشـەی (قَصّ) بـە شـوێنكەوتنی شـوێنەواری كەسێك دەگوترێ، وە وشـەی (قَصَص) بـە شـوێنەوارەكە دەگـوترێ، وە بـە چـەند هەواڵـێكیش دەگـوترێ كـە بـەدوای یەكـدا دێـن، وە دەگـوترێ: (قَصَّهُ) واتـە: (حكـاهُ، رَوَاهُ) گێڕایەوە، باسی كـرد.

(غَآئِبِينَ ): كـۆی (غـائِب)ە ، واتـە: نادیـار، یـان بـێ ئـاگـا، (غـابَ غَيْبَـاً وَغِيْبَـةً وَغَيْبُوْبَـةً وَغِيَـاباً، خلافُ شَهِدَ وَحَضَرَ، بَعُدَ وَسافَرَ) واتـە: وشـەی (غَاب) یانـی: لـەوێ ئـامادە نـەبوو، (غَابَ غَيْبَاً وَغِيْبَـةً وَغَيْبُوْبَـةً وَغِيَـاباً) وە پێچـەوانەی (شَهِدَ وَحَضَرَ)یـە، (شَهِدَ) واتـە: بینـی، (حَضَرَ) واتـە: ئـامادەبوو، وە (غـاب) بـە مانـای دووركـەوتنـەوەش دێ، وە بـە مانـای سـەفەركردنیش دێ، واتە: لـەو شـوێنە نـەبوو، سـەفەری كـرد.

(وَٱلْوَزْنُ ): (الـوَزْنُ: مَعْرِفَةُ قَـدْرِ الشيءِ) واتـە: (وَزْن) لە زمانی عەرەبیـدا، واتـە: زانـینی ئەنـدازەی شـتێك.

(مَوَٰزِينُـهُۥ ): كۆی (میزان)ە، واتە: تـەرازوو، یان كۆی (موزون)ە، واتـە: شـتێك كێشـرا بـێو قورساییەكەی زانراو بـێ.

# مانـای گـشـتـی ئـایـەتـەکـــان

دیارە ئەم سوورەتە موبارەکە کە سوورەتی (الأعراف)ە، لە گەرمەی کارو چالاکی بانگەوازی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە هاوەڵانی بەڕێزی دا هاتۆتە خوار، چونکە بەپێی ڕیزبەندیی دابەزێنرانی، ژمارە (٣٩)یە، بەپێی نێوەڕۆکەکەشی کە تەماشا دەکەین لە گەرمەی کارو هەوڵو تێکۆشانی پێغەمبەردا ﷺ بۆ تێگەیاندنو پێگەیاندنو فێرکردنو پەروەردەکردنی خەڵك دا، هی خەڵکی مەککە بەتایبەت، وە خەڵکی دیکەش بە گشتی، لەو کاتەدا هاتۆتە خوار.

وە ئەم (٩) ئایەتەی سەرەتا وەك پێشەکی وان بۆ هەموو ئەو ئایەتانەی دیکە کە لە دوایە دێن.

ئنجا مەگەر چۆن ئەگەرنا هەموو سوورەتەکانی قورئان بە پێشەکییەك دەست پێدەکەن ، ئەگەر تەماشای سوورەتەکانی (البقرة و آل عمران و النساء و المائدة و الأنعام) بکەین ، کە تا ئێستا ڕابردوون ، وە سوورەتەکانی دواییش ، مەگەر چۆن دەنا، هیچ سوورەتێك نیە ، کە خوای پەروەردگار لە سەرەتایەوە ، وەك پێشەکییەك ئاماژە نەکات بە هەموو ئەو بابەتو باسو خواسانەی کە لەو سوورەتەدا دێن .

ئنجا لێرەدا کە بە ناوی خوای ﷻ بە بەزەیيو بەخشندە دەست پێدەکات ، وە گەلێك جاری دیکەش باسمان کردوە ، کە ئینسان دەڵێ : ﴿بسم الله الرَّحمن الرَّحيم﴾ واتە : بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، دەست پێدەکەم، دەست دەکەم بە خوێندنەوەی ئەم ئایەتانە، یاخود ئەو کارەم بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە دەست پێدەکەم، کە کاتی گوتنی ئەمەش، دەبێ سێ واتا لە دڵی خۆتدا بگری :

یەکەم : ئەم کارەم بۆ خوایە.

دووەم : ئەم کارەم بەپێی شەرعی خوایە.

سێیەم : ئەم کارەم بە یارمەتیيو بە تەوفیقی خوای پەروەردگارە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓصٓ ﴾ دیارە هەردووك سووڕەتی (البقرة و آل عمران)یش بەو جۆرە پیتانە دەست پێدەکەن، هەڵبەتە چەند سووڕەتێکی دیکەش هەن، بەو جۆرە دەست پێدەکەن، ئنجا وەك دوایی باس دەکەینو پێشتریش باسمان کردوە، باشترین مانا بۆ ئەو پیتە پچڕپچڕانە: (الحرُوف الْمُقَطَّعَة) ئەوەیە کە بڵێین: خوای پەروەردگار دەیەوێ بفەرموێ: ئەی خەڵکینە ! ئەو قورئانەی کە ئێوە بڕوای پێ ناهێنن، وە موحەممەد ﷺ تۆمەتبار دەکەن بەوەی کە بۆخۆی فەرموویەتیو هەڵیبەستوە، هەر لەو پیتو دەنگانە پێکهاتوە، کە ئێوە قسەیان پێدەکەنو پێیان دەنووسن، دەفەرموون ئەو پیتانە لەبەردەستی ئێوەش دا هەن، ئەگەر ڕاست دەکەن : قورئان لەلایەن خواوە بۆ موحەممەد نەهاتوە، بەو پیتانەی لەبەردەستی ئێوەدا هەن، ئێوەش قورئانێکی وا بێنن !

دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ ﴾، واتە: ئەمە کتێبێکە دابەزێنراوە بۆ لات، لە لایەن کێوە دابەزێنراوە ؟ (من ربِّك) لەلایەن پەروەردگارتەوە، ﴿ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ ﴾، با لە بەرانبەر ئەم کتێبەدا، لە بەرانبەر ئەم قورئانەدا تۆ هیچ سەغڵەتییەك لە سینەت دا نەبێ، یانی: هەست بە سەغڵەتیی مەکە، ئنجا بەهۆی چییەوە هەست بە سەغڵەتیی دەکات؟ چونکە ئەم قورئانە گەلێك ڕاستیی تێدان، پێچەوانەی ئەوەن کە لە عەقڵو دڵی خەڵکدا جێگیر بوون، لە ئەفسانەو بیروبۆچوونی ناڕاست، وە ڕاستییەکانی قورئان لەگەڵ چەوتییەکانی کە لە عەقڵو دڵی خەڵکدا هەن، وە لە ژیانی خەڵکدا سەقامگیر بوون، تێکدەگیرێن، ئەمەش دیارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها هەر کەسێك کە شوێن قورئان بکەوێ، لەگەڵ خەڵکی دا تێکبگیرێن، ئنجا خوا فەرموویەتی بەهۆی ئەوەوە، دڵو سینەت سەغڵەت نەبێ، وە هەست بە سەغڵەتیی نەکات.

ئنجا ئایا ئەم قورئانە بۆچی دابەزێنراوە ؟ ﴿ لِتُنذِرَ بِهِۦ ﴾، بۆ ئەوەی بە گشتی خەڵکی پێ وریا بکەیەوە ، خەڵکی پێ بترسێنی ، خەڵکی پێ هۆشیار بکەیەوە، ﴿ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، وە بۆ ئیماندارانیش ببێتە مایەی بیرخستنەوەو، ببێتە مایەی پەند وەرگرتنیانو بیرکردنەوەیان، چونکە لە ڕاستییدا هەموو ڕاستییەکانی

کە قورئان فەرموونیو، وەحی خوا دەیانفەرموێ، لە فیطرەتی بەشەردا هەن، بەلام پێویستییان بەوەیە، کە ئینسان ئەو ڕاستییانەی بیر بخرێنەوە، بۆیە بەگشتی خەڵك دەبێ وریا بکرێتەوە، بەلام بەتایبەت ئیمانداران بیریان بخرێتەوە، وە کارێکی وا بکرێ کە پەند وەربگرن، وە ئەو ڕاستییانەی کە تێکهەڵکیشن لەگەڵ فیطرەتیاندا، بەهۆی ئەو قورئانەوە بیر خۆیانیان بخەنەوە.

پاشان دەفەرموێ: ﴿... ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ... ﴾، بە دوای ئەوە بکەون کە لە لایەن خواوە بۆتان دابەزێنراوە (کە قورئانە)، وە بە دوای سەرپەرشتیارانی دیکەی جگە لە قورئان، یان جگە لە پەروەردگارتان ﷻ کە قورئانو، وەحی خۆی بۆ ناردوون، کە ببێتە ڕێبازو بەرنامەی ژیانتان، مەکەون، ﴿قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾، کەم وایە بیربکەنەوە، یاخود کەم پەند وەردەگرن، هەڵبەتە دوایی باسی دەکەین کە ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ: هەر کەسێك بە دوای بەرنامەی هەر کەسێکی دیکە بکەوێ، وە ڕێبازی هەر کەسێکی دیکە بگرێ، ئەوە ئەو کەسەی کردۆتە سەرپەرشتیارو پەرستراوو مشوورخۆری خۆی.

پاشان خوا سەرنجی مرۆڤەکان ڕادەکێشێ بۆ مێژووو دەفەرموێ: ﴿وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ ﴾، وشەی (كَمْ) لە زمانی عەرەبیی دا، لێرەدا پێی دەگوترێ: (كَم الخبَرِية) واتە: بۆ زۆرییە، واتە: پێشتر زۆر ئاوەدانییمان فەوتاندوون، ﴿فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا ﴾، سزای ئێمەیان بۆ هات لە کاتێکدا کە لە شەوێ دا لە خەودا بوون، ﴿أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ ﴾، یان لە کاتێکدا کە لە خەوو ئیسراحەتی نیوەڕۆدا، یان ڕۆژێ دابوون، واتە: لە کاتی خەوو خافلان دا ، خوای دادگەر سزای داون ، ئنجا سزاو بەلایەکە ، چ بە شەوێ بۆیان هاتبێ ، چ بە ڕۆژێ ، دیارە بۆیەش خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ ﴾ چونکە هەبووە بە شەوێ فەوتاندوونی، وە هەشبووە بە ڕۆژێ فەوتاندوونی .

کەواتە: ئێوەش پەند لەوان وەربگرن، وەك چۆن خوای بالاْدەست سزای خۆی بۆ ئاوەدانییەکانی پێش ئێوەو ولاْتانو شارەکان نارد، کە لایانداbوو لە ڕێبازی خواو ڕێبازی پێغەمبەران (عَلَيهِم الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)، ئێوەش پەند لەوان وەربگرن، بۆ ئەوەی کە ئەوەی بەسەر وان هاتوە، بەسەر ئێوەش نەیەت .

﴿ فَمَا كَانَ دَعْوَىٰهُمْ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾، ئنجا ئایا کاتێك ئەوان سزای خوایان بۆ هات، چییان گوت ؟ دەفەرموێ: پاڕانەوەیان، یاخود داواکارییان، کاتێك سزای سەختی ئێمەیان بۆ هات، هەر ئەوە بوو کە گوتیان: بێگومان ئێمە لە ستەمکاران بووین، واتە: ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، خەتای خۆمان بوو خوا سزای داین، دانیان بە هەڵەو تاوانو کەمو کوڕیی خۆیان دا هێنا .

ئنجا خوا ﷻ دەگوازێتەوە بۆ ڕۆژی دوایی، بۆ قیامەت کە خەڵك وەك بەرزەکی بانان وەك ژیانی دنیا، بۆی دەرناچن، دنیا شاری بێ خاوەن نیە، ژیان تەنیا ئەم ژیانە دنیاییە نیە، بەڵکو ئەمە قۆناغێکە لە قۆناغەکان، بۆیە دەفەرموێ :

﴿ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ ﴾ ، بێگومان ئەوانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ لا ڕەوانەکراون ، لێیان دەپرسینەوە ، واتە : لە خەڵکەکە، ﴿ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، وە لە ڕەوانەکراوانیش دەپرسینەوە، واتە : هەم لە خەڵکەکە دەپرسینەوە، کە پێغەمبەرانیان بۆ هاتون، وە هەم لە پێغەمبەرانیش دەپرسینەوە، لە خەڵکەکە دەپرسینەوە : ئایا پێغەمبەرانتان بۆ نەهات ؟ ئەوانیش دەڵێن: با، ئەدی بۆچی بە قسەتان نەکردن ؟ چی خراپیان پێگوتن ؟ ئایا ئەو شتانەی پێیان گوتن، هەموویان شتی باش نەبوون ؟ بێگومان دەڵێن : با.

ئنجا خوای دادگەر لە پێغەمبەرانیش دەپرسێتەوە، بۆ ئەوەی خەڵك بیانوو بڕاو بکات، ئەگەر نا پێغەمبەران سەرپێچیی فەرمانی خوایان نەکردوە، بەلاْم خوا لە پێغەمبەرانیش دەپرسێتەوە : کە ئایا پەیامو بەرنامەی منتان بەو خەڵکە گەیاند ؟ ئەوانیش دەڵێن : بەڵێ، وە فریشتەکانیش شایەدیی دەدەن ، وە مێژووش شایەدییان بۆ دەدات ، وە بە دیکۆمێنت لە ڕۆژی قیامەتدا دەچەسپێ ، چونکە ئەگەر بەشەر

بتوانن دیکۆمێنت لەسەر خەڵك کۆبکەنەوەو کامیراى شێردراوە دابنێن ، دەبێ خواى زاناو توانا پەروەردگار لە رێى فریشتەکانەوە، چۆن ژیانى هەموو خەڵك بە دیکۆمێنت لە ڕۆژى قیامەت دا بخاتە ڕوو ؟ کە هیچ کەس نەتوانێ نکوولیى لەو ڕاستییانە بکات کە پێغەمبەران رایان دەگەیەنن ؟!

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴾، بێگومان ئێمە بەسەرهاتەکانیان بەسەردا دەخوێنینەوە بە زانیاریى، یانى : زانیاریى خوا ﷻ، خۆى کە وەك گوتم: زانیاریى خوا ﷻ بۆ بیانووبڕ کردنى خەڵك، یانى: سەرجەم کردەوەکان بە شێوەى دیکیۆمێنت، فریشتەکان دەینووسنو، تۆمارى دەکەن، چونکە وەك جارى دیکەش گوتوومانە : کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٢٩ ﴾الجاثية، ئێمە ئەوەى کە ئێوە دەتانکرد نوسخە بەرداریيمان لێ دەکرد، واتە فۆتۆکۆپییمان دەکرد، یانى: چۆنتان کردوە، ئاوا بە دەنگو بە وێنەوە (بالصوت والصورة) پێشانتان دەدەینەوە، وەك لە شوێنێکى دیکەش دا خواى کاربەجێ ئاماژەى پێ دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗاۗ ٤٩ ﴾الكهف، یانى: وە ئەوەى کە کردبوویان، بە ئامادەکراویى بینیان لەبەردەمى خۆیاندا، واتە: وەك خۆىو بە دەنگو بە وێنەوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴾، وە ئێمە بێ ئاگا نەبووین، بەڵکو ئێمە ئامادە بووین، خواى زاناو پەنهانزان بۆخۆى پێى ئاگادارە دەبینێو دەبیستێو دەیزانێو نیازو مەبەستەکانى نێو دڵیشیان دەخوێنێتەوە ، وە فریشتەکانیش هەموو شتێکیان تۆمار دەکردن ، بەڵکو کە ئێستا زانیاریى بەرەو پێش چووە ، دەرکەوتوە کە هەموو هەڵسوکەوتێکى هەر لە خودى خۆى دا تۆمار دەکرێو هەرچى مرۆڤ دەیکات، هەمووى لە مێشکیدا، بگرە لەسەر ڕووحیشى تۆمار دەکرێ.

﴿ وَٱلۡوَزۡنُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّۚ ﴾، وە لەو ڕۆژەدا کێشان بە هەقە، کەس زیادەى بۆ ناخرێتە سەر خراپەکانى، وە لە کردەوە چاکەکانیشى کەم ناکرێتەوە، کێشان بە

هەقە، بە شێوەیەكی ڕێكو ڕاستو دادگەرانە، ﴿فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾، ئنجا هەر كەسێك تەرازووەكانی گران بن، ئا ئەوانە سەرفرازن، وشەی (موازين) دەگونجێ كۆی (ميزان) بێ، واتە: ئەو تەرازووەی كە قسەكانی پێ دەكێشرێن، یان ئەو تەرازووەی كردەوەكانی پێ دەكێشرێن، یان ئەو تەرازووەی كە نیەتەكانی پی دەكێشرێن، یان خەیاڵەكانی پێ دەكێشرێن، یاخود جۆری كردەوەكان، كە ڕەنگە هەر جۆرە تەرازوویەكی تایبەتی هەبێ، تەرازوویەكی هەقو دادگەرانەیە.

وە دەشگونجێ (موازين) كۆی (موزون) بێ، واتە: كێشراوەكان ئەو شتانەی دەكێشرێن لە نیەتی دڵو، قسەی زمانو، كردەوەی ئەندامەكان، ئنجا هەر كەسێك كێشراوەكانی قورس بن ﴿فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾، ئا ئەوانە سەرفرازن، ﴿ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾، وە هەر كەسێك تەرازووەكانی یان كێشراوەكانی سووك بن، ﴿فَأُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم ﴾، ئا ئەوانە كەسانێكن كە خۆیان دۆڕاندووە خۆیان لە دەست داوە، ﴿بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا يَظۡلِمُونَ ﴾، بەهۆی ئەوەوە كە ستەمیان لە ئایەتەكانی ئێمە دەكرد.

ئنجا زانایان دەربارەی ئەم ئایەتە ﴿بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا يَظۡلِمُونَ ﴾، دەڵێن: خوای زانا دەیتوانی بفەرموێ: ﴿بِمَا كَانُواْ يَظۡلِمُونَ آياتنا﴾، واتە: لە سۆنگەی ئەوەوە كە ستەمیان لە ئایەتەكانمان دەكرد ، بەڵام بۆچی دەفەرموێ: ﴿بِـَٔايَـٰتِنَا يَظۡلِمُونَ ﴾؟ بۆچی وشەی: ﴿يَظۡلِمُونَ ﴾ بە (ب) (تَعَدّي)ی كردوە ؟! دەڵێن : بۆ ئەوەی مانای (يُكَذِّبُون) بە درۆدانانو ، بێبڕوا بوون، بگرێتە نێوخۆی ، (لتَضْمينه مَعْنَى : يُكَذِّبُون و يكفرون) كە ئەوەش یەكێكە لە ڕووەكانی ڕەوانبێژیی قورئان، وەك دواییش باسی دەكەین .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿الٓمٓصٓ﴾ کە وەك گوتم ژمارەیەك لە سوورەتەکان، کە (٢٨) سوورەتن لە قورئاندا، بەو پیتە پچڕ پچڕانە، دەست پێدەکەن، ئنجا کە پێیان دەگوترێ: پیتە پچڕ پچڕەکان (الحرُوف المُقَطَّعَة) واتە: نابێ بەسەریەکەوە بیانخوێنینەوە: بۆ وێنە: ﴿الٓمٓ﴾، نابێ بڵێین: (ئەلەم)، بەڵکو دەبێ بە پچڕ پچڕیی بخوێنرێتەوە، بەمجۆرە (ألیف ... لام... میم ... صاد) با بەسەر یەکیشەوە نووسرابن، بەلام وشەیەك نین تاکو بەسەر یەکەوە بیخوێنینەوە، بەڵکو چەند پیتێکی لێك جیاو لێك پچڕاون.

ئنجا چەند سوورەتێك لە قورئاندا بەم پیتانە پچڕ پچڕانە دەستیان پێکردوە، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێ کردوە، شایانی باسیشە زانایان زۆر قسەیان لەوبارەوە کردوە کە ئایا ئەو پیتانە یانی چی؟ وە بۆچی خوای پەروەردگار ئەو پیتانەی بەکارهێناون لە ژمارەیەك لە سوورەتەکانی قورئان دا، کە (٢٨) سوورەتن؟

بەلام باشترین مانا لێکدانەوە، ئەوەیە کە: خوا ﷻ دەیەوێ بەو خەڵکە بفەرموێ: ئەی بەشەر ! ئەو قورئانە چ ئەوانەتان کە ئیمانی پێ دێنن، چ ئەوانەتان کە ئیمانی پێ ناهێنن، بزانن کە هەر لەو پیتانە پێکهاتوە کە ئێوە قسەیان پێدەکەن: (ئەلیف، لام، میم، صاد، نون، قاف...).

کەواتە: ئەو پیتانە وەك کەرەسەیەك لەبەردەستی ئێوەشدا هەن، ئنجا ئەگەر ڕاست دەکەن قورئان خوا نەیناردوە، ئەوە ئەو کەرەسە لەبەردەستی ئێوەشدا هەیە، فەرموون، ئێوەش وێنەیەکی وەك قورئان بێنن، نەخێر، وێنەی دە (١٠) سوورەتی قورئان بێنن، نەخێر، وێنەی سوورەتێکی قورئان بێنن، ئنجا ئەگەر نەتانتوانی، کەواتە : بزانن کە ئەو کەسەی لەو کەرەسە خاوە کە پیتەکانو دەنگەکانن، ئەو قورئانەی هێناوەتە دی، یان ئەو قورئانەی فەرمووە، بزانن کە

ئەو کەسە خوای پەروەردگارە، ئەگەرنا ئەو پیتانە لەبەردەستی ئێوەشدا هەن، ئەی بەشەر ! ئەدی بۆچی ئێوەش ناتوانن فەرمایشتی وەك هی خوا بفەرموون ؟.

هەندێکیش گوتوویانە: ئەو پیتانە بۆ ئاگادارکردنەوەی خوێنەرن، هەر کەس کە قورئان دەخوێنێتەوە، کە دەبیستێ ، خوا دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓ ١ ﴾، ﴿ صٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ١ ﴾، یاخود دەفەرموێ: ﴿ قٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ١ ﴾، یاخود دەفەرموێ: ﴿ نٓ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ١ ﴾، یاخود دەفەرموێ: ﴿ يسٓ ١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ٢ ﴾، وریا دەبێتەوە، وە گوتوویانە: وەك چۆن خەڵك کە پەیوەندیی تەلەفۆن دەکات، دەڵێ: ئەلوو، یان هەلەو، ئەو پیتانەش بە هەمان شێوە بۆ ئاگادارکردنەوەن .

بەڵام من ڕای یەکەمیانم پێ بەهێزترە.

شایانی باسیشە کە ئەو (٢٨) سوورەتانەی کە ئەو پیتە پچڕ پچڕانەی لە پێشەوە هاتوون، مەگەر چۆن ئەگەرنا سەرەتای هەموویان باسی قورئانە، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢ ﴾.

وە لە سوورەتی (آل عمران) دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓ ١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ٢ نَزَّلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ ... ﴾ .

وە هەروەها لە سوورەتی (الأعراف) دەفەرموێ : ﴿ الٓمٓصٓ ١ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ ... ﴾، وە هەموو شوێنەکانی دیکەش هەر وان ، جگە لە چەند شوێنێکی کەم، کە ئەوانیش دەگونجێ بە لێوردبوونەوەی زیاتر دەریبخەین کە هەموو ئەو سوورەتانەی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەیان لە پێشەوە هاتوون، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ، باسی قورئانیان تێدا کراوە، کەواتە: ئەو مانایە زۆر

دەچێتــە عەقــڵ‌و دڵــەوە کـە خــوای پەروەردگــار، بۆیــە لــە پــێش هەنــدێك لــە سوورِەتەکاندا ئەو پیتانەی فەرموون، تاکو ئـاماژە بـێ بـۆ ئـەوە کە ئـەو قورئـانەی ئێوە نکووڵیی لێدەکەن، ئـەی بێبـڕوایەکـان ! بۆتـان نیـە نکووڵیی لێبکـەن، چونکـە هەر لەو پیت‌و دەنگانە پێکهاتوە، کە ئێوە قسـەیان پێدەکەن‌و پێیان دەنووسن.

ئنجا کە نـەتانتوانی وێنـەی وەك قورئـان بێـنن، یـان وێنـەی سـوورِەتێکی قورئـان بێنن، کەواتـە: دەبـێ دڵـنیا بن کە ئـەو قورئـانە لـە دەرەوەی توانـای بـەشــەر هـاتوە، ئەویش خـوای تـاك‌و پاکە.

**مەســەلەی دووەم:** کـە دەفــەرمووێ : ﴿ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، کـە دەفـەرمووێ : ( كِتَٰبٌ ) زانایـانی زمـانی عـەرەبی دەڵێن : شـتێك لـە پێشـەوە پـەرێنراوە، ئـەویش سیاقەکە دەلالـەتی لەسـەر دەکـات، وەك (هَـذَا)، یانــی : (هَـذَا كـتـابٌ) ئەمـە کتێبێکـە، ﴿ أُنزِلَ إِلَيۡكَ ﴾، بـۆ تـۆ دابــەزێنراوە، بۆچـی نەیفـەرمووە: ﴿ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ ﴾، لـە چەنــد شــوێنێك خــوای پەروەردگـار وایـفـەرمووە، ئنجا لەبـەر ئـەوەی لـە شـوێنەکـانی دیکـەدا ئـەو ڕاسـتییە ڕاگەیــەنراوەو ، ئــەم ســـوورِتە (٣٩)یــەمین ســـوورِەتە لــە ڕیزبــەندیی دابــەزێنران (ترتیب النزول)دا، کەواتە: لە زۆر سوورِەتی دیکەدا خـوای زانـا ڕوونی کردۆتەوە، کە قورئـان خـوا بۆ پێغـەمبــەری ﷺ دابــەزاندوە، بۆیـە لێـرەدا بــە پێویسـت نـەزانراوە بفـەرمووێ: من دام بـەزاندوە، بـەڵکو لێـرەدا هەیبــەتیشی زیـاتر تێـدا دەردەکـەوێ کە دەفـەرمووێ : بـۆت دابــەزێنراوە یانــی : لـە لایـەن خــوایەکی پەروەردگــارەوە، کە لـە سـەرووی ئەوەوەیە بـەشـەر بتوانـێ وەسـفی بکـات‌و، وەك خـۆی بیناســێ.

ئنجـا کـە دەفـەرمووێ: ﴿ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ ﴾، بـا لـە سینەتدا لەبارەیــەوە هیــچ جـۆرە سـەغڵـەتییەك نەبــێ، وە وشــەی (حَرَجٞ مِّنۡهُ ) مـادام بــە (نكـرة) هــاتوە یــانی : (أَي مِقْـدَارٍ مِـنَ الحـرَج) بـا هــیچ جـۆرە سـەغڵـەتییەك لـە سینەتدا نەبـێ بەهـۆی قورئـانـەوە، یـان لەبـارەی قورئانــەوە واتـە: بــە دڵ فراوانیــی

وەریبگرە، با لەگەڵ عادەتو نەریتو بیرو بۆچوونی گەلەکەشتدا دژ بوەستی، هەروەها سەغڵەت مەبە بەهۆی کوفرو نکوولیی لێکردنی کافرەکانەوە، کە قبووڵی ناکەنو بە درۆی دادەنێن .

ئنجا ئایا لێرەدا تەنیا مەبەست پێغەمبەرە ﷺ، یاخود وێرای وی مسوڵمانانیشو هەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێتەوە ؟

دەڵێم : مەبەست پێغەمبەری خوایە ﷺ پێش هەموو کەس، دوای ویش مەبەست هەموو ئیماندارانێکە کە بەدوای پێغەمبەردا ﷺ دەچنو ئیمان بە قورئان دێنن، کەواتە: مەبەست پێی هەردووکیانە.

ئنجا خوا ﷻ بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە قورئان بۆچی دابەزێنراوە ؟ ئامانجی چییە ؟ حیکمەتی خوا لە دابەزێنرانی دا چییە ؟ دەفەرموێ: ﴿ لِتُنذِرَ بِهِۦ ﴾، تاکو پێی ئاگادار بکەیەوە، کێی پێ ئاگادار بکرێتەوە ؟ خەڵك، مرۆڤایەتی، وە وشەی (إِنْذَار) دەڵێ: (إعْلامٌ مَعَ تخويفٍ) ئاگادارکردنەوەیەکە لەگەڵ ترساندن دا، واتە: خەڵکی پێ بترسێنیو، هۆشیار بکەیەوەو پێی ئاگادار بکەیەوە، کە دنیا شاری بێ خاوەن نیە، مرۆڤ بەرهەڵدا نەکراوە، ژیان هەر ئەم ژیانە نیە، بەڵکو مرۆڤ بۆ حیکمەتو ئامانجێك خوڵقێنراوە، کە بریتیە لە بەندایەتیی کردنی بۆ خوا، کە لە جێنیشنایەتیی کردنی خواو ، ئاوەدانکردنەوەی سەر زەویو هەڵگرتنی ئەمانەتی خوادا بەرجەستە دەبێ، بۆیە دەبێ بەشەر بترسێنرێو، وریا بکرێتەوەو ئاگادار بکرێتەوە، لەو حیکمەتو ئامانجەی کە بۆی خوڵقێنراوە، وە لەو سەرەنجامو چارەنووسەی کە چاوەڕێیان دەکات، وە بزانن کە دەبێ چۆن بژینو ، چی بکەنو ، چۆن بکەن ؟ ﴿ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾، هەروەها قورئان دابەزێنراوە تاکو بیرخەرەوە بێ، بۆ ئیمانداران، بۆچی پێشی دەفەرموێ: ﴿ لِتُنذِرَ بِهِۦ ﴾ دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ؟، یانی : (لِتُنْذِرَ بهِ عَامَّةَ النَّاسِ ، و يكون تذكيراً للمؤمنين خاصة) تاکو بە گشتی خەڵکی پێ وریا بکەیەوە، بەڵام بەتایبەت پێی بیری ئیمانداران بخەیەوەو پەندیان دابدەی بۆچی ؟ چونکە ئیمانداران پێشتر وریاو ئاگاداربوونەوەو هۆشیار بوونەوە، ئنجا دوای وریا بوونەوە، دەبێ ڕاستییەکان بیر خۆیان بخەنەوەو پەند وەربگرن.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَۗ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾، واتە: بکەونە شوێن ئەوەی کە لە پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێنراوە، کەواتە: بکەونە شوێن قورئان، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە: خوا ﷻ بە زۆریی کە باسی دابەزێنرانی قورئان دەکات، وشەی (رَبّ) بەکاردێنێ، بۆ وێنە لێرە دەفەرموێ: ﴿أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ﴾، نافەرموێ : (إِلَـهكُم) یان : (مَلِكِكم) یان (مَالِكِكُم) وشەی: ﴿مِّن رَّبِّكُمْ﴾، بە مانای پەروەردەکارو بەخێوکارو مشوورخۆرو سەرپەرشتیارو گەورەو سەروەر دێ، واتە: ئەم قورئانە لە لایەن زاتێکەوە، کە پەروەردەکاری ئێوەیە، ڕۆزیدەری ئێوەیە، ژیێنەرو مرێنەری ئێوەیە، مشوورخۆری ئێوەیە، وە سەرپەرشتیارو گەورەو سەروەری ئێوەیە، دابەزێنراوە.

کەواتە: بۆیە بۆی دابەزاندوون، تاکو بەهۆی قورئانەوە پەروەردەتان بکات، تێتان بگەیەنێ، پێتان بگەیەنێ، بەرەو پێشتان بەرێو گەشەتان پێ بدات.

ئنجا دەفەرموێ: شوێن ئەو قورئانە بکەون، شوێن ئەوە بکەون کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێنراوە، ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ﴾، وە بە دوای سەرپەرشتیارانی دیکەی جگە لەو مەکەون، واتە: جگە لە قورئان، یاخود جگە لەو، واتە: جگە لە خوا، واتە:

١/ ڕاناوی (ە) لە وشەی : (مِن دُونِهِۦ)یدا بۆ پەروەردگار دەچێتەوە، یانی: جگە لە پەروەردگار بەدوای سەرپەرشتیارانی دیکە مەکەون، وە بەدوای کتێبو بەرنامەو ڕێبازی خەڵکی دیکە مەکەون، بۆ ڕێکخستنی ژیانی دنیاتان، ڕێکخستنی ژیانی تاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و سیاسیی‌و ئابوورییتان لە هێڵە گشتییەکانیدا.

٢/ یاخود بە دوای جگە لە قورئان مەکەون، چونکە تاکە کتێبێك کە هیدایەتی خوای تێدایەو، دەگونجێ ببێتە سەرپەرشتیاری مرۆڤ و، ببێتە مشوورخۆری مرۆڤ ، تەنیا قورئانە ، وە دەگونجێ هەردووکیشیان پێکەوە مەبەست بن.

بەڵێ وشەی: ﴿ مِن دُونِهِۦٓ ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی پەروەردگار بێ، دەشگونجێ ڕاناوەکە بچێتەوە بۆ قورئان، دیارە خوای پەروەردگاریش لە ڕێی قورئانەوە خەڵك پەروەردە دەكاتو سەرپەرشتییان دەكات، ئنجا ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ: هەر كەسێك بەدوای جگە لە كتێبی خوا بكەوێ، یانی: جگە لە خوای كردوە بە سەرپەرشتیارو دۆستو پشتیوانی خۆی، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾، بە كەمیی بیر دەكەنەوەو، پەند وەردەگرن، ئنجا ئایا كێن ئەوانەی پەند وەردەگرن ؟ بێگومان ئەوانەن كە دوایی ئیمان دێنن.

## وەڵامدانەوەی پرسیارێكی گرنگ

لێرەدا زانایان دەڵێن: ئایا كە خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾، سوننەتیش دەگرێتەوە ؟

هەندێك دەڵێن: نەخێر، تەنیا قورئان دەگرێتەوە، چونكە تەنیا قورئان لەلایەن خوای زاناو تواناوە بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ هاتۆتە خوار بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ.

وە هەندێكیشیان دەڵێن: بەڵكو سوننەتیش دەگرێتەوە.

منیش ئەم ڕایەی دووەمم پێ ڕاستە، بە بەڵگەی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ كە بە چەند ڕیوایەتێك هاتووە، لە یەكێكیان دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، إِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ مِنْ دِينِكُمْ، فَخُذُوا بِهِ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ مِنْ رَأْيٍ فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٣٦٢)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٢٣)، وَالطَّبَرَانِي برقم: (٤٤٢٤)}، هۆی گوترانی ئەم فەرموودەیە (سبب الورود)یشی ئەوەبوو كە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك بە لای كۆمەڵێكدا ڕۆیشت، كە دارخورمایان موتوربە (تلقيح) دەكرد، تۆوی نێرەكەیان دەبردە سەر مێیەكەی، بۆ ئەوەی كە موتوربە بێو بەر بگرێ، فەرمووی: پێم وایە ئەگەر واش نەكەن زەرەری نیە، شتێكی وای فەرموو، ئەوانیش وازیان لێ هێنا، بەڵام دوایی دارخورمایەكە بەری نەگرت، پێغەمبەر

ﷺ دوایی کە هەوالّیان پێدا، فەرمووی: ﴿إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ﴾ واتە: بێگومان منیش تەنیا مرۆڤێکم وەك ئێوە، ئنجا ئەگەر فەرمانم بە شتێك پێکردن لە دینەکەتان، ئەوە وەریبگرن، {واتە: کە گوتم خوا وای فەرمووە، وەریبگرن}، بەلاّم ئەگەر فەرمانم پێکردن بە شتێك لە بۆچوونی خۆم، ئەوە منیش تەنیا بەشەرم. یانی: ئەگەر بە ڕاستتان زانی، وەریبگرن‌و، ئەگەر بە ڕاستتان نەزانی‌و پێتان وابوو بەهەلّەداچووم، وەری مەگرن.

لە ڕیوایەتی دیکەیدا کە موسلیم هێناویەتی دەفەرموێ: ﴿إِنْ كَانَ يَنْفَعُهُمْ ذَلِكَ فَلْيَصْنَعُوهُ فَإِنِّى إِنَّمَا ظَنَنْتُ ظَنًّا فَلاَ تُؤَاخِذُونِى بِالظَّنِّ وَلَكِنْ إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنِ اللهِ شَيْئًا فَخُذُوا بِهِ فَإِنِّى لَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٣٩٥)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم: (١٠٢) وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٢٠١)}، دوای ئەوەی هەوالّیان پێدا، کە دارخورمایەکە بەری نەگرتووە، فەرمووی: ئەگەر دەزانن سوودی بۆیان هەیە ، با بیکەن، چونکە من بە بۆچوونی خۆم پێم وابوو، ئنجا ئەگەر شتێکم بە بۆچوونی خۆم گوت، ئەوە (ئەگەر هەلّەبووم) لێم مەگرن، بەلاّم ئەگەر شتێکم بەناوی خواوە پێگوتن‌و گێڕامەوە کە خوا وای فەرمووە، وەریبگرن، چونکە بێگومان من درۆ بە ناوی خوای پایە بەرزو شکۆمەندەوە ناکەم.

وە لە ڕیوایەتێکی دیکەی هەر ئەم فەرموودەیەدا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ﴾ {(أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٣٦٣)}، واتە: ئێوە زاناترن بە کاروباری دنیای خۆتان، کەواتە: لەم فەرموودەیەوە دەردەکەوێ، هەروەها لە گەلێك فەرموودەی دیکەش دا، پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە وەك چۆن قورئانی بۆ هاتوە، سوننەتیشی بۆ هاتوە، واتە: ئەوەی کە وەك وەحی بۆی هاتوە، نەك ئەوەی وەك بۆ خۆی ئیجتیهادی کردوە، کە دەگونجێ پێکا بیءو، دەشگونجێ نەیپێکابێ، کە دیارە هەرکات نەیپێکابێ ، خوای زانا بۆی ڕاست کردۆتەوە، بۆیە ئەو سوننەتەی ئێستا لەبەردەستی ئێمە دایە ، چ ئەوەی وەحی ڕاستەوخۆی خوا بێ، چ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە ئیجتیهادی خۆی فەرمووبێتی، مادام دوایی خوا ئیقراری لەسەر کردوە، هەمووی دەچێتە نێو ڕێبازی پێغەمبەرﷺو ئایینەوە، مادام خوای پەروەردگار بە ڕاستی داناوە.

کەواتە: خوای بەرزو مەزن کە دەفەرموێ: ﴿أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ﴾، وێڕای قورئان، سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ دەگرێتەوە.

وە کە دەشفەرموێ: ﴿قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾، واتە: زۆر بە کەمیی دێتەوە یادتان، یاخود کەمێکتان دێتەوە یادتان، هەردوو واتاکەی ڕاستن، چونکە زۆر بە کەمیی دێتەوە یادتان، واتە: بەشەر بەگشتی شتی لەبیر دەچێ، وە کە دەشفەرموێ: کەمێکتان دێتەوە یادتان، واتە: تەنیا ئەوانەتان دێتەوە یادتانو پەند وەردەگرن، کە ئەهلی ئیمانن‌و خوای پەروەردگار هیدایەتی داون، بۆ ئیمان، چونکە شایستەی ئەوەن‌و ڕەغبەتتان هەیە بۆ قبووڵکردنی ئیمان، ئەگەرنا خوای پەروەردگار ستەم لە کەس ناکات، کەسێك بیەوێ بەرەو ئیمان‌و هیدایەت بڕوات، خوا دەربارەی ئەوانە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩﴾العنكبوت، واتە: وە ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، خۆماندوو دەکەن، بەرەو خوا دەچن، بە تەئکید ڕێبازەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین، یانی : دەستیان دەگرین‌و هیدایەتیان دەدەین، بەرەو خۆمان پەلکێشیان دەکەین، وە بەدڵنیاییی خوا لەگەڵ چاکەکاران دایە.

**<u>مەسەلەی چوارەم</u>** : کە دەفەرموێ: ﴿وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ ٤ فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ٥﴾، ئەم دوو ئایەتە موبارەکە، کە پێشتر مانامان کردوون، تێیاندا خوا ﷻ سەرنجی ئێمەی مرۆڤ ڕادەکێشێ بۆ مێژووی بەشەر، وە شێوەی مامەڵەکردنی خوای دادگەرو کاربەجێ لەگەڵ مرۆڤایەتییدا، لە بواری هەڵوێستی ئەرێنیی‌و نەرێنییان، لە بەرانبەر پێغەمبەران‌و ئەو بەرنامەو پەیامەدا کە پێغەمبەران لە خواوە هێناویانە، دەفەرموێ: ﴿وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا﴾، زانایان گوتوویانە: ئەو (كَمْ)ە، لێرەدا (كَمْ)ی (خَبَرية)یە، چونکە (كَمْ)یش هەیە بۆ پرسیارکردن

بەکاردێ، وەك: (كَمْ قَلَماً عِنْدَك) چەند قەڵەمت لەلان ؟ وە (كَمْ)مان هەیە بۆ زۆریی بەکاردێ، لە کوردەواریی خۆشماندا دەڵێین : (چەند جاران هاتم بۆ لات !) واتە: زۆرجار هاتم، بەڵام دەگونجێ بۆ پرسیاریش بەکاربێ ، وەك دەڵێی: (ئەرێ چەند جاران هاتم بۆ لات ؟) یانی: وشەی (كَمْ) لە کوردییدا بە چەند لێك دەدرێتەوە، بۆ پرسیارکردن، وە دەشگونجێ بۆ زۆریی بێ ، کە لێرەدا بۆ زۆرییە ، ﴿ وَكَم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا ﴾، واتە : زۆر ئاوەدانییمان فەوتاندوون، پێشتریش باسمان کردن ، وشەی: ﴿ قَرْيَةٍ ﴾، واتە: ئاوەدانیی گەورە، شاری قەرەباڵغ ، ﴿ وَكَم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا فَجَاءَهَا بَأْسُنَا بَيَاتًا أَوْ هُمْ قَائِلُونَ ﴾، یانی : زۆر ئاوەدانییمان فەوتاندوون، سزای توندی ئێمەیان بۆ هات، بە شەوێ، یان لە کاتێکدا ئەوان لە قەیلوولەدا بوون ، واتە : لەکاتی نیوەڕۆدا سەرخەویان شکاند بوو .

پێنج هەڵوەستە لەبەردەم ئایەتی ژمارە (٤ و ٥ )دا

**هەڵوەستەی یەکەم**: لێرەدا زانایان دەڵێن : کە خوای زانا دەفەرموێ : ﴿ وَكَم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا فَجَاءَهَا بَأْسُنَا بَيَاتًا ﴾، بە ڕواڵەت جۆرێك لە ئیشکال هەیە: چونکە بێگومان کە دوای ئەوەی سزای خوا هاتوە، ئنجا خەڵکی خراپو لادەری ئەو ئاوەدانییانەی فەوتاندوون، بەڵام لێرەدا خوا دەفەرموێ: زۆرمان فەوتاندوون، ئنجا سزای ئێمەیان بۆ هات !! بەڵام ئەو ئیشکالە ئاوا وەڵام دەدرێتەوە: کە ئەوە یەکێکە لە شێوازەکانی قسەکردن، نەك هەر لە زمانی عەرەبی دا، بەڵکو لە هەموو زمانەکانی دیکەدا، بۆ وێنە: تۆ بە کەسێك دەڵێی : تۆ سەردانی منت کرد، ڕێزی منت گرت، (زُرْتَنِي فَأَكْرَمْتَنِي)، کە لە ڕاستییدا ڕێز لێگرتنەکەی ئەو بۆتە پاڵنەرو هاندانی کە سەردانت بکات، بەڵام تۆ سەردانەکە پێش دەخەی، ئنجا ئەوەش لێرەدا بە هەمان شێوەیە، کە لە ڕاستییدا دوای ئەوەی کە سزای خوا هاتوە، ئنجا خەڵکی ئەو ئاوەدانییانە فەوتاون، بەڵام فەوتاندنەکە پێش خراوە ، لە شێوازی قسە کردنو زماندا.

وە دەشگونجێ مەبەست ئاوا بێ : (أَرَدْنَا إِهْلاكَهَا ، فَجَاءَهَا بأْسَنَا) واتە : ویستمان بیانفەوتێنین‌و، بڕیاری فەوتاندنیانماندا، ئنجا سزای ئێمەیان بۆ هات.

وە هەندێکی دیکە لە زانایان ئاوا لێکیان داوەتەوە: (أَهْلَكْنَاهَا بعِصيَانِها فَجَاءهَا العِقَاب)، واتە: بەهۆی سەرپێچیی کردنیانەوە {لە ئێمەو لە پێغەمبەرانی ئێمە}، بڕیاری فەوتاندنیانماندا، ئنجا سزای ئێمەیان بۆ هات، واتە: لە ئەنجامی سەرپێچییاندا خوای دادگەر فەوتاندوونیو گوناح کردنەکەیان فەوتانەکەیان بووە، چونکە یەکسەر سزای خوای دادگەر بە دوای گوناح‌و سەرپێچیی ئەواندا دێ.

**<u>هەڵوەستەی دووەم</u>**: کە دەفەرموێ: ﴿بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ﴾، (بَيَٰتًا) واتە: لە شەوێ دا، لە کاتێکدا لە ئیسراحەتی شەودا بوون، ﴿أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ﴾، یان کاتێك کە لە ئیسراحەتی ڕۆژدا بوون، واتە : غافڵ گیر کران، لە کاتێکدا کە بە شەوێ خەوتبوون یان، بە ڕۆژێ خەوتبوون.

ڕەنگە یەکێك بڵێ: ئایا خوای پەروەردگار لێی ڕوون نیە، ڕۆژ بووە، یان شەو بووە ؟ بۆچی وشەی یان (أَوۡ)ی بەکارهێناوە ، لە ڕستەی : ﴿بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ﴾ دا ؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: بۆیە خوای پەنهانزان وا دەفەرموێ، چونکە هەندێك لەو گەل‌و نەتەوانەی بە شەوێ فەوتاندوون، وە هەندێکیشیانی بە ڕۆژێ، واتە: سزای ئێمەیان بۆ هات، بە شەوێ، یان بە ڕۆژێ، دیارە هەردوو حاڵەتەکانی شەوو ڕۆژ سزای خوای بەرزو مەزنیان تێدا هاتوە.

**<u>هەڵوەستەی سێیەم</u>**: کە دەفەرموێ: ﴿فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ﴾، وشەی (دَعْوَى) پێشتریش باسمان کرد کە لە زمانی عەرەبییدا بە دوو واتایان دێ:

أ) بـە مانای پاڕانەوە دێ .

ب) بـە مانای داوا کردن دێ .

(دَعْوَىٰهُمْ : أَي دُعَاؤُهُم أَوْ طَلَبُهُم) پاڕانەوەیان، یاخود داوایان کردنیان، یانی:

﴿ فَمَا كَانَ دَعْوَىٰهُمْ ﴾، پاڕانـــەوەو داواکـــردنی ئـەوان هـەر ئـەوە بـوو و بـەو شێوەیە پاڕانـەوەو داوایـان لـە خـوا کـرد، کـە گوتیـان : خـوایە ! ئێمـە ستەمکـار بوویـن، وەك بڵێـن : بـە خراپەی خۆمان لەگەڵمان مەکە.

**هەڵوەستەی چـوارەم** : کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾، دیارە وشـەی (إِنّ) کە چووەتە سەر (نا) ئەسڵی خۆی (إنّ + نا)یە، ﴿إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾و﴿ ظَٰلِمِينَ ﴾، کـە بـە سیغەی (إسم فاعل) هێناویەتـی، واتـە: بێگومـان، بـە دڵنیاییـەوە ئێمـە ستەمکار بووین‌و زۆریش ستەمکار بووین، واتە: دان بـە هەڵەو تـاوانی خۆیـاندا دێـنن، وە خـوای کـاربەجێ ڕایگەیانـدوە کـە کۆمـەڵگاکان هەتـا سـتەمکار نـەبن، سـزایان نـادات، وەك لـە شـوێنی دیکـەدا دەفـەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾﴾القصص، واتە: وە ئێمە ئـاوەدانییەکان نافـەوتێنین ، ئەگـەر خەڵـکەکەیان سـتەمکار نـەبن، (ئێمـە ئـاوەدانییەکـان‌و شارەکان نافەوتێنین ، دانیشتووان‌و خەڵـکەکەی نافەوتێنین، ئەگەر ستەمکـارو خراپەکـارو لادەرنـەبن)، بـە تەئکیـد دادگـەریی خـواو، ڕەحمـی بـە بـەزەیی بـێ سنووری خـوا، کاربـەجێی خـوا، هەر وای لـێ چـاوەڕوان دەکـرێ، کـە لەخـۆوە لـە خەڵـکی هەڵنـاپێچـێ، بـە پێچـەوانەی ئـەوەوە کـە هەنـدێك لـە مسـوڵمانان وا تەصـەووڕ دەکـەن، کـە لەبـەر ئەوەی خـوای باڵادەسـت هـەموو شـتێکی لـە توانـادا هەیە ، وە هەرچی بیەوێ دەیکـات ! وا دەزانـن هـەر بـەگـۆترە دەیکـات ؟ نـەخێر، وەك لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ ...إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾ ﴾، واتـە : بێگومـان پەروەردگـارم لەسـەر ڕێیـەکی ڕاسـتە، واتـە: یاساکـانی ڕاسـت‌و

دادگەرانەن‌و بە کاربەجێی خۆی داینـاون‌و، بەو یاسایانەو بەو ڕێیە ڕاستەشدا مامەڵە لەگەڵ بەندەکانی خۆی دا دەکات، نەك هەر بەگوێرەو لەخۆڕا خەڵك بفەوتێنێ؟! یان هەر لەخۆڕا خەڵك دەرباز بکات، هەم دەربازکردنی هەندێك لەوانە کە دەربازیان دەکات، بەهۆی ئیمان‌و گەڕانەوەیانەوەیەو، هەم فەوتاندنیشی بۆیان، بەهۆی خراپەکاریی‌و بەردەوام بوونیانەوەیە، لەسەر ستەم‌و خراپەکارییان.

ئنجا ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ ؟ ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە ئەی بەشەر ! ئەی مرۆڤەکان ! ئێوەش پەند وەربگرن لە گەلانی ڕابردوو، گەلانی پێشوو کە بەهۆی ستەم‌و خراپەو لادانیانەوە، سزای خوایان بۆ هات بە شەو، یان بە ڕۆژ، وە فەوتان‌و لەبەین چوون، دوایش دانیان بە هەڵەو تاوانی خۆیان دا هێنا، کەواتە: ئێوەش ئاگاتان لە ستەم‌و خراپە بێ.

**هەڵوەستەی پێنجەم**: پێویستە ئەوەش بزانین کە وشەی (ظُلْم) لە زمانی عەرەبیدا ئاوا لێکدراوەتەوە: (تَجَاوز الحُدُود، أو وَضْعُ الشيء فِي غير مَوضعِهِ)، واتە: سنوور بەزاندن، یاخود دانانی شتێك لە شوێنێك کە شایستەی نەبێ.

کەواتە: وشەی (ظُلْم) هەم بۆ سنوور شکاندن لەگەڵ خەڵك‌و پێشێل کردنی مافەکانیان بەکاردێ، وە هەم بۆ هەر جۆرە گوناح‌و لادانێك بەکاردێ، تۆ هەر گوناهێك دەکەی ، هەر هەڵەیەك کە دەیکەی ، بریتیە لە دانانی شتێك لە شوێنی نەگونجاوی خۆی دا.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، ئەو (ف)ی یان بۆ جەزایە، یان بۆ تەعقیبە، (الفاء للجزاء أو التعقيب) واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا، یاخود بە دوای ئەوەدا، وە (ل)مەکەش لامی قەسەمەو بۆ تەئکیدە، یانی: سوێند بە خوا ، بێگومان ، بە دڵنیاییەوە ، ئێمە ئەوانەی کە (پێغەمبەران) بۆ لایان ڕەوانە کراون ، لێیان دەپرسینەوە ، وە ئەوانەش کە ڕەوانە کراون لێیان دەپرسینەوە، مەبەست لە:

﴿ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ﴾، واتە: ئەو خەڵكو كۆمەڵگاو میللەتانەی كە پێغەمبەرانیان بۆ لا ڕەوانە كراون، خوا لێیان دەپرسێتەوە، ﴿وَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾، وە لە ڕەوانەكراوەكانیش كە پێغەمبەرانن ، دەپرسێتەوە، ئەمە وەك ئایەتی (٦٥)ە لە سوورەتی (القصص) كە دەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾، واتە: ڕۆژێك بانگیان دەكات (خوا بانگی خەڵك دەكات) بانگی كۆمەڵگایەكان دەكات، چۆن وەڵامی ڕەوانەكراوەكانتان دایەوە ؟

سەبارەت بە لێپرسینەوەی پێغەمبەرانیش: خوا لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی (١٠٩)دا دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡۖ قَالُواْ لَا عِلۡمَ لَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ﴾، كە پێشتر تەفسیرمان كردوە، واتە: ئەو ڕۆژە كە خوا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، كۆ دەكاتەوە، دەفەرموێ: چۆن وەڵامتان درایەوە؟ گوتیان: زانیاریمان نیە، بێگومان هەر تۆی زۆر زانای پەنهانەكان، واتە: زانیاریی پێویست تەنیا لەلای تۆیە، كە چۆن وەڵام دراینەوە.

وە خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (النساء)یشدا، لە ئایەتی (٤١)دا كە دەفەرموێ : ﴿فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا﴾، واتە: چۆن دەبێ، كاتێ كە لە هەر كۆمەڵێك شایەدێكو چاودێرێكیان بەسەرەوە دێنین، وە تۆشمان بە چاودێرو شایەد هێنا، بەسەر ئەوانەوە، یانی: بەسەر ئۆممەتەكەی خۆتەوە، كەواتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، دەهێنرێن، وە خوا لە پێغەمبەرانیش دەپرسێتەوە، هەروەها خوا لە گەلو میللەتانیش دەپرسێتەوە.

## ئیشکالێك و وەڵامەكەی

لێرەدا هەندێك لە توێژەرەوان باسی پرسیارێكو ئیشكالێكیان ورووژاندوە، دەپرسن : خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (القصص) لە ئایەتی (٧٨)دا كە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾، واتە: وە تاوانباران دەربارەی گوناهەكانیان لێیان ناپرسرێتەوە، هەروەها لە سووڕەتی (الرحمن) لە ئایەتی (٣٩)دا دەفەرموێ: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ﴾، واتە: ئنجا لەو ڕۆژەدا نە مرۆڤ ، نە جند، دەربارەی گوناهەكانیان لێیان ناپرسرێتەوە، خوا لەو دوو ئایەتە وا دەفەرموێ، كەچی لە شوێنی دیكەدا خوای تاكو پاك دەفەرموێ: ﴿فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾، بێگومان ئەوانەی كە پێغەمبەرانیان بۆلا ڕەوانە كراون، لێیان دەپرسینەوە، وە لە ڕەوانە كراوانیش دەپرسینەوە، ئنجا ئەو دووانە چۆن پێكەوە دەگونجێن ؟ وەڵامەكەی بە دوو شێوە دەدرێتەوە:

یەكەم: ڕۆژی دوایی، قۆناغ قۆناغە، لە قۆناغێكدا خوای پەروەردگار لێیان دەپرسێتەوەو، لە قۆناغێكدا لێیان ناپرسێتەوە، لە قۆناغێكدا كە كاتی كۆكردنەوەیە لەوێ لێیان ناپرسێتەوە ، بەڵام دوایی لە قۆناغێكی دیكەدا كە ڕانواندن (عَرْض)و لێپرسینەوە (حساب) دێتە گۆڕێ ، لەو كاتەدا لێیان دەپرسێتەوە، یانی : لەو شوێنەی كە دەفەرموێ: لێیان ناپرسێتەوە، واتە: لەو قۆناغەدا، كە سیاقی ئەو ئایەتە دەیگەیەنێ، كە تێیدا هاتوە، وە لەو شوێنەدا كە دەفەرموێ: لێیان دەپرسێتەوە، ئەو ئایەتەش لەو سیاقەدا هاتوە كە لێیان دەپرسێتەوە، وە ئایەتەكانیش دەبێ لە سیاقی خۆیان دا لێیان تێبگەین.

دووەم: خوای زانا لێیان ناپرسێتەوە بە لێپرسینەوەی ئەوە كە بزانێ چییان كردوەو چییان نەكردوە ؟ واتە: (لا يُسْئَلُونَ سُؤَالَ اسْتِفْهَامٍ) كە خوای شارەزا بە تەئكید هەموو شتێك دەزانێ، چونكە هەموو شتێك لەلای تۆمار كراوەو، بە دیكۆمێنت كراوە، بۆیە لێیان ناپرسێتەوە كە ئایا كردووتانە ؟ یان نەتانكردوە ؟

بەلاّم لێیان دەپرسێتەوە بە لێپرسینەوەیەك کە دوایی دانی پێدا بێنن، وە لێپرسینەوەی سەرزەنشتو سەرکۆنەکردن، ئەدی ئەوەتان نەکرد ! ئەوەتان نەکرد ! ئایا ئەوەتان بۆچی کرد؟ ئاوا لێیان دەپرسرێتەوە، بەلاّم بە جۆرێك لێیان ناپرسیّ کە چاوەڕێی وەلاّم بیّ، بفەرمویّ: کردتان، یان نەتانکرد ؟ چونکە هەموو شتێك بۆ خوای پەروەردگار ئاشکرایەو نووسراوو تۆمار کراوە، لەوبارەشەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ: ﴿لا تَـزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسالَ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَ فَعَلَ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ، وَفِيمَ أَنْفَقَهُ، وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلاهُ﴾ (أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٤١٧) وَقَالَ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الشيخ الألباني)، واتە: دوو پێی هیچ بەندەیەك لە ڕۆژی قیامەتدا {لەبەردەم دادگای خوای پەروەردگاردا} ناجووڵێن تاکو پرسیاری لیّنەکریّ: دەربارەی تەمەنی کە لە چیدا بەڕێی کردوە ؟ وە لە زانیارییەکەی، چەندەی کار پێکردوە ؟ وە لەو ماڵو سامانەی کە هەیەتی ، چۆنی وەدەست هێناوەو چۆنیشی خەرج کردوە ؟ وە جەستەی لە چیدا پیر کردووە، لە چیدا بەکاری هێناوە ؟

دیارە ئەم فەرموودەیە بە چەند ڕیوایەتێك هاتوە ، لە ڕیواتەکی دیکەدا هاتوە، دەفەرمویّ: ﴿لا تَـزُولُ قَـدَمَا عَبْـدٍ يَـوْمَ القِيَـامَةِ، حَتَّى يُسالَ عَنْ أَرْبَعٍ: عَنْ عُمْرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ؟ وَعَن عِلْمِهِ مَا عَمِلَ بِهِ؟ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ، وَفِيمَ أَنْفَقَهُ؟ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَا أَبْلاهُ؟﴾ {أَخْرَجَهُ البَزَّار برقم: (٢٦٤٠)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٧٤٣٤)}.

لەوەی پێشوودا وشەی (أربع)ی نەهێناوە، بەلاّم هەر چواری باسکردوون.

کەواتە: وشەی بەندە (عبد)یش لێرەدا، هەروەك ئایەتەکە، مەبەست پێی خەڵکە بەگشتی کە دەفەرمویّ: ﴿ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، هەم لەوانە دەپرسینەوە کە بۆ لایان ڕەوانە کراون، وە هەم لە پێغەمبەرانیش کە ڕەوانەکراون، لێرەشدا کە دەفەرمویّ: ﴿لا تَـزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ} یانی : دوو پێی هیچ بەندەیەك ناجووڵێن، چ پێغەمبەر بیّ، چ خەڵکی دیکە بیّ، تاکو لە هەموویان دەپرسینەوە.

**مەسەلەی شەشەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴾، دەگوترێ: (قَصَّ عَلَيْهِ) واته: بەسەرهاتی بۆ گێڕایەوە، ﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ ﴾، بێگومان سوێند بە خوا بە زانیارییەوە هەواڵەكانیان بەسەریاندا دەخوێنینەوە، ﴿وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴾، وە ئێمە بێئاگا نەبووین لەوەی كە دەیانكرد.

كەواته : ﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ ﴾، یانی : (لِنُخْبِرَنَّهُمْ بِعِلْمٍ مُحِيط) بە زانیارییەكی دەوروەدەر كە هیچی لێ پەنهان نابێ، هەواڵیان پێدەدەین.

وە كە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴾، وە ئێمە بێئاگا نەبووین، یانی: لە كاتی كردەوەكانیان دا، لەوێ ئامادەبووین‌و ئاگادار بووین، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سووڕەتی یونس) وایە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأۡنٖ وَمَا تَتۡلُواْ مِنۡهُ مِن قُرۡءَانٖ وَلَا تَعۡمَلُونَ مِنۡ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيۡكُمۡ شُهُودًا إِذۡ تُفِيضُونَ فِيهِۚ وَمَا يَعۡزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثۡقَالِ ذَرَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصۡغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ ٦١ ﴾، واته: تۆ لە هیچ حاڵەتێكدا نابی، وە هیچ ئەندازەیەك لە قورئان ناخوێنی، وە (ئێوە) هیچ كردەوەیەك ناكەن، مەگەر ئێمە بەسەرتانەوە چاودێرین‌و ئاگادارتانین، كاتێك كە دەچنە نێوی‌و دەیكەن، (چ قورئان خوێندن بێ، چ هەر كارێكی دیكە بێ، چ هەر چالاكییەك بێ)، وە هیچ شتێك لە پەروەردگارت ون نابێ، بە گرانایی گەردێك نە لە ئاسماندا نە لە زەویدا، هەروەها لەوە بچووكتر یان گەورەتریش ون نابێ، هەمووی لە نووسنێكی ئاشكرا دایە، یاخود لە لیستێكی ڕوونكەرەوە دایە.

وشەی (مُّبِينٍ ) هەم دەگونجێ بە مانای ڕوونكەرەوە بێ، یانی : بۆ خەڵكی ڕوون دەكاتەوە كە چییان كردوە ؟ وە دەشگونجێ بە مانای ڕۆشن بێ، یانی لە خودی

خۆیدا ڕۆشنەو هەموو کەس دەتوانێ بیخوێنێتەوە، وەك لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾ واتە: وە هەموو ئینسانێك چارەنووسی خۆیمان خستۆتە گەردنی خۆی، وە لە ڕۆژی قیامەت دا ، لیستێکی ، نووسراوێکی بۆ دەردێنین بە کراوەیی دەیبینێ، پێی دەگوترێ: نووسراوەکەی خۆت بخوێنەوە، خۆت بەسە کە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆت دا بکەی.

**مەسەلەی حەوتەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ۚ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ﴾ (وزن) لە زمانی عەرەبیدا، واتە: کێشان (کیل)، واتە: پێوان، بەڵام (وَزْن) لێرەدا دەگونجێ بە مانای کێشان بێ، وە دەشگونجێ بە مانای زانینی ئەندازەی شتەکان بێ، چونکە سەنگێك کە دەکێشرێ، بۆ ئەوەیە کە بزانی ئەندازەی قورساییەکەی چەندە ؟ کەواتە: وشەی (وزن) بۆ زانینی ئەندازەی شت بەکاردێ (الوَزْنُ: مَعْرِفَةُ مِقْدَارُ الشيء) زانینی ئەندازەی شتێك، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ۚ ﴾ لەو ڕۆژەدا زانینی ئەندازەی شتەکان هەقە، واتە: ناڕێکیی و نا دادگەریی تێدا نیە، یاخود کێشانی کردەوەکانیان، یان کێشانی لیستەکان کێشانی مرۆڤەکان ، وەك دوایی باسی دەکەین، هەقەو زوڵمو ستەمو لادانی تێدا نیە.

ئەمە وەك ئایەتی ژمارە (٤٠) سووڕەتی (النساء) وایە، کە ئێمە وەك بنچینەیەك هەمیشە ئەوەمان ڕەچاو کردوە، وە ڕەچاو دەکەین کە قورئان هەندێك هەندێکی ڕوون دەکاتەوە (القُرْآنُ يُفَسِّرُ بَعْضُهُ بَعْضا) کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ

لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾، واتە: بێگومان خوا هێندەی گرانایی گەردێك ستەم ناكات، وە ئەگەر چاكە بێ، پاداشتەكەی چەند قات دەكاتەوە، وە لە لایەن خۆیەوە پاداشتێكی مەزن دەداتەوە (بەوانەی كە كردەوەی باشیان كردوە) .

هەروەها ئەم ئایەتەو وەك ئایەتی ژمارە (٤٧) لە سوورەتی (الأنبياء) وایە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔاۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴾ یانی: لە ڕۆژی دواییدا تەرازووەكانی دادگەریی دادەنێنین، وە هیچ كەسێك، هیچ جۆرە ستەمێكی لێ ناكرێ، ئەگەر بە ئەندازەی دەنكە خەرتەلەیەكیش بێ، ئێمە دەیهێنین، {چ چاكە بێ ، چ خراپە بێ} وە ئێمە بەسین بۆ ژماردنو لێپرسینەوە .

ئنجا كە لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ﴾ هیچكەس هیش جۆرە ستەمێكی لێ ناكرێ، كەواتە: مەبەست لە: ﴿ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ ﴾، چاكەیە، چونكە چاكە ون كردن زوڵمە، بەڵام خراپە ون كردنو، لێنەپرسینەوە لە خراپە زوڵم نیە، بەڵكو فەزڵو بەخششی خوایە، كەواتە: لێرەدا ﴿ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ﴾، یانی : (وَإِنْ كانَ العَمَل الصالح) با ئەو كردەوە باشە، بە ئەندازەی دەنكە خەرتەلەیەكیش بێ، كە شتێكی زۆر وردەو بچووكە، ئێمە دەیهێنین.

﴿ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴾، بەسە ئێمە لێپرسەرەوە بین، یاخود بەسە ئێمە ژمێرەر بینو، هیچ شتێكمان لێ ون نابێ.

## سێ وردە سەرنج

١/ پێشتریش باسمان كرد كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ﴾، وە دەفەرموێ : ﴿وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ﴾، لە هەردووكیان دا وشەی (مَوَازِين) دەگونجێ كۆی (مِيزَان) بێ، واتە: تەرازوو، وە دەشگونجێ كۆی (مَوزُون) بێ، واتە: كێشراو، وە هەر كەسێك تەرازووی چاكەكانی قورس بن، ئەوە سەرفرازە، وە هەر كەسێك تەرازووی چاكەكانی سووك بن، وە بە پێچەوانەوە تەرازووی خراپەكانی قورس بن، ئەوە پەشێمانەو زیانبارە، دەشگونجێ بۆ مانایەكەی بڵێی: هەر كەسێك كێشراوەكانی، واتە: كردەوە چاكە كێشراوەكانی قورس بن، سەرفرازەو، وە هەر كەسێك كردەوە كێشراوە چاكەكانی سووك بن، ئەوە زیانبارە.

٢/ كە دەفەرموێ: ﴿خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم﴾، یانی : (أَضاعُوا أَنْفُسَهُم) واتە: خۆیان لە دەست داوەو خۆیان دۆڕاندوە، كە مەبەست ئەوەیە ئینسان لە ژیانی دنیادا نەتوانێ ڕەزامەندیی خوا بەدەست بێنێ، وە نەتوانێ ئیسپاتی بكات كە بەندەی خوایەو، نەتوانێ لە تاقیكردنەوەی خوا دەربچێ، كە ئەو كاتە لەڕاستییدا لەسەر بوونەكەی قەرزار بۆتەوەو، لەسەر ژیانو تەمەنەكەی قەرزدار بۆتەوە، كەواتە: خۆی لەدەست داوە.

٣/ كە دەفەرموێ: ﴿بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظۡلِمُونَ﴾، پێشتریش باسمان كرد، وشەی ﴿يَظۡلِمُونَ﴾، بۆخۆی تەعەددا دەكات ، دەگوترێ: (يظلمون آياتنا) زوڵم لە ئایەتەكانمان دەكەن، بەڵام لێرەدا بە (ب) تەعەددای پێكراوە بۆ لای (مفعول)، تاكو (يَظۡلِمُونَ ) مانای (يُكَذِّبُون)ش بگرێتە خۆی، زانایان گوتوویانە : ضُمِّن (يَظۡلِمُونَ ) مَعْنَى يُكَذِّبُون، وَلِهَذَا عُدِّي بـ "الباء" أي بسَبَبِ كَوْنِهِم مُكَذِّبِينَ بآيَاتِنَا ظُلْماً ، خَسِرُوا أَنْفُسَهُم) بەهۆی ئەوەوە كە ئایەتەكانی ئێمەیان لە ڕووی ستەمەوە بە درۆ دانـاو بڕوایان پێنەكردن، تووشی زیانباریی بوون.

# کورتە باسێک لە بارەی کێشرانی کردەوانەوە

دەربارەی کێشانی کردەوەی مرۆڤەکان، کە ئایا مەبەست لەو کێشانە چییە ؟ وە چەند جۆرە کێشان هەن ؟ لەوبارەوە زانایان ڕا جیاییان هەیە، ئێمەش لێرەدا تیشکێکی دەخەینە سەر :

١ - ڕایەك هەیە کە هی: (مُجَاهِد وأَعْمَش وضَحَّاك)ە، وەك (فخر الدين الرازي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناویەتی، وە ڕای موعتەزیلەشە، دەڵێن: (المِيزَانُ : العَدْلُ) مەبەست لە تەرازوو یانی: دادگەریی، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ ﴾، تەرازووەکانی دادگەریی دادەنێین، واتە: ئێمە دادگەرانە سزاو پاداشتی بەندەکان دەدەین و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکەین، وەك لە سووڕەتی (الشورى) لە ئایەتی (١٧)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ ﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە کتێب (واتە: قورئان)ی بە هەق ناردۆتە خوار، وە تەرازووشی ناردۆتە خوار، واتە: دادگەریی ناردۆتە خوار.

٢ - بەلام زۆربەی زانایان دەڵێن: (المِيزَانُ لَهُ لِسان وَكَفَتَانِ وَيَمِيلُ بالأَعْمَال) واتە: تەرازوو زمانی هەیە، وە دوو تا تەرازووی هەن، وە جاری وایە بەهۆی گرانیی کردەوەکانەوە بەولادا دەچێ و، جاری وایە بەملادا دەچێ.

(إبن حجر العسقلاني) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، وەك ئاماژە بە ڕای یەکەم کە بێگومان ئەویش لە هەندێك لە زانایانی پێشینەوە هێناویەتی، دەڵێ: (وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ السَّلَفِ إِلى أَنَّ المِيزَانَ بِمَعْنَى العَدْلِ وَالقَضَاء) واتە : هەندێك لە زانایانی پێشین ڕایان وایە کە مەبەست لە میزان دادگەرییە، وە لێپرسینەوەی

دادگەرانەیـە[١].

کەواتە: ئەگەر کەسێك بڵـێ: مەبەست لە تـەرازوو (میـزان)، ئـەو تـەرازووە نیـە، کە ئێستا ئێمە شـتی پـێ دەکێشـین، وە ئەسڵەن ئـامێرێك و، ئـامرازێك لـە قیامەتـدا نیـە، کـە کردەوەکـانی پـێ هەڵسـەنگێنرێن، یاخـود نامـەی کردەوەکـانی پـێ هەڵسەنگـێنرێن، وە مەبـەسـت لـە کێشـران (وزن) دادگـەریی و چەسپانی دادگەرییـە، ئەوە ڕایـەکەی پێشـینەی هەیـە لە نێو ڕایەکانی زانایانی پێشـیندا.

بـەڵام دیـارە ڕای زۆربـەی زانایـانە وایە کە نەخێـر، تـەرازوو هەیـە، بـەڵام ئـایا ئەو تـەرازووە چۆنـە ؟

مـن دەڵێم: مـەرج نیـە ئـەو تـەرازووە، وەك تـەرازووی دنیـا بـێ، دووتـا تـەرازووی وەك هەنـدێك لـە زانایـان گوتوویـانە : دوو تـا (كفـة)ی هەبـێ و زمانێـكی هەبـێ، واتە: شـتێكی هەبـێ دەسـتی پـێ بگیـرێ، ئنجـا سـەنگێك لـە تـای تەرازوویـەکیان دا بێ و لەوەی دیکەدا شـتی تـێ بهاوێژرێ، مەرج نیە وا بێ، بـەڵـکو ئێسـتا هـەر مرۆڤـ چەندان جۆرە تەرازووی داناون، بۆ وێنـە: تـەرازووی گـەرمیی پێـو هەیـە، گـەرمیی و ساردیی دەپێـوێ، وە تـەرازووی بـا هەیـە، بـا چـەندە هەڵدەکـاو هێـزی چـەندە ؟ وە تەرازووی باران هەیـە، چـەند دەبـارێ ؟ تـەرازووی کـەش و هـەوا هەیـە، وە تـەرازووی بوومەلەرزە هەیە، کە پێی دەڵێن : پێـوەری (ڕێختەر)، چەندان جـۆرە تـەرازوو هـەن، کەواتە: مەرج نیە تەرازوو تەنیا یەك جـۆری هەبـێ، بـەڵـکو خـوا بـۆ خـۆی دەزانـێ ئـەو تـەرازووە چـۆنە ؟ وە منـیش ڕام لەگـەڵ ڕای زۆربـەی زانایـان دایـە، کـە خـوای دادگــەر تـەرازوو دادەنـێ، وەك لـە سـوورەتی (الأنبیـاء) دا دەفـەرموێ: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ... ﴿٤٧﴾ ﴾، ئنجا ئەگـەر بێتـو بڵێین: مەبـەسـت لـە (میـزان) دادگەرییـە، مانایەکـەی (مـوازین) ئـاوای لـێ دێ : وە دادگەرییـەکانی دادگـەریی دادەنێیـن !!، بـەڵام ئەگـەر بڵێیـن: مەبەسـت لـە (موازین) تەرازووەکـان، ئـەو کـاتە مانایەکـەی ڕێـك دەردەچـێ، یـانی: تەرازووەکـانی دادگـەریی ئـەو

---

١) تفسیر القرآن الحكیم ، محمد رشید رضا ج ٨، ص : (١٩١، ١٩٢).

تەرازووانەی کە دادگەرییان پێ دەچەسپێ، دایان دەنێین، بەڵام ئایا ئەو تەرازووانە چۆنن ؟ خوا بۆخۆی دەزانێ، وە حاڵو باڵی قیامەت لە ڕاستییدا جگە لەوەی کە خوای پەروەردگار ئاماژەیەکی پێداوە، یان پێغەمبەر ﷺ ئاماژەیەکی پێ داوە، ئێمە هیچی دیکەی لێ نازانین، وە ناشگونجێ قسەی یەکلاییکەرەوەو ڕوون بکەین دەربارەی شتێك کە بۆ ئێمە نادیارو پەنهانە، هەر بۆیەش بڕواهێنان بە نادیار (غیب) بنەڕەتو بناغەی عەقیدەو ئیمانە لە ئیسلامدا: خوا ﷻ نادیار (غیب)ەو، فریشتەکان غەیبنو، جند غەیبەو ، قیامەت غەیبەو، چۆنیەتی کێشانی کردەوەکان ئەوانە هەموویان نادیارن بۆ ئێمە، بۆیە نابێ جگە لەو ئاماژانەی کە خوای پەنهانزان لەوبارەوە کردوونی ، یان پێغەمبەر ﷺ کردوونی ، لەوە زیاتر قسەی لێ بکەین.

ئنجا با ئەم سێ فەرموودەیەش بێنینەوە دەربارەی کێشرانی کردەوەکانو تەرازوو، کە ئەوە دەگەیەنن تەرازوو هەیە لە قیامەتدا :

یەك: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَا مِنْ شَيْءٍ يُوضَعُ فِي الْمِيزَانِ أَثْقَلُ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٧٥٥٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٠٣) وَاللَّفْظُ لَهُ، قَالَ الشيخ الألباني: صحيح} واتە: لە ڕۆژی دواییدا ، هیچ شتێك لە تەرازوو ناهاوێشترێ قورستربێ لە ڕەوشتی جوان.

دوو: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمنِ: سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ، سبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧١٦٧)، وَابْنُ أَبي شَيْبَة برقم: (٣٥٠٢٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٠٤٣) وَبِهَذَا الحَدِيث خَتم البُخَارِيّ صحيحه، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٩٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٤٦٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٠٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٣١)} واتە: دوو وشە کە لەسەر زمان سووکن، وە لە تەرازووش دا قورسن، لەلای خوای خاوەن بە بەزەیی خۆشەویستن ، ئەوانیش: (سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ، سبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ) ئەو دوو ڕستەیە: پاکیی بۆ خوای مەزن، وە پاکییو ستایش بۆ خوا.

سێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ سَيُخَلِّصُ رَجُلاً مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُءُوسِ الْخَلائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُنْشَرُ عَلَيْهِ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ سِجِلّاً، كُلُّ سَجِلٍّ مَدَّ الْبَصَرِ، ثُمَّ يَقُولُ اللهُ: أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا ؟ أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ؟

فَيَقُولُ: لا، يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: أَفَلَكَ عُذْرٌ أَوْ حَسَنَةٌ؟ فَبُهِتَ الرَّجُلُ، قَالَ: لا، يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: بَلَى، إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً، وَإِنَّهُ لا ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ، فَيُخْرِجُ لَهُ بِطَاقَةً فِيهَا : أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فَيَقُولُ: احْضُرْ وَزْنَكَ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلاَّتِ؟ فَقَالَ: إِنَّكَ لا تُظْلَمُ، قَالَ: فَتُوضَعُ السِّجِلاتُ فِي كِفَّةٍ، وَالْبِطَاقَةُ فِي كِفَّةٍ، فَطَاشَتِ السِّجِلاتُ، وَثَقُلَتِ الْبِطَاقَةُ، قَالَ: فَلا يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللَّهِ شَيْءٌ﴾ {أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٣٠٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٩٣٧) وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٣٩)، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتە: خوا لە ڕۆژی قیامەت دا پیاوێك لەنێو خەڵكی دێنێتە دەرێ ، نەوەدو نۆ تۆماری بۆ بڵاودەكرێتەوە، هەر كامێكیان هەتا چاو بڕ دەكات ئەوەندە درێژە (یانی: ئەوەندە خراپەی كردوە)، دوایی خوا دەفەرموێ: ئایا هیچ نكوڵیی لەوانە دەكەی (لەو خراپانە كە كردوونت)، وە دەفەرموێ: ئایا فریشتە پارێزەرەكانم كە نووسیویانە هیچ زوڵمیان لێ كردووی ؟ دەڵێ: نەخێر، ئەی پەروەردگار، خوا دەفەرموێ: هیچ پاساوت هەیە، دەڵێ : نەخێر ئەی پەروەردگار، (گوناهم كردو تەواو)، خوا دەفەرموێ : با ، چاكەیەكت لەلای ئێمە هەیە، وە ئەمڕۆ تۆ ستەمت لێ ناكرێ، خوا ﷻ بیطاقەیەك، دێنێتە دەرێ (كە لیستی كردەوە چاكەكانن) كە لەسەری نووسراوە : (أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) شایەدیی دەدەم كە جگە خوا هیچ پەرستراو نین، وە شایەدیی دەدەم كە موحەممەد بەندەو ڕەوانەكراوی خوایە، خوا بەو بەندەیە دەفەرموێ: وەرە ئامادەی كێشانی كردەوەكانت بە، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئنجا ئەو وەرەقەیە كە ئەو (أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)ی تێدا نووسراوە ، لەگەڵ ئەو هەموو تۆمارانەدا چی پێدەكرێ ؟ خوای دادگەر دەفەرموێ : ئەمڕۆ تۆ ستەمت لێ ناكرێ ، ئنجا تۆماری كردەوە خراپەكان لە تای تەرازوویەك دا دادەنرێن ، وە ئەو وەرەقەیەش كە شایەتمانەكەی تێدا نووسراوە، لە تای تەرازووەكەی دیكەدا دادەنرێ ، وە تا تەرازووی تۆماری كردەوە خراپەكان بەرز دەبێتەو هەڵدەچێ، وە ئەوەی شایەتمانی تێدایە قورس دەبێ ، چونكە لەگەڵ ناوی خوادا هیچ شتێك هاوتاو هاوكێش نیە ، (مادام ئەهلی ئیمانو تەوحیدە ، دەربازی دەبێ).

هەڵبەتە لێرەدا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم فەرموودەیە هەرچەندە لە ڕووی سەنەدیشەوە ڕاستە، بەلاَم لە ڕووی مەتنەکەیەوە ئیشکالێکی تێدایە، ئەویش ئەوەیە:

مانای وایە ئەگەر هەر کەسێك شایەتمانیی هێنا، وە ناوی خوای بەسەر زاردا هات، هەرچەندە گوناح بکات، هیچ زیانی نیە، کە ئەمەش هەمان قسەی مورجیئەیە، کە مورجیئە کردەوە لە ئیمان دوا دەخەن، واتە دەڵێن: ئینسان مادام بە ئیماندار لە قەڵەم بدرێ، هەرچەند کردەوەی خراپ بکات، هیچ زیانی پێ ناگەیەنێ، ئنجا ئایا ئەم ئیشاکالە وەلاَمەکەی چییە ؟

زانایان دوو وەلاَمیان داوەنەوە، هەردووکیشیان بەجێن :

وەلاَمی یەکەم / دەڵێن: ئەو کابرایە کە هێندە خراپەی هەن، کافر بووە، بەلاَم پێش ئەوەی بمرێ ئیمانی هێناوە، یانی : فریای کردەوەی باش نەکەوتوەو مردوە، واتە: نەك لە گیانەلاَو لە سەرەمەرگ دا ئیمانی هێنابێ، بەڵکو کە ئیمانی هێناوە، بە تەمای ژیان بووە، بەلاَم بەلاَیەکی بۆ هاتوەو مردوە، وەك لە فەرموودەیەکدا هاتوە ، کە بوخاریی‌و موسلیم هێناویانە: کەسێك سەد قەتڵ دەکاو دوایی تەوبە دەکات ، وە لە نیوەی ڕێیە دەمرێ ، بەلاَم بۆ ئەو شوێنەی کە بۆ دەچێ طاعەت بکات، لێی نیزیکتر دەبێ‌و ، فریشتەکان دەیبەنە بەهەشت.

یانی: کابرایە کافر بووەو پێش مردنی ئیمانی هێناوەو، فریای کردەوەی باش نەکەوتوە، بۆیە ئەو ئیمان‌و تەوحیدە بۆتە هۆی دەربازبوونی.

وەلاَمی دووەم : مەبەست لە دەربازبوون لێرەدا، یانی : دەربازی دەکات کە بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا بمێنێتەوە، هەر کەسێك ئەسڵی ئیمانی هەبێ، واتە: موتڵەقی ئیمانی هەبێ، ئەوە لەدۆزەخدا بەهەمیشەیی نامێنێتەوەو دەربازی دەبێ.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم قسەیەك لە (مُحَمَّد رَشِید رَضا)وە بهێنم، لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] قسەیەکی جوان دەکات ، دەربارەی کێشرانی کردەوەکان،

---

١) تفسير القرآن الحكيم، ج ٨ ، ص ٢٩٩.

دەڵێ: (وَالأَصْلُ الَّذِي عَلَيْهِ سَلَفُ الأُمَّةِ فِي الإِيْمَانِ بعَالَمِ الغَيْبِ، أَنَّ كُلَّ مَا ثَبَتَ مِنْ أَخْبَارِهِ فِي الكِتَابِ وَالسُّنَّةِ فَهُوَ حَقٌ لا رَيْبَ فِيهِ، نُؤْمِنُ بِهِ، وَلا نُحَكِّمُ رَأْيَنَا فِي صِفَتِهِ وَكَيْفِيَتِهِ فَنُؤْمِنُ إِذَنْ بِأَنَّ فِي الآخِرَةِ وَزْناً للأَعْمَالِ قَطْعَاً ، وَنُرَجِّحُ أَنَّهُ بِمِيزَانٍ يليقُ بِذَلِكَ العَالَمِ يُوْزَنُ بِهِ الإِيْمَانُ وَالأَخْلاَقُ وَالأَعْمَالُ)، واتە: ئەو بناغەیەی کە پێشینی ئوممەتی (پێغەمبەر ﷺ) لە ڕووی ئیمان بە نادیارەوە دایانناوە، ئەوەیە: کە ئێمە هەر شتێك لە قورئانو سوننەتدا هەواڵی پێدرابێ، بە هەقی دەزانین، وە گومانمان لەبارەیەوە نیە، وە بڕوای پێ دێنین، وە لەبارەی سیفەتو لەبارەی چۆنیەتییەکەیەوە پەنا نابەینە بەر عەقڵی خۆمان، "بزانین داخۆ لە عەقڵمانەوە دەچێ، یان تێوەی ناچێ ؟ " کەواتە: ئیمان دێنین بەوەی کە لە دوارۆژدا کێشانی کردەوەکان هەیە، وە پێمان وایە کە ئەو کێشانە بە تەرازوویەکە کە لەگەڵ ئەو جیهانەدا، دەگونجێ، ئیدی هەم ئیمانی پێ هەڵدەسەنگێنرێ، هەم خووڕەوشتی پێ هەڵدەسەنگێنرێ، وە هەم کردەوەکان پێ هەڵدەسەنگێنرێن.

ئنجا لەوبارەوە کە ئایا چ شتێك هەڵدەسەنگێنرێو دەکێشرێ ؟ دیسان زانایان ڕاجیاییان هەیە، بەڵام ئەوەی کە لە دەقەکاندا دەرکەوێ، ئەوەیە هەم مرۆڤەکان دەکێشرێن، هەم نامەو لیستی کردەوەکانیش دەکێشرێن، هەم کردەوەکانیش دەکێشرێن، ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە ؟

١) بەڵگەمان ئەوەیە کە خوا ﷻ لە سوورەتی (الكهف) لە ئایەتی (١٠٥)دا دەفەرموێ:

﴿ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴾، واتە: ڕۆژی قیامەت دا هیچ کێشیان بۆ دانانێین، هیچ کێشو قورساییان نابێ، کە قسە دەربارەی بێبڕوایان دەکات.

٢) هەروەها لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ هەیە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لاَ يَزِنُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ ، وَقَالَ: اقْرَءُوا: ﴿ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴾﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٤٥٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٧٨٥)}، واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوی قەڵەوو زل دەهێنرێ، بەڵام لە تەرازووی خوادا بە قەد باڵە مێشوولەیەك کێشی نیە،

دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم ئایەتە بخوێننەوە کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴾، لە ڕۆژی قیامەت دا هیچ کێشیان بۆ دانانێین.

٣) هەروەها لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هاتوە : کە ڕۆژێك عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، بەسەر دارێك دەکەوێ، بۆ ئەوەی سیواکی ئەراك بۆ پێغەمبەری خوا بێنێ، دیارە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود پیاوێکی بێ داروبارو لاواز بووە، لاقی زۆر باریك بوون، هاوەڵانیش خوا لێیان ڕازی بێ ، تەماشای لاقیان کردوەو پێکەنیون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ﴿مَا تَضْحَكُونَ ؟! والّذي نفسي بيده ، لَرِجْلُ عَبْدِ اللّهِ أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ أُحُدٍ﴾ {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبي شَيْبَة برقم: (٣٢٢٣٢)، وَأَحْمَد برقم: (٩٢٠) ، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٥٣٩)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (٨٥١٦)، وقال الهيثمي: ورجالهم رجال الصحيح}، واتە: بۆچی پێدەکەنن ؟! سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە، لاقی عەبدوڵڵا لە تەرازوودا لە قیامەت دا ، لە کێوی ئوحود قورسترن.

کەواتە: ئینسانەکان دەکێشرێن.

ئنجا نامەو لیستی کردەوەکانیش دەکێشرێن، بە بەڵگەی ئەو فەرمایشتەی کە هێنامان لە : (الترمذي والحاكم وابن ماجة) وە، کە گوتمان ئەو کارتەی: {أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ}ی تێدا نووسراوە، دەخرێتە تای تەرازوویەکەوەو، کردەوە خراپەکانیش دەخرێنە تای تەرازوویەکەوەو ، تا تەرازووی کە شایەتمانی تێدایە ، قورسترە، کەواتە: نامەو لیستی کردەوەکانیش دەکێشرێن .

هەروەها خودی کردەوەکانیش دەکێشرێن، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ :

﴿ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾ کە یەکێك لە مانایەکانی (موازین) ئەوەیە کە کۆی (مَوْزُون)ە، واتە: کێشراو، کەواتە: کردەوەکانیش هەڵدەسەنگێرێن و دەکێشرێن .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان شازدە (١٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی (١٠ تاکو ٢٥)، وە ئەم شازدە ئایەتە باسی بەسەرهاتی ئادەمو حەووا (علیهما السلام) وە ئیبلیس ، نەفرینی خوای لێ بێ ، وە کڕنووش بردنی فریشتەکان ، وەك ڕێز لێگرتن بۆ ئادەم ، وە کڕنووش نەبردنی ئیبلیسو ، ئیعلانی ئیبلیس بۆ دژایەتیکردنی ئادەمو وەچەکەی ، وە پاشان نیشتەجێ کرانی ئادەمو حەووا لە بەهەشتدا ، وە فریودرانیان لە لایەن شەیتانەوەو ، سەرەنجام دەرکرانیان لە بەهەشتو دابەزێنرانیان لەگەڵ ئیبلیس دا بۆ سەر زەوی، دەکەن .

﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّـٰكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَـٰيِشَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ
﴿١٠﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَـٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَـٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟
إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴿١١﴾ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ۖ قَالَ أَنَا۠
خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن
تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّـٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ
مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَـَٔاتِيَنَّهُم
مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَـٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَـٰكِرِينَ
﴿١٧﴾ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ
﴿١٨﴾ وَيَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ
فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ لِيُبْدِىَ لَهُمَا مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن
سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ
ٱلْخَـٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ ۚ فَلَمَّا ذَاقَا
ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَنَادَىٰهُمَا
رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾
قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ
ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَـٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾
قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە بێگومـان "ئـەی مرۆڤینـە !" ئێمـە ئێوەمـان دەسـترۆیشـتوو کـردوە لـە زەویـداو هۆکـارەکـانی ژیـانو گوزەرانمـان بۆ دابین کردوون، بـە کەمیی سوپاسگوزاریی "بۆ خـوا" دەکـەن ﴿١٠﴾ وە بــە دڵنیاییــەوە ئێمــە دروســتمان کــردن، "واتــە: بابتــان ئــادەم" پاشـان وێنەدارمان کردن، ئنجـا بــە فریشــتانمان فـەرمووو: کڕنـووش "ی رێـز گـرتن" بـۆ ئــادەم ببـەن، ئیدی یەکسـەر کڕنووشـیان بـرد، جگە لـە ئیبلیس لـە کڕنـووش بـردووان نـەبوو، ﴿١١﴾ "خــوا" فـەرمووی: چ شــتێك رێـی لێگرتـیو وای لێکـردی، لـە کـاتێکدا فـەرمانمان پێکردی کڕنووش نەبـەی ؟ ﴿١١﴾ گوتی: من لەو باشتـرم، منت لە ئـاگر دروست کـردوەو، ئەوت لە قـوڕێ دروست کردوە ﴿١٢﴾ "خوا" فەرمووی: لێی دابـەزە خـوار، "لێـی داپـەڕە خوار، لە بـەهەشـت، یان لە ئـاسمان" چونکە بـۆت نیـە لەوێـدا خـۆت بـە زلـبگری، بـڕۆ دەرێ، بێگومـان تـۆ لـە زەبوونـانی ﴿١٣﴾ "ئیبلـیس" گـوتی: هـەتا ئـەو ڕۆژەی زینـدوو دەکرێنـەوە بمهێڵەوە ﴿١٤﴾ "خـوا" فـەرمووی: تـۆ لـە هێڵراوانـی ﴿١٥﴾ "ئیبلیس" گـوتی: بـەهـۆی ئەوەوە کە گومڕاو بـێ مرادت کردم، لەسـەر ڕاستە رێـی تـۆ بۆیـان "بـۆ ئــادەمو وەچەکەی" دادەنیشـم، "لێیـان دەچـمە بۆسـەوە" ﴿١٦﴾ ئنجـا لـە پـێش دەسـتیانەوەو لـە دوایانـەوەو لـە لای ڕاسـتیانەوەو لـە لای چـەپیانەوە بۆیـان دەچـم، تـاکو لایـان بـدەم، وە کـارێکیان پێدەکەم زۆربـەیانت بـە سوپاسـگوزار چـنگ نەکـەوێ ﴿١٧﴾ "خـوا" فـەرمووی: بــە ڕیســوایـیو دەرکراویـی لێــی بچــۆ دەرێ، وە بــە مسـۆگەریی : هـەر کەسـێك لـەوان شــوێنت بکــەوێ ، دۆزەختــان لــێ پـڕ دەکــەم ﴿١٨﴾ "خـوا فـەرمووی:" وە ئـەی ئـادەم! خۆتو هاوسـەرت لە بـەهەشـتدا نیشـتەجێ ببن، لـە هـەر کوێیـەکتان دەوێ بخـۆن، بـەڵام توخنی ئەم درەختە مەکەون، ئەگەرنا لە سـتەمکـاران دەبن ﴿١٩﴾ شـەیتانیش تاکو ئەوەی لـە عـەورەتیان بۆیـان پـەنهان کـراوە، بۆیـان دەربخـات، خـوتخـوتەی بـۆ کـردنو گـوتی: پەروەردگـارتان تەنیا بۆیە خـواردنی ئـەم درەختـەی لــێ قەدەغـە کـردوون، تـاکو نەبنـە

دوو فریشتە، یان لە هەر ماوانو هەمیشـە ژیـاوان نەبـن، ﴿٢٠﴾ وە سـوێندی بـۆ خـواردن کە بێگومان من بۆ ئێوە لە دڵسۆزانم ﴿٢١﴾ ئیدی سـەرەنجام بـە فریودان شۆڕی کردنـەوە (نێـو چاڵی گونـاح)، ئنجا یەکسـەر کـە لەبـەری درەختەکەیان چێشـت : عـەورەتیانیان بۆیـان ئـاشـکرا بـوو، وە دەسـتیان کـرد بـە بەخـۆوە لکـاندنی گـەڵای (درەختەکانـی) بـەهەشـت "بـۆ داپۆشـینی عەورەتیـان" وە پەروەردگاریشـیان بـانگی کـردن: ئـەدی ڕێگرییم لـێ نەکردن لەو درەختەو، پێتانم نەفەرموو : کە بێگومـان شـەیتان دوژمنێکی ئـاشکراتانە ؟ ﴿٢٢﴾ گوتیـان: پەروەردگـارمان ! ستەممان لە خۆمـان کرد، وە ئەگەر لێمـان نەبووریو بـەزەییت پێمانـدا نەیـەت، بـە مسۆگەریی لـە زیانبـاران دەبـین ﴿٢٣﴾ "خـوا" فـەرمووی: شـۆڕبنەوە بـۆ سـەر زەوی ، هەندێکـتان دوژمنـی هەندێکـتانن "ئێـوەو ئیبلیس" وە لەسـەر زەوی نشـینگەو گوزەرانێکـی کـاتییتـان دەبـێ تـاکو ماوەیـەك ﴿٢٤﴾ خـوا فـەرمووی: لەوێـدا (لەسـەر زەوی) دەژیـنو لەوێـدا دەمـرنو ، هـەر لەوێشـدا دەردەهێنرێنـەوە "پاش مردنو زیندووکرانـەوە" ﴿٢٥﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(مَكَّنَّٰكُمْ ): (مَكَّنْتُهُ وَمَكَّنْتُ لَهُ فَتَمَكَّنَ، مَكِين : ذِي قَدْرٍ وَمَنْزِلَةٍ) وشەی: (مَكَّنْتُهُ وَمَكَّنْتُ لَهُ فَتَمَكَّنَ) واتە: نیشتەجێم كرد، یاخود بالا دەستم كرد، (مَكِين) واتە: خاوەن ڕێزو خاوەن پێگەی باش، (وَمَكَّنَهُ اللهُ وَأَمْكَنَهُ) هەردووكی بە مانای ئەوەیە كە خوای پەروەردگار توانای پێدا (وَاستَمْكَنَ رَجُلُ مِنَ الشَيء وَتَمَكَّنَ مِنْهُ) هەردووكی بە مانای ئەوە دێ كە توانای بەسەردا شكا.

(مَعَٰيِشَ): (العَيْشُ: الحَيَاةُ الـمُخْتَصَّةُ بالحَيْوَانِ، لأَنَّ الحَيَاة، تُقَالُ فِي الحَيْوَانِ ، وَفِي البَارِي تَعَالَى ، وَفِي الـمَلَكِ، وَيُشتَقُّ مِنْهُ المَعِيشَة لِمَا يُتَعَيَّشُ مِنْهُ)، (مَعَايش): كۆی (مَعِيشَة)یە، (عیش) بە ژیانێك دەگوترێ كە تایبەتە بە ژیاندارانەوە، چونكە (حَيَاة) ژیان، هەم بۆ ژیانداران بەكاردێ، هەم بۆ خوای بەدیهێنەری بەكاردێ، هەم بۆ فریشتە بەكاردێ، وە وشەی (مَعِيشَة) لە (عَيْش)ەوە هاتوە، (مَعِيشَة) هەر شتێك كە ئینسان پێی بژیێ.

(مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ ): بە ڕواڵەت ئیشكالی تێدایە، بەڵام ماناكەی ئەوایە: (مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ ، وَحَمَلَكَ عَلَى أَلاَّ تَسْجُدَ): چ شتێك ڕێگرت بوو كە كڕنووش ببەی، وە چ شتێك وای لێكردی كە كڕنووش نەبەی، جا وشەی (مَنَعَكَ) مانای: وای لێكردی (حَمَلَكَ)ی تێدا شێردراوەتەوە، (وَضُمِّنَ مَنَعَكَ مَعْنَى : حَمَلَكَ ، كَي تُخْتَصَرَ جُمْلَتَانِ فِي جُمْلَة) بۆ ئەوەی دوو ڕستەدا لە ڕستەیەك كورت ببنەوە.

(فَٱهْبِطْ ): (الـهُبُوطُ: الإنْحِدَارُ عَلَى سَبيلِ القَهْرِ كَهُبُوطِ الحَجَرِ ، وَالهَبُوطُ الـمُنْحَدَرُ، يَكُونُ مِنْهُ اللازِمُ والـمُتَعَدِّي، هَبَطْتُ وَهَبَطتُ غَيْرِي)، واتە (هُبُوط) بریتیە لە شۆڕبوونەوەیەكی بە ناچاریی، وەك بەردێك كە خلۆر دەبێتەوە لە بەرزییەوە، (هَبُوطْ)یش لێژی (مُنْحَدر)ە، شوێنێكە كە شتی پێ دا خلۆر

بێتـەوە، وە (هُبُوط وَهَبَطَ) هەم (لازم)یشی هەیە، هـەم (مُتَعَدِّي)شـی هەیـە، (لازم) ئەوەیـە کـە پێویسـتیی بــە (مَفْعُول) نەکـات، وەك: (هَبَطْتُ) واتـە: شـۆڕبوومەوە، (مُتَعَدّي)یـش ئەوەیـە کـە پێویسـتیی بــە (مَفْعُول) بکـات، وەك: (هَبَطْتُ مُحَمَّدَاً) واتە: موحەممەدم شـۆڕکـردەوە.

(ٱلصَّٰغِرِينَ ): دەگوتــرێ: (صَغُر)، واتـە: بچووك بـوو، (وصَغِر) یانــی: نـزم بـوو، دیارە وشـەی (کـبیر) بـە مانـای گـەورەیە، وە وشـەی (صغیر)یـش بـە مانـای گچکـەیە، ئنجـا وشـەی (صغار) بـە مانـای زەلیلـیی‌و زەبـوونیی بەکـاردێ، وە (صـاغر) بـە کەسێك دەگوترێ کە پلەیەکی نزمـی هەبـێ‌و پێـی ڕازی بـێ، بـە حاڵـەتێکی نزمیـی قەناعـەت بکات.

(أَنظِرۡنِيٓ ): واتــە: چاوەڕێــم بکــە، (النَّظـر: الإنتظـار، نظرتـه وانتظـرته وأَنظرتُـهُ وأَخَّرتُـهُ)، وشـەی (نظر) بـە مانای چاوەڕوانیی دێ، وە دەگـوترێ: (نظرتـه وانتظرته وأَنظـرتُهُ) هەرسـێکیـان بـە مانــای : (أَخَّرتُهُ) دوام خستو چاوەڕێـم کـرد، دێ.

(أَغۡوَيۡتَنِي ): خاوەنـی (مختار الصحاح)دا دەڵـێ: (الغَيُّ: جَـهْلٌ من اعتقاد فاسد) واتــە: (غـي) بریتیـە لـە نـەزانینێك کـە لـە ئەنجـامی تێگەیشـتنێك‌و بـڕوا پـێ بوونێکـی هەڵـەوە پەیدا بووبێ، هەروەها دەڵـێ: (الغيُّ: الضَّلاَلُ وَالخَيْبة) (ضَّلاَل) بریتیـە لـە گومڕایـیی‌و پەشـیمانیی، هەروەهـا (غَـوَى يَغْـوِي غيـاً وغَوايَـة فهـو غـاوٍ وغَـوٍ وأغـواه غيره فهـو غـويٌّ)(غَـوَى يَغْـوِي غيـاً وغَوايَـة) واتـە: گـومڕا بـوو، گومڕابوونێـك لـە ڕووی نەزانینـەوە سـەرەنجـامەکەشی پەشـیمانییە، وە دەگـوترێ: (أَغْوَاهُ غَيْرهُ) واتـە: غەیـری خـۆی گومڕا کـرد، سـەرگەردانی کـرد.

(مَذۡءُومٗا ): (أَي مَذْمُومَاً) واتە: زەم کراو، سـەرزەنشـت کـراو، (يُقَـالُ: ذِمْـتُهُ أَذِيمُـهُ ذَيْمَـاً وذَمَمتـهُ أذمُّـهُ ذَمـاً، وذأَمتُـهُ ذَأَمـاً..) هـەمووی بــە مانایەکـە، کەواتـە (مَذءوم) لەگـەڵ (مَذْمُـوم) واتــە: زەم کــراو سـەرزەنشـــت کـراو، لــۆمە کـراو، ســەرکۆنە کـراو، وە زەبوون کــراو.

(مَّدْحُورًاۗ ): (الـدَّحْرُ: الطَّـرْدُ وَالإِبْعَـادُ، مَـدْحُورًا : مَطْـرُودًا، مَبْعَـدًا) (مَـدْحُور) واتــە: دەرکراو، چونکە وشــەی (دَحْر) واتـە: دەرکـردنو دوورخسـتنەوە، کەواتـە: (مَدْحُور) بـە مانای (مَطْرُود) واتە: دوورخراوەو دەرکراوە.

(مَا وُۥرِيَ ): دەگـوترێ: (وَارَيْتُ كَـذَا، إِذَا سـتَرْتَهُ) ئەگـەر شـتێکت پـەنهان کـرد، دەڵێـی (وَارَيْتُـهُ). (تَـوَارَى يَعْـنَي: اسـتتـرَ) واتـە: خـۆی پەنهـان کـرد، (وَرَّى بغَيْـرِهِ: إِذَا سـترَ خَبَـرًا وأظْهَـرَ غَيْـرَهُ)، (وَرَّى بغَيْـرِهِ) واتـە: تەورييـەی کـرد، يـانی: ويسـتی هـەواڵێك بشـارێتەوە بـەرانبـەرەکەی وا تێگـەيانـد کـە مەبەسـتی شـتێکی ديکەيـە، کەعبـی کـوڕی ماليـك خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: ﴿أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ كَـانَ إِذَا أَرَادَ غَـزْوَةً وَرَّى بِغَيْرِهَـا﴾ {مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ: رواه البُخَـارِيُّ بـرقم: (٢٩٤٧)، وَمُسْـلِمٌ بـرقم: (٢٧٦٩ )}، واتە: کاتێك پێغـەمبـەری خـوا ﷺ دەيويسـت بچـێ بـۆ جـەنگێك، ئەگـەر بـەرەو لای ڕاسـت چووبـايە خەڵـکەکەی وا حـاڵی دەکـرد بـەرەو لای چـەپ دەچـێ، ئـەوە پێـی دەگـوترێ (تَوَرِيـة)، کـە دەفـەرموێ: (مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن سَوۡءَٰتِهِمَا ) واتـە: ئـەوەی کە لـێيان پەنهـان کرابوو لە عـەورەتيان، لـە عـەيبو عاريان کـە پێيـان نـاخۆش بـوو دەربکـەوێ.

(سَوۡءَٰتِهِمَا ): (السَّوْءَةُ: الخَلَّةُ القَبِيحَةُ، وَالفَاحِشَةُ، وَكُلُّ أَمْرٍ شَائِنٍ، وَالسَّوءَة: العَوْرَةُ لأَن انْكِشَـافَهَا يَسُوءُ الإِنْسـانَ) واتــە: (سوءَة) بــە کـردەوەی خـراپ دەگـوترێو، بــە ڕەوشــتی خـراپ دەگوتــرێ، وە بــە کــردەوەی ناقــولا دەگوتــرێ، بــە هــەر شــتێك دەگوتـرێ کە ناشـيـرين بـێ، وشــەی (سوْءَة) بــە مانـای (عَوْرَة) هـاتوە، ئـەويش ئـەو شـوێنەيە لە ئينسان ، ئەگـەر دەربکـەوێ، پێی ناخـۆش بـێ.

( وَقَاسَمَهُمَآ ): واتە: سـوێندی بـۆ خـواردن، (أَقْسَـمَ: حَلَـفَ، وَأَصلُهُ مِنَ القَسَـامَةِ وَهِـيَ أَيْمَانٌ تُقسّم عَلَى أَوْلِيَاء المَقْتُولِ) ئەسڵی وشـەی (قَسَم) لە (قَسـامَة)دوە هـاتوە، کـە بريتيە لەوەی کە کەسـێك کـوژراوە، نـازانرێ کـێ کوشـتوويەتی، بـەڵام لـە شـوێنێکی نيزيـك لـە گەڕەکـێك، يـان شـارێکە، يـان دێيەکــە نـازانرێ کێيــە، ئەوانـەی کـە

دەعواکارن پەنجا (٥٠) سوێندیان دەدرێتێ، دەبێ ئەوەندە سوێندە بخۆن، بۆ ئەوەی کە خوێنی ئەو کەسە لەسەر ئەو لایەنە حەلاڵ بکەن، ئەوە پێی دەگوترێ: (قَسامَة) وشەی (قَسَم) لەوەوە هاتوە.

(فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ): واتە شۆڕی کردنەوە بە فریودان، دەگوترێ: (دَلا الدَّلوَ) واتە: دۆلچەی دەرهێنا، دۆلچە ئەوەی کە ئاوی پێ هەڵدەهێنجن لە بیر، یان دۆلکە، یاخود سەتڵ، (دلاَ) یانی: (نَزَعَهَا) دەریهێنا، بەلام (أدلاهَا: أَرْسَلَهَا فِي البِئْرِ) یانی: شۆڕی کردەوە بە بیرەکەدا، (وَدَلاَّهُ بغَرُور ، أَوْقَعَهُ فِيمَا أَرَادَ مِنْ تَغْرِيرِهِ ، وَهُوَ مِنْ إِدلاءِ الدلو) واتە: بەهۆی ئەو فریودانەوە کە دەیویست، فریوی دانو شۆڕی کردنەوە، وەك بڵێی کە شەیتان ئینسان هەڵدەفریوێنێ، وەك ئەمە وایە ئینسانی خستبێتە بیرێکەوە، یاخود چاڵێکەوە.

(وَطَفِقَا) : (طَفِقَ يَفْعَلُ كَذَا كقولك: أَخذَ يَفْعَلُ كَذَا، ويُستعْمَلُ فِي الإِيجَابِ دُونَ النَّفِي)، دەگوترێ: (طَفِقَ يَفْعَلُ كَذَا) واتە: (أَخذَ يَفْعَلُ كَذَا) یانی: دەستی پێکرد، کە زیاتر لە حاڵەتی ئەرێنیی دا بەکاردێ، نەك لە حاڵەتی نەرێنیی دا.

(يَخۡصِفَانِ): (خَصِفَ النَّعْلَ : خَرزَهَا "وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِ" أي يُلزِقَانِ بَعْضَهُ بِبَعْض لِيَسترَ بِهِ عَوْرَتَهُمَا) واتە: دەستیان کرد بەوە کە گەڵای درەختیان بە خۆیانەوە دەچەسپاند، واتە: گەڵاکانیان پێکەوە دەچەسپاند، تاکو بەدەنی خۆیانیان پێ بشارنەوە، یان عەورەتی خۆیانیان پێ بشارنەوە.

(وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِ): (وَرَق الشَّجَر: جَمْعُهُ أَوْرَاق، الوَاحِدَة: وَرَقَة، وأَوْرَقَ فُلاَنٌ ، إذا أَخْفَقَ وَلَمْ يَنَلِ الحَاجَةِ، كَأَنَّهُ صارَ ذَا وَرَق بلاَ ثَمَر)، واتە: (وَرَق) کۆیەکەی (أوراق)ە، تاکەکەی (ورقة)یە، (وَرَق) ناوی جینسە، وە دەگوترێ: (أَوْرَقَ فُلاَنٌ) ئەگەر لە ئیشێکدا سەرکەوتوو نەبوو، وەك ئەوە وایە کە تەنیا گەڵای بۆ مابێتەوەو، هیچ بەروبوومێکی دەست نەکەوتبێ.

(مُسْتَقَرٌّ ): (قَـرَّ فِـي الـمَكـانِ يَقِـرُّ قَـرَارَاً: إِذَا ثَبَتَ ثُبُـوتَاً جَامِـدَاً)، (مُسـتقَرّ)، واتــه : ئـەو شـوێنەی کـە خەڵـکی لـێ نیشتەجـێ دەبـێ، دەگـوترێ: (قَـرَّ فِـي الـمَكـانِ يَقِـرُّ قَرَارًا) واتە: لەو شوێنە نیشتەجێ بوو، بـە شـێوەیەك کە نەجووڵـێ.

( وَمَتَـٰعٌ ): (الْمَتَـاعُ: انْتِفَـاعُ مُمْتَـدُّ الوَقْـتِ، الـمَتَاعُ: الـمَنْفَعَةُ وَمَـا تَمَتَّعَـتْ بـهِ)، (مَتـاع) بريتيـە لە ڕابواردنێـك، ياخـود سـوود وەرگرتنێـك کـە کـاتێکی پـێ بچـێ، وە (متـاع) هەر شـتێکە کە سـوودی لـێ ببینـی.

(إِلَىٰ حِينٍ ): (حيْنَ) بـە مانـای کـات دێ، (الوَقْتُ وَالْمُـدَّةُ) (والحِيْنُ: وَقْتُ بُلُوغُ الشـيءِ وَحصُـولُهُ، وَهُـوَ مُـبْهَمُ الـمَعْنَى وَيَتَخَصَّصُ بالمُضـافُ إِلَيْـهِ)، (حِـيْن) بـــە کــاتی گەيشــتنو پەيـدابوونی شـتێك دەگـوترێ کـە لـە ئەسـڵـدا ماناکەی ڕوون نيـە، بــەڵام بـەهــۆی ئــەوەوە کــە شـــتێکی پـاڵ دەدرێتـــە لا ، ماناکـــەی ڕۆشــن دەبێتــەوە، وەك (حِيْنَـئِـذٍ) واتـە: لەو کـاتــەدا.

# مانـای گشـتی ئایەتەکـــان

لەم شازدە (١٦) ئـایەتەدا خـوای بـەرزو مـەزن باسـی بەسـەرهاتی یەکـەمین مرۆڤ : ئـادەم ، وە پاشان هاوسـەری : حـەووا (علیهـا السـلام)، وە ئـەوەی کـە لـە نێوانیانـدا گوزەرا لەگەڵ ئیبلیس دەکات ، کە چۆن خـوتخـوتەی بۆ کردن، وە دوایی چۆن فریویـدان، وە پێی لەو درەختە قەدەغە کراوە خـواردن، کە لێیـان قەدەغە کرابوو، خـوای زانـا لـە بەهەشـتدا تاکـە درەختێکـی لـێ قەدەغـەکردنو ئـەوانی دیکـەی هـەمووی بـۆ ڕەوا کردبوون، وە لە ئەنجامی لێخواردنی ئەو درەختە قەدەغەیـەدا، عـەورەتی خۆیانیـان بـۆ دەرکەوت، وە بە گەڵای درەختەکانی بەهەشـت خۆیان داپۆشی، وە پاشان خـوا ﷻ لۆمەو سـەرزەنشـتی کـردنو، ئـەوانیش دانیـان بـە هەڵـەی خۆیـان داهێنـاو، گـەڕانەوە بـۆ لای خـوای پەروەردگـار، وە خـوا ﷻ لێیـان خـۆش بـوون بـەڵام هـەم ئـادەمو حـەووا، هـەم ئیبلیسیشی، واتە: باب و دایکی مرۆڤ، کە ئـادەمو حەووان، وە ئیبلیس وەك بـابی جنـد، دایبـەزاندن بۆ سـەر زەوی، کە سـەرەنجام لەسـەر زەوی ژیان بگوزەرێنن.

ئنجا شایانی باسە ئەو ئـایەتـە موبارەکانە، کە وەك گوتم ئـایەتەکانـی ژمـارە (١٠ تـا ٢٥)ن، واتە: شازدە (١٦) ئـایەت، بۆ ئەو بـەسـەرهاتە، کـە بـەسـەرهاتی ئـادەمو حەووایـە لەگـەڵ ئیبلیسـدا تـەرخان کـراون، وە بەسـەرهاتی گۆڕین سـەرجەم لـە حـەوت شـوێنی قورئـاندا هـاتوە، وە سـەرجەم (٧٩) ئـایەتی لـە قورئـاندا بـۆ تـەرخانکراون ، بـەپێی سـەرەنجدانی من:

شوێنی یەکـەم: لە سوورەتی (البقـرة)دا، ئـایەتەکـانی : (٣٠ تا ٣٩) واتـە: دە (١٠) ئـایەت بۆ ئەو بـەسـەرهاتە تەرخان کراون.

شـوێنی دووەم: لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا، کـە ئـەم سـوورەتەیە، کـە ئێسـتا خـەریکی تەفسیـرکردنینی، ئایەتەکانـی : (١٠ تا ٢٥)، واتـە: شـازدە (١٦) ئـایەتی بـۆ تـەرخان کـراون.

شـوێنی سـێیـەم: لـە سـوورِەتی (الحجـر)ە، ئـایەتەکانی (٢٦ تـا ٤٤)، واتـە: نـۆزدە (١٩) ئـایەتی بۆ تەرخان کراون .

شوێنی چوارەم: لە سوورِەتی (الإسراء) دایەو، ئـایەتەکانی : (٦١ تا ٦٥)، واتە: پێنج (٥) ئـایەتـی بۆ تەرخـان کـراون .

شـوێنی پێنـجـەم: لـە سـوورِەتی (الکهـف) دایــە، ئـایەتی ژمـارە : (٥٠) واتــە: یـەك (١) ئـایەتی بۆ تەرخان کــراوە .

شوێنی شەشـەم: لـە سـوورِەتی (طـه) دایــە، ئـایەتەکانــی : (١١٥ تـا ١٢٧)، واتـە: سێزدە (١٣) ئـایەتی بۆ تەرخـان کراون.

شوێنی حەوتەم: لە سوورِەتی (ص) دایــە، ئـایەتەکانــی : (٧١ تـا ٨٥)، واتـە: پـازدە (١٥) ئـایەتی بۆ تەرخــان کراون.

کەواتە: سـەرجەم حەفتاو نۆ (٧٩) ئـایەت لە ئـایەتە بـە پێزەکـانی قورِئـانی بـەرِێز، بـۆ بـەسـەرهاتی ئـادەمو هاوسـەرەکەی (حـەووا) (علیهمـا السلام) لەگـەڵ ئیبلیسـدا تـەرخان کـراون، ئنجـا بێگومـان تەرخـانکردنی حـەفتاو (٧٩) ئـایەت لـە قورِئـاندا، لـە حـەوت (٧) سـوورِەتداو، دووبارەکردنـەوەی بەسـەرهاتێك لـە حـەوت (٧) سـوورِەتدا، وە تەرخانــکردنی پانتاییـەکی (٧٩) ئـایەتیی بـۆ بـەسـەرهاتێکی وا، دیـارە ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ کـە ئـەو بـەسـەرهاتە شـتێکی گـەورەو گرنگـە، وە بـەرِاسـتیش وایـە، چونکە بەسـەرهاتی یەکەمیـن دوو مرۆڤـ : دایـكو بابـی مرۆڤـە، لەگـەڵ دوژمـنی بابـە کوشـتەیان ئیبلیسدا، ئنجا ئێمە لەبـەرئەوەی کە بـە درێـژیو بـە وردیـی لـە مەسـەلە گرنگەکاندا لە ژێر ناوونیشـانی {پوختەیـەك لـە بـارەی بـەسـەرهاتـی ئـادەمو حـەوواو ئیبلیسـەوە} دەخەینـە رِوو، ئێسـتا لـە مانـای گشـتی ئـەم ئـایەتانەدا، زۆر بـە خێرایـی تەفسیـریان دەکـەین، زۆر بـە پوختیی مانـای گشتی ئـایەتەکـان دەخەینەرِوو.

دوای ئەوەی خـوا ﷻ لە نـۆ (٩) ئـایەتی یەکەمـدا، وەك پێشـتـر باسمـان کـردوە، وەك پێشـەکی سـوورِەتی (الأَعْرَاف)، باسـی ئـەوەی کـرد کـە قورِئـان بـۆ پێغـەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ دابـەزێنراوە، تـاکو مرۆڤـایەتیی پـێ وریـا بکـاتەوە، وە ئـامۆژگـاریی ئیمانداران پێ بکات، وە پاشـان فەرمانی پێکردن کە تەنیا بەدوای کتێبی خـوا بکەونو، بـەدوای سـەرپەرشـتیارانی دیکـە نەکـەون، وە پاشـان سـەرنجی رِاکێشـان بـۆ مێـژووی

مرۆڤایەتیی، کە خوا چەندان کۆمەڵگاو، چەندان شارو ئاوەدانییو لەبەین بردوون، لە ئەنجامی لادانیانو یاخی بوونیان دا ، لە فەرمانی خواو لە ڕێبازی پێغەمبەرانی خوا (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، وە دوایی باسی ئەوەی کرد کە لە ڕۆژی دوایی دا لێیان دەپێچێتەوە، وە دوایی لە هەموو لایەك دەپرسێتەوە، دوای ئەوە دەفەرمویٚ:

﴿ وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَۗ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴾،

کە بێگومان لێرەدا دیارە ڕووی دواندن لە هەمووی مرۆڤایەتییە، خوا دەفەرمویٚ: بێگومان ئێوەمان لە زەویدا دەستڕۆیشتوو کردوە، ﴿ مَكَّنَّٰكُمۡ ﴾ (مَكَّنَهُ أَي سَلَّطَهُ) ئێوەمان دەست ڕۆیشتوو کردوە، ئێوەمان توانادار کردوە لە زەویدا، هەموو ئەو هۆکارانەمان بۆ ڕەخساندوون کە بتوانن لە زەوی دا بالأدەست بن، وە بتوانن تەصەڕڕوفی تێدا بکەن، ﴿ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَ ﴾، وە هۆکارەکانی ژیانو گوزەرانمان بۆ ئێوە لە زەوی دا داناون : ئەوە ئاو، ئەوە هەوا، ئەوە تیشکی خۆر، پاشان با، ئنجا جۆرەکانی دانەوێلە، پاشان درەختو سەوزەو گیا، ئنجا ئەو هەموو کانزایانە کە لە زەویدا هەن، وەك: نەوتو گازو خەڵووزی بەرد، هەموو ئەو وزەو توانایانەی کە خوای زاناو شارەزا لە زەویدا هەڵیگرتوونو، هەموویان دەبنە هۆی ئەوە کە ئینسان بتوانێ ژیان لەسەر زەوی بگوزەرێنێ، ﴿ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴾، بەڵام کەمێك نەبێ سوپاسگوزارو شوکرانە بژێریی ناکەن.

ئنجا دێتە سەر باسی دروستکردنی ئادەم، دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَٰكُمۡ ثُمَّ صَوَّرۡنَٰكُمۡ ثُمَّ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾، واتە : بێگومان ئێمە ئێوەمان دروست کرد ، کە مەبەست پێی ئادەمە، ﴿ ثُمَّ صَوَّرۡنَٰكُمۡ ﴾، دوایی وێنەمان کێشان، هەڵبەتە خوای وێنەکێش هەرخۆی هەموومانی دروست کردووەو، وێنەی هەمووشمان هەر خوا کێشاویەتی، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُصَوِّرُكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ كَيۡفَ يَشَآءُ ﴾آل عمران، واتە:

خوا ئەو کەسەیە کە لە نێو منداڵدانەکاندا وێنەتان دەکێشێ، چۆنی بوێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئادەمە، بۆیە خوای بەدیهێنەر بە کۆ هێناویەتی، چونکە ئادەم بابی هەموو مرۆڤایەتییە، بەڵگەمان لەسەر ئەو مەسەلەیە ئەوەیە کە دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ﴾، کەواتە: لێرەدا مەبەست لە دروستکردنو وێنەکێشان (خَلق وتصوير)دروست کردنو وێنە کێشانی ئادەمە، چونکە خوای کاربەجێ فەرمانی بە فریشتەکان کرد، کە کڕنووش بۆ ئادەم بەرنو، فەرمان نەکراوە بە فریشتەکان کە کڕنووشی ڕێزلێگرتنو سڵاوکردن بۆ غەیری ئادەم ببەن، وە خوای پەنهانزان لە قورئاندا باسی کەسێکی دیکەی بۆ نەکردووین، جگە لە ئادەم، کە فەرمانی بە فریشتەکان کردبێ ، کڕنووشی ڕێزلێگرتنی بۆ بەرن، دەفەرموێ : ﴿فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ﴾، یەکسەر هەموویان کڕنووشیان برد، واتە: کڕنووشی ڕێزلێگرتنو سڵاوکردن، جگە لە ئیبلیس، ﴿لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾، ئەو لە کڕنووش بردووان نەبوو، ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ﴾، (خوا) فەرمووی : چ شتێك ڕێی لێگرتی، کە کڕنووش نەبەی، کاتێك کە فەرمانم پێ کردی ؟ بزانین ئیبلیس چی وەڵام دەداتەوە ؟ ﴿قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾، گوتی : من لەو باشترم ، منت لە ئاگر دروست کردووەو ئەویشت لە قوڕ وەدیهێناوە ، واتە : ئیبلیس خۆی بە ڕەچەڵەكو نەسەبو توخمو ڕەگەزیەوە هەڵکێشا ، نەك بە کردەوە ، کە بێگومان ڕەچەڵەكو ڕەگەزی هیچ کەس ئازایەتیی خۆی نیە ، ئەگەر چاك بێ ، ئەگەر خراپ بێ ، بەڵکو ئەوەی کە دەبێ ئینسان شانازیی پێوە بکات ، ئەوەیە کە ئازایەتیی ئینسانی تێدایە ، کە کردەوەکانینی ئەگەر چاك بن ، وە بە پێچەوانەشەوە ، ئەگەر خراپ بن .

﴿قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ﴾، (خوا) فەرمووی : لێی بچۆ خوارێ ، شۆڕ بەوە ، لێی دابەزە خوارێ ، هەندێك دەڵێن : مەبەست پێی ئاسمانە ، هەندێکیش دەڵێن : مەبەست پێی بەهەشتە ، هەڵبەتە

بەهەشتیش لە سەریێیە، لێی دابەزە، بۆت نیە لەوێ دا خۆت بە زلبگری، بێگومان تۆ لە زەبوونانی، (صاغِرِين) کۆی (صاغِر)ە، واتە: زەبوونو سەرشۆڕ، وەك چۆن (صغير) بە بچووك دەگوترێ، (صاغر)یش بە کەسێك دەگوترێ، کە ئەگەر بە قەبارەش بچووك نەبێ، بەڵام لە ڕووی پێگەو مەقامەوە بچووكو زەبوون بێ، ﴿ قَالَ أَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴾، (ئیبلیس) گوتی : چاوەڕێم بکە، تاکو ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێنەوە، واتە: تاکو ڕۆژی قیامەت، خوا فەرمووی: ﴿ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴾، (خوا) فەرمووی: بێگومان تۆ لە هێڵراوانو چاوەڕوانکراوانی، خوا نەیفەرموو داخۆتا ڕۆژی قیامەت چاوەڕێ دەکرێ، یان نا ؟، چونکە ئیبلیس وای داوا کرد، ﴿ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴾، تاکو ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێنەوە، بەڵام خوا فەرمووی: بێگومان تۆ لە چاوەڕوانکراوانی، تۆ لە هێڵراوانیو دەتهێڵینەوە، بەڵام تاکو کەی ؟ تاکو ئەو کاتەی کە خوا دەزانێ، دیارە هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە ئیبلیس تاکو ئەو ڕۆژەی کە دنیا تێیدا کۆتایی دێ، دەمێنێو خوا دەیهێڵێتەوە، واتە تاکو (ساعة) نەك تاکو (قیامة)، کە دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر: کە (ساعة) ئەو ڕۆژەیە دنیا تێیدا کۆتایی دێ، (قیامة) ئەو ڕۆژەیە کە خەڵکی تێدا زیندوو دەکرێتەوە، ﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾، (ئیبلیس) گوتی: بەهۆی ئەوەوە کە منت بێمراد کرد، منت بەدبەخت کرد، چونکە﴿ أَغۡوَيۡتَنِي ﴾ (غواية)، بریتیە لە سەرگەردان بوونێك کە بەدبەختیی تێدا بێ، وە (ضلال) بریتیە لە گومڕایی، بەڵام (غواية) بریتیە لەو سەرەنجامەی کە لە گومڕایی پەیدا دەبێ، هەروەك (هداية) بریتیە لە ڕێنمایی، (رُشد)یش بریتیە لە سەرڕاستییو بەو بەمراد گەیشتنەی کە لە هیدایەتەوە ئینسان بۆی دەستەبەر دەبێ، بۆیە خوا ﷻ لە سووڕەتی (النجم)دا، هەم (ضلال)و هەم (غواية)ی لە پێغەمبەری خوا ﷺ لابردوون ﴿ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ۝٢ ﴾، هاوەڵەکەتان (پێغەمبەری خاتەم ﷺ) نە گومڕا بووە، وە نە بێمرادیش بووە.

ئنجا ئیبلیس گوتی: بەهۆی ئەوەوە کە تۆ منت بەو دەردە برد ، ئاوا سەرگەردان‌و گومڕاو بەدبەختت کردم ، ﴿ لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾، لەسەر ڕاستە شەقامی تۆ بۆیان دادەنیشم ، واتە : بۆ ئەو مرۆڤانەی کە لە ئادەم پەیدا دەبن، بۆ ئادەم‌و حەوواو وەچەکەیان ، لەسەر ڕێگاکەیان بۆیان دادەنیشم، واتە: بۆیان دەچمە بۆسەوە ، ﴿ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴾، پاشان لە پێش دەستیانەوەو، لە دوایانەوەو ، لە لای ڕاستیانەوەو لەلای چەپیانەوە بۆیان دەچم، واتە: لە هەر چوار لاوە، ﴿ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴾، وە زۆربەیانت شوکرانە بژێرو سوپاسگوزار دەستناکەوێ، واتە: زۆربەیان وا لێدەکەم کە ناسوپاس‌و سپڵە بن بەرانبەر تۆ، ﴿ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ﴾، (خوا) فەرمووی: لێی بڕۆ دەرێ، واتە: لە ئاسمان، یان لە بەهەشت، بچۆ دەرێ ، بە سەرزەنشتکراویی‌و بە دەرکراویی، ﴿ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، بێگومان هەر کەسێك لەوان شوێنی تۆ بکەوێ، دۆزەختان لێ پڕدەکەم، واتە: خۆت‌و ئەوانەی شوێنت دەکەون لە وەچەی ئادەم، هەروەها لە وەچەی خۆیشی، یانی: لە وەچەی ئیبلیس، یانی هەموو ئەوانەی شوێنی ئیبلیس دەکەون، شوێنیان دۆزەخەو خوای دادگەر دۆزەخیان لێ پڕ دەکات .

ئنجا خوا ﷻ ڕوو لە ئادەم دەکات‌و، دەفەرموێ: ﴿ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ وە ، ئەی ئادەم ! خۆت‌و هاوسەرەکەت لە بەهەشتدا نیشتەجێ بن، وشەی (الجنة) بە مانای باخ‌و بێستانە، دیارە بەهەشت مەرج نیە هەر دارو درەختی تێدابێ، ئەو بەهەشتە

وەك خـوای پەروەردگـار باسـی کـردوە، کۆشـكو تـەلارو هـەموو ئـەو کەلوپـەلو پێداویستییانەی کە ژیان پێویستی پێیـانە، تێیدان، خـوا دەفەرموێ: لـە بـەهەشـت دا نیشـتەجێ بـن، خـۆتو هاوسـەرەکەت، وە لـە هـەر شـوێنێکیش حـەزتان لـێیـە، بخـۆنو لەزەتـی لـێ وەربگـرن، ﴿وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ ﴾، بـەڵام توخنـی ئـەم درەختـە مەکـەون، دیارە درەختێکی دیاریکراو بـووە، خـوا دەفـەرموێ : تووشـی مـەبنو، نـزیکی مەکـەون، ﴿ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ئەگـەر نـا لـە ستەمکـار دەبـن، کـە دەفـەرموێ : نزیکـی مەکـەون، واتە : لـێی مەخۆن، ئەدی بۆچی دەفەرموێ : توخنی مەکەون ؟ واتـە : نـەك هـەر لـێـی مەخـۆن، هـەر نزیکیشـی مەکەونـەوە، چـونکە لـە ئەنجـامی نیزیـك کەوتنەوەی ئینسان دا لە قەدەغەو حەرام ، شـەیتان زەفەری پێدەباو دەخلیسکێت.

﴿ فَوَسۡوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ لِيُبۡدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن سَوۡءَٰتِهِمَا ﴾، شەیتان خـوتخـوتەی بۆ کردن، دنەی دان، تاکو ئەوەی کە لـێیان پەنهانـە لـە عەورەتیـان ، بۆیـان دەربخـات، واتـە: ئـامانجی شـەیتـان لـەو دنـە دانـەی دا ، کـە دنـەی ئـادەمو حـەووای داو خـوتخـوتەی بۆ کـردن، ئـەوە بوو کـە لەو درەختە بخـۆن، بۆ ئەوەی عـەورەتی خۆیانیـان بـۆ دەربکـەوێ، ﴿وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنۡ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيۡنِ أَوۡ تَكُونَا مِنَ ٱلۡخَٰلِدِينَ ﴾ وە پێـی گوتـن: پەروەردگـارتان تـەنیا بۆیـە ئـەو درەختـەی لـێ قەدەغـەکردوون، تـاکو نەبنـە دوو فریشـتە، یاخـود لـە هەمیشـە ژیـاوان نـەبن، ﴿ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾، وە سوێندی بـۆ خـواردن کـە بـۆ ئێـوە لە دڵسـۆزانم، بـە تەنـگ ئێـوەوەم، وە پەرۆشـی ئێـوەمـە، چونکە (نصح) بریتیـە لـەوەی کـە چـی بـۆ بـەرانبـەرەکەت چـاکە، ئـەوەت بـۆی بـوێ[١]، ﴿فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٖ ﴾، شـۆڕی

---

١) الـنُّصـح : تحـرِّي فعـلٍ أو قـولٍ فيـه صـلاح صـاحبه : مفـردات ألفـاظ القـرآن ، راغب الأصفهاني، ص ٨٠٨ .

کردنەوە بە فریودانەوە، واتە: بەهۆی فریودانیەوە شۆڕی کردنەوە، وەك چۆن دۆلکەیەك شۆڕ دەکرێتەوە بە بیردا، تاکو ئاوی پێ هەڵبێنجرێ، ئەویش ئەوانی شۆڕ کردەوە، واتە: بە بیری گوناهدا، بە چاڵی گوناهدا شۆڕی کردنەوە، ﴿ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا ﴾، کاتێك لە درەختەکەیان خوارد، (واتە: درەختە قەدەغە کراوەکە)، عەورەتی خۆیانیان بۆ دەرکەوت، ﴿ وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِ ﴾، وە دەستیان پێکرد گەڵای (درەختەکانی) بەهەشتیان بەخۆیانەوە دەنووساند، تاکو عەورەتی خۆیانی پێ بپۆشن، ﴿ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ ﴾، وە پەروەردگاریان بانگی کردن : ئایا من قەدەغەم نەکردبوون لەو درەختە ، نەمفەرموو بوو: توخنی ئەو درەختە نەکەون ؟ ﴿ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴾، وە ئایا پێم نەگوتبوون : کە بێگومان شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە ؟ دیارە خوا ﷻ لێرەدا ئەوەی باس نەکردوە ، بەڵام لە شوێنێکی دیکەدا فەرموویەتی، کە ئەی ئادەم ! بە دڵنیایی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە ، لێی وریابن.

ئنجا ئایا ئادەمو حەووا (علیهما السلام) چییان گوت ؟ ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا ﴾ گوتیان: پەروەردگامان ! ستەممان لە خۆمان کرد، (دانیان بە هەڵەی خۆیان دا هێنا) ﴿ وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾، وە ئەگەر لێمان نەبووری و بەزەییت پێمان دا نەیەتەوە، بێگومان لە زیان باران دەبین، ﴿ قَالَ ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ ﴾، دیارە لێرەدا باسی نەکردوە، بەڵام لە سوورەتی

(البقرة)دا باسی کردوە کە دەفەرموێ: ﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٣٧ ﴾، ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگاری وەرگرتن، واتە: خوا چەند وشەیەکی فێرکردن، کە دووعایان پێ بکاتو پێیان بپاڕێتەوە، وە خوای پەروەردگاریش لێیان خۆش بوو، لێرەدا خوا باسی ئەوە ناکات، بەڵکو یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴾، فەرمووی: دابەزن بچنە خوار، {واتە: لە بەهەشت، یان لە ئاسمان، چونکە: ئادەمو حەووا (عليهما السلام) لە بەهەشت دا بوون}، هەندێکتان بۆ هەندێکتان دوژمنن، واتە: لەگەڵ ئیبلیسدا، ئەگەرنا، ئەگەر مەبەست ئادەمو حەووا بوونایە، دەیفەرموو: (اهبطا) وەك لە هەندێك شوێن دا دەفەرموێ: (اهبطا) کە مەبەست پێی ئادەمو ئیبلیسە، بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: (اهبطوا)، واتە: ئادەم تۆو حەووای خێزانت لەگەڵ ئیبلیس دا، {کە دەبن بە سێ، دەبن بە کۆ} هەمووتان دابەزن، بۆ کوێ ؟ دیارە بۆ سەر زەوی، وەك لە شوێنی دیکەدا هاتوەو هەر لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴾، وە بۆ ئێوە لە زەویدا نیشتنگەیەكو ڕابواردنێك هەیە ، تاکو کاتێکی دیاریکراو، واتە: لەوێ نیشتەجێ دەبن ، ﴿ قَالَ فِيهَا تَحۡيَوۡنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنۡهَا تُخۡرَجُونَ ﴾، (خوا) فەرمووی : لە زەویدا دەژینو ، هەر لەوێشدا دەمرن ، وە هەر لەوێش دەردەهێنرێن ، یانی : لە ڕۆژی دوایی دا کە جەستەکانتان زیندوو دەکرێنەوەو، ڕووحەکانیان بەبەردا دەکرێنەوە .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :**

## پوختەیەك لەبارەی بەسەرهاتی ئادەم و حەووا (علیهما السلام)و ئیبلیسەوە

ئێمە لە ژێر ئەم سەر باسەدا، خوا پشتیوان بێ لە بیستو چوار (٢٤) خاڵدا هەوڵدەدەین لەبەر ڕۆشنایی ئەو (٧٩) ئایەتەی کە لەو حەوت سووڕەتەدا هاتوون لە قورئاندا، کە پێشتر باسمان کردن، باسی بەسەرهاتی ئادەمو حەووا (علیهما السلام) لەلایەکەوە، وە ئیبلیس لەلای دیکەوە بکەین، تاکو لە هەر شوێنێکی دیکەی قورئاندا، ئەو بەسەرهاتەمان هاتە پێش، بۆ تەفسیرو ڕوونکردنەوەکەی بگەڕێینەوە ئێرە.

سەرەتا دەڵێین: ڕایەك هەیە دەڵێ: هەم بەسەرهاتی ئادەمو حەووا، وە هەم هەندێك لە بەسەرهاتەکانی دیکەش، شتێکی ڕەمزیو هێماییین، هەندێك لە زانایان قسەیەکی وایان کردوە، کە لە زانایانی هاوچەرخنو، ڕەنگە هی پێشتریش بووبن کە گوتوویانە: ئەوەی کە خوا لە قورئان دا باسیکردوە دەربارەی یەکەمین مرۆڤ کە ئادەمە، لەگەڵ ئیبلیس ، کە ئایا چییان لەبەیندا گوزەراوە ؟ شتێکی هێماییەو مەرج نیە شتێکی وا لە دنیی واقیع دا بووبێ ! ئێمەش دەڵێین: ئەمە قسەیەکی بێ بنەمایەو، بێگومان هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو، ناگونجێ خوای پەروەردگار بەو هەموو وردەکارییەوە لە حەوت سووڕەتانداو لە دوو توێی (٧٩) ئایەتدا باسی ئەو بەسەرهاتە بکات، کەچی بڵێین شتێکی ڕەمزیو هێماییە،

بەڵکو ئەوە بەسەرهاتێکە ڕوویداوە، بەلام جگە لەو وردەکارییانەی کە خوای پەنهانزان بۆ ئێمەی باس کردوون، ئێمە شتێکی دیکەی لێ نازانین، وە هەندێ شتیشی تێدایە لەوانەیە ئێمە وەك پێویست تێی نەگەین، وەك دوایی باسی دەکەین، بەلام گرنگ ئەوەیە کە خوای زاناو توانا ئەوەندەی ئێمە پێویستییمان پێیەتی پەندو عیبرەتی لێ وەربگرین، هەم مەسەلەی ئادەمو حەوواو ئیبلیس، وە هەم هەر شتێکی دیکە کە بۆمان باس دەکات، خوا ﷻ کە ئەوەندەمان بۆ باس دەکات کە ئێمە پێویستییمان پێیەتی، وە بۆ ئێمە جێگای پەندو عیبرەتە، ئەگەرنا هەندێ ڕاستیی هەن دەربارەی دوارۆژو، جیهانی غەیبو ، بەهەشتو دۆزەخو قیامەت، کە مەرج نیە عەقڵی ئێمە بتوانێت هەمووی ئیستیعاب بکات، بۆیە خوای بەرز هەندێك شت بە کورتیی، یان بە شێوەی ئاماژە بە ئێمە دەفەرموێ، بایی ئەوەندەی پەندو عیبرەتو دەرسی لێ وەربگرین.

ئێستاش ئێمە لە بیستو چوار (٢٤) خاڵ دا پلە پلە باسی ئەو بەسەرهاتەی ئادەمو حەوواو ئیبلیس دەکەین، لەبەر ڕۆشنایی ئەو (٧٩) ئایەتەی ئەو حەوت سوورەتە کە پێشتریش ئاماژەمان پێدانو ، لێرەش ئاماژەیان پێدەدەینەوە کە ئەمانەن :

١ / سوورەتی (البقرة) ئایەتەکانی (٣٠ – ٣٩). (٩) ئایەت.

٢ / سوورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی (١٠ – ٢٥). (١٦) ئایەت.

٣ / سوورەتی (الحجر) ئایەتەکانی (٢٦ – ٤٤). (١٩) ئایەت.

٤ / سوورەتی (الإسراء) ئایەتەکانی (٦١ – ٦٥). (٥) ئایەت.

٥ / سوورەتی (الكهف) ئایەتی (٥٠). (١) ئایەت.

٦ / سوورەتی (طـه) ئایەتەکانی (١١٥ – ١٢٧). (١٣) ئایەت.

٧/ سوورەتی (ص) ئایەتەکانی (٧١ – ٨٥). (١٥) ئایەت.

**یەکەم : دروستکرانی جند لە ئاگر کە ئیبلیس لەوانە، پێش دروستکرانی ئادەمو حەووا ( علیهما السلام ) بووە:**

بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەی ڕوونو ڕاشکاوی خوایە کە لە سووڕەتی (الحجر)دا دەفەرمویَ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: وە بێگومان ئێمە مرۆڤمان لە قوڕێکی گۆڕاوی وشك بووەوە، دروست کردوە "قوڕێك کە وشك بۆتەوەو، ئەگەر دەستی لێبدریَ ، زرینگەو دەنگی لێ بێ، وەك سواڵەت، یان گۆزە، وە پێشتریش جندمان لە بڵێسەی ئاگرێکی گەرم دروست کرد.

هەموو ئاگرێك گەرمە، بەلاّم ئەو ئاگرە، ئاگرێکی زۆر زۆر گەرم بووەو دیارە ئاگریش لە شێوەی گەرمبوونی دا پلە پلەیی هەیە، وەك چۆن لە ساردیی دا سارد هەیە، ساردتریش هەیە، گەرمو گەرمتریش هەیە.

ئنجا کە دەفەرمویَ: ﴿ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ ﴾، کەواتە: جند کە ئیبلیس لە جندە، لە پێش ئادەم دا دروست کراوە.

هەروەها بەڵگەیەکی دیکە لەوبارەوە ئەو ئایەتەی سووڕەتی (الکهف)ە، کە خوا دەفەرمویَ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴾، واتە: وە کاتێك بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم بەرن، هەموو کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس کە لە جند بوو...

کەواتە: ئیبلیس لە جندەو جندیش خوا دەفەرمویَ: ﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ

﴿ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾ واتە: لە پێش ئادەمدا جندمان لە ئاگرێکی زۆر گەرم خوڵقاندبوو، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئایا ئیبلیسو وەچەی ئیبلیس لە جیاتی من دەکەنە پشتیوانو مشورخۆری خۆتان ؟ خراپترین جێگرەوە ئیبلیسە بۆ ستەمکاران کە لە جیاتی خوا بیکەن بە دۆستو پشتیوانو پەرستراوی خۆیان .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: ﴿خُلِقَتِ المَلاَئِكَةُ مِنْ نُورٍ، وَخُلِقَ الجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ، وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٥٢٣٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٩٩٦)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم: (١٤٧٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١٥٥)، وَالدَّيْلَمِيُّ برقم: (٢٩٥٣)}، واتە: فریشتە لە ڕووناکیی دروست کراون، وە ئیبلیس لە ئاگر دروست بووە، وە ئادەمیش لەوە دروست بووە کە بۆتان باسکراوە .

ئەویش بریتیە لە قوڕ، وە قوڕیش بریتیە لە (ئاو + گڵ).

**دووەم: جەستەی ئادەم لە قوڕ دروست بووە، واتە (گڵ + ئاو = قوڕ)، وە قوڕەکەش بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە :**

بەڵگەشمان لەوبارەوە ئەوەیە کە خوا لە سووڕەتی (ص) ئایەتی ژمارە (٧١)دا دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴾، واتە: یاد بکەوە، کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: من بەشەرێك لە قوڕێ دروست دەکەم، قوڕیش لە چی دروست دەبێ؟ ئاو لەگەڵ گڵ، کە تێکەڵیان بکەی دەبێ بە قوڕ.

ئەدی بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە کە جەستەی ئادەم بە چەند قۆناغێك دا تێپەڕیوە ؟ بەڵگەمان ئەوەیە کە خوا لە سووڕەتی (الحجر) لە ئایەتی (٢٦)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴾، واتە :

بێگومان ئێمە ئینسانمان لە (صَلْصَٰلٍ) دروست کردوە، (صَلْصال)یش بریتیە لە (طین مُتَحجِّر) قوڕێکی وشك بووەوە، کە وەك بەردی لێهاتبێو ڕەق بوو بێ، ئەگەر پەنجە، یان پلی لێبدەی دەنگی بێ، وەك دێزەو گۆزە.

ئنجا ئەو (صَلْصال)ە کە قوڕێکی وشك بۆوەی زرینگە زرینگ لێهاتوه، ئەویش :

﴿ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴾، (حَمَإٖ ) واتە: قوڕێکی ڕەش هەڵگەڕاو، (مَّسۡنُونٖ )یش، واتە: بۆن کردوو، (مَّسۡنُونٖ ) واتە: قوڕێك کە بۆنی کردبێ، کەواتە: قوڕێکی ڕەش هەڵگەڕاوی بۆن کردووی، دوایی وشك بۆوە، کەواتە: جەستەی ئادەم بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە .

هەروەها خوای بەرزو بێ هاوتا لە سوورەتی (الرحمن) ئایەتی (١٤)دا دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ﴾، واتە: جەستەی ئینسانی دروست کرد لە (صَلۡصَٰلٖ) یانی : لە قوڕێکی وشك بۆوەی، (كَٱلۡفَخَّارِ )، وەك (فَخّار) وایە، یانی: ئەو قوڕە وشك بۆوەی کە دەفری لێ دروست دەکرێ، وەك دیزەو گۆزەو کوپەو ...هتد، کە بە هەموویان دەگوترێ: (فَخَّار).

**<u>سێیەم</u> : بەلأم ڕووحی ئادەم فووێکی خواییە بە بەریدا کراوە :**

ئەوە جەستەی ئادەم بەو شێوەیە دروست بووە، ئەدی ڕووحەکەی لە کوێوە هاتوە ؟ ئایا ئادەم کە بابی مرۆڤایەتییە، مرۆڤەکانیش هەموویان تەنیا جەستەن ؟ نەخێر، بەڵکو ، بەشەر دوو پێکهاتەی هەن:

أ) جەستە (جسد) کە ئەویش لە قوڕ دروست بووەو بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە.

ب) گیان (روح) کە لە خواوە هاتوە، واتە: دروستکراوێکی تایبەتی خوایە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا لە سوورەتی (ص)، ئایەتی (٧٢)دا دەفەرموێ :﴿ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾، خوا بە فریشتەکان دەفەرموێ: ئنجا کاتێك جەستەکەیم ڕێکخست، وە لە ڕووحی خۆم فووم بەبەردا کرد، بۆی لەپەو ڕوو بکەون، واتە: کڕنووشی بۆ بەرن و سڵاوی لێ بکەن، هەڵبەتە کڕنووشی ڕێزگرتن.

كەواتە: ڕووحی ئادەم دروستكراوێكی تایبەتی خوایە، هەڵبەتە لێرەدا لێمان تێكنەچێ : ڕووح شتێك نیە لە خوا جیا بووبێتەوە، چونكە تەنیا خوای پەروەردگار، بەدیهێنەرەو، غەیری خوا، هەمووی دروستكراوە، وە ڕووحیش یەكێكە لە دروستكراوەكانی خوا، بەڵام دیارە دروستكراوێكی تایبەتەو، جیایە لە ماددە، جیایە لەو ماددەیەی كە جەستەی ئینسانی لێ دروست بووە، جەستەی ئادەمیش‌و وەچەی ئادەمیش دیارە لە ماددە دروست بووە، كە شتێكی بەرهەستە، بەڵام ڕووح دروستكراوێكی نابەرهەست (غیر محسوس)ە، بە پێنج هەستەكان هەستی پێناكەین : نە تام دەكرێ، نە بۆن دەكرێ، نە دەستی لێ دەدرێ، نە بە گوێ دەتوانین دەنگی ببیستین، نە بە چاو دەبینرێ، كەواتە: بە پێنج هەستەكان پەی بە ڕووح نابەین، بەڵام بە عەقڵ پەی بە ڕووح دەبەین، هەڵبەتە هەر ڕووحیش نیە، كە ئاوایە، بەڵكو هێزی كێشكردن‌و موگناتیس‌و گەلێك شتی دیكەش لە دروستكراوەكانی خوا، مرۆڤ لە ڕێی پێنج هەستەكانەوە ناتوانێ مامەڵەیان لەگەڵدا بكات‌و هەستیان پێبكات، بەڵام شوێنەوارەكانیان دەبینێ‌و بە عەقڵ دەركیان پێدەكات.

ئنجا خواش ﷻ كە بەدیهێنەری هەموو بوون‌و كائیناتە بە هەمان شێوە بە پێنج هەستەكان ناتوانی هەستی پێ بكەی، بەڵام بە عەقڵ پەی بە خوای پەروەردگار دەبەی، ڕووحیش لەو ڕووەوە، كە لە ڕێی عەقڵەوە پەی پێ دەبردرێ، نەك لە ڕێی پێنج هەستەكانەوە، بۆیە ڕووحیشی وەك دروستكراوێكی تایبەتی خۆی ناوزەد كردوە.

**چوارەم: دروستكرانی ئادەم لە لایەن خواوە، بە دروستكردنێكی تایبەت بوو و وەك دروستكراوەكانی دیكە نەبوو:**

بە بەڵگەی ئەوە كە خوا لە سوورەتی (ص) ئایەتی (٧٥)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ﴾، واتە: (خوا) فەرمووی : ئەی ئیبلیس ! چ شتێك ڕێی لێ گرتی كە كڕنووش بۆ

ئەوە ببەی کە بە دەستی خۆم دروستم کردوە، ئایا خۆت بە زلگرت، یاخود لە سەرکەشان‌و یاخیبووان بووی؟ واتە: هەر لە پێشدا ئەو سیفەتەت هەبوو، یاخود ئێستا ئەو سیفەتەت بۆ پەیدابوو، هەر پێشتر ئاوا سەرکەش‌و یاخی بووی، یاخود ئێستا خۆت بە زلگرت ؟ کەواتە: خوای بەدیهێنەر تەنیا بۆ ئادەمی فەرمووە: (خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ) بە دوو دەستی خۆم دروستم کردوە، دیارە دوو دەستی خوای بێ وێنە لەسەر ڕای زۆربەی زانایانی پێشین، دوو سیفەتی خوان، کە بۆ خوا شایستەن، وە هەندێك لە زانایانیش ئەوە تەئویل دەکەن‌و، دەڵێن: واتە: بە شێوەیەکی گرنگیی پێدان‌و بایەخ پێدانی تایبەتەوە، تۆم دروست کرد، وە هەر دوو ڕایەکانیش ڕێیان تێدەچێ، مادام زمانی عەرەبی ڕێگا بدات، هەڵبەتە هەموو ئەو سیفەتانەی کە خوای پەروەردگار خۆی پێ وەسفکردوون‌و پێغەمبەر ﷺ خوای پەروەردگاری پێ وەسفکردوون، ئێمە ئەو سیفەتانە بۆ خوای بێ وێنە دادەنێین، بەبێ ئەوەی کە چۆنیەتییەکەیان دیاریی بکەین، چونکە چۆنیەتیی خوا ﷻ ، ئایا زاتی خوا چۆنە؟ وە چۆنیەتی سیفەتەکانی، ئێمە ناتوانین چۆنیەتی زات‌و سیفەتەکانی خوا بزانین، بەڵام ئەو سیفەتەی کە لە زمانی عەرەبییدا بە مانایەکی مەجازیی ئەو وشەیە بەکارهاتبێ، ئێمەش دەتوانین بەو واتایە بەکاری بهێنین بەبێ ئەوەی کە سیفەتەکان لە خوای تاك‌و پاك نەفی بکەین.

**<u>پێنجەم</u>: ئادەم پاش ڕێکخرانی جەستەکەی‌و ڕووح بە بەرداکرانی ، شایستەی کڕنووش بردنی فریشتەکان بووە :**

ئایا ئادەم کەی خوای پەروەردگار بە فریشتەکانی فەرموو : کڕنووشی بۆ بەرن کڕنووشی ڕێزگرتن‌و سڵاوکردن ؟ دوای ئەوەی جەستەکەی ڕێکخراو ڕووحیشی بەبەردا کرا، ئنجا شایستەی ئەوە بوو فریشتەکان کڕنووشی بۆ بەرن، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای زاناو شارەزا لە سوورەتی (ص) ئایەتی (٧٢)دا دەفەرموێ :

﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾، ئنجا کاتێك جەستەکەییم ڕێکخست‌و لە ڕووحی خۆیشم فووم پێداکرد، "لەو ڕووحە تایبەتییەی کە هەر خۆم دەزانم چۆنە" (ئەی فریشتەکانم !) کڕنووشی بۆ بەرن،

کەواتە: کاتێك ئادەم کە تەنیا جەستەی بووە، فریشتەکان کڕنووشیان بۆ نەبردوە، وە کاتێکیش کە تەنیا ڕووح بووە، دیسان کڕنووشیان بۆ نەبردوە، بەڵکو کاتێك ڕووح بە بەر جەستەکەی داکراوەو بۆتە بەشەرێکی تەواو، کە چاکەو خراپەی لە دەست بێ‌و، جێنیشنایەتیی خوای بۆ بکرێ‌و، بتوانێ ئەمانەتی خوا هەڵبگرێ، ئەو کاتە شایستەی ئەوەی بووە، کە فریشتەکان کڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ بەرن.

**شەشەم: حیکمەتی دروستکرانی ئادەم ئەوە بوو، کە ببێتە جێنیشنی خوا لەسەر زەوی :**

ئایا بەڵگەمان چییە؟ بەڵگەمان ئایەتی ژمارە (٣٠)یە، لە سوورەتی (البقرة) خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، واتە: یاد بکەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: من دانەری جێنشنێکم لەسەر زەوی، (جێنشینێك لەسەر زەوی دەگێرم‌و دایدەنێم)، دیارە دوایی باس دەکات کە ئەو خەلیفەیە ئادەمە، کەواتە: حیکمەتی دروستکرانی ئادەم‌و حەوواو وەچەکەیان ئەوە بوو کە جێنشینایەتیی خوا بکەن لەسەر زەوی، کە دیارە ئێمە پێشتر باسمان کردوە کە جێنشینایەتیی مرۆڤ بۆ خوا لەسەر زەوی، چۆنە ؟ لە سوورەتی بەقەرەدا بە تەفصیل باسمان کردوە، وە ئەو ئیشکالەی هەندێك لە زانایان باسیان کردوە کە گوایە: ناگونجێ مرۆڤ بە جێنشینی خوا لە قەڵەم بدرێ، ڕوونمان کردۆتەوە کە نەخێر وانیە، چونکە بە کردەوە مرۆڤ جێنشینی خوایە لەسەر زەوی، بەو واتایەی کە خوای پەروەردگار دەستی مرۆڤەکانی ئاوەڵا کردوە، چی دەکەن، لەسەر زەوی بیکەن : چاکە دەکەن، یان خراپە دەکەن، هەڵبەتە خوا پێی خۆشە چاکە بکەن، هەر بۆیەش هەموو ئەو پێغەمبەرانەی بۆ ناردوون، وە کتێبەکانی بۆ دابەزاندوون، وە ڕێی چاکەکردنیشی پێشان داون، بۆ ئەوەی چاکە بکەن، بەلاّم گرنگ ئەوەیە کە ئینسان وەك ئینسان چ مسوڵمان بێ، چ کافر بێ، خوا دەستی کردۆتەوەو لەسەر زەوی دایناون، بە مەبەستی

تاقیکردنەوە، وە دەستی ئاوەڵا کردوون کە چی دەکەنو چۆن دەکەن ، بیکەن . ئنجا ئەمەش بریتیە لە جێنشنایەتیی کردنی مرۆڤـ لەسەر زەوی بۆ خوای پەروەردگار .

دیارە سیفەتەکانی خواش ، نابێ سیفەتی دروستکراوەکانیان قیاس بکرێنە سەر، چونکە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: جێنشینی کەسێك کاتێك دەبێ کاتێك کە ئەو کەسە لەوێ نەبێ، یاخود نەمابێ، دەڵێن: (خَلَفَ فُلاَنٌ فُلاَنَاً) واتە: چۆتە شوێنی ئەو، لەبەرئەوەی ئەو وەفاتی کردوە، یاخود ئەو لەوێ نیە، بەلاَم خوا نە غائیب دەبێ، نە دەشمرێ، بۆیە ناگونجێ جێنشینی هەبێ ! ئێمەش دەڵێین: سیفەتەکانی خوا وەك خوان، چونکە : (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيءٌ) واتە: هیچ شتێك وەك وێنەی وی (خوا) نیە، بۆیە جێنشین پەیداکردنی خوای بەرز بۆخۆی، جیایە لە جێنشین پەیداکردنی مرۆڤەکان بۆخۆیان، خوا هەمیشە هەیەو، ئامادەیەو، زیندووشەو سەرپەرشتیکاریشە، جێنیشنیشی لەسەر زەوی داناوە، کە وەك گوتم ئەوە شتێکی بەرهەستەو شتێکی روونە، چونکە خوای پەروەردگار دەستی مرۆڤی ئاوەڵا کردوە کە چی دەکاتو چۆن دەکات ، لەسەر زەوی ؟ بەلاَم ئاگاداریشی کردۆتەوە کە چاك بکاتو خراپە نەکات، راست بڕواو چەوت نەڕوا.

**حەوتەم: مرۆڤ لە باشترین شێوەدا دروستکراوەو، هەڵگرتنی ئەمانەتی خوای پێ سپێردراوە :**

خوا ﷻ باسی کردوە کە مرۆڤی لە باشترین شێوەدا دروستکردوە، باشترین شێوەی جەستەیی‌و ڕووحیی‌و عەقڵیی، هەروەها هەڵگرتنی سپاردەی خۆی بە مرۆڤ سپاردوە، لە سوورەتی (التين) لە ئایەتی (٤)دا خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ﴾، واتە: بێگومان ئێمە مرۆڤمان لە باشترین پێکهاتەدا، لە باشترین شێوەدا دروستکردوە، وە دەربارەی پێ سپێردرانی ئینسان کە ئەمانەتی خوا هەڵبگرێ، لە سوورەتی (الأحزاب) لە ئایەتی (٧٢)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا

ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ﴾، واتە: بێگومان ئێمە سپاردەمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەکان‌و زەوی‌و چیاکان، بەڵام ئامادە نەبوون هەڵیبگرن، وە لێی ترسان، وە ئینسان ئەو سپاردەیەی هەڵگرت، بێگومان ئەویش زۆر ستەمکارەو زۆر نەفامە، واتە: ئینسان ئەگەر هیدایەتی خوای نەگاتی‌و دەست بە هیدایەتی خواوە نەگرێ ، زۆر ستەمکارە لە ڕووی کردەییەوە، وە زۆریش نەفامە لە ڕووی فیکریی‌و تیۆرییەوە.

کەواتە: لە ڕاستییدا ئینسان هەڵگری ئەمانەتی خوایە، وە لە باشترین شێوەشدا خولقێنراوە، هەڵبەتە ئێمە پێشتریش باسمان کردوە، کە مەبەست لە ئەمانەت لێرەدا ئەوەیە کە ئینسان بە ئیرادەی ئازادانەی خۆی ژیانی دنیا بگوزەرێنێ، وە خوای بێ هاوەڵ ڕێی پێداوە کە بەندایەتیی بۆ خوا بکات، یان نەیکات، کە ئەوەش بریتیە لەو ئەمانەتەی پێی سپاردوە، کە مرۆڤ لە ژیانێکی ئازادانەو ئارەزوومەندانەدا بتوانێ بژیێ‌و چاکە بکات، یان خراپە بکات، کە لە ئەنجامی ئەوەش دا هەندێکیان چاك دەردەچن‌و، هەندێکیشیان خراپ دەردەچن، یانی : هەندێکیان لە تاقیکردنەوەی خوا دەردەچن‌و ، هەندێکیشیان لە تاقیکردنەوەی خوا دەرناچن.

## هەشتەم: نە لە قورئاندا، نە لە سوننەتدا وەك باسی دروستکردنی ئادەم کراوە، ئاوا بە وردیی باسی دروستکردنی حەووا نەکراوە :

ئەوەی کە لەوبارەوە لە قورئاندا باسکراوە، ئەوەیە کە خوا لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١)دا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ ... ﴾، واتە: ئەی خەڵکینە ! پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن، کە ئێوەی لە یەك نەفس بە دیهێناوە، پاشان هەر لە خۆی هاوسەرەکەیشی وەدیهێناوە، وە لەو دوو (نەفسە) پیاوان‌و ئافرەتانێکی زۆری بڵاوکردوونەوە بە زەویدا، واتە: وەچەی لێ وە پاش خستوون، ئەم ئایەتە تەنیا ئەوە دەگەیەنێ کە ئادەم‌و حەووا (علیهما السلام) لە یەك

جۆرە جەستەو ڕووح دروست بوون، بەڵام هەندێ لە زانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتە ئاماژەیە بەوە کە حەووا لە ئادەم جیابۆتەوە، ئنجا هەندێکیان دیاریی دەکەن کە پەراسوویەکی ئادەم بۆتە حەووا، یانی: خوا لە پەراسووی ئادەم حەووای دروست کردوە ! بەڵام ئێمە دەڵێین: وانیە، وەك من لە تەفسیری سووڕەتی (النساء)دا بە تەفصیل باسی ئەوەم کردوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوا لە سووڕەتی (الروم) لە ئایەتی (٢١)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، واتە: وە لە نیشانەکانی پەروەردگارێتیی خوا ئەوەیە کە لە خۆتان هاوسەرانتانی بۆ دروست کردوون ، تاکو بە هۆیانەوە خۆشییو ئارامییتان بۆ بێو بەزەییو خۆشەویستی لە نێوانتاندا داناوە، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ کەسانێك کە بیر بکەنەوە.

ئنجا ئەگەر حەووا لە ئادەم دروست بووبێ، دەبێ هەموو پیاوانیش، ئەوانەی کە ژنیان هەیە، هاوسەرەکانیان لێیان دروست بووبن ! بەڵام نەخێر، هەم ئەوەی حەوواو ئادەم، هەم ئەوەی هەموو پیاوانو هاوسەرەکانیان : مەبەست پێی ئەوەیە کە لە جۆری ئەوان دروست بوون، ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا ﴾، واتە: لە جۆری نەفسی خۆتان هاوسەرەکانیشی بۆ دروست کردوون، وەك چۆن لەوێ دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا ﴾، لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا ﴾، هەر هەمان تەعبیرە دووبارە بۆتەوە، لەوێ بە شێوەی تاك، لێرە بە شێوەی کۆ، ئنجا ئەگەر حەووا لە ئادەم جیا بووبێتەوە، بەپێی ئەو ئایەتەی سووڕەتی (النساء)، دەبێ هەموو ژنەکانیش لە پیاوەکانیان جیا بووبنەوە، بە پێی ئایەتی ژمارە (٢١) سووڕەتی (الروم) ! کە بێگومان نە یەکەم وایەو، نە دووەمیان وایە، چونکە بە ئاشکرا دیارە، ژن لە پیاو دروست نەبووە، بەڵکو بە جیا دروست بووە، بەڵام یەك جۆرە

نەفسن، بە هەمان شێوەش حەووا لە ئادەم جیا نەبۆتەوە، بەڵام یەك جۆرە نەفس‌و پێکهاتەیان هەیە، بە شێوەی گشتی، واتە: یەك جۆرە جەستەو ڕووحیان هەیە.

ئنجا لە سوننەتیشدا ئەوەی کە هاتوە هەر ئەوەیە کە ئافرەت تەشبیه کراوە بە پەراسووەوە، بەڵام تەنیا وەك وێچواندنی ئافرەت بە پەراسوو هاتوە، نەك ئەوە کە ئافرەت، یاخود باسی حەووا بکرێ، کە گوایە : لە پەراسووی لای چەپی، ئادەم دروست بووە، با تەماشای ئەو سێ فەرموودەیە بکەین :

**فەرمایشتی یەکەم:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا، فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاهُ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٥١٨٥)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٣٦٣٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ}، واتە: ئامۆژگارییتان دەکەم، لەگەڵ ئافرەتان باش بن، چونکە ئافرەت لە پەراسوو دروست بووە، وە خوارترین بەشی پەراسوو، بەشی سەرەوەیەتی، ئنجا ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە دەشکێ (پەراسوو ئەگەر ئینسان بیەوێ ڕاستی بکاتەوە دەشکێ)، وە ئەگەر وازی لێ بێنی، هەر بە لاریی دەمێنێتەوە، بۆیە لەگەڵیان باشبن، (واتە: مودارایان لەگەڵدا بکەن‌و چاوپۆشیی لە کەموکوڕییان بکەن) .

دوایی باسی دەکەم مەبەست لە کەموکوڕیی ئافرەت چییە).

**فەرمایشتی دووەم:** ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْمَرْأَةُ كَالضِّلَعِ، إِنْ أَقَمْتَهَا كَسَرْتَهَا، وَإِنْ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا، اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَفِيهَا عِوَجٌ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٥١٨٤)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٣٦٢٩)}، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت وەك پەراسوویە، ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە، دەیشکێنی، وە ئەگەر لێی گەڕێی، هەر بە لاریی مودارای لەگەڵدا دەکەی‌و، لە یەکدی بەهرەمەند دەبن.

**فەرمایشتی سێیەم:** ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ، لَنْ تَسْتَقِيمَ لَكَ عَلَى طَرِيقَةٍ، فَإِنِ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا اسْتَمْتَعْتَ

وَبِهَا عِوَجٌ، وَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهَا كَسَرْتَهَا، وَكَسْرُهَا طَلاَقُهَا﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٤٦٨)}، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت لە پەراسوو دروست بووە (واتە: لە شێوەی پەراسوودا دروست بووە، نەك لە پەراسوو دروست بووبێ، وەك پێشتر باسمان کرد) لەسەر ڕێیەکی ڕاست بۆت بەردەوام نابێ، بۆیە ئەگەر لێی گەڕێی، لەگەڵی دەگوزەرێنی ، لە حاڵێك دا کە لارییەکەی هەیە، وە ئەگەر ویستیشت ڕاستی بکەیەوە، ئەوە دەیشکێنی، شکاندنیشی بریتیە لە تەلاق دانی.

ئێستا بزانین مەبەست لەو وێچواندنەی پێغەمبەری خوا، واتە: وێچواندنی ئافرەت بە پەراسوو چییە؟ بێگومان پەراسووەکان کە قەفەسەی سینگ پێکدێنن، لارن، ئاشکرایە بەهۆی ئەو لارییەشیانەوە، دەتوانن قەفەسەی سینگ پێکبێنن، بەلام قەفەسەی سینگ لانەی چییە ؟ صندوقێکە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (جەرگو هەناوی ئینسانی تێدایە)، سییەکان، دڵ، جەرگ، هەموویان لە نێو قەفەسەی سینگ دان، ئنجا پەراسووەکان بەهۆی لارییانەوە توانیویانە، ئەو قەفەسە پێکبێنن، ئافرەتیش خوای کاربەجێ وای خوڵقاندوە، کە تەنیا ئەو دەتوانێ دایك بێو، تەنیا ئەو دەتوانێ مندالی ببێ، واتە: وەك چۆن قەفەسەی سینگ دەتوانێ جەرگو سییەکانو، دڵی ئینسان لەنێو خۆیدا بحەوێنێتەوە، ئافرەتیش دەتوانێ کۆرپەی مرۆڤ لە باوەشی خۆیدا بحەوێنێتەوە، وە لە ڕاستییدا کۆرپەی مرۆڤ ، جەرگو هەناوی دایكو بابە، هەر بۆیەش بە مندالْ دەڵێن "جگەر گۆشە"، ئنجا ئافرەت چۆن توانیویەتی ئەو حاڵەتەی هەبێ لە ڕاستییدا بەهۆی ئەو زێدە عەطفو سۆزو بەزەییەوە کە هەیەتی.

ئەدی مەبەست لە ڕاستکردنەوەی چییە ؟ واتە: ئەگەر پیاو بیەوێ ئافرەت وەك پیاو عەقلانیی بیر بکاتەوە، کە هەڵبەتە ناڵێین ئافرەت عەقڵی نیە، بەلام ئافرەت عەقڵی هەیەو عاطیفەی هەیە، بەلام عاطیفە بەسەر عەقڵیدا زاڵە، هەروەك پیاویش عەقڵو عاطیفەی هەیە، بەلام عەقڵی بەسەر عاطیفەی دا زاڵە، ئەوە شتێکی ئاشکرایە، واتە: ئافرەتان لە پێش پیاوانەوەن لە ڕووی عەطفو سۆزەوە، وەك چۆن پیاوان لە پێشەوەی ئافرەتانن لە ڕووی عەقڵو هۆشەوە، وە هەردووکیشیان یەکدی تەواو دەکەن، ئەرکەکانی ئافرەت زیاتر پێویستییان بە

حاڵەتێکە کە عاطیفەیەکی بەهێزو عەقڵێشی لەگەڵدا بێ، بەڵام ئەرکەکانی پیاو پێویستیی بە عەقڵێکی بە هێزترە کە عاطیفەیەشی لەگەڵدا بێ.

ئنجا ئەگەر پیاو بیەوێ ئافرەت وەك خۆی لێ بکات، بۆ ئەوەی وەك خۆی بیر بکاتەوە، ئەوە ناتوانێ وەك خۆی لێ بکات، کەواتە: دەبێ تەڵاقی بداو دەستبەرداری ببێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: وەك چۆن پەراسوویەك ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیەوە، دەیشکێنی، وە پەراسوو بەهۆی لارییەکەیەوە دەتوانێ ئەرکی خۆی ببینێ، ئافرەتیش بەهۆی زێدە عەطفو سۆزەکەیەوە، دەتوانێ ئەرکی خۆی ببینێ، وە ئەو عەطفو سۆزەشی وای لێدەکات کە بە بۆچوونی پیاو، هەندێك لاریی هەیەو، هەندێك کەموکوڕیی هەیەو، هەڵەو هەڵچوونی هەیە، کە دەبێ ئەو پیاوە ئارامی لەسەر بگرێو، چاوپۆشیی لێ بکات، وە نابێ هەوڵبدا بیهێنێتە سەر سروشتی خۆی، بێگومان ئافرەت نایەتە سەر سروشتی پیاو، هەروەك پیاویش ناتوانێ بچێتە سەر سروشتی ئافرەت، هەر کامێکیان خوای پەروەردگار بە شێوەیەکی تایبەت دروستی کردوون، وە ئەرکێکی تایبەتیشی بۆ داناون، دیارە کۆمەڵە ئەرکێکی هاوبەشیشان هەن، بەڵام بێگومان کە ئەرکی دایکایەتیی، تەنیا بە ئافرەت جێبەجێ دەکرێ، هەروەك هەندێك لە ئەرکەکانیش، تەنیا بە پیاو جێبەجێ دەکرێن.

ئەدی مەسەلەی دروستبوونی (حەووا) لە پەراسووی چەپی ئادەم لە کوێوە هاتوە ؟ ئەوە لە ڕاستییدا لە تەوڕات وەرگیراوە، وەك لە (إصحاح)ی (٢) لە (سفر التكوين)دا ئەم دەقە هاتوە، دەڵێ: (فَأَوْقَعَ الرَّبُّ الإِلَـهُ آدَمَ فِي نَوْمٍ عَمِيقٍ ثُمَّ تَنَاولَ ضِلْعَاً مِنْ أَضْلاَعِهِ وَسَدَّ مَكَانَهَا باللَّحْمِ، وَعَمِلَ مِنْ هَذِهِ الضِّلْعِ امْرَأَةً أَحْضَرَهَا إِلَى آدَمَ...)[1]، واتە: پەروەردگاری پەرستراو ئادەمی خەواند بە نووستنێکی قووڵ، دوایی یەکێك لە پەراسووەکانی دەرهێناو، شوێنەکەی بە گۆشت پڕ کردەوە، وە لەو پەراسووە ئافرەتێکی لێ دروست کرد، وە بۆ ئادەمی ئامادە کرد.

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح ٢، الآيات : ٢١ و٢٢ و ٢٣، ص١١.

کەواتە: لە ڕاستییدا هەرچی لە تەفسیرەکانی خۆماندا، وە لە شەرحی سوننەتدا، زانایان لەبارەی دروستبوونی حەووا سەلامی خوای لێ بێ لە پەراسووی چەپی ئادەم سەلامی خوای لێ بێ ، دەیڵێن ، ئەمە سەرچاوەکەیەتی، ئەگەرنا نە قورئان بە ڕاشکاویی وای فەرمووە، وەك باسمان کرد، نە سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ وای فەرمووە، بەڵێ لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، بەڵام زۆر بە ڕوونیی دیارە کە لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ دەفەرموێ: ئافرەت وەك پەراسوو وایە، پاشان فەرموودەکە بە گشتی باسی ئافرەت دەکاتو، تەنیا باسی حەووا ناکات، تاکو ئەگەر هەر چۆن بوو هی حەووامان بۆ پینەکراو، گوتمان لە پەراسووی ئادەم دروست بووە، هی سەرجەم ئافرەتانمان بۆ پینە بکرێ ! چونکە فەرموودەکە دەفەرموێ: ئافرەت بە گشتیو هەموو ئافرەتێك لە پەراسوو دروست بووە، واتە: لە شێوەی پەراسوودا دروست بووە، ئەگەرنا ئەگەر حەووا لە پەراسووی ئادەم دروست بووبێ، دەبێ هەموو ئافرەتان لە پەراسووی پیاوەکانیان دروست بووبن !! کە ئەمەش پێچەوانەی واقیعەو پێچەوانەی عەقڵو مەنتیقیشە.

**<u>نۆیەم</u>: فریشتەکان پرسیاریان کرد : کە چۆن خوا ئەوان ناکاتە خەلیفەی خۆی لەسەر زەوی، وە مرۆڤ دەکاتە جێنشین، لە کاتێکدا کە خراپە کارییو خوێنڕێژیی ئەنجام دەدات ؟!**

دوای ئەوەی خوای پەروەردگار بە فریشتەکان ڕادەگەیەنێ، کە من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێنم، فریشتەکان دەپرسن: حیکمەتی چییە ؟ نەك وەك ڕەخنە گرتن لە خوا، پاکیی بۆ خوا، کە فریشتەکانی بێ هەڵەو پەڵەن، ڕەخنەی لێ بگرن، بەڵام دەیانەوێ حیکمەتەکەی بزانن، بۆچی ئەوان ناکاتە جێنشین؟ وەك خوای کاربەجێ لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (٣٠)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، واتە: وە یادبکەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو :

جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم، گوتیان: ئایا کەسێك دەکەی بە جێنیشنی خۆت لەسەر زەوی ، کە خراپەکاریی تێدا دەکات، وە خوێنی تێدا دەڕێژێ، لە حاڵێکدا ئێمە هەمیشە تۆ بە پاك دەگرین‌و ستایشت دەکەین‌و تۆ دوور دەخەینەوە لە هەر کەموکوڕیی‌و عەیبێك ؟ (خوا) فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن. یانی : بەڵێ ئادەم‌و ڕۆڵەکانی ئەو کەم‌وکوڕییانەیان هەن، بەڵام وێڕای ئەوە شایستەیی جێنشینایەتیی خواشیان هەیە لەسەر زەوی، هەڵبەتە خوا بۆ خۆی پێی فەرمووون: ئەو ئینسانە کە دەیکاتە جێنیشن، چی لە باراندا هەیەو، لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا فریشتەکان زانیویانە ئادەم چی دەکات ! چونکە هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: جند لە پێش مرۆڤدا لەسەر زەوی بوون، وە هەندێکی دیکە دەڵێن: پێش ئادەم ئادەمی دیکە هەبوون، فریشتەکان بەوە زانیویانە کە ئەو جێنشینە خراپەکارە ! بەڵام هیچ پێویست بەوە ناکات‌و، ئەوە هەمووی پەنهان‌و نادیارەو لە وەحی خواش دا شتی وا نەهاتوە، بەڵکو خوا ﷻ کە فەرموویەتی: من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم، لە هەمان کاتدا جێنشینەکەی پێ ناساندوون‌و، لەبەر ڕۆشنایی پێناسەی خوادا بۆ ئەو جێنشینە، زانیویانە کە ئەو مرۆڤە وەك چۆن دەتوانێ چاکە بکات، ئاواش دەتوانێ خراپە بکات، بەڵام ئەوان لێرەدا بۆیە باسی چاکە کردنی ئادەم ناکەن‌و، تەنیا باسی خراپەو خوێن ڕێژییەکەی ئادەم دەکەن، تاکو بەڵگەو پاساو بێننەوە، بۆ ئەوە کە ئەوانە شایستەتر بوون، چونکە خراپەیان لە دەست ڕوونادات، ئەگەرنا ئەگەر باسی چاکەکەیان کردبایە، ئەو کاتە خوا دەیفەرموو : ئنجا ئەگەر چاکە دەکەن، ئەویش چاکە دەکات، بەڵام ئەوان تەنیا باسی لایەنی خراپی ئادەمیان کردوە.

ئنجا فریشتەکان چۆنیان زانی کە مرۆڤەکان خراپەکارو خوێنڕێژ دەبن ؟!

وەك گوتم : لە پێناسەی خوا بۆ مرۆڤەوە، ئەوەیان زانی، دیارە خوای پەروەردگار کە فەرموویەتی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾، بەڵێ لە قورئان دا بە تەفصیلێ باسی نەکردوە، بەڵام بێگومان بۆ فریشتەکانی باس کردوەو، فەرموویەتی: جێنشینێك دادەنێم لەسەر زەوی کە چی‌وچی لە باران دا هەیەو، چی دەکات‌و، چۆنەو، پێکهاتەکەی چییەو، چی لەدەست دێ‌و ...هتد ؟!

**دەیەم: خوا ئادەمی کردە مامۆستای فریشتەکان و ناوەکانی فێرکردن : وە ئادەمیش فێری فریشتەکانی کردن :**

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾البقــرة، واتــە: وە خــوا ئــادەمی فیــری نــاوی سـەرجەم شـتەکان کردو، دوایی شـتەکانی لەسـەر فریشـتەکان ڕانوانـدن و فـەرمووی: ئەگەر ڕاسـت دەکەن (ئێوە شایسـتەترن بـە جێنشینایەتیی خوا لـەسـەر زەوی) نـاوی ئەو شـتانەم پێ بلێـن.

ئـەوانیش گـوتیان: بـە پاکـت دەگـرین جگـە لـەوەی تـۆ فێـرت کـردووین، هـیچ زانیارییەکی دیکەمـان نیە، بێگومان تۆ زانای کاربـەجێی.

(خـوا) فەرمووی: ئەی ئـادەم ! ناوی شـتەکانیان پێ بلـێ، ئنجا کاتێك ناوەکانیانی پـێ گـوتن.

(خـوا) فـەرمووی: ئەدی من پێمـنەگوتن من نهێنـیی ئـاسـمانەکـان و زەوی دەزانم و، دەزانم چـی ئـاشـکرا دەکـەن و چی پەنهان دەکـەن (دەیـزانم) !

زانیـاریی فریشـتەکـان وەك زانیـاریی کۆمپیوتـەر وایـە، کۆمپیوتـەر چ زانیارییـەکی بدەینـێ هەر ئەوە دەزانێ، فریشتەکان چی خوا فێـری کردوون ، هـەر ئـەوە دەزانـن، بـەڵام ئینسان وانیـە، ئینسـان خـوای زانـاو تـوانـا، توانای داوەتـێ کە بۆخۆی زانیـاریی وەدەست بێنـێ، وە توانـای داوەتـێ بتوانـێ نـاو لـە شـت بنـێ، کـە مەبـەسـت لێـرەدا ناونان لە شـت، واتە: هەڵهـێنجان و قیاسـکردنی شـت بـۆ سـەر یەکدی و دۆزینـەوەی زانیاریـی پەنهـان و ...هتد.

**یازدەیەم: خوا فەرمانی بە فریشتان کرد، کە کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، ئەوانیش تێکڕا کڕنووشیان برد جگە لە ئیبلیس، کە ئەویش لە نێو فریشتان دابوو، ئەگەرنا فریشتە نەبوو :**

ئەم حەقیقەتە خوای کارزان لە حەوت شوێنی قورئاندا باسی کردوە، کە ئەمانەن:

١) لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿١١﴾ ﴾ پێشتر تەفسیرمان کرد.

٢) لە سوورەتی (البقرة)دا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، واتە: وە یاد بکەوە کاتێك بە فریشتەکانمان گوت: کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس ئامادە نەبوو، وە خۆی بە زلگرتو، چووە ڕیزی کافرانەوە، (یان خۆی لە ڕیزی کافران دابوو).

٣) لە سوورەتی (الحجر) ئایەتەکانی (٢٨ تا ٣١)دا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: وە یاد بکەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتانی فەرموو: من بەشەرێك لە قوڕێکی بۆنکردووی ڕەش هەڵگەڕاوی ڕەق بووی، وەك بەرد، دروست دەکەم، ئنجا هەر کات جەستەکەیم ڕێکخست، وە لە ڕووحی خۆم فووم بە بەردا کرد، بۆی بکەونە کڕنووش، فریشتەکان تێکڕا هەموویان کڕنووشیان برد، بێجگە لە ئیبلیس کە ئامادە نەبوو لەگەڵ کڕنووش بردووان دا بێ.

٤) له سووره‌تی (الإسراء) ئایەتی (٦١)دا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴾، واته: وه یاد بکەوه کاتێك بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، هەموویان کڕنووشیان برد، جگە له ئیبلیس، کە گوتی: ئایا کڕنووش بۆ کەسێك ببەم کە له قوڕ دروستت کردوه ؟!

٥) لە سووره‌تی (الكهف) ئایەتی (٥٠)دا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ﴾، واته: وه یاد بکەوه کاتێك بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، ئەوانیش کڕنوشیان برد، جگە له ئیبلیس، ئەویش لە جند بوو، وه لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو.

٦) سووره‌تی (طه) ئایەتی (١١٦)دا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴾، واته: وه یاد بکەوه کاتێك بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، کڕنووشیان (بۆ ئادەم) برد، جگە له ئیبلیس ئامادە نەبووو سەرپێچیی کرد.

٧) لە سووره‌تی (ص) ئایەتەکانی (٧١ تا ٧٤)دا کە دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾، واته: وه یاد بکەوه کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: من بەشەرێك لە قوڕێ دروست دەکەم، ئنجا کاتێك ڕێکمخستو لە ڕووحی خۆم فووم بە بەردا کرد، بۆی بکەونە کڕنووش، فریشتەکان تێکڕا هەموویان کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس کە خۆی بە زلگرت، وه لە ڕیزی کافران دابوو، (یاخود چووە ڕیزی کافرانەوە).

کەواتە: ئەگەر سەرنجی ئەو حەوت شوێنە بدەین، دەبینین هەرجارە خوا ﷻ گۆشەیەکی ئەو مەسەلەیە دەردەخات ، هەڵبەتە یەکێك لە حیکمەتەکانی چەند بارە بوونەوەی مەسەلەیەك لە قورئاندا ، ئەوەیە کە خوا ﷻ بەپێی ئەو بابەتە کە ئەو ئایەتەی تێدا هاتووە، بەپێی ئەو سیاقەو، بەپێی ئەو کەش و بارودۆخە کە ئەو سوورەتەی تێدا هاتۆتە خوار، هەر جارەی لە ڕوویەکەوە، باسی ئەو مەسەلەیە دەکات، بۆ وێنە :

لە سوورەتی (البقرة)دا، خوا ئاوا باسی هەڵوێستەکەی ئیبلیس دەکات : ﴿أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، ئامادە نەبوو، (یاخود سەرپێچیی کرد)و خۆی بە زلگرت و، چووە ڕیزی کافرانەوە .

بەڵام لە سوورەتی (الأعراف)دا لەوبارەوە دەفەرموێ : ﴿لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾، لە کڕنووش بردووان نەبوو، بەڵام بۆچی لە کڕنووش بردووان نەبوو؟! لە سوورەتی (البقرة)دا باس دەکات، بەهۆی (إباء واستكبار)ەوە، واتە: ئامادە نەبوون و یاخیی بوون و خۆبە زلگرتنەوە.

وە لە سوورەتی (الحجر) دەفەرموێ: ﴿أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾، ئامادە نەبوو، (یاخیی بوو) لەوە کە لەگەڵ کڕنووش بردووان بێ .

وە لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾، واتە: لەگەڵ کڕنووش بردوواندا بێ، بەڵام لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾، واتە: لە نێو کڕنووش بردوواندا بێ.

ئنجا لە سوورەتی (الإسراء)دا ئاوا باسی کردوە : ﴿قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا﴾، ئایا کڕنووش بۆ کەسێك بەرم کە لە قوڕێ دروستت کردوە ؟ واتە: وەك پرسیارکردنی نکووڵیی لێکەرانە، یانی: شتێکی زۆر سەیرو، زۆر نامەنتیقییە، کە ئەوە ڕەخنە گرتنێکی زۆر بێ ئەدەبانەی ئیبلیسە لە خوا ﷻ.

وە لە سوورەتی (الكهف)دا دەفەرموێ: ﴿ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ﴾، ئیبلیس لە جند بوو، لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو.

ئنجا ئایا بۆچی لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو ؟ بەهۆی یاخیی بوونیەوەو، بەهۆی خۆ بە زلگرییەوە، کە لە سوورەتەکانی دیکەدا هاتوە، وەك لە سوورەتی (طه)دا دەفەرموێ: ﴿ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴾، واتە هەموو کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس ئامادە نەبوو، یاخیی بوو، (إبَاء) بریتیە لە نەکردنی شتێك‌و ڕەفزکردنی شتێك، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿كُلُّ أُمَّتِي يَدخُلُونَ الجَنَّةَ إلاَّ مَنْ أبَى، قِيلَ : وَمَنْ يَأبَى يَا رَسُول الله؟ قَالَ: مَنْ أَطاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَنْ عَصانِي فَقَدْ أبَى﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٨٥١)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٦٢٦)، تعليق الذهبي في التلخيص: صحيح على شرط البخاري ومسلم}، واتە: هەموو ئۆممەتی من دەچنە بەهەشت، مەگەر کەسێك ئامادە نەبێ، گوتیان: کێ هەیە ئامادە نەبێ؟ فەرمووی: هەر کەسێك فەرمانبەریی من بکات دەچێتە بەهەشت، وە هەر کەسێك سەرپێچیی فەرمانی من بکات، ئەوە ئامادە نیە بچێتە بەهەشت، واتە: ڕەفزی دەکات.

کەواتە:

١/ خۆبە زلگریی ئیبلیس ، هۆکاری کڕنووش نەبردنی بوو.

٢/ ئیبلیس لە ڕەگەزی جند بووە، کە کوردەواریی زۆر جار دەڵێن: جند، وە لە هەندێك شوێن دەڵێن: جن، وە دەگوترێ: جندار بووە، یانی (جنّ)ی چۆتە نێو، یان جینن دەستی لێوەشاندوە، دیارە ئیبلیس لە ڕەگەزی جند بووە، بۆیە توانیویەتی لە فەرمانی خوای کارزان دەربچێ، ﴿ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ﴾، چونکە خوا دەربارەی فریشتەکان دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾، سەرپێچیی لە فەرمانی خوا ناکەن‌و، هەر شتێك پێیان بگوترێ هەرچی فەرمانیان پێ بکرێ، جێبەجێی دەکەن، کەواتە:

ئیبلیس بۆیە توانی لە فەرمانی خوا دەربچێ، چونکە لە فریشتە نەبوو، چونکە ئەگەر لە فریشتە بووایە، سەرپێچیی فەرمانی خوای نەدەکرد.

٣) بەو هەڵوێستەی ئیبلیس بۆمان دەردەکەوێ ، کە کافر بووە، ﴿ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، یانی: کە پێشتر کافر بووە، بۆیە ئەو هەڵوێستی خۆبە زلگرییەی هەبووە، یاخود : بەهۆی هەڵوێستی خۆبە زلگرییەکەیەوە، کافر بووە، ئەوەی دووەمیان زیاتر دێتە عەقڵەوە، چونکە لە ئەنجامی ئەو هەڵوێستەیدا خوای دادگەر مۆری کوفری بە نێوچەوانیەوە دەنێ، ئەگەرنا دادگەریی خواو، حیکمەتی خوا، وای لێ چاوەڕوان دەکرێ، کە پێش ئەوەی سیفەتێك کردەوەیەك لە کەسێك دەربکەوێ ، حوکمێك کە ئەو سیفەتەی دەیخوازێ، بەسەریدا نەدات.

## دوازدەیەم: هۆکاری خۆ بە زلگرتنی ئیبلیس، خۆ پێ باشتر بوونی لە ئادەمو خۆ پێ هەڵکێشانی بووە بە ماددەی لێ دروست بوونی :

ئیبلیس بۆچی خۆی بە زلگرت؟ لە سۆنگەی ئەوەوە کە خۆی پێ لە ئادەم باشتر بوو، بەهۆی ئەوەوە کە دەیگوت: من لە ماددەیەك دروست بووم کە ئاگرەو، ئادەم لە ماددەیەکی دیکە دروست بووە کە قوڕە، با لەوبارەوە تەماشای ئەم چوار ئایەتە بکەین :

١ - لە سوورەتی (الأعراف)دا خوای باڵادەست دەفەرموێ : ئیبلیس گوتی: ﴿ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ﴾، من لەو باشترم، ﴿ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴾، واتە: ئیبلیس بەوە بەڵگە دێنێتەوە کە لە ئادەم باشترە، کە خوا ئەوی لە ئاگر دروست کردوە، بەڵام ئادەمی لە قوڕ دروست کردوە !

٢ - لە سوورەتی (الحجر)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُۥ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴾، ئیبلیس گوتی: ناگونجێ کڕنووش

ببەم بۆ بەشەرێك لە قورێکی ڕەشهەڵگەڕاوی بۆنکردووی ڕەق هەڵهاتوو، دروستت کردوە.

٣ - وە لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتەکانی (٦١ و ٦٢)دا دەفەرمویٚ: ﴿ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ ﴾، ئیبلیس گوتی: ئایا بۆ کەسێك کڕنووش ببەم کە لە قوڕ دروستت کردوە، ئایا ئەوە دەبینی کە بەسەر مندا بە ڕێزت کردوە، ڕێزت لێناوە، لە حاڵێکدا کە ماددەکەی ، کە لێی دروست بووە، بریتییە لە قوڕ ؟ واتە: ئەوە جێی سەرسوڕمانە ! کە وەك گوتم : ئەوە ڕەخنەیەکی زۆر بێئەدەبانەی ئیبلیسە لە خوا ﷻ.

٤ - لە ئایەتی (٧٦)ی سوورەتی (ص)دا دەفەرمویٚ: ﴿ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴾، هەروەك ئایەتەکەی سوورەتی (الأعراف)، دەڵێ: من لەو باشترم، منت لە ئاگر دروست کردووە، ئەوت لە قوڕێ دروست کردوە، هەڵبەتە لێرەدا ئەگەر شیکردنەوەیەکی مەنتیقییانە بکەین بۆ هەڵوێستەکەی ئیبلیس، دەڵێین:

أ) بە ڕاستیی هەڵوێستی ئیبلیس هەڵوێستێکی زۆر نەفامانە بووە، چونکە دروستکراوەکانی خوا نابێ خۆیان بەوەوە هەڵکێشن کە دەستیان تێیدا نیە، ئیبلیس کە لە ئاگر دروست بووە، کێ دروستی کردوە؟ بێگومان خوا، خوا ماددەکەی بۆ هەڵبژاردوە، خۆ بۆخۆی هەڵینەبژاردوە، تاکو خۆی پێ هەڵکێشێ، وە ئادەم لە چی دروست بووە؟ لە قوڕ، ئادەمیش خوا ماددەی دروستکردنو کەرەستەکەی جەستەکەی بۆ هەڵبژاردوە، نەك خۆی، تاکو ئەگەر بڵێی : قوڕ لە ئاگر خراپترە، مانای وایە: ئیبلیس لە ئادەم عاقڵتر بووە، چونکە ماددەیەکی لە قوڕ چاکتری هەڵبژاردوە !!

ب) کێ دەڵێ: ئاگر لە قوڕێ باشترە ؟ ئاگر شت دەفەوتێنێ، دەسووتێنێو، دەیکاتە خۆڵەمێش، بەڵام قوڕ شت پێدەگەیەنێو، شت بەرهەم دێنێ، وەك:

دانەویڵـە، تـۆو، دارو درەخـت، میـوەو سـەوزەو... هتـد، واتـە: قـورِ ماددەیـەکی بـەرهەمـدارە، بـەڵام ئـاگر ماددەیەکی لەبـەینـبـەرو فەوتێنـەرە.

## سێزدەیەم: نەفرینکـردنی خـوا لـە ئیبلـیس و بڕیـاردانی دەرکـردنـی لـە ئـاسـمان و بـەهەشت ، بـەهـۆی سـەرپێـچیی کـردن لە فـەرمـانی خـواوە:

دوای ئـەوەی کـە ئیبلـیس فـەرمانی خـوا دەشکێنـێ، بـەوەندە وازناهێنـێ کـە سـەرپێچیی لە فەرمانی خـوا دەکات، بەڵکو دەیەوێ بێ فەرمانییەکەی پینـەو پـەرۆ بکـات، بـە شـتێك لـە گونـاهی پێشـێ گـەورەتر ، وەك گوتـراوە : (العُذْرُ أَقْبَحُ مِنَ الذَّنْبِ) واتـە : پاسـاو لـە قەباحـەت خراپـتـرە ، کـە ئـەویش ئەوەیـە کـە کەسـێك گوناهێك دەکـات، دوایی پاساوێك بۆ گوناهەکـەی دێنێتـەوە، خـراپتِرە لـە گوناهەکـەی، وەك دەڵـێن : جارێـك کـابرایەك دەسـتی بـە بـەدەنی کـابرایەك کـەوتوە، کابـرا گوتوویەتی: کاکە بۆچـی وادەکـەی ؟ ئـەویش گوتوویـەتی: داوای لێبوردنـت لێدەکـەم، وامزانی هاوسەرەکەمی، یانی : دەستی بە بەدەنی کەوتوە ، بەڵام دوایی کە پاساوی بـۆ هێناوەتـەوە ، خراپـتر بـووە لـە خـودی ڕەفتـارەکەی ، کـە کـابرای شـوبهاندوە بـە هاوسـەری خـۆی !

ئیبلیسیش دوای ئەوەی کە سـەرپێچیی کـرد، کە فەرمانی خـوا جێبـەجێ بکـات، گوتوویەتـی: من لـەو باشـترم، یانی: فەرمانەکەی تۆ لە جێی خۆیـدا نیـە، مانـای وایـە : سـەرپێچیی کـردوەو، سـەربارەش ویستوویەتی خـوای پەروەردگـار دان بـە هەڵـەی خـۆی دابێنـێ،کـە نـەدەبوو ئـەو فەرمانـەی بکردبایـە !! ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ ﴾، ئەوەت نەبینیوە کە بەسـەر مندا هەڵـتبژاردوە ! واتـە: شـتێکی زۆر بێجـێت کـردوە، ڕەخنە لە خـودی فەرمانەکەی خـواش دەگـرێ، کـە ئەوە بۆخـۆی گـەورەترە لە ئەسڵی سـەرپێچییەکە !

ئنجا با بزانیـن چۆن خـوای زانـاو شـارەزا باسی نەفرین لێـکردنی ئیبلیس و، پاشـان بڕیاری دەرکـرانی لە بـەهەشـت، دەردەکات بـەهـۆی سـەرپێچیی کردنیـەوە ؟!

١ / له سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (١٣) دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴾، واته: لێی دابەزە، لێی شۆڕ بەوە، کەواتە: گوناهکردن مایەی شۆڕبوونەوەیەو ، مایەی دابەزینە، لە کوێ بچێته خوار ؟ دەگونجێ ڕاناوەکە بۆ ئاسمان یان بۆ بەهەشت بچێتەوە، چونکە بەهەشت مێینە (مؤنث)ەو، ئاسمانیش (مؤنث)ە، هەردووکیان (مؤنث)ی (مجازي)ین، کەواتە : دەگونجێ مەبەست پێی بەهەشت بێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئاسمان بێ، کە بێگومان بەهەشتیش لە ئاسمانە، یانی : لە سەرەوەیە، خوا فەرمووی: لێی دابەزە، بۆت نیە لەوێدا خۆت بە زلبگری، لێی بچۆ دەرێ، تۆ لە زەبوونانی، لە سەرشۆڕانی.

٢ / لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ٣٤ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٣٥ ﴾، واته: (خوا) فەرمووی : لێی بچۆ دەرێ (لە بەهەشت، یان لە ئاسمان) بێگومان تۆ دەرکراوی، وە تۆ نەفرینت لێ بێ، تاکو ڕۆژی دوایی .

نەفرین (لعنة) یانی چی ؟ (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (اللَّعْنُ: الطَّرْدُ والإِبْعَادُ عَلَى سَبِيلِ السَّخَطِ، وَذَلِكَ مِنَ اللهِ تَعَالَى فِي الآخِرَةِ عُقُوبَةٌ وَفِي الدُّنيا انْقِطَاعٌ مِنْ قَبُولِ رَحْمَتِهِ وتَوفِيقِهِ)[1]، واته: (لَعْن) دەرکردنو دوورخستنەوەیە، بەشێوەی لێ تووڕەبوون، کە ئەوەش لە دوارۆژدا سزادانە لە لایەن خوای بەرزەوە، وە لە دنیادا، دابڕانە لە وەرگرتنی بەزەییو هاوکاریی خوا.

کە دیارە ئەوەش بژاردەی ئیبلیس خۆی بووە، کە دەڵێ: لێمگەڕێ، بمهێڵەوە، تاکو ڕۆژی دوایی، بۆ ئەوەی هەر خەریکی خراپەو سەر لێ تێکدانی وەچەی ئادەم بم.

---

١) مفردات ألفاظ القرآن ، ص ٧٤ .

٣ / لە سوورەتی (ص)دا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ٧٧ وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٧٨ ﴾، واتە: لێی بچۆ دەرێ، بێگومان تۆ دەرکراوی، وە نەفرینی منت لەسەر بێ تاکو ڕۆژی دوایی.

وەك تەماشا دەکەین ئەم ئایەتانە هەموویان پەیوەندییەکی تەواوکارییان پێکەوە هەیە :

أ ) کە خوا نەفرینی لە ئیبلیس کردووە لە ئایەتەکەی سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا ﴾، لێی دابەزە، شۆڕ بەوە، کەواتە: گوناهکردن مایەی شۆڕبوونەوەو مایەی دابەزینو هاتنە خوارەوەی ئینسانە، کە ئەوەش مانای هەم دابەزینی مەعنەویی دەگرێتەوە، هەم دابەزینی بەرهەستو ماددیی.

ب ) ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا ﴾، بۆت نیە لەوێ دا خۆت بە زلبگری، کەواتە: بەهەشت شوێنی خۆ بە زلگران نیە، یان ئاسمان شوێنی خۆ بە زلگران نیە، بەڵام پێشتر کە ئیبلیس لەوێ بووە، دیارە جارێ سیفەتی خۆ بە زلگرتنی تێدا دەرنەکەوتوە، بۆیە لەوێدا نیشتەجێ بووە.

ج ) وە کە دەفەرموێ:﴿ فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴾، بچۆ دەرێ تۆ لە زەبوونانی، کەواتە: گوناهو تاوان دەبێتە هۆی زەبوونییو سەرشۆڕیی ئینسان.

د ) وە لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴾، (رجیم) یانی : (مَرْجُوم) تۆ ڕەجم دەکرێی، بەردباران دەکرێی، دوور دەخرێیەوە ، ﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾، لە ئایەتەکەی سوورەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴾.

هـ ) وە لە سوورەتی (الحجر) دا خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ ﴾، بەڵام لە ئایەتەکەی سوورەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ ﴾، واتە:

لێرەدا دەریدەخات کە ئەو لەعنەتە هی خوایە ﷻ، (لَعۡنَتِيٓ)، هەڵبەتە جگە لە خوای بالادەست بەتەئکید فریشتەکانیش لەعنەتیان لێکردوە، بۆیە ئایەتەکەی سوورەتی (الحجر) بەگشتی هێناویەتی (عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ ) لەعنەتەکە هی کێیە ؟ هی خواو هی فریشتەکانیەتی، بەڵام لە ئایەتەکەی سوورەتی (ص)دا دەریدەخات کە لەعنەتی خوای دادگەرە، هەڵبەتە فریشتەکانیش لە خزمەتی خوای بەرزو مەزن دانو ، هەر کەسێك خوا لەعنەتی لێ بکات، بێگومان فریشتەکانیش لەعنەتی لێ دەکەن، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ :

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴾.

**<u>چواردەیەم</u>: داواکردنی ئیبلیس لە خوا کە هەتا قیامەت بیهێڵێتەوەو، وەلامدانەوەی داواکەی :**

ئیبلیس داوا دەکات تاکو قیامەت بهێڵرێتەوە، وە خوای پەروەردگار وەلامی داواکەی دەداتەوە، بەلام نەك تاکو قیامەت، بەڵکو تاکو ئەو کاتەی کە دنیا تێیدا کۆتایی دێ، وەك لە ئایەتەکاندا دەردەکەوێ :

١ - خوا لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: "ئیبلیس" گوتی: تاکو ئەو ڕۆژەی (مردووان) زیندوو دەکرێنەوە، بمهێڵەوە، (خوا) فەرمووی: تۆ لە هێڵدراوانی، لە هێڵدراوانی تا کوێ ؟ تاکو ئەو کاتەی خوا دیاریی دەکات، نەك تاکو ئەو کاتەی کە ئیبلیس داوای کردوە.

٢ - لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە : "ئیبلیس" گوتی: پەروەردگارم ! بمهێڵەوە تاکو ئەو ڕۆژەی زیندوودەکرێنەوە، (خوا) فەرمووی: تۆ لە هێڵراوانی تاکو ڕۆژی کاتی دیارییکراو.

ئایا ڕۆژی كاتی دیارییكراو كەیە ؟ ئەو كاتەیە كە دنیای تێدا كۆتا دێ، ئەو كەونو كائیناتەی تێدا تێكدەچێ، نەك ئەو كاتەی كە ئیبلیس داوای كردوە، كە كاتی زیندووكرانەوەی ئادەمیزادو جندە، بۆ لێپرسینەوەو سزاو پاداشت.

وەك دەبینین هەر كام لە ئایەتەكان گۆشەیەك، لایەك لە مەسەلەكە ڕوون دەكاتەوە، لە ئایەتەكەی پێشێدا تەنیا دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴾، بەلاَم دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴾، تاكو ڕۆژی كاتی دیاریكراو.

٣ - لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذۡهَبۡ فَمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمۡ جَزَآءٗ مَّوۡفُورٗا ﴿٦٣﴾﴾، واتە: ئەگەر تاكو ڕۆژی قیامەت بمهێڵیەوە زۆربەی وەچەی ئادەم لە ڕیشەوە دێنم، "واتە: هەڵیان دەخەڵەتێنمو، فریویان دەدەم"، (خوا) فەرمووی : بڕۆ هەر كامێك لەوان شوێنت بكەوێ، ئەوە دۆزەخ شوێنتانە (سزاتانە)، كە سزایەكی پڕ بە پێستە.

٤ - لە سووڕەتی (ص)دا دیسان باسی ئەو بابەتە دەكاتو، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٨١﴾﴾، "ئیبلیس" گوتی: ئەی پەروەردگارم ! تاكو ڕۆژەی زیندوو دەكرێنەوە، بمهێڵەوە، (خوا) فەرمووی : بڕۆ تۆ لە هێڵدراوانی تا كاتی ڕۆژی دیارییكراو.

ئنجا ئایا كاتی ڕۆژی دیارییكراو كەیە؟ وەك گوتم: ئەو كاتەیە كە دنیا تێیدا كۆتایی دێ، وە ئەو كاتە ئیبلیسیش كۆتایی پێ دێ، بەلاَم دوایی ئیبلیسیشو ئادەمو وەچەكەیو هەموو لایەك، زیندوو دەكرێنەوە بۆ سزاو پاداشت.

## پازدەیەم: هەڕەشەکردنی ئیبلیس کە جگە لە کەمێکیان لە وەچەی ئادەم هەموویان گومڕا بکات :

دوای ئەوەی کە خوای پەروەردگار بەو شێوەیە سزای ئیبلیس دەدات، ئەویش وەك تۆڵەسەندنەوە لەو ئادەمەی کە بەهۆی ڕێز لێ نەگرتنی ویەوە، سزادراو نەفرینی لێکرا، هەڕەشە دەکات کە وەچەی ئادەم هەموویان گومڕا بکاتو، لە ڕێی خوا لایان بدات.

### ئێستاش با سەرنجی پەیوەندیی تەواوکارییانەی ئایەتەکان بدەین :

١) لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ١٦ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ وَعَن شَمَآئِلِهِمۡۖ وَلَا تَجِدُ أَكۡثَرَهُمۡ شَٰكِرِينَ ١٧ ﴾، کە پێشتر تەفسیرمان کرد، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە لێرەدا فەرموویەتی : ﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي ﴾، (ئیبلیس) گوتی : بەهۆی ئەوەی کە منت بێ مرادو سەرگەردان کرد ! وەك ئەوە کە خوا فەرموویێتی : کڕنووش بۆ ئادەم مەبەو، بێ فەرمانیی من بکە ! دیارە هەموو ئەوانەی کە قەدەری خوا دەکەنە بیانوو بۆ گوناهەکانیان، هەموویان لەسەر ڕێڕەوی ئیبلیسن، کە گوناهێکت کرد، مەڵێ : قەدەری خوا وابوو، بڵێ : خەتای خۆم بوو، وەك ئادەمو حەووا، گوتیان : ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ ، واتە: گوتیان: پەروەردگارمان ! ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، نەك وەك ئیبلیس کە گوتی: خوایە ! تۆ پێت کردووم ! کەواتە : هەر کەسێك قەدەری خوا بکاتە بیانووی گوناهو هەڵەکانی، ئەوە لەسەر مەزهەبی ئیبلیسەو، لەسەر مەزهەبی

موشریكەكـانە، وەك خـوا لەبارەیانـەوە فەرموویـەتی : ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ﴿٣٥﴾﴾النحل، واتـە: وە ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خـوا دانا بوو، گوتیـان : ئەگـەر خـوا ویسـتبای نـە ئێمـەو، نـە بـابو باپیـرانمان هیـچ شـتێكمان نەدەكردە هاوبـەشی (خوا)، وە هیچ شـتێكمان قەدەغە نەدەكرد (لـەو شـتانەی كە بـەبێ بـەڵـگە قەدەغـەمان كـردوون)، یانـی : ئـەوە بـە ویسـتی خـوا بـووە، مەبەسـتیان ئەوە بووە كە خـوا ڕازییـە لـەو شـتانەی ئێمـە ! بـەڵام ئـەوە ڕاسـت نیـە، بـەڵـێ، هـەموو شـتێك بـە ویسـتی خـوایە، بـەڵام بێگـومان خـوا بـە زۆر هـەڵەو گونـاه بـە كەس ناكات، بـەڵكو خۆیان گونـاهو هەڵە هەڵدەبـژێرن، بـەڵام كـاتێك كە خۆیان دەیـانەوێ گونـاه بكەن، خـوای كـارزان ڕێیـان لـێ نـاگرێ ، وەك خـوا فەرموویـەتی : ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴿٣٠﴾﴾الإنسـان، واتـە: ناتانـەوێ تاكو خـوا نەیـەوێ، چونكە خـوا ویسـتوویەتی تـۆ بتـوانی شـتت بـوێ، بتـوانی چاكـە بكەیو خراپە بكـەی، ئـەو ویسـتە جوزئییـەی خـوا بـە تـۆی داوە، بـە ویسـتی ڕەهـای خـوا ئـەو ویسـت (إرادة)ە بـە تـۆ دراوە، بۆیـە تـۆ هەرچییەكی بیكەی، بـە ویسـتی خـوای بـەرزو مەزنـە، ئەگـەرنا خـوا بـە تۆبـزیی خراپـە بـە كـەس ناكـات، وە بەزۆر چاكـەش بـە كەس ناكـات.

٢) وە لـە سـوورەتی (الحجـر)دا لـەبارەی هەرەشـەی ئیبلیسـەوە، خـوا دەفـەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾﴾، واتـە: "ئیبلیـس" گـوتی: پەروەردگـارم ! بەهـۆی ئـەوەوە كە منـت گومڕا كـرد، خراپـەیان لـە زەویـدا بـۆ جـوان دەكـەم، وە هـەموویان تێكـڕا سـەرگەردانو مـاڵ وێـران دەكـەم، جگـە لـە بـەندە هەڵبـژاردەكانت (ئەو بـەندانەی كـە هەڵتبـژاردوون).

کەواتــە: کەسێك بــەندەی هەڵبــژاردەی خــوا بێ، شــەیتان زەفــەری پێ نابـات، هەڵبەتە خوێنراویشەتەوە : ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلِصِينَ﴾، واتە: جگە لەو بەندانەت کە خۆیان ساغ کردۆتەوە بۆ تۆ، دیارە خـوای کاربەجێش کەسێك ساغ ناکاتەوەو دەربازی ناکـات، تـاکو بۆخـۆی سـاغ نەبێ، خـوا خۆساغکـەرەوان (مُخْلِصِين) دەکاتە هەڵبژاردەو دەربازبووی خۆی (مُخْلَص)، لێرەدا ئیبلیس زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی ڕایدەگەیەنێ کە دەسەڵاتی بەسەر بەندە هەڵبژاردەکاندا نیە.

٣) وە لە سووڕەتی (الإسراء) ئـایەتی (٦٢)دا دەفەرموێ : ﴿لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلَّا قَلِيلًا﴾، واتە: ئەگەر تاکو ڕۆژی قیامەت بمهێڵیـەوە، وەچەکەی (ئـادەم) هـەموویان لەبـەین دەبـەم، جگە لە کەمێکیان.

ئەو کەمەی کە بـەندەی هـەڵبژاردەو ساغو ڕاستی خـوای پەروەردگارن، وشـەی (أَحْتَنِكَنَّ) دەڵـێ: (احْتَنَكَ الجَرَادُ الأَرْضَ : أَكَلَ مَا عَلَيْهَا وَأَتَى عَلَى نَبْتِهَا ﴿لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ﴾، قَالَ الفَرَّاءُ: لأَستَوْلِيَنَّ عَلَيْهِم)[1] لـە زمـانی عەرەبیـدا دەگـوترێ: (احْتَنَكَ الجَرَادُ الأَرْضَ) کوللە زەوی یەکـەی (احتناك) کـرد، واتە: هەرچی لەسـەری بوو، هەمووی خـوارد، وە هەرچی سـەوزایی لەسـەری بـوو ، هـەمووی لـە ڕیشـەوە خـوارد، کـە دەڵـێ: (لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ) فـەڕراء گوتوویـەتی: دەیـانخەمە ژێر ڕکێفی خۆمـەوەو گومڕاو سـەرگەردانیان دەکـەم.

٤) وە لە ئـایەتەکانی : (٨٢ - ٨٣) سووڕەتی (ص)دا خـوای پـەروەردگار بـەو شـێوەیە ئەو مەسـەلەیە باس دەکات: ﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾﴾، واتـە: "ئیبلیس" گوتی: سوێند بـە عیـززەتی تـۆ : هەموویـان گومڕا دەکـەم، جگـە لەوانەی کە بەندەی هەڵبـژاردەی تـۆن .

١) مختار الصحاح ، ص ١٥٢.

کەواتـە : ئیبلیس هەڕەشـەی خـۆی کـردوە، بـەڵام لەگـەڵ هەڕەشـەکەشـیدا، خـۆی پاراستوە لەوە کە درۆ بکات، ئەوەش زۆر جێی سـەرنجە، نـەیگوتوە هـەموویان گـومڕا دەکـەم، چونکە زانیـویەتی هـەموویانی بۆ گومڕا ناکـرێ !

وە لـــە شــــوێنێکی دیکـــەدا دەڵـــێ: ﴿ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴾، واتـــە: زۆربـەیانت سوپاسگوزار دەسـت ناکەوێ، ئەمـەش ئـەوەی لـێ وەردەگیـرێ کـە دەبـێ ئینسان خۆی لە شتێك بپارێزێ، کە ئیبلیسیش خۆی لـێ پاراسـتوە، کـە بریتیـە لـە درۆ، درۆ سـیفەتێکی زۆر خراپە، کە تەنانەت ئیبلیسش خۆی پاراسـتوە کـە درۆیـەکی وا زەق بکات، هـەموو کەس بزانـێ درۆیە.

وە خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (سبأ) لـە ئـایەتی ژمـارە (٢٠)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾، واتــــــــە : وە بێگومـان "ئیبلـیس" گومـانی خـۆی دەربـارەی مرۆڤەکـان ڕاسـت بـردە سـەر، (گومانەکـەی ڕاسـت دەرچـوو)، هـەموویان شوێنیکـەوتن، جگـە لـە دەسـتەیەك لـە ئیمانداران، دیـارە ئەویش هـەر وای گوتبوو، گوتبووی: هەموویـان گومڕا دەکەم، جگە لە کەمێکـیان لەوانـەی کـە بـەندەی هەڵبـژاردەی تـۆن، دیـارە بـەندە هەڵبژاردەکـانی خـوا، ئیبلـیسیش یەخـەی لەبـەر دادڕیـون، ئیبلـیسیش لـە بـەرانبـەریـاندا دەسـتەو ئەژنۆیـەو دەستە پاچـەیە.

کەواتە: با هەوڵبدەین ، ئیخـلاص‌و ساغیـی‌و ڕاستیی لەگەڵ خـواداو بـەندایەتیی ڕاسـت بـۆ خـوا زیـاتر لـە خۆمانـدا بێنینـە دی، تـاکو ئیبلیسیش لـە بـەرانبـەرماندا دەسـتەو ئەژنـۆ بـێ‌و، لە بـەرانبـەرماندا بـە چۆك دابـێ.

ئنجا پێویسته سـەرنجێکی دیکە لەم ئـایەتە موبارەکە بـدەین، کـە ئیبلیس دەڵـێ: ﴿ ثُمَّ لَآتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴾، واتـە : بۆیان دێم لە پێشیانەوەو لە دوایانـەوەو، لـە لای ڕاستیانەوەو لە لای چەپییـانەوە، کەواتە: ئێمە کوێمان بـەدەستەوە مـاوە ؟ شـەیتـان

دەتوانێ لە چوار لاوە زەفەرمان پێ ببات، لە پێشەوە بۆمان بێ، وە لەلای دواوەش، وە لەلای ڕاستیش، وە لەلای چەپیش، بەڵام لای سەرەوەو لای خوارەوەمان بەدەستەوە ماون : پاڕانەوە (دعاء)و کڕنووش بردنو بەندایەتییو ملکەچیی بۆ خوا، بۆیەش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٤٤٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٨٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٨٧٥)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (١١٣٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٩٢٨)، وَالحَاكِمُ برقم: (٩٦٩)}، واتە: لە کاتێکدا بەندە کڕنووشی بردوە، لە هەموو کاتێك لە خوا نیزیکترە.

هەڵبەتە کاتێك لە خوا نزیك بی، شەیتان زەفەرت پێ نابات.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دووعا کردن زۆر فەرمایشتی فەرموون، یەکێك لەوانە: ﴿الدُّعَاءَ هُوَ الْعِبَادَةُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٤١٥)، وَابْنُ أَبي شَيْبَة برقم: (٢٩١٦٧)، وَالبُخَارِيُّ في "الأدب المفرد" برقم: (٧١٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٤٧٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٦٩) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسائِي في "الكبرى" برقم: (١١٤٦٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٢٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٩٠) ، وَالحَاكِمُ برقم: (١٨٠٢) وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد، وَالبَيْهَقِيُّ في "شعب الإيمان" برقم: (١١٠٥)}، واتە: پاڕانەوە بریتییە لە بەندایەتیی تەواوو ڕاستەقینە (بۆ خوای پەروەردگار) .

کەواتە: ئێمە لای سەرەوەمان بە دەستەوەیە، بۆ ئەوەی دیفاعی پێ لە خۆمان بکەین لە بەرانبەر ئیبلیسدا، وە لای خوارەوەشمان بە دەستەوەیە.

هەروەها خوا لەسەر زمانی بەندەکانی لە سووڕەتی (الفاتحة)دا دەفەرموێ:

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾، تەنیا بۆ تۆ ملکەچ دەبین، سەرمان بۆ تۆ دەخەینە سەر زەوی‌و، کڕنووشت بۆ دەبەین، وە ڕکووعت بۆ دەبەین، وە بۆ تۆ ملکەچ دەبین بەگشتی لە ژیانماندا، ﴿وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾، وە یارمەتی تەنیا لە تۆ دەخوازین، کەواتە: ئەگەر شەیتان لە چوار لاوە بۆمان دێ، ئێمەش دوو لای گرنگمان بەدەستەوە ماون، کە شەیتان ناتوانێ لەو دوو

لایەوە بۆمان بێ، ئەوانش پەنابردن بۆ خـواو، پاڕانـەوە لـە خـوا، وە کڕنـووش بـۆ خوا بـردنو بـەندایەتیـیو مل کەچیـی بۆ خـوا ﷻ.

**شـازدەیـەم: مۆڵـەت دانـی خـوا بـۆ ئـیبلـیس کـە چـی لەدەسـت دێ ، دژی ئـادەمو وەچـەکەی بیکـات ، وە هـەواڵ پـێدانیشـی کـە زەفـەر بـە بـەندەکـانی نابـاو، وە هەڕەشـە لێکـردنیـشی بـە دۆزەخ :**

دیارە دوای ئەوەی کە ئیبلیس ئاوا هەڕەشـە دەکات، دوای ئەوەی کـە داوای مۆڵـەت، دەکـات ، خـوای پەروەردگار وەڵامی دەداتەوە، با سـەرنج بدەیـن :

١ / لـە سـووڕەتی (الأعـراف) لـە ئـایەتی (١٨) دا دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ ٱخۡرُجۡ مِنۡهَا مَذۡءُومًا مَّدۡحُورًاۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾، واتـــــــــە: (خـوا) فـەرمووی : لێـی بچـۆ دەرێ (لـە بـەهەشـت، یـان لـە ئـاسـمان) بـە زەمـکراویـیو بـە دەرکراویـی، هـەر کەسێك لـەوان، "واتـە : لـە وەچـەی ئـادەم" شـوێنت بکـەوێ، دۆزەخ لـە تـۆو لـەوان پڕ دەکـەم.

٢ / وە لـە سـووڕەتی (الحجـر)دا خـوای پەروەردگـار دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ۝٤١ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ۝٤٢ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ۝٤٣ لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ۝٤٤ ﴾، واتـە: (خـوا) فـەرمووی : ئەمـە ڕێیـەکی ڕاسـتە لەسـەر مـن، کـە بـەندەکـانی مـن تـۆ دەسـەڵاتت بەسـەریاندا نیـە، جگـە لەوانـەی کـە لـە بـێ بـەختانو لـە سـەرگەردانان شـوێنت دەکـەون، وە بێگومـان دۆزەخ بـەڵێنگـەی هەمووتـانـە "واتـە: ئـەوێ شـوێنو کـاتی دیاریی کراوتانـە"، دۆزەخـیش حـەوت دەرگـای هـەن، بـۆ هـەر دەرگایەکیـان (بـۆ هـەر دەروازەیەکیـان) بـەشێکی دیاریکـراو لە خەڵك هەیـە.

کەواتە: لە بەرانبەر هەڕەشەی ئیبلیس دا، کە وەچەی ئادەم هەموویان گومڕا دەکات، خوای دادگەریش هەڕەشەی لێ دەکات.

٣ / وە لە سوورەتی (الإسراء)دا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ قَالَ ٱذۡهَبۡ فَمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمۡ جَزَآءٗ مَّوۡفُورٗا ﴿٦٣﴾ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ وَعِدۡهُمۡۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٞۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلٗا ﴿٦٥﴾ ﴾ دوای ئەوەی شەیتان داوای مۆڵەت دەکات، (خوا) فەرمووی : بڕۆ، هەر کەسێك لەوان شوێنت بکەوێ، دۆزەخ سزاتانە، سزایەکی پڕ بە پێست، (سزایەکی تەواو، کە بەشی هەمووتان دەکات) وە تۆش هەر کامێك لەوان لە تواناتدا هەیە، بە خوتخوتەو دەنگی خۆت هەڵیانخەڵەتێنە، وە سوارەو پیادەی خۆتیان لە دژ بەکار بێنە، وە لە ماڵو منداڵیاندا هاوبەشیان بە، وە بەڵێنیان پێ بدە، وە شەیتان جگە لە فریودان هیچ بەڵێنێکیان پێنادات، بێگومان بەندەکانی من تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا نیە، وە پەروەردگارت بەسە سەرپەرشتیار بێ .

کەواتە: هەر کەسێك خوا بکاتە وەکیلی خۆی، یان پشت بە خوا ببەستێت ، شەیتان زەفەری پێ نابات.

٤ / وە لە سوورەتی (ص)دا خوا ﷻ لە وەڵامی هەڕەشەی شەیتان دا دەفەرموێ:

﴿ قَالَ فَٱلۡحَقُّ وَٱلۡحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾، واتە: (خوا) فەرمووی : سوێند بە هەقو تەنیا هەقیش دەڵێم : دۆزەخ لە تۆو لەوانەی کە لەوان شوێنت دەکەون، تێکڕا لێیان پڕ دەکەم، کەواتە: وەك چۆن شەیتان هەڕەشەی کرد، خوای باڵادەستیش

هەڕەشەی کردوە، وە ئیبلیس بە کردەوە هەڕەشەکەی خۆی جێبەجێ کردوە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ ﴾، بێگومان شەیتان گومانەکەی خۆی بەرانبەر مرۆڤەکان ڕاست بردە سەر، ﴿ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، هەموویان شوێنی کەوتن جگە لە دەستەیەك لە ئیمانداران ، ئەو دەستە ئیماندارەی کە بەندەی ساغو ڕاستو چاکن بۆ خوا، شەیتان زەفەریان پێ نابات.

ئنجا ئیبلیس کە هەڕەشەی کردو خوای پەروەردگاریش هەڕەشەی لێکردووە، کە هەڕەشەی خوای پەروەردگار بێگومان هەم لە دنیادا دێتە دێ، کە بەندە چاکەکانی خوا، شەیتان دەسەڵاتی بەسەریان دا نیە، وە هەم لە قیامەتیش دا دێتە دێ، کە سزایەکەی دەبینین، هەم بۆ ئیبلیس، وە هەم بۆ ئەو کەسانەی کە شوێنی ئیبلیس دەکەون، چ لە وەچەی خۆی، چ لە وەچەی ئادەم .

**حەڤدەیەم: ئاگادارکردنەوەی خوا بۆ ئادەمو حەووا ( عليهما السلام ) لە دوژمنایەتیی ئیبلیس :**

دیارە خوا ﷻ ئادەمو حەوواو لە پەنای ئەوانەیش دا وەچەکەشیانی ئاگادار کردۆتەوە، کە ئیبلیس دوژمنیانە، با سەرنج بدەین :

١ - لە سووڕەتی (الأعراف)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: وە پەروەردگاریان بانگی کردن : ئایا قەدەغەم نەکردن لەو درەختە، وە پێشم نەگوتن کە شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە ؟!

٢ - وە لە سووڕەتی (طه) ئایەتی (١١٧)دا دەفەرموێ: ﴿ فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴾، واتە: ئنجا گوتمان: ئەی ئادەم ! ئەمە "ئەم ئیبلیسە کە دیارە خوا ئیبلیسی پێشانی

ئادەم داوە لەو کاتەدا، یاخود ئەو ئیبلیسەی کە بۆم پێناسە کردووی"، دوژمنە بۆ تۆش‌و بۆ هاوسەرەکەشت (و بۆ وەچەکەشت) وریابن لە بەهەشت دەرتان نەکات ، کە تووشی ژیانی تاڵ‌و گوزەرانی زەحمەت‌و قورس ببن لە زەوی دا.

لە بەهەشتدا هەموو شتێکتان بۆ دەستەبەر کراوە، بەبێ ماندووبوون‌و سەغڵەتیی، بەڵام ئەگەر بێت‌و لە بەهەشتێ دەرتان بکات ، تووشی ژیانی پڕ مەشەققەت دەبن‌و ، دەبێ بە ئارەقەی نێوچەوانی خۆتان ژیان بگوزەرێنن، کە دیارە هەر ئاواشیان بەسەر هات .

**هەژدەیەم: نیشتەجێکردنی خوا بۆ ئادەم‌و حەووا ( علیهما السلام ) لە بەهەشتداو دەست ئاوەڵاکردنیان بۆ لێ بەهرەمەند بوونی‌و ، ئاگادارکردنەوەیان لە خواردن لە درەختە قەدەغە کراوەکە :**

پێشێ خوا ﷻ ئادەمی ئاگادارکردەوە کە ئەوە شەیتان بۆ ئێوە دوژمنەو ئاگاتان لێی بێ، ئنجا دوای ئەوە خوای بەخشەر ئادەم‌و حەووای لە بەهەشتدا نیشتەجێ کردن، وە دەستیشیانی ئاوەڵاکرد ، کە بە کەیفی خۆیان ڕابوێرن‌و بگوزەرێنن‌و لە هەموو میوەو بەرهەمەکانی بەهەشت بخۆن، جگە لە درەختێکی دیارییکراو، با سەرنج بدەین :

١) وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتی (٣٥)دا دەفەرموێ:

﴿ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، واتە:" وە فەرموومان ئەی ئادەم ! تۆو هاوسەرەکەت لە بەهەشتدا نیشتەجێ بن، وە بە کەیفی خۆتان بە فراوانیی لێی بخۆن لە هەر شوێنێك دەتانەوێ (لە هەر درەختێك‌و بەرووبوومێکی بخۆن)، بەڵام توخنی ئەم درەختە مەکەون ، ئەگەرنا لە ستەمکاران دەبن .

٢) وە لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (١٩)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ

﴿ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، كە، هەر هەمان تەعبیرە ، تەنیا وشەی ﴿ رَغَدًا ﴾ی تێدا نیە، وە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَكُلَا ﴾و نەیفەرمووە: ﴿ وَكُلَا ﴾، واتە : وە ئەی ئادەم! تۆو هاوسەرەكەت لە بەهەشتدا نیشتەجێ بن، یەكسەر هەرچی حەزتان لێیە، (هەر میوەیەك) لێی بخۆن، بەڵام توخنی ئەم درەختە مەكەون، ئەگەرنا لە ستەمكاران دەبن.

ئنجا زانایان دەڵێن: لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَكُلَا ﴾، بەڵام لەوێ فەرموویەتی: ﴿ وَكُلَا ﴾، (و) واو بۆ (عَطْف)ە ، واتە: بخۆن، بەڵام لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ فَكُلَا ﴾، واتە: هەر كە نیشتەجێ بوون ، ڕاستەوخۆو دەستەبجێ بۆتان هەیە لێی بخۆن، ئەوەی پێشێ تەنیا ئەوەی لێ دەفامرێتەوە، كە بۆیان هەیە لێی بخۆن، ئنجا ئایا دەستبەجێ بێ، یان دوای ماوەیەكی دیكە؟ ئەوەی لێ وەرناگیرێ، بەڵام لە ئایەتەكەی سوورەتی (الأعراف) ئەو دەستبەجێ خواردنەی لێ دەفامرێتەوە، چونكە (ف) بۆ (تَعْقِيب)ە، یانی : یەكسەر دوای ئەوەی كە نیشتەجێ بوون، ئەوە بۆ ئێوە ڕەوایە لێی بخۆن .

وە لە ئایەتەكەی سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ﴿ رَغَدًا ﴾، واتە: بە فراوانیی و، هیچ شتێكتان لێ قەدەغە نیە، هەرچەندەی پێتان دەخورێ، بیخۆن، بەڵام ئایەتەكەی سوورەتی (الأعراف) وشەی ﴿ رَغَدًا ﴾ی تێدا نیە.

٣) ئنجا لە سوورەتی (طه)دا ، هەر لەوبارەوە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ ﴾، واتە:

ئنجا گوتمان ئەی ئادەم ! ئەمە دوژمنە بۆخۆتو بۆ هاوسەرەکەت، (وریابن !) لە بەهەشتێ دەرتان نەکات، تووشی ژیانی نارەحەتو تەنگو تاڵو گرفتاریی دەبن، (واتە: ژیانی سەر زەوی) ﴿ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ ﴾، تۆ بۆت هەیە لە بەهەشت دا نە برسی بی ، نە ڕووت بی ، (وا دیارە لە بەهەشتدا پۆشتە بوون) ﴿ وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ ﴾، وە تۆ نە تینووت دەبێ، نە گەرماشت دەبێ، (واتە: لە هیچ شتێکت کەم نیە لە بەهەشتداو، هەوڵبدە ئەو ژیانە خۆشە، ئەو بەختەوەرییە لەدەست خۆتو خێزانت نەدەی، بەهۆی گوناهو تاوانێکەوە، کە بەهۆی فریودانی شەیتانەوە تووشی دەبی) بەلام ئایا ئادەمو هاوسەرەکەی توانیان ئەو فەرمانەی خوا نەشکێننو، لەو درەختە قەدەغەکراوە نەخۆن ؟ نەخێر .

**نۆزدەیەم: دنەدانو خوتخوتە کردنی ئیبلیس بۆ ئادەمو حەووا ، کە لە درەختە قەدەغە کراوەکە بخۆن، وە تەماع وەبەرنانیان کە لە ئەنجامی لێخواردنیاندا دەبنە فریشتەو هەرماو، وە موڵکێکی لە نەبن نەهاتوویان چنگ دەکەوێ، وە سەرگرتنی پیلانەکەی :**

١ / لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتی (٣٦)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ﴾، واتە: شەیتان خلیسکاندنیو لەو بەهەشتە، وەدەرینان وەك بڵێی : پێی وەبەرپێی نان ، یاخود سابوونی لە بن پێیان دانو خلیسکاندنیو ﴿ فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ﴾، وە دەری نان لەو نازو نیعمەتەی کە تێیدابوون.

٢ / ئنجا لە سوورەتی (البقرة)دا تەنیا دەفەرموێ: خلیسکاندنیو هەڵیخەڵەتاندن، بەلام لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی : (٢٠ تا ٢٢)دا ، بە تەفصیلٚ باسی چۆنیەتی ئەو خلیسکاندنو هەڵخەڵەتانەمان بۆ دەکاتو ڕوونی دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ فَوَسۡوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ لِيُبۡدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن

سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ ۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: شەیتان خوتخوتەی بۆ کردن، تاکو ئەوەی کە لێیان پەنهانە لە عەورەتیان {لەو ئەندامانەی جەستەیان کە حەز ناکەن ببینرێن} بۆیان دەربخات، {لە ئەنجامی خواردنیان لەو درەختە قەدەغەکراوەدا ، عەورەتیان دەربکەوێ}، وە پێی گوتن: پەروەردگارتان تەنیا بۆیە ئەو درەختەی لێ قەدەغە کردوون ـ کە لێی بخۆن ـ تاکو نەبنە دوو فریشتە، یاخود لە هەردەم ژیاوان و هەر ماوان نەبن، {ژیانێکی هەمیشەییتان دەست نەکەوێ}، وە سوێندی بۆ خواردن کە من بۆ ئێوە لە دڵسۆزان و بە تەنگەوە بووان و پەرۆشانم، سەرەنجام بە فریودان شۆڕی کردنەوە {بە چاڵی لادان و گوناهدا}، وە هەر کە لە درەختەکەیان تامکرد {لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: کە لێیان خوارد، ئنجا ئەگەر ئەمەی ئێرە نەبێ، لەوێ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە تەواو لێیان خواردوە، ئنجا عەورەتیان بۆیان وەدەرکەوتوە، بەڵام لێرەدا ئەمە دەردەخات کە هەر کە لێیان تامانەوە، تامیان کردوەو لەنێو زاریان دا دایاننــاوە، یەکسەر عەورەتیان بۆیان وەدەرکەوتوە}، وە یەکسەر دەستیان کرد بە بەخۆوە لکاندنی گەڵای درەختەکانی بەهەشت {تاکو عەورەتی خۆیانی پێ بشارنەوە}.

٣ / وە لە سوورەتی (طه) لە ئایەتەکانی : (١٢٠ - ١٢١)دا جارێکی دیکە تیشك دەخاتە سەر ئەم بابەتەو دەفەرموێ: ﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنْهَا

فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴾، واتە: شەیتان وەسوەسەی بۆ لا کرد،

{لێرەدا تەنیا باسی ئادەم دەکات : شەیتان خوتخوتەی بۆ ئادەم کرد :

﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ﴾ ئنجا لە سوورەتی (الأعراف) دا دەفەرموێ:

﴿ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ﴾، وەسوەسەی بۆ کردن، بەلام لێرەدا دەفەرموێ:

﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ﴾، وەسوەسەی بۆ فڕێدا، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە لە دوورەوە دنەی دابێو خوتخوتەی خستبێتە دڵی ئادەمەوە}، گوتی: ئەی ئادەم ! ئایا درەختی هەمیشەییت پێشاندەم {هەر کەسێك لە بەرەکەی بخوات بە هەمیشەیی بمێنێتەوەو لە بەین نەچێ}، وە موڵکێكو دەسەڵاتێکت پێشاندەم کە هەرگیز لە بەین نەچێ ؟، {واتە: لەو درەختە بخۆ ئەوەت دەست دەکەوێ} ئنجا هەردووکیان لێیان خوارد، وە عەورەتی خۆیانیان بۆ دەرکەوت، وە دەستیان کرد بەوە کە گەڵای درەختەکانیان بە بەدەنی خۆیانەوە لکاند، {یاخود بە پاشو پێشی خۆیانەوە لکاند، وەك زۆر لە توێژەرەوان وا دەڵێن}، وە ئادەم سەرپێچیی فەرمانی پەروەردگاری کردو تووشی ژیانی ناڕەحەتیی بوو.

﴿ فَغَوَىٰ ﴾، واتە: بێ مراد بوو بێ ئاکام بوو سەرگەردان بوو.

دیارە ئێمە بوارمان نیە زۆر هەڵوەستە بکەین لە بەردەم ئەم ئایەتانەدا، کە هەر کامێکیان وەك گوتم : گۆشەیەكو ڕوویەکی بابەتەکە باس دەکات، بەپێی ئەو سیاقەی کە ئەو ئایەتانەی تێدا هاتوون، بەلام ئەوەی بۆمان دەردەکەوێ لەم ئایەتانە، ئەوەیە کە ئامانجی ئیبلیس ئەوە بووە : ئادەمو حەووا عەورەتی خۆیانیان بۆ دەربکەوێ؟ ئنجا ئایا دەبێ ئەمە چۆن بوو بێ ؟

أ ) هەندێك دەڵێن: پۆشاکێکی نوورینیان لەبەردا بووەو لە ئەنجامی ئەو گوناهەدا، پۆشاکە نوورینەکەیان لێ کەوتۆتە خوار، یانی : پۆشاکێکیان

لەبەردابووە، بە پێی یاسای خوای پەروەردگار، ئەو پۆشاکە بەهۆی گوناهەوە لە ئینسان داکەنراوە، یاخود لەبەرچاویان نەماوە .

ب) هەندێکیش دەڵێن: عەورەتی خۆیانیان نەبینیوە، تاکو لە درەختەکەیان خواردوە.

ج) وە هەندێك دەڵێن: دوای ئەوەی کە لە درەختەکەیان خواردوە، ئەو درەختە وا بووە کە پاشەڕۆك لە ئینساندا پەیدا بکات، بۆیە عەورەتی خۆیانیان بینیوە.

بە هەر حاڵ، گرنگ ئەوەیە دوای ئەوەی لەو درەختەیان خواردوە، عەورەتیان دەرکەوتوە، وە ئیبلیسیش ئامانجی ئەوە بووە، کە عەورەتی خۆیانیان بۆ دەربکەوێ، بە هۆی ئەو گوناهبارییەوە، عەیبیشیان دەربکەوێ، وە هەمیشەی گوناهباریی عەیبدارییشی بە دواوەیە، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە هەمیشە گوناهباریی قیامەت، عەیبداریی دنیاشی بەدواوەیە.

ئنجا ئایا شەیتان بیانووەکەشی چی بووە ، واتە: چۆن هەڵی خەڵەتاندوون؟

گوتوویەتی: ﴿ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴾، پەروەردگارتان بۆیە ئەم درەختەی لێ قەدەغە کردوون ، کە نەبنە فریشتەو، نەبنە هەر ژیاوو هەر ماوو، وەك لە سوورەتی (طه)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴾، گوتی : ئەی ئادەم ! ئایا درەختێکت پێشانبدەم، ئەگەر لێی بخۆی ، هەمیشە هەر بمێنیەوە، وە موڵکێکت دەستکەوێ هەرگیز لەبەین نەچێ ؟

ئنجا ئایا شێوازی فریودانەکەی چۆن بووە ؟

لە سوورەتی (طه)دا ڕوونی دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾، سوێندی بۆ خواردن کە من لە دڵسۆزانم بۆ ئێوە، زۆر بەتەنگی ئێوەوەمو، زۆر بە خەمم بۆ ئێوە ، لەولاوە خۆی پاراستوە لە درۆ،

بەلاَم لێرەدا درۆیەکی زۆر گەورەی کردوە، چونکە بەو درۆیە نەبووایە ، دیارە نەیدەتوانی ئادەمو حەووا فریودا ، وە هەمیشە وەسوەسەی شەیتان درۆیە ، وەسوەسەی شەیتان بۆ مرۆڤەکان درۆیەو هەلْخەلاَتاندنە، وە پێچەوانەی مەبەستی ئینسانیشە ! چونکە: ئەگەر ئادەمو حەووا (عليهما السلام) لە درەختەکەیان نەخواردبایە، ئەو کاتە وەك دوو فریشتە لە بەهەشت دا دەمانەوە، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە پێی گوتن !

ئیبلیس گوتی: ئەگەر لێی بخۆن دەبنە دوو فریشتەو لە بەهەشت دا دەمێننەوە، بەلاَم بە پێچەوانەوە : ئەگەر لێیان نەخواردبایە ، هەمیشە وەك دوو فریشتە دەمانەوە، کە لێیان خوارد ، دەرکران ، ئنجا هەمیشەش هەروایە ئیبلیس زینا لەبەرچاوی خەلْك جوان دەکات، قەتلْیان لەبەرچاو جوان دەکات، دزیی، خیانەت، گەندەلْیی، زولْم، شیركو کوفر، نیفاق ، کە هەموو ئەو شتانە دەردو نەخۆشییو میکرۆبن بۆ مرۆڤ ، بۆ دنیاو قیامەتی، بۆ دنیا مایەی عەیبداریین، بۆ قیامەتیش مایەی گوناهبارییین، واتە : ئەوەی کە ئیبلیس پێت دەلْێ: چاکەو جوانە ، بە پێچەوانەوە : خراپو دزێوە، وە ئەوەی کە ئیبلیس لە سەر دلْت قورس دەکات ، کە طاعەتی خواو بەندایەتیی خوایە : ڕاستییە، ساغییە، چاکییە، بەلْێ قورسە، وە ئیبلیس لەسەرت قورس دەکات، بەلاَم ئەوەی کە ئیبلیس لەبەرچاوت قورس دەکات ، بۆ تۆ خێرە ، وە ئەوەی لەبەرچاوت جوان دەکات ، خراپەیە، ئێمەش هەر لە دایكو بابمانەوە، لە ئادەمو حەوواوە دەبێ ئەو پەندە وەربگرین، وە ئەو دەرسە فێر ببین.

٤ / ئنجا کە دەفەرموێ: (فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ ) شۆڕی کردنەوە بە فریودان، کەواتە: فریوی دانو هەلْی خەلْەتاندن، هەلْبەتە ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە دەبێ ئیبلیس ڕووبەڕوو لەگەلْ ئادەمو حەوواوادا قسەی کرد بێ، چونکە ﴿ وَقَاسَمَهُمَآ ﴾، سوێندی بۆ خواردن، ئەوە بە شێوازی وەسوەسە نابێ، هەلْبەتە خوتخوتەو وەسوەسەشی خستۆتە دلْیان، بەلاَم واش پێدەچێ لە شێوەی مرۆڤێکدا، یان لە شێوەی فریشتەیەکدا، چووبێتە بەرچاویان، وە ڕووبەڕوو قسەی لەگەلْدا

کردبن، چونکە : هەم ڕستەی : ﴿ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾، وە هەم ڕستەی : ﴿قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ ﴾، هەر کامێکیان لێی وەردەگیرێ، کە دەبێ ئیبلیس ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵ ئادەمو حەووادا کردبێ، وێڕای ئەوەی کە بە شێوەیەکی پەنهانیش دنەی داونو خوتخوتەی بۆ کردوون، ڕووبەڕووش دەبێ چووبێتە بەرچاویانو ئاخاوتنو قسەی لەگەڵدا کردبن، کە دیارە خوای پەروەردگاری بۆ تاقیکردنەوەی ئادەمو حەووا ئەو توانایەی داوەتە ئیبلیس.

**بیستەم: خواردنی ئادەمو حەووا لە درەختە قەدەغەکراوەکەو ، دەرکەوتنی عەوڕەتیان و ، خۆ دا پۆشینیان بە گەڵای درەختو ، بڕیاری دەرکرانیان لە بەهەشت :**

١ ) خوا ﷻ لە سوورەتی (طه) لە ئایەتی (١٢١)دا دەفەرموێ : ﴿ فَأَكَلَا مِنۡهَا فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴾، واتە: ئنجا کە لێیان خوارد ، عەیبو عاری خۆیانیان بۆ دەرکەوت ، وە دەستیان کرد بە بەخۆوە لکاندنی گەڵای (درەختەکانی) بەهەشت ، وە ئادەم سەرپێچیی لە فەرمانی پەروەردگاری خۆی کردو ، تووشی گرفتاریی‌و بێمرادیی بوون.

٢ ) وە لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (٢٢)دا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِ ﴾، واتە: ئنجا هەر کە لە درەختەکەیان چێشت، {واتە : لە میوەی درەختەکەیان چێشتو، یان لەبەری درەختەکەیان چێشت ، تەنیا خستیانە دەمیان} عەیبی خۆیانیان بۆ دەرکەوت، وە دەستیان کرد بە بەخۆوە لکاندنی گەڵای درەختەکانی بەهەشت .

ئنجا ئەوەی جێی سەرنجە لێرەدا : خوا ﷻ باسی ئادەمو حەووا پێکەوە دەکات، کە لە درەختە قەدەغەکراوەکەیان خواردوە، نەك حەووا لێی خواردبێ‌و ئادەمی فریو دابێ، وەك لە تەوڕاتدا هاتوە، کە هەندێك لە کۆلکە عەلمانییەکانی خۆمان، ئەوانەی کە شارەزای کتێبەکانی جوولەکەو نەصرانییەکان نین، وە لە قورئانو ئیسلامیش لە بەهانەن، وە لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای ئیسلام دەکەن، وە نەشارەزاو کۆڵەوارن، دەڵێن: تەماشا بکەن ! ئیسلام، چۆن بە کەم تەماشای ئافرەت دەکات ! دەڵێ : ئافرەت سەرچاوەی گوناهەو، ئافرەت بوو کە ئادەمی فریودا !

نازانن کە ئەوە قسەی ئەو تەواراتەیە، ئەو پەیمانی کۆنەیە، کە جوولەکەو نەصرانییەکانی ڕۆژئاوا، کە کۆلکە عەلمانیەکانی خۆمان کردوویانە بە قیبلەی خۆیان، وە هەر شتێك لەوێوە بێ، بەبێ قەیدو مەرج وەریدەگرن، بێ ئەوەی لێی بکۆڵنەوە، ئەو قسەیە لەو پەیمانی کۆنەدا هاتوە، نەك لە قورئانی ئێمەدا، دیارە ئەو پەیمانی کۆنەش‌و ئەو تەوراتەش، بە تەئکید دوای گۆڕان‌و دەستکارییکرانی، ئەوەی تێدایە، ئەگەرنا کتێبەکانی خوا، هەموویان زانیاریی ڕاستیان تێدایە، وە خوای پەروەردگار کە لە قورئاندا دەفەرموێ : ئادەمو حەووا پێکەوە لە درەختەکەیان خوارد، دیارە هەر ئەوە ڕاستە، نەك ئەوەی لە تەوراتدا هاتوە، کە کاتی خۆی ڕۆمو ڕۆژئاواییەکان لە ژێر کاریگەریی تەوراتی گۆڕدراوو ئینجیلە گۆڕاوەکاندا، ڕاوبۆچوونی بە کەم تەماشاکردنی ئافرەتیان بۆ دروستبووە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی کتێبە دەستکارییکراو گۆڕاوەکانیان، بەڵام لە ئیسلامدا شتێکی وامان نیە، با تەماشا بکەین :

لە قورئاندا وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا ، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَكَلَا مِنْهَا ﴾، ﴿فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا ﴾، ﴿ فَأَكَلَا مِنْهَا ﴾، واتە: هەردووکیان لێیان خوارد، هەردووکیان لێیان چێشت پێکەوە.

بەڵام لە تەوراتدا ئاوا هاتوە: (وَكَانَتِ الْحَيَّةُ أَمْكَرَ وُحُوشِ الْبَرِّيَّةِ الَّتِي صَنَعَهَا الرَّبُّ الإِلَهُ فسألَتِ الْمَرْأَةَ : أَحَقّاً أمركُمُ اللهُ لاَ تَأْكُلاَ مِنْ جَمِيعِ شَجَرِ الْجَنَّةِ؟ فَأَجَابَتِ الْمَرْأَةُ يمكننا أَن نَأْكُلُ مِنْ ثَمَرِ شَجَرِ الْجَنَّةِ كُلِّهَا ما عدا ثَمَرِ الشَّجَرَةِ الَّتِي فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ، فَقَدْ قَالَ اللهُ: لاَ تَأْكُلاَ مِنْهُ وَلاَ تَلمَسَاهُ لِكَي لا تَمُوتَا.

فَقَالَتِ الْحَيَّةُ لِلْمَرْأَةِ: لَنْ تَمُوتَا! بَل إنَّ اللهُ يَعْرِفُ حين تَأْكُلانِ مِنْ ثَمَرِ هذه الشَّجَرَةِ تَنْفَتِحُ أَعْيُنُكُمَا فتصيران مثلَهُ قَادِرَيْنِ عَلَى التَّمِييزِ بَيْنَ الْخَيْرِ وَالشَّرِّ، وَعِنْدَمَا شَاهَدَتِ المَرْأَةُ أَنَّ الشَّجَرَةَ لَذِيذَةٌ لِلْمَأْكَلِ وشهيَّةٌ للعيون ومُثِيرةٌ للنَّظَر، قَطفَت مِنْ ثَمَرِهَا وَأَكَلَتْ ثُمَّ أَعْطَتْ زَوْجَهَا أيضا فأكلَ مَعَهَا، فَانْفَتَحَتْ لِلْحَالِ أَعيُنُهما ، وَأَدْرَكَا أَنَّهُمَا عُرِيَانَانِ فَخَاطا أنفُسَهُمَا مآزِرَ مِنْ أَوْرَاقِ التين)[1]، واتە: مار فێڵبازترین دڕندەی دەشتێ بوو، کە پەروەردگاری پەرستراو دروستی کرد بوو، مار پرسیاری لە ئافرەتەکە کرد، {واتە پرسیاری لە حەووا کرد، کە دیارە دەبێ ئەم مارە شەیتان بوو بێ، خۆی بردبێتە سەر شێوەی مار} ئایا ڕاستە خوا فەرمانی پێ کردوون لە هەموو درەختەکانی بەهەشت بخۆن؟ ئافرەتەکە وەڵامی دایەوە: {واتە: حەووا وەڵامی دایەوە} دەتوانین لە هەمووی بخۆین، جگە لەو درەختەی کە لە نێوەڕاستی بەهەشت دایە، چونکە خوا فەرمووی: لە وە مەخۆن، وە دەستی لێ مەدەن، بۆ ئەوەی نەمرن، مارەکە بە ئافرەتەکەی گوت: ئەگەر لێی بخۆن، نامرن، بەڵکو خوا دەزانێ، ئەگەر لە بەری ئەو درەختە بخۆن، چاوتان دەکرێتەوەو وەك خوا زانا دەبنو، توانادار دەبن بەوەی کە چاکەو خراپە لێك جیا بکەنەوە، وە لە کاتێکدا ئافرەتەکە درەختەکەی بینی تەماشای کرد، زۆر بەتامەو زۆر سەرنج ڕاکێشە بۆ چاوان، وە زۆر خۆشە بۆ خواردن، لە میوەکەی لێکردەوەو لێی چنی، وە خواردی، وە پاشان دای بە مێردەکەشی ئەویش لێی خوارد لەگەڵیدا، وە دەستبەجێ چاویان کرانەوە، وە زانییان کە ڕووتن، بۆیە یەکسەر سەرو شەرواڵیان، {یاخود سەرو دامێنیان} لە گەڵای درەختی هەنجیرەکە بۆخۆیان دروست کرد، بۆ ئەوەی عەیبی خۆیان پێ داپۆشن .

کەواتە: بە پێی قسەی تەورات بێ، خوا ﷻ بۆیە فەرموویەتی : لەو درەختە مەخۆن، تاکو شارەزا نەبن، بەڵام لە قورئاندا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ﴾، خوا هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد، وە بە فریشتەکانی

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس: العهدم القديم ، سفر تكوين ، الإصحاح ٣ ، سقوط الإنسان ، ص ١٢، ١٣.

فەرموو : کڕنووشی ڕێزگرتن بۆ ئادەم ببەن ، ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ ...﴿٣٤﴾ ﴾ البقرة، چونکە بووەتە مامۆستاتان، کەچی لە تەوراتدا دەڵێ: خوا بۆیە فەرموویەتی : لەو درەختە مەخۆن، بۆ ئەوەی زانا نەبن و، شارەزا نەبن ! بەڵام لە قورئاندا خوا دەفەرموێ: بۆیە بە فریشتەکانی فەرمووە، کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، چونکە لە ئێوە زاناترە، وە خوا شتێکی فێرکردوە، کە ئێوە نایزانن ! قورئان لە کوێ و تەورات کوێ !

وە پاشان خوای دادگەر زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی لە قورئاندا دەفەرموێ : هەردووکیان لێیان خوارد، هەردووکیان لێیان چێشت، بەڵام لە تەوراتدا ئۆباڵی تاوانەکە دەخاتە سەر حەووا، کە گوایە ئەو ئادەمیشی فریوداوەو هەڵخەڵەتاندوە !

**بیست و یەك: سەرزەنشتکردنی ئادەم و حەووا لە لایەن خوای دادگەرەوە:**

دوای ئەوەی ئادەم و حەووا سەلامی خوایان لێ بڕی، ئەو قەدەغەیان شکاندو، ئەو تاوانەیان کرد، خوای کارزان سەرزەنشتیان دەکات، وەك : لە سووڕەتی (الأعراف) لە ئایەتی (٢٢)دا دەفەرموێ: ﴿ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾، واتە: پەروەردگاریان بانگی کردن، ئایا قەدەغەم نەکرد بوون لەو درەختە، {نەمگوت بوو توخنی مەکەون} وە پێم نەگوتبوون کە شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە، {بەهۆی ئەو درەختەوە فریوتان دەدات} ؟! دیارە ئەوانیش دوایی دان بە تاوانی خۆیاندا دێنن.

**بیست و دوو : دان بە هەڵەی خۆداهێنانی ئادەم و حەووا، وە داوای لێبووردن کردنیان لە خوا، بۆ چاوپۆشیی لێکردنیان :**

وەك پێشتر باسمان کرد : دوای ئەوەی خوا سەرزەنشتی کردن و، پێی فەرموون: ئایا ئەو درەختەم لێ قەدەغە نەکردبوون ؟ وە پێشم نەگوتبوون : کە

شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆتان؟ ئەوانیش دوای ئەوەی دان بە هەڵەی خۆیاندا دێنن، وەك لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٣٧)دا دەفەرموێ: ﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، واتە: ئنجا ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگاری وەرگرتن، پەروەردگاریش گەڕاوەیە سەری: "واتە: لێی خۆش بووە بێگومان خوا زۆر تۆبە وەرگری میهرەبانو بە بەزەیی یە.

ئنجا کە خوا لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٢٣)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾، واتە: گوتیان: ئەی پەروەردگارمان ! ئێمە ستەممان لە خۆمان کردو، ئەگەر تۆ لێمان نەبووریو بەزەییت پێمان دا نەیەتەوە، بێگومان لە زیانباران دەبین، ئەم ئایەتەی سوورەتی (الأعراف) چەمكو واتای ئەو وشان (كلمات)ە ڕوون دەکاتەوە، کە لە ئایەتی (٣٧) سوورەتی (البقرة)دا هاتوون، کە دەفەرموێ: ﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ ﴾، ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگاری وەرگرتن، نازانین چین ؟ بەڵام لە سوورەتی (الأعراف)دا بۆمان ڕوون دەکاتەوە، کە ئەو وشانە چین، کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾، واتە: گوتیان: ئەی پەروەردگارمان ! ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، ئەگەر تۆ لێمان نەبووریو بەزەییت پێمان نەیەتەوە، بێگومان لە زیانباران دەبین .

ئا ئەو وشانە بوون، کە دوای ئەوەی ئادەمو حەووا هەڵەیان کردو گوناهیان کرد ، خوا ﷻ ئەو وشانەی فێرکردنو، ئیلهامی دڵیانی کرد، بۆ ئەوەی بەم وشانە لە پەروەردگاریان بپاڕێنەوە، وە پەروەردگاریشیان لێیان خۆشبوو، وەك لە سوورەتی (طه) دا دەفەرموێ : ﴿ ... وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ ﴾، واتە: ئادەم سەرپێچیی لە فەرمانی پەروەردگاری کردو

بێمراد بوو، {سەرگەردانو ژین تاڵ بوو} پاشان خوا هەڵیبژاردو، لێی خۆش بوو، وە ڕێنماییکرد کە لەمەودوا ژیانی سەر زەوی چۆن بگوزەرێنێ ؟

**بیست و سێ : دابەزێنرانی هەرکام لە ئادەمو حەووا لەلایەك، وە ئیبلیس لەلایەکی دیکەوە ، لە بەهەشتو ئاسمان بۆ سەر زەوی، وەك دوژمنی سەرسەختی یەکدی :**

خوای پەروەردگار هەموویانی سزادا : ئادەمو حەووا (علیهما السلام) هەر چەند لێیان خۆش بوو، بەڵام دەبوو باجی هەڵەکەی خۆیان بدەن، ئنجا ئیبلیسیش شایستەی ئەوە نەمابوو ، کە لە بەهەشتو ئاسمان دا بمێنێ، ﴿ فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴾:

**با سەرنج بدەین :**

١ / لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٣٦)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴾، واتە: وە گوتمان دابەزن، هەندێکتان بۆ هەندێکتان دوژمنن، وە لەسەر زەویدا نشینگەو ڕابواردنێکی کاتییتان هەیە.

٢ / وە لە سوورەتی (الأعراف)یش ئایەتەکانی : (٢٤ و ٢٥)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: (خوا فەرمووی : دابەزن، هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن، {واتە: ئبلیس دژایەتیی ئێوە دەکات}، وە نشینگەو ڕابواردنێکی کاتیی بۆ ئێوە لە زەویدا هەیە، {واتە : هەم بۆ ئادەمو حەوواو وەچەکەیان، وە هەم بۆ ئیبلیسو وەچەکەی} تاکو

کاتی دیارییکراو، {تاکو ئەو کاتەی دنیا کۆتایی پێ دێو، ژیانی سەر زەوی دەپێچرێتەوە، مرۆڤو جند تاقیکردنەوەی خۆیان تەواو دەکەن}، (خوا) فەرموی : لەوێدا دەژینو، وە لەوێشدا دەمرنو، وە لەوێشدا دووبارە {جەستەکانتان لە زەوی} دەردەهێنرێنەوەو زیندوو دەکرێتەوە.

٣ / وە لە سوورەتی (طه) ئایەتی (١٢٣)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢاۖ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ ﴾، واتە: (خوا) فەرمووی: هەردووك لاتان لێی دابەزن تێکڕا، هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن.

ئنجا ئەگەر ئینسان بە وردیی سەرنجی ئایەتەکانی قورئان نەدات، بە ڕواڵەت هەندێك جار وای دێتە بەرچاو، کە جۆرێك لە ناکۆکییو دژایەتیی لە نێوان ئایەتەکانیدا هەبێ:

لە سوورەتی بەقەرە و سوورەتی ئەعراف دا دەفەرموێ: ﴿ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ ﴾، ﴿ قَالَ ٱهۡبِطُواْ ﴾ ، ﴿وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ ﴾،کەچی لێرەدا لە {سوورەتی (طه) دا} دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱهۡبِطَا ﴾!!، بەلام وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، کاتێك دەفەرموێ: ﴿ٱهۡبِطُواْ ﴾، ئەوە ئادەمو حەوواو ئیبلیس، هەرسێکیان مەبەستن، وە کە دەفەرموێ: ﴿ٱهۡبِطَا ﴾، واتە: هەردووك لایەن، لایەك ئادەمو حەووایەو، کە لایەك ئیبلیسە، کە ئەو کاتە دەبن بە دووان (مُثَنَّى)، بۆیە ڕاناوی دووانیان بۆ بەکاردێ، بەلام لە حاڵەتی پێشتردا دەبن بە کۆ ، بۆیە ڕاناوی کۆیان بۆ بەکاردێنێ .

ئنجا کە دەشفەرموێ: ﴿بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ ﴾، بە تەئکید ئادەمو حەووا دوژمنی ئیبلیس نین، بەو واتایەی کە دژایەتیی ئیبلیسیان کردبێ، بەلام ئیبلیس دژایەتیی ئەوان دەکات، ئنجا خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾، چونکە

کەسێك دژایەتییت بکات، دەبێ تۆش بە چاوی دوژمن تەماشای بکەیو ، دژایەتیی بکەیو بەرەنگاری ببیەوە، نەك تەسلیمی بی ، ئەگەرنا مرۆڤـ هیچ پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە کە دژایەتیی شەیتان بکات ، ئەگەر شەیتان لێی گەڕێ، بەڵام بە تەئکید ئەو واز لە ئێمە ناهێنێو ، ئێمەش دەبێ بە چاوی دوژمن تەماشای بکەینو، وەك دوژمنێك مامەڵەی لەگەڵدا بکەین ، نەك وەك دۆستێك .

**<u>بیست و چوارەم و کۆتایی</u> : بەڵێندانی خوا بە ناردنی پەیامو بەرنامەی خۆی ، بۆ ڕێنماییکردنی مرۆڤو جند، کە شوێنکەوتووانی سەرفرازو پشت تێکردووانی زیانبار دەبن :**

١ ) وەك لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتی (٣٨)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْنَا ٱهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعًاۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾، (خوا) فەرمووی: هەمووتان لێی دابەزن، {لێی بچنە خوار، لە بەهەشت، یان لە ئاسمان} ئنجا هەر کاتێك لە منەوە ڕێنماییتان بۆ هات، هەر کەسێك شوێن ڕێنمایی من بکەوێ، نە ترسیان لەسەرەو نە پەژارە دادەگەرن، {یانی: نە ترسی داهاتوویان لەسەرە، نە خەمو پەژارەی ڕابردوویان هەیە} بەڵام ئەوانەی بێبڕوان و ئایەتەکانی ئێمە بە درۆ دەزانن، ئا ئەوانە هاوەڵی ئاگرن، {یان خاوەنی ئاگرن} و، بە هەمیشەیی تێدا دەمێننەوە.

کە دیارە مەبەستی ئاگری دۆزەخە .

٢ ) لە سوورەتی (طه)دا خوای زاناو توانا بە تەفصیلْ باسی ئەوە دەکاتو، دەفەرموێ : ﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًاۢ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ

أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ ﴾، واتە: (خوا) فەرمووی: هەردووك لاتان لێی دابەزن تێكرا، هەندێكتان دوژمنی هەندێكتانن، ئنجا هەر كاتێك لە منەوە ڕێنماییتان بۆ هات {بە كێدا ڕێنماییان بۆ دێ ؟ بە پێغەمبەران دا}، هەر كەسێك شوێن ڕێنمایی من بكەوێ، نە گومڕا دەبێ‌و نە بەدبەختو ژین تاڵ دەبێ، وە هەر كەسێك پشت لە یادی من بكات، {پشت لە بەرنامەكەی من بكات، كە بە هۆی بەرنامەكەمەوە منی دێتەوە یاد} ئەوە ژیانو گوزەرانێكی سەختو تاڵی دەبێ، {ژیانی سەختو تەنگو تاڵ لە دنیادا، كە لە ڕاستیدا ژیانی بێبڕوایی‌و دوور لە خوایی، هەر چۆنێك بێ، هەر ژیانی تەنگو تاڵە، ئینسانێك كە تەنیا پێنجو دوو ڕۆژێكی دنیا ببینێ‌و، تەنیا بازنەی تەسكی دنیا ببینێ، وە تەنیا جەستەو غەریزەكانی ببینێ، بە تەئكید ژیانێكی تەنگو تاڵو پڕ دڵەڕاوكەو پڕ لە كێشەو گرفتارو موعاناتی دەبێ، هەر بۆیە ڕێژەی خۆكوشتن لەو وڵاتانەدا كە لە ڕووی خۆشگوزەرانییەوە لە هەموو وڵاتانی دنیا لەپێشترن، لە هەمووی زیاترە، مەبەستم دەوڵەتانی ڕۆژئاوایە، بۆچی ؟ چونكە وەك گوتراوە: (لیس بالخُبْزِ وحده یحیی الإنسان) ئینسان تەنیا بە نان ناژێ، ئینسان تەنیا جەستە نیە، تاكو بەس بە تێركردنی غەریزەكانی هەست بە ئۆخژنو ئارامیی بكات، بەڵكو ئینسان وێڕای جەستەو بگرە لەپێش جەستەشدا ، ڕووحە ، ڕووحی ئینسان بناغەی ئینسانە، ئەو ڕووحەش بە پەیوەندیی لەگەڵ خواداو، بە یادی خوا، ئارام دەگرێ : ﴿ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾الرعد، جەستە لە خاك دروست كراوەو، بەو خواردنو خۆراكانەش كە لە خاك پەیدا دەبن، تێرو تەسەل دەبێ، ڕووحیش لە خواوە هاتوەو، تەنیا بە پەیوەندیی لەگەڵ خواداو، بە بەندایەتیی بۆ خوا، كە ئەنجامی دەدات، ئارام دەبێ، بۆیەش هەر كەسێك پشت

لە خوا بکات، پشت لە یادی خوا بکات، ژیانێکی تەنگو تاڵی دەبێ، با لە ڕووی دەست ڕۆیشتوویی ماددییەوە، ژیانی فراوان بێ، بەڵام بێگومان لە ڕووی ڕووحییو لە ڕووی ناخ و دڵو دەروونەوە، هەست بە ئارامیی ناکات، بەڵکو هەست بە سەغڵەتییو دڵەڕاوکە دەکات} .

﴿ وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴾، وە لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا بە کوێریی کۆی دەکەینەوەو، دەیهێنین بۆ مەیدانی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت، ﴿ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴾، گوتی : پەروەردگارم ! بۆچی بە کوێریی کۆت کردمەوە، کە بێگومان پێشتر بینا بووم چاوم دەیبینی؟ ﴿ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ﴾، (خوا) فەرمووی: بەهۆی ئەوەوە کە پێشتر ئایەتەکانی منت بۆ هاتن، فەرامۆشت کردن، ئەمڕۆش بە هەمان شێوە ، تۆ فەرامۆش دەکرێی.

هەندێك لە توێژەروان گوتوویانە : ئەم ڕستە قورئانییە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە هەر کەسێك قورئان لەبەر بکاتو دوایی لەبیری بچێتەوە ، ئەوە بە کوێریی حەشر دەکرێ ! بەڵام ئەمە وا نیە، چونکە بەڵێ گوناهە کە ئینسان قورئان لەبەربکاتو، دوایی ئیهمالی بکاتو لە بیری بچێتەوە، بەڵام ئەمە سزایەکەی نیە، ئەوە سزای کەسێکە کە ئایەتەکانی خوا پشتگوێ دەخاتو گوێیان پێ نادات، وە مەبەست ئەوە نیە کە ئایەتەکانی ئێمەت لەبەر کردو دوایی لەبیرت چوونەوە، وەك چۆن کەسێك شتێك لەبەر دەکاتو ، دوایی لەبیر خۆی دەباتەوەو لە بیری دەچێتەوە، لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿ فَنَسِيتَهَا ﴾، لەبیر خۆتت بردنەوە، واتە: ئایەتەکانی ئێمەت فەرامۆش کردو، پشتت لە هیدایەتی ئێمە کرد، وە هیدایەتی ئێمەت قبووڵ نەکرد، بۆیە ئەمڕۆش تۆ فەرامۆش دەکرێی، وە ئاوا بە کوێریی حەشر دەکرێی، تۆ لە دنیادا چاوی عەقڵو دڵی خۆت کوێر کردوە، ئەمڕۆش لە قیامەت دا چاوی سەرت کوێر کراوەو، ئاوا بە کوێریی حەشر دەکرێی .

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾، خوا ڕوو لە مرۆڤایەتیی دەکاتو دەفەرمویٚ: وە ئێوەمان لە زەویدا دەستڕۆیشتوو کردوە، وە ژیانو گوزەرانو هۆکارەکانی ژیانو گوزەرانمان بۆتان ڕەخساندوە، بەڵام بە کەمیی سوپاسگوزاریی دەکەن .

لێرەدا ڕووی دواندن لە هەموو بەشەرە بە گشتی، ئنجا کە دەفەرمویٚ :

﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، (أَي جَعَلْنَاكُمْ مُسَلَّطِينَ عَلَيْهَا) یان (سَلَّطْنَاكُمْ عَلَيْهَا) ئێوەمان دەستڕۆیشتوو کردوە، ئێوەمان دەستەڵاتدار کردوە لە زەویدا، بە کەیفی خۆتان تێیدا دێنو دەچن، خێرو بێرەکانی بۆ ئێوە دەستەبەر کراونو، دەستەمۆ کراون، وەك لە شوێنێکی دیکەدا خوا دەفەرمویٚ: ﴿ فَسِيرُوا فِي ٱلْأَرْضِ ﴿١٣٧﴾ ﴾آل عمران، بە زەویدا بڕۆن، یان لە شوێنی دیکەدا دەفەرمویٚ: ﴿ فَٱمْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ﴾الملك، واتە: بە قەد پاڵو دۆڵو چیاکانیدا بڕۆنو، لە ڕزقی خوا بخۆن، وە بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە.

﴿ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ ﴾، (مَعَايِش) کۆی (مَعِيْشَة)یە، (الـمَعِيْشَة: مَا يَتَعَيّشُ بِهِ الإِنْسَان) هەر شتێك ئینسان ژیانی پێی بگوزەرێنێ، پێی بژیەت، پێی دەگوترێ (مَعِيْشَة)، واتە: خوای بەخشەر هۆکارەکانی ژیانو گوزەرانی بۆ لە زەوی دا داناون، ﴿ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾، کەم سوپاسگوزاریی دەکەن، ئەمە دوو واتای هەن :

١ / بە کەمیی سوپاسگوزاریی دەکەن.

٢ / کەمێکتان سوپاسگوزاریی دەکەن بۆ خواو ، بە زۆریی سپڵەو ناسوپاسن .

وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾سبأ، کەمێك لە بەندەکانم سوپاسگوزارن، سوپاسگوزار یانی چی؟ لە زمانی کوردییدا بۆ (شكر) و (حمد) هەر دەڵێین: سوپاس، بەڵام من وشەی (حمد) ستایشی بۆ بەکاردێنم‌و، وشەی (شكر) سوپاسی بۆ بەکاردێنم، کە تۆ بە کەسێك دەڵێی (شُكْرًا) واتە: سوپاست دەکەم، سوپاس کردن جیایەو، ستایش کردن جیایە، ستایش کردن (حَمْد)، ئەوەیە کە تۆ ستایشی کەسێك بکەی، لەبەر سیفەتە باشەکانی، با لەویشەوە چاکەیەك بۆ تۆ نەهاتبێ، ئێمە ستایشی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) دەکەین، کە خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو جوان بوون، ستایشی (حاتم الطائي) دەکەین کە کابرایەکی کافر بووە، لەبەر ئەوەی سەخیی بووە، وە ستایشی (ڕۆستەم) دەکەین، لەبەر ئەوەی کابرایەکی ئازا بووە، وە ستایشی فلان کەس دەکەین ، لەبەر ئەوەی کابرایەکی ڕاستگۆ بووە، ئەوە پێی دەگوترێ: (حَمْد) ستایش.

بەڵام سوپاس (شكر) ئەوەیە کەسێك چاکەیەکت لەوەوە چاکەیەك بۆ تۆ بێ، سوپاسی دەکەی .

ئنجا سوپاس کردن بە سێ شتان دەکرێ: بە دڵ دەکرێ، بە زمان دەکرێ، بە ئەندامەکانیش دەکرێ، بەڵام ستایش تەنیا بە زمانی دەکرێ، بەڵێ بە زمان دەگونجێ ستایشی کەسێك بکەی، وە بە دڵیش، بەڵام ئەگەر بە دڵیشیت دانەیەت، مادام بە زمان مەدحت کردو سەنات کرد، هەر دەگوترێ : ستایشی کرد، بەڵام (شُكْر) پێویستی بە هەر سێکیان هەیە : بە دڵ‌و بە زمان‌و بە ئەندامەکان ؛ سوپاسکردنی خوا بە دڵ ، ئەوەیە کە تۆ چاکەو نیعمەتەکانی خوا، لە خوا بزانی : ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ﴿٥٣﴾ ﴾النحل ، واتە: وە هەر چاکەیەك لە ئێوەدا هەیە ، لە خواوەیە، کە تۆ چاکەکانت لە خوا زانی‌و گوتت: ﴿ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي ﴾، ئەوە بەخششی پەروەردگارمە، لەو حاڵەتەدا شوکری دڵت بەجێهێناوە.

وە شوکری زمان ئەوەیە کە باسی نیعمەتەکانو چاکەکانی خوا بکەی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ ﴾الضحی، واتە: باسی چاکەکانی پەروەردگارت بکە ، وە بۆ خوایان بگێڕەوە.

وە سوپاسی ئەندامەکان، ئەوەیە بە کردەوەی ئەندامەکانت ، نیعمەتەکان لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنی ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ﴿١٣﴾ ﴾سبأ، واتە: ئەی بنەماڵەی داوود ! شوکر ئەنجام بدەن .

کەواتە: شوکر ئەنجام دەدرێ، نەك هەر بگوترێ، با بزانین چۆن ؟

خوای پەروەردگار زانیاریی بە داوود دابوو، زانیاریی زرێ دروست کردن، وە موڵكو دەسەڵاتی زۆری بە داوودو سولەیمان دا بوو، صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ﴿١٣﴾ ﴾سبأ، واتە: ئەو نیعمەتانەی خوا پێی داون، لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاریان بێنن، وە بەڕاستی داوودو سولەیمان ئەو بابو کوڕە بەڕێزە ، کە دوو پێغەمبەری پایە بەرزی خوا بوون، پادشاش بوون، وایان دەکرد ؛ نیعمەتەکانی خوایان لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاردەهێنا، لە هیدایەتدانی خەڵکداو ، لە بەختەوەریی خەڵکدا .

ئنجا ئا ئەوە شوکرە، شوکر ئەوەیە : هەم بە دەست ، هەم بە زمان ، هەم بە دڵ ، چاکەکانی خواو نیعمەتەکانی خوا ، لە خوا بزانیو بۆ ڕازیکردنی خوا بەکاریان بێنی.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَـٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَـٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴾

کە پێشتر مانامان کرد ، ئێمە لێرەدا سێ هەڵوێستەی لە بەرانبەردا دەکەین :

**هەڵوێستەی یەکەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ ﴾، لێرەدا ئاشکرایە مەبەست پێی ئادەمە، بەڵام چونکە ئادەم بابی هەموو مرۆڤەکانە، بۆیە ڕووی دواندن لە مرۆڤەکان کراوە، کەواتە: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ﴾، واتە: بابتانمان خوڵقاند، بەڵام چونکە ئەو بابە ، کە ئادەمە ﷺ ئێمە هەموومان وەچەی ئەوین، بۆیە دەفەرموێ: ئێوەمان خوڵقاند، دوایی وێنەمان کێشان، دوایی بە فریشتەکانمان فەرموو : کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، کەواتە: کە لێرەدا ڕاناوی کۆ (جمع) هێنراوە، ﴿ خَلَقْنَٰكُمْ ، صَوَّرْنَٰكُمْ ﴾، مەبەست هەر ئادەمە سەلامی خوای لێ بێ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئادەم بابی هەموو مرۆڤایەتییە، وە (بالقُوَّة) هەموو وەچەکەی لەنێودا بووە، بۆیە خوا ﷻ بەو دروستکرانو وێنەکێشانی یەکەمەو، بەو کڕنووش بردنەی فریشتەکان بۆ ئادەم، ئێمەشی پێ دەگرێتەوە.

**هەڵوەستەی دووەم:** کەواتە: لێرەدا دەردەکەوێ کە ئادەم بە تایبەت خوڵقێنراوەو وێنەدار کراوە، وەك پێشتریش باسمان کرد، کە خوا فەرموویەتی : ﴿ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ﴿٧٥﴾ ﴾ص، واتە: چ شتێك ڕێگرت بوو کە کڕنووش بەری بۆ کەسێك ، کە بە دوو دەستی خۆم دروستم کردوە ؟ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئادەم بە شێوەیەکی تایبەت خوڵقێنراوە، مەبەستم ئەوەیە کە تیۆری گەشەکردنو پەرەسەندن (نظرية النشوء والتطور) کە داروین، وە دوایی هەندێك خەڵکی دیکە دوای وی قسەو باسی زۆریان لەسەر کردوە، کە ئێستا پووچەڵ کراوەتەوە، ئەوە لە ڕاستییدا ئەفسانەیەك بووو لەگەڵ دەقی قورئانیشدا تێکدەگیرێ، وە زانیارییش نەیتوانی پشت ڕاستی بکاتەوە، بەڵێ زانیاریی پشت ڕاستی ئەو بیردۆزەیەی نەکردۆتەوە، کە دەڵێ : ئادەم وەك دروستکراوەکانی دیکە پەیدابووە ، لە ئەنجامی گەشەکردنو پەرەسەندنی

دروستکراوەکانەوە ، لە ژیانداریکی یەك خانەیی (ئەمیبا)و دوایی بۆ ژیانداریکی سادەو، دوایی بۆ ژیاندارانی ئالۆزتر ، هەتا گەیشتۆتە مەیموونو ، مەیموونیش بە چەند قۆناغیك گەیشتۆتە مرۆڤ !! بەڵێ ئەوە ئەفسانەیەك بوو، مێشکی خەڵکی زۆر پێوە خەریك کرا، وە ئەو کاتە شەپۆلی ماددیی گەرایی‌و بێ دینایەتیی لە رۆژئاوا ، لە لووتکەی دابوو، بۆیە ئەو جۆرە بیردۆزانە رەواجیان هەبوو، هەروەك بیردۆزەی مارکیسزمو، بیردۆزەی دۆرکایمو ، بیردۆزەی فرۆید، ئەوانە رەواجیان پێ دەدرا، کە ببن بە ئەڵتەرناتیڤو جێگرەوە بۆ دینو، بۆ ئەو حەقیقەتانەی کە دینی خوا بەگشتی لە کتێبە ئاسمانییەکاندا رایگەیاندوون، دەربارەی دروستکردنی ئادەمو ، ژیانی دنیاو ، چارەنووسی مرۆڤ و ، رۆژیی دوایی‌و...هتد.

**هەڵوەستەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: خوا لە سوورەتی (الكهف) ئایەتی (٥١)دا دەفەرموێ: ﴿ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓ ﴾، واتە: هەموویان کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس، ئیبلیس لە جند بوو لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو .

باشە مادام ئیبلیس لە جند بووە، کاتێك خوا فەرمان دەکات بە فریشتان، بۆچی ئیبلیس دەگرێتەوە ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە : هەر چەندە ئیبلیس فریشتە نەبووە، بەڵام چونکە لەگەڵ فریشتەکاندا بووە ، فەرمانەکە ئەویشی گرتۆتەوە، بەڵگەمان چییە؟ بەڵگەمان ئەوەیە کە ئیبلیس هەر لە بیانوویەك گەڕاوە ، فەرمانی خوای پێ ڕەتبکاتەوە، وە ئیبلیس بە تەئکید لەو ئیبلیسییانە زاناترو شارەزاتر بووە ، کە ڕەخنە لە قورئانو لە ئیسلام دەگرن، چونکە ئیبلیس مامۆستای ئەوانە، بەڵام ئیبلیس ئەوەی بە بەڵگە نەهێناوەتەوە ، کە : ئەو فەرمانە من ناگرێتەوە، چونکە من جندمو ئەوانە فریشتەن، ئنجا مادام ئیبلیس ئەوەی بە بەڵگە نەهێناوەتەوە، کە بە تەئکید لە هەموو شوێنکەوتووەکانی

شارەزاترە، کەواتە: بە بەڵگە ناشێ ، چونکە مادام ئیبلیس تەمەنێکی زۆر لەنێو فریشتەکاندا بووە، کە بەس خوا دەزانێ چەند بووە ! بەهۆی ئەوەوە وەك یەکێك لەوانی لێهاتوەو، حوکمی ئەوانی وەرگرتوە، وە بێگومان کاتێك نەفەرێکی عەشیرەتێکی دیکە، بێتە نێو عەشیرەتێکەوەو ، چەندان ساڵ لەنێویان دا ژیابێ‌و، چەند پشتان لەنێوانان دا بوو بێ، دوایی هەر فەرمانێ بەو عەشیرەتە بکەن، بۆی نیە بڵێ: من لەو عەشیرەتە نیم، چونکە مادام تەمەنێکە لەنێو ئەواندا گوزەراندوویەتی ، بۆتە یەکێك لەوان.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴾، واتە: (خوا) فەرمووی: چ شتێك رێی لێگرتی کە کڕنووش نەبەی ، کاتێك فەرمانم پێکردی، (ئیبلیس) گوتی: من لەو چاکترم، منت لە ئاگر دروست کردووەو، ئەوت لە قوڕ دروست کردووە.

لێرەدا بەڕواڵەت ئەم ڕستە قورئانییە ئیشکالێکی تێدایە، چونکە دەفەرموێ : ﴿ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ ﴾، چ شتێك رێی لێ گرتی کە کڕنووش نەبەی ؟ چونکە لە شوێنی دیکەدا هاتوە : ﴿ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ﴿٧٥﴾ ﴾ص، واتە : چ شتێك ڕێگرت بوو ، کە کڕنووش ببەی بۆ کەسێك کە بە دوو دەستی خۆم دروستم کردوە ؟ بەلام لێرەدا دەفەرموێ: چ شتێك ڕێی لێ گرتی ، کە کڕنووش نەبەی ؟!

زانایان دەڵێن : لێرەدا ئەم وشەی (مَنَعَكَ ) ، (تَضْمِين)ی مانای (حَمَلَكَ)ە، کراوە ، بنچینەیەك هەیە لە زمانی عەرەبییدا، کە قورئان بەکاری دێنێ : وشەیەك مانای وشەیەکی دیکەی دەخرێتە پاڵ، کە ئەوە پێی دەڵێن : خستنەگەڵ ، خستنەنێو (تَضْمِين) بۆ ئەوەی لە جیاتی دوو ڕستە، یەك ڕستە بەکاربێنێ، کە لێرەدا ئەو تەعبیرە ئاوای لێ هاتۆتەوە: (مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ وَحَمَلَكَ على أَلاَّ تَسْجُدَ) یانی : چ شتێك ڕێی لێگرتی کە کڕنووش بەری، وە وایلێکردی

کە کڕنووش نەبەی ، ئنجا لە جیاتی ئەو دوو ڕستەیە، خـوای پەروەردگـار ئـەم تەعبیـــرەی بـەکارهێنــاوە : ﴿ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسۡجُدَ ﴾ یانـــی : (مَـا مَنَعَـكَ أَنْ تَسْجُدَ وَحَمَلَكَ على الاَّ تَسْجُدَ)، کە ئەوە پێی دەگوترێ: (إِخْتِصارُ جُمْلَتَيْنِ فِي جُمْلَة) کورتـکردنەوەی دوو ڕستە لە ڕستەیەکدا، ئنجا ئەمە یەکێکە لە ڕووەکانی ئیعجازی قورئـان، چونکـە پوختـیی و کـورتیی، یەکێکـە لـە ڕووە گرنگـە ئیعجازی قورئـان، کە (تَضْمِين)یش یەکێکـە لە شـێوازەکانی کورتـکردنـەوە (إيجاز)، کـە پێـی دەگوترێت: (قَاعِدَةُ تَضْمِينِ فِعْلٍ مَعْنَى فعلٍ آخر ، لِيُعْطِيَ مَعْنَى الفعلين) یانـی : مانـای کردارێـك بخـرێتە نێـو کـردارێکی دیکـەوە، بـۆ ئـەوەی ئـەو کـردارە ، مانـای هـەردوو کـردارەکان بگـەیەنـێ.

ئنجـا (الطبـري) ئـەم ڕسـتـەیەی ئـاوا لـێك داوەتـەوە (مَا مَنَعَكَ مِنَ السُّجُودِ فَأَحْوَجَكَ أَنْ لا تَسْجُد)[1]، واتە: چ شـتێك ڕێـی لـێگرتـی لـە کڕنـووش بـردن، وە وایلـێکـردی کە کڕنووش نەبـەی .

ئنجـا ئیبلیس کـە دەڵـێ: ﴿ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ﴾، من لـەو باشـتـرم منت لە ئـاگر دروست کـردووە، ئـەوت لە قـوڕ دروست کردووە .

لـێرەدا سـێ هەڵوەسـتە دەکـەین :

**هەڵوەستەی یەکـەم**: دیـارە ئیـبلـیس خۆی پێ لە ئـادەم چاکتـر بووەو خۆی بەسـەردا هەڵکێشاوە، کە ئەوەش سیفەتێکی خراپە، خۆت پێ لە خەڵك چاکتر بێ، وە خـۆت بەسەر خەڵکدا هـەڵکێشی بە بێ بەڵـگە، بەڵکو بە بەڵگەوەش هەر خراپـە.

ئنجـا خۆهـەڵکێشـانەکەی ئیـبلـیس بــە شـتێکەوە بـووە، کـە دەسـتی تێیـدا نەبـووە، جارێ تۆ ئەگەر دەستیشت لە شتێکدا هەبـێ، هـەر نابـێ خـۆت بـەسـەر خەڵکدا هەڵکێشی، چونکـە فەخـرو شـانازیی کـردن بـەسـەر خەڵـکیدا ، خراپـە ، بـەڵام تۆ خـۆت بـە شـتێك هەڵـکێشـی ، کـە دەسـتت تێیدانیـەو، هـیچ ئـازایەتیی تۆی تێـدا نیـە، ئـەوە هەر شـتێکی زۆر بێ مـانایە .

---

١) جامع البيان : ج ٨ ، ص ١٣٦.

ئیبلیس خۆی بە چییەوە هەڵکێشاوە ؟ خۆی بە ڕەچەڵەك و بەو کەرەسەیەی کە لێی دروست کراوە، بەو توخمەی کە لێی دروست کراوە، کە (ئاگر)ە ، ئایا تۆ خۆت خۆتت لە ئاگر دروست کردوە ؟ نەخێر ، خوا دروستی کردووی ، ئەدی بۆچی خۆت بە شتێکەوە هەڵدەکێشی ، کە دەستی تۆی تێدا نیە ؟ وە بۆچی خۆت پێ لە کەسێك چاکترە ، کە لە ماددەیەك دروست بووە، کە خۆی دەستی تێدا نەبووە ؟

وە پاشان وەك پێشتریش باسمان : کرد ئایا ڕاستە ئاگر لە قوڕ باشترە ؟ لە حاڵێك دا کە ئاگر دەسووتێنێ‌و دەفەوتێنێ، بەڵام قوڕ بەرهەم دێنێ‌و دەڕوێنێ .

ئنجا لە ڕاستیشدا پێویست ناکات بەراورد بکەین لە نێوان ئاگرو قوڕدا ، کە کامیان باشترە ؟ چونکە ئاگر بۆ ئەرکەکانی خۆی باشترە : بەڵێ شت دەسووتێنێ‌و دەفەوتێنێ، بەڵام چێشتیش دەکوڵێنێ‌و گۆشتیش دەبرژێنێ‌و، خۆشی پێ گەرم دەکرێتەوە، کەواتە: هەر کامێك لە ئاگرو قوڕ لە بواری خۆیان دا باشترن ، وە دروست نیە یەکێکیان لەوی دیکەیان بە باشتر دابنرێن .

**<u>هەڵوەستەی دووەم</u>**: دووەم هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (أَوَّلُ مَنْ قَاسَ إِبْلِيس) شیعەکان زۆر ئەو عیبارەتە بەکاردێنن، هەروەها ظاهیرییەکانیش کە بڕوایان بە قیاس نیە، دەڵێن: یەکەمین کەس کە قیاسی کردوە ، ئیبلیس بووە ، گوتوویەتی : من لە ئاگر دروست بووم‌و ئادەم لە قوڕێ‌و، ئاگریش لە قوڕ باشترە، کەواتە: من لە ئادەم باشترم، ئەوە پێی دەگوترێ: قیاس.

بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە : کە قیاسێك هەڵەیە، کە لە جێی خۆیدا نەبێ، ئایا چ قیاسێك لە شوێنی خۆیدا نیە ؟

١ - کە پێشەکییەکان (مقدمات)ی تەواو نەبن : {ئاگر لە قوڕ باشترە، ئادەم لە قوڕو ، منیش لە ئاگر دروست بووم ، کەواتە : من لە ئادەم باشترم} پێشەکییەکی هەڵەیە ، ئاگر لە قوڕ باشتر نیە .

٢ – پاشان قیاسێك هەڵەیە كە لە بەرانبەری دەق دابێ، قیاس دەبێ كاتێك بكرێ ، كە دەقێكمان بەدەستەوە نەبێ، چونكە قیاس بریتیە لە چی ؟

قیاس: بریتیە لەوە كە تۆ شتێك كە دەقێكی لەسەر هاتوە، وە عیللەتو هۆكارەكەشی دیارە، شتێك پێوانە بكەی لەگەڵ ئەودا، كە دەقی لەسەر نیە، بەلام لە هۆكارو عیللەتكەدا هاوبەشن، وەك چی ؟ ئێمە دەڵێین : ویسكیی حەرامە، یاخود مادده سەرخۆشكەرەكان هەموویان حەرامن، بۆچی؟ چونكە خوا مەی (خَمْـر)ی قەدەغەكردوەو، ئەویش بۆیە حەرامە، چونكە سەرخۆشكەرە، كەواتە: هەر ماددەیەكی دیكەش سەرخۆشكەر بێ، حەرامە، كەواتە: ویسكی حەرامە، ئەوە پێی دەگوترێ: قیاس.

بەڵێ قیاسێك كە لە جێی خۆی دابێ، ڕەوایە، بەلام قیاسێك لە بەرانبەر دەق دابێ، ئەوە زانایان ڕەخنەیان لێگرتوە، كە گوتوویانە: (لا إِجْتِهَادَ فِي مَعْرِض عِنْد النَّصِ ، أَوْ فـي مقَـابِل النَّصِ) كە دیارە قیاسیش جۆرێكە لە ئیجتیهاد، وە شتێك كە دەقی لەسەر بێ، نابێ بۆ حوكمەكەی پەنا ببرێتە بەر ئیجتیهاد، هەڵبەتە قیاسیش سەرەكیترین شێوازی ئیجتیهاد كردنە.

**<u>هەڵوەستەی سێیەم</u>**: دەربارەی خۆهەڵنەكێشان بە باوو باپیرانەوەو، شانازیی نەكردن بە ڕەچەڵەكو نەسەبەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرمودەیەكی هەیە كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ، وَفَخْرَهَا بِالآبَاءِ، مُؤْمِنٌ تَقِيٌّ وَ فَاجِرٌ شَقِيٌّ، أَنْتُمْ بَنُو آدَمَ، وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ، لَيَدَعَنَّ رِجَالٌ فَخْرَهُمْ بِأَقْوَامٍ، إِنَّمَا هُمْ فَحْمٌ مِنْ فَحْمِ جَهَنَّمَ، أَوْ لَيَكُونُنَّ أَهْوَنَ عَلَى اللَّهِ مِنَ الْجِعْلَانِ الَّتِي تَدْفَعُ بِأَنْفِهَا النَّتْنَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠٧٩١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥١١٦)، وَالبَيْهَقِي برقم: (٢٠٨٥١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٩٥٦) تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث حسن} ، واتە: بێگومان خوا خۆ بە زلگرتنی نەفامێتییو شانازیی بە بابو باپیرانیەوە، لە ئێوەدا لابردوە، {ئێوە كە مسوڵمانن نابێ خۆ بە زلگریی سەردەمی نەفامییو شانازیی كردن بە بابو باپیرانتان لە نێودا هەبێ} ، خەڵك یان بڕوادارێكی پارێزكارە، یاخود خراپەكارێكی بەدبەختە، ئێوە ڕۆڵەی ئادەمن، ئادەمیش لە گڵە، پیاوانێك

دەبێ واز لە شانازیی کردن بە کەسانێکەوە بێنن کە لە ڕەژووی دۆزەخن، {واتە : لە دۆزەخدا دەسووتێنرێن} یاخود ئەگەر وازنەهێنن ، لەلای خوا لە قالۆنچە کە شیاکەو ڕیخو بە لووتی خڕ دەکاتەوە (بە پێش خۆی دەداتو، دەیکاتە تۆپەڵ) ، سووکترو نزمتر دەبن .

<u>**مەسەلەی پێنجەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴾، لە بەرانبەر ئەم دوو ئایەتەش دا سێ هەڵوەستە دەکەین :

<u>**هەڵوەستەی یەکەم**</u> : کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱهْبِطْ مِنْهَا ﴾، واتە : لێی دابەزە ، شۆڕبەوە ، داپەڕە خوارێ ، یانی : لە بەهەشت ، یان لە ئاسمان ، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە گوناهو تاوان دەبێتە مایەی سەرشۆڕیی ئینسانو شۆڕبوونەوەیو دابەزینی پێگەی لەو پایە بەرزە، کە خوای بەخشندە تێیدا دایناوە.

<u>**هەڵوەستەی دووەم**</u> : کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴾، بۆت نیە لە بەهەشتدا، یان لە ئاسماندا خۆت بە زلبگری، بڕۆ دەرێ تۆ لە زەبوونانی، یان لە سەرشۆڕانی، کەواتە: خۆ بە زلگران، شایستەی بەهەشت نین، وە گوناهو تاوانیش دەبێتە مایەی زەبوونییو سەرشۆڕییو نزمییو پەستیی ئینسان.

<u>**هەڵوەستەی سێیەم**</u> : ئیبلیس دەڵێ : ﴿ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴾، وەك پێشتریش باسمان کرد : ئیبلیس داوا دەکات تاکو ڕۆژی زیندووبوونەوە، بهێڵدرێتەوە، بەڵام خوا دەفەرموێ: تۆ لە هێڵدراوانی،

دوایی لە دوو شوێناندا، لە سوورەتی (الحجر)و لە سوورەتی (ص)دا ڕوونی دەکاتەوە ، کە ئەوە هێڵرانەوەیە ، تاکو ڕۆژی کاتی دیارییکراو (الى یوم الوقت المعلوم)ە ، لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ٣٧ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ٣٨ ﴾، هەروەها لە سوورەتی (ص)یش دا: ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ٨٠ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ٨١ ﴾، هەر بە هەمان تەعبیر هاتوە، واتە: بێگومان تۆ لە هێڵدراوانی، تاکو ڕۆژی کاتی دیارییکراو، ئنجا ئایا ڕۆژی کاتی دیارییکراو کەییە؟ هەڵبەتە دەشگونجێ مەبەست پێی ڕۆژی زیندووبوونەوە بێ، بەڵام ئێمە پێمانوایە، کە کە ڕۆژی کاتی دیارییکراو، واتە: ئەو کاتەی کە دیارییکراوەو دنیای تێدا کۆتایی دێ، چونکە خوای کاربزان کە باسی (ساعَة) دەکات، باسی کاتی دیارییکراو دەکات، نەك لە باسی (قِیَامَة)دا، (ساعَة)ش ئەو کاتەیە کە دنیا تێیدا تێکدەچێ و، بوونەوەری تێدا کۆتایی دێ :﴿ يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ٤٨ ﴾إبراهيم، بەڵام قیامەت ئەو کاتەیە کە خەڵکی تێدا هەڵدەستێنرێتەوەو زیندوودەکرێنەوە، بۆ سزاو پاداشت.

کەواتە: مانەوەی ئیبلیس تاکو (قِیَامَة) نیە، بەڵکو تاکو (ساعَة)یە، واتە: تاکو ئەو کاتەی کە دنیای تێدا کۆتایی پێ دێ.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ وَعَن شَمَآئِلِهِمۡۖ وَلَا تَجِدُ أَكۡثَرَهُمۡ شَٰكِرِينَ ﴾، کە پێشتریش مانامان کرد، بەڵام لێرەدا پێنج هەڵوەستەی لە بەرانبەردا دەکەین :

**هەڵوەستەی یەکەم :** ئیبلیس گوتوویەتی : ﴿ فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە منت بێمراد کرد، منت سەرگەردان کرد، وەك بڵێی خوا وای لێ کردبێ، کە وەك گوتم: ئەوە بێئەدەبییەکی گەورەی ئیبلیسە بەرانبەر بە خوای پەروەردگار، چونکە خوا بۆخۆی فەرموویەتیو فەرمانی پێ کردوە، کە رێزی ئادەم بگرێ، ئنجا ئەگەر فەرمانەکەی خوای جێبەجێ کردبایە، بەختەوەر دەبوو، بەڵام بۆخۆی فەرمانەکەی جێبەجێ نەکردوە، کەچی وا پێشان دەدات، کە خوا بەتۆبزیی تووشی گوناهی کردبێو، گوناهەکە دەگێڕێتەوە بۆ خوای پاك ! ئنجا وەك گوتم : هەر کەسێك قەدەری خواو ویستی خوا، بکاتە بیانووی گوناهباریی خۆی، ئەوە لەسەر مەزهەبو مەشرەبی ئیبلیسە.

**هەڵوەستەی دووەم:** کە ئیبلیس دەڵێ : ﴿ لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾، یانی : ﴿ لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ عَلَىٰ صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾، واتە: لەسەر راستە رێی تۆ بۆیان دادەنیشم، یانی: بۆیان دەچمەوە بۆسەوە.

**هەڵوەستەی سێیەم:** کە دەشڵێ : ﴿ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ وَعَن شَمَآئِلِهِمۡ ﴾، کەواتە: شەیتان لە پێشەوەو، لە دواوەو، لە راستەوەو، لە چەپەوە دەتوانێ بۆمان بێ، بەڵام ئێمە دوولامان بەدەستەوە ماون : سەرێو خوارێ، واتە: لە خوا پاڕانەوەو، کڕنووش بردن بۆ خوا، پاڕانەوە لە خوا، وە ملکەچ کردن بۆ خوا، لەو دوو رێگایەوە دەتوانین بەرهەڵستیی بکەین لە بەرانبەر فێڵو پیلانی ئیبلیسدا، هەر بۆیەش هەموو ئەوانەی کە بۆ خوا صولْحاون، شەیتان زەفەریان پێنابات، وە شەیتان بۆخۆی ئیعتیرافی بەوە کردوە، گوتوویەتی: ﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ٤٠ ﴾الحجر، واتە: جگە لە بەندە ساغەکانت (هەموویان گومڕا دەکەم). وە خواش دەفەرموێ :

﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ٤٢ ﴾

الحجـــر، واتـــه : ئەوانـەی بـەڕاسـتی بـەندەی مـن بـن، {یانـی : پشـت بـه مـن ببەستن، وه تەنیا من بپەرستن، وه تەنیا لـه مـن بپاڕێنـەوە} تـۆ زەفەریـان پـێ نابـەی، تۆ بەس بەو سـەرگەردانانـه دەوێـری کە شـوێنـت کەوتـوون.

**هەڵوەستەی چـوارەم :** ئنجا ئیبلیس کە دەڵـێ: ﴿ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴾، زۆربـەیانت شـوکرانه بژێـرو سوپاسـگوزار دەسـت ناکـەوێ، وەك دەبینیـن نەیگوتووه: (وَلاَ تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ عَابِدِينَ) بۆچی ؟ چونکه شـوکر بـەرهەمی هـەره گـەورەی ئیمانـه، هـەروەك سپڵـەیی (کفـران) بـەرهەمی هـەره خراپـی کـوفرو بێبـڕواییـە.

**هەڵوەستەی پێنـجـەم:** لەوبارەشـەوە ، کە چـۆن شـەیتان دەیەوێ ئینسـان لـه ڕێـی ڕاسـتی خـوا لابـدا، پێغـەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ الشَّيْطَانَ قَعَدَ لابْنِ آدَمَ بِأَطْرُقِهِ، فَقَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الإِسْلام، فَقَالَ لَهُ: أَتُسْلِمُ وَتَذَرُ دِينَكَ، وَدِينَ آبَائِكَ، قَالَ: فَعَصَاهُ فَأَسْلَمَ، ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْهِجْرَةِ، فَقَالَ: أَتُهَاجِرُ وَتَذَرُ أَرْضَكَ وَسَمَاءَكَ، وَإِنَّمَا مَثَلُ الْمُهَاجِرِ كَمَثَلِ الْفَرَسِ فِي الطِّوَلِ، قَالَ: فَعَصَاهُ فَهَاجَرَ، قَالَ: ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْجِهَادِ، فَقَالَ لَهُ: هُوَ جَهْدُ النَّفْسِ، وَالْمَالِ فَتُقَاتِلُ فَتُقْتَلُ فَتُنْكَحُ الْمَرْأَةُ، وَيُقَسَّمُ الْمَالُ، قَالَ: فَعَصَاهُ فَجَاهَدَ ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٠٠٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣١٣٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٥٩٣)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (٦٥٥٨)، والبيهقي في "شعب الإيمان" برقم: (٤٢٤٦)، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتـه: شـەیتـان بـۆ ئـادەمیزاد لەسـەر ڕێگاکـانی بـۆی دانیشـتوه، {واتـه: ئـەو ڕێیـانـەی کـه بـەرەو خـوا دەچـن} پێشـێ لەسـەر ڕێـی ئیسـلامەتیی بـۆی دانیشتوه، کە هەر نەیەته نێو ئیسلامەوه، پێی دەڵـێ: (واتـه: دەیخـاته نێـو دڵـیو خوتخـوتەی بـۆ دەکـات، کەسێك نامسـوڵمانەو دێتـه نێـو ئیسـلام، شـەیتـان خوتخـوتەی بـۆ دەکـات) ئـایا مسـوڵمان دەبـی، ئـایینی خـۆتو ئـایینی بـابو باپیـرانت واز لـێ دێنـێ، ئنجا ئەو ئینسانه ئەگەر خـوا هیدایەتی بـداو، خـاوەنی ئیـرادە بێ، به خوتخـوتەی شـەیتان هەڵناخەڵەتـێو ، سـەرپێچیـی لـه شـەیتـان دەکـاو مسوڵمان دەبـێ .

دوایی لەسەر ڕێی کۆچ کردندا بۆی دادەنیشێ، {واتە : ئەگەر پێویست بکات ئەو ئینسانە لەو شوێنە کۆچ بکاتو بچێ بۆ شوێنێك مسوڵمانێتیىو دینداریی خۆی بکات، جاری وایە واپێویست دەکات ئینسان نیشتیمانو ماڵو حاڵی خۆی بەجێبێڵێ، ئەگەر کۆچ کردن هاتە پێش} پێی دەڵێ: ئایا کۆچ دەکەیو نیشتیمانی خۆتو ئاسمانی خۆت بەجێدێڵی ؟ وە کۆچکەر وەك ئەسپێك وایە، کە بە پەتێك بەسترابێتەوە بۆ لەوەڕ بێتو بچێ، ئنجا دیسان ئەو ئینسانە ئەگەر خوا هیدایەتی بدات، سەرپێچیی لە قسەی شەیتان دەکاو، کۆچ دەکات.

دوایی لەسەر ڕێگای جەنگو جیهاددا بۆی دادەنیشێ، { لەسەر ڕێی فیداکاریی لە پێناوی خوادا، کە بریتیە لەوەی ئینسان ماڵو نەفسی خۆی لە پێناوی خوادا ببەخشێ، لەو کاتەدا کە دینت پێویستی پێی بێ}، ئیبلیس بە خوتخوتە پێی دەڵێ: ئایا جەنگ دەکەی دوایی بکوژرێیو، ژنەکەت مارە بکرێتەوەو، ماڵەکەشت دابەش بکرێ بەسەر میراتگراندا ؟ دیسان ئەو ئادەمزادە ئەگەر هیدایەتدراو بێ ، سەرپێچیی لە قسەی شەیتان دەکاتو، لە ڕێگای خوادا جەنگو جیهاد دەکات .

وشەی (طِوَل) : خاوەنی کتێبی (مختار الصحاح)[1] دەڵێ : (الطِّوَلُ بِوَزْنِ العِنَبِ : الحَبْلُ الَّذِي يُطَوَّل لِلدَّابة فَتَرْعَى فِيهِ وَهُوَ الطِّوِيلَةُ)، واتە : وشەی (طِوَلُ) کە لە فەرموودەکەدا هاتوە، لەسەر کێشی (عِنَب)ە، ئەو پەتەیە کە درێژ دەکرێ بۆ وڵاخێك تاکو بلەوەڕێو بەرهەڵدا نەبێ، کە پێشی دەگوترێ: (طَوِيْلَة).

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱخۡرُجۡ مِنۡهَا مَذۡءُومٗا مَّدۡحُورٗاۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾، پێشتر ئایەتەکەمان مانا کرد، بەڵام هەردووك وشەی : (مَذۡءُومٗا مَّدۡحُورٗا )و (تَبِعَكَ ) تۆزێك شیدەکەینەوە.

---

١) ص ٣٥٤.

١/ أ) (الـذَأمُ: إذَا عَـابَهُ وَحَقـَّرَهُ فَهُوَ مَذْءُومٌ)[١]، وشـەی (ذَأَمَ) واتـە (عَـابَ)، (ذَأَمَـهُ) واتە : (عَـابَهُ وَحَقَّرَهُ) واتـە : عەیبـی لـێگـرتو بـە سووك تەماشـای کـردو، بـە کەمی گـرت، (مذؤوم) واتـە : (مُحَقَّر، وَمَعِيب) یـانی: عەیبـدار.

ب) (مدحـوراً: دَحَـرَهُ : طَـرَدَهُ وأبعـده)[٢]، یـانی : دەریکـردو دووری خسـتەوە .

کەواتە : بێ فەرمانیی خـوا کردن، مایـەی عەیـبداریی‌و نەنگـیی یـەو، هۆکـاری دوورخرانەوەشـە لە ڕەحمـەتی خـوا.

٢/ ﴿ لَّمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ ﴾، بـۆ هـەر کـامێك لـەوان شـوێنت بکـەوێ، ئـای چـەند عەیـبو ناشـیـرینە ئینسـان دوای دوژمنـی خـۆی بکـەوێ، کـە ئیبلیسـە، ئیبلـیسێك کـە دوژمـنی ئـادەمو حـەووا بـووە، ئـەوانی بـەهـۆی فیڵـی خـۆی لـە بـەهەشـتدا دەرکردوە، تۆ دووبـارە شـوێنی بکـەویو، جـارێکی دیکە ڕێـی چـوونە بـەهەشـتت لـێ بگـرێ ؟! بـە ڕاسـتی ئـەوە غـەدرو خیانـەتێکی گەورەیـە ئینسـان بـەخـۆی دەکـات، شـەیتان کە جارێك ئـادەمی هەڵخەڵەتانـدو، لـە بـەهەشـتـێ بـە دەرکردنیـدا، بۆچـی جارێکی دیکـە بـە قسـەی دەکەیـەوە، کـە ئـەوجاریش ڕێـی چوونە بـەهەشـتت لـێ بگرێتـەوە ؟ دیارە ئەگـەر بـە دوایـی بـابی خـۆت بکـەوی، بـە دوای ئـادەم بکـەوی، وە بـە دوای پێغـەمبـەران (عليهم الصلاة والسلام)، بکـەوی، دەچیەوە بـەهەشـت، بـەڵام ئەگەر بـە دوای ئیـبلیس بکـەوی، وەك چۆن کـاتی خۆی ئـادەمی لە بـەهەشـت مەحرووم‌و بێبـەش کردوە، ئـاوا دووبـارە ڕێـی چوونـەوە بـەهەشـت لە تـۆش دەگـرێ.

**مەسـەلەی هەشـتەم:** کە دەفـەرموێ: ﴿ وَيَـٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ فَكُلَا مِنۡ حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، لەبـەردەم ئـەم ئـایەتـەدا سـێ هەڵوێسـتە دەکـەیـن :

---

١) مختار الصحاح : ص ٣٥٤ .

٢) مختار الصحاح : ص ١٩٩ .

**هەڵوەستەی یەکەم :** کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَـٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ ﴾، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ ، کە دابینکردنی جێگاو ڕێگای حەوانەوە، لەسەر پیاوە، کە جێگاو ڕێگا بۆخۆیو بۆ ژنو منداڵی دابین بکات.

**هەڵوەستەی دووەم :** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَكُلَا مِنۡ حَيۡثُ شِئۡتُمَا ﴾، لە هەر شوێنێك کە حەز دەکەن دەتوانن لێی بخۆن، واتە ڕێتان لێ نەگیراوە، نەیفەرمووە: (فَلاَ تَأْكُلا مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَة)، بەڵام دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقۡرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ ﴾، هەر ئەوەی لێ وەردەگیرێ : (فَلاَ تَأْكُلا مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَة)، بەڵام بۆچی دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقۡرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ ﴾ وە نافەرموێ : (فَلاَ تَأْكُلا مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَة) ؟ چونکە لە ئەنجامی نزیك بوونەوەیان دا لێی ، دەخلیسکێنو دەکەون ، وەك لە پەیمانی کۆنیشدا هاتوە دەڵێ : {کاتێك کە تەماشایان کرد ، بەرەکەی زۆر جوان بوو، زۆر سەرنج ڕاکێش بوو، زۆر دڵ بزوێن بوو}[1]، هەڵبەتە مرۆڤ لە ئەنجامی لێ نزیك کەوتنەوەی لە هەندێك گوناهـ ، دەخلیسکێ، بۆیەش خوای پەروەردگار لە باسی زینادا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا ﴿٣٢﴾ ﴾الإسراء، واتە: توخنو نزیکی زینا مەکەون .

یان لە باسی مەی (خمر)دا بە هەمان شێوە دەفەرموێ : دەفەرموێ :

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ ﴿٩٠﴾ ﴾ المائدة، خۆتانی لێ دوور بگرن، واتە: توخنی مەکەون، چونکە کە توخنی کەوتیو، لێی نزیك بوویەوە، ڕەنگە وردە وردە

---

١) پێشتر دەقەکەی تەوراتمان هێنا .

لێی بچیە پێش، کەواتە: لێرەدا کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ ﴾ هەمان مانا دەگەیەنێ، کە: (فَلاَ تَأْكُلاَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةَ)، چونکە هەندێك گوتوویانە: ئادەمو حەووا بۆیە هەڵخەڵەتاون، چونکە خوای پەروەردگار فەرموویەتی : نزیکی مەکەون، نەیفەرمووە : لێی مەخۆن، بەڵام لە ڕاستییدا : {لێی نزیك مەکەون}، مانایەکەی بەهێزترە لە {لێی مەخۆن}، هەر بۆیەش خوای زانا دوایی دەفەرمویٚ : ﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴾، ئادەم سەرپێچیی لە فەرمانی پەروەردگاری کردو، سەرگەردان بوو، ئنجا ئەگەر ﴿ وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ ﴾ مانای : (فَلاَ تَأْكُلاَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةَ) نەگەیاندبایە، بە سەرپێچیی دانەدەنرا.

**هەڵوەستەی سێیەم:** ئایا ئەو بەهەشتە لە کوێ بووە ؟ چونکە وشەی (جنّة) یانی : باغ، ئێمە بە کوردیی دەڵێین: بەهەشت، ئەگەرنا لە ڕاستییدا وشەی (جنة) لە زمانی عەرەبییدا ، مانای باغە، وەك خوا لە سوورەتی (الکهف) ئایەتی: (٣٢)دا دەفەرمویٚ: ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَٰبٍ وَحَفَفْنَٰهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا ﴾، وە هەروەها لە سوورەتی (القلم)یشدا دەفەرمویٚ: ﴿ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ﴿١٧﴾ ﴾، کەواتە: (الجنة) بە مانای باغ دێ، ئنجا ئایا ئەو باغە لە کوێ بووە؟ هەندێك لە زانایان دەڵێن : باغێك بووە لەسەر زەوی لە شوێنێکی بەرز، هەڵبەتە لەوبارەوە کە ئایا ئەو باغە، هەر هەمان باغو بەهەشتە کە خوا بۆ بڕوادارانی داناوە ؟ یان باغێك بووە لەسەر زەوی ؟ مشتومڕێکی زۆر بووە لە نێوان زانایانداو (إبن قيم الجوزية) لە کتێبی (مفتاح دار السعادة)دا بە تەفصیلّ باسی کردوە، بەڵام ئەوەی دەچێتە عەقڵەوە ، ئەوەیە کە ئەو باغە، ئەو بەهەشتە، هەر ئەو بەهەشتەیە کە خوا بۆ ئیماندارانی داناوە، چونکە ئەو وەسفانەی کە خوا بۆ

ئەو باغە دەیانکات ، تەنیا بەسەر بەهەشتدا دەچەسپێن، کە دەفەرموێ :

﴿ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ ﴾

واتە: بۆت هەیە لەوێدا نە برسی بی، نە ڕووت بی، نە گەرمات بێو، نە تینووت بێ، کە بێگومان لە باغی دنیادا شتی وا نیە، وە پاشان خوای کارزان بۆی باسی هیچ باغێکی دیکە نەکردووین جگە لە بەهەشت، کەواتە: وشەی (الجنة) (أل)ەکەی ئەلیفو لامی (تعریف)ە، یاخود ئەلیفو لامی (عهد)ەو، یەکسەر دەچێتەوە بۆ ئەو بەهەشتەی کە خوا بۆ ئیماندارانی داناوە، ئنجا وەك گوتم ئەو پێداویستییانەش کە خوا باسی کردوونو بۆ ئادەمو حەووا دابین کراون، بە تەئکید جگە لە بەهەشتێك کە خوا بۆ ئیماندارانی داناوە ، هیچ باغێکی سەر زەوی ، ئاوا بەو وەسفانە دەستناکەوێ .

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ : ﴿ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِىَ لَهُمَا مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ ﴾، لێرەدا پێنج هەڵوەستە دەکەین :

**هەڵوەستەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾، ئەمە ئەوەی لێ وەرناگیرێ کە شەیتان ئادەمو حەووای نەدیتبن، وە قسەی لەگەڵدا نەکردبن، بۆچی؟ بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای پەنهانزان باسی وەسوەسە دەکات لە سووڕەتی (الناس)دا، دەفەرموێ: ﴿ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾ الناس ، ئنجا ئەگەر جند بە شێوەی پەنهانو نەبینراو، وەسوەسە دەخاتە دڵی ئینسانەوە، بەدڵنیایی مرۆڤ دەبینرێ کە وەسوەسە دەخاتە دڵی مرۆڤەوە، چونکە خوا دەفەرموێ: ئەو خۆ پەنهانکەرەی کە خوتخوتە دەخاتە سینەی

خەڵـکەوە، ئـەو پەنهانکـەرە کە لـە جنـدو مـرۆڤـە، کەواتـە: دەگونجـێ شـەیتـان بینـدرابـێ، وێڕای ئەوەی وەسوەسـەی خستۆتە دڵـی ئادەمو حـەووا، بینـرا بێـتو ڕووبـەڕووش قسـەی لەگـەڵـدا کـردبن، وەك پێشتـریش باسـمان کـرد .

**هەڵوەســــــتەی دووەم :** کــــە دەفــــەرموێ: ﴿ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا ﴾، ئەمــە ئــەوەی لــێ وەردەگیــرێ کــە بـەهــۆی خـــواردنەکەوە عەورەتیــان بۆیـان دەرکـەوتوە، وە ئیـبلیســیش زانیـویەتــی کــە لــە ئەنجـامی خـواردنیـان لە بـەری ئەو درەختـە، عـەورەتیـان بۆیان دەردەکەوێو ئـاشکرا دەبێ.

**هەڵوەســــــتەی سێیـــــەم :** کــە دەفــەرموێ: ﴿ وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴾، ئیبلـیس بــە دوو شـــتان ئـادەمو حەووای فریـو داون، کـە هەردووکیشیان بـە پێچـەوانەوە بـوون ! چونکـە گوتوویـەتـی :

أ ) بۆ ئەوەی نەبـنە دوو فریشـتـە.

ب ) بۆ ئەوەی نەبنـە هەرمـاوو، هـەر ژیاو، بۆیە خـوا فەرموویـەتی : لەو درەختـە مەخـۆن، بـەڵام بـە پێچـەوانـەوە : ئەگەر لێـیان نەخـواردبـایە :

١/ وەك دوو فریشـتە دەژیـانو تووشـی گونـاح نەدەبـوون.

٢/ وە ژیــانێکی هەمیشـەیشـــییان دەســـتدەکەوت، کەواتـــە : هەمیشــــە فێــــڵو تەڵەکـانی شـەیتـان ، پێچـەوانەی خێـرو بەرژەوەنـدیی مرۆڤـیان تێـدایـە.

**هەڵوەســــــتەی چـــــــوارەم :** کــــە دەفــــەرموێ: ﴿ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾، ئەمە ئەوەی لـی وەردەگیـرێ کە ڕوو بـەڕوو قسـەی لەگـەڵدا کردوون، چونکـە ئەگـەر ڕوو بـەڕوو نەبـێ، سـوێند ناخـورێ.

**هەڵوەستەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿فَدَلَّـٰهُمَا بِغُرُورٍ﴾، واتە: بەهۆی فریودانەوە شۆڕی کردنەوە ، هەڵبەتە خوا تەفصیلو درێژەکەی باس نەکردوە، بەلاّم دیارە بە شێوەیەك فریوی داون ، کە ئەوان هەستی پێ نەکەن، نەك یەکسەر زانیبێتیان ئەوە سەرپێچییەو گوناهە، بەڵکو دەبێ بە جۆرێك فێڵی لێ کردبن ، کە ئەوان هەستی پێ نەکەن، کە ئەوە گوناهو تاوانە، بەلاّم گرنگ ئەوەیە کە ئینسان تووشی گوناهو تاوان بوو، بە هەڵخەڵەتاندن بێ، یان بە هەر جۆرێك بێ، هەر گوناهو تاوانە، وە دەبێ باجەکەشی هەر بدات.

**مەسەلەی دەیەم** : کە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِ﴾، لێرەشدا دوو هەڵوەستە دەکەین :

**هەڵوەستەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا﴾، دیارە ئەوە حاڵەتێکی نائاساییە، چونکە لە دنیادا شتی وانیە، ئینسان شتێك بخواو عەورەتی بەدیار بکەوێ، بۆیە ئەمە حاڵەتێکی نائاسایی بووە، کە خوای کارزان بۆ خۆی وردەکاریی و تەفصیلەکەی دەزانێ، وە هەندێك لە زانایان دەڵێن : بەرگێکی نوورییان لە بەردابووە، لە ئەنجامی گوناهکردنیاندا، ئەو بەرگە نوورییە، لەبەرچاویان داکەنراوە، چونکە لە سوورەتی (الأعراف)دا، لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا﴾ پۆشاکەکەیانی لێ دادەکەندن، چونکە هەندێك لە توێژەروان گوتوویانە: لە ئەنجامی خواردنیان لەو درەختەدا ، پاشەڕۆکیان پەیدابووەو، هەستیان بە پاشو پێشی خۆیانو عەورەتی خۆیان کردوە ! بەلاّم واپێناچێ ئەوە ڕاست بێ، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا فەرموویەتی : ﴿يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآ﴾، پۆشاکەیانی لێ دادەڕنین، بۆ ئەوەی عەیبەکانی خۆیانیان

پێشـــان بـدات، کەواتــە : جۆرێـك لـە پۆشـاكیان لەبــەردا بـووە ، لـە ئەنجـامی خـواردنیان لەو درەختەدا ، پۆشاكەكـانیان لەبـەر داكەنراوە ، وە هەر ئەوە نـەبووە کە پۆشـاكەکە شـتێکی نـووریی‌و ڕووحیـی بووبـێ، بـەڵـكو پۆشـاكێكیان لەبــەردا بووە لە ئەنجامی خـواردنیـان لـەو درەختــەدا ، پۆشـاكەكـانیان لەبــەر داكـەنراوە، وە عـەوڕەتـی خۆیانیـان بۆ دەركـەوتـوە.

**<u>هەڵوەسـتەی دووەم</u> :** وە ئەوەش لەم ئـایەتە وەردەگیـرێ، کە شـەرم‌و حەیـا شـتێکی خـوارِسـكە لـە ئینسـاندا، واتـە: ئینسـان پێـی ناخۆشــە عـەوڕەتی دیـار بـێ، پێـی ناخۆشــە پـاش‌و پێشـی دیــار بــێ، ئـەوە شــتێكی سروشـتییــە هــەر لـە ئـادەم‌و حـەوواوە، هەر كەسێك كە مرۆڤ بێـت‌و، سروشـتی تێك نەچووبـێ‌و لـە سروشـتی خـۆی هەڵنـەگـەڕابێتـەوە، شــەرم‌و شكۆی هەیـە‌و، پێـی ناخۆشــە عەیـب‌و عــارو عـەوڕەتی دەربكـەوێ.

لـەوبارەوە ئەم فەرمایشـتەی پێغـەمبـەر ﷺ هەیە ، كە حاكم هێنـاویـەتی‌و بـە (صـحیح)یشـی دانـاوە، پێغـەمبــەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ آدَم كَـانَ رَجُـلاً طِـوَالاً كَـأَنَّهُ نَخْلَةَ سَحُوقٌ كَثِيرُ شَعْرِ الـرَّأْسِ ، فَلَمَّا وَقَـعَ بالخَطِيئَةِ، بَدَتْ لَـهُ عَوْرَتُـهُ، وَكَـانَ لا يَرَاهَا قَبْل ذَلِكَ، فَانْطَلَق فَارّاً، فتعرَّضَتْ لَـهُ شَجَرَة فَحَبَسَـتهُ بشعره ، فَقَـالَ : أَرْسِـلِينِي، فَقَـالَتْ: لَسـت بِمرْسَـلِتك، فَنَـادَاهُ رَبُّـهُ : يَـا آدَمُ أَمِـنِّي تَفِـرُّ ؟ قَـالَ : لاَ ، وَلَكِــنْ استحْيَيْتُــكَ﴾ {أَخْرَجَــهُ الطَّبَــرِي فِــي "تفســيره" بــرقم: (١٤٠٣١٤)}، واتە: بێگـومان ئـادەم پیاوێكی درێژ بـوو، وەك دارخـورمایەكی بــەرز وابـوو، زۆر كەڵەگــەت بـوو، وە قــژی ســەری زۆر بـوو، كـاتێك كـە تووشـی ئـەو هەڵـەیە بوو، عـەوڕەتی خۆی بۆ دەركـەوت، كە پێش ئەمە نەیدەبینـی، ئنجـا كـە ڕای كــرد، درەختێك هاتە پێشـی، وە قـژی سـەری لـە درەختەكـە ئـاڵقـا، ئـادەم بــە درەختەكـەی گـوت: بــەرمدە، درەختەكە گـوتی: بــەرت نـادەم، پەروەردگــاری بانگی كـرد: فەرمووی: ئـایـا لە مـن ڕا دەكـەی ؟ گوتــی : نەخێر ، بـەڵام شــەرمم لە تۆ كــرد.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾، تەماشا دەکەین: ئادەمو حەووا سەلامی خوایان لێ بێ، دوای ئەوەی گوناهیشیان کردووەو سەرپێچیشیان کردوە، خوا چەند بە شێوەیەکی میهرەبانانە دەیاندوێنێ ﴿ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ ﴾، ئایا قەدەغەم نەکردن لەم درەختە، وە پێشم نەگوتبوون کە شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆتان ؟

کەواتە: کاتێك کە تووشی گوناهو هەڵە دەبین، با لە بەزەیی‌و میهرەبانیی بێسنووری خوا نائومێد نەبین، چونکە هەر چەندە گوناهی ئێمە زۆریش بن، گەورەش بن، بەڵام بەرانبەر ڕەحمەت‌و بەزەیی بێسنوورو میهرەبانیی خوا، هەر بچووکن، واتە: کە تووشی گوناه دەبین، با تووشی نائومێدیی نەبین، بەڵام گوناهی خۆشمان پێ بچووك نەبێ، چونکە لە بەرانبەر گەورەیی خوادا، دەبێ بە گەورەیان ببینین، بەڵام کە ویستمان بگەڕێینەوە بۆ لای خوا، هەرچەندە گوناهمان زۆرو گەورە بن، با نائومێد نەبین، چونکە ڕەحمەتی خوا لە گوناهی ئێمە گەورەترەو فراوانترە.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾، ئادەمو حەووا لێرەدا چوار وشەیان بەکارهێناون :

١) ﴿ رَبَّنَا ﴾، واتە: ئەی پەروەردگارمان ! ئەی ئەو کەسەی کە تۆ پەروەردگاری ئێمەی، ژیێنەری ئێمەی، مرێنەری ئێمەی، ڕۆزیدەری ئێمەی، تۆ ئێمەت دروست کردوە، تۆ سەرپەرشتیارمانی، تۆ مشوورخۆرمانی، ئەی ئەو کەسەی کە ئاوای !

٢) ﴿ ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا ﴾، ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، خەتای خۆمانبوو، خەتایەکە ناگێڕنەوە بۆ لای خوا، هەرچەندە بە ویستی خوایە، بەڵام ویستی خوا ﷻ مرۆڤەکان ناچار ناکات کە گوناح بکەن، ویستی خوا مرۆڤەکانی ئازاد کردوە، بە ویستی خۆیان گوناه دەکەن، بۆیە خوا سزایان دەدات، وە بە ویستی خۆشیان چاکە دەکەن، بۆیە خوا پاداشتیان دەداتەوە.

٣) ﴿ وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا ﴾، وە ئەگەر لێمان نەبووریو ڕەحممان پێ نەکەی، پێویستییان بە هەر کام لە: لێبوردنی خوا، وە بەزەیی خوا هەیە، لێبوردنی خوا بۆ ئەوەی گوناهەکەیان بپۆشێ، وە بەزەیی خوا بۆ ئەوەی ڕەحمیان پێ بکات، وە دوای ئەو گوناهبارییە، چاکیان بکاتو، دەرووی خێریان لێ بکاتەوە.

٤) ﴿ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾، بێگومان ئێمە لە زیانباران دەبین، کەواتە: ئینسان بەهۆی گوناهەوە، زیان دەکات، بەڵام ئەگەر لێبوردنو بەزەیی خوای بەخشەر دەفریا بێ ، گوناهیش زیان لە ئینسان نادات.

**مەسەلەی سێزدەیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ٢٤ قَالَ فِيهَا تَحۡيَوۡنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنۡهَا تُخۡرَجُونَ ٢٥ ﴾، چوار هەڵوەستەی کورتیش لەبەردەم ئەم دوو ئایەتەدا دەکەین :

**هەڵوەستەی یەکەم:** کە دەفەرموێ : ﴿ ٱهۡبِطُواْ ﴾، واتە: شۆڕببنەوە ، هەڵبەتە هەم ئیبلیس هەڵەی کردوە، هەم ئادەمو حەووا هەڵەیان کردوە، بۆیە دەبێ باجی هەڵەکەی خۆیان بدەن، گوناهکردنو تاوانکردنو لادان لە فەرمانی خوای پەروەردگار، دەبێتە مایەی شۆڕبوونەوەو دابەزینی ئینسان، بەڵام

ئیبلیس چونکە دانی بە هەڵەی خۆی دانەهێنا، بەڵکو هەڵەکەی خۆی بە هەڵەیەکی گەورەتر پینە کرد، بۆیە خوا غەزەبی لێ گرتو نەفرینی لێکرد، بەڵام ئادەمو حەووا دانیان بە هەڵەی خۆیان دا نا، بۆیە خواش لێیان خۆش بوو.

**هەڵوەستەی دووەم :** ﴿ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ ﴾، هەندێکتان بۆ هەندێکتان دوژمنن، بە تەئکید ئیبلیسە کە دژایەتیی ئادەم دەکات، چونکە ئادەم نەیفەرمووە: ئەی خوایە ! ئەوە ئیعلانی دژایەتییم لەگەڵ ئیبلیس کرد ! بەڵکو ئیبلیس بوو ئیعلانی دژایەتیی کرد بۆ ئادەم، بەڵام بۆیە خوا دەفەرموێ: ئێوەش بە دوژمنی بگرن، ﴿ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾، چونکە تۆ کەسێك دژایەتییت بکات، نابێ تەسلیمی بیو، دۆستایەتیی بکەی، دەبێ تۆش بەرهەڵستیی بکەیو لە بەرانبەریدا بوەستی.

**هەڵوەستەی سێیەم :** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴾، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە بەشەر تەنیا دەتوانێ لەسەر زەوی بژی، وە ئەوە کە باس دەکرێ کە گوایە : لە خڕۆکەکانی دیکەدا ژیان هەیە، ئەگەر گریمان ژیانیش هەبێ، یان هەلومەرجێك هەبێ کە ئینسان بتوانێ تێیدا بژی، کە تاکو ئێستا شتی وا دەرنەکەوتوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ژیانی ئینسان بەس لەسەر زەوی دەبێ، وە لەسەر زەوییش کۆتایی پێ دێ، وە دوایی لەسەر زەوییش مرۆڤەکان زیندوو دەکرێنەوە، کەواتە: هەرچی دەگوترێ دەربارەی ئەوە کە ژیان لە خڕۆکەیەکی دیکەدا هەبێو، ئینسان بتوانێ لە شوێنێکی دیکەی جگە لە زەوی دا، ژیان بگوزەرێنێ، بەس خەیاڵ پڵاوە، بە پێی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ئێوە ژیانتان هەیە لە زەویداو تێیدا نیشتەجێ دەبن، تاکو کاتێکی دیاریکراو .

**هەڵوەســـتەی چـــوارەم :** کـە دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴾، کەواتە: ژیانەکە هەر لـێرەدایە، وە مەرگـو کۆتایی پێهاتنـی مرۆڤەکانیش هـەر لەسـەر زەوییە، وە جارێکی دیکـەش دەرهێـنرانەوەشـیان هـەر لە زەوییە، بەڵام ئایا خـوای زانـاو توانـا لە چ جەســتەیەکدا ، وە لە چ ماددەیەك ، وە چۆن زینـدوومان دەکاتەوە ؟ ئەوە وەك خـوا بۆخـۆی لـە ئـایەتی ژمـارە (٦١)ی سوورەتی (الواقعة)دا دەفەرموێ : ﴿ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ بـە شێوەیە ك دروسـتتان دەکەینەوە، کە نایزانـن، مەرج نیە بـەو شێوەیەی ئێسـتا بـێ، بـەڵام گرنگ ئەوەیە هەم لە جەســتە پێـك دێـینو هـەم لـە ڕووح، بـەڵام بـە شـێوەیەکی دیکـە کـە خــوای زانــای کــارزان دەزانـــێ، وە لەگــەڵ قۆنـاغــی قیـامــەتو ڕۆژی دوایــی دا دەگونجــێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی (٢٦ تاکو ٣٦)، دیارە لەو یازدە ئایەتەدا خوای بەرزو مەزن چوار جار بانگی مرۆڤایەتیی دەکات، بە:

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، ئەی وەچەی ئادەم ! ئەی ڕۆڵەی ئادەم ! وە هەرجارە بابەتێکی گەورەو گرنگیان پێ ڕادەگەیەنێ.

جاری یەکەمیان دوای ئەوەی کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، ئاگاداریان دەکاتەوە، کە پۆشاکی داپۆشەری عەوڕەتیانی پێ بەخشیون، وێڕای پۆشاکی خۆ پێ ڕازاندنەوەیان، وە سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ گرنگیی پۆشاکی پارێزکاریی.

پاشان ئاگاداریان دەکاتەوە کە لە پیلانی شەیتان وریا بن، وە بە دەردی بابو دایکیانیان {ئادەمو حەووا سەلامی خوایان لەسەر بێ} نەبات، کە لە بەهەشتێ وەدەرنان، دوای ئەوەی کە عەوڕەتیانی دەرخست ! چونکە شەیتان دەیانبینێ بێئەوەی ئەوان ببینن .

پاشان باسی هەندێ هەڵوێستو بیروڕای پووچی کافرەکان دەکات، کە کاری ناقۆڵای خۆیان بە ڕێبازی بابو باپیرانیانو، فەرمان پێکراوی خوا دادەنێن ! کە بەڵێ ڕێبازی بابو باپیرانیانە، بەڵام بە تەئکید فەرمان پێکراوی خوا نیە.

ئنجا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە پێیان ڕابگەیەنێ، (واتە بە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان) وە پێیان بڵێ: خوا ، فەرمان بە شتی ناقۆڵا ناکات، وە تەنیا فەرمان بە شتی ڕێکوپێكو دادگەرانە دەکات، وە فەرمانیشیان پێبکات ، کە ڕوو بکەنە خوا بە ساغییو لێی بپاڕێنەوە، پاشان خوا ڕایدەگەیەنێ، کە بەشەر دوو بەشی

سەرەکیی پێکدێنێ : هیدایەتدراوو سەرلێشێواو، دیارە سەرلێشێواو بەهۆی دۆستایەتییکردن لەگەڵ شەیتانەکانەوە، وە هیدایەتدراویش، بەهۆی شوێن پێ‌هەڵگرتنی پێغەمبەرانەوە .

ئنجا بۆ جاری سێیەم خوا بانگی وەچەی ئادەم دەکات، لەبارەی خواردنو خواردنەوەو جوانیی نیعمەتەکانی خواوە ، چەند ڕێنماییەکیان دەکات ، وە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کە پێیان بڵێ: خوا چیو چی قەدەغە کردوە، کە چوار شتی سەرەکیین، وە هەرچی شتی حەڕامو خراپە ، ئەو چوارە دەیگرنەوە .

پاشان ئاگاداریان دەکاتەوە کە : هەر کۆمەڵگایەك کاتێکی دیاریکراوی هەیە بۆ لەنێوچوونو سەر بە فەتارەت چوون .

وە سەرەنجام بۆ جاری چوارەمو کۆتایی بانگی وەچەی ئادەم دەکات ، کە دوای هاتنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ، وە خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا لەلایەن پێغەمبەرانەوە، ئەوانەی چاکەکارو پارێزکاربن ، سەرفرازن ، وە بێبڕواو خۆ بەزلگرانیش خاوەنو هاوەڵی دۆزەخن .

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ
ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ٢٦ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ
أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ
وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ٢٧ وَإِذَا
فَعَلُواْ فَٰحِشَةٗ قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ
أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٢٨ قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ
عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ٢٩ فَرِيقًا
هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُۗ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ ٣٠ ۞ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ
وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ
أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ
يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٣٢ قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ
مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ
سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٣ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٞۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا
يَسۡتَأۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ٣٤ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ
عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِيۙ فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٥ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ
بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٣٦ ﴾.

## مانای وشـه به وشەی ئایەتەکـان

((ئەی نەوەی ئـادەم ! بەدڵنیـایی پۆشاکمان دابەزاندۆتە سەرتان ، عەورەتەکانتان دادەپۆشێ، وە بۆ ڕازاندەوەشتان، وە پۆشاکی پارێزکاریی ، ئا ئەوە چاکترە، ئەو "ڕەخساندنی پۆشاك"ەش لە نیشانەکانی خوایە ، بەڵکو بیتەوە یادیان "کە چۆن بژین و بەڕێوەبچن !" ﴿٢٦﴾ ئەی نەوەی ئادەم ! "وریابن" شەیتان فریوتان نەدات، وەك چۆن بابو دایکتانی (لە بەهەشتێ) وەدەرنان، پۆشاکەیانی لێ دادەڕنین ، تاکو عەورەتەکانی خۆیانیان پێ نیشان بدات، بە دڵنیاییەوە (ئیبلیس) خۆی و کۆمەڵەکەی ئێوە دەبینن، "بەڵام" ئێوە نایانبینن، مسۆگەر ئێمە شەیتانەکانمان کردوونە دۆستو نزیکی ئەوانەی بڕوا ناهێنن ﴿٢٧﴾ وە کاتێك بێبڕوایان کارێکی دزێویان کرد، گوتیان: بابو باپیرانمان لەسەری بینیوە، وە خوا بەوەوە فەرمانی پێکردووین، بڵێ: بێگومان خوا فەرمان بە شتی ناقۆڵاو خراپ ناکات، ئایا شتێك بە ناوی خواوە دەڵێن ، کە نایزانن ﴿٢٨﴾ بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی بە دادگەریی و ڕێکیی کردوە، وە ڕووەکانتان "بەرەو خوا" ڕاست بکەن ، لەلای هەر مزگەوتێك، وە بە ملکەچییەکی ساغەوە لێی بپاڕێنەوە، وەك چۆن لە سەرەتاوە هێناوونی ، دەشگەڕێنەوە بۆ لای وی ﴿٢٩﴾ کۆمەڵێکی لێ خستوونە سەر ڕێی ڕاست "کە شایستە بوون" و کۆمەڵێکیشیان گومڕاییان لەسەر پێویست بووە، چونکە لە جیاتی خوا، شەیتانەکانیان بە دۆست گرتووە، پێشیان وایە ڕێی ڕاست گرتووانن ﴿٣٠﴾ ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم ! لە لای هەر مزگەوتێك خۆتان بڕازێننەوە، وە بخۆن و بخۆنەوەو زێدەڕۆیی مەکەن، بە دڵنیایی ئەو "خوا" زێدەڕۆیی کارانی خۆش ناوێن، بڵێ: کێ ئەو جوانییەی خوا "دروستی کردوە"و ڕۆزییە خۆش و بەسوودەکانی قەدەغە کردوون، کە بۆ بەندەکانی هێناونیە دی؟! بڵێ: ئەو شتانە بۆ ئەوانەی لە ژیانی دنیادا بڕوایان هێناوە، لە ڕۆژی قیامەتدا تایبەتن بەوانەوە، بەو شێوەیە ئایەتەکان ڕوون دەکەینەوە، بۆ کۆمەڵێك کە بزانن ﴿٣٢﴾ بڵێ: پەروەردگارم ! تەنیا ئەو شتانەی قەدەغە کردوون : گوناهە ناشیرینەکان بە ئاشکراو پەنهانەوە، وە گوناهو دەست

درێژیی بە ناهەق، وە ئەوە کە شتێك بکەنە هاوبەشی خوا، کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەناردۆتە خوار، وە کە شتێك بە ناوی خواوە بڵێن، کە نایزانن ﴿٣٣﴾ وە بۆ هەر کۆمەڵێك کاتێکی دیارییکراو هەیە، "کە تێیدا دەفەوتێن"، ئنجا هەر کات کاتی دیارییکراویان هات، نە سەعاتێك دوا دەکەون، نە پێش دەکەون ﴿٣٤﴾ ئەی ئادەمزادەکان ! هەر کاتێك پێغەمبەرانێك لە خۆتان بێنە لاتان ، ئایەتەکانی منتان بەسەردا بخوێننەوە ، ئەوە هەر کەس پارێز بکاتو ، چاکەو چاکسازیی بکات ، نە ترسیان لەسەرەو نە خەمباریش دەبن ﴿٣٥﴾ بەڵام ئەوانەی بڕوا بە ئایەتەکانمان نەهێننو لە ئاستیاندا خۆیان بە زل بگرن ، ئا ئەوانە هاوەڵی دۆزەخن ، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ﴿٣٦﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَرِيشًا ): (رِيشُ الطّائِرِ معْرُوف وَلِكَونِ الرّيشِ لِلْطائِرِ كالثِّيَابِ لِلإِنْسانِ استعِيرَ لِلْثِيَابِ وَاللِّبَاسِ الفَاخِرِ)[1]، وشەی (ریش) واتە: پەڕ ، پەڕی باڵندە ، ئنجا لەبەر ئەوەی پەڕی باڵندە ، وەك بەرگو پۆشاك وایە بۆ مرۆڤ ، بۆیە وشەی (ریش) بۆ بەرگو پۆشاكێك كە ڕێكو جوانبێ ، جێی شانازیی بێ ، خواستراوەتەوەو بەكارهاتوە .

(لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ): (طبري) دەڵێ: (لا يَخْدِعَنَّكُمْ)، واتە: هەڵتان نەخەڵەتێنێ، (لا يُوقِعَنَّكُمْ في شِدّة وَبَلاَء) یا نەتانخاتە نێو سەختییو بەڵاوە (أصْلُ الفَتْنِ: إدْخَالُ الذَّهَبِ النَّار لِتَظهَر جَوْدَتُهُ مِنْ رَدَاءَتِهِ) واتە: ئەسڵی وشەی (فِتنَة) لە (فَتْن)ەوە هاتوە، (فَتْن)یش ئەوەیە زێڕ بخەیە نێو ئاگر، بۆ ئەوەی چاكو خراپی لەیەك جیابێتەوە، وەك خوای كاربەجێ بە مووسای فەرمووە: ﴿...وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ...﴿٤٠﴾﴾ طه، واتە: تۆمان تاقیكردەوە بە چەند تاقیكردنەوەیەك، تاكو خڵتەی پێوە نەهێڵێ.

(وَقَبِيلُهُۥ ): (القَبِيلُ: جَمْعُ قَبِيلَة، وَهِيَ الجَمَاعَة المُجْتَمِعَةُ الَّتِي يُقْبِلُ بَعْضُهَا عَلَى بَعْض)، وشەی (قبيل) كۆی (قبيلَة)یە، وە (قبيلَة)ش بریتیە لە كۆمەڵە خەڵكێك كە كۆبوونەتەوە، وە هەندێكیان ڕوو لە هەندێكیان دەكەن.

(فَٰحِشَةً ): (الفُحْشُ وَالفَحْشَاءُ وَالفَاحِشة: مَا عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأفْعَالِ والأقْوَالِ ...) وشەی (فُحْشُ، فَحْشَاءُ، فَاحِشة) هەرسێكی، هەرشتێكە كە زۆر ناشیرین بێ لە قسەو كردەوە، هەر كردەوەیەك ، یان قسەیەكی زۆر ناشیرینو ناقۆڵاو دزێو ، پێی دەگوترێ: (فُحْشُ) یان (فَحْشَاءُ) یان (فَاحِشة) .

---

١) مختار الصحاح : ص ٢٤٢.

(زِينَتَكُمۡ ) : (الزِّيْنَةُ: الحَقِيقِيَةُ مَا لا يَشِينُ الإِنْسَان فِي شَيء مِنْ أَحْوَالِهِ لاَ فِي الدُّنِيا وَلاَ فِي الآخِرَة، وَالزِّينَة ثلاث: زِينَة نَفسِية ، كَالعِلْمِ وَالإِعتِقَادَاتِ الحَسَنَة، وَزِينَة بَدَنِيَة ، كَالقُوَّةِ وَطُولِ القَامَةِ، وَزِينَةُ خَارِجِيَة ، كَالْمَالِ وَالجَاه)، وشەی (زينة) بە مانای جوانیی ڕاستەقینەیە، ئەوەیە کە ئینسان ناشیرین نەکات، لە هیچ حاڵێکی دا، چ لە دنیاو چ لە دوارۆژدا، وە جوانیی ڕاستەقینە سێ جۆرە: جوانییەکی خودیی، وەك زانیاریی‌و عەقیدەی ڕاست‌و تەواو، وە جوانیی جەستەیی: وەك هێزو بالأبەرزی، وە جوانیی دەرەکی: وەك ماڵ‌و جاهو دەست ڕۆشتوویەتیی‌و ، (الزِّيْنَةُ: مَا يُتَزَيَّن بِهِ)[١]، وە (زينة) هەر شتێکە کە ئینسان خۆی پێ جوان بکات.

(وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ ) : (السَّرْفُ: تَجَاوُزُ الحَدِّ فِي كُلّ فِعْل ، يَفْعَلُهُ الإِنْسان)، (سَرْف) بریتیە لە سنووربەزاندن لە هەر شتێکدا کە ئینسان پێی هەڵدەستێ.

(وَٱلطَّيِّبَٰتِ ) : (وأصْلُ الطَّيِّبِ: مَا تَستَلِذُّهُ الحَوَاسُ ومَا تَستَلِذُّهُ النَّفْسُ) لە بنچینەدا (طَيِّب) هەر شتێکە کە هەستەکان تامی لێوەربگرن، بۆنێکی خۆش، تامێکی خۆش، ڕەنگێکی جوان، دەنگێکی خۆش، هەموویان پێیان دەگوترێ: (طَيِّب)، هەموو ئەو شتانەی کە خۆشن، وە هەرشتێك کە نەفس لەززەتی لێبکات، وشەی : (طَيِّب)یان بۆ بەکاردێ.

(نُفَصِّلُ ) : (الفَصْلُ: إِبَانَةُ أَحَدِ الشَّيْئَيْنِ مِنَ الآخَر)، (فَصْل) بریتیە لەوە کە دوو شتان لێك جیا بکەیەوە، (وَنُفَصِّل : نُبَيِّنُ)[٢] (نُفَصِّل) یانی : ڕوونی دەکەینەوە .

(وَمَا بَطَنَ ) : (البَطْنُ: خِلاَفُ الظَّهْرِ مِنْ كُلّ شَيءٍ)، (بَطْن) واتە: پەنهان، هەر شتێك دوو دیوی هەبن، یاخود ئاشکراو پەنهانی هەبێ، دیوی بەرانبەری

---

١) مختار الصحاح: ص٢٥٤.

٢) مختار الصحاح: ص٤٤٠.

پشتەکەی، یاخود دیوی بەرانبەری ئاشکرایەکەی پێی دەگوترێ: (بَطْن)، واتە: پەنهان، یاخود زگ، (وَيُقَالُ لِكُلّ غَامِضٍ: بَطْن) وە هەر شتێکی پەنهان، پێی دەگوترێ : (بَطْن) و (وَيُقَالُ لِمَا تُدْرِكُهُ الحَاسَة : ظَهْر) وە هەر شتێکیش بە هەستەوەرەکان بزانرێ، پێی دەگوترێ: پشت (ظهر)، یاخود ئاشکرا، (وَلِمَا يَخْفَى عَنْهَا بَاطِنًا)، وە هەر شتێکیش لە هەستەوەرەکان پەنهان بێ، پێی دەگوترێ : (بَاطِن)، بەوەی دیکەش دەگوترێ: (ظاهر) ئاشکرا.

(وَٱلۡإِثۡمَ ): (الإِثْمُ وَالأثَامُ: اسْمُ لِلأَفْعَالِ المُبطِئَةِ عَنِ الثَّوَابِ، وَجَمْعُهُ: آثَام)، وشەی (إثم وأثام) ناوە بۆ ئەو کردەوانەی کە ئینسان لە پاداشت دوا دەخەن، کۆیەکەیان بریتیە لە: (آثام)، واتە گوناهەکان .

(وَٱلۡبَغۡيَ ): (البَغِيُّ: طَلَبُ تَجَاوزِ الإِقْتِصادِ فِيمَا يُتَحَرّى، تَجَاوَزَهُ أم لَمْ يَتَجَاوَزَهُ، كَمًّا، وَكَيْفًا) ، وشەی (بَغِي) بریتیە لەوە کە ئینسان لە شتێکدا بیەوێ لە سنوور تێپەڕێنێ ، ئنجا تێپەڕێنێ ، یا تێنەپەڕێنێ ، واتە : سنووری نێوەڕاست، لە ڕووی چۆنیەتی یان چەندێتی یەوە .

(يَقُصُّونَ ): (قَصَّ عَلَيْهِ الخَبَرُ قَصَصا: تَلاَهُ، وَحَكَاهُ..)، هەواڵ خوێندنەوە پێی دەگوترێ: (قَصٍّ وَقَصَصْ)، (قَصَّ عَلَيْهِ) واتە: هەواڵەکەی بەسەردا خوێندەوە .

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنەوە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾ :

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَهِيَ عُرْيَانَةٌ، فَتَقُولُ: مَنْ يُعِيرُنِي تِطْوَافًا؟ تَجْعَلُهُ عَلَى فَرْجِهَا، وَتَقُولُ الْيَوْمَ يَبْدُو بَعْضُهُ أَوْ كُلُّهُ، فَمَا بَدَا مِنْهُ فَلاَ أُحِلُّهُ ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ ﴾﴾ رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم (٣٠٢٨)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو باوکی ڕازی بێ، دەڵێ: ئافرەت لە سەردەمی نەفامییدا بە ڕووتیی طەوافی دەکرد، بە دەوری کەعبەدا، وە دەیگوت: کێ بەرگێکی هەیە کە طەوافی پێ بکەم ؟ "ئەوان پێیان وابوو ئەو بەرگو پۆشاکەی کە گوناهیان پێکردوە، دروست نیە طەوافی پێ بکەن ، لەبەرئەوە بەرگەکەی خۆیان دادەنا ، ئنجا ئەگەر بەرگێکی دیکەیان دەست کەوتبایەو لەبەریان کردبایە، باش بوو ، ئەگەرنا بە ڕووتیی یان بە نیوە ڕووتیی طەوافیان دەکرد"، ئنجا ئەگەر بەرگی دەست نەکەوتبان ، ئەو ئافرەتە دەستی بە عەورەتی خۆی دەگرتو دەیگوت : ئەمڕۆ هەندێکی یان هەموو دەردەکەوێ ، ئەوەی کە دەریش کەوت ، بە ڕەوای دانانێم کەس تەماشام بکات .

ئەوە لە سەردەمی نەفامییدا یەکێك بووە لە عادەتە خراپو ئەفسانەییەکان، ئیدی بەو بۆنەوە، ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ ... ﴾.

# مانای گشتی ئایەتەکان

دیارە پاش ئەزموونی تاڵی ئادەمو حەووا سەلامی خوایان لێ بێ، کە هەڵەیان کردو، بەهۆی شەیتانەوە بەهەڵە داچوون، وە فریوی دان، پاشان داوای لێبوردنیان لە خوا ﷻ کردو ئەویش لێیان خۆشبوو، پاش ئەوە خوا ﷻ بانگی مرۆڤایەتیی دەکات، وە ئاگاداریان دەکاتەوە، کە پەند لە دایكو باوکیان وەربگرن، وە ئەم ئایەتانە بە گشتی ڕۆڵی گرنگو گەورەی پۆشتەیی، وە خۆداپۆشین لە ژیانی مرۆڤدا دەردەخەن.

ئنجا وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەماندا گوتمان : لەم (١١) ئایەتەدا خوا ﷻ چوار جار بانگی مرۆڤایەتیی دەکات، بە: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، ئەی وەچەی ئادەم ! ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم ! دەیاندوێنێ، سەرەتا دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ ﴾، ئەی وەچەی ئادەم ! ئێمە پۆشاکێکمان دابەزاندۆتە سەرتان کە عەورەتتان دادەپۆشێ، وە ڕیشیشمان بۆ دابەزاندن، (ڕیش) وەك پێشتر گوتمان : لە ئەسڵدا بە پەڕی باڵندە دەگوترێ، بەڵام لەوەوە خوازراوەتەوە، نەك تەنیا بۆ خۆداپۆشینو خۆپاراستن لە سەرماو گەرما، بەڵکو بۆ جوانییو ڕازانەوەش بەکاردەهێنرێ، چونکە دیارە خەڵك هەم بە مەبەستی عەورەت داپۆشینو خۆپاراستن لە سەرماو گەرما پۆشاك لەبەر دەکەن، هەم بە مەبەستی جوانییو خۆجوان پێشان دان، ﴿ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ﴾، ئنجا خوا ﷻ لە باسی بەرگو پۆشاکەکان دا سەرنجی مرۆڤەکان ڕادەکێشێ بۆ گرنگیی پۆشاکی پارێزکارییو دەفەرموێ: ئا ئەوە چاکترە، کە ئەگەر پۆشاکی جەستەیی جەستەمان دادەپۆشێ، وە لە سەرماو گەرما دەمانپارێزێ، وە جوانمان دەکات لەبەر چاوی خەڵك، وە ڕواڵەتمان جوان دەکات، ئەوە پۆشاکی تەقوا، ناخمان دادەپۆشێ، وە ناخمان دەپارێزێ لە گوناهو تاوانو لادان، وە ڕووحمان جوان دەکات، کە جێگای تەماشاو سەرنجی خوای پەروەردگارە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى أَجْسَادِكُمْ، وَلاَ إِلَى صُوَرِكُمْ، وَلكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وأعْمَالِكُمْ﴾،{أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٨١٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٦٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١٤٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٩٤)، وَالبَيْهَقِي في "شعب الإيمان" برقم: (١٠٤٧٧)، وَالدَّيْلَمِيُّ برقم: (٦١٤)}، واتە: بێگومان خوا تەماشای جەستەو دیمەنتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵو کردەوەکانتان دەکات.

کەواتە: عاقڵ ئەو کەسەیە کە زیاتر غەم بخوات لە جوانکردنو ڕازاندنەوەی ئەوەی کە جێگای سەرنجی خوایە، کە ناخو دڵو دەروونە، کە ئەویش بەهۆی تەقواوە جوان دەبێ، هەڵبەتە ئەگەر ئینسان ڕواڵەتی خۆشی بڕازێنێتەوەو جوان بکات، بەڵام لەسەر حیسابی ناخی نەبێ، ئەوەش هەر شتێکە شەرع داوای کردوە، وەك دوایی باسی دەکەین، ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾ ئا ئەوە لە نیشانەکانی خوایە، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن ، یان بۆ ئەوەی ڕاستییەکان بێننەوە بیر خۆیان ، واتە : ڕوونکردنەوەی ئەو حەقیقەتە ، لە نیشانەکانی خوایە ، یاخود دروستکردنی بەرگو پۆشاكو ، ئەو کەرەستەو هۆکارانەی بەرگو پۆشاکیان لێ دروست دەکرێ ، وەك: خوریی، موو، تووکی ژیانداران ، پەڕو تووکی پەلەوەران ، نایلۆن ، لۆکە ، ئاوریشمو ، گەلێك شتی دیکە کە بەرگو پۆشاکیان لێ دروست دەکرێ ، ئەوە نیشانەی کاربەجێیو مشوورخواردنی خوای پەروەردگارو ، بەزەیی نواندنێتی بۆ بەندەکانی.

ئنجا بۆ جاری دووەم دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ ﴾، ئەی وەچەی ئادەم ! با شەیتان هەڵتان نەخەڵەتێنێ، لە خشتەتان نەبات، وەك چۆن بابو دایکتانی لە بەهەشت وەدەرنان، ئایا چۆنی لە بەهەشتێ وەدەرنان ؟ ﴿ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ﴾، کاتێك کە بەرگو پۆشاکەکانیانی لێ دادەڕنین ، خوای پەروەردگار بۆیە دیمەنەکە بە کرداری ئێستا (فعل المضارع) دێنێ بۆ ئەوەی بە عەقڵو چاوی دڵ تێیڕا مێنین کە : ئەوە شەیتان خەریکە بەرگو پۆشاکیان لێ دادەڕنێ ، تاکو عەورەتو عەیبو عاریان

دەرخات، وە سەرەنجام شایستەی ئەوە نەبن، كە چی دیكە لە بەهەشتدا بمێننەوە، ﴿ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ﴾، بێگومان ئەو خۆیو كۆمەڵەكەی، كە شەیتانەكانن‌و وەچەی خۆینی، دەتانبینن بە شێوەیەك كە ئێوە ئەوان نابینن، ﴿إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، بێگومان ئێمە شەیتانەكانمان كردوون بە دۆستی ئەوانەی كە ئیمان ناهێنن، كەواتە: شەیتانێك بتبینی‌و تۆ نەیبینی، ئەگەر پەنا نەبەیتە بەر خواو، ئەگەر پۆشاكی تەقواو قەڵغانی تەقوا بەسەر خۆتەوە بەرز نەكەیتەوە، زەفەرت پێ دەبات.

ئنجا خوا باسی بێبڕوایەكان دەكاتو، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ﴾، وە كاتێك شتێكی ناقۆڵا دەكەن، (فَاحِشَة) هەر قسەو كردەوەیەكە كە دزێوو ناشیرین‌و ناقۆڵا بێ، هەندێكیش گوتوویانە : وشەی (فَاحِشَة) تایبەتە بە لایەنی جینسییەوە، بەڵام ئەوە ڕاستترە كە (فَاحِشَة) هەر گوناهێكە كە زۆر ناقۆڵاو ناشیرین‌و دزێو بێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی جنیسەوە هەبێ ، چ پەیوەندیی بە لایەنی قسەو تەعبیرەوە هەبێ ، چ پەیوەندیی بە ئەندامەكانەوە هەبێ ، چ پەیوەندیی بە لایەنی ماڵ‌و سامانەوە هەبێ ، هەمووی پێی دەگوترێ : (فَاحِشَة) ، ( فَحش) ، (فَحشَاء) ، ئنجا هەركات گوناهێك ، خراپەیەك دەكەن ، ﴿ قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ﴾، دەڵێن : ئێمە باب‌و باپیرانمان لەسەر ئەو گوناهو كردەوانە بینیوە، وە خوا فەرمانی پێكردووین ، ﴿ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ﴾، بڵێ : خوا فەرمان بە شتی ناقۆڵاو ناشیرین‌و دزێو ناكات، نەیفەرمووە: باب‌و باپیرانتان وا نەبوون، بەڵكو خوای كاربەجێ بەس ئەوە نەفی دەكات كە تێیدا ڕاستیان نەكردوە ، بەڵام ئەوەی دیكە كە ڕاستیان كردوە ، خوای دادگەر لێی بێدەنگە ، واتە : ڕاستە باب‌و باپیرانتان وایانكردوە ، بەڵام خوا فەرمانی بەوە نەكردوە ، ﴿ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا

﴿تَعۡلَمُونَ﴾، ئایا شتێك بە ناوی خواوە دەڵێن ، کە نایزانن، چۆن دەزانن خوا فەرمانی بەوە کردوە ؟ خۆ کتێبێکتان لەبەردەستدا نیە، وە بە پێی عەقڵو مەنتیق خوا فەرمان بە شتی خراپ ناکات، خوایەك کە خاوەنی هەموو سیفەتێکی پەسەندو چاکە، چۆن فەرمان بە خراپەو کردەوەی دزێوو ناشیرینو هەڵەو پەڵە دەکات؟! پاکیی بۆ خوا، ﴿قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِ﴾، پێیان بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی کردوە بە دادگەریی، بە ڕێكو پێکیی بە هەموو شتێکی چاكو ڕێكو ڕاست، ﴿وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾، وە فەرمانیشی کردووە، پێی فەرموون : ڕووی خۆتان ڕاست بکەن لە لای هەموو مزگەوتێك، یان لەلای هەموو پەرستگایەك، بەندایەتیی ڕاستو ساغ بۆ خوا بکەن ، ﴿وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾، وە بە ساغیی لە خوا بپاڕێنەوە، واتە: خڵتەی شیركو ڕیای تێمەکەن، بە ساغیی‌و ڕاستی لە خوا بپاڕێنەوە، چونکە (مُخْلِص) کە لەسەر وەزنی (مُفْعِل)ە، کەسێکە کە کردەوەکەی خۆی ، یاخود پاڕانەوەکەی خۆی، دەرباز کردبێ‌و خاوێنی کردبێتەوە لە خڵتەو پڵتە، وشەی (دین)یش بە مانای ملکەچیی دێ ، واتە : ملکەچیی خۆتان بۆ خوا ساغ بکەنەوە، یانی: کاتێك لە خوا دەپاڕێنەوە، لە جگە لە خوا مەپاڕێنەوە ، ﴿كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ﴾، وەك چۆن ئێوەی دەست پێکردووە ، هێناوەتە دی، بەو شێوەیەش دەگەڕێنەوە، واتە: لێتان دەپرسرێتەوە، بۆیە وریابن‌و بزانن لەو ژیانی دنیایەدا کە جێگای تاقیکردنەوەیە ، چۆن مامەڵە لەگەڵ خوادا دەکەن ! ﴿فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ﴾، خوا کۆمەڵێکی لێ ڕێنمایی کردوون ، کە شایستەی ئەوە بوون ، وە کۆمەڵێکیش گومڕاییان لەسەر پێویست بووە ، شایستەی بوون، بۆچی؟ ﴿إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ﴾ ئا ئەوانە شەیتانەکانیان لە جیاتی خوا

کرد بە پشتیوانو بە دۆستی خۆیان، وە پێشیان وایە کە ڕێی ڕاست گرتووانن ، کەواتە : مەرج نیە ئینسان کە بە ڕێی ڕاستی نەزانی ، هەمیشە خاوەن پاساو (عُذْر) بێ ، چونکە ئەوەتا خوا دەفەرموێ : ئەوانە شەیتانەکانیان لە جیاتی خوا کردوە بە دۆستی خۆیان ، وە پێشیان وایە ڕێی ڕاستیان گرتوە ، بابایەکی نەصرانیی ، جوولەکە ، مەجووسی ، ئێزیدیی ... هەر کەسێك کە لایداوە ، دیارە پێشی وایە ڕێی ڕاستی گرتوە ، مەرج نیە ئەهلی نەجات بێ، مادام وا نەبێ کە پاساوی هەبێ بۆ بێ ئاگاییەکەیو نەزانییەکەی، مادام هیدایەتی لەبەردەست دابێ، وە بتوانێ لە هیدایەتەکە بکۆڵێتەوەو پێی ئاشنا بێ ، بەڵام کەمتەرخەمیی بکاتو پشتگوێی بخات، ئەوە لەڕاستییدا مانای وایە، بیانووی نیە بۆ شوێنکەوتنی گومڕاییو سەرگەردانییو سەرلێشێواویی.

ئنجا بۆ جاری سێیەم خوا ﷻ بانگی مرۆڤایەتیی دەکات، دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ﴾، ئەی وەچەی ئادەم ! لەلای هەر مزگەوتێك خۆتان برازێننەوە، جوانیی خۆتان بە خۆوە بخەن، واتە: بەرگو پۆشاکی جوان لەبەر بکەن، وە خۆتان برازێننەوە بۆ دیداری خوا، کاتێك کە دەتانەوێ ڕازو نیاز لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بکەن، ﴿ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ ﴾، ئنجا وەك چۆن لەگەڵ خوادا دەبێ بە ئەدەبەوە ڕەفتار بکەنو، بەرگو پۆشاکی جوان لەبەر بکەن، کاتێك دەتانەوێ پەرستش ئەنجام بدەن، بە هەمان شێوەش پێویستە هەقی جەستەشتان بدەن، هەقی پەروەردگارتان بدەنو، هەقی جەستەشتان بدەن، بخۆنو بخۆنەوە، بەڵام زێدەڕۆیی مەکەن، بۆچی؟ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾، بێگومان خوا زێدەڕۆیی کارانی خۆشناوێ، هەڵبەتە دوایی ئێمە هەڵوەستەی زۆر دەکەین، لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا.

پاشان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِ ﴾، پێیان بڵێ: بە پرسیارلێکردنی نکوولیی لێکەرانەوە (الإستفهام الإنكاري) بڵێ: ئەو جوانییەی کە خوا بۆ بەندەکانی وەدەریناوە، وە ئەو

ڕزق ڕۆزییە خۆش‌و بەسوودانەی کە وەدیهێناون، کێ قەدەغەی کردوون ؟ واتە: خوا ئەو شتانەی بۆ بەندەکانی دروست کردوون، ئنجا ئایا کە خوا بەدیهێنەرو پەروەردگاری ئەو شتانەیە، ئەگەر بۆخۆی قەدەغەی نەکردبن، کێ لە بەندەکانی خوای قەدەغەی کردوون ؟! ﴿ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ ﴾، بلێ: ئەو جوانییەو ئەو ڕزق‌و ڕۆزییە، وە ئەو خواردن‌و خواردنەوە بەلەززەت‌و خۆش‌و بەسوودانە، بۆ بڕواداران لە ژیانی دنیادا، وە لە دواڕۆژدا بۆ ئەوان ساغ دەبێتەوە، لە دنیادا دیارە کافرو مسوڵمان لە نیعمەتەکانی خوا بەهرەمەندن، بەڵام لە دواڕۆژدا ساغ دەبنەوە بۆ بڕواداران، واتە: بەشی کافرانیان پێوە نابێ، ئەوان لە جیاتی نیعمەت نیقمەتیان دەبێ، لە جیاتی خۆشیی‌و لەززەت، سزاو ئەشکەنجەیان دەبێ، ﴿ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە ئایەتەکانمان ڕوون دەکەینەوە، بۆ کۆمەڵێك کە بزانن، کێ قەدری قورئان دەزانێ ؟ کێ لە ئایەتەکانی خوا تێدەگات ؟ کەسانێك کە ئەهلی زانست بن ، کەسانێك کە ئەهلی عەقڵ بن ، وەك لە شوێنێك دەفەرموێ : ﴿ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ١٦٤ ﴾البقرة ، وە دەفەرموێ: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ ٦٥ ﴾الأنعام ، بەڵێ لە ڕاستییدا وەك گوتراوە : قەدری زێڕ لە لای زێڕینگەرە ، کەسێك قەدری ئیسلام‌و قورئان دەزانێ، وە کەسێك لە یاساکانی شەریعەت حاڵی دەبێ، وە دەزانێ چەند بەجێن، کە خاوەنی عەقڵێکی باش بێ، خاوەنی زانست‌و شارەزایی بێ.

ئنجا خوای پەروەردگار باسی ئەوە دەکات کە چی قەدەغە کردوە لە بەندەکانی، دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾، بلێ: بێگومان پەروەردگارم تەنیا ئەم شتانەی قەدەغە کردوون :

یەکەم: ﴿ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾، گوناهە ناقوڵاو دزێوو ناشیرینەکان، قسەو ڕەفتارە ناقۆڵاو نابەرچاوەکان، چ ئاشکراکانیان، چ پەنهانەکانیان.

دووەم : ﴿ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، وە گوناهو دەستدرێژیی بە ناهەق، ئنجا دیارە گوناهو دەستدرێژیی هەر بە ناهەقن، بەڵام لێرەدا بۆ زێدە خستنە ڕووی خراپیی گوناهو دەستدرێژیی، یاخود گوناهو سنوورشکێنیی ، خوای بەرزو مەزن وشەی :﴿ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، کردۆتە وەسفو قەیدیان، هەندێکیش دەڵێن :﴿ وَٱلْبَغْىَ ﴾ واتە: سنوورشکێنیی، ئنجا کەسێك سنووری خۆی بەرەو تۆ بشکێنی، تۆش بۆت هەیە سنوور بەرەو ئەو بشکێنی، کە ئەو کاتەش: ﴿ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾ نیە، چونکە، خوا دەفەرموێ : ﴿ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ﴿١٩٤﴾ ﴾ البقرة، هەروەها دەفەرموێ : ﴿ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ﴿٤٠﴾ ﴾ الشورى، بۆ نموونە : کەسێك کەسێك لە تۆ دەکوژێ، تۆش بۆت هەیە ئەو کەسە بکوژیەوە، چونکە دەربارەی تۆڵەکردنەوە، خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ ﴿١٧٩﴾ ﴾ البقرة، کە دیارە کوشتن هەر خراپە، بەڵام مادام بە هەق بێ ، خراپ نیە ، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿١٥١﴾ ﴾ الأنعام ، ئەو نەفسەی کە خوا قەدەغەی کردوە ، بە هەق نەبێ مەیکوژن ، کەواتە : ئەگەر بە هەق کوشتت ، بەڵێ بە ڕواڵەت سنوورت بەزاندوە بەرەو ئەو ، بەڵام ئەو سنوور بەزاندنە هەقە ، وە هەندێکیش دەڵێن : وشەی : ﴿ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، بۆ زیاتر دەرخستنی ناشیرینیی : (الإثم والبَغِي) یە .

سێیەم: ﴿ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا ﴾، وە خوا قەدەغەی کردوە ، شتێك بۆ خوا بکەنە هاوبەش ، کە بەڵگەی لەسەر نەناردۆتە خوار، دیارە خوا هاوبەشی نین، کەواتە: هەر شتێکیش بکرێتە هاوبەشی خوا، هیچ بەڵگەیەك پشت ڕاستی ناکاتەوەو، پشت ئەستوور نیە بە هیچ بەڵگەیەك، کەواتە: شتێك بەڵگەی لەسەر نەبێ، کە هاوبەشی خوایە ، لەگەڵ خوادا مەیکەنە هاوبەش ، لە بەندایەتیی بۆ کردندا، یان لە هەر شتێك لەو شتانەدا کە تایبەتن بە خواوە، وەك بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و ناوو سیفەتو کردەوەکانی خوا : خوا ڕزق دەدات، خوا شیفا دەدات، خوا لە بەندەکانی دەبووری، ئەوانە پاڵ مەدەنە لای جگە لە خوا.

وە ئەو شتانەی کە دەبێ بۆ خوا ئەنجام بدرێن، وەك پاڕانەوە، قوربانیی کردن، نەزر کردن، سوێند بە خوا خواردن، مل بۆ خوا کەچکردن، تەنیا خوا لە هەموو شتێك زیاتر خۆشویستن، لە خوا زیاتر ترسان لە هەموو شتێك، تەنیا پشت بە خوا بەستن، لەوانەدا هیچ کەسێك و هیچ شتێك بەشدار مەکەن، چونکە هیچ کام لەو شتانە بەڵگەی لەسەر نیە، کە جگە لە خوا تێیان دا هاوبەشی خوا بێ.

چوارەم: ﴿ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾، وە خوا قەدەغەی کردوە بە ناوی خواوە شتێك بڵێن، کە زانیارییتان دەربارەی نیە، واتە: شتێك بڵێن کە بەڵگەی لەسەر نیە بە ناوی خواوە، بە ناوی دینی خواوە، هەر کات بەناوی ئاین و بەرنامەی خواوە گوتت : ئەو شتە حەڵاڵە ، یان ئەو شتە حەرامە ، ئەو شتە چاکە ، ئەو شتە خراپە ، دەبێ بەڵگەی لەسەر بێ ، بەڵگەی شەرعیی، هەر کەسێك لە بواری حەڵاڵ و حەرام دا، وە لە بواری چاکەو خراپەدا ، هەر شتێك بڵێ کە بەڵگەی شەرعیی بەدەستەوە نەبێ ، ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە، چونکە شتێکی بە ناوی خواوە گوتوە، کە زانیاریی پێی نیە.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٞۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَأۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ﴾، وە بۆ هەر کۆمەڵێك، بۆ هەر کۆمەڵگایەك کاتێکی دیارییکراو

هەیە، كە تێیدا لەبەین دەچن، ئنجا كاتێك كاتی دیارییكراوی لەبەین چوون هات، نە سەعاتێك دوا دەخرێن، نە سەعاتێك پێش دەخرێن، بە وردیی لە كاتی دیارییكراوی خۆیاندا لەبەین دەچن، ئنجا هەم تاك تاكیان كاتی دیارییكراویان هەیە، كاتی ئەجەلیان هەیە، وە هەم بە كۆمەڵ كۆمەڵیش كاتێكی دیارییكراوو، ئەجەلیان هەیە كە تێیدا لەبەین دەچن.

بۆ جاری چوارەمو كۆتایی دەفەرمویٚ : ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، ئەی وەچەی ئادەم ! ئەی رۆڵەكانی ئادەم ! ئەی ئادەمزادەكان ! ﴿ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي ﴾، هەر كاتێك پێغەمبەرانێك لە خۆتان، واتە: وەك خۆتان بەشەرن، لەگەڵتاندا دەژین ، وەك ئێوە هەست بە گەرماو سەرما دەكەن، هەست بە خۆشییو ناخۆشیی دەكەن ، وەك ئێوە لە گۆشتو خوێن پێكهاتوون ، بە زمانی خۆتان دەتاندوێنن ، هەر كاتێك رەوانەكراوانێكتان لە خۆتان بۆ لاتان هاتن ، ﴿ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي ﴾، ئایەتەكانی منیان بەسەردا دەخوێندنەوە ، ﴿ فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾، دوای ئەوەی پێغەمبەرانێك (علیهم الصلاة والسلام)، دێن لە خۆتان ئایەتەكانی منتان بەسەردا دەخوێننەوە : هەر كامێك لە ئێوە پارێزكار بێو، چاكەكار بێ، نە ترسیان هەیە بۆ داهاتوو، نە خەمو پەژارەش دادەگرن بۆ رابردوو، یاخود نە هەست بە مەترسیی دەكەن، نە هەست بە دڵتەنگیی دەكەن، واتە: بەرانبەر خوا، وە بەرانبەر دیداری خوا ﷻ، ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، بەڵام ئەوانەی كە لە جیاتی ئەوەی پارێز بكەن، ئایەتەكانی خوا بە درۆ دادەنێن، وە لە جیاتی ئەوەی كە چاكسازیی بكەن، خۆیان لە بەرانبەر ئایەتەكانی خوادا بە زل دەگرنو خراپەكاریی دەكەنو ستەم دەكەن، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئەوانە

هاوەڵی ئاگرن، یاخود خاوەنی ئاگرن، وە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، کەواتە: وریای خۆتان بن، ئەهلی تەقواو ئیصلاح بن، نەك ئەهلی کوفرو خۆ بە زلگریی، بۆ ئەوە وەبەر موژدەی خوا بکەون، کە ترس و خەم و پەژارەتان لەسەر نەبێ‌و، بچنە بەهەشتێکەوە کە هیچ ترس و هیچ دڵتەنگییەکی تێدا نەبێ، نەك بچنە دۆزەخێکەوە، کە سزای ئەوانەیە ئایەتەکانی خوایان بە درۆ داناوە، وە خۆیان لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا بە زل گرتوە، وە سەرەنجام خراپەکارییان کردوە لە زەویدا، وە شایستەی ئەوە بوون کە خوای دادگەر بە دۆزەخ سزایان بدات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴾.

پێنج هەڵوەستە لە بەرانبەر ئەم ئایەتەدا

**هەڵوەستەی یەکەم** : لە ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، (یا) ئامرازی بانگ کردنە (أَدَاةُ النِّدَاء)

بەڵام یەکێك بۆی هەیە بڵێ: بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم ! ئەی وەچەکانی ئادەم ؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بۆیە ئێمە (بني آدم)مان، بە ڕۆڵەکانی ئادەم، بە وەچەی ئادەم، بە نەوەی ئادەمو، بە ئادەمزادەکان لێکداوەتەوە، چونکە هەردوو ڕەگەزەکە دەگرێتەوە، وشەی (بَنِي آدَمَ) واتە: ئەوانەی کە لە ئادەم پەیدا بوون، ئنجا نێر بن، یان مێ، لە زمانی عەرەبیدا بنچینەیەك هەیە کە پێی دەگوترێت: (تَغْلِيب الذُّكُورِ عَلَى الإِنَاث) کاتێك کە نێرو مێ پێکەوە باس دەکرێن، وشەیەك بەکاردەهێنرێ کە نێرینەکان دەگرێتەوە ،

بەڵام مێینەکانیش هەر دەگرێتەوە ، ئەگەرنا کە دەفەرموێ : ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، مانای : (یَا أبنَاء آدَمَ و یَا بَنَات آدَمَ) هەردووکیان دەگرێتەوە، وەك چۆن : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، هەرچەندە ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بۆ نێرینەیە ، بەڵام هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئافرەتانیش دەگرێتەوە، بەڵام خوا بە پێویستیی نەزانیوە ، بفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّتِيٓ آمنّ ﴾.

**هەڵوەستەی دووەم** : کە دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا ﴾، ئایا پۆشاك لە ئاسمان دابەزیوە ؟ خوا بۆچی دەفەرموێ : ﴿ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ ﴾، پۆشاكمان بۆ سەرتان ناردۆتە خوار، عەورەتو عەیبتان دادەپۆشێ؟ لە وەڵام دەڵێین: ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ﴿٢٥﴾ ﴾الحديد، واتە: ئاسنمان ناردۆتە خوارێ کە هێزێکی زۆری تێدایە، وە چەند سوودو کەڵکێکی تێدان بۆ خەڵك، ئەمە ئاماژەیە بۆ تەکنۆلۆژیای سەربازیی‌و تەکنۆلۆژیای مەدەنیی .

یان وەك ئایەتی ژمارە (٦) لە سوورەتی (الزمر)دا، کە دەفەرموێ : ﴿ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖ ﴾، واتە: خوا هەشت جووتی لە ئاژەڵان بۆ ناردوونە خوار، کە مەبەستی حوشتری نێرو مێ، ڕەشە وڵاخی نێرو مێ، وە حەیوانی سپی نێرو مێ، وە حەیوانی ڕەشی نێرو مێ، وەك لە سوورەتی (الأنعام)دا بە تەفصیلێ باسمان کردوە، ئنجا بۆچی وشەی دابەزاندن (إنزال) بەکارهاتوە، بۆ ئاسنیش‌و، بۆ ئاژەڵیش‌و، بۆ بەرگ‌و پۆشاکیش ؟

چونکە هەموو ئەو شتانە بە فەرمانی خوا دروست بوون، وەك بڵێیی: فەرمانی خوا دابەزیوە بۆ سەر زەوی، بۆ هێنانەدی ئەو کەرەستانەی کە ئەو شتانەیان لێ دروست دەبن، ئەو فەرمانە لەلایەن خواوە دابەزیوە، یان لەبەر ئەوەی کە ئاوی لەسەرەوەڕا دەبەزێنراو، دەبێتە هۆی ڕووەك‌و ، پاشان پەیدابوونی تووك‌و خوریی‌و مووی ئاژەڵ ...، بەڵام ڕای ڕاستتر هەر ئەوەیە کە ئەو شتانە بە فەرمانی خوا دروست بوون‌و، فەرمانەکەش لە خواوە دابەزیوە، کە ئەو شتانە لە زەویدا بخوڵقێن.

**هەڵوەستەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ ﴾، مانای (تُخْفِي وَيَسترُ عَورَاتِكُمْ) عەورەتتان دادەپۆشێو پەنهان دەکات، وە هەم جوانییشتان پێ دەبەخشێ، ﴿ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ﴾، وە پۆشاکی تەقوا ، ئەوە باشترە ، کە مەبەست پێی ئەوەیە تەقواش پۆشاکێکی مەعنەوییەو ناخی ئینسان دادەپۆشێ ، وە ناخی ئینسان دەپارێزێ، وەك چۆن پۆشاك ئینسان لە گەرماو سەرما دەپارێزێو، لە چاوی خەڵك دەیپارێزێ، کە عەیبو کەموکوڕیی ببینن، تەقواش کە ئەوەیە ئینسان کە عەیبو کەموکوڕیی تێدا پەیدا نەبێ، وا لە ئینسان دەکات کە ڕاستو ساغ بێ لەگەڵ خواو خەڵکدا، وە خۆی لە درۆو خیانەتو فێڵو غەشو ستەمو گوناهباریی‌و عەیبداریی بپارێزێ، پۆشاکی تەقوا وا لە ئینسان دەکات ڕووحی سەلامەتو پارێزراو بێ، وە هەر کەسێك ڕووحی نەخۆش‌و عەیبدار بێ، بە تەئکید سەلامەتیی‌و پارێزراویی جەستە سوودێکی پێ ناگەیەنێ ، چونکە لە ڕاستیدا جەستەی ئینسان توێکڵی ئینسانە ، بەڵام ڕووحی ئینسان نێوەڕۆك‌و کاکڵی ئینسانە.

**هەڵوەستەی چوارەم** : ئنجا ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ﴾، وەك ئەو ئایەتەی ژمارە (١٩٧)ی سووڕەتی (البقرة)یە، کە دەفەرموێ : ﴿ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰۖ ﴾ ، وە توێشوو هەڵبگرن، باشترین توێشوو تەقوایە ، لەوێ دەفەرموێ: ﴿ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰۖ ﴾، باشترین توێشوو تەقوایە، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ﴾، کەواتە: تەقوا لەوێ تەشبیھ کراوە بە توێشووو زادو زەخیرەیەك کە ئینسان هەڵیدەگرێ، لێرەش تەشبیھ کراوە بە بەرگو پۆشاکێك، کە ئینسان جوان دەکاتو دەیپارێزێ، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ﴾، مەبەست پێی پۆشاکێکە کە لە کاتی جەنگدا، مرۆڤ

دەپارێزێ، وەك : پۆشاكی خودەو زرێو قەڵغانو ئەو پۆشاكەی كە كاتی خۆی تیرو شیرو ڕمی لە ئینسان گێڕاوەتەوە، وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ ﴿٨١﴾﴾، واتە: بەرگو پۆشاكێك كە لە كاتی سەرماو گەرمادا دەتانپارێزی، وە بەرگو پۆشاكێك كە لە كاتی جەنگدا دەتانپارێزێ.

**هەڵوەستەی پێنجەم** : پاشان دەفەرموێ : ﴿ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾، ئا ئەمە لە نیشانەكانی خوایە، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن، یاخود بیر بكەنەوە، چییان بیر بكەویتەوە ؟ تاكو نیعمەتەكانی خوایان بیر بكەوێتەوە، وە ئەركی سەرشانی خۆیان بەرانبەر بە خوای تاكو پاك بیر بكەوێتەوە.

بەڵێ لە نیشانەكانی خوای پەروەردگار، بەرگو پۆشاكە، كە خوای پەروەردگار چەندان جۆرە كەرەستەی خاوی لە زەویدا داناون، كە جۆرەها بەرگو پۆشاكیان لێ دروست دەكرێ ، وەك : ڕووەك ، بۆ وێنە : پەمۆ، نایلۆن، ئاوریشم، مووو خوریی و تووكی ئاژەڵ ....، خوا ﷻ زۆر جۆرە كەرەستەی خاوی دروستكردووی كە چەندان بەرگو پۆشاكی جۆراو جۆریان لێ دروست دەكرێن، هەم بۆ خۆ پاراستن لە سەرماو گەرما، وە داپۆشینی عەیبو عار، وە بۆ خۆڕازاندنەوەو خۆ جوان كردن .

**مەسەلەی دووەم** : كە دەفەرموێ: ﴿يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ﴾، ئەی وەچەی ئادەم ! شەیتان فریوتان نەدات، وەك باب و دایكتانی لە بەهەشت دەركرد، بەرگو پۆشاكیانی لێ دارنین ، تاكو عەیبو عەورەتی خۆیانیان پێشان بدات .

**ئەمە چوار شتی لـێ وەردەگیرێن :**

١/ واتە پەند لە بابو دایکتان وەربگرن، ئێوەش بە مەرەدی بابو دایکتان نەچن، وە شەیتان وەك ئەوانی فریودا، ئێوە لە خۆتان وریابن، ئێوەش فریو نەدات.

٢/ ئنجا کە دەفەرموێ : پۆشاکیان لێ دادەڕنێ، نەك لێی داڕنین ، واتە : خوای زانا ، کە کارەکەی شەیتان بە کرداری ئێستا (فعل المضارع) دێنێ، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، بۆ ئەوەیە کە وێنەکەو مەشهەدەکە بێنێتە بەرچاوت ، کە تۆ بە کردار دەیبینیو تێوەی ڕادەمێنێ بە چاوی خەیاڵ .

٣/ کە دەفەرموێ: ﴿لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ﴾، تاکو عەورەتیانیان پێشان بدات، کەواتە: دەرخستنی عەورەتو عاری مرۆڤ ئامانجێکی گەورەی شەیتانە، کە بە داخەوە مرۆڤ هەتا لە ڕووی تەکنۆلۆژیاو لە ڕووی ماددییەوە پێش دەکەوێ، زیاتر عەورەتی خۆی دەردەخات ! چونکە کاتی خۆی کە مرۆڤ زۆر دواکەوتوو بووە، بەعاستەم خۆی داپۆشیوە، ئنجا وردە وردە کە بەرەوپێش چووە، خۆداپۆشینی زیادی کردووە، هەتا زیاتر بەرەوپێش چووە، زیاتر خۆی داپۆشیوە، بەڵام ئێستا دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نەفامییو سەردەمی سەرەتایی، کە هەرچەندە لە ڕووی تەکنۆلۆژیاو لە ڕووی ڕواڵەتییەوە بەرەوپێش چووە، بەڵام لە ڕووی ئینسانییو مەعنەوییەوە بەرەو دوا گەڕاوەتەوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە وردە وردە خۆی بەرەو ڕووتکردنەوەی زیاتر بردۆتەوە.

٤/ بێگومان ئەمە ئەوەشی لێوەردەگیرێ، کە ئادەمو حەووا پۆشاکێکیان لەبەردا بووە، وە شەیتان لێی داڕنیون، ئەوە نەبووە کە بەهۆی گوناهەکەیانەوە ــ وەك هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە ــ عەیبو عاری خۆیان، عەورەتی خۆیان، یاخود پاشو پێشی خۆیان، ئەندامەکانی زاوزێی خۆیان ببینن، بەڵکو پۆشاکێکی دیارییکراویان لەبەردابووە، لە ئەنجامی گوناهەکەیاندا، پۆشاکەکەیان لێ داکەنراوە، ئەدی بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا﴾؟ خۆ شەیتان نەچووە بەدەست لێیان دابڕنێ ، دەڵێین : چونکە لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئادەمو حەووا بەهۆی خواردنیان لەو درەختە قەدەغەکراوەوە، کە بە

دنەدانو خوتخوتەی شەیتان لێیان خوارد، ئەوەیان بەسەر هاتوە، کەواتە: وەك خۆی بەرگەکەی لێ دارنی بن، وایە.

# کورتە باسێک دەربارەی سنووری عەورەت و حوکمی داپۆشینی

**١) سنووری عەورەت[١] :**

**یەکەم** / سنووری عەورەتی پیاو :

لەسەر ڕای زۆربەی زانایان نێوان نێوك‌و ئەژنۆیە، بۆ نموونە: (أبو حنيفة) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، گوتوویەتی : (الركبة عورة) واتە: ئەژنۆ عەورەتە ، بەڵام ڕای دیکەش هەیە کە دەڵێ: عەورەتی پیاو تەنیا پاش‌و پێشیەتی، ئەم ڕایەش هی کۆمەڵێك لە زانایە، ئەوانیش (إبن أبي الذئب و داود الظاهري، وإبن أبي عبلة والطبري)ین، ئەوانە هەموو ڕایان وایە کە تەنیا پاش‌و پێشی پیاو عەورەتە، بەڵام ڕان‌و ئەندامانی دیکە هیچیان عەورەت نین، وە چەند شتێك لەوبارەوە بە بەڵگە دێننەوە:

١ - خوا دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗا ﴾، پۆشاکێکمان بۆ دابەزاندوون کە عەورەتتان دادەپۆشێ ، ئنجا عەورەتیش ئەوەیە کە ئینسان پێی ناخۆشبێ دەربکەوێ ، کە بەنسبەت پیاوەوە پاش‌و پێشیەتی .

---

١) الجامع لأحكام القرآن، ج٧، ص١٤٧.

٢ – ﴿عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، فَأَجْرَى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ فِي زُقَاقِ خَيْبَرَ "وفيه" ثُمَّ حَسَرَ الإِزَارَ عن فَخِذِهِ حَتَّى إِنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِ فَخِذِ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ﴾ {(أَخْرَجَهُ البُخَارِيّ برقم (٣٧١)، وَمُسْلِم برقم: (١٣٦٥))}، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشبڕکێی کرد {یاخود بە خێرایی ڕۆیشت، یاخود بە ڕاکردن}، لە کۆڵانەکانی خەیبەردا، وە لەو فەرموودەیەدا هاتوە : کە پێغەمبەر ﷺ کراسەکەی خۆی هەڵکرد، هەتا من تەماشای سپێتیی ڕانی پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد، {واتە: ڕانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرکەوتوە کاتێ کراسەکەی خۆی هەڵکردوە، بۆ ئەوەی چاك بتوانێ ڕا بکات}.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ڕان عەورەت نەبێ، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا ڕانی خۆی دەرنەدەخست.

٣ - مالیك ڕەحمەتی خوای لێ بێ گوتوویەتی: (السُّرَّةُ لَيْست بِعَوْرَة)، واتە: نێوك عەورەت نیە.

٤ - شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، گوتوویەتی: (لَيْست السُّرَّةُ وَلاَ الرُّكْبَتَانِ مِنَ العَوْرَةِ عَلَى الصَّحِيح)، واتە: نێوكو هەردوو ئەژنۆیەکان لە سنووری عەورەتدا نین، لەسەر قسەی ڕاست تر.

هەڵبەتە وەك پێشتر گوتمان : زۆرێك لە زانایان دەڵێن: بۆ پیاو نێوانی نێوكو ئەژنۆ عەورەتەو، بۆیەش ڕای ئەو زانایانەی دیکەشم هێنا، تاکو کاتێك مرۆڤ ناچار بوو بزانێ بوارو دەرفەت هەیە، هەروەها لە کاتی یاریی کردندا ، یان لە کاتی وەرزشدا ، ئەگەر کەسیکمان دی : ڕانی دیار بوو، یان ئەوانەی کە وەرزشی لەش جوانیی دەکەن ، مادام پاشو پێشیان داپۆشرابێ، بە پێی ڕای ئەو زانایانە : گوناهبار نابن ، هەڵبەتە تەنیا بۆ پیاوان.

**دووەم/ سنووری عەورەتی ئافرەت :**

بەڵام بە نسبەت ئافرەتانەوە، زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە عەورەتی ئافرەت هەموو جەستەیەتی، جگە لە هەردوو لەپە دەستیو ڕووی

(الوَجْـه وَالكَـفَّان) هەڵبـەتە مـن لـە کتێبـی: (ئـافرەتو خێـزان لـە سـایەی شـەریعەت دا)دا، وە لە کتێبی : (چەند بابەتێکی هونەریـی)دا بـە تەفصیلێ باسم کردوە، وە ڕای زانـایـانو بـەڵگەکانیشم لەوبـارەوە هێنـاون.

٢) حوکمی دا پۆشینی عـەورەت :

دەربـارەی حـوکمی داپۆشینـی عـەورەت (القُرطُبي) دەڵـێ: (لاَ خِلاَفَ بَيْنَ العُلَمَاءِ فِي وُجُوبِ ستر العَوْرَةِ) واتـە: ڕا جیـایی نیـە لـە نێـوان زانایان دا کـە پێویسـتە عـەورەت دابپۆشـرێ، پێشـتـریش باسـمان کـرد کـە سـنووری عـەورەتی پیاو بە ڕای ژمارەیەك لە زانایـان : تەنیـا پاشو پـێش (دبـر و قبـل)یـەتیو تەنیـا ئەوەنـدە پێویستە دابپـۆشـرێ ، بەڵام ڕای زۆرینـەی زانایـان ئەوەیـە کە عـەورەتی پیاو نێوان نێوكو ئەژنۆیەو دەبـێ ئـەو نێوانـە داپۆشـرێ، کـە بێگومـان ئەگـەر ئینسـان ئـەوە بکـات ، دووربینـیـی (إحتیـاط)ی زیـاتری تێدایـە ، بـەڵام لـە کـاتی ناچارییو تێکگیـران دا دەگونجـێ ڕایـەکـەی دیکـەش کـاری پـێ بکـرێ.

هەڵبـەتە مـن پێمـوایە کـە عـورفو بـاوی کۆمەڵگـاش تـا ڕاددەیەکـی زۆر کاریگـەریی هەیـە لەسـەر دیاریکـردنی سـنووری عـەورەت، مـادام دەق نەبـێ ، هەڵبـەتە ئەوە تەنیا بـە نسبـەت پیاوەوە، بـەڵام بـە نسبـەت ئافرەتـەوە کە دەقی ڕوون هـەن ، لەوبـارەوە حاڵەتەکە جیاوازە، بۆ وێنـە :

١ - خـوای پەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ ﴿٥٩﴾﴾ الأحـزاب، واتـە: با پۆشـاکەکانی خۆیـان لـە خۆیـانەوە بپێچـن، ئەوە باشـتـرە بۆ ئەوەی بناسێرن {کە بـە حەیاو حەشـمەتن} .

٢ - وە خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴿٣١﴾﴾ النـور، واتـە: وە با جوانیـی خۆیان دەرنەخـەن، مەگـەر ئەوەی کـە دەردەکـەوێ، وە با بـە سـەرپۆشـەکانیـان سـینگو بەرۆکیـان داپۆشـن .

شایانی باسیشە زۆربەی توێژەرەوان، زۆربەی فەرمووودەناسانو ، زۆربەی شەرعزانان دەڵێن : ئەوەی کە دەردەکەوێ دەمو چاوە لەگەڵ هەردوو لەپە دەست (الوَجْه وَالكَفَّان) .

کەواتە : بەپێی ئەو ئایەتانە، دەبێ سەرجەم ئەندامەکانی دیکەی جەستەی ئافرەت داپۆشرێن مادام خوا ﷻ بفەرموێ: با سەرپۆشیان لە سینگو بەرۆکیانەوە بپێچن ، مانای وایە ئەگەر سینگو بەرۆکیان دیار نەبێ ، کەواتە : لە پێشترە کە دەبێ ئەندامەکانی دیکەیان دیار نەبن ، هەر لە مووی سەر (قژ)یانەوە بگرە هەتا پێیەکانیان ، هەرچەندە بەشێك لە زانایانیش کە یەکیان (أبو حنیفة)یە ، ڕای وایە هەردووك پێیەکانی ئافرەتیش عەورەت نین .

**<u>مەسەلەی سێیەم</u>:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡ ﴾، ئیبلیس خۆیو کۆمەڵەکەی دەتانبینێ، بێ ئەوەی ئێوە ئەوان ببینن .

(الشوکاني) گوتوویەتی: (وَقَدِ استَدَلّ جَمَاعَةٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ بِهَذِهِ الآيَةِ عَلَى أَنَّ رُؤْيَةَ الشَّيَاطِينِ غير مُمْكِنَة، وَلَيْسَ فِي الآيَةِ مَا يَدلّ عَلَى ذَلِك، وَغَايَةُ مَا فِيهَا أَنَّهُ يَرَانَا مِنْ حَيْثُ لاَ نَرَاهُ ، وَلَيْسَ فِيهَا أَنَّا لاَ نَرَاهُ أَبَداً، فَإِنَّ انْتِفَاءَ الرؤْيَةِ مِنَّا لَهُ فِي وَقْتِ رُؤْيَتِهِ لَنَا ، لاَ يَستَلْزِمُ انْتِفَاءَهَا مُطْلَقاً)[1]، واتە : کۆمەڵێك لە زانایان ئەم ئایەتەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، لەسەر ئەوە کە شەیتانەکان نابینرێن، بەڵام ئەم ئایەتە ئەوەی تێدانیە کە بەڵگەبێ لەسەر ئەوە، ئەوپەڕی ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ، کە کاتێك شەیتانەکان ئێمە دەبینن، ئێمە ئەوان نابینین، بەڵام ئەوەی تێدانیە کە ئێمە هەرگیز ئەوان نابینین ، کەواتە : نەفیکردنی ئەوە کە بە شێوەیەك کە ئەو ئێمە دەبینێ ، ئێمە ئەو نابینین ، ئەوە ناگرێتەوە کە بە ڕەهایی ئێمە ئەو نەبینین، واتە: دەگونجێ بەو شێوەیەی کە ئەو ئێمە دەبینێ، ئێمە ئەو نەبینین، بەڵام ئێمە بە شێوەیەکی دیکە ئەو ببینین .

---

١) فتح القدير للشوكاني: ج٢، ص٢٤٣.

دیارە زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کاتێك کە شەیتانەکان جەستاندن (تَجَسُّد) دەکەن لە شێوەی مار، یان شێوەی پشیلە، یان شێوەی ئاژەڵ دا دەگونجێ ببینرێن، ئنجا بەڵگەش لەسەر ئەوە کە شەیتان کاتێك خۆی دەباتە سەر شێوەی شتی دیکە دەبینرێن، زۆر فەرموودە هەن، یەکێك لەوانە کە لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە، ئەو فەرموودەیە کە پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو هورەیرەی فەرموو: ﴿مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ البَارِحَةَ؟﴾[1]، واتە: دیلەکەی دوێنێ شەوت چی لێکرد ؟ کە ئەمە فەرموودەیەکی درێژە، لە تەفسیری سوورەتی (البقرة)دا هێناومانە : پێغەمبەر ﷺ ئەبو هورەیرە دادەنێ لەسەر زەکات، ئنجا سێ شەوان لەسەر یەك کەسێك دێ ، لە خورمای زەکات دەدزێ، هەموو جارێ ئەبو هورەیرە دەیگرێ، ئەویش دەڵێ بەرمدە، منداڵم هەیەو هەژارین، ئەویش بەریدەدا، پێغەمبەریش ﷺ هەموو جارێ دەفەرموێ: درۆی کردوەو دەگەڕێتەوە، هەتا کۆتا جار پێی دەڵێ: ئایەتێکت فێر دەکەم بیخوێنە، شەیتان توخنت ناکەوێ، ئایەتی کورسی بخوێنە، دوایی پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموێ: ﴿صَدَقَك وَهُوَ كَذُوبٌ﴾، واتە: ڕاستی لەگەڵ گوتووی ، هەرچەندە درۆزنیشە، پێشی دەڵێ: ئەمە شەیتان بووە .

هەروەها هەر لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عِفْرِيتًا مِنَ الْجِنِّ تَفَلَّتَ عَلَيَّ الْبَارِحَةَ ﴾[2] واتە: دوێنێ شەو عیفریتێك لە جند (شەیتانێکی یاخی جند) لێم بەرهەڵداو بەلەسە بوو.

کەواتە: دەگونجێ شەیتان شێوەی خۆی بباتە سەر ئینسانێك، یاخود ئاژەڵێك، یاخود دڕندەیەك، وە دەگونجێ ببینرێ، بەڵام لەسەر شێوەی خۆی نابینرێ.

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٣١١).

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٩٥٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٤١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٤١)، وَالنَّسائِيُّ في (الكبرى) برقم: (١١٤٤٠).

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، ئێمە شەیتانەکانمان کردوون بە دۆستو پشتیوانو نزیکی ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن، ئەمە چی لێ وەردەگیرێ ؟

لێرەدا خوا ﷻ یاسایەکی خۆی بۆ ئێمە دەخاتە ڕوو، ئەگەرنا ئەوە نیە خوا پێی خۆش بێ، ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن، شەیتانەکان ببنە دۆستیان، بەلآم :

﴿إِنَّا جَعَلْنَا ﴾، یانی : هەموو شتێك بە ئیرادەی خوایە، وە خوا لێرەدا یاسایەکی خۆی بۆ ئێمە دەخاتە ڕوو، کە هەر کاتێك ئینسان بێبڕوا بوو، شەیتان دەبێتە دۆستی، هەر کاتێك ئینسان خراپەکار بوو، شەیتان لێی نزیك دەبێ، وە بە پێچەوانەشەوە : هەر کاتێك ئینسان ئیماندار بوو، فریشتەکان لێی نزیك دەبن، یانی : مرۆڤ بە ئەندازەی ئەوە کە چاکە دەکات، لە خواو لە فریشتەکان نزیك دەبێ، وە لێیان بەهرەمەند دەبێ، وە بە ئەندازەی ئەوە، کە خراپەکار دەبێ ، لە شەیتان نزیك دەبێو لێشی زەرەرمەند دەبێ، وەك خوا ﷻ دەربارەی ئیمانداران لە سووڕەتی (فصلت) ئایەتی (٣٠)دا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ﴾ واتە: بێگومان ئەوانەی گوتوویانە: پەروەردگارمان خوایەو ، پاشان ڕاوەستاوو نەلەخشاو بوون لەسەر ئەوە ، فریشتەکان دادەبەزنە سەریان . عەرەبیش گوتوویانە : (الطّيورُ علَى أشْكالِهَا تَقَعُ)! واتە: باڵندەکان هۆگری شێوەکانی خۆیان دەبن ، قەل لەگەڵ قەل، کۆتر لەگەڵ کۆتر، کەو لەگەڵ کەو، کەواتە: کێ دەیەوێ لە خوا نزیکتر بێ، لە فریشتەکان نزیك بێ، با ئیمان لە خۆیدا قووڵتر بکاتەوەو، طاعەت لە خۆیدا زیاد بکاتو، زیاتر خۆی بۆ خوا ساغو چاكو پاك بکات، وە ئەگەر بە پێچەوانەشەوە بێ، دەبێ دڵنیا بێ کە شەیتانەکان لێی نزیك دەبنو زەفەری پێ دەبەن.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، بێبڕوایەکان کاتێك کردەوەیەکی ناقۆڵا دەکەن، {ئنجا کردەوەی ناقۆڵاو ڕەفتاری ناقۆڵا، چ کردەوەیەك بێ بە ئەندامەکان، چ قسە بێ بە زمان} دەڵێن : ئێمە بابو باپیرانمان لەسەر ئەو ڕەوشتو ڕەفتارو ئاکارە ناقۆڵایە بینیوە، وە خواش فەرمانی پێ کردووین، {بێگومان خوای پەنهانزان بە درۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ} بڵێ: خوا فەرمان بە شتی ناقۆڵاو ناشیرین ناکات، ئایا شتێك بەناوی خواوە دەڵێن، کە نایزانن ! .

پێشتر باسمان کرد : وشەی (فُحْشَ، فَحْشَاءَ، فَاحِشَة) یانی: (مَا عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ والأَقْوَالِ) هەرشتێکە کە زۆر ناشیرین بێ لە قسەو کردەوە، هەر کردەوەیەك، یان قسەیەکی زۆر ناشیرینو ناقۆڵاو دزێو، پێی دەگوترێ: (فُحْشُ) یان (فَحْشَاءُ) یان (فَاحِشَة) .

ئنجا بێبڕوایەکان دوو شت بە بەڵگە دێننەوە، بۆ کردەوە خراپەکانی خۆیان، دەڵێن: ﴿ وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ﴾، واتە: لاساییکردنەوە + درۆ کردن بە ناوی خواوە، (التَّقْلِيد + الإِفْتِرَاء) ئەمە وە نەبێ هەر موشریکو بتپەرستەکان وا بووبن، بەڵکو ئەوە عادەتی زۆرێك لە لادەرانە لە ڕێبازی ڕاستی خواو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، تەنانەت ئەهلی ئیسلامیش، مسوڵمانانیش کاتێك لە ڕێبازی خوا لادەدەن، بەهۆی لاسایی کردنەوەی کوێرانەی پێشینانەوەیە، بە کەسێك دەڵێی: ئەو شتە بیدعەتە، یان ئەو شتە حەرامە، دەڵێ: تاکو ئێستا بابو باپیرانمان هەر وایانکردوە، بە کەسێك دەڵێی ڕەشبەڵەك مەکەن، حەرامە ! دەڵێ: چۆن ئەوە عادەتێکی کۆنی کوردانە، یان دەڵێی: فلان شت مەکەن خراپە ! دەڵێ: تاکو ئێستا خەڵکمان بینیوە هەر وایکردوە، بەڵێ شوێنکەوتنی کوێرانەی پێشینان، هۆکارێکی گەورەو گرنگی لادانو خلیسکانی خەڵکە، لە ڕاستە شەقامی خوا .

پاشان درۆکردن بە ناوی خواوە، بە ناوی دینی خواوە، ئەویش دیسان هۆکارێکی دیکەی گەورەو گرنگی لادانی خەڵکە لە ڕاستە شەقامی خوا ، ئەو هەمووە بەناو فەرمووودەی هەڵبەستراو ، یاخود لێکدانەوەی ئایەتەکانی بە مانای هەڵە !! بەڵێ ئەو دووە :

١/ لاساییکردنەوەی کوێرانە .

٢/ درۆ هەڵبەستنو گۆڕینی دەقەکانی شەریعەت .

دوو هۆکاری گەورەو گرنگی لادانو لاڕێ بوونو سەرگەردان بوونی خەڵکن، لە ڕاستە شەقامی خوا .

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ ﴾، بەڵێ: خوا فەرمان ناکات بە شتی ناقۆڵاو ناشیرین، کەواتە: هەرچی شتی ناشیرینو خراپە، فەرمانی خوای لەسەر نیە، لە هەر کەسێکتان بینی، هەر کەسو لایەنێك بێ: فلاّن کردەوەو ڕەفتارە دەکات، کە بە پێی عەقڵو بەپێی شەرعو سروشتی ساغ، ناشیرینە؟ ئەوە دڵنیابن کە فڕی بەسەر ئایینەوە[1] نیە، فلاّن مەلایە، فلاّن شێخە، فلاّن سۆفییە، فلاّن مسوڵمانە، فلاّن دەروێشە، فلاّن ئیسلامییە، فلاّن حاجییە، ئەو ڕەوشتو ڕەفتارەی هەیە، ئەو ئاکارەو خووخدەی هەیە ، مادام پێچەوانەی شەریعەتە، پێچەوانەی عەقڵی سەلیمە، پێچەوانەی فیطرەتە، ئەوە مانای وایە ئیسلام لێی بەرییەو خوای پەروەردگار لێی بەرییە، کەواتە:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ ﴾، بیکەن بە پێوەرو تەرازوو، هەر شتێك کە دزێوو ناقۆڵاو ناشیرینو بە کەڵك نەهاتوو بوو، بزانن فڕی بەسەر دینەوە نیە، با بە ناوی دینو بە ناوی خواو بە ناوی ئیسلامەوەش بکرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾، ئایا بە ناوی خواوە شتێك دەڵێن، کە نایزانن، کەواتە: بەبێ زانیارییو بە ناوی خواوە قسەکردن،

١) واتە: ئایینی ڕاستو هەقو دەستکاریی نەکراوی خوا، کە ئیسلامە.

تاوانێکی زۆر گەورەیە، ئەگەر سەرنجی وەزعی مسوڵمانان بدەی : دینداریی ئەفسانەیی، دینداریی‌یەك كە ناچێتەوە سەر قورئانو سوننەت، لە زۆر شوێناندا هەیە، وە ئەو جۆرە دینداریییە ساختەیەشە، كە قسەی ئەهلی كوفر سوار دەكات بەسەر مسوڵماناندا، كە دەڵێن : فەرموو: ئەها ئەوە مسوڵمانەكەیە ! ئنجا وەك زۆر جاری دیكەش گوتوومە : بەتایبەتی لە لایەن سۆفیگەریی‌و شیعەگەرییەوە ، ئەفسانەو لیتەو لاڵو خڵتەو خاڵی زۆر هاتۆتە نێو ئیسلامەوە ، كە قسەی ئەهلی كوفر لەسەر ئەهلی ئیسلام سوار دەكات بە ناهەق، بەڵێ لەو دوو ڕێیەوە درۆو دەلەسەو ئەفسانەو شتی ناڕاستو ناعیلمیی‌و نا مەنتیقیی زۆر هاتۆتە نێو ئیسلامەوە، كە ئیسلام سەرچاوەكەی ڕوونو بێ چەندو چوونە، بەڵام لادانی مسوڵمانان، بۆتە هۆی ناشیرینكردنی ڕووی ڕاستەقینەی ئیسلام، لەبەرچاوی كەسانێك كە شارەزای ئیسلام نین، وە بە تایبەت لە ڕۆژگاری ئێستاماندا، زۆر گرووپو تاقم هەن، بە جۆرێك ڕەفتارو هەڵسوكەوت دەكەن ، كە دەبێتە مایەی ناشیرینكردنی ئیسلامو قێزەون كردنی ئیسلام ، هەڵبەتە بۆ كەسانی ناحاڵیی‌و كرچو كاڵ، بەڵام كەسێك ئەهلی ئینصاف بێو ، لە ئیسلام شارەزا بێ، یان خاوەنی فیطرەتێكی ساغ بێ، دەزانێ كە بەرنامەی خوا ، وە خوا ﷻ كە خاوەنی هەموو سیفەتێكی بەرزو پەسندو چاكەو، خاوەنی هەموو ناوێكی بەرزو جوانە، شتی خراپی لێناوەشێتەوە، كەواتە: با ئەوانە خۆشیان پاڵ بدەنە لای خواو، با درووشمی ئیسلامیش بەكاربێنن، با ئایەتو فەرمودەش بخوێننەوە، مادام ڕەوشتو ڕەفتارو قسەو ئاكارەكەیان پێچەوانەی ڕووحی شەریعەت بێو، پێچەوانەی بەرزیی‌و گەورەیی خوای پەروەردگار بێو ، پێچەوانەی بەرزیی‌و گەورەیی دینەكەی‌و پێغەمبەرەكەی بێ ﷺ، كەواتە : ئەوە ماڵی قەڵبەو سەر بە خاوەنەكەیەتی .

**مەسەلەی شەشەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ﴾،

لێرەدا خوا ﷻ چوار شتی فەرموون :

١) ﴿ قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِ ﴾، بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی کردوە بـە دادگەریی .

ئنجا دادگـەریی پەیوەندیی چییـە بـە (فَحْشَـاء)ەوە ؟ لـەوێ باسـی (فَحْشَاء) دەکات، لێرەش باسی دادگەریی دەکات، (فَحْشَاء) مانـای کـردەوەو قسـەو ڕەفتـارو ئـاکارێکی دزێـوو ناقـۆڵاو ناشـیـرین، دادگـەریـی (قِسْط)یش واتـە : هاوسـەنگیی‌و حاڵـەتی ڕێکوپێـك، ئـەویش پێچـەوانەی ڕێکوپێکییـە، کەواتـە: خـوا تـەنیا فەرمانی کردوە بـە شـتی ڕێکوپێـك :

١ - دادگەریی لە مەسـەلەی حوکم‌و قەزاوەتدا ، ڕێکوپێکییە.

٢ - بـە شـێوەیەك مامـەڵەکردن ، کە خەڵك لـێت زەرەرمەند نەبـن، ڕێکوپێکییە.

٣ - بـە شـێوەیەك مامەڵەکردن ، کە خەڵك بـەهـرەمەند بکـەی، ڕێکوپێکییـە.

٤ - بـە شـێوەیەك مامەڵەکردن ، کـە زیان بـە ژینگـە نەگـەیەنـی، ڕێکوپێـکییـە.

٥ - بـە شـێوەیەك مامەڵەکـردن لەگـەڵ مـاڵ‌و خێـزان‌و لەگـەڵ دەوروبـەردا، کـە سـوودیان پێبگـەیەنـی‌و، لە دەسـت‌و زارت سـەلامەت بن، ڕێك‌و پێکییـە.

٦ - بـە شـێوەیەك مامەڵەکردن لەگـەڵ خـوادا ﷻ کـە لـە خـۆتی ڕازی بکـەی‌و لـە خۆتی توورە نەکەی، ڕێك‌و پێـکییـە.

٧ - بـە شـێوەیەك دینـداریی کـردن کە وەك شـەریعەت دەیڵـێ، وا ڕەفتـار بکـەی، نـەك ئـەوەی میـزاج‌و سروشـتی خـۆت دەیڵــێ، یـان لـە کـاتی کـاردانەوەی هەڵەی خەڵکدا، تووشی هەڵە ببـی، ڕێـك‌و پێـکییـە.

کـەواتە: لـێرەدا کە دەفـەرموێ: ﴿ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِ ﴾، واتە: خـوا فـەرمانی کردوە بـە دادگـەریی‌و ڕێـك‌و پێکیـی، وە زانایان گوتوویانـە: (أَيْنَمَا وَجِدَ العَدْلُ فَثَـمّ شَرْعُ الله)، واتە: دادگـەریی لە کوێ بـێ، شـەریعەتی خـوا لـەوێیـە.

وە لــە ســوورەتی (النحـل) ئایــەتی (٩٠)دا خـــوا دەفــەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ

﴿وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾، واتە: بێگومان خوا فەرمان دەكات بە دادگەریی‌و بە چاكەكاریی‌و بە بەخشین بە نزیكان، ﴿وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِ﴾، هەرچی شتی ناقۆڵایەو خراپەو دەستدرێژییە، خوا قەدەغەی دەكات، ئامۆژگارییتان دەكات بەڵكو پەند وەربگرن .

٢) ﴿وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾، واتە: ڕووی خۆتان ڕاست بكەن لەگەڵ خوادا، لە لای هەر پەرستگایەك ڕوو بكەنە خوا، ﴿مَسۡجِدٖ﴾، هەر شوێنێكە كە كڕنووشی تێدا ببردرێ‌و بەندایەتیی بۆ خوا تێدا بكرێ، كە دەگونجێ مەبەست پێی مزگەوت بێ، وە دەگونجێ مەبەست پێی پەرستگا بێ، وە دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ كە لە هەر كاتێكدا بۆتان كرا، ڕووی خۆتان لەلای خوا بكەن‌و بەندایەتیی بۆ بكەن.

٣) ﴿وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾، كاتێك لە خوا دەپاڕێنەوە، پاڕانەوەكانتان بۆ خوا ساغ بكەنەوە، با خڵتەی شیركی تێدا نەبێ، وە با لەگەڵ خوادا چاوەڕوانییتان لە كەسی دیكە نەبێ، ئەو شتانەی كە تەنیا بە خوا دەكرێن، هەر دەبێ داوا لە خوای باڵادەست بكرێ.

٤) ﴿كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ﴾، واتە: وەك چۆن دەستی پێكردوون‌و هێناونیە دی، دەشگەڕێنەوە، ئەمە وەك ئایەتی ژمارە (١٠٤)ی سووڕەتی (الأنبياء) وایە، كە دەفەرموێ: ﴿كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾، واتە: وەك چۆن یەكەم جار دروستكراوەكانمان دەست پێكرد، بەو شێوەیە دەیگێڕینەوە، ئەوەش بەڵێنە لەسەر ئێمە، كە ئێمە بەو شێوەیە دەكەین، كە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەمە ئیعجازێكی زانستیی تێدایە، دەڵێن: وەك كە چۆن خوا یەكەمجار بوونەوەری دروست كردوە، كەرەسەو ماددەكەی بریتی بوو لە دووكەڵ (گاز)، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ

دُخَانٌ ﴿١١﴾ فصلت، کە دەفەرموێ: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴾، واتە: دووبارە دەیگێڕینەوە حاڵەتی پێشێ، کە حاڵەتی گازیی (دخاني)یە .

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴾، چۆنی دروست کردوون، ئاوا دەگەڕێنەوە، واتە: چۆن دروستی کردوون لە ڕووی جەستەییەوە، بەو شێوەیە دروستتان دەکاتەوە، کاتێك زیندوو دەبنەوە، لەوبارەوە ئەم فەرموودە هەیە : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿يُحْشَرُ النَّاسُ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً، فَأَوَّلُ مَنْ يُكْسى إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلاَم، ثُمَّ قَرأَ: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴾﴾، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد (٢٠٢٧)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَقَالَ شُعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ ، وَالبُخَارِيُّ بـرقم: (٣٢٦٣)، وَالحَاكِمُ بـرقم : (٣٣٨٥)}، واتە : خەڵك کۆ دەکرێنەوە بە پێخواسیی و بە ڕووتیی و بە سوننەت نەکراویی ، وە یەکەمین کەس کە پۆشاکی لەبەر دەکرێ ، ئیبراهیمە ، دوایی پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴾، واتە: وەك چۆن یەکەم جار دروستمان کردوون، ئاوا دەیگێڕینەوە.

کەواتە: ﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴾، لەگەڵ ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴾، هەردووکیان لە نێوەرۆکدا یەك دەگرنەوە، بەڵام ئایەتەکەی سووڕەتی (الأعراف) تایبەتە بە مرۆڤەکانەوەو، ڕووی دواندن لەوانە، بەڵام ئەوەی (الأنبياء): ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴾، وەك چۆن دروستکراوەکانمان یەکەمجار دروست کردن، وەك حاڵەتی پێشێیان لێ دەکەینەوە، ئەوە لێرەدا بەگشتی خوای زاناو توانا فەرموویەتی .

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ ۗ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحْسَبُونَ

أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ ﴾، پێویستە لە بەرانبەر ئەم ئایەتەدا سێ هەڵوەستەیەك بکەین :

**هەڵوەستەی یەکەم** : کە دەفەرموێ : ( فَرِيقًا هَدَىٰ ) : یەکێك بۆی هەیە بڵێ: دیارە خوا بەس کۆمەڵێکی لێ ڕێنمایی کردوون و خستووینەتە سەر ڕێی ڕاست، ﴿وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ﴾، بەڵام دەستەیەکیان گومڕایی یان لەسەر پێویست بووە، ئەدی باشە بۆچی خوای میهرەبان هەموویانی ڕێنمایی نەکردوە ؟

لە وەڵامدا دەڵێین: خوا هەموویانی هیدایەت داوە بەگشتی، بەڵام تەنیا کۆمەڵێك هیدایەتی خوایان قبووڵ کردوە، بەڵگەشمان ئەوەیە کە خوا لە سوورەتی (فصلت) ئایەتی ژمارە (١٧)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ ﴾، واتە: بەڵام گەلی ثەموودمان هیدایەت داو، ڕێنماییمان کردن، کەچی ئەوان کوێرییان هەڵبژارد بەسەر بەرپێی خۆبینین و ڕێنمایی دا، کەواتە: ئەو هیدایەتە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَرِيقًا هَدَىٰ ﴾، مانایەکەی تایبەتە، وە ئەوە وەك ئایەتی ژمارە (١٧)ی سوورەتی (محمد) وایە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدًى ﴾، واتە: ئەوانەی کە هیدایەتی خوایان قبووڵ کردوە، خوا هیدایەتی بۆ زیادکردن، کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَرِيقًا هَدَىٰ ﴾، مەبەست پێی ئەو هیدایەتە تایبەتییەیە کە خوا دەیدات بە کەسانێك، کە هەر لە سەرەتاوە قبووڵی ئەو هیدایەتە دەکەن، دواییش خوا هیدایەتیان بۆ زیاد دەکات، بەڵام کەسێك هەر لەڕێوە هیدایەتی خوا ڕەفز بکات :﴿ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ ﴾، ئەوانە خواش گومڕاییان لەسەر پێویست دەکات.

ئەگەرنا خوا ﷻ کە باسی قورئان دەکات دەفەرموێ: ﴿ وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾، وە دەفەرموێ: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴾، پاشان کە باسی پێغەمبەر ﷺ دەکات دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾، مانای وایە بۆ هەموو جیهانییانە، بەڵام کە تەنیا بەشێك لە خەڵك بەهرەمەند دەبن لە قورئانو لە پێغەمبەر ﷺ، مانای وایە تەنیا ئەوانە ئیمانیان پێیان هێناوەو قبووڵیان کردوون ، ئنجا بەرانبەر بە قبووڵکردنەکەش خوا ﷻ چییان بۆ دەکات ؟ ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴾، ئەوانەی هیدایەتی خوا قبووڵ دەکەن، خوا ڕێنماییان بۆ زیاد دەکات ، وە پارێزکارییشیان پێ دەبەخشێ.

<u>**هەڵوەستەی دووەم**</u> : کە دەفەرموێ : ﴿ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ ﴾، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: بۆچی ئەوانە گومراییان لەسەر پێویست بووە ؟ خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوەو وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە، کە لە زیهنی هەندێ کەس دا دروست دەبێ، چونکە قورئان هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە، هەمیشە لێتان وەصیەت بێ، بۆ ڕوونکردنەوەی ڕستەیەك، ئایەتێك، بابەتێك لە قورئان دا تەماشای ئایەتەکانی دیکەی قورئان، وە شوێنەکانی دیکەی قورئان بکەن، کە لەوبارەوە دەدوێن، شتەکانتان زۆر باش بۆ ڕوون دەبێتەوە.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ ﴾، یەکێك دەپرسێ : بۆچی ؟ خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، لەبەر ئەوەی ئەوانە شەیتانەکانیان کردوە بە دۆستی خۆیان، یانی : خۆیان تەسلیمی شەیتانەکان کردووە، بە دوای شەیتانەکان کەوتوون، بۆیە گومراییان لەسەر پێویست بووە، ئایا شەیتان بێجگە لە گومرایی هیچی دیکەی پێیە؟ بێگومان نەخێر، هیدایەت لەلای خوایە، بۆیە ئەگەر بە دوای هیدایەت دەکەوی،

لە خـوای داوا بکـە، وە ئەگـەر خێـرو خۆشـی داوا دەکـەی، لـە خـوای داوا بکە، ئەگەرنا بـەدوای شـەیتان بکەوی، تووشی چاڵـت دەکـات، تووشـی سـەرگەردانییت دەکـات، چـونکە شـەیتان هـەر گومڕایـی پێیـە، ئنجـا ئایـا خـوای دادگـەرو کاربـەجێ کێ گومـڕا دەکات؟ بێگومـان ئەوانەی ستەمکاربن، وەك لـە سـووڕەتی (إبـراهیم) ئـایـەتی (٢٧)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، واتـە: وە خـوا سـتەمکـاران گـومڕا دەکـات، ئـەدی ئایـا خـوا کـێ هیدایـەت دەدات؟ لـە سـووڕەتی (الرعـد) ئـایەتی (٢٧)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ ﴾، واتە: ئەوانـەی کە بـەرەو خـوا دەگەڕێنـەوە، خـوا هیدایەتیـان دەدات .

کەواتـە: هیدایەتـدانو گـومڕاکردن لەلایـەن خـواوە ، بـە گۆتـرە نیـە، بـەڵـکو هەنگـاوی یەکـەم لـە بـەندەوەیە، هەنگـاوی یەکـەم لـە ئینسـانەوەیە، هەرکـات ئینسان بـەرەو خـوا ڕۆیشـت، خـوا هیدایەتی دەداو دەسـتی دەگرێ ، بەڵام ئەگـەر بـەرەو شـەیتان ڕۆیشت، خـوا لـێی دەگـەڕێو شـەیتان زەفەری پێدەبـات .

وە مشـتومڕی قەدەرییـەو جەبرییـە لەوبـارەوە، دەرەنجامـی زێدەڕۆیـیو کورتهێنـان (إفراط وتفـريط)ە، جەبرییـە دەڵێن: ئینسـان هەرچـی دەیکـات، خـوا پێی دەکات، قـەدەرییەش دەڵـێن: ئینسـان بۆخـۆی کردەوەکـانی دەخـوڵقێنـێو، خـوا هـەقی بەسـەریەوە نیـە، هـەر یەکـەیان بـە لایەکـدا تێدەپـەڕێنن، یـان دەتوانین بڵێیـن: جـەبرییە کورتی دێنـنو، قەدەرییـەش تێدەپـەڕێنن، جەبرییـە کورتی دێنـن لـەوەدا کـە پێیـان وایـە: ئینسـان دەسـتە پاچـەو هـیچ پـێ نـەکراوە، قەدەریـیـەش تێدەپـەڕێنن، کـە ئینسـان بـە بـەدیهێنـەری کردەوەکـانی خـۆی دادەنـێن، وە دەڵـێن: خـوا کردەوەکـانی ئینسـان ناخـوڵقێنـێو، هـەقی بەسـەر کردەوەکانی ئینسانەوە نیە، بـەڵکو گوتوویانە : خـوا زانیـاریی بـە کردەوەکـانی ئینسـان ، هـەر نیـە ، ئنجـا ئـەو تێپـەڕاندنو بـە زایەدانـەو ئـەو مشـتومـڕە بێجێیـە ، بـەهۆی سـەرنج نەدانی کۆی ئـایەتەکـانەوە دروسـت بـووە، جەبرییـە تەنیـا تەماشـای هەندێـك لـە ئـایەتەکـان دەکـەن، قەدەرییـەش تـەنیا تەماشـای بـەشـێکیان دەکـەن ، بەڵام ئەگەر تەماشای هەردووکیان بکـەین، ئـەو تێگەیشـتنە

ڕێكو ڕاسـتو هاوسـەنگە دێتە دەسـت، كە زۆربـەی مسوڵمانان كە پێیانـدەگوتـرێ: (أَهْـلِ السُّـنَّةِ وَالجَمَـاعَةِ) تەبـەننییـان كـردوە.

**هەڵوەسـتەی سـێیـەم** : كە دەفـەرموێ: ﴿ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴾، وە پێشیان وایە، كە ئەوانە ڕێی ڕاست گرتـوون، كەواتە: گومانو پێوابوونی كـافران، بـە پاساو ناشـێ، وەك پێشـتـریش باسمان كـرد، واتـە: ئـەوە بـە پاسـاو ناشـێ كـە نەیـانزانیـوەو، وایانزانیـوە كـە ڕێـی ڕاسـتیان گرتـوە، بەڵـێ، كەسـێك : كـافرە، جوولەكەیـە، نەصـرانیی یـە، ئێزیدییـە، زەردەشـتییە، صـابیئـیـە، مەجووسـییە، بـووذییــە، بتپەرسـتـە، مولحیـدە.. هتـد، مـادام بتوانـێ دەسـت بگەیەنێتـە هیدایەتـی خـواو كەمتەرخـەمیی بكـات، وە پشـت لـە هیدایـەتی خـوا بكـاتو، هەوڵنەدا دەست بگەیەنێتە بـەرنامەو هیدایـەتی خـوا، یا بـەهـۆی نەزانییشـەوە گومـڕا بـێ، وە پێشـی وابـێ شـتێكی چـاك دەكـاتو، لەسـەر ڕێـی ڕاسـتە، ئـەوە نابێتـە بیانوو پاساوی دەربازبوونی، بـەڵگەشـمان لەسـەر ئـەوە زۆرن، بـۆ وێنـە :

خــوا لــە ســوورەتی (فــاطر) ئــایەتی (٨)دا دەفـەرموێ: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾، واتـە: ئــایا كەسـێك كـە كردەوە خراپەكەی خۆی بۆ ڕازێنراوەتەوە، وە بەجوانی هاتۆتە بەرچاو، (بـەهۆی ئەوەوە كە شـەیتان بۆی ڕازندۆتـەوە)، ئـایا كەسێك كەوایە تۆ هیچـت لـە دەسـت دێ بۆی؟ بێگومان هەر خـوا دەتوانێ هـەر كەسـێكی بیـەوێ گومڕای بكـاتو، هـەر كەسێكی بیــەوێ هیدایەتی بدات، {بـەڵام خـوا بــە زۆر نـە كـەس گومڕا دەكـاتو نە كەس ڕێنمایی دەكات، بـەڵكو ئـازادی كـردوونو، سـەر پشكی كـردوون، خۆیـان دەبـێ گـومڕایی هەڵبـژێرن، یاخــود ڕێنمــایی هەڵبـژێرن}، دوایــی دەفــەرموێ:

﴿ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ ﴾، هێنـدەیان خـەم لـێ مەخـۆ، نەفسـی خۆت بفەوتێنی ، بەهۆی خەفەت لێخواردنیانـەوە ،﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾

خوا زانایە بەوەی کە بە وەستایی دەیکەن، کەواتە: بە ویستی خۆیانو، بە هەڵبژاردنی خۆیان، کردەوەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن، بۆیە تۆ خەمیان لێ مەخۆ، بەهۆی ئەوەوە کە بە ویستی خۆیان کردەوەی خراپ هەڵدەبژێرن، وە پاشان تووشی سزایەکەی دەبن، ئۆباڵی خۆیان بە ئەستۆی خۆیان .

هەروەها خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الكهف) لە ئایەتەکانی : (١٠٣ و ١٠٤)دا دەفەرموێ : ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾﴾، واتە: بڵێ: ئایا هەواڵتان پێ بدەم، کێ لە هەموو کەس زیانبارترە، لە ڕووی کردەوەکانیەوە، ئەوانەی کە هەوڵو کۆششیان لە ژیانی دنیادا زایە بووە، {واتە: هەوڵو کۆشش دەکەن لە ژیانی دنیادا ، بەڵام بێ بەرهەمە} بەڵام پێشیان وایە کردەوەی باش دەکەن ، {لە حاڵێکدا کە کردەوەکانیان زایە دەبن لە ژیانی دنیاداو ، هیچ بەرهەمێکیان نیە بۆ قیامەتیان ، ئا ئەوانە لە هەموو کەس زیانبارترن} .

کەواتە: مەرج نیە هەر کاتێك ئینسان خۆی پێی ڕاست بوو، مانای وایە: خاوەن پاساوە، نەخێر، بەڵکو مادام کەمتەرخەم بێ، لەوەدا کە ڕێی ڕاستی نەدۆزیوەتەوە، بەڵێ هەر کەسێك کە پەیامی پێغەمبەری خاتەمی ﷺ پێدەگات، یان لە ڕابردوودا پەیامی پێغەمبەرانیان پێگەیشتوە، بەڵام ڕوویان لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، نەکردوە، وە هیدایەتی خوای پەروەردگاریان قبوول نەکردوە، لە نەفامییو نەزانییدا ماونەوە، ئەوانە نەزانییو نەفامییەکەیان بۆیان نابێتە پاساوو بیانوو.

**مەسەلەی هەشتەم:** جارێکی دیکە خوا بانگی مرۆڤایەتی دەکاتو، دەفەرموێ:

﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾، ئەی وەچەی ئادەم ! جوانیی خۆتان، (یان پۆشاکی خۆتان) لەلای هەموو مزگەوتێك وەربگرنو خۆبڕازێننەوە (بەرگو پۆشاکی چاك

لەبەر بکەن) ، وە بخۆنو بخۆنەوەو زێدەڕۆیی مەکەن ، بێگومان ئەو (خوا) زێدەڕۆیی کارانی خۆشناوێن .

وەك پێشتر باسمان کرد لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا هاتوە ، ئیبنو عەبباس دەڵێ: {كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَهِيَ عُرْيَانَةٌ} (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم (٣٠٢٨)، لە سەردەمی نەفامییدا ئافرەتان بە ڕووتیی طەوافیان دەکرد.

دیارە پیاوانیش هەر بە ڕووتیی طەوافیان کردوە، ئەگەر بەرگیان دەست نەکەوتبێ خواستبیانەتەوەو پۆشیبایان، بە ڕووتیی طەوافیان دەکرد، تەنیا قوڕەیش نەبێ، قوڕەیشییەکان دەیانگوت: ئێمە هەڵاوێردراوین لەو حوکمە، بۆمان هەیە ئەو بەرگەی کە گوناهمان پێکردوە طەوافی پێوەبکەین، بەڵام غەیری قوڕەیش بۆیان نەبووە بەو بەرگەی گوناهیان پێکردوە ، طەواف بکەن ، بۆیە دەبووایە بە ڕووتیی طەوافیان کردبایە ، بۆیەش خوا فەرموویەتی :

﴿ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ﴾، لە لای هەر مزگەوتێك، مزگەوتی حەڕامو غەیری مزگەوتی حەڕام، خۆتان ڕووت مەکەنەوەو، خۆتان پۆشتە بکەن، وە دەشگونجێ مەبەستی ئەوە بێ : هەر کاتێك ویستت پەرستش بۆ خوا بکەی، و، بەندایەتیی بۆ خوا بکەی، پۆشتە بەو خۆت برازێنەوەو بەبێ سەروبەریی لە خزمەت خوادا مەوەستە، بۆیە هەندێك لە زانایانی پێشینی چاك (السّلف الصالح) کاتێك هەڵدەستان بۆ نوێژ، خۆیان بۆنخۆش دەکردو جوانترینو ڕێکوپێکترین بەرگو پۆشاکیان لەبەر دەکرد، وە بچن بۆ میوانداریی، یان بۆ سەر داوەتێك، دەیانگوت : لە خزمەت خوادا، دەبێ بە جوانترین شێوە ڕابوەستین.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ ﴾، واتە: بە ناوی دینداریییەوە، خواردنو خواردنەوە لە خۆتان قەدەغە مەکەن، بۆیەش لە باسی خۆڕازاندنەوە لەکاتی پەرستش دا : ﴿ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ﴾، یەکسەر باسی خواردنو خواردنەوەی کردوە : ﴿ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْ ﴾، وە

بخۆنو بخۆنەوە، وە زێدەڕۆیی مەکەن، واتە : وەك گەلێك لە میللەتانی پێشوو، بە بیانووی دینداریی‌و لە خوا نزیك كەوتنەوەوە، خواردنە پاك‌و چاك‌و حەڵاڵەکان، لە خۆتان قەدەغە مەکەن.

وە لەبارەی ئەم دوو مەبەستەوە، واتە: بەرگ‌و پۆشاك لەبەرکردن، وە خواردن‌و خواردنەوەو زێدەڕۆیی تێدا نەکردنیان ، با ئاماژە بە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ بکەین :

١/ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَلْبَسْ ثَوْبَيْهِ ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَحَقُّ مَنْ تُزِيِّنَ لَهُ﴾ {أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي "الأوسط" برقم: (٩٣٦٨)، وَقَالَ الهَيْثَمِيُّ: إِسْنَادُهُ حَسَن، وَالبَيْهَقِيُّ فِي "الكُبْرَى" برقم: (٣٠٨٨)، وَالبَزَّار برقم: (٥٩٠٣) قَالَ المناوِي: ورجالُهُ مُوَثَّقُون}، واتە: ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد، با دوو پۆشاکەکەی لەبەر بکات، "پۆشاکی سەرو خواری"، چونکە خوای زاڵ‌و پایە بەرز، شایستەترین کەسە کە خۆی بۆ برازێنرێتەوە.

٢/ وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ، لَيْسَ عَلَى عَاتِقِهِ مِنْهُ شَيْءٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٩٨١)، وَعَبْدُ الرَّزَاق برقم: (١٣٧٥)، وَابْنُ أَبِي شَيْبة برقم: (٣٥٠٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٤٨٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥١٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٦٢٦)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٧٦٩)، وَالحُمَيْدِيُّ برقم: (٩٦٤)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٦٢٦٢) وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (٧٦٥)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (١٣٧١)}، واتە: با یەکێك لە ئێوە بە یەك پۆشاك "لە یەك پۆشاکدا" نوێژ نەکات، کە هیچ لەسەر ملی نەبێ، {یەك پۆشاك واتە: شەرواڵ، لە پشتێن بەرەو سەرەوە ڕووت بێ}، با ئاوا نوێژ نەکات، دوو پۆشاك، واتە: هەم لە پشتێن بەرەو سەرەوە، هەم لە پشتێن بەرەو خواری هەر دەبێ داپۆشرێ، ئاوا نوێژ بکات ڕێکترە، ئەگەرنا ئینسان مادام عەورەتی خۆی داپۆشی لە کاتی ناچارییدا، نوێژەکەی هەر دروستە، بەڵام وا باشترە، جوانتر خۆی پۆشتەو پەرداخ‌و ڕێکوپێك بکات، لە خزمەت خوای پەروەردگاردا.

٣/ هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا وَالْبَسُوا وَتَصَدَّقُوا، مِنْ غَيْرِ مَخِيْلَةٍ، ولا سَرْفٍ ، فَإِنَّ اللهَ يُحِبّ أَنْ يَرَى أَثَر نِعْمَتِهِ عَلَى عَبْدِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ

الطَّيَالِسي في مسنده برقم: (٢٢٦١)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧١٨٨) وَصَحَّحَهُ الذَّهَبِي}، واتە: بخۆن‌و بخۆنەوەو بەرگ‌و پۆشاك لەبەر بكەن، وە خێرو چاكەش بكەن‌و ببەخشن، بەبێ كەشخەو فیز، وە بەبێ زێدەڕۆیی، چونكە خوا پێی خۆشە شوێنەواری چاكەی خۆی بەسەر بە بەندەی خۆیەوە ببینیێ. یانی: مادام خوا پێی داوی ، با شوێنەواری ئەو خوا پێدانە، بەسەرتەوە ببینرێ.

٤/ وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَا مَلأَ آدَمِيٌّ وِعَاء شَرّاً مِنْ بَطْنٍ، بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ لا مَحَالَةَ، فثُلُثٌ لِطَعَامِهِ، وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٢٢٥)، وَالتِّرْمِذِيُّ برقم: (٢٣٨٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٣٤٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٧٤)، وَالبَيْهَقِي فِي "شعب الإيمان" برقم: (٥٦٤٩) وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتە: ئادەمزاد هیچ توورەكەیەكی پڕ نەكردوە لە ورگی خراپتر "یانی: ئەگەر ورگی پڕ بكات لە خواردن، ئەوە خراپترین توورەكەی پڕ كردوە" ئادەمزاد ئەوەندەی بەسە چەند پاروویەكی كەم بخوات، كە پشتی ڕابگرن، ئنجا ئەگەر هەر بەخۆی نەوێرا "واتە: لە بەرانبەر خواردن دا بێهێز بوو، ئیشتیای هەبوو" با مەعیدەی بكاتە سێ بەش : سێیەك (١/٣)ی بۆ خواردن‌و، سێیەك (١/٣)ی بۆ خواردنەوە، وە سێیەك (١/٣)ی بۆ هەناسە.

واتە: با سێیەك (١/٣)ی بە بۆشیی بهێڵێتەوە، ئەمەش كاتێك دەبێ كە ئینسان چەندی خواردوە، ئەوەندەی دیكەی پێ بخورێ، ئەوجار دەست هەڵبگرێ، چونكە چەندەت خواردوە ، ئەگەر ئەوەندەی دیكەشت پێ بخورێ ماناى وایە سێ یەكت خواردوە ، ئنجا ئەگەر سێ یەكی دیكەشت پێ بخورێ، ئەوە شوێنی نەفەسەكەیە، وە ئەوەندەشت ئاو پێ دەخورێتەوە، ئەوە هەر سێ بەشەكە، بەڵام تۆ بێنی هەر سێ بەشەكان خواردنیان تێبكەی، دوایی بە زەحمەت هەناسەت بۆ بدرێ، جێی خواردنەوەشت نەبێ، ئەوە بە ڕاستیی خۆ ماڵوێران كردنە، بۆیە من پەندێكم داناوە لەوبارەوە، كە دەڵێم :

**ئەوەندە بخۆ هەڵت بگرێ ، ئەوەندە مەخۆ هەڵیگری**

واتە: ئەوەندە بخۆ كە خواردنەكە تۆ هەڵبگرێ ، ئەوەندە مەخۆ دوایی ببیە حەمباڵی خواردنو حەمباڵی گۆشتو بەزو پیو، بەتایبەت لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆماندا، كە قەڵەویی بۆتە یەكێك لە نەخۆشییە كوشندەكانی دنیا ، وە زانایان دەڵێن : چوار هێندەی ئەوە كە خەڵك بەبێ خۆراكیی دەمرێ، بە زۆرخۆریی دەمرێ ، واتە : ئەگەر پێنج یەك(١/٥)ی خەڵك بە بەدخۆراكیی بمرێ، ئەوە چوار لەسەر پێنج (٤/٥)ی خەڵك بە زۆرخۆریی‌و بەو نەخۆشییانەی كە لە زۆرخۆرییو لە قەڵەویی پەیدا دەبن ، دەمرن ، وە زانایان هەموو دەڵێن : قەڵەویی یەكێكە لە ترسناكترین دەردو نەخۆشییەكانی ئەم سەردەمەی ئێمە .

<u>**مەسەلەی نۆیەم**</u> : كە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾، لە بەرامبەر مانای ئەم ئایەتەدا سێ هەڵوێستە دەكەین :

<u>**هەڵوەستەی یەكەم**</u> : هیچ كەسێك بۆی نیە جوانییو خۆشییەكان لە خەڵك قەدەغە بكات، بەبێ بەڵگەی ڕوونو بێ چەندو چوونی شەرعیی، هەر لەخۆوە بڵێ : فلانە شت قەدەغەیەو، میزاجی خۆی لە خەڵك بكا بە شەرع، ئەوە هەڵەیەو بگرە تاوانێكی گەورەشە .

وەك خوای كاربەجێ لە سوورەتی (یونس) لە ئایەتی (٥٩)دا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ۖ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴾، واتە: بڵێ: ئایا ئەوەتان بینیوە لە ڕزقو ڕۆزیی كە خوا بۆی ناردوونە خوار، دوایی (هەر لەخۆوە)

هەندێکتان بە حەڵاڵو حەرام داناوە، بڵێ: ئایا خوا مۆڵەتی داون، یاخود درۆ بەناوی خواوە دەکەن ؟!

کەواتە: شت قەدەغەکردن، بەبێ بەڵگەی شەرعیی، درۆکردنو، درۆ هەڵبەستنە بەناوی خواوە.

هەروەها لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٨٧)دا، خوا ڕوو لە ئیمانداران دەکاتو، هۆشیارییان دەداتێ، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾،

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! ئەو ڕزقو ڕۆزییە خۆشو بە سوودانەی خوا بۆی ڕەوا کردوون، قەدەغەیان مەکەن، وە دەستدرێژیی مەکەن، خوا دەستدرێژییکارانی خۆشناوێن .

دیارە ئێمە لە کاتی ڕوونکردنەوەی مانای ئایەتەکانی سوورەتی (المائدة)دا لە بەرگی چوارەمی ئەم تەفسیرەدا، بەتەفصیل لەوبارەوە قسەمان کردوە، بۆیە لێرە زۆری لەسەر ناچین ، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ ﴾

هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)یش ، لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (١٤٥)دا ، کە دەفەرموێ : ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ ﴾،

زۆر بە درێژیی باسێکی تێرو تەسەلمان لەوبارەوە کردوە، بۆیە لێرە بەو ئەندازەیە لێی دەگەڕێین .

**<u>هەڵوەستەی دووەم</u>** : ﴿ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، واتە: ئەو جوانییو نازو نیعمەتو خێرو خۆشییانەی دنیا، لە قیامەتدا بۆ ئیمانداران یەکلا دەبنەوەو ساغ دەبنەوە، بەشی کەسی دیکەیان

پێوە نیە، جگە لە ئیمانداران، چونکە کافران بێ بەشن، لە نازو نیعمەتەکانی خوا.

**هەڵوەستەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾،

ئاوا ئایەتەکانی خۆمان ڕوون دەکەینەوە بۆ کۆمەڵێك کە بزانن، وەك گوتراوە: قەدری زێڕ لەلای زێڕنگەرە، کێ لە ئەم ئایەتەکانی خوا تێدەگات؟ کێ قەدری دینی خوا دەزانێ ؟ کێ قەدری ئەو حەقیقەتو بەها بەرزانەی قورئانو سوننەت دەزانێ ؟ کەسێك کە ئەهلی عیلم بێ، بۆیە چەندە لە وڵاتی مسوڵمانان دا خەڵك لەبەر نەزانین لە دین دوور دەکەوێتەوە، لە وڵاتانێك دا کە خەڵك لە پێشەوەیە لە زانستەکاندا، لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژ ئاوادا، ئەوانەی کە دەرفەتیان دەبێ دەستیان بگاتە قورئانو ئیسلام، خەڵك بەرەو ئیسلام دێن، لێرە بەهۆی نەزانییەوە، چەندە خەڵك لە ئیسلام دوور دەکەوێتەوە، لەوێ بەهۆی زانیاریی‌و شارەزاییەوە، ئەوەندە خەڵك لە ئیسلام نزیك دەکەوێتەوەو ئیمانی پێ دێنێ .

**مەسەلەی دەیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، لێرەدا خوا ﷻ چوار جۆرە خراپە دیاریێ دەکات، کە وردتر دەبنەوە بۆ شەش دانە (مفردة)و ، دەریدەخات کە هەر ئەوانەی قەدەغە کردوون، چونکە وشەی: ﴿إِنَّمَا﴾، ئامرازی کوتهەڵێنانو چەسپاندن (أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَات)، واتە: خوا تەنیا ئەوانەی قەدەغە کردوە ، ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ﴾، بڵێ : بێگومان پەروەردگارم تەنیا ئەوانەی قەدەغە کردوون :

**شەش قەدەغە کراوە سەرەکییەکان :**

١ و ٢ خراپەی یەکەم‌و دووەم : ﴿ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾، گوناهە ناقۆڵا ئاشکراو پەنهانەکان (المعاصي العلنية والسرية) یاخود (المعاصي البدنية والنفسية) گوناهە ئاشکراو پەنهانەکان، یاخود ئەوانەی پەیوەندییان بە جەستەوە هەیەو، ئەوانەی پەیوەندییان بە ناخو دەروونی ئینسانەوە هەیە، هەموو ئەو کردارو ڕەفتارانەی ناشیرینن‌و ناقۆڵان بە پێی عەقڵی ساغ، کە شەریعەتی خواش هەمیشە عەقڵی ساغ پشتگیریەتی ، چ ئاشکرا بن ، چ پەنهان بن، وە چ پەیوەندییان بە جەستەوە هەبێ ، چ پەیوەندییان بە ڕووح‌و نەفسەوە هەبێ، قەدەغەن .

٣ و ٤) خراپەی سێ‌و چوار: ﴿ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، گوناهو، دەستدرێژیی بە ناهەق، (الإثْمُ: مَا بَيْنَ اللّٰهِ وَالعَبْد)، (إثْم) گوناهێکە لەنێوانی بەندەو خوادا دەکرێ، (البَغِي: مَا بَيْنَ العَبْدِ والغير) (بَغِي)، گوناهێکە لەنێوانی بەندەو ئەوی دیکەدا دەکرێ، کەواتە: هەر شتێك کە شەرعی خوا قەدەغەی کردوە، کە لە زاتی خۆتدا بیکەی لەنێوان خۆت‌و خوادا، ئەوە (إثْم)ە، وە هەر شتێك کە خوا قەدەغەی کردوە، لەنێوان خۆت‌و ئەوانەی دیکەدا، ئەوە (بغي)یە، وەك: دەستدرێژیی بکەیە سەر ماڵیان، سەر نەفسیان، سەر ناموسیان .

پێشتریش باسمان کرد کە بۆچی دەفەرموێ: ﴿ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾؟ چونکە زیاتر پەیوەندیی بە (بَغِي)ەوە هەیە، چونکە جاری وا هەیە (بَغِي) بەمانای سنوور شکاندنە، کە ئەگەر کەسێك سنووری تۆی شکاند، تۆش بۆت هەیە سنووری ئەو بشکێنیەوە، ئەگەر کەسێك زوڵمی لە تۆ کرد، تۆش بۆت هەیە زوڵمی لێ بکەیەوە، هەرچەندە ئەوەی تۆ بە زوڵم لەقەڵەم نادرێ، بەڵام لە ڕووی ڕواڵەتییەوە، بە ستەم دادەنرێ، یاخود ڕەنگە بەرانبەرەکەت بە زوڵم‌و سنوور شکاندنی دابنێ، بەڵام مادام بە هەقەو لە بەرانبەر

ناهەقییەك دایە، وە هەقی خۆت وەردەگریەوە، ئەوە گوناهـ نیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ ﴾الإسراء، کەواتە: کوشتنی بە هەق هەیە، وەك چۆن کوشتنی بە ناهەقیش هەیە، یان دەفەرموێ: ﴿مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴿٣٢﴾ ﴾المائدة، ئەگەر ﴿بِغَيْرِ نَفْسٍ ﴾ بوو، ئەوە ﴿بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾ە، بەلاّم ئەگەر لە بەرامبەر نەفسێك دا بێ ، ئەوە بە هەقە.

٥ ) خراپەی پێنجەم : ﴿وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا ﴾، وە خوا لێی قەدەغە کردوون شتێك بکەنە هاوبەشی، کە بەڵگەی لەسەر نەناردوە، ئایا ئەوە کە خوا هاوبەشی هەبێ، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر هەیە؟ بە تەئکید نەخێر، چونکە تەنیا بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە کە خوا دەبێ، بە تەنیا بپەرسترێ، وە جگە لە خوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، کە شایستەی پەرستران بێ، بۆیە جگە لە خوا هەر کەسێك بپەرسترێ، بەبێ بەڵگە دەپەرسترێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا ﴾، بەڵگەش بۆیە پێی دەگوترێ: ﴿سُلْطَٰنًا ﴾، چونکە دەسەلاّتی هەیە بەسەر عەقڵ و دڵ و دەروونی ئینسان دا، وەك چۆن پادشاو حوکمڕان دەسەلاّتی هەیە بەسەر خەڵکداو، دەتوانێ سزایان بداو پاداشتیان بدات، بەڵگەش دەسەلاّتی هەیە بەسەر عەقڵ و دڵی ئینسان دا، کە ئەگەر مرۆڤ خاوەنی ئینصاف بێ، دەیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو، دەسەلاّتی بەسەردا هەیە .

کەواتە : وەك زانایان گوتوویانە: (الـمَعْبُودُ هُوَ مَا كَانَ عَلَيْهِ برهان عُلْوِيٌّ إذ لا يُعْرَفُ الـمَعْبُودُ إلاَّ مِنْ خِلاَلِ الوَحِي) واتە: پەرستراوی ڕاستەقینە ئەوەیە کە بەڵگەیەکی سەروویی لەسەر بێ، چونکە پەرستراوی ڕاستەقینە تەنیا لەمیانەی وەحییدا دەناسرێ، تەنیا لەرێی خواوە دەزانرێ، ئێمە کێ بپەرستین ؟ وە چۆنی بپەرستین ؟ هەڵبەتە عەقڵی سەلیمو فیطرەتی ساغیش، ئینسان هاندەدەن کە خوا بپەرستن و بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، بەڵام چۆنی بپەرستن ؟ کەی بیپەرستن؟ لە کوێ بیپەرستن؟ وردەکاریی پەرستن و چۆنیەتییەکەی، دەبێ وەحیی بۆمان بێنێ، ئەگەرنا لە مەودای عەقڵ دا نیە .

٦) خراپەی شەشەم: ﴿ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾، وە کە شتێك بەناوی خواوە بڵێین، کە نایزانن، کەواتە: هەموو جۆرە قسەکردنێك بەناوی ئایینەوە، کە بەڵگەی لەسەر نەبێ، دەچێتە ئەو قاڵبەوە، ئەوەش یەکێکە لە گوناهە هەرە گەورەکان، کە شتێك بەناوی خواوە بڵێی، زانیارییت لەبارەیەوە نەبێ و، بەڵگەت لەسەری نەبێ ، وەك گوتراوە : هەر لەخۆتەوە بەدوای هەڵڵای مام کوێخا بکەوی ! یان بە لاساییکردنەوەی کوێرانەی پێشینان، یان هەر لەخۆوە بڵێی : وایانگوتوە ، یان هەر وادەڵێن ، ئەوە هیچ نیە، بەتایبەت بۆ مەسەلەی قەدەغەکردن (تحريم)، چونکە ئەسڵ لە هەموو شتەکاندا ڕەوایە، ئەسڵ پاکییە، ئەسڵ حەڵاڵییە، وە بۆ قەدەغەکردن بەبێ بەڵگە، نابێ قسە بکەی، چونکە لە ئەسڵدا شتەکان حەڵاڵن، کە گوتت قەدەغەن، دەبێ بەڵگەی شەرعی خوات لەسەری هەبێ ، بەڵام بۆ ڕەوایی پێویستیمان بە بەڵگە نیە، چونکە لە ئەسڵدا خوا شتەکانی بۆ ئینسانەکان خوڵقاندوون ، وەك فەرموویەتی : ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ﴿٢٩﴾ ﴾البقرة ، ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ ﴿١٣﴾ ﴾الجاثية ، بەڵێ لە ئەسڵدا خوا شتەکانی بۆ ئێمە خوڵقاندوون ، بەڵام هەندێك لە شتەکان هەڵاوێردراون ، بە بەڵگەی شەریعەت و وەحی.

کەواتە: بۆ جیاکردنەوەی هەندێك لە شتەکان، وە حوکمی حەڕام بەسەردا دانیان ، پێویستییمان بە بەڵگەی شەرعیی دەکات، بەڵام بۆ بە ڕەوا دانانیان ، پێویستییمان بە بەڵگەی شەرعیی ناکات ، چونکە لە ئەسڵدا خوا ئەو کەونو کائیناتەی بۆ مرۆڤ خوڵقاندووەو ، نیعمەتەکانی بۆ بەهرەمەندبوونی ئینسانەکان ، هێناونە دی.

ئنجا لێرەدا ڕەنگە ئیشکالێك دروست ببێ، کە بڵێ: (إِنَّمَا: أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَاتِ)، مانای (إِنَّمَا) ئاوای لێ دێتەوە (ما إلاَّ) یانی: (مَا حَرَّمَ الله إِلاَّ الفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ) ئنجا ئایا هەر ئەوانە قەدەغەن ؟

**وەڵام:** ئەو شەشە سەرەکییەکانیانن، وە لە ڕاستیدا ئەو شەشە هەموو شتەکانی دیکە دەگرنە نێو خۆیان، بەڵێ هەموو وردەکارییەکان ناگرنەوە، بەڵام بە شێوەیەکی سەرەکیی، ناوونیشانە سەرەکییەکانی قەدەغە کراوان، ئەو شەشانەن، چۆن؟ ئاشکراوو پەنهان لە کردەوەو قسە، ئنجا مافی خواو خەڵك پێشێل کردن، یان نێوانی خواو بەندەکان، یان بەندەو بەندەکان، ئنجا هاوبەش بۆ خوا دانان (شرك)، پاشان هەر قسەیەکی بێ بەڵگە بەناوی دینەوە، کەواتە: لە ڕاستیدا ئەم شەشە ناوونیشانە گشتییەکانی قەدەغە کراوەکانن.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴾، بۆ هەر کۆمەڵێك کاتێکی دیارییکراو هەیە، هەر کاتێك کاتی دیارییکراویان هات، نە سەعاتێك دوا دەخرێن، نە سەعاتێك پێش دەخرێن، ئەم ئایەتە دوو ڕاستیی لێوەردەگیرێن :

**یەکەم:** کۆمەڵگاکانیش وەك تاکەکان ئەجەلیان هەیە، کاتی دیارییکراویان هەیە بۆ لەبەین چوونیان، بەڵام بۆچی لەبەین دەچن؟ لەوبارەوە خوای دادگەر دەفەرموێ : ﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا

ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ القـصص، واتـە: ئێمـە ئـاوەدانییەكـان لەبـەین نابـەین ، مەگـەر خەڵكەكەیـان ستەمكـار بـن، كەواتـە : لـە ئەنجـامی سـتەمو لادانـدا ئـاوەدانییـەكان ئەجەلیـان دێو لەبـەین دەچن، یـان دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ﴿١٦﴾ ﴾ الإسـراء، واتـە: ئەگـەر ویسـتمان ئـاوەدانییـەك بفـەوتێنین، فـەرمان دەكـەین بـە خۆشگوزەرانەكـانـی (چـاكە بكـەن) ، ئەوانیـش خراپـە دەكـەن ، ئیـدی بڕیاری خـوا لەسـەریان دێتـە دی ، وە كـاولـی دەكەین .

**دووەم**: هـەروەها ئەوەش دەگەیەنـێ، كـاتێك كـە خـوا دیاریكـردوە بـۆ لەبـەین چوونـی ئـاوەدانییەكان، پاشو پێش ناخـرێ ، هـەروەك چۆن بۆ تاكەكانیش بـە هـەمان شـێوەیە.

**<u>مەسـەلەی دوازدەیـەمو كۆتـایی</u>**: كە دەفـەرموێ : ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئێمـە چوار هەڵوەسـتە دەكـەین لـە بـەرانبـەر ئـەم دوو ئـایەتـە موبـارەكـەدا :

**<u>هەڵوەستەی یەكـەم</u>** : ئـەوە دواندنی خـوا بووە لـە سـەرەتایی ژیـانی مرۆڤـەوە، واتـە: ئەم دواندنـەی خـوا، خـوا گێڕاویەتـەوە لە قورئـانـدا، بـەڵام لـە سـەرەتاوە خـوای پەروەردگـار ئـاوا مرۆڤەكـانی دوانـدنوە، لەسـەر زمـانی پێغەمبـەران (علـیهم الصلاة والسلام)، یـان ئـاوا ئـادەمی دوانـدوە، وە پێغەمبـەرانی دوای ئـادەم گەلەكـانی خۆیـان بـەناوی خـواوە دوانـدوە، بۆچـی ؟ چـونكە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ ﴾، ئاشكراشـە لەدوای پێغـەمبـەری خاتەم ﷺ هیچ

پێغەمبەرێك نایەت ، كەواتە : ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، ئەی مرۆڤایەتی بەگشتی ! لە سەرەتاوە خوا ئاوا پەیمانی لەگەڵ مرۆڤەكاندا بەستوە، كە ئەگەر پێغەمبەرانتان لەخۆتان بۆ هاتن، ئایەتەكانی منیان بەسەردا خوێندنەوە، هەر كامێك لە ئێوە پارێز بكاو چاكسازیی بكات، بۆ قیامەت نەترسی لەسەر دەبێ، نە پەژارەش دادەگرێ، بەڵام ئەوانەی كە ئایەتەكانی ئێمە بە درۆ دادەنێنو لە بەرانبەریان دا خۆ بە زل دەگرن، ئا ئەوانە هاوەڵی دۆزەخنو، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

**هەڵوەستەی دووەم** : ئایەتەكانی خوا بناغەی پارێزكارییو چاكسازیین، بۆچی؟

چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ ﴾، كەواتە: دوای ئەوەی ئایەتی خوامان بەسەردا دەخوێنرێنەوەو، دەستمان لە ئایەتەكانی خوا گیر دەبێ، دەتوانین پارێزكاربین ، وە چاكەكار بین .

**هەڵوەستەی سێیەم** : كە دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ ﴾، ئەوانەی ئایەتەكانی ئێمەیان بە درۆ داناوە ، وە خۆیان لە بەرانبەریان دا بە زلگرتوە، لێرەدا بۆیە وشەی ﴿ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ ﴾، بە (عَنْ) (تَعَدّي) كردوە، تاكو مانای پشت تێكردن (إِعْرَاض) بگەیەنێ : {عُدِّيَ استَكبَرُوا بـ (عَنْ) لِتَضْمِينِهِ مَعْنَى (إِعْرَاض)}، ﴿ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ ﴾، یانی خۆیان بە زلگرتو پشتیان تێكرد، واتە: لێرەدا كە وشەی ﴿ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ ﴾ بە (عَنْ) (تَعَدّي) كردوە، هەم مانای خۆبە زلگرتن دەگەیەنێو، هەم مانای پشت تێكردنو لامل تێكردنیش دەگەیەنێ.

دیارە پێشتریش گوتوومانە: وشەی ﴿ أَصۡحَٰبُ ﴾، كە كۆی (صاحِبَ)ە، (صاحِبَ) بە مانای هاوەڵ دێو، بە مانای خاوەنیش دێ، وەك خوا دەربارەی

پێغەمبەرو ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، دەفەرموێ: ﴿إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ﴿٤٠﴾﴾التوبة، واتە: کاتێك بە هاوەڵەکەی دەگوت: دڵتەنگ مەبە ! خوا لەگەڵمانە، وە بە مانای خاوەنیش دێ : ﴿أَصْحَابُ ٱلْقَرْيَةِ﴾، ﴿أَصْحَابَ ٱلْجَنَّةِ﴾ ، خاوەنان، کەواتە: کافرەکان هەم دەبن بە هاوەڵو هاودەمی دۆزەخ، کە هاوەڵ ئەوەیە لە کۆڵ هاوەڵەکەی نابێتەوەو هەمیشە لەگەڵیەتی، وە هەم دەبن بە خاوەنیشی، هەڵبەتە خراپترین شت ئەوەیە کە ئینسان خاوەنی دۆزەخ بێ، واتە: ئەو کەسە هیچ شتی دیکەی نیە، جگە لە دۆزەخ لە ڕۆژی قیامەت دا، خوا پەنامان بدات لەوەی کە ببینە هاوەڵو خاوەنی شتێکی ئاوا خراپ، کە شوێنی سزادانە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە حەوت (٧) ئایەت پێکهاتوە: (٣٧ تا ٤٣)، خوای کاربەجێ تێیاندا باسی سەرەنجامی درۆ بە ناوی خواوە هەڵبەستن و بێبڕوابوون بە ئایەتەکانی دەکات، چ لە حاڵەتی سەرەمەرگ و چ لە حاڵەتی ڕۆژی دوایی دا، ئەو کەسانەی درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، وە بێبڕوا دەبن، سەرەنجامیان چۆن دەبێ؟ لە دوارۆژدا ئەهلی کوفر حاشا لە یەکدی دەکەن و نەفرین بارانی یەکدی دەکەن و، داوای سزای زیاد بۆ یەکدی دەکەن ! وە خوای دادگەر ڕایدەگەیەنێ: کە بە درۆ دانەرانی ئایەتەکانی خواو خۆبە زلگران لە ئاستیاندا، هەرگیز چاویان بە بەهەشت ناکەوێ و ، لە ئاگری دۆزەخ دا جێگاو پێخەفیان بۆ دانراوە !

پاشان خوا باسی سەرەنجامی بڕوادارانی چاکەکار دەکات، کە شوێنیان بەهەشتەو دڵ و سینەشیان لە کینەو بوغز پاك دەکرێتەوە، لە بەرانبەر یەکدیداو ، ستایشی خوای بەخشندەیان دەکەن ، لەسەر ڕێنمایی کردنیان ، وە سەرەنجام بانگ دەکرێن کە : ئەم بەهەشتە بەهۆی کردەوە باشەکانتانەوە ، بۆتە موڵك و میراتتان !

﴿ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ يَنَالُهُمۡ نَصِيبُهُم مِّنَ
ٱلۡكِتَٰبِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ
قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾ قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ
خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا
ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا
ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا
كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ
ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٤٠﴾ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٞ وَمِن
فَوۡقِهِمۡ غَوَاشٖۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعۡنَا
مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا
وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ
أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ .

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئنجا ئـایا کـێ لەو کەسـە ستەمکاترە کە بـەناوی خـواوە درۆ هەڵدەبـەسـتـێ ، یـان بڕوا بە ئایەتەکانی ناکات ! ئەوانە ئەو بەشە "تەمەنە"ی بۆیان دیاریکراوە، دەیگوزەرێنن هـەتا کـاتێك "فریشـتـە" نێرراوەکـانمان هاتنـە لایـان، گیانیـان دەکێشـن، گوتیـان: کـوان ئەوانەی لەجیاتی خـوا بانگتان دەکردن؟ گوتیان: لێمـان بزربـوون، وە شـایەدییان لەسـەر خۆیاندا کە بێبـڕوا بوون ﴿٣٧﴾ "خـوا" فەرمووی: لە ڕیزی چـەند کۆمەڵێکـدا لـە جنـدو مرۆڤ کە لە پێش ئێـوەدا ڕابـردوون، بچنە نێـو ئـاگـر"ی دۆزەخ"ەوە، ئنجـا هـەر کـات کۆمەڵێك دەچووە نێو "دۆزەخ" نەفرینی لە "کۆمەڵەکەی دیکەی" خوشکی دەکرد، هەتـا کاتێك کە تێکرا خرکرانەوە سەریەك، ئەوەی دوایەیان بە هی پێشێی "شـوێنکەوتووەکان بە سەرکردەکانیان" گوت: پەروەردگـارمان! ئائەوانە گومڕایان کردین "بۆیە" چەند قات سـزایان بدە، لە ئـاگـر "ی دۆزەخ"دا، "خـوا" فـەرمووی: بۆ هـەر کـامتـان "سـزای" چەند بـەرانبـەر هەیە، بـەڵام نازانن ﴿٣٨﴾ وە ئـەوەی پێشێیان "پـەیڕەویی لێکـراوان" بەوانـەی دوایە "شـوێنکەوتووەکان"یان گوت: ئێوەش هـیچ چاکییەکـتان بەسـەر ئێمـەوە نیـە، دە سـزاو ئـازار بچێـژن بەهـۆی ئـەوەوە کـە وەدەسـتتان دەهێنـا "لـە کـردەوەی خـراپ" ﴿٣٩﴾ بێگومان ئەوانەی بڕوایـان بـە ئـایەتەکـانمان نەهێناو، لە بەرانبەریان خۆیـان بـە زلگـرت، دەروازەکانی ئاسـمان "لە ڕووحەکـان"یان لێناکرێنەوەو، ناچنە بەهەشـتێ، هەتا حوشـتـر بـە کونی دەرزییەوە نەچێ، وە ئـاوا سزای تاوانباران دەدەین ﴿٤٠﴾ لە دۆزەخـدا ڕایـەخیان هـەنو، پێخەفیشـیان بەسـەردا دەدرێـن، وە ئـاوا سـزای سـتەمکاران دەدەیـن ﴿٤١﴾ وە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشـەکان دەکـەن ـ لـە تـوانـا بـەدەریـش لە هـیچ کـەس داوا ناکـەین ــ ئەوانـە هـاوەڵـی بەهەشــتن، تێیانـدا هەمیشـەیی دەبـن ﴿٤٢﴾ وە هـەرچی کینـە هەیـە لـە سینەیاندا دەریدێنیـن"و سـینەیان پـاك دەکەینـەوە" ڕووبـاریـان بـەژێر "کۆشـکەکانیان"دا دەڕۆن، وە گوتیـان: سـتایش بـۆ ئـەو خـوایەی کـە بـۆ ئـەم "ئــایینو ڕێبـاز"ە ڕێنمایی کردین ، وە ئەگەر خـوا نەیخستبایینە سەر ڕێی ڕاسـت، نەدەگونجا ڕێـی ڕاسـت بگرین، بێگومان ڕەوانـەکراوانی پەروەردگـارمان هەقیان هێنـابوو، وە بـانگ کـران: کە ئەو بەهەشـتـەتان پێدراوەو کراوەتە موڵکتان، بەهۆی ئەو کـردەوە "بـاش"انەوە ، کـە ئەنجـامتـان دەدان ﴿٤٣﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ) : واتە: درۆی بە ناوی خواوە هەڵبەست، ئنجا ئایا ئەو وشەیە لە چییەوە هاتووە؟ لە (فَرْي)ەوە هاتووە: (الفَرْيُ: قَطْعُ الجِلْدِ لِلْخَرْزِ وَالإِصْلاَحِ ...) (فَرْي) بریتییە لەوەی چەرمێك ببڕدرێ، بۆ ئەوەی شتێكی پێ پینە بكرێ، یاخود چاكی بكەی (وَاستعْمِلَ فِي القُرْآنِ للكَذب والشِّرْكِ وَالظُّلْمِ)، واتە : وشەی (افترى) لە قورئان دا بەكارهاتوە، بۆ درۆ، وە بۆ شیرك، وە بۆ زوڵم .

(يَنَالُهُمۡ ) : (النَّيْلُ مَا يَنَالُهُ الإِنْسَانُ بِيَدِهِ)، (نَيْل) ئەوەیە كە ئینسان دەست بگەیەنێتە شتێك، (يَنَالُهُم: يَصِلُهُم) واتە: دەیانگاتێ، ﴿ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا ﴾، واتە: ناگاتە خوا، خوا قبووڵی ناكات، (أَي لَنْ يَصِلَ اللهَ) واتە: قوربانیی كە دەكرێت، گۆشتو خوێنەكەی ناگاتە خوا، ﴿ وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقۡوَىٰ مِنكُمۡ ﴾، بەڵام تەقواكەتان كە پاڵتان پێوە دەنێ قوربانییەكە بكەن، ئا ئەوە دەگاتە خوا، ئەگەر نا گۆشتو خوێنەكەی دەگات بە هەژاران.

(ضَلُّواْ عَنَّا ) : واتە : (غَابُوا، وَضاعُوا) لێمان ون بوون ، لێمان زایە بوون ، دەگوترێ : (ضَلَّ الشيءُ : ضاعَ وَهَلَكَ) واتە: ئەو شتە لەبەین چوو ، وە ون بوو.

(ٱدَّارَكُواْ فِيهَا ) : (إدّاركوا : وَأَصْلُهُ: تَدَارَكُوا، فَأُدْغِمَ التاء في الدّال: تلاحقوا أي لحق آخِرَهُم أوَّلَهم...)، كۆمەڵە خەڵكێك كە بڕۆن هەندێكیان لە پێشو هەندێكیان لە دواوە بن، ئنجا ئەوانەی پێشێ ڕابگێرێن، تاكو ئەوانەی دیكە پێیان دەگەن، ئەوە پێی دەگوترێ: (ٱدَّارَكُواْ )، واتە هی پێشیان ڕابگیرێ، تاكو هی دواوەیان پێیان دەگەن، (إدّاركوا)یانی: پێكەوە خڕكرانەوە سەریەك.

(ضِعۡفًا ) : (ضِعْفُ الشيءِ مِثْلُهُ...)، (ضِعْف) لە زمانی عەرەبی دا بە مانای دوو چەندان دێ، (ضَعَّفَ الشيءَ وَأَضْعَفَهُ: جَعَلَهُ مِثْلَيْنِ أَوْ أَكْثَر) دوو بەرانبەری کرد، یاخود زیاتری کرد، (ضِعْفَاهُ: مِثْلاهُ) واتە: دوو ئەوەندەی ئەو شتە.

(ٱلۡجَمَلُ ) : (البَعِيرُ: إِذَا بَزَلَ، بَزَلَ يَبْزُلُ فَطرَنَابُهُ، أي إنبثق)، واتە: حوشتر کە ددانی هاتن پێی دەگوترێ: "جَمَل".

(سَمِّ ٱلۡخِيَاطِ ) : واتە: کونی دەرزی، (السَّمُّ: الثَّقْبُ) واتە: (سمّ) یانی : کون، (ومنه سمُّ الخياط وكذلك السُّمُّ القَاتِلُ يُفْتَحُ ويُضَمُّ) ، بەلام (سمُّ الخياط) کونی دەرزیی، بەلام بۆ ژەهر هەم دەگونجێ بلێی (سَمٌّ)، وە هەم دەگونجێ بلێی : (سُمٌّ) ، بەلام (سَمَّ) بە مانای کون دێ ، (الخِيَاط)یش بە مانای دەرزی دێ، (المخِيطُ وَالخيَاط: الإِبْرَة)، دیارە حوشتر هەرگیز بە کونی دەرزییەوە ناچێ ، ئەوە بۆ شتی مەحاڵ بەکاردێ .

(مِهَادٌ ) : (المَهْدُ وَالمِهَادُ: المَكان الممهدّ الموطّأ)، (مَهْد وَمِهَاد) شوێنێکە کە ئامادە کرابێ‌و خۆش کرابێ.

(غَوَاشٍ) : (غواش : جَمْعُ غَاشِيَة: الغِطاء و جمع غشاء: أَغْشِيية، وجمع غطاء، أغطية)، (غطاء) بە (أغطية) کۆ دەکرێتەوە، وە (غِوَاش)یش بە (أَغْشِيَة) کۆ دەکرێتەوە ، (غشاء و غاشية) شتێکە کە شتێکی پێ داپۆشرێ ، یاخود پێخەف ، یان پۆشاکێك کە بەخۆدا بدرێ .

(غِلٍّ ) : (العَدَاوَةُ وَالحِقْدُ الكامِل) ، (غِلّ) دوژمنایەتیی‌و کینەیەکە لەدڵدا شێردراوەتەوە .

(أُورِثۡتُمُوهَا ) : (وَرِثَ : حَصَلَ عَلَى شَيءٍ مِنْ غَيْرِ تَعْب)، (وَرِث) واتە: ئەو شتەی بەدەست هێنا بەبێ ئەوەی پێوەی ماندوو بێ، (أُورِثَ: خُوِّلَ شيئاً مُهَنِّئاً)، (أُورِث) ئەوەیە شتێکی بدرێتێ، بێئەوەی کە پێوەی نارەحت بێت‌و، زەحمەتی پێوە بکێشێ.

# مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خـوای بـەرزو مەزن لـەم حـەوت (٧) ئـایەتەدا، باسـی سـەرەنجـامی ئیمـانو کـردەوەی باش لەلایەك، وە کوفـرو کردەوەی خـراپ لەلایەکی دیکە، دەکات، کە لـە مرۆڤەکـانەوە پەیدا دەبـن، بـە ویستی ئـازادی خۆیان لە ژیانی دنیایانـدا، وە سـەرەنجـامی ئـەو ئیمـانو کـردەوە باشـەو، ئـەو کوفـرو کـردەوەی خراپـە، لـە ڕۆژی دواییـدا چـۆن بـەرجەسـتـە دەبـێ؟ کـە ئیمـانو کـردەوەی بـاش، خـوای پەروەردگـار بـەهەشـتی ڕازاوەو نـەبڕاوە دەکـاتـە پاداشـتی خاوەنەکـەی، وە کـوفرو کـردەوەی خـراپیش، سـزای بـێ ڕەزای دۆزەخ دەکاتـە سزای خاوەنەکەی، بـە گشـتی ئەم حـەوت (٧) ئـایەتە لەوبارەوە دەدوێن .

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَـٰتِهِۦٓ ﴾، ئنجا ئایا کـێ ستەمکـارترە لـە کەسێك کـە درۆ بـەنـاوی خـواوە دەکـات، یاخـود ئـایەتەکانی بـە درۆ دەزانـێ، واتـە: هـیچ کـەس لـەو کەسـە سـتەمکـارتر نیـە، کـە یەکێك لەو دوو گونـاهـەی هەیـە، چ جـای هەردووکیان :

یەکـەم: درۆ بـەناوی خـواوە هەڵبـەسـتن، شـتێك بڵـێ بـەنـاوی خـواوە، بـەنـاوی ئـایینی خـواوە کـە وانـەبـێ .

دووەم: ئـایەتەکـانی خـوا بـە ناڕاسـت دابنـێ، یاخـود بێبـڕوا بوون بـە ئـایەتەکـانی خـواو درۆ پاڵدانە لایان، ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾، ئـا ئەوانـەی کـە بـەو شـێوەیەن، ئـەو بـەشـەی کـە بۆیـان دیـاریی کـراوە لـە کتـێـبی خـوادا، لـە بڕیـاری خـوادا، لە زانیاریی خـوادا، دەیانگـاتـێ .

دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکـاندا باسـی دەکـەین، بۆچـی دەفـەرموێ: ﴿ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُم ﴾، وەك بڵـێی پشـكو بـەشـەکەیان دەگـاتە ئـەوانو بـەدوای ئەوانـدا دەچـێ، نـەك ئـەوان پشـكو بـەشـەکەیان وەدەسـت بێـنن، کـە بـە ڕواڵەت دەبـوو فەرموویـای:

(يَنَـالُونَ نَصِـيْبَهُم مّنَ الكِتَـاب) ئەو پشكەی بۆیان بڕیار دراوە وەدەسـتی دێـنن، دوایی ڕوونی دەكەینەوە، ئەوە لەبـەرچی وایە؟ چونكە وشـەی (نَالَهُ) واتـە: (وَصَلَهُ) (يَنَالُهُ) واتە: دەیگاتـێو وەدەسـتی دێنـێ، (يَكْسِبة)، دیارە كە دەفەرموێ: ﴿يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾، توێژەرەوان چەند واتایەكیان بۆ لێكداوەتەوە :

١) هـەندێكیان وایان لێكداوەتەوە كە ڕابواردنو خۆشـیو كـەیفـو شـادیی ژیـانی دنیـایی خۆیـان تـەواو دەكـەن.

٢) وە هەندێكیشـیان گوتوویـانە: ﴿يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾، واتـە: ئـەوەی كـە خـوا بۆی بڕیـار داون لە سـزا، لە دواڕۆژدا دەیانگاتـێ.

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوْنَهُمْ﴾، ئنجا خـوا ﷻ باسـی حاڵەتی سـەرەمەرگـو حاڵـەتی گـیان كـێشـرانیان دەكـات، دەفـەرموێ: هەتـا كـاتێك ڕەوانـەكراوانـی ئێمـە هـاتنـە لایـان، ﴿يَتَوَفَّوْنَهُمْ﴾، كە گیانیان دەكێشان، لێرەدا (رُسُل) كە كۆی (رَسُـول)ە، بـە مانـای ڕەوانەكراوانـە، دیـارە وشـەی (رَسُول) لـە زمـانی عەرەبیـدا بـە مانـای ڕەوانـەكـراو دێ، كەسێك كە بۆ كـارێـك دەنێـردرێ، بـەڵام بـە مانـای عورفـیی، وشـەی (رَسُول) بۆتـە نازنـاوو ناوونیشـان بـۆ پێغـەمبـەر ﷺ كەسێك كـە خـوا پـەیامی خۆی پێـدا دەنێـرێ، بـەڵام لـە قورئـاندا خـوای پەروەردگـار وشـەی (رَسُـول)ی بـۆ فریشـتەكانیش بـەكـارهێناوە ، كـە لێـرەدا بـەو واتایـەیە، چونكە فریشـتەكـانیش هـەر دەنێـردرێن، ئەگـەر پێغـەمبـەران (علـيهم الصـلاة والسـلام) دەنێـردرێـن، بـۆ ئـەوەی پەیامی خـوا بـە بـەندەكانی خـوا بگەیەنن، فریشـتەكـانیش دەنێردرێن، بـۆ ئەنجـامدانی چـەند كـارێك، كـە یەكێك لە كـارەكـانیان بریتیە لە گیان كێشـانی مرۆڤـەكـان .

ئنجـا دەفـەرموێ: ئەوانـە كـاتێك كـە ڕەوانـەكراوانی ئێمـە دێنـە لایـان، گیانیـان دەكـێشـن، ﴿قَالُوٓاْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، پێیـان گـوتن: كـوا ئـەوانەی كـە لـە جیـاتی خـوا لێیـان دەپاڕانـەوەو هـاوارتان لـێ دەكـردنو داواتـان لـێ

دەکردن ؟ واتە: کوا پەرستراوەکانتان ! ئنجا ئەو پەرستراوانە، چ مرۆڤ بووبن، کە هەندێك کەس بە نەفامیی، مرۆڤێکی وەك خۆی دەپەرستێ، بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ مرۆڤێکدا دەکات، وەك خوا بێ، چ مرۆڤی زیندوو، چ مردوو، کە ئەو مامەڵەیە تەنیا دەبێ لەگەڵ خوادا بکرێ : داوای لێبوردنی لێ دەکات، چاوەڕوانی شیفادانی لێ دەکات، چاوەڕوانی سەرخستنی لێ دەکات، چاوەڕوانی فراوانکردنی ڕزقی لێ دەکات، ئەو شتانەی کە تەنیا بە خوا دەکرێن، لە هەر کەسێکیان داوا بکەی، زیندوو بێ، یان مردوو، مرۆڤ بێ، یاخود جگە لە مرۆڤ ، ژیاندار بێ، یان بێ ژیان، ئەوە ئەو شتە کراوەتە پەرستراو، وە کراوەتە هاوبەشی خوا.

ئنجا فریشتەکان دەڵێن: کوا ئەو شتانەی کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕانەوەو داواتان لێ دەکردن، لە کوێن ؟ ﴿قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا﴾، گوتیان: لێمان ون بوون، دیار نین، بۆچی دیار نین ؟ چونکە لەڕاستیدا پەرستراو نەبوون، وە هاوبەشی خوا نەبوون، وە لە بەرانبەر خوادا هیچ نەبوون، (أَلاَ كُلُّ شَيءٍ مَا خَلاَ اللهَ بَاطِلُ) ئاگاداربن هەموو شتێك جگە لە خوا پووچە، بەو ناو ناوونیشانەی کە وەك خوا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، هەمووی دروستکراوی خوایە، هیچی شایستەی ئەوە نیە، وەك پەرستراو مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، ئنجا پێغەمبەر بێ، فریشتە بێ، مرۆڤ بێ، جند بێ ، شەیتان بێ، داربێ، بەرد بێ ، ڕووەك بێ، ژیاندار بێ، چیا بێ ، هەرچی بێ ، ﴿وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ﴾، وە شایەدییان لەسەر خۆیاندا، کە کاتی خۆی بێبڕوا بوون، واتە: بت پەرستەکان و جگە لە خوا پەرستەکان، شایەدییان لەسەر خۆیاندا، کە بێبڕوا بوون، چونکە شیرك جۆرێکە لە جۆرەکانی کوفر، ئنجا خوا ﷻ چییان پێ دەفەرموێ ؟ ﴿قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ ٱلنَّارِ﴾، فەرمووی : بچنە نێو گەلو کۆمەڵێکەوە، کە لە پێش ئێوەدا ڕابردوون ، لە کۆمەلانی پێشوو لە جندو لە مرۆڤ {لەگەڵ واندا بچنە نێو ئاگر، واتە: ئەوانیش لە پێش ئێوەدا ڕۆیشتوون}، وا پێدەچێ خوا ﷻ بە پێی ڕیزبەندیی کاتی لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی مرۆڤەکان دیاریی بکات، ئەوانەی پێشتر ژیابن ، دیارە زووتر لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ، وە ئەوانەی

دواتر ، دوایی ، ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا﴾، هەر كاتێك كۆمەڵێكی چوونە نێو؟ چوونە نێو كوێ ؟ بێگومان چوونە نێو ئاگری دۆزەخ، ﴿لَّعَنَتْ أُخْتَهَا﴾، نەفرین لە خوشكەكەی دەكات ، واتە: نەفرین لەو ئۆممەتەی پێش خۆی، لەو كۆمەڵەی پێش خۆی دەكات ، بۆچی نەفرینی لێ دەكات ؟ چونكە پاشینەكان شوێن پێشینەكان كەوتوون، ئەوان بۆیان بوونە سەر مەشق لە خراپەدا، بۆیە نەفرینیان لێ دەكەنو دەڵێن: خەتای ئێوە بوو، وەك خوا دەربارەی كافرەكان دەفەرموێ: ﴿ بَلْ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾الزخرف، واتە: بەڵكو گوتیان : ئێمە بابو باپیرانی خۆمان لەسەر رێبازێك بینیوەتەوە، كەواتە: ئەوانەی دوایە نەفرین لەوانەی پێشێ دەكەن، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعًا ﴾، (ٱدَّارَكُواْ ) لە بنەڕەتدا (تَدَارَكُوا)یە، یانی: (تَلاحَقُوا) ئەویش ئەوەیە كە ئەوانەی پێشێ بوەستێنرین، تاكو ئەوانەی دوایە دەیانگەنێ، دیارە لە دۆزەخ دا دەوەستێنرێن، تاكو هەموو پێكەوە كۆدەكرێنەوە، دەفەرموێ:

هەتا كاتێك هەموویان پێكەوە خڕكرانەوە سەریەك، ﴿قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ ﴾، ئەوانەی دوایە بەوانەی پێشێیان گوت، ئەوانەی دوایە دەگونجێ مەبەست پێی ئەو كۆمەڵە بێ، كە بەدوای ئەوانی دیكەدا هاتوون، كە پێشینیان بوون، بەڵام لێرەدا وا پێدەچێ مەبەست پێی ئەوانە بێ ، كە شوێنكەوتە بوون، ﴿لِأُولَىٰهُمْ ﴾، ئەوانەی كە پەیڕەوییلێكراو بوون ، واتە: ﴿أُخْرَىٰهُمْ ﴾، واتە: (أتباع) شوێنكەوتووان ، پەیڕەوییكەران ، وە (أولهم) ، واتە: سەركردەكانو پەیڕەویی لێكراوان.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ ﴾، ئەوانەی پاشین بە ئەوانەی پێشینیان گوت، یاخود شوێنكەوتووان بە سەركردەكانیان گوت، ﴿رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ

أَضَلُّونَا ﴾، پەروەردگارمان ! ئا ئەوانە ئێمەیان گومڕا کردو، ئێمەیان لەڕێ ون کرد، ﴿فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ ﴾، بۆیە لە سزای ئەوەدا کە خۆشیان گومڕا بوونو ئێمەشیان گومڕا کرد، ئەی پەروەردگار! سزای دووقاتیان بدە، لە ئاگری دۆزەخ دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ﴾، بۆ هەرکامێکتان سزای دووقات {وە لەسەر ڕای هەندێك لە زانایان : سزای چەند قات} هەیە، بەڵام نازانن، دیارە ئێمە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسێکی سەربەخۆ دەکەین دەربارەی ئەو بابەتەی سزادانی هەر کام لە سەرکردەکانو لە شوێنکەوتووان بە دووقات، یان بە چەند قات، لەلایەن خوای دادگەرەوە، بۆچی وایە؟ ﴿وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ ﴾، وە ئەوانەی کە سەرکردە بوون، یاخود ئەوانەی کە لە پێشەوە بوون، بەوانەی دواوەیان گوت، بەوانەی کە شوێنکەوتەیان بوون، یان لە دواوەیان هاتبوون، گوتیان: ﴿فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ ﴾، ئێوە هیچ چاکەتان بەسەر ئێمەوە نیە، واتە: ئێوە هیچ پلەیەکتان بەسەر ئێمەوە نیە، هیچ بەسەر ئێمەدا هەڵبژاردراو نین، سیفەتێکی باشتان نیە، ﴿فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴾، دەجا سزا بچێژن، بەهۆی ئەوەوە کە بەدەستتان دەهێنا، واتە: سزای دووقات کە خوا بۆی داناون، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئەگەر سەرکردەکان خۆیان گومڕا بوونو، خەڵکیشیان گومڕا کردوە، شوێنکەوتوەکانیش بوونە هۆی ئەوە کە سەرکردەکان لافی پەروەردگارێتیی لێبدەن، بەهۆی شوێنکەوتنی ئەوانەوەو ، ئەگەر ئەوان پشتگیریان نەبانو بەدوایاندا نەچووبان، مەلە لە وشکانیی ناکرێ، دەبێ گۆمە ئاوێك هەبێ، ئەوجار خەڵك دەتوانێ مەلەی تێدا بکات ! فیرعەونەکان ، هەر شوێنکەوتووە لاسایکەرەوەو بێهێزو بێ ئیرادەکان بوون، وایان لێکردوون کە کەڵکەڵەی کوێخایەتیی و پەروەردگارێتیی و پەرستراوێتییان، لەلا پەیدا بێ، تەماشایان کردوە : ئەو خەڵکە

هەمووی چەپڵەیان بۆ لێدەداو هوتافیان بۆ دەكێشیو (بارك الله)یان بۆ دەكات، گوتوویانە: دیارە ئێمە شتێكی جیاین، بۆیە سەرەنجام : زەمینەیان بۆ خۆش بووە، كە داوای پەرستراوێتیو پەروەردگارێتییان بەسەردا بكەن .

ئنجا خوای قسە لەجێ بەگشتی بەرانبەر بە هەموویان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِ ﴾، بێگومان ئەوانەی بە ئایەتەكانی ئێمە بێبڕوا بوونو، ئایەتەكانی ئێمەیان بە درۆ زانی، وە لە بەرانبەریاندا خۆ بەزلگر بوون، وە شوێن ئایەتەكانمان نەكەوتنو، ئایەتەكانیان قبووڵ نەكرد، ئا ئەوانە: ﴿ لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ ﴾، دەروازەكانی ئاسمانیان بۆ ناكرێتەوە، ﴿ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ ﴾، وە ناچنە بەهەشت، چونكە بەهەشت لە ئاسمانە، لە سەرەوەیەو، ئەگەر دەروازەكانی ئاسمانیان بۆ نەكرێتەوە، مانای وایە ناچنە بەهەشت، ئنجا هەتاكەی ناچنە بەهەشتیش ؟ دەفەرموێ : ﴿ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِ ﴾، تاكو حوشتر بە كونی دەرزییەوە نەچێ ! حوشتریش قەت بە كونی دەرزییەوە ناچێ، وەك بۆ ئێمە دیارە، كەواتە: هەرگیز ئەوانە ناچنە بەهەشتەوە ، دیارە ئەم جۆرە تەعبیرانە لە هەموو زمانەكاندا هەن، وەك یەكێك بە یەكێك دەڵێ : (دە بڕۆ هەتا ماست ڕەش نەبێو، قیر سپی نەبێو ، زیخ گوڵ نەدا ، من هەرگیز ئەو شتەت بۆ ناكەم) مەبەستی ئەوەیە كە هەرگیز نایكەم ، چونكە بەستنەوەی شتێك بە شتێكی مەحاڵەوە، مەبەست پێی نەكردنی ئەو شتەیە، ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾ ، ئاوا بەو شێوەیەش سزای تاوانباران دەدەین، كە لێرەدا مەبەست لە تاوانباران هەموویانن، ئەوانەی بە ئایەتەكانی خوا بێبڕوا بوونو، لە بەرانبەریاندا خۆ بەزلگر بوون، هەم سەركردەكانو چاولێكراوەكان دەگرێتەوەو، هەم شوێنكەوتەو چاولێكەرەكانیش، چونكە هەموویان تاوانبارن.

ئنجا خوا ﷻ باس دەکات، کە ناچنە بەهەشت، ئەدی دەچنە کوێ‌و سزایان چۆنە؟ دەفەرموێ: ﴿ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ ﴾، لە دۆزەخدا شوێنیان بۆ ئامادەکراوە، ﴿ مِهَادٌ ﴾، واتە شوێنی ئامادەکراو، ئنجا لە ئەسڵدا شوێنی ئامادەکراو بۆ ئیسڕاحەتە، واتە: ئەگەر ئەوانە شوێنێك هەبێ، ئیسڕاحەتی تێدا بکەن، دۆزەخە ! یانی : ڕایەخیان لە دۆزەخ دا بۆ ڕادەخرێ، ﴿ وَمِن فَوْقِهِمْ ﴾، وە لە سەرووشیانەوە ﴿ غَوَاشٍ ﴾ پێخەف هەن، ﴿ غَوَاشٍ ﴾ کە کۆی (غَاشِيَة)یەو، (غَاشِيَة)ش، هەر شتێکە کە بەسەر ئینساندا دەدرێ، ئنجا پەردەیە، لێفەیە، هەرچی هەیە، کە بە کوردیی (پێخەف)ی پێدەگوترێ، کەواتە: مەبەست لە ﴿ مِهَادٌ ﴾ شتێکە کە : ڕادەخرێ : وە ﴿ غَوَاشٍ ﴾ شتێکە کە : پێدادەدرێ، یانی: ئەوانە لە دۆزەخدا هەم بنەوەیان ئاگرەو، هەم سەرەوەیان ئاگرە، لە جیاتی ڕایەخ‌و لێفە، ئەوە شوێنیانە، ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە سزای ستەمکاران دەدەین، پێشی دەفەرموێ : تاوانباران ﴿ الْمُجْرِمِينَ ﴾، ئەمجارەش ﴿ الظَّالِمِينَ ﴾ کەواتە: ئەوانە هەم تاوانبار بوون، هەم ستەمکار بوون، وە بە ڕاستی ئینسان کە لە خوا دوور بوو، هەم تووشی تاوان‌و خراپە دێ، وە هەم تووشی ستەم‌و دەستدرێژیی‌و سنوور بەزاندنیش دێ.

ئەوە بەنسبەت بێبڕوایانی خراپەکارەوە، ئەدی بەنسبەت ئیماندارانی چاکەکارەوە ، با بزانین ئەوان سەرەنجامیان چۆنە ؟ دەفەرموێ : ﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾، بەڵام ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە ، ئیمانیان بەچی هێناوە ؟ بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ ، ﴿ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ﴾، وە چاکەکانیشیان ئەنجام داون، چاکەکان چین ؟!

هەمموو ئەو شتانەن كە شەرع بە چاكی داناون، بە پەسندی داناون، لە نیەتە باشەكانو ، قسە باشەكانو ، كردەوەی ئەندامەكان، چ پەیوەندییان بە خۆیانەوە هەبێ ، چ پەیوەندییان بە ماڵو خێزانیانەوە هەبێ ، چ پەیوەندییان بە دەوروبەریانەوە هەبێ، ئەوانەی كە ئیمانیان هێناوە، بە هەمموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، وە كردەوە باشەكانیان ئەنجامداون، ﴿لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَآ ﴾، ئەوە ڕستەیەكی نێواخن (جملة معترضة)یە واتە : لە حاڵێكدا كە ئێمە لەسەر هیچ كەسێك پێویست ناكەین، مەگەر ئەوەی لە توانایدا هەیە، واتە: ئەوە كە خوا دەفەرموێ: ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو كردەوە باشەكانیان ئەنجامداون، بۆ ئەوەی یەكێك وانەزانێ، كە ئەوانە بارێكی زۆر قورسیان كەوتۆتە سەرشانو، زۆر تووشی زەحمەت بوون، نا، خوا دەفەرموێ: لەسەر هیچ كەسێك پێویست ناكەین، جگە لەوەی كە لە توانایدا هەیە، ئەو ئیمانو كردەوە باشە، دیارە لە توانای ئینساندا هەیە، بەڵكو لەگەڵ سروشتی ئینساندا دەگونجێ، بەڵكو سروشتی ئینسان هەر بەوە ئاسوودە دەبێ، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئا ئەوانەی كەوا بوون، خاوەنی بەهەشتن، یاخود هاوەڵی بەهەشتن، كە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

ئنجا لە كۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ ﴾، وە هەرچی كینەو بوغزی شێردراوە هەبوو، لە سینەكانیان دا، دامانڕنیو دەرمان هێنا، چونكە ئەگەر ئینسان دڵی پڕ بێ لە كینەو بوغز ، ئنجا بەرانبەر ئەهلی كوفر بێ ، یان بەرانبەر بە هەر كەسێك بێ ، ئیسراحەت ناكات ، بۆیە خوا دەفەرموێ : سنەیان پاك دەكەینەوە ، لە ڕقو بوغزو كینە، وە دڵ ئاسوودەیان دەكەین، ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ ﴾، ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، واتە: ڕووبار بەژێر كۆشكەكانیاندا دەڕۆن، ﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا ﴾، وە گوتیان: ستایش بۆ ئەو خوایەی

کە ڕێنمایی کردین بۆ ئەمە، وە خستینیە سەر ئەم ڕێیە ڕاستە، ﴿ وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ﴾، وە نەدەگونجا ئێمە ڕێی ڕاست بگرین، ئەگەر خوا ڕێی ڕاستی پێشان نەدابایین، یانی : ئەگەر خوا پێغەمبەرانی نەناردبان، وە کتێبو بەرنامەی پێنەدابانایە ، ئێمە نەماندەزانی چۆن خوا لە خۆمان ڕازی بکەین ؟ وە چۆن ژیانێك بگوزەرێنین ، کە جێگای پەسندیی خوا بێ‌و، جێگای ڕەزامەندیی خوا بێ ؟ ئەوە واتایەکی ، یاخود : ئێمە نەدەکەوتینە سەر ڕێی ڕاست، هەر چەند ڕێیە ڕاستەکەمان دەبینی، بەلاّم نەدەکەوتینە سەری، ئەگەر خوای پەروەردگار ئێمەی نەخستبایە سەر ئەو ڕێیە ڕاستە، واتە: ئەوە کە لەسەر ڕێی ڕاست بوون، دەیگێڕنەوە بۆ ویستی خوای میهرەبان ، جا چ وەك ناردنی پێغەمبەرو بەرنامە، چ وەك ئەوە کە خوا تەوفیقی داون‌و دڵی وەرچەرخاندوون بەرەو تاعەت‌و بەرەو ئیمان‌و بەرەو چاکە، ﴿ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ﴾، بێگومان ڕەوانەکراوەکانی پەروەردگارمان بە هەق هاتبوون، یانی : پەروەردگارمان بە شێوەیەکی هەق ڕەوانەی کردبوون، وە هەقیشیان هێنابوو، بۆیە ئێمە کاتێك شوێن ئەو هەقە کەوتین، کە ئەوان هێنابوویان، ئێستا تووشی ئەو سەرەنجامە چاکە بووین، ﴿ وَنُودُوٓاْ ﴾، وە بانگ کران، لەلایەن کێوە بانگ کران ؟ لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، یان لەلایەن فریشتەکانەوە، هەردووکیان دەگونجێن : ﴿ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، کە ئەم بەهەشتەتان، ئەم باغو بێستان‌و شوێنە خۆشە، کراوە بە میراتی ئێوەو، بە ئێوە دراوە، بەهۆی ئەو کردەوە چاکانەوە کە دەتانکردن، کە گەورەترین کردەوە بریتیە: لە ئیمان هێنان، ئنجا لە ئیمانەوە هەرچی لق‌و پۆپی کردەوەی باش‌و تاعەت‌و ڕەوشتی بەرزو بەهای جوانە، پەیدا دەبێ.

## چەند مەسـەلەیەكی گرنـگ

**مەسـەلەی یەكەم** : كـە دەفـەرموێ: ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَـٰتِهِۦٓ ﴾، ئەم ڕستە قورئـانییـە بـەم شێوەیەو بـە شـێوەیەكی تۆزێـك جیـاواز، لـە چەند شـوێنێك لە قورئـاندا دووبارە بۆتـەوە، بۆ نموونـە :

١/ لـە سـوورەتی (الأنعـام)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَـٰتِهِۦٓ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، واتــە: وە كـێ سـتەمكـارترە لـە كەسێك كە درۆ بـە ناوی خـواوە بكات، یاخـود ئـایەتەكانی خـوا بــە درۆ دەزانـێ ؟ بێگومان سـتەمكاران سـەرفراز نابن.

٢/ وە لە سوورەتی (یـونس)دا دەفەرموێ: ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَـٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: ئنجا كـێ سـتەمكارترە لە كەسێك كە درۆ بـە نـاوی خـواوە بكات، یان ئـایەتەكانی خوا بـە درۆ دەزانـێو بێبـڕوا دەبێ بـەرانبــەریان ؟ بێگومـان تاوانبـاران سـەرفـراز نابـن.

٣/ هـەروەها لـە سـوورەتی (هـود)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ...﴿١٨﴾ ﴾، وە كـێ سـتەمكـارترە لـە كەسـێك كـە درۆ بــە نـاوی خــواوە بكات ؟

٤/ وە لـە سـوورەتی (الأعـراف)یشـدا هـاتوە، ئنجـا ئایـا بۆچـی خــوای پەروەردگــار دەفـەرموێ: هـیچ لـەو كەسـە سـتەمكـارترە نیـە؟ چـونكە ئـەوە پرسـیاركردنێكـی نكوولـیی لێكـەرانەیە (الإِستِفْهَامُ الإِنْكَارِي) خــوا دەفـەرموێ : كـێ سـتەمكـارترە لە كەسێك كە درۆ بـە ناوی خـواوە بكات ، یان ئـایەتەكانی خـوا بـە درۆ دەزانـێ ؟

یانی هیچکەس لەو کەسە ستەمکارتر نیە ، بۆیەش وا دەفەرموێ، چونکە ئەو دوو هۆکارە، واتە: درۆکردن بە ناوی خواوەو ، ئەفسانە سازیی لە ئایینی خوادا، وە بە درۆدانانی ئایەتەکانی خوا ، دوو هۆکاری هەرە سەرەکیی کافربوونو سەرلێشێوانی مرۆڤەکان بوون بە درێژایی مێژوو و ئێستاشی لەگەڵدابێ ، تەنانەت لە نێو مسوڵمانانیش دا ، وەك ئێستاش زۆر پێڕو کۆمەڵی نێو مسوڵمانان ، کە ناوونیشانی جۆراوجۆریان هەن، بەهۆی ئەوەوە کە شتێك بە دین دەزانن‌و ئایین نیەو ، بە ناوی خواو بە ناوی ئایینی خواوە ، هەڵیانبەستوەو خوا نەیفەرمووە : بۆتە مایەی سەرلێشێوانیان، یاخود لەبەرئەوە کە ئایەتەکانی خوا بەڕاست نازانن ، وەك ئەو خەڵکە عەلمانییو لادەرانەی کە بە کوێرە ڕێیان‌و ڕێچکاندا دەڕۆن .

واتە: ﴿ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾، ئەوانە دەگرێتەوە کە لە بەرگی ئیسلام دان، بەڵام بەدوای هەندێ شت دەکەون، کە ڕاست نیەو، لادانیان کردوە لە ئیسلام دا، وە (كَذَّبَ بِـَٔايَـٰتِهِۦٓ) ئەوانەن کە لە ئەسڵدا بڕوایان بە ئایەتەکانی خوای پەروەردگار نیە.

ئنجا ئەگەر تەماشای واقیعی مسوڵمانان بکەی ، ئەوانەی سەرگەردان‌و سەرلێشێواون، لەو دوو حاڵەتە بەدەر نین : یان لەنێو بازنەی ئیسلام دان‌و خۆیان بە چەند شتێکەوە خافڵاندوە ، کە خۆیان هەڵیانبەستوون ، بە ناوی ئیسلامەوەو لە ئیسلام دا نین ، یاخود لە دەرەوەی بازنەی ئیسلامن‌و ، بڕوایان بە ئایەتەکانی خوا نیە .

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ : ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ يَنَالُهُمۡ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَـٰبِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَـٰفِرِينَ ﴾، پێشتر مانامان کرد، بەڵام لێرەدا بەمەبەستی زیاتر ڕوونکردنەوەی واتایەکەی ، چوار هەڵوەستەی لە ئاست دا دەکەین :

**هەڵوەستەی یەکەم** : کە خوا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يَنَالُهُمۡ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِۖ ﴾
واتە: ئەوانە بەشی خۆیان لە کتێب دەگاتێ، وەك زانایان دەڵێن : (كَأَنَّ النَّصِيب شَخْصٌ طالَبَ طِلْبةً فَنَالَهَا) یانی: ئەو پشكو بەشە وا وێناكراوە ، كە كەسێكەو بە دوای شتێك دەكەوێو دەیگاتێ، لە حاڵێك دا كە پشكو بەشی ئینسان، شتێكە ئینسان بەدەستی دێنێو دەیگاتێ، نەك ئەو بگاتە ئینسان، بەلاَم لێرەدا وا وێناكراوە كە : ئەو پشكو بەشەی خۆت ، بەدوات دەكەوێ ، ئەگەرنا لەڕاستیدا ئینسان بەدوای پشكو بەشی خۆی دەكەوێ .

**هەڵوەستەی دووەم** : کە دەفەرموێ: ﴿ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، ئەم ڕستەیە سێ مانای هەن :

أ - (يُكْمِلُونَ مُدَّةَ الحَيَاةِ المُقَرَّرة لهم) واتە: ماوەی ژیانی دنیا كە بۆیان دانراوە ، لە كتێبی خوادا (لە زانیاریی خوادا) تەواوی دەكەنو دەیگوزەرێنن .

ب - (يَتَنَعَّمُونَ بِقدر نصيبهم المُقرَّرِ لهم فِي الدُّنيَا) خۆشیو ڕابواردنی دیارییكراوی دنیایان، بەشو پشكی خۆیان لە دنیادا تەواو دەكەن .

ج - (يُخَلَّدُونَ فِي النَّار المدَّة المُقرَّرة لهم) یانی: بەشی خۆیان كە بۆیان دیاریی كراوە، كە بریتیە لە هەمیشەیی مانەوە لە دۆزەخدا، ئەو قسمەتەیان پێ دەبڕێ ، كە خراپترین قسمەتە.

**هەڵوەستەی سێیەم** : کە دەفەرموێ: ﴿ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی زانیاریی خوا بێ، یاخود لیستی پارێزراو (لَوْح المَحْفُوظ) بێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی كتێبی خوا بێ، واتە: ئەوەی كە لە كتێبەكانی خوادا بۆیان دیاریی كراوە، ئنجا چ بەشە دنیاییەكە بێ، چ بەشە قیامەتییەكە .

**هەڵوەستەی چوارەم** : کە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ ﴾، هەتا كاتێك كە ڕەوانەكراوانی ئێمە چوون، بۆ لایان دەیانمرانن،

﴿ يَتَوَفَّوْنَهُمْ ﴾، دەڵێ : (وفاة) بریتیە لە : (أَخْذُ الشَّيءِ وَافِيًا) شتێك کە بەتەواویی وەربگری، ﴿ يَتَوَفَّوْنَهُمْ ﴾، واتە: ڕووحەکەیان بەتەواویی لە جەستەیان وەردەگرن، دیارە وەك پێشتر ئاماژەم پێدا، وشەی (رُسُل) کۆی (رَسُول)ە، بە مانای ڕەوانەکراو، مانا باوو عورفییەکەی بریتیە لە پێغەمبەر، کە پەیامی خوای هێناوە، بەڵام لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا، بە مانای نێردراو دێ، کەسێك شتێکی پێدا نێردراوەو ئەرکێکی پێ سپێردراوە، کە دیارە لێرەدا مەبەست پێی ئەو فریشتانەن کە ئەرکی گیان کێشانی مرۆڤەکانیان پێ سپێردراوە، دەفەرمویٰ : کاتێك کە نوێنەران و ڕەوانەکراوانی ئێمە کە فریشتەکانن، هاتن گیانیان کێشان ، ﴿ قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، دیارە کە فریشتەکان ئەو پرسیارەیان لێدەکەن، کاتێك لە سەرەمەرگدان، وە نەبێ فریشتەکان نەزانن ئەو پەرستراوانەی وان هیچ نەبوون، بۆش بوون، پەرستراوی ڕاستەقینە نەبوون، بۆیە دیار نین، بەڵام ئەوە پێی دەگوترێ پرسیاری گلەیی کردن و سەرزەنشتکەرانە (سُؤَال تَوْبِيخ وَتَقْرِيع)، واتە: ئەو شتانەی کە ئێوە دەتانپەرستن، پەرستراو نەبوون، ئەگەرنا دەبوو ئێستا لێرەبان، ئێوە ئێستا لە هەموو وەختان زیاتر پێویستیتان بە پەرستراوەکانی خۆتان هەیە، بۆئەوەی دەفریاتان بێن، پێویستیتان بە سەرکردەو مشوورخۆرەکانی خۆتانە، کە لە دنیادا ڕیشی خۆتان لە مست نابوون، دەیانبردن و ئێوەش بەدوایاندا دەچوون، ئەدی کوا بۆچی دیارنین ؟ ئەوان دەڵێن چی ؟ ﴿ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا ﴾، دەڵێن: لێمان ون بوون ، بزربوون ، دیارنین ، بێ سەرو شوێنن ، بۆچی ؟ خۆ هەبوون !

بەڵێ ، کەسێك فیرعەونێکی پەرستوە ، یان شەیتانی پەرستوە ، یان دارو بەردێکی پەرستوە ، یان هەواو ئارەزووی خۆی پەرستوە ، یان ئاژەڵێکی پەرستوە ، کە هەموویان دروستکراو (مخلوق)ن و ، وەك پەرستراو (معبود)ی هەق نین ، بێن مشوور لەوانە بخۆن کە شوێنیان کەوتوون و لەگەڵیاندا بوون و

پەیڕەوییـــان لێکـــردوون، ئێســـتا ئامـــادەنین و نـــاتوانن بـــێن ، ﴿وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴾، وە شـایەدییـان لەسـەر خۆیاندا کـە ئـەوان بێبـڕوا بـوون، بۆیـە بێگـومان شـیـرك‌و پەرسـتنی جگـە لـە خـوا ﷻ جۆرێکـە لـە جۆرەکـانی کوفـر، وە جۆرێکی زۆر بـاوو گـەورەشـیەتی.

**<u>مەسـەلەی سـێیەم</u> :** لەبـەر تیشکی ئەم ئایـەتەدا کـە دەفـەرموێ : ﴿قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٨﴾﴾، لێکۆڵینەوەیـەکی لەبـارەی سـەرکردەو شـوێنکەوتووانی ئەهلـی کوفـرەوە، لـە قیامەتـدا دەکـەین ، کـە سـەرەنجـامیان چـۆن دەبـێ ؟ واتـە شـوێنـکەوتووان (أتبـاع)و پـەیڕەویی لێکـراوان (متبـوعـین) چـۆن دەبـن ؟ خـوا چـۆن سـزایان دەدات ؟ چـۆن پێکـەوە مشـتومڕ دەکـەن ؟

# لێکۆڵینەوەیەک لەبارەی سەرکردەو شوێنکەوتووانی ئەهلی کوفرەوە

لە هەشت شوێنی قورئاندا، واتە: جگە لەم شوێنە کە سوورەتی ئەعرافە، لە حەوت شوێنی دیکەشدا لە قورئاندا، خوای پەروەردگار مشتومڕی نێوان سەرکردەکانو ئەوانەی کە شوێنیان کەوتوون واتە: (متبوعین)و (أتباع) باس دەکات، کە بە حەقیقەت زۆر جێی سەرنجە ! چونکە خوای کاربەجێ هیچ شتێکی زیادەی لە کتێبی کۆتایی خۆیدا دانەناوە، وە بابەتێك کە لە هەشت شوێن لە قورئاندا، دووبارەی کردبێتەوە، دیارە زۆر جێی بایەخەو ، زۆر جێی سەرنجە، وە زۆر جێی دەرسو عیبرەتە :

١) جارێ سەرەتا ئەم ئایەتانەی سوورەتی (الأعراف) ڕوون دەکەینەوە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِ ﴾، (خوا)ﷻ فەرمووی: بچنە نێو چەند کۆمەڵێکەوە، ﴿ أُمَمٖ ﴾، کۆی (أُمَّة)ە، واتە: کۆمەڵ، بچنە نێو چەند کۆمەڵێکەوە، ﴿ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِ ﴾، لەپێش ئێوەدا ئەو کۆمەڵانە لە جندو مرۆڤ بوون، لە پێش ئێوەدا چوونە نێو ئاگر، ئەمە هەرچەندە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، بەڵام من لێی هەڵدەهێنجم، کە لە ڕۆژی دواییدا سزاو پاداشتی مرۆڤەکانو جندەکانیش، بە پێی ڕیزبەندیی کاتییانە، واتە: ئەوانەی کە پێشتر ژیاون لە سەردەمەکانی پێشتردا، پێشتر خوای دادگەر سزاو پاداشتیان لەگەڵدا ئەنجام دەداو لێپرسینەوەیان لەگەڵدا

دەکات، وە ئەوانەی دوایی دواتر، بەو پێیەش دەبێ ئۆممەتی پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە دوای ئۆممەتەکانی دیکە پڕۆسەی سزاو پاداشتیان لەگەڵدا ئەنجام بدرێ، یانی : ئەو بەشەرانەی کە لە دوای هاتنی پێغەمبەری کۆتاییەوە، دێن، چ ئۆممەتی موحەممەد ﷺ بن، بەو واتایە کە پەیڕەوییان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردبێ، بە ڕاستی یان بە ناڕاستیی، یانی : ئەهلی تاعەت بوو بن، یان ئەهلی گوناه ، وە چ ئەو بەشەرانە کە لە سەردەمی ئەودا بوون، بەڵام بەدوای پەیڕەوو بەرنامەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەوتوون، دەبێ لە قۆناغی دواتردا، لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکرێ، چونکە لێرەدا خوا دەفەرموێ : خوا بەو کافرانەو بت پەرستو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی فەرموو: بچنە نێو چەند کۆمەڵێکەوە، لە جندو لە مرۆڤ ، کە لە پێش ئێوەدا چوونە نێو ئاگر، کەواتە: هەموویان پێکەوە خڕدەکرێنەوەو، هەر کەسە لەکاتی خۆیداو، بەپێی ڕیزبەندیی ئەو کاتانەی کە لە ژیانی دنیادا تێیدا ژیاون، سزاو پاداشتیان لەگەڵدا جێبەجێ دەکرێ .

دوایی دەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا﴾، هەر کاتێك کۆمەڵێك چووە نێو دۆزەخەوە، نەفرینی کرد لە دەستە خوشکەکەی واتە: هەر کۆمەڵێك کە دەچێ ، نەفرین لەوەی پێش خۆی دەکات، بۆچی؟ چونکە دەڵێ: ئێوە لە پێش ئێمە ڕێی کوفرتان شکاندوەو، ڕێی گوناه و تاوانو سەرپێچییتان شکاندوە، ئێمەش بەدوای ئێوەدا هاتووین، نەفرینتان لێبێ، خەتای ئێوە بوو، ئەمە واتایەکی، واتایەکی دیکەشی ئەوەیە کە : هەر کاتێك کۆمەڵێك دەچنە نێو دۆزەخەوە لە شوێنکەوتووەکان ، نەفرین دەکەن لەوانەی کە لەپێش واندا چوون، چونکە سەرکردەکانو چاوساغەکانیان، لەپێش وان دا دەچنە نێو ئاگری دۆزەخەوە، بەڵام مەرجیش نیە تەنیا ئەوانەی دوایی دەچن، نەفرین لەوانی پێشێ بکەن، ڕەنگە ئەوانەی پێشێش نەفرین لەوانەی دوایی بکەن، ئەوەش دەگرێتەوە، بڵێن: ئێوە بۆچی بەدوای ئێمەدا هاتن، تاکو گوناهی ئێمەش قورستر بێ، بەهۆی ئەوەوە کە بەدوای ئێمە کەوتوون، کە گوناهی خۆمان لە ئەستۆ بوو، گوناهی ئێوەشمان هاتە ئەستۆ، ئەوانیش نەفرین لەوان دەکەن، واتە: هەرکامێکیان نەفرین لەوی دیکە دەکات، چونکە هەرکامێکیان زیانی لەوی دیکە داوە.

ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعًا ﴾، وشەی (إدَّرَكُوا) لە ئەسڵدا (تَدارَكُوا)یە، یانی : (تلاحقوا) ئەویش ئەوەیە كە هی پێشێ بوەستێنرێ، تاكو هی دوایی دەیگاتێ، دیارە هەموویان لە دۆزەخدا دەوەستێنرێن، تاكو كۆمەڵ كۆمەڵ دێن و، لەوێدا خڕ دەبنەوە، دەڵێ : (يُلْحَقُ اللاّحِقُ بالسابق) ئەوەی دوایی دەگەیەنرێ بەوەی پێشێ، ﴿ قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ ﴾، یانی (قَالَ الأَتْبَاع لِلْمَتْبُوعِين) شوێنكەوتووەكان بە سەركردەكانیان گوت، پەیڕەوان بە پەیڕەولێكراوانیان گوت، ﴿ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴾، گوتیان : پەروەردگارمان ! ئا ئەوانە ئێمەیان گومڕا كرد، بۆیە ئێستا لە سزای ئاگری دۆزەخ ، دوو قات سزایان بدە، وەك خوا لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ١٣ ﴾ العنكبوت ، واتە: بێگومان گوناهە قورسەكانی خۆیان هەڵدەگرن، وە لەگەڵ گوناهە قورسەكانی خۆیان دا ، گوناهی قورسی دیكەش هەڵدەگرن {كە هی ئەوانەن كە شوێنیان كەوتوون و هەڵیانخەڵەتاندوون}، وە لە ڕۆژی دوایی دا لێیان دەپرسرێتەوە لەوەی كە هەڵیان دەبەست بەناوی خواوەو درۆیان دەكرد .

## ئیشكالێك و وەڵامەكەی

ئنجا لێرەدا یەكێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی ئەوە نیە خوا لە سوورەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ ١٨ ﴾، واتە: هیچ گوناهبارێك گوناهی كەسێكی دیكە هەڵناگرێ، لێرەدا وا دەفەرموێ، كەچی لە سوورەتی (العنكبوت)یشدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ

أَثْقَالِهِمْ ﴾، واتــە: گوناهــە قورســەکــانی خۆیــان هەڵـدەگرن‌و، گونــاهی قورســی دیکـەش هەڵـدەگـرن، لەگـەڵ هی خۆیان دا.

هـەروەها لـە شــوێنی دیکـەش دا خــوا دەفـەرموێ : ﴿ وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ ﴾، واتــە: وە ئـەوان گوناهەکــانی خۆیــان هەڵدەگرن لەسەر پشـتیان، ئـاگـاداربن ! ئـەو کـۆڵـە خراپتــرین شـتە کە ئەوانـە هـەڵیدەگـرن .

ئنجـا بــە ڕواڵــەت ئـەوە کـە خــوا دەفـەرمـوێ: هـیچ گوناهبـارێـك گونــاهی کەسێکی دیکە هەڵنـاگـرێ، لەگـەڵ ئـەوەی کە لـە سووڕەتی (الأنعـام)و سـووڕەتی (العنکبـوت)دا خــوا دەفــەرموێ: لەگـەڵ گونـاهی خۆیــان دا، گونــاهی ئەوانــەش هەڵـدەگـرن کە گومڕایـان کـردوون، تێکدەگـیـرێن، یەکیان دەڵــێ: هەڵــی ناگـرن‌و، یەکیـان دەڵــێ هـەڵیـدەگرن، ئـایا ئەمـە چۆنـە ؟

وەڵامەکـەی ئەوەیـە کـە : هـەڵیـدەگرن، وەك سـزای زیـاتر، بـەڵام هەڵیـناگـرن، وەك لە کـۆڵ کردنەوەی ئەوان، واتە: ئەوانەی کە ســەرکردەن‌و پێشکەوتوون، وەك ســزادانی زیــاتر، گونـاهی خۆیـان لـە ئەســتۆی خۆیانــەو، گونـاهی ئەوانـەش کـە گومڕایـان کـردوون، هەڵـدەگـرن، بـەڵام بـەو واتـایە، گوناهی ئەوان هەڵناگــرن، کە لـە کــۆڵ وانـی بکەنــەوە، بەڵکـو ئەوانیــش بــە گوناهـەکـەی خۆیـان ، هـەر سزا دەدرێـــن، کەواتــە: کــە دەفــەرموێ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۗ ﴿١٨﴾ ﴾فاطر، ئەوە دەبێ تەماشـای هەموو ئـایەتەکە بکەین، دەفەرموێ: هـیچ گوناهبــارێك گوناهــی ئـەوەی دیکە هەڵنـاگـرێ، وە ئەگــەر کەســێك بـاری شــانی قورسبـێ بــە گوناهـان‌و بـانگ بکـات کەســێك بارەکــەی لــێ سووك بکـات، هیچی لـێ هەڵناگیـرێ، هـیچ کـەس یارمەتـی نـادات، تۆزێـك لە باری شانی قورسی سووك بکـات، لە کۆڵەکـەی بخاتـە سـەر پشـتی خـۆی، ئەگـەر خزمیشـی بـێ، یـان زۆریـش لـێی نزیـك بـێ.

کەواتە : هەڵیناگرن بەو واتایەی کە لە کۆڵیان ناکەنەوە، هەڵیشی دەگرن، واتە : بەهۆی گوناهی ئەوانیشەوە ، سزا دەدرێن ، سزای دووقات ، یان چەند قات .

ئنجا کە شوێنکەوتووەکانو گومڕاو سەر گەردانەکانو هەڵخەڵەتاوەکان، داوا دەکەن، خوایە ! سەرکردەکانمان دووقات سزا بدە، خوای دادگەر وەڵام دەداتەوە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾، بۆ هەر کامێکتان دووقات هەیە، بەلاَم نازانن، یەکێك لێرەدا بۆی هەیە بپرسێ : باشە سەرکردەو دەم ڕاستەکان، ئەوە دیارە، دووقات سزا دەدرێن، جارێکیان لەسەر خۆیان، وە ئەوی دیکەش لەبەرئەوەی کە خەڵکیان گومڕا کردوە، بەلاَم ئەدی ئەو هەڵخەتێنراوو چاولێکەرو شوێنکەوتوە سەرگەردانانە، بۆچی دووقات سزا دەدرێن ؟ وەڵام : ئەوانیش بۆیە دووجار سزا دەدرێن، جارێکیان لەسەر گوناهی خۆیان، کە خوا ئیرادەیەکی ئازادی پێداون عەقڵی پێداون، توانای پێداون، دەتوانن بە دوای خەڵك نەکەونو بۆخۆیان ڕێ بدۆزنەوە، ئنجا چونکە عەقڵی خۆیان بەکارنەهێناوەو، ئیرادەی خۆیان لە دەست داوەو، ڕیشی خۆیانو ڕێشمەی خۆیان لە مست ئەو سەرکردە بێبڕواو کافرو فیرعەون سیفەتانە ناوە، جارێك لەسەر ئەوە سزا دەدرێن، جارێکیش لەسەر ئەوە کە شوێنکەوتنی ئەوانو، چاولێکەریی ئەوان، هۆکار بووە کە ئەوانی وا لێکردوە لەخۆبایی بن، وە لافی پەروەردگارێتییو پەرستراوێتییو خاوەنداریێتیی بەسەر خەڵك دا لێبدەن ، وە ئەگەر ئەوان (شوێنکەوتەکان) نەبوونایە، ئەوان (سەرکردەکان) وا لەخۆبایی نەدەبوون ، وە لە کەوڵی خۆیان دەرنەدەچوون .

کەواتە: لەسەر گوناهی خۆیان، وە لەسەر ئەوەش کە بوونە هاوکاری ئەوە کە سەرکردەکان ببنە فیرعەونو طاغووت بەسەر خەڵكو میللەتەوە، لەسەر ئەوەش سزا دەدرێن ، بۆیە هی وانیش دووقات دەکرێتەوە .

ئنجا با تەماشای چەند شوێنێکی دیکەش بکەین لە قورئانی بەرزو بەپێزدا، کە وەك گوتم : جگە لەم ئایەتانەی سوورەتی (الأعراف) ، لە حەوت شوێنی دیکەش دا خوای پەروەردگار باسی هەمان بابەت دەکات، دیارە لە

هیچیشدا دووبارەبوونەوە نیە، بەڵکو هەر جارەی لە گۆشە نیگایەك و لە ڕوویێکەوە، باسکراوەو هەر جارەش دەرس و پەندو عیبرەتێکی تازەی لێ وەردەگیرێ، بۆ وێنە :

٢) لە سوورەتی (إبراهیم) دا خوای زاناو توانا ئاوا دەفەرموێ: ﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَـٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ قَالُواْ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَـٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: وە تێکڕا بۆ خوا هاتنە گۆڕێ، (هاتنە مەیدان، هاتنە گۆڕەپان) ئنجا ئەوانەی کە بێهێز بوون ، بە وانەیان گوت کە خۆیان بەزل گرتبوو : ئێمە شوێنکەوتووی ئێوە بووین ، (واتە: لە دنیادا) ، ئایا ئێوە هیچ تۆزێك لە سزای خوامان لێ دوور دەخەنەوە ؟ گوتیان: (واتە: سەرکردەکان و خۆ بەزلگرەکان) ئەگەر خوا ڕێنمایی کردباین ، ئێمەش ڕێنماییمان دەکردن، چونکە ئێوە ڕیشی خۆتان لە مست ئێمە نابوو ڕێشمەی خۆتان وەدەست ئێمە دابوو، ئێمەش ڕامان دەکێشان !!

بەڵێ بەشەر بۆخۆی، خۆی بکاتەوە ئاژەڵ، وەك چۆن گوێدرێژێك، ئاژەڵێك، ڕادەکێشرێ بە ڕێشمە، ئەوە بەڕاستی بێڕێزییەکی زۆر گەورەی بەخۆی کردوە، بۆیە هەر لەسەر ئەوە دەبێ خوای دادگەر سزای بدات، کە ئەی مرۆڤ ! خوا ئازادی خوڵقاندووی، خاوەنی ئیرادەو ویستێکی ئازادی، خەڵك دەتوانێ پارچە پارچەت بکات، بەڵام ناتوانێ ویستو خواستی ئازادانەی تۆ بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، ئەگەر بۆخۆت نەتەوێ، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (مریشك بۆخۆی خۆڵ بەسەر خۆیدا نەکات، بە کەسی دیکە بەسەریدا ناکرێ)، ئینسان بۆخۆی خۆی نەکاتە کۆیلە، بە کەس ناکرێتە کۆیلە، وەك ڕواڵەتو جەستە، ژێردەست دەکرێ، زەلیل دەکرێ، بەڵام لە ڕووی دەروونییەوە، هیچ کەس ناتوانێ وات لێبکات، شتێك بڵێی کە قەناعەتت پێی نەبێ، ئنجا سەرکردەکان دەڵێن :

ئەگەر خوا ڕێنمایی ئێمەی کردبایە، ئێمەش ڕێنمایی ئێوەمان دەکرد، یانی : چونکە ئێوە هەر بەدوای ئێمە دەکەوتن بە چاك و بە خراپ، ﴿ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ ﴾، ئێستاش یەکسانە بۆمان، ئێمەش و ئێوەش، ﴿ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴾، نارەحەتیی بکەین، یاخود خۆڕاگربین، هیچ پەنامان نیە، هیچ شوێنی دەربازبوونمان نیە.

دیارە ئەوان بۆیە وایانگوتوە، چونکە لە دۆزەخیشدا هەر لێیان دەبنەوە بە مشوورخۆر، ئەوان دەچن لێیان دەپاڕێنەوەو، دەڵێن: تۆزێك لە سزای خوامان لێ کەم بکەن ! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە سەرکردەکان پێشێ چوونە دۆزەخەوەو، هەموو شتێکیان ئەزموون کردوە، وە ماوەیەکی زۆر نارەحەتییان کردوەو، پاڕانەوەو کرووزاونەوەو سوودی نەبووە، دوایی گوتوویانە: با تۆزێك خۆڕاگربین و پشوو درێژبین و دان بەخۆدا بگرین، بەڵام هەر سوودی نەبووە، بۆیە دەڵێن: ﴿ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴾، یەکسانە : نارەحەتیی بکەین و دادو فیغان بکەین، یاخود دان بەخۆدا گربین و بێ دەنگ بین ، هیچ سوودی نیە ، هەر لە دۆزەخێ داین ، واتە : ئێمە هەموو لامان ئەزموون کردوون ، مەگەر سوودێك لە ئەزموونی ئێمە وەربگرن ، کە بێسوودە هەرچی بکەن ، ئەگەرنا هیچی دیکەمان بۆتان لەدەست نایەت .

٣) وە لە سووڕەتی (سبأ)دا دەفەرموێ :﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓاْ أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ

بِٱللَّهِ وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَغۡلَٰلَ فِيٓ أَعۡنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾، خـــــــــوا دەفەرموێ : ئەگەر ببینی کە ستەمکارەکان لەلای پەروەردگاریان وەستێنراون ، هەندێکیان قسە لەگەڵ هەندێکیاندا دەکەن، (وشەی : ستەمکارەکان هەموویان دەگرێتەوە ، چونکە هەموو لادەران ، بە سەرکردەو شوێنکەوتووەوە ، ستەمکارن ، هەر ئەو کەسە ستەمکار نیە کە پێش خەڵك دەکەوێ، بەڕێی بەتاڵ و پووچدا ، حەڵاڵ لە خەڵك حەرام دەکات و ، حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەکات، چاکەیان بە خراپە پێشان دەداو ، خراپەیان بە چاکە پێشان دەدات ، شتەکانیان لێ هەڵدەگێڕێتەوەو، خۆیان بەسەردا دەسەپێنێ، دەڵێ: من پەروەردگارتانم، تەنیا ئەو ستەمکار نیە، بەڵکو ئەوانەش کە شوێنی دەکەون، بەو ڕێیە پووچ و بەتاڵەدا، ئەوانیش ستەمکارن، چونکە خوای دادگەر هەردووکیان پێکەوە باسی دەکات)، ئەگەر ببینی کاتێك ستەمکاران لەلای پەروەردگاریان وەستێنراون، قسە لەگەڵ یەکدی دا دەکەن و وەڵامی یەکدی دەدەنەوە، ﴿ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ ﴾، ئنجا خوا ﷻ مشتومڕو تووێژەکەیان باس دەکات : ئەوانەی کە چەوسێنراونەوە، بەوانە دەڵێن کە خۆیان بە زلگرتبوو: ﴿ لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ ﴾، ئەگەر ئێوە نەبوونایە، ئێمە ئیماندار دەبووین، ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ ﴾، ئەوانەی کە خۆ بە زلگر بوون، بەوانە دەڵێن کە چەوسێنراونەوە: ئایا ئێمە ئێوەمان لە ڕێنمایی خوا گێڕایەوە، دوای ئەوەی کە (ڕێنمایی خوا) هات، بەڵکو ئێوە بۆخۆتان تاوانبار بوون.

یانی : دەتانتوانی بە دوامان نەکەون، خۆ ئێمە ڕووح و ئیرادەی ئێوەمان پێ کۆنترۆڵ نەدەکرا، دەمانتوانی سجنتان بکەین، دەمانتوانی ئەشکەنجەتان بدەین، دەمانتوانی دەرتان بکەین، بەڵام نەماندەتوانی بڕواو قەناعەتتان بەو

شێوەیە لێ بکەین، کە ئێمە دەمانویست، ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ﴾، وە ئەوانەی کە چەوسێنرابوونەوە، بەوانەیان گوت کە خۆیان بەزل گرتبوو: بەڵکو فێڵی شەوو ڕۆژی ئێوە بوو، واتە: شەوو ڕۆژ ئێوە لە پیلان گێڕاندا بوون، کە ئێمە بکەنە کۆیلەو وابەستەو دابەستەی خۆتان، ﴿ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ﴾، کە فەرمانتان پێ دەکردین : بێبڕوابین بەرانبەر بە خوا، وە هاوبەشانی بۆ دابنێیین، دیارە هاوبەشەکانیش سەرکردەکان بوون، چونکە هەر کەسێك بەدوای کەسێك بکەوێ، لە شتێك دا کە پێچەوانەی دینو شەریعەتی خوایە، وە ڕیشی خۆی لە مست بنێ، وە ویستی خۆی بخاتە دەست، مانای وایە وەك خوا مامەڵەی لەگەڵدا کردووە، کردوویەتی بە هاوتای خوا، چونکە: (أَنْدَاد) کۆی (نِدّ)ە، واتە: وێنەو هاوکوف، واتە: ئێوە ئێمەتان وا لێدەکرد، کە هاوبەشان بۆ خوا دابنێیین، ﴿ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ﴾، ئنجا خوا دەفەرموێ : دوای ئەوەی سزایان بینی بە پەنهانیی پەشێمانییان کێشا، کێ پەشێمانیی کێشا، کێ بە شێوەی نهێنیی‌و پەنهانیی پەشێمانیی پێشان دا ؟ هەموویان : هەم خۆ بە زلگرەکان، هەم چەوسێنراوەکان، ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَـٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، (أَغْلَال) کۆی (غُلّ)ە، واتە: پێوەند، شتێك کە دەکرێتە گەردنی ئینسان، کە ناتوانێ سەر نزم بکاتەوە، یانی : کۆت‌و پێوەندمان خستە گەردنی ئەوانەوە کە بێبڕوا بوون، کێن ئەوانەی بێبڕوا بوون ؟ هەموو ئەوانەن کە بە ڕێی چەوتدا ڕۆیشتوون، چ لە پێشەوە بووبن، چ لە دواوە بووبن، چ سەرکردە بووبن، چ پاشکۆ بووبن، یەك حسابیان هەیە، هەم لە پێش دا، کە دەفەرموێ : ﴿ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾، کەواتە: هەموویان ستەمکارن، هەم دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، وە هەموویان بێبڕوان ﴿ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا

كَانُوا۟ يَعۡمَلُونَ ﴾، ئەمە وەڵامی پرسیارێکە ، کە ڕەنگە لە زۆر مێشکاندا خوتخوتە بکات ! کە دەڵێ : بۆچی خوا ئاوا سزایان دەدات ؟ دەفەرموێ : ئایا پاداشت دەدرێنەوەو سزا دەدرێن ، مەگەر بە گوێرەی ئەوە کە کردوویانە ؟ کردەوەکانیان وا بوونو ئەوەش سزاکەیانە.

٤) وە لە سوورەتی (القصص)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ أَيۡنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغۡوَيۡنَآ أَغۡوَيۡنَٰهُمۡ كَمَا غَوَيۡنَاۖ تَبَرَّأۡنَآ إِلَيۡكَۖ مَا كَانُوٓا۟ إِيَّانَا يَعۡبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدۡعُوا۟ شُرَكَآءَكُمۡ فَدَعَوۡهُمۡ فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُوا۟ لَهُمۡ وَرَأَوُا۟ ٱلۡعَذَابَۚ لَوۡ أَنَّهُمۡ كَانُوا۟ يَهۡتَدُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾، واتە: وە ئەو ڕۆژە (واتە: ڕۆژی دوایی) خوا بانگیان دەکات دەفەرموێ: کوان هاوبەشەکانی من، کە پێتان وابوو، خەیاڵتان وابوو، هاوبەشی منن ؟ ئەوانەی کە فەرمانی خوایان لەسەر هاتۆتە دی (دیارە ئەوانە سەرکردەکانن، پێشڕەوەکانن) گوتیان: ئەی پەروەردگارمان ! ئا ئەوانەی کە ئێمە بێ مرادمان کردوون، سەرگەردانمان کردوون، ئێمە ئەوانمان سەرگەردانو بێ مراد کرد، وەك چۆن خۆشمان بێ مرادو سەرگەردانو چارەڕەش بووین، ﴿ تَبَرَّأۡنَآ[1] إِلَيۡكَ ﴾، ئێستاش ئێمە یەخەیان لێ دادەدڕینو، حاشایان لێدەکەین بۆ لای تۆ، ﴿ مَا كَانُوٓا۟ إِيَّانَا يَعۡبُدُونَ ﴾، ئەوان ئێمەیان نەدەپەرست، واتە: ئێمە ناچارمان نەکردبوون، ئێمە بپەرستن، دەیانتوانی تەسلیمی ئێمە نەبن، بەڵام دیارە خۆیان ئەوەیان پێ خۆش بووە، ئەمە واتایەکی، واتایەکی دیکەشی ئەوەیە کە : ئەوانە هەرچەندە بە ڕواڵەت تەسلیمی ئێمە بوون، بەڵام لە ڕاستییدا ئێمە پەرستراو نەبووین، پەرستراوی ڕاستەقینە،

---

١) (تَبَرَّأۡنَآ إِلَيۡكَ) دیارە (تبرَّأ) بە (من) (تعدّى) دەکات، بەڵام لێرەدا بە (إلى) (تعدّي)ی کردوە، تاکو مانای (رجعنا)ی بخرێتە نێو (ضُمِّن معنى رجعنا) .

﴿ وَقِيلَ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ﴾، وە پێیان گوترا: {کێ پێی گوتن ؟ خوای بێ وێنە، یان فریشتەکان پێیان گوتن:} هاوبەشەکانتان بانگ بکەن، واتە: ئەوانەی کە کردبووتانن بە هاوبەشی خوا، بانگیان بکەن ، با بەدەمتانەوە بێن ، ﴿ فَدَعَوۡهُمۡ ﴾ ئەوانیش بانگیان کردن، ﴿ فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ ﴾، کەچی وەڵامیان نەدانەوە ، کە دە فریایان بێن، ﴿ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ﴾، وە سزای خوایان بینی، ﴿ لَوۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ يَهۡتَدُونَ ﴾، ئەگەر رێی راستیان گرتبایە، لێرەدا شتێك قرتێنراو (مَحْذوف)ە، واتە : خۆزگەیان خواست، ئاواتیان دەخواست، کە ئەگەر لە دنیادا رێگای راستیان گرتبایەو ، تووشی ئەم سەرەنجامە شوومە نەبوونایە ، بەڵام وەك گوتراوە : (لەدوای بارانان کەپەنەك) ، یان : (درەختی خۆزگە بۆ کەس بەرناگرێ) .

٥) لە سوورەتی (الأَحْزَاب)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٨﴾ ﴾، واتە: ئەو رۆژە کە دەمو چاویان وەردەسووڕێنرێ لە ئاگردا، یانی : ئەگەر ئەم لایەی باش سووتا، ئنجا لایەکەی دیکەی، رووی پێ لە ئاگرەکە دەکرێ، وەك چۆن کەسێك کە گۆشت دەبرژێنێ، ئەملاولای پێدەکات، دیارە ئەوانە شوێن کەوتووە سەرگەردانو سەرلێشێواوو هەڵخەڵەتێنراوەکانن دەڵێن: ﴿ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾، خۆزگە فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەرمان کردبایە، ﴿ وَقَالُواْ رَبَّنَآ ﴾، وە گوتیان: ئەی پەروەردگارمان ! ﴿ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾ ، ئێمە

فەرمانبەریی بەرپرس‌و گەورەکانمان کرد، (سادَة)، کۆی (سَیّد)ە، وە (کُبَراء) کۆی (کَبیر)ە، ئنجا هەندێك لە زانایان‌و توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست لە (سادَة)، ئەوانەن کە لە ڕووی ئایینییەوە خەڵك هەڵدەخەڵەتێنن‌و بەناوی ئایینەوە گومڕایان دەکەن، وە (کُبَراء) ئەوانەن کە لە ڕووی سیاسیەوە، واتە: سەرکردە ئایینی‌و دنیاییەکانمان .

هەندێکیشیان بە پێچەوانەوە دەڵێن : (سادَة)، ئەوانەن کە لە ڕووی دنیاییەوە سەرکردەو مشوورخۆری خەڵکن‌و بەڕێی هەڵەیاندا دەبەن، وە (کُبَراء) ئەوانەن کە لە ڕووی ئایینیەوە، خەڵك بە ڕێی هەڵەدا دەبەن، گرنگ ئەوەیە (سادَة) و (کُبَراء) دەبێ دوو شتی جیابن، وە لەڕاستیدا خەڵك کە هەڵدەخەڵەتێ، یان بەدوای سەرکردە دنیاییەکان دەکەوێ، یان بە دوای سەرکردە ئایینیەکان‌و لە ڕێی ئایینەوە هەڵدەخەڵەتێنرێ، ئەو هەموو جوولەکەو نەصرانیی‌و بووزایی‌و مەجووسیی‌و ئێزیدیی‌و صابئیی‌و ...هتدەی کە بەناوی دینەوە هەڵدەخەڵەتێنرێن ، دیارە بەدوای ڕیش سپییەکانیان دەکەون، هەروەها ئەوانەش کە لە ڕووی دنیاییەوە بە دوای سەرکردەکانیان دەکەون، وەك سەرکردە عەلمانیی‌و لیبڕال‌و مارکسیی‌و سەرمایەدارو ... هتدەکان ، چ لە بەرگی دیندا بن ، چ لە بەرگی دنیادا .

ئنجا دەڵێن : ئێمە بەدوای وان کەوتین‌و فەرمانبەریی ئەوانمان کرد، ﴿ فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾، ئەوان لە ڕێ لایان داین، ڕێیان لێ ون کردین، ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴾، پەروەردگارمان ! ئێستا دووقاتیان سزا بدە، وە نەفرینێکی گەورەشیان لێ بکە ! هیچی دیکەشیان لە دەست نایەت، داخی دڵی خۆیان پێ بڕێژن، ئەوە نەبێ کە داوا لە خوا بکەن خوای پەروەردگار دوو هێندەی ئەوانیان سزا بدات، وە نەفرینێکی گەورەشیان لێ بکات.

٦) وە لە سوورەتی (الصافات)یشدا خوا ﷻ هەر باسی شوێنکەوتووان‌و پەیڕەو لێکراوان ، یاخود هەڵخەڵەتێنراوان‌و هەڵخەڵەتێنەران ، یاخود بێهێزەکان‌و

خۆ بە زلگرەکان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ مَا لَكُمۡ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلۡ هُمُ ٱلۡيَوۡمَ مُسۡتَسۡلِمُونَ ﴿٢٦﴾ وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَأۡتُونَنَا عَنِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُواْ بَل لَّمۡ تَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنِۭۖ بَلۡ كُنتُمۡ قَوۡمٗا طَٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيۡنَا قَوۡلُ رَبِّنَآۖ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغۡوَيۡنَٰكُمۡ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمۡ يَوۡمَئِذٖ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٣٤﴾﴾، واتە: ئەوانەی کە ستەمیان کردوە، وە هاووێنەکانیان، وە ئەوەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرست، کۆیان بکەنەوە، {(أَزْوَاج) کۆی (زَوْج)ە، بەمانای جووت دێ، بەلاَم لێرەدا توێژەوانی قورئان گوتوویانە: (أَي: أَصْنَافَهُمْ وَأَشْكَالَهُم) ستەمکارەکان، واتە: ئەوانەی کە لە پێشەوە ڕۆیشتوون، سەرکردەکان کۆبکەنەوە، وە ئەوانەش کە وەك وان بوو ون، کە شوێنکەوتووەکانیانن، وە ئەوانەش کە لە جیاتی خوا پەرستوویانن، واتە: بتو صەنەمو پەرستراوەکانیشیان}، بۆ کوێیان کۆبکەنەوە ؟ ﴿فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ﴾، ڕێنماییان بکەنو، بەرەو دۆزەخ کۆیان بکەنەوەو وەپێش خۆیان بدەن ، وەك چۆن گاڕانو ئاژەڵ پێش خۆ دەدرێ، ﴿وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ﴾، وە ڕایان بگرن لێیان دەپرسرێتەوە، دەبێ هەموویان لێیان بپرسرێتەوە، ﴿مَا لَكُمۡ لَا تَنَاصَرُونَ﴾[1]، بە سەرکردەکان دەگوترێ : ئەوە بۆچی یارمەتی ئەو دەستو پێوەندانە نادەن ، خۆ ئەوانە لە دنیادا پاشکۆی ئێوە بوونو ئێوە لە پێشیانەوە

---

١) هەرچەندە (تَنَاصَرُونَ) لەسەر کێشی (تفاعل)ە‌و بۆ بەشداریی دوو لایەن یان زیاترە، بەلاَم لێرەدا بەپێی سیاق دیارە کە مەبەست سەرخستنی سەرکردەکانە بۆ ژێردەستەکانیان .

بوون ، مادام لە دنیادا هەڵتان خەڵەتاندوون، فەرموون ئێستاش دە فریایان بێن !

﴿ بَلۡ هُمُ ٱلۡيَوۡمَ مُسۡتَسۡلِمُونَ ﴾، بەڵكو ئەوان ئەمڕۆ ملكەچن، ﴿ وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴾، هەندێكیان پرسیار لە هەندێكیان دەكەن، بە شێوەی مشتومڕو موجادەلەو سەركۆنەكردنی یەكدی ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَأۡتُونَنَا عَنِ ٱلۡيَمِينِ ﴾، بێهێزو چەوسێنراوەكان بە سەركردەكان دەڵێن: ئێوە لەلای ڕاستەوە بۆمان دەهاتن، یاخود ئێوە سوێندتان بۆ دەخواردین، ﴿ قَالُواْ بَل لَّمۡ تَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴾، (ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە)، دەڵێن: نەخێر بەڵكو هەر خۆتان بڕوادار نەبوون، ﴿ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنِۭۖ بَلۡ كُنتُمۡ قَوۡمٗا طَٰغِينَ ﴾وە ئێمە دەسەڵاتمان بەسەرتاندا نەبوو، {واتە: دەسەڵاتمان بەسەر عەقڵ و دڵ و ئیرادەتان دا نەبوو}، بەڵكو هەر بۆخۆتان یاخیی بوون ، {یانی : هەر بۆخۆتان ئارەزوومەندی ئەو لارێی و چەوتییە بوون و ، ئێمەش پێشتان كەوتین و ئێوەش بە دوامانندا هاتن، ئەگەرنا خۆ ئاژەڵ نەبوون، ڕاتان بكێشین لە دوای خۆمان} ﴿ فَحَقَّ عَلَيۡنَا قَوۡلُ رَبِّنَآۖ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴾، ئێستاش قسەی پەروەردگارمان لەسەر ئێمە هاتۆتە دی، ئێمە دەبێ (سزا) بچێژین، ﴿ فَأَغۡوَيۡنَٰكُمۡ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴾، ئێمە خۆمان سەرگەردان و بێ مراد بووین ، ئێوەشمان بێ مراد كرد ، چونكە (غِواية) سەرەنجامی (ضلالة)ە، وەك پێشتریش باسمان كرد، یانی : ئێمە بێ ئاكام بووین، ئێوەشمان بێ ئاكام كرد، ئێمە بەدبەخت بووین، ئێوەشمان بەدبەخت كرد .

ئنجا خوا لە كۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿ فَإِنَّهُمۡ يَوۡمَئِذٖ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ ﴾، ئەوان لەو ڕۆژەدا هەموویان پێكەوە هاوبەشن (لە سزا)دا، ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾، ئێمە ئاوا لە تاوانباران دەكەین.

وەك دەبینین خوای کارزان چۆنی پێناسە کردوون: ﴿ ظَلَمُوا ﴾، ﴿ وَأَزْوَاجَهُمْ ﴾، ﴿ طَاغِينَ ﴾، ﴿ بِالْمُجْرِمِينَ ﴾، کەواتە: هەموویان یەکسان دەبنەوە لە تەرازووی دادگەریی خوادا، سەرکردەو سەرمەشقان و شوێنکەوتەکانیان .

٧) وە لە سوورەتی (غافر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي النَّارِ فَيَقُولُ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنْتُمْ مُغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِنَ النَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُلٌّ فِيهَا إِنَّ اللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ الْعِبَادِ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: کاتێك لە ئاگری دۆزەخ دا مشتومڕو شەڕە قسە دەکەن، ئەوانەی بێهێز بوون، بەوانەی کە خۆ بە زلگر بوون دەڵێن : ئێمە لە دنیادا شوێنکەوتووی ئێوە بووین، ئایا ئێوە هیچ بەشێك لە ئاگری دۆزەخمان لێ ناگێڕنەوە ؟ ئەوانەی خۆ بە زلگر بوون دەڵێن: ئێمە هەموومان لێرەداین، بێگومان خوا دادوەریی کردوە لە نێوان بەندەکانیدا {وە هەر کەسە بەشی خۆی پێ بڕاوەو هیچمان لەدەست نایە}.

٨) کۆتا شوێن : لە سوورەتی (فصِّلت)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَا أَرِنَا الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ الْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: وە ئەوانەی بێبڕوا بوون گوتیان: پەروەردگارمان ! ئەوانەی کە لە جندو ئینس ئێمەیان گومڕاو سەرگەردان کرد، پێشانمان بدە تاکو بیانخەینە ژێر پێی خۆمان، بۆ ئەوەی ئەوان لە بنەوە بن. واتە: ئەوان لە خوار ئێمەوە بن لە ئاگری دۆزەخدا، دیارە هیچی دیکەیان لە هەگبەدا نەماوە ئەوە نەبێ، کە ئەو داوایە بکەن.

**ئەنجام**: وەك دەبینن خوا ﷻ شوێنکەوتووەکان بە (ضعفاء) وە ئەوانی دیکە بە ﴿ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا ﴾، وە هەموویشیان بە (ظالمون) و بە (مجرمون) ناو دەبات، کەواتە: دەبێ هەموو کەس بزانێ کە لەبەرئەوەی بێدەسەڵاتەو،

چەوسێنراوەتەوە، وە لەبەرئەوەی شوێن خەڵكی دیكە دەكەوێ، لە سزای خوا رزگاری نابێ‌و، ئەوە نابێتە پاساوو بیانووی دەربازبوونی، بەڵكو هەموویان لە سزادا هاوبەشن، وەك خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾ الصافات، ئەوانە لەو رۆژەدا لە سزادا هاوبەشن . ئێمە ئاوا لە تاوانباران دەكەین (بەو جۆرە سزایان دەدەین).

**مەسەلەی چوارەم** : كە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَقَالَتْ أُولَىٰهُمْ لِأُخْرَىٰهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾، یەكەمەكان بە دوامینەكانیان (سەركردەكان بە شوێنكەوتووو پەیڕەوەكانی خۆیان) گوت : ئێوە هیچ چاكەو پەسندییتان بەسەر ئێمەوە نیە ، دوای ئەوەی كە فەرموودەی پەروەردگار دەبیستن ، كە دەفەرموێ : ﴿ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾، بۆ هەر كامێكتان سزای دوو قات هەیە، نەك هەر بۆ سەركردەكان، بۆ ئێوەش ئەی شوێنكەوتووو چاولێكەرو هەڵخەڵەتێنراوەكان ! ئنجا ئەو سەركردەو دەمڕاستو مشوورخۆرانە، وەك بڵێی شەماتەیان[1] پێدەكەن‌و، داخی دڵی خۆیانیان پێ دەرێژن، دەڵێن: ئێوەش هیچ زیادیی‌و پەسندییتان بەسەر ئێمەوە نیە، دە سزا بچێژن، بەهۆی ئەوەوە كە دەتانكرد، كەواتە: وەك یەكن، چونكە خوای قسەلەجێش لە كاتی وەڵامی سەركردەكانیان‌و پێشووەكانیان دا، كە بە پەیڕەوانی خۆیان دەڵێن: ئێوەش زیادەتان بەسەر ئێمەوە نیە، نەیفەرمووە: وانیە كەواتە: هەردووكیان لە سزادا وەك یەك‌و یەكسانن،

وە لەڕاستییدا ئەگەر تەماشای واقیع بكەین : زۆرجار ئەو كەسەی دەبێتە سەركردەیەكی لادەرو ستەمكار، ئەو باندەی كە هەیەتی زۆر لە خۆی زاڵمترو گەندەڵترو تاوانبارترە، نەك هەر ئەوەندە، بەڵكو جاری وا هەیە ئەوان سەركردەكە هاندەدەن بۆ ئەنجامدانی كردەوە خراپەكان، بۆیە شتێكی سەیر نیە،

---

١) شماتة : خۆشحاڵیی دەربڕینی كەسێكە بە ناڕەحەتیێ كەسێكی ناحەزی .

کە سزایەکەیان لە هی سەرکردەکانیان خراپتر بێ، مادام کردەوەیان لە هی وان خراپتر بێ، وە ناخیان لە هی وان پیسترو گڵاوتر بێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُواْ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤٠﴾ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ ﴾، ئێمە لەبەردەم ئەم دوو ئایەتەدا ، دوو هەڵوەستە دەکەین :

**هەڵوەستەی یەکەم** : هەندێك لە زانایانی ڕوونکەرەوەی قورئان گوتوویانە: کە دەفەرموێ: ﴿ لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ ﴾، دەروازەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێنەوە، (قِيلَ المُرَادُ: لا يُرْفَعُ لَهُمْ مِنْهَا عَمَلٌ صالِحٌ وَلاَ دُعَاء)، واتە: هیچ کردەوەیەکی باش و هیچ نزاو پاڕانەوەیەکیان بۆ لای خوا بەرز نابێتەوە، ئەمە (مجاهید و سعید بن جبیر) وایانگوتوە، هەروەها : (العَوْفِيُّ وَعَلِي بْنُ أَبي طَلْحَة، لە (ابْنِ عَبَّاسٍ)ەوە، وە (الثَّوْرِي) لە (لَيْث) لە (عَطاء) لە (ابْنِ عَبَّاسٍ)ەوە هێناویانە.

وە هەندێکی دیکە گوتوویانە: (وَقِيلَ المُرَادُ: لاَ تُفَتَّحُ لأَرْوَاحِهِم أَبْوَابُ السَّمَاءِ) واتە: مەبەست ئەوەیە دەروازەکانی ئاسمان بۆ ڕووحەکانیان ناکرێنەوە، چونکە دوای ئەوەی ڕووحی مرۆڤ دەکێشرێ، لەلایەن فریشتەی گیان کێشانەوە ، بۆ ئاسمان بەرز دەکرێتەوە، وەك دوایی فەرمووده دێنین لەوبارەوە، ئنجا ئەگەر بەهەشتیی نەبێ، ڕووحەکەی ناچێ بۆ سەرەوە، کە دیارە بەهەشت لە سەرەوەیە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَـٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ ﴾المطففین، واتە : نەخێر (وانیە کە کافرەکان دەڵێن) لیستی کردەوەی خراپەکاران لە خواری خوارێیە.

هەروەهـا دەفـەرموێ : ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ ﴾المطففين ، واتە: نەخێر (وانیە) لیستی کردەوەی چاکەکاران لە سەری سەرەوەیە .

ئنجا هەرچەندە سەرەوەو خوارەوە گوێرەیی (نسبي)ین، بەڵام بە هەر حاڵ، چەمکی سەرەوەو خوارەوە، ئینسان هەر بە سروشتی خۆی هەستی پێدەکات، کە بەهەشت لە سەرێو، دۆزەخ لە خوارێیە، ئەمەشیان (رَوَاهُ الضّحّاك، عَنِ ابْنِ عَبَّاس، وَقَالَهُ السُّدِّيُّ وَغَيْرُ وَاحِد) (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص ٤٧٦) .

ئنجا لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە: {عَنِ البَرَاءِ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ذَكَرَ قَبْض رُوحِ الفَاجِرِ وَأَنَّهُ يُصْعَدُ بِهَا إِلَى السَّمَاءِ، قَالَ: فَيَصْعَدُونَ بِهَا، فَلا يَمُرُّونَ بِهَا عَلَى مَلإٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ، إِلاَّ قَالُوا: مَا هَذَا الرُّوحُ الْخَبِيثُ؟ فَيَقُولُونَ: فُلاَنُ ابْنُ فُلاَنٍ، بِأَقْبَحِ أَسْمَائِهِ الَّتِي كَانَ يُسَمَّى بِهَا فِي الدُّنْيَا، حَتَّى يُنْتَهَى بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَيُسْتَفْتَحُ لَهُ، فَلا يُفْتَحُ لَهُ، ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ﴿ لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ﴾} (أَخْرَجَهُ الطّيالِسي برقم: (٧٥٣)، وَأَحْمَد برقم: (١٨٥٥٧)، وَقَالَ الهَيْثَمِي: رجاله رجال الصحيح، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٥٣)، وَابْنُ خُزَيْمَة في "التوحيد" (ص ١١٩)، وَالحَاكِم برقم: (١٠٧)، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْط الشَّيْخَين، وَالبَيْهَقِي في "شعب الإيمان" برقم: (٣٩٥)، وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد)، واتە: بەراء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کێشرانی ڕووحی مرۆڤی خراپەکاری دەکرد، کە بەرز دەکرێتەوە بەرەو ئاسمان، فەرمووی : فریشتە ڕووحەکەی دەبەن، بەرزی دەکەنەوە، بە لای هیچ کۆمەڵێك لە فریشتەکان دا تێپەڕ نابن، مەگەر لێیان دەپرسن : ئەو ڕووحە پیسە هی کێیە ؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەوە هی فلان کەسە، بە ناخۆشترین ناو کە لە دنیادا پێی بانگکراوە، ناوی دێنن، هەتا دەیبەن بەرەو ئاسمانی نیزیك (یەکەم) ، ئنجا داوا دەکەن دەروازەی ئاسمانیان بۆ بکرێتەوە، بەڵام

بە ڕوویاندا ناکرێتەوە ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە :

﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ﴾، واتە: دەروازەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوەو ناچنە نێو بەهەشت، هەتا حوشتر بە کونی دەرزییەوە نەچێ ، {حوشتر بۆخۆی ئەوەندە زل ، چۆن بەو کونە بچووکەوە دەچێ ؟!} .

وە هەندێك گوتوویانە: (الجَمَلُ: هُوَ حَبْلُ السَّفِينَةِ الَّذِي يُقَالُ لَهُ القَلْسُ) واتە: (جَمَل) ئەو گوریسە گەورەیە کە کەشتی پێ ڕادەگیرێ، کە زۆر ئەستوورە .

بەڵام مانای یەکەم زیاتر لە ڕاستییەوە نزیکە، کە مەبەست پێی مانا باوەکەیەتی کە حوشتری نێرەیە، کە دیارە بەو جەستە گەورەو زلە ، هەرگیز بە کونی دەرزیەوە ناچێ، پاشان خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ﴾، ئاوا سزای تاوانباران دەدەین.

**<u>هەڵوەستەی دووەم</u>** : لە ئایەتەکەی دیکەدا کە دەفەرموێ : ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، واتە: وە لە دۆزخدا (مِهَاد)یان بۆ هەیە ، (مِهَاد ومَهد : مَا يُمَهَّدُ لِلشَّخْص) بۆیە بێشکەی منداڵ پێی دەگوترێ : (مَهْد) ، گوتراوە : (اطْلُبُوا العِلْمَ مِنَ الْمَهْدِ إِلَى اللَّحْدِ) ، واتە : داوای زانیاریی بکەن (و بە دوای زانست دا بگەڕێن) لە نێو بێشکە (لانکە)وە تاکو دەچنە ژێر خاك، دیارە بێشکەو جۆلانەش بۆ منداڵان ئامادە دەکرێ .

بە کورتیی : خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوانە لە ئاگری دۆزەخدا شوێنیان بۆ ڕادەخرێ ، ڕایەخیان بۆ دادەنرێ ، ﴿وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، وە لە سەرووشیانەوە پێخەف ، یاخود لێفە هەیە ، کە پێیاندا

دەدرێ ، هەموویشـی لـە ئـاگرە ، واتـە: هـەم بنـەوە (ژێـرەوە) یـان‌و هـەم سـەرەوەیان لـە ئـاگرە، خـوا پـەنـامان بـدات .

وە بەو شـێوەش سـزای سـتەمکاران دەدەیـن .

**<u>مەسـەلـەی شـەشـەم</u>:** دوای ئەوەی خـوای زانـاو شـارەزا باسـی سـزای تاوانبـارانی کـرد، ئنجـا باسـی پاداشـتی ئیمانـدارانێك دەکـات، کـە کـردەوە باشـەکـانیان ئەنجـام داون، دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتـە : بێگومـان ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکـانیـان ئەنجـام داون، ـ کە بێگومان هیـچ شـتێك لـە هـیچ کەسێك داوا ناکـەین، مەگەر ئەوەنـدەی لە توانـایـدا هەبـێ. {لێرەدا بۆیـە خـوا وایفـەرمووە ، تاکـو کـەس وا گومـان نەبـات، کە ئەوانەی ئیمانیـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکـانیان ئەنجـام داون ، ئەرکێکیان لەسـەر دانـراوە، کـە توانـا پڕووکـێن بـووە، نـەخێر، خـوای دادگـەرو بـە بـەزەیـی هـەر ئەوەی لە توانـای مرۆڤ دایە ، لەسـەری پێویست دەکات ، کەواتە : ئەو کـردەوە باشـانەی ئیمانداران ئەنجامیـان داون ، شـتێکی دەسـتەوسانکەر نەبوون، کـە کـەس جگـە لـەوان نەیتـوانیبـێ ئەنجـامیان بـدات ، بەڵکـو هـەر کەسـێکی دیکـە بیـویسـتبایـە دەیتوانـی ئەنجامی بدات} .

ئنجا خـوا دەربارەی ئەو ئیـماندارانە دەفـەرموێ : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئـا ئەوانـە هـاوەڵی بـەهەشـتن‌و بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەمێننـەوە، جـاری دیکـەش باسـمان کردوە ، (أصحاب) هـەم بـە مانـای هاوەڵ دێ ، هەم بـە مانای خـاوەن دێ .

کـە دەشـفەرموێ : ﴿ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾، کـە پێشتـر مانامـان کـردو لێـرە دووبـارەی ناکەینـەوە، بـەڵام پێـنج هەڵوەسـتەی لـە بەرانبـەردا دەکـەیـن :

**هەڵوەسـتەی یەکـەم** : وشـەی (غِـلّ) یانـی : (الـبُغْضُ الْمُستكِن) یـان (الـبُغْضُ الكاتِـم) واتـە: کینـەیەکی شـێردراوە، واتـە: ئـەو کینەیـەی کـە لـە سینەیـاندا شـێردراوەتـەوە، دایدەڕنیـنو سینەیان پاك دەکەینـەوە، لە بوغـزو ڕقو کینـە.

چەنـد ڕیوایەتێـك هـەن کـە تیشـك دەخەنـە سـەر مانـای ئـەم ڕسـتە قورئـانییـە، پێـم باشـە ئـاماژەیـان پـێ بکـەم :

یەکـەم: (قَـالَ قَتَـادَةَ: قَـالَ عَلِـيٌّ رَضِـيَ اللّٰهُ عَنْـهُ: إِنِّـي لأَرْجُـو أَنْ أَكُـونَ أَنَـا وَعُثْـمَانَ وَطَلْحَـةُ وَالزُّبَيْــرُ، مِــنَ الَّــذِينَ قَــالَ اللّٰهُ تَعَالــى فِـيهِمِ: ﴿ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ ﴾) {أَخْرَجَـهُ نُعـيم بـن حمـاد فـي "الفـتن" بـرقم: (١٩٤)، وَابْـنُ أَبـي عاصـم فـي "السـنة" بـرقم: (١٢١٥)، وَالطَّبَرَانِـيُّ فـي "الكبيـر" بـرقم: (١١١)، وَالبَيْهَقِـي فـي "السُّنَن الكُبْرَى" برقم: (١٦٤٩١)، وَإِبْنُ أَبي شَيْبَـة بـرقم: (٣٨٩٧٦)، والحاكِم في "المستدرك" برقم: (٤٥٦٣) بنحوه، وَإِسْنَادُهُ حَسَن).

واتـە: قەتــادە دەڵــێ: عەلـی خـوا لـێی ڕازی بـێ، گوتوویـەتی: ئومێدم وایـە، منو عوسمانو تەڵحەو زوبەیر لـەوانە بـین کە خـوای بـەرز لەبارەیانــەوە فەرموویــەتی: ﴿ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ ﴾، هەرچـی کینــە لــە سـینەیاندا هــەبوو، دەرمانهێنــاو پاکمــان کـــردەوە، دیــارە لەبـــەرئەوەش وایگــوتوە، چـونکە ئـەوان لـە دنیـادا کێشـەو ناکۆکییـان لـە نێوانـدا هـەبوو، گوتوویـەتی: ئومێد دەکـەم لە دواڕۆژدا خـوا سینەمـان بـەرانبـەر بـە یەك پاك

بکاتەوە، هەڵبەتە بەشەریش هەر بەشەرەو، فریشتە نیە، تاکو بگوترێ: چۆن دەبێ ئەوانە کینەو بوغزیان بەرانبەر یەکدی چووبێتە دڵ ؟ مرۆڤ بۆیە دروست کراون ، تاکو تاقیبکرێنەوە بە یەکدی ، بۆئەوەی خۆمان لە سیفەتە خراپەکان بە دوور بگرینو سیفەتە باشەکان لە خۆماندا بێنینە دی .

دووەم: ﴿عَنْ أَبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَخْلُصُ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ، فَيُحْبَسُونَ عَلَى قَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيُقْتَصُّ لِبَعْضِهِمْ مِنْ بَعْضٍ مَظَالِمُ كَانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا هُذِّبُوا وَنُقُّوا أُذِنَ لَهُمْ فِي دُخُولِ الْجَنَّةِ، قَالَ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَحَدُهُمْ أَهْدَى بِمَنْزِلِهِ فِي الْجَنَّةِ مِنْهُ لِمَنْزِلِهِ كَانَ فِي الدُّنْيَا﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٤٤٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (٨٧٠٦) وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد، وَأَحْمَد برقم: (١١٧٢٤)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَين}، واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : کە بڕواداران لە ئاگر دەرباز دەبن (یانی: کاتێ بەسەر پشتی دۆزەخ دا تێپەڕ دەبن)، لە شوێنێك ڕادەگیرێن لە نێوانو دۆزەخو بەهەشت دا، تۆڵەیان بۆ وەردەگیرێتەوە، بۆ هەندێ لەو ستەمو دەستدرێژییانەی کە لە دنیا بەرانبەر یەکدی کردوویانە، هەتا پاك دەبنەوە، ئنجا دوای پاکبوونەوە، مۆڵەتیان پێدەدرێ کە بچنە بەهەشت، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە، یەکێك لەوان بۆ جێگاو ڕێگاکەی خۆی لە بەهەشت دا، شارەزاترە کە لە دنیادا دەچێتەوە ماڵی خۆی .

**هەڵوەستەی دووەم** : کە خوا دەفەرموێ: ﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ ﴾، یانی : (تَجْرِي مِنْ تَحْتِ قُصُورِهِمُ الأَنْهَار)، ڕووبارگەل بەژێر کۆشکەکانیان دا دەڕۆن . ئەگەرنا ئاو بەژێردا ڕۆیشتن ، نیعمەت نیەو ، زەحمەتە ، پەندی پێشینانە دەڵێن : (ئاویان لەژێر کردو دەریانپەڕاند) ، وە لە زمانی عەرەبیدا ئەم جۆرە

تەعبیرانە هەن ، ڕووبارەکان بەژێریاندا دەڕۆن ، یانی : بە ژێر کۆشكو تەلارەکانیاندا دەڕۆن .

**هەڵوەستەی سێیەم** : پاشان کە بەهەشتییەکان دەڵێن: ﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ﴾.

(الطبري) دەربارەی مانای ئەم ڕستە قورئانییە دەڵێ: (الحَمْدُ للهِ الَّذِي وَفَّقَنَا لِلْعَمَلِ الَّذِي أَكْسَبَنَا هَذَا الَّذِي نَحْنُ فِيهِ مِنْ كَرَامَةِ اللهِ وَفَضْلِهِ، وَصَرْفِ عَذَابِهِ عَنَّا، وَمَا كُنَّا لِنَرْشُدَ لِذَلِكَ، لَوْلا أَنْ أَرْشَدَنَا اللهُ لَهُ وَوَفَّقَنَا بِمَنِّهِ وَطَوْلِهِ)[1]، واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە یارمەتی ئێمەیدا، بۆ کردەوەیەك کە ئەم ژیانە خۆشەو ئەم پاداشتەی پێ وەدەست هات، کە ئێستا تێیداین، لە ڕێزگرتنی خوا بۆ ئێمە، وە لە چاکەی خوا لەسەر ئێمە، وە لەوە کە سزای خۆی لەسەر ئێمە لاداوە، وە ئێمە بەو ڕێیەمان نەدەزانی، ئەگەر خوا سەرڕاستی نەکردباینو، بە چاکەو بەخششی خۆی یارمەتی نەدابایـن.

وە هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كُلُّ أَهْلِ النَّارِ يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، فَيَقُولُ: لَوْ أَنَّ اللهَ هَدَانِي فَيَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً، قَالَ: وَكُلُّ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، فَيَقُولُ: لَوْلا أَنَّ اللهَ هَدَانِي، قَالَ: فَيَكُونُ لَهُ شُكْرًا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (١٠٦٦٠) تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِي، وَالحَاكِم برقم: (٣٦٢٩)، وَحَسَّنَهُ الألباني في "الصحيحة" برقم: (٢٠٣٤)}، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو کەسێکی دۆزەخیی، جێگاو ڕێگای خۆی دەبینێ لە بەهەشتدا، دەڵێ: ئەگەر خوا ڕێنمایی کردبام، ئەوە جێگاو ڕێگای من دەبوو، ئەوەش مایەی خەمو خەفەتە بۆیان، وە هەموو بەهەشتییەکیش جێگاو ڕێگای خۆی دەبینێ لە دۆزەخدا، دەڵێ: ئەگەر خوا ڕێنمایی نەکردبام، ئەمە جێگاو ڕێگام دەبوو، ئەوەش دەبێتە (مایەی دڵخۆشیی‌و) سوپاسگوزاریی بۆی.

---

١) جامع البيان، ج ٨ ، ص١٩٢.

**هەڵوەســتەی چـوارەم** : کە دەڵێن : ﴿لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّ﴾، بێگومان ڕەوانەکـراوانـی پەروەردگـارمـان هەقیـان بۆ هێنـابوویـن .

منیش دەڵێم : دەنـگـو باسـی ئـەولا، دەبێ هـەر لـە نوێنـەری مـەولا جل وعـلا ببیستـرێ، کـە ئایـا لـەوێ چ باسـەو چـۆن دەگـوزەرێ ؟ بێگومـان بـەس خـوای پەروەردگار هەواڵمان پێـدەدات، وەك چۆن لـە دنیـادا ڕێنمـایی کـردین، کـە دەبێ چۆن بژینو، چی چاکەو چی خراپـە ؟ چـی حەڵاڵەو چـی حەرامـە ؟ وەك شـتی بنەڕەتـیی، نەك وەك وردەکارییـەکانی کە لە مەودای عەقڵی بـەشـەردان، دەبـێ بەرنـامـەی ژیـان هـەر لـە خـواوە پێشـانمـان بـدرێ، بێگومـان بـە نسبـەت ڕۆژی دواییشـەوە : سـزا چـۆن دەبـێ ؟ پاداشـت چۆن دەبێ ؟ چیمان لـێ دێ ؟ خـوا چـیمان لـێدەکـات...؟ هـەمووی هەردەبـێ لـە ڕێـی وەحییـەوە بزانـرێ ، وە بـە گومانو بـە تەخمیـن، بێگومـان نازانـرێ !

**هەڵوەســتەی پێنجـەم** : ئنجا لە کۆتـایی دا دەفـەرموێ : ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾، وە بانـگ کران : کە ئەو بـەهەشتەی کـراوە بـە میـراتتـان ، بـەهـۆی ئـەوەوەیە کە دەتـانکـرد، یـانی: بـەهـۆی ئـەو کـردەوە باشـانەوە ئەنجامتان دەدان ، ئەم بـەهەشـتەتان پێـبـڕاوە ، ئنجـا ئـایا بۆچـی ئـەم تەعبیـرە بـەکارهـاتوە ؟

أ / (طَبَـرِي) لـە تەفسیـــرەکەی دا[1]، دەڵـێ: چـونکە ئـەو بـەهەشـــتە شـــوێنی کافرەکـان بووە، بۆیـە بـە میـرات ناوبـراوە، کە ئەگەر بـە پێی ئـەم بۆچوونـە بـێ ، هـەموو ئیمـانداریـێك شـوێنی تایبـەتی خـۆی هەیـە لـە بـەهەشـتو ، شـوێنی کـافرێکیش بـە میـرات دەگـرێ.

ب / بەڵام بۆچوونێکـی دیکەش هەیە دەڵێ: چونکە بەهەشـت وەك میـرات دەبێتە موڵکی خۆیـان، وەك چۆن کەسێك کە میراتی بۆ دەمێنێتەوە، دەبێتە هی خۆیو کەس بۆی نیە داوای بکاتەوە، ئەوانەش ئەو بـەهەشـتە موڵکی خۆیـانـە.

---

١) جامع البيان، ج ٨ ، ص ١٩٣.

ج / مانایەکی دیکەشی ئەوەیە کە ئەوان کردەوەکانیان لەقەدەر بەهەشت نین، بۆیە ئەم وشەی میراتە بەکارهاتوە، وەك چۆن بابای میراتگر بە میراتەوە ماندوو نابێ، ئەوانیش بە هەمان شێوە، ئەمەش لێکدانەوەیەکی جوانە : ئیمانداران کردەوەکانیان هۆکارن بۆ چوونە بەهەشت، بەلاّم ئەو کردەوانە نرخی تێرو تەواوی بەهەشت نین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە دە (١٠) ئایەت پێكدێ، ئایەتەكانی (٤٤ تا ٥٣)، لەم دە (١٠) ئایەتەدا درێژترین وتوویژی نێوان بەهەشتییانو دۆزەخییانی تێدایە، هەروەها ئەم چەند ئایەتە تاكە شوێنێكە لە قورئاندا ، كە باسی (ئەعراف)و ئەهلی ئەعرافی تێدایە، كە دیارە شوێنێكە لە نێوەڕاستی بەهەشتو دۆزەخداو، خەڵكەكەی ئاگاداری هەر كام لە بەهەشتو دۆزەخ هەنو، سەلام لە بەهەشتییان دەكەنو ، سەرزەنشتی دۆزەخییەكانیش دەكەن .

هەروەها باسی جارچییەك دەكرێ، كە لە نێوان بەهەشتو دۆزەخییاندا قسەی خۆی دەكاتو نەفرین، لە دۆزەخییەكان دەكات .

پاشان خوای كاربەجێ ئەو ڕاستییە ڕادەگەیەنێ كە هۆكاری ئەو چارەنووسە نەگریسەی ئەهلی دۆزەخ، ئەوە بووە كە ئایینەكەیانیان بە گاڵتەو یاریی گرتووەو، ژیانی دنیا فریوی داون !

پاشان باسی قورئان دەكات كە بە چ مەبەستێك هاتووەو ، سەرەنجام باسی پەشێمانییو داخو حەسرەت خواردنی ئەوانە دەكات ، كە قورئانیان فەرامۆش كردووەو ، پشتیان لە بانگو پەیامی پێغەمبەران (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) كردووە !

﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا
وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ
عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ
رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ
يَطۡمَعُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ
جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ
﴿٤٩﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ فَهَلۡ فَهَلۡ فَهَلۡ
مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ فَهَلۡ ٱتَّخَذُواْ
دِينَهُمۡ لَهۡوٗا وَلَعِبٗا وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ
يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿٥١﴾ وَلَقَدۡ جِئۡنَٰهُم بِكِتَٰبٖ فَصَّلۡنَٰهُ
عَلَىٰ عِلۡمٍ هُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأۡوِيلَهُۥۚ يَوۡمَ يَأۡتِي تَأۡوِيلُهُۥ
يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ
فَيَشۡفَعُواْ لَنَآ أَوۡ نُرَدُّ فَنَعۡمَلَ غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ قَدۡ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَضَلَّ عَنۡهُم
مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾.

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە هــاوەڵانی بـەهەشــت بـانگی هـاوەڵانی ئــاگر "ی دۆزەخ"یـان کـرد: کـە ئێمـە بینیمان بـەڵێنێـك کە پەروەردگـارمان پێی دابووین ڕاسـت دەرچوو، ئنجـا ئـایا ئێـوەش بـەڵێنــی پەروەردگــارتانتان بینـی ڕاســت دەربچـێ ؟ گوتیـان: بـەڵــێ، ئنجـا جارچییەك جارِیــدا : کە نەفرینــی خــوا لـە ستەمکـاران ﴿٤٤﴾ ئەوانـەی "خەڵـك" لـە ڕێـی خــوادا لادەدەن‌و هـەوڵدەدەن خـوارو خێچـی بکــەن، وە بڕواشــیان بــە ڕۆژی دوایـی نیــە ﴿٤٥﴾ وە لـە نێوانیـان "بـەهەشــتییان‌و دۆزەخییـان" دا نێـوانیـك هەیــەو، لەســەر بــەرزایی یـەکـان پیـاوانێك هــەن ، کــە هەموویــان بــە نیشـانەکـانیان دەناسـنەوە، وە بانگــی هاوەڵانـی بـەهەشـتیان کرد کە : سـەلامتـان لـێ بـێ، نەچـووبوونــە نێـو "بـەهەشـت"ێ، بـــەڵام ئومێـدیـــان وابـــوو "بچـــن" ﴿٤٦﴾ وە کـــاتێك ڕوویـــان بـــەرەو هـــاوەڵانی دۆزەخ وەرچەرخێنرا، گوتیان: پەروەردگـارمان ! ڕەگەڵ کۆمـەڵی ستەمکـارانمان مەخـە ﴿٤٧﴾ وە هـاوەڵانـی ئەعـراف پیـاوانێکیان "کە بـە نیشـانە دەیانناسینەوە" بانگ کـرد : گوتیـان : ئـایا کۆمـەڵەکەتان‌و ئـەوە کە خۆتان بـە زلـگـرت، چ ســوودێکی پێگەیانـدن ؟ ﴿٤٨﴾ ئـایـا ئــا ئەوانـە بـوون "بـەهەشـتییەکــان" کـە سـوێندتان دەخــوارد، خــوا بــەزەیی پێیــاندا نایەتــەوە؟ "کەچـی ئێســتا پێیـان گـوترا :" بچـنە بـەهەشـتەوە، نەترســتان لەســەرەو نەخەمبــار دەبــن ! ﴿٤٩﴾ وە هــاوەڵانی ئـاگــر "ی دۆزەخ" بـانگی هـاوەڵانی بـەهەشــتیان کــرد : کــە لـە ئــاو، یـان لـەوەی کـە خــوا پێیــداون، بـەســەرماندا بڕێــژن، گوتیـان : بێگومان خـوا لە کـافـرانی قەدەغـە کـردوون ﴿٥٠﴾ ئەوانـەی کـە ئـایینـەکەیـانیـان کـردوە بــە مایــەی خافــڵان‌و یاریــی، وە ژیــانی دنیــا فریــوی داون، بۆیــە ئــەمڕۆ ئێمــەش لەبیـریـان دەکـەین، وەك چۆن ئەوان دیـداری ئەمڕۆیـان لە یـاد کـردبوو، وە نکووڵییــان لـە ئـایەتەکـانمان دەکـرد ﴿٥١﴾ وە بــە دڵنیـایی ئێمـە کـتێبێکمان بـۆ هێنـاون، کـە بــە زانیـارییــەوە ڕوونمــان کردۆتــەوە، ڕێنمــایی‌و بـەزەییــە، بـۆ کەسـانێك بـڕوابێنن ﴿٥٢﴾ ئنجـا ئــایا چاوەڕێــی سـەرەنجـامەکەی دەکـەن ! کـاتێك سـەرەنجـامەکەی دێ "ئـەوەی

فەرموویەتیو هەواڵی پێداوە دێتە دی" ئەوانەی کە پێشتر لە بیریان کردبوو، دەڵێن: بە ڕاستیی پێغەمبەرانی پەروەردگارمان، هەقیان هێنابوو، ئنجا ئایا هیچ تکاکارانێك هەن تکامان "لە لای خوا" بۆ بکەن، یان بگێڕڕێینەوە "بۆ ژیانی دنیا" کردەوەیەکی دیکەی جیا لە کردەوە پێشووەکانمان بکەین ؟! بە مسۆگەریی "ئەوانە" خۆیان لە دەستداو، ئەوەی بە درۆ هەڵیان دەبەست، لێیان ون بوو ﴿٥٣﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(وَنَادَىٰٓ ) : واتە: بانگی کرد، (النِّدَاءُ: رَفْعُ الصَّوْتِ وَظُهُورُهُ، وَأَصْلُ النِّدَاءِ مِنَ النَّدَى أَي الرُّطُوبة، وَصوْتٌ نَدِي أيٌّ رَفِيع)، (نِداء) واتە: دەنگ بەرزکردنەوەو دەنگ ئاشکرا کردن، وە وشەی (نِداء) لە بنەڕەتدا لە (نَدَى)وە هاتوە، (نَدَى) واتە: ئاونگ، یاخود تەڕایی، وە دەگوترێ: (صوْتٌ نَدِيٌّ) واتە: دەنگێکی بەرز.

(حَقًّا) : (أَصْلُ الحَقِّ المُطابَقَةُ وَالمُوَافقَة)، وشەی (حَق) لە بنەڕەتدا بریتیە لەوەی کە دەگوترێ، لەگەڵ ئەوەی کە هەیە، پڕ بە پێست بێو ڕێك دەربچێ.

(مُؤَذِّنٌۢ ) : (المُؤَذِّنُ : كُلُّ مَنْ يُعْلِمُ بِشَيءٍ نِدَاءً)، (مُؤَذِّن) بریتیە لە هەر کەسێك کە ئاگادار بکاتەوە بەشێوەی بانگکردن، واتە: خەڵك ئاگادار بکاتەوە، بۆیە بانگبێژ پێی دەگوترێ: (مُؤَذِّن)، چونکە خەڵك ئاگادار دەکاتەوە، کە کاتی ئەنجامدانی نوێژە.

(يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ) : واتە: خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەن، (الصُّدُودُ وَالصَدُّ قَدْ يَكُونُ انْصِرَافاً عَنِ الشيءِ وَامْتِنَاعاً، وَقَدْ يَكُونُ صَرْفاً وَمَنْعاً)، (صُدُودُ، صَدّ) دەگونجێ بریتی بێ لەوەی کە ئینسان خۆی واز لە شتێك بێنێو ڕووی تێنەکاتو دەستبەرداریی بێ ، وە دەشگونجێ بریتی بێ لەوەی خەڵك لابداتو پێشگیریی لە خەڵك بکات ، لەوەی بەرەو هەق بچن ، ئنجا لێرەدا کە خوا وای فەرمووە ، مەبەستی ئەوەیە ، ئەوانە خۆیان لە ڕێی خوا لادەدەن، یان خەڵك لادەدەن.

(وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًا ) : یانی: (يَطْلُبُونَ اعِوِجَاجَهَا) واتە: دەیانەوێ خواری بکەن، لاری بکەن، دەیانەوێ ڕاستە شەقامی خوای پەروەردگار بە خواریی بخەنە بەرچاوی خەڵکی، وەك چۆن ئێستا دەوڵەتە کافرو زلهێزەکانو عەلمانییەکان، کە دەیانەوێ پەروەردگارێتییو پەرستراوێتیی بەسەر خەڵکدا بکەن، دەیانەوێ

بەهۆی هەڵسوکەوتی هەڵەو لادەنەرانەی هەندێ گرووپی لاڕێو کرچوکاڵەوە، وا پێشان بدەن ، کە ئیسلام ئاوایە، کە بۆخۆشیان دەزانن کە ، ئەوانە لایانداوەو ئیسلام ڕێی ڕاستی خوایە .

(حِجَابٌ) : (الحَجْبُ وَالحِجَابُ : المَنْعُ مِنَ الوُصُول) ، وشەی (حِجَاب) بە مانای پەردە دێ، وە بە مانای ڕێگرتن لە گەیشتن دێ، ڕێ لە شتێك بگری، بگاتە شتێك، پێی دەگوترێ: (حَجْب)، وە پێشی دەگوترێ: (حِجَاب).

(ٱلْأَعْرَافِ) : (الأَعْرَافُ: قِيل : سُور بَيْنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، الحَاجِزُ بَيْنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، جَمْعُ عُرف، وَعُرْفُ الجبَل، وَنَحْوِهِ: أَعْلاَهُ)، (أَعْرَاف) دیوارو شوورایەکە لە نێوان بەهەشتو دۆزەخدا، وە (أَعْرَاف) کۆی (عُرْف)ە ، دەگوترێ : (عُرْفُ الجبَل) واتە : لووتکەی هەرە بەرزی چیایەکە ، یاخود قەراغەکەی لە لای سەرێوە .

(بِسِيمَـٰهُمْ) : (السِّيْمَاءُ وَالسِّيْمِيَاءُ : العَلاَمَةُ) ، هەردوو وشەی (سِيْمَاء، سِيْمِيَاء) واتە : نیشانە ، (وَسَوَّمْتُهُ أَي أَعْلَمْتُهُ) ، (سَوَّمْتُهُ) واتە : نیشانەدارم کرد .

(تِلْقَآءَ) : واتە : (حِذَائَهُ) یانی : بەرانبەر ، ڕووبەڕووی .

(أَفِيضُواْ ): (فَاضَ المَاءُ إِذْ سالَ مَنْصَبًّا، وَأَفَاضَ إِنَاءَهُ إِذَا مَلأَهُ حَتَّى أَسالَهُ)، (فَاضَ المَاء) واتە: ئاوەکە هەڵڕژا، (أَفَاضَ إِنَاءَهُ) واتە: قاپەکەی خۆی پڕ کرد هەتا لێی ڕژا .

(لَهْوًا ) : (اللَّهُو : مَا يَشْغُلُ الإِنْسانَ عَمَّا يَعْنِيهِ وَيُهِمُّهُ)، (لَهُو) هەر شتێکە مرۆڤ سەرقاڵ بکات، بێ ئاگای بکات لە شتێك کە بۆ ئەو گرنگە، وە دەگوترێ: (لَهَوْتُ بِكَذَا، وَلَهَوْتُ عَنْ كَذَا) هەردووکی یەك مانای هەیە، واتە: بێ ئاگام کرد، خافڵاندم بەهۆی فلان شتەوە.

(وَلَعِبًا): (أصل اللعِبِ مِنَ اللُّعَابِ وَهُوَ البُزَاقُ السائِلُ)، وشەی (لَعِب) لە بنچینەدا لە (لُعَاب)ەوە هاتوە، واتە: ئەو لیکەی کە لە دەم دایە، (وَلَعِبَ إِذَا كَانَ فِعْلُهُ غَيْرُ قَاصِدٍ بِهِ مَقْصَدًا صَحِيحًا)، (لَعِب) بریتیە لەوەی کردەوەیەك بکات،

مەبەستێكی ڕاستی لە پشتەوە نەبێ، دەگوترێ: بە گاڵتە وا دەكات، جاری وایە كەسێك قسە بە كەسێكی دی دەڵێ، ئەویش تووڕە دەبێ، دەڵێ: كاكە تووڕە مەبە، بە ڕاستم نەبوو، بە گاڵتەم بوو، مەبەستم ئەوە نەبوو كە تۆ لێی تێگەیشتووی، ئەوە پێی دەگوترێ: (لَعِب).

(تَأْوِيلَهُۥ) : (التَأْوِيلُ : الرُجُوعُ إِلى الأَصْل، وِمِنهُ: الْمَوْئِلُ للموضعِ الَّذِي يُرْجَعُ إِلَيْهِ، وَهُوَ رَدُّ الشَّيءِ إِلى الغَايَةِ المرادة مِنهُ، عِلْماً كانَ أَوْ فِعْلاً، فَفِي العِلْم نحو : ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ ...﴿٧﴾﴾آل عمران ، وفي الفعْلِ نحو : ﴿...هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأۡوِيلَهُۥ ...﴿٥٣﴾﴾الأعراف)، واتە : (تَأْويل) بریتیە لە گەڕانەوە بۆ سەر بنەڕەت، ئەو شوێنەی كە شتی بۆلا دەگێڕدرێتەوە، ئنجا دەڵێ: (تَأْويل) بریتیە لەوەی كە تۆ قسەیەك بگێڕیەوە بۆ ئەو مەبەستەی كە تێیدا ڕەچاو كراوە، جا چ لە ڕووی عیلمییەوە، چ لە ڕووی كردەییەوە، لە ڕووی عیلمییەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ ..﴿٧﴾﴾آل عمران ، واتە: ئەو فەرمایشتە تەنیا خواو ڕۆچووان لە زانیاریی دا تێیدەگەن ، وە مەبەستەكەی دەزانن، لە كردەوەش دا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿...هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأۡوِيلَهُۥ ..﴿٥٣﴾﴾ الأعراف ، واتە : ئایا چاوەڕێی چی دەكەن، جگە لەوەی كە قورئان هەواڵی پێداوە بێتەدی بە كردەوە ؟ یان دەگونجێ مەبەست پێی هاتنە دی ئەو شتە بێ، وەك خەونەكەی یوسف علیه السلام، كە گوتی: ﴿هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ ﴿١٠٠﴾﴾یوسف ، واتە: ئەوە سەرەنجامی خەونەكەمە ، كە پێشتر بینیبووم ، بێگومان پەروەردگار خەونەكەمی بە ڕاست گێڕا .

# مانای گشتی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار وەك پێشتر باسمان كرد، لەم دە (١٠) ئایەتەدا، وتووێژو دیالۆگێکی دوورو درێژی ئەهلی بەهەشتو ئەهلی دۆزەخ دەخاتە ڕوو، وە باسی ئەعراف دەکات، وە کەسانێك کە لەسەر (ئەعراف)ن واتە : ئەو شوێنەی کە لە نێوانی بەهەشتو دۆزەخ دایە باسی دەکات ، وە پاشان باسی سەرەنجامی ئەوانە دەکات ، کە لە ڕێ لایاندابوو ، وە ئاییني خوای پەروەردگاریان فەرامۆش کردبوو ، بۆیە لە دواڕۆژدا خوای پەروەردگار ئەوان فەرامۆش دەکات.

سەرەتا خوا دەفەرموێ: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ﴾، وە هاوەڵانی بەهەشت، یان خاوەنانی بەهەشت، بانگی هاوەڵان، یان خاوەنانی ئاگری دۆزەخیان کرد، گوتیان : ئێمە ئەوەی پەروەردگارمان بەڵێنی پێدا بووین، کە بچینە نێو بەهەشت ، هاتە دیو ، ڕاست دەرچوو ، ئەدی ئایا ئێوەش ئەوەی پەروەردگارتان گفتی پێدابوون ، ڕاست دەرچوو ؟ ئەوانیش گوتیان : بەڵێ (ئەوە لە دۆزەخ داینو ڕاست دەرچوو) ، هەڵبەتە بەهەشتییەکان وەك سەرکۆنەو سەرزەنشت ئەوەیان پێ دەڵێن، ئەگەرنا مادام لە دۆزەخدان، دیارە دەزانن کە وەك چۆن موژدەی خوا بۆ بەهەشتییان هاتۆتە دی، هەڕەشەی خواش بۆ دۆزەخییان هاتۆتە دی، وەك چۆن بەڵێنی خوا بۆ ئیمانداران هاتۆتە دی، هەڕەشەی خواش بۆ کافران هاتۆتە دی، بۆیە هیچ چاریان نیە دەڵێن: بەڵێ، ئێمەش ئەوەی کە خوا گفتی پێ دابووینو هەڕەشەی پێ لێکردبووین ، هاتۆتەدی، ﴿فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، ئنجا بانگکەرێك بانگی کرد، لە بەینیاندا، جاڕچییەك جاڕیدا لە نێوانیاندا، کە نەفرینی خوا لە ستەمکاران، {واتە: ئەوانەی کە لە دۆزەخدان}، کە دیارە بەهۆی ستەمی خۆیانەوە چوونەتە دۆزەخ، ئەگەرنا خوا ستەم لە بەندەکانی ناکات، ﴿وَمَا

كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾العنكبـــــوت، واتە: نەدەگونجا خـوا سـتەم بكات، بـەڵام خۆیـان سـتەمیان لە خۆیان كـرد.

ئنجا دوایی باسـی سـتەمەكەیان دەكات، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴾، ئەوانـەی كـە خۆیـان لـە ڕێـی خـوا لادەداو، خەڵكیشـــیان لادەدا، وە دەشـــیان ویســـت كـــە خـــوارو خـــێچو لارو چـــەوت بیخەنـــە بـەرچاوی خەڵكی بیبـێزرێنـنو ، لەبـەرچاویان بخـەن ، ﴿وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴾، وە بۆ دوارِۆژیش بێبـڕوا بوون .

ئنجا دێتە سـەر باسـی ئەعـراڤو دەفەرموێ : ﴿ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ ﴾، نێوانێكـیان لـە نێـواندا هەیـە ، پـەردەیەك هەیـە لە نێوانیاندا ، لە نێوان بـەهەشـتییانو دۆزەخییان دا، یـــان نێـــوانی بـەهەشـــتو دۆزەخ دا، ﴿وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ ﴾، لەســەر سوانەكـــانو بـەرزاییەكـانی ئەو نێوانە، {كە دیـارە دەبـێ زۆر گەورەبـێو، هـەر خـوا بۆخـۆی دەزانـێ نـە ؟!} پیـاوانێك هـەن ، ﴿وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ ﴾، ســەرەتا بـانگی خاوەنـــانو هـــاوەڵانی بـەهەشـــتیان كـــردو گوتیـــان: ســـەلامتان لـــێ بـــێ {ئـاشـــتیی‌و سەلامەتییتان لەسـەر بێ}، ﴿لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ﴾، نەچووبوونە بـەهەشــت ، بـەڵام ئومێدیان وابوو ئومێدەوار بوون، {كـە بچنـە نێـوی} ﴿وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە كـــاتێك ڕوویـــان پـــێ وەرچەرخێنـــرا، بـــەرەو هـــاوەڵانی ئـاگـــری دۆزەخ، گوتیـــان: پەروەردگـــارمان ! ڕەگـــەڵ كۆمـەڵی سـتەمكـارانمان مەخـە، یانـــی: ئەگـەر بـەدەســـت خۆیـــان بووایـــە تەماشـــای دۆزەخیان نەدەكرد، بۆخۆیـان سلاویان لە بـەهەشـتییەكان كـردو پێـی ئومێـدەوار بوون،

بەڵام بۆ دۆزەخییەکان دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا صُرِفَتْ ﴾، یانی: (قُلِبَت) کاتێك کە ڕوویان پێ وەرچەرخێنرا بەرەو هاوەڵانی ئاگری دۆزەخ، ئەو دیمەنەیان بینی، ئەو سزاو ئەشکەنجەیان بینی، لە پەروەردگاریان پاڕانەوە: ڕەگەڵ کۆمەڵی ستەمکارانمان مەخە، ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَٰهُمۡ ﴾، وە هاوەڵانی ئەعراف ئەوانەی لەسەر سوانەکانو بەرزاییەکانی ئەو دیوارو پاردەیەی نێوان بەهەشتو دۆزەخن، بانگی پیاوانێکیان کرد، کە بە نیشانەکانیان دەیانناسینەوە، ﴿ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ ﴾، گوتیان : چ سوودێکتان لەو دەستو پێوەندو شوێنکەوتووەکانتان، بینی ؟ {ئەوانەی کە هەڵتانخەڵەتاند بوونو، بەدوای خۆتان خستبوون} ﴿ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴾، وە ئەو خۆ بە زلگرییەتان لە دنیادا، کە خۆتان پێ لە بەندەکانی خوا زیاد بوو، چ سوودێکی پێگەیاندن ؟

ئنجا ئاماژە دەکەن بۆ بەهەشتییەکانو دەڵێن : ﴿ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ﴾، ئا ئەوانە بوون کە سوێندتان دەخوارد، خوا بەزەیی خۆییان ناگەیەنێتێ ؟ {ئا ئەوانە بوون کە لەبەرچاوی ئێوە هێندە نابووت بوون، دەتانگوت: خوا ڕەحم بەوانە ناکاتو، نایانخاتە بەهەشتو، شایستەی چوونە بەهەشت نین، لەبەرئەوەی کە بە پێوەرو تەرازووە لاتەڵو خوارەکەی ئێوە، ئەوانە چەوساوە بوون، یان بێ ماڵو سامان بوونو، ڕەشو ڕووت بوون، پێتان وابوو ئەگەر لە نیعمەتی دنیا بێبەش بن، خوای پەروەردگار لە دواڕۆژیشدا لە نیعمەتەکانی خۆی بێبەشیان دەکات، هەرچەندە ئەهلی ئیمانیش بن}، نەخێر ! ئێستا پێیان گوترا: ﴿ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴾، بچنە نێو بەهەشت، نە ترستان لەسەرەو نە خەمو پەژارە دەگرن، یانی : بۆ ڕابردوو خەمو پەژارە

دانـاگرن، بۆ داهاتووش هیچ ترسێکتان لەسـەر نیـە، بۆچـی؟ چـونکە ئـەوەی پاکـە، بـێ باکـە، ئـەوەی پەرێـزی پاکـە، بـەرچاوی ڕووناکـە.

﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ﴾، ئنجـا خـاوەنو هـاوەڵانی ئـاگـری دۆزەخ ، بـانگی خاوەنو هاوەڵانی بـەهەشـت دەکـەن : ﴿ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ﴾، پێیان دەڵێن: بـەسـەرماندا بڕێـژن، لـەو ئـاوە کە لەلاتـانە، ئەو ئـاوە سازگارو شـیرینو خۆشـەی خـوا داویەتی بـە ئێوە، وە لەو هـەموو میوەجـاتو خـواردنو خۆراکـە بـە تامـەی خـوا بـە ئێـوەی بـەخشـیوە، بـەسـەرماندا بڕێـژن، بـەهەشـتییـەکان وەڵام دەدەنـەوە : ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، دەڵێـن: بێگومان خـوا لە کـافرانی قەدەغـە کـردوون، ناگونجـێ بۆتـان بنێـرین، ناگونجـێ بۆتان ڕەوانە بکەین .

ئنجـا ئایـا ئـەو بێبـڕوایـانە کێـن ؟ ﴿ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا وَلَعِبٗا وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا ﴾، ئەوانەی کە ئـایینـەکـەی خۆیانیـان کردۆتـە مایـەی گەمـەو یـاریی، وە ژیـانی دنیـاش فریـوی داون، کەواتـە: کەسـانێك کـە لـە دنیـادا ئـاوا مامەڵەیـان لەگـەڵ ئـایینی خـوادا کـردبـێ، شـایستـەی چوونـە دۆزەخـن، هەڵبـەتـە مـەرج نیــە مەبـەسـت لـە (دِينَهُمۡ ) تـەنیا ئـاییـنی خــوابێ، ئـەو ئـاییـنـەی کـە خـوا بـۆی نـاردوون، چونکـە وشـەی (دیـن) یـانی: بـەرنامـەی ژیـان، کەواتـە: ئەوانـە بـەرنامـەی ژیانیان بریتـی بووە لە گەمـەو گـاڵـتەو یـارییو خافـڵان، جیـددیـی بـوون لـە ژیانیـانـدا نـەبووە، وە ژیـانی دنیـاش فریـوی داونو، خـوایان لەبیـر نـەبووە، خـواش دەفـەرموێ:

﴿ فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا ﴾، ئەمڕۆش ئێمـە لە بیـریان دەکـەین، وەك چۆن ئەوان دیداری ئەمڕۆیـان لەبیـر کردبـوو، لەبیـریان دەکـەین، واتـە: بـە شـێوەیەك مامەڵەیان لەگـەڵدا دەکەین، وەك لەبیـرمان چووبن، ئەگەرنا خـوای زانـاو شـارەزا کەسی لەیاد ناچێ، یانی وا مامەڵـەیـان لەگـەڵدا دەکەین، وەك ئەوەی هەر نـەبن ،

پشت گوێیان دەخەین، ﴿وَمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴾، وە بەهۆی ئەوەشەوە کە نکوولّییان لە ئایەتەکانی ئێمە کرد، وشەی: (جحد) بریتیە لەوە کە ئینسان شتێك بزانێ‌و دانی پێدا نەنێ، واتە: نکوولّیی لێکردن، وەك خوای تاك‌و پاك دەربارەی فیرعەون‌و دارو دەستەکەی لە بەرانبەر مووسا ﷺ بەرنامەو موعجیزەکانی دا دەفەرموێ: ﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ...﴿١٤﴾﴾ النمل، واتە: دانیان پێدانەهێناو لە دەروونیشدا یەقینیان هەبوو کە ڕاستە، چونکە چاویان لە ستەم‌و لە خۆ بە زلگرتن بوو.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْنَـٰهُم بِكِتَـٰبٍ فَصَّلْنَـٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾، وە بێگومان ئێمە کتێبێکمان بۆ هێناون {کە قورئانە}، بە زانیاریی خۆمان ڕوونمان کردۆتەوە، {مەبەستەکانمان تێدا ڕوونکردوونەوە} و ڕێنمایی‌و بەزەییە بۆ کۆمەڵێك کە بڕوا بێنن، لە دنیادا ڕێنماییان دەکات، لە دواڕۆژیشدا بۆیان دەبێتە مایەی ڕەحمەت‌و بەزەیی خوای بە بەزەیی .

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ﴾، ئایا چاوەڕێی چی دەکەن ، جگە لەوەی سەرەنجامەکەی بێتە دی ؟ واتە : سەرەنجامی ئەوە کە هەواڵی پێداوە ، کە ئەهلی ئیمان دەچنە بەهەشت‌و ، ئەهلی کوفر دەچنە دۆزەخ ، ﴿يَوْمَ يَأْتِى تَأْوِيلُهُۥ ﴾، ئەو ڕۆژە کە سەرەنجامەکەی دێتە دی‌و ڕوون دەبێتەوە، ئەو شتانەی کە هەواڵی پێداون، هەموویان دێنە دی بە کردەوە، یان ڕوون دەبنەوە، چونکە دەگونجێ مەبەست لە (تأويل)، ڕوونکردنەوە (بيان) بێ.

ئنجا ئایا ئەوانەی کاتی خۆی ئەو شتانەیان لەبیرخۆیان بردبۆوەو پشت گوێیان خستبوون ، چی دەڵێن ؟ ﴿يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ ﴾، ئەوانەی پێشتر {قورئانیان} لەبیرخۆیان بردبۆوە، دەڵێن : ﴿قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ﴾، بێگومان

ڕەوانەکراوانی پەروەردگارمان بە هەق هاتبوون، ئێستا بۆمان دەرکەوت کە ئێمە بەهەڵەدا چووبووین، ئەوان هەقیان هێنابوو، ئەوەی فەرموویان هەمووی ڕاست دەرچوو، کە دەیانگوت: دنیا شاری بێ خاوەن نیە، وەك یەکێك لە کافرە ملهوڕەکان لەبارەی ژیانی دنیاوە گوتبووی: (أَرْحَامٌ تَدْفَعُ وَقُبُورٌ تَبْلَعُ) مندالّدانەکان دەردەاوێن و، گۆڕەکانیش قووت دەدەن و کۆتایی پێ دێ ! بەلاّم ژیان هەر ئەوە نەبوو، بەڵکو مرۆڤ شتێکی زۆر گرنگ بوو، بۆ تاقیکردنەوە دروستکرا بوو، جێنشینی خوا بوو، هەڵگری سپاردەی خوا بوو، ئاوەدانکردنەوەی سەر زەوی پێ سپێردرا بوو، ژیانی دنیا قۆناغی کۆتایی نەبوو، بەڵکو قۆناغێك بوو لە قۆناغەکانی ژیانی بەشەر، واتە: بەتەواویی پەشیمان دەبنەوە لە ڕۆژی دوایی دا، بۆیە دەڵێن: ﴿فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُواْ لَنَآ﴾، ئنجا ئایا تکاکار هەن تکامان بۆ بکەن، ﴿أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ﴾، یان ئەگەر تکاکاریش نەبن تکامان بۆ بکەن، بگێڕدرێینەوە کردەوان بکەین ، جیا لەو کردەوانەی کە دەمانکردن ، ئەگەر لە ڕابردوو لە دنیادا ، کردەوەی خراپمان کردوە ، ستەم و گەندەڵییمان کردوە ، لەمەودوا پێچەوانەی ئەوانە ئەنجام دەدەین، دادگەر دەبین، چاکە دەکەین، دیندار دەبین، بەخشەرو بە بەزەیی دەبین لەگەڵ خەڵك، بە ئینصاف دەبین..، ئنجا ئایا یەکێك لەو دووانەمان بۆ دەکرێ؟ خوای پەروەردگار وەلاّمیان دەداتەوە، دەفەرمویْ: ﴿قَدْ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ﴾، بێگومان خۆیانیان دۆڕاندو لەدەست دا، وە ئەوەی کە هەڵیان دەبەست، لێیان ونبوو.

دیارە ئەو شتەی کە هەڵیان دەبەست، بریتی بوو لە هاوبەش دانان بۆ خوا (الشرك بالله) ، چونکە هیچ بنچینەو بناغەیەکی نەبوو ، هەمووی ئەفسانەی بێ بنەما بوو ، ئێستا دەسخەڕۆ بوون و کەوتوونە گۆڕێ .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٤ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ﴾، خاوەنی کتێبی (مختار الصحاح) دەڵێ: (الحَقُّ ضِدُّ البَاطِل، وَحَقَّ الشَّيءَ يَحِقّ حَقّاً أي وَجَبَ، وتَحقَقَّ عِنْدَهُ الخَبَرُ : صَحّ)، واتە: وشەی (حَقّ) پێچەوانەی (بَاطِل)ە، (حَقّ) واتە: ڕاست، (بَاطِل) واتە: پووچو ناڕاست، دەگوترێ: (حَقَّ الشَّيءَ يَحِقّ حَقّاً) واتە: ئەو شتە پێویست بوو، (تَحَقَقَّ عِنْدَهُ الخَبَرُ) واتە: هەواڵەکە ڕاست دەرچوو، ئنجا خاوەنی کتێبی (المصباح المنير)[1] دەڵێ : (حَقَّ الشَّيءُ: وَجَبَ وَثَبَتَ) واتە: پێویست بوو، چەسپا، وە دەگوترێ: (حَقَّقْتُ الأَمْرَ أَحُقُّه : تَيَقَّنْتُهُ أو جَعَلْتُهُ ثَابِتَاً لاَزِمَاً) واتە: لێی دڵنیا بووم، یاخود چەسپاندم .

کە دەفەرموێ : ﴿فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ، زۆربەتی زانایان گوتوویانە ئەو جاڕچییە فریشتەیەکە لە فریشتان : (مَلَكٌ مِنْ المَلاَئِكَة) ، لەوبارەوەش چەند ڕایەك هەن ، هەندێ دەڵێن: ئیسرافیلە، هەندێ دەڵێن: هەر فریشتەیەکە لە فریشتەکان، وە شیعەکان دەڵێن: عەلی کوڕی ئەبو طالیبە ! خوا لێی ڕازی بێ، گرنگ ئەوەیە خوای کاربەجێ فریشتەیەك لە فریشتەکانی، یان یەکێك لە دروستکراوانی خۆی، تەرخان کردوە، بۆئەوەی وەك جاڕچییەك بانگ بدات، لە نێوان بەهەشتییان و دۆزەخییان دا، جاڕدانەکەی چییە ؟ دەڵێ : ﴿أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٤ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ

---

١) ص (٧٨).

﴿ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْأَخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴾، نەفرینی خـوا لـەو ستەمکـارانە بـێ، کە خەڵـکیان لـە ڕێـی خـوا لادەدا، خۆشـیان لادەر بـوون، وە دەیانویسـت ڕێـی خـواش خـوارو خێچ پێشان بدەن، وە بـەرانبـەر بـە دواڕۆژیش بێبـڕوا بـوون.

کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْأَخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴾، خاوەنـی تەفسیـری (التحرير والتنوير)[1] دەڵێ : (أَيْ يَرُومُونَ وَيُحَاوِلُونَ إِظْهَارَ هَـذِهِ السَّبِيلِ عَوْجَاء ، أَي يَخْتَلِقُونَ لَهَا نَقَائِص يُمَوِّهُونَهَا عَلَى النَّاسِ تَنْفِيراً عَنِ الإِسْلَامِ) ، واتـە : هەوڵـدەدەن بۆئەوەی وای پێشان بدەن ، کـە ئەو ڕێبـازە خـوارو خێـچەو کەموکوڕیی بـۆ هەڵدەبەسـتن ، تاکـو خەڵـك لـێی ڕابکـاتو لـێ دوور بکەوێتـەوە ، {بـۆ وێنـە دەڵێن : ئیسـلام بـە کەڵکی ئێستا نایـەت ، کـاتی بـەسەر چووە}، تا فـێڵ لـە خەڵـك بکـەن.

ئنجـا ئـەوەی جێی سـەرنجـە، ئەوەیـە کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ئـەو نەفرینـە هـەموو ستەمکـاران دەگرێتـەوە، چ ئەوانـەی لـە ڕێ لادراون، چ ئەوانـەی کـە خەڵـکیان لـە ڕێ لاداوە، وە ئەوانـەی کـە ئـایینـی خـوایان خـوارو خـێچ خسـتۆتە بەرچـاوی خەڵـك، وە ئەوانـەی کـە کەوتوونەتـە ژێـر کاریگەریی ئەو پڕوپاگەندانەو، ئـایینـی خـوایان بـە خـوارو خێچی ناسیوە، بـەهـۆی پڕوپاگەندەی ژەهراویـی کەسـانێکەوە کـە ئـەوە عادەتیـان بـووە، وشـەی ستەمکـاران (ٱلظَّٰلِمِينَ ) هـەموو ئەوانـە دەگرێتـەوە .

**مەسـەلەی دووەم** : کـە دەفـەرموێ : ﴿ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَٰهُمْ وَنَادَوْا۟ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ ﴾، چـوار هەڵوەستە لەبـەردەم ئەم ئـایەتەدا دەکـەین :

---

١) ج ٨، ص (١٣٩ و ١٤٠).

**هەڵوەستەی یەکەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ ﴾، ئەوە خوا لە سوورەتی (الأعراف)دا ئاوا باس دەکات، بەڵام لە سوورەتی (الحدید)دا فەرموویەتی : ﴿ ... فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾ ﴾ الحديد ، دەفەرموێ: لە نێوانیاندا (واتە: لە نێوان بەهەشتییان‌و دۆزەخییاندا) شووره‌یەك دانراوە، دەرگایەکی هەیە، دیوی نێوەوەی (واتە: دیوی بەهەشتییان) بەزەییە، وە دیوی دەرەوەی (واتە: دیوی دۆزەخییان) سزاو ئازارە.

بەڵام ئەوەی (الحدید) لە سیاقێك دا هاتوە کە باسی بڕواداران‌و مونافیقان دەکات‌و، مەرج نیە مەبەست پێی هەمان مەبەستی ئەو ئایەتانەی سوورەتی (الأعراف) بێ .

**هەڵوەستەی دووەم** : ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّۢا بِسِيمَىٰهُمْ ﴾ ، دیارە (ال) سەر (الأعراف) یان ئەلیف‌و لامی عەهدە، واتە: (ما عهِدَهُ الناسُ فِي الأسوار)، (الأسوار) یانی : سوانەو قەراغی دیوار کە خەڵك عادەتیانە لەسەری دادەنیشن، یاخود ئەو (أل)ە، لە جیاتی پاڵ بۆلادراو (عِوَض عَنِ المضاف إِلَيْهِ)ە، (أي على أعراف السُّور) لەسەر بەرزاییەکانی ئەو شووره‌و دیوارە، پیاوانێك هەن، کەواتە: (الأعراف) دەبێتە قەراغەکان، یان سەرەوەی ئەو دیوارو شووره‌یە، وە (أعراف) کۆی (عُرف)ە، (عُرف)یش بریتیە لە چڵەپۆپەی هەر شتێك، بۆ نموونە : بە پۆپیتەی کەڵەشێر دەگوترێ: (عرف الدّيك)، هەروەها بەو مووانەی سەر پشتە ملی ئەسپ‌و ولاخە بەرزە دەگوترێ: (عرف الفرس، عرف الخيل)، چونکە لە پشتە ملیەتی‌و لە ملی بەرزترە.

**<u>هەڵوەستەی سێیەم</u>** : ئنجا لەسەر ئەو بەرزاییانەی ئەو شوورەو دیوارانەی نێوان بەهەشتو دۆزەخ، پیاوانێك هەن، ئایا ئەو پیاوانە كێن ؟ زانایان لەوبارەوە یەكدەنگ نینو ڕا جیاییان هەیە :

١ - هەندێك دەڵێن : پێغەمبەرانن .

٢ - هەندێك دەڵێن : فریشتەكانن .

٣ - هەندێك دەڵێن : شەهیدانن .

٤ - شیعە دەڵێن : دوازدە ئیمامەكانی ئێمەن !!

٥ - هەندێك دەڵێن : ئەو شەهیدانەن كە لە ڕێی خوا كوژراون ، بەلآم بێ مۆڵەتی دایكو بابیان چوونە بۆ جیهاد.

٦ - هەندێك دەڵێن: ئەو كەسانەن كە چاكەو خراپەیان وەك یەكەو یەكسانە.

دیارە من ئەم بۆچوونەی شەشەمم لە هەمووان زیاتر دەچێتە دڵەوە، چونكە ئەوانەی دیكە هیچ بەڵگەیەكیان لەسەر نیە، وە ئەو كەسانەش كە لە نێوان بەهەشتو دۆزەخدان، دیارە كردەوەی چاكو خراپیان وەك یەكەو یەكسانە، نە كردەوەی چاكیان زیاترە، پێی بچنە بەهەشت، نە كردەوەی خراپیان زیاترە، پێی بچنە دۆزەخ، هەردوو تا تەرازووی چاكەو خراپەیان وەك یەكە، بۆیە خوای دادگەر لە نێوان بەهەشتو دۆزەخ دا ڕایگرتوون، بەلآم وەك دوایی باسی دەكەین ، بێگومان ئەوانە سەرەنجام دەچنە بەهەشت.

لەوبارەوە (الطبري) پێشەوای توێژەرەوان دەڵێ: (وَالصَّوَابُ مِنَ القَوْلِ فِي أَصْحَابِ الأَعْرَافِ أَنْ يُقَالَ كَمَا قَالَ الله جَلَّ ثَنَاؤُهُ فِيهِم: هُمْ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلاً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ وَأَهْلِ النَّارِ بِسِيمَاهُمْ، وَلا خَبَرَ عَنْ رَسُولِ الله ﷺ يَصِحُّ سَنَدُهُ، وَلاَ أَنَّهُ مُتَّفَق عَلَى تَأْوِيلِهَا، وَلاَ إِجْمَاعَ مِنَ الأُمَّةِ عَلَى أَنَّهُمْ مَلاَئِكَة، فَإِذْ كَانَ ذَلِكَ كَذَلِكَ، وَكَانَ ذَلِكَ لاَ يُدْرَكُ قِيَاسا، وَكَانَ المُتَعَارَفُ بَيْنَ أَهْلِ لِسَانِ العَرَبِ أَنَّ "الرِّجَال" اسْمُ يَجْمَعُ ذُكُورَ بَنِي آدَم دُونَ إِنَاثِهِم وَدُونَ

سـائِرِ الخَلْـقِ غَيْـرِهِم)[1]، واتــە: قســەی ڕاســت دەربــارەی هـاوەڵانی ئەعــڕاف ئەوەیــە كـە بگوتــرێ : وەك خــوای بــەرزو مــەزن لـە بارەیانــەوە فەرموویــەتی: ئەوانـە پیاوانێكـن هـەر كـام لـە ئەهلـی بـەهەشـتو ئەهلـی دۆزەخ بـە نیشانەی خۆیان دەناسـنەوە، وە هیچ هـەواڵێكی وا لە پێغـەمبـەری خـواوە ﷺ بـە ئێمـە نەگەیشــتوە، كـە سـەنەدەكەی ڕاســت بـێ، (بفـەرموێ: فـلان كەسـن) هـەروەها زانایــانی تەفسیــر لەســـەر ماناكــەی ڕێكنەكــەوتوون، وە زانایــانی ئۆممــەت یەكدەنگییشیان لەسـەر ئەوە نیە كە فریشـتەن، ئنجا مادام وابێ كـە ئـەوەش بـە قیــاس نازانــرێ، وە لـە نێــو شــارەزایانی زمــانی عـەڕەبی دا ئـەوەی كـە بـاوە ، ئەوەیـە كە وشـەی (رجـال) ناوێكـە بۆ كۆمەڵـێك لـە نێرینەكـانی وەچـەی ئـادەم، جیـا لـە مێینـەكـان، وە جیـا لـە خەڵـكی دیكــەش، كەواتـە: ئەوانـە كۆمەڵــە پیــاوێكن وەك خـوا فەرموویـەتـی.

ئنجا یەكێك بۆی هەیـە بڵـێ : بۆچی خـوا بـە تەنیـا باســی پیاوانی كـردوەو، باســی ئـافرەتــانی نەكــردوە ؟ ئــایا هــەر پیــاوان دەگونجــێ كـردەوەی چــاكو خراپیـان وەك یـەك بنو یەكسـان بن ، تاكـو لـەوێ ڕابگیـرێن ؟

زانایان دەڵێن : لەبـەرئەوەی پیاوان ناكـۆكیـیو مشـتومڕیـان لە نێوانـدا هەیــە، وە ئــافرەتانیش بــە زۆریـی شــوێنكەوتووی پیــاوانن، ئەگـەرنا مـەرج نیـە تـەنیا پیاوان لەوێ بن، بـەڵام زیـاتر پیاوەكـان قسـە دەكـەن، دیـارە سروشـتی كۆمـەڵگـا بـەشـەرییـەكــانیش هـەر وایــە، لــەو حاڵەتانــەدا زیــاتر پیــاوان قســان دەكــەن، ئـافرەتان زیاتـر لە پەنای پیاوان دانو شوێنكەوتووی پیاوانن ، ئەمە بە پێـی ئـەو واتـایـەی كە ئەگـەر ئەوانە كەسانێكن چـاكەو خراپـەیـان وەك یـەكو یەكسـانە، كـە هـەڵبـەتە ئەمـەش دەقـی لەسـەر نیــە.

وە دەشگونجــێ ئەوانــە كــۆمەڵە پیاوێـك بـن خــوای پەروەردگــار لـەو شــوێنە دایـنـابن، ڕەنگـە خەڵـكی زۆر باشـیش بـن، خــوای كـاربەجێ ئـەو پلـەو پایـەیان پێبــدات، كـە چـاویان لـە بـەهەشـتییـانو دۆزەخییـان بـێ، كـە ئـەوەش پێگـەو پایەیەكی بــەرزە، كە هـەم دۆزەخییــان بدوێـنو سـەرزەنشـتیان بكـەن، وە هـەم بـەهەشـتییـان بدوێـنو سـەلامیان لـێبكـەن .

---

١) جامع البيان : ج ٨ ، ص٢٠٢.

ئنجا لەوبارەوە (إبن كثير) دەڵێ: ﴿عَنْ أَبِي زُرْعَة عَنْ عَمْرو بن جَرِير، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ أَصْحَابِ الأَعْرَافِ ، قَالَ: هُمْ آخِرُ مَنْ يُفْصَلُ بَيْنَهُمْ مِنَ العِبَادِ، فَإِذَا فَرَغَ رَبُّ العَالَمِين مِنْ فَصْلِهِ بَيْنَ العِبَادِ، قَالَ: أَنْتُمْ قَوْمٌ أَخْرَجَتْكُمْ حَسَنَاتِكُمْ مِنَ النَّار، وَلَمْ تُدْخِلكُمُ الجَنَّة، فَأَنْتُمْ عُتَقَائِي، فَارْعَوا مِنَ الجَنَّةِ حَيْثُ شِئْتُمْ)[1]، واتە: ئەبی زورعە لە عەمرِی کوڕی جەریرەوە {کە لە زانایانی (تابیعین)ە} هێناویەتی کە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کراوە، دەربارەی هاوەڵانی ئەعراف، فەرموویەتی: ئەوانە دوایەمین کەسانێکن کە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ لە بەندەکان، کاتێك پەروەردگاری جیهانییان لە لێپرسینەوە کردن لەگەڵ بەندەکانی تەواو دەبێ، (بە هاوەڵانی ئەعراف) دەفەرموێ : ئێوە کۆمەڵێکن چاکەکانتان لە ئاگر دەری کردوون، بەلام نەشیخستوونە بەهەشتەوە، بۆیە ئێوە ئازادکراوانی منن‌و بچنە بەهەشت، نتان دەوێ بگوزەرێنن‌و ڕابوێرن .

(الشوكاني) لە (فتح القدير)دا[2] دەڵێ: (أَصْحَاب الأَعْرَافِ قَوْمٌ استوت حسناتهم وسيئاتهم) واتە: هاوەڵانی ئەعراف کۆمەڵێکن چاکەو خراپەیان وەك یەکە، (وەك پێشتر گوتمان)، وە ئەم ڕایە هەم حوزەیفەو هەم ئیبنو عەبباس‌و هەم ئیبنو مەسعوودو جگە لەوانیش لە زانایانی پێشین‌و پاشین، دەقیان لەسەر کردوە کە مەبەست لە هاوەڵانی ئەعراف ، کۆمەڵێکن چاکەو خراپەیان یەکسانن.

**هەڵوەستەی چوارەم** : ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَنَادَوْاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ﴾، ئەوە کە سەلام دەکەن لە بەهەشتییان، وە ئومێدیشیان هەیە بە چوونە بەهەشتیان، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم بۆچوونە بەهێزەو، ئەوانە کەسانێکن کە خراپەیان لەگەڵ چاکەیان دا یەکسانە، چونکە نەچوونە بەهەشت، بەلام ئومێدیان هەیە، ئنجا کە ئومێدیان هەیە، دیارە هێندەیان خراپە نیە، کە پێی بچنە دۆزەخ، بەلام هێندەشیان چاکە

[1] ) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، ص ٤٧٨ ، وَقَالَ: هَذَا مُرْسَلٌ حَسَنٌ .
[2] ) ج ٢، ص ١٥٧.

نەبووە، کە یەکسەر پێی بچنە بەهەشت، بۆیە ماوەیەك ڕادەگیرێن، دوایی خوای بە بەزەیی، بە بەزەیی بێسنووری خۆی دەیانخاتە بەهەشتەوە.

**مەسەلەی سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَٰرُهُمْ تِلْقَآءَ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُوا۟ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، کاتێك ڕوویانو چاویان پێ وەردەگێڕدرێ بەرەو لای هاوەڵانی ئاگری دۆزەخ دەڵێن: پەروەردگارمان ! ڕەگەڵ کۆمەڵی ستەمکارانمان مەخە.

خاوەنی تەفسیری (التحرير والتنوير)[1] دەڵێ: (الصَّرْفُ: أَمْر الحَالّ بمغادرة المكان، وَالصَّرْف هُنَا مجاز فِي الإلتفات أو استعارةٌ، وإسناده إلى المجهول هنا جار على المتعارف فِي أمثاله من الأفعال التي لا يُتطلّب لها فَاعِل، وَقَدْ تَكُونُ لِهَذَا الإِسْنَاد هُنا فَائِدَة زَائِدة ، وَهِيَ الإِشَارَة إلى أَنَّهُم لا ينظرون إلى أَهْل النَّار إلاَّ نَظراً شَبِيهاً بفعل من يحمله على الفعل حَامِلٌ)، واتە: (صرف) بریتیە لەوە کە تۆ فەرمان بە کەسێك بکەی لە شوێنێك لا بچێ، کە لێی نیشتەجێیە، وە لێرەدا وشەی (صرف) بەکارهێنراوە بۆ ئاوڕدانەوە، یاخود خوازراوەتەوە بۆ ئەوە، وە دەشگونجێ ئاماژە بێ بۆ ئەوە ، کە ئەوانە تەماشای خەڵکی دۆزەخ ناکەن، مەگەر بە تەماشا کردنێك وەك کەسێك کەسێکی دی ناچار بکات تەماشای شتێك بکات، واتە: بە ناچاریی ، ئەگەرنا بە ئارەزووی خۆیان تەماشا ناکەن .

ئنجا دەربارەی وشەی (تلقاء)یش ، دەڵێ : (وتلقاءُ مكان وجود الشيء ، وهو مصدر بمعنى لقاء) ، (تلقاء) بە مانای شوێنی بوونی شتێکە، ئەویش چاوگەو ، بە مانای دیدار دێ ، وە هەروەها بە مانای (جهة) دێ، وە بە مانای (جاە)یش دێ، {ولم يأت مصدرٌ على (إفعال) غيرُ مصدرين تلقاء وتبيان، وماعدا هذين بالفتح}، وشەی (تلقاء) لەسەر کێشی (تِفعال) بە چاوگ نەهاتوە، جگە لە دوو وشە : (تلقاء و تبيان) بەڵام وشەکانی دیکە هەموویان بە (فتح) هاتوون، نەك بە (کسر)، وەك: (تَجْوَال ...) هتد.

١) ج ٨ ، ص ١٦٥.

**مەسەلەی چوارەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾، لێرەدا كە دەفەرموێ: هاوەڵانی ئەعراف پیاوانێكیان بانگكردن كە بە نیشانەیان دەیانناسینەوە، گوتیان: ئەو سەروەتو سامانە كۆكراوەتان لەگەڵ ئەو خۆ بە زلگرییەتان كە هەتانبوو، چ سوودێكی پێگەیاندن، واتە: سەروەتو سوڵتەكەتان چ سوودێكی پێگەیاندن ، كە پێی لە خۆبایی بووبوونو، پێی یاخی بووبوون ؟ ئەوەتا سەرەنجام هاتن بۆ دۆزەخ، دیارە لێرەدا مەبەست سەرزەنشت كردنیانە، وە بە درۆ خستنەوەیانە كە پێیان وابوو، سەروەتو سامانو دەستەڵات لە فریایان دێ، وە دەیانگوت: ئەگەر بەهەشت هەبێ هەر بۆ ئێمەیە، چونكە ئەوەتا لە دنیادا هەر ئێمە دەستڕۆیشتووین، ئەو ڕەشو ڕووتانە هیچ نین، لەوێش هەر هیچ نابن ! ئەوە دیارە هاوەڵانی ئەعراف دەیانەوێ بە درۆیان بخەنەوەو، بۆیان دەربخەن كە كاتی خۆی درۆتان دەكرد، خۆتان فریو دەدا ، خەڵكیشتان هەڵخەڵەتاندبوو، هەڵبەتە ئەمە هەمووی ترساندنی كافرە خۆ بە زلگرەكانە، كە بە چاوی كەم تەماشای چەوساوەو كەم دەستەڵاتەكان دەكەن ، لە مسوڵمانانو نامسوڵمانان ، یانی : كە خۆتان بە زل دەگرن ، سەرەنجام ئاواتان بەسەر دێ .

ئنجا كە دەفەرموێ : ﴿ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ﴾ ، ئا ئەوانە بوون كە سوێندتان دەخوارد : خوا بەزەیی یان ناگەیەنێتێ ؟، دەڵێ : (أَصْلُ النَّيْلِ: إصابةُ الإنْسان شَيْئاً لِنَفْسِهِ بِيَدِهِ)، (نَيْل) ئەوەیە كە ئینسان دەست بگەیەنێتە شتێك، (نوَّلَهُ : أعطاه ، فنال ، فالأصل أن تقول : نَالَ فُلاَنٌ كَسْبَاً) ، واتە : كەسێك شتێكی بە كەسێك بدات ، (فَنَالَ) یانی : وەریگرت ، لە بنچینەدا ئەوەیە كە تۆ بڵێی : (نَالَ فُلاَنٌ كَسْبَاً) واتە : فلان كەس شتەكەی وەرگرت .

كەواتە: لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ ﴾، یانی ئەی ئەو ئیماندارانەی كە لە دنیادا ڕەشو ڕووتو بێ دەستەڵات بوونو خۆبە زلگرەكان

پێیان وابوو، بەزەیی خوا ناتانگرێتەوە، لەبەرئەوەی ئەوان بە پێوەری دنیا حاڵی ئێوەیان هەڵدەسەنگاند ! ئێستاش بچنە نێو بەهەشتەوە .

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُواْ عَلَيْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾:

کە دەڵێن: ﴿ أَنْ أَفِيضُواْ عَلَيْنَا ﴾، خاوەنی تەفسیری (التحرير التنوير)[١] دەڵێ : (فِعْلُ الفَيْضِ حَقِيقَتُه سَيَلَانُ الْمَاءِ وَانصبابه بقوَّةٍ وَيُستعْمَلُ مَجَازًا فِي الكثرَة، إِذْ لَيْسَ مَعْنَى الصبِّ بمناسب بَل المقْصُود الإِرْسال وَالتّفضل) واتە : لە بنچینەدا وشەی (فیض) ئەوەیە کە ئاوێك بە لووزەو هەڵبڕژێ، بەڵام ئەم وشەیە وەك مەجازیش بەکاردێ بۆ زۆریی، {کە دەگوترێ: (أُفيض عَلَيْهِ) واتە : زۆری دەدەمێ}، وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ، واتە : بۆمان بنێرن ، یاخود لە چاکەی خۆتان پێمان ببەخشن ، چونکە لێرەدا : هەڵڕشتنو ڕژاندن گونجاو نیە .

ئنجا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەهلی بەهەشت ئەگەر ببەخشن زۆر دەبەخشن، چونکە سەخیی و دڵ فراوانن .

بۆیەش پێیان دەڵێن : لەو ئاوەی خوا پێیداون پێمان ببەخشن ، چونکە ئەوان لە هەموو شتێك زیاتر پێویستییان بە ئاو هەیە، هەموو هەناویان وشکەو قرچاوە بە ئاگری دۆزەخ، وە لەو ڕزقو ڕۆزییەی خوا پێی داون لەو میوەجاتو خواردنو خۆراکە جۆراوجۆرەی کە خوا پێی داون، پێمان بدەن ! بەڵام ئەوان چۆن وەڵامیان دەدانەوە؟ دەڵێن: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، خوا قەدەغەی کردوە لە کافران، واتە: ئێمە ناتاندەینێ، چونکە ئێوە بێبڕوا بوون، نەك لەبەرئەوەی ئەوان ڕەزیل بن، بەڵکو لەبەرئەوەی بە پێی یاساو

---

١) ج ٨ ، ص ١٤٨.

سوننەتی خوا ، ئێوە شایستەی نین، وە ئێمەش لێرەدا بەندەی خواین و میوانی خواین ، وە لەو شوێنەین کە خوای پەروەردگار لێی داناوین و ، شتێك ناکەین کە خوای بەخشندەمان پێی ناخۆش بێ ، دیارە لەو کاتەدا بەهەشتییەکان دڵو دەروونیان وای لێدێ ، نەك وەك ژیانی دنیا، چونکە لە دنیادا جاری وایە مرۆڤ شتێك دەکات، کە خوا پێی خۆش نیە، بەڵام دیارە بەهەشتییەکان هیچ شتێك ناکەن کە خوای پەروەردگار پێی خۆش نەبێ و لێی ڕازی نەبێ، ئەگەرنا نازو نیعمەتەکانی بەهەشت زۆر زۆرن، بەشی خۆیان و غەیری خۆشیان دەکەن و زیادیشن، بەڵام بە پێی یاسای خوای کارزان لەوان قەدەغەن .

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَـٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴾، وشەی : (لَهو) بەمانای خافڵان دێ، وشەی : (لَعِب) بە مانای یاریی دێ، ئێمە لە سوورەتی (الأنعام)دا لە بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرەدا بە تەفصیلْ باسی هەردووك وشەی : (لَهو)و(لَعِب)مان کردووە ، لێرە بە پێویستی نازانم دووبارەی بکەینەوە .

ئنجا کە خوا دەفەرموێ : ﴿ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا﴾، دوو مانای هەن :

١/ واتە: ئەو ئایینەی کە خوا بۆی ناردوون وایان لێکردوە : کردوویانە بە مایەی گاڵتەجارو خافڵان ، بە داخەوە ئێستا زۆر لە مسوڵمانان دەبینی ، زۆر بۆنان ساز دەکەن بەناوی ئایینەوە ، کە لە ڕاستییدا خۆخافڵاندنە ، کەچی زۆر شتی گرنگ و بنەڕەتیی هەیە ، فەرامۆشیان کردوە ، خۆیان بە زۆر شتەوە سەرقاڵ دەکەن ، کە ڕەنگە هەر بۆخۆیان دایانهێنابێ و هیچ بنچینەیەکی لە ئاییندا نەبێ ، یاخود ئەگەر ئایینیش ڕێگای پێدابێ ، بەڵام زۆر زێدەڕۆیی تێدا دەکەن .

٢/ واتایەكی دیكەی ئەوەیە كە ئەوانە هەر ئەسڵی ئایینەكەیان ، واتە: بەرنامەی ژیانیان بریتیە لە گەمەو یاریی‌و خافڵاندن‌و كات بەسەر بردن، كە وەك زۆر جار ئەهلی دنیا بە یەكدی دەڵێن: وەرە با كات بكوژین ! لە چایخانەیەك دا دادەنیشن، دامەو دۆمینە دەكەن، یان لە یانەو هۆڵ دا قومار دەكەن، بە بیانووی ئەوەی كاتیان لێ ناڕوات ! ئەوانەی كە ژیانیان ئاوا بەو شێوەیە بەڕێ دەكەن، ئەوە بەرنامەو ئایینەكەیان بووە، بە یاریی و خافڵان، چونكە وشەی (دین) لە بەكارهێنانی قورئاندا ـ وەك زۆرجار گوتوومانە ـ واتە : بەرنامەی ژیان‌و، ڕێبازێك كە ئینسان بە پێی ئەوە ژیانی دەگوزەرێنی ، ئنجا ئەو بەرنامەیە : چ خوایی بێ ، چ مرۆڤكرد ، وە كە خواییشە : چ گۆڕاو بێ‌و دەستكاریێ كرابێ ، چ بە ساغو سەلامەتیی مابێ ، كە بەس ئیسلامە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەرسی شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە پێنج (٥) ئایەتان پێکدێ ، ئایەتەکانی (٥٤ تا ٥٨) .

لەم پێنج ئایەتەدا سەرەتا خوای بەرز مەزن لە میانی خستنەڕووی چەند دیمەنێکی دروستکراوەکانی دا ، خۆی پێناسە دەکاتو، ڕایدەگەیەنێ کە بەس ئەو توانای بەدیهێنانو فەرمانی ڕەهای هەیە.

پاشان فەرمان بە بەشەر دەکات ، کە بە کڕووزانەوەو ترسانەوە لێی بپاڕێنەوەو ، سنوور شکێنیی نەکەن ، وە خراپەکاریی لە زەویدا نەکەنو ، بە ترسو هیواوە لە خوا لێی بپاڕێنەوەو ، جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە بەزەیی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە .

ئنجا باسی ڕووپەڕێکی دیکەی کتێبی دروستکراوەکانی دەکات ، کە مەسەلەی باران بارینو ڕووەك ڕواندنو میوەجات بەرهەم هێنانە ، ئا ئەوە دەکاتە بەڵگەی زیندووکرانەوەی مردووان لە قیامەتدا.

وە سەرەنجام بەراوردێك لە نێوان زەوی بە پیتو هی بێ پیتو پێزدا دەکات، کە یەکەمیان بە مۆڵەتی پەروەردگاری ڕووەكو شیناوردی باش بەرهەم دێنێو، ئەوی دیکەش تەنیا شتی بێ خێر، یان شتێکی زۆر کەم دەردێنێ .

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ
عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ
بِأَمۡرِهِۦٓۗ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا
وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا
وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًاۚ إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي
يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابٗا ثِقَالٗا سُقۡنَٰهُ
لِبَلَدٖ مَّيِّتٖ فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ
لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ
لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗاۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ .

## مانای وشـە بە وشـەی ئایەتەکان

((وە بێگومان پەروەردگارتان ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکانو زەوی لە شەش ڕۆژان دا "بە شەش قۆناغ" دروستکردوون، پاشان چووە سەر بارەگا، بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ ، بە خێرایی بەدوای دەکەوێ، وە خۆرو مانگو ئەستێرەکان بە فەرمانی خۆی ڕامکراوو ملکەچن، ئاگاداربن ! بەدیهێنانو کاروبار بەڕێوەبردن "لە بووندا" هەر هی ویە، بەرەکەتدارو بەرزە خوای پەروەردگاری جیهانەکان ﴿٥٤﴾ بە ملکەچییو پەنهانیی لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە، بە ڕاستیی ئەو "خوا" سنوور بەزێنانی خۆشناوێن ﴿٥٥﴾ وە خراپەکاریی لە زەویدا مەکەن پاش چاکبوونی، وە بە ترسو ئومێدەوە لێی "لە خوا" بپاڕێنەوە، بێگومان بەزەیی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە ﴿٥٦﴾ وە ئەو "خوا" ئەو کەسەیە، کە بایەکان وەك موژدە لە پێش دەستی بەزەیی {باران}دەکەیەوە دەنێرێ، هەتا کاتێك کە هەورە قورسەکانی هەڵگرتن بەرەو سەر زەمینێکی مردوو لێیان دەخورین، ئنجا لەوێ ئاو دەنێرینە خوارێو، یەکسەر لە هەموو بەروبوومو میوەیەکی پێ دەردێنین، دەجا هەر ئاواش مردووان دەردێنین "و زیندوویان دەکەینەوە"، (ئەو وێنەیەمان هێنایەوە) بەڵکو بیرتان بکەوێتەوە "کە زیندووکرانەوەتان ئاسانە" ﴿٥٧﴾ وە سەر زەمینی بە پیتو پێز بە مۆڵەتی پەروەردگاری ڕووەکی "باشی" لێ دەروێو هی بێ پیتیش ، مەگەر ڕووەکی بێ خێر، دەنا هیچ ناڕوێنێ، بەو شێوەیە ئایەتەکانمان جۆراو جۆر دەکەین "بە شێوازی جیا جیا دەخەینەڕوو" بۆ کەسانێك سوپاسگوزاریی بکەن ﴿٥٨﴾) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ): {استوى يُقَالُ عَلَى وَجْهَيْنِ، أَحَدُهُمَا: يُسْنَدُ إِلَيْهِ فَاعِلَانِ فَصاعِدًا، نَحْو: استوى زَيْدٌ وَعَمْرو فِي كَذَا، أي تَساوَيَا، وَالثَّانِي أَنْ يُقَالَ لإعْتِدَالِ الشيءِ فِي ذَاتِهِ، نحو: ﴿ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ۝٦﴾النجم}، وشەی (استوى) بە دوو ڕووان بەکاردێ: یەکێکیان دوو بکەر یان زیاتری دەدرێنە پاڵ، وەك: زەیدو عەمر لەو شتەدا یەکسان بوون، وەك یەك بوون، ڕووی دووەمی ئەوەیە کە شتێك لە خودی خۆیدا ڕێکوپێك بێ، وەك خوا دەربارەی سیفەتی جبریل فەرموویەتی: ﴿ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ۝٦﴾النجم، واتە: بەهێزە، یاخود جوانو بەرچاوو ڕێکوپێکە.

ئنجا جاری وایە (استوى) ئەگەر بە (على) تەعەددا بکات، مانای خستنە ژێر ڕکێفو دەست بەسەرداگرتن (استولى) دەگەیەنێ، بەڵام جاری دیکەش هەیە مانای دیکە دەگەیەنێ، وەك دوایی باسی دەکەین.

(حَثِيثًا ): (الحَثُّ: السُّرْعَةُ)، واتە: خێرایی.

(مُسَخَّرَٰتٍ ): واتە: ڕامکراون، دەستەمۆ کراون، (التَّسْخِيرُ: سِيَاقَةُ إِلى الغَرَضِ الْمُخْتَصِّ بِهِ قَهْرًا)، (تسخير) بریتیە لە لێخوڕینو بردنی شتێك بە ناچاریی، بەرەو ئەو مەبەستەی کە پەیوەستە پێیەوە.

(تَضَرُّعًا ): (تَضَرَّعَ: أَظْهَرَ الضَّرَاعَةَ، وَضَرَعَ الرَّجُلُ ضَرَاعَةً: ضَعُفَ وَذَلَّ، فَهُوَ ضارِعٌ وَضَرِعٌ)، (تَضَرَّعَ) واتە: لالانەوەی دەربڕی، کڕووزایەوە، دەگوترێ: (ضَرَعَ الرَّجُلُ ضَرَاعَةً: ضَعُفَ وَذَلَّ فَهُوَ ضارِعٌ وَضَرِعٌ) واتە: لاواز بوو، بێهێز بوو، زەبوون بوو.

(وَخُفۡيَةً ) : (خَفِيَ الشيءُ خُفْيَـةً : استتَرَ)، واتـە: ئـەو شـتـە پەنهـان بـوو، شێردراوە بـوو.

(أَقَلَّتۡ ) : (أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالاً) ، واتـە : هـەوری قورسـی هەڵگـرت ، (إحْتَمَلَتْـهُ فَوَجَدتـهُ قَلِـيلاً باعْتِبَـارِ قُوَّتِهـا)، (أَقَلَّتْ) واتـە : هەڵیگـرتو پێـی کـەم بـوو ، لەبـەرئەوەی بۆخـۆی بەهێـز بـوو .

(وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ ): (أصْلُ الطيِّـبِ: مَـا تَسـتلِذُّهُ الحَـوَاسُّ، وَمَـا تَسـتلِذُّهُ الـنَّفسُ، وفـي الشَّرْعِ: مَا كـانَ مُتَنَـاوَلاً مِنْ حَيْثُ مَا يَجُوزُ) واتـە: ئەسڵـی (طَيِّب) هـەر شـتێکـە کــە هەستەکــان چێــژی لێوەرگــرن، وە نەفسـی ئینسـان چـێژی لێـوەربگرێ، (الطَيِّـب) لـە ڕووی شــەرعــەوە، هـەر شـتێکــە کــە شــەرع ڕێیدابــێ، ئـەو شــتـە وەربگـیـرێ و بـەکاربهێنـرێ .

(وَٱلَّذِي خَبُثَ ): (الخُبْـثُ و الخَبِيـثُ: مـا يُكـرَهُ رَدَاءَةً وَخساسـةً، مَحْسُوسـا كـانَ أَو مَعْقُولاً)، (الخُبْثُ) و (الخَبِيثُ): هەر شـتێکە کـە لەبـەر خراپیـی نەویسـترێت، ئنجـا شــتێکی بەرهەســت بــێ، یاخــود لــە ڕووی مەعنەوییــەوە بەکەڵــك نەهاتووبێ، (الخَبائث جَمْعُ الخَبيث : مَا لاَيُوَافِقُ النَّفسِ مِن المَحْظُورات) واتە : (خَبَائِث) کۆی (خَبِيث)ە ، هەر شـتێکە کـە لەگـەڵ سروشـتی ئینسـان دا گونجـاو نەبێو ، ئینسـان پێـی خـۆش نەبـێو پێـی چـاك نەبـێ .

(نَكِدًا ): (النَّكِـدُ : كُـلُّ شَـيءٍ خَـرَجَ إِلـى طالِـبِهِ بِتَعَسُّرٍ)، (نَكِـد) هـەر شـتێکـە کـە کـەسێك بــە دوای دا بگـەڕێو بــە زەحمـەت بکـەوێتە دەسـتی، دوایـی بکەوێتـە دەسـتی، (نَكِـدَ يَنْكَـدُ، نَكَدًا، وَنَكـادًا: شَؤُمَ، والأمـرُ عَسُـرَ والشـيء: نَـزَرَ وَقَـلَّ)، واتـە: ئەو شتە بێخێـرە، یان قـورسو بـە زەحمـەتـە، یاخود کەمو کەم بایەخـە.

(نُصَرِّفُ ): (التَّصْـرِيفُ: صَـرْفُ الشـيء مِـنْ حَـالٍ إِلـى حَـال ، تُنَـوِّع)، (صَـرْف) بریتیـە لـەوەی شــتێك لە حاڵـێك بۆ حاڵێـکی دیکـە بگـۆڕێ.

## مانـای گشـتـی ئایەتەکـــان

خــوای پەروەردگــار لـەم پێنــج ئــایەتەدا، یەکــەمجار خـۆی پێناســە دەکـات، دوایـی فەرمان بـە بـەندەکانی دەکات : لێـی بپــاڕێنەوە، وە شـێوازی پاڕانـەوەیان فێــر دەکـات، وە دوایی جارێکی دیکە یەکێك لە شوێنەوارەکانی پەروەردگارێتیی خۆی دەخاتـە ڕوو، کە بریتیە لە مەسـەلەی باران باراندنو چـاندنی میوەو میوەجاتو گیـاو دانەوێڵـە، وە دەیکــاتە وێنــەیەك، وەك بـەڵگــە لەســەر ئـەوە کــە خــوا دەتوانــێ مــردووان زینــدوو بکــاتــەوە .

ســــەرەتا دەفـــــەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾، بێگومـان پەروەردگــاری ئێـوە ئـەو خــوایەیە کە ئـاسمانەکانو زەوی لە شـەش ڕۆژاندا وەدیهێنــان ، پاشـان چۆتە ســەر عـەرش، یـان بـەرز بۆتــەوە بـۆ ســەر عــەرش، دیــارە ئێمـە دوایـی باسێکی سـەربـەخـۆ لەبارەی ئـەم ڕســـتە موبارەکــەوە دەکــەین، یــانی چـــی ، خــوای بـەدیهێنــەر لــە شـــەش ڕۆژان دا ئـاسمانەکانو زەوی بـەدیـهێنـاون ؟ هەروەها باسێکی سـەربـەخۆش دەکەین ، دەربارەی ڕســتەی: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾، کــە ئـەوە یـانی چــیو چۆنــە ؟ وە ڕاجیـایــی زانایــان لــەوبارەوە بــاس دەکــەین، ﴿يُغۡشِى ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾، خـــوا بـــە شـەوگــار ڕۆژگــار دادەپۆشـــێ، وە شـەوگــار بـــە خێرایـی بــە دوای ڕۆژگـــاردا دەچــێ، هەڵبــەتە شـەوگــارو ڕۆژگــار لــە ئەنجـامی خــولانەوەی زەوی بـــە دەوری خۆیـدا لــە بـەرانبـەر ڕۆژدا پەیـدا دەبن، وە بێگومـان زەوی بــە خێراییـەکی زۆر بــە دەوری خۆیـدا دەخـولێتـەوە، وە ڕۆژو شەویش بـە خێرایی بـەدوای یەکدا دێن، ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓ﴾، وە هـەر کـام لـە مـانگو خــۆرو ئەستێرەکــانیش بــە فەرمـانی خـوا ڕامو دەستەمۆ کـراون، بـەو خێراییەی کە خـوا بۆی دیـاریی کـردوون، لـە

سوورِگەکانی خۆیاندا دەخولێنەوە ، ﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ﴾، ئاگاداربن ! بەدیهێنانو فەرمان هەر هی خوایە، واتە: دروستکردنی دروستکراوەکانو ، بەڕێوەبردنیان تەنیا هی خوایە، ﴿ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بەرزو بەرەکەتدارە خوای پەروەردگاری جیهانەکان .

ئنجا خوای بێ وێنە بە گشتی فەرمان بە بەندەکانی دەکاتو ، دەفەرموێ : ﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ﴾، لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە بلاڵێنەوە بە ملکەچییو پەنهانیی، یانی : کە لە خوا دەپاڕێنەوە، با بە شێوازی چاكو بەرزو شایستەی خوا بێ، بە لاڵانەوەو کڕووزانەوو خۆبە کەم زانینەو لە بەرانبەر خوادا، نەك بە قیرەو قیڕو هاوار، ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾، بێگومان خوا سنوور شکێنانی خۆشناوێن، هەڵبەتە ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا، لە دوو کورتە باس دا باسی سنوور شکاندن لە پاڕانەوەدا دەکەین، وە باسی شێوازی پاڕانەوەو دووعا کردن دەکەین .

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾، وە دوای ئەوەی خوا زەوی باش خوڵقاندووەو پاکی کردووەو پڕی کردووە لە خێرو بێر، خراپەی تێدا مەکەن، وە لە خوا بپاڕێنەوەو داوای لێ بکەن بە ترسو ئومێدەوە، یانی : هەم ترستان هەبێ لە سزای خواو، هەم ئومێدیشتان هەبێ بە بەزەیی خوا، ﴿ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، بێگومان بەزەیی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە، ئەگەر دەتانەوێ ڕەحمەتی خواتان بۆ بێ، چاکەکاریی لە خۆتان دا بێننە دی.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ﴾، وە (خوا) ئەو کەسەیە کە بایەکان لە پێش دەستی بەزەیی (بارانەکەی) خۆیدا دەنێرێ.

باران بەرجەستەکەری ڕەحمو بەزەیی خوایە ، بۆ مرۆڤ و گشت ژیانداران‌و زیندەوەران‌و ڕووەك‌و دارو درەخت، چونکە بەهۆی بارانەوە، ئەوانە ژیانیان بەردەوام دەبێ، بۆیە ناوی لێناوە ڕەحمەت، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابًا ثِقَالٗا سُقۡنَٰهُ لِبَلَدٖ مَّيِّتٖ ﴾، هەتا کاتێك بایەکان هەوری قورس هەڵدەگرن، واتە: هەوری باراناویی، ئنجا لێیان دەخوڕین‌و هەورەکان پاڵ پێوەدەنێین بەرەو زەوییەکی مردوو، سەر زەمینێك کە ژیانی تێدا نەماوە، ﴿ فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ ﴾، ئنجا ئاو لەو سەر زەمینە دەنێرینە خوارێ، کە مەبەست باران‌و تەرزەو بەفرە، بۆیەش خوا وشەی ئاو (ماء)ی بەکارهێناوە، تاکو هەر سێکیان بگرێتەوە، هەم باران‌و هەم بەفرو هەم تەرزە، چونکە ئەگەر فەرمووبای : باران (مطر) تەنیا بارانی دەگرتەوە، وە ئەگەر فەرمووبای : بەفر (ثلج) تەنیا بەفری دەگرتەوە، ئەگەر فەرمووبای : تەرزە (برد) ، تەنیا تەرزەی دەگرتەوە، بۆیە لە قورئان دا بە زۆریی وشەی ئاو (ماء) بەکارهاتوە، ﴿ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، بەهۆی ئەو ئاوەوە کە لە ئاسمان ناردوومانەتە خوار، کە ئاوی شیرینەو، لە ئاوی سوێرو تفت‌وتاڵی دەریاکان پاڵێوراوە ، هەموو میوەیەکی پێ دەڕوێنین، ﴿ كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾، ئنجا هەر بە هەمان شێوەش : مردووەکان دەردێنینەوەو زیندوویان دەکەینەوە ، ئەوەمان بۆ باس کردن تاکو پەند وەربگرن‌و ، پێتان وانەبێ زەحمەت بێ ، خوا زیندووتان بکاتەوە، وەك چۆن سەر زەمینێکی دێمەکاری مردوو ، کە هیچ شوێنەواریی ژیانی تێدا نەماوە، خوا پڕی دەکات لە گوڵ‌و گوڵزارو دارو درەخت‌و دانەوێڵەو میوەجات، دەشتوانێ دوای ئەوەی سەرزەمین کاول بوونی بەسەردا دێ، جارێکی دیکە زیندووتان بکاتەوە.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦ ﴾، وە زەوی پڕ پیت‌و پێز ، ڕووەکەکەی دێتە دەرێ ، بە مۆڵەتی پەروەردگاری ، واتە: ڕووەکی باش، دانەوێڵە، سەوزە ، میوە ، هەر چی بەشەر پێویستی پێیەتی ، زەوی بە پیت‌و پێز دەیڕوێنێ ، بەڵام بە فەرمانی پەروەردگاری، یانی : بە پێی ئەو یاسایانەی کە

پەروەردگاری بۆی داناون، ﴿ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ﴾، بەڵام زەوییەك كە پیسە، بێ بەرەكەتە، شۆرەزارە، هیچی لێ نایەتە دەرێ، مەگەر شتێكی بێخێر، یانی : شتێكی بێ كەڵكو كەم بایەخ، واتە: ئێوەش هەوڵبدەن زەوییەكی بە پیت بن، بۆ ئەوەی درەختی ئیمانو كردەوەی باشو ڕەوشتی بەرزتان تێدا بڕوێ، وە خۆتان لەوە بپارێزن ، دڵو دەروونتان زەوییەكی بێخێربێ ، جگە لە كوفرو شیركو نیفاقو ڕەوشتی خراپ ، چی دیكە سەوز نەكات ! ﴿ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە نیشانەكانی خۆمان، ئایەتەكانی خۆمان ، واتە: ڕستەكانی قورئان، یاخود دیاردە سروشتییەكان جۆراو جۆر دەكەینو دەخەینەڕوو ، بۆ كۆمەڵێك كە سوپاسگوزاریی بكەن {بۆ خوای پەروەردگار} ، خوا لەو كەسانەمان بگێڕێ كە سوپاسگوزار دەبن ، وە قەدری ئایەتەكانی خوا دەزانن ، چ ئەو ئایەتانەی لە قورئاندا خستوونیەڕوو ، چ ئەو ئایەتانەی كە لە كتێبی بوونەوەردا هەن ، چ ئەو ئایەتانەی كە لەسەر دەستی ـ پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام كە موعجیزەكانیانن ـ خستوونیە ڕوو .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :**

## باسێک لە بارەی دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی یەوە لە شەش ڕۆژان دا

دیارە ئێمە لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە موبارەکەی کە خوا تێیدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، ئەم بابەتە دەتوێژینەوەو، سەرەتا دەڵێین :

خوای بەرزو مەزن لە هەشت سووڕەتاندا باسی ئەوەی کردوە ، کە ئاسمانەکان‌و زەوی لە شەش ڕۆژاندا دروست کردوون، ئەمەش ئایەتەکانن :

١) ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف .

٢) ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴿٣﴾﴾ یونس .

٣) ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴿٧﴾﴾ هود .

٤) ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴿٥٩﴾ ﴾ الفرقان .

٥) ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴿٤﴾ ﴾ السجدة .

٦) ﴿ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ
رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا
فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا
وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ
فِى يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا ﴿١٢﴾ ﴾ فصلت .

٧) ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ ﴾ ق .

٨) ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٤﴾ ﴾ الحديد .

وەك تێبینی دەكەین خوای پەروەردگار دەفەرموێ: بێگومان پەروەردگارتان ئەو خوایەیە، كە ئاسمانەكانو زەوی لە شەش ڕۆژاندا هێناونە دی ، لە هەندێك ئایەتەكاندا (وە ئەوەی لەنێوانیان دایە) (وَمَا بَيْنَهُمَا )ش زیاد دەكات ، ئنجا ئایا مەبەست لەو شەش ڕۆژە چییە ؟ ئایا شەش ڕۆژی بیستو چوار سەعاتیین ؟ یان شەش ڕۆژی دوازدە سەعاتین ، وەك باوە ؟ یان مانایەكی دیكەیان هەیە ؟

دیارە زۆربەی توێژەرەوانی قورئان، بە شەش ڕۆژی حەفتە تەفسیریان كردوە، واتە: یەك شەم، دووشەم، سێشەم، چوارشەم، پێنج شەم، جومعە، بە پلەی

یەکەمیش پشتیان بە چەند فەرموودەیەك بەستوە، کە ئەم فەرموودەیەی ئێستا دەیهێنم لە ڕووی سەنەدەوە لە هەموویان بەهێزترە :

{قَالَ مُسْلِم: حَدَّثَنِي سُرَيْجُ بْنُ يُونُسَ وَهَارُونُ بْنُ عَبْدِ اللهِ قَالاَ: حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: قَالَ ابْن جُرَيْج: أَخْبَرَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ أُمَيَّةَ، عَنْ أَيُّوبَ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ رَافِعٍ مَوْلَى أُمِّ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ : أَخَذَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِيَدِي فَقَالَ: ﴿خَلَقَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ التُّرْبَةَ يَوْمَ السَّبْتِ، وَخَلَقَ فِيهَا الْجِبَالَ يَوْمَ الأَحَدِ، وَخَلَقَ الشَّجَرَ يَوْمَ الإِثْنَيْنِ، وَخَلَقَ الْمَكْرُوهَ يَوْمَ الثُّلاَثَاءِ، وَخَلَقَ النُّورَ يَوْمَ الأَرْبِعَاءِ، وَبَثَّ فِيهَا الدَّوَابَّ يَوْمَ الْخَمِيسِ، وَخَلَقَ آدَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ بَعْدَ الْعَصْرِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، فِي آخِرِ الْخَلْقِ وَفِي آخِرِ سَاعَةٍ مِنْ سَاعَاتِ الْجُمُعَةِ، فِيمَا بَيْنَ الْعَصْرِ إِلَى اللَّيْلِ﴾} (رَوَاهُ مُسْلِمُ: باب ابْتِدَاءِ الْخَلْقِ وَخَلْقِ آدَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ، رقم: (٧٢٣١)، وصححه الألباني في "السلسلة الصحيحة" برقم: (٢٠٣٣))[1].

واتە: ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرتم، دوایی فەرمووی: خوای زاڵو پایەبەرز : گڵی لە ڕۆژی شەممەدا دروست کرد، وە چیاکانی لە ڕۆژی یەك شەممە لە زەویدا دروست کردن، وە دارو درەختی لە ڕۆژی دوو شەممەدا دروست کرد، وە شتی ناپەسندی لە ڕۆژی سێ شەممەدا دروست کرد، وە ڕووناکیی لە ڕۆژی چوار شەممەدا دروست کرد، وە هەموو زیندەوەرێکی ژیانداریشی لە زەویدا بڵاوکردەوە، لە ڕۆژی پێنج شەممەدا، وە لە ڕۆژی جومعەدا دوای عەسر لە دوا کاتەکانی کۆتایی جومعە، لەو ماوەیەدا کە دەکەوێتە نێوان عەسرو شەو، ئادەمیشی دروست کرد.

## هەڵسەنگاندێکی ئەم دەقە لە ڕووی سەنەدو دەقەوە:

ژمارەیەك لە زانایان دەڵێن: ئەم حەدیسە لە ڕووی سەنەدو دەق (متن)ەوە ئیشکالی تێدایە !

١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٦٣٢٣)، وَالبُخَارِيُّ في "التاريخ: ج١، ص٤١٣، وَقَالَ، قَالَ بَعْضُهم: عَن أَبي هُرَيرَة عَنْ كَعْب وَهُوَ أَصَحّ، وَالنَّسائِيُّ في "الكبرى" برقم: (١١٠١٠) وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (١٧٣١)، وَأَبُو يَعلَى برقم: (٦١٣٢)، وَالديلمي برقم: (٢٩٢٧).

## یەکەم : لە ڕووی سەندەوە :

جاریَ لە ڕووی سەنەدەوە، زانایان قسەیان لەسەر ئەو پیاوانە هەیە، کە ئەم حەدیسەیان گێڕاوەتەوە :

١) بوخاریی دەڵێ : ئەبو هوڕەیڕە ئەو قسەیەی لە کەعبی زانای جوولەکە وەرگرتوە، کە هەر ئەو قسەیەش ڕاستەو تەواوە (دیارە کەعبی ئەحبار دوایی مسوڵمان بووە، بەڵام زۆر لە زانایان قسەیان لەسەری هەیە لەبەرئەوەی زۆر ئیسرائیلییاتی هێناوەتە نێو ئیسلامەوە) کەواتە: ئەم دەقە (موقوف)ە لەسەر کەعب، نەك (مرفوع) بێ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ .

٢) عەلی کوڕی مەدینی دەڵێ : ئیسماعیلی کوڕی ئومەییە ، ئەو حەدیسەی لە (ئیبڕاهیمی کوڕی ئەبی یەحیا) وەرگرتوە، کە ئەو کەسێکی زۆر درۆزنە.

٣) بەیهەقیی لە کتێبی (الأسماء والصفات، ص ٢٧٦)دا دەڵێ : (إبراهيم مرميٌّ بالكذب) ، واتە : ئیبڕاهیم تۆمەتبارە بە درۆکردن .

٤) وە (ئیبڕاهیمی کوڕی عەرعەرە) دەڵێ : گوێم لە یەحیای کوڕی سەعیدی قەطان بوو، دەیگوت: پرسیارم لە مالیکی کوڕی ئەنەس کردوە، دەربارەی (ئیبڕاهیمی کوڕی ئەبی یەحیا) ئایا جێی متمانەیە ؟ گوتی: نەخێر، جێی متمانە نیە لە دینداریيەکەی دا ، (الجرح والتعديل: للرازي، ج ١، ص١٩).

٥) ئیبنو ئەبی شەیبە دەڵێ : گوێم لە عەلی کوڕی مەدینی بوو (کە هەردووکیان مامۆستای بوخاریین) دەیگوت : (ئیبڕاهیمی کوڕی ئەبی یەحیا) زۆر درۆزنە. (تأريخ بغداد، ج ٣، ص ١٣).

٦) وە ئیمام بەززار دەربارەی (ئیبڕاهیمی کوڕی ئەبی یەحیا) دەڵێ : یەکێکە لەو کەسانەی لەخۆوە حەدیس هەڵدەبەستێ، وە دەڵێ : جاری وا بووە هەندێ پرسیاری لێکراوە، هەر لەخۆوە سەنەدێکی بۆ داناوەو، دەستی بە گوتنی حەدیس کردوە !! (تهذيب التهذيب ، ج ١، ص ١٣٩).

ئنجا بەنسبەت یەكێك لە ڕاوییەكانی دیكەیەوە، كە ناوی (ئەیوبی كوڕی خالید)ەو لە زنجیرەی ڕاوییەكانی ئەم فەرمووده دایە، كە موسلیم لێی گێڕاوەتەوە، زانایان قسەیان هەیەو دەڵێن: قسەكانی ئەو پیاوە بە بەڵگە ناشێن، لەبەرئەوەی پیاوێكی لاوازە.

٧) ئیمام ئەوزاعیی دەربارەی (ئەیوبی كوڕی خالید) دەڵێ : قسەی بێ بنەماو نەناسراوی هەن (لَهُ مناكير)، (ميزان الإعتدال ج ١، ص ٢٨٦).

٨) وە ئیبنو حەجەری عەسقەلانیی دەڵێ : پیاوێكی لاوازە، {(رجل ضعيف) (لسان الميزان ج ١، ص ٣٦٩)}، وە هەروەها لە كتێبی: (التقريب ج١، ص١١٧) دا دەڵێ : نەرمییەكی تێدایە (فيه لين).

## دووەم : لە ڕووی نێوەڕۆك (متن)ەوە :

ئنجا ئەگەر لە ڕووی نێوەڕۆكەوە ، لەم فەرموودەیە وردبینەوە دەزانرێ كە ئیشكالی زۆری تێدان، وە زانایان هەر لە زووەوە ، قسەی خۆیان لەسەری هەبووە :

كورتەی قسەی ئیبنو تەیمییە لە (مجموع الفتاوى ج ١٨، ص ١٧) دەربارەی ئەو حەدیسە ئەوەیە: دەڵێ : ئنجا ئەگەر ئەوە تانە دان بێ لە ئیمام موسلیم (بەوە كە بگوترێ : ئەم فەرموودەیە لاوازە، یان قسەی كەعبی زانای جوولەكەیەو ئەبوو هوڕەیرە لەوی بیستوە)، ئایا كێ لە یەحیای كوڕی موعینو بوخارییو جگە لەوان (واتە: زانایانی پایەداری وەك وان) زاناترو شارەزاترە ، بە موسلیم ؟! كەچی ئیمام بوخاریی دەڵێ : ئەوە قسەی كەعبی زانای جوولەكەیە) .

دواییش دەڵێ : هەندێك كەس ئەم فەرموودەیان بە بێهێز داناوەو، هەر ئەوەش ڕاستە (یانی : ئەویش پێی بێهێزە) ، ئنجا دەڵێ : وە لە ڕاستییدا بە دڵنیاییو بە شێوەیەكی تەواتور بە ئێمە گەیشتوەو جێگیریش بووە، كە خوای بالادەست ئاسمانەكانو زەویو ئەوەی تێیاندایە ، لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروستی كردوون، وە جێگیریش بووە كە دوا دروستكراویشی ڕۆژی هەینی دروستكردوە.

مادام وابێ : وا پێویست دەکات یەکەم دروستکراو لە ڕۆژی یەك شەممەدا دروست کرابێ (نەك ڕۆژی شەممە)، وە هەروەها ئەوە لە لای ئەهلی کیتابیش (واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان) ئاوایە ، پاشان دەڵێ : ئەگەر یەکەم دروستکراو ڕۆژی شەممە بێ، وە دوا دروستکراویش ڕۆژی هەینی بێ، ئەو کاتە مانای وایە، خوای بەرز لە ماوەی حەوت ڕۆژان دا دروستکراوەکانی دروست کردوون، کە بێگومان ئەوەش پێچەوانەی ئەو هەواڵەیە کە قورئان پێی ڕاگەیاندووین، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ... ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف، واتە: بێگومان پەروەردگارتان ئەو خوایەیە ، کە ئاسمانەکانو زەوی لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروست کردن .

پاشان ئیبنو تەیمییە، دەڵێ : لەگەڵ ئەوەش دا زانایانی زۆر شارەزا لە ئەهلی حەدیس ناتەوایی‌و ناڕاستیی ئەم حەدیسەیان جێگیر کردووە ، لە چەند لایەنی دیکەی جگە لەو لایەنەوە ، (واتە: لە ڕووی سەنەدەوە، وەك پێشتر باسمان کرد) .

## سێیەم : ئەگەر تەماشای دەقی فەرموودەکە بکەین :

بە هیچ جۆرێك باسی دروستکرانی ئاسمانەکانی تێدا نیە، وەك ئەوەی ئاسمانەکان‌و زەوی بە جیا دروست کرابن ، لە کاتێکدا خوای زاناو شارەزا دەربارەی دروستکرانی ئاسمانەکان‌و زەوی ، فەرموویەتی: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ... ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنبياء، واتە : ئایا ئەوانەی بێبڕوان نابینن کە ئاسمانەکان‌و زەوی پێکەوە نووساوبوون‌و لە یەکمان جیاکردنەوە .... .

بۆیە وا پێدەچێ ئەم دەقە ڕاست نەبێ‌و ، لە ئیسرائیلییاتەوە وەرگیرا بێ ، وەك دوایی لە پەیمانی کۆندا ئاماژەی پێدەکەین ، چونکە ئەم دەقە لە پەیمانی کۆندا هاتوە .

وە لەوبارەوە (محمد رشيد رضا) لە تەفسیرەکەی خۆی دەڵێ : {كل ما روي في هذه المسألة من الأخبار والآثار، مأخوذٌ من الإسرائيليات، لا يصحُّ فيها

حديث مرفوع، وحديث أبي هريرة هذا، وهو أقواها مردود بمخالفة متنه لنص كتاب الله، وأما سنده فلا يغرّنك رواية مسلم له ، فهو قد رواه كغيره عن حجاج بن محمد الأعور المصيص إبن جريج ، وهو تغيَّر في آخر عمره وثبت أنه حدَّث بعد اختلاط عقله ، كما في (تهذيب التهذيب) وغيره، والظاهر أن هذا الحديث مما حدَّث به بعد اختلاطه}، (تفسير القرآن الحكيم ج ٨، ص ٤١٢، ٤١٣) ، واتە : وە هەرچی لەبارەی ئەو پرسەوە ، لە هەواڵەکانو لە شوێنەوارەکان گێڕدراوەتەوە ، هەمووی لە ئیسرائیلییاتەوە هاتوە، (ئیسرائیلییات ناوونیشانە بۆ هەموو ئەو ڕیوایەتو قسەو باسانەی کە زانایانی جوولەکە بۆ هاوەڵانیان باس کردوون ، یان بۆ شوێنکەوتووانیان باس کردوون، وە ئەوانیش کەمو زۆر خستوویانەتە نێو کەلەپووری ئیسلامییو ، هەندێ جار خستوویانەتە نێو تەفسیری قورئانو شەرحی فەرموودانیش) وە هیچ فەرموودەیەکی بەرز کراوە (مرفوع) بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی نەهاتوە لەوبارەوە، وە ئەو دەقە کە ئەبو هورەیرە هێناویەتی ، کە لە ڕووی سەنەدەوە بەهێزترینیانە ، ڕەد دەکرێتەوە ، لەبەرئەوەی دەقەکەی لەگەڵ دەقی کتێبی خوادا دژ دەوەستێ، بەڵام نابێ بە سەنەدەکەی فریو بخۆین کە موسلیم گێڕاویەتەوە ، چونکە موسلیمیش وەك غەیری خۆی، هەر لە (حَجَّاجُ بْن مُحَمَّد)ەوە هێناویەتی، ئەویش لە ئیبنو جورەیجەوە، کە ئەویش لە کۆتایی تەمەنیدا حاڵی عەقڵییو دەروونیی گۆڕا بوو، وە شتێکی چەسپاوە لە دوای ئەوەی کە عەقڵی تێکچوو بوو، وەك لە کتێبی (تهذیب التهذیب)و جگە لەویشدا هاتوە، هەندێ فەرموودەی گێڕاونەوە، وە وا پێدەچێ ئەم فەرموودەیە لەو جۆرە بێ ، کە لە دوای عەقڵ تێکچوونی باسی کردوە.

ئنجا (الحافظ إبن كثير) لە دوای هێنانی ئەم فەرموودە دەڵێ : (وَفِيهِ استيعَاب الأَيّامِ السَّبْعَةِ، وَاللهُ تَعَالَى قَدْ قَالَ فِي ستةِ أَيّام؛ ولهذا تكلّم البخاري وغير واحدٍ من الحفّاظ في هذا الحديث، وجعلوه من رواية أبي هريرة، عن كعب الأحبار، ليس مرفوعاً، والله أعلم)[١]، واتە: ئەم فەرموودەیە هەر حەوت ڕۆژەکانی حەفتەی گرتوونەوە، لە کاتێکدا کە خوای بەرز فەرموویەتی: لە شەش ڕۆژاندا خوا

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص ٤٨٠ .

ئاسمانەکان‌و زەوی هێناونــە دی، بۆیـەش بوخـاریی‌و غـەیری ویـش قسـەیان لەسـەر ئەم حەدیسە کـردوەو، گوتوویانـە: ئـەبو هـورەیرە لـە کـەعبـی ئەحبـاری گێڕاوەتـەوە، مەرفـووع نیــە، وە خـواش زانـاتـرە .

کـەواتە: ئەم فەرموودەیە لەگـەڵ دەقی قورئـان دا تێکدەگیـرێ، پێغـەمبـەر ﷺیش ، بێگـومان، بێگـومان، شـتێك نافـەرموێ کـە لەگـەڵ قورئـان دا دژ بوەسـتێ، کـەواتە: ئەگـەر بـە ناوی پێغـەمبـەر ﷺەوە ، شـتێکمان پێگـەیشت ، لەگـەڵ قورئـان دژ وەسـتا، دیـارە فەرمایشتی پێغـەمبـەر ﷺ نیـە.

## چوارەم: ئەگـەر سـەرنجی تەورات بدەین، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکـەوێ:

دروسـتکرانی ئـاسـمانەکـان‌و زەوی لـە مـاوەی حـەوت ڕۆژدا ، لـە تەوراتـدا هـاتوە، وە ڕۆژەکـانیشـی بـەم شـێوە دابـەش کـردوون : (الیـوم الأوّل : النـور ، الیـوم الثـاني : الجَليد ، الیوم الثـالث : الأرض الجافة والخضروات ، الیوم الرابـع : القمر والنجـوم، الیـوم الخـامس : الطیـور والأسمـاك ، الیـوم السـادس : الحیوانـات والإنسـان ، الیـوم السـابع : یوم الراحـة)[1] واتـە : ڕۆژی یەکـەم خـوا ڕووناکیی دروسـت کـردوە ، ڕۆژی دووەم بـەستەڵـەکی دروسـت کـردوە ، ڕۆژی سـێیەم وشـکـانیی‌و سـەوزایی دروسـت کردوە ، ڕۆژی چوارەم مانگ‌و ئەستێرەکانی دروست کردوون ، ڕۆژی پێنجـەم باڵـندەو ماسییەکـانی دروست کردوون ، ڕۆژی شـەشـەم ژیانـداران‌و مرۆڤـی دروسـت کـردوون ، ڕۆژی حەوتەمیـش ڕۆژی پشـوودانە !

ئنجا لە تـەوراتـدا دەڵێ : (وهکذا اکتملت السموات والأرض بکل مـا فیهـا ، وفـي الیـوم السـابع أتمَّ الله عَمَلَـهُ الـذي قـام بـهِ فاسـتراح فیــه مِنْ جَمِیع مَا عَمِـلَـهُ) واتـە: بــەو شــێوەیە ئـاسـمانەکـان‌و زەوی‌و هەرچـی تێیـانـدایە تـەواو بـوون ، وە لـە ڕۆژی حەوتەمـدا خـوا بـەو کـارانەی هەڵسـا بـوو ، تـەواوی کـردن ، وە لـە ڕۆژی حەوتەمـدا پشـوویدا ، لە هـەموو ئەو کـارانەی کـە ئەنجـامی دابـوون !!

---

١) التفسیر التطبیقي للکتـاب الـمقدس، العهـد القـدیم، سـفر التکوین، الإصحاح : ١ و ٢، "قصـة الخلق " ص (٦ إلـى ٩).

بەڵام خوای پەروەردگاری توانا بۆخۆی کە باسی دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی دەکات دەفەرموێ : ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾﴾ق ، واتە : وە بێگومان ئێمە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی نێوانیانمان لە شەش ڕۆژاندا دروست کردوونو هیچ ماندووش نەبووین .

بەڵێ هەموو سیفەتەکانی خوا بێسنوورن، توانایی خوا (قدرة الله)کە یەکێکە لە سیفەتەکانی بێ سنوورە ، ئنجا ئەگەر تەماشای ڕیزبەندیی شتەکانیش بکەین، شتێکی زۆر سەیرە ! ماسیو پەلەوەرەکان دەکەونە پێش ژیاندارانو ئینسانەوە ! وە مانگو ئەستێرەکان ، دەکەونە دوای زەویو بەستەڵەكو ڕووناکییەوە، بە هەر حاڵ ئەوە دیارە کە هیچی بەسەر هیچەوە نیە ، لە ڕووی عەقڵیو عیلمییەوە ، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەم فەرموودەیەو باقی فەرموودەکانی دیکە کە لەوبارەوە قسە دەکەن ، ئەسڵەکەیان دەچێتەوە سەر ئەو ئیسرائیلییاتەی کە وەك گوتم : لەگەڵ عەقڵو عیلمو واقیعدا دژ دەوەستن .

بەڵام ئەدی ئایا مەبەست لە شەش ڕۆژەکان چییە ، کە خوای پەروەردگار لە هەشت سوورەتی قورئاندا باسی کردوە ، کە ئەمەش ئەمە دەگەیەنێ خوای کاربەجێ بایەخێکی زۆری داوە بەو مەسەلەیە ؟

لە وەڵامدا دەڵێین: مەبەست لەو شەش ڕۆژە، شەش قۆناغە (ست مراحل)، لەوبارەوە چەند بەڵگەیەك دێنینەوە :

**<u>بەڵگەی یەکەم</u>**: وشەی (یوم) کە بە (أیام) کۆدەکرێتەوە، وێڕای ئەوە کە بە سووڕانەوەیەکی زەوی بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەری خۆردا، کە بیستو چوار سەعاتە دەگوترێ، وە جاری واشە بە دوازدە سەعاتەکەی ڕۆژێ دەگوترێ، واتە: ڕۆژگار (نهار)، دوازدە سەعاتەکەی دی شەوگارە (لیل)، وێڕای ئەوە وشەی (یوم) لە زمانی عەرەبیدا، وە لە بەکارهێنانی قورئاندا، بەمانای ماوەیەك لە

کاتیش دەگوترێ، (مدة من الزمن)، ئنجا کەم بێ، یان زۆر بێ، وەك لە فەرهەنگەکانی زماندا هاتوە، بۆ وێنە:

١ - (راغب) لە (مفردات ألفاظ القرآن) لاپەڕە (٨٩٤)دا لەوبارەوە دەڵێ : (اليَوْمُ: يُعَبَّرُ بِهِ عَن وَقْتِ طُلُوعِ الشَّمْسِ إِلى غُرُوبِها، وَقَدْ يُعَبَّر بِهِ عَنْ مُدَّةٍ مِنَ الزَمَانِ أي مُدّة كانَتْ، وقال تعالى : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ ﴿١٥٥﴾ ﴾ آل عمران، ﴿ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَى ٱللَّهِ يَوۡمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ ﴿٨٧﴾ ﴾النحل، ﴿ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٌ ... ﴿٢٥٤﴾ ﴾البقرة)، واتە: (يَوْم) وشەیەکە بەکار دەهێنرێ، بۆ تەعبیر کردن لەو کاتەی کە خۆر هەڵدێ تا خۆر ئاوا بوون، جاری واش هەیە بەکاردەهێنرێ ، بۆ تەعبیر کردن لە ماوەیەك لە کات، هەر ماوەیەك بێ، کەم یان زۆر ، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ئەوانەی لە پێکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکاندا پشتیان لە ئێوە کرد، وە هەروەها دەفەرموێ: وە لەو ڕۆژەدا (واتە: لە ڕۆژی دوایی دا) گەردنکەچییان بۆ خوا پێشاندا، هەروەها خوا فەرموویەتی: لەوە کە پێمان داون ببەخشن ، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێ.

٢ - (الفيومي) لە (المصباح المنير) لاپەڕە (٣٩٢)دا دەڵێ : (اليوم: أوله من طلوع الفجر الثاني إلى غروب الشمس...، والعرب قد تطلق "اليَوْمَ" و تريد الوقت والحين نهاراً كان أو ليلا فتقول : ذخرتك لهذا اليوم ، أي لهذا الوقت...) ، واتە : (يَوْم) سەرەتایەکەی هەڵهاتنی سپێدەی یەکەمە ، تاکو خۆرئاوا بوون، وە عەرەب جاری وایە وشەی (يَوْم) بەکاردێنن ، مەبەستیان پێی کاتە ، یان ماوەیەکە ، ئنجا ڕۆژ بێ ، یان شەو ، دەڵێن : (ذخرتك لهذا اليوم) واتە : بۆ ئەمڕۆ هەڵمگرتبووی ، یانی : بۆ ئەم کاتە.

٣ – هەروەها (المعجم الوسيط) لە لاپەڕە (١٠٦٨)دا دەڵێ : (اليوم: زمن مقداره من طلوع الشمس إلى غروبها، واليوم: الوقت الحاضر، ومنه في التنزيل العزيز: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ... ﴿٣﴾ ﴾المائدة، وفي

الفلك: مقدار دوران الأرض حول محورها ومدته أربع وعشرون ساعة)، واته : (يَوْم) كاتێكه ئەندازەكەی بریتیه له هەڵهاتنی خۆر تاكو ئاوا بوونی، وه (يَوْم) بە كاتی ئێستا دەگوترێ، وەك خوای بەرز دەربارەی قورئان كه دایبەزاندوه، دەفەرموێ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ...﴿٣﴾﴾ المائدة، واته : ئەمڕۆ دینەكەتانم بۆ تەواو كردن ، واته : ئەو كاته دینەكەتانم بۆ تەواو كردن ، وه (يَوْم) له زانیاریی گەردوون ناسیی دا ، بە ئەندازەی سووڕانەوەی خۆر دەگوترێ بە دەوری خۆی دا، كە ماوەكەی بیستو چوار سەعاته .

**بەڵگەی دووەم:** له بەركارهێنانی كتێبی خواشدا ، وشەی (يوم) و (أيام) بە مانای جۆراو جۆر هاتوون ، بۆ وێنه :

١- خوای پەروەردگار له سووڕەتی (الحج)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾، واته: بێگومان ڕۆژێك له لای پەروەردگارت ، وەك هەزار ساڵه لەوەی كه ئێوه دەیژمێرن ، واته: بە ئەندازەی هەزار ساڵی ئێوەیه.

٢ - وه له سووڕەتی (المعارج)دا دەفەرموێ : ﴿تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾﴾، واته: فریشتەكانو ڕووح "واته: جبريل" بۆ لای خوا بەرز دەبنەوە ، له ڕۆژێكدا كه ئەندازەكەی پەنجا هەزار ساڵه.

٣ - وه له سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ : ﴿...وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ...﴿١٤٠﴾﴾، واته: ئەم ڕۆژانه له نێوان خەڵكدا دەستاو دەستیان پێدەكەین .

٤ - وە لە سوورەتی (الفاتحة)دا دەفەرموێ: ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤ ﴾، واتە: خاوەنی ڕۆژی پاداشتو سزایە.

٥ - وە لە سوورەتی (غافر)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۢ بِمَا كَسَبَتۡۚ لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ١٧ ﴾، واتە: ئەمڕۆ هەموو نەفسێك سزاو پاداشتی دەدرێتەوە ، بەگوێرەی ئەوە كە كردوویەتی، ئەمڕۆ ستەم لە كەس ناكرێ.

كەواتە: (يَوْم) دەگونجێ هەزار ساڵ بێ، وە دەگونجێ پەنجا هەزار ساڵ بێ، وە دەشگونجێ ماوەیەك لە كات بێ ، بە بێ دیاریی كردن.

<u>**بەڵگەی سێیەم:**</u> بەر لەوەی ئاسمانەكانو زەوی دروست بكرێن، وە كۆمەڵەی خۆرو سووڕانەوەی زەوی هەبێ ، ڕۆژو شەو بەم شێوەیەی ئێستا بوونیان نەبووە، مادام وابێ ئەو كاتە ، ئەو ڕۆژانەی كە ئێستا ئێمە دەیانژمێرین : یەك شەممەو دوو شەممەو سێ شەممەو ...هتد ، نەبوون .

ئنجا ڕەنگە یەكێك لەبارەی ئایەتەكانی سوورەتی (فصلت)ەوە ئیشكالی بۆ دروست بێ كە بە پێی ئەو ئایەتانە قۆناغەكان دەبنە هەشت قۆناغ : (٢ + ٤ + ٢ = ٨)، بەڵام بە تێگەیشتنی ڕاستو دروست لە ئایەتەكان ، ئەو ئیشكالەش چارەسەر دەبێ، با تەماشا بكەین :

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ وَتَجۡعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٩ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ ١٠ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ١١ فَقَضَىٰهُنَّ

سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ ﴿١٢﴾ ﴾فصلت، واتە: بڵێ:
ئایا ئێوە بێبڕوان بەو کەسەی کە زەوی لە دوو ڕۆژاندا دروست کردوە، وە هاوبەش‌و هاووێنانی بۆ دادەنێن، ئا ئەو زاتە پەروەردگاری جیهانەکانە، وە لەسەر زەوی چیاکانی چەسپاندن، وە بەرەکەتو پێزی تێدا دانا، وە بژیوەکانی تێدا بە ئەندازەگیریی دانان، بە یەکسانیی بۆ هەموو ئەوانەی داوا لە خوا دەکەن (بە زمانی حاڵ)، پاشان ویستی ئاسمان دروست بکات، وە بەرەو ئاسمان چوو، لە کاتێکدا کە دووکەڵ بوو، وە بە ئاسمانەکان‌و زەوی فەرموو: چارو ناچار "واتە: بتانەوێ‌و نەتانەوێ" پەیداببن، ئەوانیش گوتیان: بە ملکەچیی پەیدا دەبین، ئنجا خوا لە دوو ڕۆژاندا ، حەوت ئاسمانی دروست کردن.

کەواتە: سەرەتا باسی دروستکرانی زەوی لە دوو ڕۆژدا کراوە، ئنجا باسی دروستکرانی چیاکان‌و، دانانی بژیوەکان لە زەوی دا، لە ماوەی چوار ڕۆژاندا کراوە، دوایی باسی دروستکرانی ئاسمان دەکات ، کە پێشتر دوو کەڵ بووە، وە باسی دروستکرانی زەوی دەکات ، هەردووکیان لە ماوەی دوو ڕۆژدا.

کەواتە: مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە هەموو ئاسمانەکان‌و زەوی بە دوو قۆناغ دروست کراون، پێکهاتەکانی زەویش هەموویان بە چوار قۆناغ، یانی: (٢ + ٤ = ٦)، بەڵام ئەوەی ئیشکالی دروست کردوە، باسکردنی دروستکرانی زەوییە لە سەرەتاوە ، کە ئەوە بۆ خستنە ڕووی گرنگیی‌و بایەخی زەوییە ، بۆ ئێمەی مرۆڤ ، ئەگەرنا بێگومان ناگونجێ زەوی‌و پێکهاتەکانی نێوی، پێش ئاسمان دروست بووبن، چونکە زەوی شتێکی بچووکە لەچاو ئاسمان، وە پێکهاتەکانی بچووکتریشن، کەواتە: زەوی لە میان (ضمن)ی ئاسماندا دروست بووە، وە پێکهاتەکانی زەوی لە میان (ضمن)ی زەوی‌و ئاسماندا دروست بوون.

ئنجا من وای تێدەگەم کە مەبەست لە دوو قۆناغەکەی دروست بوونی ئاسمانەکان‌و زەوی ، هەردوو قۆناغی پێکەوەلکان (رتق)و لێک جیابوونەوە (فتق)ن، کە خوای بەرز فەرموویەتی : ﴿ أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ

وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ﴿٣٠﴾ ﴾الأنبياء ، واتە : ئایا ئەوانەی بێبڕوان نازانن ، ئاسمانەكانو زەوی پێكەوە چەسپاو بوون ، لێكمان جیاكردنەوە ، واتە : سەرەتا كە بوونەوەر لە حاڵەتی گاز (دخان)دا بووە ، هەمووی پێكەوە جۆش دراوەوەو چەسپاوە، دوایی حاڵەتی تەقینەوەو لێك جیابوونەوە (إنفجار)ی بۆ پەیدا بووە ، وەك بیردۆزە فیزیاییەكانی ئێستا دەڵێن .

هەڵبەتە ئێمە قورئان بەو بیردۆزانە تەفسیر ناكەین ، بەلاّم دەڵێین : ئەوە ئاماژەیەكەو دەگونجێ مەبەست لەوە كە دەڵێ كە ئاسمانەكانو زەوی بە دوو قۆناغ دروست بوون ، قۆناغی پێكەوەلكاویی (رتق) ، وە قۆناغی لێك جیابوونەوە (فتق) بێ ، وە پێكهاتەكانی دیكەی زەوییش لە چوار كات دا، دروست كراون .

**مەسەلەی دووەم :**

# باسێک دەربارەی (استواء)ی خوا لە سەر عەرش

خوای زاناو توانا لە حەوت شوێنان دا باسی ئەم بابەتەی کردوە، با تەماشای ئەو شوێنانە بکەین، کە خوای پەروەردگار ئەم مەسەلەیان تێدا دەخاتەڕوو:

١ - ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف .

٢ - ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۖ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾﴾ یونس .

٣ - ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴿٢﴾﴾ الرعد .

٤ - ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾﴾ طه .

٥ - ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ ٱلرَّحْمَٰنُ فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٩﴾ ﴾ الفرقان .

٦ - ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا شَفِيعٍ ۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٤﴾ ﴾ السجدة .

٧ - ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۖ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤﴾ ﴾ الحديـد .

هەڵبەتە لە سوورەتی (البقرة) ئـایەتی (٢٩)داو ، لـە سوورەتی (فصلت) ئـایەتی (١١)دا ، ڕسـتەی ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ﴾ هاتـوون، واتـە: دوایـی ڕووی کـردە ئـاسـمان، یان (استواء)ی کرد بۆ ئـاسـمان، بـەڵام ئەمە جیـایە لە : ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴾ .

ئنجـا دیـارە زانایـان دەربـارەی مانـای : (إِسـتواء الله علـى العـرش)، مشـتومڕی زۆریـان بووە ، لە نێوان تەئـویـل کردنو نەکـردنی دا ، کـە پـێم وایـە هـۆی تەئویـل کردنـی ڕسـتەی : ﴿ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴾، لەلایـەن هەنـدێ لـە زانایانـەوە کـە گوتوویانـە : (استـوی) یـانی: (استولـی) واتـە: دەسـتی بەسـەردا گـرت، کـە لـە فەرهەنگەکـانی زمـانی عەرەبیـدا ئـەو مانایەشـی هەیـە، هۆیەکـەی ئـەوە بـووە کـە هەنـدێ کـەس بـەهـۆی مانـا لـێکـدانەوەی ڕواڵەتییـەوە ، دووچـاری وێچـواندنو جەسـتاندن (التشـبیه والتَّجسـید)ی خـوای بێ وێنـە بوون، ئنجـا بـۆ ڕێگـرتن لـەوە، هەڵسـاون مانایەکـی دیکەی دوور لەوەیـان بۆ لـێکداوەتـەوە.

وە پوختەی بۆچوونو هەڵوێستم ، لەبارەی تەفسیرو واتای ئەم ئایەتانەوە ، هەمان ئەو قسەیە کە (نُعَيْمُ بْنُ حَمَّادٍ الخُزَاعِيُّ شَيْخُ البُخَارِيِّ) لەوبارەوە کردوویەتی، دەڵێ : (مَنْ شَبَّهَ اللهُ بِخَلْقِهِ كَفَرَ، وَمَن جَحَدَ مَا وَصَفَ اللهُ بِهِ نَفْسَهُ ، فَقَدْ كَفَرَ ، وَلَيْسَ فِيمَا وَصَفَ اللهُ بِهِ نَفْسَهُ وَلاَ رَسُولُهُ ، تَشْبِيهٌ، فَمَنْ أَثْبَتَ مَا وَرَدَتْ بِهِ الآثَارُ الصَّرِيحَةَ وَالأَخْبَارُ الصَّحِيحَةَ ، عَلَى الوَجْهِ الذِي يَلِيقُ بِجَلاَلِهِ، وَنَفَى عَنِ اللهِ النَّقَائِصَ فَقَدْ سَلَكَ سَبِيلَ الهُدَى)، واتە: هەر کەسێك خوا بە دروستکراوەکانی بچوێنێ ، کوفری کردوە، وە هەر کەسێك نکووڵیی لە سیفەتێك بکات ، کە خوا خۆی پێ وەسف کردوە، ئەوە کوفری کردوە ، وە هەرچی کە خوا خۆی پێ وەسف کردوە، هەروەها پێغەمبەری خوا، خوای پێ وەسف کردوە، وێچواندن (تشبیه)ی تێدا نیە ، بۆیە هەر کەسێك ئەوە بۆ خوای بەرز بچەسپێنێ ، کە ئایەتەکان بە ڕوونو ڕاشکاویی ، وە هەواڵە ڕاستەکان گەیاندوویانن ، بەو شێوەیەی کە بۆ خوای پایە بەرز شایستەیە، وە کەموکورییەکان لە خوا دوور بخاتەوە (واتە: بە شێوەیەك ئەو وشانەی بۆ خوا لێکداتەوە کە هیچ کەموکوریی بۆ خوا نەگەیەنێ) ئەوە ڕێی ڕاستی گرتوە.

دیارە ئێمە درێژەی هەڵوێستمان لەوبارەوە لە کتێبی : (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی) بەرگی سێ دا خستۆتە ڕوو، کە دەربارەی ناوو سیفەتەکانی خوای بەرزو بێ وێنەیە، هەروەها لە کتێبی : (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تعالى) لە بەرگی دوودا، باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

ئنجا زۆربەی زانایانی پێشین ، دەڵێن : ئێمە ئەو وشانە بەکاردێنین ، وە ماناکەشیان دەزانین ، بەڵام چۆنیەتی ئەو مانایانە ، بۆ خوای زاناو شارەزا دەگێڕینەوە ، وە خوای پەروەردگار ئەو وشانەی بۆ هەندێ سیفەتی خۆی بەکارهێناون .

وە لەوبارەوە پرسیار کراوە لە (مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ) دەربارەی وشەی: (الإستواء) : (قيلَ لَهُ: يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ ! ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ۝٥﴾طه، كَيْفَ استوَى؟ فَقَالَ مَالِكٌ: الإستوَاءُ مَعْلُومٌ ، وَالْكَيْفُ مَجْهُولٌ، وَالإِيمَانُ بِهِ

وَاجِبٌ، وَالسُّؤَالُ عَنْهُ بِدْعَةٌ)[١]، واتە: گوترا: ئەی بابی عەبدوڵڵا ! کە خوا دەفەرمویێ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ۝٥﴾طه ، چۆن (استواء)ی کردوە ؟ مالیکیش فەرمووی: (إستواء) ماناکەی دیارەو زانراوە، بەڵام چۆنیەتییەکەی بۆ خوا نەزانراوە، (نازانین خوا چۆن چۆتە سەر عەرش ! چونکە کاتێك خوا هەبووە، هیچ شتێك نەبووە، نە کورسیو نە عەرش، وە خوا پێویستی بە جگە لە خۆی نیە، هەڵیبگری)، وە ئیمان بوون بەوە کە خوا چۆتە سەر عەرش ، پێویستەو پرسیارکردنیش لەوبارەوە شتێکی داهێنراوە.

ئنجا وشەی (استوَى) وەك (مختار الصحاح)[٢] هێناویەتی ، بە چەند واتایەك دێ، دەڵێ : (استوَى من اعوجاج، وَاستوَى عَلَى ظَهْرِ دَابَّتِهِ ، أَي استقَرَّ، وَاستوَى إِلى السَّمَاءِ قصد ، واستوَى أي استوْلَى وَظهر)، واتە :

١) شتێك لاربێتو دوایی ڕێك بێو ڕاست بێتەوە ، دەگوترێ : (استوَى).

٢) کەسێك سواری پشتی وڵاخەکەی دەبێ ، دەگوترێ : (استوَى عَلَى ظَهْرِ دَابَّتِهِ) ، واتە : نیشتەجێ بوو لەسەری .

٣) کە دەگوترێ : (وَاستوَى إِلى السَّمَاءِ) واتە: ویستی، ڕووی تێکرد.

٤) (واستوَى أي : استوْلَى وَظهر) وە (استوَى) بە مانای سەرکەوتنو دەستبەسەرداگرتنیش دێ.

ئەوانە هەموویان مانای وشەی (استوَى)ن، بەڵام وەك گوتمان کاتێك بۆ خوای بەرزو مەزن بەکاردێن، واتە: خوا چووە سەر عەرش، بەرز بۆوە بۆ سەر عەرش، بەڵام چۆن ؟ بە تەئکید وەك بەرزبوونەوەی شتێك بۆ سەر شتێكو ، نیشتەجێبوونی شتێك لە شتێك نیە ، کە ئێمە دەیبینینو دەیزانین، بۆچی ؟ چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ۝١١﴾ الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك وێنەی خوا نیە، ئەدی چۆنە ؟ چۆنیەتییەکەی

---

١) (التفسير الكبير للطبراني ، ج ٣ ، ص١٤٧ و ١٤٨).

٢) ص ٢٩٠.

تەنیا خوا دەیزانێ، بەڵام ئێمە دەڵێین: چوونە سەر عەرش یەکێکە لە سیفەتەکانی خوا، بەڵام چۆنیەتییەکەی ، وەك ئیمام مالیك گوتوویەتی: بۆ ئێمە نایەتە عەقڵەوەو دیارنیەو زانراو نیە، ئەگەرنا مانای (استوَى) بۆ ئێمە زانراوە کاتێك بەکاری دێنین، بەڵام کاتێك بۆ خوا بەکاری دێنین ، چۆنیەتییەکەی بۆ ئێمە زانراو نیە، گرنگ ئەوەیە دەزانین خوا چۆتە سەر عەرش بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیە، وە بەو واتایەی کە بۆ خوا شایستەیە، وە لێی دەوەشێتەوە، وە ئەوە یەکێکە لە سیفەتەکانی خوا ، وەك هەموو سیفەتەکانی دیکەی خوای بێ وێنە، کە بۆ ئێمە حەقیقەتیان زانراو نیە، چونکە مادام هیچ شتێك وەك زاتی خوا نەبێ ، کەواتە: هیچ سیفەتێك وەك سیفەتەکانی خوا نیە، وە سیفەتەکانی خوا ، وەك سیفەتەکانی هیچ کام لە دروستکراوەکان نین، کەواتە: نابێ هیچ کەس بە هیچ شێوەیەك ئەوەی بە دڵدا بێ ، کە وەك چۆن کەسێك دەچێتە سەر شتێك، کەسێك لەسەر کورسی دادەنیشێ، خوای بێ وێنەش ئاوا چۆتە سەر عەرش، چونکە خوای بالادەستو توانا ، نە پێویستی بە عەرشەو نە پێویستی بە جگە لە عەرشە، چونکە خوا هەر بووە، پێش ئەوەی عەرش هەبێ، وە عەرشو ئاسمانەکانو زەوی ، وەك خوا دەفەرموێ هەموویان خوا ڕایگرتوون : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤١﴾﴾ فاطر، واتە : خوا ئاسمانەکانو زەوی دەگرێ ، کە لەبەین بچنو لابچن ، وە ئەگەر لابچن ، بێجگە لە خوا کەس بۆی ناگیرێنەوە ، واتە : تەنیا خوا گرتوونیو دەیانپارێزێ، عەرشیش بە تەئکید پێویستی بە خوایە کە ڕایبگرێ، نەك خوا پێویستی بە عەرش بێ، تاکو خوا ڕابگرێ ، بەڵام کە خوا چۆتە سەر عەرش ، بە مانایەك کە شایستەیەتی بەکاری دێنین ، بێئەوەی کە مانای بۆ ئێمە دیاربێ ، بەڵام بە تەئکید ئەوە دەزانین کە خوا نە پێویستی بە عەرشەو ، نە پێویستی بە جگە لە عەرشیشە، وە هەموو دروستکراوەکان بە عەرشیشەوە پێویستییان بە خوای زاناو توانا هەیە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ : ﴿ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ ، بە خێرایی دوای دەکەوێ ، وە خۆرو مانگو ئەستێرەکان ، هەموویان بە فەرمانی خوا ڕامو دەستەمۆ کراون ، ئاگاداربن ! دروستکرانو فەرمان کردن ، هەر هی خوایە، پایەبەرزو بە پێزە خوای پەروەردگاری جیهانییان .

لەبەر تیشکی ئەم ڕستە قورئانییەدا بابەتێك دەخەینەڕوو :

# پوختەیەک لەبارەی بوونەوەرەوە

وەك لە سوورەتی (آل عمران)یش دا شتێكمان باس كرد ، لەكاتی تەفسیركردنی ئایەتی : ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ دا ، لێرەش حەزدەكەم پوختەیەك دەربارەی فراوانیی بوونەوەر ، وە دەربارەی ئاسمانەكانو زەوی بە تایبەت ، بخەینەڕوو :

١/ ئەوەی كە تاكو ئێستا بە دووربینو تەلسكۆبەكان بۆ گەردوون ناسان دەركەوتوە، دەڵێن: بەلای كەمەوە (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) سەد ملیار كەهكەشان، تاكو ئێستا دۆزراوەنەوە، كە دیارە وەك جاری دیكەش باسم كردوە، بە پێی قورئان كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ ﴿٥﴾ ﴾ الملك، واتە: ئاسمانی نزیك ئێوەمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، كەواتە: هەموو ئەو ئەستێرانەی كە كەهكەشانەكان پێكدێنن، دەبێ هەموویان لە سنووری ئاسمانی یەكەمدا بن، ئنجا سنووری ئاسمانی یەكەمیش لە كوێ كۆتایی دێ ؟ هەر خوا دەزانێ، تاكو ئێستا زانایان ئەوەیان بۆ نەدۆزراوەتەوە، ئنجا لە سەرووی ئاسمانی یەكەمیشەوە، شەش ئاسمانی دیكە هەن .

٢/ ئنجا لە هەر كام لەو سەد ملیار كەهكەشانەدا، بە گریمان سەد ملیار ئەستێرە هەیە، وە كەهكەشانی كاكێشانی خۆمان، كە بە عەرەبی پێی دەگوترێ : (مجرة درب التبّان)و بە ئینگلیزیی پێی دەڵێن: (milk way) واتە: ڕێی شیریی، بە فارسیش پێی دەڵێن: (راهی شیری)، كە لە كۆندا پێیان وابووە ڕێیەو شیری لێ ڕژاوە ، یان پێیان وا بووە ڕێیەو كای لێوە كێشراوەو ، كای لێ ڕژاوە، كەچی لە ڕاستییدا هەمووی كۆمەڵە ئەستێرەیە ، كە خۆر یەكێكە لە ئەستێرەكانی ، ئەو سەد ملیار ئەستێرەیە كە لەو

کاکێشـــانەدا هـــەن، کۆمەڵـــەی خـــۆریش دیـــارە نـــۆ خڕۆکـــەن : (زەوی، مـــەریخ، موشـــتەری، زوحـــەل، عەتـــارد، زوهـــرە ، ئـــۆرانـــۆس، نیبتـــۆن، بلـــۆتـــۆن) کـــە هـــەر نۆیـان پێکەوە پێیـان دەگـوترێ : کـۆمەڵەی خــۆر (المجموعة الشمسية) .

٣/ ئنجـــا قـــەبارەی خـــۆر، ئـــەم ڕۆژەی خۆمـــان کـــە یەکێکـــە لـــە ئەستێرەکـــانی کەهکەشـــانی کاکێشـــان، ملیـۆنێـــك‌و ســـێ ســـەد هـــەزار جـار هێنـدەی قـەبارەی زەوییـــە، واتـــە: ملیـۆنێـــك‌و ســـێ ســـەد هـــەزار زەوی وەك ئێمـــە ، لـــەنێو خـــۆردا جێگـەیان دەبێتـــەوە .

٤/ تیـرەی خۆرو کۆمەڵەی خۆر ، بریتیە لە دوازدە ملـیۆن کیلۆمـەتر، بـەڵام تیـرەی کەهکەشان نزیکەی یەك ملیۆن ترلیۆن کیلۆمەترە (١٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) وە تیشـکی کـەهکەشان لە نـزیکتـرین لایەوە ، سەدو پەنجا هەزار ساڵی پێدەچێ، هەتـا دەگاتـــە زەوی، ئنجـا تیشـك ســێ ســەد هـەزار کیلـۆمەتر لـە چرکـەیەکدا دەبـڕێ، کـەواتـە: سـێ سـەد هـەزار کیلۆمەتـر دەبـێ (جـاران)ی (٦٠) بکـرێ ، بـۆ ئەوەی بۆمان دەربکـەوێ ، لـە چرکـەیەکدا چەند دەبـڕێ، پاشان (جـاران)ی (٦٠) بکـرێ بۆ ئـەوەی بۆمان دەربکـەوێ ، لە سـەعاتێکدا چەند دەبڕێ، ئنجا (جـاران)ی (٢٤) بکرێ بۆ ئەوەی بۆمان دەربکـەوێ ، لـە ڕۆژو شـەوێکدا چـەند دەبـڕێ، ئنجـا (جـاران)ی (٣٦٥) بکرێ بۆ ئەوەی بۆمـان دەربکـەوێ ، لـە مـاوەی ساڵێکـدا چـەند دەبـــڕێ ، کـــە دەگـــاتە (٩,٤٦٠,٨٠٠,٠٠٠,٠٠٠) نـــۆ ترلـــیۆن‌و چوارســـەدو شـەســـت ملیـارو هەشـت سـەد ملیۆن کیـلۆمەتـر ، ئنجا بە ســەدو پەنجـا هـەزار ساڵی ئـاوا ، تیشکی کـەهکەشـان لە نـزیکتـرین لایـــەوە ، دەگـاتە زەوی !

٥/ زەوی سـەدو پەنجا ملیۆن کیلۆمەتر لـە خـۆرەوە دوورە، وە زەوی بـە سـێ سـەدو شـەســـت‌و پێنـــج ڕۆژو یـــەك لەســـەر چـــواری ڕۆژێـك جارێـك بـــە دەوری خـۆردا دەخـولێتـــەوە، بـــە خێرایـــی هـــەژدە مـــیل لـــە چرکـــەیەکدا ، وە شـەســـت‌و پێـنج هـەزار میـل لە سـەعاتێکـدا، کـە ئەوە خـێراییـەکی زۆر زۆرە .

٦/ ئنجـا زەوی بـە بیست‌و چـوار سـەعات جارێـك بـە دەوری خۆیـدا ، بـە خێرایـی هـەزار میـل لـە سـەعاتێکـدا دەسووڕێتـــەوە ، لـە بـەرانبـــەر خـۆردا، کـــە دیـارە سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خـۆردا ، دەبێتـــە هۆی پەیدابوونی چوار کـەشـەکـان ،

(واتە: هاوینو زستانو پایزو بەهار) وە سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەر خۆردا ، دەبێتە هۆی پەیدابوونی شەوو ڕۆژ، وە شایانی باسە : زەوی بە بیستو سێ پلەو نیو لە هێڵی یەکسانیی لایداوە ، وە بەو هۆیەوە چوار کەشەکان دروست دەبن ، ئەگەرنا تەنیا زستانو هاوینمان دەبوون ، ئەو ڕووەی کە دوورە لە خۆر ، دەبوو بە زستان، ئەوەی دیکەش دەبوو بە هاوین ، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە بیستو سێ پلە لارە لە هێڵی یەکسانیی (خط الإستواء) بۆیە چوار کەشەکان دروست دەبن .

٧/ پاشان ئەو دوو بەرگە ئاویی‌و هەواییەی کە دەوری زەوییان داوە، کە دیارە زەوی بە دوو بەرگ ، دەور پێچ کراوە :

<u>یەکەم</u> : بە بەرگێکی هەوایی کە ڕێژەی (٧٨ ٪) نایترۆجینە، وە ڕێژەی (٢١ ٪) ئۆکسجینە، وە لە سەدا سفرو لە دەیا سێی (٠,٣ ٪) دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە، وە ڕۆژانە بیست ملیۆن بەردی ئاسمانی بە خێرایی پەنجا کیلۆمەتر بەرەو زەوی دێن ، کە لە خرۆکەو ئەستێرەکان جیادەبنەوە، بەڵام هەوای دەوری زەوی هەموویان دەسووتێنێ، مەگەر جار جار یەکێك لەوانە کە دەڵێن ئەوە پارچە نیازیکێکە، پارچە بەردێکە ، بکەوێتە سەر زەوی .

<u>دووەم</u> : سێ لەسەر چواری زەوی بە بەرگی دووەم دەورە دراوە ، کە ئاوە .

هەڵبەتە دەگونجێ زۆر شت لە بارەی بوونەوەرو ئاسمانەکانو زەوییەوەو ئەوەی لە زەویدا هەیە ، باس بکرێ[1].

**<u>مەسەلەی چوارەم</u>:** کە دەفەرموێ: ﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾، واتە : لە پەروەردگارتان بە کڕووزانەوەو پەنهانیی بپاڕێنەوە،

---

١) بڕوانە : (مبادىء الكونيات أمين محمد أحمد كعورة، ط ٣) ، وە (الذرة والكون لبيار روسو) ، وە (وأساسيات الفيزياء إعداد: فا بوش) وە (مع الله في السماء أحمد زكي) وە (الكون) لايف المكتبة العلمية .

چونکە ئەو سنوور بەزێنانی خۆشناوێن، وە لە زەویدا دوای ئەوەی خوا چاکی دروست کردوە(و پڕی کردوە لە نازو نیعمەت) خراپەکاریی مەکەن، وە لە خوا بپارێنەوە بە ترس و هیواوە ، بێگومان بەزەیی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە.

دیارە لەم دوو ئایەتەدا ، خوای بەرزو مەزن فەرمانمان پێدەکات کە لێی بپارێینەوە، وە چوار ئەدەبی گەورەو گرنگی پاڕانەوەمان فێر دەکات، جا ئێمە بەم بۆنەوە باسێکی کورت لە بارەی دووعاوە دەکەین :

باسێك دەربارەی :

# گرنگی وپایەی پاڕانەوە و ئەدەبەکانی و، خۆ دوورگرتن لە تێپەڕاندن

**یەکەم : چەند ئایەتێکی قورئان لەبارەی لە خوا پاڕانەوەوە :**

١) خوای بێ هاوتا فەرموویەتی : ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ٦٠ ﴾غافر ، واتە : پەروەردگارتان فەرمووی: لێم بپاڕێنەوە ، وەڵامتان دەدەمەوە ، بێگومان ئەوانەی لە بەرانبەر بەندایەتیی کردن بۆ مندا خۆیان بە زل دەگرن ، بە زەبوونیی دەچنە دۆزەخەوە .

٢) لە سوورەتی (البقرة)دا هەر لە بارەی پاڕانەوەوە خوای بەرزو مەزن دەفەرمویٚ :

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ ١٨٦ ﴾البقرة ، وە هەر کاتێك بەندەکانم لەبارەی منەوە پرسیاریان لێکردی (واتە: لە تۆ ئەی موحەممەد ﷺ) ئەوە (با بزانن کە) من نزیکم، وەڵامی داواکەر دەدەمەوە ، هەر کات لێم بپاڕێتەوە ، دەجا با ئەوانیش بە دەنگمەوە بێن و بڕوام پێ بێنن ، بەڵکو سەر ڕاست بن .

٣) لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ : ﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾، واتە: لە پەروەردگارتان بە کڕووزانەوەو لالانەوەو پەنهانیی بپاڕێنەوە ، چونکە بێگومان ئەو سنوور شکێنانی خۆشناوێن .

٤) هەر لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ : ﴿ وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًاۚ إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾، واتە: وە لە خوا بپاڕێنەوە بە ترس و هیواوە، بێگومان بەزەیی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە .

٥) لە سووڕەتی (النمل)دا دەفەرموێ : ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلۡمُضۡطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكۡشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجۡعَلُكُمۡ خُلَفَآءَ ٱلۡأَرۡضِۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾، واتە: یان ئایا کێ وەڵامی بابای بێ دەرەتان و ناچار دەداتەوە ، کاتێك کە لێی دەپاڕێتەوە، خراپەی لادەبات و لە نارەحەتیی دەربازی دەکات، وە دەتانکاتە جێنشین لەسەر زەوی و دەتانهێڵێتەوە، ئایا لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی دیکە هەیە ؟ بێگومان بە کەمیی بیر دەکەنەوە.

**دووەم : چەند فەرموودەیەك کە گرنگیی و گەورەیی دووعایان تێدا دەبینرێ :**

فەرموودەی یەکەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿إنَّ الدُّعَاءَ هُوَ العِبَادَةُ﴾ {رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٢٨)، عَنْ النُّعمَانِ بنِ بَشيرٍ رضي الله عنه، وَحَسَّنهُ الألباني في (سنن أبي داود)}، واتە: پاڕانەوە خودی خوا پەرستییە.

فەرموودەی دووەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ لَمْ يَدْعُ اللهَ، سُبْحَانَهُ غَضِبَ عَلَيْهِ﴾ {رَوَاهُ ابن ماجه برقم: (٣٨٢٧)، عَنْ أبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٣٦٥٤)}، واتە: هەر کەسێك لە خوا نەپاڕێتەوە ، خوا لێی تووڕە دەبێ .

بۆچی هەرکەسێك داوا لە خوا نەکاتو لێی نەپاڕێتەوە ، خوا لێی تووڕە دەبێ ؟! چونکە دیارە خۆی بێ نیاز دەبینێ لە خوا !!

فەرموودەی سێیەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدْعُو بِدَعْوَةٍ لَيْسَ فِيهَا إِثْمٌ وَلاَ قَطِيعَةُ رَحِمٍ، إِلاَّ أَعْطَاهُ اللَّهُ بِهَا إِحْدَى ثَلاثٍ: إِمَّا أَنْ تُعَجَّلَ لَهُ دَعْوَتُهُ، وَإِمَّا أَنْ يَدَّخِرَهَا لَهُ فِي الآخِرَةِ، وَإِمَّا أَنْ يَصْرِفَ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلَهَا﴾ {رَوَاهُ البُخَارِيُّ فـي (الأدَب المفرد) برقم: (٧١٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٨١٦)، وَوَافَقَهُ الذَّهَبِي، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدريّ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (المشكاة) برقم: (٢٢٥٩)} ، واتە: هیچ مسوڵمانێك نیە لە خوا بپاڕێتەوە بە پاڕانەوەیەك، پاڕانەوەکە لە خودی خۆیدا گوناح نەبێت (شتێکی بێ جێو گوناح نەبێ) وە مایەی پچڕانی پەیوەندیی خزمایەتیی نەبێ (چونکە خوا لەگەڵ گوناحو ناشەرعیی دا نیە) ئەوە خوا ﷻ یەکێك لە سێ شتان بۆ ئەو بەندەیەی خۆی دەکات :

١ - یان ئەو شتەی داوای دەکات یەکسەر بۆی جێبەجێ دەکات .

٢ - یاخود بۆی هەڵدەگرێو پاداشتەکەی لە دواڕۆژدا دەداتەوە .

٣ – یان بەقەدەر ئەو شتە باشەی کە داوای کردوە، خراپەیەکی لێ لادەدات (داوای شتێکی باشی کردوە، خوا شتە باشەکەی بۆ ناکات ، حیکمەتی خوا وا ناخوازێ، بەڵام بەقەدەر ئەو شتە باشە یاخود زیاتر ، خوا خراپەو بەلای لێ لادەدات).

فەرموودەی چوارەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿يُسْتَجَابُ لأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٣٤٠) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٨٦٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٤٨٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٣٨٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٥٣)، وَمَالِك برقم: (٥٠٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٩٧٥)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه} ، واتە: یەکێك لە ئێوە وەڵامی دەدرێتەوە، ئەگەر پەلە نەکات {ئنجا ئایا پەلە کردنەکەی چۆنە ؟ دوو سێ جار بپاڕێتەوە ، بڵێ زۆر لە خوا پاڕامەوە، بەڵام وەڵامی نەبووو خوا شتەکەی بۆ نەکردم} .

فەرموودەی پێنجەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٤٨٢)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٨٧٥)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (١١٣٧)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (١٩٢٨)} واتە: ئەو کاتەی بەندە کڕنووشی بردوە ، لە هەموو کاتێك زیاتر لە پەروەردگاری نزیکترە، بۆیە زۆر بپاڕێنەوە لە کاتی کڕنووش بردندا.

فەرموودەی شەشەم: ﴿عن أَبي أمامة رضي الله عنه قَالَ : قيل لِرسول اللهِ ﷺ : أَيُّ الدُّعَاءِ أَسْمَعُ؟ قَالَ: جَوْفَ اللَّيْلِ الآخِرِ، وَدُبُرَ الصَّلَوَاتِ المَكْتُوبَاتِ﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٤٩٩) قال الشيخ الألباني: حسن}، واتە: ئەبو ئومامە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ : بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوترا: چ دووعایەك باشتر دەبیسترێو گیرا دەبێ (لەلایەن خواوە ؟) فەرمووی: نیوەڕاستی کۆتایی شەو، (واتە: قووڵایی بەشی کۆتایی شەو) وە لە دوای نوێژە فەرزەکان .

کە زۆربەی زانایان وایان لێکداوەتەوە مەبەست ئەو کاتەیە کە تەحییات دەخوێنیو تەواو دەبێ لە تەحییات ، ئنجا دووعاو پاڕانەوە بکرێ ، نەك دوای سەلامدانەوەی نوێژ وەك زۆر لە مسوڵمانان کردوویانە بە عادەت ، دوای تەواوبوونی نوێژ لەجیاتی تەسبیحاتو وێردەکانیش ، یەکسەر دەست بەرز دەکەنەوە !

فەرموودەی حەوتەم: ﴿عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ : لَمَّا غَزَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ "حُنَيْنَاً" أَوْ قَالَ لَمَّا تَوَجَّهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى حُنَيْنٍ ، أَشْرَفَ النَّاسُ عَلَى وَادٍ فَرَفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّكْبِيرِ: اللَّهُ أَكْبَرُ ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ ! ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، إِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبَاً، إِنَّمَا تَدْعُونَ سَمِيعَاً قَرِيبَاً وَهُوَ مَعَكُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم : (٦٤٠٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٧٠٤) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٤٨٤)} واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ : کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگی حونەینی کرد ، یان گوتی : ڕووی کردە جەنگی حونەین، خەڵك چوونە شیوێكو بە دەنگی بەرز تەکبیریان دەکرد دەیانگوت: (اللَّهُ أَكْبَرُ ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) پێغەمبەری خواش فەرمووی : ئەی خەڵکینە ! بەزەییتان بە خۆتاندا بێتەوە، یان زۆر خۆتان ئەزیەت مەدەن، چونکە ئەوەی ئێوە لێی دەپاڕێنەوە ، نە کەڕەو نە نادیارە،

بێگومان ئێوە لە کەسێك دەپاڕێنەوە کە نزیکەو لەگەڵتانە (کە خوای پەروەردگارە) .

مانای وشەی (ارْبَعُوا) : (أَرْبَعَ الغَيْثُ إِرْبَاعَاً : حَبَسَ النَّاسَ فِي رِبَاعِهِم لِكَثْرَتِهِ فَهُوَ مُرْبِعٌ) (المصباح المنير، ص١١٤) کەواتە: (ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ) واتە: زۆر تێمەپەڕێنن ، خاتری خۆتان بگرن، چونکە (أَرْبَعَ الغَيْثُ إِرْبَاعَاً) واتە: باران هێندە باری کە خەڵکی لە شوێنەکانی خۆیان حەپس کرد، لەبەر باران خەڵك ڕێی نەبوو هاتووچۆ بکات .

فەرموودەی هەشتەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿سَيَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ﴾ {أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَةَ بِرقم: (٢٩٤١٠)، وَأَحْمَد بِرقم: (١٤٨٣)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (١٤٨٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني في "صحيح الجامع" بِرقم: (٣٦٧١)}، واتە: کۆمەڵێك دێن زێدەڕۆیی دەکەن لە پاڕانەوەدا.

ئێستاش لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتو فەرمایشتانەدا ، لە سێ تەوەرەدا ، باسی لە خوا پاڕانەوە دەکەین :

## یەکەم: گرنگیی و پێگەی لە خوا پاڕانەوە:

١/ لە ئایەتی (٦٠)ی سووڕەتی (غافر)دا خوا فەرمانی پێکردووین، کە لێی بپاڕێینەوە، وە گفتیشی پێداوین، کە وەڵاممان دەداتەوە، وەك دەفەرمویٚ : ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ ﴾، پاشان ڕایگەیاندوە، کە پاڕانەوە بریتیە لە خواپەرستیی، بۆیە دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾، بێگومان ئەوانەی خۆبە زل دەگرن لە بەرانبەر بەندایەتیی کردن دا بۆ من ، ئەوە بە دڵنیاییی بە زەبوونیی دەچنە دۆزەخەوە . کەواتە: وەك گوتمان : پاڕانەوە ئەوپەڕی بەندایەتییە ، وە هەر کەسێکیش لە بەرانبەر پەرستنی خوادا خۆی بە زل بگریٚ، بە زەبوونیی و بچووکیی دەچێتە دۆزەخەوە.

کەواتە: پاڕانەوەو لالانەوە بەرانبەر خوا ، شتێکی زۆر گەورەو گرنگە، وە نەپاڕانەوە لەبەر خواو نەپەرستنی ، داخوازی ئەوە دەکات، ئەو کەسە بە زەبوونیی‌و بچووکیی بچێتە دۆزەخەوە .

٢/ وە خوای بەخشەر لە ئایەتی (١٨٦)ی سوورەتی (البقرة)دا هەر لەبارەی پاڕانەوەوە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِى وَلْيُؤْمِنُواْ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ واتە: وە هەر کاتێك بەندەکانم لەبارەی منەوە پرسیاریان لێکردی (واتە: لە تۆ ئەی موحەممەد ! ﷺ) ئەوە (با بزانن کە) من نزیکم، وەڵامی داواکەر دەدەمەوە ، هەر کات لێم بپاڕێتەوە، دەجا با ئەوانیش بە دەنگمەوە بێن‌و بڕوام پێ بێنن، بەڵکو سەر ڕاست بن .

٣/ وە پێغەمبەری خوا ﷺ خواپەرستیی لە پاڕانەوەدا کورت هەڵهێناوە، وەك فەرموویەتی : ﴿إنَّ الدُّعَاءَ هُوَ العِبَادَةُ﴾ {رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٢٨)، عَنْ النُّعمَانِ بنِ بَشيرٍ ﷺ، وَحَسَّنَهُ الألباني في (سنن أبي داود)}، واتە: پاڕانەوە خودی خوا پەرستییە .

٤/ هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێداوین ، کە پاڕانەوەی هیچ مسوڵمانێك زایە نابێ‌و ، مسۆگەر خوا لە یەکێك لە سێ شتانی بۆ دەکات، وەك پێشتر لە فەرموودەکە هێنامان، کە فەرمووی: ﴿مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدْعُو بِدَعْوَةٍ لَيْسَ فِيها إِثْمٌ وَلاَ قَطِيعَةُ رَحِمٍ، إِلاَّ أَعْطَاهُ اللَّهُ بِها إِحْدَى ثَلاثٍ: إِمَّا أَنْ تُعَجَّلَ لَهُ دَعْوَتُهُ، وَإِمَّا أَنْ يَدَّخِرَها لَهُ فِي الآخِرَةِ، وَإِمَّا أَنْ يَصْرِفَ عَنْهُ مِنْ السُّوءِ مِثْلَها﴾ {رَوَاهُ البُخَارِيُّ في (الأدَب المفرد) برقم: (٧١٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٨١٦)، وَوَافَقَهُ الذّهَبي، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدريّ ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (المشكاة) برقم : (٢٢٥٩)}، واتە : هەر مسوڵمانێك لە خوا بپاڕێتەوە بە پاڕانەوەیەك ، پاڕانەوەکە لە خودی خۆیدا گوناح نەبێ ، وە مایەی پچڕانی پەیوەندیی خزمایەتی نەبێ ، ئەوە مسۆگەر خوا یەکێك لە سێ شتان بۆ ئەو بەندەیەی خۆی دەکات : یان ئەو شتەی داوای دەکات یەکسەر بۆی

جێبەجێ دەكات ، یاخود بۆی هەڵدەگرێو پاداشتەكەی لە دوارِۆژدا دەداتەوە، یان بەقەدەر ئەو شتە باشەی كە داوای كردوە، خراپەیەكی لێ لادەدات .

## دووەم : ئەدەبەكانی لە خوا پارِانەوە :

١و٢) بە گەردن كەچییو ئاتاجییو ، پەنهانیی لە خوا پارِانەوە : وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةً ﴾، واتە : لە پەروەردگارتان بپارِێنەوە بە لالانەوەو كرِووزانەوە ، وە بە پەنهانیی ، واتە: نە بە لووت بەرزییو ، نە هاواركردنو قیرِەو دەنگی بەرز ، مەگەر لە هەندێك حاڵەتی هەلاوێردراودا، كە مرۆڤ تینی بۆ دێ ، ئەوە جیایە .

٣و٤) بە ترسو ئومێدەوە لە خوا پارِانەوە : وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًا ﴾، واتە : وە لە خوا بپارِێنەوە بە ترسو هیواوە ، هەم ترست لەوە هەبێ ، خوا سزات بدات ، هەم ئومێدت هەبێ بە بەزەیی خوا ، یاخود ترست هەبێ كە خوا وەلامت نەداتەوە لەبەر كەموكورِییەكانی خۆت ، وە هەم ئومێدت هەبێ ، كە وەلامت دەداتەوە ، لەبەر بەزەییو بەخششی بێ سنووری خۆی .

٥) دڵنیابوون لە وەلامدرانەوەی داواكەی : وەك لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دا هاتوە، فەرموویەتی : ﴿ادْعُوا اللَّهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالإِجَابَةِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٦٦٥٥)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٣٨٢٨)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَحَسَّنَهُ الأَلبَانِي}، واتە: لە خوا بپارِێنەوە ، لە كاتێك دا كە دڵنیان وەلام دەدرێنەوە.

ئنجا چۆن دەبێ دڵنیا نەبین ! ئەوە نیە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ ﴿٦٠﴾ ﴾غافر ، واتە : پەروەردگارتان فەرموویەتی : لێم بپارِێنەوە ، وەلامتان دەدەمەوە، بێگومان خوا راست دەفەرموێ : ﴿ وَمَنۡ أَصۡدَقُ

مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا ﴿٨٧﴾﴾النساء ، ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا ﴿١٢٢﴾﴾النساء ،
قسەی کێ لە هی خوا ڕاستترە ؟ هی کەس !

٦) پەلە نەکردن لە وەڵامدانەوەی خوا : وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتەکەدا فەرمووی : ﴿يُستجَابُ لأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَمْ يُستجَبْ لِي﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٣٤٠) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٨٦٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٤٨٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٣٨٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٥٣)، وَمَالِكٌ برقم: (٥٠٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٩٧٥)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه) واتە: یەکێك لە ئێوە وەڵامی دەدرێتەوە، ئەگەر پەلە نەکات {ئنجا ئایا پەلە کردنەکەی چۆنە ؟ دوو سێ جار بپاڕێتەوە، بڵێ زۆر لە خوا پاڕامەوە ، بەڵام وەڵامی نەبوو، شتەکەی بۆ نەکردم، ئیدی واز لە پاڕانەوە بێنێ} .

٧) هەڵبژاردنی کاتە گونجاوەکان : وەك پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کراوە ، لەوبارەوە: ﴿عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ! أَيُّ الدُّعَاءِ أَسْمَعُ ؟ قَالَ : جَوْفَ اللَّيْلِ الآخِرِ وَدُبُرَ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٤٩٩)، وَقَالَ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَالنَّسائِيُّ فِي "الكُبرَى" برقم: (٩٩٣٦)، وَحَسَّنَهُ الأَلبَانِي) واتە: ئەبو ئومامە خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : گوترا : ئەی پێغەمبەری خوا ! کام دووعا باش دەبیسترێو وەڵام دەدرێتەوە ؟ فەرمووی : قووڵایی کۆتایی شەو ، وە دوای نوێژە فەرزەکان .

٨و٩) دەست بەرزکردنەوەو ڕووکردنە کەعبە: بەڵگەش بۆ دەست بەرزکردنەوە زۆرن:

أ/ یەکیان ئەم فەرموودەیە: ﴿عَنْ سَلْمَانَ الفَارِسِي رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى حَيِيٌّ كَرِيمٌ، يَستحيي إِذَا رَفَعَ الرَّجُلُ إِلَيْهِ يَدَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْراً خَائِبَتَيْنِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٧٦٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٥٥٦) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيب، وَالحَاكِمُ برقم: (١٩٦٢)، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَين، وَالبَيْهَقِيُّ برقم: (٢٩٦٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٤٨٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٧٦)}، واتە: سەلمانی فارسیی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای بەرز بە شەرمو بەڕێزە، شەرم دەکات

ئەگەر پیاوێك دەستەكانی بەرز بكاتەوەو لێی بپاڕێتەوە ، ڕەتیان بكاتەوە ، بە بە تاڵیی ، واتە : مسۆگەر وەلامی دەداتەوە.

ب / بەڵگەیەكی دی لەسەر دەست بەرزكردنەوە: ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لاَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ إِلاَّ فِي الإِسْتِسْقَاءِ، وَإِنَّهُ يَرْفَعُ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ إِبْطَيْهِ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٩٨٤) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢١١٣)}، واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ لە هیچ پاڕانەوەیەك دا دەستی بەرز نەدەكردەوە ، مەگەر لە پاڕانەوەی باران بارین كردن دا، لەوكاتەدا هێندەی دەست بەرز دەكردنەوە ، تاكو سپیایی بن هەنگڵانی دەبینرا.

ئنجا ئەمە یانی چی ؟ واتە: لە هیچ دووعایەكدا هێندە دەستی بەرز نەكردۆتەوە، ئەگەرنا زۆر فەرموودەی دیكەمان هەن كە پێغەمبەر ﷺ دەستی بەرزكردۆتەوە، ئەوەی پێشێ كە ڕابرد، ئەوەی كە ئێستاش دێ، ئەدی مەبەست چییە ؟ یانی: هێندەی لە كاتی دووعای باران بارین دا دەستی بەرز دەكردەوە ، لە هیچ دووعایەكی دیكەدا هێندە دەستی بەرز نەكردەوە، هەڵبەتە ئەوە ئەنەسی كوڕی مالیك وای بینوە، ئەگەرنا دەگونجێ لە كاتی دیكەدا دەستی زیاتریش بەرز كردبێتەوەو ، ئەو نەیدیبێ ! بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە.

ج/ ﴿عَنْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَابِ قَالَ لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ نَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَهُمْ أَلْفٌ وَأَصْحَابُهُ ثَلاَثُمِائَةٍ وَتِسْعَةَ عَشَرَ رَجُلاً ، فَاسْتَقْبَلَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ الْقِبْلَةَ ثُمَّ مَدَّ يَدَيْهِ فَجَعَلَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ: (اللَّهُمَّ أَنْجِزْ لِي مَا وَعَدْتَنِي، اللَّهُمَّ آتِ مَا وَعَدْتَنِي، اللَّهُمَّ إِنْ تَهْلِكْ هَذِهِ الْعِصابةَ مِنْ أَهْلِ الإِسْلاَمِ لاَ تُعْبَدْ فِي الأَرْضِ)، فَمَازَالَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ مَادًّا يَدَيْهِ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ حَتَّى سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ مَنْكِبَيْهِ، فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ فَأَخَذَ رِدَاءَهُ ، فَأَلْقَاهُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ الْتَزَمَهُ مِنْ وَرَائِهِ، وَقَالَ : يَا نَبِيَّ اللَّهِ كَفَاكَ مُنَاشَدَتُكَ رَبَّكَ، فَإِنَّهُ سَيُنْجِزُ لَكَ مَا وَعَدَكَ

فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ : ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي

مُمِدُّكُم بِأَلْفٖ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ ﴾ الأنفال، فَأَمَدَّهُ اللَّهُ بِالْمَلَائِكَةِ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٧٦٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٨١)، وَالبَزَّار برقم: (١٩٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٧٩٣)} واتە: عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا لە جەنگی بەدردا تەماشای هاوبەش دانەرەکانی کرد، ژمارەیان هەزار بوو، وە تەماشای هاوەڵەکانی کرد، سێ سەدو ئەوەندە کەسە بوون ، بۆیە ڕووی کردە قیبلەو دەستەکانی درێژ کردن، وە دەستی کرد بە هاوار لە خوا بەستن‌و پاڕانەوە لە خوا، (وا پێدەچێ دەنگی بەرز کردبێتەوە ، چونکە دەنگەکەی بیستراوە)، دەیفەرموو: ئەی خوایە ! ئەو بەڵێنەی پێت داوم بۆم بێنە دی، ئەی خوایە ! ئەو گفتەی پێداوم بۆم جێبەجێ بکە ! ئەی خوایە ! ئەگەر ئەو کۆمەڵە لە بەین بچن ، تۆ لەسەر زەوی ناپەرستریی، (واتە: ئەوەی کە من لە ماوەی سێزدە ساڵی مەککەو دوو ساڵی مەدینەدا پەروەردەم کردوون ، ئەوەندەن، ئنجا ئەگەر ئەوان لەبەین بچن، مانای وایە تۆوی ئیسلام دەبڕێتەوە، بۆیە خوایە بەزەییت پێماندا بێتەوە) بۆیە بەردەوام هاواری دەکردە پەروەردگاری: دەستی بەرزکردبوونەوەو ڕوو بە ڕووگە ، هەتا عەبایەکەی لەسەر شانی کەوتە خوار ، بۆیە ئەبو بەکر هات عەبایەکەی خستە سەر شانی‌و، دوایی لە پشتڕا لە باوەشی کردو گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! بەسە، زۆر لە پەروەردگارت پاڕایەوە، بێگومان ئەو بەڵێنەی پێی داوی ، بۆت جێبەجێ دەکات، ئیدی لەوکاتەدا خوای زاڵی پایەدار ئەم ئایەتەی ناردە خوار : ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٖ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ ﴾ الأنفال ، واتە: یاد بکەنەوە ! کاتێك لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوە، ئەویش وەڵامی دانەوەو فەرمووی : من بە هەزار لە فریشتەکان کە هی دیکەشیان بە دوادا دێن ، کۆمەکیی ئێوە دەکەم‌و یارمەتیتان دەدەم ، وە بە فریشتان پشتگیریی کرد .

د/ (إبن رجب الحنبلي ) لە لاپەڕە (٢٢٢)ی (جامع العلوم والحكم)دا دەڵێ : (وَقَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فِي صِفَةِ رَفْع يَدَيْهِ فِي الدُّعَاءِ ،

أَنْوَاعٌ مُتَعَدِّدَةٌ) ، واتە: وە لە دەربارەی چۆنیەتی دەست بەرزکردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە کاتی پاڕانەوەدا چەند جۆرێك (لە دەست بەرز کردنەوە) گێڕدراوەتەوە .

١٠) تووكو دووعا نەکردنی خراپ : لە کوردەوارییدا کە دەڵێین: تووك، واتە: دووعای خراپ ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی : ﴿لاَ يَزَالُ يُستجَابُ لِلْعَبْدِ مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ، أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ ، مَا لَمْ يَستعْجِلْ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٧٣٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٨١)} واتە : بە بەردەوامیی وەڵامی بەندە دەدرێتەوە ، مادام بۆ شتێك نەپاڕێتەوە ، کە گوناح بێ، یاخود پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی بێ، بە مەرجێك پەلە نەکات.

١١) خۆ دوورگرتن لە حەرام : کەسێك بیەوێ خوا وەڵامی دووعاکانی بداتەوەو بە هانایەوە بێ ، دەبێ خۆی لە هەموو شتێکی حەرام بپارێزێ، لە پۆشاکی حەرام، لە خواردنو خواردنەوەی حەرام ، لە پارەوماڵی حەرام ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ طَيِّبٌ لاَ يَقْبَلُ إِلاَّ الطَّيِّبَ وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ ، قَالَ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ٥١﴾ المؤمنون ، وَقَالَ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ١٧٢﴾ البقرة ، ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ ، يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ يَا رَبِّ ! يَا رَبِّ ! وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَقَدْ غُذِّيَ بِالْحَرَامِ ، فَأَنَّى يُستجَابُ لَه﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٣٣٠) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (١٠١٥) ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٨٩) ، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٧١٧))، واتە: بێگومان خوا پاكو چاکە، وە شتی پاكو چاکیش نەبێ وەرناگرێ ، وە بێگومان خوای بەرز فەرمانی کردوە بە بڕواداران ، بە هەمان شت کە فەرمانی پێ بە پێغەمبەران کردوە، بە پێغەمبەرانی فەرمووە : ئەی پێغەمبەران! لە ڕزقە پاكو چاکەکان بخۆن، وە کردەوە باشەکان ئەنجام بدەن ، وە خوای بەرز فەرموویەتی : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! لە ڕزقە پاكو چاکەکانی کە پێمان داون بخۆن، دوایی

پێغەمبەر ﷺ باسی جۆرە پیاوێکی کردوە، کە سەفەری دوورو درێژ دەکات، چڵکنە، قژو مووی هاتوون ، وە تۆزاوییە ، دەستیش درێژ دەکات بۆ ئاسمان (دەپاڕێتەوە ، دەڵێ :) ئەی پەروەردگارم ! ئەی پەروەردگارم ! بەڵام : خواردنەکەی حەرامە، خواردنەوەکەی حەرامە ، پۆشاکەکەی حەرامەوە ، وە جەستەکەی بە حەرام پێگەیوە، ئا ئەمە چۆن وەڵامی دەدرێتەوە ؟!

١٢) خۆ ڕازاندنەوە بە چاکەکاریی ، ئینسانی بڕوادار ئەگەر بیەوێ دووعایەکەی لە لای پەروەردگار گیرا بێ ، دەبێ هەوڵبدات بە گشتی چاکەکاربێ، چونکە خـوای پەروەردگـار فەرموویـەتی : ﴿إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾﴾ الأعراف ، واتە: بێگومان بەزەیی خوا لە چاکەکاران نزیکە ، کەواتە: ئێمە بە ئەندازەی ئەوە کە لە چاکەکارییدا دەبین ، هەم لە پەیوەندییمان لەگەڵ خوادا ، وە هەم لە پەیوەندییمان لەگەڵ خەڵك دا ، بێگومان خوای پەروەردگاریش دووعاکانمان وەردەگرێ .

## سێیەم: خۆ دوورگرتن لە تێپەڕاندن لە پاڕانەوەدا:

خـوای پەروەردگـار دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾﴾ المائدة، واتە: سنوور شکێنیی مەکەن، خوا سنوور شکێنانی خۆشناوێن.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ وەك پێشتریش هێنامان، فەرموویەتی: ﴿سَيَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ﴾ {أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٢٩٤١٠) ، وَأَحْمَد برقم : (١٤٨٣)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (١٤٨٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الجامع) برقم : (٣٦٧١)} ، واتە: کۆمەڵێك دێن زێدەڕۆیی دەکەن لە پاڕانەوەدا .

١ - ئنجا تێپەڕاندن ، دەگونجێ لە نێوەڕۆکی پاڕانەوەدا بێ ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ﴿لاَ يَزَالُ يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ ، أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ ، مَا لَمْ يَسْتَعْجِلْ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم : (٢٧٣٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٨٨١)}، واتە : بە بەردەوامیی وەڵامی بەندە دەدرێتەوە ، مادام بە شتێك نەپاڕێتەوە کە

گوناح بێ ، یاخود پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی بێ ، بە مەرجێك پەلە نەكات .

كەواتە : ئەگەر كەسێك پاڕانەوەیەكی كرد ، كە لە خودی خۆیدا حەڕام بوو ، بۆ وێنە: تووكی لە مسوڵمانێك كرد ، تووكی لە خزمێك كرد، یان بڵێ: خوایە ! باران نەبارێنی، یان پاڕانەوەكەی دەبووە هۆی پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، یان دەبووە هۆی خراپ بوونی لەگەڵ كەسو كارو دەوروبەری دا، ئەوە لە ڕووی نێوەڕۆكەوە ، تێپەڕاندنە .

جۆرێكی دیكەی تێپەڕاندن لە نێوەڕۆكی دوعادا ، ئەوەیە كە ئینسان پێچەوانەی یاساكانی خوا لە ژیانی دنیادا بپارێتەوە، بۆ وێنە : زۆرجار لە مامۆستایانی ئایینیم بیستوە دەڵێن : خوایە هەژار نەهێڵی ، هەرچی هەژارەو كرێچییە ، خانووی دەستبكەوێ ، خوایە ! هەرچی بێوەژنو قەیرە كچە ، شوویان دەستبكەوێ ، خوایە ! هەرچی قەرزدارە ، قەرزی بۆ بدەیەوە ، خوایە ! هەرچی نەخۆشە ، شیفای بدەی ، خوایە ! هەر كەسێك هەر پێویستییەكی هەیە ، بۆی جێبەجێ بكەی !

كە بێگومان ئەو دوعایانە پێچەوانەی یاساكانی خوای كاربەجێن، خوای پەروەردگار ئەم ژیانی دنیاییەی داناوە بۆ تاقیكردنەوە، كەواتە: هەژارو بێوەژنو كرێچییو ساغو نەخۆش ... هتد ، هەر دەبن ، هەڵبەتە من لێرەدا پاساو ناهێنمەوە بۆ واقیعێكی ناشەرعیی ، كە لە ئەنجامی ستەمو گەندەڵییو نادادگەرییدا ، خەڵكێك كونجە خانوویێكی دەست ناكەوێ، ئەوی دیكەش ڤێللای هەیە، لەسەر حیسابی خەڵكو ، لەسەر زەوی كشتوكاڵو بە موڵكو ماڵی خەڵك ! قسەم لەوە نیە ، مەبەستم ئەوەیە كە ساغیيو نەخۆشیی هەر دەبێ ، هەژارییو نەدارییی هەر دەبێ ، كەموكوڕیی لە ژیانی بەشەردا هەر دەبێ .

ئنجا كەسی وا هەیە دەپاڕێتەوە دەڵێ : خوایە ! هەرچی كافرە نەیهێڵی، ژنەكانیان بێوەژن بكەی، منداڵەكانیان هەتیو بكەی، دایكیان جەرگ سووتاو بكەی !! كە بێگومان هیچ كام لە پێغەمبەران دوعای وایان نەكردوە ، جگە لە نووح سەلامی خوای لێ بێ ، كە دوعای لە گەلەكەی كرد، وەك خوا ﷻ

دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ ﴾ نوح، واتە: نووح گوتی: خوایە ! هیچ کام لەو کافرانە لەسەر زەوی مەهێڵە، بەلام دوایی پاساوی هێنایەوەو، گوتی : ﴿ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ ﴾ نوح ، واتە : ئەگەر تۆ لەسەر زەوی بیانهێڵیەوە ، بەندەکانت " یانی : ئەو وەچەیەی تازە پێڕادەگەن" ئەوانیش گومڕا دەکەن ، وە ئەوانە وا لە کوفردا ڕۆچوون ، ئەوانەی کە لێشیان وەپاش دەکەوێ لە مندالْ ، هەر سپڵەو بێبڕوایە، کەواتە: تەواو لێی حالْی کراوە ، کە ئەو گەلە کەڵکیان نەماوەو ، خێریان پێوە نەماوە، بۆیە فەرموویەتی : خوایە گەسکێکیان لێ بدەو ، سەر زەوییان لێ پاك بکەوە ، بۆ ئەوەی وەچەیەکی پاك و چاك لە مرۆڤ بێتە دی ، بەلْێ جگە لە نووح ، کە ئەویش خوا هەوالْی پێداوە : گەلەکەت خێریان پێوە نەماوە ، ئەگەرنا کەس دوعای وای نەکردوە .

ئیدی تۆ چ ڕەوای هەقە دوعای وا بکەی ؟ کە بە دلْنیاییش هیچی قبوولْ نابێ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ... ﴿٣﴾ ﴾ التغابن ، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە ئێوەی دروست کردوە، هەتانە کافرەو هەشتانە بڕوادارە.

ئەم دنیایە دەبێ تاکو ڕۆژی دوایی ، کافرو مسولْمانی تێدا هەبن .

بەلْێ ئەو جۆرە پاڕانەوەیە ، جگە لەوەی تێپەڕاندنە لە نێوەڕۆکی پاڕانەوەدا ، پێچەوانەی یاساو سوننەتی خوای دادگەریشە .

٢ – وە لە ڕووی شێوازەوە ، دەبێ پاڕانەوە (دعاء) بە شێوەیەکی ڕێك و پێك بێ ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەکەی پێشیدا فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ! ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، إِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبًا، إِنَّمَا تَدْعُونَ سَمِيعًا قَرِيبًا وَهُوَ مَعَكُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٦٤٠٩)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٧٠٤)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (١٤٨٤)} ، واتە: ئەی خەلْکینە! بەزەییتان بە خۆتاندا

بێتــەوە، یـان زۆر خۆتـان ئەزیـەت مەدەن، چونکـە ئەوەی ئێوە لێی دەپاڕێنـەوە ، نـە کـەڕەو نـە نادیـارە، بێگومـان ئێـوە لـە کەسـێك دەپاڕێنـەوە ، کـە نـزیکـەو لەگەڵتـانە {کە خـوای پەروەردگـارە } .

کــەواتە: لــە ڕووی شـێوازیشــەوە، نابـێ مسـوڵمان زۆر دەنـگ هەڵبــڕێو هــاوار بکـات، بــە تایبــەتی هەنـدێك دوعــا دەکـرێن، کــە زۆر گریــانو هــاتو هــاواری سەیریـان لەگــەڵ دا دەکــرێ ، کــە مـن زۆر تێبینیـیم لەســەریان هەیـە، چونکـە پێغەمبـەران کاری وایـان نەکـردوە، دوعـا دەبـێ بـە لالانەوەو کڕووزانـەوەوە بـێ ، لەبـەر خۆتـەوە، وە بـە پەنهانیـی .

٣ – هەروەهــا لــە ڕووی چەندێتییــەوە، دیســان نابــێ زێدەڕۆیــی لــە پاڕانــەوەدا بکـرێ ، وەك پێشــتـریش ئـاماژەم پێدا، هەنـدێ مـەلا کردوویانــە بــە عـادەتو ، هــەموو ڕۆژانـی جـومعــە چەنـد دوعـایەکـی دوورو درێــژ، دووبـارە دەکـەنەوە، هەڵبـەتـە دەگونجـێ دوعـا بکەی بۆ کەسـێك، یـان چـەند کەسـێکی دیارییکـراو، کـە کێشـەیەك، یان نەخۆشـییەکی دیارییکـراویان هەیـە، بەڵام تـۆ بڵێی : خـوایە ! هـەر کـەس نەخۆشیی هەیـە ، شیفای بـدەی ، وە هـەر کـەس گرفتـی هەیـە ، بـۆی چارەسـەر بکـەی ، ... هتد ، ئەوە پێچەوانەی یاساکان (سـنن)ی خـوایــە ، بۆیـەش باسـی ئەوە دەکـەم ، چونکـە دوایـی خەڵك بـەد گومان دەبێ بـەهـۆی وەرنەگیــرانی ئـەو جـۆرە دوعـایانــەوەو، نازانــێ کــە ئـەو جـۆرە دوعـاکردنــە ناشـەرعییــە، وە نائومێـد دەبـێ لە ڕەحـمو بەخششـی خـواو، ڕەنگـە بڵـێ: چـەند ساڵـە بـەبیـرم دێ لە مەککەو مەدینــە، لــە مزگـەوتـی حــەڕامو مزگـەوتی پێغـەمبــەر ﷺ ئـەو مەلایـانە : نیو سـەعات، سـێ چارەگ دوعـا دەکـەن، ئەو هەموو خەڵکەش دەڵێـن: ئــامین، کەچــی دنیــاش هــەروەك خۆیــەتیو حاڵــی مســوڵمانانیش هــەر وەك خۆیەتـی : نـە مسـوڵمانان سـەرکـەوتوونو ، نـە کـافر ژێرکـەوتوونو ، نـە هـەژار دەوڵـەمەنـد بوونو ، نـە نەخۆشـەکـانیش هەموویان چـاك بوونـەوە !! بــەڵام بــۆ هەر یەکێك لەوانــە ، دەبێ هۆکـاری تایبـەتـی خـۆی هەبــێ، بۆ نەخۆشـیی دوای پـاڕانــەوە ، دەبـێ ســەردانی پزیشـك بکـرێ، وە بـۆ دەوڵــەمەندبوون ، دەبـێ کـارو کەسـابــەت بکـرێ ، وە بـۆ سـەرکــەوتن بەســەر کــافران دا ، دەبـێ هۆکـارەکـانی سـەرکەوتن لەلایـەن مسـوڵمـانـانەوە بگیـرێنـە بـەرو ئەنجام بدرێـن ... هتد.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾، وە خراپەکاریی لە زەوییدا مەکەن ، دوای ئەوەی کە چاك کراوە ، ئەمە یانی چی ؟ واتە: خوای کاربەجێ ئەم زەوییەی باش دروست کردووە، پڕی کردوە لە خێرو بێرو نازو نیعمەت، جوان هەڵیخستووە، پڕی کردوە لە هەموو ئەو پێداویستییانەی کە ژیانی مرۆڤ پەکی لەسەریان کەوتوە ، ئەوە لە دوای ئەوە ، مرۆڤەکان پێداویستییەکانی خۆیان لەسەر زەوی و ژێر زەوی دا دەدۆزنەوە ، کاتی خۆی نەیاندەزانی نەوت بە کەڵکی چی دێ ؟ غازی ژێر زەوی و ، خەڵووزی بەرد سوودیان چییە ؟ بەڵام کاتێك کە زانییان و توانییان سوودیان لێ ببینن، ئەوجار دۆزییانەوە، تاکو ئەو کاتە ، خوای پەنهانزان لە ژێر زەوی دا بۆی هەڵگرتبوون، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا ... ﴿١٠﴾ ﴾فصلت، بۆیە من پێم وایە ئەوەندەی خوا مرۆڤان لەسەر زەوی دەخوڵقێنێ، ئەوەندەش پێداویستیی و خواردنیان بۆ دابین دەکات ، چونکە کارەکانی خوا هەموویان بەجێن و بە ئەندازەن، وەك پیرەمێرد دەڵێ :

کاکە خوا کاری نابەجێ ناکا

تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

بەڵێ خوا هەر هێندە بەشەران دەخوڵقێنێ ، کە ڕزق بەشیان بکات، دەشزانێ چەندی ڕزق داناوە، وە دەشزانێ چەندان دەخوڵقێنێ ! بەڵام ئەوەی وا دەکات خەڵك لە برسان بمرێ و خەڵك لە بەریان ببڕێ، ئەو زێدەڕۆیی و لەسەرەوە ڕژانەی ستەمکارەکانە، ئەوان لەسەریان ڕژاوە ، بۆیە هەندێك لە بەریان بڕاوە، ئەوە نادادگەریی و تێکچوونی هاوسەنگیی وا دەکات، هەندێ لە وڵاتانی ئەورووپا ئەو دانەوێڵەو کاڵایانەی بەرهەمی دێنن و لێیان زیاد دەبێ ، دەیخەنە نێو دەریا ، بۆ ئەوەی هەم کارگەکانیان لە کارنەکەون ، وە هەم داخوازیی

زیاتریان لەسەر بێ ، چونکە بە پێی بنچینەی : ڕانواندنو داواکردن (عرض و طلب) هەر شتێك لە بازاڕ کەم بێ ، داخوازیی زیاتری لەسەر دەبێ ، ئەوە بەنسبەت خۆراکەکانیانەوە .

بەنسبەت چەکەکانیشانەوە ، ئەگەر زۆر بوون ، شەڕێك هەڵدەگیرسێنن ، لە نێوان مسوڵمانان دا، وەك ئێستا دەیبینین، بۆ ئەوەی عەمبارەکانی خۆیان چۆڵ بکەنو پارەکانی ئەوانیش بەرنو، یەکدیشیان پێ قەلاچۆ بکەن، ئنجا دوایی کە یەکدییان کوشت، داوایان لێ بکەنو (تشبُّث)یان پێ بکەن : ئەرێ نایەن ئاشتمان بکەنەوەو ، صوڵحێکمان دا لە نێوان بکەن ؟ بەڵێ ، ئا ئەوەیە کە ژیانی بەشەری لەسەر زەوی تێکداوە ، ئەگەرنا لە ئەسڵدا ئەو ڕزقو ڕۆزییەی کە لەسەر زەوی هەیە ، بەشی مرۆڤەکانی سەر زەوی دەکات، چونکە خوا هەموو شتەکان بە ئەندازەگیریی دروست دەکات ، وەك دەفەرموێ : ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ۝٢﴾ الفرقان ، واتە : وە (خوا) هەموو شتێکی دروست کردووەو ئەندازەشی بۆ داناوە .

دیارە خراپەکاریی لە زۆر ڕووەوە دەکرێ ، لە ڕووی فیکرییو عەقیدەییەوە، لە ڕووی ئابوورییەوە، لە ڕووی ڕەوشتییەوە، لە ڕووی سیاسییەوە، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لە ڕووی ئاساییشەوە، واتە: هەر کارێك دژی ژینو دینی خەڵك بێو، دینو ژینی خەڵك بخاتە مەترسییەوە ، پێی دەگوترێ : خراپەکاریی (فساد) خوای پەروەردگاریش ڕێگریی لە هەموو جۆرەکانی خراپەکاریی (فساد) کردووە فەرموویەتی : ﴿وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ... ۝٥٦﴾ الأعراف.

**مەسەلەی شەشەم :** کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، بێگومان بەزەیی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە، کەواتە: بە چاکەکاریی لەگەڵ خواو خەڵکدا ، شایستەی بەزەیی خوا دەبین، یانی : کێ دەیەوێ زیاتر بەزەییو بەخششی خوای لێ نزیك بێ ، با هەوڵبدات چاکترو

چاکەکارتر بێ، چاکتر بێ لەلای خوا، بەو مانایەی بەندایەتیی چاك بۆ خوا بکات، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکراوە دەربارەی (إحْسان) فەرموویەتی : ﴿الإحْسانُ : أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَراهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَراهُ فَإِنَّهُ يَراكَ﴾ {رَواهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٠)، عَنْ عُمَرَ بْنُ الخَطابِ ﷺ}، واتە: (إحْسان) ئەوەیە خوا بپەرستی وەك ببینی، {کاتێ کە خوا دەپەرستی بە چاوی دڵ ببینی}، یان بە لای کەمەوە ، هەست بکەی کە ئەو تۆ دەبینێ، کەواتە: لە عیبادەتیشدا ئیحسان هەیەو ، چاك خوا پەرستنیش ئیحسانە.

وە دەبێ مرۆڤ لەگەڵ خەڵکیش دا چاك بێ ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾، وە چاکە بکەن بێگومان خوا چاکەکارانی خۆش دەوێن ، وە فەرموویەتی : ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا ﴿٨٣﴾﴾ البقرة، وە قسەتان لەگەڵ خەڵك خۆشبێ .

بەڵێ ، بە ئەندازەی ئەوە کە ئینسان لەگەڵ خواو لەگەڵ خەڵك دا چاك دەبێو ، چاکەکار دەبێ، بەزەیی خوای لێ نزیك دەبێ، ئەوەش سوننەتی خوایە.

ئنجا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: حیکمەتی چییە کە خوا دەفەرموێ : ﴿إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، وە بۆچی نەیفەرمووە : (قَرِيبةٌ مِنَ المُحْسِنِين) چونکە (رحمة) ، (مؤنث)ە ؟ چەند جۆرە وەڵامێکیان داونەوە :

١) هەندێك دەڵێن : مەبەست لە (رحمة) پاداشتو چاکەیە، هەندێکیش دەڵێن: مەبەست پێی چاکەیە، واتە: پاداشتو چاکەی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە، واتە: خوا چاکە لەگەڵ کەسێك دەکات کە ئەویش چاکەکار بێ، ئنجا وشەی (إحسان)و (ثواب)یش دیارە (مذكَّر مَجازي)ین ، یاخود مەبەست پێی (إيتاء الخَير)ە، خێر بەخشین ، کە ئەویش هەر (مذكَّر)ە.

٢) وە هەندێك دەڵێن : مەبەستی پێی باران (مطر)ە ، کە ئەویش (مذكَّر)ە .

٣) وە هەندێکیش گوتوویانە : یانی : (وَقْتَ رَحْمَةِ اللّه) کاتی بەزەیی نواندنی خوا ، یاخود (مَكانَ رَحْمَةِ اللّه) واتە : شوێنی بەزەیی نواندنی خوا .

ئنجا دەڵێ : (والقرب حقيقته دنوُّ المجال ويطلق على الجار مجازاً ، يقال : هذا قريبٌ، أي : ممكن مرجوٌ)، وشەی (قرب) لە ئەسڵدا بریتیە لەوەی کە شتێك لە شتێك نزیك بێ، وە جاری وایە بە مەجاز بە مانای دراوسێ دێ، دەگوترێ: ئەو شتە نزیکە، یانی : ئومێدی لێ دەکرێ کە پەیدا ببێ.

بۆیەش خوای پەروەردگار وشەی (رحمة)ی بە (قريب) هێناوە ، چونکە مانای ئومێد پێبوونو نزیکی دەگەیەنێ .

وە (فرَّاء) و (أبو عبيدة) گوتوویانە: (إنَّ قَرِيباً أَو بَعِيداً إِذَا أُطْلِقَ عَلَى قَرَابَةِ النَّسَبِ أَوْ بُعدِ النَّسَبِ ، فَهُوَ مَعَ المُؤَنَّثِ بتَاءٍ وَلَابُدَّ، وَإِذَا أُطْلِقَ عَلَى قُرْبِ المَسَافَةِ أَوْ بُعْدِهَا ، جَازَ فِيهِ مُطابَقَة مَوْصُوفِه ، وَجَازَ فِيهِ التَّذْكِير عَلَى التَّأْوِيل بالمَكانِ، وَهُوَ الأَكْثَرُ، قَالَ اللّه تَعَالَى: ﴿وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ۝٨٣﴾ هود، وَقَالَ: ﴿لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ۝٦٣﴾ الأحزاب)[1]، واتە: هەر کام لە وشەی (قريب) و (بعيد) ئەگەر بۆ نزیکیو دووریی خزمایەتیی بەکاربێ ، ئەوە هەمیشە دەبێ بە (تاء) بێ، بەڵام ئەگەر بۆ دووریی یان نزیکیی ماوەو مەسافە بەکاربێ ، ئەوە دەگونجێ مادام وەسفکراو (موصوف)ە (مؤنث) بێ ، ئەوانیش وەك وی بن ، بەڵام دەشگونجێ کە بە تەئویلی ئەوە کە (قريب) واتە : شوێنەکەی نزیکە ، یان کاتەکەی نزیکە، بە (مُذَكَّر) بێ ، کە ئەوەش زیاتر بەکاردێ ، وەك خوای بەرز فەرموویەتی : ﴿وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ۝٨٣﴾ هود ، وَقَالَ : ﴿لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ۝٦٣﴾ الأحزاب ، خوا باسی (سزا) دەکات کە (مؤنث)ە کەچی فەرموویەتی: ﴿وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ

---

١) التحرير والتنوير، ج ٨ ، ص ١٧٦ و ١٧٧، والطبري ج ٨، ص٢١٦.

﴿ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾ ﴾ یانی : شوێنەکەی ، یان کاتەکەی لە ستەمکارانەوە نزیکە، هەروەها دەفەرموێ: تۆ چووزانی، دەبینی کە کاتی هاتنی کۆتایی دنیا (ساعة)، نزیکە، دەبوو فەرمووبای : (قريبة) بەلاّم کاتو شوێنی هاتنی مەبەست بووە ، بۆیە بە (مذکر) هاتوە (قريباً) .

**مەسەلەی حەوتەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَـٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾.

لەم ئایەتە بەپێزەدا ، خوای پەروەردگار دەیەوێ جارێکی دیکە پێناسەی خۆی بکاتەوەو خۆی بە بەندەکانی بناسێنێ ، بە یەکێك لە نیشانە هەرە دیارەکانی دەستەلاّتو بەزەییو پەروەردگارێتیی خۆی ، کە بریتیە لە باراندنی باران، وە رواندنی رووەكو شینایيو دارو درەخت :

سەرەتا دەفەرموێ : ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى ﴾ واتە: وە ئەو (خوا) کەسێکە، زاتێکە ﴿ يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ ﴾، بایەکان دەنێرێ ، واتە: وە بایەکان بە پێی یاسای خۆی دەنێرێ، ئیدی ئەگەر کەسێك نەفامو نەزان نەبێ ، نالّێ ئەدی بۆچی دەستی خوا نابینم ، کە با دەنێرێ ؟ یان بۆچی فریشتەیەك نانێرێ فوو بکات ؟ نەخێر ، خوا کارەکان بە پێی یاساکانی خۆی دەکات : لە شوێنێك فشاری هەوا کەم دەبێ ، لە شوێنێکی دیکە زۆر دەبێ، وە سەرەنجام با هەڵدەکاتو دێ، ئەوە یاسای خوایە، کەواتە: خوا ئەم کارە دەکات .

﴿ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ﴾، واتە: موژدەدەرن لە پێش دەستی بەزەییەکەی خۆی دا، کە مەبەست لە بەزەییەکەی ئەو ئاوەیە کە دێتە خوار، کە ئەویش سێ جۆرە: یان بەفرە، یان بارانە، یان تەرزەیە، دیارە (بُشْراً) بە (نُشْراً)یش خوێنراوەتەوە، واتە: بلاّویان دەکاتەوە .

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابٗا ثِقَالٗا ﴾، هەتا كاتێك ئەو بایانەی كە خوا دەیاننێرێ ، هەوری قورسیان هەڵگرتن ، (سحاب) كۆی (سحابة)یە یانی : هەور ، (ثقال)یش كۆی (ثقِیلَة)یە، واتە: هەورە قورسەكانیان هەڵگرتن ، ئنجا ئایا كەی هەور قورس دەبێ ؟ دیارە كاتێك بارانی هەڵگرتبێ ، ئنجا دوای ئەوەی چی لێ دەكات ؟ دەفەرموێ : ﴿ سُقۡنَٰهُ لِبَلَدٖ مَّيِّتٖ فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ ﴾، پاڵی دەدەین بۆ زەوییەكی مردوو قاقڕو دێمەكار، ئاوی لێ دەنێرینە خوار، وە بەو ئاوە لە هەموو میوەیەكی پێ دەڕوێنین .

ئنجا ئەگەر یەكێك بڵێ : بۆچی خوا دەفەرموێ : ﴿ سُقۡنَٰهُ لِبَلَدٖ مَّيِّتٖ ﴾، خۆ (سَحَابٗا ثِقَالٗا) مێینەیە (مؤنث)ەیە؟ وەڵامەكەی ئەوەیە كە : بە ئیعتیباری جنسی هەور، كە (مذكَّر)ە، ڕاناوەكەی بە (مُذَكَّر) هێناوە .

لە كۆتایی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ : ﴿ كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾ وەك چۆن دوای ئەوەی ئەو زەوییە مردبوو ، شوێنەواری ژیانی لێ نەمابوو، بەڵام دوای ئەوەی خوای پەروەردگار بایەكانی ناردن ، لە پێش دەستی هەورەكاندا، ئنجا هەورەكان ئاویان هەڵگرتو ناردیانە خوار، كە بەهۆیەوە هەموو جۆرە گژوگیاو درەختێكی ڕوواند، ئێوەش بەهەمان شێوە هەر كاتێك خوا ویستی ، ئاوا لە زەوی دەرتاندێنیێو، زیندووتان دەكاتەوە، ئەو ڕاستییەشمان بۆیە ڕوونكردەوە : تاكو پەند وەربگرنو بیر بكەنەوە ، كە زیندووكردنەوەی ئێوەش لە لای خوا زۆر ئاسانە .

<u>**مەسەلەی هەشتەمو كۆتایی**</u> : كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗاۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ ﴾، وە زەوی بە پیتو پێز ڕووەكەكەی بە مۆڵەتی پەروەردگاری دەڕوێ .

ئنجا ئەو ڕووەکە : سەوزەیە ، دانەوێڵەیە ، میوەیە ، دارو درەختە ، هەرچی هەیە ، هەمووی بەپێی یاساکانی خوا دەڕوێ ، بۆ وێنە : خوا داینـاوە کە ئەو دەنکە تۆوە ، یان ئەو دەنکە میوەیە ، دەبێتە دوو بەش ، بەشێکی دەبێتە چەکەرەو ، پاشان ڕووەك یان نەمامو بەرز هەڵدەچێ ، وە بەشێکی دەبێتە ڕەگو ڕیشەو بە زەویدا دێتە خوار ، ئنجا ئینسان تا سەرنجی بداو لێی وردبێتەوە ، زانایی‌و دەسەڵاتی خوای تێدا دەبینێ .

﴿ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ﴾، بەڵام زەوی پیس‌و بێ خێر ، کەمێك نەبێ لێی نایەتە دەرو بەروبووم سەوز ناکات، یانی : تەنیا شتی بێ کەڵك سەوز دەکات، یاخود تەنیا کەمێك لەو شتەی کەڵکی هەیە ، سەوزی دەکات ، هەردوو مانایەکەی هەن .

کە دەفەرموێ : ﴿ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە ئایەتەکانی خۆمان دەخەینەڕوو ، بۆ کۆمەڵێك کە سوپاسگوزار بن ، دیارە خوا ئایەتەکانی خۆی بۆ هەموو بەشەر ناردوون، ئەدی بۆچی لێرەدا فەرموویەتی : ﴿ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ﴾ ؟

چونکە هەر ئەوان لێی بەهرەمەند دەبن ، هەر وەفادارانو سوپاسگوزارانو بە ئەمەگان بۆ خوا، ئەوانەی چاکەکانی خوا دەبینن ، هەر ئەوانە پەند وەردەگرن ، لەو نیشانانەی خوا جۆراو جۆر دەیانخاتە ڕوو، کە هەر جارەی بە تامو چێژێکی جیاو ، بە ڕەنگو بۆنێکی جیا، وە بە مەبەستێکی جیا ، با هەر یەك حەقیقەتیش بێ ، جاری وایە خوای کاربەجێ لە سەد شوێن دا باسی یەك حەقیقەتی کردوە، بەڵام هەر جارەی بە شێوازێك ، وە هەر جارەی مانایەکی تازەو تایبەتی تێدایە، جیا لەوانەی پێشێ .

ئنجا وەك پێشتریش باسمان کردوە : وشەی (آية) کە لە ئەسڵی زمان دا بە مانای نیشانە (علامة) : نیشانەیە لە قورئان دا ، بە سێ واتایان هاتوە :

١) بە مانای موعجیزە، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ...﴿١٠١﴾ ﴾الإسراء، واتە: ئێمە نۆ موعجیزەی ڕوونو ئاشکرامان بە مووسا

دابوون، کە دووانیان گۆچانەکەی و دەستی بوون، وە حەوتی دیکەش بوون، وەك لەم سوورەتی (الأعراف)دا باسکراوەو ،دوایی دەیگەینێ .

٢) مانایەکی دیکەی (آیة) بریتیە لە دیاردەو دیمەنە سروشتییەکان ، کە خوا دروستی کردوون ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾﴾يوسف، واتە: زۆر نیشانە لە ئاسمانەکانو زەویدا هەن ، بە لایاندا تێپەڕ دەبن ، لە حاڵێك دا کە سەرنجیان نادەن ، واتە : زۆر دیاردەی دروستکراو هەن ، کە دیمەنی سەرنج ڕاکێشن ، بەڵام تەماشایان ناکەن.

٣) مانای سێیەمی (آیة) بریتیە لە ڕستەکانی قورئان، یان بە شێوەکی گشتی ڕستەکانی فەرمایشتی خوای زانا لە کتێبە ئاسمانییەکان دا ، دیارە ڕستەکانی قورئانیش ئەوانیش خوا بە ئایەتی داناون ، وەك دەفەرموێ : ﴿... وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا... ﴿٢﴾﴾الأنفال ، واتە : وە ئەگەر ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا خوێنرانەوە، ئیمانیان پێیان زیاد دەبێ، کە مەبەست پێی ڕستەکانی قورئانە .

کۆتایی ئەم دەرسەش بەم فەرموودەیە دێنین، کە لەو ئایەتەوە زۆر نزیکە ، ﴿عن أَبِي مُوسى، عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم ، قَالَ : مَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللهُ بِهِ مِنَ الْهُدَى وَالْعِلْمِ، كَمَثَلِ الْغَيْثِ الْكَثِيرِ، أَصابَ أَرْضا، فَكانَ مِنْها نَقِيَّةٌ قَبِلَتِ الْماءَ فَأَنْبَتَتِ الْكَلأَ وَالْعُشْبَ الْكَثِيرَ ، وَكانَ مِنْها أَجادِبُ أَمْسَكَتِ الْماءَ ، فَنَفَعَ اللهُ بِها النَّاسَ ، فَشَرِبُوا وَسَقَوْا وَزَرَعُوا ، وَأَصابَتْ مِنْها طائِفَةً أُخْرَى، إِنَّما هِيَ قِيعانٌ لاَ تُمْسِكُ ماءً، وَلاَ تُنْبِتُ كَلأً ، فَذلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقِهَ فِي دِينِ اللهِ وَنَفَعَهُ مَا بَعَثَنِي اللهُ بِهِ، فَعَلِمَ وَعَلَّمَ ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذلِكَ رَأْسا وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم : (٧٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٨٣)}، واتە : وێنەی ئەو ڕێنماییو زانیارییەی کە خوا منی پێ ناردوە ، وەك بارانێکی زۆرە کە لەسەر زەمینێك دەباری : ئنجا بەشێکی (ئەو زەوییە) بە پیتو پێزە ،

وە گژو گیاو لەوەڕی زۆر دەڕوێنێ، وە بەشێکیش ڕەقو سەختەو ئاوەکە لە خۆیدا ڕادەگرێو کۆی دەکاتەوەو ، سەرەنجام خوا خەڵکی لێ بەهرەمەند دەکات : لێی دەخۆنەوەو ، ئاژەڵی پێ ئاو دەدەنو ، کشتوکاڵی پێدەکەن ، وە بەشێکیشی گۆملایی یە : نە ئاوەکە کۆ دەکاتەوەو ، نە لەوەڕیش دەڕوێنێ ، ئنجا ئەوە وێنەی کەسێکە کە لە ئاییني خوادا شارەزا دەبێو ، ئەوەی خوا منی پێ ناردوە لێی بەهرەمەند دەکات : فێر دەبێو فێر دەکات ، وە وێنەی کەسێکە کە سەری بەرز نەکردۆتەوەو ، ئەو ڕێنماییەی خوا پێیدا ناردووم ، وەری نەگرتوە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەوتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی (٥٩ تاکو ٦٤) ، واتە: (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی ، وەك پێناسەی نێوەڕۆکی ئەم شەش ئایەتە، دەڵێین: خوای پەروەردگار لەم شەش ئایەتەدا باسی نووح ﷺ دەکات، لەگەڵ گەلەکەیدا کە چی فەرمووە ؟ وە چی کردوە ؟ وە سەرەنجامی خۆیو گەلەکەیو ئەوانەی کە شوێنی کەوتوونو ، ئەوانەی کە دژی وەستان ، چۆن بووە ؟

ئنجا بێگومان بەسەرهاتی نووح ﷺ، خوای کاربەجێ وەك بەسەرهاتی سەرجەم پێغەمبەرەکانی دیکە ، لە چەند سوورەتێکی دیکەی قورئانیشدا خستویەتە ڕوو، بەڵکو یەکێك لە سوورەتەکانی قورئان بە ناوی (نوح)ەوە ناونراوە، کە سوورەتی (نوح)ە، وە ژمارەی ئایەتەکانی (٢٨)ە.

هەروەها لە سوورەتی (هود)یشدا خوا ﷻ بیستو پێنج (٢٥) ئایەتی بۆ تەرخان کردوە، کە پانتاییەکەیان لە هی سوورەتی (نوح) زیاترە، بۆیە ئێمە خوا پشتیوان بێ، وە تەمەن باقی بێ ، لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (هود)دا بە تێرو تەسەلی ، باسی بەسەرهاتی نووح ﷺ دەکەین لەگەڵ گەلەکەیدا، لەبەر تیشکی کۆی ئەو ئایەتانەدا کە لە قورئاندا لەوبارەوە هاتوون، وەك عادەتی خۆمان لەبارەی توێژینەوەی بەسەرهاتی هەر کام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لەگەڵ گەلەکەیاندا، هەموو ئەو ئایەتانەی دیکە لە سوورەتەکانی دیکەدا هاتوون، لە هەر شوێنێك بە چاکمان زانی بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرەو گەلەکەی بتوێژینەوە، هەموو ئایەتەکان دێنین، چونکە بێگومان بە هەموویان وێنەیەکی زۆر ڕوونو ئاشکرامان دەست دەکەوێ ، لە ژیانو بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرە (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ

وَالسَّلاَم) لەگەڵ گەلەکەیدا، بۆیە ئێمە قسەی تێرو تەسەل‌و تویژینەوەی چڕو پڕی خۆمان دەربارەی نووحو گەلەکەی ، بۆ سوورەتی (هود) هەڵدەگرین .

ئنجا ئەوەی لەم شەش ئایەتەدا باسکراوە ئەوەیە کە نووح ﷺ وەك سەرجەم پێغەمبەرانی دیکە ، بانگی خوا بەیەکگرتن‌و تەنیا خوا پەرستنی ، بە گوێی گەلەکەیدا داوە، وە قسە ڕۆیشتووان‌و زلە زلەکانی گەلەکەی ، یەکسەر تۆمەتباری دەکەن ، بە گومڕا بوون، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە کە گومڕا نیە، بەڵکو ڕەوانەکراوی خوای پەروەردگارە ، هاتوە دڵسۆزانە پەیامی خوایان پێ ڕابگەیەنێ ، بەڵکو پارێزکار بن، واتە: لە دنیادا بپارێزرێن لە گوناهباریی‌و عەیبداریی، وە لە دواڕۆژیشدا بپارێزرێن لە شەرمەزاریی‌و ڕیسوایی‌و ، سزاو جەزرەبەی دادگەرانەی خوای دادگەر.

وە پێیان دەڵێ : ئەگەر بێت‌و پەیامی خوا وەربگرن ، ئەوە دەبێتە مایەی ئەوە کە خوا بەزەیی پێتان دا بێتەوە ، لە دواڕۆژدا ، بەڵام ئەوان هەر لەسەر بیرو ڕای خۆیان بەردەوام دەبن ، وە سەرەنجام نووحو ئەو خەڵکە کەمەی کە شوێنی کەوتوون {کە خوا لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٤٠﴾﴾ ، تەنیا کەمێك نەبێ شوێنی نەکەوتن} سواری ئەو کەشتییە دەبن کە نووح ﷺ بە فەرمانی خوا دروستی کردوە ، وە تۆفانێکی زۆر گەورە دێ ، وە ئەوان (واتە : نووحو شوێنکەوتووانی) دەرباز دەبن بە سواری کەشتییەکەو، ئەوانی دیکەش هەموویان دەخنکێن‌و ، سەر زەوییان لێ پاك دەکرێتەوە.

﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ
إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٥٩﴾ قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي
ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٦٠﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ
﴿٦١﴾ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٢﴾
أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمۡ
تُرۡحَمُونَ ﴿٦٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ
بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾﴾ .

# مانای وشــە بە وشەی ئایەتەکـان

((بێگـومان ئێمـە نـووحمان بـۆ لای گەلـەکـەی نـارد ، گـوتی : ئـەی گەلەکـەم ! خـوا بپەرستن ، جگە لـەو هیچ پەرسـتـراوی دیکە(ی شایسـتـەی پەرسـتـران)تان نیـن ، مـن لە سزای ڕۆژێـکی مـەزن لێتـان دەترسـم ﴿٥٩﴾ قسـە ڕۆیشـتووانی گەلـەکـەی گـوتیـان : بـەڕاسـتی ئێمـە لـە گـومڕاییـەکی ئـاشـکرادا دەتبینیـن ﴿٦٠﴾ "نـووح" گـوتی : ئـەی گەلەکـەم ! هـیچ گـومڕاییـەك لـە منـدا نیـە ، بـەڵام مـن لـە لایـەن پەروەردگـاری جیهانەکـانەوە بـۆ لاتـان ڕەوانـە کـراوم ﴿٦١﴾ پەیامەکـانی پەروەردگـارمتـان پـێ ڕادەگـەیـەنـم، وە دڵسـۆزییـتان بـۆ دەکـەم ، وە مـن لـە خـواوە شـتێك دەزانم کـە ئێـوە نایزانن ﴿٦٢﴾ ئـایا پێتـان سـەیر بـوو : بـە پیـاوێکدا لـە خۆتـان بیـرخەرەوەیـەکـتان لـە پەروەردگـارتـانـەوە بـۆ بـێ ، تاکـو وریاتـان بکاتـەوەو بتـانتـرسێنـێ ، وە "سـەرەنجـام بـەهـۆی وەرگرتنـی پەیامەکـانی خـواوە" پـارێز بکـەنو ، بـەڵکـو بـەزەییـتـان لەگـەڵ بنـوێنـرێ ؟ ﴿٦٣﴾ لە ئـاکـامـدا پێـی بێبـڕوا بـوون، وە ئێمـەش خـۆیو ئەوانـەی لەگـەڵـی بـوون ، لـە کـەشـتییـدا دەربـازمان کـردنو ، ئەوانـەش کـە بڕوایـان بـە ئـایـەتاکـانمـان نەهێـنـا ، خنکـانـدمـانن ، بێگـومـان ئـەوان کـۆمەڵێـکی کـوێر دڵ بوون ﴿٦٤﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(إِلَٰهَ) : (إسمٌ لِكُلِّ مَعبُودٍ) ناوە بۆ هەر پەرستراوێك، چ بە هەق بپەرستریٚ ، كە تەنیا خوایە، چ بە ناهەق بپەرستریٚ ، كە هەموو ئەو شتانەن كە لە جیاتی خوا، یان لەگەڵ خوادا ، دەپەرسترێن، ئنجا ئایا وشەی (إِلَٰهَ) لە چییەوە هاتوە ؟

١/ لە : (أَلِـهَ)ەوە : (أَلِـه فُلانٌ يَأْلَـهُ إلاهَـةً: أي عَبَدَ يَعْبُدُ عِبادَةَ) لەوەوە هاتوە واتە : پەرستی، دەپەرستیٚ ، پەرستن .

٢/ یان لە : (أَلَـهَ)ەوە هاتوە ، بە مانای (تَحيَّر) سەرسام بوو .

٣/ یاخود لە : (لاهَ يَلُوهُ لِيَاهَاً)ەوە، هاتوە بە واتای (احْتَجَبَ)، پەنهان بوو، چونكە خوا ﷻ پەنهانە.

(ٱلْمَلَأُ ) (المَـلأُ : جَماعَـةٌ يَجْتَمِعُـونَ عَلَـى رَأْيٍ، فَيَمْلَـؤُونَ العُيُـونَ رِواءً وَمَنْظَـراً، وَالنُّفُوسَ بَهَاءً وَجَلالاً ، وَالمَقصودُ بهِ: سُراة القَوْمِ وَأَشرافه) واتە: (مَلأ) كە من بە دەست ڕۆیشتووان یان قسە ڕۆیشتووانم تەفسیر كردوە ، واتە : (ملأ)ی هەر كۆمەڵێك ئەوانەن كە لە نێو خەڵكدا قسەیان دەڕواو ، دەستیان دەڕواو ، ئەمرو نەهییان بە دەستە، لەوەشەوە هاتوە كە چاوی خەڵك پڕ دەكەن لە ترس و سام و ڕێزو هەیبەت، وە دڵەكان پڕ دەكەن لە بەهاو شكۆ .

(وَأَنصَحُ لَكُمْ ) : (النّصُحُ: تَحَرّي فِعْلٍ أَوْ قَوْلٍ فِيهِ صَلاحُ صاحِبِهِ)، (نُصْح): بریتییە لە خەفتان لە هەر كردەوەو هەر قسەیەك كە بەرژەوەندیی ئەو كەسەی تێدابیٚ كە تۆ نوصحەكەت بەرانبەری هەیە، یان وەك گوتراوە : (إرادَةُ الخَيْرِ لِلْمَنْصُوحِ) نەصیحەت و نوصح بریتییە لەوەی كە تۆ چی بۆ بەرانبەرەكەت چاكە، ئەوەی بۆ بكەی، بۆی دڵسۆز بی، بۆیە بە كوردیی من بە "دڵسۆزیی"م مانا كردوە.

(عَمِينَ ) : ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴾، واتــه : ئەوانــه کەســانێکی کـوێر دڵ بـوون ، (العَمَى : يُقـال في افْتِقَـادِ البَصَرِ وَالبَصِيرَةِ) ، (عَـمى) واتـه : کـوێـریـی ، کـه بـه نەبـوونی چـاو، وه بـه نەبوونـی (بَصِـيرَة)و دڵیش دەگـوترێ، واتــه: کـاتێـك کـه چـاو نابینـێو (بصیرة)ش دەرك بــه شــت ناکـات ، (وَيُقَـالُ فِي الأَوَّلِ أَعْـمَى) دیـاره کەســێك کـه چـاوی نەبـێ ، کـوێـری پێدەگـوتـرێ ، (وَفِي الثَّـانِي أَعْـمَى وَعَم) ئەو کـەسـەی کـه دەروونی کـوێـر بـێ ، بـه دڵ نەبینـێو بـه عەقڵ نەبینـێ ، هــەم (أَعْمَى)و هــەم (عَمٍ)شـی پێدەگـوتـرێ ، کـۆی (عَـم) بریتیــه لـه (عَمُون) لـه حاڵـەتـی (رَفْـع)دا ، وه (عَـمِـين) له حاڵەتـی (نَصْـب)و (جَـر)دا.

# مانای گشتی ئایەتەكان

سەرەتا دەڵێین: شوێنی نووح ﷺ دیار نیە، واتە: لە قورئاندا دیاریی نەكراوە، بەڵام نیشتنەوەی كەشتییەكە، كە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ : ﴿وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ ﴿٤٤﴾﴾، واتە : وە كەشتییەكە لەسەر چیای (جوودیی) نیشتەوە، بە ڕای زۆر لە جوگرافیی زانانو شوێنەوار ناسان ، چیای جوودیی ئەو چیایەیە كە دەكەوێتە كوردستان ، واتە: خوارووی باكووری كوردستان ، وە سەرووی باشووری كوردستان، (هەرێمی كوردستان) ، چیایەكی گەورەیە ، ئنجا بە پێی ئەوە بێ ، دەبێ نووح ﷺ مادام كەشتییەكەی لەوێ نیشتۆتەوە، عەقڵ وا دەخوازێ ، كە دەبێ ئەو خەڵكەش كە نووحیان لە نێودا ڕەوانكراوەو بەو تۆفانە لە بەین چوون ، هەر لەو دەوروبەرەی سەرچاوەكانی دیجلەو فورات ، (لە كوردستان) لەوێ ژیابن ، چونكە لە عەقڵ دوورە لە شوێنێكی دیكەی ئەوپەڕی دنیا ژیابن ، بەڵام كەشتییەكە لەوێ نیشتبێتەوە ، چونكە ئەو خەڵكەی كە ماون ، زیاتر هەر بە نیشتمانو وڵاتی خۆیان ئاشنا بوون .

بەڵام بە هەر حاڵ، دیار نیە نووح ﷺ ئەو گەلەی كە لە نێوی دابووە، چ گەلێك بووە ؟ ڕەنگە ئەو كاتە بەشەر هەر ئەوەندە بووبێ كە لەوێدا ژیاوە، ئەو تۆفانەش كە هاتوە ، وەك دوایی باسی دەكەین، واش پێدەچێ : ئەو شوێنەی كە ئەو خەڵكەی لێبووە تۆفانەكە تەنیا ئەو شوێنەی گرتبێتەوە ، وە بەشەریش لەسەر زەوی لەو كاتەدا بەس ئەوانە بووبن. وە بەشێك لە زانایان دەڵێن: تۆفانەكە هەموو سەر زەوی گرتۆتەوە.

ئنجا با سەرنجێكی گشتی لەو ئایەتانە بدەین :

خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەكانی پێشوودا باسی پەروەردگارێتیی خۆی كرد، وە باسی ئەوەی كرد ، كە بەندەكان دەبێ لە خوا بپاڕێنەوە، وە باسی شێوازی پاڕانەوەی كرد، وە باسی شوێن دەستی خۆی كرد ، كە هەر خوایە ﷻ ئاوی ئاسمان دەنێرێ، كە مایەی ڕەحمەتو بەرەكەتە بۆ خەڵكی سەر زەوی، ئنجا خوا ﷻ بە

بۆنەی باسکردنی ئاوی ئاسمانەوە کە زەوی پێ دەبووژێتەوەو زیندوو دەبێتەوە، باسی زیندووبوونەوەی مرۆڤەکانیشی کرد.

ئنجا بەو بۆنەوە کە زەوی هەندێکی بە پیتو پێزەو ، بەرهەمی باش سەوز دەکات، وە هەندێکیشی بێ خێرو بێ پیتە ، شتێکی کەم، یاخود شتێکی بێ خێر سەوز دەکات، دێتە سەر باسی ژمارەیەك لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە ئەوانیش هەندێکیان گەلەکانیان وەك زەوی بە پیت ، پەیامی خوایان تێدا سەوز بووەو ، هەندێکیشیان وەك زەوی بێ پیتو پێز هیچیان سەوز نەکردوون ! ئنجا ئەو پێغەمبەرانەی کە لەم سوورەتەدا باسکراون ، هەشتن ، کە یەکەمیان ئادەم بوو (عَلَيْهِ السَّلاَم) کە بەسەرهاتەکەیمان بە تەفصیل باسکرد، وە دووەمیشیان نووحە، وە بە نووح گوتراوە : بابی دووەمی مرۆڤایەتیی (أَبُو البَشَرِ الثّانِي) چونکە خوا ﷻ لە هەموو قورئاندا، نووحی دوای ئادەم باسکردوە، هەروەها مێژووەکانیش وا دەگێڕنەوە ، کە نووح لە دوای ئادەم دێو دەبێو، تەنیا پێغەمبەرێك بووبێ کە خاوەن ئۆممەت بووە ، هەڵبەتە باسی ئیدریسو شیثو ئەوانەش دەکرێ، بەڵام بە هەر حاڵ نووح عليه السلام بەسەرهاتەکەی زۆر باوترە، هەم لە قورئانو لە کتێبەکانی خاوەن کتێباندا، وە هەم لە مێژووی بەشەریشدا ، تۆفانەکەی نووح لە زۆربەی کتێبەکانی مێژوودا باسکراوە.

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾، بێگومان ئێمە نووحمان بۆ لای گەلەکەی ڕەوان کرد، پێی گوتن: ئەی گەلەکەم ! بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، خوا بپەرستن، جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾، بێگومان من مەترسیی سزای ڕۆژێکی مەزنم لێتان هەیە، واتە: ئەگەر بە دەنگمەوە نەیەنو پەیامەکەم قبووڵ نەکەن ، سزای ڕۆژێکی مەزن بۆ ئێوە لە پێشە، وە من مەترسییم لێتان هەیە، واتە: پێم ناخۆشە، وە لەسەر دڵم قورسە کە ئێوە تووشی ئەو سزا سەختە دەبن ، کە لەو ڕۆژە مەزنەدا دێتە پێش، کە هەر کەسێك لە دنیادا بە دەم بانگی پەروەردگارو پەیامی پێغەمبەرانەوە نەچێ ، تووشی دەبێ .

وەك پێشتریش باسمان کرد : ئایا گەلی نووح گەلێکی دیارییکراو بوون، جارێ وشەی (قوم) یانی : (مَجْمُوعَة مِنَ النَّاسِ) واتە کۆمەڵە خەڵکێك، وە وشەی (قَوْم) جیایە لە وشەی (شَعْب)، بۆچی؟ چونکە خوای پەروەدگار بۆ وشەی (شَعب) دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ ﴾ الحجرات، گەلی کورد (شعب)ەو ، گەلی عەرەب (شعب)ەو، گەلی فارسو تورك‌و ئەفغان ... هتد، هەموویان (شعب)ن، بەڵام (قوم) بریتیە لە کۆمەڵە خەڵکێك با لە چەند گەل‌و تیرەو هۆزێکیش پێکهاتبن ، ئنجا خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا ﴾، یەکێك بۆی هەیە بڵێ : باشە بۆچی خوا ﷻ تەئکید دەکاتەوە ؟ وەڵام : تەئکیدەکە بۆ ئەوەیە کە ئەو نووحە ﷺ ئێمە ڕەوانمان کردبوو ، وە هەرکام لە پێغەمبەرانی دیکەش ، ئێمە ڕەوانمان کردوون‌و ، لەخۆوە نەهاتوون، قسەی گیرفانی خۆیان نەبووە ، بۆ خەڵکی هەڵیرێژن ، بەڵکو پەیامی خوایان بە خەڵکی گەیاندوە .

ئنجا دوای ئەوەی نووح ﷺ ئاوا بە دواندنێکی پڕ نەزاکەت‌و ئەدەبو ، پڕ ڕەحم‌و سۆزو بەزەیی گەلەکەی خۆی بە گشتی دەدوێنێ، با بزانین ئەوان وەڵامیان چی دەبێ ؟ ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، قسە ڕۆیشتووانی گەلەکەی ﴿ ٱلْمَلَأُ ﴾، پێشتر باسمان کرد، واتە: ئەو کەسانەی کە عەقڵ‌و چاوو دڵ پڕ دەکەن لە سام‌و هەیبەت‌و لە سەرنج ڕاکێشران، ئەوانەی کە ڕواڵەت‌و ڕووکەشیان سەرنجی خەڵك ڕادەکێشێ، لەبەرئەوەی کە جل‌و بەرگیان، خانووبەرەیان، موڵك دەستەڵاتیان ، زەق‌و بەرچاوە، خەڵك جۆرێك لە سام‌و هەیبەتیان لێدەکات، بەشەر بە گشتی وان، هەڵبەتە کەسێك بە چاوی دڵ ببینێ، ناکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو شتە ڕواڵەتییانەوە، بەڵام وەك دەگوترێ: {زۆربەی خەڵك عەقڵی لە چاوی دایە} زۆربەی خەڵك هەر بە چاوی سەر دەبینن، بە گوێی سەر دەبیستن، نەك بە چاوی دڵ ببینن‌و بە گوێی دڵ ببیستن، تاکو پاك‌و پیس لێك جیابکەنەوەو ، نەکەونە ژێر کاریگەریی ڕواڵەتە سەرنج ڕاکێشەکانەوە ، ئەو شتانەی کە : ڕواڵەت خۆشن، بەڵام نێوەڕۆك بۆشن، یاخود : ڕواڵەت جوانی ناخ وێرانن، ئنجا ئەو زلەزلەو دەست ڕۆیشتووانەی گەلەکەی گوتیان: ﴿ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى

﴿ ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾، بێگومان ئێمە تۆ لە گومڕاییەکی ئاشکرادا دەبینین، ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، (نووح) گوتی : ئەی گەلەکەم ! ئەی خەڵکەکەم ! هیچ گومڕاییەك لە مندا نیە، بەڵام من ڕەوانەکراوی پەروەردگاری جیهانییەکانم، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە ڕەوانە کراوم و پەیامم پێیە، ئەگەرنا هیچ جۆرە گومڕاییەك لە مندا نیە، نەك هەر من لە گومڕاییدا نیم، ئەوان گوتیان : ﴿ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾، لە زمانی عەرەبیدا ئەوە زێدەڕۆییەکی زۆر دەگەیەنێ، یانی: تۆ دەبینین لە چاڵی گومڕایی دا نوقم بووی، بەڵام ئەو فەرمووی : ﴿ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ ﴾، هیچ جۆرە گومڕاییەك لە مندا نیە، نەك هەر نوقم نەبووم ، ﴿ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي ...﴿٦٢﴾ ﴾الأعراف، پەیامەکانی پەروەردگارمتان پێ ڕادەگەیەنم، لە هەندێ شوێن گوتوویەتی: ﴿ رِسَالَةَ رَبِّي ﴾ پەیامی پەروەردگار، لێرە دەفەرموێ : ﴿ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي ﴾، کە دەفەرموێ: ﴿ رِسَالَةَ رَبِّي ﴾، واتە: پەیامی پەروەردگارم کە هەموو بەرنامەکانی تێدایە، کە دەفەرموێ: ﴿ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي ﴾، واتە پەیامەکانی پەروەردگارم ، واتە: پەیامێك لە بواری خوا بەیەکگرتنەوە، پەیامێك لە بواری خوا پەرستنەوەوە، پەیامێك لە بواری ئەخلاق و ڕەوشتەوەو، پەیامێك لە بواری کۆمەڵایەتیی، پەیامێك لە بواری ئابووریی و... هتددا، ﴿ وَأَنصَحُ لَكُمۡ ﴾، وە دڵسۆزییتان بۆ دەنوێنم و، پەرۆشییتان بۆ دەردەبڕم ، ﴿ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾، وە لەلایەن خواوە شتێك دەزانم کە ئێوە نایزانن، کە بریتیە لە چی ؟ بریتیە لەو شتەی کە هەر خوا دەیزانێ ، لە حەڵاڵ و حەرام و ، چاك و خراپ ، وە پاشان ئینسان چۆن بژیەت، وە پێداویستییەکانی ژیانی ئینسان دەبێ چۆن دابین بکرێن ؟ بەتایبەتی پێداویستییە ڕووحیی و مەعنەوییەکان ، پاشان سەرەنجامی ئینسان چۆن دەبێ ؟ هەر خوای زاناو توانا ئەوانە دەزانێ ، بۆیە دەفەرموێ : لەلایەنی خواوە شتێك دەزانم ، کە ئێوە نایزانن .

ئنجـــا دەفـــەرموێ : ﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، ئـایا پێتـان سـەیر بـوو کـە بەرنامەیـەك‌و بیـرخەرەوەیـەکتـان لـە پەروەردگـارتانەوە بـۆ بـێ، بـە پیـاوێك لـە خۆتـان دا ، تـاکو وریاتان بکاتـەوەو بتـانـترسێنـێ، وە بۆ ئـەوەی کـە پارێـز بکـەن، وە تـاکو بـەزەییـتان لەگەڵ دا بنـوێنرێ ؟ ئـایا ئەمە چ سـەیرێکی تێدایـە، جێی چ سـەرسوڕمانێکە ؟!

دیارە ئەوانیـش لە بـەرانبـەر هێـزی مەنتیقی نـووح دا، پـەنایان بـردە بـەر مەنتیقـی هێـز : ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَٰهُ ﴾، لێـرە دیـارە بـە کـورتیی بـاسی دەکـات، بـەڵام لـە شـوێنـەکـانی دیکـە ڕوونـتـری بـاس دەکـات، بـۆ وێنـە لـە سـوورەتی (الشـعراء)دا، دەفەرموێ: ﴿ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ۝١١٦ ﴾، واتـە : گـوتیان : ئەی نـووح ! ئەگـەر واز نەهێنـی ، بـەردبـارانت دەکـەین ، بـەڵام لێرەدا هەر بـە کورتیـی دەفەرموێ : ﴿ فَكَذَّبُوهُ ﴾، بـە درۆیـان دانـا ، بێبـڕوا بـوون پێـی ، ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ﴾ ئێمـەش خـۆی‌و ئەوانـەی کـە لەگـەڵی بـوون، لـە کەشـتیی دا ، دەربـازمان کـردن ، واتـە: ئەوانـەی بـە ئیمانـەوە لەگەڵـی بـوون، نـەك وەك نەسـەب‌و ڕەچـەڵەك، ئەگـەرنا کوڕەکـەیشـی ، وەك لـە سـووڕەتی (هـود)دا هـاتـوە، هەروەهـا خێزانەکـەیشـی وەك لـە سـووڕەتی (التـحـریم)دا هاتـوە، ڕەگەڵـی نەکەوتـن لـە ئاییـن‌و بەرنامەکـەی داو، لـە خنکـاوان بـوون، لەبـەرئەوەی کـە لەگـەڵ ئـەو پەیـام‌و ئیمـان‌و عەقیدەیـەدا نەبوون ، کە نـووح لە خـواوە هێنـابووی.

﴿ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾، وە ئەوانـەی بڕوایـان بـە ئـایـەتـەکـانی ئێمـە نەکـرد، خنکاندمانـن، ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴾، بێگـومان ئـەوان کۆمەڵێکی کوێـر دڵ بوون، کۆمەڵێـك بوون کـە دڵیـان نابینـا بـوو، وە هـەق‌و ناهـەق‌و ، ڕاسـت‌و چـەوت‌و ، حـەڵاڵ‌و حـەرام‌و ، چـاك‌و خراپیـان ، لێـك جیـا نـەدەکـردەوە .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴾، وەك پێشتریش باسمان کرد ئەمە دووەمین بەسەرهاتە کە خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الأعراف)دا ، دەیخاتە ڕوو ، لە دوای بەسەرهاتی ئادەم، دیارە شەش بەسەرهاتی دیکەش هەن، کە بەسەرهاتی هەرکام لە هوودو گەلەکەی کە (عاد)ە، وە صالْحو گەلەکەی کە (ثمود)ە، وە لووطو گەلەکەی، وە شوعەیبو گەلەکەی کە (أهل مدین)و ﴿ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ ﴾، بوون ، پاشان مووساو هاروونو گەلەکەیان (بنو إسرائیل)، لەگەڵ فیرعەونو دارو دەستەکەی دا، بەسەرهاتی ئەو هەشت پێغەمبەرانە ، لەم سووڕەتەی (الأعراف)ەدا هاتوە .

ئنجا کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ ﴾، بێگومان ئەوە بۆ جەخت لەسەر کردنەوەو داکۆکیی لەسەر کردنەو، وەك پێشتریش باسم کرد : مانای سوێند دەگەیەنێ، واتە: ئەو تەئکید کردنەوەیە بۆ ئەوەیە کە ئێمە نووحمان ڕەوانە کردبوو، هەروەها هەر جارێکی دیکەش کە خوای پەروەردگار باسی هەر کام لە پێغەمبەران دەکات ، بە تەئکیدەوە باس دەکات، واتە: ئێمە ئەو پێغەمبەرانەمان ڕەوانە کردوون، ئەوانە لەخۆوە نەهاتوون، وە قسەی گیرفانی خۆیان بۆ خەڵك دەرنەهێناوە.

وە لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە ، کە نووح یەکەمین پێغەمبەری خاوەن ئۆممەت بووە، لە (صحیح مسلم)دا هاتوە ، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمایشتێك دەفەرموێ ، کە لە قیامەتدا خەڵك کە زۆر تەنگەتاوو سەغڵەت دەبن، کاتێك کۆ دەکرینەوە لە مەیدانی مەحشەردا، ئنجا یەك بەیەك دەچن بۆ لای پێغەمبەرە زۆر دیارەکان، کە لەنێو بەشەردا ناودارترو دیارتر بوون، پێشی

دەچـن بـۆ لای نـووح و پێـی دەڵـێن: ﴿يَا نُوحُ ! إِنَّكَ أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٩٦٢١)، وَالبُخَارِيُّ بـرقم: (٤٤٣٥)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٩٤)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (٢٤٣٤)}، واتـە: ئـەی نـووح ! تـۆ یـەکـەمین ڕەوانەکـراو بـووی بـۆ خەڵـکی سـەر زەوی، واتـە: یـەکـەمین کەسـی کـە بـۆ لای خەڵـکی سـەر زەوی ڕەوانە کراوی، کاتێك کـە خەڵك کۆبوونەتـەوە لە یـەکدیو زۆر بـوون لەسـەر زەوی، ئەگـەرنا پێشـتـر دیـارە پێغەمبـەرانی دیکـەش هـەبوون، ئـادەم بۆخـۆی پێغـەمبـەر بـووە، هـەروەها ئیـدریسو شـیثو نـازانین چـەند پێغـەمبـەری دیکـەش بوون لە پێش دا بوون، بـەڵام ئەو کاتـە ڕەنگـە وەك عەشیـرەتێكو وەك خەڵکێـکی کـەم لە شـوێنێـك بـووبن، بـەڵام کاتێـك وەك قـەومێكو کۆمەڵگایـەکی فراوانیـان لـێ هاتـوە، یـەکـەمین پێغـەمبـەرێك کـە بۆیان ڕەوانە کراوە، نـووح بووە.

هـەر لەوبـارەوە ئـەم دەقـەش هەیـە: ﴿عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيّ ﷺ قَالَ: أَوَّلُ نَبِيَ أرْسِلَ نُوحٌ﴾ {أَخْرَجَهُ الدَّيْلَمِيُّ فِي (مسنده) ج، ص٩، وَابْنُ عَسَاكِر فِي (تاريخه) ج١٧، ص٣٢٦، وقال الألباني: إسناده ضعيف، لكن الحَدِيث صحيح، فإن له شاهداً قوياً عن أبي هُرَيرَة مرفوعاً في حديث الشفاعة الطويل وفيه: فيأتون نوحاً فيقُولُونَ: يَا نُوحُ ! إِنَّكَ أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ وَالتِّرمِذِيُّ)، وَقَالَ: هَذَا حَدِيث حسن صحيح}، واتـە: یـەکـەمین پێغـەمبـەرێك کـە ڕەوانـە کـراوە بۆ خەڵـکـی سـەر زەوی ، نـووح بووە .

هەروەها هەر لەبارەی نـووحەوە ئەم دەقـەش هاتـوە: ﴿كَانَ بَيْنَ آدَم وَنُوح عَشْرَةُ قُرُونٍ كُلُّهُم عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الحَقّ﴾ {أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ فِي مستدركه برقم: (٣٦٥٤) وَقَالَ: هَذَا حَدِيث صحيح على شرط البخاري، ولم يخرجاه تعليق الذهبي في التلخيص: على شرط البخاري}، واتـە: لـە نێـوان ئـادەمو نـووحدا ، دە سـەدە، (دە وەچە) هەبوون، هەموویان لەسـەر بـەرنامەی هـەق بوون.

بـەڵام دوایی هەتـا نۆرە گەیشتۆتـە سـەر نـووح، پێش ئـەوەی نـووح ڕەوانـە بکـرێ، خەڵـکی سـەر زەوی تووشی بتپـەرستیـی بـوون، ئـەویش عەبدوڵـڵای کوڕی عەبباس خـوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ ، لـە (صـەحیحی بوخـاریی)دا بـاس دەکـات کـە لـە ئەنجـامی ئـەوەدا ، پێشـێ وێنـەی زانـایەکـانو پێشـەوایەکـانی خۆیـان، لـە

پەرستگاکانی خۆیان دا کێشاوە، تاکو بەهۆی تەماشاکردنی وێنەی ئەوانەوە ، تەقواو عیباداتی ئەوانیان بیر بکەوێتەوە، دوایی وردە وردە بەوەدا قووڵ بوونەتەوەو پەیکەریان بۆ دروست کردوون، دوایی لە جیاتی ئەوەی کە خوا بپەرستن، خودی پەیکەرەکانیان پەرستووە، دەستیان کردوە بە بت پەرستیی ، یانی : لەوەوە بتپەرستیی دەرکەوتوە .

یەکەمین شتێك کە نووح ﷺ بە گەلەکەی ڕادەگەیەنێ ئەوەیە : ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾، ئەی گەلەکەم ! {یانی : ئەی خەڵکەکەم ! ئەی ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە من لەنێوتان دامو، بۆتان ڕەوانە کراوم !} خوا بپەرستن، بێجگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، بەڵێ هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بەبێ هەلاواردن ، بۆ خوا بەیەکگرتن (توحید الله) ڕەوانە کراون.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾، زۆر لە زانایان دەڵێن : ﴿عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾، واتە: (يَوْم الطوفَان) واتە: ئەو ڕۆژەی کە تۆفانی تێدا دێ و ئاو هەڵدەستێ، وەك لە سووڕەتی (القمر)دا دەفەرموێ: ﴿فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ ۝١١ وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ ۝١٢﴾ القمر، واتە: دەروازەکانی ئاسمانمان کردنەوە بە ئاوێکی هەڵڕژاوەوە، وە زەمینمان کردە سەرچاوەی تەقێنراو، وە سەرەنجام ئاوی ئاسمانو زەوی پێکگەیشتن ، بە بڕیارێکی ئەندازەگیریی بۆکراو ، واتە : لە ئەرزێ ئاو هەڵدەقوڵێو ، لە ئاسمانێ وەك کوندەی سەر بەرەو ژێر ئاو هەڵدەڕژێ ، سەرەنجام دەبێتە تۆفانێك کە هەموو سەر زەمین دەگرێتەوە، یاخود ئەو سەر زەمینەی ئەو خەڵکەی تێدا ژیاون ، کە نووحیان بۆ لا ڕەوانە کراوە، کە هەر ئەوەندە مرۆڤەش هەبوون لەو کاتەدا لەسەر زەوی و ، زەوی ئاوەدان هەمووی دادەگرێ .

هەندێکیش دەڵێن: مەبەست لە ﴿ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴾، سزای ڕۆژی مەزن ، ئەو ڕۆژەیە کە ڕۆژی قیامەتە، ئنجا بە پێی ئەو ئایەتانە کە خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (الصافات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ نَادَىٰنَا نُوحٞ فَلَنِعۡمَ ٱلۡمُجِيبُونَ ٧٥ وَنَجَّيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ ٧٦ وَجَعَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلۡبَاقِينَ ٧٧ ﴾، واتە: بێگومان نووح بانگی کردین ، ئێمە باشترین وەڵامدەرەوە بووین، لێمان پاڕایەوە ، ئێمەش باش بە هانایەوە هاتین، وە خۆیو ئەهلەکەی {واتە: خۆیو ئەوانەی کە بڕوایان پێهێنابوون ، بە ئیمانو عەقیدەوە} لە بەڵای مەزن دەربازمان کردن ، {کە دیارە بەڵای مەزن مەبەستی تۆفانە}، وە خۆیو وەچەکەیمان لە هێڵراوان گێڕان.

کەواتە: تەنیا وەچەی نووح ﷺ ماونەتەوە، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەو کاتە هەر ئەوەندە خەڵکە هەبوون کە لەو شوێنە ژیاون، وە ئەو تۆفانەش ئەو سەر زەمینەی کە ئەو خەڵکەی لێ هەبووە ، هەمووی گرتۆتەوە، وە واش لەو ئایەتانە وەردەگیرێ کە هەموو ئەوانەی کە لە کەشتییەکەی نووحدا سوار بوون ، هەموویان لە وەچەی خۆی بوون، واتە: ئەوانەی کە ئیمانیان پێهێناوە، وە دوور نیە ، خەڵکێکی دیکەی زۆریش لە وەچەی ئەو بووبێ، بەڵام لەگەڵیدا نەبوون لەبەرئەوەی ئیمانیان پێ نەهێناوە، چونکە نووح ﷺ (٩٥٠) ساڵ بەس لە نێو گەلەکەیدا ماوەتەوە، ئنجا هەر خوا بۆخۆی دەزانێ ، پێشتریش تەمەنی چەند بووە ، وە دوای تۆفانیش چەند ماوەتەوە ، کەواتە : دیارە دەبێ وەچەیەکی زۆری بووبێ، بەڵام ئەوەندەی کە لە کەشتییەکەدا لەگەڵی سوار بوون ، هەر ئەوانە ماونەتەوە، یانی : خوای پەروەردگار جۆماڵێکی باشی سەر زەوی کردوە ، وە گەسکێك لە زەوی دراوەو ، پاککراوەتەوە ، تاکو لە مەودوا بەشەر ژیانێکی تازە دەست پێبکەنەوە، کە ئەو ئیماندارانە بوون ، لە خزمەتی نووح ﷺ دابوون، وە خوا سەرزەمینی پاك کردۆتەوە لە ئەهلی کوفرو لە گومڕاو سەرگەردانان .

**مەســـەلەی دووەم:** کـــە دەفـــەرموێ: ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾، وشـەی ﴿ٱلۡمَلَأُ﴾ دەڵـێ: (الـمَـلأ: الأَشْـرَافُ الـمَتْبُوعُون الـذِينَ يَمْلـؤن عُيُونَ هيبة)، (الـملأ) واتە: ئەشراف، یاخود ئەوانەی کـە پەیڕەوییـان لـێدەکـرێو ، خەڵك شـوێنیان دەکـەوێو گوێیـان بـۆ دەگـرێ، بۆچیـش ناویان لـێنراوە (مَلأ)؟ لەبـەرئەوەی کـە چـاوو دڵان پـڕ دەکـەن لـە سـامو هەیبـەتو ، سـەرنجی خەڵـك ڕادەکێشـن ، بەهـۆی ڕواڵەتو زریـقو بریقـی سـەروەتو سـامانو خانـووو بـەرەو جـلو بـەرگـەوە.

کـە دەفـەرموێ: ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ...﴾، ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنـێ ، کـە زلـەزلان دەسـتـڕۆیشـتووانی گەلـی نـووح ، هـەموویـان یەکدەست بوونـە لـە بەرانبـەر نـووح داو ، پەیامو بەرنامەکەییـان ڕەفـز کـردوە ، ئنجا وادیـارە خەڵك و جـەماوەرە چەواشـەکراو کلاو لـەسـەر نـراوەکـەش وەك ئـاژەڵـێـکی ، ڕێشـمە لـەملکـراوی بـێ ئیـرادە ، بەدوای ئەو زلـەزلانـەدا چوون .

بـەڵام لەبـارەی گەلـی (عـاد)ەوە ، کـە هوودیـان بـۆ لا ڕەوانەکـرا ، دەفەرمـوێ :

﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦٓ ۝٢٧﴾، واتـە: دەسـت ڕۆیشـتووانێك کـە کافـر بوون لـە گـەلەکـەی، گوتیـان ، واتـە: هـی گەلـی (عـاد) بـە پێچـەوانەوە، ئـەوە دەگەیـەنێ کـە دەسـتـڕۆیشـتووانی گەلەکـەی هەموویـان دژی نـەبوون، بەڵـکو تەنیـا ئەوانـەیان کـە کـافر بوون ، دژی بوون، بـەڵام کـەسانێك هـەبوون کـە ئەهلـی ئیمان بوون، بـەڵام ئەوەی نـووح ﷺ زیاتر وا پێدەچێ کـە هەموو ئەوانەی دەسـتـڕۆیشتوو بـوون لـە گەلەکـەی ، کـەسـیان تێـدا نـەبووە کـە ئیمـان بێنـێ ، وە هـەموویان دژی وەسـتاونەتـەوە .

ئنجا ئایـا دەسـتـڕۆیشـتووانی گەلەکـەی دەڵێـن چـی ؟ ﴿إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾، بێگـومان (إِنَّا ) ئەسـڵی خـۆی (إِنَّ + نـا)یـە، وە (ل)مـیش بـۆ تـەئکـیدە، واتـە: بێگـومـان ئێمـە تـۆ لـە گـومڕاییـەکی ئـاشـکرادا دەبیـنین، (واتـە: تـۆ دەبیـنین

نوقم بووی لە گومڕایی دا)، ئنجا با بزانین نووح ﷺ چۆن وەڵامی ئەو تۆمەتە دەداتەوە ؟

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، ئەی گەلەکەم ! هیچ گومڕاییەك لە من دا نیە، بەڵام من ڕەوانە کراوم لە لایەنی پەروەردگاری جیهانەکانەوە .

ئەگەر سەرنج بدەین پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) وشەی ﴿يَٰقَوۡمِ ﴾، زۆر بەکاردێنن، ئەی گەلەکەم ! ئەی کۆمەڵگاکەم ! ئەی ئەو خەڵکەی کە من لە نێوتان دامو ، بۆ لاتان ڕەوانە کراوم ! کە ئەوە جۆرێکە لە هەست بزواندنیان‌و سۆز جووڵاندنیان ، ئنجا سەرنج بدەن ! نووح ﷺ چەند بەڕێزەوە قسە دەکات ، دیارە پێغەمبەران سەرمەشقی ئێمەن ، ئێمەش دەبێ لەوانەوە فێری ئەو ئەدەبو ڕێزو نەزاکەتە بین ، ئەوان پێی دەڵێن : تۆ لە گومڕایی دا نوقم بووی ، ئەو ناڵێ : نەخێر ، ئێوە لە گومڕایی دا نوقم بوون، کە ئەگەر وای فەرمووبایە ڕاستی دەکردو قسەی ئەوان درۆ بووە، بەڵام ئەوان کە ویستوویانە بە درۆ ئەو تۆمەتبار بکەن ، ئەو دەیتوانی بە ڕاست ئەوان تاوانبار بکات، بەڵام وای نەفەرمووە ، بەڵکو دەڵێ چی ؟ ﴿لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ ﴾، هیچ جۆرە گومڕاییەك لە مندا نیە، پاشان خۆی پێناسە دەکات : نازناوو پێناسەی ئەو چییە؟ ﴿ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، بەڵام من ڕەوانەکراوم لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە.

کەواتە: ئەوەی کە ئێوە بە گومڕایی دەزانن، پەیامو فەرموودەی خوایەکە ، بۆم هێناون ، کە پەروەردگارو بەخێوکەرو مشووخۆری خۆتانە، کاتێك کە من بە گومڕا دادەنێن‌و، بە لە گومڕایی نوقم بوو، دام دەنێن، ئەوە لە ڕاستیدا تۆمەتێکە ئاڕاستەی پەیامی خوای پەروەردگارو، ئاڕاستەی خوای پەروەردگاریش دەکرێ، وە ئەوە بێئەدەبییەکی زۆر گەورەیە بەرانبەر بە پەروەردگارو خاوەن‌و بەدیهێنەری خۆتان.

ئنجا دوایی لەسەر پێناسەکردنی خوای پەیامەکەی بەردەوام دەبیو دەڵێ :
﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي ﴾، خوێندراویشەتەوە : ﴿أُبْلِغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي ﴾،
وە خوێنراویشەتەوە : ﴿ رِسَالَةَ رَبِّي ﴾، واتە : پەیامەکانی پەروەردگارمتان پێڕادەگەیەنم واتە : ئەوەی کە من پێتان ڕادەگەیەنم پەیامەو بەرنامەیەو خوا ﷻ بۆ ئێوەی ناردوە ، ئێوەی پێ ئاراستە دەکاتو ڕێنمایی دەکات، ﴿ وَأَنصَحُ لَكُمْ ﴾، پێشتر باسمان کرد : (النُّصْحُ : إِرَادَةُ الخَيْرِ لِلْمَنْصُوحِ)، (نُصْح) یان (نَصِيحَة) بریتییە لەوەی کە چی بۆ بەرانبەرەکەت چاکە ، ئەوەت بۆی بوێ، واتە: دڵسۆزییو بە تەنگەوە بوونو بە پەرۆشەوە بوون، ﴿ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، وە ئەوەی من لە خواوە دەیزانم ، ئێوە نایزانن، واتە: لە ڕووی ئیمانو عەقیدەوە : جیاوازیی بەینی کوفرو ئیمان چییە ؟ شیركو تەوحید جیاوازییان چییە ؟ وە لە ڕووی حەڵاڵو حەرامو، لە ڕووی ڕەوشتو، لە ڕووی سەرەنجامەوە .

یاخود ئەوەی من دەیزانم : کە تۆفانێکی گەورە بۆ ئێوە لە ڕێدا هەیە ، وەك سزایەك بۆ ئەو هەڵوێستەتان ، ئەگەر ئیمان نەهێنن ، بەڵام ئێوە نایزانن .

ئنجا لە کۆتاییدا پێیان دەڵێ : ﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، ئایا پێتان سەیرە بە پیاوێکدا لە پەروەردگارتانەوە کە لە خۆتانە ، پەیامێکتان بۆ بێ، بیرخەرەوەو بەرنامەیەکتان بۆ بێ ، بۆچی ؟ تاکو پێی وریاتان بکاتەوە، بۆ ئەوەی پارێز بکەنو، بۆ ئەوەی شایستەی بەزەیی خوای پەروەردگار بن، ئایا ئەوە چ شتێکی سەیری تێدایە ؟ ئەدی پەروەردگار نابێ خەم لە پەروەردەکراوەکانی خۆی بخوات ؟ بەدیهێنەر نابێ خەم لە بەدیهێنراوەکانی خۆی بخوات ؟ پەرستراو نابێ خەم لە بەندەکانی خۆی بخوات ؟ شتی مەنتیقیی ئەوەیە، ئایا بۆچی ئێوە شتێك کە مەنتیقییەو ، عەقڵو سروشت دەیخوازن ، پێتان سەیرە ! هەڵوێستەکەی خۆتانتان پێ سەیر بێ، کە شتێکی زۆر نامەنتیقییە خوا

بەندەکانی خۆی، دروستکراوەکانی خۆی ، ژیێنراوەکانی خۆی ، فەرامۆش بکاتو، کە بەرنامەی بۆ گەردیلە تاکو کەهکەشان داناوە، ئەوان وێڵ بکاتو ئیهمالیان بکات، ئەوە سەیرە ! ئەو بیروڕاو بۆچوونە سەیرە .

**مەسەلەی چوارەمو کۆتایی**: باسی سەرەنجام دەکاتو، دەفەرموێ : ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴾، بە درۆیان داناو بێبڕوان بوون، لەسەر بێبڕوایی خۆیان بەردەوام بوون، ئێمەش ئەوو ئەوانەی کە ئیمانیان پێهێنا بوو ، لەگەڵی بوون ، لە کەشتییدا دەربازمان کردن، (الفُلْك : السَّفِينة)، ئنجا (فُلْك) هەم تاکیش دەگەیەنێ، هەم کۆش دەگەیەنێ، وە هەم بە (مُذَکّر)یش دێ، واتە: (المُذَكّر المَجَازِي)، وە هەم بە (مُؤَنَّث)یش دێ، دەگونجێ بڵێی : (هَذِهِ الفُلْك)، وە (هَذَا الفُلك)، (جَاءَت فُلك) و (جَاءَ فُلْك).

ئنجا ئایا ئەوانەی کە لەگەڵ نووح ﷺ بوونو ، ئیمانیان پێ هێنا بوو ، چەند کەس بوون ؟ توێژەوانی قورئان زۆریان قسە لەسەر کردوە :

پێشەوای توێژەرەوانی قورئان (أبو الجعفري الطبري) هەمیشە قسەیەکی زۆر جوان دەکاتو دەڵێ: شتێك کە خوا ﷻ نەیفەرموەو ڕوونی نەکردۆتەوە، ئێمە دیارە پێویستییمان پێی نیەو، پەکمان لەسەری نەکەوتوە، وە هەر شتێك کە خوا نەیفەرمووبێ، وە پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو بێ، مادام پەیوەندیی بە غەیبو نادیارەوە هەبێ، پێویست ناکات ، وەختی خۆمانی پێوە بە فیڕۆ بدەین .

یەکێك لەوانە ئەوەیە کە ئایا چەند کەس لەگەڵ نووح بوون ؟ هەر خوا بۆخۆی دەزانێ ، چونکە خوا نەیفەرمووەو پێغەمبەریش ﷺ لە ڕێیەکی ڕاستەوە بە ئێمە نەگەیشتوە ، لەوبارەوە شتێکی فەرمووبێ ، لەبەرئەوە هەرچی بگوترێ ، بە گومانە ، وە کتێبی خاوەن کتێبەکانیش هی جوولەکەو نەصڕانییەکان ، ئەگەر هەندێ شتی لەوبارەوە تێدا هەبێ ، جێی متمانەپێکردن نیە، چونکە ئەوە غەیبەو ، غەیبیش تەنیا خوا دەیزانێ ، وە پێغەمبەری خوا

ﷺ ئەویش کە خوا پێی دەفەرموێ، وە دەبێ لە ڕێیەکی ڕاستەوە بە ئێمەوە گەیشتبێ، وە کتێبی خاوەن کتێبەکانیش ، خوا هەواڵی پێداوین کە گۆڕدراوە، کەواتە: جێی متمانەپێکردنو پشت پێ بەستن نیە.

وە هەندێك لەوانەی کە زۆریان گوتوە، دەڵێن: ژمارەیان هەشتا (٨٠) کەس بوون، لە کەشتییەکەدا.

وە هەندێك گوتوویانە : دوازدە (١٢) کەس بوون، واتە: بە نووحەوە سێزدە (١٣) کەس بوون، گوتوویانە : (حام و سام و یافث) ئەوە سێ کوڕەکەی نووح بوون، ئەوانەی کە دەرباز بوون، لەگەڵ هاوسەرەکانیان، وە شەش کەسی دیکەش بوون ، لەگەڵ نووحیش ، ئەوە سێزدە (١٣) کەس.

بەلام لە ڕاستیدا ئەوە هەر قسەیەو وەك گوتم : بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە.

دوایی کە دەفەرموێ: ئەوانەی بێبڕوا بوون بە ئایەتەکانمان ، خنکاندمانن، پاشان دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمًا عَمِينَ ﴾، وشەی : ﴿ عَمِينَ ﴾، کۆی (عَم)ە، (عَم)یش واتە: کەسێك کە دڵی کوێر بێو (بصيرة)ی نەبێ، لە دەروونیی دا شت نەبینێو فەرق بە هەقو ناهەق نەکات.

دەربارەی ئەوەش کە ئایا ئەو تۆفانەش گشتگیر بووە، یان ناوچەیی بووە، ئیقلیمگیر بووە بۆ هەموو دنیا، یاخود ناوچەیی بووە ؟

من وام دێتە بەرچاو کە ئەو کاتە بەشەر تەنیا لەو شوێنەدا ژیاون ، چونکە خوا دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلۡبَاقِينَ ﴾، تەنیا وەچەی نووحمان هێشتەوە، واتە: لە بەشەر ، تەنیا وەچەی نووحمان لەسەر زەوی هێشتەوە، کەواتە: دیارە هەر ئەوەندە خەڵکە هەبوون کە نووح بۆ لایان ڕەوانە کراوە، وە ئەوانەش کە لەگەڵی سواربوون ، دیارە هەر هەموویان بە نەسەبو ڕەچەڵەك ، دەچنەوە سەر نووح ؊، ئەوانەی ئیمانیان پێهێناوە، هەروەك دیارە ، زۆرێك لەوانەش کە وەچەی ئەو بوون ، ئیمانیان پێ نەهێناوە ، لەگەڵ خەڵکەکەی دیکەدا ئەهلی کوفر بوون .

ئەمە وەك گوتم ئایەتەكانی قورئان بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنن ، كە ئەوانەی دەربازبوون هەموویان لە وەچەو نەسلی نووح ﷺ بوون، خوا لێیان ڕازی بێ.

دیارە یەكێك لەوانەی كە شوێنی نەكەوتوون، خێزانەكەی بووە، وەك لە قورئاندا هاتوە، خوا دەفەرمویٚ: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَـٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ ﴾ التحريم،

واتە: خوا ژنەكەی نووحو ژنەكەی لووطی بە وێنە هێنایەوە بۆ ئەوانەی بێبڕوان، كە لە ژێر دوو بەندە لە بەندە چاكەكانمان دابوون، بەڵام ئەوان ناپاكییان لێیان كرد (سەرپێچییان لێكردن)، ئەوانیش (نووح و لووط) هیچ سوودیان پێیان نەگەیاند ( بۆ دەربازكردنیان لە سزای خوا)، وە پێیان گوترا : لەگەڵ ئەوانەی چوونە نێو ئاگری دۆزەخەوە ، بچنە نێو ئاگری دۆزەخەوە .

كەواتە: ئەو دوو هاوسەرەی ئەو دوو پێغەمبەرە (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) ، لە دوارۆژدا لەگەڵ ئەوانەی كە چوونە دۆزەخ، چوونە دۆزەخەوە، لەبەرئەوەی كە ئیمانیان پێیان نەهێنا بوو .

هەروەها یەكێك لە كوڕەكانی نووحیش كە هەندێك دەڵێن: ناوی كەنعان بووە، ئەویش لە سووڕەتی (هود)دا ﷺ خوای پەروەردگار بەسەرهاتەكەی باس دەكات ، ئەویش لەگەڵ ئەوانەدا بووە كە بە هیلاك چووە ، چونكە ئامادە نەبووە كە بە دوای بابی بكەوێ، صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ، وە لە ڕاستییدا هەر كام لە : خێزانەكەی نووحو خێزانەكەی لووطو ، كوڕەكەی نووح، وە بابی ئیبراهیم ئازەر، بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە لە ئایینی خوای پەروەردگارو پەیامەكانی خوادا ، لە شەریعەتی خوادا : خزمایەتییو نەسەبو ڕەچەڵەك نایخوا ، هەر كەسێك ڕێی خوا نەگرێ ، با كوڕی پێغەمبەریش بێ ، با بابی پێغەمبەریش بێ ، با خێزانی پێغەمبەریش بێ ، ئەو پێغەمبەرە (صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) سوودی پێ ناگەیەنێو ، ئەگەر داواشی بۆ

لـە خـوا بكـات ، داوايـەكـەی ناگـرێتـەوە ، وەك لـە سـوورەتی (هـود)دا هـاتوە كـە نـووح ﷺ داوای لە پەروەردگاری كـرد بۆ كـوڕەكەی : گـوتـی : ﴿ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾، واتـە : وە نـووح بانگی پەروەردگاری كـرد ، گـوتـی : پەروەردگـارم {تـۆ فەرمووتـە : خۆتو ئەهلەكەت دەرباز دەكـەم } كوڕەكەشـم ئەهلی منە ، بەڵێنـی تـۆش ڕاسـتەو تـۆش باشتـرین كـار بـەجێـی، بـەڵام خـوا فـەرمووی : ﴿ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ﴿٤٦﴾ ﴾، ئـەی نـووح ! ئـەو (كـوڕە) هیچ پەیوەنـدیی بـە تـۆوە نیـەو، لـە نـزیكانی تۆ نیـە، {یانـی : ئەهلی تۆ ئەوانـەن كـە لـە ئیمـانو عەقیـدەدا لەگەڵ تـۆ دان، یاخـود : مانـایـەكـەی ئـاوایـە : كـە خـوا فەرموویـەتی : خـۆتو ئەهلـەكـەت دەربـاز دەبـن ، واتـە : ئەو ئەهلـەت كە ئیمانیان بـە تـۆ هێنـاوە ، بـەڵام ئـەوە لـەو ئەهلـەت نیـە ، كـە ئیمانیـان پێت هێنـاوە ، وە كـە پەیوەندیـی ئیمـانو عەقیـدە نەبـوو ، پەیوەنـدیی ڕەچـەڵەكی (نسب) دەپچـڕێ .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی هەشتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی (٦٥ تا ٧٢) دەگرێتە خۆی، واتە: هەشت (٨) ئایەت، دیارە ئەم (٨) ئایەتە ، دەربارەی سێیەمین بەسەرهاتی پێغەمبەرانی خوان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لەو هەشت پێغەمبەرانەی کە لەم سوورەتەدا باسکراون ، کە بەسەرهاتی (هود)ە ، ﷺ لەگەڵ گەلەکەی (عاد) ، دیارە بەسەرهاتی هوود ﷺو گەلەکەشی، واتە: گەلی عاد، وەك بەسەرهاتی نووحو گەلەکەی ، لە گەلێ شوێنی دیکەی قورئاندا هاتووە، یەکێك لە سوورەتەکانی قورئانیش هەر بە ناوی (هود)ەوەیە، کە ئێمە خوا یار بێ لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (هود)دا ، لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەل لەبارەی هوود ﷺو گەلەکەیەوە دەکەین، بۆیە لێرە زۆر ناچینە نێو وردەکارییەکانەوە .

ئەوەی لێرەدا باسکراوە لەبارەی هوودەوە، کورتەیەکە ، کە ئەویش وەك نووح ﷺ سەرەتا بانگی گەلەکەی دەکات، وە بانگی تەنیا خوا پەرستیی (توحید) بە گوێی گەلەکەیدا دەدات ، بەڵام کافرە زلەزلەکانی گەلەکەی ، بە نەفامو درۆزن ، تۆمەتباری دەکەن ، ئەویش زۆر بە ئەدەبو ڕێزو ویقارێکی بەرزەوە ، کە هەر شایستەی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ئەو تۆمەتانە بەرپەرچ دەداتەوە، وە ڕای دەگەیەنێ کە ئەو پێغەمبەری خوای پەروەردگاری جیهانەکانە، وە پەیامی خوای بۆ هێناون، وە بۆیان دڵسۆزو بە پەرۆشە، وە لەگەڵیشیان ئەمینداره.

پاشان هۆشدارییان دەداتێ : کە پەند لە گەلی نووح وەربگرن، وە چاکەو نیعمەتەکانی خوا بەسەر خۆیانەوە یاد بکەنەوە، بەڵام زلەزلەکانی گەلەکەی، واتە : کافرە زلە زلەکان ، قسە ڕۆیشتووەکان ، دەسەڵاتدارەکان، بێمنەتی دەکەن ،

وە ئامادە نابن دەست لە بت پەرستییەك هەڵبگرن ، کە بابو باپیرانیانی لەسەر بوون، ئەویش بۆ دواجار پێیان دەڵێ : کە پەرستراوەکانی ئەوان، جگە لە ناوی بێ نێوەڕۆك ، هیچی دیکە نین، وە پێیان دەڵێ : چاوەڕێی سزای خوا بن، ئەگەر هەر مکوڕ بن لەسەر بت پەرستیی، وە سەرەنجام بەڵای خوا دێ، وە هوود ﷺ خۆیو هەموو شوێنکەوتووانی دەربازدەبن، بەڵام کافرەکان بە سەر زلو ئەوانەی دیکەشەوە ، بە پەیڕەویی لێکراوان پەیڕەوانەوە ، بە قسە ڕۆیشتووانو لاساییکەرانەوە ، هەموویان سەریان بە فەتارەت دەچێ .

﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ
﴿٦٥﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ
مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى سَفَاهَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن
جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ۚ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ
خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ
لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ ٱللَّهَ وَحْدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ
ءَابَآؤُنَا ۖ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم
مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ ۖ أَتُجَٰدِلُونَنِى فِىٓ أَسْمَآءٍ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم
مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٧١﴾
فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۖ وَمَا
كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾.

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە بـۆ لای گـەلــی عــاد هــوودی برایانمــان نــارد، گـوتی: ئـەی گــەلەکەم ! خــوا بپەرستن، جگـە لـەو هـیچ پەرسـتراوی دیکـە (ی شـایسـتەی پەرسـتـران)تـان نـین، ئـایـا پارێـز ناکــەن ! ﴿٦٥﴾ دەسـتـڕۆیشتووانی بێبـڕوای گـەلەکەی گوتیـان : مسۆگـەر ئێمـە تـۆ لە نەفامیی دا دەبینـیـنو پێشـمان وایە لە درۆزنــانی ﴿٦٦﴾ گوتـی: ئـەی گــەلەکەم ! هـیچ نەفـامیـیــم تێــدا نیــە، بـەڵــکو لــە لایــەن پەروەردگــاری جیهانەکــانەوە بــۆ لاتــان ڕەوانــەکراوم ﴿٦٧﴾ پەیامەکــانی پەروەردگــارمتان پـێ ڕادەگــەیەنم، وە مــن دڵسـۆزێکی ئەمیندارم بۆتـان ﴿٦٨﴾ ئـایا پێتـان سـەیر بـوو کـە بیـرخەرەوەیەکـتان بــە پیـاوێکدا لـە خـۆتــان ، لــە پەروەردگــارتانەوە بــۆ هـات، تــاکو بتانتـرسـێنیو وریاتــان بکــاتەوە ! وە یادبکەنــەوە کە (خـوا) ئێـوەی گێـڕاوە بــە جـێگـرەوە لە پاش گـەلـی نـووح، وە لـە ڕووی جەسـتەیی یەوە ، زێدەیی پێـداون ، دەجـا یادی چاکەکـانی خـوا (بـەسـەر خـۆتانەوە) بکەنەوە ، بـەڵکو سەرفـرازبن ﴿٦٩﴾ (زلەزلانـی گـەلەکـەی) گوتیـان: ئـایا بۆیـە هـاتوویـە لامـان ، تاکو بـە تەنیا خـوا بپەرستینو ، ئەوەی بابو باپیـرانمان پەرستوویـانە ، وێـڵـی بکـەین ؟ دەجا ئەگـەر لە ڕاسـتانی ، ئەوەی هەڕەشـەی پـێ لـێمان دەکـەی ، بۆمـان بێنـە ﴿٧٠﴾ گـوتی : بــە دڵنیاییــەوە ، ئـەوە سـزاو تـووڕەییتــان لـە پەروەردگــارتانەوە کەوتـە سـەر (بڕیاری کۆتـایی لەسـەر درا) ئـایا لەبـارەی چەند شـتێکەوە ، کە خـۆتانو بـابو باپیــرانتان ناوتـان لێـناون، (وە هـیچ نێوەرۆکیــان نیـە) خــوا هـیچ بـەڵـگـەی لەســەر نەنـاردوونــە خــوار ، مـشـتومــڕم لەگـەڵــدا دەکــەن ! دەجــا چــاوەڕێ بــن ، منیــش لەگـەڵـتـان لە چاوەڕێـیـانم ﴿٧١﴾ ئیدی سـەرەنجام بـە بــەزەیی خـۆمان خـۆیو ئەوانـەی لەگـەڵــی بــوون قوتارمـان کـردن ، وە ئەوانـەش کـە بــە ئـایەتەکانمــان بێبــڕوا بــوون ، (بڕوادار نەبــوون) دوامــان بڕیــنو قیــڕەبڕمــان کــردن ﴿٧٢﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(سَفَاهَةٍ) : (السَّفَهُ: خِفَّةٌ فِي البَدَنِ، وَثَوْبٌ سَفِيهٌ: رَدِيءُ النَّسْجِ ، وَاستُعْمِلَ فِي خِفَّةِ النَّفْسِ لِنقُصانِ العَقْلِ) واتە: وشەی (سَفَه) بە مانای جەستە سووکیی دێ، وە قوماشێك کە باش نەچنرابێ (سَفِيه)ی پێ دەگوترێ، واتە: باش نەچنراوەو سووکە، پاشان بەکارهێنراوەو خوازراوەتەوە بۆ سووکیی نەفس، لەبەر عەقڵی سووك، چونکە عەقڵ بریتیە لە حەقیقەتی ئینسانو کاکڵی ئینسانە .

(نَاصِحٌ أَمِينٌ) : واتە : دڵسۆزێکی ئەمیندار، (الناصح : مُرِيدُ الخَيْرِ وَالصَّلاَحِ لِلْغَيْرِ) ، هەر کەسێك کە چاکەو بەرژەوەندیی بەرانبەرەکەی بوێ ، پێی دەگوترێ : (نَاصِح)، (أَمِين)یش کەسێکە کە لەگەڵیاندا ڕاستەو خیانەتیان لێ ناکات، (أَمِيْن: مَنْ يُوْثَقَ بِهِ وَيُؤْتَمَنُ، وَالحَافِظُ الحَارِس)، (أَمِين) هەر کەسێکە کە متمانەی پێ بکرێو ، خەڵك لێی دڵنیا بێ، وە هەر کەسێکە کە پارێزەر بێ، وە پاسەوان بێ بۆ ئەمانەتو سپاردەی خەڵك .

(بَصۜۡطَةً) : (بَسْط الشيءِ : نَشْرُهُ وَتَوسِيعُهُ) (بَسْط) واتە: بڵاوکردنەوەی شتێك، یاخود فراوانکردنی ، کەواتە: ﴿وَزَادَكُمۡ فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗ﴾ فراوانیی پێتان داوە لە جەستەتان دا ، یانی : جەستەی گەورەو بەهێزی پێداون .

(ءَالَآءَ ٱللَّهِ) : (آلاَءَ: جَمْعُ أَلاً وَإِلَىً ، نَحُو : أَنَاً وَإِنَىً لِوَاحِدِ الآنَاء)، (آنَاءَ اللَّيْل) بە (أَنَاً وَإِنَىً) کۆ دەکرێتەوە، کەواتە: (آلاَء)یش یان کۆی (أَلاً)ە، بە دوو سەر، یان کۆی (إِلَىً)ە، دیسان بە دوو سەر، (أَلاً وَإِلَىً) واتە: یەك نیعمەت، بەڵام (آلاَء) واتە: نیعمەتەکان ، کەواتە (ءَالَآءَ ٱللَّهِ) یانی : چاکەو نیعمەتەکانی خوا .

(وَنَذَرَ ) : (نَدَعُ وَنَتْرُكُ) واتە: لێی دەگەڕێین‌و وازی لێ دێنین .

(رِجْسُ ) : (الرِّجْس : الشَّيءُ القَذِر) واتە : (رجْس) بە مانای پیسیی دێ ، یاخود بە مانای شتێکی پیس دێ، هەروەها (الفِعْل القَبيح ، والكُفر والعَذَاب) بە کردەوەی خراپ‌و بە کوفرو بە سزاش دێ. (وَهُوَ عَلَى أَرْبَعَة أَوْجُهٍ : الطَّبْعُ وَالعَقْلُ وَالشَّرْعُ وَ ثَلاَثَتُهَا) واتە : چوار حاڵەتی هەن :

١/ ئەو شتە بە سروشت ئینسان قێزی لێ بکاتەوە .

٢/ یاخود بە عەقڵ بزانرێ کە ئەوە پیسە .

٣/ یان شەرع بە پیسی لە قەڵەم دابێ .

٤/ یاخود هەم بە سروشت‌و هەم بە عەقڵ‌و هەم بە شەرعیش، کەواتە: دەکاتە چوار جۆر.

(دَابِرَ ): (قَطَعَ اللّهُ دَابِرَهُمْ : أي آخِرَ مَنْ بَقِيَ مِنْهُمْ)، واتە : (دَابِر) یانی : (آخِرْ) کۆتا کەسێکە کە لە کۆتاییدا ماوەتەوە، واتە : دوابڕاو بوون .

## مانـای گشـتـی ئایەتەکـــان

سەرەتا لەبارەی ئەسڵو ڕەچەڵەکی عەرەب بە گشتیو ، گەلی یان هۆزی (عاد) کە عەرەب بوون ، دەڵێین: عەرەب بە گشتی سێ جۆرن: (العَرَبُ البَائِدَة، العَرَبُ العَارِبة، العَرَبُ المُستعْرِبة) یانی : عەرەبی لە بەین چوو، وە عەرەبێك كە لە ئەسڵدا عەرەبن، وە عەرەبێك كە عەرەب نەبوونو، بوون بە عەرەب، ئنجا دیارە هۆزی (عاد) لە (العَرَبُ البَائِدَة)ن، كە هەندێك دەڵێن: دە (١٠)، وە هەندێكیش دەڵێن : سێزدە (١٣) تیرە (عشيرة) بوونو لەو شوێنە بوون كە پێی دەگوترێ : (بلادُ العَرَب) واتە : ئەسڵی ئەو شوێنەی كە گەلی عەرەبی تێدابووە ، كە بریتیە لە : (أرض اليمن ، وحضرموت ، وعمّان) ئەو ناوچەیە ، كە نشینگەی ئەسڵیی گەلی عەرەبە، گەلی (عاد) لەو شوێنەدا ژیاون، وە لە قورئاندا باسی (الأحقاف) كراوە ، ئەو شوێنەی كە گەلی عادی لێبووە ، واتە : ئەو گەلەی كە هوودیان بۆ لا ڕەوانەكراوە ، (محمد طاهر بن عاشور)یش لە پێناسەی (الأحقاف)دا دەڵێ : (رمال بَيْنَ حَضْرمَوت و عمان)[1] ئەو دەشتە لماویەیە كە لە نێوان (حَضرموت و عمان)ە.

ئنجا پێش ئەوەی بچینە سەر مانای گشتی ئەو ئایەتانە ، پێویستە ئەوەش بزانرێ، كە وشەی (عاد) دیارە لە قورئاندا تەصریف كراوەو حاڵەتی (رَفْع وَ نَصْب وَ جَـرّ)ی وەرگرتوەو ، شارەزایانی زمان لەوبارەوە گوتوویانە : (كَلِمَةُ عَادَ : سَاغَ صَرْفُهُ لِإِنَّهَا ثُلاَثِيٌّ ساكن الوَسْط ، مِثْل : نُوح و لُوط) هەڵبەتە وشەكانی : {نوح و لوط و عاد} هەر سێكیان ئەعجەمیین ، بەڵام بۆچی صەرف كراون ؟ لەبەرئەوەی كە لە سێ پیت پێكهاتوونو ، پیتی نێوەڕاستیشیان زەنەدار (ساكن)ە .

سەرەتاو لە دەستپێكی تەفسیركردنی ئەو ئایەتانەدا دەڵێین :

---

١) التحرير والتنوير : ج ٨ ، ص٢٠٠.

خوا ﷻ باسی گەلی (عاد) دەکاتو دەفەرموێ : ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ﴾، وە بۆ لای گەلی (عاد)، (هود) ی برایانمان ڕەوانەکرد، وە لە دوایی دا کە باسی گەلی (ثمود)یش دەکات ، دەفەرموێ: ﴿ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ﴿٦١﴾ ﴾هود، کە دوایی کە باسی گەلی (مدین)یش دەکات ، دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ﴿٨٤﴾ ﴾هود، وەك دوایی باسی دەکەین، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) لە ڕووی ڕەچەڵەك (نسب)ەوە ، لەو گەلانە بوون، واتە: ئەوە نەبووە کە لە گەلێکی دیکە بووبن ، هاتبن، بەڵکو لە گەلی خۆیان بوون، بۆیە خوای پەروەردگار وشەی : برا (أَخ)ی بۆ بەکارهێناون : ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾، بۆ لای گەلی عاد ، هوودی برایانمان نارد، پێی گوتن: ئەی گەلەکەم ! خوا بپەرستن، جگە لەو هیچ پەرستراوێکی دیکەتان نیە، ئایا پارێزی لێ ناکەن، واتە: ئایا خۆتان ناپارێزن ، لەوەی کە بێفەرمانیی خوا بکەن، وە سەرەنجام تووشی سزای خوای دادگەر ببن؟!

﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾، دەستڕۆیشتووانێك کە کافر بوون لە گەلەکەی گوتیان : بێگومان ئێمە تۆ لە نەفامییدا دەبینین، وە ئێمە پێمان وایە کە تۆ لە درۆزنانی، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى سَفَاهَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، گوتی : ئەی گەلەکەم ! من {نەك لە نەفامییدا نیم، وە لە درۆزنانیش نیم}، بەڵکو هیچ جۆرە نەفامییەکم تێدا نیە، بەڵکو من ڕەوانەکراوم لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە .

لێرەدا دیسان دەبینین هوود ﷺ یش وەك نووح ﷺ بە نەزاکەتو بەوپەڕی ڕێزو حورمەتەوە ، وەڵام دەداتەوە، بە ڕێزو حورمەتو ویقارەوە کە شایستەی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) ئەگەرنا ئەگەر پێی فەرمووبان : بەڵکو

ئێوە زۆر زۆر نەفامنو، ئێوە زۆر درۆزنن ، ڕاستی دەفەرموو، بەڵام وەك شایستەی ئەوانە ، وەڵام ناداتەوە ، بەڵكو وەك شایستەی خۆیەتی ، وەڵام دەداتەوە ، واتە: ناچێتە ئاستی نزمی ئەوانەوە ، بەڵكو لە ئاستی بەرزی خۆیدا دەمێنێتەوە .

ئنجا هوود ﷺ پێناسەی خۆی دەكات، دەڵێ : ﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَالَاتِ رَبِّي وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾، پەیامەكانی پەروەردگارمتان پێ ڕادەگەیەنم، وە من بۆ ئێوە دڵسۆزێكی ئەمیندارم، زۆر بە تەنگتانەوەم بە پەرۆشتانەوەم، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) وە شوێنكەوتوانی پێغەمبەران ، هەمیشە بە تەنگ خەڵكەوە بوون ، بۆ خەڵك بە پەرۆش بوون ، بۆ خەڵك دڵسۆز بوون ، وە لەگەڵیشیاندا ئەمینو دەستپاك بوون .

ئنجا هوود دەڵێ : ﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ﴾، ئایا پێتان سەیر بوو ، كە لە پەروەردگارتانەوە بە پیاوێك دا لە خۆتان {كە دەیناسنو لە گەلی خۆتانە، ئینسان ئەگەر لە قەومێك بێ ، زیاتر بۆیان دڵسۆز دەبێ، بە شێوەیەكی فیطرییو جیبیللی} ، بیرخەرەوەیەكتان لە پەروەردگارتانەوە بۆ بێ ، تاكو وریاتان بكاتەوەو بتانترسێنێ ، ئایا پێتان سەیر بوو ، كە هیچ جێی سەرسوڕمان نەبوو ، بەڵكو جێی سەرسوڕمان ئەوەیە كە : خوا بەندەكانی خۆی وێڵ بكاتو ئاگاداریان نەكاتەوەو ، پەیامیان بۆ نەنێرێ، ﴿ وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَصْطَةً ﴾، وە یاد بكەنەوە كە خوا ئێوەی كرد بە جێنشین لە دوای گەلی نووح، وە لە ڕووی جەستەو بەدەنتانەوە زیادەی پێداون، واتە: جەستەو بەدەنێكی بەهێزتر لەوانی ، پێداون، ﴿ فَاذْكُرُوا آلَاءَ اللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، دەجا یادی چاكەكانی خوا بەسەر خۆتانەوە بكەنەوە، بەڵكو سەرفراز بن.

پێیان دەڵێ : کە چاکەکانی خوا یاد بکەنەوە ، یانی ئەگەر خوای تاكو تەنیا لەبەرئەوەش ناپەرستن ، کە شایستەی پەرستن‌و بەندایەتیی بۆ کردنە ، لەبەرئەوە بیپەرستن ، کە چاکەی بەسەرتانەوە ، هەیە ، بۆیە دەفەرموێ : ﴿ فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، دەجا چاکەکانی نیعمەتەکانی خوا یاد بکەنەوە ، بۆ ئەوەی سەرفراز بن، بەڵکو سەرفراز بن، کە چاکەکانی خواتان یاد کردەوە، ئەو کاتە ئەگەر نمەكو ئەمەگتان هەبێ، وەفاتان هەبێ، دەبێ کەسێك کە چاکەی لەگەڵ کردووی ، دەبێ تۆش لەقەدەر چاکەی وی بی، تۆش چاکە لە بەرانبەر چاکەدا بکەی، ئەوەش دەبێتە هۆی سەرفرازیی، بەڵام ئەوان دەڵێن چی ؟

﴿ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ ٱللَّهَ وَحْدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾ گوتیان : ئایا تۆ هاتووی بۆ لامان ، تاکو تەنیا خوا بپەرستین، وە ئەوەی کە بابو باپیرانمان دەیانپەرست ، وازیان لێ بێنین‌و وێڵیان بکەین ؟ پێیان شتێکی زۆر سەیر بووە ، کە هوود ﷺ داوایان لێ بکات تەنیا خوا بپەرستن، وە ئەوەی کە بابو باپیرانیان پەرستوویانە ، لە بتو صەنەم‌و ناوە بێ نێوەڕۆکەکان ، وازیان لێ بێنن ، ئەوان زۆر پێیان داوایەکی سەرسوڕهێنەر بووە .

سُبْحَانَ الله ! بەشەر کە میزاجو عەقڵو فیطرەتی تێکدەچێ ، شتە چاکەکانی بە خراپ دێنە بەرچاو، وە شتە پاکەکانی بە پیس دێنە بەرچاو، وە شتە ڕاستەکانی بە چەوت دێنە بەرچاو، وە بە پێچەوانەشەوە، شتی پیسو خراپو چەوتی ، بە پاكو چاكو ڕاست ، دێتە بەرچاو، هەروەك کەسێك کە میزاجی تێکدەچێ بە گرانەتا ، ئاوی شیرینی بە زاری تاڵە ، خوا بمانپارێزێ لە تێکچوونی میزاجی عەقڵو فیطرەتو سروشت ، بۆئەوەی شتەکان وەك خۆیان ببینین ، نەك هەڵیان بگێڕینەوە .

ئنجا ئەوان لە جیاتی ئەوەی کە ئیمانی پێ بێنن، دەڵێن: ﴿ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، دەجا ئەوەی کە تۆ هەڕەشەی پێ لە ئێمە دەکەی‌و ، گفتمان پێ دەدەی، بۆمان بێنە ، ئەگەر لە ڕاستانی .

﴿ قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ ﴾، پێغەمبەر هوود ﷺ وەڵام دەداتەوە، دەڵێ: ئەوە لە پەروەردگارتانەوە سزاو تووڕەییتان لەسەر پێویست بوو، دیارە کاتێك هوود ﷺ ئەوەی فەرمووە کە خوای پەروەردگار هەواڵی پێداوە ، کە ئەو گەلە ، ئیمان ناهێنن، وە تۆ توانای خۆت لەگەڵیاندا سەرف کرد، وە بەڵگەت لەسەر تەواو کردن، وە بیانوو بڕاوت کردن، ئێستا کاتی ئەوە هاتوە ، سزا بدرێن، هەڵبەتە دوای ئەوەی کە خوا هەواڵی پێداوە ، ئەو قسەیەی پێ گوتوون ، کە ئەوە بڕیاری سزاو تووڕەیی پێویست بوونی پەروەردگارتان ، لەسەر ئێوە ، هاتە دی ، ﴿ أَتُجَادِلُونَنِي فِي أَسْمَاءٍ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم ﴾، ئایا شەڕە قسەو مشتومڕ لەگەڵ من دەکەن، دەربارەی چەند ناوێك کە خۆتانو باوو باپیرانتان ئەو ناوانەتان بەکارهێناوە ؟! واتە : بۆ ئەو بتو صەنەمانە کە هەر ناونو ، نێوەڕۆکیان نیە، ﴿ مَّا نَزَّلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ ﴾، خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردوونە خوار، واتە : پەرستراو دەبێ لەلایەن خواوە بەڵگەی لەسەر بێ، مادام خوا بەڵگەی لەسەر نەناردوونە خوار، کەواتە : دیارە شایستەی پەرستران نین ، ﴿ فَانتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ ﴾، کەوایە : ئێوە چاوەڕێ بن ! منیش لەگەڵ ئێوە لە چاوەڕوانانم .

ئنجا دەفەرموێ : ﴿ فَأَنجَيْنَاهُ وَالَّذِينَ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا ﴾، سەرەنجام : خۆیی و ئەوانەی کە لەگەڵی دابوون ، {واتە: بە ئیمانەوە لەگەڵی دابوون}، دەربازمان کردن ، بە بەزەیی خۆمان ﴿ وَقَطَعْنَا دَابِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ﴾، وە ئەوانەی کە بێبڕوا بوون بە ئایەتەکانمان ، دوابڕاومان کردن، واتە: دوا هەمینیانمان بڕی، ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێك هی دواییان لە بەین بچێ ، مانای وایە هی پێشەوەیان زووتر لە بەین چووە ، یانی دوابڕاومان کردن، لە کوردەوارییش دا دەگوترێ : دوابڕاو کران، یان قیرە بڕاو کران، ﴿ وَمَا كَانُوا مُؤْمِنِينَ ﴾، وە ئەوانە بڕوادار نەبوون ، ئنجا لەبەرئەوەی بڕوادار نەبوون ، بە پێی یاسای دادگەرانەی خوا ﷻ لە گەلانی پێشوودا ،

یاسای خوا وابووه کە هەر گەلێك، یان هەر کۆمەڵگایەك ئاوا عاصیَ بیَ لە پێغەمبەری خۆی، خوای کارزان بەو شێوەیە سەر زەمینی لیَ پاك بکاتەوە.

دیارە ئۆممەتی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ لەو بنچینەیە هەڵاوێردراوە، چونکە ئەو بەشەرە ، کە موحەممەد ﷺ بۆ لای ڕەوانە کراوە، دوا ئەڵقەی وەچەی بەشەرە ، بەو واتایە کە : ئەگەر خوا ﷻ لە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم ، بە پێی ئەو یاسایە مامەڵەی لەگەڵ بەشەردا کردبایە ، کە مامەڵەی پیَ لەگەڵ گەل و کۆمەڵگاکانی پێغەمبەرانی دیکەدا کردوە، دەبوو بەشەری بڕیبایەوە لەسەر زەوی ، چونکە پێغەمبەرانی دیکە بۆ گەلێکی دیارییکراوو ، بۆ هۆزێکی دیارییکراو هاتوون ، ئنجا ئەگەر ئەو هۆزو گەلە لە بەین چوو بیَ ، خەڵکێکی دیکە ماوە لەسەر زەوی، بەڵام خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەمی بۆ هەموو مرۆڤایەتییو جند ناردوە، بۆیە ئەگەر هەرچی ئیمانی پیَ نەهێنابا ، لە بەین برابایە ، ئەو کاتە خەڵکی سەر زەوی هەمووی لەبەین دەچوو، بەشەرو جند هەموویان لە بەین دەچوون ، وەك هی گەل و کۆمەڵگایەکانی پێغەمبەرەکانی دیکە نە دەبوو ، کە لە شوێنێکی دیارییکراودا ، گەلێکی دیارییکراو ، هۆزێکی دیارییکراو لە بەین بچیَ ، گەلەکەی دیکە بمێنێتەوە ! بۆیە خوای کاربەجیَ بە هەمان یاسای کە لەگەڵ گەلان و کۆمەڵگاکانی پێغەمبەرانی دیکەدا ڕەفتاری کردوە ، بەو یاسایە مامەڵەی لەگەڵ ئۆممەتی پێغەمبەری کۆتایی دا نەکردوە، چونکە ئۆممەتی پێغەمبەری کۆتایی دەبێتە دوو بەش : بەشێك کە وەڵامی داوەتەوە ، واتە: ئەهلی ئیمانن ، وە بەشێك کە وەڵامی نەداوەتەوەو لەسەر کوفرو شیرك و ئیلحاد ماونەوە .

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرمویّ: ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾، پێنج هەڵوەستە لەبەردەم ئەم ئایەتەدا دەكەین :

هەڵوەستەی یەكەم : پێشتریش باسمان كرد ، كە گەلی عاد ، لەو ناوچەیە بوون كە پێی دەگوترێ (الأحقاف) ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَٱذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُۥ بِٱلْأَحْقَافِ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحقاف، كە دەكەوێتە نێوان (حضرموت) و (عُمان)ی ئێستاوە، لەوێ ژیانیان گوزەراندوە .

هەڵوەستەی دووەم : كە دەفەرموێ : ﴿ أَخَاهُمْ هُودًا ﴾، وەك ئەوانەی دیكە، كە دەربارەی صالح دەفەرموێ : ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَـٰلِحًا ۚ ﴿٦١﴾ ﴾هود ، دەربارەی شوعەیب دەفەرموێ : ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ﴿٨٤﴾ ﴾هود ، واتە : لە ڕووی ڕەچەڵەكەوە برایان بووە، واتە: برای نەسەبییان هەبووە، یانی : برایەتییەكەیان برایەتیی نەتەوەیی ، یان برایەتیی نیشتیمانیی بووە ، كەواتە : ئەم وشەیە ئەگەر بەكاربهێنرێ بۆ كەسێك نامسوڵمان بێ، مولحید بێ ، بتپەرست بێ ، بەڵام مادام لە ڕووی نەسەبو ڕەچەڵەكەوە لەگەڵتدا یەك دەگرێتەوە ، هیچ ئیشكالێكی تێدا نیە، بەڵكو ئەگەر بۆ هەموو خەڵكی سەر زەوی بەكاربهێنرێ، بەو ئیعتیبارەی كە بەشەر هەمووی دەبێتەوە خێزانێك، هەموومان لە ئادەمو حەوواوا پێكدەگەینەوە، هەموو براو خوشكی یەكدین ، هەموو ڕۆڵەی یەك دایكو بابین ، دیسان هیچ ئیشكالێكی تێدا نیە ! كەواتە : ئەگەر بێتو لەسەر ئاستی نیشتمانێك بەكاربهێنرێ ، لەپێشترو چاكتریشە ، چونكە ئەو خەڵكە لە ڕووی

نیشتیمانییەوە ، یان لە ڕووی نەتەوەییەوە، پێك دەگەنەوە ، ئەوە هیچ ئیشکالێکی تێدا نیە، چونکە برایەتیی تەنیا برایەتیی ئیمانیی‌و ئایینیی نیە، بەڵکو چەند جۆرە برایەتیی دیکەش هەن، ئەگەرنا بە تەئکید کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودًا ﴾، دیارە هوود ﷺ برای ئیمانیی‌و ئایینیی گەلی عاد نەبووە، بە بەڵگەی ئەوەی کە گەلی عاد هەموویان ئەهلی کوفر بوون‌و، خواش هەموویانی لەبەین بردوون، ئەدی ئایا چ جۆرە برایەتییەکیان لە بەیندا هەبووە ؟ بێگومان برایەتی نەسەبیی ، کەواتە : وەك چۆن برایەتیی ئیمانیی هەیە ، برایەتی ڕەچەڵەك‌و (نسب)یش هەیە ، وە برایەتیی نیشتیمانیی‌و ، برایەتیی نەتەوەییش هەیە .

<u>هەڵوەستەی سێیەم</u> : ئنجا هوودیش وەك نووح گەلەکەی دەدوێنێ : ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ ﴾، ئەی گەلەکەم ! ئەی خەڵکەکەم ! ئەی ئەو کۆمەڵگایەی کە من لە نێوتان دام ! ﴿ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ﴾، دیارە ئەمە خوێنراویشەتەوە : ﴿ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِهِ ﴾، کە هەردووکیان لە ڕووی ڕێزمانییەوە تەواون، واتە: خوا بپەرستن جگە لەو هیچ پەرستراوێکی دیکەتان نین .

<u>هەڵوەستەی چوارەم</u> : ڕەنگە یەکێك بڵێ: ئەدی ئەوە نیە خەڵك شتی دیکە دەپەرستن ؟ کەواتە پەرستراوی دیکە هەن ! دەڵێین : واتە : ﴿ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ بِحَقٍّ ﴾، یاخود : ﴿ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ حَقٍّ غَيۡرُهُۥٓ ﴾، واتە: هیچ پەرستراوی دیکەی ڕاستتان نین، ئەگەرنا پەرستراوی ناڕاست ، هەن ، بەڵام پەرستراوێك کە شایستەی پەرستران بێ ، نیە ، ئەگەرنا پەرستراوانێك کە شایستەی پەرستراني هەق نین، هەن .

هەڵوەستەی پێنجەم : ﴿ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾، ئایا خۆتان ناپارێزن ؟ یانی : ئایا خۆتان لە سزای خوا ناپارێزن ، کە واز لە بتپەرستییو واز لە غەیری خوا پەرستیی ، بێنن، بۆ ئەوەی کە تووشی سزای خوا نەبن .

مەسەلەی دووەم: کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾، لێرەدا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦٓ ﴾، بەڵام لە هی نووح ﷺدا فەرمووی : ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ ﴿٦٠﴾ ﴾الأعراف، کەواتە : ئەوەی نووح هەموو زلەزلانی گەلەکەی، کۆمەڵگاکەی، هەموو دەستڕۆیشتووەکان یەك هەڵوێست بوون و، پێکەوە دژی نووح بوون، بەڵام هی گەلی عاد، هەموو دەستڕۆیشتووەکانی ، دژی هوود ﷺ نەبوون ، بەڵکو تەنیا ئەوانەیان کە بێبڕوا بوون، وابوون، بەڵام کەسانێکیش هەبوون کە دەستڕۆیشتووش بوون، بەڵام دژی هوود نەبوون، چونکە بێبڕوا نەبوون، چونکە کە دەفەرموێ : ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦٓ ﴾، ئەو زلەزلانەی بێبڕوا بوون، بەڵام لە هی نووح دا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ ﴿٦٠﴾ ﴾الأعراف، واتە: هەموو دەستڕۆیشتووانی گەلەکەی، ئەوە هەڵوێستیان بوو .

لێرەشدا بۆمان دەردەکەوێ کە کتێبی خوا چەند وردە : دیارە لە نێو گەلی عاددا ، هەندێك کەسی دەستڕۆیشتوو و خاوەن ئیمکانیەت هەبوون، کە ئیمانیان بە هوود ﷺ هێناوە، بەڵام لە نێو گەلی نووحدا ، هیچ کەسێکی دەستڕۆیشتوو نەبووە، بۆیە خوای پەروەردگار ئاوا لێکی جیا کردوونەتەوە.

ئنجا گەلی عاد دەڵێن: ﴿ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾، لێرەدا گەلی عاد دووان لە گەورەترین جۆری جنێوو تۆمەت ،

ئاراستەی هوود ﷺ دەكەن ، چونكە ئینسان بە چی ئینسانە ؟ دەڵێن : (إِنَّما الْمَرْءُ بِأَصْغَرَيْهِ : عَقْلِهِ وَلِسانِهِ، أو قَلْبِهِ وَلِسانِهِ) ئینسان بە دوو شتە بچوكەكان ئینسانە : بە عەقڵیی‌و بە زمانی، یان بە دڵ‌و زاری .

لێرەدا ئەوانە هوود ﷺ تۆمەتبار دەكەن‌و دەڵێن : تۆ نەفامی : ﴿إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٍ﴾ ئنجا ناشڵێن : نەفام (سَفِيه)ی، چونكە كە بڵێن : (سَفِيه)ی ، ئەوە تەنیا بە (نەفام) داناوە ، بەڵام كە دەڵێن : ﴿فِي سَفَاهَةٍ﴾، واتە : تۆ لە نەفامیی دا نوقم بووی‌و نغرۆ بووی ، كە ئەوە زێدەڕۆیی زیاتری تێدا هەیە .

دوایی زمانیشی تۆمەتبار دەكەن ، كە قسەی ڕاستی پێدا نایەت‌و ناشڵێن : (كَذَبْتَ) یان (أَنْتَ كاذِبٌ)، بەڵكو دەڵێن: ﴿وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ وە ئێمە تۆ دەبینین‌و پێمان وایە تۆ لە درۆزانانی، واتە: لە درۆكردندا هێندە قووڵ بوویەوەو ئیشت لەسەر درۆكردن كردوە، چوویە ڕیزی درۆزنانەوە ! هەڵبەتە لێرەدا وشەی: (نَظُنُّكَ)، بە مانای دڵنیایی (یقین)ە ، چونكە (ظن) لە قورئاندا بە مانای گومان هاتوە ، وە بە مانای یەقین‌و دڵنیاییش هاتوە ، ئنجا بە پێی سیاقەكە ، دەبێ بزانین كام مانایە، مەبەستە ؟ بۆ وێنە ئەو شوێنەی كە دەفەرموێ : ﴿ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ ٱللَّهِ ﴿٢٤٩﴾﴾ البقرة ، ئەوانەی كە پێیان وایە كە بە دیداریی خوا دەگەن ، لێرەدا (یظنون) یانی : یەقینیان وایە ، چونكە ئەوە مەدحە، دیارە كەسێك گومانی هەبێ ، داخۆ دەگاتە خوا ، یان ناگاتە خوا ، قیامەت دێ ، یان قیامەت نایەت ؟ ئەوە بابای وا ، نەك هەر مەدح ناكرێ ، بگرە هەر بە ئیمانداریش لە قەڵەم نادرێ .

كەواتە: لێرەدا ﴿وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ ، یانی : (إِنَّا لَمُسْتَيقِنُونَ أَنَّكَ مِنَ الكاذِبِين)، ئنجا وەك گوتم: بەم قسەیە گەورەترین قسەی ناشیرینیان ئاراستەی هوود ﷺ كردوە، وە گەورەترین تۆمەتیان ئاراستە كردوە، ئنجا با بزانین هوود ﷺ پێغەمبەری پایە بەرزی خوا ، پێغەمبەری پڕ نەزاكەت‌و بە

ئـەدەب ، چۆن وەڵامی ئەو تۆمەتـانە دەداتـەوەو چۆن لەگـەڵ ئـەو گـەلەی خـۆیدا ، لەگەڵ ئەو زلـە زلانـی بێبـڕوای گەلەکـەیدا ، ڕووبـەڕوو دەبێتــەوە ؟

**مەسەلەی سێیـەم** : کە دەفـەرموێ : ﴿ قَالَ يَـٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي سَفَاهَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٧ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾، ئـــــەی خەڵکەکەم ! ئەی گەلەکـەم ! هیچ نەفامییـەك لـە منـدا نیـە، نـەك لـە نـەفامیی دا نقوم نەبووم، بـەڵکو هیچ جۆرە نەفامییــەك لـە منـدا نیــە، ئنجـا ناڵــێ مـن درۆزن نیــم، چـونکە ئـاشــکراو دیــار بـووە کـە هــوود ﷺ قسـەی درۆ ناکــات، واتـە: بـە پێویسـتی زانیـوە تۆمـەتی نەفامیــی لـە خــۆی دوور بخاتـەوە، بــەڵام بــە پێویســتی نەزانیــوە بڵـــێ: مــن درۆزن نیـــم، بۆچـــی ؟ چـونکە مەســـەلەی نــەفامیی داخــۆ ئینســانەکە نەفـامە ، یـان نەفــام نیــە، ئـەوە پێویسـتی بــە ڕوونکردنـەوە دەکـات، بـەڵام ئـەوە کـە ئایا ڕاســتگۆیە ، یاخـود درۆزنـە ؟ ئەوە دیار دەبـێ ، وەك گوتــراوە : مەیـدانی درۆیــە کورتــە، ئەگــەر درۆ بکـات دەردەکـەوێ ، داخـۆ درۆزنــە یــان نــا ؟ بـەڵام مەسـەلەی نەفامیـی ، پێویسـتی بـە بـەڵگە هێنانـەوە هەیـەو ، پێویســتی بـە ڕوونکردنـەوە دەکات ، وە دەتوانین بڵـێین: دوایـی کـە دەفـەرموێ : ﴿ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ ئـەوە وەڵامـدانەوەی هـەردوو تۆمەتەکەیـە، واتـە: بــەڵام مـن ڕەوانـەکراوم لەلایـەن پەروەردگـاری جیهانەکـانەوە ، کەواتـە: کەسێك پەروەردگـاری جیهانەکــان ڕەوانـی بکــات، نابــێ نــەفام بـێ، بـەڵکـو دەبـێ لـە لووتکـەی عەقـڵو تێگەیشـــتن دابـــێ ، وە نابــێ درۆزنیـــش بــــێ ، بـەڵــکو دەبـێ لـە هـەموو کـەس ڕاسـتگۆتر بـێ .

**هوود ﷺ لە نۆ (٩) بڕگەدا وەڵامی گەلەكەی دەداتەوە:**

١) ﴿ لَيْسَ بِي سَفَاهَةٌ ﴾، هیچ نەفامییەك لە مندا نیە.

٢) ﴿ وَلَكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴾، بەڵام ڕەوانەكراوم لە لایەن پەروەردگاری جیهانەكانەوە.

٣) ﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَالَاتِ رَبِّي ﴾، پەیامەكانی پەروەردگارمتان پێ ڕادەگەیەنم ، كەسێك پەیامەكانی پەروەردگار بە خەڵك ڕابگەیەنێ ، دەبێ لە لووتكە دابێ لە هەموو سیفەتێكی بەرزو جواندا، كەسێك نوێنەری خوا بێ، واتە: لە خوا بەرەو ژێر ئەو بێ، دەبێ لەقەدەر خوا بێ، وە لە هەموو ڕەوشتێكی بەرزو جوان لە لووتكە دابێ، ئنجا شایستەی ئەوەیە ، كە خوا بیكاتە نوێنەری خۆی بۆ لای بەندەكانی.

٤) ﴿ وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾، وە من بۆ ئێوە دڵسۆزێكی ئەمیندارم، كێ لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دڵسۆزتر بووە بۆ بەشەر؟ كە تەحمولی ئەو هەموو ناڕەحەتیی‌و ئازارەیان كردوە، ئەو هەموو بێ ئەدەبیی‌و بێ نەزاكەتییەی بەرانبەرەكانیان تەحەممول كردوە، بەڵام وشەیەكی بێنەزاكەتیان لە دەم نەهاتۆتە دەرێ ، چەند دڵسۆز بوون ، چەند بە خەم بوون، چەند بە پەرۆشەوە بوون ، وە چەندیش ڕاست‌و ئەمیندار بوون لەگەڵیان !!.

٥) ﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ﴾، ئایا پێتان سەیر بوو كە لە پەروەردگارتانەوە بە یەكێك لە پیاوەكانتاندا، (واتە: یەكێك لە پیاوەكانی خۆتان، لە نێو گەلەكەی خۆتان دا) بیرخەرەوەیەكتان لە پەروەردگارتانەوە بۆ بێ، بەرنامەیەكتان بۆ بێ ، كە مایەی بیرخستنەوەتانە، یاخود مایەی شەرەف‌و ڕێزو حورمەتتانە، تاكو وریاتان بكاتەوە ، هۆشیارتان بكاتەوە ، بتانترسێنێ‌و لە خەوی غەفڵەت ڕاتان بچڵەكێنێ ، كە : ئەم دنیایە شاری بێ خاوەن نیە، كە ئەمڕۆ دنیایە سبەینێ قیامەتە، وە ئینسان لەوە

بەرزترە، وە لەوە گەورەترە کە وەك ئاژەڵو ماڵاتو پەلەوەرو زیندەوەر ، بۆ ژیانێکی پێنجو دوو ڕۆژی دنیایی بخولڵقێندرێ، بەڵکو ئینسان لەم سەرزەوییە دانراوەو ، هەموو شتەکانی بۆ ڕامو دەستەمۆ کراون ، تاکو تاقی بکرێتەوە ، وەك شاعیرێك دەڵێ :

لَقَدْ خُلِقْتَ لأَمْرٍ عَظِيمٍ لَوْ فَطِنْتَ لَه

فَارْبأ بنَفْسِكَ أن ترعى مَعَ الهَمْلِ

یانی : ئەگەر تۆ بزانیو هەستی پێ بکەی ، بۆ شتێك گەورە دروستکراوی ، له خۆتی مەوەشێنەوە لەگەڵ ئاژەڵدا بلەوەڕێی، واتە ژیانێکی ئاژەڵانەت هەبێ، کە لە نێوان : لەوەڕینو ڕاکشانو ڕیندا ، کورت بێتەوە ، یانی : بخواو بخەوێو خۆی خاڵی بکاتەوە ، ژیانی لەوەدا کورت بێتەوە ، بە تەئکید ئەگەر بەشەر وەك ئاژەڵ بژیەت ، ئەو کاتە لە ئاژەڵ خراپتر دەبێ ، چونکە ئاژەڵ ناتوانێ ئاژەڵ نەبێ ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ ئاژەڵ نەبێ !

٦) ﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ قَوۡمِ نُوحٖ﴾، وە یادبکەنەوە کە (خوا) ئێوەی گێڕاوە بە جێنشین لە دوای گەلی نووح ، واتە : دوای ئەوەی خوا گەلی نووحی لەبەین بردوە ، ئێوە بوونە جێنشینو جێگرەوەی ئەوان ، دیارە لە بەشێك لەسەر زەمیندا ، ئەگەرنا گەلی عاد ، کە هوودیان بۆ لا ڕەوانە کراوە، هیچ کام لە مێژوونووسانو توێژەرەوانی قورئانیش نەیانگوتوە : کە تاکە کۆمەڵێك بوون لەسەر زەوی ژیابن ، لەدوای گەلی نووح، بەڵام دیارە یەکێك لەو گەلانەی کە شوێنی گەلی نووحیان گرتۆتەوە ، عاد بووە ، وە ڕەنگە خەڵکێکی زۆریش بووبن ، ئەگەرنا واپێدەچێ لەگەڵ ئەواندا کە لە ناوچەی (حضرموت)و نێو دوورگەی عەرەبی دا بوون ، خەڵکی دیکەش لە شوێنی دیکە بوو بێ، بە پێچەوانەی گەلی نووحەوە، کە کاتێك گەلی نووح لەو شوێنەی ئەوان لێی بوون ، هەر ئەوان هەبوون لە بەشەر ، لەسەر زەوی، وەك پێشتر باسمان کرد.

٧) ﴿ وَزَادَكُمۡ فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗ ﴾، وە زێدەییشی پێداون لە دروستکراندا، واتە: لە جەستەتاندا (خَلْق) واتە: لاشەو جەستە، (خُلُق) واتە: لایەنی مەعنەویی، وە لایەنی ڕەوشتییو ئاکاری، بۆیە سوننەتە کە ئینسان تەماشای ئاوێنە دەکات ، ئەو دوعایە بکات بڵێ: ﴿اَللَّهُمَّ فَحَسِّنْ خُلُقِي، كَمَا أَحْسَنْتَ خَلْقِي﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٤٣٧)، وَقَالَ الهَيْثَمِيُّ: رجاله رجال الصحيح، وَالبُخَارِيّ في (الأَدَب المفرَد) برقم: (٢٩٠)، وَأَبِي يَعْلَى برقم: (٥١٨١)، وَإِبْنُ أَبي شَيْبة برقم: (٣٦٧)، والبيهقي في (شعب الإيمان) برقم: (٨٥٤٥)}، واتە: ئەی خوایە ! ڕەوشتم جوان بکە، وەك چۆن جەستەت جوان کردووم .

کەواتە: ﴿ وَزَادَكُمۡ فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗ ﴾، واتە: لە ڕووی جەستەو بەدەنو ڕواڵەتو کەلەشتانەوە ، زیادەی پێداون، وە دیارە کە لە شوێنی دیکەش خوای زاناو توانا باس دەکات، کە گەلی عاد گەلێکی زۆر بە هێزو توانا بوون ، لە ڕووی جەستەوەو زۆر بە کەلەشو زل بوون .

٨) ﴿ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ ﴾، دەجا یادی چاکەکانی خوا بکەنەوە بەسەر خۆتانەوە، چاکەکانی خوا بێننەوە بەرچاوی خۆتان، بۆئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن بۆ خوا، وەك گوتم : ئەگەر لەبەر ئەوەش خوا ناپەرستن، کە شایستەی پەرستنە، لەبەر ئەوە بیپەرستن ، کە چاکەی لەگەڵتان کردوە، سپڵەو بێ وەفاو بێ ئەمەگ مەبن .

٩) لە کۆتایی دا دەڵێ : ﴿ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، بەڵکو سەرفراز بن، ئەگەر ئەوانە ڕەچاو بکەن، سەرفراز دەبن، خۆشبەخت دەبن، بە مراد دەگەن.

کەواتە : هوود عليه السلام لە پێنج تەوەردا وەڵامی گەلەکەی دەداتەوە :

أ/ لە تەوەری یەکەم دا ، بەرپەرچی تۆمەتەکەیان دەداتەوە .

ب/ لە تەوەری دووەم دا ، پێناسەی خۆیو بەرنامەکەی دەکات .

ج/ لە تەوەری سێیەم دا ، گومانو دوودڵیی بێجێ دەڕەوێنێتەوە.

د/ لە تەوەری چوارەم دا ، سەرنجیان ڕادەکێشێ کە بۆ مێژوو، پەندی لێ وەربگرن.

ه/ لە تەوەری پێنجەم دا ، سەرنجیان ڕادەکێشێ‌و پێیان دەڵێ: سەرنجی چاکەکانی خوا بدەن، چاکەو نیعمەتەکانی خوا لەسەر خۆیان یاد بکەنەوە .

وە سەرەنجام پێیان دەڵێ : ئەگەر واتانکرد، سەرفرازیی بۆخۆتان دەستەبەر دەکەن.

وشەی (تفلِحُون) لە (فَلْح)ەوە هاتوە ، (الفَلْحُ : الشَقُّ) واتە: لەت کردن‌و شەق کردن ، بۆیە عەرەب دەڵێن : (لا يُفَلِّحُ الحَديدَ إلاَّ الحَدِيدُ) یان دەڵێن: (الحَدِيدُ بِالحَديدِ يُفَلَّحُ) ، واتە: ئاسن بە ئاسن لەت دەکرێ ، وە جوتیار بۆیە پێی دەگوترێ : (فَلاّح) چونکە زەوی دەکێڵێ‌و لەتی دەکات، (مُفْلِح)یش کەسێکە کۆسپەکانی بەردەمی خۆی دەبڕێ ، تاکو دەگاتە ئەو ئامانجەی کە دەیەوێ ، وە (مُفْلِح) لە زاراوەی شەرعدا ، کەسێکە کە لە دنیادا بەختەوەر بووبێ ، وە لە دواڕۆژیشدا سەرفراز بووبێ ، بەهۆی پابەندبوونی بە شەریعەتەوە .

ئنجا سەرفرازیی (فلاح) دنیایی هەیەو ، سەرفرازیی دواڕۆژیی هەیە ، (الفَلاَحُ الدنيَوي : الظَّفْرُ بالسَّعَادَاتِ الَّتِي تَطِيبُ بِهَا الحَيَاةُ الدُّنِيَا، وَهُوَ البَقَاءُ وَالعِزُّ وَالغِنَاء)، واتە: سەرفرازیی دنیایی بریتیە لە وەدەستهێنانی بەختەوەرییەکان کە ژیانی دنیایان پێ خۆش دەبێ ، ئەوانیش بریتین لە : مانەوەو، باڵادەستی‌و ، دەوڵەمەندیی .

بەڵام (الفلاح الأُخروي) سەرفرازیی دواڕۆژ ، لە چوار شتان پێکدێ : (بَقَاء بِلاَ فَنَاء، غِنَاء بِلاَ فَقْر، عِزّ بِلاَ ذُل، عِلْم بِلاَ جَهْل)، واتە: مانەوە بەبێ لەبەین چوون ، بێ نیازیی بەبێ هەژاربوون ، باڵادەستیی بەبێ زەبوون بوون ، وە زانیاریی بەبێ نەفامیی .

کە دیارە ئەوەش تەنیا لە بەهەشتدا دەستدەکەوێ ، خوای پەروەردگار سەرفرازیی دنیاو دواڕۆژمان بە قسمەت بکات .

<u>مەسەلەی چوارەم</u> : کە دەفەرموێ : ﴿ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِنَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَحۡدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾، (گەلەکەی) گوتیان : ئایا تۆ هاتوویە لامان ، تاکو تەنیا خوا بپەرستین، وە ئەوەی کە باب‌و باپیرانمان پەرستوویانە

وازی لـێبێنین ؟ بە سەرسوورمانەوە، وا دەڵێن، یاخود بە نکووڵیی لێکردنەوە ئەو پرسیارە دەکەن ، واتە: شتێکی زۆر سەیرە ! کە تۆ داوامان لێبکەی : دەستبەرداری ئەو بتو صەنەمو پەرستراوانە بین ، کە باب و باپیرانمان لەسەریان بوون ، وە بێنین تەنیا خوا بپەرستین !

هەڵبەتە ئەم مەسەلەی خوا بەیەکگرتن و تەنیا خوا پەرستنە، وەك زانایان گوتوویانە : (عُقْدَةُ العُقَدِ عِنْدَ البَشَر)، واتە: گرێی هەموو گرێیەکان بووە ، لە لای مرۆڤ .

سُبْحَانَ الله ! بەشەر بۆ مەسەلەی تەنیا خواپەرستیی و، تەنیا خوا بە پەرستراوی خۆزانین و، تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، زۆر بە زەحمەت ڕێی داگرتوە، بەڵام بۆ شیرك و هاوبەش دانان ، تەماشا دەکەی زۆر لە لای ئاسان بووە ، وەك خوا لە سووڕەتی (یوسف)دا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾، واتە: زۆربەیان ئیمان بە خوا ناهێنن، مەگەر هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن، کە دیارە هەر کاتێك خواپەرستییش هاوبەش بۆ خوا پەیداکردنی ڕەگەڵ کەوت، ئەوکاتە خوای بێ نیاز نایەوێ ، وە ئەو کاتە بە ئیمانیش لە قەڵەم نادرێ .

ئنجا سەرەنجام دەڵێن : ﴿ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، ئنجا ئەگەر تۆ لە ڕاستانی ، ئەوەی کە هەڕەشەی پێ لە ئێمە دەکەی ، بۆمان بێنە، دیارە کە دەڵێن : ﴿ بِمَا تَعِدُنَآ ﴾، وشەی : (وعد)، یانی : گفت ، (وَعَدَ، يَعِدُ، وَعْداً، الوَعْدُ يُستعْمَلُ فِي الخَيْرِ وَالشرّ، وَعَدَ، يَعِدُ، وَعْداً، والإِيعَادُ فِي الشَّرِّ فَقَط، أَوْعَدَ يُوعِدُ وَعِيداً)، وشەی (وعد) لە خێرو شەڕدا بەکاردێ، واتە: لە بەڵێندانی چاك، وە لە هەڕەشە لێکردنیش دا ، بەڵام (إِيعَاد) کە لە (أَوْعَدَ)ەوە هاتوە، تەنیا بۆ هەڕەشە بەکاردێ .

لێرەدا کە دەڵێن : ﴿ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ ﴾، ئەوەی کە تۆ وەعدی پێدەدەی بە ئێمە، واتە: گفتمان پێدەدەی ، یاخود هەڕەشەی پێ لە ئێمە دەکەی،

چونکە بۆ هەردووکیان بەکاردێ، ئەگەر ڕاست دەکەی بۆمان بێنە، ئنجا با بزانین هوود عليه السلام چۆن وەڵام دەداتەوە ؟

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ ﴾ (هوود عليه السلام) فەرمووی : ئەوە لە پەروەردگارتانەوە سزاو تووڕەییتان کەوتە سەر، واتە : لەلایەن خواوە بڕیاری سزادانتان دەرچووەو لێتان تووڕە بووە .

ئنجا شایانی باسە کە بتپەرستەکان کۆمەڵێك بتو صەنەمیان هەبوون ، کە لە نێوانیان دا : (لات)و (مَنَاة)و (عُزَّى) هەبوون ، کە (لات) هەندێك لە توێژەرەوانی زمانی عەرەبی دەڵێن : (مُؤَنَّث)ی (إِلَه) ، یان (مُؤَنَّث)ی (اللّٰه) بووە ، وە (مَنَاة) (مُؤَنَّث)ی (مَنَّان)ە ، وە (عُزَّى) (مُؤَنَّث)ی (عَزِيز)ە، کە ئەوانە دیارە سێ بت بوون ، بە حیساب سێ بتی مێینە بوون .

ئنجا هوود عليه السلام دەفەرموێ : ﴿ أَتُجَادِلُونَنِي فِي أَسْمَاءٍ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا نَزَّلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ ﴾، ئایا ئێوە شەڕە قسەو مشتومڕ لەگەڵ من دەکەن ، دەربارەی هەندێك ناوان ، کە خۆتانو بابو باپیرانتان ئەو ناوانەتان بەکارهێناون ، بۆ چەند شتێك، لە کاتێکدا کە خوا بەڵگەی لەسەر نەناردوونە خوارێ ؟! دیارە تەنیا خواش دەزانێ دەبێ چی بپەرسترێ، کە تەنیا پەرستراوی بە هەق ، مافی ئەوەی هەیە، بپەرسترێو بەندایەتیی بۆ بکرێ .

کەواتە: عەقیدەو ئیمان، بە تایبەت کرۆکی ئیمانو عەقیدە ، کە بریتییە لە خوا بەیەکگرتن (توحید) دەبێ لەلایەن خواوە هەواڵی پێبدرێ ، وە دەبێ لە لایەن خواوە ، بەڵگەی لەسەر هەبێو عیلمێك لە لایەن خواوە بێ، ئنجا ئێمە بۆمان دەردەکەوێ کە بەشێکە لە ئیمانو عەقیدە، بۆیە هوودیش دەفەرموێ :

﴿ فَانتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ ﴾، چاوەڕێ بن، منیش لەگەڵ ئێوە لە چاوەڕوانانم، یانی : مادام ئیمان ناهێنن ، چاوەڕێی سزای خوا بن.

**مەسەلەی شەشەم و کۆتایی** : ئنجا ئایا سەرەنجام چۆن بوو ؟ خوای پەروەردگار زۆر بە کورتیی‌و بە خولاصەیی دەفەرموێ : ﴿ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا ﴾، سەرەنجام خۆی‌و ئەوانەی لەگەڵی دابوون ، بە بەزەیی خۆمان دەربازمان کردن ، واتە: ئەوانەی بە ئیمان‌و بە عەقیدەوە لەگەڵ پەیام‌و بەرنامەکەی دابوون، ئەگەرنا کافرەکانیش هەر لەگەڵیدا بوون ، وەك خزم‌و قەوم‌و ، لە ڕووی شوێن‌و نیشتیمانەوە ، بەڵام لەگەڵ بەرنامەو ڕێبازەکەیدا نەبوون ، کەواتە : ﴿ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ ﴾، یانی : (وَالَّذِينَ مَعَهُ بالإيمَان والعَقِيدَةِ وَالإتِّبَاعِ) ئەوانەی بە ئیمان‌و عەقیدەو شوێنکەوتنی لەگەڵیدا بوون ﴿ وَقَطَعۡنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، وە ئەوانەی کە بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە نەکردو، بێبڕوا بوون ، دوابڕاومان کردن .

ئنجا لە سوورەتەکانی دیکەدا وەك خوا پشتیوان بێ بە تەفصیلْ لە کاتی ڕوونکردنەوەی مانای ئایەتەکانی سوورەتی (هود) دا باسی دەکەین، خوای تۆڵەستێن‌و دادگەر ، بایەکی زۆر بەهێزی ناردە سەریان‌و بەو بایە ، دوابڕاوی کردن‌و تاقی لێ نەهێشتن ، دوایی دەفەرموێ : ﴿ وَمَا كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴾، ئەوانە بڕوادار نەبوون ، بۆیە شایستەی ئەو سزا سەختەی خوای دادگەر بوون ، کەواتە : خوای پەروەردگار ئاوا بۆمان باسی سەرەنجامی شوومی گەلی عاد دەکات ، کە بە شوێن هوود عليه السلام ی برایان نەکەوتن، وە سەرەنجام زیانباری دنیاو دوارۆژ بوون .

هەڵبەتە ئامانج‌و حیکمەتی بنەڕەتییش لە گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتانەدا ، دەرس و عیبرەت لێوەرگرتنی ئوممەتی پێغەمبەری کۆتایی یە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی نۆیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان حەوت (٧) ئایەت دەگرێتە خۆی : (٧٣ تا ٧٩)، لەو حەوت ئایەتەدا ، خوا ﷻ باسی بەسەرهاتی صالّح ﷺو گەلەكەی واتە: گەلی (ثمود)مان بۆ دەكات، كە چوارەمین بەسەرهاتە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأعراف)دا باسی كردوە، گەلی (ثمود)یش ئەو گەلە بوون ، كە خوا حوشترێكی وەك موعجیزەو بەڵگەی پێغەمبەرایەتیی صالّح ﷺ پێداون ، وە صالّح ﷺ بە گەلەكەی گوتوە : كە دەست لەو حوشترە نەدەن ، ئەگەرنا تووشی سزا دەبن ، ئنجا ئەوان بیرێكیان هەبووە ، دیارە ڕۆژێك حوشترەكە ئاوی لێ خواردۆتەوە ، ڕۆژێكیش خۆیان ئاویان لێ هەڵێنجاوە ، وە ئەو ڕۆژە كە حوشترەكە ئاوی لێ خواردۆتەوە ، دیارە حوشترەكە زۆر گەورە بووەو، ئاوەكەی هەموو خواردۆتەوە، بەڵام ئەوانیش گەلی (ثمود) هەموویان شیریان لێ دۆشیوەو ، سوودێكی زۆریان لێ بینیوە ، وەك موعجیزەیەكیش لە شاخە بەردێكی گەورە هاتۆتە دەرێ ، بەهۆی داواو پاڕانەوەی پێغەمبەر {صالّح ﷺ}ەوە ، وەك دوایی باسی دەكەین ، وە پێی گوتوون : دەستی لێ مەدەن، هەروەها ئامۆژگاریی كردوون كە یادی چاكەی خوا بەسەر خۆیانەوە بكەنەوە ، كە كردوونیە جێگرەوانی گەلی عاد، وە دروستكردنی خانووبەرەی لە دەشتو چیاكاندا ، بۆ ئاسان كردوون .

بەڵام زلەزلانی بێبڕواو خۆ بەزلگرانی گەلی (ثمود)یش ، وەك هەموو گەلانی دیكە ، كەوتوونەتە سەركێشییو یاخیی بوون ، لە بەرانبەر پێغەمبەر صالّح دا، وە مشتومڕیان لەگەڵ بڕواداره چەوساوەكاندا كردوە ، لەبارەی پێغەمبەرایەتیی صالّح ﷺەوە، وە بێبڕوایی خۆیانیان دەربڕیوەو ، سەرەنجام حوشترەكەشیان سەربڕیوەو

پەییان کردوە ، واتە : لاقەکانیان بڕیون ، دوایی سەریان بڕیوە ، وە صالْحیشیان بێمنەت کردوەو ، لە ئاکام دا بوومەلەرزەو چریکەیەکی بەهێز لێی داون ، وە لەگەڵ زەویدا تەختو یەکسان بوون ، صالْحیش پشتی تێکردوونو بە داخو حەسرەتەوە پێی گوتوون : ئەی گەلەکەم ! ئەوە پەیامو بەرنامەی پەروەردگارم پێگەیاندنو ، دلْسۆزییم بۆ نواندن، بەلاّم ئێوە دلْسۆزانتان خۆش ناوێن .

ئنجا خوا پشتیوان بێ ئێمە لە کاتی تەفسیرکردنی سووڕەتی (الحجر)دا ، بە درێژیی باسی بەسەرهاتی صالْحو گەلەکەی (واتە: گەلی ثمود) دەکەین .

(الحجر)یش بەو سەر زەمینە گوتراوە ، کە گەلی (ثمود)ی لێبووە ، بۆیە ئێمە قسەکردنی تێرو تەسەل دەربارەی بەسەرهاتی صالْحو گەلەکەی ، هەلْدەگرین بۆ کاتی تەفسیرکردنی سووڕەتی (الحجر) إن شاء الله .

﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ
غَيْرُهُۥۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةًۖ
فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾
وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ
مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًاۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟
فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ
ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦۚ قَالُوٓا۟
إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا بِٱلَّذِىٓ
ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ فَعَقَرُوا۟ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوْا۟ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُوا۟
يَٰصَٰلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ
فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ
رِسَالَةَ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە بۆ لای گەلی سەموود صالْحی برایانمـان نـارد، گوتـی : ئەی گـەلەکەم ! خـوا بپەرستن جگە لەو پەرستـراوێکی دیکەتان نیە (کە شیاوی پەرستـران بێ)، بێگـومان بەڵگـەیەکی ڕوونتـان لـە پەروەردگارتـانەوە (لەســەر ڕاستیــی مـن) بـۆ هـاتوە : ئـەم حوشتـرەی خوا بـۆ ئێـوە ، نیشـانە (وموعجیـزە)یـە، دەجا لـێی گـەڕێن بـا لـە زەوی خـوادا بلْــەوەڕێو ، بــە خراپـە دەستــی مەگـەیەننــێ، ئەگـەرنا سـزایەکی بــە ئـێش دەتانگــرێ ﴿٧٣﴾ وە یـاد بکەنـەوە کـە (خـوا) ئێـوەی گێـڕاوە بــە جێـگرەوان لـە دوای (گـەلـی) عـاد، وە لـە زەویـدا دەستـڕۆیشـتووی کـردوون، لـە پێدەشتەکـاندا کۆشکـان دروسـت دەکـەنو ، لـە چیاکـانیشــدا خـانووان دەتاشـن، دەجـا یـادی چاکەکـانی خــوا (بـەسـەرخـۆتانەوە) بکەنــەوە، وە خراپـەکـارانە لـە زەویـدا ڕەفـتار مەکـەن ﴿٧٤﴾ ئـەو دەسـتـرۆیشتووانـەی خـۆیـان بـە زلـگـرت لـە گـەلەکـەی ، بـەوانەیان گـوت کـە بڕوایان هێنـا بـوو لـە چەوسێنراوەکـان : ئـایا دەزانـن (قەناعەتتـان وایـە) کـە صـالْح لـە پەروەردگاریــەوە ڕەوانـە کـراوە ؟ (بـڕوادارە چەوسێنراوەکـان) گـوتیـان : (بـەڵــێ)، بێگـومان ئێمـە بـەو (پـەیام)ەی پێـی نێـرراوە ، بڕواداریــن ﴿٧٥﴾ ئەوانـەی خـۆیان بـە زلگرتبـوو ، گـوتیـان : بێگومان ئێمە بەوەی بڕواتـان پێهێنـاوە ، بێبـڕواین ﴿٧٦﴾ ئنجـا حوشتــرەکەیان پەیکــرد (و ســەربڕی)و لـە فـەرمانی پەروەردگــارییان یـاخی بـوونو گـوتـیان : ئەی صالْح ! ئەگەر لە ڕەوانەکراوانی (خوای) ئـەوەی هـەڕەشـەی پـێ لـێمان دەکــەی بەســەرمان بێنــە ﴿٧٧﴾ ئیــدی بوومەلەرزیــەك (ی گــەورە) گرتنـــیو لــە مەنـزڵگاکـەیاندا بــە زەوییــەوە تەخــت بــوون ﴿٧٨﴾ ئنجـا ئـەویش پشتــی تێکــردنو گـوتـی: ئەی گەلەکـەم ! بێگـومان پـەیامی پەروەردگـارمم پێگـەیاندنو (دڵسۆزییـم بـۆ نوانـدن) بـەڵام (چی بکـەم کـە ئێـوە) دڵسۆزانتـان خۆشنـاوێـن ﴿٧٩﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(بَيِّنَةٌ ) : (البَيّنَـةُ: الدِّلاَلَـةُ الوَاضِـحَة عَقلِيَـة كـانَتْ أَو مَحْسُوسـَة، وسُمِي شـهادة الشَّاهِدَيْنِ بَيِّنَـة)، (بَيِّنَـة) يانـی : ڕێ پیشـاندەرێكی ڕوونو ئـاشكرا، جـا چ ڕێ پێشاندەری عـەقڵیی بێ، چ هی بـەرهەسـت بێ، هـەر ڕێ پێشاندانێك كـە مرۆڤـ بگەیەنێتـە ئەنجـام ، پێـی دەگوتـرێ: (بَيِّـنَة)، بۆیـە بـە شـایەدییـدانی دوو شایەدان گوتـراوە: (بَيِّـنَة)، چونكە ئەگـەر دوو شـایەدیـی دادگـەر، شـایەدیی بـدەن لەسـەر شـتێكو بڵێـن : ئەم شـتەمان ئـاوا بينيوە، يـان وامـان بيسـتوە، يـان وامـان ئـاگا لـێ بووە، مانـای وايـە دادوەر ڕێنمـايی دەكـەن بۆ هـەق .

(نَاقَةُ ٱللَّهِ ) : (نَاقَة) كۆيەكـەی (نُوق، وَنِيَـاق)ە، (نَاقَة: أُنْثَى الجَمَل)، حوشـتـری مـێ پێی دەگوتـرێ (نَاقَة)، بـەڵام ئـەوەی پێـی دەگوتـرێ: ﴿نَاقَةُ ٱللَّهِ ﴾، حوشـتـری مێنـەی خـوا، دیارە حوشـترێكی تايبـەت (نَـاقَةُ مَخْصُوصَة) بـووە، كـە وەك دوايـی باسـی دەكـەين لە بـەردێكی گـەورە هـاتۆتـە دەرێ.

(وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ ) : (مَسَّهُ يَمَسُّهُ مَسّاً، الـمَسُّ يُقَالُ فِي كُلِّ مَا يَنَالُ الإِنْسانَ مِنْ أَذَى) وشەی (مَس) بە هەر شـتێك دەگوترێ لە ئازار، كە تووشی ئینسان بـێ (مَسَّهُ يَمَسُّهُ مَسا) واتە: پێـی گـەیشـت ، لە ئـازارو شـتێك كە ئینسان پێی ناخـۆش بـێ .

(خُلَفَآءَ) : (خُلَفَاء) كـۆی (خَلِيفَة)يـە، دەڵـێ : (الخِلاَفَةُ: النِّيَـابَـة عَنِ الغَيْرِ، وَخَلَفَ فُـلاَنٌ فُـلاَناً، قَـامَ بالأَمْرِ عَـنْهُ)، (خِلاَفَة) بريتـيە لەوەی كەسێك لە جياتـی كەسێك بـە كـارێـك هـەڵسـێ، دەگوتـرێ: (خَـلَفَ فُـلاَنٌ فُـلاَناً)، فـلاّنـكـەس لـە جياتـی فـلاّنـكـەس دانيشـت، واتـە: لە شـوێنـی ئەو كـارەكەی بـەڕێوەبـرد.

(وَبَوَّأَكُمْ) : (أَصْـلُ البَـوَاء مُسـاوَاةُ الأَجْـزَاء فِـي الـمَكـان خِـلاَفُ النُّـبـوِّ) ، وشـەی (بَوَاء) ، بريتـيە لە شـوێنێك كە هـەموو بـەشـەكـانی يەكسـان بـن، بـە پێچـەوانەی

(نُبوّ)ە، (نَبا ینبوا) واتە: بەرزبوۆوە لە ئاستی زەوی، دەگوترێ: (بوّأتُ لَهُ مَكانًا : سَوَّيْتُهُ) واتە: شوێنەكەم بۆ خۆش و تەخت كرد .

(وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ) : (العَيْثُ وَالعَثْيُ يَتَقَارَبَان، نَحو جَذْبُ جَبْذ) وشەی (عَيْث، عَثِي) وەك (جَذْب جَبْذ)ە، وە (جَذْب) واتە: ڕاكێشان، ئەوە دووانەش هەردووكیان بە مانای خراپەكاریی دێن، (العَيْثُ وَالعَثْي : الفَسادُ حسًّا وَحُكْمًا)، واتە: چ خراپەكاریی بەرهەستو مەعنەویی بێ، چ لە ڕووی حوكمەوە بێ .

( فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ ) : واتە: سەریان بڕی، یاخود پەییان كرد، واتە: چوار پەلیان بڕی، دەگوترێ: (عُقْرُ الحَوْض والدَّارِ وَغَيْرِهِمَا : أَصْلُهَا ، عَقَرْتُهُ : قطعت أصْلَهُ)، واتە : لە ڕیشەم كێشا، یاخود ڕیشەییم بڕی، (عَقْر) واتە: سەربڕین، وە بە مانای بڕینی پاشوو، یانی : پێیەكانی پاشەوەی وڵاخیش دەگوترێ، یاخود بڕینی هەر چوار پەلی .

(ٱلرَّجۡفَةُ ) : (الرَّجْفَةُ : الإِضْطِرَابُ الشَّدِيدُ)، (رَجْفة) واتە: لەرزینەوە، بوومەلەرزە، دەگوترێ : (رَجَفَتِ الأَرْضُ وَ رَجَفَ البَحْرُ) زەوییەكە لەرزییەوە، یاخود دەریاكە لەرزی و هەژا ، (وَبَحْرٌ رَجَّاف) دەریا كە زۆر بێت و بچێ بهەژێ، پێی دەگوترێ : (رجّاف) .

(جَٰثِمِينَ ) : (جَثَمَ الطائِرُ: إِذَا قَعَدَ وَلَطِيءَ بالأَرْض)، باڵندە كە دەنیشێ و خۆی بە زەوییەوە دەنووسێنێ ، پێی دەگوترێ: (جَثَم)، (جَاثِم) واتە: باڵندە كە خۆی بە زەوی نووساندبێ، وە كە دەفەرموێ : (جَٰثِمِينَ ) واتە : وەك چۆن باڵندە دەنیشێ و خۆی بە زەوییەوە دەنووسێنێ ئەوانەی كە لەبەین چوون ، ئاوا بە زەوییەوە تەخت بوو بوون و بە زەوییەوە نووسا بوون .

## مانای گشتی ئایەتەکان

گەلی (ثمود)یش وەك زانایان گوتوویانە: (أُمَّةٌ عَظِيمَةٌ مِنَ العَرَبِ البَائِدَة كَانَتْ مَسَاكِنُهُم بالحِجْرِ بَيْنَ الحِجَازِ وَالشَّام) کۆمەڵێکی مەزن بوون، خەڵکێکی زۆر بوون لە عەرەبی فەوتاو، پێشتر باسمان کرد، کە عەرەب سێ جۆر بوون : (العرب البائدة) و (العرب العاربة) و (العرب المستعربة)، واتە: عەرەبە لەبەینچووەکان ، وە عەرەبی ئەسڵییو، عەرەبێك کە گەلی دیکە بوونو دوایی بوون بە عەرەب .

وە پێغەمبەری خۆمان (محمد) ﷺ کە دەچێتەوە سەر عەدنانییەکان ، کە بە عەرەبی موستەعرەبە بەناوبانگن، لەبەرئەوەی لە ئەسڵدا عەرەب نەبوون، بەڵام بەهۆی ئیسماعیلی بابیانەوە، کە کوڕی ئیبراهیمە (عَلَيْهِ السَّلاَم) کە ژنو ژن خوازییو هاوسەگیریی کردوە لەگەڵ هۆزی جورهوم دا، وە ئەوانیش عەرەب بوون خۆیو نەوەکانی فێری عەرەبی بوونو، بوون بە عەرەب، ئنجا لەبەرئەوەی هەر خۆیان غەیرە عەرەب لەوێ بوون، لەگەڵ گەلی عەرەب تێکەڵ بوون ، بوون بە عەرەب ، وە ئەوان پێیان دەگوترێ : عەرەبی موستەعرەبە ، ئنجا گەلی (ثمود) لە عەرەبی (بائدة)ن ، ئەو عەرەبەی کە لەبەین چوون ، وە شوێنی نیشتەجێبوونیان لە (حجر) بووە ، وە (حجر)یش شوێنێکە کە دەکەوێتە نێوان حیجازو شامەوە .

خوای پەروەردگار کە باسی گەلی (ثمود) دەکات ، دەفەرموێ : ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا﴾، بۆ لای گەلی (ثمود) صاڵحی برایانمان ڕەوانە کرد، کەواتە: صاڵحیش هەر لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە ، برای گەلی (ثمود) بووە، ئەگەرنا برایەتیی ئیمانیی لەگەڵیاندا نەبووە، ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾ فەرمووی: ئەی خەڵکەکەم ، ئەی کۆمەڵگایەکەم ، ئەی ئەو خەڵکەی من لە نێوتاندام ! بەندایەتیی بۆ خوا بکەن ، بێجگە لەو، بێجگە لە خوا ، پەرستراوێکی دیکەتان نیە، واتە: پەرستراوێك کە شایستەی پەرسترانو بەندایەتیی بۆ کران بێ.

دیاره ئێمه دەبێ بزانین كه پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەموویان باسی ئەوەیان كردوه، كه به خوا بەیەكگرتن (توحید) ڕەوانەكراون، ئنجا پەرستن (عبادة)یش وەك زۆر جاری دیكەش لەم دەرسی تەفسیرەدا باسمان كردوه ، هەر ئەوه نیه باسی نوێژو ڕۆژوو بێ، بەڵكو پەرستن (پەرستنی خوا) بریتیه ملكەچیی له هەموو ڕووەكانی ژیانەوە، چ له ڕووی درووشمەكان (شعائر)ەوه ، چ له ڕووی بەرنامەكان (شرائع)ەوه، وه به ڕواڵەتو به پەنهان، وه له ژیانی تاكیی‌و خێزانیی‌و كۆمەڵایەتی‌و سیاسیی دا، واته: پابەندیی بەو بەرنامه شەریعەتەوه كه خوا ناردوویەتی‌و، ملكەچ كردن بۆ خوا ، له هەموو بوارەكانی ژیاندا، لەسەر دوانگەو له فەرمانگە، له مزگەوتو له بازاڕ ، له هەموو كایەكانی ژیاندا ، دەبێ مرۆڤ پابەند بێ به شەریعەتی خواوه، ئنجا مانای وایه بەندایەتیی بۆ خوا كردوه، ﴿ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ﴾، صالح به گەلەكەی دەڵێ : ئێوه له پەروەردگارتانەوه بەڵگەیەكی ڕوون‌و ئاشكراتان بۆ هاتوه، ئەمه حوشتری خوایه بۆ ئێوه ، نیشانەو موعجیزەیه، ﴿ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ ﴾، دەجا لێی گەڕێن ، با لەسەر زەمینی خوا بلەوەڕێ ، به مەسرەفی ئێوه نازی، ئێوه پشتتان پێوه نەهێشاوه ، خوا له چیایەك بۆی دەرهێناون، وه لەسەر زەمینی خواش دەلەوەڕێ ، له لەوەڕگایەك دا كه خوا دروستی كردوه، وه له كانیاوێكیش دەخواتەوه ، كانیاوەكەش هی خوای پەروەردگاره، واته: به نان‌و مەسرەف‌و نەفەقەی ئێوه نیه، وه خۆشتان لێی بەهرەمەندن، بۆیه لێیگەڕێن، ﴿ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، وه به خراپه دەستی بۆ درێژ مەكەن، وه زیانی پێ مەگەیەنن، ئەگەرنا ئازاری سزایەكی بەئێش دەتانگرێ ، بۆیەش فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ ﴾، چونكه هەر ڕۆژێك نا ڕۆژێك ، دۆشیویانه كەواته: ئەگەر به باری چاكەداو ، به مەبەستی سوود لێوەرگرتن‌و بەهرەمەند بوون ، دەستی پێ بگەیەنن‌و بیدۆشن قەیناكا ، بەڵام به باری زیان پێگەیاندن ، دەستی مەگەیەننێ، ئەگەرنا سزایەكی به ئێشتان تووش دێ، واته: سزایەك كه زۆر به ئێشه، دەنا هەموو سزایەك ئێشی هەر هەیه.

ئنجا ئامۆژگارییان دەکات : ﴿ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، وە یاد بکەنەوە کە خوا ئێوەی گێڕاوە بە جێنشین لە دوای گەلی (عاد)و ئێوەی کردوە بە جێگرەوەی ئەوان، وە زەوی بۆ تەخت کردوونو ، سەر زەوی بۆ دەستەمۆو هەموار کردوون ، کە چی لێ بکەن ؟، ﴿ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا ﴾،لە پێ دەشتەکانو لە دەشتاییەکانیدا کۆشکی بەرز بەرز دروست دەکەن، وە لە چیاکانیشدا خانوو دەتاشن، کە ڕەنگە کاتی هاوینان چووبنە چیایەکانو لەوێ خانوویان داتاشیبێ، وە کاتی زستانان هاتبنە دەشتاییەکانو لە پێ دەشتەکاندا کە گەرمە سێر بووە، کۆشكو تەلاریان دروست کردبێ، واتە : گەرمیانو کوێستانیان کردوە، یاخود ئەگەر لە دوژمنێك ترساون ، چوونە ئەو نێو ئەو خانووانە کە لە چیاکاندا دایانتاشیونو، لە کاتی هێمنیو ئاساییشدا ، لەو کۆشکانەدا ژیاون، کە لە پێ دەشتەکاندا دروستیان کردوون ، ﴿ فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾، دەجا یادی چاکەکانی خوا بەسەر خۆتانەوە بکەنەوە، وە لە زەویدا خراپەکارانە ڕەفتار مەکەن، ئنجا با بزانین ئەوان چییان وەڵام دایەوە ؟

هەمیشە خۆ بە زلگرو دەستڕۆیشتووەکان ، بەناوی خەڵکەکەوە قسەیان کردوە، کە ڕەنگە خەڵکەکە ئاگایان لە هیچ نەبووبێ، بەڵام ئەوانە بە ناوی خەڵکەکە قسەیان کردوە، وەك ئێستاش زۆر جاران هەر وایە، بە ناوی خەڵکێکی زۆرەوە کەسێك قسە دەکات، با نوێنەرێکی ناڕاستیشیان بێ، با نا دڵسۆزیشیان بێ، بەڵام خەڵکێك بە دوای کەسێك بکەون کە نا دڵسۆزیانە، وە لەگەڵیاندا درۆ دەکات، وە دەیانچەوسێنێتەوە ، وە مافەکانیان زەوت دەکات، بەڵام خۆی لێکردوونە مامۆتكو ، خۆی لەسەر فەرز کردوون، ئەوانیش هەقەمستیان بێ ، شایستەی ئەوەن کە لەگەڵ ئەو زلە دەستڕۆیشتووانەدا ، سزا بدرێن، ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ ﴾، دەستڕۆیشتووانو خۆ بە

زلگرەکانی گەلەکەی ، بە وانەیان گوت کە دەچەوسێنرانەوە ، وە ئیمانیان هێنابوو لە گەلەکەی ﴿أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾، بە سەرسووڕمانەوە ، بە پرسیارکردنێکی نکوولّیی لێکەرانەوە، واتە: شتێکی زۆر بێجێتان کردوە، کە پێتانوابێ‌و ، بڕواتان وابێ صالّح لە لایەنی پەروەردگارییەوە ڕەوانەکراوە، چۆن بڕوا بە شتی وا بێجێ دێنن ؟ ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ﴾، چەوسێنراوە بڕوادارەکانی گەلی (ثمود) ، شوێنکەوتووەکانی صالّح ، گوتیان : ئێمە بەوەی کە پێی ڕەوانەکراوە ، بڕوادارین ، واتە: ئەوە کە صالّح لەلایەن پەروەردگاریەوە ڕەوانەکراوە ، جێگەی مشتومڕ هەر نیە، وە بەوەش کە پێی ڕەوانە کراوە ، لەلایەن پەروەردگاریەوە ، بەڵێ ئێمە بڕوادارین ، ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ ئەوانەی خۆیان بە زلگرتبوو لە گەلی (ثمود) گوتیان : بێگومان ئێمە بەوەی کە بڕواتان پێ‌هێناوە ، بێبڕواین .

تەماشا بکەن ! ئەوانیش شەیتانانە قسە دەکەن، ناڵێن: بەوەی کە صالّح پێی ڕەوانەکراوە ! دەڵێن : بەوەی کە ئێوە بڕواتان پێهێناوە، کەواتە : دان بەوە دانانێن کە صالّح لە لایەن پەروەردگاریەوە ڕەوانەکراوەو ، پەیامێکی هێناوە .

ئنجا دوایی خوا ﷻ سەرەنجامەکەیان کورت دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ﴾، ئنجا حوشترەکەیان پەیکرد، چوار پەلیان بڕی، دوایی سەریان بڕی، وە لە بەرانبەر فەرمانی خوای پەروەردگاریاندا خۆیان بە زل گرت، ﴿وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾، وە گوتیان : ئەی صالّح ! ئەوەی تۆ هەڕەشەی پێ لە ئێمە دەکەی ، بۆمان بێنە، ئەگەر تۆ لە ڕەوانە کراوانی، واتە: ئێمە بڕوا ناکەین کە تۆ لە ڕەوانە کراوان بی، ئەگەر لە ڕەوانە کراوانی ، فەرموو سزا بێنە، ئەو سزایەی کە هەڕەشەی پێ لە ئێمە دەکەی ، بۆمان بێنە ، ﴿فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ

﴿ جَٰثِمِينَ ﴾، ئنجا بومەلەرزەیەك گرتنی ، لە شوێنێكی دیكەدا باسی (صیحة) دەكات، واتە: دەنگێكی گەورە، كەواتە: دەبێ دەنگێكی زۆر گەورە بووبێ، وە بووبێتە هۆی لەرزینەوەی زەوی، یاخود سەر زەوی كە لەرزیوەتەوە ، دەنگێكی گەورەی لێ پەیدا بووە ، وەك دوایی باسی دەكەین ، ﴿ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴾، ئیدی لە خانووی خۆیاندا ، تەخت بوونو لە پەوڕوو كەوتنو بە زەوییەوە نووسان، وە لە شوێنی دیكەی قورئاندا دەفەرموێ : ﴿ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ٦٧ ﴾هود، لێرەدا دەفەرموێ : ﴿ فِي دَارِهِمۡ ﴾، وەك ئەوەی كە هەموو ماڵەكانیان ، هەموو خانووەكانیان یەك خانوو بووبێ ، وە لە خانووەكەیاندا وەك چۆن باڵندەیەك دەنیشێو بە زەوییەوە دەنووسێ لە كاتی خەودا ، ئاوا بە زەوییەوە نووسان، ﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ ﴾ ئەویش پشتی تێكردن {دوای ئەوەی كە گەلەكەی فەوتا ، خۆیو ئەوانەی كە دەربازیان بوو بوو ، ئیمانیان پێهێنابوو ، وەك لە شوێنی دیكەدا هاتوە} ڕۆیشت پشتی تێكردنو ئاوڕێكی لێدانەوەو تەخت بوون، وە گوتی: ئەی گەلەكەم ! ئەی خەڵكەكەم ! من بێگومان پەیامی پەروەردگارمم پێ ڕاگەیاندن، وە دڵسۆزیی و پەرۆشییم بۆ نواندن، ﴿ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾، بەلاّم ئێوە دڵسۆزانتان خۆشناوێن، ئەو زلە زلە قسە ڕۆیشتوانەتان خۆشویستو، بە دوای ئەوانە كەوتن كە درۆیان لەگەڵدا كردنو خیانەتیان پێ كردنو ئێوەیان دەچەوساندەوە ، بۆیەش لەگەڵ واندا سزا دران ! ئیمانتان بە منی دڵسۆز نەهێنا ، كە بۆتان دڵسۆزم لە دنیاو دوارۆژتان دا ، بە دوای من نەكەوتن ، بەڵكو بەدوای ئەوان كەوتن ! دە بیخۆنو عافیێتتان بێ ، ئەوە لەگەڵ ئەوانیشدا سزا دران !.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾

دیارە گەلی (ثمود) وە پێشتر باسمان کرد : یەکێك بوون لەو هۆزە عەرەبانەی کە فەوتاون، وە صالح لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە برایان بووە، ئەگەرنا لە ڕووی ئیمانییەوە ، ئەوان نەهاتوونە سەر ئەو دینو ئیمانەی کە صالح هێناویەتی.

ئەویش وەك نووحو هوود ، هەمان قسە دووبارە دەکاتەوەو دەفەرموێ : ﴿ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴾، ئەی گەلەکەم ! ئەی خەڵکەکەم ! خوا بپەرستن ، جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، سەرەتا : بە گەلەکەم، خەڵکەکەم ، بانگیان دەکات، بۆئەوەی هەستو سۆزیان بجووڵێنێ، وە فەرمانیان پێ دەکات ، پێش هەموو شتێك ، بە خوا بەیەکگرتن، یان بەس خوا پەرستن، کە ئەوە بناغەو کاکڵی بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمِ).

دوایی دەفەرموێ: ﴿ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾، لە پەروەردگارتانەوە بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکراتان بۆ هاتوە ، هیچ پێغەمبەرێك بەبێ موعجیزەو بەڵگە نەهاتوە، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ : ﴿مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ أُعْطِيَ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُهُ وَحْياً أَوْحَاهُ اللهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (٨٤٧٢)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٦٩٦)، وَمُسْلِمٌ بِرقم:

(١٥٢)}، واتە: هیچ پێغەمبەرێك نەبووە لە پێغەمبەران ، مەگەر نیشانەی وای پێدراون ، کە خەڵك بەپێی ئەو نیشانەو موعجیزانە {بزانن کە ڕاست دەکاتو پێغەمبەری خوایە} ئیمانی پێ بێنن، وە ئەوەی بە من دراوە ، وەحییە لە لایەن خواوە {واتە: قورئانە} بۆیە ئومێد دەکەم لە ڕۆژی دوایی دا لە هەموویان زیاتر شوێن کەوتووم هەبن .

چونکە موعجیزەکەی پێغەمبەری خاتەم دوای خۆی دەمێنێتەوە ، بەڵام هەموو پێغەمبەرانی دیکە لەگەڵ خۆیان دا موعجیزەکەشیان ڕۆیشتوە .

ئنجا موعجیزە صالح چی بووە ؟ ﴿هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةً﴾، ئا ئەوە حوشتری خوایە، هەڵبەتە خۆ هەموو شتەکان هی خوان، حوشترەکانی دیکەش هەر هی خوان، بەڵام ئەم حوشترەیان خوا بە تایبەت دروستی کردوە، وەك دوایی باسی دەکەین ، خوا پیشتوان بێ ، ئنجا لەبەرئەوەی بە شێوەیەکی تایبەت دروست کراوە، بۆیە ئەم وشەیەی بۆ بەکارهێنراوە : ﴿نَاقَةُ ٱللَّهِ﴾، ئەگەر نا هەموو شتەکان ، هەر دروستکراوی خوای بەدیهێنەرن .

ئنجا دەربارەی موعجیزە بوونی حوشترەکەی صالح ﷺ کە بە (نَاقَةُ الله) ناوبراوە ، لە زۆر شوێنی قورئاندا :

١/ هەم لێرە لە سوورەتی (الأعراف)دا، هەم لە سوورەتی سوورەتی (هود)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَٰقَوۡمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٞ قَرِيبٞ ٦٤ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ٦٥ ﴾.

٢/ وە هەم لە سوورەتی سوورەتی (الشعراء)دا کە دەفەرموێ : ﴿ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٞ لَّهَا شِرۡبٞ وَلَكُمۡ شِرۡبُ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ ١٥٥ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ١٥٦ فَعَقَرُوهَا فَأَصۡبَحُواْ نَٰدِمِينَ ١٥٧ ﴾ .

٣/ وە هەم لە سوورەتی (الشمس)دا كە دەفەرمویٚ: ﴿ وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ۝١ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ۝٢ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ۝٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ۝٤ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ۝٥ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ۝٦ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ۝٨ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ بِطَغۡوَىٰهَآ ۝١١ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا ۝١٢ فَقَالَ لَهُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقۡيَٰهَا ۝١٣ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمۡدَمَ عَلَيۡهِمۡ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمۡ فَسَوَّىٰهَا ۝١٤ وَلَا يَخَافُ عُقۡبَٰهَا ۝١٥ ﴾، كەواتە: حوشترەكە بە (نَاقَةُ الله) ناوزەد كراوە .

ئنجا لەوبارەوە چەند فەرموودەیەك هەن :

١) یەكێك لەوانە: ﴿ أَخرَجَ عَبْدُ الرَّزَّاق وَالفريابِيُّ وَابْنُ أَبي شَيْبَة وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْد وَابْنُ جَرِير وَابْنُ المُنْذِر وَابْنُ أَبي حَاتِم عَنْ أَبي طُفَيْل قَالَ : قَالَ ثَمُودُ لِصالِح: ائْتِنَا بآيَةٍ إنْ كُنْتَ مِنَ الصادِقِين، قَالَ: أُخْرُجوا فَخَرَجُوا إلى هَضْبَة مِنَ الأَرْض فإذَا هِيَ تَمْخَضُ كَمَا تَمْخَضُ الحَامِلُ ثُمَّ إِنَّهَا انْفَرَجَتْ، فَخَرَجَتِ النَّاقَةُ مِنْ وَسَطِهَا، فَقَالَ لَهُم صالِح: هَذِهِ نَاقَةُ اللهِ لَكُمْ آيَة ، فَلَمَّا مَلُّوها عَقَرُوهَا ﴾[1] ئەو زانا بەرێزانە لە (أبي طُفَيْل)ەوە گێڕاویانەتەوە كە یەكێكە لە زانایانی (تابعین)ەوە، ئەم فەرموودەیە بە (مُرْسَل) لە قەڵەم دەدرێ، (أَبي طُفَيْل) دەڵێ: گەلی سەموود بە پێغەمبەر (صالح)یان گوت: ئەگەر ڕاست دەكەی تۆ لە ڕاستگۆیانی، (لە پێغەمبەرانی خوای) نیشانەیەكمان بۆ بێنە ، ئەویش پێی فەرموون: با بڕۆینە دەر، لە شارەكەیان چوونە دەر، بەرەو بەرزاییەك چوون ، لە زەوی دا ، {جا هەندێك دەڵێن : تەپۆلكەیەك بووە، هەندێك دەڵێن : شاخۆلكەیەك بووە} تەماشایان كرد ژانی دەهاتێ ، وەك چۆن حوشتری ئاوس ژانی دێتێ، (واتە: ژانی بەچكە بوون) دوایی ئەوە بوو ، كە

---

١) فتح القدير للشوكاني ج٢، ص٢٧٠.

لێك بووەوە، وە لە نێوەڕاستی حوشترێك هاتە دەرێ، صالّح پێی گوتن: ئا ئەوە حوشتری خوایە بۆ ئێوە، نیشانەو بەلّگەیە لەسەر ئەوە كە من پێغەمبەری خوام، ئنجا كاتێك كە لێی بێزار بوون، ئەوە بوو كە پەییان گرتو سەریان بڕی .

٢) هەر لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتەش هەیە: ﴿عَنْ جَابِرٌ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمَّا نَزَلَ الْحِجْرُ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ ، قَامَ فَخَطَبَ النَّاسَ ، فَقَالَ : يَا أَيُّهَا النَّاسُ! لاَ تَسألُوا نَبِيَّكُمْ عَنِ الآيَاتِ، فَإِنَّ قَوْمَ صالِحٍ سألُوا نَبِيَّهُمْ أَنْ يَبْعَثَ إِلَيْهِمْ آيَةً، فَبَعَثَ اللَّهُ لَهُمُ النَّاقَةَ، فَكَانَت تَرِدُ مِنْ هَذَا الْفَجِّ، فَتَشْرَبَ مَاءَهُم يَوْمَ وِرْدِهَا، وَيَحْتَلِبُونَ مِنْ لَبَنَها مِثْلَ الَّذِي كَانُوا يَأْخُذُونَ مِنْ مَائِهَا يَوْمَ غِبِّهَا ، وَتَصْدُرُ مِنْ هَذَا الفَجِّ، فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَعَقَرُوهَا فَوَعَدَهُمُ الله العَذَابَ بَعْدَ ثَلاَثَة أَيّام ، وَكَانَ وَعْدٌ مِنَ اللهِ غَيْرُ مَكْذُوبٍ، ثُمَّ جَاءَتْهُمُ الصَّيْحَةُ فَأَهْلَكَ اللهُ مَنْ كَانَ مِنْهُمْ تَحْتَ مَشَارِقِ الأَرْضِ وَمَغَارِبِهَا ، إِلاَّ رَجُلاً كَانَ فِي حَرَمِ اللهِ فَمَنَعَهُ حَرَمُ اللهِ مِنْ عَذَابِ اللهِ، فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ مَنْ هُوَ؟ فَقَالَ : أَبُو رِغَالٍ ، فَلَمَّا خَرَجَ مِنَ الْحَرَمِ ، أَصابَهُ مَا أَصابَ قَوْمَهُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤١٩٣)، قَالَ الهَيْثَمِي في (المجمع) ج٧ ، ص ٣٨ : رجاله رجال الصَّحِيح، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٦١٩٧)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٢٤٨) وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَاد، وَالطَّبَرَانِيُّ في (الأَوسط) برقم: (٩٠٦٩)}، واتە جابیری كوڕی عەبدوڵلا خوا لە خوّی‌و بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی لە سەفەری بەرەو جەنگی تەبووك لە ناوچەی (حجر) ـ كە دەكەوێتە نێوان (حیجاز و شام)ەوە ـ مەنزلگای گرت ، هەڵسا وتاری داو فەرمووی : ئەی خەڵكینە ! داوای موعجیزەو نیشانان لە پێغەمبەرەكەتان مەكەن ، چونكە گەلی صالّح داوای نیشانەیەكیان لە پێغەمبەرەكەی خۆیان كرد ، خوای پەروەردگاریش حوشتری بۆ ڕەخساندن، ئنجا ئەو حوشترە لەو دۆڵەوە دەهات (دیارە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی كردوە بە شێوێك) وە ئەو ڕۆژە كە نۆرە ئاوی حوشتر بوو ، لە ئاوەكەیانی دەخواردنەوە ، {دیارە كانی‌و سەرچاوەیەكیان هەبووە ، ڕۆژێك حوشترەكە لێی خواردۆتەوە ، ڕۆژێك خەڵك ئاویان لێ هەڵێنجناوە ، دیارە بەشی هەردووك لایانی نەكردوە} وە ئەو ڕۆژەش كە نۆرە ئاوی حوشترەكە

بوو ، لە شیرەکەیان وەردەگرت ، بە ئەندازەی ئەو ئاوەی کە لە ڕۆژی خۆیدا ئاوی دەخواردەوە ، ئنجا فەرمووی : وە لەم دۆڵەوە دەچووە دەرێ، {واتە : لەم شیوەوە ، ئامازەی کرد بە شیوێك } دەرۆیشت بۆ لەوەڕگا ، بەلام ئەوان لە فەرمانی پەروەردگاریان یاخی بوون، وە حوشترەکەیان سەربڕی، یاخود پەییان کرد، (واتە : چوار پەلیان بڕی)، وە دوای ئەوەی سەریان بڕی، خواش هەڕەشەی سزای لێکردن، دوای سێ ڕۆژان، دیارە هەڕەشەی خواش ڕاست بوو، درۆ نەبوو ، ئەوەبوو کە دەنگێکی گەورە، چریکەیەکی گەورە هات ، وە هەموویان هەرچی لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا بوون ، {واتە: گەلی (ثمود)} هەموویان لەبەین چوون، مەگەر یەك پیاو ، ئەویش لەو کاتەدا لە حەرەم دا بوو (لە دەوری مەککە بوو، بەهۆی حەرەمی خواوە خوای مەزن لە سزای خۆی پاراستی) گوتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ ئەو پیاوە کێ بوو ؟ ناوی چی بوو ؟! فەرمووی : ناوی (أبو رِغال) بوو، بەلام دوای ئەوەی لە سنووری حەرەم چووە دەرێ، ئەو بەلایەی کە تووشی گەلەکەی هاتبوو ، تووشی ئەویش بوو، ئەویش فەوتا .

٣) هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە: ﴿عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لأَصْحَابِ الْحِجْرِ : لاَ تَدْخُلُوا عَلَى هَؤُلاَءِ الْقَوْمِ الْمُعَذَّبِينَ، إِلاَّ أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ، فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا بَاكِينَ، فَلاَ تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ، أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ مَالِك في المُوطا) برقم: (٩٦٦)، وَأَحْمَد برقم: (٥٤٤١)، وَعَبْدُ الرَّزَّاق برقم: (١٦٢٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٤٢٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٩٨٠)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١٩٩)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٥٥٧٥)}، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کاتە کە لە حیجر بوو، (کە دەڤەرێك بووە) فەرمووی : مەچنە شوێنەواری ئەو سزا دراوانە، مەگەر بە چاوی بە گریانەوە ، وە ئەگەر گریانتان نەهات{ لە ترسی سزای خوا} ئەوە ، مەچنە شوێنەکەیانەوە، نەوەك ئەوەی کە تووشی ئەوان بووە ، تووشی ئێوەش بێ .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دڵە پڕ ئیمانو پڕ نوورو بەرەکەتەی ئاوا بەو شێوەیە بووە، هێندە هەستیار بووە کە تەنانەت بەهۆی ڕابردنو تێپەڕبوون بە شوێنی گەلێکی سزادراودا، مەترسیی ئەوەی هەبووە کە ئەوانیش تووشی سزا ببن .

سێ سەرنج :

١) کە ئایەتەکە دەفەرموێ : ﴿فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِيٓ أَرْضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾﴾، واتە: لێی گەڕێن با لەسەر زەمینی خوا بخواو، وە بە خراپە دەستی مەگەیەننێ، واتە : ئەو حوشترە هیچ ئەرکی لەسەر ئێوە نیە،

٢) وشەی (مَخَض) (وَهِيَ تَمْخَضُ) دەڵێ: (مَخِضَتِ الحَامِلُ تَمْخَضُ مَخَاضًا فَهِيَ مَاخِضٌ : دَنَى وِلادُهَا وأَخَذَهَا الطَّلْقُ)[١]، حاڵەتی (مَخَاض) کە بە (مَخِضَ، تَمْخَضُ) هاتوە ، ئەوەیە کە حوشتر، یان هەر ژیانداریێکی دیکەی مێیینە کە ئاوس بێ ، ژان بیگرێو کاتی ئەوەی بێ ، کە بەچکەکەی ببێ .

٣) وشەی (غِبّ) کە دەفەرموێ: (يَوْمَ غِبِّهَا)، دەڵێ : (الغِبُّ : بالكَسْرِ فِي سَقْيِ الإِبْلِ وَفِي الحُمَّى ، يَوْمٌ وَيَوْم)، واتە : هەر شتێك کە ڕۆژێك ببێو ڕۆژێك نەبێ، حوشترەکەش ڕۆژێك ئاوی دەخواردەوەو، ڕۆژێك ئەوان شیریان لێ دەدۆشی ، هەروەها (تا) لێهاتن کە ڕۆژ نا ڕۆژێکە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿زُرْ غِبًّا تَزْدَدْ حُبًّا﴾ {أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٥٤٧٧)، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي (الصَّغِير) برقم: (١٧٥٤)، وَابْنُ أَبِي الدُّنِيَا فِي (كِتَاب الإخوان) برقم: (١٠٤)، وَالطَّبَرَانِيُّ كَمَا فِي (مجمع الزوائد) ج ٨ ، ص ١٧٥، قَالَ الهَيْثَمِيُّ : إِسْنَادُهُ جِيِّد، وَحَسَّنَهُ الأَلبَانِي فِي (صَحِيح الترغيب والترهيب)}، واتە : کەم کەم سەردان بکە ، بۆ ئەوە خۆشەویستییت زیاد بکات ، یانی : بۆ ئەوەی زیاتر خۆشەویستیت بی لە لای ئەوانەی کە سەردانیان دەکەی، نەك هێندە سەردان بکەی ، کە سێبەری خۆت لەلایان قورس بکەی .

---

١) المعجم الوسيط ، ص ٨٥٧.

**مەسەلەی دووەم** : كە دەفەرموێ : ﴿ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾،

وە یاد بكەنەوە كە خوا ئێوەی كردوە بە جێنشین لە دوای گەلی عاد ، وشەی (خُلَفَاء) كۆی (خَلِيفَة)یە ، وە (خَلَفَهُ ، يَخْلُفُهُ أي : جَاءَ بَعْدَهُ) یاخود (قَامَ مَقَامَهُ) ، واتە : لە دوای ئەو هات ، یان لە شوێنی ئەو دانیشت، ئنجا وشەی (خَلِيفَة) بە (خَلائِف وخُلَفَاء) كۆدەكرێتەوە، هەردووكیشیان لە قورئاندا هاتوون : ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ ...﴿١٦٥﴾ ﴾ الأنعام ، یان دەفەرموێ : ﴿ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً ...﴿٦٩﴾ ﴾ الأعراف .

ئنجا ﴿ وَبَوَّأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، (بَوَّأَكُم) پێشتریش گوتمان، (بَوَّأَهُ) واتە : تەختی كرد، یەكسانی كرد، كە (بَوْأ) عەكسی (نُبُوّ)ە، كە ئەوەیە شوێنێك بەرزتر بێتەوە لە ئاستی زەوی ، كەواتە : ﴿ وَبَوَّأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، یانی : (وَطَّأَ لَكمْ وَمَكَّنَ) واتە: زەوی بۆ هەموار كردوونو، ئێوەی تێدا دەستڕۆیشتوو كردوە، ئنجا دوایی ڕوونی دەكاتەوە كە چی لێدەكەن لەو زەوییەی كە هەموار كراوەو بۆیان دەستەمۆ كراوە، دەفەرموێ : ﴿ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا ﴾، لە دەشتو پێ دەشتەكانی دا كۆشك بنیات دەنێن ، وە لە چیاكانیشدا خانوو دادەتاشن ، كە پێشتریش باسمان كرد : لەوانەیە ئەوانە كەسانێك بووبن كە گەرمیانو كوێستانیان كردبێ، دیارە پێ دەشتەكان گەرمەسێر بوونو، چیاكان كوێستان بوون، وا پێدەچێ كە ئەوانە زستانان لە پێ دەشتەكان لە كۆشكەكانیان دا بووبن، هاوینانیش چووبنە چیاو چۆڵەكانو لەوێ دیارە خانووبەرەیان دروست كردوە .

ئنجـــا کـــه دەفـــەرموێ : ﴿ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴾، دەجـا چاکەکـانی خـوا یـاد بکەنـەوە بەسـەرخـۆتانەوەو، خراپەکـارانە لـە زەوییدا خراپـە بـڵاو مەکەنـەوەو ، بـە زەویـدا مەیـەن‌و مەچـن‌و شـوێنـەواری خـراپ بـەجێ مەهێڵـن .

کە دیـارە مەبـەست پێی زۆر شـتە :

١/ هەم لە نێو مرۆڤەکاندا خراپەکاریی مەکەن.

٢/ هەم بـە شـێوەیەکی نارێك دەستکاریی ژینگـە مەکـەن .

٣/ وە هـەم نیعمەتـەکانی خوا، ئەو هەموو نیعمەتانەی کە خـوا دروسـتی کردوون ، بـە شێوەیەك هەڵسوکەوتیـان تێدا مـەکەن ، کە ببێتە مایەی خراپ کردنیـان.

**مەسەلـەی سێیـەم:** کـە دەفـەرموێ : ﴿ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾، لێـرەدا خـوای پەروەردگـار دیالۆگـێك بـاس دەکـات، لـە نێـوان دەسـتـرۆیشـتووە خـۆ بـەزلـگرە کافرەکانی گـەلـی سـەموودو ، ئیمانـدارە چەوسێنراوەکـان دا، سـەرەتا دەفـەرموێ : دەسـتـرۆیشـتووە خـۆ بـەزلـگرەکـانی گـەلەکەی بـەوانەیـان گـوت ، کـە دەچەوسێنرێنـەوە لـە ئیمانـداران ، ئەمـە ئـەوە دەگـەیەنێ کە هـەموویان نـەبوون، چونکـە دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ ﴾، ئەمـە ئەگـەر (مِنْ) بـۆ بەشـێك (بَعْض) بـێ‌و (تبعیضیَّـة) بـێ ، بـەڵام ئەگـەر (مِنْ)ی ڕوونکردنـەوە (بَیَانِیـَّة) بـێ ، هەموویـان دەگرێتـەوە، کـە ئەوکـاتە ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ کە سـەرجەم دەسـتـرۆیشتووەکان کافرو خـۆ بەزلـگـر بـوون ، هـەروەها کـە دەفـەرموێ : ﴿ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ ﴾، بـەوانـەی کـە

چەوسێنرابوونەوە ، لەوانەیان کە ئیمانیان هێنابوو ، لێیان، دیسان ئەگەر (مِنْ)ی (مِنْهُم) بگەڕێتەوە بۆ (قَوْم) واتە: بەشێك لە گەلەکەی کە چەوسێنراونەوە ، ئیمانیان هێنابوو ، بەلاّم ئەگەر بۆ (الّذِیْنَ) بگەڕێتەوە ، مانای وایە مەرج نیە کە تەنیا ئیمانداران چەوسێنرابنەوە، کە پێم وایە ئەم ڕایەی دووەم لە ڕاستییەوە نزیکترە، چونکە خۆ بەزلگرەکان بەگشتی خەڵك و کۆمەڵگا دەچەوسێننەوە، جا ئیمانداربن، یان بێ ئیمان بن، هەرچەندە وا پێدەچێ ئیمانداران پشکی زیاتریان پێ ببڕێ لە چەوسێنەرانەوەو ستەم .

ئنجا کە دەڵێن : ﴿أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾، ئایا دەزانن کە صالح ڕەوانەکراوە لەلایەن پەروەردگاریەوە ؟! ئەو تەعبیرە وەك گاڵتە پێکردن دەچێ، ﴿أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾، ئایا زانیارییتان هەیە کە صالح ڕەوانەکراو بێ لەلایەن پەروەردگارەوە ؟ ئەگەرنا دەبووایە بڵێن : (أَتُؤْمِنُونَ بِصالِحٍ أَنَّهُ مُرْسَلٌ مِنْ رَبِّهِ)؟ بەلاّم ئەوان دەڵێن : ﴿أَتَعۡلَمُونَ﴾، ئایا زانیارییتان هەیە ؟ واتە: ئێوە بەبێ زانیاریی بڕواتان بە صالح هێناوە ، لە حاڵەتیکدا کە داوای پێغەمبەرایەتیی دەکات .

بەلاّم ئەوان وەلاّمێکی حەکیمانەیان داوەتەوە : ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ٧٥﴾، واتە: (بڕوادارەکان) گوتیان : ئێمە بەوەی کە پێی ڕەوانە کراوە ، بڕواداریـن، واتە: زانیارییمان هەیە ئەوە هیچ ، ئێوەش هەر زانیارییتان هەیە، بەلاّم ئێمە ئیمانمان هێناوەو جێی خۆیەتی، ئێمە بەپێی زانیارییەکەی خۆمان ، کە دەزانین صالح پێغەمبەری خوایە، ئیمانمان پێ هێناوە، بەلاّم ئێوە بۆچی بە پێی زانیارییەکەتان ڕەفتار ناکەن، تاکو ئێوەش وەك ئێمە ئیمان بێنن ؟!

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ٧٦﴾، ئەوانەی خۆیان بە زلگرتبوو، گوتیان: ئێمە بەوەی ئێوە بڕواتان پێهێناوە، بڕوا ناهێنین، واتە: ئێمە هەر لەسەر هەڵوێستی خۆمان دەمێنینەوە .

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ : ﴿ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾، لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ : (العَقْرُ: الجَرْحُ ، عَقَرَهُ يَعْقِرُهُ وَعَقَّرَهُ تَعْقِيراً: قَطَعَ قَوائِمَهُ بالسَّيفِ وَهُوَ قَائِمٌ)، وشەی (عَقْر) لە زمانی عەرەبی دا بە مانای برین (جَرْح) دێ، وە دەگوترێ: (عَقَرَهُ يَعْقِرُهُ وَعَقَّرَهُ تَعْقِيراً) یەك واتای هەیە، یانی: لە کاتێکدا کە ئەو ئاژەڵە وەستاوە، ئنجا حوشترە ، یان ئاژەڵێکە، هەر چوار پەلی برین (وَقَالَ الأَزْهَرِيُّ: العَقْرُ عِنْدَ العَرَبِ : قطع عُرْقُوبِ البَعِيرِ، ثُمَّ يُجْعَلُ النَّحْرُ عَقْراً لأَنَّ نَاحِرَ الإِبِلِ يَعْقِرُهَا ثُمَّ يَنْحَرُهَا، والعَقْرُ: النَّحْر) ئەزهەریی کە یەکێکە لە زانایانی زمانەوان، دەڵێ : وشەی (عقر) لە لای عەرەبان بریتیە لەوەی کە پاشووی ئەو ئاژەڵە ببڕدرێ، واتە: پێیەکانی پاشووی ببڕدرێن، وە جاری واش هەیە وشەی (نحر) بە (عقر) لە قەڵەم دەدرێ، چونکە کەسێك کە بیەوێ حوشتر سەرببڕێ، پێشی دەبێ پێیەکانی ببڕێ، ئەگەرنا بۆی بەردەست ناکرێ، ئنجا دواییش سەری دەبڕێ، هەروەها وشەی (عَقْر) بە مانای (نَحْر)یش هاتوە، واتە: سەربڕین .

ئنجا یەکێك بۆی هەیە بڵێ خۆ قەومی (ثمود) بە هەموویان ئەو حوشترەیان سەرنەبڕیوە، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الشمس)دا دەفەرموێ : ﴿ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقۡيَٰهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمۡدَمَ عَلَيۡهِمۡ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمۡ فَسَوَّىٰهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقۡبَٰهَا ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: کاتێك کە خراپترینی قەومەکە بۆی دەرپەڕی، بۆی چوو ، کە دیارە ئەو پێشی پەی کردوەو دواییش سەری بڕیوە ، بەڵام بۆچی سەربڕینەکەی پاڵداوەتەوە لای هەموویان ؟ دەڵێین : چونکە بە نوێنەری هەموویان چووەو ، هەموویان ڕازی بوونە بە کردەوەکەی ، بۆیە خوای دادگەر سەربڕینەکەی پاڵداوە لای هەموویان، وە هەر بۆیەش دوایی سزایەکەش هەموویانی گرتۆتەوە، ئەمەش بەڕاستی دەرسو پەندێکی گەورەی لێ وەردەگیرێ، کە هەر کۆمەڵگایەك

خراپەکارەکانی هەر شتێ بکەن ، مادام خەڵکەکە بەو خراپەی وان ڕازی بێ ، یاخود لە بەرانبەر خراپەی ئەواندا ، بێ هەڵوێست بن ، ئەوە بێگومان کۆمەڵگایەکە هەمووی شایستەی سزاو جەزرەبەی خوا دەبێ لە دنیاداو لە دوارۆژدا .

**مەسەلەی پێنجەم :**

# حیکمەتی باسکردنی گەلی (ثمود) لە ژێر شەش ناوو نیشان دا

کە دەفەرموێ : ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ ﴾

دیارە خوای زانا بە چەند شێوەیەك تەعبیری کردوە لەو سزایەی کە تووشی گەلی (ثمود) بوو :

١ - (رَجْفَة) .        ٢ - (صَيْحَة).        ٣ - (عَذَاب) .

٤ - (صاعِقة) .        ٥ - (طاغِيَة) .        ٦ - (دَمْدَمَ عَلَيهِم رَبّهُم بذَنْبِهِم).

ئنجا ئەگەر کەسێك بە سەرکێڵیی تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکات، ڕەنگە بڵێ : خوا لە شوێنێك بە (رَجْفَة) لەرزینەوە، لە شوێنێك (صَيْحَة) بە دەنگو چریکە، لە شوێنێك بە (عذاب) سزا، لە شوێنێکی دی بە (صاعقة) گەردەلوولی ئاگریی ، لە شوێنێکی دی بە (طاغية) کارەساتێکی لە سنوور بەدەر، وە لە شوێنێك بە زەوی ڕووخانو هەژان بە سەریان دا (دمدم عليهم) ، باسی ئەو سزایە دەکات، ئنجا ئایا ئەمە چۆنەو ئایا کامەیان بووە ؟

وەڵامەكـەی ئەوەیـە كـە : خـوا قسـە لەجـێ لـە هـەر سـوورەتەدا تەعبیـرێـك، وشـەیەك بـەكاردێنـێ كـە ئـەو تەعبیـرو وشـەیە لایـەكی، یاخـود وەسـفێكی ئـەو سزایە بـاس دەكـات، دیـارە ئـەو سزایە دەگونجـێ ئێمـە بڵێیـن : (صـاعِقَة) بـووە، واتە: گەردەلوولێك كە ئاگری تـێدا بووە، یاخـود هـەورە تـریشـقەیەك كە ئـاگری تـێدا بووە، كە ئەو (صـاعـقة)یـە (صَـیْحَة)ی لــێ پەیدا دەبـێ : دەنگـێكی گـەورە، ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا (رَجْفَة) : لەرزینـەوە ، پەیـدا دەبـێ ، ئنجـا ئەمـە دەبێتـە هۆی (دَمْدَمَ عَلَیْهِم) واتە : زەوی بـەسـەریاندا دەهەژێو دەڕووخـێ، وە دوایـی ئـەوە دەبێتە هۆی ڕووداوێك، دەبێتە هۆی كارەساتێك كە لە سنوور دەردەچـێ : (طـاغِـیَة)، وە سەرەنجامی ئەوەش هەمووی ، بریتـیە لەو سزاو جەزرەبـەیەی كە خـوا دەیانـدا (عـذاب) ، كەواتــە : وشــەكانی (صاعِـقَة، صَیْحَة، رَجْفَـة، دَمْدَمَ عَلَیْهِـم، طاغِیَـة، عَـذَاب) نەك هیچ ناكۆكییەكیـان لەنێوان دا نیە ، بەڵكو بـە هەموویان تەعبیـر لـەو جۆرە بەڵاو سزایە دەكەن ، كە خوای دادگەر بەسـەر گـەلـی (ثـمود)ی دا هێنـاوە.

ئێسـتاش با سـەرنجـی ئەو ئایـەتانە بدەیـن ، كـە خـوای دادگـەرو كـارزان تێیـان دا باسـی ئـەو سـزایـە دەكـات :

١/ لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا دەفـەرموێ : ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ ﴾.

٢/ لــە ســـوورەتی (هــود)دا دەفــەرموێ : ﴿ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾.

٣/ لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ : ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ﴿١٥٨﴾ ﴾.

٤/ لە سوورەتی (فصلت)دا دەفەرموێ : ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّواْ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ ﴿١٧﴾ ﴾،(صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ )

واتە: بڵێسـە ئـاگری سـزایـەكی ڕیسـواكەر.

٥/ هەروەها لە سوورەتی (الحاقة)دا دەفەرموێ : ﴿ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا۟ بِٱلطَّاغِيَةِ ۝٥ ﴾.

٦/ وە لە سوورەتی (الشمس)دا ئایەتی (١٤) دەفەرموێ: ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ۝١٤ ﴾، واتە: بە درۆیان دانا و حوشترەکەیان پەیکرد، پەروەدگاریشیان بە هۆی تاوانەکەیانەوە سەرزەمینەکەی بەسەردا تەخت کردن و ، بێ گرێ و گۆڵی کرد ، (کە دیارە بەرزایی و تەپۆلکەو شتی وای تێدا هەبووە) .

**مەسەلەی شەشەم و کۆتایی** : کە دەفەرموێ : ﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ۝٧٩ ﴾،

واتە: پشتی تێکردن و گوتی : ئەی گەلەکەم ! من پەیامی پەروەردگارمم پێ گەیاندن، وە دڵسۆزییم بۆ نواندن، بەڵام ئێوە دڵسۆزانتان خۆش ناوێن، بەخەمەوە بووانتان خۆش ناوێن .

دەگونجێ صالح لەبەرخۆیەوە ئەو قسەیەی کردبێ ، بەداخ و حەسرەتەوە ، چونکە ئیمانیان نەهێناوە، وە دەشگونجێ صالح دواندبنی ، دوای ئەوەی کە مردوون و لەبەین چوون، وەك چۆن پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ ئەوانەی دواند کە لە (قَلِيب)ی بەدر دابوون[١] ، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە : ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ : اطَّلَعَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى أَهْلِ الْقَلِيبِ، فَقَالَ : هَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقّاً؟ فَقِيلَ لَهُ : تَدْعُو أَمْوَاتاً؟ فَقَالَ: مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ مِنْهُمْ، وَلَكِنْ لا يُجِيبُونَ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٣٠٤)}، واتە: عەبدوڵڵای

١) (قَلِيب) بە بیرێك دەگوترێ هەڵقەنرابێ، بەڵام دوایی چاك نەکرابێ (القَلِيبُ: البِئْرُ قَبْلَ أَنْ تُطْوى) پێش ئەوەی قەراغەکانی هەڵچنرێ و ڕێك بکرێ ، پێی دەگوترێ: (قَلِيب) کە دوای ئەوەی لە جەنگی بەدردا کافرەکان حەفتا نەفەریان لێ کوژرا، جەنازەکانیان فڕێ دایە قەلیبی بەدرەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەگەڵدا کردن .

کوڕی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بەسەر ئەهلی قەلیب داگرت، (واتە ئەو جەنازانەی کافرەکان ، کە حەفتا جەنازە بوون، فڕێ درابوونە قەلیبی بەدرەوە) فەرمووی : ئایا ئەوەی پەروەردگارتان بەڵێنی پێدا بوون ، هەق بوو ، بە شێوەیەکی ڕاست هاتە دی ؟ پێی گوترا : ئایا قسە لەگەڵ مردووان دەکەی ؟ فەرمووی : ئێوە بیسەرترنین لەوەی کە من دەیڵێم، بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە، ئێوە لەوان باشتر گوێتان لە قسەی من نیە، بەڵام ئەوان توانای وەڵامدانەوەیان نیە.

ئنجا با لە کۆتایی ئەم دەرسەدا ، ئەو قسەیەی (محمد رشید رضا) بێنین کە لە تەفسیرەکەی خۆی[1] کردوویەتی، قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ : {مِثْلُ هَذَا مِمَّا خَصَّ اللّهُ بِهِ الأَنْبِيَاءَ، وَلَكِنْ بَعْضُ الـمُعْتَذِرِين لِعُبَّاد القُبُور بِدُعَاءِ أَصْحَابِهَا لِقَضَاءِ حَوَائِجِهِم، يَقِيسُونَ عَلَيْهِ وَعَلَى مَا وَرَدَ مِنْ حِيَاةِ الأَنْبِيَاءِ وَالشُّهَدَاءِ فِي البَرْزَخ، أَنَّ كُلَّ مَنْ دَعَا مَيِّتاً مِنَ الصالِحِين ، يَسْمَعَ مِنْهُ وَيَقْضِي حَاجَتَهُ، مَعَ العِلْمِ بَأَنَّ أُمُورَ عَالَمَ الغَيْبِ لا يُقَاسُ عَلَيْهَا ، وَإِنْ لَمْ تَكُن مِنَ الخَصائِصِ الَّتي لا يَجْرِي القِيَاسُ فِيْهَا} واتە : وێنەی ئەمە { یانی : کە پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەگەڵ تەرمەکانی کوژراوانی جەنگی بەدردا کردوە} شتێکی تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە، {هەروەها ئەگەر ئەوەی (صالح)یش مانای دووەمی وەربگرین ، کە مردووانی دواندبن ، ئەوەش شتێکی تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە، وەك چۆن پێغەمبەران ، خوا وەحی بۆ ناردوون بە فریشتەداو قسەی لەگەڵدا کردوونو ، موعجیزەیان هەبوون، ئەوەش یەکێك بووە لە تایبەتمەندییەکانیان} دەڵێ : بەڵام هەندێك لەوانەی بیانووان دێننەوە بۆ گۆڕ پەرستەکان ، ئەوانەی کە دێنن بۆ جێبەجێکردنی کاروباریان ، لە خاوەن گۆڕەکان، (لەوانەی کە لە نێو گۆڕەکاندان) دەپاڕێنەوە، قیاس دەکەنە سەر ئەم فەرموودەیە ، بینا لەسەر ئەو ڕاستییە کە پێغەمبەرانو شەهیدان ژیانیان هەیە لە بەرزەخدا، دەڵێن کەواتە: هەر کەسێك لە صالحان بپاڕێتەوە با مردووش بێ، ئەگەر تۆ بانگی بکەی ، ئەوە گوێی لێت دەبێ، وە کارەکەشت بۆ

---

[1]) تفسير القرآن الحكيم : ج ٨ ، ص ٤٦٦.

جێبەجێ دەکات ! لە حاڵێکدا کاروباری پەنهانو نادیار قیاسی ناکرێتە سەر، تەنانەت ئەگەر ئەمە لە تایبەتمەندیی پێغەمبەرانیش نەبێ ، ئەوە بێگومان هەر ناگونجێ قیاس بکرێتە سەر ئەوە، چونکە ئەوە شتیکی نادیارە .

منیش دەڵێم : بێگومان ئێمە نازانین پێغەمبەر کە قسەی کردوە لەگەڵ ئەو مردووانە، چۆن بووە ؟ ئنجا ئێمە چۆن بۆمان هەیە شتێك كە پێغەمبەری خوا کردوویەتی ، وە بۆ ئێمە نادیارە ئێمەش وەك ئەو بکەین ؟ لە حاڵێکدا کە پێغەمبەر وەك سەرزەنشتو لۆمەکردنو سەرکۆنەکردن قسەی لەگەڵ جەنازەی مردوواندا کردوە ، وە کە فەرمووشیەتی : ئێوە لەوان باشتر نابیستن ، بێگومان مەبەست پێی ڕووحەکانیان بووە، ئەگەرنا جەنازەکان نابیستن، چونکە نە خواردنو خۆراك نە هیچ کام لەو تەصەرووفو هەڵسوکەوتانەیان نامێنێ ، وەك دیتنو بیستنو... هتد ، بەڵام بێگومان ڕووحەکانیان ئاگادارن .

شایانی باسیشە لە (صحيح البخاري) دا هاتوە کە دایکمان (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ ڕەخنەی لەو ڕیوایەتە گرتوەو نکووڵیی لەوە کردوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی بیستن (سمع)ی جەنازەی کافرەکانی کردبێ، بۆ فەرمایشتەکانی، بەڵکو باسی زانین (علم) یانی کردوە بە قسەکانی ئاشکراشە زانیاریی بە ڕووحیش دەکرێ، بەڵام بیستن تەنیا بە جەستە دەبێ ، واتە : جەستەیەکی ساغ کە ڕووحی تێدا بێ .

خواش پشتیوان بێ لە تەفسیری سووڕەتی (الأنفال)دا دەقی قسەکانی دایکی بڕواداران (عائشة)و ڕاجیایی زانایان لەوبارەوە دێنین ، لەکاتی باسکردنی ڕووداوەکانی جەنگی بەدردا، کە سووڕەتی (الأنفال) هەمووی لەوبارەوە هاتۆتە خوار.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسـەمان لە پێنج (٥) ئـایەت پێك دێ، کە بـریتین لـە ئـایەتەکـانی (٨٠ تا ٨٤)، وە خـوای زاناو توانا زۆر بـە کـورتیـی لـەم پێنج ئـایەتەدا باسـی پێغـەمبـەر لـووط ﷺو گـەلەکەی دەکـات، کـە چـۆن ئـەو پێغـەمبـەرە پایـە بـەرزە، بـە سـەرزەنشـت کـردنو سـەرکۆنەکردنـەوە ، لەسـەر نێربازیـی ڕەخنـە لـە گـەلەکەی دەگـرێ، وە ئـەوانیش هەڕەشـەی دەکـردن لـە خـۆیو لـە شـوێنکەوتووانـی دەکـەن، بـە بیـانووی ئـەوە کـە خۆیـان پـاك ڕادەگـرن ! ئنجـا دوای ئـەوە خـوای بالآدەسـتو دادگـەریش ، خـۆیو کەسوکـارەکەی ، جگـە لە ژنەکەی دەرباز دەکـات، وە بارانێـکی لـە ئـاگـرو ئـاسـن بەسـەر گـەلە بـێ ڕەوشـتو بێبـڕوایەکـەیدا دەبـارێنـێو، وە بـەو شـێوەیە سـزایان دەداو لـەبـەینیـان دەبـات.

هـەڵبـەتە ئێمە خـوا پشـتیوان بـێ ، بـەتەمـاین لـە کـاتی تەفسـیـرکردنی سـووڕەتی (هـود)دا توێژینەوەیـەکی تێـرو تەسـەل لەبـارەی لـووط ﷺو گەلەکەیـەوە بکـەین، لەبـەر تیشکی سـەرجەم ئـەو ئـایەتـانەدا کە لەوبـارەوە هـاتوون، لەبـەرئەوەی کـە لـە سـووڕەتـی (هـود)دا وردەکـاریی زۆر هـاتوە، وە ئێمـە ئایـەتەکانـی لەمـەڕ ئـەو بەسـەرهاتـە، لـە سـووڕەتەکـانی دیکـەش دێنیـنو ، لێـکۆڵینـەوەیەکی تێـرو تەسـەلـی لەبـارەوە دەکـەین ، وەك هـەر کـام لە ژیانی پێغـەمبـەران (عَلَيهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کـە بـاس دەکـەین ، وا دەکـەین، بۆیـە ئێمـە لێـرە بـە شـێوەیەکی ئـاسـایی بەسـەر تەفسـیـرکردنـی ئـایەتەکـاندا دەڕۆیـن ، وەك هـەریەك لـە بـەسـەرهـاتی هوودو نـووحو صالّح، وە دواییش شوعەیب کە دواتـر پێـی دەگـەیـن ، صـەڵاتو سـەلامی خـوا لەسـەر هـەمـوو پێغـەمبـەران بـێ .

﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾ وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾ .

## مانای وشــه به وشـەی ئایەتەکـان

((وە لووط (یشمان ڕەوانە کـرد) کاتێـك بـە گەلەکـەی خـۆی گـوت: ئـایا کارێـکی ناقـۆلاو خـراپ دەکەن کە پێش ئێوە هیچکەس لە جیهانییـان نەیکـردوە ﴿٨٠﴾ ئـایا ئێوە بۆ تێرکردنـی ئـارەزوو ، لـە جیاتی ئـافرەتـان دەچنە لای پیاوان ؟ بـەڵکـو ئێوە کۆمەڵێکـی زێـدەڕۆیـی کـارن ﴿٨١﴾ وە گەلەکەیشـی هـەر ئـەوە وەڵامیـان بـوو، کـە گوتیـان : (خەڵکینـە !) لە ئـاوەدانیـی خۆتانیـان وەدەرنێـن، ئەوانـە کەسـانێکن خۆیـان پـاك ڕادەگـرن ﴿٨٢﴾ ئیـدی ئێمـەش خـۆی و نـزیکەکـانیمان دەربـاز کـرد، جگـە لـە ژنەکـەی ، کە ئەویش لە بەجێمـاوو فەوتـاوان بوو ﴿٨٣﴾ وە بارانێکی تایبـەتمان بەسـەردا بـارانـدن، دەجا سـەرنج بدە ، سـەرەنجامی تاوانبـاران چـۆن بوو ! ﴿٨٤﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ٱلۡفَٰحِشَةَ ) : کە لە دەرسەکانی ڕابردووشدا ماناماان کردوە، بەلام بە موناسەبەتی ئەوە کە چەندان جار لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە، بۆ زیاتر چەسپاندنی واتاکەی دووبارەی دەکەینەوە، (الفُحْشُ وَالفَحْشَاءُ وَالفَاحِشَة : مَا عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ وَالأَقْوَالِ) ، واتە: هەر سێ وشەی: (فُحْشُ، فَحْشَاءُ، فَاحِشَة) بەمانای هەر قسەو کردەوەیەکن کە زۆر دزێوو ناقۆلاو ناشیرین بێ ، کە دیارە وشەی : (فَاحِشَة) لە قورئاندا هەم بە مانای زینا هاتوە ، هەم بە مانای نێربازیی هاتوە ، وە هەم بە مانای چرووکیی‌و ڕژدییش هاتوەو ، هەم بە مانای بلاوکردنەوەی قسەی خراپیش هاتوە .

(شَهۡوَةً ) : واتە : ئارەزوو ، (أَصْلُ الشَّهْوَةِ : نُزُوعُ النَّفْسِ إِلى مَا تُرِيدُهُ وَذَلِكَ ضَرْبَانِ : صادِقَة وَكاذِبة) وشەی (شَهْوَة) لە بنەڕەتدا بریتیە لەوە کە نەفس بەرەو شتێك دەڕوات ، کە دەیەوێ، ئەویش دوو جۆرە : جۆرێك کە ئارەزوویەکی ڕاستە، وە جۆرێکیان ناڕاستە، ئارەزووی ڕاست ئەوەیە، کە بەرەو ئەو شتانە دەچێ کە جەستە پێویستیی پێیانە ، جاری واش هەیە نەفس ئارەزووی شتێك دەکات ، کە جەستە پێویستیی پێی نیە ، بەڵکو دەبێتە هۆی نەخۆش بوون ، یاخود قەڵەو بوون ، (المشتهَى : القُوَّةُ الَّتِي تَشْتهِي الشيء) (مُشْتهَى) بریتیە لەو هێزەی کە ئارەزووی شت دەکات لە ئینساندا، وە (إِشْتهَاء)یش ، واتە : ئارەزووکردنی شت .

(مُّسۡرِفُونَ ) : (السَّرْفُ: تَجَاوُزُ الحَدِّ فِي كُلِّ فِعْلٍ يُفعَلُ)، (سَرْف) بریتیە لە سنووربەزاندن لە هەر کردەوەیەکدا کە ئەنجام دەدرێ .

(ٱلۡغَـٰبِرِينَ ) : (الغَابِرُ : الماكِثُ بَعْدَ مُضِيِّ مَا هُوَ مَعَهُ)، (غَابر) بريتيە لە مانەوەی كەسێك كە دەمێنێتەوە ، دوای ئەوەی كە ئەوەی لەگەڵیدا بووە ڕۆیشتوە ، كەواتە : (غَابر) واتە: ئەوەی كە دەمێنێتەوە، لە دوای ئەوەی ئەوانەی لەگەڵیدا بوون فەوتاون، (وَمِنْهُ الغُبْرَةُ ، البَقِيَّةُ فِي الضَّرْعِ مِنَ اللَّبَنِ) (غُبْرَة) لە زمان عەرەبیدا بەو پاشماوەیە دەگوترێ ، كە لە گوانی ئاژەڵدا دەمێنێتەوە لە شیر ، كەواتە : (غَابر) یانی : كۆتایی ، دوایی .

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکــان

خـوای پەروەردگـار دوای ئـەوەی کـە بـەسـەرهـاتـی هـەندێ لـە پێغـەمبـەرانی ، وەك ئـادەمو نـووحو صـالّحی صـەلاّتو سـەلامی خـوایان لەسـەر بـێ ، خسـتە ڕوو.

ئـنجا دەفـەرموێ: ﴿ وَلُوطًا ﴾، واتە: بێگومان ئێمە (لـوط)یشمان ڕەوانەکـرد ، ئـەم (و) واوە عەتفـی دەکـاتەوە سـەر، ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ ﴿٥٩﴾ ﴾، دوای ئـەوە دەفـەرموێ : ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًاۗ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾، یانی : (وَأَرْسَلْنَا إِلى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا)، هەروەها دوایـی دەفـەرموێ : ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَـٰلِحًا ﴿٧٣﴾ ﴾، یـانی : (وَأَرْسَلْنَا إِلـى ثَمودَ أَخَاهُمْ صالِحاً) لـێرەش کە دەفەرموێ : ﴿ وَلُوطًا ﴾، واتـە : (لقـد أرسـلنا لـوطاً الـى قومـه)، بێگومان لووطمـان ڕەوان کـرد بـۆ لای گـەلەکـەی، ﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ ﴾، کـاتێك بــە گـەلەکەی خــۆی گــوت : ﴿أَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾، ئـایا ئێـوە کـردەوەیەکی زۆر ناقـۆلاّ دەکەن ، کـە لـە پـێش ئێـوەدا لـە جیهانییـان هیـچ کەس ئـەوەی نەکـردوە ؟! واتـە : هـیچ کـەس بـەو ڕێژەیــە نـەیکردوە ، کـە بیکـات بـە عادەت، یاخـود هیچ کەس هـەر ئەسـڵەن ئەو گوناهـانەی نـەکردوە ، کـە لەوانەیـە مانـای یەکـەمیان ڕاســتــرو ، لەگــەڵ واقیـعــدا گونجــاوتر بــێ، وەك دوایـی باســی دەکـەین ﴿ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ﴾، بێگومـان ئێـوە دەچـنە لای پیـاوان لـە ڕووی ئـارەزووەوە لـە جیــاتی ژنــان ، لەگـەڵ پیاوان جـووت دەبـن، لـە جیـاتی ئـەوەی بێـن لەگەڵ ژنـان جــووت بـن ، لـە حـاڵێکـدا کە خـوای پـەروەردگـار ژنی بۆ پیـاو، وە پیـاوی بـۆ ژن دروسـت کـردوە ، نـەك پیـاو بـۆ پیـاو، وە ژن بـۆ ژن !

﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾ بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکی زێدەڕۆیی کارن ، زۆر تێدەپەڕێنن‌و زێدەڕۆیی دەکەن ، سنوور دەشکێنن ، نەك سنوور دەشکێنن بەو واتایە کە ئەسڵی کارەکەتان چاکە، بەڵام ئێوە تێدەپەڕێنن ! بەڵکو مەبەست لێرەدا لە زێدەڕۆیی کردن ، یانی : لە سنوورەکانی خوا تێدەپەڕێنن ، وە سنوورەکانی خوا دەبەزێنن ، چونکە خوا داناوە ، کە پیاو ئارەزووی جینسیی خۆی لەگەڵ ئافرەتدا تێر بکات، هەڵبەتە بە حەلاڵیی‌و لەگەڵ هاوسەری خۆیدا، ئافرەتیش بە هەمان شێوە ، لەگەڵ هاوسەری خۆیدا، بەڵام ئەوە کە پیاو لەگەڵ پیاو جووت بێ، یاخود پیاو لەگەڵ ئافرەتێك جووت بێ ، کە پێی ناشێ، یاخود ئافرەتێك لەگەڵ پیاوێك جووت بێ ، کە حەلاڵی نیە، ئەوە بێگومان زێدەڕۆییەو سنوور شکێنییە.

ئنجا با بزانین گەلەکەی چییان وەڵام دایەوە ؟ ﴿وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾﴾، وە وەڵامی خەڵکەکە هەر ئەوە بوو کە گوتیان : (خەڵکینە !) لە ئاوەدانیی خۆتان دەریان بکەن، شاربەدەریان بکەن ، بێگومان ئەوانە کۆمەڵە خەڵکێکن ، خۆیان پاك ڕادەگرن ، کەواتە : بەکەڵکی نێو ئێوە نایەن ، ئنجا ئەوە دەگونجێ بە توانج‌و تەوسەوە پێیان گوتبن، واتە: ئەوانە خۆیان پاك ڕادەگرن‌و ئەو کارەی ئێمە ناکەن‌و ، پێیان وایە ئەو کارەی ئێمە پیسەو قێزەونە ، وە دەشگونجێ هەر بەڕاستیی پێیان گوتبن ، واتە : ئەو کارەی ئێمە دەیکەین ، هەرچەندە پیسیشە، بەڵام ئەوە دەیکەین ، دیارە ئەوانە خۆیان پاك ڕادەگرن‌و ، ئەو کارەی ئێمە لە خۆیان ناوەشێننەوە، کەواتە: بە کەڵکی نێو ئێمە نایەن .

دیارە خوای کاربەجێ پێغەمبەرانی خۆی ، کە بەندە تایبەتییەکانی ، وێڵ ناکات‌و ، پشتیان بەرنادات، بەڵکو هەمیشە بەرگرییان لێدەکات ، بە پێی حیکمەتی خۆی، چونکە مەرج نیە هەمیشە بە سەرکەوتنی ڕواڵەتیی دەربازبن‌و ، هیچیان لێ نەیەت، جاری وایە سەرکەوتنی بەندەکانی خوا ، ئەوەیە کە لەسەر ئەو بیروبڕواو پەیامەی خوا، گیان فیدایی بکەن‌و ، خۆیان بەخت بکەن، وە جاری واش هەیە ، وێڕای ئەوە کە لە ڕووی مەعنەوییەوە سەردەکەون، لە ڕووی ڕواڵەتییشەوە خوا سەریان دەخات‌و، دەربازیان دەکات‌و ، ڕێگا نادات کافرەکان دەستیان بیانگاتێ .

ئنجا دەفەرموێ : ﴿ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥٓ ﴾، ئێمە خۆیو کەسوکارەکەی، یاخود خۆیو نزیکەکانیمان دەرباز کرد، نزیکەکانی (لووط) کێ بوون ؟ ئەوانە بوون کە بڕوایان پێ هێناوە، ئەوانە نزیکینی، ئەوانە کەسوکارینی، هەرکام لە پێغەمبەران نزیکەکانو دڵسۆزەکانیان ئەوانە بوون ، کە لە خزمەتیان دابوون، لە خزمەت ئەو پەیامو بەرنامەیە دابوون کە پێیان بووە ، با بە خوێنو نەسەبو گۆشتیش نەچنەوە سەریان، ﴿إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴾، {نزیکەکانیمان هەموو دەرباز کردن} جگە لە ژنەکەی، ئەو لە فەوتاوان بوو، واتە: لە بەجێماوان بوو، دیارە ژنی لووط ، بۆیە خوا بەو جۆرە سزای داوە، چونکە بڕوای بە لووط پێغەمبەر نەهێناوە ، بەڵکو دەڵێ : دەست کێشیی قەومەکەشی دەکردو، هاوکاریی دەکردن لەسەر خراپە ، بەڵام هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن ، کە هاوسەرانی پێغەمبەران (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەموویان بە هاوسەرانی نووحو لووطیشەوە، لە ڕووی ئاکارو ڕەوشتەوە ، پاك بوون ، چونکە ڕەوشت نزمیی بۆ ئافرەت تانە (طعن)یە لە کەرامەتو شەرەفی پیاو ، وە لە ڕەچەڵەكو وەچەی پیاو ، ڕەچەڵەكو وەچەی پێغەمبەرانیش، دەبێ پارێزراوو پاكو چاك بێ .

بەڵام ئایا بۆچی کوفری ئەو دوو هاوسەرە ، وای نەکردوە کە ئەوان دەستبەرداری هاوسەرەکانیان ببن ؟ دیارە ئەو کاتە ڕێگا درابووە کە پیاوی مسوڵمان هاوسەری کافری هەبێ، وە دیارە کوفر مایەی نەنگییو شەرمەزاریی نەبووە ، چونکە ئەو خەڵکە شانازییان بە کوفر کردوە، بۆیە کە خێزانی هەر کام لە نووحو لووط سەلامی خوایان لێ بێ ، کافر بوون، ئەوە نەبۆتە هۆی تانە لێدانیانو، عەیبدار بوونیان، بەڵکو ڕەنگە شانازییشیان پێوە کردبنو گوتبێیان ئەوەتا نووحو لووط ، تەنانەت خێزانەکانیشیان لە ڕووی بیروبڕواوە ، لەگەڵ ئێمەن ! بەڵام بێگومان ئەگەر لە ڕووی ڕەوشتییەوە ، لە ڕووی جینسییەوە ، ئینحرافو هەڵەیان ببووایە، ئەو کاتە هەم لە ڕووی ڕەچەڵەكو وەچەوە ، ئیشکال بۆ پێغەمبەران (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، پەیدا دەبوو، وە لە ڕووی شەرەفو کەرامەتی پێغەمبەرانیشەوە ، ئەوە شتێکی نەگونجاوە، بۆیە زانایان لەسەر ئەوە

یەکدەنگن کە خێزانەکانی ئەو دوو پێغەمبەرەش، صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، پاك بوون ، کەواتە مەبەست لەوە ، کە دەفەرموێ : ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا[1] ﴿١٠﴾ ﴾ التحريم .

یاخود کە لێرەدا دەفەرموێ : {ژنەکەی لووط لە فەوتاوان بوو}، یان لە بەسەرهاتی نووح دا ﷺ وەك باسمان کرد، باسی خێزانەکەی دەکات، کە دەرباز نەبووە، مەبەست ئەوە نەبووە کە وەك قەومەکەیان لە ڕەوشتی نزمو ئەو کردەوە ناقۆڵایانەدا ، کە ئینسانیان پێ ناشیرین دەبێ ، چ کافربێ ، چ مسوڵمان بێ ، دەستیان لەوەدا بوو بێ ، بەڵکو مەبەست ئەوە بووە، کە لەڕووی بیرو بڕواوە ، لادانی عەقیدەییو فیکرییان هەبووە .

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، وە بارانێکی تایبەتییمان بەسەردا باراندن، تەماشا بکە سەرەنجامی تاوانباران چۆنە ؟ دیارە ئەو بارانە تایبەتییە، ئاگرو ئاسن بووە ، بەسەریاندا باریوە، یان وەك تەعبیری پەیمانی کۆن دەڵێ : کبریتیان بەسەردا باریوە، کانزا (معدن)ی تواوەیان بەسەردا باریوە، کە دوایی باسی دەکەین ئەوە چۆن بووە ؟

---

١) ناپاکییان بەرانبەریان کرد، یانی : سەرپێچییان لێیان کردو دژایەتییان کردن ، لە ڕووی عەقیدەیی یەوە.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾، مێژوونووسان، بۆ وێنە: موحەممەد عید عەبدوڵلا یەعقووب حوسەینی[1] دەڵێ : (لُوط إِبْنُ أَخِ إِبْرَاهِيم عَلَى أَرْجَحِ الأَقْوَال، فَهُوَ لُوط بْنُ هَارَانَ بْنُ تَارح ، وَقِيلَ تَارح هُوَ آزَر الَّذِي وَرَدَ ذِكْرُهُ فِي القُرْآن) هەڵبەتە زۆر جێی دڵنیایی نیە، بەڵام زۆر لە زانایان دەڵێن : لووط برازای ئیبراهیم بووە ، بەپێی بەهێزترین قسە، واتە: لووط كوڕی هارانی كوڕی تارح بووە، كە دیارە دەبێتە برازای ئیبراهیم، هەندێكیش گوتوویانە : تارح بریتیە لە ئازەر كە خوای پەروەردگار ناوی لە قورئاندا هێناوە، ئنجا گەلی لووط ، لەم پێنج شارەدا بوون، وەك لە كتێبەكانی مێژوودا هاتوە : (سەدووم، صامووره، صابووره، دووما، عامووڕه) ئەو پێنج شارە، ناوچەكەشیان ئێستا لە نێوان ئوردن و دەسەڵاتی فەڵەستین و قەوارەی زایۆنی دایە، وە كاتی ژیان و گوزەرانی گەلی (لوط) (٢٠٠٠) ساڵ پێش زاین بووە، وە ژمارەیان بەپێی سەرچاوە مێژووییەكان ، لە نێوان (٤٠٠,٠٠٠ تا ٦٠٠,٠٠٠) كەس بووە، وە ئێستا شوێنی گەلی لووط لە ژێر دەریای مردوو (البَحْرُ المیِّت) دایە، كە دیارە بۆیە وای پێ دەگوترێ ، چونكە هیچ زیندەوەرێكی تێدا ناژی، چونكە ڕێژەی خوێی تێدا زۆر زۆر بەرزە ، كە ئەمانە هەمووی لە سەرچاوەی پێشوودا هاتوون .

ئنجا كە (لوط) بە گەلەكەی خۆی دەڵێ : ﴿أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾، ئایا كردەوەیەكی ناقۆڵا دەكەن كە هیچكەس

١) سِيْرَةِ النَّبِيّ وَالمرْسَلِين: ج١، ٢٨٢.

له جیهانییان پێشتان نەکەوتوە تێیدا ؟ (الفَاحِشَة: مَا عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ وَالأَقْوَالِ)، (فَاحِشَة) بریتیە له هەر کردەوەیەكو قسەیەك کە زۆر ناقۆڵاو دزێوو ناشیرین بێ ، کە مەبەست پێی نێربازییە، جووت بوونی پیاو لەگەڵ پیاو، کە بە عەرەبی (الذکورية)ی پێ دەڵێن، وە (المثلية)شی پێ دەڵێن ، بەڵام بەڕاستیی من وشەی (لِوَاطة)ەم پێ خۆش نیەو ، لەسەر دڵم قورسە ، چونکە وەك بڵێی لە ناوی (لووط)ەوە وەرگیرابێ ، کە لە ڕاستییدا (لوط)یش پێغەمبەرێکی پایەبەرزی خوایە ، بۆیە ئەم وشەیە بەکارنەهێنرێ چاکە ، هەرچەندە دەڵێن : مەبەستمان لە : (لِوَاطة) کردەوەی گەلی (لوط)ە .

کە دەفەرموێ: ﴿ سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، واتە: بەو ڕێژەیەو بەو قەبارەیە، وە یاخود بەو شێوازە زەقە، وە دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە هیچ کەس لە پێش ئێوەدا ئەو کردەوە دزێو ناقۆڵایەی نەکردوە، واتە: هیچ پیاوێك لەگەڵ هیچ پیاوێك دا جووت نەبووە ، لە پێش گەلی لووط دا، بەڵام زۆر لە زانایان دەڵێن : ڕەنگە مەبەست پێی ئەوەبێ کە بەو شێوە زەقو بێ مانایەو ، بەو شێوەیە کە ڕێگا لە خەڵك بگرنو ، پیاوان واز لە ئافرەتان بێننو ، پێکەوە ئارەزووی جینسییان تێر بکەن ، ئافرەتانیش واز لە پیاوان بێنن ، ئەوە بەس لەنێو گەلی لووط دا ئەم شێوەیە هەبووە .

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ : ﴿ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ﴾، هەر کام لە (نافع و حفص) وایان خوێندۆتەوە، ئەوانی دیکە هەموویان ئاوایان خوێندۆتەوە : (أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاء)، (أَئِنَّكُمْ) ، واتە : ئایا ئێوە دەچنە لای پیاوان بە ئارەزووەوە ، لە جیاتی ئافرەتان ؟

بەڵام : ﴿ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ﴾، واتە: بێگومان ئێوە دەچنە لای پیاوان بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانتان ، لە جیاتی ژنان .

کە دەفەرموێ : ﴿ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴾، وەك گوتم : ﴿ مُّسۡرِفُونَ ﴾ واتە : لە سنوور دەرچووان، چونکە ئەوان لە سنووری سروشتو شەرعو عەقڵ دەرچوون، چونکە مەسەلەی پەیوەندیی نێوان پیاوو ئافرەت ، لەڕاستییدا تەنیا تێرکردنی ئارەزووی جینسیی نیە، بەڵکو پێکەوەنانی خێزانە، پێکەوە ئارامگرتنە، پاشان بەردەوامبوونی وەچەی مرۆڤایەتییە، بۆیە کاتێك کە مرۆڤ لەو ڕووەوە ئینحیراف دەکات ، مانای وایە لە حوکمی عەقڵو شەرعو سروشت ، دەردەچێ .

ئنجا کە لێرەدا : ﴿ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ٨١ ﴾ هاتوە ، لە سوورەتی (الشعراء)دا ، دەفەرموێ : ﴿ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٌ عَادُونَ ١٦٦ ﴾، واتە : بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکی سنوور شکێنن .

وە لە سوورەتی (النمل) دا دەفەرموێ : ﴿ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ٥٥ ﴾، واتە: بەڵکو ئێوە کەسانێکن نەفامیی دەکەن، ئاشکراشە کە ئەو جۆرە ئینحیرافو لادانە : هەم تێپەڕاندنە، هەم سنوور شکاندنە، هەم نەفامییەو، کۆمەڵێك وەسفی خراپ لە خۆیدا کۆدەکاتەوە .

ئنجا لێرەدا مەبەست لەوە کە دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ٨١ ﴾، یانی : لێرەدا مەسەلە هەر ئەوە نیە ، کە بتانەوێ ئارەزووی جینسییتان تێر بکەن، ئەگەرنا ئارەزووی جینسیی پیاو لەگەڵ ئافرەت ، باشتر تێر دەبێ، بەڵکو ئێوە هەر زێدەڕۆیی کارنو، حەزتان لە خراپەو گوناحو تاوانە.

<u>**مەسەلەی سێیەم:**</u> کە دەفەرموێ : ﴿ وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخۡرِجُوهُم مِّن قَرۡيَتِكُمۡۖ إِنَّهُمۡ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ ﴾، وەڵامی گەلەکەی هەر ئەوە بوو کە گوتیان : لە ئاوەدانیی خۆتان دەریان بکەن، {واتە: شاربەدەریان بکەن} ، چونکە ئەوانە کۆمەڵێکن دەیانەوێ خۆیان پاك ڕابگرن،

کە دەڵێن : ﴿أَخۡرِجُوهُم مِّن قَرۡيَتِكُمۡ﴾، وەك بڵێی ئەوانە هاوولاتیی نەبن ، مافی هاوولاتیی بوونیان پێ ڕەوا نابینن !

کە دەڵێن : ﴿إِنَّهُمۡ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ﴾، وەك گوتم: دەگونجێ لەبەر ئەوەبێ کە ئەوان پیس بوون ، ئەوانیش خۆیان پاك ڕاگرتوە، وە دەشگونجێ بە توانجو تەوسەوە ئەوەیان پێ گوتبن .

ئنجا لە سووڕەتی (العنكبوت) دا دەفەرموێ : ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱئۡتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٢٩﴾، وەلامی گەلەکەی هەر ئەوە بوو کە گوتیان: سزای خوامان بۆ بنێرە ، ئەگەر لە ڕاستانی، لێرەش دەفەرموێ : ﴿وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخۡرِجُوهُم مِّن قَرۡيَتِكُمۡ﴾، یەکێك بۆی هەیە بڵێ : چۆن لەوێ دەفەرموێ : وەلامیان هەر ئەوە بوو، لێرەش دەفەرموێ : وەلامیان هەر ئەوە بوو ؟! وەلامەکەی ئەوەیە: کە ئەمە لە دوو قۆناغدا بووە، لە قۆناغی یەکەمدا گوتوویانە: دەریان بکەن، وەلامەکەیان هەر ئەوە بوو ، وە لە قۆناغی دووەمدا دوای ئەوەی کە دەرنەکراون، یان بۆیان دەرنەکراون، گوتوویانە: ئەگەر ڕاست دەکەی سزای خوامان بۆ بێنە ، ئەوە بووە کە خوای پەروەردگاریش سزای بۆ ناردوون ، لەسەر داوای خۆیان .

<u>**مەسەلەی چوارەمو کۆتایی**</u> : کە دەفەرموێ : ﴿فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ٨٣ وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِم مَّطَرٗاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٨٤﴾، واتە: تەنیا خۆیو خێزانیو بنەماڵەکەیمان دەرباز کردن ، جگە لە ژنەکەی، لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە خوای کاربەجێ

نەیفەرمووە : (إلاَّ زَوْجَتَهُ) یان (إلاَّ زَوْجَهُ) بەڵکو فەرموویەتی : ﴿إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ﴾، وەك بڵێی : ئەوە هەر ژن بووەو مێینەیەك بووە، ئەگەرنا هاوسەری نەبووە، چونکە هاوسەرایەتیی ئەوەیە کە ژنو مێرد پێکەوە تەباو گونجاوو هاوکار بن ، بەڵام ئەو هیچ ئینسیجامو تەباییەکی لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆیدا نەبووە ، ئەو هاوسەرە بەرزو بەڕێزەی کە (لوط)ە ، ئنجا واش پێدەچێ کە تەنیا خۆیو بنەماڵەکەی دەرچووبن ، جگە لە ژنەکەی ، بە بەڵگەی ئەوە کە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الذريات)دا دەفەرموێ : ﴿فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾﴾، واتە: هەرچی ئیماندار بوون لەو شارو وڵاتە دەربازمان کردن، بەڵام جگە لە ماڵێك لە مسوڵمانان ، تێماندا نەدۆزینەوە ، ئنجا ماڵە مسوڵمانەکەش ماڵی (لوط) بووە، مانای وایە : ئەوانەی کە رزگاریان بووەو دەرچوون ، تەنیا لە کەسوکارەکەیو نزیکەکانی خۆی بوون، کە دیارە هەر ئەوانە ئیمانیان پێی هێناوە .

وشەی (الغَابِرِين : البَاقِين، الهالِكِين) چونکە وشەی (غَبَرَ) دوو مانای پێچەوانەی یەکدی هەن، وەك (عَسْعَسَ) بە مانای هات (أَقْبَلَ) دێ، بە مانای ڕۆیشت (أَدْبَرَ)ش دێ. (غَبَرَ)ش، بە مانای (مَضَى) ڕۆیشت، وە بە مانای (بَقِيَ) مایەوە ، دێ ، کەواتە (الغابرين : الباقين) واتە: ئەوانەی کە مانەوە بۆئەوەی سزا بدرێن، ئافرەتەکەش لەگەڵ ئەواندا بوو، یاخود (الهالكين) ئەوانەی کە فەوتان و ڕۆیشتن .

کە دەفەرموێ: ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾، بارانێکی تایبەتمان بەسەردا باراندن، بڕوانە سەرنج بدە ! سەرەنجامی تاوانباران بوو !

لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ ۖ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾﴾، واتە: ئێمە بەردێكمان بەسەردا باراندن ، كە لە قوڕی وشك كراوە (دروست) كرابووو زۆر ڕێك ڕیز كرابوو ، نیشانەدار كرابوو لەلایەن پەروەردگارەوە ، (دەڵێن : هەر بەردێك ناوی ئەو كەسەی لەسەر بووە كە پێی دەفەوتێ، یان نیشاندار كرابووو شێوەیەكی تایبەتیی وەرگرتبوو، (بۆ ئەو تاوانبارانە)، وە ئەو (جۆرە سزایە)ە لە ستەمكارانەوە دوور نیە .

وە لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ : ﴿ فَجَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾﴾، واتە: سەرەوەی ئەو ئاوەدانییەمان كردە خواری، وە خوارێشمان كردە سەری، واتە: هەڵمانگێڕایەوە ، وەك چۆن ئەوان فیطرەتی خۆیان هەڵگێڕابووەوە، ئێمەش ئاوەدانییو وڵاتیانمان وەرگێڕاو سەرەوبنمان كردن، وە بەردێكی لە قوڕی وشككراوەمان بەسەردا باراندن.

وە لە سوورەتی (النجم)دا دەفەرموێ : ﴿وَالْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّاهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾﴾، (مُؤْتَفِكات) واتە : (مُنْقَلِبَات) ئەو شارانەی كە هەڵمانگێڕانەوە، (خوا) بەرزی كردنەوەو بەریدانەوە، ﴿أَهْوَىٰ﴾ یانی (أَسْقَطَ) ﴿ فَغَشَّاهَا مَا غَشَّىٰ ﴾، ئیدی بەسەریدا هات (تەمو مژو چڕە دووكەڵێك) ئەوەی كە بەسەریدا هات ، ﴿ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾﴾ ئنجا (ئەی مرۆڤ !) بەرانبەر بە كام لە نیعمەتەكانی پەروەردگارت دەكەویە گومان، یاخود شەڕەقسە دەكەی ؟!

ئنجا لە تەوراتدا ئاوا باسی فەوتانی گەلی لووط دەكات، كە دەیكەمە كۆتایی ئەم دەرسەمان ، دەڵێ :

(فَأَمْطـر الـرَّبُّ عَلَـى سَـدُومَ وَعَـمُورَةَ كِبْرِيتَـاً وَ نَـاراً مِـنْ عِنْـدِ الـرَّبِّ مِـنَ السَّـمَاءِ. وَقَلَـبَ تِلْـكَ الـمدُنَ والسـاكِنِينَ فِيهـا وَالسَّـهْل الـمحِيْطَ بِهـا وُكُـلَّ مَزْرُوعَـاتَ الأَرْض، وَتَلَفَّتَــتْ زَوْجَــة لُـوط السـائِرَة خَلْفَـهُ وَرَاءَهـا فَتَحَوَّلَـتْ إِلــى عَمُـودٍ مِـنَ الملْــح)[1] واتــە: پەروەردگــار بەســەر شــاری ســەدووم‌و عــەمووڕەدا ، کبـریــت‌و ئـاگری باراند ، لەلایەن خوای لە ئاسـمانەوە، وە ئـەو شـارانەو دانیشتووەکانیشـی هەڵگێڕایـەوە، وە ئەو دەشت‌و دەرەی کە دەورەیـان دابـوون ، وە ئـەو کشتوکـاڵەی کە لە دەوری بـوو ، هـەمووی هەڵگێـڕایەوە، وە خێزانـی لووطـیش ئـاوڕی دایـەوە ، کـاتێــك لـە پشـتیەوە دەڕۆیـی ، ئـەویش بـوو بـە یـەك کۆڵـەکـەی خــوێ {واتـە : ئەویش لە شوێنی خوێ ڕەق‌و وشـك بـوو}.

لە پەیمانی کۆندا ئـاوا باس دەکات ، بـەڵام لە قورئـاندا بـە گشـتـی دەفـەرموێ : هەڵمانـگێـڕایــەوە، وە دەفــەرموێ : بـــەردی ئـاگـرینمـــان بەســـەردا بـارانـــدن ، هەڵبــەتە ئێمـە دوایـی لـە تەفسـیــری ســووڕەتی (هــود)دا، بــە درێـژیی باســی بەسەرهاتی لـووط و گـەلەکــەی دەکـەین ، وە باسـی قسـەی زانـایـانیش دەکــەین لەبـارەی حوکم‌و سـزای نێـربازییـەوەو ، لێرەدا دێـینـە کۆتـایی ئەم دەرسـەمان .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) التَّفِسير التَّطْبِيقي للكِتَاب الـمقَدَّس ، العَهْـد القَدِيم ، سِفْر التكوين ، الإِصْحَاح : ١٩، إِهْلاَكُ سَـدُوم وعَـمُورة ، ص ٥٢ .

# دەرسی یازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان نۆ (٩) ئایەت دەگرێتە خۆی : (٨٥ تا ٩٣)، دیارە لەم دەرسەماندا بەسەرهاتی پێغەمبەر شوعەیبو گەلەکەی، واتە: گەلی مەدیەن باس دەکەین، کە ئەویش وەك سەرجەم پێغەمبەرانی برای ، لە خوا بەیەکگرتنەوە دەستی بە دواندنی گەلو کۆمەڵگاکەی خۆی کردوە ، پاشان لە ڕووی هەڵسوکەوتی ئابووریی و کۆمەلایەتییو ئەمنییەوە ، ئامۆژگاریی کردوون .

وە پێی ڕاگەیاندوون کە دەبێ بیروڕای جیاوازی یەکدی تەحەممول بکەن، وە بە تەبایی پێکەوە بژین، تاکو خوا دادوەرییان لە نێواندا دەکات، بەلام کۆمەڵی دەستڕۆیشتووو خۆ بەزلگری کۆمەڵگایەکەی ، هەڕەشەی لە ولات دەرکردنو شاربەدەرکردنیان لە خۆیو شوێنکەوتووانی کردوە، ئەگەر نەگەڕێنەوە سەر ئایینو ڕێبازەکەیان، ئەویش (واتە: شوعەیب) بە سەرسوڕمانەوە دەپرسێ : ئایا ئەگەر پێشمان ناخۆش بێو قەناعەتیشمان بە ڕێبازەکەتان نەبێ ، هەر ناچارمان دەکەن ؟! پاشان قسە ڕۆیشتووە خۆ بەزلگرەکانی گەلەکەی بە ، بڕواداران دەڵێن : ئەگەر بەدوای شوعەیب بکەون ، زیانبارن، کە ئەوە دیارە هەڕەشەیەکی پەنهانە ، واتە : زەرەر دەکەن، وە سەرەنجام ئەوانیش بومەلەرزەیەك دەیانگرێو ، لەگەڵ خاکدا یەکسان دەبنو قیڕەبڕ دەبن، ئنجا شوعەیب ڕوویان لێ وەردەگێڕێو پشتیان تێدەکاتو دەڵێ : ئەی گەلەکەم ! پەیامەکانی پەروەردگارمم پێ ڕاگەیاندن ، وە خێرخوازییو دڵسۆزییم بۆ نواندن ، بەلام بە قسەتان نەکردم ، کەواتە : چۆن خەفەت بۆ کۆمەڵێکی کافر بخۆم ؟!

هەڵبەتە ئێمە دوایی لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (هود)دا ، بە درێژیی باسی بەسەرهاتی شوعەیبو گەلەکەی دەکەین .

﴿ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ
غَيۡرُهُۥۖ قَدۡ جَآءَتۡكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡۖ فَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ
وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَاۚ
ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (٨٥) وَلَا تَقۡعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٖ
تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبۡغُونَهَا عِوَجٗاۚ
وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ كُنتُمۡ قَلِيلٗا فَكَثَّرَكُمۡۖ وَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ
ٱلۡمُفۡسِدِينَ (٨٦) وَإِن كَانَ طَآئِفَةٞ مِّنكُمۡ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٞ
لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ فَٱصۡبِرُواْ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَاۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ (٨٧) قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ
ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ
فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ (٨٨) قَدِ ٱفۡتَرَيۡنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم
بَعۡدَ إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَاۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ وَسِعَ رَبُّنَا
كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ
(٨٩) وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعۡتُمۡ شُعَيۡبًا إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ (٩٠)
فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ (٩١) ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ
فِيهَاۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَانُواْ هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ (٩٢) فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ
أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡۖ فَكَيۡفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ (٩٣) ﴾.

# مانای وشــە بە وشەی ئایەتەکـان

((وە بۆ (گەلـی) مەدیەن شـوعەیبی برایـانمان نـارد، گوتی : ئەی گـەلەکەم ! خـوا بپەرستن ، جگە لەو هیچ پەرستـراوی دیکە (ی شایستەی پەرستن)تـان نین ، ئەوە (بۆ ئیسپاتی راستیی منیش) بەڵگـەیەکی ڕوونتـان لە پەروەردگـارتانەوە بۆ هـاتوە ، دەجا پێـوانو کێشـان بـە تەواویـی بکـەنو (ستەمکـارانە) شتەکـانی خـەڵك سـووك مەکـەن، وە پاش چاکسـازیی تێداکـرانی ، خراپەکـاریی لە زەوی دا مەکـەن، ئـا ئـەوە بۆتـان باشتـرە ئەگـەر ئیمـانداربن ﴿٨٥﴾ وە بـە مەبەسـتی ترسـاندن (ی خەڵـكو هەڕەشـە لێکردنیـان) لەسـەر هـەموو ڕێیان (بۆ جەردەیی) دامەنیشـن، وە (واز لـەو نەرێتـەتان بێنـنو) دڵنیابـن تاوانێکی زلە، کە ئەوانەی بڕوایان هێناوە لە ڕێی خـوا دەگێڕنـەوە، وە هەوڵـدەدەن (ڕێبـازی خـوا) خـوارو خـێچ بکـەن (و نارێـك بیخەنـە بەرچـاوی خەڵـك) وە ئـەوە یـاد بکەنـەوە کاتێـك (لـە ڕووی ژمـارەوە) کـەم بـوون ، بـەڵام (خـوا) زیـادی کـردن، وە سـەرنج بـدەن ، بزانـن سـەرەنجـامی خراپەکـاران چـۆن بوو ! ﴿٨٦﴾ وە ئەگەر کۆمەڵێکتان بڕوایـان بـەوە هێنـا کە پێـی نێـرراومو ، کۆمەڵێـك بڕوایان نەهێنـا ، ئەوە یەکدی تەحەممول بکەنو خۆڕاگـربـن ، هەتا خـوا دادوەرییمـان لەنێـواندا دەکـاتو ، ئـەویش باشتـرین دادوەرە ﴿٨٧﴾ ئەو دەسـتڕۆیشـتووانەی خۆیـان بـە زل دەگـرت لە گەلەکـەی گوتیـان : ئەی شـوعـەیب ! بـە دڵنیـاییەوە یان خـۆتو ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە لەگەڵـت ، لـە ئـاوەدانیی خۆمـان وەدەرتـان دەنـێین، یـان دەگەڕێنـەوە سـەر ئایینەکـەمان ! گوتـی : ئـەدی ئەگـەر پێمـان نـاخۆش بـێ (قەناعەتمان بە ئایینەکەتان نەبێو ، حەزیش نەکەین شاربـەدەر بین !) ئـایا هـەر ناچـارمان دەکـەن ؟ ﴿٨٨﴾ بـە ڕاسـتیی ئەگـەر بگەڕێینـەوە سـەر ڕێبازەکەتـان ، پاش ئەوەی خـوا قوتاری کـردووین ، مانـای وایـە درۆمـان بـە نـاوی خـواوە هەڵبەسـتوە ، وە مەگـەر خـوا پەروەردگـار بیـەوێ، ئەگـەرنا هـەرگیز ناگـەڕێینـەوە سـەری، زانیـاریی پەروەردگـارمان هـەموو شـتێکی گرتۆتـەوە، تەنیـا پشـتمان بـە خـوا بەسـتوە،

پەروەردگارمان ! بە هەق دادوەریی لە نێوان ئێمەو گەلەکەماندا بکە، وە تۆ چاکترین دادوەری (٨٩) وە ئەو دەستڕۆیشتووانەی بێبڕوابوون لە گەلەکەی گوتیان : (بە بڕوادارەکان) بە مسۆگەریی ئەگەر شوێن شوعەیب بکەون ، هیچ گومانی تێدا نیە کە ئێوە زیانبارن (٩٠) ئیدی بوومەلەرزە گرتنیو ، لە ماڵەکەیاندا تەخت بوون (٩١) ئەوانەی بڕوایان بە شوعەیب نەکرد ، وەك هەرگیز لەو وڵاتەدا نەبووبن ، (هیچ کەسیان لێ دەرباز نەبوو ، وە قیڕەبڕ بوون) ئەوانەی بڕوایان بە شوعەیب نەکرد ، هەر خۆیان زیانبار بوون (٩٢) ئەویش پشتی تێکردنو ، گوتی : ئەی گەلەکەم ! بێگومان پەیامەکانی پەروەردگارمم پێڕاگەیاندنو ، دڵسۆزییم بۆ نواندن ، کەواتە : چۆن بۆ (چارەنووسی ڕەشی) کۆمەڵێکی بێبڕوا خەفەتبار بم ! (٩٣)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(فَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ ) : واتە : پێوان و كێشان بە تەواویی بكەن، (كَيْل) واتە : پێوان ، (مِيزَان) واتە : كێشان ، دەڵێ : (الوَافِي : الَّذِي بَلَغ التَّمَامَ) (وَافِي) واتە : شتێك كە گەیشتبێتە ئەندازەی تەواوی خۆی ، دەگوترێ : (دِرْهَمٌ وَافٍ، وَكَيْلٌ وَافٍ) واتە : درەمێكی تەواو لە ڕووی وەزن و كێشەوە، وە شتێك كە بە تەواویی بكێشرێ.

(وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ ) : واتە : شتی خەڵك بە كەم مەگرن، یاخود بە سووكی تەماشا مەكەن، یاخود لە نرخی شتەكانیان دامەشكێنن، {البَخْسُ: نَقْصُ الشَّيءِ عَلَى سَبِيلِ الظُّلْمِ، وَالبَخْسُ، وَالبَاخِسُ: الشيءُ الطَّفِيف النَّاقِص (بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِم مَعْدُودَة)}، (بَخْس) بریتییە لەوەی كە بە شێوەی ستەمكارانە شتێك كەم بكەیەوە، وە (بَخْس، وَ بَاخِس) بە شتێكی سووكی ناتەواو دەگوترێ، وەك لە سوورەتی (یوسف)دا هاتوە، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۭ بَخۡسٖ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ٢٠ ﴾

واتە: یوسفیان فرۆشت بە چەند درەمێكی كەم، وە تێیدا زۆر بە كەمگر بوون، یانی: زۆر بە كەمیان گرت ، بۆیە هەرزان فرۆشیان كرد .

(صِرَٰطٖ ) : (الصِّرَاطُ: الطریقُ المستقِيم، وَالسِّرَاطُ: الطریق المستهل)، وشەی (صِرَاط) بە (ص) واتە: ڕێی ڕاست، بەڵام بە (س) واتە: ڕێیەك كە ئاسان بێ، چونكە : (سَرَطَهُ : بَلَعَهُ) واتە: خواردنەكەی قوتدا، وەك بڵێی بابای پێڕۆ ، كە بە ڕێیەكدا دەڕوا ، ڕێیەكە قوتدەدا.

(تُوعِدُونَ ) : (الوَعِيدُ: فِي الشّرِّ خاصة، تُوعِدُونَ، أَوْعَدَ، يُوعِدُ، فَهُوَ مَوْعِدٌ) واتە : هەڕەشەی كرد، هەڕەشە دەكات، هەڕەشە كەرە، (وَعِيد) گفتە بەتایبەت

دەربارەی شتی خراپە، واتە: هەڕەشە، (الوَعْدُ يَكونُ فِي الخَيْرِ وَالشرِّ) بەلاّم (وَعْد) یانی : گفت دانو بەڵێن دان، هەم بۆ چاکە بەکاردێ، وە هەم بۆ خراپەو بۆ هەڕەشەش بەکاردێ، دەگوترێ : (أَوْعَدْتُهُ) واتە: هەڕەشەم لێکرد .

(وَتَصُدُّونَ ) : (الصّدُودُ وَالصدُّ: قَدْ يَكونُ انْصِرَافاً عَنِ الشَّيءِ وَامْتِنَاعاً، وَقَدْ يَكونُ صَرْفاً وَمَنْعاً)، (صّدُودُ وَصَد) جاری وایە بەوە دەگوترێ کە واز لە شتێك بێنیو نەیکەی، وە جاری واش هەیە مەبەست پێی ئەوەیە ، کە کەسێك لە ڕێیەك لابدەیو نەیهێڵی، یانی: نەهێڵی بەرەو ئەو شتە بچێ .

(وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا ) : واتە : بە دوای ئەوەدا دەگەڕێن خوارو خێچو لاری بکەن ، (يطلبون لَها العوج والإنحِرَاف، أَبْغَاهُ الشيء : طَلَبهُ لَهُ)، (يَبْغُونَهـا عِوَجَاً) واتە: خواریی بۆ دەخوازن، دەیانەوێ ڕێبازی خوا خوارو خێچو بێزراو بخەنە بەرچاو، (أَبْغَاهُ الشيء) یانی : (طَلَبهُ لَهُ) واتە : ئەو شتەی بۆ داواکرد ، (وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا )، یانی : (تَبْغُونَ لَها عِوَجَاً) لاریی بۆ ڕێبازی خوا دەخوازن .

(مِلَّتِنَا ): (الملَّةُ : كالدِّين، وَهُوَ اسْم لِمَا شَرَعَ اللّهُ تَعَالَى لِعِبَادِهِ عَلَى لِسانِ الأَنْبِيَاءِ لِيَتَوَصَّلُوا بهِ إِلى جَوَارِ اللّه)، (مِلَّة) وەك دین وایە، بەلاّم ناوە بۆ ئەوە کە خوای بەرز وەك ڕێباز داینا‌وە ، لەسەر زمانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، بۆ ئەوەی پێی بگەنە دیداریی خواو پێی ببنە دراوسێی خوا ، واتە : پێی لە خوا نزیك بکەونەوە ، وە وشەی (مِلَّة) هەمیشە پاڵ دەدرێتە لای شەخص ، بەلاّم دین پاڵ دەدرێتە لای خوا ، بۆ وێنە دەگوترێ: (دِينُ اللّه)، بەلاّم دەگوترێ : (مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ) یان (مِلَّة مُحَمَّد) صەلاّتو سەلامی خوایان لەسەر بێ .

(ٱلْفَٰتِحِينَ ) : (الفَتْحُ: إِزَالَةُ الإغْلاَقِ وَالإشْكَالِ) ، (فَتْح) بریتییە لە شتێك کە داخرابێو بیکەیەوە ، یاخود ئیشکالێك، گرێیەك هەبێ، چارەسەری بکەی ، دەگوترێ : (فَتَحَ القَضِيَة فِتَاحَاً : فَصَلَ الأَمْرُ فِيها) واتە: قەزیەکەی هەڵبڕیو کێشەکەی یەکلایی کردووە .

(ٱلرَّجۡفَةُ ) : (الرَّجْفُ : الإِضْطرابُ الشَّدِيد) پێشـتـریش باسمان کـرد، وشـەی (رَجْفـة)ە بـە مانـای لـەرزینـەوەو هـەژان دێ .

(لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَا ) : (غَنِيَ فِي المكانِ كَذَا: إِذَا طالَ مُقَامه فِيهِ مُستغْنِياً عَنْ غَيْره، وَالمغْنى : يُقَالُ للمَصْدَر المكان)، (غَنِيَ فِي المكانِ كَذَا) واتـە لـەو شـوێنەدا زۆر مایەوە کـە بـەهـۆی ئەو شـوێنەوە بێنیاز بوو لـەوەی کە بچێ بۆ شـوێنی دیکە ، (غَـنِيَ ، يغـني ، مَغْنـى) هـەم بـۆ چـاوگ بـەكـاردێ واتـە : مانـەوە ، هـەم نـاوی شـوێنیشـە ، واتـە : شـوێنی تێـدا مانـەوە .

(ءَاسَىٰ) : (الأَسى: الحـزن) واتـە : خەمباریـی، دڵـتەنگـیی، دەگوتـرێ : (أَسَيْتُ عَلَيْهِ، وَأَسَيْتُ لَـهُ) ، واتــە : هـەردووكیـان بـەیەك مانــان ، واتــە : خـەمم بـۆی خـوارد ، بۆی خەفەتبـار بووم ، (وَحَقِيقَتهُ : إِتِّبَاع الفَائِتِ بالغَـمّ) حەقیقەتەكەشـی ئەوەیـە كە شـتێكت لەدەسـت چووە خـەمی بـە دواوە بخـۆی .

## مانای گشتی ئایەتەکان

ئنجا خوای پەروەردگار لەم سوورەتی ئەعرافەدا ، شەشەمین بەسەرهات دەربارەی پێغەمبەران دەخاتە ڕوو، کە بریتیە لە بەسەرهاتی شوعەیب پێغەمبەر ﷺ بۆ لای گەلەکەی، (مەدیەن) هەروەها شوعەیب جگە لە گەلی مەدیەن بۆ لای (أَصْحَابُ الأَيْكَةِ)ش ، واتە : خاوەنی درەختەکە[1]، بۆ لای ئەوانیش ڕەوانەکراوە ، وەك دوایی باسی دەکەین ، وە وا پێدەچێ شوعەیب تاکە پێغەمبەرێك بوو بێ ، بۆ لای دوو گەل و دوو کۆمەڵی جیاواز ڕەوانەکرابێ، هەم مەدیەن ، خاوەنانی درەختەکە هەم (أَصْحَابُ الأَيْكَةِ) .

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ﴾، دیارە ئەم (و) واوە، ئەمە (عطف) دەکاتەوە سەر ئەوەی پێشێ، کە خوا ﷻ لە سەرەتاوە دەربارەی نووح ﷺ فەرمووی : ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥٩﴾ ﴾الأعراف، یانی (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا)، واتە: وە بێگومان ئێمە بۆ لای گەلی مەدیەن شوعەیبی برایانمان ڕەوانەکرد، بۆیەش بەجەختکردنەوە وا دەفەرموێ، چونکە ڕەنگە یەکێ بڵێ : ئنجا پێویستی بە تەئکید کردنەوە هەیە ، کە خوا ﷻ ناردوویەتی ؟! دەڵێین : بەڵێ، واتە: بە تەئکیدو بێگومان ، ئێمە شوعەیبی برایانمان بۆ لای گەلی مەدیەن ڕەوانە کرد، نەك لەخۆوە چوو بێ‌و، لە گیرفانی خۆی قسەی بۆ دەرهێنابن، ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴾، دیارە شوعەیبیش وەك هەر کام لە نووح‌و هوودو صالح، وە سەرجەم پێغەمبەرانی دیکەش صەلاتو سەلامی خوایان لێبێ ، ئەویش هەر بەو شێوەیە

---

١) (الأيْكَةِ : الغَيْضَةِ الملْتَفَّةِ الأشْجَارِ) ، (أَيْكَة) واتە : درەختێکی زۆر چڕو پڕ .

گەلەكەی دەدوێنێ : ئەی گەلەكەم ! ئەی خەڵكەكەم ! خوا بپەرستن جگە لەو پەرستراوی دیكەتان نیە ، واتە : جگە لەو پەرستراوێكی شایستەی پەرسترانتان نیە ، ئەگەرنا دیارە پەرستراویان هەبوون ، بەڵام پەرستراوی ساختەو ناڕاست ، ﴿قَدۡ جَآءَتۡكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾، بێگومان ئەوە بەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكراتان بۆ هاتوە، كە مەبەستی پێ ئەو موعجیزەیەیە كە خوا ﷻ پێی داوە، ئنجا ئایا موعجیزەكەی شوعەیب كە بۆ گەلی مەدیەنی بردوە ، هەروەها ئەوەی كە بۆ (أَصْحَابُ الأَيْكَةِ)ی بردوە ، چیی بووە ؟! نەبینیومە خوا باسی كردبێ لە قورئاندا، وە نە بینیومە مێژوو زانانیش لە مێژووی بەسەرهاتی پێغەمبەراندا (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) باسیان كردبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە كە بێگومان بەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكرای پێ بووە، بە شێوەیەك كە گەلەكەی پێ دەستەوسان بكات ، وە ئەگەر ڕێزی عەقڵ و مەنتیق بگرن ، ناچاریان بكات ، كە دان بێنن بەوەدا كە شوعەیب پێغەمبەری خوایە ، وە ئەو پەیام بەرنامەی هێناویەتی ، لە خواوە بۆی هێناون .

ئنجا دوای ڕاگەیاندنی خوا ﷻ بەیەكگرتن (توحید) كە كاكڵ و بناغە پەیام و بانگەوازو بەرنامەی سەرجەم پێغەمبەران بووە، هەموو پێغەمبەران هاتوون مرۆڤەكان بكەنە بەندەی خوا، وە ئەوە بەردی بناغەی وەرچەرخان و چاكسازیی بووە لە نێو بەشەردا ، دوای ئەوە، ئنجا دەگوازێتەوە بۆ بابەتێكی دیكە ، كە دیارە گەلی مەدیەن كە شوعەیبیان بۆ ڕەوانە كراوە ، گەلێك بوون، لە ڕووی ئابوورییەوە ، لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوەو ، لە ڕووی ئەمنیی و ئاساییشەوە ، تووشی لادان و هەڵەو پەڵە بوون، بۆیە یەكسەر دەفەرموێ : ﴿فَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ﴾، پێوان و كێشان بە تەواویی بكەن، واتە: كە شت بۆ خەڵك دەپێون و دەكێشن، با پێوان و كێشانتان بۆ خەڵك تەواوبێ، ﴿وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ﴾، وە شتی خەڵك بە كەم مەگرن ، وە شتەكانیان لێ كەم مەكەنەوە ، مافەكانیان لێ زەوت مەكەن ، لێیان دامەشكێنن ، ﴿وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا﴾، وە ئەو زەوییە دوای ئەوەی

خوا ﷻ چاکی کردووەو ، دروستی کردووەو ، پڕی کردوە لە خێرو خۆشیی ، لە نازو نیعمەت ، خراپەکاریی تێدا مەکەن ، ﴿ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، ئا ئەوە بۆ ئێوە چاکترە، ئەگەر بڕواداربن، بڕوادار دەبێ هەمیشە چاکە کاربێ، دەبێ چاکسازیی کاربێ لە زەویدا، نەك خراپەکاربێ، وە نەك گێرە شێوێنو ئاشووب گێڕ بێ .

ئنجا دوای ئەوەی لە ڕووی ئابورییەوە ئامۆژگارییان دەکات ، ئنجا لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و تێکنەدانی ئاساییشەوە ، ئامۆژگارییان دەکاتو دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تَقْعُدُوا بِكُلِّ صِرَاطٍ تُوعِدُونَ ﴾، وە لەسەر هەموو ڕێیان دامەنیشن، هەڕەشە لە خەڵك بکەن، ﴿ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِهِ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا ﴾، وە مەیکەن بە عادەت کە دابنیشن لەسەر ڕێو خەڵك لە ڕێی خوا بگێڕنەوە (ئەوانەی کە ئیمانی پێ دێنن ) وە هەوڵبدەن ڕێبازی خوا ﷻ خوارو خێچو لار، بخەنە بەرچاوی خەڵك .

ئنجا لە ڕوویەکی دیکەشەوە ئامۆژگارییان دەکات، کە نیعمەتو چاکەکانی خوا ، بەسەر خۆیانەوە ببینن ، دەفەرموێ : ﴿ وَاذْكُرُوا إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ ﴾، وە یاد بکەنەوە : کاتێ ئێوە کەم بوون ، خوا زۆری کردن ، ﴿ وَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ ﴾، ئنجا چاویان پێ هەڵدەگوازێ بەرەو ڕابردوو، بەرەو مێژوو، دەفەرموێ : وە سەرنج بدەن ، سەرەنجامی خراپەکاران چۆن بووە ؟ ئێوەش پەند لەوان وەربگرن .

ئنجا دەربارەی ئەوە کە ئەو پەیامو بەرنامەیە هێناویەتی ، کە دیارە خەڵکێك ئیمانی پێ هێناوەو، زۆربەشیان ئیمانیان پێ نەهێناوە، لەوبارەشەوە ئامۆژگارییان دەکات، کە چۆن پێکەوە مەدار بکەن ، دەفەرموێ : ﴿ وَإِن كَانَ طَائِفَةٌ مِّنكُمْ

ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٞ لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ فَٱصۡبِرُواْ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَاۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴾، وە ئەگەر کۆمەڵێکتان بڕوای بەو بەرنامەو پەیامە هێنا ، کە من پێی ڕەوانەکراوم، وە کۆمەڵێکیش بڕوایان پێ نەهێنا، خۆڕاگربن (واتە : تەحەمولی یەکدی بکەن) جیاوازییەکانی یەکدی تەحەمول بکەن ، هەتا خوا دادوەرییمان لە نێوان دا دەکات .

بێگومان بە پێی یاسای خوا : سەرەنجام بۆ ئەهلی ئیمانو ئەهلی تەقوایە، وە سەرەنجام (لا يَصِحُّ إلاَّ الصَّحِيح) هەر ئەوەی ڕاستە دەچەسپێ، وە سەرەنجام ﴿ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴿١٧﴾ ﴾ الرعد، ئەوەی کە کەفو کوڵو پووشو پەڵاشە دەڕواو، ئەوەی سوودی بۆ خەڵك هەیە ، دەمێنێتەوە ، پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) پشت ئەستوور بوون ، بەوەی کە خوا ﷻ خەڵکی لەسەر سروشتێکی باش دروست کردوە، کە سەرەنجام ئەوەی ڕاستو دروستەو بەسوودە بۆ خەڵك ، کە پەیامو بەرنامەی خوای پەروەردگارە، چ لە ڕووی ئیمانو عەقیدەو فیکرییەوە، چ لە ڕووی ئەخلاقییەوە، چ لە ڕووی عیبادییەوە، چ لە ڕووی ئابوورییو سیاسییو کۆمەڵایەتییەوە، هەر ئەوە دەچەسپێ، بۆیە فەرموویەتی: با یەکدی تەحەمول بکەین .

دیارە کۆمەڵگا سەرکەوتووەکان، ئەو کۆمەڵگایانەن کە جیاوازییەکانی یەکدی تەحەممول دەکەن، وە شەڕی دەوەن بە ئاش لەگەڵ یەکدی دا ناکەن، وە چاو دەگێڕن بۆ خاڵە هاوبەشەکان، وە هەر کامێکیان تایبەتمەندیی لایەنی بەرانبەری قبووڵ دەکاتو ، لێی دەگەڕێ تایبەتمەندییەکانی خۆی بۆخۆی بن ، ﴿ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴾، بێگومان خوا باشترین دادوەرە، کە دادوەریی دەکات لە نێوان بەندەکانیدا ﴿ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ﴾، تەماشا بکەن ! شوعەیب چەند بە

نەزاکەتو ئەدەبو ڕێزو حورمەتێکی بەرزەوە خەڵکەکە دەدوێنێ، گەلو کۆمەڵگایەکەی خۆی دەدوێنێ، زۆر ئامۆژگاریی چاکیان دەکات، هەر بۆیەش پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ شوعەیبی بە (خَطِيبِ الأَنْبِيَاءِ)[١] واتە : وتاربێژی پێغەمبەران ناوبردوە ، هەرچەندە هەموو پێغەمبەران صەلاتو سەلامی خوایان لێبێ زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی، وە زۆر بەڕەوان بێژیی، وە زۆر بە دانایىو وەستایی قسەیان کردوە، بەلاّم خوای پەروەردگار هی هەندێکیانی وا خستۆتە بەرچاو ، کە لە هەندێکیان زیاتر لە بواری خستنە ڕووی بەڵگەدا ، بەهێزتر بوون، وە هەمووشیان لە هەموو ڕوویێکەوە لە لووتکە دا بوون، بەلاّم لووتکەکانیش بەرزو بەرزتریان هەیە ، وە شوعەیب لە هەموو شوێنەکانی کە لە قورئاندا هاتوون ، زۆر قسەی وەستایانەو، دانایانەو بەجێی لەگەڵ گەلەکەیدا دەکات .

بەلاّم ئایا گەلەکەی لە وەلاّمی ئەو قسەو باسانەی شوعەیبدا دەڵێن چی ؟! ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ ﴾، دەستڕۆیشتووە خۆ بەزلگرەکانی گەلەکەی ، واتە: ئەوانە کە دەستڕۆیشتوو بوون، خاوەن دەسەلاّت بوون ، گوتیان : ﴿ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ﴾ بێگومانو سوێند دەخۆین ، ئەی شوعەیب ! خۆتو ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لەگەڵ تۆدا ، لە شارو ئاوەدانیی خۆمان دەرتان دەکەین، ﴿ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ﴾، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ڕێبازەکەی ئێمە، واتە: یان شاربەدەر، یان هەڵگەڕانەوە لەو ئیمانو عەقیدە تازەیەی کە هێناوتانە، بەلاّم سبحان الله ! شوعەیب وەك هەموو پێغەمبەرانی پایە بەرزو ڕەوشت بەرزی خوای پەروەردگار، وەك دەریایەو شلوێ نابێ : لە وەلاّمی ئەو هەڕەشەیەدا کە دیارە سەختترین هەڕەشەیە ؛ یان شاربەدەر ، یان هەڵگەڕانەوە ،

---

١) عن محمد بن إسحاق قال : وشعيب بن ميكائيل النبي ﷺ ، بعثه الله نبياً فكان من خبره وخبر قومه ما ذكر الله في القرآن ، وكان رسول الله ﷺ إذا ذكره، قال : ذاك خطيب الأنبياء لمراجعته قومه . المستدرك على الصحيحين : ج ٢ / ص٦٢٠ ح ٤٠٧١ ، تعليق الذهبي في التلخيص : سكت عنه الذهبي في التلخيص.

دەڵێ چی ؟! ﴿ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴾، فەرمووی : ئەدی ئەگەر پێمان ناخۆش بێ ، واتە : عەقڵو مەنتیق وا دەخوازێ ، هیچ کەسێك شتێك لەسەری فەرز نەکرێ ، کە پێی ناخۆش بێ، ئێمەش پێمان ناخۆشە وڵاتی خۆمان واز لێبێنین، وە پێشمان ناخۆشە ئیجبار بکرێینو ، وا خۆمان پێشان بدەین کە بڕوامان بە شتێك هەیە ، کە لە دڵەوە بڕوامان پێی نیە، واتە نیفاقو دووفلیقانەیی بکەین، ئینسانی خاوەن فیطرەتی ساغ ، نە حەز دەکات وڵاتی خۆی جێ بێڵێ ، چونکە نیشتیمانی خۆی خۆشدەوێو ، کۆمەڵگای خۆی خۆشدەوێ ، بۆ کۆمەڵگایەکەی دڵسۆزە ، وە نە حەزیش دەکات شتێك بڵێ ، کە قەناعەتی پێی نەبێ ، مەگەر ئینسان میزاجی تێکچووبێ ، ئەگەرنا نیفاقو دوورووییی لەخۆی ناوەشێنێتەوە، بۆیە شوعەیب لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێو دەڵێ : ﴿ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا ﴾، ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە نێو ڕێبازەکەی ئێوەو بەرنامەکەی ئێوە ، دوای ئەوەی خوا ئێمەی لێ دەربازکردوە ، ئەوە درۆمان بە ناوی خواوە هەڵبەستوە ، یانی : چی ؟ یانی ئێمە ئەو کاتە بە زمانی حاڵ بە خەڵك دەڵێین : بۆمان دەرکەوت کە ڕێبازی خوا ﷻ هەڵەیە، بۆیە دەستبەرداری بووین ! کە ئەوەش درۆو هەڵبەستنە بە ناوی خواوە، چونکە ئێمە قەناعەتمان وایە ئایینی خوا ڕاستە، بۆیە ئێستا کە لێی هەڵگەڕێینەوە ، درۆیەك هەڵدەبەستین بەناوی خواوە بە زمانی حاڵ ، ﴿ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ﴾، وە بۆمان نیەو ناگونجێ ئێمە بگەڕێینەوە سەر ئەو ڕێبازەی ئێوە ، مەگەر خوای پەروەردگارمان بیەوێ .

لێرەدا شوعەیب ئەدەب لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بەکاردێنێ، ئەگەرنا وەنەبێ لە گوماندا بێ : داخۆ دەگەڕێنەوە، یان ناگەڕێنەوە ؟ خۆیان عەزمیان جەزمە ، نەگەڕێنەوە، بەڵام وەك ئەدەب لەگەڵ ویستی ڕەهای خوادا ﷻ دەڵێ : لە حاڵێکدا کە خوای پەروەردگارمان ویستبی، ئەوە شتێکی دیکەیە، لەگەڵ ویستی خوای پەروەردگاردا هیچ ناکرێ ، کە خوای بەرزیش بێگومان هیچ شتێکی ناوێ ، وەك

زۆرکــردن لــە بـەندەکــانی ، وەك دەفــەرموێ : ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًا ﴿٩٩﴾ ﴾یونس، واتە: وە ئەگەر پەروەردگار ویستبای ، هەرکەس لەسەر زەویدایە ، تێکڕایان ئیمانیان دەهێنا، بەڵام نەیویستوە زۆریان لێ بکات.

کەواتە : ئامانجو پوختەی قسەکەی (شعیب) ئاوایە : (خوای کارزان زۆر لە ئێمە ناکات بمانکات بە کافر ، مەگەر بۆخۆمان بمانەوێ ، خۆشمان عەزممان جەزمە کە نامانەوێ) بەڵام وەك گوتم : ئەوە زێدە ئەدەبە لەگەڵ ویستی خوای پەروەردگاردا ، ﴿ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًا ﴾، پەروەردگارمان زانیارییەکەی هەموو شتێکی گرتۆتەوە ، هەموو شتێك دەزانێ ، ﴿ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا ﴾، پشتمان بە خوا بەستوە، ﴿ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ ﴾، پەوەردگارمان ! بە هەق دادوەریی بکە لەنێوان ئێمەو گەلەکەماندا ، بە شێوەیەکی ڕاستو دادگەرانە ، وە تۆ باشترین دادوەری .

ئنجا دووبارە دەست ڕۆیشتووە خۆ بەزلگرەکانی گەلەکەی ، لەسەر هەڵوێستی خۆیان بەردەوام دەبن : ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعۡتُمۡ شُعَيۡبًا إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ﴾، وە ئەو دەسترۆیشتووە بێبڕوایانەی گەلەکەی گوتیان، {واتە: بە بڕوادارەکانیان گوت :} ئەگەر ئێوە بە دوای شوعەیب بکەون، بێگومان ئێوە زیانبارن، ئەوەش دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ : زیانبارن کە بڕواتان بە شتێك هێناوە ڕاست نیە، یان دەگونجێ هەڕەشەیەکی پەنهان بێ، واتە: زەرەر دەکەن، ئەگەر بێتو لەسەر ئەوە بەردەوام بن، کە دیارە ئەوە عادەتی هەموو تاغووتو دیکتاتۆرەکانە، کە هەڕەشە لە خەڵك دەکەن، وە دەیانەوێ خەڵك لە بیرکردنەوەشدا ئازاد نەبێ، بە ئیجازەی ئەوان بیربکاتەوە، وە بە ئیجازەی ئەوان بڕوا بە شتێك بێنێ ، یان بڕوا بە شتێك نەهێنێ، وەك فیرعەون بە جادووگەرەکانی گوت: دوای ئەوەی موعجیزەی مووسایان بینیو کڕنووشیان برد، بۆ خوای پەروەردگارو گوتیان :

﴿ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ الأعـــراف، واتـــە : بـــڕوامان بـــە پـــەروەردگاری جیهانییان هێنا ، پەروەردگاری مووساو هـاڕوون ، فیـرعەون چی پـێ گوتـن ؟ ﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡ ... ﴿١٢٣﴾ ﴾ الأعـراف، فیـرعـەون گوتـی : ئـەوە چـۆن بڕواتـان پێهێنـا ، پێش ئـەوەی مۆڵەتـتـان بـدەم ؟! یانی خەڵك دەبێ تەنانەت بۆ ئیمان هێنانیان، یان ئیمان نەهێنانیشیان ! مۆڵەت لەو تاغووتانە وەربگـرن !

ئنجا خوا ﷻ باسی سەرەنجامەکەیان دەکاتو ، دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴾، لەرزینەوەیەك گرتنی، بەڵام چ لەرزینەوەیەك ! بوومەلەرزەیەکی گەورە گرتنی ، وە لە ماڵەکەیاندا لەپەوڕوو کەوتن ، وەك چۆن باڵندە هەڵدەنیشێ بە زەوییەوە دەنووسێ ، ئاوا تەخت بوون، ﴿ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبًا كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَا ﴾، ئەوانەی بڕوایان بە شوعەیب نەهێنا پێی بێبڕوابوون ، وەك هیچ کاتێك لەو شوێنەدا نەمابنەوە، واتە : تەخت بوونو دوایی لەگەڵ خۆڵدا یەکسان بوون ، وەك هەرگیز کەسی لێ نەبووبێ ، ﴿ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبًا كَانُواْ هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾، ئەوانەی بڕوایان بە شوعەیب نەهێنا ، هەر ئەوانە زیانبار بوون .

ئنجا شوعەیب چی کرد ؟ ﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ ﴾، پشتی تێکردن، ﴿ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي ﴾، گوتی: ئەی گەلەکەم، ئەی خەڵکەکەم ! پەیامەکانی پەروەردگاری خۆمم پێ ڕاگەیاندن، ﴿ وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ ﴾، وە دڵسۆزییم بۆ نواندن، ﴿ فَكَيۡفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ ﴾، ئێستا چۆن دەبێ خەفەت بخۆم لە کۆمەڵێکی بێبڕوا، واتە: شایستەی ئەوە نین، خەفەتتان لێ بخۆم ، ئەگەر بێیە سەر باری عەقڵو مەنتیق .

جاری وایە مرۆڤ سۆزی بەسەر عەقڵو مەنتقیدا زاڵ دەبێ، وە خەفەت لە شتێك دەخوا کە نابێ خەفەتی لێ بخورێ، ئنجا وەك پێشتریش گوتوومانە: ئەوە قسەیە یان لەبەرخۆیەوە گوتوویەتی، یان ئەوەتا ڕووی لە جەنازەکانیان کردوە کە لەگەڵ خاکدا یەکسان بوونو ، ئاوا بەو شێوە دواندوونی ، کە بێگومان ڕووحەکانیان قسەکانی شوعەیبیان زانیوەو بیستوە، بەڵام توانای وەڵامدانەوەیان نەبووە .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم** : کە دەفەرموێ : ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾، لەبارەی ڕەچەڵەکی گەلی مەدیەنو ڕەچەڵەکی شوعەیبەوە، مێژوونووسان قسەی زۆریان کردوە، وە زۆربەیان ڕایان وایە کە گەلی مەدیەن دەچنەوە سەر (مدين بن إبراهيم الخليل) لە هاوسەری سێیەمی (قَطورَا)، واتە : إبراهیم ﷺ جگە لە ساراو هاجەر سەلامی خوایان لێبێو خوا لێیان ڕازی بێ ، کە دایکی ئیسحاقو ئیسماعیلن ، هاوسەرێکی دیکەشی بە ناوی (قَطُورَا) هەبووە ، وەك لە کتێبی خاوەن کتێبەکاندا ، لە پەیمانی کۆندا هاتوە ، بە ناوی (قَطُورَا) و (قنطُورَاء)، وە ئەم (قطورا)یە کوڕێکی بووە بە ناوی (مەدیەن) ئەویش کوڕی ئیبراهیمە، ئنجا دەڵێ : وشەی مەدیەن هەم ناوی هۆزە، هەم ناوی شوێنیشە، دیارە شوعەیب لە تەوراتدا بە (يَثْرُون، رَعْوَئِيل)یش ناوی هاتوە ، ئنجا دەڵێ : شوعەیب کوڕی نوەیبی کوڕی ڕەعوەئیل کوڕی عیفا کوڕی مەدیەنە، واتە: شوعەیب دەچێتەوە سەر مەدیەن ، کە کوڕی ئیبراهیمە، ئنجا وەك گوتمان : مەدیەن هەم ناوی تیرەو هۆزە ، جگە لەوەی باپیرەی ئەو تیرەو هۆزە بووە ، هەم ناوی شوێنیشە، وە ئەوانە لە بنەڕەتدا عەرەب نەبوون ، بەڵام دوایی بەهۆی تێکەڵیی عەرەبەوە بوون بە عەرەب ، وەك ئیسماعیلو نەوەکانی ، واتە : ئەوانە لە جۆری سێیەمی عەرەبن :

١/ (العرب البائدة) ئەوانەن کە لەبەین چوون.

٢/ (العرب العاربة) عەرەبە قەحطانییەکان.

٣/ (العرب المستعربة) کە عەرەبی عەدنانیین، یانی: لە ڕێی عەدنانەوە دەچنەوە سەر ئیسماعیل، ئیسماعیلیش کوڕی ئیبراهیمە، کە دیارە عەرەب

نەبوون، کەواتە : شوعەیب ﷺ هەر لە خۆیان بووە بۆیە ، خوا فەرموویەتی : ﴿أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾.

بەلاّم لەوبارەوە کە (مدین)و (أَصْحَابُ الأَيْكَة) هەر یەکن ، یاخود دوو گەلو کۆمەڵگای جیاواز بوون، واتە مەدیەم گەلێك بووە، وە (أَصْحَابُ الأَيْكَةِ)ش گەلێکی دیکە بوون ؟! لەوبارەوە ڕاجیایی هەیە .

دیارە وشەی (أَيْكَة)ش بە (الغَيْضَةِ) لێکدراوە، (الأَيْكَةِ : الغَيْضَةِ الـمُلْتَفَّةِ الأَشْجَارِ) واتە: درەختێك كە لقو پۆپو گەڵای چڕوپڕی هەبێ، یاخود باغو دارستانێك كە گەڵاو لقو پۆپەکانی چڕوپڕ بن، وا پێدەچێ ئەو گەلەش درەختێکی وایان بووبێ ، یاخود باغو دارستانێکی بەو شێوەیان هەبووە .

**چەند بەڵگەیەك لەسەر ئەوە كە ( شعيب ) عليه السلام بۆ لای هەردوو گەلی ( مدين )و ( أصحاب الأيكة ) نێرراوە :**

دەگونجێ ئێمە چەند بەڵگەیەك لەوبارەوە بێنینەوە ، كە شوعەیب ﷺ بۆ لای دوو گەل ڕەوانەکراوە :

١) بۆ لای گەلی مەدیەن ، كە دیارە خۆشی لەوان بووە ، بۆیەش خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾.

٢) وە بۆ لای (أَصْحَابُ الأَيْكَةِ)ش ، كە لە ڕەچەڵەکدا شوعەیب ناچێتەوە سەر ئەوان :

بەڵگەی یەکەم: ئەوەیە كە خوای بەرزو مەزن ناوی یەکێکیانی بە (مدين)و ئەوەی دیکەیانی بە (أَصْحَابُ الأَيْكَة) ناوبردوە، کەواتە: دەبێ دوو گەلو کۆمەڵگا بووبن، نەك یەك ، وە خوا ﷻ وەختێك ناوی گەلێکی بە شتێك هێنابێ، بۆ وێنە ناوی گەلی پێغەمبەر (هود)ی هەر بە (عاد) هێناوە، وە ناوی گەلی (صالح)ی هەر بە (ثمود)ی هێناوە، بەلاّم لێرەدا خوای کارزان کاتێ

باسی شوعەیب دەکات، باسی (مدین) دەکات، وە باسی (أَصْحَابُ الأَيْكَة)ش دەکات، کەواتە: دەبێ دوو گەل بن .

بەڵگەی دووەم: ئەوەیە کە خوای زاڵو توانا ، باسی سزادانی ئەو دوو گەلەی بە جیا کردوە ، بە نسبەت مەدیەنەوە، فەرموویەتی: ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ ﴿٩١﴾ ﴾ الأعراف ، واتە لەرزینەوە گرتنی، بوومەلەرزە گرتنی، بەڵام بە نسبەت (أَصْحَابُ الأَيْكَة)وە، لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ : ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ ﴾، واتە: {گەلی (أَصْحَابُ الأَيْكَة)} بە درۆ دانا ، ئنجا سزای ڕۆژی هەورەکە گرتنی (ڕۆژی سێبەر) کە دیارە خوای باڵادەست سزایەکی بۆ ناردوون و کەوتوونەتە تاریکایی و سێبەرو دووکەڵێکەوە.

بەڵگەی سێیەم: لە باسی ناردنی شوعەیب بۆ گەلی مەدیەن دا، بە برایان (أَخَاهُمْ ) ناوی بردوە : ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ﴾، بەڵام لە بارەی ناردنیەوە بۆ لای گەلی (أَصْحَابُ الأَيْكَة) لە کاتێکدا هەر کام لە : نووحو هوودو صالحو لووط بە برای گەلەکانیان ناو براون، بۆ شوعەیبو (أَصْحَابُ الأَيْكَة) وشەی برا بەکارنەهاتوە :

١ - ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾الشعراء.

٢ - ﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾ الشعراء.

٣ - ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ ﴾الشعراء.

٤ - ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ ﴾ الشعراء.

بەڵام بەنسبەت شوعەیبەوە دەفەرموێ : ﴿ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٧٦ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ شُعَيۡبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ١٧٧ ﴾ الشعراء، واتە: بە برایان ناوی نەهێناوە ، چونکە لەڕووی ڕەچەڵەكو نەسەبی نزیکەوە، وەك گەلو نەتەوە ، لەو گەلو نەتەوەیە نەبووە .

بەڵگەی چوارەم: ئەم دەقەیە : {أَخْرَجَ إِسْحَاق وَابْنُ عَساكِر عَنْ عِكْرِمَة والسُّدِّيّ قَالا: مَا بَعَثَ اللهُ نَبِيًّا مَرَّتَيْنِ إِلاَّ شُعَيْبًا، مَرَّةً إِلى مَدْيَنَ فَأَخَذَهُمُ اللهُ بِالصَّيْحَة، وَمَرَّةً أُخْرَى إِلى أَصْحَابِ الأَيْكَةِ ، فَأَخَذَهُمُ اللهُ بِعَذَابِ يَوْمِ الظُّلَّةِ}(١) ئیبنو ئیسحاقو ئیبنو عەساکیر هێناویانە لە عیکریمەو سوددییەوە کە گوتوویانە: خوا هیچ پێغەمبەرێکی دوو جاران ڕەوان نەکردوە ، جگە لە شوعەیب : جارێك بۆ گەلی مەدیەن ، کە بە چریکە ، (بوومەلەرزە) لە بەینی بردن، وە جارێکی دیکە ناردی بۆ لای هاوەڵانی درەختەکە، کە خوای بەرزو مەزن بە ئازاری ڕۆژی سێبەر لە بەینی بردن .

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥ ﴾، تا کۆتایی قسەکانی شوعەیب ﵇ کە لە سێ چوار ئایەتدا فەرمووونی، شوعەیب بەرنامەیەکی (نۆ) بڕگەیی بە گەلەکەی ڕادەگەیەنێ :

## بەرنامە نۆ بڕگەییەکەی ( شعیب ) علیه السلام بۆ گەلەکەی

١/ یەکەم شتێك کە پێیان ڕادەگەیەنێ، دەفەرموێ: ﴿ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥ ﴾، خوا بپەرستن ، جگە لەو هیچ پەرستراوی دیکەتان نیە، کە بێگومان خوا بە یەکگرتنو تەنیا خوا پەرستن ، بناغەی بەرنامەی خواو

١) فتح القدير للشوكاني ، ج ٢ ، ص ٢٧٦.

ئایینی خوای پەروەردگارە، ئنجا وەك هەموو پێغەمبەران (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ئەویش لە ئیمانو خوا بەیەکگرتنەوە دەست پێدەکات .

٢/ لە بڕگەی دووەمدا دەڵێ : ﴿قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾، بێگومان لە پەروەردگارتانەوە بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکراتان بۆ هاتوە .

لە دوای ئیمانو خوا بەیەکگرتن دێتە سەر باسی پێغەمبەرایەتیی، کە دیارە پێغەمبەرانیش دەبێ بەڵگەیان لەسەر بێ، ئەگەرنا ڕاستو درۆ لێك جیا ناکرێنەوە ، بەبێ بەڵگە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١١١﴾﴾ البقرة، بڵێ: بەڵگەتان بێنن ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، پێشتریش فەرموودەیەکمان هێنا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران نەبووە، مەگەر ئەوەندە ئایەتو بەڵگەی پێدراون ، کە لەسەریان مرۆڤەکان ئیمان بێننو ، ئەوەی لە هەقی بگەڕێ ، قەناعەتی بێ، کە ئەو خاوەن بەڵگەو موعجیزەیە ، پێغەمبەری خوایەو کەسێکی ئاسایی نیەو، ئەوەی دەیڵێ قسەی گیرفانی خۆی نیەو ، وەحی خوایە بۆی دێ .

٣/ لە بڕگەی سێیەم دا دەڵێ : ﴿فَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ ﴾، ئنجا دێتە سەر باسی چاکسازیی ئابووریی، دەفەرموێ : پێوانو کێشان بە تەواویی بکەن، کە بێگومان ئەگەر خەڵك مافە ئابوورییەکانی یەکدی پێشێل نەکەن، وە سنووری یەکدی نەشکێنن، خێرو خۆشییو بەرەکەت دەکەوێتە وڵاتەوە، وە ئەگەر قڕیو پڕیی نەبێ، هەندێکیان لەسەریان نەڕژێو ، زۆربەیان لەبەریان نەبڕێ ، هەمیشە هاوسەنگیی کۆمەڵایەتیی دەپارێزرێ .

٤/ لە بڕگەی چوارەم دا دەڵێ : ﴿وَلَا تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ ﴾، دوای چاکسازیی ئابووریی دێتە سەر چاکسازیی کۆمەڵایەتییو دەڵێ : شتی خەڵك کەم مەکەن، بە کەم بایەخ تەماشای مەکەن ، ئەمە هەم شتی ماددییو

هەم شتی مەعنەویی دەگرێتەوە، واتە: خۆتان پێ زۆر نەبێو خەڵکتان پێ کەم نەبێ، شتی خۆتان پێ چاکتر نەبێ لە شتی خەڵك، بەبێ بەڵگە، وە زۆر واتای دیکەش دەگرێتەوە .

٥/ لە بڕگەی پێنجەم دا باسی چاکسازیی گشتی دەکاتو دەڵێ : ﴿وَلَا تُفْسِدُوا فِي ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾
واتە : دوای ئەوەی زەوی چاك دروست كراوەو پڕكراوە لە خێرو بێرو نازو نیعمەت ، تێكی مەدەن ، خراپەكاریی تێدا مەكەن، ئەوە بۆ ئێوە چاكترە ، ئەگەر ئێوە بڕواداربن .

ئەمەش چاكسازییەكی گشتگیرەو، هەموو لایەنەكان دەگرێتەوە، لایەنی فیكرییو ، لایەنی ڕەوشتییو ، لایەنی خێزانییو ، لایەنی ئابووریییو ، لایەنی هێمنییو ئاسایشو ... هتد .

٦/ لە بڕگەی شەشەم دا باسی چاكسازیی ئەمنیی دەكاتو دەڵێ : ﴿وَلَا تَقْعُدُوا بِكُلِّ صِرَاطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾، وە لەسەر هەر ڕێبازێك دامەنیشن، هەڕەشە لە خەڵك بكەنو ڕێگریی بكەنو خەڵك بترسێنن، {یانی: جەردەیی مەكەن، هێمنییو ئاسایشی خەڵك تێك مەدەن}، وە خەڵك لە ڕێی خوا مەگەڕێننەوە كە دەیانەوێ بەرەو خوا بێنو ، ملكەچی بەرنامەو ئایینی خوا بن ، {چونكە خوا ئەم سەر زەوییەی داناوە ، كە بە ئازادیی تێیدا بژین، نابێ كەس ڕێی دینداریی ئازاد ، ڕێی بیركردنەوەی ئازاد ، لە كەس بگرێ ، چونكە ئەم سەرزەوییە ، شوێنی تاقیكرانەوەیە ، نەك شوێنی تەصفیە حیسابو لێك دەركردن}، ﴿وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا﴾، وە لارییو خواریی بۆ دینی خوا ، مەخوازن، بە ناهەق دینی خوا لارو نارێك مەخەنە بەرچاوی خەڵكو، مەیشێوێنن {چۆنە با خەڵك ئاوا ببینن}.

٧/ لە بڕگەی حەوتەم دا چاکەو نیعمەتەکانی خوایان وەبیر دێنێتەوەو، دەڵێ : ﴿ وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ كُنتُمۡ قَلِيلٗا فَكَثَّرَكُمۡ ﴾، واتە : وە بیربکەنەوە کاتێك ئێوە کەم بوون، بەڵام خوا ﷻ زۆری کردن، دیارە گەلی مەدیەن پێشێ کەم بوون ، بەڵام دوایی وەچەیان زۆر بووەو ، ژمارەیان زۆر بووە، زۆربوونی گەل‌و کۆمەڵگایەکان ، یەکێکە لە نیعمەتەکانی خوا، وەك چۆن کەم بوونەوەو لەبەین چوونیان ، بەڵایەکە بەسەریان دێ ، کەواتە: ئەم بڕگەی حەوتەمە : بریتیە لە یادکردنەوەی چاکەکانی خوا ، بەسەر خۆوەو بینینی نیعمەت‌و چاکەکانی خوا .

٨/ لە بڕگەی هەشتەم دا باسی پەند وەرگرتن لە مێژوو دەکات‌و دەڵێ : ﴿ وَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾، واتە : وە سەرەنج بدەن ، سەرەنجامی خراپەکاران چۆن بووە ؟ ئەمەش بریتیە لە پەند وەرگرتن لە مێژوو، وە چاو بە مێژوودا گێڕانەوەو پەند لێوەرگرتنی، کەواتە: ئێوەش خراپەکاریی مەکەن ، بۆ ئەوەی ئێوەش بە دەردی ئەوانەی پێشوو نەچن .

٩/ لە بڕگەی نۆیەمدا باسی تەبایی‌و پێکەوە ژیان‌و یەکدی تەحەمولکردنیان بۆ دەکات‌و دەڵێ : ﴿ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٞ مِّنكُمۡ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٞ لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ فَٱصۡبِرُواْ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَاۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴾ وە ئەگەر کۆمەڵێك لە ئێوە بڕوایان هێنا بەوەی من پێی ڕەوانەکراوم، وە کۆمەڵێکیش بڕوایان پێ نەهێنا ، خۆڕاگربن ، واتە : هەردووك لاتان تەحەمولی یەکدی بکەن‌و ، خۆڕاگربن ، پشوو درێژ بن ، پێکەوە تەنگە پڕێسکە مەبن ، دڵتان بچووك نەبێ ، چیکڵدانەتان لەگەڵ یەك گچکە نەبێ، پێکەوە بێ حەوسەلە مەبن، گوێ لە یەکدی بگرن، پێکەوە دیالۆگ بکەن ، تاکو سەرەنجام بگەنە ئەوەی کە هەقەو ڕاستەو چاکە، ﴿ فَٱصۡبِرُواْ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَا ﴾، تاکو خوا حوکممان لە بەیندا دەکات، خوا لە ڕێی یاساکانی خۆیەوە ، دادوەریی لە نێوان بەندەکانی خۆی دا دەکات، کە یاسای

خوا ئەوەیە : ئەوەی هەقەو ڕاستەو چاکەو بەسوودە ، دەمێنێتەوە، وە ئەوەی کە بێسوودە ، لەبەین دەچێ، وە هەمیشە پێغەمبەران پشت ئەستوور بوون ، بەوە کە ئەوەی پێیانە ، هەقەو ڕاستەو چاکەو ، دەمێنێتەوە، ئنجا کە شوعەیب ﷺ ئاوا بەو شێوەیە هێندە بە دانایی‌و بە وەستایی‌و دادگەرانە قسە دەکات، بزانین ئەوان وەڵامیان چیە ؟!

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ﴾، دیارە هەمیشە لۆژیکی هێز (منطق القوة) جێگرەوەی نەبوونی هێزی لۆژیك (قوة المنطق)ە، یانی (منطق القوة) پەنای پێ دەبرێ لە کاتی نەبوونی هێزی ڕاستیی دا، کەسێك کە بەڵگەی نەبێ ، پەنا دەباتە بەر کوتەك‌و هەڕەشەو گوڕەشەو ئاگرو ئاسن، بۆیە دەفەرموێ : دەستڕۆیشتووەکان کە خۆیان بە زل دەگرت لە گەلەکەی گوتیان : ئەی شوعەیب ! خۆت‌و ئەوانەی لەگەڵ تۆ ئیمانیان هێناوە ، لە شاری خۆمان دەرتان دەکەین ، وەك بڵێی : ئەوان بەشیان بەو وڵاتەوە نەبێ ، بۆیە شاربەدەریان دەکەن ! ﴿ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ﴾، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ڕێبازەکەی ئێمە ! دیارە ڕێبازەکەی شوعەیب ﷺ کە خەڵکێکی بۆ بانگ کردوە ، ئەوە بووە : واز لەو بت پەرستییە بێنن ، واز لەو گێرە شێوێنیی‌و ڕێگرییە بێنن ، ئەو تەرازوو بازیی‌و قۆڵ بڕییە ، لە بواری ئابووریی دا ، ئەو خراپەکارییە لە بواری کۆمەڵایەتییدا، ئەو بت پەرستیی‌و سەرلێشێوانە لە بواری فیکریی دا ، وازی لێ بێنن ، وەرنە سەر ڕاستە شەقام ، کە تەوحیدو دادگەرییەو ، چاکسازیی ئابوورییەو ، چاکسازیی کۆمەڵایەتییەو ، ڕێز لە یەکدی گرتنەو ، یەکدی تەحەموول کردنە، وەرنە سەر ئەو ڕێبازە ڕاستە، کەچی ئەوان دەڵێن : یان دەبێ شاربەدەرتان بکەین، یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ڕێبازەکەی ئێمە !

ئنجا ئەمە هەمیشە مەنتقیی مێژوویی ئەهلی کوفر بووە ، لە بەرانبەر ئەهلی ئیسلامدا، کەچی بەڕاستی زۆر جێی داخە، کە ئێستا دەویسترێ : ئیسلام بە جۆرێکی دیکە وێنا بکرێ ، وە هەندێك گرووپ‌و دەستەی کرچ‌و کاڵ‌و

لادەریش لە ڕاستە شەقامی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، وە پێغەمبەران بە گشتی هەن، کە کەرستەی پڕوپاگەندەی باش دەخەنە دەستی ناحەزانی ئیسلامەوە، بۆ ئەوەی کە ئیسلام بە پێچەوانەی ئەوەوە کە پێغەمبەران وێنایان کردوە ، کە هەمیشە پشتی بە هێزی لۆژیك بەستوە، نەك لۆژیکی هێز ، وە هەمیشە پشتی بەستوە بە عەقڵ بە فیطرەتو، بە عیلم ، وە بەوە کە بەرژەوەندیی خەڵك دێنێتە دی، نەك پشت ببەستێ بەوەی کە خۆ فەرز بکات بەسەر خەڵکداو خەڵك ناچار بکات ! هەمیشە ئایینی خوا ، خەڵك لە پەنایدا هەستی بە ئاسوودەیی‌و ئارامیی کردوە، نەك هەست بە بیم‌و ترس‌و لەرز بکات ! وە هەمیشە ئایینی خوا بەرگریی کردوە لە ستەم لێکراوان‌و چەوساوان‌و ، دژی ستەمکاران‌و خۆ بەزلگران بووە، نەك بە پێچەوانەوە، وە هەمیشە پەیامەکانی خوا، بەرنامەکانی خوا، کە پێغەمبەران هێناویانن ، لای ئازادییان گرتوە ، وە دژی چەوساندنەوەو خۆ بەزلگرتن‌و زەبرو زۆر بوون ، نەك بە پێچەوانەوە ، وەك ئێستا دەویسترێ وا وێنا بکرێ ، وەك گوتم هەندێ گرووپ‌و دەستەش کە ناوی جۆراو جۆر لەخۆیان دەنێن ، بە ناوی ئیسلامەوەو ، بەیداغ‌و ئاڵای ئیسلامیش بەکاردێنن ، بەڵام ڕەوشت‌و ڕەفتارەکانیان ، پێچەوانەی ئەو ڕێبازەی پێغەمبەرانە، پێچەوانەی ئەوەیە کە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لەسەری بوون .

وە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەمیشە پەنایان بردۆتە بەر بەڵگەی ئیسپاتکەر بۆ تێگەیاندنی خەڵك، وە هەمیشە پشتیان بە فیطرەت‌و عەقڵ‌و مەنطق بەستوە ، وە هەمیشە چاویان لەوە بووە ، کە خەڵك بە هێمنیی‌و ئاساییش پێکەوە بژین‌و، یەکدی تەحەممول بکەن، وە ئەوە دوژمنانی پێغەمبەران بوون ، کە پەنایان بردۆتە بەر ئاگرو ئاسن‌و هەڕەشەو گوڕەشەو زوڵم‌و ستەم‌و چەوساندنەوە، کەچی ئێستا وەك گوتم هەم دوژمنانی ئیسلام دەیانەوێ ئیسلام بەو شێوەیە وێنا بکەن ، واتە : پێچەوانەی ئەوە کە هەیە، وە هەم زۆر گرووپ‌و تاخمی ئیسلامیی واش هەن ، کە لادەرن‌و ناحاڵیی‌و کرچ‌و کاڵن‌و، بە ڕەوشت‌و ڕەفتارو ئاکارە لادەرەکانیان ، کەرەستەیەکی خاوی باش بۆ پڕوپاگەندەی خراپ دەخەنە دەستی ناحەزانی ئیسلامەوە ! کە ئەوە گەورەترین بەڵایە لەم سەردەمەدا، تووشی ئۆممەت بووە، کە : لە نێو شوێنکەتووەکانی

خۆیداو ، لەلایەن شوێنکەتووەکانی خۆیەوە دژایەتیی دەکرێو ، ناشیرین دەکرێو ، نارێكو خوارو خێچ دەخرێتە بەرچاوی خەڵك ! لە حاڵێکدا کە ئەوە پیشەی دوژمنانی ئیسلامو ، دوژمنانی پەیامەکانی خوایەو، ئەوان ویستوویانە ئایینی خوا بە خوارو خێچی بخەنە بەرچاوی خەڵك !

بەڵێ ، ئەوە کە هەندێك لە مسوڵمانانی کرچو کاڵو سەرکێڵ ، بە ڕەفتارە ناشەرعییو هەڵسوکەوتە نارێکەکانیان ، ئایینی خوا ، خوارو خێچو قێزەون دەخەنە بەرچاوی خەڵك، ئەوە گەورەترین بەڵایە بەسەر ئوممەتی ئیسلام هاتوە، لەم سەردەمەدا ، لە خوای میهرەبانو زاڵ داواکارین کە زوو ئەو بەڵایە دەفع بکات ، وە مسوڵمانانو ئەوانەی کە ئیددیعای ئیسلام دەکەن ، تێبگەن کە ئیسلام چییە ؟ قورئان چۆنە ؟ ڕێبازی پێغەمبەران چۆنە ؟ وە شتێك نەکەن خیانەت بێ ، بە ئیسلام ، وە شتێك نەکەن کە بەراوەژووو پێچەوانە بێ لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەران دا (عَلَیهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ، لەگەڵ ڕەوشتو ڕەفتارو ئاکاری بەرزو جوانیان دا.

**مەسەلەی چوارەم** : ئایا پێغەمبەر شوعەیب ﷺ لە وەڵامی ئەو هەڕەشەیەدا چی دەڵێ ؟ ﴿قَالَ أَوَلَوۡ كُنَّا كَـٰرِهِينَ ﴾، گوتی: ئەدی ئەگەر پێمان ناخۆش بێ ، هەڵبەتە دوایی چەند قسەیەکی دیکەش دەڵێ ، کە هەموو وەڵامەکەی ، خۆی لە شەش بڕگەدا دەبینێتەوە :

## وەڵامی ( شعیب ) علیە السلام بۆ هەڕەشەی سەرانی کافری گەلەکەی لە شەش ( ٦ ) بڕگەدا

بڕگەی یەکەم : ﴿أَوَلَوۡ كُنَّا كَـٰرِهِينَ ﴾، ئایا ئەگەر پێشمان ناخۆش بێ ؟ کامیانیان پێ ناخۆش بێ ؟ دیارە هەردووکیانیان پێ ناخۆشە :

١- پێیان ناخۆشە لە شارو وڵاتی خۆیان شار بەدەر بکرێن، هەموو مرۆڤێك بە سروشت حەز دەکات لە وڵاتی خۆیدا بژی، لە نێو هاوزمانەکانی خۆیداو ، حەز ناکات بە ناهەق دەربکرێ .

٢- پاشان هەموو کەسێکیش پێی ناخۆشە : بیروبڕوایەکی لەسەر فەرز بکرێ ، کە قەناعەتی پێی نیە، وە ڕێگریی لێ بکرێ لە بیروبڕوایەك کە قەناعەتی پێیەتی ، بۆیە دەڵێ : ﴿ أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴾، یانی : بێگومان پێمان ناخۆشە شار بەدەر بکرێین ، یان بخرێینەوە سەر ڕێبازی ئێوە .

برگەی دووەم : ﴿ قَدِ ٱفۡتَرَيۡنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم بَعۡدَ إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَا ﴾، بێگومان ئێمە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستین ، ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ڕێبازەکەتان ، دوای ئەوەی خوا لێی دەربازی کردووین .

واتە : کاتێك ئێمە لە ڕێبازو بەرنامەی خوا بگەڕێینەوە ، بە زمانی حاڵ بە خەڵك و کۆمەڵگای خۆمان دەڵێین: ئەو ڕێبازو بەرنامەیەی خوا ، هەڵە بوو، چونکە عادەت وایە، وە مەنتقیش وا دەخوازێ، کە مرۆڤ واز لە شتی هەڵە دێنێ ، ئنجا ئەگەر ئێمە لێی هەڵگەڕێینەوە ، لە ژێر فشاری ئێوەدا ، بە زمانی حاڵ بە خەڵك دەڵێین: ئەو ڕێبازو بەرنامەیەی خوا ، هەڵە بوو، بۆیە دەستبەرداری بووین و لێی هەڵگەڕاینەوە، کە بێگومان ئەوەش درۆ هەڵبەستن و بوختان کردنە بە ئایینی خوا ، چونکە ئایینی خوا هەڵە نیە، بەڵام کاتێك ئێمە لێی هەڵدەگەڕێینەوە ، بە زمانی حاڵ و بە کردەوە بە خەڵك دەڵێین ، ئەم ئایینە هەڵەیە، ئەوەش گەورەترین خیانەتە بە ئایینی خوا .

برگەی سێیەم : ﴿ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ﴾، وە ئێمە بۆمان نیە بگەڕێینەوە سەر ئەو ڕێبازەی ئێوە ، مەگەر خوای پەروەردگارمان بیەوێ .

بە دڵنیایی لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە شوعەیب ﷺ ئەگەری ئەوەی دانابێ : ڕۆژێك لە ڕۆژان بگەڕێتەوە سەر ڕێبازەکەی ئەوان، ئەدی بۆچی دەیبەستێتەوە بە ویستی خواوە ؟ ئەوە بریتیە لە ئەدەب نواندن لەگەڵ

ویستی ڕەهای خواداو، بەستنەوەی هەموو شتێك بە ویستی خواوە، ئەگەرنا وەنەبێ ئەگەری ئەوەیان دانابێ ، كە بگەڕێنەوە !

ئەوەتا ئیبراهیمی خەلیلیش ﷺ بە هەمان شێوە ، خوا لێی دەگێڕێتەوە ، كە دەفەرموێ : ﴿ وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ ۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّى فِى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ ۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّى شَيْـًٔا ۗ وَسِعَ رَبِّى كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۗ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾، لە درێژەی ئایەتەكەدا دەفەرموێ: وە من لەوە ناترسم كە دەیكەنە هاوبەشی خوا، مەگەر پەروەردگارم شتێكی بوێ ، یانی : خوا هەر شتێكی بوێ ، دەبێ‌و ، هیچ شتێك ناتوانێ لە بەرانبەر ویستی ڕەهای خوای پەروەردگاردا بوەستێ، بەلام بێگومان خوای دادگەریش هیچ شتێكی چاك، یان خراپ لەسەر بەندەكانی فەرز ناكات، چونكە خوا ﷻ ستەم لە بەندەكانی ناكات، واتە: ئەگەر پەروەردگارم شتێكی بوێ، ئەو كاتە من تووشی زیانێك دەبم ، لەلایەن پەرستراوەكانی ئێوەوە ، یاخود هەر زیانێك كە خوا بیەوێ تووشی دەبم ، بەلام من مەترسییم نیە لە پەرستراوەكانی ئێوە ، لەوێشدا دیسان ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ ویستی ڕەهای خوای بێ وێنەدا ، ئەو هەلاوارنەی تێخستوە .

<u>بڕگەی چوارەم</u>: ﴿ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴾، زانیاریی پەروەردگارمان هەموو شتێكی گرتۆتەوە ، واتە : زانیاریی خوا فراوانەو هەموو شتێكی تێدایەو ، هەموو شتێك دەزانێ، هەڵبەتە لێرەدا پێغەمبەر شوعەیب ﷺ دەیەوێ بە خەڵكەكە بڵێ ، بەوانەی كە هەڕەشەیان لێكردوە : كە هەموو شتێك لە زانیاریی بێ سنووری خوای زاناو تواناداهەیە، وە ئەگەر گریمان زیانگەیاندنێكی ئێوەش لە زانیاریی خوادا هەبێ ، ئەوە پێمان دەگات ، بەلام ئەگەر زانیاریی خوا پەیوەست نەبێ بە زیانگەیاندنی ئێوەوە ، هەرچەندە هەڕەشەمان لێبكەن، مادام لە زانیاریی خوادا نەبێ ، ئێمە هیچ شتێكمان تووش نایەت .

بڕگەی پێنجەم: دەڵێ : ﴿عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا﴾، پشتمان هەر بە خوا بەستوه، دیارە ئیمانداران پشتیان هەر بە خوا قایمەو ، دڵیان هەر بە خوا دەبەستن.

بڕگەی شەشەم : دەڵێ : ﴿رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ﴾، پەروەردگارمان ! دادوەریی بە هەق لە نێوان ئێمەو گەلەکەماندا بکە ، وە بێگومان تۆ باشترینی دادوەرانی .

لێرەدا دیارە ئەوە دوایین قۆناغی مشتومڕیان بووە ، بۆیە پەنا دەبەنە بەر خوا، بۆ دادوەریی لە نێواندا کردنیان .

**مەسەلەی پێنجەم** : کە خوا دەفەرموێ : ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعۡتُمۡ شُعَيۡبًا إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ﴾، وە قسە ڕۆیشتووانی بێبڕوای گەلی شوعەیب بە ئیماندارانی شوێنکەوتووی شوعەیب ﷵیان گوت: ئەگەر ئێوە شوێنی شوعەیب بکەون، مسۆگەر زیانبارن .

لێرەدا دەگونجێ مەبەست لەو قسەیەی دەستڕۆیشتووانی گەلی شوعەیب بۆ ئیمانداران ، ئەوە بوو بێ کە : ئێوە لە دنیادا مایە پووچن و ، دەست بەتاڵن ، چونکە بە دوای بەرنامەو ڕێبازێکی هەڵە کەوتوون، یاخود بە دوای کەسێك کەوتوون کە بەرەو هەڵدێرتان دەبات . وە دەشگونجێ مەبەستیان لەوە کە دەڵێن : ئێوە زیانبارن ، ئەوە بێ : وەك چۆن کەسێك هەڕەشە لە کەسێك دەکات دەڵێ : (زەرەر دەکەی !) ، واتە : ئێمە تووشی سزاو جەزرەبەتان دەکەین ، هەردوو واتاکەش هەڵدەگرێ .

وە لە سووڕەتی (هود)دا هەڵوێستی گەلی هوود کە (عاد)ە، ئاوا بەیان دەکرێ، خوا دەفەرموێ: ﴿قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ مَا نَفۡقَهُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفٗاۖ وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ لَرَجَمۡنَٰكَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡنَا بِعَزِيزٖ ٩١﴾، واتە : گوتیان : ئەی شوعەیب ! زۆرێك لەوەی کە تۆ دەیڵێی تێیناگەین ، وە ئێمە لە نێو خۆماندا

بێهێزو بێ دەستەڵات دەتبینین ، وە ئەگەر کۆمەڵەکەت نەبووایە ، بەردبارانمان دەکردی ، وە تۆ لەلای ئێمە کەسێکی خاوەن پێگەو بە دەستەڵات نی .

دەگونجێ مەبەست لە (رَهْطُكَ ) گەل و هۆزەکەی بووبێ، وە دەشگونجێ مەبەست شوێنکەوتووەکانی بێ، بەڵام ئەوەی یەکەمیان بەهێزترە، چونکە پێغەمبەران (عَلَيهِمِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کەم وا بووە هێندە خەڵك شوێنیان بکەوێ ، کە بۆیان ببنە پشتو قوەت ، زیاتر هۆزو خزمەکانیان بەرگرییان لێکردوون ، کەواتە گوتوویانە: ئەگەر لەبەر هۆزەکەت نەبێ ، بەردبارانت دەکەین .

ئنجا کە لێرەدا دەفەرموێ : ﴿إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَسِرُونَ ﴾، هەڕەشەیەکی ڕوونیان لێ نەکردوە ، بەڵکو هەڕەشەیەکی پەنهانیان لێکردوە، لەبەرئەوەی پشتو قوەتێکیان پێوە شك بردوە ! پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ، وەك تەعقیب لەسەر قسەی لووط {دوای ئەوەی گەلەکەی دێن دەستدرێژیی بکەنە سەر میوانەکانی ، کە فریشتەن سەلامی خوایان لێ بێ ، وە خۆیان لە شێوەی گەنجی جواندا نواندووەو هاتوون بۆ ماڵی لووط} سەلامی خوای لێ بێ کە دەفەرموێ :

﴿ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ ٨٠ ﴾هود ، واتە : ئەگەر خۆم توانایەکم هەبووایە لە بەرانبەرتاندا ، یاخود پشتو هێزێکم هەبووایە ، {لێم قبووڵ نەدەکردنو سزام دەدان} پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی : ﴿... وما بعث الله نَبِيّاً بعده الاّ في ثَروةٍ من قومه ﴾ رواه الترمذي ، (٢ / ١٣٩) وقال : حسن ، والحاكم ، (٢/ ٥٦١) ، وقال : صحيح على شرط مسلم ، واتە لە دوای لووط خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە ، مەگەر لە نێو خەڵکێکدا کە بتوانن بەرگریی لێ بکەن} وەك چۆن بەنی هاشیم بەرگرییان لە پێغەمبەری خوا کرد ، هەرچەندە زۆربەیان ئیمانیشیان پێ نەهێنابوو .

**مەسەلەی شەشەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴾، پێشتر باسمان کرد، کە وشەی (رَجْفَة) واتە: لەرزینەوە، بوومەلەرزە ، ئنجا کە لێرەدا بە (ف) هێناویەتی ، توێژەروان دوو ڕایان هەن :

١/ هەندێکیان دەڵێن : ئەو (ف)ە ، (ف)ی (تعقیب)ـە ، چونکە ئەگەر گوتت : (جَاءَ مُحَمَّدُ فَأَحْمَد) واتە: یەکسەر ئەحمەدیش بە دوای موحەممەددا هات .

٢/ هەندێکیشیان گوتوویانە: ئەو (ف)ە، (ف)ی (جَزَاء)ە، واتە هەر کەسێك وایکرد ، ئەوە جەزایەکەیەتی (فَجَزَاؤُهُ)، هەردووکیشیان دەگونجێن، گرنگ ئەوەیە خوای دادگەر فەرموویەتی : یەکسەر دوای ئەو هەڕەشەیەی ئەوان ، بوومەلەرزە گرتنی ، یاخود لە سزای ئەو قسەو هەڕەشەی ئەواندا : بوومەلەرزەیەك گرتنی ، ﴿ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴾، لە ماڵەکەی خۆیاندا لەپەڕوو کەوتن، (جَاثِم)[1] بە باڵندەیەك دەڵێن کە دەنیشێت و خۆ بە زەوییەوە دەچەسپێنێت ، (جَاثِمِين) واتە : ئەوانیش وەك چۆن باڵندە بە زەوییەوە نووساوە ، ئاوا بە زەوییەوە تەخت بوون .

هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان پرسیویانە : بۆچی لێرەدا خوا دەفەرموێ : ﴿ فِي دَارِهِمْ ﴾، (دار) واتە : لە ماڵەکەیان دا ، لە خانووەکەیان دا ، خۆ ماڵەکانیان چەند خانوویەك بوون ؟ وە لە شوێنی دیکەش فەرموویەتی : ﴿ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ هود ؟ (فِي دِيَٰرِهِمْ ) یانی : لە خانوو ماڵەکانیان دا .

لە وەڵامدا دەڵێین : لەبەرئەوەی ماڵەکانیان وا تەخت بووبوون بە زەوییەوە ، شارە وێرانەکەیان وەك وێران بوونی یەك ماڵ ، وابووە ، وە کە دەشفەرموێ :

﴿ دِيَٰرِهِمْ ﴾، بۆ ئەوەیە کە بزانرێ هەموو نشینگەکانو ماڵەکان ، وەك یەك کاول بوونو ، ئەوانەش کە لەو ماڵانەدا نیشتەجێ بوون ، بە زەوییەوە تەخت بوون .

ئنجا دیارە گەلی مەدیەن دوو هەڕەشەیان کردوون لە پێغەمبەر شوعەیبو شوێنکەوتووانی :

---

١) جَثَم الطائر : تَلَبَّد بالأرض ، مختار الصِّحاح ، ص ٩٤.

١) گوتوویانە : ﴿ لَنُخْرِجَنَّكُمْ ﴾ لە ئاوەدانیی ولاتو شاری خۆمان دەرتان دەکەین .

٢) ﴿ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ﴾ یاخود دەگەڕێنەوە سەر ڕێبازەکەی ئێمە .

ئنجا لەبەر ئەوەی ئەوان هەڕەشەیان لە پێغەمبەر شوعەیبو شوێنکەتووانی کردوە ، کە شاربەدەریان بکەن ، خوای دادگەریش ئەوانی شار وێران کردوەو کاولی کردوە بەسەریاندا.

ئنجا کە لە شوێنێك سزایە (عقوبة) کەیانی ناوناوە: (رَجْفَة)، وە لە شوێنێکی ، دیکە بە : (صَيْحَة) ناوی هێناوە، وە لە شوێنێکی دیکە بە : (صاعِقَة) ناوی هێناوەو لە شوێنێکی دیکە بە : (عَذَابُ الهَوْن) ناوی هێناوە، ئەوانە هیچ ناکۆکییەکیان لە نێواندا نیە، چونکە پێدەچێ تریشقەیەکی ئاگراویی لە ئاسمانەوە هاتبێ لێی دابێ‌و، بووبێتە هۆی دەنگێکی گەورەو، پاشان بووبێتە هۆی بوومەلەرزەیەکی گەورەو، سەرەنجام سزاو ئازارێکی ڕیسواکەر، کەواتە : با ئاوا تەماشای ئایەتەکان بکەین : هەر کام لەو ئایەتانە تەعبیری کردوە لە گۆشەیەکی ئەو سزایە ، یاخود لە قۆناغێکی ئەو سزایە ، کە باسی (صاعقة) دەکات، واتە: سەرەتای سزایەکە (صاعقة)یەك بووە، دوایی بۆتە دەنگێکی گەورە (صَيْحَة) پاشان بۆتە بوومەلەرزەیەك (رَجْفَة)و ، سەرەنجام ئەو شارو ولاتەیان کاول کراوەو ، ئەوانیش بە زەوییەوە تەخت بوون .

**مەسەلەی حەوتەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْۖ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ۝٩٣ ﴾، واتە: پشتی تێکردن، دوای ئەوەی کە شارەکەیان کاول بوو، دیارە ئەو لەگەڵ شوێنکەوتووانی دوور کەوتوونەتەوەو، ئنجا شارو ولاتەکەیان کاول بووەو تەخت بووە.

ئنجا کە دەڵێ : ﴿ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ ﴾، ئەوە دوو واتایان هەڵدەگرێ :

١ - یان ئاورێکی لێ داونەوەو دواندوونی .

٢- یان لەبەر خۆیەوە قسەکانی کردوون ، بە داخو حەسرەتەوە گوتوویەتی : ئەی گەلەکەم ! ئەی ئەو کۆمەڵگایەی کە لە نێوتان دا بووم ! دیارە هەر لە خۆشیان بووە، چونکە خزمو کەسی بوون .

چونکە وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗا ﴿٨٥﴾ ﴾ الأعراف وەك پێشتر باسمان کرد ، ئەو برایەتییە، برایەتیی ئایینی نیە ، چونکە ئەوان کافر بوونو ئیمانیان نەهێنا، بەڵکو برایەتیی نەژادیی و ڕەچەڵەكو نەسەبە ،

دوایی فەرموویەتی : ﴿ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي ﴾، بێگومان پەیامەکانی پەروەردگاری خۆمم پێ ڕاگەیاندن ، وشەی (رِسالاَت) لە هەندێك خوێندنەوە (قِراءة)دابە (رِسالَة) هاتوە، ئنجا ئەگەر : (رِسالاَت ربّي) بێ ، لەبەرئەوەیە کە هەر کام لە پێغەمبەران لە چەند ڕوویەکە پەیامی خۆیان گەیاندوە : لە ڕووی عەقیدەیی و فیکرییەوە ، لە ڕووی خواپەرستییەوە ، لە ڕووی ڕەوشتی بەرزەوە ، لە ڕووی ئابووریی و لە ڕووی سیاسییەوە ، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی، ... هتدەوە . وە ئەگەر (رِسالَةَ رَبّي) بێ ، لەبەر ئەوەیە کە پەیامی خوا فرە ڕەهەندەو هەموو ئەو لایەنانە دەگرێتە خۆی .

دوایی دەفەرموێ : ﴿ وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ ﴾، وە دڵسۆزییشم بۆ نواندن ، (نُصْح) بە پێچەوانەی تێگەیشتنی زۆر خەڵکەوە، بریتیی نیە لە ئامۆژگاریی کردن ، بەڵکو بریتیە لە دڵسۆزیی و پەرۆشیی نواندن، دەربارەی ئەو وشەیە ، ئەم فەرموودەیە هەیە ، ﴿عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ أَنَّ النَّبِي صلى الله عليه وسلم ، قَالَ : الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قُلْنَا: لِمَنْ ؟ قَالَ : لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسولِهِ وَلأَئِمَّةِ المسلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٥٥)}، واتە: تەمیمی داریی خوا لێی ڕازی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دینداریی بریتیە لە نەصیحەت، گوتیان: بۆ کێ ؟ فەرمووی: بۆ خواو بۆ کتێبەکەیو بۆ پێغەمبەرەکەیو بۆ پێشەوایانی مسوڵمانانو تێکڕایان .

ئنجا ئایا ئامۆژگاریی خواو قورئانو پێغەمبەر چۆن دەکرێ ؟! بە هەر حاڵ، کەواتە: وەك زانایان گوتوویانە: (نصیحة) بریتیە لەوە کە تۆ ئەو کەسەی کە نەصیحەتی ئاڕاستە دەکەی، چی چاکە ئەوەت بۆی بوێ ، واتە : دڵسۆزیی بۆ نواندنو بە تەنگەوە بوونو، بە پەرۆشەوە بوون .

شوعەیب بە گەلەکەی دەڵێ: من دڵسۆزییم بۆ نواندن، بە پەرۆشتانەوە بووم، خەمخۆرتان بووم .

دیارە ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ : کە ئینسانی ئیماندار دەبێ دڵسۆز بێ بۆ هەموو کەسێك ، چونکە ئەوەتا تەماشای ژیانی پێغەمبەران دەکەی ، بە پەرۆشو دڵسۆزی گەلە کافرەکانیان بوون ، چونکە هەندێ مسوڵمانی کرچو کاڵ وا حاڵی بوون ، کە نابێ کافر هیچ خێرێکیان لێ ببینێ ! کە ئەمە هەڵەیە ، لە ڕاستییدا ئیماندار دەبێ هەمیشە لەگەڵ هەموو کەس دا کافر بن ، یان مسوڵمان : ئەهلی چاکەو ئیحسان بێ، بە بەزەیی بێ .

کەواتە: وەك زانایان گوتوویانە: مەبەست لە (نُصح) بریتیە لەوە کە تۆ ئەو کەسە نوصحەکەی ئاڕاستە دەکەی ، چی چاکەیە بۆ ئەوت بوێ ، واتە : دڵسۆزیی بۆ نواندن ، بە تەنگەوە بوون، بە پەرۆشەوە بوون ، (نصحت لكم) واتە : من دڵسۆزییم بۆ نواندنو بەپەرۆشتانەوە بووم ، بە تەنگتانەوە بووم ، خەمخۆرتان بووم .

بەڵێ مسوڵمان لە حاڵەتی مامەڵەکردندا، دەبێ چۆن چاکە ، ئاوا بێ ، بەڵام کە کەوتە حاڵەتی ڕووبەڕووبوونەوە ، ئەو کاتە، وەك گوتراوە: (لِكُلِّ مَقَامٍ مَقَال) بۆ هەر حاڵەتە ، هەڵوێستی خۆی دەوێ .

دوایی لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ[1] عَلَىٰ قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴾، واتە : چۆن زۆر دڵتەنگ بمو ، خەفەت بخۆم لەسەر کۆمەڵی کافران ؟

---

١) الأسى : الحُزْن ، مختار الصِّحاح ، ص ٢٩.

پێشتریش گوتمان لێرەدا توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: دەگونجێ پێغەمبەر شوعەیب لەبەرخۆیەوە ئەم قسەیەی کردبێ ، کاتێ بینیویەتی ، ئەوان شارەکەیان بەسەردا کاول بووەو قیرەبڕ بوون، وە دەشگونجێ ڕووی تێکردبن‌و ئەو قسانەی لەگەڵ کردبن، وەك چۆن پێغەمبەری خوا ڕووی کردە ئەو حەفتا کەسەی کە لە جەنگی بەدردا کوژرابوون‌و لە بیر (قَلِیب)ێك دا فڕێ درابوون، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە : ﴿عن أَنَسٍ أَنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ تَرَكَ قَتْلَى بَدْرٍ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ حَتَّى جَيَّفُوا، ثُمَّ أَتَاهُمْ، فَقَامَ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ: يَا أُمَيَّةُ بْنَ خَلَفٍ ! يَا أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ ! يَا عُتْبَةُ بْنَ رَبِيعَةَ ! يَا شَيْبَةُ بْنَ رَبِيعَةَ ! هَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَكُمْ رَبُّكُمْ حَقًّا ؟ فَإِنِّي قَدْ وَجَدْتُ مَا وَعَدَنِي رَبِّي حَقًّا ، قَالَ : فَسَمِعَ عُمَرُ صَوْتَهُ ، فَقَالَ يَا رَسولَ اللهِ ! أَتُنَادِيهِمْ بَعْدَ ثَلاثٍ وَهَلْ يَسْمَعُونَ؟ يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِنَّكَ لا تُسْمِعُ الموْتَى؟ فَقَالَ : وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ مِنْهُمْ وَلَكِنَّهُمْ لا يَسْتَطِيعُونَ أَنْ يُجِيبُوا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (١٤٠٩٦) وَغَيْرُهُ، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ} ، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژان کوژراوەکانی (بدر)ی واز لێهێنان تاکو بۆنیان کرد ، پاشان چووە لایان‌و بەسەریانەوە وەستاو فەرمووی : ئەی (أُمية بن خَلَفْ !) ئەی : (أبو جهل بن هشام)، ئەی : (عتبة بن ربيعة !)، ئەی (شيبة بن ربيعة !) ئایا ئەوەی پەروەردگارتان بەڵێنی پێدابوو، بۆتان ڕاست دەرچوو ؟ من بەڵێنی پەروەردگارمم ڕاست بینی، ئنجا عومەر گوێی لە دەنگی بوو، گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا دوای ئەوان ـ لە مردنیان ـ بانگ دەکەی ، وە ئایا دەبیستن ؟ خواش ﷻ دەفەرموێ : ﴿ إِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ ﴿٨٠﴾ ﴾ النمل ـ تۆ بە مردووان نابیستێنی ـ ! فەرمووی : سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە ، ئێوە لەوان باشتر نابیستن ، بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە .

ئنجا ئەمە دەگونجێ موعجیزەیەك بووبێ بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، یاخود هەر کەسێك قسە لەگەڵ مردوو بکات ئەو مردوە دەیبیستێ، هەڵبەتە لاشە ڕزیوەکەی نا، کە ڕووحی تێدا نەماوە، بەڵکو ڕووحەکەی دەیبیستێ، وە بێگومان ئەگەر بشیبیستن ، توانای وەڵامدانەوەیان نیە، کەواتە: هەردوو ئەگەرەکان هەن .

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴾، چۆن خەفەت بخۆم لە کۆمەڵێکی بێبڕوا، وا پێدەچێ خەفەتی خواردبێ، بەلاَمن وای تێدەگەم پێغەمبەر شوعەیب بە خۆی دەڵێ : عەقڵو مەنتیق وا دەخوازێ ، مادام ئەوانە دڵسۆزیی تۆیان قبووڵ نەکرد، بە دەنگ بانگەوازی تۆوە نەهاتن ، تۆش خەمیان لێ مەخۆ، بەلاَم جاری واش هەیە ئینسان سۆزو هەستی بەسەر عەقڵو مەنتیقدا زاڵ دەبێ، ئەگەرنا هەم شوعەیبو هەم صالح ، هەمان ڕستەیان دووبارە کردۆتەوە ، لەگەڵ تۆزێ جیاوازیی دا ، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ ، کە خەفەتیان لێ خواردبن ، وە بێگومان پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە تەنگ خەڵکەوە بوونو ، کاتێك ئەو خەڵکە هیدایەتی وەرنەگرتوە ، تووشی خەفەت خواردنو دڵتەنگیی بوو ون بۆیان ، بەلاَم لێرەدا شوعەیب جۆرێك لە سەرکۆنەی خۆی دەکات ، کە نەدەبوو خەمتان لێ بخۆم ، بەلاَم ئەوە زیادە ڕەحمو بەزەیی و شەفەقەتی منە ، ئەگەرنا ئێوە شایستەی خەم بۆ خواردنو پەرۆشیی نین .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دوازدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی ژمارە (٩٤ تا ١٠٢) دەگرێتە خۆی، واتە: نۆ (٩) ئایەت، لەم نۆ ئایەتەدا خوای کاربەجێ بە شێوەیەکی گشتی باس لە هەندێ یاسای خۆی دەکات ، کە لە ژیانی کۆمەڵگەکانی بەشەردا هاتوونە دی ، کە خوای پەروەردگار لە قورئاندا ئەو یاسایانەی بە (سنن) ناوبردوون ، کە کۆی (سنة)ەو سوننەت، واتە : یاسای خوا .

دیارە لە دەرسەکانی ڕابردوودا خوا باسی بەسەرهاتی پێنج لە پێغەمبەرانی کرد، پێشتریش باسی ئادەمی کردبوو ئەوە شەش، کە ئێمە گوتمان لەم سووڕەتی ئەعرافەدا ، خوا باسی بەسەرهاتی هەشت لە پێغەمبەران دەگێڕێتەوە ، نووح عليه السلام و گەلەکەی ، هوود عليه السلام و گەلی عاد ، صالح عليه السلام و گەلی سەموود ، لووط عليه السلام و گەلەکەی، شوعەیب عليه السلام و گەلی مەدیەن‌و خاوەنانی درەخت، ئادەمیش عليه السلام پێشتر، ئنجا خوای کاربەجێ دوایی باسی مووساو هاروونیش سەلامی خوایان لێ بێ ، دەکات ، ئنجا وەك بەدواداچوون لەسەر بەسەرهاتی ئەو پێنج پێغەمبەرانە ، کە واپێدەچێ بەرجەستەترینی نێو پێغەمبەران بن، چونکە لە سووڕەتی (الشعراء)شدا باسی ئەو پێغەمبەرانە بەسەر یەکەوە کراوە، وە لە سووڕەتی (هـود)یش دا خوا بەسەرهاتیانی گێڕاوەتەوە ، وەك شیکردنەوەی هەندێك لە یاساکانی خۆی لە ژیانی بەشەردا ، چەند شتێك دەفەرموێ ، سەرەتا دەفەرموێ : ئەو کۆمەڵگایانەی کە دژایەتیی پێغەمبەران دەکەن ، بە گرفتاریی‌و خۆشگوزەرانیی تاقییان دەکەمەوە، پاشان دوای ئەوەی نە بە ناخۆشیی‌و گرفتاریی دەگەڕێنەوە لای خواو، نە بە خۆشگوزەرانیی ، سوپاسی خوا دەکەن‌و دەگەڕێنەوە، ئەوکاتە خوا سزایان دەدات، وە پاشان خوا باسی یەکێك لە یاساکانی دیکەی دەکات، کە بریتیە لە

کردنـەوەی دەروازەکـانی خێروبێـری بـۆ کەسـانێك کـە ئەهلـی تـەقواو ئیمـانن، وە بـە پێچەوانەوەش ئـەوەی ئەهلـی ئیمـانو تەقـوا نەبـێ ، خـوا دەروازەکـانی خێـرو بێـری زەویو ئـاسمانەکانی لەسـەر دادەخـات .

پاشان خـوا سـەرزەنشـتی کۆمەڵگـا لارێیەکـان دەکـاتو، هۆشـیاریان دەکـاتەوە ، کە زۆر نـزیکە لەناکاوو بـە کتـوپڕی ، شـەوێ لـە کـاتی خـەودا، یاخـود بـە ڕۆژ لـە کـاتی گـەمەو یارییـاندا ، بـەڵای ناگەهانیـان بـۆ بنێـرێ ، وەك لـە کـوردەواریی خۆمـاندا دەڵێـن : (بـەڵای ناگـەهان) واتـە : بـەڵایەکـی کتوپـڕی چاوەڕوان نەکـراو .

دوایی خـوا هۆشـیاریی دەدات بـە بـەشـەر کـە ئەگـەر پەنـدو دەرس لـە گـەلانی پـێش خۆیـان وەرنەگـرن، نـزیکە بـەهۆی گوناهـەکـانیانەوە ، دڵو گـوێیـان مـۆر بکـرێ، واتـە : ئـەو ئەنـدامانـەی کـە پێـی داون ، بـۆ ئـەوەی شـتیـان پـێ ببیـنن‌و ببیسـتن‌و بزانـن‌و بناسـن ، لە کار دەکـەون .

لە کۆتایی دا خـوای پەروەردگار ڕوو لە پێغـەمبـەری خاتەم دەکاتو پێی دەفەرموێ : ئـەو گـەلانەی کـە بـەسـەرهاتەکـانیان بـەسـەرتدا دەخـوێنرێنـەوە ، لەبـەرئەوەی لـە سـەرەتاوە ئیمانیـان نەهێنـاوە ، ئەو ئیمـان نەهێنانـە لە سـەرەتاوە ، بـوو بـەهـۆی ئـەوە کە دڵیان مـۆر بکـرێ ، لەلایەن خـوای دادگـەرەوە ، وە خـوا ڕایدەگـەیەنـێ کـە زۆربـەی ئەو گەلانە ، بێ پەیمانو لارێ بوون ، بێ پەیمان بـوون ، واتـە : پابـەند نەبـوون ، بـەو پەیمانـەوە ، کە خـوا وەك پەیمـانێکـی سروشـت (فِطـري)ی لـێی وەرگـرتوون، کـە دەبـێ خـاوەن‌و بـەدیهـێنەری خۆیـان بناسـن‌و، بەرانبـەری سـوپاسگوزارو بـە ئەمـەگو بـە وەفـابن .

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ
يَضَّرَّعُونَ (٩٤) ثُمَّ بَدَّلۡنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَواْ وَّقَالُواْ قَدۡ مَسَّ
ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ (٩٥) وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ
ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ
فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ (٩٦) أَفَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ أَن يَأۡتِيَهُم بَأۡسُنَا بَيَٰتٗا
وَهُمۡ نَآئِمُونَ (٩٧) أَوَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ أَن يَأۡتِيَهُم بَأۡسُنَا ضُحٗى وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ
(٩٨) أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ (٩٩) أَوَلَمۡ
يَهۡدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ أَهۡلِهَآ أَن لَّوۡ نَشَآءُ أَصَبۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡۚ
وَنَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ (١٠٠) تِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآئِهَاۚ
وَلَقَدۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ مِن قَبۡلُۚ
كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلۡكَٰفِرِينَ (١٠١) وَمَا وَجَدۡنَا لِأَكۡثَرِهِم مِّنۡ عَهۡدٖۖ
وَإِن وَجَدۡنَآ أَكۡثَرَهُمۡ لَفَٰسِقِينَ (١٠٢) ﴾.

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە ئێمە هیچ پێغەمبـەرێکمان لـە هیـچ ئـاوەدانییەکـدا نـەناردوە ، مەگـەر (پاش بڕوا نەهێنـانیان) خەڵکەکەیمان بـە نـەداریی‌و ناخۆشـیی سـزاداوە، بـە ئومێـدی ئـەوەی (بۆ خـوا) ملکەچیـی‌و کـڕووزانــەوە بکـەن ﴿٩٤﴾ دوایـی حاڵـەتی خراپـەمان بـۆ گۆڕیـون بـە چاکە ، هـەتـا (لە هـەموو ڕوویەکەوە) زیادیان کرد ، وە گوتیان : بـاب‌و باپیـرانیشـیان هـەر ئـاوا بـوون، گـرفتـاریی‌و شـادمانییـان بـەسـەر هـاتوون، ئیـدی ئێمـەش (لـە سـزای ئـەوەدا) بێئـەوەی هـەسـت بکـەن ، کتـوپڕ گـرتمـانن ﴿٩٥﴾ وە ئەگـەر هـاتبـاو خەڵـکی ئـاوەدانییـەکان بڕوایان هێناباو پارێزیان کردبایە ، بە مسـۆگـەریی (دەروازەکانی) خێرو بێرەکـانی ئـاسـمان‌و زەمینمـان بـەسـەردا دەکردنـەوە، بـەڵام بێبـڕوا بـوون‌و ، ئێمـەش بەهـۆی کـردەوە (خراپـە)کـانیانەوە ، گـرتمـانن‌و سـزامان دان ﴿٩٦﴾ ئنجـا ئـایا خەڵـکی ئـاوەدانییـەکان دڵنیـان ، کـە لە کاتێکدا خەوتـوون ، سزای ئێمە شـەبـەیخوونیان بکاتە سـەری ؟ ﴿٩٧﴾ یان ئـایا خەڵکی ئـاوەدانییـەکان دڵنیان ، کە بـە چێشـتەنگاو لـە کـاتێکـدا یـاریی دەکـەن ، سزای ئێمـەیـان بـە مل دا بـێ ؟ ﴿٩٨﴾ ئـایا لـە نەخشـەو پلانـی خـوا بـێ بـاکـن ؟ بێگومان جگە لە کۆمـەڵی زیانبـاران هیچکە لە پلان‌و نەخشـەی خوا بێ بـاك نیـە ﴿٩٩﴾ ئـایا ئەوانـەی پاش خەڵکە (فەوتـاوە)کە زەمینیان بـە میـرات گـرتوە ، بۆیـان دەرنەکـەوتوە ، کـە ئەگــەر ویســتبامان بـەهــۆی گوناهـەکــانیانەوە ســزامان دەدان‌و ، دڵیانمــان مـــۆر دەکـــرد ، بـــە جـــۆرێك کـــە (هـــەق) نەبیســـتن ﴿١٠٠﴾ ئەوانـــە ئـــەو ئـاوەدانییـانەن ، کە لە هـەواڵەکـانیـانت بـۆ دەگێڕینـەوە ، وە بێگـومان پێغەمبـەرانیـان بــە بـەڵگــە ڕوونەکــان (موعجیزەکــان)ەوە هــاتنە لایـان، بــەڵام (هێنــدە بــە کــوفرو سـەرەخـەریی دا ڕۆچوو بوون) نەدەگونجا بـڕوا بـەوە بێنـن ، کـە پێشـتـر بڕوایـان پـێ نەهێنابـوو، بـەو شـێوە خـوا دڵـی کـافران مۆر دەکـات ﴿١٠١﴾ وە لە زۆربـەیـانـدا (وەفـاداریی بـە) پەیمـانمـان نـەدی، بـەڵکـو بـە دڵنیاییـەوە زۆربـەیانمـان بـە لاڕێ بینـی ﴿١٠٢﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(بِٱلْبَأْسَآءِ ) : (أَصْلُ بئْسَ: بَئِسَ وهُوَ مِنَ البُؤْسِ) ، (بِئْسَ) واتە: خراپترین شت، چونكە وشەی (بِئْسَ) لە (بَئِسَ)ەوە هاتوە ، ئەویش لە (بُؤْس)ەوە هاتوە، واتە: خراپترین نارەحەتیی . (البُؤْسُ والبَأْسُ وَالبَأْساء: الشدَّة وَالمكْرُوه، إلاَّ أن البُؤْس فِي الفَقْرِ وَالحَرْبِ) واتە : (بؤْسُ و بَأْسُ و بَأْساء) هەموویان بە مانای تەنگانەو سەغڵەتیی دێن، تەنیا ئەوەنەبێ كە (بُؤْس) بریتیە لە سەختییەك كە لە جەنگدا دێتە دی .

(وَٱلضَّرَّآءِ ) : (ضَرّآء) لە (ضـرّ)ەوە هاتوە ، (الضُّرُّ سوءُ الْحَالِ ، والضَّرّآء عَكْسُ السَّرّآء)، (ضـر) واتە : حاڵی ناخۆش ، پێچەوانەی (سرور)ە ، واتە : خۆشیی، (والضراء يقابل بالسَّرَّاءِ وَالنَّعْمَاء ، والضُرّ بالنَّفْع) ، (ضَرَّاء) لە بەرانبەری دا وشەی (سَرَّاءُ، ونعمَاء) هەیە، واتە: شادمانییو خۆشیی، وە وشەی (ضُرّ) كە بە مانای زیان دێ، بەرانبەرەكەی (نفع)ە، واتە: سوودو قازانج .

(حَتَّىٰ عَفَواْ ): یانی : هەتا زیادیان كرد، دەگوترێ: (عَفَى الشَّعْرُ و كَثُرَ) واتە: مووەكە زیادی كرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ﴿أَعْفُوا اللِّحَى، وَحُفُّوا الشوارِبَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٥٦) عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، تعليق شعيب الأرنؤوط : صحيح رجاله ثقات ، رجال الصحيح}، واتە : لە ڕیشتان بگەڕێن ، بیهێڵنەوە، سمێلیشتان كورت بكەنەوە .

(بَغْتَةً ): (البَغْتُ : مُفَاجَأَةُ الشَّيءِ مِنْ حَيْثُ لاَ يُحْتَسَبُ) ، (بَغْت) بریتیە لەوەی شتێك كتوپڕ بە ملت دا بێ ، بێئەوەی حیسابت بۆ كردبێو، چاوەڕێت كردبێ، واتە : شتی لەناكاو .

(بَأْسُنَا) : (البَأْس : العَذَابُ ، وَهُوَ الشِدَّةُ فِي الحَرْب) ، (بَأْس) هەم بە مانای سزاو ئازار دێ ، وە هەم بە مانای ئەو سەختییە دێ ، کە لە حاڵەتی جەنگ دا دێتە دی .

(مَكْرَ ٱللَّهِ) : (المكْرُ : صَرْفُ الغَيْرِ عَمَّا يَقْصِدُهُ بِحِيْلَةٍ وَذَلِكَ ضَرْبَانِ : مَحْمُودٌ وَمَذْمُومٌ) وشەی (مَكْر) لە زمانی عەرەبیدا ئەوەیە کە تۆ کەسێك لە شتێك لابدەی، کەسێك بەرەو ئامانجێك بچێ، یەکێکی دی بە فێڵێك ، لایبدات، وە وشەی (مَكْر) دەگونجێ پەسند بێو دەگونجێ ناپەسند بێ، بۆ وێنە: ئەگەر کەسێك بەرەو گوناهو تاوان بچێو بتەوێ بە شێوەیەك فێڵی لێ بکەیو لایبدەی ، ئەوە مەکرێکی پەسندە، وە بە پێچەوانەوە : ئەگەر کەسێك بەرەو ئەنجامدانی چاکەیەك بچێو یەکێك لایبدات ، ئەوە شتێکی ناپەسندە، لە زمانی کوردیدا وشەی (مَكْر) زیاتر بۆ ئافرەتان بەکاردەهێنرێ، دەڵێن: مەکری ژنان، هەر حیکایەتێك هەیە بە ناوی : (مەکری ژنان)، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا ، وەك لە کتێبی (ئەحمەدیی)دا هاتوە ، دەڵێ : (مَكْرُ وكَيْدُ وحِيْلَةُ) فێڵە، (جبینو جَبْهَةُ) (تەوێڵ)ە[1].

بەڵام دیارە کە خوای پەروەردگار ئەم وشانە بۆخۆی بەکاردێنێ ، بە تەئکید نابێ بەو مانا باوەی نێو خەڵك بۆ خوا بەکاربهێنرێ، بۆیە من وشەی (مَكْر)م بۆ خوا ، بە مانای پلانو نەخشەدانان تەفسیر کردوە، نەك بە فێڵ، ئێمە نابێ بڵێین : خوا فێڵ دەکات، دەڵێین : خوای دادگەرو کاربەجێ نەخشەو پلان دادەنێ، هەرچەندە وشەی پلانو پیلان هەر یەکە لەبەرئەوەی لە ئینگلیزیی وەرگیراوە ، بەڵام وشەی پیلان بۆ کاری خراپ بەکاردێ ، دەگوترێ : پیلانگێڕیی ، بەڵام پلان دانان ، بۆ چاکە بەکاردێ ، جاری وایە وشەکان بە پیتێك کەمتر یان زیاتر ماناکەیان دەگۆڕێ ، هەڵبەتە لە ڕووی باو (عُرف)ی نێو کۆمەڵگاوە .

---

١) تەوێڵ : واتە : نێوچەوان .

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی بەسەرهاتی ئەو پێنج پێغەمبەرە پایە بەرزەی کرد صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، لەگەڵ گەلەکانیان، ئنجا دێنێ هەندێك لە یاساکانی خۆی ، کە هەم لە ژیانی ئەو پێنج پێغەمبەرەو گەلەکانیان داو ، هەم لە ژیانی غەیری وانیش دا ، هاتوونە دی، ڕوون دەکاتەوە، کە بە ڕاستیی هەرکەسێك بیەوێ باش لە قورئان تێبگات ، دەبێ زۆر چاك سەرنجی بەسەرهاتی پێغەمبەران‌و شێوەی وتووێژیان لەگەڵ گەلەکانیان بدات لە قورئان دا، چونکە پوختەی ئەوە کە دەبێ وەك دەرس‌و پەند وەربگیرێ لەو بەسەرهاتانەدا ، خوای پەروەردگار لەو ئایەتانەدا دەیخاتەڕوو.

ئێستا لەم نۆ (٩) ئایەتەدا کە تەفسیریان دەکەین ، خوای تاك‌و پاك دەیەوێ لە دوو توێی بەسەرهاتی ئەو پێنج پێغەمبەرە پایە بەرزەدا ، پوختەی پەندو ئامۆژگارییەکانمان پێ بفەرموێ.

سەرەتا دەفەرموێ : ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ ﴾، وە بێگومان هیچ پێغەمبەرێکمان لە هیچ شارێك‌و ئاوەدانییەکی قەڕەباڵغدا نەناردوە، مەگەر خەڵکی ئەو شارو ئاوەدانییەمان بە سەختیی‌و ناخۆشیی تاقیکردۆتەوە، بەڵکو، بپاڕێنەوەو بلاڵێنەوەو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، وە زەبوونیی‌و بچووکیی خۆیان بەرانبەر خوای بالادەست پێشان بدەن .

کەواتە : ئەمە یاسایەکی خوای تاك‌و تەنیایە ، کە دەفەرموێ : ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ ... ﴾، چونکە ئەو تەعبیرە ئەوە دەگەیەنێ کە هەمیشەو بەردەوام خوا ﷻ هەر بەو جۆرە مامەڵەی لەگەڵ بەشەردا کردوە، کەواتە : ئەم یاسایە ئەوەنیە تەنیا لە ژیانی پێغەمبەران‌و گەلەکانیاندا هاتبێتە دی‌و ، تازە بڕابێتەوە ، بەڵکو

مەبەست ئەوەیە کە ئەمە یاسایەکی گشتی خوایە لە ژیانی بەشەردا ، کە خوا هەموو خەڵکی تاقی دەکاتەوە بە سەختیی‌و ناڕەحەتیی‌و ، نەخۆشیی‌و ناخۆشیی‌و نەهامەتیی .

ئنجا ئایا بۆچی خوای کاربەجێ ئەو خەڵکە تاقی دەکاتەوەو تووشی گرفتاریی‌و ناخۆشیان دەکات ؟ دەفەرموێ : ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ ﴾، بەڵکو بپاڕێنەوەو بلاڵێنەوەو بگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار.

ئنجا ئایا خوای دادگەر هەر بەوەندە لێیان گەڕاوە کە بە سەختیی‌و ناڕەحەتییان تاقییان بکاتەوە ، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە ؟ دەفەرموێ : ﴿ ثُمَّ بَدَّلۡنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ ﴾، دوایی لە شوێنی خراپە ، چاکەمان بۆ داناون ، واتە : بەنسبەت ئەوەی پێشی کە پێیان خراپ بووە ، ئەگەرنا لەلایەن خوای زاناوە سەختییەکە شتێکی باش دەبوو ، ئەگەر گەڕابانایەوە بۆ لای خوا، بۆ ئیمانداران ئەو تاقیکردنەوەیە دەبووە شتێکی باش، بەڵام ئەوان پێیان خراپ بووە، ئەدی ئەوان چییان پێ باش بووە ؟ خۆشگوزەرانیی‌و دەوڵەمەندیی‌و شادمانیی.

لێرەدا خوای پەروەردگار دوو وشەی بەکارهێناون ، کە بریتین لە : ﴿ ٱلسَّيِّئَةِ / ٱلۡحَسَنَةَ ﴾، دیارە بە پێی تێگەیشتنی ئەو خەڵکە کە فەوتاون، بەکاری هێناون ، ئەوان هەمیشە نەخۆشیی‌و ناخۆشیی‌و ناڕەحەتیی‌و هەژاریی‌و نەدارییان ، پێ خراپ بووە، بەڵام دەوڵەمەندیی‌و هاتو خۆشگوزەرانییان ، پێ چاك بووە ، بۆیە دەفەرموێ : دوایی چاکەمان بۆ لە شوێنی خراپە دانان ، ﴿ حَتَّىٰ عَفَواْ ﴾، هەتا زیادیان کرد، چییان زیادی کرد ؟ ماڵیان زیادی کرد ، نەفسەکانیان زیادی کرد، هەموو شتێکیان زیادی کرد، ﴿ وَّقَالُواْ قَدۡ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ ﴾، وە گوتیان : پێشینانیشمان، باب‌و باپیرانیشمان ناخۆشییان تووش بووەو، خۆشییشیان تووش بووە ، واتە : ئەو حاڵەتە کە پێشی ناڕەحەتییان تووش بوو ، دوایی خۆشییان

تووش بوو : گێڕایانەوە بۆ لای سروشتی ژیان، نەك بۆ لای خوای پەروەردگار، یانی وەك تاقیكردنەوەی خوا حیسابیان بۆ نەكرد، گوتیان: ژیانی بابو باپیرانیشمان هەروا بووە، خۆشیی‌و ناخۆشیی‌و شیرینی‌و تاڵیی ، تێدا بووە .

كەواتە: نە حاڵەتی گرفتاریی ، بوو بەهۆی پەند وەرگرتنیان، وە نە حاڵەتی شادمانیی‌و خۆشیی ، بووە هۆی گەڕانەوەیان، بۆیە خوا دەفەرموێ : ﴿ فَأَخَذْنَاهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾، كتوپڕ گرتمانن‌و سزاماندا، بێئەوەی كە هەست پێبكەن.

ئنجا خوا ﷻ باسی یاسایەكی دیكەی خۆی دەكات، دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ﴾، وە ئەگەر خەڵكی ئاوەدانییەكان بڕوایان هێنابا‌و پارێزیان كردبایە، لە چی ، پارێزیان كردبایە ؟ وە بڕوایان بە چی بهێنابا ؟ هەمیشە لە قورئاندا خوا وشەیەك دێنێ، دوایی ئەوەی وشەكەو سیاقەكە دەلالەتی لەسەر دەكەن ، دەیقرتێنێ، بۆ ئەوەی ڕستەكە زۆر درێژ نەبێتەوە، بۆ وێنە : كە خوای زانا باسی ئیمان دەكات ، بە زۆریی بەس وشەی (إیمان) بە شێوەی (آمِنوا) یان (آمَنوا) یان (یؤمنون) بەكاردێنێ ، كە لە ڕاستیی دا مەبەست پێی بڕواهێنانە بە : خواو فریشتەكانی‌و كتێبەكانی‌و پێغەمبەرانی‌و ڕۆژی دوایی‌و قەدەرو ، هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ : (آمنُوا بِاللّهِ وَمَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرسولِهِ وَاليَوْمِ الآخر وَبِكُلّ مَا يَجِبُ أَنْ يُؤْمَنَ بِهِ) بەڵام لە زۆربەی شوێنەكان دا ئەو ڕستەیە لادەبات‌و ، تەنیا لە چەند شوێنێكی كەم دا دەیهێنێ، بۆ وێنە : لە سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ :

﴿ لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ ﴿١٧٧﴾ ﴾، وە دەفەرموێ :

﴿ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ

وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ ﴾البقـرة، هەروەها لە سـوورەتی (النسـاء)دا دەفــــەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ ﴾، ئــاوا جگـــە لــە چـــەند شـوێنێکی کـەم ، ئەگـەرنا بـە زۆریـی وشـەی ئیمان بـە تەنیـا دێـنـێ .

کەواتــە : مەبەســـت لــەوە کــە فەرموویەتـــی : ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ ﴾، ئەگـەر خەڵکی ئاوەدانییـەکان بڕوایـان هێـنـابایـە، ئەوەیە کە بڕوا بێنن بـە خـواو، بـە فریشتەکانو، بـە کتێبـەکانو، بـە پێغـەمبـەرانو، بـە ڕۆژی دوایـی، وە بـە هـەموو ئـەو شـتانەی کـە پێویسـتە ئیمانیـان پـێ بهێنــرێ ، وە کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱتَّقَوْاْ ﴾، وە ئەگـەر پارێـزیان کردبـایە، پارێزیـان لـە چی کردبایــە ؟ بەگشــتی پارێزیـان کردبایە لەوەی خـوا لە خۆیان تووڕە بکـەن ، خـواش بـە دوو شـتان لـە بـەندە تـووڕە دەبـێ ، کە بریتیــن لــەوە کــە فـەرزەکـانی بچـوێنــێو قەدەغـەکـانی بشـکێنــێ، کـە لـە ڕاسـتییدا جێبـەجێکــردنی ئەرکەکـان، وە خـۆ دوورگــرتن لـە قەدەغەکــان ، هــەموو شــەریعەت دەگـرێتــە خـۆی، چـونکە خــوای بالادەســتو بــە بــەزەیی لـە هــەموو فەرمانەکــاندا فەرموویـەتی : ئـەوە بکـەن ، چونکـە بۆ ئێوە باشــە، وە ئـەوە مەکـەن ، چـونکە بـۆ ئێـوە خراپــە .

ئنجا ئـایا ئەگـەر مرۆڤەکـان ئیمان بێـنـنو ، پـارێز بکـەن ، خـوا چییان بـۆ دەکـات ؟ دەفــەرموێ : ﴿ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بێگومــان ئـەو لامــە (ل) لامی تەئکیدە، واتە: بـە تەئکـید دەروازەی خێرو بێری ئـاسمانو زەویمان بـەسـەردا دەکـردنــەوە، یـان لـە سـەرێو لـە خـوارێ ڕا بـەرەکەتمـان بـەســەردا دەڕشـتن، ئنجـا

بەرەکەتی ئاسمان ئەوە دیارە : تیشکی خۆرە ، بارانە ، بەفرە، تەرزەیە ، هەوایە ، کە بە شێوەیەکی وا هەڵبکات زیانمان پێنەگەیەنێ ، وە هەموو ئەو خێرو بێرانەی کە زانیاریی وردە وردە پەردەیان لەسەر هەڵدەماڵێ .

خێرو بێری زەویش ئەو بەروبوومانەن کە لە زەوی بۆمان پەیدا دەبن ، کەواتە : بەهۆی ئیمان هێنان‌و پارێزکردنەوە (بەلاّم بە مانای ڕاستەقینەی ئیمان‌و تەقوا) هەموو ئەو دەروازانەی ئاسمان‌و زەویمان بۆ دەکرێنەوە .

خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَٰكِن كَذَّبُوا ﴾، بەلاّم بێبڕوبوون لە جیاتی ئیمان‌و تەقوا، پێغەمبەرانیان (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلام) بە درۆ دانا، ﴿ فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾، ئێمەش گرتمان‌و سزامان دان، بەهۆی کردەوەکانی خۆیانەوە، یانی: ئێمە ستەممان لێنەکردن : چییان چاندبوو ، ئەوەیان درووییەوە .

ئنجا خوا دەفەرموێ : ﴿ أَفَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَاتًا وَهُمْ نَائِمُونَ ﴾، ئایا خەڵکی ئاوەدانییەکان، خەڵکی شارو وڵاتەکان ، دڵنیابوون کە سزای ئێمەیان بۆ بێ ، لە کاتێکدا کە خەوتوون ؟ واتە : دڵنیان کە بە شەوێ سزای ئێمەیان بۆ بێ ؟ ﴿ أَوَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴾، یان ئایا خەڵکی ئاوەدانییەکان ، خەڵکی شارو وڵاتەکان دڵنیابوون ، کە سزای ئێمەیان بۆ بێ بە چێشتەنگاو، لە کاتێکدا کە گەمەو یاریی دەکەن ؟ بۆچی دەفەرموێ : گەمەو یاریی دەکەن ؟! ئایا خەڵکی دنیا هەموویان گەمەو یاریی دەکەن ؟ نەخێر، واتە: ژیانی ئەوان وەك گەمەو یاریی وایە، وەك چۆن گەمەو یاریی منداڵان هیچ ئامانجێکی لە پشتەوە نیە : منداڵ خانوولکەیەك دروست دەکات، دوایی هەر بۆخۆشی تێکی دەداو خراپی دەکاتەوە، ژیانی دنیاش ئەگەر تەنیا بریتی بێ لەو خواردن‌و خواردنەوەو هاتن‌و چوونە ، دوایی هیچی دیکەی بەدوادا نەیەت ، وەك گەمەو یاریی منداڵان وایە ، چونکە ژیانی دنیا پێنج‌و دوو ڕۆژێکەو تێدەپەڕێ، ژیانی دنیا ئەگەر پەیوەست نەکرێ بە ئامانجێکەوە ، کە مرۆڤ بۆی بژی ، وەك

خانووچکەو گەمەو یاریی منداڵانە وایە، بۆیە خوا دەفەرموێ: لە کاتێکدا یارییان دەکرد، ﴿ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ﴾ ئەگەرنا ئەو خەڵکە کارو کەسابەتیش دەکەن، کافرو مسوڵمان کەسابەت دەکەنو، ژیانیان هەمووی یاریی نیە، بە چەمکە باوەکەی، بەڵام خوا ژیانەکەیانی هەموو بە یاریی داناوە، ئێمە دەبێ ئاوا لە مانای قورئان تێبگەین، کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ژیانی دنیا گەمەو یارییە، واتە : ئەگەر ژیانی دنیا پەیوەست نەبێ بە خواو دوارۆژو پاداشتو سزاوە ، ئەوە لە ڕاستییدا گەمەو یاریی‌و کات بەسەر بردنە .

دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾، ئایا لە پیلانو نەخشەی خوا (بۆ سزادانیان) ، دڵنیابوون ؟ جگە لە کۆمەڵی زیانباران هیچ کەس لە پیلانو نەخشەی خوا دڵنیا نابێو، پشتێندی لێناکاتەوە ، لێی بێباك نابێ ، پێی وانیە کە دنیا شاری بێ خاوەنەو هەر لەخۆڕا هاتۆتە سەر زەوی، وەك یەکێك لە عەرەبە کافرەکان گوتبووی: (أرحام تدفع و قبورٌ تبلع) منداڵدان دەرداوێنو ، گۆڕیش قووت دەدەنو ، کۆتایی پێ دێ .

پاشان خوا باسی یاسایەکی دیکەی خۆی دەکاتو، دەفەرموێ : ﴿ أَوَلَمۡ يَهۡدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ أَهۡلِهَآ ﴾، ئایا ئەوانەی کە سەر زەمینیان بە میرات گرتوە، لە دوای خەڵکەکەی {واتە: خەڵکێك بوون لەسەر زەوی ، خوا لە نێوی بردوون، بەهۆی خراپەو تاوانو لادانەکانیانەوەو، خەڵکێکی دیکە هاتوون ، ئەو سەر زەمینەیان بە میرات گرتوە} ، فێری نەکردوونو بۆیانی ڕوون نەکردەوەو ، ڕێنمایی نەکردن ؟ ﴿ أَن لَّوۡ نَشَآءُ أَصَبۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡۚ ﴾، {دەرککردنی ئەو ڕاستییە} کە ئەگەر ویستبامان بەهۆی گوناهەکانیانەوە سزامان دەدان ، ﴿ وَنَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴾، وە دڵیانمان مۆر کرد ، کە هیچ نەبیستن .

ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە خوا ﷻ لە ئەنجامی گوناح کردنی ئینساندا ، وای لێدەکات کە دڵی تێنەگات، گوێی نەبیستێ، چاوی هەق نەبینێ، هەڵبەتە دڵو گوێو چاویان ساغە بە ڕواڵەت، بەڵام لە ڕووی مەعنەوییەوە : مرۆڤی لادەر : دڵی پەردەپۆش دەکرێو ، گوێی دەئاخنرێو چاویشی پەردەی دێتە بەر ، واتە: هەق نابیستێو نابینێو دەرك ناکات .

ئنجا لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآئِهَا ﴾، ئا ئەو ئاوەدانییانە ئێمە بەسەرهاتەکانیانت بەسەردا دەخوێنینەوە ، دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە موحەممەد ﷺ، یاخود لە هەر کەسێکە کە قورئان بخوێنێ ﴿ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾، بێگومان پێغەمبەران بە بەڵگە ڕوونو ئاشکرایەکانەوە بۆیان هاتن، وشەی (بیِّنات) یانی : بەڵگە ڕۆشنەکان ، هەموو ئەو بەڵگانە دەگرێتەوە ، کە پێغەمبەران (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلام) هێناویانن بۆ پشت ڕاستکردنەوەی بانگەوازەکەیان، وە بۆ ئیسپاتی ئەوە کە پێغەمبەرو نوێنەری خوان، ﴿ فَمَا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ مِن قَبْلُ ﴾، بەڵام نەدەگونجا بڕوابێنن ، بەوەی کە پێشتر پێی بێبڕوا بوون، واتە: هەر لە سەرەتاوە بڕیاریان دابوو کە بڕوا نەهێنن ، دوایی ئەو هەڵوێستەیان بووە هۆی ئەوەی کە دڵو عەقڵیان حاڵەتێکی نەخۆشیی وەربگرێ ، وە بۆی نەگونجێ کە ئیمان بێنێ ، ﴿ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە ، خوا مۆر بەسەر دڵی کافرانەوە دەنێت ، یانی : دڵیان مۆر دەکات بەهۆی کوفرەکەیانەوە ، بەهۆی خراپەکانیانەوە ، وە ئەو حاڵەتەیان وا دەکات کە دەرکی حەقیقەت نەکەن .

ئێمە زۆر جار وەك مسوڵمان کە تەماشای قورئانو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەکەین، دەبینین : هەرچی باشو پەسندە، فەرمانیان پێکردوە، وە هەرچی خراپو زیانبەخشە ، قەدەغەیان کردوە، کەچی کەسانێك دەڵێن: کوا قورئان چی تێدایە ؟ بۆیە هەڵوێستێکی خراپ وەردەگرن، بەڵام کاتێك ئەم ئایەتانە دەخوێنین ، ئنجا

نهێنیی ئەو هەڵوێستەمان بۆ دەردەکەوێ، من بۆخۆم زۆرجار وتووێژم لەگەڵ کەسانێکدا کردوە کە ئەهلی کوفرو نیفاق بوون ، لە وڵاتی خۆمان و غەیری خۆمان دا ، گوتوومە : ڕاستێتیی ئیسلام ، حەقیقەتێکی زۆر ڕوونە ، ئیسلام دەڵێ : قەتڵ مەکە ، زینا مەکە ، دزیی مەکە ، گەندەڵیی مەکە ، ستەم مەکە ، کە بێگومان هەموو ئەو گوناهانە مایەی عەیبداریی دنیاو قیامەتن، کەواتە : بەرنامەو ڕێبازی خوای پەروەردگار خێرو خۆشیی و بەختەوەریی و ساغ و سەلامەتیی و پاکیی دنیاو قیامەتی تێدایە ، بۆچی وەریناگرن ؟ وەڵام ئەوەیە کە لە ڕاستییدا لە ئەنجامی زۆر گوناح کردندا ، ئینسان وای لێدێ کە ئیرادەی خۆی لەدەست بدات ، بۆیە خوا لە قورئاندا دەفەرموێ : ﴿ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾ غافر، واتە : بەو شێوەیە ئەوانەی نکووڵیی لە ئایەتەکانمان دەکەن ، لادەدرێن . (يُؤْفَكُ) یانی : (يُقْلَب ، يُصْرَف) وەك بڵێی : عەقڵ و ویستی خۆیان لەدەست دابێ ، شەیتان بەملاو لایاندا دەبات .

ئنجا لە کۆتاییدا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ ﴾، وە زۆربەیانمان بە خاوەن بەڵێن نەبینی ، خاوەن بەڵێن و پەیمان نەبوون، ﴿ وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَـٰسِقِينَ ﴾، ئەم (إنْ)ە ، بۆ تەئكیدە ، بە بەڵگەی هەبوونی لام (ل) لەسەر وشەی (لَفَـٰسِقِينَ) واتە : بە دڵنیاییەوە زۆربەیانمان لاڕێ بینی ، ئنجا ئایا مەبەست لەو پەیمانە چییە ؟ دەگونجێ مەبەست پێی پەیمانی فیطریی بێ ، کە خوای دادگەر هەموو مرۆڤەکانی وا دروست کردوە ، کە بەدیهێنەرو پەروەردگاری خۆیان بناسن، وەك بڵێی پەیمانی لێوەرگرتبن، هەندێکیش دەڵێن : مەبەست پێی ئەو پەیمانەیە کە کاتی خۆی خوای پەروەردگار لە وەچەی ئادەم ، کە لە پشتی ئادەم دا بوون ، وەریگرتوە ، وەك لە هەندێك ڕیوایەتان دا هاتوە ، بەڵام مانای یەکەم ڕاستە .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَوا۟ وَّقَالُوا۟ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾، پێشتریش ئاماژەیەکمان پێداو، لێرەش تیشکی زیاتری دەخەینە سەر: خوای کاربەجێ لێرەدا یەکێك لە یاساکانی خۆی لە ژیانی بەشەردا دەخاتە ڕوو، ئەو یاسایە بریتیە لە چی؟ پوختەی ئەو یاسایەی خوا ئەوەیە کە: پاش ڕەوانەکردنی هەر کام لە پێغەمبەران بۆ کۆمەڵگایەك، وە لە ئەنجامی بڕوا نەهێنانیان دا بەو پێغەمبەرە، خوا گرفتاری کردوون بە نەداریی‌و نەخۆشیی‌و ناخۆشیی، بۆچی؟! ڕقی لێ هەڵساون؟!

نەخێر، خوای بە بەزەیی بەندەکانی خۆی خۆشدەوێ، وە بەندەکانی بۆ ئەوە دروست نەکردوە، لە دنیادا تووشی گرفتاریی‌و، لە دواڕۆژدا تووشی دۆزەخیان بکات، مەگەر بۆخۆیان بیانەوێ بچنە دۆزەخ، ئەگەرنا خوا بەندەکانی خۆی خۆشدەوێ‌و بەڕەحم‌و بەزەییە لەگەڵیان، بەڵام بۆیە تووشی گرفتاریی‌و ناخۆشیی کردوون، وەك بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ﴾، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای خواو، لێی بپاڕێنەوەو، وە بۆی ملکەچ بن، وە واز لە خۆ بە زلگریی بێنن، لە بەرانبەر پێغەمبەرانی خواو پەیامی خوادا، کە پێغەمبەران (عَلَيهِمِ الصَّلَاةُ وَالسَّلام) پەیامی خوایان بۆ هێناون، تاکو ژیانێکی مرۆڤانەی ڕێك‌و ڕاست‌و پاك‌و چاك بگوزەرێنن، کەواتە: خوای کاربەجێ بۆیە تووشی ناڕەحەتیی کردوون، وەك دەگوترێ: ئەوە زللەی میهرەبانییە، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە، وەك

چۆن جاری وایە مرۆڤ گوێی منداڵەکەی خۆی ڕادەکێشێ، زللەیەکی لێدەدا، تێی دەخوڕێ و لێی تووڕە دەبێ ، خۆ ڕقی لێی هەڵناستێ بۆی دڵسۆزە، بەڵام دەیەوێ جارێکی دیکە ئەو هەڵەیە نەکاتو واز لەو ڕەفتارە خراپەی بێنێ .

ئنجا کە ئەوە سوودی نەبووە ، خوا گرفتاریی و ناڕەحەتییەکەی بۆ گۆڕیون بە خۆشیی و شادمانیی و چاکەو نیعمەت، بەڵکو ئەگەر ئەهلی صەبر نەبوون، ئەهلی شوکر بن، ئەگەر بە زللەی میهرەبانیی بێدار نەبوونەتەوە، ئەمجارە بە چاکەو نیعمەتەکانی خوا بێدار ببنەوەو ، بزانن کە خوا ئەو هەموو چاکانەی لەگەڵدا کردوون، وە سەرەنجام لە هەموو ڕوویەکەوە، بەرە زیادیی چوون، خوای بەخشەر بەرەکەتی بەسەردا ڕشتوونو، نوقمی نازو نیعمەتی خۆی کردوون، بەڵام دیسان بەوەش هەر نەگەڕاونەوە، وە ئەم حاڵەتانەیان بە شتێکی ئاسایی زانیوە، گوتوویانە: ئەوە هەروا بووە، ژیان بە گشتی وایە، بابو باپیرانیشمان هەروا بوون ! ئنجا سەرەنجام کەسێك کە بە هیچ نەگەڕێتەوە، نە بەخۆشییان، نە بە ناخۆشییان، پێشتریش یاسای خوا هەروا بووە لەسەر زەوی، کە هەر کۆمەڵگایەك نەگەڕابێتەوە ، خوا ﷻ تۆوی بڕیونو دوابڕاوی کردوونو قیڕەبڕی کردوونو، سەر زەوی لێیان پاك کردۆتەوە ، بۆ ئەوەی خەڵکێکی دی بێنێ و پێغەمبەرێکی دیکەیان بۆ بنێرێ و ، ئەزموونێکی دیکە دەست پێبکەن، بەڵکو ئەوان باش بوون .

پێشێ یاسای پەروەردگار وابووە، بەڵام دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، ئەو یاسایەی گۆڕیوە، بەوە کە خەڵکەکە لەبەین نابات، چونکە کاتی خۆی کە پێغەمبەرێك بۆ ئاوەدانییەك، ناوچەیەك، هۆزێك هاتوە، ئنجا کە خوا لە بەینی بردوون، خەڵکێکی دیکەی هێناونە شوێن، بەڵام لە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ هەموو بەشەر ئۆممەتی موحەممەدە، ئنجا چ ئەو ئۆممەتە وەڵامیان دابێتەوە، یان وەڵامیان نەدابێتەوە ، بۆیە ئەگەر خوای کاربەجێ هەموو ئەو بەشەرەی کە پێغەمبەری ﷺ خاتەمی بۆ ناردوون ، لە بەینی بردبان، بەشەر کۆتایی پێدەهات، چونکە پێغەمبەرانی دیکە جگە لە نووح ﵇ هیچ کامیان بۆ هەموو بەشەر نەنێردراون، هەرکامێکیان بۆ هۆزو تیرەو گەلێك نێردراون، بەڵام نووح ﵇ دیارە بۆ هەموو بەشەری سەردەمی

خۆی نێردراوە، چونکە هەر ئەوەندە مرۆڤە هەبوون، بۆیە خوای پەروەردگار کاتێك ئەوانەی بێبڕوا بوون لەنێوبرد ، وە نووحو ئەوانەی شوێنی کەوتبوونو لەگەڵیدا سواری کەشتییەکە بووبوون ، هێشتنیەوە، دووبارە لەوانەوە وەچەی بەشەر دەستی پێکردەوە، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾﴾ الصافات، واتە: تەنیا وەچەی ئەومان هێشتەوە ، (لەسەر زەوی) .

بەڵام لە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، خوا ﷻ ئەو یاسایەی گۆڕیوە کە هەموو بەشەر لە بەین بەرێ، چونکە ئەو کاتە هەموو مرۆڤ قیرەبڕ دەبوونو کۆتاییان پێدەهات، بەڵکو خوای کارزان هەر تووشی خۆشیو ناخۆشییان دەکات، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە، تاکو ڕۆژی قیامەت، ئنجا ئەگەر خێریان پێوە نەما، کە ڕۆژێك دا دێ کەس نامێنێ خێری پێوە مابێ لەسەر زەوی ، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، فەرموویەتی : ﴿لاَ تَقُومُ السَاعَةَ إِلاَّ عَلَى شِرَارِ الْخَلْقِ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٩٤٩) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ}، واتە: تێکچوونی ئەم دنیایە نایەت، مەگەر لەسەر خراپترینی خەڵك .

وە لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ﴿لاَ تَقُومُ السَاعَةُ حَتَّى لاَ يُقَالَ فِي الأَرْضِ : اللّهُ ، اللّهُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٠٦٢)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (١٢٤٧). وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٧٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢٠٧)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٨٤٩)، وَالبَزَّار برقم: (٦٩٨٠) وَالبَيْهَقِيُّ في (الشعب الإيمان) برقم: (٥٢٤)، واتە: تێکچوونی دنیا نایەت ، هەتا ئەو کاتەی لەسەر زەوی ناگوترێ : (اللّهُ ، اللّهُ).

کەواتە: دنیا بەسەر خراپترین دروستکراوانی خوادا کاول دەبێ ، کە کەسیان تێدا نامێنێ بڵێ : (اللّه) کەس خوای لەبیر نامێنێ، ئەو کاتە مانای وایە کەسی وا نەماوە خێری پێوەمابێو ، ئەم ژیانە دنیاییەی کە لەسەر ئەم زەوییەیە، یەکجاریی کۆتایی پێ دێ .

ئنجا کاتێك ئەم کۆمەڵگایانە وا بوون، سەرەنجام خوا سزایەکی کتوپڕی بۆ ناردوون، بێئەوەی بۆ خۆشیان هەستی پێ بکەن .

وە دەربارەی مردنی کتوپڕ ، ئەم فەرموودەیە گێڕدراوەتەوە : ﴿مَوْتِ الْفَجْأَةِ رَاحَةٌ لِلْمُؤْمِنِ وَأَخْذَةُ أَسَفٍ لِفَاجِرٍ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٢٥٠٨٦)، وَالبَيْهَقِيُّ برقم : (٦٣٦٤)، وَضَعَّفَهُ كُل مِنَ الألباني والأنؤوط، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ وَاهٍ}، واتە : مردنی کتوپڕ بۆ بڕوادار ئاسوودەییەو بۆ خراپەکار مایەی خەفەتبارییە، چونکە فریای گەڕانەوە (توبة) ناکەوێ، بەڵام ئیماندار پەرێزی پاکەو بێباکە .

ئنجا ئەو یاسایەی خوا لێرەدا باسی کرد ، لە تەفسیری سوورەتی ئەنعام دا ، کە بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرەیە ، بە تەفصیلێ باسمان کردوە ، لەوێ خوا فەرموویەتی : ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ فَأَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾، واتە: وە بێگومان لە پێش تۆشدا پێغەمبەرانێکمان ڕەوان کرد ، بۆ لای چەند کۆمەڵگایەك لە پێش تۆدا ، ئێمە بە نەداریی‌و سەختیی‌و ناخۆشیی‌و نارەحەتیی گرتمانن، سزامان دان، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە، وەك زللەی میهرەبانیی ، خوا سزای داون بۆ ئەوەی بۆ لای خوا بگەڕێنەوەو لە خوا بپاڕێنەوە ، ﴿ فَلَوۡلَآ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَٰكِن قَسَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾، ئنجا کاتێك سزای ئێمەیان بۆ دەهات، دەبوایە (گەڕابانەوە بۆ لای خوا)، لێی پاڕابانەوە، بەڵام دڵیان ڕەق بوو، وە شەیتان ئەو کردەوە خراپانەی کە دەیانکردن ، بۆی ڕازاندنەوە ﴿ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾، ئنجا کاتێك ئەوەی پێی ئامۆژگاریی کرابوون (کە وەك گەلانی پێشوو نەبن) فەرمۆشیان کردو لە بیریان کرد ، دەرگاکانی هەموو خێرو خۆشیی‌و نیعمەتێکیان بەسەرداکردنەوە (بۆ ئەوەی شوکرانە بژێربن)، بەڵام کاتێك (لەجیاتی ئەوەی کە سوپاسگوزاربن‌و لە خوای بزانن)، پێی لە خۆبایی

بوون، کتوپڕ گرتمانن‌و سزاماندان، ئەوانیش نائومێد بوون‌و دەستیان لە هەموو پچکان بڕاو هاواریان بە هیچ کەس نەگەیشت، ﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾، واتە: ئەو کۆمەڵەی کە ستەمیان دەکرد ، دوابڕاو بوون، (تاقیان لێبڕاو قیرەبڕ کران)، وە ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان .

لێرەدا خوا ﷻ ستایشی خۆی دەکات لەسەر ئەوە کە خەڵکی خراپی سزای داوەو لای بردوون‌و سەر زەوی لێ پاك کردوونەتەوە، کەواتە: لابردنی خەڵکی خراپەکارو ستەمکار لە زەویدا : چاکەو نیعمەتێکی خوایە، لەگەڵ بەشەردا دەیکات، چونکە ئەگەر بێت‌و خراپەکاران لە زەویدا هەر بمێنن، ژیان زیاتر تێکدەچێ ، بۆیەش تەماشا دەکەین هەموو ئەو وڵاتانەی گەیشتوونەتە لووتکە لە ستەم‌و خراپەکاریی‌و داڕووخانی ڕەوشتدا ، خوای دادگەر کۆتایی پێهێناون، تاکو لە شوێنێکی دیکە، قەوارەیەکی دیکەو ئەزموونێکی دیکە دەست پێ بکاتەوە، وە ئەگەر بێت‌و ئەوانەی گەندەڵ‌و پووچەڵ‌و پۆخڵن ، لێیان بگەڕێ ، ژیانی بەشەر هەمووی خراپ‌و گەندەڵ‌و پووچەڵ دەکەن، کەواتە: ئەوە نیعمەتێکە خوای بە بەزەیی لەگەڵ مرۆڤایەتیی دا دەیکات، کە سەر زەمین لەو جۆرە کەسانە پاك دەکاتەوە .

**مەسەلەی دووەم**: کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾، ئەم ئایەتەش یەکێکە لە یاسایەکانی خوای کاربەجێ لە ژیانی مرۆڤایەتیی دا، کە لە زۆر شوێنی قورئاندا بە تەعبیری جۆراوجۆر هاتوە، دیارە ئەگەر ڕاستییەك یەکجار هاتبێ لە شوێنێکی قورئان دا ، ئەوە بە ئەندازەی ئەو جارە مرۆڤایەتیی پێویستی پێیەتی‌و گرنگە، وە ئەگەر دووجار بێ ، بە ئەندازەی ئەو دووجارە، گرنگەو جێی بایەخە ، وە ئەگەر لە سەد شوێن دا هاتبێ ، ئەوە بە ئەندازەی ئەو سەد شوێنە پێگەو بایەخی هەیە، وە ئەو کاتە پێویستە

زیاتر گرنگیی پێبدەین‌و لێی بکۆڵینەوەو لێی وردبینەوە، لێرەدا خوا دەفەرموێ : ئەگەر خەڵکی ئاوەدانییەکان خاوەنی ئیمان‌و تەقوابن، دەروازەی خێرو خۆشییەکانی سەرو خواریان لێدەکەینەوە ، بەڵام بێبڕوابوون ، بۆیە سزامان دان ، بەهۆی کردەوەکانیانەوە .

ئنجا وەك گوتم ئەم ڕاستییە لە شوێنی دیکەشدا هاتوە ، بۆ وێنە :

١/ لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَـٰهُمْ جَنَّـٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُوا۟ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم ۚ مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ ﴿٦٦﴾﴾، واتە: وە ئەگەر هاتباو خاوەن کتێبەکان ئیمانیان هێنابایەو پارێزیان کردبایە، بە مسۆگەریی خراپەکانیانمان لێیان دەسڕیەوەو دەمانخستنە باغە پڕ نازو نیعمەتەکانەوە . وە ئەگەر ئەوان تەوڕات‌و ئینجیل‌و ئەوەی کە لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆیان دابەزێنراوە، جێبەجێیان کردبایەو، پێیانەوە پابەند بوونایە ، بە دڵنیایی یەوە لە ڕۆزیی‌و بەرەکەتی سەروویان‌و ژێر پێیان دەیانخوارد، کۆمەڵێکیان ڕێك‌و ڕاستن‌و ، زۆربەشیان خراپترین ڕەفتار دەکەن .

لێرەدا خوای پەروەردگار ئەم یاسایە تایبەت دەکات بە خاوەن کتێبەکانەوە، ئەوانەی کتێبی پێداون، واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان‌و ئەوانەی دیکەش .

٢/ وە لە سووڕەتی (هود)دا کاتێك پێغەمبەر هوود ﵇ بە گەلەکەی خۆی (واتە : گەلی عاد) دەفەرموێ : ﴿وَيَـٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٥٢﴾﴾، واتە: ئەی گەلەکەم ! داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان

بکەن، پاشان بۆ لای بگەڕێنەوە، (واتە: پێشێ بە قسە بڵێن : داوای لێبوردن لە خوا دەکەین (أَسْتَغْفِرُ الله) دوایی بە کردەوە بۆ لای خوا بگەڕێنەوە ، ئنجا ئایا خوا چیتان بۆ دەکات ؟) ئاسمانتان بە ئاوی خورزەم بەسەردا دەڕژێنێ ، (یانی: لە ئاسمانەوە ئاوی زۆرتان بۆ دەبارێنێ لە شێوەی بارانو تەرزەو بەفردا) وە هێزتان بۆ زیاد دەکات ، لە ڕووی ماددییو مەعنەوییەوە، وە تاوانبارانە ، پشت لە ئایینو بەرنامەی خوا مەکەن .

٣/ هەروەها لە سووڕەتی (نوح)دا، پێغەمبەر نووح ﵇، دوای نۆسەدو پەنجا ساڵ، ڕاپۆرتی خۆی بۆ خوا دەخوێنێتەوە، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾﴾العنكبوت، هەڵبەتە نووح کە بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە، بێگومان خوای پەنهان زان هەموو شتێکی بینیوەو بیستوە، بۆئەوەی ئەوانەی دوای نووح دێن، بزانن نووح ﵇ چۆن خەباتی کردوە ؟ چەندە خۆی ماندووکردوە بەو خەڵکەوە ؟ بەڵام ئەوان هەر کەللە ڕەقو بێبڕوا بوون، دەفەرموێ: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾﴾نوح ، واتە : (نووح ﵇ دەڵێ) گوتم : داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، بێگومان ئەو زۆر لێبوردەیە، ئاسمانتان بە ئاوی خورزەم بەسەردا دەبارێنێ ، (واتە : لە سەریوە ئاوێکی بە لووزەوو بە خورزەم لە شێوەی بارانو بەفرو تەرزەدا بەسەرتاندا دەڕێژێ) وە لە ڕووی سەروەتو سامانو وەچەوە بۆتان زیاد دەکات ، وە باغو بێستانتان بۆ زیاد دەکات ، وە ڕووبارو جۆگەو جۆبارتان بۆ زۆر دەکات .

کەواتە : ئەگەر بەندەکان ڕوو لە خوابن ، ئەو سروشتو دنیایەی کە لەبەردەستی خوادایە، بۆ ئینسان دەستەمۆ دەبێو باشتر بە دەم ئینسانەوە دێو، لەگەڵی تەبا دەبێو خێروبێری خۆی زیاتر دەخەنە بەردەستی ئینسان، هەروەها بە

پێچەوانەوەش هەر ڕاستە : وەك خـوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾الأعراف ، هەروەها لە سوورەتی (الروم)یش دەفەرموێ :

﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: تێکچوونو خراپەکاریی ، وشکانیی‌و دەریای گرتەوە، بەهۆی ئەوەوە کە دەستی خەڵك ئەنجامی دابوو، (ئنجا ئایا بۆچی خوا ئەو یاسایەی داناوە کە کاتێك خەڵك گوناهیان کرد : دەرەنجامە شوومەکەی وشکانیی‌و دەریاش بگرێتەوە ؟ دەفەرموێ :) بۆئەوەی سزای هەندێك لە خراپەکانیان پێ بچێژین ، وە بەڵکو بگەڕێنەوە .

ئێستا زانایانی گەردوونناس دەڵێن: چینی ئۆزۆن کونی تێبووە ، لە ئەنجامی ئەو هەمووە دووکەڵو غازەی کارگەکان دا، بەتایبەتی کارگەی چەك دروستکردن ، کە دووکەڵەکەی زۆر زیانبەخشە و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن‌و مادده زیانبەخشەکان دەردەکات ، کە دەبنە هۆی تێکدانی دەریاو هەوا ، کە لە ئەنجام دا زۆر زیندەوەر لە دەریاکاندا دەمرن ، وە تیشکی زیانبەخش لە ئەنجامی کون بوونی ئەو بەرگە هەوایەدا کە دەوری زەوی داوە ، بەتایبەت چینی ئۆزۆن ، تیشکی زیانبەخش دێتە نێو مەجالی زەوییەوەو، سەرەنجام کاریگەریی خراپی دەبێ بۆ سەر مرۆڤ و ژیاندارو ئاژەڵو دەریاو وشکانیی ، ئنجا ئایا بۆچی خوای کارزان وادەکات ؟ دەفەرموێ : بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای خوای بەخشندە !

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە وەك گوتم : ئەم بوونەوەرە پەیوەستە بە ژیانی بەشەرەوە، بۆیە ئەگەر مرۆڤ بۆ خوا صوڵحاوبێ‌و گونجاوبێ، ئەم بوونەوەرەش لەگەڵیدا تەباو گونجاو دەبێ، وە بە پێچەوانەوەش : بە ئەندازەی ئەوە کە مرۆڤ بێ فەرمانیی خوا دەکات، سروشتیش لێی هەڵدەگەڕێتەوەو ، لەگەڵی ناتەباو نەگونجاو دەبێ‌و زیانی لێدەدات .

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾، لێرەدا خوای زاناو کاربەجێ سێ پرسیاری نکوولّیی لێکەرانە دەکات ، واتە: پرسیارەکان ئاسایی نین، چونکە پرسیاری ئاسایی ، پێویستی بە وەڵامە ، بەڵام پرسیاری نکوولّیی لێکەرانە ، پێویستی بە وەڵام نیە، چونکە وەڵامەکەی لەنێوخۆدایە ، وەك ئەوەی من دەفتەرێکم لە دەست دا بێ ، بڵێم : ئەمە دەفتەر نیە ؟ تۆش بڵێی : با، کەواتە : لەم سێ پرسیارەدا خوای بەرزو مەزن چاوەڕێی وەڵام ناکات :

١) دەفەرموێ : ئایا خەڵکی ئاوەدانییو شارەکان دڵنیان کە سزای ئێمەیان بۆ بێ لە کاتێکدا کە خەوتوون ؟ ئایا دڵنیان ؟ واتە : نەدەبوو دڵنیابن ، خوای کاربەجێ چاوەڕێ ناکات، ئەوان بڵێن : بەڵێ دڵنیاین، یان نەخێر دڵنیانین، کەواتە: خوای باڵادەست نکوولّیی لەوە دەکات ، کە ئەوان دڵنیانو پشتێنیان کردۆتەوە، چونکە دنیا شاری بێ خاوەن نیە .

٢) پاشان دەفەرموێ: ﴿ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾الأعراف، واتە: یان ئایا خەڵکی ئاوەدانییەکان دڵنیان کە بەڵای ئێمەیان بۆ بێ ، لە کاتێکدا کە ئەوان سەرگەرمی گەمەو یارییـن ؟ دیسان ئەوەش پرسیارێکی نکوولّیی لێکەرانەیە، واتە: نەدەبوو دڵنیابنو ئاوا بێباكو بێمنەت بن .

٣) پاشان دەفەرموێ : ﴿ أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾، ئایا لە نەخشەو پلانی خوا بێباکنو لێی دڵنیان ، {کە خوا نەخشەیەکی بۆ داناونو سزایان دەدات} ، هیچ کەس لە نەخشەی سزادانی خوا دڵنیاو بێ منەت نابێ ، مەگەر کۆمەڵێکی زەرەرمەند.

هەڵبەتە پێشتریش باسمان کرد : خوای بەرزو مەزن ئەم پرسیارانە ئاڕاستەی بەشەران دەکاتو، پێیان دەفەرموێ : ئەوانەی پێشی وا بوون : بێباكو

دڵنیابوون ، بۆیە خوای دادگەر هەیانبووە بە شەوێ بەڵای بۆ ناردوون ، وە هەیانبووە بە ڕۆژێ بەڵای بۆ ناردوون، ئەوانە کەسانێك بوون وایانزانیوە خوا لێیان گەڕاوە : چی دەکەن، بیکەن ! دنیا شاری بێ خاوەنە، بەڵام بێگومان دنیا شاری بێ خاوەن نیە، خوا ئاگای لە هەموو دروستکراوەکانی خۆی هەیە، وەك دەفەرموێ : ﴿إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾﴾طـه، واتە: من لەگەڵتانم، دەبیستمو دەبینم، هەروەها خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾﴾المؤمنون، واتە: وە بێگومان لە سەرووی ئێوەوە ، حەوت چین ئاسمانمان دروست کردوون، وە ئێمە لە دروستکراوەکانی خۆمان بێئاگانین .

کەواتە: ئەگەر مرۆڤ هەست بکات ، خوا چاوی لێیەو بەسەری ڕادەگاو ئاگای لێیە، ئەگەر لابدات سزای دەدات، بێگومان ئەو کاتە زۆر بە هۆشیارییو وریایی مامەڵە دەکات، ئنجا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە هاتوونو کتێبەکانی خوایان هێناون ، بۆ ئەوە بووە کە مرۆڤ بە هۆشیارییو وریایی بژیەت، نەك بێ منەتانەو بێ باکانە، چونکە خوا ئێمەی لەسەر ئەم زەمینە داناوە بەوشێوەیە بژین ، کە خوا پێی خۆشە، وە ژیانێکی شایستەی مرۆڤ بژین، ژیانێکی پاكو چاك بەڕێ بکەین، بۆئەوەی هەم لەم دنیایەدا بەختەوەر بین، هەم سەرەنجامەکەی کە دواڕۆژە ، سەرفراز بین .

<u>**مەسەلەی چوارەم**</u> : کە دەفەرموێ : ﴿ أَوَلَمۡ يَهۡدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ أَهۡلِهَآ أَن لَّوۡ نَشَآءُ أَصَبۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡۚ وَنَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴾، زانایانو توێژەرەوانی قورئان دەڵێن : ( أَوَلَمۡ يَهۡدِ ) یانی: (أَوَلَم يَتَوَضّح لَهُم) ئایا بۆیان ڕوون نەبۆتەوە، ئنجا ئایا بۆچی خوا وشەی (یهدي) بەکارهێناوە ؟ لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەك هەیە دەڵێ : (ضُمِّنَ يَهْدِي : مَعْنَى يَتَبَيّن)، جاری وایە خوای کارزان وشەیەك بەکاردێنێ، ئەو وشەیە وێڕای

مانایەکەی خۆی مانایەکی دیکەش دەگەیەنێو دەگرێتە خۆی، ئنجا لە جیاتی ئەوەی دوو ڕستە بفەرموێ، یەك ڕستە دەفەرموێ، ئێستا لێرەدا کە دەفەرموێ :

﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ الْأَرْضَ مِنْ بَعْدِ أَهْلِهَا ﴾، واتە: ئایا ژیانی میللەتانی پێشوو، بەسەرهاتی وان، ڕێنمایی نەکردنو بۆی ڕوون نەکردنەوە ؟ بۆ کێ ؟ بۆ ئەوانەی کە سەرزەمین بە میرات دەگرن، دوای ئەوە کە خەڵکەکە فەوتاوە، دەبوو بۆیان ڕوون بووبایەوەو حاڵی بووبان، کە هەرچی گوناهو تاوان بکاتو بەردەوام بێ، دەگونجێ کە دڵی مۆر بکەین، دوایی وای لێبکەین کە هیچ شتێك نەبیستێو نەزانێ .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ أَنْ لَوْ نَشَاءُ أَصَبْنَاهُمْ بِذُنُوبِهِمْ ۚ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴾، لێرەدا ئەم تەعبیرە نهێنییەکی زۆر گەورەمان بۆ دەردەخات لە ژیانی بەشەردا، ئەویش ئەوەیە کە لە ئەنجامی گوناهدا ، ئینسان گۆڕان بەسەر هەموو هەستەوەرەکانیدا دێ، گۆڕان بەسەر دیوی مەعنەویی و ڕواڵەتییدا دێ، واتە : گوناح زیان بە دەرو دەروونی مرۆڤ دەگەیەنێ، با تەماشای قورئان بکەین :

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأحقاف)دا باسی ئەم ڕاستییە دەکات کە چۆن ئەو هێزانەی بە مرۆڤی داون ، وەك چاوو گوێو دڵو ... هتد ، لە ئەنجامی گوناح کردن دا ، لەکاردەکەون ، دەفەرموێ : ﴿ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُمْ مِنْ شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِمْ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە: ئێمە بیستنو بینینو عەقڵو دڵمان پێدابوون، بەڵام نە بیستنیان، نە چاوەکانیان، نەعەقڵەکانیان هیچ سوودێکی پێنەگەیاندن، (لەبەرچی ؟ دەفەرموێ :) چونکە نکووڵییان دەکرد لە ئایەتەکانی خوا، بێبڕوا بوون بە ئایەتەکانی خوا، بۆیە ئەم بێبڕواییەیان کاریگەریی خستە سەر هەستەوەرەکانیان : کە نە گوێیان چاك

ببیستێ ، نە چاوەکانیان شت ببینن ، نە عەقڵیان دەرکی حیکمەتەکان بکات ، بە ڕواڵەت شت هەست پێ دەکەن ، بەڵام لە دیوی پەنهانی شتەکان حاڵی نابن.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ ، دەربارەی شوێنەواری چاکەو خراپە کردن، گوتوویەتی : ﴿إِنَّ لِلْحَسَنَةِ لَنُورًا فِي الْقَلْبِ، وَضِيَاءً فِي الْوَجْهِ، وَقُوَّةً فِي الْبَدَنِ، وَسَعَةً فِي الرِّزْقِ، وَمَحَبَةً فِي قُلُوبِ الْخَلْقِ، وَإِنَّ لِلسَّيِّئَةِ لَظُلْمَةً فِي الْقَلْبِ، وَسواداً فِي الْوَجْهِ، وَوَهَنًا فِي الْبَدَنِ، وَضِيقًا فِي الرِّزْقِ، وبغضة فِي قُلُوبِ الْخَلْقِ﴾[1] واتە: بێگومان چاکە : درەوشاویی دەدا بە ڕووی ئینسان، وە ڕووناکیی دەخاتە نێو دڵی، وە هێز دەخات جەستەی، وە ڕۆزیی زیاد دەکات ، وە خۆشەویستیی دەخاتە نێو دڵی خەڵكو خەڵك خۆشیان دەوێ ، وە بە پێچەوانەوە : خراپە ڕووخسارو دەموچاوی ئینسان لێڵو تڵخ دەکات ، وە دڵی تاریك دەکات، وە جەستەی بێهێز دەکات (ئەو شتانەی خوا قەدەغەی کردوون بەکاریان دێنێ ، نەخۆش دەبێ) ، وە ڕۆزیی لێوە تەنگ دەبێ ، وە لەلایەن خەڵك کەسێکی بێزراو دەبێو خۆشیان ناوێ ، (بەتایبەتی ئەهلی ئیمان، کە جاری وایە کەسی نامسوڵمانیش مسوڵمانێکی خۆشدەوێ ، ئەمەش یاسایەکی خوای پەروەردگارە) .

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴾، خوای زاناو توانا چوار وشەی بەکارهێناون ، بۆ تەعبیرکردن لەو حاڵەتەی کە تووشی کەسی خراپەکار دەبێ، بە چوار قۆناغ کە بریتین لە: (مَرَض، رَيْن، خَتم، طَبع) .

## چوار قۆناغ بۆ لەکارکەوتنی عەقڵو دڵو هەستەوەرکانی مرۆڤ

١/ بۆ حاڵەتی یەکەم دەفەرموێ : ﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ۝١٠ ﴾البقـرة، واتە: ئەوانە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، کەواتە: سەرەتا لە ئەنجامی کوفرو خراپەکردندا ، دڵی مرۆڤ نەخۆش دەبێ، وەك دەڵێ : ڤایرۆسێ یان میکرۆبێك دەچێتە نێو دڵی .

---

١) مدارج السالكين: ج١، ص٤٢٤.

٢/ قۆناغــی دووەم : دوایــی دەگــۆڕێ بــۆ حــاڵەتی (رَيْـن) واتــە : ژەنــگ ، خــوا ﷻ فەرموویەتـــی : ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المطففيـــــن، ئنجـا وەك دوایی لـە فەرموودەیەكـدا باسـی دەكـەین ، دڵـی ئینسـان لـە ئەنجـامی گوناهـكردنـدا ژەنگ دێـنـێ .

٣/ قۆناغی سـێیـەم : ئنجـا دەگـۆڕێ بـۆ حاڵەتی (خـتم) مۆركـردن ، وەك خـوا ﷻ فەرموویەتـی : ﴿ خَتَمَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ... ﴿٧﴾ ﴾، البقـرة .

٤/ قۆنـاغـی چوارەم : پاشـان دەگۆڕێ بۆ قۆناغی (طبـع) كـە ئەوكـاتە بـە یەكجـاریی كۆتـایی پــێ دێو ئـەو دڵە وای لــێ دێ كە تروسكـایی ئیمـانو هیدایـەت ناچێتـە نێـــــوی، وەك خــــوا ﷻ فەرموویەتـــــی : ﴿... كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الْكَافِرِينَ ﴿١٠١﴾ ﴾ الأعراف ، بۆیە پێتان سـەیر نەبـێ كـە جاری وایـە تـۆ زۆر بـە دڵســۆزیی‌و خەمخــۆرانە ئـامۆژگـاریــی كەسـێك دەكـەی، بــەڵام بــەو گــوێیەیدا دەچێتــە ژووری ، بــە گـوێیەكـەی دیكــەدا دەچێتــە دەرێ، یـان وەك بایـە بــەلای گوێیـدا دێ، بۆچـی ؟ چـونكەی دڵەكـەی (خـتم) یـان، (طبـع) بـووە، وە جـاری واش هـەیە قسـە بۆ كەسێك دەكـەی بـە دەنگـتەوە دێ، چـونكە دڵـەكەی بـەس نـەخۆش بووە، یـان ژەنگـاوی بووە، بـەڵام بـەتـەواویی دانەخراوەو، مەجـالـێكـی تێدا ماوە، جا ئـەوەی دڵـی (خـتـم) یــان (طبـع) بـووە، زۆر بــە زەحمـەت ئـەو (خـتم) و (طبـع)ە دەشـكـێ، بۆیــە خــوای دادگــەر لــە ســەرەتای ســوورەتی (البقـرة)دا دەفـەرموێ :

﴿ خَتَمَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰ أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٧﴾ ﴾، واتە : خـوا مـۆری بەســەر دڵەوە نـاون ، كـە بێـگومـان مەبەسـت تەنیــا هــەندێك لەوانــەیــە كــە بێبــڕوان ، چونكــە جــاری وا هــەیە كەســێك بێبـڕواشـە، بـەڵام بێبـڕواییەكـەی مەجالێكـی تێدا ماوە ، بۆچی ؟ چـونكە ئەوەنیـە كە هـەقی كەوتبێتـە بـەرچـاوو نكوولـیی لـێكـردبـێ ، بـەڵكـو بـەهـۆی نـەزانیی‌و

نەفامیـــی‌یـەوە، بـەرانبــەر بــە هــەق هەڵوێستێکــی خراپــی هەیـە، ئـەو جـۆرە کەسـە ئومێدی خێـری زیـاتری لـێ‌دەکـرێ ، لـەو جـۆرە بێبـڕوایانـەی هـەقیان بـۆ ڕوون بۆتــەوەو نکووڵیی لـێدەکـەن .

**مەسـەلەی پێنـجەم** : کە دەفەرمـوێ : ﴿ تِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآئِهَاۚ وَلَقَدۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ مِن قَبۡلُۚ ﴾،

لەبەردەم ئەم ئایەتەدا چوار هەڵوەستە دەکەین :

**هەڵوەســـتەی یەکــەم** : هەڵبەتــە مانـای ڕواڵـەتی بێــژە (لـفظ)ی (ٱلۡقُرَىٰ) لـە ئایەتــەکەدا هــەموو ئـاوەدانیی‌و شـارەکـانە، بــەڵام لـەم ســوورەتەدا بــە تایبــەت ، گەلەکـانی پێغـەمبــەران : نـووح‌و هـوودو لـووطو صـاڵح‌و شـوعەیب دەگــرێتەوە، صـەڵاتو سـەلامی خـوا لەسـەر هەموویان بێ .

**هەڵوەســـتەی دووەم** : کـە دەفەرمـوێ : ﴿ نَقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآئِهَا ﴾، (مِـن) بـۆ هـەندێـك (تَبْعِيض)ە ، کەواتـە : خـوای پەنهـانزان هــەموو بـەسـەرهـاتـەکـانی ئـەو پێغـەمبـەرانەو گـەلەکانیانی بـەسـەر ئێمەدا نەخـوێندۆتەوە ، بـەڵکو هـەندێك لـە بـەسـەرهـاتی ئـەوانی بـەســەر ئێمـەدا خـوێندۆتــەوە ، بۆیـە نابــێ پێمان وابـێ کە هــەرچی بــووە ، خـــوا لــە قورئانــدا بەســـەر ئێمــەی دا خوێندۆتــەوە ، چــونکە دەفەرمـوێ : لـە هــەواڵی ئـەوانت بـەســەردا دەخــوێنینەوە، نــەك هەواڵەکــانیان هـەموویـان .

**هەڵوەستەی سـێیـەم** : ئنجا کـە دەفەرمـوێ : ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، بێگومان پێغـەمبـەرانیان هـاتنـە لا ، بـە بـەڵگە ڕوونو ئـاشـکرایەکـانەوە .

دیارە وشـەی (بینـات) کۆی (بیِّـنة)یـە، واتـە: بـەڵـگـەیەکی ڕوونو ئـاشــکرا، کـە ئەمە گشـتییتـرە لە وشـەی (معجزات)، چونکە هـەموو موعجیزەیـەك (بیِّـنة)یـە، بـەڵام هەموو (بیِّـنة)یـەك موعجـیزە نیـە، خـوای کاربەجـێ هـەم موعجـیزە کە

دەستەوەسانکەری کەسی بەرانبەرە، وە هەم (بیِّنة) کە بەڵگەی ڕوونو ئاشکرایە، بە پێغەمبەرانی داون .

**هەڵوەستەی چوارەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ مِن قَبْلُ ﴾، زانایان دەڵێن : ئەم لامە (ل) ، (لام الجحود)ە ، هەر لامێك لە دوای نەفییەوە بێ (لام الجحود)ە ، ﴿ فَمَا كَانُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ مِن قَبْلُ ﴾ ، واتە : نەدەبوو ، نەدەگونجا ئیمان بێنن بە شتێك کە پێشتر پێی بێبڕوا بوون، ئنجا توێژەرەوانی قوڕئان چەند مانایەکیان بۆ ئەم ڕستە قوڕئانییە لێکداوەتەوە :

یەك: مادام یەکەمجار ئیمانیان نەهێنا ، نەدەگونجا دوایی ئیمان بێنن ، کەواتە : دوای ئەوەی هەقت دەکەوێتە بەرچاو ، یەکسەر قبووڵی بکەو ، دوای مەخە ، چونکە ڕەنگە سەربکێشێ بۆ ئەوە کە پەلکێشت بکات بۆ شتی خراپ : بتەوێ بگەڕێیەوە ، بەڵام نەتوانی ئیمان بێنی، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾، واتە: دڵەکانیانو چاوەکانیان هەڵدەگێڕینەوە ، وەك چۆن یەکەمجار ئیمانیان پێ نەهێنا، بۆ ئەوەی دواییش ئیمانی پێ نەهێنن، لە سزای ئەوەدا کە پێشێ قبووڵیان نەکرد .

دوو: مادام لە زانیاریی خوادا ئیمانیان نەهێناوە، نەدەگونجا ئیمان بێنن ، وەك لە سوورەتی (یونس)دا فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی کە وشەی پەروەردگارت لەسەر ئەوان هاتۆتە دی، (یانی: لە زانیاریی پەروەردگارتدا هەبووە ، کە ئەوانە ئیمان ناهێنن) ناگونجێ ئیمان بێنن .

هەڵبەتە ئەمە زیاتر چەمکێکی جەبرییە ، من بۆخۆم ئەوەم بە دڵ نیە ، هەرچەندە لە تەفسیرەکاندا هاتوەو (طبري)یش ، ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە ، بەڵام من ئەم ئایەتە ئاوا تەفسیر دەکەم : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ ، واتە : ئەوانەی کە وشەی پەروەردگارت بە نسبەت ئەوانەوە چەسپیوە ، ئیمان ناهێنن ، یانی : خوای پەنهانزان زانیاریی هەبووە، کە بڕوا ناهێنن ، بەڵام ئەو بڕیارەی خوا بە نسبەت ئەوانەوە ، لەبەر ئەوە بووە کە ئەوان بۆخۆیان ئارەزوویان نەبووە ئیمان بێنن ، چونکە لەو مەسەلانەدا ویستی خوا بە دوای ویستی مرۆڤ دەکەوێ ، خوا زانیویەتی ئەو کەسە ئیمان ناهێنێ، بۆیە لە زانیاریی خوادا هەیە، لە ئەزەلەوە خوا زانیویەتی فلانکەس ئیمان ناهێنێ، بەڵام بە ویستی خۆی ، نەك هیچ کەسێك ڕێی لێ بگرێ ! ئنجا ئەگەر وابێ ـ خوا ڕێی ئیمان هێنانیان لێ بگرێ ـ چۆن خوای قسەلەجێ سەرزەنشتی کەسێك دەکات ، کە خۆی ڕێی لێ گرتوە ئیمان بێنێ ؟!.

<u>سێ :</u> هەرچەندە بهێڵرابانەوە ، نەدەگونجا ئیمان بێنن، کە دەفەرموێ : ﴿ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ مِن قَبۡلُ ﴾، واتە: خوا کە شەست ساڵ، حەفتا ساڵ، نەوەد ساڵ، هێشتوونی لەسەر زەوی، ئەگەر دە هێندەش لە زەویدا هێشتباینەوە ، هەر ئیمانیان نەدەهێنا، چونکە ڕەنگە یەکێك بڵێ : ئەگەر خوای میهرەبان ئێمەی زۆر هێشتبایەوە ، ئیمانمان دەهێنا ، خوا دەفەرموێ : نەخێر ، مادام لە سەرەتاوە ئیمانیان نەهێناوە ، ئیمان ناهێنن ، کەسێك بە شەست ساڵ خوا نەدۆزێتەوەو قەناعەت بەو هەقە نەهێنێ ، دە ئەوەندەش تەمەنی هەبێ ، هەر ئیمان ناهێنێو خوا نادۆزێتەوە .

<u>چوار :</u> ئەگەر گێڕدرابانەوە بۆ دنیاش، هەر ئیمانیان نەدەهێنا، وەك لە سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ : ﴿ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ چونکە ئەوان زۆر جار گوتوویانە : خوایە بمانگێڕەوە بۆ دنیا ، تاکو ئیمان

بێنیـن ، خـوا دەفـەرموێ : ﴿ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴾، وە ئەگەر گێڕدرابانەوەش بۆ دنیا ، دەگەڕانەوە سـەر ئـەوەی کـە لـێی قەدەغـە کرابوونو ، وەك پێشـێیان دەکـردەوە .

هەموو ئەو مانایانە هەن ، بەلاّم وەك گوتم : من مانای دووەمیانم بـە دڵ نیـە، بـەلاّم هـەر کام لە مانایەکانی دی بگری ، پێـم ئـاساییە.

**مەسـەلەی شـەشـەم:** کە دەفەرموێ : ﴿ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الْكَافِرِينَ ﴾، ئـاوا بـەو شـێوەیە خـوا مـۆری بەسـەر دڵـی ئـەو کـافرانەوە نـا، (لـە ئەنجـامی خراپەکارییاندا).

ئەمەش یاسایەکی دیکەی خـوای دادگـەرە، کـە کافرەکـان بـەهـۆی خراپەکـاریی‌و کوفرەکەیانەوە ، مـۆر بـەسـەر دڵـیانەوە دەنـرێ، وەك لـە سـوورەتی (یـونس)دا خـوا دەفـەرموێ : ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾، واتـە : وە هیـچ نەفسـێك بـۆی نیـە ئیمان بێنـێ ، مەگـەر بـە مۆڵـەتی خـوا، وە خـوا سـزا لەسـەر ئەوانـە دادەنـێ کـە نافامن، واتـە : عەقڵـی خۆیـان بـەکارناهێـنن ، خـوا ئەوانـە سـزا دەدات ، سـزایەکەش بریتیـە لـە ئیمان نەهێنـانیـان .

وە لـە سـوورەتی (الـمطففین)دا دەفـەرموێ: ﴿ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾، واتـە: نەخێـر ، (کافرەکـان) ڕاسـت ناکـەن ، بـەڵکـو لـە ئەنجـامی کردەوە خراپەکـانیاندا ، دڵیان ژەنگی گـرتوە ، کە دڵ ژەنگی گـرت ، ڕێـی تروسکـایی‌و ئیمـان‌و هیـدایەت نابـێ بچێتـە نێـوی ، کەواتـە : خۆیـان خۆیـان بەو مەرەدە بردوە.

لە کۆتـایی ئەم مەسـەلەیەش دا ، ئـاماژە بـەو فەرمایشـتە موبارەکەی پێغـەمبـەری خـوا دەکـەم کـە دەفـەرموێ : ﴿إِنَّ العَبْـدَ إِذَا أَذْنَبَ ذَنْـبًا كَـانَتْ نُكْـتَةٌ سـوداءُ فِـي، قَلْـبِهِ ، فَـإِنْ تَـابَ وَنَـزَعَ وَاسـتغْفَرَ، صُـقِلَ مِنْـها قَلْـبُهُ، فَإِنْ عَادَ رَانَـتْ حَتَّـى يُغْلَـقَ بِهـا

قَلْبُهُ، فَذَاكَ الَّذِي ذَكَرَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي كِتَابِهِ: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٧٩٣٩)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٣٣٣٤)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالنَّسائِيُّ في (الكبرى)، برقم: (١٠٢٥١)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٤٢٤٤)، وَإِبْنُ أَبِي الدُّنيَا في (التوبة) برقم: (١٩٨)، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٧٨٧) ، وَالحَاكِمُ برقم: (٦) وَقَالَ : صَحِيح، وَالبَيْهَقِيُّ في (الكبرى) ، برقم : (٢٠٥٥٢)}، واته: ئەگەر بەندە گوناهێکی کرد ، خاڵێکی ڕەش لە دڵیدا پەیدا دەبێ ، ئنجا ئەگەر تەوبەی کردو گەڕایەوەو وازی هێنا ، ئەوە دڵی سپی دەکرێتەوە، بەڵام ئەگەر گەڕایەوە سەر گوناهەکان ، خاڵە ڕەشەکانی زیاد دەبن، هەتا بەهۆیەوە دڵی دادەخرێ، ئا ئەوەیە کە خوا لە قورئاندا باسی کردوە، دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ ، واتە: نەخێر، ڕاست ناکەن، بەڵکو لە ئەنجامی کردەوە خراپەکانیاندا ، دڵیان ژەنگی گرتوە .

خوا بمانپارێزو یارمەتیمان بدات بۆ ئەوەی خراپە نەکەین، وە ئەگەر خراپەمان کرد ، زوو بگەڕێینەوە ، بۆ ئەوەی دڵەکەمان هەمیشە بە ساغو صافی بمێنێتەوە .

**مەسەلەی حەوتەمو کۆتایی** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ وَإِن وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ ﴾، وە زۆربەیانمان نەبینی خاوەن پەیمان بن، بەڵکو زۆربەیانمان لاڕێ بینی، بۆچی دەفەرموێ زۆربەیانمان نەبینی پەیمانیان هەبێ ؟ چونکە پەیمانێك پابەندیی پێوە نەکرێ ، بوونو نەبوونی وەك یەکە ، سەرنج بدەن تەعبیری قورئان زۆر وردە ، دەفەرموێ : زۆربەیان پەیمانیان نەبوو ، ڕەنگە یەك بپرسێ ، بلێ : چۆن پەیمانیان نەبوو ، ئەدی خوا نافەرموێ : ﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى ﴿١٧٢﴾ ﴾الأعراف، وەڵامەکەی ئەوەیە وەك گوتم : پەیمانێك کە پابەندیی پێوە نەکرێ ، بوونو نەبوونی وەك یەك وانو، یەکسانن .

وە هەندێکی دی بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێن: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ ﴾، وشەیەك قرتێندراو (محذوف)ە، یانی: (وَمَا وَجَدْنَا لأَكْثَرِهِم مِّنْ وَفَاءٍ بِعَهْدٍ)، واتە: وە زۆربەیان وەفاداریی بە پەیمانیانمان تێدا نەبینین .

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَٰسِقِينَ ﴾، ئەو (إِنْ)ە، (إن النافية) نیە، بەڵکو (إِنْ)ی تەئکیدە، یانی: بە تەئکید زۆربەیانمان بینی لارێ بوون، هەڵبەتە خوا ﷻ زۆر دادگەرە، تەماشای قورئان بکە! نافەرموێ: هەموویان، قورئان هەمیشە خۆی بە دوور گرتوە لە رەهایی و گشتاندن (إطلاق وتعميم)، تەنانەت بۆ کافرانیش نافەرموێ: هەموویان، دەفەرموێ: زۆربەیان، یان کەمێکیان نەبێ.

ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە دەبێ ئێمەی مسوڵمانیش خۆمان بە دوور بگرین لە گشتاندن، وەك هەندێ کەس دەڵێ: هەموو وڵاتانی رۆژئاوا کەڵکی هیچیان نیە، یان جوولەکەو نەصرانیی هەموویان خراپن، یان: مسوڵمانان هەموویان باشن، نەخێر، لە نێو خراپاندا چاك هەیە، لە نێو چاکانیشدا خراپ هەیە، وە لە راستییدا زۆر جاران گشتاندن ئینسان تووشی بێ ئینصافیی دەکات، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَٰسِقِينَ ﴾، بە تەئکید زۆربەیانمان لارێ بینی، لە رێ دەرچوو بینی، لە رێ دەرچوون، لە چی؟! لە سروشتی خۆیان دەرچوون، لە حوکمی عەقڵ و شەرع دەرچوون، چونکە خوا روونی نەکردۆتەوە لە چی دەرچوون، بەڵام لە هەموو ئەوانە دەرچوون، کە باسم کردن .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێزدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لەنێو دەرسەکانمان دا ، بۆ تەفسیری ئەم سوورەتە ، زۆرترین ئایەت دەگرێتە خۆی، لە ئایەتی (١٠٣ تا ١٢٩)، واتە: بیستو حەوت (٢٧) ئایەت، دیارە ئێمە لەم دەرسە بە دواوە ، تاکو نزیکەی حەفتا (٧٠) ئایەت ، باسی بەسەرهاتی مووساو هاروون صەلاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، لەگەڵ گەلەکەیانو فیرعەونو دارودەستەکەی ، دەکەین ـ دیارە لە چەند دەرسێك دا نەك لە یەك دەرس دا ـ چونکە تەنیا یەك بەسەرهات نیە ، بەڵکو کۆمەڵێك بەسەرهاتە.

ئەم دەرسەمان یەکێك لە قۆناغە گرنگەکانی ژیانی پێغەمبەران مووساو هاروون (علیهما السلام) ، کە قۆناغی ڕووبەڕووبوونەوەیانە لەگەڵ فیرعەونو داروودەستەکەی دا ، دەگرێتە خۆی ، پوختەی نێوەڕۆکی ئەو بیستو حەوت ئایەتە ئەوەیە: دوای ئەوەی خوای پەروەردگار مووسا ڕەوانە دەکاتو هاروونی براشی دەکاتە وەزیر، وە مووسا پەیامی خوا بە فیرعەون ڕادەگەیەنێ، دەڵێ : من پێغەمبەری خوامو خوای من پەروەردگاری جیهانییەکانە، منی ناردوە بۆ لای تۆ ، تاکو ئیمان بێنی، وە گەلی بەنی ئیسرائیلیش نەچەوسێنیەوە، وە ئیزنیان بدەی لەگەڵ ئێمەی پێغەمبەرانی خوادا بێنو ڕزگاریان ببێ .

دیارە فیرعەونیش داوای موعجیزەی لێدەکات، مووساش کە گۆچانەکەی دەبوو بە مار، بۆی دەخاتەڕوو، دەستیشی دەخاتە بن هەنگڵی کە دەریدێنێ دەدرەوشێتەوە، بێئەوەی کە تووشی نەخۆشیو بەڵەکیی بووبێ، ئنجا کە فیرعەون دەزانێ مووسا ڕاست دەکات، ئەوەی ئەنجامی دەدات موعجیزەیە ، هەڵدەستێ خەڵکەکە چەواشە دەکاتو، خۆڵ دەکاتە چاوی خەڵکەوە، دەڵێ: ئەی مووسا ! تۆ جادووگەری، منیش

جادووگەرانت بۆ کۆدەکەمەوە، با بزانین جادووی تۆ بەهێزترە، یان جادووی جادووگەرانی من ؟ سەرەنجام جادووگەرەکانی بۆ کۆدەکاتەوە ، کە ڕووبەڕوو دەبنەوە ، لە کۆتایی دا مووساو هاڕوونی برای سەردەکەون ، وە فیرعەون‌و دارودەستەکەی تێکدەشکێن ، جادووگەرەکانیش ئیمان دێنن‌و دەبنە مسوڵمان ، وە فیرعەون هەڕەشەی مەرگیان لێدەکات ، دەڵێ : لە سێدارەتان دەدەم‌و دەست‌و پێی ڕاست‌و چەپتان دەبڕم، ئەوانیش بێمنەتی دەکەن‌و لە خوا دەپاڕێنەوە، کە ئارامییان بەسەردا بڕێژێ‌و لەو تاقیکردنەوەیە دەربچن، کە بریتیە لە کوژرانیان لەلایەن فیرعەونەوە ، پاشان فیرعەون‌و دارو دەستەکەی هەڕەشەی سەبڕینی نێرەکان‌و هێشتنەوەی مێینەکانیان لێدەکەن، مووساش ﷺ بە گەلەکەی دەڵێ : پەنا بە خوا بگرن‌و ، خۆڕاگربن ، سەرەنجامی چاك هەر بۆ پارێزکارانە ، ئەوانیش باسی کڵۆڵیی‌و بێ چارەیی خۆیان دەکەن ، بەدەست فیرعەون‌و دارو دەستەکەیەوە ، ئەویش موژدەیان پێدەدات ، کە خەریکە خوا دوژمنان بفەوتێنێ ، وە بیانکاتە جێگرەوەی ئەو دوژمنانە لەسەر زەویدا، وە تەماشا بکات داخۆ چی دەکەن ؟

﴿ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَظَلَمُواْ بِهَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٠٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرۡعَوۡنُ إِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾
حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ قَدۡ جِئۡتُكُم بِبَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَرۡسِلۡ
مَعِيَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ قَالَ إِن كُنتَ جِئۡتَ بِـَٔايَةٖ فَأۡتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾
فَأَلۡقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعۡبَانٞ مُّبِينٞ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيۡضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ قَالَ
ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٞ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخۡرِجَكُم مِّنۡ أَرۡضِكُمۡۖ فَمَاذَا
تَأۡمُرُونَ ﴿١١٠﴾ قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ وَأَرۡسِلۡ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأۡتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ
عَلِيمٖ ﴿١١٢﴾ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرۡعَوۡنَ قَالُوٓاْ إِنَّ لَنَا لَأَجۡرًا إِن كُنَّا نَحۡنُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾
قَالَ نَعَمۡ وَإِنَّكُمۡ لَمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ
نَحۡنُ ٱلۡمُلۡقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلۡقُواْۖ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسۡتَرۡهَبُوهُمۡ
وَجَآءُو بِسِحۡرٍ عَظِيمٖ ﴿١١٦﴾ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ فَإِذَا هِيَ تَلۡقَفُ مَا
يَأۡفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلۡحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ
﴿١١٩﴾ وَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾
قَالَ فِرۡعَوۡنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَمَكۡرٞ مَّكَرۡتُمُوهُ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لِتُخۡرِجُواْ
مِنۡهَآ أَهۡلَهَاۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمۡ
أَجۡمَعِينَ ﴿١٢٤﴾ قَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا
لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ﴿١٢٦﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ
مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ

نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ
إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓاْ
أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ
عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ ﴾ .

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئنجا دوای ئەوان (نووحو هوودو صالّحو لـووط و شوعەیب) مووسـامان بـە نیشانە (بەڵگەو موعجیزە)کانمانەوە ناردە لای فیـرعەونو کۆمەڵە دەسـتـرۆیشتووەکەی، کەچی ستەمکارانە بڕوایان پێ نەکرد، دەجا سـەرنج بدە ، سـەرەنجامی (شـوومی) خراپەکـاران چۆن بوو ! ﴿١٠٣﴾ وە مووسـا گوتی: ئەی فیـرعەون! بێگومـان من لەلایــەن پەروەردگـاری جیهانەکانەوە نێـرراوم ﴿١٠٤﴾ لەسەرم پێویستە کە جگە لە هـەق بـە ناوی خـواوە نەڵێم، بە دڵنیاییەوە، لەلایەن پەروەردگارتانەوە ، بەڵگەی ڕوونو ئاشکرام بـۆ هێنـاون، دەجـا بـەنی ئیسـرائیلـم لەگـەڵ بنێرە (با ئێـرە چۆڵ بکـەین) ﴿١٠٥﴾ (فیـرعەون) گـوتی: ئنجـا ئەگـەر لـە ڕاسـتـانی نیشـانە (و بـەڵـگـە)یەکـت کـە هێنــاوە ، بیخـە ڕوو ﴿١٠٦﴾ ئەویـش گۆچانەکەی هەڵداو ، یەکسەر بوو بە مارێکی ئاشـکرا ﴿١٠٧﴾ وە دەستیشی (لە یەخەیەوە) دەرهێنـا یەکسـەر بـۆ بینـەران سـپی بـوو ﴿١٠٨﴾ دەسـتـرۆیشـتـووان لـە گەلـی فیـرعەون گوتیان: مسـۆگەر ئەمە (مووسا) جادووگـەرێکی شـارەزایە، ﴿١٠٩﴾ دەیەوێ لەسـەر زەمینـی خۆتـان وەدەرتـان بنـێ، ئنجـا فەرمانتـان بـە چییـە ؟ ﴿١١٠﴾ گوتیـان: خـۆیو برایەکـەی دوابخەو ، کۆکـەرەوان بـۆ شـاران بنێـرە ﴿١١١﴾ کـە هـەرچی جادووگـەری شـارەزایە بـۆت بێنن ﴿١١٢﴾ وە جادووگەرەکان هاتنە لای فیـرعەونو گوتیان: ئایا کرێو خەڵاتمان هەیـە ، ئەگـەر ئێمـە زاڵ بـووین ؟ ﴿١١٣﴾ (فیـرعەون) گـوتی : بەڵـێ ، وە بێگومـان ئێـوە لـە زۆر

وەنزیـك خـراوانیش دەبـن ﴿١١٤﴾ (جادووگەرەکـان) گوتیـان: ئـەی مووسـا ! یـان تـۆ (گۆچانەکەت) فـڕێ دەدەی، یان ئێمـە فڕێـدەر (ی گۆچـانو پەتەکـانمان) دەبیـن ﴿١١٥﴾ (مووسـا) گوتـی: (ئێوە شـتەکانتان) فڕێ بدەن، ئنجا کاتێك فڕێیانـدان ، جادوویان لـە چاوی خەڵك کردو ترسـاندنیانو ، جـادوویەکی مـەزنیان کـرد ﴿١١٦﴾ وە سروشـمان بـۆ مووسا کرد : کە گۆچانەکەت فڕێبدە، یەکسەر هەرچی فێڵی کردوویانە، قووتی دەدا ﴿١١٧﴾ ئیدی هەق چەسپاو ، ئەوەی دەیانکرد پووچەڵ بۆوە ﴿١١٨﴾ ئنجا هەر لەوێدا (فیـرعەونو دارودەسـتەکەی) بـەزینو زەبوون بوون ﴿١١٩﴾ وە جادووگەرەکـانیش کڕنووشیان (بۆ خـوا) برد ﴿١٢٠﴾ گوتیان : بڕوامان بە پەروەردگاری جیهانیەکان هێنا ﴿١٢١﴾ پەروەردگاری مووساو هـاڕوون ﴿١٢٢﴾ فیـرعەون گـوتی : ئـایا بڕواتـان هێنـا ، پـێش ئـەوەی مۆڵەتتـان بـدەم ؟! بێگومان ئـەوە پیلانێکـە گێـڕاوتـانە لـە شـارەکەدا ، تاکـو خەڵکەکـەی لـێ وەدەرنـێن ، ئنجا لەمـەودا دەزانـن ﴿١٢٣﴾ دەسـتو لاقـەکانتان بـە پێچـەوانەوە (دەسـتی ڕاسـتو لاقـی چەپ) دەبڕم، ئنجا تێکڕاشـتان هەڵدەواسم ﴿١٢٤﴾ (جادووگەرەکان) گوتیـان: بێگومان ئێمە بۆ لای پەروەردگـارمان دەگەڕێینەوە ﴿١٢٥﴾ وە تۆش عـەیبێکمان لێنـاگریو ، لەسـەر هـیچ شـتێك سـزامان نادەی، مەگەر لەسـەر ئەوە کە بڕوامان بـە نیشانەکانی پەروەردگـارمان هێنا کە بینیمـانن ، پەروەردگارمان ! ئـارامییـمان بەسـەردا بڕێـژەو ، بـە مسـوڵمانەتییو گەردنکەچیی بمانمرێنە ! ﴿١٢٦﴾ وە کۆمەڵی دەسـتڕۆیشتووان لە گەڵـی فیـرعەون گوتیـان: ئـایا واز لـە مووسـاو گەلەکـەی دێنـی ، کـە خراپەکـاریی لـە زەویـدا بکـەنو ، خـۆتو پەرستـراوەکانیشت وێڵ بکەن ؟ (فیـرعەون) گوتی : (نەخێر) لەمەودوا کوڕەکـانیان بـە خەسـتیی دەکوژینو ، ئافرەتەکانیشیان بە زیندوویی دەهێڵینەوە ، وە ئێمە بەسـەریاندا زاڵو مـل پێکەچکـەرین ﴿١٢٧﴾ مووسـاش بـە گەلەکـەی خـۆی گـوت : یارمـەتیی لـە خـوا وەربگرنو خۆڕاگـربن ، بێگومان زەمین هی خوایە ، دەیکاتە میـراتی هـەر کەسـێك لـە بەندەکانی کە بیـەوێ ، وە سـەرەنجامیش بـۆ پارێزکارانـە ﴿١٢٨﴾ (گەلـی مووسا) گوتیـان : پێش ئەوەی بێیە لامان هەر ئازار دەدراینو ، دوای هاتنیشت بۆ لامان (بە هەمان شێوە) (مووسا) گوتـی: نـزیکـە (ئومێد وایە) پەروەردگـارتان دوژمنانتان لەبـەین بەرێو ، ئێـوە لەسەر زەوی بکاتە جێنشین، ئنجا تەماشـاتان دەکات داخۆ چۆن (ڕەفتار) دەکەن ﴿١٢٩﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(حَقِيقٌ عَلَىٰٓ ) : شایستەیەكە ، خوێنراویشەتەوە : (حَقِيقٌ عَلَيَّ) (أَي وَاجِبٌ عَلَيَّ) واتە : لەسەرم پێویستە .

(ثُعۡبَانٌ ) : (ضَرْبٌ مِنَ الحَيات طوالٌ ، وَجَمْعُهُ ثعَابين) جۆرێكە لە مار، مارێكی زۆر درێژو گەورەیە ، وە بە (ثعابین) كۆدەكرێتەوە ، وە لە عەرەبیدا دەگوترێ : (ثَعَبْتُ الماءَ ، أَي فَجَّرْتُهُ) واتە : ئاوەكەم تەقاندەوە ، ئاوەكەم بە لووزەو هێنا ، لەوەوە هاتوە كە ماریش كتوپڕ دەردەچێو ، ئەو جۆرە مارە زۆر خێرا دەجوولێ ، وەك چۆن ئاو هەڵدەڕژێو هەڵدەقوڵێ، یان وەك كانیو سەرچاوەی ئاو كە دەتەقێتەوە .

( وَنَزَعَ ) : (نَزَعَ الشيءَ : جَذَبَهُ مِنْ مَقَرِّهِ كَنَزَعِ القَوْسِ عَنْ كَبِدِهِ)، (نَزَعَ الشيء) واتە: شتەكەی هەڵقەند، وەك چۆن تیر لە كەوان دەردەچێو، تیرئاوێژ ژێی كەوانەكە ڕادەكێشێ .

(أَرۡجِهۡ ) : (رَجَا الأَمْرَ أَرْجَاهُ: أَخَّرَهُ) واتە: دوای خست، كەواتە: (أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ ) واتە: خۆیو براكەی دوابخە، یانی جارێ ڕایانبگرە .

(ٱلۡمَدَآئِنِ ) : (المدائِن : جَمْعُ مَدِينَة وَتُجْمَعُ على مُدْن ومُدُن)، وشەی (مَدائِن) كۆی (مَدِينَة)یە، یانی : شار ، وە بە (مُدْن) و (مُدُن)یش كۆدەكرێتەوە .

(لَأَجۡرًا ) : (الأَجْرُ والأُجْرَةُ مَا يَعُودُ مِنْ ثَوَابِ العَمَلِ دُنيَوِيَاً كَانَ أَوْ أُخْرَوِياً) وشەی (أَجْر) و (أُجْرَة) بریتیە لە پاداشتی كردەوە ، كە بە ئینسان دەبڕێ : چ لە ڕووی دنیاییەوە، چ لە ڕووی دواڕۆژییەوە .

(تَلۡقَفُ ) : واتــە : قــوت دەدا ، (لَقِفْــتُ الشَّــيءِ أَلْقَفْـهُ وَتَلَقَفْـتُهُ : تَنَـاوَلْتُهُ بِالْحِذْقِ سواءٌ بِالْفَمِ أَوِ اليَدِ) واتە : زۆر بـە کارامەیی ئەو شـتەم وەرگـرت ، ئنجا بــە زار ، یان بـە دەست، کە لێـرەدا مەبـەست پێی گۆچانەکەی مووسایە کاتێك بـووە مـار ، هەموو ئەو دارو پەتانەی کە جادووگەرەکان جادوویان پێکردبووو، کردبوویانن بـە مار ، لەبـەرچـاوی خەڵـك، هەموویـانی بـە دەمـی قـوتدا.

(يَأۡفِكُونَ ): واتـــە: لادەدەن، (الإِفْـك: كُـلُّ مَصْرُوفٍ عَـنْ وَجْهِـهِ الَّـذِي يَحِقُّ أَنْ يَكـونَ عَلَيْـهِ ومنه قيل للرياح العادلـة عن المهـاب : مؤتفكة) ، وشـەی (إِفْـك) بریتـیە لە هـەر شـتێك کە لە ڕووی خـۆی ، کـە پێویسـتە لەسـەری بـێ ، لابدرێ ، {بۆیـە (إِفْـك) بــە مانـای هەڵگـەڕانەوەو ، بــە مانـای درۆ هـاتوە ، وە (إِفْـك) بــە مانـای هەڵگـێڕانەوەی شـتێك هـاتوە ، بۆیـە بــە شـارو ئـاوەدانییەکـانی گـەلـی لـووط گوتـراوە : (مُؤْتَفِكات) واتە : ئـەو ئـاوەدانییانــەی کـە هەڵگـێڕرانەوە} ، وە هـەر بۆیـەش بە (بـا)یەك کە لە ڕێـی خـۆی لادەدات دەگوتـرێ (مؤتفكة) .

(صَٰغِرِينَ ): واتە: زەبوونـان، (صَغِر و صَغَرَ صَغَاراً : أي : ذَلَّ)، واتـە : زەبـوونو ملکەچ بوو، بـەڵام (صَغُرَ) واتە : بچووك بوو ، (يَصْغُرُ فَهُوَ صَغير) ، واتە : بچووك دەبـێ ، بــەڵام (صَغِرَ يَصْغَرُ صَغَاراً وصَغراَ فَهُوَ صـاغِرْ) واتـە : زەبوون بـوو ، جا دەڵـێ : (الصـاغِرُ : الرَاضـي بِمَنْـزِلَةِ الدَّنِـيَّة) ، (صـاغِر) بــە کەسـێك دەگـوترێ کـە بــە پێگـەیەکی نزمو پەست ڕازی بـێ .

(مِّنۡ خِلَٰفٖ ) : واتـە: پێچەوانە ، (أَي إِحْدَاهُمَا مِـنْ جَانِـبٍ والأُخْرَى مِـنْ جَانِـبٍ آخـر) دەستی ڕاستو پێـی چەپیـان دەبـڕم ، یاخـود بـە پێچـەوانـەوە .

(مُنقَلِبُونَ ) : واتــە : (مُنْصَـرِفُون) ، دەگــەڕێینەوە ، (الإِنْقِـلاَبُ : الإِنْصِـرَاف) واتــە : گـەڕانــەوە .

( وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ ) : واتە : لێمان بـە ڕەخنە ناگـری ، لێمان بـە عـەیب ناگـری ، (نَقَمْتُ الشَّـيءَ وَنَقِـمْتُـهُ إِذَا أَنْكَرْتَهُ إِمَّـا بِاللِّسـانِ وَإِمَّـا بِالعُقُـوبـة)، واتـە: نکووڵـییـم لـەو

شـــتە کـرد، جا بــە زمـان نکووڵــیی لـــێ بکــەی، یـان بــە ســزادان، نکـووڵیی لـە کەسـێك بکەی کە بۆچی وای کردوە.

(أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا ) : (أَفْرَغْـتُ الدَّلْـوَ : صَبَبْـتُ مَـا فِيـهِ) ، (دَلْـوَ) ئــەوەیە کە ئـاوی پێ دەردێنی ، کە بڵـێی : (أَفْرَغْتُهُ) واتە : هەرچی ئـاوی تێـدا بـوو ، هــەڵم ڕشــت ، ئــەوانیش داوا دەکــەن ، دەڵــێن : خـــوایە ئـــارامییەکی زۆر هەڵبـــڕێژە ســـەر دڵو دەروونمــان، چـونکە بـــە ئـارامییـــەکی زۆر نەبـــێ ، نــاتوانین بـەرهـەڵســـتیی ئــەو هەڵوێـستو هـەڕەشـەیـەی فیـرعەون بکـەین.

(قَٰهِرُونَ ) : (القَهْـرُ: الغَلَبَـةُ وَالتَّذْلِيلُ مَعَـاً ، وَيُسـتعْمَلُ فِـي كُلٍّ وَاحِـدٍ مِنْهُمَـا) هەم بـە زاڵبوون دەگوترێ ، وە هـەم بــە ملـپێکــەچ کــردن دەگوتــرێ ، وێکــڕا ، وە بـە هـەر کـامێکیشـیان دەگوتـرێ .

(عَسَىٰ ) : (عَسى طَمَعٌ وَتَرَجّي) (عسى) بریتیە لە ئومێدەوار بوونو هیوا خواســتن ، ئنجـا وەك ڕاغیبـــی ئەسـفەهــانی دەڵـــێ : (وَكَـثِير مِـنَ الـمفَسِّرِين فَسَّرَوا لَعَلَّ وَعَسـى فِـي القُرْآن بِالـلاَّزِمِ وَقَـالُوا إنَّ الطَّمَـعَ وَالرَّجَـاءَ لاَ يَصِحُّ مِـنَ اللهِ ، وَفِـي هَـذَا مِنْهُمْ قُصُـورُ نَظَـرٍ ، وَذَاكَ أنَّ اللهَ تَعَـالَى إذَا ذَكَـرَ ذَلِـكَ يَـذْكُرهُ لِيَكـونَ الإِنْسـان مِنْـهُ رَاجِيَـاً لاَ لأَنْ يَكـونَ هُـو تَعَـالَى يَرْجُـو) ، واتــە : زۆرێــك لـە ڕوونەکــەرەوانی مانایەکانی قورئـان (لَعَـلَّ) و (عَسَـى) یــان بـە (لازم)ەکـەیان لێکداوەتــەوە ، بۆیــە گوتوویـانە : هیــواو ئومێـد، بۆ خــوا ڕاســت نیــە ، بەڵام ئـەوە کورتبینیـی یـە ، چونــکە کــە خــوای بــەرز باســی ئــەوە دەکـات ، مەبەســت ئەوەیــە کــە مــرۆڤــ ئومێـدەوار بێ ، نـەك خـوای بەرز ئومێـدی وابـێ !

## مانـای گـشـتـی ئـایـەتـەكـان

# قۆناغەكانی بەسەرهاتی مووساو هاروون و گەلەكەیان و فیرعەون

دەتـوانین قۆناغەكـانی بـەسـەرهـاتی مووسـاو هـارِوونی بـرایو گـەلەكەیان لەگـەڵ فیـرعەونو دارو دەسـتەكەیدا ، بۆ سـێزدە (١٣) قۆناغ دابـەش بكەین :

قۆنـاغی یەكـەم : چەوسـێنرانەوەی بـەنی ئیسـرائیل لەلایـەن فیـرعەونو داروودەسـتەكەیەوە ، واتە: پێش ئەوەی كە مووسا عليه السلام لە دایك بێ، ئـەم قۆناغـە بـە پلـەی یەكـەم لـە سـوورِەتی (القصص)دا باسـكراوە ، لـە ئایەتەكـانی (١ تـا ٨) ، هـەروەهـا لـە چـەند شـوێنێكی دیكـەش دا ئـاماژەی پێكـراوە، وەك: سـوورِەتی (طـه) ئـایەتی (٤٧)و سوورِەتی (الشعراء) لە هەر دوو ئـایەتی (١٠ و ١١)دا.

قۆنـاغـی دووەم: لە دایـكبوونی مووسا عليه السلام، وە بـەخێوكـرانی لـە مـاڵـی فیـرعەوندا ، ئـەم قۆناغـەش بـە پلـەی یەكـەم هـەر لـە سـوورِەتی (القصص)دا باسـكراوە، لـە ئـایەتەكانی (٧ تا ١٣)دا ، بـەڵام لە سوورِەتی (طـه)دا ، ئـاماژەیەكی كـورتی پێكـراوە ، لە ئـایەتەكانی (٣٧ تا ٤٠)دا.

قۆنـاغـی سـێیـەم: پێگـەیشـتنی مووسـا عليه السلامو گـەورەبوونی ، وە پاشـان بـەرگـرییكردنی لە گەلەكەی خۆی ، وە كوژرانی قیبتییەك بـە دەسـتی ، كـاتێك ئـەو قیبتییـە لەگـەڵ یـەكێك لـە بـەنی ئیسرائیل دا تێكگیـراوە ، ئـەم قۆناغـە تـەنیا لـە

سووڕەتی (القصص)دا باسکراوە، لە ئایەتەکانی (١٤ تا ٢١)دا ، وە لە سووڕەتی (الشعراء) لە ئایەتی (١٤)و ئایەتەکانی (١٩ و ٢٠) دا ئاماژەیەك کراوە ، بە کوشتنی بابایەکی فیرعەونیی.

قۆناغی چوارەم: ڕاکردنی مووسا ﷺ بۆ مەدیەنو شوانیی کردنی ، بۆ ماوەی دە (١٠) ساڵ، ئەوەش بە پلەی یەکەم هەر لە سووڕەتی (القصص)دا باسکراوە، لە ئایەتەکانی (٢٢ تا ٢٨)دا ، بەڵام لە سووڕەتی (طه)دا ، ئاماژەیەکی کورتی پێکراوە ، لە ئایەتی (٤٠)دا ، وە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن : ئەو پیاوەی مووسا ﷺ دە ساڵ شوانیی بۆ کردوە ، پێغەمبەر شوعەیب ﷺ بووە ، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەم، بە پێی تێگەیشتنی من پێغەمبەر شوعەیب ﷺ نەبووە، بەڵکو پیاوێکی صاڵحو خواناس بووە.

قۆناغی پێنجەم: گەڕانەوەی مووسا ﷺ بۆ میسر ، وە بەدەم ڕێگاوە کرانی بە پێغەمبەر، وە نێررانی بۆ لای فیرعەونو دارودەستەکەی، ئەم قۆناغە وێڕای سووڕەتی (القصص) لە ئایەتەکانی (٢٩ تا ٣٥)دا ، لە سووڕەتی (طه) ، ئایەتەکانی (٩ تا ٤٨)دا بە درێژیی، باسکراوە، وە لە هەر کام لە سووڕەتەکانی (الشعراء) ئایەتەکانی (١٠ تا ١٧)دا ، وە سووڕەتی (النمل) ئایەتەکانی (٧ تا ١٢) دا ، وە سووڕەتی (النازعات) ئایەتەکانی (١٥ تا ١٩)شدا هاتوە، ئنجا دیارە لە هەر کام لەم سووڕەتانەدا ، کە ئەم ڕووداوانە باس دەکرێن بە شێوەیەکی دیکەی جیا لەوەی دیکە باس دەکرێن ، یاخود هەندێ شت باس دەکرێ ، لە شوێنەکانی دیکەدا باس نەکراوە، وە بە هەموویان دیمەنێکی تێرو تەواو گشتگیرمان دەدەنە دەست .

قۆناغی شەشەم: ڕووبەڕووبوونەوەی مووساو هاڕوون (علیهما السلام) لەگەڵ فیرعەونو دارودەستەکەیدا، ئەم قۆناغەش ، وێڕای سووڕەتی (القصص) لە ئایەتەکانی (٣٦ تا ٣٩)دا ، لە سووڕەتی (الإسراء)یشدا ، ئایەتەکانی (١٠١تا ١٠٣)دا ، وە سووڕەتی (طه) ئایەتەکانی (٤٧ تا ٥٦)دا ، وە سووڕەتی (الشعراء) ئایەتەکانی (١٨ تا ٣٧)دا ، وە سووڕەتی (النمل) ئایەتەکانی (١٢ تا ١٤)دا هاتوە، هەر جارە بە شێوازێك .

قۆناغی حەوتەم: ژیانو بەسەرهاتەکانی مووساو هارِوونی برای لەگەڵ بەنی ئیسرائیلو فیرعەونو داروودەستەکەیدا، وە کۆکردنەوەی جادووگەرەکانو ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ مووسا ﷺدا، ئەم قۆناغە بە پلەی یەکەم لە سوورِەتی (طه) ئایەتەکانی (٥٧ تا ٧٦)دا ، زۆر بە وردیی، وە لە سوورِەتی (الشعراء)یشدا ، بە هەمان شێوە ، لە ئایەتەکانی (٣٦ تا ٥١)دا بە وردیی هاتوە، بەڵام هەر کامێکیان تامو چێژو وردەکاریی تایبەت بەخۆی تێدایە .

قۆناغی هەشتەم: توندکردنی سزایەکان لەلایەن فیرعەونەوە ، لەسەر بەنی ئیسرائیلو گرفتاربوونی فیرعەونو داروودەستەکەی بە چەند بەڵایەکەوە، ئەمیش بە پلەی یەکەم لە سوورِەتی (الأعراف) ئایەتەکانی (١٣٠ تا ١٣٥)دا هاتوە، هەروەها لە سوورِەتی (الإسراء)یش لە ئایەتەکانی (١٠١ و ١٠٢)دا ئاماژەیەکی کورتی پێکراوە .

قۆناغی نۆیەم: دەربازبوونی بەنی ئیسرائیلو خنکانی فیرعەونو سوپایەکەی لە دەریای سووردا، ئەمیش لە زۆر شوێندا هاتوە، بەڵام بە پلەی یەکەم لە سوورِەتی (الشعراء) ئایەتەکانی (٥٢ تا ٦٨)دا بە کورتیی هاتوە، وە لە سوورِەتی (الإسراء)یش لە ئایەتەکانی (١٠٣ و ١٠٤)دا بە کورتیی ئاماژەی پێکراوە، وە لە سوورِەتی (طه) ئایەتەکانی (٧٧ تا ٧٩)دا ، دیسان بە تەفصیلْ باس دەکات، وە هەروەها لە سوورِەتی (القصص) ئایەتەکانی (٤١ و ٤٢)دا ، وە لە سوورِەتی (الصافات) ئایەتەکانی (١١٤ تا ١٢٢)دا ، وە لە سوورِەتی (الذاريات) ئایەتەکانی (٣٨ تا ٤٠)دا ، ئاماژە بەم بەسەرهاتە کراوە.

قۆناغی دەیەم: نیشتەجێبوونی بەنی ئیسرائیل لە بیابانی سینادا ، ئەمیش لە چەند شوێنێکدا باسکراوە، وەك سوورِەتی (الأعراف) ئایەتی (١٦٠)، وەك دوایی باسی دەکەین ، وە سوورِەتی (طه) ئایەتی (٨٠ تا ٨٢)، وە سوورِەتی (البقرة) ئایەتی (٥٧).

قۆناغی یازدەیەم: وەرگیرانی تەورات لەلایەن مووساوە لە خوای پەروەردگار ، کە لە لەوحەکاندا نووسرا بوو، ئەمیش لە چەند سوورِەتێکدا هاتوە، بەتایبەت لە سوورِەتی (الأعراف) ئایەتەکانی (١٤٣ تا ١٤٥)، وە سوورِەتی (طه) ئایەتەکانی

(٨٣ تا ٩٨)، بە تەفصیلێ باسکراوە، هەرچەندە لەوێ باسی ئەلواح نەکراوە، بەلأم لەوکاتەدا ئەو بەسەرهاتە ڕوویداوە، واتە: دوای ئەوەی کە مووسا تەوڕاتی لە لەوحەکاندا وەرگرتوە، ئەو بەسەرهاتە ڕوویداوە ، کە لەو ئایەتانەدا باسکراوە .

قۆناغی دوازدەیەم : داوالێکردنی مووسا لە گەلەکەی بۆ ئەوەی بچنە شارێکەوە ، وە سەرپێچییکردنیان ، ئەویش لە چەند شوێنێکدا هاتوە ، لە سووڕەتی (البقرة) هەردوو ئایەتی (٥٨ و ٥٩)دا ، وە سووڕەتی (المائدة) بە تایبەت ئایەتەکانی : (٢٠ تا ٢٤) ، وە لە سووڕەتی (الأعراف) هەردووك ئایەتی (١٦١ و ١٦٢)دا .

قۆناغی سێزدەیەم : نائومێدبوونی مووسا لە گەلەکەی‌و پاڕانەوەی لە خوا ، بۆئەوەی لە یەکدییان جیابکاتەوە ، ئەم قۆناغە، وە ئەم ڕوداوە ، تەنیا لە سووڕەتی (المائدة) ئایەتەکانی : (٢٥ و ٢٦)دا هاتوە.

دیارە ئێمە توێژینەوەی قۆناغەکانی یەك‌و دوو و سێ‌و چوار پێنج (١، ٢، ٣، ٤ ، ٥) بۆ تەفسیری سووڕەتی (القصص)و سووڕەتی (طه) هەڵدەگرین، لەبەرئەوەی وەك گوتمان : لەوێ زیاتر باسکراون، وە هەوڵدەدەین لێرەدا قسە لەسەر سەرجەم قۆناغەکانی : (٦ و ٧ و ٨ و ٩ و ١٠ و ١١ و ١٢ و ١٣) بکەین، لەبەر تیشکی ئەو شەستو (٦٩) ئایەتەی سووڕەتی (الأعراف)دا ، وە بێگومان هەندێك جاریش باسی ئەو قۆناغانەی دیکەش دەکرێ ، وە هەندێ بابەتی دیکە ، بەتایبەت کە لە سووڕەتی دیکەدا هاتبن ، کاتێك دەگەینە تەفسیری ئەو سووڕەتانە خوا پشتیوان بێ‌و تەمەن باقی بێ ، لەوێ زیاتر دەیانتوێژینەوە، هەرچەندە لە سووڕەتی (الأعراف)یشدا ، ئاماژەیان پێدەکەین .

ماوەتەوە بڵێین : دوو بەسەرهاتی دیکەی تایبەت هەن ، لە سەرگوزشتەی مووسا عليه السلامدا، کە هەر کامیان تەنیا لە یەك سووڕەتدا هاتوون، ئەو دووانەش لە کاتی گەیشتنمان بە تەفسیرکردنی سووڕەتەکان دا دەیانتوێژینەوە، ئەوانیش بریتین لە:

یەك: بەسەرهاتی مووسا عليه السلام‌و بەندەیەکی صاڵحی خوا، کە مووسا وەك قوتابی سەفەری لەگەڵدا کردوە، تاکو زانیاریی لێ فێر بێ، ئەوەیان تەنیا لە سووڕەتی

(الكهف)دا هاتوه، له ئایەتەكانی : (٦٠ تا ٨٢)دا ، واته : (٢٣) ئایەت تەرخان كراون ، بۆ ئەو بەسەرهاتە، خوا پشتیوان بێ ، كە پێیگەیشتین دەیتوێژینەوە .

دوو : بەسەرهاتی هەڕەشەكردنی فیرعەونە ، لە مووسا ﷺ كە بیكوژێ، وە بەرگرییكردنی یەكێك لە داروودەستەی فیرعەون لە مووسا ﷺ، كە ئەو كەسە ئەهلی ئیمان بووە، ئەو بەسەرهاتە تەنیا لە سووورەتی (غافر)دا، هاتوە لە ئایەتەكانی (٢٣ تا ٤٦)دا ، واته : ئایەتیش تەرخان كراون ، بۆ ئەو بەسەرهاتە كە بە ڕاستیی زۆر جێی پەندو عیبرەتە .

ئێستاش ڕاستەوخۆ دەچینە سەر مانای گشتی ئەو بیستو حەوت (٢٧) ئایەتەی كە ئەم دەرسەمان پێك دێنن‌و باسی قۆناغی شەش (٦)ی ژیان‌و بەسەرهاتی مووساو هاڕوونی بڕای‌و گەلەكەیان و، فیرعەون‌و داروودەستەكەی دەكەن ، كە وەك پێشتریش باسمان كرد ، ئایەتەكانی : (١٣ – ١٢٩)ن :

خوای بەرزو بێهاوتا پاش ئەوەی باسی بەسەرهاتی هەركام لە :

نووح‌و هوودو صالح‌و لووط و شوعەیبی علیهم السلام لەگەڵ گەلەكانیان دا ، كرد، ئەمجارە دێتە سەر باسی بەسەرهاتی مووساو هاڕوونی بڕای علیهما السلام لەگەڵ فیرعەون دا ، كە گەلەكەیانیانی دەچەوساندەوەو سۆغرەو بێگاری پێدەكردن .

هەڵبەتە ئامانجی سەرەكیی لە ڕەوانەكردنی مووساو هاڕوونی بڕای بۆ لای فیرعەون‌و فیرعەونییەكان ، بریتی بووە لە دەربازكردن‌و قوتاركردنی گەلی بەنی ئیسرائیل ، لە چەنگی فیرعەون‌و داروودەستەكەی ، وەك خوا ﷻ لەوبارەوە فەرموویەتی : ﴿ فَأۡتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبۡهُمۡ ...﴿٤٧﴾ ﴾ طه .

سەرەتا خوای تاك‌و پاك دەفەرمویٚ : ﴿ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَظَلَمُواْ بِهَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ الأعراف.

دیـــارە لـەم ئایەتــەی یەکـەم دا ، خـــوای کــاربەجێ کورتــەو گوشـــراوی بەسەرهــاتی مووساو فیـرعەون دەخاتەڕوو، کە ئەمـە وەك پێشـەکی وایــە بـۆ کـۆی بەسـەرهاتەکـە ، دەفەرمـوێ :

پاشـان دوای ئەوان (دوای نووحو هوودو صالْحو لـووط و شـوعـەیب) مووسـامان بـە نیشـانەکانمانەوە ناردە لای فیـرعەونو داروودەسـتەکەی ( کۆمەڵە دەسـتـڕۆیشـتووەکەی)، کەچـی بەهـۆی بێبـڕوایی یـانەوە بە ئـایـەتەکـانـمان ، سـتەمکارییـان کرد ، دەجا سـەرنج بدە سـەرەنجامی سـتەمکاران چـۆن بوو !

دواتــر بـاس دەکەیــن ــ لـە مەســەلە گرنگـەکان دا ــ کـە وشـەی (ظلـموا) بۆخـۆی (تَعَدِّي) دەکاتو پێویستی بە پیـت (حـرف) نیـە ، بـەلاَم لێـرەدا وشـەی (ظلـموا) بـە پێـی بنچینەی خسـتنەنێو (تضمین) مانـای (كـفـروا)یشی ناواخـن کـراوە .

ئنجا خوای پەنهانـزان دێتـە سـەرباسی چۆنیـەتی دوانـدنی مووسـا بـۆ فیـرعەون :

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَـٰفِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ۚ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ ﴾

واتـە: وە مووسا فەرمووی : ئەی فیـرعـەون ! من لە لایەن پەروەردگـاری جیهانەکانـەوە ڕەوانـە کـراوم : شایسـتەمەو لەسـەرم پێویسـتـە کە جگـە لـە هـەقو ڕاسـتیی بـەناوی خـواوە نەڵێـم ؛ بە دڵنیـایی مـن لـە پەروەردگـارتانەوە بەڵگـەو موعجیـزەیەکـی ڕوونو ئاشـکرام ـ بۆ ئیسـپاتی ڕاسـتیی خـۆم ـ بـۆ هێنـاون ، دەجـا گەلـی بـەنی ئیسـرائیلـم لەگـەڵ بنێـرە (با ئێـرە بەجێ بهێڵـن).

وەك دەبیـنین : مووسـا ﷺ لـە یەکـەمین دوانـدنی دا بـۆ فیــرعەون ، چـەند شـتێك دەخاتە ڕوو :

١/ بــە نازنــاوی پادشایەتیــیو بەڕێــزەوە بانگــی دەکـات (يَـٰفِرْعَوْنُ !) چونکــە بــە پێچــەوانەی چەمــكو واتــای بـاوی ئــەو ڕۆژگــارەوە ، وشــەی (فرعـون) نازنـاوی پادشـایەکانی میصـر بووە !

٢/ ڕایدەگەیەنێ کە لە لایەن خوای پەروەردگاری جیهانەکانەوە نێرراوە : (إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ) ، کەواتە : هەر لەخۆوە نەهاتوە ، یەخەی فیرعەون بگرێو گێچەڵی پێ بکات .

٣/ ڕایدەگەیەنێ کە لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەناوی خواوە دەدوێ، جگە لە ڕاستیو هەقبێژیی ، بە ڕەواو شایستەی خۆی نازانێ : ( حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ... ).

٤/ ڕایدەگەیەنێ کە پشت ئەستوورە بە بەڵگەو موعجیزەی دەستاوسانکەری ڕوون لە لایەن پەروەردگارەوە : ( قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ...).

٥/ وە سەرەنجام ئامانجە سەرەکییەکەی خۆی دەخاتەڕوو کە ڕزگارکردنی گەلی بەنی ئیسرائیلە ، لەو ژیانە کولەمەرگییەی ژێردەستی فیرعەون : (فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ... ) .

ئنجا فیرعەونیش دێتە قسە : ﴿ قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ واتە : فیرعەون گوتی : ئەگەر لە ڕاستانی : ئەگەر بەڵگەو نیشانەیەکت هێناوە ، بیخە ڕوو .

دیارە فیرعەون ویستوویەتی هەر لەڕێوە تانە لە ڕاستگۆیی مووسا بداتو تۆمەتباری بکات بە درۆ !

ئنجا مووسا دوو بەڵگەو موعجیزە ڕۆشنەکەی خۆی : گۆچانەکەیو دەستی سپیو درەوشاوەی ، وەك دوو بەڵگەو نیشانەی ئیسپاتی دەعوایەکەی دەخاتە ڕوو : ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ واتە : ئنجا (مووسا) گۆچانەکەی هاویشت : یەکسەر بوو بە مارێکی ئاشکرا.

وە دەستیشی ( لە بن هەنگڵی ڕاستی ، یان لە یەخەکەی) دەرهێنا : یەکسەر سپیو درەوشاوەو بوو بۆ تەماشاکاران .

ئنجا دەستو پێوەندە قسە ڕۆیشتووانی دەوری فیرعەون ، دێنە قسە : ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ ۖ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾. واتە : کۆمەڵە دەستڕۆیشتووەکە لە گەلی فیرعەون گوتیان : ئەمە (مووسا) جادوگەرێکی شارەزایە. دەیەوێ لەسەر زەمینی خۆتان وەدەرتان بنێ ؛ ئنجا ئایا فەرمانتان بە چییە ؟

شایانی باسیشە لە شوێنی دیکەدا هاتوە ، کە فیرعەون بە (ٱلْمَلَأُ )ەکەی گوتوە چی بکەین ؟ :

﴿ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الشعراء .

هەڵبەتە ئەوەش بەهۆی جیاوازیی سیاقەکانەوەیەو، لە هەردووکیشیانەوە دەزانرێ کە (ٱلْمَلَأُ )ی فیرعەونیش بوونەتە بەشێك لە فیرعەونو تێیدا تواونەوە!

ئنجا دارودەستەکەی فیرعەون دەست دەکەن بە خستنەڕووی پێشنیاران بۆ فیرعەون : ﴿ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿١١٢﴾ ﴾. واتە : کۆمەڵە دەستڕۆیشتووەکە گوتیان : خۆیو برایەکەی دوابخە (هیچ بڕیاریان لەبارەوە مەدە) وە جنارچییان بە شاران دا بنێرە. کە هەموو جادووگەرێکی زانات بۆ بێنن (بۆ بەرەنگاربوونەوەی مووسا).

﴿ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓا۟ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ ، واتە : وە جادووگەرەکان هاتنە لای

فیرعەونو گوتیان : ئایا ئەگەر ئێمە زاڵبووین ، کرێ (پاداشت)مان دەدەیە ؟ گوتی : بەڵێ ، بەڵکو بە دڵنیایی ، ئێوە لە زۆر نیزیکانیشم دەبن .

ئنجا جادووگەرەکان پاش ئەوەی کرێو خەڵاتی خۆیانیان لەلایەن فیرعەونەوە مسۆگەر کرد ، بۆ مووسا ﷺ دێنە مەیدانێ :

﴿ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحۡنُ ٱلۡمُلۡقِينَ ١١٥ ﴾ ، واتە: (جادووگەرەکان) گوتیان : ئەی مووسا ! یان تۆ هی خۆت فڕێ دە (پێشانی بدە) یان ئێمە فڕێدەر (ونیشاندەر)ی جادووەکانی خۆمان دەبین !

﴿ قَالَ أَلۡقُواْۖ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسۡتَرۡهَبُوهُمۡ وَجَآءُو بِسِحۡرٍ عَظِيمٍ ١١٦ ﴾ واتە: مووسا فەرمووی : بیهاوێن ، ئنجا کاتێك هاویشتیان (گۆچانو پەتەکانیان فڕێ دان) جادوویان لە چاوی خەڵك کردو ترساندنیانو جادوویەکی مەزنیان کرد .

بەڵام ئەمجارە خوای پشتیوانی بڕواداران ، بۆ پشتیوانی مووسا دەست بەکاردەبێ :

﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ فَإِذَا هِيَ تَلۡقَفُ مَا يَأۡفِكُونَ ١١٧ فَوَقَعَ ٱلۡحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١١٨ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ١١٩ وَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ١٢٠ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٢١ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ١٢٢ ﴾،

واتە: وە سروشمان بۆ لای مووسا کرد کە : گۆچانەکەت فڕێ بدە: ئنجا یەکسەر ئەوەی (بە جادوو) هەڵیان بەستبوو ، قووتی دان . ئیدی هەق چەسپاو ئەوەی کردبوویان (لە جادوو) هەڵوەشایەوە. سەرەنجام لەوێ تێشکانو بە زەبوونیی گەڕانەوە، وە جادووگەرەکانیش بە کڕنووش دا کەوتن . گوتیان : بڕوامان بە پەروەردگاری جیهانەکان هێنا . پەروەردگاری مووساو هاڕوون .

هەڵبەتە لێرەدا و لە بەرانبەر ئەو هەڵوێستە بوێرانەیەی جادووگەرەکان دا فیرعەون تووشی حەپەسانو شۆك دەبێو ، یەکجار قەڵس دەبێو ، دەست دەکات

بە هەڕو گیف لە جادووگەرەکانو ، پێش ئەوەش تۆمەتبارکردنیان بە پیلانگێڕیو ئاژاوەچییەتی :

﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَمَكۡرٞ مَّكَرۡتُمُوهُ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لِتُخۡرِجُواْ مِنۡهَآ أَهۡلَهَاۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿١٢٤﴾ ﴾ ، واتە: فیرعەون گوتی : ئایا بڕواتان پێهێنا بەرلەوەی مۆڵەتتان بدەم ؟! بێگومان ئەمە پیلانێکە لە شارەکەدا گێڕاوتانە تاکو خەڵکەکەی لێی وەدەربنێن ، ئنجا لەمەودوا دەزانن ! بە دڵنیایی دەستو لاقتان پێچەوانە (دەستی ڕاستو لاقی چەپ) دەبڕم ، پاشان هەمووانیشتان هەڵدەواسم .

بەڵام بێگومان جادووگەرەکان کە ئیمانو خوا بەیەکگرتن چۆتە دڵیانەوە بەرچاوڕوونییو غیرەتو ئازایەتیی تێدا پەیداکردوون، بۆیە وەك کێوی نەلەخشاو دەوەستنو بەچۆك دانایەن :

﴿ قَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ﴿١٢٦﴾ ﴾، واتە : گوتیان : بێگومان ئێمە بەرەو لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. وە تۆ هیچمان لی بە ڕەخنە ناگری جگە لەوەی کاتێك نیشانەکانی پەروەردگارمان بۆمان هاتن ، بڕوامان پێیان هێنا . پەروەردگارمان ! ئارامیی مان بەسەردا هەڵڕێژە ، وە بە مسوڵمانەتیی بمانمرێنە .

ئنجا بێگومان داروودەستەی وابەستەو دابەستەی فیرعەون ، لەبەردەم ئەو هەڵوێستە بوێرانەیەی ئەو بڕوادارانەی ئێستاو ، جادووگەرانی پێشوو بێدەنگ نابنو دەستەو ئەژنۆ دانانیشن :

﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ

(١٢٧) ﴾ ، واتە : کۆمەڵی دەستڕۆیشتوو لە گەلی فیرعەون پێیان گوت : ئایا واز لە مووساو گەلەکەی دێنی ، کە خراپەکاریی لە زەوی دا بکەن ، وە واز لە خۆت و پەرستراوەکانت بێنن (وێڵتان بکەن) ؟ (فیرعەون) گوتی : بێگومان کوڕەکانیان سەردەبڕینو ئافرەتەکانیان دەهێڵینەوە ، وە ئێمە بەسەریانەوە ملپێکەچکەرین .

هەڵبەتە لە بەرانبەر ئەو هەڕەشە دڕندانەیەش دا ، مووسا پێغەمبەری خواو مشوورخۆری گەلی ستەمدیدەی بەنی ئیسرائیل ، وەدەنگ دێ :

﴿ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ (١٢٨) ﴾ ، واتە : مووسا بە گەلەکەی خۆی فەرموو : یارمەتیی لە خوا وەربگرنو ، خۆڕاگربن ، بە دڵنیایی زەوی هی خوایە دەیکاتە میراتی هەرکەس لە بەندەکانی کە بیەوێ، وە سەرەنجام بۆ پارێزکارانە .

وە سەرەنجام بەنی ئیسرائیلی چەوساوە ، بە نائومێدییەوە دێنە قسە، بەڵام مووسا دڵیان دەداتەوەو موژدەی خۆشیان پێ دەدات :

﴿ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ (١٢٩) ﴾ ، واتە : (گەلەکەی مووسا) گوتیان : بەرلەوەی بێیە لامان ــ وەك پێغەمبەرێکی فریادڕەس ــ هەر ئازار دەدراینو ، دوای ئەوەی هاتشیە لامان بە هەمان شێوە ، ئازارو ئەشکەنجەمان هەر بەردەوامە ! (مووسا) فەرمووی : نیزیکە پەروەردگارتان دوژمنتان بفەوتێنێو لەسەر زەوی بتانکاتە جێنیشنیان ، ئنجا سەرنج بدات چۆن ڕەفتار دەکەن ؟!

ئاشکراشە سەرەنجام ئەوەی مووسا بە ڕەنگە ، نیزیکە (عَسَىٰ ) پێی گوتبوون، لەسەر ئەرزی واقیع هاتەدی، وەك لە دەرسی داهاتوودا باسیدەکەین .

# چەند مەسـەلەیەکی گرنگ

**مەسـەلەی یەکـەم** : ئـەو نـۆ ئـایەتەی دەرسـی ڕابـردوو ، شـیکردنەوەی ئـەو دەرس‌و پەنـدو عیبـرەتانە بـوون، کـە وەك یاسـای خـوا لـە ژیـان‌و گـوزەرانی ئـەو پێـنج پێغەمبەرانەو گەلەکانیاندا بەرجەستە بوون، وە بـە گشـتی لە ژیـانی بەشـەردا بەرجەستە بوون، ئنجا خوای کاربەجێ یەکسەر دوا بە دوای بەسەرهاتی نـووح‌و هوودو صـاڵح‌و لـووط‌و شوعـەیب، بەسەرهـاتی مووسـا ﷺ دێنێتـە پـێش‌و، دەفـەرموێ: ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾، واتـە: دوای ئـەوان (واتـە: دوای نووح‌و هوودو صالح‌و لووط‌و شوعەیب) مووسامان بە نیشانەکانی خۆمانەوە ، بۆ لای فیرعەون‌و داروودەستەکەی ڕەوان کـرد، کەچی ستەمیان لە ئایەتەکانمان کرد ، سـەرنج بـدە سەرەنجـامی خراپەکـاران چـۆن بـوو ؟ لێـرەدا حـەوت هەڵوەسـتە لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا دەکەین :

<u>هەڵوەسـتەی یەکـەم</u> : ئەوەیە کە دەفەرموێ : ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ ﴾، واتە: لە دوای ئـەو پێـنج پێغەمبـەرە صـەڵات‌و سـەلامی خـوایان لەسـەر بـێ، کە پێشـتـر بەسەرهاتەکـانیانمان باسکرد، مووسـامان بـە دوایانـدا نـارد، ئەمە چی لێوەردەگیـرێ ؟

ئەمە ئـەوەی لێوەردەگیـرێ ، کە پێغەمبـەران هـەموویان ڕێبـواری یـەك ڕێـن، هەموویان لە یەك کاروانن، هەموویان ئاڵقەکانی زنجیرێکن، سەرەتایەکەی بە ئادەم دەستی پێکردووە، کۆتاییەکەی بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ و هـەموویان تەواوکـاری ئیشی یەکدین، وە هیچ ناکۆکیی‌و پێکەوە نەگونجاوییەك لـە نێـوان بانگـەوازو پـەیامی پێغەمبـەراندا نـەبووە، بـەڵکـو هـەر کامێکـیان تەواوکـاری ئیشی ئەوی دیکە بووە، وە هەرکامێکیان ئەوەی پێش خۆی بەڕاست زانیوە.

هەڵوەستەی دووەم : کە دەفەرمویٚ: ﴿ بِـَٔايَـٰتِنَآ ﴾، لە سوورەتی (هـود)دا دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا وَسُلۡطَـٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ ﴾، وە لە سوورەتی (غافر)دا، بـە هـەمان شێوە دەفەرمویٚ : ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا وَسُلۡطَـٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ ﴾، شایانی باسیشە وشەی (آیة) لە قورئان دا ، بەسێ واتایان هاتوە[١]:

١) بـە مانای موعجیزە، وەك خوا دەفەرمویٚ : ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَـٰتِۭ بَيِّنَـٰتٖ ..﴿١٠١﴾ ﴾الإسراء، واتـە: ئێمە نۆ موعجیزەی ڕوونو ئاشکرامان بـە مووسا دابوون، کە دووانیـان گۆچانەکەیو دەستی بوون، وە حەوتی دیکەش بوون، وەك لـەم سوورەتی (الأعراف)دا باسکراون .

٢) مانایـەکی دیکـەی (آیـة) بریتیـە لـە دیاردەو دیمەنـە سروشتییەکان ، کە خـوا دروستی کردوون، وەك خـوای پەروەردگـار دەفەرمویٚ : ﴿ وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ یوسـف، واتە : زۆر نیشانە لە ئاسمانەکانو زەویدا هەن ، بـەلایاندا تێپـەڕ دەبن، بـەڵام سەرنجیان نادەن، واتـە: زۆر دیاردەی دروستکراو هـەن کـە دیمەنی سـەرنج ڕاکێشن، بـەڵام تەماشایان ناکـەن .

٣) مانای سێیەمی (آیـة) بریتیـە لە ڕستەکانی قورئـان، یـان بـە شێوەکی گشتی ڕستەکانی خـوای پەروەردگـار لـە کتێبـە ئاسمانییەکـان دا، بەڵـێ ڕستەکانی کتێبـەکانی خـواو ، قورئانیش خـوا ﷻ بـە ئـایەتی داناون ، وەك دەفەرمویٚ : ﴿ ... وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَـٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَـٰنٗا ...﴿٢﴾ ﴾الأنفال، واتە: وە ئەگەر ئـایەتەکـانی ئێمـەیان بـەسـەردا خـوێنرانەوە، ئیمانیـان پێیـان زیـاد دەبـێ، کـە مەبـەسـت پێیـان ڕستەکـانی قورئـانە، وە لێرەشـدا ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ

١) مانای زمانەوانیی (آیة) بریتیـە لە (علامة) یانی : نیشانە ؛ بڕوانە : مختار الصّحاح ، ص ٤٦.

﴿بِـَٔايَـٰتِنَا وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾﴾: دەگونجـێ مەبەسـت پێیـان ڕستەکـانی تەوڕات بێ، یان مەبەسـت پێیـان ئەو فەرمایشـتە بـێ ، کە خـوا ﷻ پێش ئـەوەی تـەوڕات لـە لەوحەکـان دا بـۆ مووسـا بنووسـێ فەرمایشـتی لەگـەڵ دا کـردوە ، دیارە لەوحەکان تایبـەت بـوون بـە بـەنی ئیسـڕائیلـەوە بـۆ ڕێکخسـتنی ژیـانو گوزەرانـی بـەنی ئیسـڕائیل ، وە دەشـگونجـێ مەبەسـت پێیـان ئـەو مـوعجیزەو نیشـانانە بـن ، کە خـوای بالادەست بـە مووسـای داون .

<u>هەڵوەسـتەی سـێـیـەم</u>: کـە دەفـەرموێ : ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾﴾، لە شـوێنێکی دیکەدا، دەفەرموێ : ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَقَـٰرُونَ فَقَالُوا۟ سَـٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾﴾غافر، وە لە شـوێنێکی دیکەدا ، دەفـەرموێ : ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ﴿١٢﴾﴾النمل، وە لـە شـوێنێکی دیکـەدا ، فەرموویەتی: ﴿وَفِى مُوسَىٰٓ إِذْ أَرْسَلْنَـٰهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾﴾ الذاريات !

بۆیـەش ئـەم ئـایەتانەم هێنـان، چـونکە ڕەنگـە کەسـێك بڵـێ : ئـایا ئەوانـە ناکۆکییـان لە نێـواندا نیـە ؟

ئێمە دەڵێیـن : نەخێر هیچ ناکۆکییەکیـان لە نێواندا نیـە ، چونکـە :

١) لـەو شـوێنەی کـە دەفـەرموێ : بـۆ لای فیـرعەونو دەسـتـڕۆیشتووەکـانی ، ئـایا دەسـتـڕۆیشـتووەکان کـێ بوون ؟ پێش هـەموو کەس هامـانو قـاڕوون بوون .

٢) وە کــە دەفــەرموێ : بــۆ لای فیـرعــەونو گەلەکەیــمان نــارد ، دیــارە دەسـتـڕۆیشتووانی گەلەکەی ، بـە نـاوی گەلەکەیەوە قسەیان کـردوە .

٣) وە کــە تەنیــا باســی فیــرعەون دەکــات ، لەبەرئەوەیــە کــە فیـرعــەون کۆمەڵگایەکـەی خـۆی لە خـۆی دا خولاسـە کردۆتـەوە .

کـەواتـە کـاتێك خـوا ﷻ باسی ڕووداوێك دەکـات ، بـە تەعبیـری جیـا جیـا باسـی دەکـات، هـەر تەعبیـرەی گۆشـەیەكو ڕوویەك لـەو بـەسـەرهاتە دەخاتە ڕوو.

هەڵوەستەی چوارەم : ئایا ئەم ئایەتانە چەند بوون ؟ وە چی بوون ؟ خوای پەنهانزان ، لە سوورەتی (النمل)دا بۆمان ڕوونکردۆتەوە ، دەفەرمویٚ : ﴿ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾ ﴾، نۆ موعجیزەو نیشانە بوون، وە لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرمویٚ : ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۖ فَسۡـَٔلۡ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِذۡ جَآءَهُمۡ فَقَالَ لَهُۥ فِرۡعَوۡنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسۡحُورٗا ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە : (ئەی موحەممەد !) بێگومان نۆ نیشانەمان بە مووسا دابوون ، { هەموویان بەڵگە بوون لەسەر ئەوە کە مووسا پێغەمبەری خوایە}، لەوبارەوە لە بەنی ئیسرائیل بپرسە .

ئنجا وەك دوایی باسی دەکەین ، من لە پەیمانی کۆندا هێناومە، کە ئەو موعجیزانەی خوا لە قورئاندا باسی کردوون ، ئێستاش لەگەڵ تۆزێك جیاوازیی لە کتێبەکانی ئەهلی کیتاب دا دەبینرێن، لەگەڵ ئەو هەموو دەستکارییەش کە کراون ، ئێستاش با وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە : ئایا ئەو ئایەتو نیشانانە چی بوون ؟

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی (١٣٠ تا ١٣٣) دا ، دەفەرمویٚ : ﴿ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ ﴾، دوایی دەفەرمویٚ : ﴿ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾، ئەوە حەوت، دوایی لە سوورەتی (النمل) لە ئایەتی (١٠)دا دەفەرمویٚ : ﴿ وَأَلۡقِ عَصَاكَ ... ﴿١٠﴾ ﴾، وە لە ئایەتی (١٢)دا دەفەرمویٚ: ﴿ وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖۖ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓ ﴿١٢﴾ ﴾، وە دەست بخە باخەڵت بە دراوەشاوەیی دێتە دەرێ، بێئەوەی کە نەخۆش بێ،

دەستەکەش یەکێکە لە نۆ نیشانەکان، دیارە ئێمە دوایی ئایەتەکان تەفسیر دەکەین.

بەڵام ئێستا بە کورتیی، دەیانهێنین :

١) ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ ﴾، وە ئالی فیرعەونمان سزادا بە ساڵانی گرانیی (سنین)، لە زمانی عەرەبیدا وشەی (السنة) واتە: ساڵی گرانیی و قات و قڕیی، وە (السنین) واتە: ساڵەکانی گرانیی و قات و قڕیی ، ئەوە موعجیزەو نیشانەی یەکەم.

٢) ﴿ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾، وە کەمیی بەروبووم، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن و بگەڕێنەوە، کەواتە : لە نۆ نۆیەکان ، ئەوە نیشانەی دووەم .

٣) ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ ﴾، ئنجا تۆفانمان بۆ ناردن، واتە : ئاو هەڵدەستاو بەرز دەبۆوە ، زەوییەکانی هەموو دادەپۆشی، ئەوە هی سێ یەم .

٤) ﴿ وَٱلْجَرَادَ ﴾، وە کوللەمان نارد ، ئەوە هی چوارەم .

٥) ﴿ وَٱلْقُمَّلَ ﴾، وە ئەسپێمان نارد، هەندێکیش دەڵێن: گەنەو قڕنوو، ئەوەی بە وڵاخە ڕەشەو وڵاخی سپییەوە دەنیشێ، دەیمژێ و نەخۆشی دەکات ، ئەوە نیشانەی پێنجەم .

٦) ﴿ وَٱلضَّفَادِعَ ﴾، وە بۆقمان بۆ ناردن ، ئەوە نیشانەی شەشەم .

٧) ﴿ وَٱلدَّمَ ﴾، وە خوێنمان بۆ ناردن ، لووتیان دەپژا ، خوێن لە زارو دەمو گوێیان دەهاتە دەر ، وە هەندێك لە زانایان دەڵێن : ئاویان دەبوو بە خوێن ، واتە : قاپیان لە ئاوێ هەڵدەدا ، خوێنی سوور بوو ، ئەوە نیشانەی حەوتەم .

٨) گۆچان (عصی)ەکەی بوو .

٩) وە دەست (ید)ی بوو ، کە دەیخستە بن باخەڵیو دەریدەهێنا دەدرەوشایەوە .

کەواتە: ئەو نۆ موعجیزەو نیشانەیەی مووسایان پێ ڕەوانە کرابوو بۆ لای فیرعەونو گەلەکەی ، ئەم نۆ موعجیزەیە بوون.

هەڵوەستەی پێنجەم : کە دەفەرموێ : ﴿ فَظَلَمُواْ بِهَا ﴾، یانی: (فَكَذَّبُوا بِها ظالمين) واتە: ستەمکارانە بە درۆیان زانی، لێرەدا وشەی (ظَلَمُوا) وشەی (تَكْذِيب)ی خراوتە نێو، خوا ﷻ لە جیاتی ئەوەی دوو ڕستە بفەرموێ : (فَكَذَّبُوا بِها وَظَلَمُوا) یەکسەر فەرموویەتی : ﴿ فَظَلَمُواْ بِهَا ﴾، ستەمکارانە بە درۆیان دانا، چونکە وشەی (ظَلَمَ) لە زمانی عەرەبیدا بۆخۆی (تَعَدّي) دەکاتو، پێویستی بە پیتێك ناکات، بەڵام بۆ وشەی (كَذَّبَ) دەبێ بڵێی : (كَذَّبَ بِهِ)، کەواتە : کاتێك وشەی (ظَلَمَ) دەچێتە سەر وشەی (كَذَّبَ)ە ، مانای (تَكْذِيب) دەگرێتە خۆی، ئەمەش یەکێکە لە ڕووەکانی ئیعجازی ڕەوانبێژیی لە قورئاندا، خوای پەروەردگار وشەیەك بەکاردێنی کە مانای دوو ڕستە دەگەیەنێ ، بە پێی بنچینەی (تضمين).

وە لە سوورەتی (النمل)دا ، خوا دەربارەی فیرعەونو داروودەستەکەی ، دەفەرموێ : ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ...﴿١٤﴾ ﴾، واتە: نکووڵییان لێی کردو دانیان پێدانەهێناو دڵنیاش بوون لە دڵی خۆیان کە (پەیامەکەیو موعجیزەکانی (مووسا) ڕاستن .

ئنجا ئایا ئەو نکووڵیی کردنە ، بەهۆی چییەوە بوو ؟ دەفەرموێ : ﴿ ... ظُلۡمًا وَعُلُوًّاۚ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤﴾ ﴾، لە ئەنجامی ستەمکردن خۆبە زلگرتن دا، سەرنج بدە سەرەنجامی خراپەکاران چۆن بوو .

وە لــە شــوێنی دیکــەدا دەفــەرموێ : ﴿ فَٱسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ الـمؤمنـون ، واتـە : خۆیان بـە زلگرتو، گەلێکی سەرکێش بوون .

وەك دەبینـین : لێـرەدا دەفـەرموێ: ﴿ فَظَلَمُواْ بِهَا ﴾، وە لـە شـوێنێکی دیـکەدا دەفــــەرموێ : ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا ﴾، وە لـــە شـــوێنی دیکـــەدا دەفـــەرموێ : ﴿ فَٱسْتَكْبَرُواْ ﴾، ئنجـا ئـایا ئەوانـە تێکدەگیـرێـن ؟ بێگومـان نەخێـر، چـونکە فیـرعەونییەکان هـەم ستەمیان لە ئایەتەکـان کـردوە ، کە بـە درۆیـان دانـاون، هــەم نکوولێشــیان لـێکــردوون، دوای ئــەوەی کــە زانیوویانــە ڕاســتن ، وە هــەم خۆشیان بـە زل گـرتوە، وە ئەم وشـانە هـەر یەکەی تەعبیـر لـە لایـەکی بابــەتەکە دەکــات.

هەڵوەســتەی شــەشــەم :

أ/ دیـارە مووسـا ﷺ بـە تەنیـا نـەبوو ، بـەڵکـو هارۆونیشــی لەگــەڵدابوو ، وەك خـوا لە سوورەتی (الـمؤمنون)دا باس دەکات ، دەفەرموێ :﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتــە: دوایــی مووســـاو هـــارۆونی برایشـــمان بـــە نیشانەکانمانەوەو بە بەڵگەیەکی ڕوونەوە نـارد بۆ لای فیـرعـەونو دارو دەسـتە دەسـتـرۆیشتووەکەی ، کەچی خۆیان بە زلـگرتو کۆمەڵێکی خۆ بەزرگر بوون .

دیـارە ئـەوە فەزڵــێکی زۆر گــەورەیە، بــۆ مووســا ، کــە هــەرچی حاڵــەتی هەســتیاریی‌و حەســادەتە ، لـەو پێغەمبــەرە پایـە بــەرزەدا نەبــووە، ئــەوەتا بۆخۆی داوا لـە خــوا دەکـات، هــارۆونی براشـی لەگــەڵ بکـات بـە پێغـەمبــەر ، تاکو لەگەڵی دا بـێ .

ئنجـا هــارۆون وەك چـی لەگــەڵ مووســادا بــووە ؟ وەك وەزیــر، لـە کـوێ ئەوەمان بۆ دەردەکـەوێ ؟

ب/ لە سوورەتی (الفرقان)دا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾ فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە کتێبمان بە مووسادا، وە هارِوونی برایشیمان لەگەڵی کردە وەزیر، ئنجا پێمان گوتن: بڕۆن بۆ لای ئەو گەلەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ داناوە، کە ماڵوێرانمان کردن، لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ داناوە.

وشەی وەزیریش لە قورئان واتە: پاڵپشت، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴿١٢﴾ ﴾القيامة، هیچ پشتو پەنایەك نیە، لەو ڕۆژەدا (لە لای خوا) شوێنی سەقامگیریی (کارەکان) بۆ لای پەروەردگارتە.

لە زاراوی ئێستاش دا وشەی وەزیر، هەمان مانای هەیەو، مەبەست لە وەزیرەکان ئەو کەسانەن کە پاڵپشتن بۆ سەرۆك وەزیران، یاخود بۆ سەرۆك کۆمار.

ج/ وە هارِوونیش لەسەر پێشنیارو داوای مووسا، کراوە بە پێغەمبەرو وەزیر، وەك پێشتر ئاماژەم پێدا، بەڵام لە سوورەتی (طه) ئایەتەکانی (٢٩ تاکو ٣٦)دا، دوای ئەوەی خوای پەروەردگار مووسا دەنێرێ، بۆ لای فیرعەون، کە ئەو کەسێکی یاخیی بووە، تاکو پێی بڵێ: من پێغەمبەرمو پەیامی خوام بۆت هێناوە، مووسا کەسێکی زۆر عاقڵو دووربین بووە، یەکسەر ناچێ ملی ڕێگا بگرێ، بڵێ: مادام خوا دەمنێرێو، خوا قسەی لەگەڵ کردووم، یەکسەر دەڕۆم! بزانن چەند دوور بینو ورد بووە! ئەگەرچی زۆر پشتی بە خوا بەستووەو زۆر لە خۆی ڕابینیوە، بەڵام سەرەتا لە خوا دەپاڕێتەوە:

﴿ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِى صَدْرِى ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِىٓ أَمْرِى ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِى ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِى ﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّى وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِى ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِى ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ

أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە : گوتی : پەروەردگارم ! سینەم گوشاد بکە، سینەم فراوان بکە، (چونکە ئینسانی چیکڵدانە گچکە ، کاری گەورەی بۆ ناکرێ) . وە کارم ئاسان بکە (ئینسانی سینگ فراوان هەمیشە کاریشی ئاسان دەبێ، بەڵام ئینسانی چیکڵدانە گچکە هەمیشە ئیشی لێ دەئاڵقێ). وە گرێی زمانم بکەوە ، تاکو لە قسەکەم باش تێبگەن ، وە لە نیزیکانی خۆم پاڵپشتێکم بۆ پەیدا بکە، (کێ بێ ئەو پاڵپشتە) هارونی برام. (هارون لە موسا گەورەتر بووە ، پیاوێکی زۆر نەرمو نیانو لەسەرخۆبووە ، ئنجا بۆچی داوا دەکات هارون ببێتە پاڵپشت ؟) پشتم پێی بەهێز بکە ، وە لە کارەکەشم دا هاوبەشی بکە ، بۆ ئەوەی زۆر تۆ بە پاك بگرین ، وە زۆر یادی تۆ بکەین ، وە تۆ دەمانبینی (کە هەمیشە پێویستیمان بە هاوکاریی و یارمەتی تۆ هەیە) خوا فەرمووی : ئەی موسا داواکەت جێبەجێ کرا .

کەرەمو بەخشندەیی خوا سنووری نیە، بە مەرجێك مرۆڤ داوای بەجێ بکات، خوای بەخشندە پێی دەبەخشێ .

هەروەها هەر لەوبارەوە پێشتریش ئایەتەکەمان هێنا، لە سووڕەتی (مریم)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥١﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: لە کتێبدا باسی موسا بکە، کە ئەو هەڵبژێردراو بوو، وە پێغەمبەرو ڕەوانەکراویش بوو، واتە : پەیامی خوای پێبوو، وە لە لای ڕاستی (طور) (کە جیایەکی دیاریکراوە، یاخود جیایەکە لە جیاکان) بانگمان کرد ، وە لە خۆمان نیزیکمان خستەوە ، قسە (ی تایبەتمان)مان لەگەڵدا کرد. وە لە ئەنجامی بەزەیی خۆماندا ، هارونی برایشیمان وەك پێغەمبەر پێ بەخشی .

كە دیارە پێشتر داوای كرد، وە لە شوێنی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءًا يُصَدِّقُنِيٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ ﴾القصص، واتە: وە هاڕوونی براشم بنێرە ، ئەو زمانی لە من پاراوترە ، پشتیشم بگریۆ بەڕاستم بزانێ ، من دەترسم كە ئەوانە من بە درۆ دابنێن .

تەماشا بكەن ! مووسا چەندە بە ئینصاف بووە ، فەزڵێك كە لە هاڕوونی برای دا هەیەو ، بەو ڕاددەیە لەودا نیە ، باسی دەكات، ئنجا ئەوە دیارە كە ئەوانەی بەلای تووڕەییدان ، زۆرجار ڕەنگە نەتوانن وەك پێویست تەعبیر بكەن ، لەوەی لەنێو دڵو دەروونیان دایە ، بۆیە مووسا پێویستیی بە هاڕوون بوو ، صەڵاتو سەلامی خوا لەسەر هەردووكیان بێ .

هەڵوەستەی حەوتەم: كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾

ئەمە یاسای خوایە، خراپەكاران هەمیشە سەرەنجامیان خراپە، لەوبارەوە خوا فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئۡتُم بِهِ ٱلسِّحۡرُۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبۡطِلُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٨١﴾ ﴾ یونس ، واتە : كاتێك مووسا پەتو گۆچانەكیان فڕێ دا ، مووسا گوتی : ئەوەی كردتان جادوویە ، بێگومان خوا پووچەڵی دەكاتەوە ، بێگومان خوا كاری خراپەكاران چاك ناكات ، واتە : ناهێڵێ بەرهەمداربێو ، سەرەنجامی خێربێ.

ئنجا ئایا ئەو فیرعەونەی مووسا بۆ لای چووە كێ بووە ؟ چۆن بووە ؟ ناوی چی بووە ؟ چی لە نێوانیاندا ڕوویداوە ؟ لە مەسەلەی دووەم دا باسی دەكەین .

**مەسەلەی دووەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرۡعَوۡنُ إِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، مووسا گوتی: ئەی فیرعەون ! دڵنیابە من لەلایەن پەروەردگاری جیهانەكانەوە نێردراوم .

ئەو کات فیرعەون ناوێکی مەمدوح بووە، پادشاکانی میسرِ نازناویان فیرعەون بووە، پادشاکانی فارس نازناویان (کیسرا) بووە، پادشاکانی ڕۆم نازناویان (هیرەقل) بووە، (خان) نازناوی پادشای توورکەکان بووە، (نەجاشیی) نازناوی پادشای حەبەشییەکان بووە، (نەمردوود) نازناوی پاشای کەنعانییەکان بووە، وە (تُبَّعْ) کە بە کۆ (تبابعة)یان پێ دەگوترا، نازناوی پادشای یەمەن بووە .

ئنجا کە مووسا دەڵێ : ﴿ يَـٰفِرۡعَوۡنُ ﴾، واتە: ئەی پادشای میسرِ، چونکە گومان لەوەدا نیە هەموو پێغەمبەران زۆر بە نەزاکەت بوون، زۆر بەڕێز بوون، ناوی سووکیان لە خەڵك هەڵنەداوە، بۆیەش ئەوەم ڕوونکردەوە، چونکە ئێستا کە دەگوترێ : فلان کەس بۆتە فیرعەون، کە بە مانا عورفییەکەی واتە: ستەمکار، ڕەنگە هەندێك وابزانێ مووسا ناوێکی خراپی لە فیرعەون هەڵداوە ! نەخێر، هەر ئەوە نازناوی خۆی بووە ، کە کۆیەکەی (فراعِنة)یە ، ئنجا مووسا دەڵێ : ئەی فیرعەون ! من ڕەوانەکراوم لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە ، لەسەر من پێویستە کە بە ناوی خواوە ، تەنیا هەق بڵێم ، واتە : هەرچی بە ناوی خواوە دەیڵێم هەمووی هەر هەقە ، درۆ ناکەم ، وە لە پەروەردگارتانەوە بەڵگەیەکی ئاشکرام بۆ هێناون ، بۆیە بەنی ئیسرائیلم لەگەڵ بنێرەو چی دیکە مەیان چەوسێنەوەو ستەمیان لێ مەکە .

دیارە لێرەدا دەبێ پێنج هەڵوەستە بکەین :

<u>هەڵوەستەی یەکەم :</u> باسمان کرد، کە مووسا پادشای میسری بە نازناوی خۆی بانگ کردوە، چونکە پادشاکانی میسرِ نازناویان فیرعەون بووە .

<u>هەڵوەستەی دووەم :</u> مووسا عليه السلام پێناسەی خۆیو هاڕوونی برای دەکات، ئایا ئەو دوو پیاوە کێن ؟ لە کوێ پەیدابوون ؟ چ کارێکیان هەیە ؟ ئنجا ئایا چۆن ڕێگا دراوە ، ئەو دوو نەفەرە بچنە لای پادشایەكو قسەی لەگەڵ بکەن ؟ لە تەفسیرو کتێبە مێژووییەکان دا زۆر شت باسکراوە ، بەڵام خوای کاربەجێ ئەم وردەکارییانەی باس نەکردوون ، ڕەنگە فیرعەون مووساو هاڕوونی ناسیبێتەوە ، کە مووسا کاتی خۆی لە ماڵی ئەودا بەخێو کراوە ، ئایا مووسا چی پێ دەڵێ ؟ دەڵێ : من ڕەوانەکرام لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە ،

واتە: هەرچی دەیڵێم ، قسەی خۆم نیەو لە گیرفانی خۆمەوە دەریناهێنم ، پەیامێکە پێمەو پێت ڕادەگەیەنم، مـن (رسول)م، (رسول)و (مُرْسَلْ) کەسێکە لەلایەن کەسێکی دیکەوە نێردراوە، کە ئەویش (مُرْسِلْ)ە واتە: ڕەوانەکار، نێرەر.

ئنجا دەڵێ : پاشان پەیامێکیشم پێیە، لە کێ وە ؟ ﴿مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، لە پەروەردگاری جیهانەکانەوە، چونکە فیرعەون داوای پەروەردگارێتیی کردوە ، گوتوویەتی : ﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾ النازعات، واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرز مەزنتانم، کەواتە: هەر لەڕێوە مووسا ﷺ پێی دەڵێ : تۆ پەروەردگار نی ، بەڵکو پەروەردگار ئەو کەسەیە کە منی ناردوە بۆ لای تۆ، پەیامێکی پێدا ناردووم، دیارە فیرعەون نەك هەر پەروەردگار، بەڵکو خۆی بە پەرستراویش زانیوە : ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾القصص، واتە: فیرعەون گوتی: ئەی دەستو پێوەندو قسە ڕۆیشتووان ! من جگە لە خۆم پەرستراوێکی دیکەم بۆ ئێوە پێ شك نایەت ، هەر من پەرستراوتانم... .

<u>هەڵوەستەی سێیەم</u> : ئنجا مووسا دوای ئەوەی خۆی وەك نوێنەرو ڕەوانەکراوی خوا ناساند، دەفەرموێ : ﴿ حَقِيقٌ عَلَىٰٓ ﴾، یاخود : (حَقِيقٌ عَلَـيَّ) لەسەر من پێویستە ﴿أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ﴾، کە بە ناوی خواوە ، جگە لە هەق هیچی دیکە نەڵێم، ئەوەی دەیڵێم هەمووی هەقەو ڕاستەو بێ کەمو زیاد خوای پەروەردگار پێی فەرمووم ، ئاوا بڵێم .

ئنجا وشەی ﴿ حَقِيقٌ عَلَىٰٓ ﴾، دوو واتای هەن :

١) لەسەرم پێویستە کە بەس هەق بڵێم .

٢) سوورم لەسەر ئەوە کە بەس هەق بڵێم بە ناوی خواوە .

شارەزایانی زمان گوتوویانە : (ضُمِّن حَقِيقٌ مَعْنى حَرِيص)، وشەی (حَقيق) مانای (حَرِيص)ی خراوەتە نێو : (حَقٌ عَلَيَّ ألاَّ أقُولُ إلاَّ الحَق ، وَأنَا حَرِيصٌ عَلَى ألاَّ أقُولُ إلاَّ الحَقّ) ، واتە : لەسەرم پێویستە کە تەنیا هەق بڵێم ، وە من سوورم لەسەر ئەوەی جگە لە هەق هیچی دی نەڵێم .

جا دیارە بەندەکانی خوا، نوێنەرانی ئایینی خوا، چ پێغەمبەران بن، چ زانایانو جێگرانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر هەقیان شایستەیە بیڵێن، وە نابێ شتی ناڕاست بڵێن، تەنانەت بە دوژمنانیش دەبێ هەر قسەی ڕاستو دادگەرانەو بە ئینصافانە بڵێن، واتە: بە چاکەی دوژمنیش بڵێن چاکە، بە هەقی دوژمنیش بڵێن هەقە، وە نابێ ڕق هەڵسانیان لە کردەوە خراپەکانیان ، وایان لێ بکات کە کردەوە چاکەکانیشیان نەبینن.

هەڵوەستەی چوارەم : ئنجا ئایا مووسا هەر لەخۆوە هاتوە ؟ یان بەڵگەی پێیە ؟

دەفەرموێ : ﴿قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾، لە پەروەردگارتانەوە بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرام بۆ هێناون، دیارە (بيِّنة) بە مانای موعجیزەو بەڵگە دێ ، دوای ئەوەی دوو موعجیزەو بەڵگەی پێ پێشاندان ، کە بریتی بوون لە گۆچانەکەیو دەستی، ﴿مِّن رَّبِّكُمْ﴾، واتە: لە پەروەردگارتانەوە، پێشێ فەرمووی : ﴿مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، لە پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە، بۆچی وایفەرموو ؟ تاکو دوایی فیرعەون نەڵێ : پەروەردگاری من نیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿مِّن رَّبِّكُمْ﴾، لە پەروەردگاری ئێوەوە، واتە: تۆش هەر بەندەیەکی، ئەوە نی کە پەروەردگاربی ، یان خوا دەستەڵاتێکی پێدابی، چونکە زۆر لە پادشاکانی دنیا لەبەرئەوەی خۆیان بە سێبەری خوا، یان وەکیلی خوا ناساندوە، پەرستراون .

هەڵوەستەی پێنجەم : ئنجا ئایا مووسا بۆچی نێرراوە ؟ ﴿فَأَرْسِلْ مَعِىَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾، بەنی ئیسرائیلم لەگەڵ بنێرە ، واتە : ئامانجی سەرەکیی مووسا ڕزگارکردنی گەلەکەی بووە ، کەواتە : ڕزگارکردنی گەلو کۆمەڵگا ئامانجێکی گەورەیە ، چونکە هەندێ کەسی کرچو کاڵو فام کاڵ ، کاتێك گوێبیستت

دەبێ ، کە باسی مافی نەتەوەیی‌و نشتیمانیی‌و چانووسیی گەلەکەت دەکەی، جا کوردە، عەرەبە، فارسە، تورکە، ... هتد، دەڵێ : ئەوە لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێ ! نەخێر وانیە، ئەوەتا پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك مووسا ﷺ هەموو ئیشەکەی ئەوە بووە ، کە بچێ بۆ لای فیرعەون ، تاکو گەلی بەنی ئیسرائیلی لەگەڵ ڕەوانە بکات، چی دیکە نەیانچەوسێنێتەوە، ئێمەش ئەگەر گەلی خۆمان ڕزگار بکەین‌و، نەهێڵین بچەوسێنرێتەوەو ، هەوڵبدەین قەوارەی سیاسییمان هەبێ‌و، بە مافەکانی خۆمان بگەین، ئەوە شتێکمان کردوە، وەك ئەوەی پێغەمبەران، کە شتێکی زۆر چاك‌و پەسندو چاکە.

بەڵام ئەوەی کە خراپە ، دەمارگیرییە، دەمارگیریی (تَعصُّب)یش ئەوەیە کە تۆ یارمەتی گەل‌و خەڵکەکەت بدەی لەسەر ستەم، یاخود خراپی قەومەکەت پێ لە چاکەی قەومێکی دی چاکتر بێ ، ئەگەرنا مادام جیاوازیی نەکەی، با لەگەڵ قەومی خۆشتدا چاکە بکەی ، مادام بە موستەحەق‌و شایستەیان دەزانی ، ئەوە : (الأَقْرَبُونَ أَوْلَى بالمعْرُوفِ) واتە: ئەوانەی کە نیزیکن شایستەترن کە چاکەیان لەگەڵدا بکرێ.

ئنجا با بزانین چی ڕوویداوە ، لە نێوان مووساو هاروون لە لایەك ، وە فیرعەون دا، لە لایەکی دیکەوە ؟ :

١ - خوای پەروەردگار لە سوورەتی (طه)دا باسی مووساو هاروون دەکات ، کە ناردوونی بۆ لای فیرعەون، دەفەرموێ : ﴿ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْۖ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: بچن بۆ لای فیرعەون ، پێی بڵێن: ئێمە ڕەوانەکراوی پەروەردگاری تۆین، بۆیە وەچەی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرە، چی دیکە سزاو ئازاریان مەدە، لە پەروەردگارتەوە بەڵگەو نیشانەمان بۆ هێناوی ، ئاشتیی‌و سەلامەتیی لەسەر کەسێك بێ ، کە بە دوای ڕێنمایی خوا دەکەوێ .

واتە : ئەگەر بە دوای ڕێنمایی خوا نەکەوێ‌و ، هەر خەڵك بچەوسێنێتەوە، ئەوە سەلامەت نابێ !

٢ - لە سووڕەتی (الشعراء)دا دوای ئەوەی مووسا ﷺ دەڵێ: دەترسم لێم تێنەگەن، وە دەترسم بمکوژن، چونکە کاتی خۆی نەفەرێکم لەوان کوشتوە، دەترسم بە درۆم دابنێن، خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ كَلَّا فَٱذۡهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسۡتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأۡتِيَا فِرۡعَوۡنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنۡ أَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: فەرمووی : نەخێر (زیانت پێناگەیەنن) بە نیشانەکانی ئێمەوە بڕۆن، ئێمە لەگەڵ ئێوەدا بیسەرین، (مشتومڕو قسەی تۆ، وەڵامی فیرعەون ، هەمووی دەبیستین ، ئاگامان لێتانە) بڵێن : ئێمە ڕەوانەکراوی پەروەردگاری جیهانەکانین، هاتووین کە بەنی ئیسڕائیلمان لەگەڵ بنێری ، ئیزنیان بدەی (تاکو چی دیکە نەیانچەوسێنیەوە ، دەیانبەین بۆ وڵاتێکی دی، ڕزگاریان دەکەین لەو سۆغرەو بێگارو سووکایەتییەی پێیان دەکەی : ئافرەتەکانیان دەهێڵیەوە ، کوڕەکانیشیان سەردەبڕی) .

٣ - ئنجا خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (طه)دا دەفەرموێ : ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: بێگومان من لەگەڵتانم، دەبیستمو دەشبینم ، دەبینم چی دەکەنو چۆن دەکەن ؟ وە دەشبینم ئاگام لە قسەو باستان هەیە .

٤ - وە لە سووڕەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ فَقَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا وَقَوۡمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، هەموو ئەو ئایەتان ئەوە دەگەیەنن، کە بەنی ئیسڕائیل وەك کۆیلە چەوسێنراونەتەوە، ئەوەتا دەڵێن: ئایا بڕوا بێنین بۆ دوو بەشەران (بۆ دوو کەسان)، کە گەلەکەشیان ملکەچو بەردەستی ئێمەن، ژێردەستی ئێمەن.

٥ - کاتێك فیرعەون بە مووسا دەڵێ : ﴿ قَالَ أَلَمۡ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدٗا وَلَبِثۡتَ فِينَا مِنۡ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ ﴾الشعراء، ئایا ئێمە تۆمان بە گچکەیی بەخێو نەکرد، چەند ساڵان لە تەمەنت لە نێو ئێمەدا نەمایەوە، لە ماڵی ئێمە بەخێو

نەکرایو ؟! چونکە وەك دوایی باسی دەکەین، مووسا بە منداڵیی دایکی بە ڕووباری دادوەو ، داروودەستەی فیرعەون هەڵیانگرتۆتەوەو لە ماڵی وی دا بەخێویان کردوە.

دیارە مووسا وەڵامێکی زۆر چاکی ئەو منەتەی فیرعەون دەداتەوە ، کە گوایە ئەو بەخێوی کردوەو گەورەی کردوە ، لە سووڕەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ : ﴿ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: ئەو چاکەیە کە بە چاوی منی دادەدەیەوە ، بەهۆی ئەوەوە بوو ، کە تۆ بەنی ئیسرائیلت کردبوو بە کۆیلەو دەتچەوساندنەوە ، ژێردەستەت کردبوون .

کەواتە: بەنی ئیسرائیل ژێردەستەو زەبوون بوون، چەوساوەی ژێردەستی فیرعەون بوون، وە ئامانجی سەرەکیی مووسا لە چوونی بۆ لای فیرعەون ، ئەوە بووە، کە لە چەوسانەوەو ستەمدیدەیی ڕزگاریان بکات، وە بیانبات بۆ شوێنێکی دی.

**مەسەلەی سێیەم** : دیارە فیرعەونیش وەڵام دەداتەوە، بەڵام چۆن وەڵام دەداتەوە؟ ﴿ قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾، دەڵێ : ئەگەر نیشانەیەکت هێناوە ، بیخەڕوو ئەگەر لە ڕاستانی .

هەڵبەتە لێرەدا باس نەکراوە ، کە مشتومڕیان بووبێ و ، مووسا بەڵگەی بۆ فیرعەون هێنابێتەوە، یان فیرعەون قسەی کردبێ، بەڵام لە هەر کام لە سووڕەتەکانی (طـه)و (الشعراء)و (غافر)دا باسی وتووێژی نێوان مووساو فیرعەون کراوە :

١/ لە سووڕەتی (طه) ئایەتەکانی (٤٩ تا ٥٢)دا خوا باسی مشتومڕەکەیان دەکات، کە بەم شێوەیە بووە : دوای ئەوەی خوا مووساو هاڕوون دەنێرێ بۆ لای فیرعەون ، بۆئەوەی بەنی ئیسرائیلیان ڕەگەڵ بخاتو ، چی دیکە نەیانچەوسێنێتەوە ، وەك پێشێ باسمان کرد، ئەم وتووێژەیان دەبێ : ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَـٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ

فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٍۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: (فیرعەون) گوتی : ئەی مووسا ! پەروەردگاری ئێوە کێیە ؟ (یانی: هەر من پەروەردگارو پەرستراوو گەورەتانم، هیچ گەورەی دیکەتان نیە)، (مووسا) گوتی : پەروەردگارمان ئەو کەسەیە، کە بوونی بە هەموو شتێك داوە، دوایی ڕێنماییشی کردوە .

لێرەدا مووسا هەردووك یاسای : هۆکاریی (السببیة)و ڕێکخستن (نظام)ی باسکردوە ، کە دەڵێن : {هیچ پەیدابوویێك بێ پەیداکەر نابێ}، وە {هەموو ڕێك و پێکییەك ڕێکخەرێکی هەیە} : (لِكُلّ حَادِثٍ مُحْدَث ، وَلِكُلّ نِظامٍ مُنْظِم) ، بەم ڕستەیە هەردوو بەڵگەکە لێك دەداتو ، دەڵێ : ﴿ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾، پەروەردگارمان ئەو کەسەیە، کە بوونی بە هەموو شتێك داوەو دروستی کردوون، (ئەوە یاسای یەکەم) وە دوایی ڕێنماییشی کردوون ، کە چۆن بژینو ، چۆن بەڕێوە بچن ؟ لە گەردیلە تا کەهکەشان ، وە ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان ، خوا هەمووی بەدیهێناوەو ڕێکی خستوەو بەرنامەشی بۆ داناوە ، هیچی لە بەرنامەی خوا لانادات ، هەر کامیانی لە جوانترینو باشترین شێوەشدا خولقاندوە ، یانی : تۆ کە لێمان دەپرسی : پەروەردگارتان کێیە ؟ ئا ئەوە پەروەردگاری ئێمەیە، وە تۆ یەکێکی لەوانەی کە خوا دروستی کردوونو ، ڕێگاو بەرنامەشی بۆ داناون ، ئەوەتا بەرنامەی بۆ ناردووی لە بەشە ئیختیارییەکەتدا، چونکە فیرعەونیش لە بەشە ئیجبارییەکەی دا وەك خەڵکی دی خوارددوویەتیو خوارددوویەتەوەو خەوتوەو ، نەیتوانیوە لە یاسای خوا دەربچێ .

ئنجا دوای ئەوەی فیرعەون لە بەرانبەر ئەم بەڵگە ڕوونو بێ چەندوو چوونەی مووسادا گیر دەخوات، هەوڵدەدات بیگوازێتەوە بۆ بابەتێکی دی : ﴿ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٍۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: (فیرعەون) گوتی: ئەدی گەلە پێشووەکان چییان

لێهات ؟ سەرەنجامیان چۆن بوو ؟ مووساش وەڵامێکی زۆر کورتی دەداتەوەو دەیگرێ‌و، ناهێڵێ بەملاولادا بڕوات، دەڵێ : زانیاریی ئەو گەل و میللەتانە لە لای پەروەردگارمە ، لە کتێبێك دا، کە پەروەردگارم نە لێی ون دەبێ‌و ، نە لەبیری دەچێ .

٢/ بەڵام لە سووڕەتی (الشعراء) ئایەتەکانی (١٦ تا ٣٣)دا درێژتر ئەم وتووێژە باسکراوە، ئنجا کەسێك کە شارەزا نەبێ ، هەر بە سەرکێڵیی تەماشای قورئان بکات، دەڵێ : خوا لێرەدا بەم شێوەیە باسی ئەم وتووێژە دەکات، کەچی لە سووڕەتی (الشعراء)دا بە شێوەیەکی دیکە باس دەکات، لە حاڵێك دا کە هەردووکیان یەك بەسەرهاتن ؟! وەڵامەکەشی ئەوەیە کە : لە سووڕەتی (طه)دا خوا بە کورتیی باسی کردووە ، لە سووڕەتی (الشعراء)دا بە درێژیی باسی کردوە.

ئنجا ئێمە لێرەدا تەنیا مانای ئایەتەکان دەکەین‌و لە کاتی تەفسیرکردنی سووڕەتی (الشعراء)دا بەتەفصیلْ باسی دەکەین ، خوا پشتیوان بێ ، دەفەرموێ :

﴿ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾
قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى
فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ
مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا
عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ
﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ
لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ

ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ أَوَلَوۡ جِئۡتُكَ بِشَيۡءٖ مُّبِينٖ
﴿٣٠﴾ قَالَ فَأۡتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلۡقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعۡبَانٞ مُّبِينٞ
﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيۡضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾، واتە: هەردووكتان بچن بۆ لای فیرعەونو بڵێن : ئێمە ڕەوانەكراوی پەروەردگاری جیهانەكانین ، هاتووین كە بەنی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێری ، (فیرعەون) گوتی : ئایا تۆمان بە گچكەیی لە لای خۆمان بەخێو نەكردوە ؟ ساڵانێكی زۆر لە تەمەنت لەنێو ئێمەدا نەمایەوە ؟ وە ئەو كەتنو كردەوەیەشت كرد ، كە كردت (یانی : نەفەرێكت كوشت) ؟ وە تۆ سپڵە بووی، (مووسا وەڵام دەداتەوە، هەڵبەتە، پێغەمبەرانی خوا زۆر ڕاستگۆ بوون، كە هەڵەیەكیان لێ ڕوودابێ دانی پێدا دێنن) ، دەڵێ: ئەو كردەوەیەم كە كرد، ئەوكات من بۆخۆم سەرگەردان بووم، بە ڕێیەم نەدەزانی، (واتە: ئەو كات وەحییم بۆ نەهاتبوو، پێغەمبەر نەبووم، نەمدەزانی چۆن چارەسەری كێشەو گرفتەكان بكەم، بەرگرییم لەو ستەم لێكراوە كردوە ، ئەو ستەمكارەم لە دەست كوژرا) ئنجا لە ترسی ئێوە ڕامكرد، ئنجا پەروەردگارم حیكمەتی پێدامو منیشی گێڕا لە ڕەوانەكراوان (واتە: منی كردە پێغەمبەر)، بەڵام بەنسبەت ئەوەوە كە لە ماڵی ئێوەدا بەخێوكرام ، كە ئەوەش چاكەیەكە منەتی پێ لەسەر من دەكەی ، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو كە تۆ بەنی ئیسرائیلت دەچەوساندەوەو ، كردبوونت بە ژێردەستەو كۆیلەی خۆت (بۆیە من بە ڕووباردا درامو ، هاتم لە ماڵی تۆدا بەخێوكرام، ئەگەرنا دایكم منی لێ بەلا نەبوو، تا بمخاتە تابووتێكو بە ڕووبارم دابدات، بەڵكو لە ترسی ئەوەی كە تۆ نێرەكانت سەردەبڕین ، دایكم ترسی ئەوەی هەبوو سەرببڕدرێم، خستمیە تابووتێكەوەو بە ئیلهامی خوا بە ڕووباری داداو دوایی لە لای ئێوە گیرسامەوە).

ئنجا فیرعەون گوتی : ئەدی پەروەردگاری جیهانەكان چییە ؟ (نەیگوت : كێیە ؟) (مووسا) گوتی : پەروەردگاری ئاسمانەكانو زەویو ئەوەی نێوانیانە ، ئەگەر زانیارییتان هەبێو بتانەوێ ئیمان بێنن.

(فیرعەون) بە دەوروبەرەکەی گوت : ئایا گوێتان لەو قسانەیە (واتە: ئەو قسە سەیرو نامەنتیقییانە !)

(مووسا) گوتی : پەروەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باب و باپیرانی پێشووشتانە .

(فیرعەون) ڕووی لە خەڵکەکە کردو گوتی : ئەو پێغەمبەرەتان کە بۆ لاتان ڕەوانە کراوە شێتە .

(بە تەوسەوە وای گوت ، یانی : ئەوە پێغەمبەر نیە ، چونکە خوا پێغەمبەری شێت نانێرێ) ئنجا مووسا بەڵگەیەکی دیکەی بۆ هێنایەوە ، گوتی : پەروەردگاری ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاواو ئەوەی نێوانیانە ، ئەگەر عەقڵتان هەبێ ، (وا دیارە مووساش وردە وردە لەهجەکەی توند دەکات) .

(فیرعەون) گوتی : ئەگەر جگە لە من پەرستراوێکی دیکەت هەبێ ، ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم (واتە : زۆری وەك تۆشم گرتوون).

(مووسا) گوتی : ئەدی ئەگەر بەڵگەیەکی زۆر ڕوونو ئاشکرات بۆ بێنم، کە بەڵگە بێ لەسەر ئەوە من پێغەمبەرم ؟

(فیرعەون) گوتی : ئەگەر لە ڕاستانی بیخەڕوو ، ئەویش گۆچانەکەی فڕێدا ، بووە مارێکی ئاشکرا ، وە دەستیشی لەبن هەنگڵی دەرهێنا ، زۆر سپیو درەوشاوە بوو ، بۆ ئەوانەی کە تەماشایان دەکرد .

٣/ لە سوورەتی (غافر)دا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٧﴾﴾، فیرعەون گوتی : لێم گەڕێن ، با مووسا بکوژمو ئەویش لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە، من مەترسیی ئەوەم هەیە ، بەرنامەکەتان بگۆڕێ، یاخود خراپەکاریی و ئاشووبو ئاژاوە لە زەویدا پەیدا بکات، وە مووسا

گوتی: من پەنا بە پەروەرگارمو پەروەردگاری ئێوەش دەگرم، لە هەر خۆ بە زلگرێك، كە بڕوای بە ڕۆژی لێپرسینەوە نیە .

كەواتە: لێرەش دا بە كورتی خوای پەروەردگار باسی ئەو مشتومڕە دەكات، وە ئێرە تاكە شوێنێكە كە ئەو هەڕەشەیەی فیرعەون دەخاتە ڕوو، كە دیارە فیرعەون هەڕەشەی كوشتنی لە مووسا ﷺ كردوە، مووساش پەنای بە پەروەردگاری خۆیو پەروەردگاری فیرعەونو داروودەستەكەیو هەموو جیهانییانیش بردوە .

٤/ وە هەر لێرەش دایە، ـ واتە لەم ئایەتانەی سووڕەتی (غافر)دا ـ كە پیاوە ئیماندارەكەی نێو داروودەستەی فیرعەون، كە ئیمانەكەی خۆی شاردۆتەوە، بەرگرییەكی جوامێرانە لە مووسا ﷺ دەكات، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ ﴿٢٨﴾ ﴾غافر، واتە: پیاوێكی بڕوادار لە داروودەستەی فیرعەون، كە ئیمانەكەی خۆی دەشاردەوە، گوتی: ئایا پیاوێك هەر لەسەر ئەوە دەكوژن، كە دەڵێ: پەروەردگارم خوایە .

ئنجا دیارە ئێمە تەفسیركردنی تێرو تەسەلی ئەم ئایەتانە هەڵدەگرین بۆ كاتی گەیشتنمان بەو سووڕەتانە، بەڵام بە پێویستم زانی لێرەدا ئاماژەیەكیان پێ بكەم بەتایبەت كە لە سووڕەتی ئەعرافدا، وتووێژو مشتومڕی نێوان مووساو فیرعەون بەو شێوەیە نەخراوەتە ڕوو، بەڵام لە سووڕەتەكانی دیكەدا، باش تیشكی خراوەتە سەر، وەك ئاماژەمان پێیاندا .

ئنجا بە پێی ئایەتەكانی سووڕەتی (الشعراء) زۆر جوان دیارە كە خستنە ڕووی مووسا بۆ هەردوو موعجیزەكەی: گۆچانو دەستی، یان وەك گوتوویانە: (العَصَى وَاليَدُ البَيْضَاء) دوای موناقەشەو وتووێژی قووڵو دوورو درێژ بووە، لەگەڵ فیرعەوندا، واتە: هەروا نەچووە یەكسەر گۆچانەكەی فڕێ بداتو، دەستیشی لە یەخە دەربێنێو پێشانی بدات! بەڵكو وتووێژو موناقەشەی زۆری بووە لەگەڵی، وە فیرعەونی بێ قسە كردوە، ئنجا دوای ئەوەی فیرعەون لە مەیدانی بەڵگاندا،

بێ پشتو پەنا کەوتۆتە گۆڕێ، وە دەستی لە بنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەرچووە، ئنجا وەك دەستەوسان کردن بۆ مووسا ، گوتوویەتی : ﴿ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ ﴾الأعراف ، واتە : ئەگەر ڕاست دەکەی نیشانەیەك بێنە ، ئەگەر لە ڕاستانی .

هەڵبەتە زانیوشیەتی مووسا ڕاست دەکات، بەڵام مەبەستی دڕدۆنگ کردنو گومانداركردنی خەڵکەکە بووە، وە بۆ خۆڵ کردنە چاوی خەڵکەکە بووە، کە گوایە مووسا بەڵگەی بەدەستەوە نیەو، نیشانەیەکی بەدەستەوە نیە کە ئیسپاتی بکات ، پێغەمبەری خوایەو لەلایەن خوای پەروەردگارەوە ڕەوانە کراوە، بۆیە ئەو تەحەددایەی ئاڕاستەی مووسا کردوە، دیارە مووساش زۆر مەردانەو ڕوونو ڕاشکاوانە ، وەڵامی تەحەدداکەی فیرعەونی داوەتەوە ، وەك لە مەسەلەی چوارەمدا باسی دەکەین .

**مەسەلەی چوارەم:** دەفەرموێ : ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾، (مووسا) گۆچانەکەی فڕێدا ، یەکسەر بوو بە مارێکی ئاشکرا، وە دەستیشی دەرهێنا ، بۆ بینەران سپیو درەوشاوە بوو.

وشەی : ﴿ فَأَلْقَىٰ ﴾، یانی : (طرحَ) فڕێیدا، هاویشتی .

وشەی : ﴿ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴾، (أي حَيَّةٌ ظاهِرَةٌ جَلِيَّةٌ) مارێکی ئاشکرا ، واتە : وەك هی جادووگەرەکان نەبوو ، کە هەر لەبەرچاوی خەڵك وابێ ، بەڵکو هەر مارێکی ڕاستەقینە بوو ، بە فەرمانی خوا لەو گۆچانە پەیدا بوو .

ڕستەی : ﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ ﴾، واتە: دەستی دەرهێنا، دەستی لە کوێ دەرهێنا ؟ لە سوورەتی (النمل)دا ، خوای پەروەردگار بۆمان ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ :

﴿ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ۖ فِى تِسْعِ ءَايَـٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ

وَقَوۡمِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾، دەست بخە یەخەتەوە، دوایی دەریبێنەوە سپی دەبێ بۆ تەماشاکەران .

وشەی : ﴿جَيۡبِكَ﴾، (جَيْبُ القَميصِ : مَا يَنْفَتِحُ على النَّحْرِ) ئەوەی کە لە ئاستی سینگەوە دەکرێتەوە ، دیارە ئێمە پێی دەڵێین : یەخە ، یان یەقە ، (والجمع : أَجيَاب وجيُوب) کۆی (جيب) (أجباب)ە و ، بە (جيوب)یش کۆدەکرێتەوە (المصباح المنير، ص : ٦٤).

کە دەفەرموێ : ﴿بَيۡضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ﴾، ئنجا ئایا ئەو سپێتییە ، وا بووە کە لێی ناشیرین بێ ؟ یاخود نیشانەی نەخۆشیی بێ ؟

خوای کاربەجێ لە سوورەتی (النمل)دا ، بۆمان ڕوون دەکاتەوەو ئەو گومانە لادەباتو، دەفەرموێ : ﴿وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖۖ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾﴾، واتە: وە دەست بخە یەخەتەوە ، دوایی دەردێتەوە ، بەبێ هیچ خراپەو نەخۆشیی ، یانی : بێ ئەوەی کە تووشی کەموکوڕییەك بووبێ ... .

ئنجا توێژەرەوان باسیان کردوە کە ئەو سپێتییە، سپێتییەکی ئاسایی نەبووە ، بەڵکو زۆر بە شەوق بووە، هەندێك دەڵێن : چاوی لەبەر هەڵنەهاتوە، وە هەندێك دەڵێن : درەوشاوە بووە، بەلام گرنگ ئەوەیە وشە قورئانییەکە تەنیا دەفەرموێ :

﴿بَيۡضَآءَ﴾، لە هەموو شوێنەکان دا هەر وا دەفەرموێ ، بەلام باسی ئەوە ناکات کە چاوی لەبەر هەڵنەهاتبێو زۆر درەوشابێتەوە ، هەرچەند ئەوەش دەگەیەنێ ، بەلام زۆر بەڕوونو ڕاشکاویی ئەوە ناگەیەنێ ، مەگەر بڵێی نابێ ئەو سپێتییە سپێتییەکی ئاسایی بووبێ، بۆ ئەوەی ببێ بە بەڵگە ، لەسەر ئەوە کە ئەمە موعجیزەیەکی دەستەوسان کارە، دیارە دەبێ سپێتییەکی تایبەتیی بووبێ، بۆیە هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: وەك گڵۆپو چرا بووەو چاوی لەبەر هەڵنەهاتوە .

**مەسـەلـەی پێنجـەم** : کـە دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾، واتـــە: دەســـت ڕۆیشـــتووان و کاربەدەســـتان لـــە گەلـــی فیرعـــەون گوتیـــان: ئەمـــە جاردووگەرێکـی زانـایە، دەیەوێ لەسـەر زەمینـی خۆتـان وەدەرتـان بنـێ، ئنجـا فەرمانتـان بـە چییـە ؟! دیارە ڕوویان لە فیرعەون کردوەو، گوتوویانە: فەرمانت بـە چییە ؟ چی بکەین ؟

بـەڵام لـە سـوورەتی (الشعراء)دا ئەمـە بـە شـێوەیەکی دیکـە هـاتوە، دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾، واتە: فیرعەون بە دەستـڕۆیشتووانی دەوروبـەری خۆی گوت: ئەمە جادووگەرێکی زانایە، دەیەوێ لەسەر زەمینی خۆتان بە جادووەکەی دەرتـان بکـات ، فەرمانتـان بـە چییـە ؟ کەواتـە : قسـەی دەستـڕۆیشـتووان و قسـە بـەدەستانی کۆڕو مەجلیسـەکەی فیـرعەون ، کە لەجێی پەرلەمانی ئێستا بووە، هـەر دووبارەکردنەوەی قسـەکەی فیـرعەونـەو هـەمان شـت کـە فیـرعەون گوتوویـەتی ، لـە سـوورەتی (الشعراء)دا، خـوای پەروەردگـار لێـرە لە {سـوورەتی (الأعراف)} دا هـەمان شـت بـەناوی دەستـڕۆیشتووانی کۆڕو مەجلیسـی فیـرعەونەوە ، دووبـارە دەکـاتەوە ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە عادەتی دەستو پێوەندو دەوروبەری تاغووتو حوکمڕانە خۆ بـەزلگـرەکان وایە، کە ماستـاو چییـنو، وەك تووتی قسـەی حوکمڕانـەکە، قسـەی گـەورەکەیان دووبـارە دەکەنـەوە، وەك بلێـی عـەقڵی خۆیـان تەسـلیمی ئـەو کـردوە ، بۆیـە خـوای زانـا لەوێ ئـاوای هێناوە ، لێرەش بـەو شێوەیەی هێناوە ، واتە : دەسـتو پێوەنـدو دەوروبـەری فیـرعەونیش ، هـەر هـەمان قسـەی فیـرعەونیان دووبـارە کردۆتـەوە ، وەك تووتـی .

ئنجـا ئایا مووسا ﷺ ئەوەی کە ئەوان پێیان وایە جـادوویە ، دەیـەوێ کـێـی پـێ دەربکـات ؟ ئەگـەر مەبەسـت پێـی بـەنی ئیسـرائیل بـێ ، ئـەدی بۆچـی فیـرعـەون دەڵێ : ﴿ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ ﴾، ؟ وەڵام :

١/ چونکە دیارە فیرعەون بەنی ئیسرائیلی بە کۆیلەی خۆی داناونو، وەك بەشێك لە گەلەکەی خۆی داناون، وەك بلێی : ئەوانە بێ خاوەننو، فیرعەون خاوەنیانە.

٢/ مەبەست پێی میسرییەکانە، واتە: ئەگەر مووسا ﷺ کارەکەی سەربگرێو گەلەکەی لەگەڵی بڕۆن، ئێوەش ژیانتان نابێ..، وەك ئێوەش ڕۆیشتبنو شاربەدەر کرابن ، وایە.

٣/ یاخود مەبەست ئەوەیە ، کە ئەگەر ئەوەی بۆ بچێتە سەر ، کە گەلەکەی خۆی (بەنی ئیسرائیل) کە دەچەوسێنرێنەوە ، لەژێر دەستی ئێوە بێنێتە دەرێ، ئەوە دوایی ئێوەش هەر دەردەکات، واتە: شۆڕش لە دژی ئێوەش دەکاتو ، سەرەنجام هەمووتان لەم وڵاتە دەربەدەر دەکات.

شایانی باسیشە کە فیرعەون بە چەند شتێك خەڵکەکەی لە دژی مووسا هان دەدات :

١) لە سوورەتی (الشعراء)و سوورەتی (الأعراف)دا خوا ﷻ لەسەر زمانی فیرعەونو فیرعەونییەکان دەفەرموێ : ﴿ يُرِيدُ أَن يُخۡرِجَكُم مِّنۡ أَرۡضِكُمۡ ﴾، دەیەوێ لەسەر زەمینی خۆتان وەردەرتان بنێ .

٢) وە لە سوورەتی (غافر)دا خوا ﷻ لەسەر زمانی فیرعەون ، فەرموویەتی : ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ٢٦﴾، واتە: من مەترسیی ئەوەم هەیە کە بەرنامەکەتان بەرنامەی ژیانتان ، کە تا ئێستا لەسەری بوون ، بیگۆڕێ، وە خراپەو ئاژاوەو ئاشووب لە زەویدا بەرپا بکات، ئنجا دیارە لە ئەنجامی گۆڕانی بەرنامەکەیانو سیستەمی حوکمڕانیی یەوەو لە ئەنجامی پەیدابوونی ئاشووبو ئاژاوەدا ، ناچار دەبن کە وڵاتەکەیان جێ بێڵن ، یاخود فیرعەون ئەویشی گوتووە ، ئەوەشی گوتوە .

٣) وە لە سوورەتی (یونس)دا خوا لەسەر زمانی فیرعەونییەکان فەرموویەتی : ﴿ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَلۡفِتَنَا عَمَّا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا نَحۡنُ لَكُمَا بِمُؤۡمِنِينَ ٧٨﴾، گوتیان : (واتە فیرعەونو

دارودەستەکەی بە مووسایان گوت) : ئایا تۆ هاتووی بۆ لامان ، تاکو ئەوەی باب‌و باپیرانمان لەسەری بینیوە ، لەوە لامان بدەی، {واتە : لەو ڕێبازەی کە باب‌و باپیرانمان لەسەری بوون‌و ، ئێمەش ئەوانمان لەسەر بینیوە ، ئێمە هەڵبگێڕیەوەو لامان بدەی} ، ﴿وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، وە سەرەنجام دەسەڵات‌و گەورەیی بۆ ئێوە بێ لەسەر زەمیندا ، ﴿وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴾، وە ئێمە بڕواتان پێ ناهێنین ، بە تۆو بە هارڕوونی برات .

ئنجا وەك جاری دیکەش باسمان کرد : خوای پەروەردگار بەو تەعبیرە جۆراوجۆرانە، کۆی ڕووداوەکە لە هەموو ڕووەکانییەوە، ڕوون دەکاتەوە، لێرەش دا بە هەمان شێوە :

أ / لە سوورەتی (یونس)دا ، خوا لەسەر زمانی فیرعەون دەفەرمویٚ : ئێوە دەتانەویٚ ئێمە لەسەر ڕێبازی باب‌و باپیرانمان لابدەن‌و، خۆتان ببنە گەورەو حوکمڕان.

ب / لە سوورەتی (غافر)دا دەڵێ : من دەترسێم دینەکەتان بگۆڕێ‌و ئاشووب لە زەویدا بەرپا بکات .

ج / لە سوورەتی (الأعراف) و (الشعراء)دا دەڵێ : ئەوە دەیەوێ لە نیشتیمانی خۆتان ، لەسەر زەوی خۆتان ، وەدەرتان بنێ.

کە دیارە فیرعەون هەموو ئەو قسانەی کردوون، بەڵام خوای پەروەردگار لە هەر شوێنەو، لە هەر سوورەتەدا ، یەکێك لە قسەکانی دێنێ ، کە قسەکانیش بە هەموویان تەعبیر دەکەن لەو پڕوپاگەندەیەی ، کە فیرعەون کردوویەتی لە دژی مووساو هارڕوونی برای سەلامی خوایان لەسەر بێ، بۆ ئەو پەیام‌و بەرنامە خواییەی کە هێناویانە، بۆئەوەی جەنگێکی دەروونییان لەگەڵدا بکات، وە خەڵکەکەیان لێ هانبداو ، خۆڵ بکاتە چاوی خەڵکەکەی خۆیشی ، تا متمانەیان بە مووسا ﷺ نەبێ ، وە ئیقناعیان بکان ، کە ئەو بۆ بەرژەوەندیی‌و خێری ئەوان نەهاتوە ، بەڵکو هاتوە :

١ - بەڵایـان بـەسـەر بێنـێ .

٢ – وەدەریـان بنـێ لە نیشتیمانی خۆیانو شاربـەدەریان بکات .

٣ - وە لە دینی بابو باپیـرانیان لایان بدات.

٤ - وە بـەرنامەو ڕێبازی ژیانیان تێك بدات .

٥ - وە خۆیان بـەسـەردا بکاتـە گـەورەو حوکـمـڕان .

٦ - ئـاشـووبو ئـاژاوە لە زەویدا بـەرپا بکات !

هـەمان ئـەو پڕوپاگـەندانەی کـە ئێسـتاش ئـەو حوکمڕانـە خـۆسـەپێنـانەی، کـە خۆیـان بـەسـەر کۆمەڵـگا مسوڵمانەکـاندا سـەپاندوە ، لـە دژی ئەوانـەی داوای چاکسازی دەکـەن ، دیانکـەن !!

کـاتێك کـە خەڵـکێکی سـتەمدیـدە ، لایـەنێکی ئیسـلامیی، دەڵـێ : ئـەو شـێوە حوکمـڕانییە بگۆڕنو بگەڕێنـەوە بۆ ڕای میللـەت، با هـەڵبژاردن بکـرێ ، با خەڵـك خۆیـان بـەرپرسـانی خۆیـان دابنێیـن، بـا ئـەو شـەریعەتو بەرنامەیـەی خـوا ناردوویـەتی ، بۆ ڕێکخستنی ژیـانی خەڵك بـۆ هـیدایەتی مرۆڤ ، ئـەوە حاکـم بـێ ، هەمان ئەو پڕوپاگەندانەی کە فیـرعەونو داروودەستەکەی ، سـێ چوار هـەزار سـاڵ لەمـەو پـێش کردوویانـە ، لـە دژی مووسـاو هـاڕوونو ئەوانـەی لەگـەڵیاندا بـوون، تاغـووتو دیکتاتـۆرە خـۆسـەپێنەو بـە زەبـرو زۆرەکـانی ئـەم ڕۆژگـارەش ، هـەر هەمان قـەوان دووبـارە دەکەنـەوە ، هەر هـەمان قسـە دووپات دەکەنـەوە .

**مەسـەلەی شـەشـەم** : ئنجا با بزانیـن دوا بڕیاریان چی دەبـێ ، دوای ئـەوەی فیـرعەون ڕاوێـژ دەکـات بـە داروودەسـتەکەیو دەوروبـەری ؟ ﴿قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ وَأَرۡسِلۡ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأۡتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ﴾، ئـەوانیش دەڵـێن: خـۆیو برایەکەی دوا بخـە، واتە: جارێ هـیچ ئیجـڕائـاتێکـیان بـەرانبـەر مەکـەو دوایان بخـە {(أَرْجِهِ) واتـە : (أَخِّر)} وە بـە شـاراندا بنـێرە، کـۆ کـەرەوان بنێرە، بـا جـاڕچیـی بچـن ، خەڵك کۆبکەنـەوە، هەموو جـادووگـەرێکی زانـات بۆ بێنـن .

لە سوورەتی (الشعراء)دا ، ئەو تەعبیرە بە تۆزێك جیاوازییەوە هاتوە ، دەفەرموێ : ﴿ قَالُوٓاْ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾ ﴾، کە دیارە ئەوەی سوورەتی (الأعراف)یش : (ساحِر) بە (سَحَّارِ)یش خوێنراوەتەوە ، جیاوازییەکەی ئەوەیە کە دەفەرموێ : گوتیان : خۆی‌و برایەکەی دوا بخە ، لەوێ دەفەرموێ : (وَأَرْسِلْ ) دەڵێ : (وَٱبْعَثْ ) دیارە (وَٱبْعَثْ ) و (وَأَرْسِلْ ) مانایان زۆر لێك نیزیکە.

ئنجا لەوێ دەفەرموێ : ( يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ) کە وەك گوتم : بە (سَحَّارِ)یش خوێنراوەتەوە ، (ساحِر) واتە : جادووگەر ، (سَحَّار) دیارە ڕێژگەی زێدەڕۆیی (صَيغَة مبالغة)یە بۆ (سَاحِر)، واتە : زۆر جادووگەر، زۆر کارامە لە جادووگەریدا .

وشەی (أَرْجِهْ) واتە (أَخِّرْ) دەڵێ : (أَرْجَيْتُهُ: أَخَّرْتُهُ) ئەمە بە سێ جۆر خوێنراوەتەوە (أرجِهِ ، وَأَرْجِئْهُ ، وأَرْجِهْ).

لە سوورەتی (طه)دا وردەکاریی زیاتر باسکراوە ، دەربارەی چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی فیرعەون‌و داروودەستەکەی ، لەگەڵ مووسادا : کە چی بکەن ؟ وە چۆن بکەن ؟ وە چییان پێ گوتوە ؟ وەك دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە: وە بێگومان ئێمە هەموو نیشانەکانی خۆمانمان پێشان دان ، {پێشانی فیرعەون‌و داروودەستەکەی } بەڵام بە درۆی دانان‌و بێبڕوا بوو، وە لامل بوو، ملی نەدا، گوتی : ئایا ( ئەی مووسا) هاتووی کە بە جادووەکەت لەسەر زەمینی خۆمان

وەدەرمان بنێی؟ بە تەئکید ئێمەش جادوویەکی وەك جادووی تۆی دێنین ، بۆیە بەڵێنگە (موعد)ێکمان بۆ دابنێ ، نە ئێمەو نە تۆ لەو مەوعیدە دوا نەکەوین ، وە شوێنێکی تەخت بێ ، (واتە : شوێنێکی تەخت بێ ، بۆئەوەی هەموو خەڵك چاوی لێ بێ) ، گوتی : با بەڵێنگەتانو کاتی دیدارو پێك گەیشتنمان ، ڕۆژی خۆڕازاندنەوە بێ، (کە دیارە ڕۆژێکیان هەبووە خۆیان تێدا ڕازاندۆتەوەو بەرگێکی جوانیان لەبەرکردوە، دیارە ڕۆژێکی جەژن بووە، هەندێك دەڵێن: ڕۆژی نەورۆز بووە، بە هەر حاڵ ڕۆژێك بووە کە بەرگی جوانیان تێدا لەبەرکردوەو خەڵك چۆتە دەشتو دەر، یان چوونە دەرەوەی شارو کۆبوونەتەوە) وە با خەڵکیش لە کاتی چێشتەنگاودا کۆ بکرێتەوە .

چونکە کاتی چێشتەنگاو کە ڕۆژ بەرەو نێوەڕاستی ئاسمان دەچێ ، دنیا ڕووناکترەو خەڵك باشتر دەیبینێ ، کەسێك هەقی پێ بێ ، پێی خۆشە بە ڕۆژی ڕوون ، وە بە ڕووناکیی بیخاتە ڕوو ، چونکە لێی دڵنیایەو پێی پشت ئەستوورە ، کە هەتا خەڵك باشتر بیبینێ ، زیاتر کاریان تێ دەکاتو ، زیاتر دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە، بەڵام ئەوەی ناهەقی پێ بێ، پێی خۆشە لە پەناو پەسیوانو ، لە حەشارگەو نەدیوانو ، لە شوێنی پەنهانو شێردراوەدا بە خەڵکی بڵێ ، بە چرپەو سرکە سرك ، بەڵام ئەوەی کە هەقێ پێ بێ ، پێی خۆشە لە شوێنی تەختو لە ڕۆژی قەرەباڵغ دا ، وە لە کاتێکیشدا کە ڕۆژ لە نێوەڕاستی ئاسمانێیە، بۆئەوەی کە هەموو خەڵك بیبینێ، وە بیناسن کە چۆنە ؟ بیخاتەڕوو .

لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرموێ : ﴿ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ٱئۡتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ ﴿٧٩﴾ ﴾، واتە: فیرعەون گوتی : هەموو جادووگەرێکی زانام بۆ بێنن .

وەك گوتم هەر جارە خوای کاربەجێ بە جۆرێك تەعبیر دەکات ، لە ڕوویەکی ئەو ڕووداوە ، کە ڕووی داوە ، ئەگەرنا دیارە هیچی نە دووبارە کردنەوەیە ، بەبێ حیکمەت، وە نە واشە کە تێکگیرانو ناکۆکیی هەبێ ، بەڵکو هەر جارە خوای لێزان تەعبیر دەکات لە ڕوویەكو لە لایەنێکی ئەو مەبەستەی کە دەویسترێ باس بکرێ .

**مەسەلەی حەوتەم**: ئنجا بزانین جادووگەرەکان چییان کردو، چۆن هاتن ؟

﴿ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓاْ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾، وە جادووگەرەکان هاتن بۆ لای فیرعەونو گوتیان : ئایا پاداشتمان هەیە (کرێمان دەدەیە) ئەگەر ئێمە زاڵ بووین ؟ گوتی : بەڵێ ، بێگومان وە ئێوە لە وەنیزیك خراوان دەبن ، {واتە : زۆر لە خۆم نیزیکتان دەخەمەوە، پێگەو پلەو پایەتان بەرز دەکەمەوە} .

لە سوورەتی (الشعراء)دا بەم شێوەیە هاتوە ، دەفەرمویٚ : ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُواْ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾، وە کاتێك جادووگەرەکان هاتن ، بە فیرعەونیان گوت : ئایا پاداشتو خەڵاتمان دەبیٚ ، ئەگەر ئێمە زاڵ بووین، گوتی: بەڵیٚ، وە بێگومان ئێوە لە زۆر وەنیزیکخراوانیش دەبن.

دیارە تەعبیرەکان زۆر لێك نیزیکنو ، چەند جیاوازییەکی کەمیان هەیە .

چونکە :

١/ لە سوورەتی (الأعراف)یشدا ﴿ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا ﴾ خوێنراوەتەوە : ﴿ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا ﴾.

٢/ هەروەها لە سوورەتی (الشعراء)دا ﴿ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا ﴾ خوێنراوەتەوەش : ﴿ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا ﴾، بەلاٚم بە شێوەی پرسیارکردن واتە: ئایا ئێمە کرێمان دەبیٚو، خەلاٚت دەکرێین ، ئەگەر زاڵ بووین ؟ دیارە ئەویش دەڵێ : بەڵێ ، بە دڵنیاییەوە.

بەلاٚم لە سوورەتی (طـه)دا وردەکاریی زیاتر هەیە ، دەربارەی ڕووبەڕووبوونەوەی جادووگەرەکانو جادووەکەیان لەگەڵ مووساو موعجیزەکەیدا : خوای پەروەردگار

جوان ئەو بابەتە ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ : ﴿ فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ﴿٦١﴾ فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ﴿٦٣﴾ فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا ۚ وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ ﴿٦٤﴾ ﴾، واتە: فیرعەون پشتی کردە (مووسا)و ئەو پەیامەی کە هێنابووی، وە پیلانو فێڵی خۆی کۆکردەوە، دوایی هات، مووسا پێی گوتن : سزای سەخت بۆ ئێوە، یان ئەی هاوار بۆ ئێوە، درۆ بە ناوی خواوە مەکەن، ﴿ فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ﴾، ئەگەرنا خوا ڕیشەکێشتان دەکات بە سزای خۆی، وە هەر کەسێك درۆ بکات (بە ناوی خواوە) پەشێمانو بەدبەختە.

درۆ بە ناوی خواوە، یانی : خوای پەروەردگار کە منی ناردوە پەیامی پێدا ناردووم ، ئێستا ئێوە ئەو جادووگەرانە دێنن، جادووەکەیان لەگەڵ موعجیزەی مندا بەراورد دەکەنو، دەیانخەنە تەرازوویەکەوە ، ئا ئەوە درۆکردنە بە ناوی خواوەو، درۆ هەڵبەستنە بەناوی خواوە ، چونکە ئێوە تۆمەت پاڵ دەدەنە لای خوا ، کە گوایە ئەو موعجیزەیەی بەمنیشی داوە ، جادوویە، وەك جادووی جادووگەرەکانی ئێوە ، کەواتە : ئەوە درۆ هەڵبەستنە بە ناوی خواوە ، بوختان کردنە بە پێغەمبەری خواو بە پەیامی خوا، وە سەرەنجام بە خوای پەروەردگار، کە ئێوە بێنن موعجیزەیەکی خوای بێ هاوتا ، لەگەڵ جادووی جادووگەران دا بخەنە تەرازوویەکەوە .

﴿ فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ ﴾، لەنێوان خۆیاندا کەوتنە ناکۆکیی کە چی بکەن ؟ زۆر پێدەچێ دەربارەی میکانیزمو شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەکە کەوتبنە ناکۆکیی : یەکێك گوتبێتی با وا بکەین ، ئەوی دیکە گوتبێتی : با

وا نەکەین ، وە هەمیشە ئەهلی باتڵ لەنێوخۆدا ناکۆکن، ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجْوَىٰ﴾، بەڵام تەگبیرکردنو پیلانگێڕانەکەی خۆیان بە پەنهانیی کرد، یانی : سرتە سرتو چپە چپێکیان بەیەکەوە کرد ، کە چۆن ڕووبەڕوو ببنەوەو ، چی بکەنو چۆن بکەن ؟ یان ڕەنگە هەر ئەو کاتە کە مووسا ﷺ لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو بۆتەوە ، هەندێکیان کەوتبنە گومانەوە ، وە لەنێوان خۆیاندا بووبێتە ناکۆکییان : ئەوە ناگونجێ جادووگەر بێ، ئەو دەموچاوە، ئەو هەڵسوکەوتە ، ئەو ڕەوشتو ئاکارە بەرزو پەسندەی ئەو دوو پیاوە کە مووساو هارووون، وەك هی جادووگەران ناچێ، چونکە هەموو خاوەن پیشەیەك ، خاوەن پیشەکانی خۆی دەناسێ، جادووگەر جادووگەر دەناسێ، ئنجا کە تەماشای مووساو هارووونیان کردوە ، بە جادووگەریان نەهاتوونە بەرچاو ، لەبەینی خۆیاندا کەوتوونەتە ناکۆکیی ، ﴿قَالُوٓاْ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ﴾، سەرەنجام ئەو ڕایەیان تەبەننیی کرد ، گوتیان : ئەم دووانە جادووگەرن ، ﴿يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا﴾، دەیانەوێ لەسەر زەمینی خۆتان دەرتان بکەن بە جادووەکەیان !

تەماشا بکەن فیرعەونییەکان چۆن دەماری هەستیاریی خەڵك دەگرن، خەڵك زۆری پێ ناخۆشە لەماڵو حاڵی خۆی دەربکرێو ، شاربەدەر بکرێو نیشتیمانی خۆی بەجێبهێڵێ ، ئەگەرنا مووسا نەهاتوە ئەوان دەربکات، هاتوە دەڵێ : بەنی ئیسرائیلم وێبدەنو، چی دیکە مەیانچەوسێننەوە، بەڵام ئەوان بۆ ئەوەی خەڵکەکە هەمووی هانبدەن لە دژی مووسا، ئەو پڕوپاگەندەیە دەکەن ! ﴿وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ﴾، وە ئەو ڕێبازە هەرە چاکەی ئێوە لەنێو بەرن (ماشاء الله ! ڕێبازێکی چەند چاكو عەجایب بووە : فیرعەونیان پەرستوەو، فیرعەون خۆی لێ کردوونە پەرستراوو پەروەردگار). ﴿ٱلْمُثْلَىٰ﴾، دیارە (مؤنث)ی (أمثل)ە، (أمثل)، واتە : باشترینو بەرزترین شت ، شتێك کە نموونەی چاکیی بێ .

ئەو ڕێبازەی کە دارودەستەی فیرعەونی لەسەر بووە، هەڵبەتە بۆ فیرعەونو دارودەستەکەی چ عەیبی نەبووە، باشترین ڕێباز بووە، ئەگەر قیامەت نەبێو

گوێ نەدەی بە دادگەریی‌و بە مافی خەڵك، باشترین شت ئەوەیە خەڵك بۆ تۆ ببێتە بارەبەرو ڕێشمەیان بخەنە دەستی تۆ، وە تۆ بۆ کوێت بوێ بۆ ئەوێیان بەری، وە چیت بوێ ، ئەوەیان پێ بکەی، ئەوە بۆ فیرعەون‌و داروودەستەکەی چ عەیبی نەبووە، بەڵام بێگومان بۆ خەڵکەکە ، مایەی چارەڕەشیی‌و ڕووڕەشیی دنیاو قیامەتیان بووە .

جا دوایی دەڵێن : ﴿ فَأَجۡمِعُواْ كَيۡدَكُمۡ ثُمَّ ٱئۡتُواْ صَفّٗاۚ ﴾، پیلان‌و فێڵی خۆتان هەمووی کۆبکەنەوە، دوایی بە یەك ڕیز وەرن، واتە: ناکۆك مەبن لە نێو خۆتان دا، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ڕەنگە پێشتر موناقەشەو دەمبەدەمبەیەکیان بووبێ ، وەك ئاماژەم پێدا : هەندێکیان کەوتبنە ژێر کاریگەریی قسەکانی مووسا ، ئنجا دەڵێن : با هەموو یەك ڕیز بین‌و یەك دەنگ بین‌و یەك قسە بین ، ئەگەرنا مەرج نیە ، هەموو بە یەك ڕیز بوەستن، واتە: با هەموومان وەك خشتەکانی دیوارێك بین ، کە یەکدییان مەحکەم کردوە ، وە با قسەی جیامان نەبێ ، چونکە هێزو پێزمان لە یەك ڕیزییمانداییە، ﴿ وَقَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡيَوۡمَ مَنِ ٱسۡتَعۡلَىٰ ﴾، وە هەر کەسێك ئەمڕۆ بەرز بێ ، (بیباتەوە) بە دڵنیایی ئەوە سەرفرازە .

دیارە ئەوان سەرفرازییان هەر لەوەدا بینیوە کە زاڵ بن بەسەر مووساو بەسەر پەیامەکەی مووسادا ﷺ.

**مەسەلەی هەشتەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحۡنُ ٱلۡمُلۡقِينَ ١١٥ قَالَ أَلۡقُواْۖ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسۡتَرۡهَبُوهُمۡ وَجَآءُو بِسِحۡرٍ عَظِيمٖ ١١٦ ﴾، واتە: "جادووگەرەکان" گوتیان: مووسا یان دەبێ تۆ گۆچانەکەی خۆت هەڵدەی، یان دەبێ ئێمە فڕێدەربین، {واتە: جادووی خۆمان بکەین} ، وەك: چۆن دوو کەس بەیەکەوە شەڕ دەکەن، یەکێکیان دەڵێ: دەست بوەشێنە، تۆ دەست دەوەشێنی، یاخود من دەست بوەشێنم ؟

دەست پێ دەکەی ، یان دەست پێ بکەم ؟ چ لە قسەکردندا ، چ لە شەڕدا ، ئنجا ئەگەر کەسێك لە خۆی ڕاببینێ ، بێ منەتە ، دەڵێ : تۆ دەست بوەشێنە ، یان تۆ قسەی خۆت بکە .

مووسا فەرمووی : ﴿أَلْقُوا﴾، بیهاوێن ، ئێوە شتەکانی خۆتان هەڵدەن، لێرەدا باس ناکات کە چییان هەڵداوە ؟ بەڵام لە ئایەتەکانی دیکەدا، وەك دوایی باسی دەکەین ، خوای زاناو شارەزا ڕوونی دەکاتەوە ، کە ئەوەی هەڵیانداوەو هاویشتوویانە ، چی بووە ؟! ﴿فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾﴾، ئنجا کاتێك هاویشتیان ، جادوویان لە چاوی خەڵك کرد، وە ترسیان خستە دڵیان، وە جادوویەکی مەزنیان کرد.

لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾﴾، واتە: کاتێك جادووگەرەکان هاتن ، مووسا پێی گوتن: ئەوەی ئێوە دەتانەوێ بیهاوێن، فڕێی بدەن، ﴿فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨٢﴾﴾، واتە: کاتێك شتەکانی خۆیان هاوێشتو فڕێدا ، مووسا فەرمووی : ئەو جادووەی هێناتان ، بێگومان خوا هەڵی دەوەشێنێتەوە ، چونکە بێگومان خوا کردەوەی خراپەکاران چاك ناکات ، (پێزی تێناخات ، بەرەکەتداری ناکاتو ، بەرهەمداری ناکات) وە خوا بە بڕیارو وشەکانی خۆی ، هەق دەچەسپێنێ ، هەرچەندە تاوانبارانیش حەزنەکەنو پێیان ناخۆش بێ .

وە لە سوورەتی (طه)دا ، هەندێ گۆشەی دیکە لەو ڕووداوە دەخاتەڕوو، دەفەرموێ : ﴿فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾﴾، واتە: ئنجا کە

پەتەكانیانو گۆچانەكانیان هەڵدا ، بەهۆی جادووی ئەوانەوە { كە كاریگەریی بۆ سەر وەهمو خەیاڵی مووسا عليه السلام هەبوو} ، وا دەهاتە بەرچاوی كە بڕۆنو بجووڵێنو بێنو بچن ، ئیدی مووسا ترس چووە نێو دڵی ، بەهۆی ئەو دیمەنەوە كە بینی !

ئنجا ئایا ترسەكە بەهۆی ئەوەوە بوو ، كە لەبەرچاوی بوون بە مارو ئەژدیهاو هاتوونو چوونو خۆیان باداوەو فیشكاندوویانەو ، وەك چۆن مار دەفیشكێنێو، خۆی بەرز دەكاتەوەو دەمی دەكاتەوەو، درێشووكەی (زمانی) دەردێنێ ؟ یاخود ترسەكەی لەوە بووە ، كە خەڵك بەهۆی جادووی ئەوانەوە ، هەڵخەڵەتێنو سەرەنجام بڕوا بكەن ، بەو جادووگەرانە ، وە لە موعجیزەكەی مووسا عليه السلام بكەونە گومانەوە ؟ هەردوو ماناكە هەڵدەگرێ :

١/ سەیر نیە مرۆڤ بترسێ ، با پێغەمبەری خواش بێ .

٢/ وە ئەگەر مەترسییشی لە خەڵكەكە هەبووبێ ، كە هەڵخەڵەتێن ، دیسان ئەوەش هەر ڕێی تێدەچێ .

وە لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾ فَأَلْقَوْا۟ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾واتە: مووسا پێی گوتن: ئەوەی كە ئێوە فڕێدەرینی، (هاوێژەرینی)، فڕێیان بدەن، {واتە: جادووەكەتان بكەن} ئنجا ئەوانیش پەتەكانیانو گۆچانانەكانیان كە پێیان بوو ، هەڵیاندان، وە گوتیان : بەهۆی عیززەتی فیرعەونو دەسەڵاتی فیرعەونەوە ، هەر ئێمە زاڵ دەبین .

كەواتە: بە پێی ئایەتەكانی سوورەتی (طه) و سوورەتی (الشعراء)، بۆمان دەردەكەوێ كە ئەوەی لە سوورەتی (الأعراف) دایە، وە لە چەند شوێنی دیكەدا دەفەرموێ : هەڵبدەنو بیهاوێژن ، ئەوانە پەتو گوریسو گۆچان بوون .

وە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن : پەتو گوریسەكان لە چەرم دروست كراونو ، جیوەیان تێكردوونو كاتێك هەڵیان داون ، بۆ بەر خۆر، دیارە جیوە كاتێك تیشكی خۆری لێدەدا، گەرم دادیو دەكشێو دەجووڵێ، هەروەها

گۆچانەکانیش بە هەمان شێوە، بەڵام بە هەر حاڵ ئەو وردەکارییە لە قورئاندا باس نەکراوە، وە پێم وایە پێویستیش بەو تەئویلە ناکات، چونکە پێم وایە وەك ئایەتەکە ئاماژە پێ دەکات: ﴿يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾﴾ دەگونجێ جادوو کار بکاتە سەر خەیاڵو هۆشی مرۆڤ، وە شتێکی دەخاتە بەرچاو کە حەقیقەتی نیە.

هەڵبەتە خوای زاناو توانا لە سووڕەتی (طه)دا، دوای ئەوەی مووسا ترسی لێ دەنیشێ، دەفەرموێ: ﴿قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾﴾، واتە: گوتمان: مەترسێ، هەر تۆ لە سەرەوەی، هەر تۆ بەرزتری.

ئەمەش ئەو مانایە زیاتر بەهێز دەکات، کە ترسی مووسا لە خۆی نەبووە، کە لەو دارو گوریسو شتانە بترسێ، بەڵکو ترسەکەی لەوە بووە، کە خەڵکەکە هەڵبخەڵەتێنرێن کە گوایە: جادووەکەی ئەوان ڕاستە، وە لە موعجیزەو، پاشان لە پەیامو بەرنامەکەی مووسا بکەونە گومانەوە، بۆیە خوای بە بەزەیی لەو ڕووەوە دڵنیای دەکاتەوە، واتە: سەرەنجام موعجیزەکەی تۆ بەسەر جادووی ئەواندا زاڵ دەبێ، وە ئەو خەڵکە تووشی چەواشە بوون، نابن.

**مەسەلەی نۆیەم:**

**ڕووبەڕووبوونەوەی مووساو هاڕوونی برایو، فیرعەونو جادوگەرەکانی:**

ئنجا باسی سەرەنجامی ئەو کێبڕکێو ڕووبەڕووبوونەوەیە دەکات، کە لە نێوان مووساو هاڕوونی برایو موعجیزەکانی مووسادا لە لایەك، وە فیرعەونو داروودەستەکەیو جادووەکانیان دا لەلایەکی دیکەوە، ڕوویداوە، دەفەرموێ:

﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ الْحَقُّ
وَبَطَلَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا هُنَالِكَ وَانقَلَبُوا صَاغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ
سَاجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَارُونَ ﴿١٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ

ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَمَكۡرٞ مَّكَرۡتُمُوهُ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لِتُخۡرِجُواْ مِنۡهَآ أَهۡلَهَاۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾، واتە : سروشمان بۆ مووسا کرد : کە گۆچانەکەت هەڵدە، یەکسەر دەبینی هەرچی ئەوان بە درۆ کردوویانە ، قوتی دەداو هەڵیدەلووشێ .

ئنجا خوای پەروەردگار یەکسەر دێتە سەر سەرەنجامەکەی، نافەرموێ : فڕێیداو ئنجا گۆچانەکە بوو بە مارێك، حەزیایەك و دەمی لێك کردەوەو، هەموو گۆچان و گوریس و پەتەکانی کە جادووگەرەکان فڕێیاندابوون ، جادوویان پێ لە چاوی خەڵك کردبوو ، هەموویانی هەڵلووشین، ئەوە هەمووی دەپێچێتەوەو، یەکسەر دەفەرموێ : ﴿ فَوَقَعَ ٱلۡحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ ئنجا هەق چەسپی ، وە ئەوەی ئەوان دەیانکرد ، پووچەڵ بوو، ﴿ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ﴾ لەوێدا لەو مەیدانەدا ، ئەوان تێکشکان، وە بە زەبوونیی و سەرشۆڕیی گەڕانەوە ، کێ ؟! دیارە فیرعەون و داروودەستەکەی ، ئەدی جادووگەرەکان چییان کرد ؟! ﴿ وَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴾ جادووگەرەکانیش لەپەوڕوو خرانە سەر زەوی، وەك بڵێی : ئەوەندە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی موعجیزەکەی مووساوە ﷺ، خواست و ئیختیاریان بەدەست خۆیان نەمابێ و ، بەدەست خۆیان نەبووبێ کە یەکسەر لەپەوڕوو کەوتوون ، بۆیە بە صیغەی بکەر نەزانراو ( مجهول الفاعل) هێناویەتی ، نەیفەرمووە : (وَأَلْقَى السَّحَرَةُ أَنْفُسَهُمْ ساجِدِين) ، وە جادووگەرەکان خۆیان خستە سەجدەوە ، دەفەرموێ: ﴿ وَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴾ جادووگەرەکان لەپەو ڕووو خرانە حاڵەتی کڕنووشەوە ، چییان گوت ؟ ﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ گوتیان : بڕوامان بە پەروەردگاری جیهانەکان هێنا ، پەروەردگاری مووساو هارۆون.

بۆچی گوتوویانە: پەروەردگاری مووساو هارِوون ؟! واتە ئەو مووساو هارِوونە صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، کە بەدەستی خاڵییەوە هاتوون، بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ فیرعەونێك دا، کە ئەو هەموو سوپاو هێزو ئەو هەموو دەسەڵاتەی هەیە، بەڵام ئەوان خوایەکی پەروەردگاریان هەیە، کە پەروەرگاری فیرعەونو داروەستەکەشیەتی، بۆیە بێمنەتانەو بێ باکانە لەگەڵیدا رووبەرِووبوونەوە بە دەستی خاڵیی، وە سەرەنجامیش پەروەردگار، مووساو هارِوونی بەسەر فیرعەونو داروەستەکەیدا زاڵ کرد.

لە سوورِەتی (طه)دا باسی ئەو بابەتە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓا۟ ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا۟ كَيْدُ سَـٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَـٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ ﴾، کە دیارە مانایەکەیان لە هی ئایەتەکانی سوورِەتی (الأعراف)ەوە زۆر نیزیکە، دوای ئەوەی کە مووسا ترسی لێ دەنیشێ، وەك پێشتر باسمان کرد، خوا ﷻ دەفەرموێ: گوتمان: مەترسێ، بێگومان هەر تۆ لەسەرەوەی‌و، هەر تۆ باڵادەستی، ئەوەی کە بەدەستی راستتەوەیە، فرِێبدە، هەرچی ئەوان بە لێزانیی‌و کارامەیی دروستیان کردوە، هەڵیدەلووشێ {چونکە (صُنع) بریتیە: لە دروستکردنی شتێك بە لێزانیی‌و کارامەیی‌و وردەکاریی، دیارە جادووکردنیش زانستێکە وردەکاریی‌و کارامەیی دەوێ} ئەوە هەمووی فێڵی جادووە، جادووگەریش لە هەر شوێنێکەوە بێ‌و هەرچییەك بکات سەرفراز نابێ، (نە لە دنیاو نە لە دوارِۆژدا)، ئیدی جادووگەرەکان بە کرِنووش دا خران، گوتیان: برِوامان هێنا بە پەروەردگاری هارِوونو مووسا.

هەروەها لە سوورِەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿٤٥﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَـٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾، کە هەموویان نێوەرِۆکەکەیان یەکە، بەڵام شێوەی دەربرِینەکەیان جیایەو، گۆشەیەکی دیکە لەو بابەتە دەخاتە روو، دەفەرموێ:

مووسا گۆچانەکەی فڕێدا، یەکسەر هەرچی بە درۆو بوختان کردبوویان، بە هەڵگێڕاوەیی کردبوویان، هەڵیلووشی {چونکە وەك پێشتر گوتم (إفك) بریتیە لە درۆیەك کە حەقیقەتێکی هەڵگێڕابێتەوە ، ئەوانەش لە ڕاستییدا ئەو جادووەی کە کردوویانە ، کە دارو پەتیان کردوونە مار ، دارو پەتو گوریسەکان ، هەر دارو پەتو گوریس بوون ، بەلام چاوی خەڵکیان هەڵخەڵەتاندبوو} جادووگەرەکان لەپەوڕوو خرانە کڕنووش بردنەوە ، گوتیان : بڕوامان بە پەروەردگاری جیهانەکان هێنا، پەروەردگاری مووساو هاڕوون .

لە شوێنی دیکە دەفەرموێ : ﴿ ... قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ ﴾طه،

لێرە دەفەرموێ : ﴿ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴾ کە دیارە ئاساییە چ مووسا پێش هاڕوون بخرێ ، یان هاڕوون پێش مووسا بخرێ ، وە هەندێك لە زانایانو زانایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن : خوای پەروەردگار بۆیە لە هەندێك شوێن دا ، مووسای پێش هاڕوون خستوەو هاڕوونی خستۆتە دوای، وە لە شوێنێکی دیکەدا هاڕوونی پێش مووسا خستوە ، لەبەر قافیەی ئایەتەکانو ئاوازیان ، تاکو هەمووی پێکەوە بگونجێ ، بەلام دەشگونجێ حیکمەتو نهێنییەکی دیکەی تێدابێ ، بۆ وێنە : کە خوای زاناو شارەزا هاڕوون پێش دەخات ، چونکە هاڕوون بە تەمەنتر بووە لە مووسا، وە کە مووسا پێش دەخات ، لەبەرئەوەیە کە مووسا پایەی بەرزتر بووە لە هاڕوون ، صەڵاتو سەلامی خوایان لێ بێ، واتە: کە هاڕوون پێش دەخرێ ، ڕەچاوی تەمەنداریی کراوە، چونکە هاڕوون بە تەمەنتر بووە، وە کە مووساش پێش خراوە ، حاڵەتی پێگەو پایەی مەعنەوییی ڕەچاو کراوە، کە دیارە مووسا ، پلەو پایەی لە هاڕوون لەلای خوای پەروەردگار بەرزتر بووە .

هەروەها دەشگونجێ ئەو مەسەلەیە پەیوەست بێ ، بە نێوەڕۆکی ئەو بابەتەی لەو زنجیرە ئایەتو سیاقەدا خراوەتە ڕوو.

**مەسەلەی دەیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَمَكۡرٞ مَّكَرۡتُمُوهُ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لِتُخۡرِجُواْ مِنۡهَآ أَهۡلَهَاۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾،

(فیرعەون) گوتی: ئایا بڕواتان پێ هێنا ، پێش ئەوەی مۆڵەتتان بدەم ؟ بێگومان ئەمە پیلانێکە لە شارەکەدا کردووتانە تاکو خەڵکەکەی لێ وەدەرنێن ، بەلام لەمەودوا دەزانن، (چی دەزانن ؟) دەستو پێتان ڕاستو چەپ دەبڕم ، دوایی هەمووانتان تێکڕا هەڵدەواسم.

لە شوێنی دیکەدا باسی کردوە ، کە بە سەرەوەی دار خورمایانەوە هەڵیاندەواسێ ، کە دەشڵێ : دەستو پێتان ڕاستو چەپ دەبڕم ، واتە : دەستی ڕاستو ، پێی چەپتان دەبڕم .

وە لە سووڕەتی (طه)دا بەم شێوەیە هاتوە ، دەفەرموێ : ﴿ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾ ﴾، (فیرعەون) گوتی : ئایا بڕواتان پێ هێنا پێش ئەوەی مۆڵەتتان بدەم ؟ {وەك بڵێی : خەڵك بۆی نەبێ قەناعەت بە شتێك بێنێ، مەگەر بە ئیزنی فیرعەون، دەبێ عەقڵی خۆیان دابخەن، کاتێك فیرعەون مۆڵەتیدا، ئنجا عەقڵی خۆیان بکەنەوە، ئەو فیرعەونو تاغووتانە چەند لە خۆیان ڕا دەبینن ! وە چەند بە کەم تەماشای خەڵك دەکەن ! پێیان وایە خەڵك بۆی نیە بیربکاتەوە بە مۆڵەتی ئەوان نەبێ}، ئەوە ئەو گەورەیەتانە کە فێری جادووی کردوون، {تەماشا بکەن ! فیرعەون چۆن گاڵتەی بە عەقڵی خەڵك کردوە، ئەو جادووگەرانە ، هی خۆی بوون ، مووساو هاڕوونیان هەر نەناسیوە ، هەر یەکەی لە شارێکەوە هاتوون، وە دەزانێ کە ئەوەی مووسا جادوو نیە، بە بەڵگەی ئەوە کە نەخرانە تەرازوویەکەوە، گۆچانەکەی مووسا بوو بە حەزیاو مارێك هەرچی ئەوان کردبوویان ، هەمووی هەڵلووشی، کە هەر خوا دەزانێ چەند ساحیر بوون ، چونکە لە هەندێك ڕیوایەتان دا هاتوە کە هەزاران جادووگەر بوون ، وە هەندێك دەڵێن : بە سەدان جادووگەر بوون ، وە خوا دەزانی چەند گۆچانو گوریسیان بەکارهێناون}، ئنجا فیرعەون دەڵێ : ئەوە ئەو گەورەیەتانە، (ئەو مامۆستایەتانە) کە فێری جادووی کردوون .

وە لە سوورەتی (الأعراف)دا فیرعەون دەڵێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِي الْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا مِنْهَا أَهْلَهَا ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿١٢٣﴾﴾، واتە: بێگومان ئەوە پیلانێك بوو لە شارەکەدا کردتان، بەڵام لێرەدا دەڵێ: ئەوە گەورەکەتانە کە فێری جادووی کردوون، کە دیارە ئەو دووانە تێك ناگیرێن، واتە: ئەوە ئەو گەورەیەتانە کە ئێوەی فێری جادوو کردووە، بە هەمووتان ئەو پیلانەتان داناوە، بۆئەوەی ئەو خەڵکە شاربەدەر بکەن.

ئنجا دەست دەکات بە هەڕەشە، لە شوێنێك دا دەڵێ: ﴿لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾﴾الأعراف، کەچی لێرەدا دەڵێ: ﴿فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ النَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَا أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾﴾طه، واتە: بێگومان من دەستو لاقتان ڕاستو چەپ دەبڕم.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە بە کوێیان هەڵدەواسێ؟ لە سوورەتی ئەعراف دا تەنیا دەڵێ: ﴿لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ﴾، بەڵام دەرینەخستوە بە چییان هەڵدەواسێ؟ بەڵام لێرەدا دەڵێ: ﴿فِي جُذُوعِ النَّخْلِ﴾طه، واتە: بە قەدی دارخورمایانەوە هەڵتاندەواسم، ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَا أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ﴾ طه، وە ئەوکاتە چاکیش دەزانن کاممان (واتە: من، یاخود پەروەردگاری مووسا)، سزایەکەمان سەختتریشەو بەردەوامتریشە؟!

وە لە سوورەتی (الشعراء) ئاوا دەفەرموێ: ﴿قَالَ آمَنتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمُ الَّذِي عَلَّمَكُمُ السِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ۚ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾﴾، واتە: ئایا بڕواتان پێی هێنا، بەرلەوەی

مۆڵەتتان بدەم ! بێگومان ئەو (مووسا) ئەو گەورەیەتانە کە فێری جادووی کردوون، لەمەودوا دەزانن ! دەستو پێتان ڕاستو چەپ دەبڕم ، وە هەمووشتان هەڵدەواسمو لە سێدارەتان دەدەم .

**مەسەلەی یازدەیەم :** ئنجا با بزانین هەڵوێستی جادووگەرە ئیماندارەکان ، دوای ئەوەی کە ئیمانیان هێنا، وە عیززەتی ئیمانییان پەیدا بوو، ئایا لە هەڕەشەی فیرعەون دەترسێن ؟ ئایا کە پێش ئەوەی ئیمان بێنن ، چاوەڕێی زار چەورو شیرین کردنێکی فیرعەون بوون، چاوەڕێی خەڵاتو بەرات بوونو ، داوای کرێیان لێ دەکرد ، بەڵام ئێستا کە ئیمانیان هێناوە ، گۆڕان بەسەریاندا هاتوە ، با بزانین هەڵوێستیان چۆن دەبێ ؟

خوا دەفەرمووێ : ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ ... ﴾، (جادووگەرە ئیماندارەکان) گوتیان : بێگومان ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە ، وە تۆش هیچمان لێ بە عەیب ناگری ، وە تۆڵەمان لێ ناکەیەوە ، مەگەر لەسەر ئەوە کە بڕوامان بە نیشانەکانی پەروەردگارمان هێناوە ، کاتێك نیشانەکان هاتوون بۆ لامان ، واتە : موعجیزەکانی کە بە مووسادا ناردوونی ، کە چونکە ئەوەی لە مووسا دەرکەوت ، بە خوا نەبێ بە کەس ناکرێ ، ئەوەی ئێمە خۆمان دەزانین کە جادووە ، ئێمەش جادووگەرینو دەزانین جادوو تا کوێ دەڕوا ، بەڵام ئەوەی مووسا کردی ، هەموو سنوورەکانی بەزاندوون ، ئەوەی مووسا لەگەڵ جادووی ئێمەدا ناخرێتە تەرازووەوە !

ئنجا دوای پاکیو بێگوناهیی خۆیان ڕادەگەیەنن ، لە خوا دەپاڕێنەوەو دەڵێن : ﴿ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ١٢٦ ﴾، پەروەردگارمان ! ئارامییمان هەڵڕێژە سەر دڵ ، وە بە مسوڵمانەتییو ملکەچیی بۆ خۆت بمانمرێنە (و ڕووحەکەمان بە پاکیی لێ وەربگرەوە) .

وشەی (إِفْراغ) وەك پێشتر باسمان كرد : بریتیە لەوەی دۆڵچەیەك[١]، كە ئاوی پێ هەڵدەهێنجی، هەموو ئاوەكەی هەڵرێژی[٢]، دەڵێن : خوایە ! هەرچی سەبرو ئارامیی هەیە بیرژێنە سەرمان، دیارە زۆر لە هەڕەشەی فیرعەون ترساون ، وە سزایەكە زۆر سەخت بووە، چونكە نەیگوتوە : ئێستا دەتانكوژم ، گوتوویەتی : دەستو پێی ڕاستو چەپتان دەبڕمو هەڵیشتان دەواسم ، ئنجا بزانە بە چەند ڕۆژان گیانیان دەردەچێو ، ژیانیان لێ دەبڕێ ؟! دیارە زۆر بە ئازارو ئەشكەنجە دەیانكوژێ، بۆیە ئاوا لە خوای پەروەردگار دەپاڕێنەوە ، كە یارمەتییان بداتو ئارامییەكی باشیان بڕژێنێتە سەر دڵو دەروون .

وە لە سووڕەتی (طه)دا خوای زانا وردترو ڕوونتر ، باسی هەڵوێستی جادووگەرە ئیماندارەكان دەكات ، كە لە فیرعەون هەڵگەڕاونەوەو ئیمانیان بە مووسا هێناوە :

﴿ قَالُواْ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ ۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿٧٣﴾ إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾ ﴾،

واتە : (جادووگەرەكان كە ئیمانیان بە مووسا ﷺ هێنا) گوتیان : تۆ هەڵنابژێرین بەسەر ئەو بەڵگەو موعجیزە ڕوونو ئاشكرایانەدا كە بۆمان هاتوون لە پەروەردگارمانەوە ، {واتە : تۆ هەڵنابژێرینو بەرژەوەندییەك كە لە لای تۆ بێ ، هەڵی نابژێرین بەسەر خواو بەڵگەكانی خواو پەیامو بەرنامەكانیدا} ، وە بەسەر ئەو كەسەدا كە ئێمەی هێناوەتە دی، ﴿ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ﴾، چ بڕیارێك دەدەی

---

١) دۆڵچە : دَلْو ، سەتڵە یان دۆلكەیەكی گەورە كە ئاوی پێ لە بیر هەڵدەهێنجرێ .
٢) أفرغ يُفرِغُ إفراغاً : ئاوەكەی هەموو هەڵڕشتو هیچی لە دەفرەكەدا نەهێشت .

بیدە ، ﴿إِنَّمَا تَقْضِي هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ﴾، هەر بڕیارێك تۆ بیدەی ، تەنیا لە چوارچێوەی ئەم ژیانەی دنیا دایە، (قیامەت ناگرێتەوە)، ﴿إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ﴾، ئێمە بڕوامان بە پەروەردگارمان هێنا، بۆ ئەوەی لە گوناهەکانمان بمانبووری، {گوناهی جادووکردنو جادوو فێری خەڵك کردن ، لە دژی موعجیزەی مووسا ﵇} ، وە ئەوەی کە تۆ بە زۆر پێت دەکردین ، {دیارە فیرعەون بە زۆر خەڵکی کردوە بە جادووگەر، وا دیارە منداڵی خەڵکیان وەرگرتووەو، بە زۆر ناردوویانە بۆ لای ئەوانەی کە جادوو دەزانن، وە کردوویانن بە قوتابی جادووگەرەکان ، بۆ ئەوەی فێری جادوویان بکەن ، تاکو لە ڕۆژێکی ئاوادا بە حیساب بە جادووەکەیان ، بەرگریی بکەن لە فیرعەونو لە دامو دەزگاو لە کورسی حوکمڕانییەکەی} ﴿وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ﴾، واتە: وە (پاداشتی) خوا چاکترەو زیاتریش دەمێنێتەوە، واتە: پاداشتی خوا باشترە، لە پاداشتو خەڵاتو بەراتی تۆ ، وە زیاتریش دەمێنێتەوە، کە ژیانێکی هەمیشەییو هەتا هەتاییە لە بەهەشت دا .

ئنجا دوایی دەڵێن : ﴿إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ﴾، بێگومان هەر کەسێك بە تاوانباریی بچێتەوە بۆ لای پەروەردگاری، ئەوە دۆزەخ شوێنیەتی ، کە نە تێیدا دەمرێ، نەتێیدا دەژی ، {نە گیانی دەردەچێو نە ژیانەکەشی ژیانە} ﴿وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ﴾، وە هەرکەسێك بچێتەوە بۆ لای پەروەردگاری بە ئیمانەوە ، وە کردەوە باشەکانی ئەنجام دابن، ئەوە ئەوانە پلە بەرزەکانی بەهەشتیان هەیە، ﴿جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، لە نێو باغو بێستانە هەمیشەییەکان دا ، کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، {واتە : ڕووبارو جۆگەو جۆبار بە ژێر دارو درەختەکانو

کۆشـك‌و تەلارەکانیانـدا دەڕۆن} ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، واتـە : بـە هەمیشـەیی تێیـاندا دەمێننەوە ، ﴿ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴾، ئەوەش پاداشـتی هـەر کەسێکە ، کە خـۆی پاك‌و چـاك کـردوە .

وە لـە سـوورەتی (الشـعراء)دا ، دەفـەرموێ : ﴿ قَالُواْ لَا ضَيۡرَۖ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ۝٥٠ إِنَّا نَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ۝٥١ ﴾، واتـــــە : {جادووگەرەکان کە ئیمانیان هێنابوو لە وەڵامی هـەڕەشـەی فیـرعەوندا} گوتیـان : ﴿ لَا ضَيۡرَ ﴾، واتـە: زیـان ناکەیـن ﴿ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴾، ئێمە دەگـەڕێینەوە بـۆ لای پەروەردگـارمان ﴿ إِنَّا نَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ ﴾، ئێمـە ئومێـدمان هـەیە پەروەردگـــارمان لــە گوناهەکـــانمان بمانبـــووری، ﴿ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، لــە سۆنگــەی ئــەوەوە ، کــە ئێمــە یەکـــەمین بــڕواداران بـــووین (بــە مووســا ﵇و پەیامەکـەی‌و موعجیـزەکانی) .

دیــارە نــە لــێرە ، نــە لـە هـیچ کـام لـە ئایەتەکـان دا ، باسـی کوشـتن یـان نەکوشـتنیان نــەکراوە ، واتــە : باســی ئــەوە نەکــراوە : ئــایا فیــرعەون ئــەو هەڕەشـەیەی کە لێی کردن‌و ئەو بڕیارەی کە بـەسـەری دادان ، ئەو سزایەی بەسـەردا چەسپاندن، یان نـا ؟! ، خـوای کاربـەجێ لە هیچ کام لـە ئایەتەکـان دا باسـی ئـەوەی نەکردوە، ئەوەش ـ بـە ڕای مـن ـ دوو حیکمـەتی تێـدان‌و، دەگونجـێ زیاتریـش بـن :

یەکەم : گـرنگ نیـە دوای ئـەوەی کە مرۆڤـ لـە پێنـاوی خـوادا ، بڕیـاری مـەرگی بـۆ دەردەچـێ، بڕیارەکـە جێبـەجـێ بکـرێ‌و مەرگـەکە بـێ، یاخـود نەیـەت ، مـادام لەپێنـاوی خوادایـە ، هەموو شـتێك لەپێنـاوی خـوادا ئـاسـانە .

دووەم : ئەوەیـە کە بۆیە خـوای پەروەردگـار باسـی نەکـردوە، چونکە ئـەو بڕیـارە، وە ئـەو سـزا سـەختـە ، حـاڵەتێکـی نەرێنـیـی (سلـبي)ە ، بۆیـە خــوای شــارەزا نەیخسـتۆتە ڕوو ، ئەگـەرنا وا پێدەچـێ فیـرعەون سـزایەکەی جێبــەجێ کردبـێ بەسـەریاندا ، چونکـە هـیچ کـەس دەسـتی نەگـرتـوەو ، دەسـەڵاتی تەواویشـی

بەسەریاندا هەبووە ، بەڵام مادام ئەوان تازە خۆیان بە خوا فرۆشتوەو ئیمانیان هێناوە ، مەرگ لە ڕێی خوادا لەلایان بۆتە شتێکی ئاسایی ، تەماشا دەکەین : ئەگەر پێشێ چاوەڕێی تۆزە تەماعو خەڵاتو بەراتێکی فیرعەونیان دەکرد ، وە داوای کرێو خەڵاتیان لێ دەکرد ، ئێستا نەك چاوەڕێی هیچ شتێکی لێ ناکەن ، بەڵکو لە سزاو جەزرەبەکەشی بێمنەتن ! دیارە ئیمانیش بە خوای باڵادەست ، بەو شێوەیە مرۆڤ فێری عیززەت دەکات، وە وای لێدەکات کە بەرانبەر دنیاو ئەهلی دنیا ، سەربەرزبێو بێمنەت بێ .

**مەسەلەی دوازدەیەم** : کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾ ﴾، واتە: دارودەستەو قسە ڕۆیشتووانی فیرعەون ، بە فیرعەونیان گوت : ئایا لە مووساو گەلەکەی دەگەڕێی ، خراپەکاریی بکەن لە زەویدا، وە واز لە خۆتو پەرستراوەکانت بێنن ؟ ئەویش گوتی : زۆر بە خەستیی کوڕەکانیان دەکوژینو ئافرەتەکانیان بە زیندوویی دەهێڵینەوە، وە ئێمە بەسەر ئەوانەوە ، دەسەڵاتدارو باڵادەستو مل پێکەچکەرین .

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ، ئایا فیرعەون کە خۆی بە پەرستراوو پەروەردگار زانیوە ، پەرستراوانی (آلِهة)ی هەبوون ؟!

لە وەڵامدا دەڵێین : میسرییەکان کۆمەڵێك پەرستراویان هەبوون، وەك (مُحَمَّد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆی (التحرير والتنوير)دا دەڵێ : {وَكَانَ القِبْطُ مُشْرِكِينَ يَعْبُدُونَ آلِهةً مُتَنَوِّعَةً مِنَ الكَوَاكِبِ وَالعَنَاصِرِ ، وَصَوَّروا لَها صُوَرًا عَدِيدَةً مُخْتَلِفَةً باخْتِلاف العُصُورِ والأَقْطارِ، أَشْهَرُها (فِتَاح) وَهُوَ أَعْظَمُها عِنْدَهُمْ، وَكَانَ يُعْبَدُ بِمَدِيْنَةِ (مَنْفِيس)، وَمِنْها (رَعْ) وَهُوَ الشَّمْسُ ، وَتَتَفَرَّعُ عَنْهُ آلِهةٌ باعْتِبَارِ أَوْقَاتِ شُعَاعِ الشَّمْسِ، وَمِنْها (أزيريس) وَ (إِزِيس) وَ (هُورُوس) وَهَذا عِنْدَهُمْ ثَالُوثٌ مَجْمُوعٌ مِنْ أَبٍ وَأُمٍّ وَابْنٍ، وَمِنْها (تُوتْ) وَهُوَ القَمْرُ

وَكَان عِنْدَهُمْ رَبّ الحِكْمَةِ، وَمِنْها (أَمُونْ رَعْ)}[1]، واتە : قیبتییەکان هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، چەند پەرستراوێکی جۆراو جۆریان لە خڕۆکەو ئەستێرەو توخمەکان دەپەرستن ، وە وێنەی جۆراو جۆرو جیاوازیان بۆ دروستکردبوون ، بە پێی جیاوازیی چاخو سەردەمەکانو شوێنەکان، بە ناوبانگترینیان (فِتَاح) بووە، کە ئەوە گەورەترین پەرستراویان بووە، وە لە شاری (مَنْفِیس) پەرستراوە ، وە یەکێکی دیکە لەو پەرستراوانەیان ، ناوی (رَعْ) بووە کە بریتیە بووە لە خۆر ، کە ئەویش واتە : خۆر چەند پەرستراوێکی دی لێ جیابوونەوە ، بە پێی کاتەکانی تیشکدانەوەی خۆر، {یانی: کاتی بەرەبەیان ، کاتی چێشتەنگاوو ، نیوەڕۆو ، ئێوارە بەو شێوەیە} هەروەها لەو بتانەی کە پەرستوویانن بە پەرستراویان داناون، یەکێکی دی ناوی (أَزِیرِیس) بووە، یەکێکی دی ناوی (إِزِیس) بووە، وە یەکی دی ناوی (هُورُوس) بووە، وە ئەو سێیە سێکوچکەیەکیان پێکهێناوە ، کە گوایە بابو دایكو کوڕن، هەروەها یەکی دیکە لەو بتانە ناوی (تُوت) بووە ، کە بریتیە لە مانگ، وە لە لای ئەوان بە پەروەردگاری خاوەن حیکمەتو زانست ناسراوە، هەروەها یەکی دی ناوی (أَمُونْ رَعْ) بووە .

کەواتە: فیرعەونییەکان چەند بتو صەنەمێکیان پەرستوون، بۆیە داروودەستەی فیرعەونو قسەڕۆیشتووەکانی، بە فیرعەون دەڵێن : ئایا لە مووساو لە گەلەکەی دەگەڕێی ، واز لە خۆتو پەرستراوەکانت بهێنن، خوایەك بپەرستن کە جیایە لەو پەرستراوانە، دیارە فیرعەونیش وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێ : نەخێر، ئێمە لێیان ناگەڕێین، بەڵکو کوڕەکانیان سەردەبڕین، وە ئافرەتەکانیشیان دەهێڵینەوە (بۆ خزمەتو بۆ ڕابواردن)، وە ئێمە بەسەر ئەوانەوە دەسەڵاتدارین ، وە ملپێکەچکەرین، یانی : لە دەستمان قوتار نابن ! بەڵێ فیرعەون لەو خەیاڵە دابووە، بەڵام ئەوەی لەلای عەبد خەیاڵە، لەلای خوا بەتاڵە ، وەك لە دەرسی داهاتوودا باسی دەکەین .

**مەسەلەی سێزدەیەمو کۆتایی:** ئنجا با بزانین سەرەنجام چی لێدێ ؟! کاتێك کە فیرعەون بەو شێوەیە هەڕەشەی لە بەنی ئیسرائیل کرد ، کە نێرینەکانیان

---

١) ج : ٩ ، ص : ٥٨ .

سەردەبڕێ، وە کچەکانیشیان دەهێڵێتەوە، وە بەردەوام دەیانخاتە ژێر سۆغرەو بێگارەوە، دیارە بەنی ئیسرائیل زۆر دڵتەنگ بوون، وە دیارە لە دوای هاتنی مووسا ﷺ، فیرعەون ئەوەی بە بەنی ئیسرائیلی کردوە ، زیاتر بووە، لە ئازارو ئەشکەنجەو سۆغرەو بێگار ، لە کاردانەوەی مووساو پەیامەکەیدا، بۆیە پێویستی بەوە کردوە کە مووسا دڵی خەڵکەکەی‌و میللەتەکەی خۆی بداتەوە، ئنجا لێرەدا خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ ﴾

واتە: مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: یارمەتی لە خوا وەربگرن، {واتە: داوای یارمەتیی لە خوا بکەن} وە خۆڕاگر بن ، بێگومان سەرزەمین هی خوایە، دەیکاتە میراتی هەر کەسێك لە بەندەکانی کە بیەوێ {وامەزانن کە فیرعەون‌و داروودەستەکەی هەروا دەسەڵاتدارو حوکمڕان دەبن} وە سەرەنجامی دنیاو دوارۆژ هی پارێزکارانە،{ یانی : ئەگەر ئێمە پارێزکار بین ، سەرەنجامی چاك لە گەرەوی ئێمە دایە} ئەوانیش دیارە کە زۆر چەوسێنراونەوەو زۆر بێزارو ماندوو بوون، ئاوا وەڵام دەدەنەوە : ﴿ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ ﴾، گوتیان: هەم پێش ئەوەی کە تۆ بێی بۆ لامان، {وە پەیامی خوامان بۆ بێنی} ، هەر دەچەوسێنراینەوەو ئازار دەدراین، وە دوای ئەوەی کە هاتیشی ، ئازارو ئەشکەنجەکەمان هەر لەسەرەو بەردەوامە، مووساش ﷺ وەڵام دەداتەوەو ، دەفەرموێ : زۆر نیزیکە پەروەردگارتان دوژمنتان بفەوتێنێ، وە ئێوە لە جێی ئەوان بکات بە جێنشین لەسەر زەوی، ئنجا تەماشا دەکات، بزانێ چۆن ڕەفتار دەکەن ؟

لێرەدا مووسا ﷺ حەوت شتان بە گەلەکەی خۆی دەڵێ :

١/ ﴿ ٱسْتَعِينُواْ بِٱللَّهِ ﴾ : یارمەتیی لە خوا وەربگرن، واتە : پشت بە خوا ببەستن‌و، ڕووبکەنە خوا، وە کۆمەکیی لە خوا بخوازن ، لە بەرانبەر فێڵ‌و پیلان‌و ئازارو جەزرەبەی فیرعەوندا، مرۆڤ ئەگەر پشتی بە خوا قایم بێ، بێگومان خۆڕاگرتر دەبێ، وە ئومێد بەرناداو نابەزێ.

٢/ ﴿ وَٱصْبِرُوٓاْ ﴾: وە تەنیا ئەوەندەش نا ، کە پشت بە خوا ببەستن‌و داوای یارمەتیی لە خوا بکەن، بەڵکو بۆخۆشتان خۆڕاگربن، (صبر) بریتیە لەوە کە تۆ کە نەفسی خۆت حەپس بکەی ، لەسەر شتێك کە پێی ناخۆشە، نەفس شتێکی پێ ناخۆشە ، دەبێ خۆتی لەسەر حەبس بکەی، خۆتی لەسەر ڕابگری‌و پشوو درێژ بی، نەك چیکلْدانە گچکەو کەم حەوسەڵە بی .

٣/ ﴿ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾: ئنجا یەکێك لە یاساکانی خوای پێ ڕاگەیاندن : سەرزەمین هی خوایە ، دەیکاتە میراتی هەر کامێك لە بەندەکانی کە بیەوێ، واتە: وا مەزانن کە فیرعەون هەمەکارەی کەون‌و کائیناتە، فیرعەون یەکێکە لە دروستکراوەکانی خوا ، بەڵام خاوەنی سەرزەمین‌و ، خاوەنی دنیاو دواڕۆژ ، تەنیا خوایە ، وە دەگونجێ خوا فیرعەون لەبەین بەرێ‌و ئێوە بکاتە جێنیشین، وە سەرزەمینێك کە فیرعەون تێیدا حوکمڕانە ، بیکاتە میراتی ئێوە .

٤/ ﴿ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ : وە سەرەنجام بۆ پارێزکارانە، واتە : ئەهلی باتڵ لە سەرەتاوە ، هەندێك دێن‌و دەچن‌و خۆیان بادەدەن ، بەڵام سەرەنجام بۆ پارێزکارانە، ئێوەش ئەگەر ئەهلی پارێز بن ، سەرەنجام دنیاو دواڕۆژ لە گرەوی ئێوەدایە .

دیارە بەنی ئیسرائیلیش کە وەك گوتم : زۆر ناڕەحەت بووبوون، ناڕەحەتی‌و بێزاریی دەردەبڕن‌و دەڵێن : پێش تۆش‌و دوای تۆش ، ئازاردرانمان هەر بەردەوامە . واتە : پێش ئەوەی هەڵبژێردرێی بە پێغەمبەر، وە دوای ئەوەی کە کراوی بە پێغەمبەر ، ئێمە ئەو ئازارو ناڕەحەتییەی کە فیرعەون دەیداین ، هەر بەردەوامە .

٥/ ﴿ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ ﴾ : (مووسا) گوتی : نیزیکە پەروەرگارتان دوژمنەکانتان بفەوتێنێ ، واتە: ئومێدەوار بن بە خوا، وە پشتتان بە خوا قایم بێ ، وە بەرچاوتان ڕوون بێ، وە دوور ببینن، تەنیا ئەم پێنج و دوو ڕۆژە، کە تێیدا دەژین : سۆغرەو بێگارتان لەسەرەو فیرعەون دەتانچەوسێنێتەوە ، هەر ئێستا مەبینن، ئاسۆی دوور تەماشا بکەن .

٦/ ﴿ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الْأَرْضِ ﴾ وە نیزیکە خوا بتانکاتە جێنشین لەسەر زەوی ، واتە : بتانکاتە جێگرەوەی فیرعەون و داروودەستەکەی ، لە شوێنی ئەوان ئێوە ببنە حوکمڕان .

٧/ ﴿ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾ : ئنجا ئەو کاتە خوا تەماشاتان دەکات ، بزانێ چۆن ڕەفتار دەکەن ؟ واتە: ئەوکاتەش ئاگاتان لە خۆتان بێ.

ئنجا لە سووڕەتی (یونس)دا وردەکاریی زیاتر لەوبارەوە هاتوە ، کە فیرعەون و داروودەستەکەی ، چۆن مووسا ﷺ و گەلی مووسایان چەوساندۆتەوە ، خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (یونس)دا ئاوا دەفەرموێ : ﴿ فَمَا آمَنَ لِمُوسَىٰ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِ عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ ۚ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّهُ لَمِنَ الْمُسْرِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَا قَوْمِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴿٨٤﴾ فَقَالُوا عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّآ لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا وَاجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ ۗ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالًا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا عَن سَبِيلِكَ ۖ رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَىٰ

أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَٱسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾،

لێرەدا خوای پەنهانزان باسی ئەو ماوەیە دەکات کە چۆن فیرعەون ، لەعنەتی خوای لێ بێ ، بەنی ئیسرائیلی چەوساندۆتەوە، وە مووسا ﷺ و هاروونی برای صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ ، چۆن ئامۆژگاریی گەلی خۆیان کردوە، وە سەرەنجام خوای پەروەردگار چ بەڵێنێکی پێداون :

دەفەرموێ : ﴿ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِۦ عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ ﴾، دوای ئەوەی کە مووسا ﷺ چوو بۆ لای بەنی ئیسرائیلو لەنێو بەنی ئیسرائیلدا بە پێغەمبەری خوا هەڵبژێردراوە، لەگەڵ فیرعەوندا ڕووبەڕوو بووەوە ، ئنجا لەنێو گەلەکەیدا بانگەوازی کرد ، خوا ﷻ دەفەرموێ : بەڵام کەس بڕوای بە مووسا ﷺ نەهێنا ، جگە لە گەنجانێك لە گەلەکەی ، ﴿ ذُرِّيَّةٌ ﴾، واتە : تازە پێگەیشتووانێك لە گەلەکەی ، وادیارە ئەوانەی کە بەتەمەن بوون ، لەسەر بت پەرستیی و عەقیدەی غەڵەتو پەڵەت ، کە لە ڕۆژگاری فیرعەونو لە فیرعەونییەکانەوە فێری بوون، بەردەوام بوون، بەڵام گەنجەکانی بەنی ئیسرائیل ، بڕوایان بە مووسا ﷺ هێنا، ئەویش لە چ حاڵەتێکدا ؟ ﴿ عَلَىٰ خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ ﴾، لە حاڵێکدا کە مەترسییان هەبوو ، لە فیرعەونو داروودەستەکەی ، کە بیانچەوسێننەوەو سزاو ئەشکەنجەیان بدەنو ، هەڵیان بگێڕنەوە ﴿ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾، وە بێگومان فیرعەون لە زەوی دا خۆی بە زل گرتبوو ، وە لە زێدەڕۆیی کاران بووو زۆر سنوور بەزێن بوو .

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴾، وە مووسا گوتی : ئەی گەلەکەم ! ئەگەر ئێوە بڕواتان بە مووسا هێناوە، پشتی پێ ببەستن ، ئەگەر ملکەچن بۆ خوا .

ئنجا ئایا ئەوان چییان گوت ؟! ﴿ فَقَالُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، (ئەوانەی کە بڕوایان هێنابوو) گوتیان: ئێمە پشتمان بە خوا بەستوە ، پەروەردگارمان ! مەمانکە بە مایەی تاقیکردنەوە بۆ کۆمەڵی ستەمکاران، {واتە: با نەمانچەوسێننەوە، وە ئازارو ئەشکەنجەمان نەدەن} وە بە بەزەیی خۆت دەربازمان بکە لە کۆمەڵی کافرانی ستەمکار.

ئنجا خوا باس دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا ﴾، وە وەحییمان نارد بۆ مووساو برایەکەی، {هاڕوون} پێمان گوتن : با لە میسر چەند جێگاو ڕێگایەکتان هەبن ، وا پێدەچێ مەبەست ئەوە بێ : با چەند ماڵێکتان هەبن ، کە کۆبوونەوەی تایبەتییان تێدا بکەن، ﴿وَٱجْعَلُوا۟ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً﴾، وە با ماڵەکانتان ڕوویان لە یەکدی بێ ، {بۆ ئەوەی کە ئاگاتان لە هەستو خوستی یەکدی بێ، ئەگەر کەسێکتان بەلایەکی بەسەر هات ، تەعەددایەکی لێکرا ، ئەوانی دیکە دیفاعی لێ بکەن}، ئەمە واتایەکی، واتایەکی دیکەی ئەوەیە : کە ماڵەکانتان بکەن بە ڕووگە ، واتە : بیکەن بە پەرستگا ، واتە : مەچنە دەر لە ماڵەکانتان بۆ خوا پەرستییو ، هەر لە ماڵەکانی خۆتاندا خوا پەرستیی بکەن، بە پەنهانیی، وە هەر لە ماڵەکانی خۆشتاندا کۆبوونەوە بکەنو دەرسو دەورتان هەبێ ، ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، وە نوێژ بەرپا بکەن لە ماڵەکانتاندا ، وە موژدەش بدەن بە ئیمانداران.

موژدەی چییان پێ بدەن ؟ موژدەی ئەوە کە ڕۆژێك دێ خوا دەربازیان دەکات ، ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، وە مووسا گوتی: پەروەردگارمان ! تۆ جوانییو ماڵو سامانێکی زۆری ژیانی دنیات بە فیرعەونو بە داروودەستەی فیرعەونو قسەڕۆیشتووانی فیرعەون ،

بەخشـــیوە ﴿ رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَ ﴾، پەروەردگـــارمان ! تاکـــو ئەوانـــە سەرەنجام بەهۆی ئەو ماڵو سامانو ئیمکانیەتەوە ، خەڵك لە ڕێی تۆ لابدەن، ﴿ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ ﴾، دەجـا پەروەردگـــارمان ! مـاڵو سامانەکـــەیان لەبەین بەرە ، ﴿ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴾، وە دڵیشیان توند بکەو مەهێڵە ئیمان بێنن ، تاکو سزای بە ئێشی تۆ دەبینن .

دیارە مووسا ﷺ زۆر لێیان بە داخ بووەو بە ڕقدا چووە، چونکە گوتوویەتی: خوایە ! مەهێڵە ئیمان بێنن ، مادام تەمەنیان هەمووی بە گوناحو تاوانو زوڵمو دەستدرێژیی ، لە بەنی ئیسرائیل ، بەڕێ کردوە ، با عاقیبەت خێر نەبنو ، ئیمان نەهێنن ، تاکو سزای بە ئێشی تۆ دەبینن .

هەڵبەتە مووسا ﷺ وەك هەر کام لە پێغەمبەرانی خوا ، مەگەر چۆن، ئەگەرنا داوایەکیان نەکردوە لەجێی خۆیدا نەبێ، وە بۆ شتێك لە خوا نەپاڕاونەوە کە بێجێ بێ، بۆیە هەمیشە خوای میهرەبان وەڵامی پێغەمبەرانی خۆی داوەتەوەو ، داواو پاڕانەوەکانیانی گیرا کردوون .

﴿ قَالَ قَدۡ أُجِيبَت دَّعۡوَتُكُمَا ﴾، (خوا) فەرمووی : وەڵامی داوایەکەتان درایەوە ، دوعایەکەتان گیرا بوو، ﴿ فَٱسۡتَقِيمَا ﴾، کەواتە : ئێوەش بەردەوام بنو پشوو درێژییتان هەبێ ، ﴿ وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، وە بە دوای ڕێو شوێنی ئەوانە مەکەون ، کە نازانن ، ئاگاتان لە خۆتانو گەلەکەتان بێ ، لەسەر ڕاستە شەقامی خوا بەردەوام بن ، وە بە دوای ئەو نەفامو نەزانانەی بەردەستی فیرعەون ، مەکەون .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چواردەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەشت (٨) ئایەت پێك دێ، لە ئایەتەکانی (١٣٠ تا ١٣٧)، خوای پەروەردگار لەم هەشت ئایەتەدا باسی ئەوە دەکات: کە پاش هەڵوێستی خراپو کەللەڕەقانەی فیرعەونو داروودەستەکەی، خوای باڵادەست سەرەتا گرانیی و قاتو قڕیی و بێ بەروبوومیی بەسەردا هێنان ، بەڵکو پەند وەربگرنو بگەڕێنەوە ، بەڵام سوودی نەبوو ، وە خێرو چاکەیان بۆ خۆیانو ، خراپەو شەڕیشیان بۆ مووسا عليه السلامو بڕواداران دەگێڕایەوەو ، دەیانگوت : ئەوە خەتای ئێوەیە تووشی ئەو بەڵاو گرفتارییانە دەبین ، وە بە مووساشیان گوت : هەرچەندە نیشانانمان بۆ بێنیو ، موعجیزانیشمان پێشان بدەی ، بڕوات پێ ناهێنین .

پاشان خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ : ئنجا تۆفانو کوللەو ئەسپێو بۆقو خوێنمان وەك بەڵا بە ملدا هێنان، جارێك ئاو زۆر دەبوو، دەبوو بە لافاوو تۆفان، جارێك کوللە کشتوکاڵو بەروبوومیی دەخواردن، جارێك ئەسپێ دەکەوتە گیانیان، یان دەکەوتە دەغڵو دانیان ، یان مەبەست پێی گەنەو قرنووە ، کە دەکەوتە جەستەی ئاژەڵو وڵاخەکانیان ، جارێك بۆق زۆری بۆ دەهێنان ، وە جارێك خوێنیان دەپژا ، یاخود ئاویان هەمووی دەبوو بە خوێن ، وەك دوایی بە تەفصیل باسی دەکەین ، وە هەر جارێك کە یەکێك لەو بەڵایانەیان تووش دەبوو ، دەیانگوت : ئەی مووسا ! داوامان بۆ لە پەروەردگارت بکە، کە ئەگەر ئەو سزایەمان لەسەر لابەرێ ، بڕوات پێ دێنینو بەنی ئیسرائیلیشت لەگەڵ دەنێرین ، کەچی کاتێك خوا بەڵایەکەی هەتا کاتێکی دیاریکراو ، لەسەر لادەبردن، بەڵێنیان هەڵوەشاندەوەو دەچوونەوە سەر بەزمی پێشێ !

بۆیــە خــوا دەفـەرموێ : سـەرەنجـام تۆڵـەمان لــێ سـتاندن‌و ، لـە دەریـادا نغــرۆمان کردن ، وە ئەو خەڵکەی کە دەچەوسێنرانەوە (کە بـەنی ئیسرائیل بـوون) ڕۆژهـەڵات‌و ڕۆژئـاوایەکانی ئەو سەرزەمینـەی کە بـە پێـزمان کـردوە (کـە وڵاتـی شـامە، بەتایبـەت فەلـەستین) کردمان بـە میـراتی ئەوان‌و، بـەوانـمان دا، وە بـەڵێنی چاکی خـوا بۆ بـەنـی ئیسرائیل هـاتە دی، وە هـەرچی فیـرعەون‌و گـەلەکەیشی دروسـتیان کردبوو، لەبـەین چوون‌و وێرانمـان کـرد .

﴿ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ
(١٣٠) فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ
وَمَن مَّعَهُۥٓۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ (١٣١) وَقَالُواْ
مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ (١٣٢) فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ
ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا
مُّجۡرِمِينَ (١٣٣) وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ
عِندَكَۖ لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ
(١٣٤) فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلرِّجۡزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ (١٣٥)
فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ
(١٣٦) وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا
ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ
وَدَمَّرۡنَا مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ (١٣٧) ﴾.

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە بــە دڵنیاییــەوە دارو دەســتەی فیــرعەونمان ، بــە ســاڵانی گــرانیی‌و کــەمیی بــەرووبووم گــرت (سـزادا) بـەڵکـو بیـریان بکەوێتـەوە (و پەنـد وەربگـرن) ﴿١٣٠﴾ ئنجـا کـاتێك خۆشـیی‌و چاکەیەکـیان بـۆ دەهـات ، دەیـانگوت: ئـەوە هـەر شـایسـتەی ئێمەیـە، بـەڵام کە ناخۆشـیی‌و خراپەیـەکیان بـەسـەر دەهـات ، بـە نەگبـەتیی مووسـاو ئەوانـەی لەگـەڵیـدان ، لـێکیان دەدایەوە، بزانن ! نەگبـەتییەکەیان لەلایەن خـواوەیە، وە گوتیـان : ئەی مووسا ! هەر نیشانەیەکمان بـۆ بێنـی ، تاکـو بـەهۆیــەوە جادوومـان لـێ بکـەی ، ئێمـە هـەر بـڕوات پـێ ناهێـنیـن ﴿١٣١﴾ ئنجـا ئێمـەش لافاوو کوللـەو گـەنە (یـان کـێچ‌و ئەسپێ)، وە بـۆق‌و خـوێنمـان (وەك بـەلا) بۆ ناردن، کەچی هـەر خۆیـان بـە زلگـرتو ، کۆمەڵـێکی تاوانبـار بـوون ﴿١٣٣﴾ وە کـاتێك سـزایان کەوتـە سـەر (و گیــرۆدە بـوون بــە بـەلایانــەوە) گوتیــان: ئـەی مووســا ! بـەهــۆی پـەیمانی خــواوە لەگـەڵــتدا (کـە ڕێـزت بگــرێ‌و داوات بگـرێتــەوە) بۆمـان لـە پەروەردگــارت بپــاڕێوە، ئەگــەر ئـەو سـزایەمان لەســەر لابـدەی ، بــە مسـۆگــەریی بـڕوات پــێ دێنیــن‌و، بــە دڵنیــاییەوە بــەنی ئیسـرائیلیـشت لەگەڵ دەنێرین ﴿١٣٤﴾ بـەڵام هەر کە سـزایەکەمان لەســەر لادان ، هـەتا کـاتێك کە پێیدەگەن، بـەڵێنیـان شـکـاند ﴿١٣٥﴾ بۆیە ئێمەش تۆڵەمان لـێ سـتـاندن‌و ، لـە دەریــادا نوقممــان کـردن ، بەهـۆی ئـەوەوە کـە بــە نیشانەکـانی ئێمـە بێبــڕوا بـوون‌و ، لێیــان بــێ ئـاگــا بـوون ﴿١٣٦﴾ وە ڕۆژهــەڵات‌و ڕۆژئـاوایـەکـانی ئـەو ســەر زەمینـەی کـە پیــت‌و پێــزمان تێخســتوە ، کردمـانــە میــراتی ئــەو خەڵکــەی کــە پێشـتــر دەچەوسێنرانــەوە، وە بەهــۆی ئــەوەوە کـە بــەنی ئیسـڕائیل خـۆڕاگــربوون ، وشــە (و بـەڵـێن)ی پەروەردگــاریان بــە تـەواویی بـۆ هــاتە دی، وە هــەرچی کــە فیــرعەون‌و خەڵکەکەی دروسـتیان دەکـرد ، (لـە خـانووو بــەرەو کەلوپــەل)وە هــەرچی لـە کەپــرو سـێبـەر ســازیان کردبـوو ، هـەموویمـان تێـك ڕماند ﴿١٣٧﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(بِٱلسِّنِينَ ) : دیارە (سِنِین) کۆی (سَنَة)یە، (سَنَة) واتە: سالٚ (السَّنَةُ: مِقْدَارُ قَطْعِ الشَّمْسِ البُرُوجَ الإِثْنَي عَشَرَ، وَهِيَ السَّنَة الشَّمْسِيَّة، أَوْ الجَدْبُ وَالقَحْط)، (سَنَة) ئەو ئەندازەیە کە خۆر دوازدە بورجەکان دەبڕێ ، واتە : دوازدە مانگان تەواو دەکات ، دیارە ئەوە سالٚی خۆریی پێ دەلٚێن، بەلاٚم سالٚی مانگیی ئەوەیە : کە مانگ دیارە دوازدە سووڕ تەواو دەکات، واتە : دوازدە (٢٩) شەوی ، یاخود (٣٠) شەوی، وە دیارە سالٚی خۆریی بە ڕۆژ حیساب دەکرێ ، وە سالٚی مانگیی بەشەو حیساب دەکرێ، وە سالٚی خۆریی پەیوەندیی بە جووڵەی مانگەوە هەیە، ئنجا دیارە مانگ هەر مانگی جارێك بە دەوری زەویدا دێتو دەچێت ، کە (٢٩) شەو یاخود (٣٠) شەوی پێ دەچێ، بۆیە دەگوترێ: سالٚی مانگیی (السَّنَة القَمَرِية) و سالٚی خۆریی (السَّنَة الشَّمْسِية) ، هەروەها وشەی (سَنَة) لە زمانی عەرەبیدا بە گرانیی‌و قاتو قڕییش دێ، وە لێرەدا کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ بِٱلسِّنِينَ ﴾، واتە: سالاٚنی گرانیی‌و قاتو قڕییمان بەسەر هێنان ، ئایا چەند سالٚ بوون ؟ دیاریی نەکراوە .

(يَطَّيَّرُواْ ) : لە ئەسلٚدا (يَتَطَيَّرُ)ە، دەگوترێ : (تَطَيَّرَ فُلاَنٌ : تَفَاءَل بالطَّيْرِ ، التطيُّر : التَّفَاؤُلُ والتشاؤُم ، طائِرهُم: شُؤْمُهُم) عادەتی عەرەبان وابووە ، ئەگەر ویستبیان کارێك بکەن، بالٚندەیەکیان هەلٚدەفڕاند، ئەگەر بە لای ڕاستدا ڕۆیشتبایە دەیانگوت : (تیامن) ئەوە بەرەکەتە، بەلاٚم ئەگەر بە لای چەپدا ڕۆیشتبایە دەیانگوت : (تَشاءَم) ئەوە شوومە، نەگبەتییە، لای ڕاستیان بە لای خێرو بەرەکەت دانابوو، وە لای چەپیان بە لای نەگبەتیی، بەلاٚم ئەوە عادەتێکی نەفامیی عەرەبەکان بووە، ئنجا لەوە ڕا ڕەشبینیان بە (تَطَيُّر) لێك دەدایەوە، (تَطَيَّر)، واتە: (تَشاءَم)، ئەو وشەیان بە نەگبەتیی زانیوە، بۆیە دەفەرموێ :

﴿يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ﴾، واتە: مووساو ئەوانەی لەگەڵیدان ، بە مایەی نەگبەتیی‌و بێ خێریی خۆیان دەزانی ، دیارە (تَفَاؤُل) واتە : گەشبینی ، وە (تشاؤُم) واتە : ڕەشبینیی .

(مَهۡمَا ) : واتە هەرچەندە، دەڵێ: (اسْمُ شَرْطٍ جَازِمٌ لِفِعْلَيْنِ) (مهما) ناوی مەرجەو ، دوو فیعلان مەجزووم دەکات، وەك : (مَهْمَا تَزُورْنِي ، أُكْرِمْكَ) هەرچەندە تۆ سەردانم بکەی، منیش ڕێزت دەگرم، کە هەردووکیانی (مجزوم) کردوە .

(ٱلطُّوفَانَ ) : (الطُّوْفَان: كُلُّ حَادِثَةٍ تحيط بالإِنْسانِ، وَصارَ مُتَعَارَفَاً فِي الماءِ المتَنَاهِي فِي الكَثْرَة)، (طوْفان) هەر بەڵایەك، یان ڕووداوێکە کە دەوری مرۆڤ بدات، بەڵام وەك مانای باوی : تۆفان ئاوێکە زۆر زۆربێ .

(وَٱلۡجَرَادَ ): کوللە ، لەبەر چی ؟ (لأَنَّهُ يَجْرُدُ الأَرْضَ جَرْدَاً)، چونکە زەوی ڕووت دەکاتەوە، هەر کشتوکاڵێکی لەسەربێ ، دەیخوات، بۆیە ناوی لێنراوە (جَرَاد).

(وَٱلۡقُمَّلَ ) : دەڵێ : (دُوَيْبَةٌ مِنْ جِنْسِ القِرْدَانِ إِلاَّ أَنَّها أَصْغَرُ مِنْها تَرْكَبُ البَعِيرَ عِنْدَ الهُزَال، ذَاتُ أَرْجُلٍ كَثِيرَة تَعِيش عَلَى الدَّوَابِ والطيور، وَمِنْها أَجْنَاس الوَاحِدَة قِرَادَة)[1]، کورتەی ماناکەی (قُمَّل) ئەوەیە لە شێوەی (قردان)ە، واتە لە شێوەی گەنەو قرنووە، وە لە کاتی بێهێزییدا بە جەستەی حوشترەوە دەنووسێ، (وە ئەوان باسی حوشتریان کردوە، چونکە حوشتریان لەلابووە، ئەگەرنا بە جەستەی ڕەشەوڵاخو مانگاو گاو مەڕو بزنیشەوە ، دەنووسێ) ، ئنجا دەڵێ : چەند پێیەکی زۆری هەن، لەسەر ئاژەڵ‌و لەسەر باڵندەش دەنیشێ ، وە جۆری زۆرن، تاکەکەی پێی دەگوترێ : (قِرادة)، هەڵبەتە هەندێکیشیان وشەی (قُمَّل)یان بە مانای ئەسپێ‌و کێچ لێکداوەتەوە ، ئەوەی دەکەوێتە جەستەی مرۆڤەوەو خوێنی مرۆڤ دەمژێ .

---

١) المعجم الوسيط ، ص ٧٤٤ ، و مختار الصحاح، ص ٤٧٨ .

(ٱلرِّجۡزُ ) : (الرِّجْـزُ: الإضْطـراب، العَـذَاب) ، (رِجْـز) بــە مانـای جــوولآنو لەرزینــەوە هاتوە، وە بـە مانای سـزاو ئـازاریش هاتــوە.

(يَنكُثُونَ ) : (النَّكْـثُ: الـنَقْضُ وَاســتعِيرَ لِـنَقْضِ العَهْـدِ) ، (نکـث) بریتیــە لــە هـەڵوەشـاندنەوەی شـتێك، بەڵام دوایی خـوازراوەتەوە بۆ هـەڵوەشـاندنەوەی پـەیمان .

( فَٱنتَقَمۡنَا ): واتـە: تۆڵـەمان لـێ سـتاندن، (نَقَتُ الشـيءَ وَنَقَمْتـهُ: إذَا أَنْكَرْتَـهُ لِسـاناً أَو عُقُوبـة) شـتێك کـە بــە زمـان نکوولّـیی لـێ بکـەی، یاخـود سـزای لـە بـەرنبـەردا دابنێـی ، (نَقِمَ)ی بۆ بەکاردێ ، ئەوە پێی دەگـوترێ : (نَقِمَ يَنْقَمُ نَقَمْتهُ) .

(ٱلۡيَمِّ ) : (يَـمْ) بــە مانـای ئــاوێکی زۆر دێ، چ دەریـا بـێ، چ ڕووبـار بـێ، هـەرچـەندە گوتــوویەتی: (الْـيَمُّ : البَحْـرُ)، بــەڵام بــە ڕووبـاری گــەورەش دەگـوترێ (يَـمْ)، بــە بـەڵگەی قورئـان ، کـە دوایی باسـی دەکەین .

(وَدَمَّرۡنَا ) : (التَّدْمِيــرُ: إِدْخَـالُ الـهَلاَكِ عَلَـى الشـيءِ)، (تَدْمِيــر) بریتیـە لـەوە کـە شـتێك بفـەوتێنـیو لەبـەینی بـەریو کـاول بــێ .

(يَعۡرِشُونَ ) : واتـە کـەپرو سـاباتیان بـۆ دروسـت دەکـرد (العَرْشُ فِي الأَصْلِ شَـيء مسـقّف، وَجَمْعُـهُ عُـرُوش، قِيـلَ عَرَشـت الكَـرْمَ وَعَرَّشــتهُ ، إِذَا جَعَلْـتَ لَـهُ كَهَيْئَـةِ سَقْفٍ)، (عَرْش) لە ئەسڵدا شـتێکە سـەربانێك ، سـەقفێکی هەبـێ ، وە کۆیـەکـەی (عُـرُوش)ە، دەگوتــرێ : (عَرَشـت الكَـرْمَ وَعَرَّشـتهُ) ، واتــە : کەپــرم بـۆ مێوەکـە دروسـت کرد، سـاباتم بۆ دروست کرد .

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە درێژەی بەسەرهاتی فیرعەون‌و مووسا عليه السلامدا، دوای ئەوەی کە فیرعەون ـ وەك لە دەرسی ڕابردوودا باسمان کرد ـ بەو شێوەیە هەڕەشەی لە بەنی ئیسرائیل کرد، مووسا عليه السلام ئامۆژگاریی قەومەکەی کردو دڵی دانەوەو دڵی خۆشکردن، وە ئومێدی خستنە بەر، کە دوور ببینن‌و ئاسۆ بە ڕوونیی ببینن، هەر تەماشای ئێستا نەکەن، کە لێڵە، دیارە هەمیشە دەبێ سەرکردەو چاوساغان‌و مشوورخۆران، بە دڵی گەورەوە، بە ئومێدو هیواوە، تەماشا بکەن، وە تووشی نائومێدیی‌و تەما بڕاویی نەبن، وە تەنگە پرێسکەو چیکڵدانە گچکە نەبن .

بەڵێ دوای ئەوە خوای پەروەردگار باسی ئەوە دەکات کە: ئەوەی مووسا عليه السلام ئەگەری بۆ دانابووو، چاوەڕوانیی دەکرد، هاتە دی، کە مووسا چاوەڕوانیی ئەوەی دەکرد، خوا گەلی فیرعەون بفەوتێنێ: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٢٩﴾﴾، واتە: نیزیکە پەروەردگارتان، دوژمنەکانتان بفەوتێنێ، وە ئێوەش لەسەر زەوی بکاتە جێنشینی ئەوان، وە تەماشا بکات ئێوەش چۆن ڕەفتار دەکەن .

ئنجا ئەوە سەرەتای هاتنە دی، ئەو ئەگەرەیە کە مووسا عليه السلام لە دڵی گەورەو پڕ ئیمانیدا جێگیری کردبوو :

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَا آلَ فِرْعَوْنَ بِالسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾، وە بێگومان ئێمە داروودەستەو شوێنکەوتووانی فیرعەونمان بە ساڵانی گرانیی‌و قات‌و قڕیی گرت، (سزامان دان)، وە بەروبووم میوەو حاصەڵاتیان لە کەمیی دا، بەڵکو پەند وەربگرن‌و بگەڕێنەوە .

واتە: خوای پەروەردگار ڕقی لێیان نەبوو، بەڵکو بەزەیی پێیاندا دەهات، کە بەو دوو بەڵایە: بە بەڵای قاتو قڕیو، کەمیی بەروبووم، تاقیکردنەوە، یانی جاری وا بووە، قاتو قڕیی نەبووە، بەو مانایەی وشکە ساڵ بووبێو باران نەباریبێ، باران هەبووە، بەڵام بەرهەمو حاصەڵاتەکەیان بۆ نەهاتۆتەدی: کوللە لێی دەدا، نەخۆشیی دیکەی تووش دەبوو، گرنگ ئەوەیە بەرهەمەکەیان زۆر کەمی دەکردو، ئەوە نەبوو کە چاوەڕوانییان دەکرد، بەڵام ئایا بۆچی خوا وای بەسەرهێنان؟ بەڵکو پەند وەربگرن.

ئنجا باسی هەڵوێستی قیبتییەکان، هەڵوێستی داروودەستەی فیرعەون شوێنکەوتووانی فیرعەون دەکات، دەفەرمووێ: ﴿فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦ﴾، ئەگەر چاکەو خێرو خۆشییەکیان تووش بووبایە، دەیانگوت: ئەوە هی ئێمەیە، ئەوە ئێمە شایستەین، بۆیە خوا ئەوەمان بەقسمەت دەکات ﴿وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ﴾، بەڵام ئەگەر خراپەیەکیان تووش بووبایە، کە ئەوان بە خراپیان دادەنا، هەرچەندە ئەگەر پەندیان لێ وەرگرتبایە، خراپەکەشیان بۆ وەخێر دەگەڕا، وە چاکەش ئەگەر شوکری لەسەر نەکەی، دەبێتەوە بە نیقمەت، دەفەرمووێ: کاتێك شتێك کە ئەوان پێیان خراپە، تووشیان دەبوو، ئنجا ساڵی گرانیی دەبوو، وشکە ساڵی دەبوو، بەرهەمو میوەجاتیان کەم دەبوو، دانەوێڵەکەیان باش نەدەبوو، ﴿يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ﴾، مووساو ئەوانەی کە لەگەڵ مووسا عليه السلام دان (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەوانیان دەکردە مایەی نەگبەتیی، دەیانگوت: ئەوە نەگبەتیی ئەوانە لە ئێمەشی داوە، یانی: ئەوان مووساو شوێنکەوتوانیان دەکردە مایەی ڕەشبینیی خۆیان، ئنجا خوا دەفەرمووێ: ﴿أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾، ئاگاداربن مایەی نەگبەتییەکەیان لە خواوەیە، واتە: بە ویستی خوا بەسەرتان هاتووە، بەڵام بەهۆی کردەوە خراپەکانی خۆیانو، بەهۆی هەڵوێستی خراپی خۆیانەوە، خوای

دادگەر ئەو نەگبەتییو بێ خێرییەی بۆ بڕیارداون ، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەلاّم زۆربەیان نازانن، نازانن کە بەهۆی کردەوە خراپەکانی خۆیانەوەیە ، خوا نەگبەتیی بە مل دا هێناون و بۆی بڕیارداون .

ئنجا هەڵوێستێکی دیکەی خراپو بگرە خراپتریشیان لێ دەگێڕێتەوە : ﴿ وَقَالُوا مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴾، وە بە مووسایان گوت : هەرچەندە هەر نیشانەیەك، هەر موعجیزەیەکمان پێشان بدەی ، تاکو جادووی پێ لە ئێمە بکەی ، ئێمە هەر بڕوات بۆ ناهێنین، وە بە ڕاستت نازانین ، یانی : ئێمە هەڵوێستمان ناگۆڕێ، چەند کەللە ڕەق بوون !!

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ﴾، سەرەنجام ئێمەش لافاوو کوللەو ئەسپێو بۆقو خوێنمان ناردە سەریان :

١ / ﴿ ٱلطُّوفَانَ ﴾، لافاو، ئاوی زۆر، کە هەڵدەستا هەموو کشتوکاڵ، بەڵکو جاری وا هەبوو ماڵو حاڵەکانیشیان پڕ دەبوون لە ئاو .

٢ / ﴿ وَٱلْجَرَادَ ﴾، کوللە لە کشتوکاڵو بەروبوومیانی دەداو هەمووی دەخوارد .

٣ / ﴿ وَٱلْقُمَّلَ ﴾، ئەسپێ ، یاخود کێچ کە لە جەستەی خۆیانی دەداو ، بێزاری دەکردن ، خوێنی دەمژین ، یاخود گەنەو قڕنوو لە ئاژەڵەکانیانو پەلەوەریانی دەدا .

٤ /﴿ وَٱلضَّفَادِعَ ﴾، واتە: بۆقیشمان بۆ ناردن ، مێژووزانان دەڵێن : ئەو بۆقانە دەهاتنە بەرو مەجلیسیانو جاری وا هەبوو ، کە قسەی دەکرد ، بۆقێك دەیویست بچێتە نێو زاری ! زۆر بێزاریان دەکردن، وە هەمیشە قڕە قڕیان هەبوو .

٥ / ﴿ وَٱلدَّمَ ﴾، وە خوێنیشمان بۆ ناردن، ئنجا هەندێك لە زانایان دەڵێن : ئەوە بوو کە بەردەوام خوێنیان دەپژا ، هەندێکیش دەڵێن : کانیاوو سەرچاوەکانیان

هەموویان پڕ دەبوون لە خوێــن ، واتــه : لـه جیاتی ئـاو، کـه هەڵیـان دەهێنجـا ، خـوێن بـوو !

﴿ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ﴾، ئەوانە چەند نیشانەو بەڵگەو موعجیزەیەکی ڕوونو ئاشـکرا بوون، وەك چۆن قسـەیەك کە بـە کاوەخـۆ دەیکـەی، ئـەوەی کـە گوێگـرە ، بـاش لێـی تێدەگات، ئەو نیشانانەش : ئەوەندە ڕوونو ئاشکرا بوون ، وەك قسەی بە ڕێو جێ ؛ زۆر ڕوونو ئـاشــکرا بـوو، کـە ئەوانـە تاقیکردنــەوەی خــوان، ئەوانــە بــەڵای خــوان بـەسـەریان هاتوون ، کەچی ئەوان هەڵوێستیان چۆن بـوو ؟ ﴿فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ﴾، خۆیـان بـە زل گـرت ، وە کۆمەڵێکـی زۆر تاوانبار بوون .

دیـارە ئێمە دوایی ئـەو نیشـانەو بەڵایانـە ، لـە مەسـەلە گـرنگەکـان دا باشـتـر ڕوون دەکەینەوە، کە ئەوانە چۆن بوونو چۆنیـان بـەسـەر هـاتوون ؟ کـە دیارە ئـەم پێنجە : لافـاوو کوللـەو ئەسـپێو بــۆق و خوێــن ، لەگــەڵ ئــەو دووەی پێشـــێ : گـرانیــیو بـەروبووم کەمیـی ، لەگـەڵ گۆچـانی مووسـاو دەسـتەکـەی دا ، ئـەو نـۆ ئـایەتەن ، کە خـــوا پەروەردگـــاری دەربارەیــان فەرموویــەتی : ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ ...﴿١٠١﴾﴾الإسراء، واته: ئێمە نۆ نیشـانەی ڕوونو ئـاشـکرامان بـە مووسـادا بـوون ، بـۆ لای فیـرعـەونو فیـرعەونییـەکان .

ئنجا دەفەرموێ : ﴿وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ﴾، ئنجا کاتێك ئـازارو سـزای خـوایان کەوتە سەر ، گوتیان : ئەی مووسا ! بۆمان لە پەروەردگـارت بپـاڕێوە ، بـەهۆی ئەوەوە کە بـەڵێنی بـە تـۆ داوە ، ﴿لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ﴾، ئەگەر تۆ ئەم سزاو ئازارەمان لەسـەر لابـەری ، ﴿لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ﴾، لەبـەر تۆ بڕوا دێنین ، بڕوا دێنین بۆ تۆ : بە پەیامەکەتو بە پەروەردگارتو بـەو بەرنامەیـەی کــە هێناوتــە ، ﴿وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾، ســەرباری ئــەوەش : بــەنی

ئیسرائیلیشت لەگەڵ ڕەوان دەکەین ، کە تۆ داوا دەکەی لەبەردەستی ئێمەیان دەربێنی ، ئەوانیشت لەگەڵ دەنێرین ، بۆ کوێیان دەبەی بیانبە، بەڵام ئایا ڕاستیان دەکرد ؟ نەخێر بەڵکو : کە گرانییان بەسەردا هاتوە ، ئەو بەڵێنەیان داوە ، دوایی کە مووسا ﷺ دوعای کردووەو گرانییەکەیان لەسەر لاچووە، دیسان گەڕاونەوە سەر بەزمی پێشی !

ئەوجار کەمیی بەروبوومیان بەسەردا هاتوە ، دیسان چوونەوە بۆ لای مووسا ﷺ و پاڕاونەوەو، ئەویش لە خوا پاڕاوەتەوە، ئەو بەڵایەی لەسەر لابردوون، کەچی دوایی دووبارە تێهەڵچوونەوە، پاشان خوای پەروەردگار تۆفانی بۆ ناردوونو ، ئاوا بەو شێوەیە ...هتد، ئنجا خوا ﷻ دەفەرمویٚ : ﴿ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ ﴾، ئنجا هەر جارێك سزاو ئازارمان لەسەر لادەبردن ، تا کاتێك کە پێی دەگەن ، واتە بە ڕەهایی خوا لەسەری لانەبردوون ، بەڵکو بۆ کاتێکی دیاریکراو، ئەو بەڵایەی لەسەر لابردوون، وە کە دووبارە گەڕاونەوە سەر وەزعی پێشوویان ، ئەوجار بەڵایەکی دیکەی بۆ ناردوون ، ﴿إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴾، هەموو جاریٚ پەیمانیان دەشکاند، خوای کارزانیش بە جۆرێکی دیکە بەڵایەکی دیکەی بۆ دەناردن ، هەتا ئەو بەڵایانەی هەموو بە ڕیز بۆ ناردن ، یەك لە دوای یەك ، بەڵام دوایی ئەوە بوو کە : خۆیان بە زل گرتو نەهاتنە ژێر بار ، سەرەنجام : ﴿ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَٰفِلِينَ ﴾، تۆڵەمان لیٚ ستاندنەوە ، وە لە دەریادا نوقممان کردن ، یاخود لە ئاوێکی زۆردا نوقومەان کردن، چونکە وشەی: (يَمّ) هەم بە مانای دەریا دیٚ ، هەم بە مانای ڕووباری گەورەش دیٚ، چونکە هەندێك لە زانایان گوتوویانە : لە ڕووباری (نیل)دا خنکاون، زۆربەشیان دەڵێن : لە (دەریای سوور)دا خنکاون، کە ئەوەی دووەمیان ڕاستترە، بەڵیٚ وشەی : (يَمّ) هەم ڕووبارێکی گەورە دەگرێتەوە، هەم دەریاش دەگرێتەوە ، کەواتە : یانی : لە ئاوێکی زۆردا نوقممان کردن .

ئنجا ئایا بۆچی وایان لێکرا ؟! دەفەرموێ : ﴿بِأَنَّهُمْ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنْهَا غَٰفِلِينَ ﴾، لەبەر ئەوەی بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە نەکرد، وە لێیان بێ ئاگا بوون، ئایەتەکان کامانەن ؟ ئەو موعجیزانەن کە خوا بە مووسا ﷺ ی داون، ئەو نۆ موعجیزەیە، وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو وەحیی‌و پەیامە بێ کە مووسا ﷺ لە خواوە بۆی هاتووە، ئەویش بە فیرعەون‌و داروودەستەکە ڕاگەیاندوە ، کە : تەنیا خوا بپەرستن، دوا ڕۆژ هەیە ، لێپرسینەوە هەیە، سزاو پاداشت هەیە، دنیا شاری بێ خاوەن نیە، تا کۆتایی .

ئنجا لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ﴾، وە ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە دەچەوسێنرانەوە : ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاواییەکانی ئەو سەرزەمینەی کە پیت‌و پێزمان تێخستوە ، کردمانە میراتیان ، ئەو سەرزەمینە کوێیە ؟ زۆربەی زانایان دەڵێن : شامە، چونکە دوایی بەنی ئیسرائیل دەچن لە شام نیشەجێ دەبن ، بۆیە ئێستاشی لەگەڵ دابێ جوولەکە داوای فەلەستین دەکەن‌و دەڵێن : ئەوە هی ئێمەیە، کە وەك دوایی باسی دەکەین : لەوەدا بەهەڵەداچوون، چونکە خوای پەروەردگار بۆ بە میراتگرتنی ئەو سەرزەمینە ، بەڵێنی دا بە چاکەکانیان ، کە ئەو سەرزەمینەیان بداتێ، بەڵام دوایی لەسەر گوناهو خراپەکانیان‌و لادانیان ، ڕۆمەکان لەوێ دەریانکردن ، هەروەها (بختنصر)ی بابلی دەریکردن‌و دەربەدەر بوون ، وە هەر ئەو کاتەش ئەو بەڵێنەی خوای پەروەردگار تەواو بووو کۆتایی هات .

ئنجا دەفەرموێ : ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْ ﴾ وە وشەی هەرە چاکی پەروەردگارت تەواو بوو ، لەسەر بەنی ئیسرائیل ، واتە: بەڵێنی هەرە چاکی خوا ، کە گفتی پێدان : سەریان بخات‌و، دەربازیان بکات، خوا ئەو بەڵێنە هەرە چاکەی بۆ بەنی ئیسرائیل بەجێ گەیاند، بەهۆی ئەوەوە کە خۆڕاگر بوون‌و، پشوو درێژ بوون، هەڵبەتە خەڵکی کەم حەوسەڵەو تەنگە پرێسکەو بێزاریشیان تێدا بووە، بەڵام دیارە خەڵکی واشیان تێدا بووە، کە خاوەنی سەبرو

خۆڕاگریی بوون، وە شایستەی ئەوە بوون خوای میهرەبان هەموویان دەرباز بکات، وەك کوردەواریی خۆشمان دەڵێ : (لە پەنا گوڵە گەنمێك دا ، سەد گوڵە جۆ ئاوێ دەخۆنەوە)، عەرەبیش دەڵێن : (وَمِنْ أَجْلِ عَيْنٍ، أَلْفُ عَيْنٍ تُكْرَمُ)، بەهۆی چاوێکەوە رێز لە هەزار چاو دەگیرێ ، ئەوانیش خەڵکی چاکیان هێندە تێدا هەبووەو شایستەی ئەوە بوون ، کە خوای بەخشەر لەبەر چاکەکان چاوپۆشیی لە خراپەکانیشیان بکات، وە بەڵێنی خۆی بۆ هەموویان بێنێتەدیو دەربازیان بکات ، ﴿وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ﴾، وە ئەوەی کە فیرعەونو گەلەکەی دروستیان دەکرد لە قەڵاو خانوو کۆشكو بینا، وە لە کارگەو دیاردەی شارستانیی ، ئەوانەمان هەموویان کاول کرد ، ﴿وَمَا كَانُواْ يَعْرِشُونَ﴾، وە ئەوەش کە دەیانکردە کەپرو سابات، واتە: ئەوەی کە بۆ ژیانی زستانە لە کۆشكو خانوو ، دروستیان دەکرد، وە ئەوەش کە بۆ هاوینە لە کەپرو سابات ، دروستیان دەکرد، یاخود ئەوەی کە لە قەڵای مەحکەمو کۆشكو تەلار بە کارامەییو بە وەستایی دروستیان دەکرد، وە ئەوەی کە بۆ باغو بێستانەکانیان سازیان دەکرد، ئەوانەمان هەموویان بەسەریێك دا رماندو رووخاندو ، کۆتاییمان بە قەوارە سیاسیەکەیانو حاڵەتەکەیان هێنا .

## چەند مەسـەلەیەکی گرنگ

**مەسـەلەی یەکـەم**: کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴾، دیارە پێشتر باسمان دەکرد، کە وشەی (سَنَة) بە مانای ساڵ دێ، کە دوازدە مانگە، بەڵام لێرەدا بە پێی سیاق دەزانین، کە مەبەست لە (سِنِين) واتە: ساڵانی بێ باران، ساڵانی وشکە ساڵ، کە دیارە ساڵ ئەگەر وشك بوو، وە ئەگەر باران نەبوو، بەروبوومو کشتوکاڵو دانەوێڵەش نابن، زانایان گوتوویانە: (أَخَذَهُ بالسنَة: بالقحْطِ وَالجَدْب) یانی: وشکە ساڵیی و بێ بەروبوومیی، بەڵگەشمان لەوبارەوە، ئەم فەرمایشتەیە: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ، دوعای لە قورەیش کرد، فەرمووی: ﴿اللَّهُمَّ اجْعَلْها عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٧٧١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥٧٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٤٤٤)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (١٠٧٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٢٤٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٥٨٥)}، واتە: خوایە! بە ساڵانێك سزایان بدە، {ساڵانی گرانیی و قاتو قڕیی و وشکە ساڵیی}، وەك ئەو ساڵانەی کە لە بەسەرهاتی (یوسف)دا هاتوون، {کە حەوت ساڵ بوو، بێ بارانیی و وشکە ساڵی قاتو قڕیی بوو}.

کە دەفەرموێ: ﴿ءَالَ فِرۡعَوۡنَ﴾ واتە: شوێنکەوتووانی فیرعەون، دەستو پێوەندی فیرعەون، لایەنگرانی فیرعەون، چونکە (ءَالَ)ی هەر کەسێك شوێنکەوتووانی ئەو کەسەن، (آلُ كُلُّ شَخْصٍ هُمْ أَتْبَاعُهُ) بەڵگەمان چیە لەسەر ئەوە؟! بەڵگەمان لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە دەگوترێ: (آل) لە (آل، يَؤُل، أَوْلاً)ەوە، هاتوە، واتە: (رَجَعَ، يَرْجِعُ، رُجُوعَاً) ئنجا بەو پێیەبێ (آل) ئەوانەن کە بۆ لای کەسێك دەگەڕێنەوە بە نەسەب، یاخود بە پەیوەندیی فیکریی، یان بە پەیوەندیی بە قسەکردنو پەیوەندیی سیاسی، واتە: هەر

کۆمەڵە کەسێك سەر بە کەسێك بن، چ بە ڕەچەڵەك (نسب) ، چ بە قسەکردنو گوێ ڕایەڵیی، پێیان دەگوترێ (آل)ی ، بۆیەش ئێمە :

﴿ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ ﴾، مان بە داروودەستە، وە بە شوێنکەوتووان ، تەفسیر کردوە ، نەك ئەوە کە مەبەست لە خزمانی فیرعەون بێ ! ئەگەرنا دەبێ خێزانی بگرێتەوەو ، ئەوانەی لە فیرعەون نیزیك بوون ، مسوڵمان بن، یان کافربن ، بیانگرێتەوە ! بەلام لە ڕاستی دا وانیە، بەڵکو (آل) واتە : شوێنکەوتووان ، کەسانێك کە لێی نیزیکن‌و، لەگەڵی هاوڕاو هاوڕێبازن، بۆیە وشەی (آل إبراهیم) و (آل مُحَمَّد)یش بە هەمان شێوەیە، واتە: کەسانێك کە لە موحەممەد ﷺەوە، یان لە ئیبراهیمەوە نیزیکن‌و ، لەگەڵی هاو بڕواو هاو ڕێبازن ، بۆیەش وا دەڵێین : چونکە هەندێ خەڵکی سەیدو شێخ دەڵێن : ئێمە خزمان‌و بنەماڵە (أهل البيت)ی پێغەمبەرین ﷺو خراپیش بین ، هەر لەوی نیزیکین ، وە خراپیش بین هەر لەگەڵ وین لە بەهەشت !! کە لە ڕاستی دا ئەوە ئەسڵ‌و ئەساسی نیە، شاعیرێکیش لەوبارەوە زۆر جوانی گوتوە ، دەڵێ :

آلُ النَّبِيِّ هُمُ أَتْبَاعُ مِلَّتِهِ
مِنَ الأَعَاجِمِ وَالسودَانِ وَالْعَرَبِ
لَوْ لَمْ يَكُنْ آلُهُ إلاَّ قَرَابَتَهُ
لصَلَّى المصَلِّي عَلَى الطاغِي أَبِي لَهَبِ

واتە : ئالی پێغەمبەر ، شوێنکەوتووانی ڕێبازەکەینی ، لە عەجەم‌و ڕەشپێستەکان‌و لە عەرەب ، ئەگەر ئەهلی ئەو تەنیا خزمە نزیکەکانی بان ، ئەوە کەسی صەڵەواتدەر، صەڵەواتی بۆ ئەبو لەهەبی یاخییش دەنارد !

ئنجا لەو نۆ نیشانانەی خوا بە مووسای داون، دووانیان بە ڕای زۆربەی توێژەرەوانی قورئان، ئەم دووەن : ﴿ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، واتە : وە ئێمە کە ئالی فیرعەونمان سزادا ، بە گرانیی‌و قاتو قڕیی‌و ، وشکە ساڵی ، وە بە کەمیی بەروبووم‌و میوە .

حەوتەکەی دیکەش : دووانیان : گۆچان‌و دەستی بوون ، وە پێنجەکەی دیکەش کە دوایی باسیان دەکەین : تۆفان‌و کوللەو ئەسپێ‌و بۆق‌و خوێن ، بوون ، ئنجا ئایا ئامانج چی بوو، لەوە ؟ ﴿لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾، ئامانج لەوە کە خوای پەروەردگار داروودەستەی فیرعەون‌و شوێن کەوتووانی فیرعەونی ، بەو دوو بەڵایە گرفتار کردووەو تاقی کردوونەوە : بیرخستنەوەیان بوو ، نەك ئەزیەت دانیان ، چونکە خوا ﷻ هیچ پێویستیی بە ئەزیەتدانی بەندەکانی نیە ، بەڵام بەڵایان بەسەر دێنێ ، تاکو بیربکەنەوەو، بە خەبەر بێن‌و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا.

ئەمە وەك هەردووك ئایەتی ژمارە (٤٢ و ٤٣)ی سوورەتی (الأنعام)ە ، کە پێشتر ئاماژەمان پێداون، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە لە پێش تۆدا پێغەمبەرانمان ڕەوانەکرد ، بۆ لای چەند کۆمەڵێك، کە بە هەژاریی‌و نەداریی‌و ناخۆشیی‌و نارەحەتیی تاقیمان کردنەوە، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای خواو بپاڕێنەوە ، ئنجا دەبووایە ئەگەر سزای ئێمەیان بۆ دەهات ، پاڕابانەوەو لاڵابانەوە (بۆ لای خوا) بەڵام دڵیان ڕەق بوو ، وە شەیتان ئەو کردەوانەی کە دەیانکردن ، بۆی جوان کردن ، وە لەسەر سەرکێشیی‌و یاخیی بوونی خۆیان بەردەوام بوون، {بۆیە سەرەنجام خوای دادگەر سزای دان} .

<u>**مەسەلەی دووەم**</u> : خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، ئنجا کاتێك کە چاکەو خۆشییەکیان بۆ دەهات ، {بارانیان باش بۆ دەباری، کشتوکاڵیان باش دەبوو، بەروبوومیان باش

دەبوو، ئاژەڵیان باش زاوزێی دەکرد}، دەیانگوت : ئەوە هی ئێمەیە، {خوا هەر بە ئێمەی داوەو شایستەی ئێمەیە}، بەلاّم ئەگەر خراپەیەکیان تووش دەبوو ، دەیانگوت : ئەوە لە نەگبەتیی مووساو ئەوانەیە کە لەگەڵ مووسادان ، خوا دەفەرموێ : ئاگاداربن ! نەگبەتییەکەیان بڕیارەکەی لەلای خواوەوەیە ، {بەلاّم هۆکارەکەی بێگومان لەلایەن خۆیانەوەیە} ، بەلاّم زۆربەیان نازانن .

ئنجا ئەمە یانی : گێڕانەوەی نەگبەتییو بەلاّ بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وە بۆ ئەهلی ئیمان، عادەتی لە مێژینەی ئەهلی کوفر بووە ، بۆ وێنە :

١) لە سووڕەتی (یس)دا خوا دەفەرموێ : ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ١٨﴾، واتە : (خەڵکی ئەو شارە کە سێ پێغەمبەرەکەیان بۆ لا چوون) گوتیان: ئێمە بەهۆی ئێوەوە تووشی نەگبەتییو بەلاّ بووین، وە ئێمە ڕەشبینین بەهۆی هاتنی ئێوەوەو ، ئەگەر واز نەهێنن ، لەلایەن ئێمەوە ئازارێکی بە ئێشتان پێدەگات .

٢) هەروەها لە سووڕەتی (النمل)دا ، دەفەرموێ : ﴿ قَالُواْ ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمۡ عِندَ ٱللَّهِۖ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ ٤٧﴾، گوتیان : { گەلی سەموود بە (صالح)یان گوت} : ئێمە بەهۆی تۆو ئەوانەوە کە لەگەڵ تۆدان ، تووشی بەلاّو نەگبەتییو گرفتاریی بووین .

٣) هەروەها لە سووڕەتی (النساء)دا ، دەفەرموێ : ﴿وَإِن تُصِبۡهُمۡ حَسَنَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِكَۚ قُلۡ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلۡقَوۡمِ لَا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ حَدِيثٗا ٧٨﴾، (خوا لێرەدا باسی دەغەڵو مونافیقەکان دەکات) ، واتە : وە ئەگەر خێرو خۆشییەکیان تووش بێ دەڵێن : ئەوە لە خواوەیە، بەلاّم ئەگەر خراپەو ناخۆشییەکیان بەسەربێ، دەڵێن: ئەوە لە تۆوەیە (ئەی موحەممەد) ! بڵێ : هەمووی هەر لەلایەن خواوەیە، ئەو کۆمەڵە (خەڵکە) بۆچی وان، نیزیکە لە قسە تێنەگەن !

وەك بڕیارو ویست لەلایەن خوایە، بەڵام بێگومان خراپەکان ، هۆکارەکانیان لە مرۆڤەکانەوەن .

ئنجا دەگوترێ : (تَطَيَّرَ مِنَ الشيءِ وَتَطَيَّرَ بَالشَيءِ وَالإسم الطِّيَرَةُ بَوْزَنِ العِنَبَة ، وَهُوَ مَا يُتَشاءَمُ بِهِ مِنَ الفَأْلِ الرَدِيءِ وَفِي الحَدِيثِ : أَنَّهُ كانَ يُحِبُّ الْفَأْلَ الْحَسَنَ وَيَكْرَهُ الطِّيَرَةَ)[1] ، (تَطَيَّرَ مِنَ الشيءِ وَتَطَيَّرَ بَالشَيءِ) هەردووکیان بەکاردێن ، واتە : ئەو شتەی کردە مایەی نەگبەتیی خۆیو ڕەشبینیی، بەهۆی ئەو شتەوە ڕەشبینیی بۆ دروست بووە ، وە ناوی (الطِّيَرَة) لەسەر کێشی (عِنَبَة)ە .

وە (طيرة) واتە : ڕەشبینیی نواندن، یاخود گەشبینیی نواندن ، بەڵام بە زۆریی بۆ ڕەشبینیی بەکاردەهێنرێ ، دەڵێ : (وَهُوَ مَا يُتَشاءَمُ بِهِ مِنَ الفَأْلِ الرَدِيءِ) بریتیە لە پێشبینیی کردنی شتی خراپو ڕەشبینیی، وە دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو هورەیرە گوتوویەتی : ﴿كانَ رَسولُ اللّهِ ﷺ يُحِبُّ الْفَأْلَ الْحَسَنَ وَيَكْرَهُ الطِّيَرَةَ﴾[2] {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٨٣٧٤) تعليق شعيب الأرنؤوط: صَحيح} ، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ گەشبینیی حەز لێ دەکرد، بەڵام ڕقی لە ڕەشبینیی بوو .

کەسێك دەهات دەیپرسی : ناوت چییە ؟ ئەگەر ناوێکی خۆشی هەبوایە ، دەیفەرموو ، موژدەتان لێ بێ (إِنْ شاءَ اللّه) خێرمان دێتە ڕێ ، ئەو نەفەرە ئەو ناوە خۆشەی هەیە .

١ - لە سوورەتی (الأعراف)دا خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرموێ : ﴿ فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٣١﴾ ﴾، ئاشکرایە وشەی (طائرهم) یانی : باڵندەکەیان، بەڵام لەبەر ئەوەی عەرەب عادەتیان وابوو، باڵندەیان هەڵدەفڕاندو، ئەگەر بە لای چەپدا ڕۆیبایە ، دەیانگوت :

---

١) مختار الصحاح، ص ٣٥٦ .

٢) مختار الصحاح، ص ٣٥٦ .

مایەی ڕەشبینییە ، وە بەلای ڕاستدا دەیانگوت : مایەی گەشبینییە ، بۆیە ڕستەی : ﴿طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾، واتە: هۆکاری نەگبەتییەکەیان لە خواوەیەو ، بە ئیرادەی خوایە .

٢ - هەروەها لە سووڕەتی (یس)دا ، دەفەرموێ : ﴿قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡۚ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ١٩﴾، واتە : (سێ نێرراوەکان) گوتیان : هۆی نەگبەتییەکەتان لەگەڵ خۆتانە، ئایا بەهۆی ئەوەوە کە ئامۆژگاریی کراون ، نەگبەتیی‌و بەڵاتان تووش بووە ؟ بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکی زێدەڕۆیی کارن .

٣ - وە لە سووڕەتی (الإسراء)دا ، دەفەرموێ : ﴿وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦۖ وَنُخۡرِجُ لَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ كِتَٰبٗا يَلۡقَىٰهُ مَنشُورًا ١٣ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ١٤﴾، واتە : هەموو مرۆڤێك بەخت‌و چارەنووسەکەی خۆیمان لە گەردنی قایم کردوە، وە لە ڕۆژی قیامەتدا نووسراوێکی بۆ دێنینە دەرێ ، بە کراوەیی دەیبینێ (پێی دەگوترێ :) لیستەکەی خۆت بخوێنەوە ، بەسە بۆخۆت لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتدا بکەی .

کەواتە: کە لەلایەك دەفەرموێ : ﴿طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾، لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ﴾ ، وە لێرەدا کە دەفەرموێ : ﴿وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦ﴾، ئەوە هەمووی بە ئیعتیباراتی جیایەو، ناکۆکیی لە نێوان ئەو ئایەتە موبارەکانەدا نیە، بەم شێوەیە :

١/ وەك بڕیارو ویست ، هەموو شتێك لەلایەن خواوەیەوە .

٢/ بەڵام وەك هۆکار ، خەڵکەکە بە گشتی هۆکارەکانی بەڵایەکانی خۆیان دەستەبەر دەکەن .

٣/ وە هەر مرۆڤێکیش بۆخۆی چارەنووسی خۆی ، وە سەرەنجامی خۆی بەدەست خۆیەتی ، دەگونجێ چارەنووسی باش بۆخۆی دابین بکات ، وە دەگونجێ هی خراپ .

وە دەربارەی ڕەشبینیی ئەم فەرمایشتەش دێنینەوە : ﴿عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ : الطِّيَرَةُ شِرْكٌ ، ثَلاَثاً: وَمَا مِنَّا إِلاَّ وَلَكِنَّ اللهَ يُذْهِبُهُ بِالتَّوَكُّلِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٤١٩٤) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (٣٩١٠) ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (٣٥٣٨) ، وَالحَاكِمُ برقم : (٤٣)، وَالبَيْهَقِي فِي (شعب الإيمان) برقم : (١١٦٧) ، وَالبُخَارِيُّ فِي (الأدب المفرد) برقم: (٩٠٩) ، وَأَبُو يَعْلَى برقم : (٥٢١٩) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٦١٢٢) ، وَالدَّيْلمِيُّ برقم : (٣٩٨٤)﴾ ، واتە : عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ڕەشبینیی هاوبەش بۆ خوا دانانە ، سێ جاران وای فەرموو ، وە هیچ کامێك لە ئێمە نیە ، مەگەر (جۆرێك لە ڕەشبینیی بە دڵدا دێ ) بەلاّم خوا بەهۆی پشت بەستن بە خواوە ڕەشبینیی لادەبات .

وە مرۆڤ بەهۆی ئەووە تووشی گوناح نابێ کە جارێك خەتەرەیەکی بەدڵدا بێ ، بەهۆی شتێکەوە کە لەنێو خەڵکدا بۆتە عورفو عادەت بۆ نموونە : یەکێك دەپژمێ ، یەکێك ناوێکی ناخۆشی لێیە ، بە پێی عورفو عادەتی باوی نێو میللەتان کە کردوویانە بە مایەی ڕەشبینیی ، ئەگەر بەهۆی ئەووە خەتەرەیەکی بەدڵدا بێ ، مادام پشتی بە خوا قایم بێ ، ئەوە ڕەشبینیی نیەو ، کاریگەریی نابێ ، چونکە مرۆڤ مرۆڤە ، دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو عورفو عادەتانەوە ، کە لە نێو کۆمەڵگاکان دا باویان هەیە .

**مەسەلەی سێیەم** : کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴾، واتە : وە ئەهلی میسر (دارودەستەی فیرعەون) بە مووساو بە هاروونیان گوت ، (بە پلەی یەکەم بە مووسا ؑ یان گوت :) هەرچەندە نیشانەمان بۆ بێنی، موعجیزەمان بۆ بێنی، بۆ ئەوەی کە بەو نیشانانەو موعجیزانە جادوومان لێ بکەی ، ئێمە هەر بۆ تۆ لە بڕواداران نابین، بۆ تۆ نابین بە بڕوادار .

دیارە لەمەوە دەردەکەوێ کە ئەوانە عەزمیان جەزم بووە ، لەسەر بڕوا نەهێنان ، واتە : پەکیان لەسەر بەڵگە نەکەوتوە ، بەڵکو ویستیان نەبووە ، بۆ ئیمان هێنان، بە بەڵگەی ئەوە کە دەڵێن : هەرچەندە نیشانەو بەڵگەو موعجیزەمان پێشان بدەی ، ئێمە هەر نابینە بڕوادار، دیارە خوا ﷻ مرۆڤی وا دروست کردوە کە بتوانێ ئیمان بێنێ ، وە بشتوانێ ئیمان نەهێنێ ، چونکە ئیمان تەنیا بریتی نیە لە زانینی شتەکان ، زانینی شتەکان وەك خۆیان ، وە پەیدابوونی ئیعتیقادو قەناعەتێکی چەسپاو ، بەوە کە فلانە شت ئاوایە ، بەڵکو ئەوە تەنیا یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی ئیمان ، بەلام وێڕای ئەوە ، ئیمان سێ پێکهێنەری دیکەشی هەن .

کە لە هەموویان گرنگتر بریتیە لە ویستن‌و ئارەزوومەند بوونی بە دڵ‌و پەسندکردنی‌و بە دڵ ، کە زانایان (الإذعان والقبول)ی پێ دەڵێن ، دەبێ بە دڵ ئەو شتەت بوێ‌و ئارەزووت لێ بێ ، کە ئەوەیان لە ژێر کۆنتڕۆڵی مرۆڤ دایە ، بەلام مرۆڤ کاتێك شتێکی دەکەوێتە بەرچاوو عەقڵ‌و دەرکی پێ دەکات ، بەدەست خۆی نیە کە دەزانێ ئەو شتە وایە ، مرۆڤ بەدەست خۆی نیە کە ئەستێرە دەبینێ ، ئاسمان دەبینێ ، باران دەبینێ ، چیا دەبینێ ، دەزانێ ئەوە چیایە، بەلام بەدەست خۆیەتی کە بڵێ : ئەو شتەیە یان ئەو نیە، واتە : دەتوانێ نکووڵیی لێ بکات ، یان بە پێچەوانەوە قبووڵی بکات ، وەك خۆی، کە ئەوە بەشی دووەمی ئیمانە ، وە پەیوەندیی بە دڵ‌و دەروونەوە هەیە، ئەوەی یەکەمیان پەیوەندیی بە عەقڵ‌و هۆشەوە هەیە ، بەلام ویستن‌و نەویستن‌و ، قبووڵ کردن‌و قبووڵ نەکردن ، پەیوەندیی بە دڵ‌و دەروونەوە هەیە .

ئنجا پێکهێنەری سێیەمی ئیمان ، بریتیە لە دان پێداهێنانی بە زمان ، مرۆڤ دەتوانێ دان بە شتێك دا نەهێنێ ، دەشتوانێ دانی پێدا بهێنێ .

وە پێکهێنەری چوارەم بریتیە لە ئەنجامدان بە ئەندامەکان ، کە ئەویشیان دیسان لە ژێر کۆنتڕۆڵ‌و ئیرادەی مرۆڤ دایە ، مرۆڤ دەتوانێ ئەو شتەی کە قەناعەتی پێیەتی ، جێبەجێی بکات ، وە دەشتوانێ جێبەجێی نەکات .

کەواتە : سێ لە پێکهێنەرەکانی ئیمان پەیوەندییان بە ویستی مرۆڤەوە هەیە، تەنیا ئەوەیان کە پەیوەندیی بە عەقڵەوە هەیە لە ژێر کۆنتڕۆڵی ئیرادەیدا

نیە ، هەڵبەتە ئەویش دەتوانێ تەماشای نەکاتو ، سەرنجی نەداو هەوڵ نەدا بیزانێ ، بەڵام دوای ئەوەی کە بۆی دەردەکەوێ ، ئیرادەو بژاردەی تێدانیە ، کە دەرکی بکا ، یان نەکات ؟ چونکە تازە کەوتۆتە بەرچاوی ، جا چ ئەوەی بە چاو دەبینرێ ، چ ئەوەی بە گوێ دەبیسترێ ، چ ئەوەی بە عەقڵ دەرك دەکرێ ، بۆ وێنە : هەموو مرۆڤێکی عاقڵ دەزانێ کە (٢ + ٢ = ٤)، بەڵام کە بە عەقڵ ئەوە دەزانێو دەرکی دەکاتو بەدەست خۆی نیە، چونکە شتێکی بەڵگە نەویستە، دەتوانێ دانی پێدا نەهێنێ بە زمان، وە دەتوانێ بە دڵ ئەو مەسەلەیەی کە بە عەقڵ دەرکی کردوە ، قبووڵی نەکاو ڕەفزی بکات .

**مەسەلەی چوارەم :** کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُّفَصَّلَاتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴾، خوا دەفەرموێ : ئێمە لافاو ، (ئاو هەڵسانێکی گەورە) وە کوللە ، وە ئەسپێ ، (یاخود گەنەو قرنوو) ، وە بۆق ، وە خوێنمان ، وەك چەند نیشانەیەکی ڕوونو ئاشکرا ناردە سەریانو بە ملیاندا هێنان ، وەك بەلا ، ﴿ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴾ کەچی خۆیان بە زل گرت، وە کۆمەڵێکی تاوانبار بوون .

وشەی: ﴿ الطُّوفَانَ ﴾، بە هەر بەڵایەکی دەورەدەر دەگوترێ ، هەر شتێك کە دەوری مرۆڤ بداتو، ئابڵووقەی بدات، بەڵام بە زۆریی بۆ لافاو بەکارهاتوە .

﴿ وَالْجَرَادَ ﴾، هەموو توێژەرەوانو زمان زانان بە کوللە لێکیان داوەتەوە ، ئەویش : (لأَنَّهُ يَجْرُدُ الأَرْضَ جَرْدًا) ، چونکە زەوی ڕووت دەکاتەوە ، هەر کشتوکاڵێکی لەسەربێ دەیخوات .

وشەی : ﴿ وَالْقُمَّلَ ﴾، بە ئەسپێ دەگوترێ، وە بە کێچیش دەگوترێ، وە بە گەنەو قرنووش دەگوترێ، (گەنە)ش زیندەوەرێکی مشەخۆرە لەسەر خوێنی ئاژەڵ دەژی ، (قرنوو)ش بە هەمان شێوە، بەڵام گەنە لە قرنوو گەورەترە ،

قرنوو وردە، گەنە گەورەیە، هەروەها (قمل) بە ئەسپێی دانەوێڵەش دەگوترێ ، وە بە کوللەی گچکەی بێ باڵیش دەگوترێ ، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ کە مەبەست پێی کێچو ئەسپێ بێ ، کە زیندەوەرێکی مشەخۆرە، لەسەر خوێنی مرۆڤ دەژی ، گەنە یان قرنووش کە زیندەوەرێکی مشەخۆری چەند پێیە، لەسەر خوێنی ئاژەڵ دەژی، وە ئەو ئاژەڵە بێهێزو نەخۆش دەکات .

وشەی : (الضفادع) کۆی (ضفدع)ە ، واتە : بۆق ، کە هەموومان دەزانین چیە .

وشەی : (الدم) ، واتە : خوێن ، ئنجا ئایا لێرەدا مەبەست لە تاقیکردنەوەیان بە خوێن چیە ؟ هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن : ئاوەکەیان دەبوو بە خوێن ، کە دەیانویست ئاو بخۆنەوەو قاپیان تێ هەڵدەدا ، یاخود چنگیان تێ هەڵدەدا ، هەر خوێنی سوور بوو .

کە دەفەرموێ : ﴿ مُّفَصَّلَٰتٖ ﴾، واتە: چەند نیشانەیەکی زۆر ڕوون، (مُفَصَّلْ)یش لە ئەسڵدا بەوە دەگوترێ کە چەند شتێك لێك جیا بکرێنەوە، دەگوترێ : (فَصل هذا عَنْ ذَاك) هەڵبەتە شتەکان کە لە یەکدی جیا بکرێنەوە ، دیارترن ، هەروەها بە قسەش دەگوترێ : (وَفَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلاً) قسەیەکی ڕوون ، کە ڕستە ڕستەو، برگە برگە، لە یەکدی جیا کرابێتەوە، کە ئەگەر وابێ باشتر فەهم دەکرێو ، مرۆڤ دەتوانێ لێی تێ بگات .

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئەو مەعجیزەو نیشانانە ، هەر کامێکیان دەلالەتێکی ڕوونو ئاشکرای هەبوو، لەسەر ڕاستیی مووساو هارون ، بەڵام ئەوان لە بەرانبەردا خۆیان بە زل گرت، وە سەرەنجام کۆمەڵێکی تاوانبار بوون ، کەواتە : ئەوانە ئەو نۆ (٩) نیشانەو موعجیزەیە بوون ، کە خوای پەروەردگار بە مووسا ﷺو هارونی برای ﷺ دابوون ، کە لە چەند شوێنێك لە قورئان دا ئاماژە بەوە کراوە ، کە ژمارەیان نۆ (٩)یە .

# ڕوونكردنەوەی نۆ (٩) موعجیزەی مووسا (علیه السلام):

بۆ وێنە: لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (١٠١ و ١٠٢) دا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍۢ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە نۆ بەڵگەو نیشانەی ڕوونمان بە مووسا دابوون، لە بەنی ئیسرائیل بپرسە: كە كاتێك مووسا هاتە لایان، فیرعەون پێی گوتن: ئەی مووسا! من پێم وایە تۆ جادووت لێكراوە، مووساش گوتی: تۆ باش دەزانی كە ئەم نیشانانە تەنیا پەروەردگاری ئاسمانەكانو زەوی دایبەزاندوون، وەك بەرچاو ڕوونییو بەڵگەی ڕوونو ئاشكرا {كە دەبنە مایەی ئەوەی مرۆڤ پێیان بگاتە حەقیقەت}، وە من پێم وایە ئەی فیرعەون! تۆ بە هیلاك چووی.

هەروەها لە سوورەتی (النمل)دا دەفەرمووێ: ﴿ فِى تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: (ئەی مووسا!) تۆ بە نۆ نیشانەو بەڵگەوە بڕۆ بەرەو فیرعەونو گەلەكەی، بێگومان ئەوان گەلێكی لەڕێ دەرچوو بوون.

وە لە سوورەتی (الزخرف)دا دەفەرمووێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا ۖ وَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: كاتێك مووسا بە نیشانەو بەڵگەكانی ئێمەوە هاتە لایان، پێی پێدەكەنین، وە هیچ بەڵگەو نیشانەیەكمان پێشان

نـەدان ، مەگــەر لــە دەســتە خـوشـکـەکــەی (لــەوەی پێشــێی) گــەورەتر بــوو ، وە سـەرەنجام {بـە سـزا} گـرتمانن ، بۆ ئەوەی بگـەڕێنـەوە .

بـەڵام دیارە عەزمیـان جەزم بوو ، لەسـەر نەگـەڕانەوەو ملهـووڕییو بـەردەوامیی لەسـەر بـێ بڕوایـی .

کەواتە: ئەو نۆ بـەڵگـەو موعجیزەیـە سـەرەنجام ئـەمانـەن :

١/ دەسـتی . ٢/ گـۆچـانەکـەی . ٣/ گـرانیـیو وشکە سـاڵیی .

٤/ کـەمیی بـەروبـووم ٥/ تۆفـان . ٦/ کولـلـە .

٧/ ئەسـپـێ {یاخـود گـەنەو قرنـوو} . ٨/ بـۆق . ٩/ خـوێـن .

هـەڵبـەتە باسـی ئـەو موعـجیـزەو نیشـانانە لـە تەوراتیشدا هاتـوە، واتــە : لـە پەیمانی کۆندا کە تەورات بـەشـێکیەتی ، بـەڵام لەوێدا باسـی (١٠) نیشـانان کـراوە ، وە هـەندێکیشـیان جیـاوازن لـەو (٩)یـەی کـە لـە قورئـاندا هـاتوون ، لەوێـدا بـەو شێوەیە هـاتوون :

(الضَّـرْبـةُ الأُولَـى : ضَـرْبَـةُ الـدَّم) واتــە : زەبــری یەکـــەم ، زەبــری خـــوێن ، کـە خوێنیـان پـژاوە ، یـان ئـاویـان بۆتـە خـوێـن .

(الضَّـرْبـةُ الثَّـانِيَة : صُـعُودُ الضَّـفَادِعِ) زەبـری دووەم ، سـەرکەوتنی بۆقەکـان بـوو ، بۆق دەهـاتنە نێـو مـاڵو حـاڵـیانو، خۆیـان لـە زاریـان هـەڵدەهاویشـت ، کـاتێـك دەیانویسـت قسـه بکـەن .

(الضَّـرْبـةُ الثَّـالِـثَة : غَـزْو البَعُوض) زەبری سێیەم ، هێرشی مێشوولە ، مێشـوولەیان بەنێـو وەردەبـوون .

(الضَّرْبـةُ الرَّابِعَـة : أَسْرَابُ الذُّبَاب) زەبری چوارەم ، لێشاوی مێشـیان وەسەر گەڕاوە .

(الضَّـرْبـةُ الخَـامِسـة : إِهْلَاكُ الـمَوَاشِي) زەبری پێنجـەم ، لەبـەین چـوونی ئـاژەڵیان.

(الضَّـرْبـةُ السـادِسـة : الدَّمَـامِلُ الـمُتَقَيِّحَة) زەبری شـەشـەم ، کوانو دوومەڵی کێـمو زوخـاودار.

(الضَّرْبَة السابِعَة : سُقُوط البَرَد) زەبری حەوتەم ، تەرزەی زۆریان لێ باری ، هیچ شتێکی بۆ نەدەهێشتن .

(الضَّرْبَة الثَّامِنَة : غَزو الجَرَاد) زەبری هەشتەم ، هێرشی کوللە.

(الضَّرْبَة التَّاسِعَة : الظَّلاَمُ الكَثِيف) زەبری نۆیەم ، تاریکییەکی چڕوپڕ.

(الضَّرْبَة العَاشِرة مَوْتُ الأَبْكار) مردنی نۆبەرەیان ، چ نۆبەرەی منداڵی خۆیان ، یاخود نۆبەرەی ئاژەڵەکانیان[(١)] .

هەڵبەتە دەگونجێ وێڕای ئەو شتانەی کە لە قورئاندا هاتوون، ئەو شتانەی دیکەش کە لە تەوراتدا هاتوون، بووبن، وە دەشگونجێ زیاد کرابن، وەك زۆر شتی دیکەشیان گۆڕیوە، بەڵام بێگومان ئەوانەی کە لە قورئاندا هاتوون ، ئەوانە بوو ون، ئنجا ئایا وێڕای ئەوانە، شتی دیکەشیان لەگەڵدا بووە، یان نا ؟ لەوبارەوە ئێمە بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نیە، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ : نۆ نیشانە، کە لەسەر ڕای زۆر لە زانایان : نۆ نیشانەکە هەم دەستی مووسا ، کە سپی دەبووو دەدرەوشایەوەو ، هەم گۆچانەکەشی ، وە هەم وشکە ساڵیی، وە هەم کەمیی بەروبووم ، لەگەڵ بوون ، کە بەو پێنجەی دیکەشەوە دەبن بە نۆ .

## نەکوشتنی زیندەوەرو ژیانداری بێ زیان

لێرەدا بابەتێکی فیقهیی هەیە ، کە فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێ دەکات : ﴿عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا ، قَالَ : نَهَى رَسولُ اللهِ ﷺ عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنَ الدَّوَابِّ : اَلنَّمْلَةُ، وَالنَّحْلَةُ، وَالْهُدْهُدُ، وَالصُّرَدُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٣٠٦٧) ، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْد برقم : (٦٥١). وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٠٠٥)، وَأَبُو دَاوُد

١) (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس العهد القديم، سفر الخروج ، الإصحاح : ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠)دا، لە ژێر ناوونیشانی : (وعد الرب بمعاقبة فرعون)دا هاتوە ، ص (١٤١ –١٥٥) .

بـرقم: (٥٢٦٧) ، وَابْـنُ مَـاجَـهْ بـرقم : (٣٢٢٤) وَصَـحَّحَهُ كـل مـن الألبـاني وشـعيب الأرنؤوط} واتە: عەبدوڵـڵای کوڕی عەببـاس خـوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ ، دەڵـێ: پێغـەمبـەری خـوا ﷺ ڕێگـریی کـردوە لـە کوشـتنی چـوار ژیانـدار : مێـروو، وە مێشـەنگوینە، وە پەپوسـلێمانـە، وە صـوڕەد ، کـە دیارە جۆرە باڵندەیەکـی بـێ زیـانـە، بـە عـەرەبی (صُـرَد)[1]ی پـێ دەڵـێـن ، مـن نـازانم داخـۆ لـە کوردسـتان دا هەیـە، تاکو ناوی بـۆ دانرابێ، یـان نـا، چونکە ئـەو باڵندانـەی لای ئێمـە نـەبن دیـارە ناویشیان بۆ دانەنراوە، بۆیە دەبێ هـەر ناوەکەی خۆیان بـەکاربێـنین .

گـرنگ ئەوە هـەرکام لە : مێرووو هـەنگـو پەپـوسـلێمانەو صـورەد ، کوشـتنیـان قەدەغـە کـراوە ، بەڵام ئەگـەر زیان بگـەیەنن ، بـۆ نموونـە مێـروو ، ئـەوە دەگونجـێ کارێکی وابکـەی لەخـۆتی دوور بخـەیـەوە، بـەڵام دەبـێ خـۆ لـە کوشـتنیو لەبـەین بردنـی ، بپارێـزرێ .

هـەروەهـا لــەوبارەوە ئــەم دەقــەش هەیــە : ﴿ عَنْ عبد الـرّحمن بْنِ عُثْمـانَ أنَّ طَبيباً ذَكَـرَ ضِفْدَعـاً فِـي دَواءٍ عِنْـدَ رَسُولِ الله ﷺ فَنَهـى رَسُولِ الله عَنْ قَـتْـلِه﴾ {أَخْرَجَــهُ النَّسـائـِي فــي (ســننه) برقــم : (٤٣٥٥) وصــححه ألبانــي } ، واتــە : عەبدوڕڕەحمــانی کــوڕی عوســمان، دەڵــێ : پزیشـکـێك باســی بـۆقی کـرد لـە دەرمـانێکـدا کـە لـەلای پێغـەمبـەری خـوا (محـمـد ﷺ)ی دروسـت کردبـوو (بـۆ چارەسـەری نەخۆشـییەك) پێغـەمبـەری خـوا ﷺ ڕێگـریی کرد لە کوشـتنی .

هەڵبـەتـە حیکمەتـی قەدەغـەکردنی کوشـتنی ئەو پێنـج ژیانـدارەش : مێـرووڵـەو هەنـگو هوهـودو صـوڕەدو بـۆق ، ئەوەیـە کـە بـێ زیانــن ، بگـرە سـوودبەخشیشـن بـۆ مـرۆڤـ و ژینــگە ، وەك لــە : هــەنگـو پەپـوسـڵـێـمانەو صـوڕەدو بــۆق دا بـە ڕوونــیی دیــارە ، ئنجــا بــە قیـاس لەســەر ئــەو پێنـجـە دەگونجــێ بڵـێـیـن : هــەر زیندەوەرێك یـان ژیانـدارێکی گـەورە ، مـادام زیـانی نـەبـێ ، دروسـت نیـە بکـوژرێ ، مەگـەر بۆ بەرژەوەنـدییـەك ، چونکـە لە ئەسـڵدا خـوای پەروەردگـار هـەرچی لەسـەر زەوی دا هـەیە ، بۆ مرۆڤـی دروسـت کـردوە ، بۆیـە ئەگـەر گـریمان دەرکـەوت کـە لـە

---

١) الصُّرد : طائـرٌ أكبـر مـن العصـفور، ضخـم الـرأس والـمنقـار، يصـيدُ صـغار الحشـرات و ربّمـا صـاد العصـفور، وكـانوا يتشـاءَمون بـه . الـمعجم الـوسـيد ص ٥١٢ .

فلان باڵندەیەدا ، چارەسەرێك دەرمانێك هەیە ، ئەوكاتە حوكمەكەی جیایە، بەڵام ئەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردوە لە كوشتنی بۆق ، هەرچەندە پزیشكەكە وای گوتوە ، دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ زانیبێتی كە ئەوە دەرمان نیە یان وەك چۆن بە كەڵكی دەرمان دێ ، ڕەنگە زیانیشی هەبێ ، یان دەرمانەكە پەكی لەسەر ئەوە نەكەوتوە ، بۆ ئەوەی نەبێتە دابێك و ڕێ و شوێنێك و بگوترێ : مادام پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێی داوە با ئێمەش بیكەین .

**مەسەلەی پێنجەم** : كە دەفەرموێ : ﴿ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ۖ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَـٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴾ ، وە كاتێك كە سزای خوایان كەوتە سەر، (یانی : هەر جارێك كە یەكێك لەو بەڵایانەیان بە مل دا دەهات) ، دەیانگوت : ئەی مووسا ! بۆمان لە پەروەردگارت بپاڕێوە بەهۆی ئەو پەیمانەی خوا كە لەلاتە، (كە بریتیە لە پێغەمبەرایەتیی و لەوە كە داوای تۆ دەگرێتەوە)، ﴿لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ ﴾، ئەگەر ئەو ئازارو سزایەمان لەسەر لابەری ، بێگومان بۆ تۆ ئیمان دێنین ، (واتە : ئیمان بۆ تۆ دێنین ، لەبەر داوای تۆ، كە پێت خۆشە !) .

ئنجا لێرەدا كە دەفەرموێ : ﴿لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ ﴾، لە ئەسڵ دا خۆی وشەی (آمن ، یؤمن) بە (ب) تەعدیی دەكات، بەڵام وا پێدەچێ لێرەدا بۆیە بە (ل) تەعەدداى كردبێ ، تاكو مانای (لنخضعنَّ) بۆ تۆ ملكەچ دەبین، یان وشەیەكی ئاوا ، ئەو مانایە بگەیەنێ، یانی : بڕوات پێ دێنین و بۆت ملكەچ دەبین، چونكە پێشتر باسمان كرد ، كە لە زمانی عەرەبیی دا بنچینەی (تضمین) هەیە، كە بریتیە لەوەی مانای وشەیەكی دیكەی بخرێتە نێو وشەیەكەوە بەهۆی تەعەدداكردنی بە پیتێك ، كە عادەت نیە، بەو پیتە تەعەددا بكات بۆ (مفعول)، وە خوای

کارزان لە قورئاندا ئەو بنچینەیەی بەکارهێناوە بۆ کورتکردنەوەو لە جیاتی دوو ڕستە بەکاربێنێ یەك ڕستەی بەکارهێناوە بۆ نموونە : لێرە لەجیاتی ئەوەی بفەرمویٚ : بڕوات پێ دێنین و بۆت ملکەچ دەبین، (نؤمنُ بكَ ، ونخضع لكَ) یەکسەر فەرموویەتی: ﴿ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ ﴾، واتە : ئیمانت پێ دێنین ، وە بۆشت ملکەچ دەبین ﴿ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ وە بێگومان بەنی ئیسرائیلیشت لەگەڵ دەنێرین ، کە تۆ مەبەستتە لەژێر ڕکێفی ئێمەیان دەربێنی، ﴿ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴾، بەڵام دوای ئەوەی کە سزاو ئازارمان لەسەر لابردن بۆ کاتێك کە ئەوان پێی دەگەن ، واتە : بۆ کاتێکی دیاریکراو نەك بەرەهایی ، یاخود مەبەست کاتی مردنیانە ﴿ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴾، ئەوان پەیمانیان دەشکاندو وەفایان بەو قسەو بەڵێنەی خۆیان نەدەکردو هەڵیان دەوەشاندەوە .

ئنجا کە دەفەرمویٚ : ﴿ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ﴾ هەندێ لە توێژەرەوان ئاوایان تەفسیر کردوە : (أي بعَهْدِهِ عِنْدَك وَهُوَ النُّبوَّة) بەهۆی پەیمانی خواوە ، لەلای تۆ کە بریتیە لە پێغەمبەرایەتیی .

وە (النَّسفي) گوتوویەتی : (أدْعُ اللّهَ لَنَا مُتَوَسِّلاً إلَيْهِ بعَهْدِهِ عِنْدَك) واتە : بۆمان لە خوا بپاڕێوە ، ئەو پەیمانەی کە لەلاتە بیکە بە ئامراز (وسيلة)ی نیزیکبوونەوە بۆ لای خوا ، واتە پێی لە خوا نیزیك ببەوەو بڵێ : خوایە ! بۆ خاتری ئەو پەیمانەی کە لەلامە کە پێغەمبەرایەتییە ، ئەو شتەی بکە .

دیارە ئەو مەسەلەیە لە سوورەتی (الزخرف)یشدا هاتوە ، دەفەرمویٚ :

﴿ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾، واتە : وە دارو دەستەی فیرعەون گوتیان : ئەی جادووگەر ! بۆمان لە پەروەردگارت بپاڕێوە ، بەهۆی ئەو

پەیمانەوە کە لەلاتە بێگومان ئەگەر ئەو بەڵایەمان لەسەر لابەری، ئێمە ڕێی ڕاست دەگرین، بەڵام کاتێك سزامان لەسەر لابردن ، ئەو بەڵێن‌و پەیمانانەیان هەڵوەشاندەوە . وەڵامەکەی ئەوەیە :

یەکێك بۆی هەیە بڵێ : چۆن داواشیان لێکردووەو، پێشیان گوتوە : ﴿ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ﴾؟

وا پێدەچێ وشەی ساحیر لەلای ئەوان ، وەك چۆن دەگوترێ : مامۆستا ، مانایەکی ئاوای هەبێ، یان لەبەر ئەوەی ئەوان پیشەی سیحریان لەلا شتێکی پیرۆز بووە ، وەك شتێکی ئایینی ، وە جیاوازیشیان نەکردوە لەنێوان پێغەمبەرایەتیی‌و جادووگەریدا ، وە لە نێوان موعجیزەی پێغەمبەران‌و جادووی جادووگەراندا ، یانی: واپێدەچێ ئەو تەعبیرەیان بۆ شکاندنی مووسا ﷺ نەبووبێ‌و ، وەك زاراوەو وشەیەکی خۆیان نازناوێکی خۆیان ، بۆ کەسێك کە زانا بوو بێ‌و بە پیرۆزیان زانیبێ ، بەکاریان هێنابێ ، وە دەشگونجێ بە توانج‌و تەوسەوە وایانگوتبێ ، کە لە حاڵێکی ئاوادا ، نابێ داواکردنەکەیان داواکردنێکی جیددیی بووبێ ، چونکە تۆ داوای شتێك لە کەسێك بکەی ، نابێ لە کاتی داواکردنەکەدا بە تەوسەوە قسەی لەگەڵ بکەی‌و توانج‌و پلاری تێبگری !.

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ ﴾، زانایان دوو واتایان بۆ لێکداونەوە :

١/ واتە: بۆ کاتێکی دیارییکراو کە ئەوان پێی دەگەن ، یانی : کاتێکی دیارییکراو کە مووسا بۆی دیاریی دەکردن ، تاکو وا نەزانن بەڵایەکە لەخۆوە لادەچێ، بۆ وێنە : کاتێك ڕەوە کوللەیان بە مل دا دەهات ، ئەوانیش دەچوون لە مووسا دەپاڕانەوەو تەکلیفیان لێ دەکرد، ئەویش دەیگوت : باشە دوای یەك حەفتەی دیکە لادەچێ ، بۆئەوەی وا نەزانن کە لەخۆیەوە لادەچێ .

٢/ بەڵایەکەیان لەسەر لادەچێ، بەڵام کاتێك کە ئەوان پێی دەگەن ، کە بریتیە لە کاتی فەوتان‌و مردنیان ، یانی : گرفتاریی‌و بەڵایەکەیان تا کاتی لەبەینچوونیان بەردەوام دەبێ ، بەڵام مانای یەکەم باشتر دەچێتە عەقڵەوە .

**مەسەلەی شەشەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴾، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ ﴾، لەبەرئەوەی کە ئەوان بێ بەڵێن بوون، پەیمانیان شکاند، ئێمەش تۆڵەمان لێستاندنو سزامان دان، وە لەو ئاوە زۆرەدا نغرۆمان کردن، بۆچی؟ ﴿ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە نەکردو لێیان بێئاگا بوون.

وشەی (یم) (الیم: البحر)، (یم) یانی: دەریا، کە ئەگەر بە مانای دەریا (بحر)بێ، مەبەست پێی دەریای سوور (بحر الأحمر)ە، کە ئەوکاتە پێیان گوتوە: (بحر القُلْزم).

هەروەها یاخود (الیم: النهر الکبیر) (یم) یانی: ڕووباری گەورە، کە ئەگەر مەبەست ڕووبار (نهر) بێ، دیارە ڕووباری نیلە، بەڵام زیاتر واپێدەچێ مەبەست پێی دەریای سوور بێ، وە لە تەوراتیشدا هەر بە ڕاشکاویی دەڵێ دەریا، وە مەبەست پێی دەریای سوورە، بۆ وێنە، لە (التفسیر التطبیقي للکتاب المقدس، العهد القدیم، سفر الخروج، الإصحاح: ١٤، ص١٦٠)، لە ژێر ناونیشانی: (عبور البحر الأحمر)دا دەڵێ: (وَهَكَذَا انْشَقّ البَحْرُ فَاجْتَازَ الإِسْرَائِيلِيون فِي وَسَطِ البَحْرِ عَلَى أَرْض يَابسٍ فَكَانَ الماء بمَثَابَة سورَيْن عَنْ يَمينهم وعن يسارهم، وَلَحِق بِهِم المصريون وَدَخَلوا وَرَاءَهُم إِلى وَسَطِ، بجَمِيع خَيْل فِرْعَوْنَ وَمَرْكَبَاتِهِ وَفُرْسانِهِ... وَارْتَدَّتِ المِيَاهُ وَأَغْرَقَتِ المرْكَبَات والفُرْسَان وَكُلّ جَيْش فِرْعَون الّذِي لَحق بهم إِلى البَحْرِ، فَلَمْ يَفْلِتْ مِنْهُم نَاجٍ وَاحِد)، واتە: ئاوا بەو شێوەیە دەریا لەت بووو ئیسرائیلییەکان بە نێوەڕاستی دەریادا لەسەر زەوییەکی وشك دەڕۆیشتن، ئنجا ئاوی دەریاکە، وەك دوو شووراو دیواری بەرز لەلای ڕاستو چەپیان بوو، میسرییەکانیش (واتە: فیرعەونییەکانو دارودەستەی فیرعەونیش) بەدوایان کەوتنو، بە دوای واندا هاتنە نێوەڕاستی دەریاوە، بە هەموو ئەو وڵاخانەی کە فیرعەون پێی بوون، وە بە هەموو ئەو

عەرەبانانەی کە وڵاخەکان ڕایان دەکێشان ، وە بە هەموو سوارەکانیشیانەوە {(فرسان) کۆی (فارس)ە ، واتە : سوارەکان} .

دوایی دەڵێ : وە دوای ئەوەی کە کۆتا کەسی بەنی ئیسرائیل لە دەریاکە دەرچوون، وە کۆتا کەسی داروودەستەی فیرعەونیش هاتنە نێو دەریا، دەریایەکە گەڕایەوەو وێککەوتەوە، وە هەموو ئەو عارەبانەو سوارانەو هەموو سوپای فیرعەون کە بەدوایان کەوتبوون بۆ نێو دەریا، هەموویان نقوم بوون، وە یەك نەفەریان لێ دەرباز نەبوە .

ئنجا هەر لە پەیمانی کۆندا هەندێ زانیاری دیکە هاتوون، واباشە بیانزانین، با زۆریش لێیان دڵنیا نەبین ، بۆ وێنە :

١) دەربارەی سوپای فیرعەون کە ژمارەیان چەند بووە ؟ دەڵێ : (فأعدَّ مَرْكبتهُ وَاصْطَحَبَ جَيْشَهُ مَعَهُ ، فَأَعَدّ ست مِئَة مَرْكبة وَسائِر مَركَبات مصر وحمل عليها قادة سلاح المركبات)[1]، واتە : فیرعەون عەرەبانەکەی خۆی، (کەژاوەکەی خۆی) وە سوپایەکەشی لەگەڵ خۆی برد، وە شەش سەد عەرەبانەی ئاوای ئامادە کرد ، وە هەموو ئەو عەرەبانانەی میسڕ، (واتە: جگە لەو شەش سەدەش)، وە ئەوانەی کە فەرماندەی چەك بوونو، فەرماندەی سووپاکە بوون (ئەو سوپایەی کە بە عەرەبانەکان دەگوازرایەوە ، کە لەجێی سەیارەی ئێستا بوون) سواری ئەو عەرەبانانەی کردن .

٢) دەربارەی ژمارەی بەنی ئیسرائیل لەو کاتەدا هەر لە (سفر الخروج، الإصحاح: ١٢، ص١٥٦) لە ژێر ناوونیشانی : (بنو ئیسرائیل فِي البرية)دا هاتوە : (وَارْتَحَل بَنُو إِسْرَائيل مِنْ رَعسْمِيس إِلى سُكوت ، فَكانُوا نَحو ست مائة أَلْف مِنَ الرّجَال المشاة ما عَدَا النِّساء والأَوْلاد ، وَكَذَلِكَ انضمَّ إِلَيْهِم حَشْد كَبير مِنَ النَّاسِ مَعَ غَنَمٍ ومَوَاشٍ وَقِطْعَانٍ كَثِيرَة)، واتە: بەنو ئیسرائیل لە ڕەعمسیسەوە (دیارە ناوی شارێکە) بۆ سوککوت (ئەویش دیارە ناوی شارێکی دیکەیە) بارگەو بنەیان تێکناو ڕۆیشتن، وە ژمارەیان شەش سەد هەزار بوو بەس لە پیاوانی

---

١) (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ١٤) ، ص ١٥٩.

پێ ڕۆ، جگە لە ژن و منداڵ: وە خەڵکێکی زۆری دیکەشیان ڕەگەڵ کەوتبوو، لەگەڵ مەڕو ماڵاتو بزن و ڕەشەوڵاخو ڕانە ئاژەڵی زۆر.

بەڵام من پێم وایە ئەوە ڕاست نیە، چونکە ئەگەر هەر پیاوەکان شەش سەد هەزار بووبن، دیارە دوو ئەوەندەش ژن و منداڵیان لەگەڵ دا بووە، ئنجا بەو پێیە دەبنە ملیۆن و نیوێك زیاتر، وە خەڵکی دیکەشیان ڕەگەڵ کەوتبێ، دەبنە دەوری دوو ملیۆن، وە من پێم وایە هەرگیز دوو ملیۆن کەس ئەو کاتە لە میسر نەژیاوە بە هەمووشیانەوە !! لەبەر ئەوە دڵنیام کە ئەوە زیادەڕۆیی زۆری تێدایە.

٣) دەربارەی ماوەی مانەوەشیان لە میسردا، لەو کاتەوە کە یەعقووب، وە دوازدە کوڕەکەی لەوێ نیشتەجێ بوون، تاکو دەرچوون، دەڵێ: (وَكَانَت مُدَّةُ غُرْبَة بَني إِسرَائيل الَّتِي أَقَامُوها فِي مِصْرَ أَرْبَع مِئَة وَثَلاثين سنة، وفِي اليوم الأخير بالذات في ختام أربع مئة وثلاثين سنة، خرج جميعُ أَجْنَادِ الربّ مِنْ أَرْض مِصْر)[1]، واتە ماوەی غەریبایەتیی، (واتە: دوورکەوتنەوەی بەنی ئیسرائیل لە نیشتیمانی خۆیان) کە تێیدا نیشتەجێ بوون لە میسر: چوار سەدو سی (٤٣٠) ساڵ بوو، وە لە ڕۆژی کۆتایی ئەو چوار سەدو سی (٤٣٠) ساڵەدا، هەموو سەربازەکانی پەروەردگار لەسەر زەمینی میسر دەرچوون[2].

**مەسەلەی حەوتەم**: ئنجا خوا باسی سەرەنجامی بەنی ئیسرائیل دەکات، کە چیان لێهات؟ دەفەرموێ: ﴿وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَـٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَـٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَـٰرَكْنَا فِيهَا ۖ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟ ۖ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ ﴿١٣٧﴾﴾، وە ئێمە ڕۆژهەڵاتەکان و ڕۆژئاوایەکانی ئەو

---

١) (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ١٤)، ص ١٥٩.

٢) هەروەها لە لایەکی دیکەشەوە: هەرگیز ناگونجێ لەماوەی چوارسەدوسی (٤٣٠) ساڵ دا بەرەو وەچەی دوازدە کوڕەکەی یەعقووب سەلامی خوای لێ بێ هێندە زۆر ببن، ببنە دەوری ملیۆن و نیوێك زیاتر.

سەرزەمینەی کە پیتو پێزمان تێخستبوو، کردمانە میراتی ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە دەچەوسێنرانەوە (کە مەبەست بەنی ئیسرائیلە، وەچەوسێنەرەکانیش فیرعەون داروودەستەکەی بوون) ، وە وشەی هەرە چاکی پەروەردگارت ، (واتە: بەڵێن و گفتی پەروەردگارت ، یاخود بڕیاری هەرە چاکی پەروەردگارت) لەسەر بەنی ئیسرائیل چەسپی و بۆیان هاتە دی ، بەهۆی خۆڕاگرییانەوە ، ﴿وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ﴾، وە ئەوەی کە فیرعەون و گەلەکەی دروستیان دەکرد (لە بیناو قەڵاو کۆشك و تەلار) هەموویمان تێکداو کاول کرد، هەروەها ئەوەش کە وەك کەپرو ساباط دروستیان دەکرد (ئەوەشمان ڕووخاندو تێکمان دا) .

## ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی چەمکی ﴿مَشَـٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَـٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَـٰرَكْنَا فِيهَا﴾:

زانایان دەربارەی: ﴿مَشَـٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَـٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَـٰرَكْنَا فِيهَا﴾، ڕۆژهەڵاتەکان و ڕۆژئاوایەکانی ئەو سەر زەمینەی کە پیتو پێزمان تێخستبوو ، چەند ڕایەکیان هەن :

١ - هەندێکیان دەڵێن : مەبەست هەموو شامە ، {شام : یانی : لوبنان و فەڵەسطین ، بە قەوارەی زایۆنیشەوە ، وە ئوردن و سوریا} ، چونکە کاتی خۆی هەمووی پێی گوتراوە : شام .

٢ – وە هەندێك دەڵێن : مەبەست پێی تەنیا فەڵەسطینە، بەو شوێنەشەوە کە قەوارەی زایۆنیشی لەسەر بنیات نراوە ، کە زۆربەی خاکی فەڵەسطینە .

٣ - وە هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی (میسر)ە .

٤ - هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی میسر و شامە .

بەڵام زیاتر واپێدەچێ مەبەستی پێ شام بێ ، (شام) بەو چەمكەو واتایە كە كاتی خۆی باوبووەو ، ئێستا بووە بە چوار دەوڵەت .

بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە ؟

سێ بەڵگان لەوبارەوە دێنینەوە :

١) خوا ﷻ لە سوورەتی (الأنبياء)دا ، دەفەرموێ : ﴿ وَنَجَّيْنَـٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَـٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَـٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ ﴾، (باسی ئیبراهیم دەكات) ، واتە ئەو (ئیبراهیم)و لووطیشمان ڕزگار كردن بۆ ئەو سەرزەمینەی كە بۆ جیهانییان پیتو پێزمان تێ خستبوو ، وە ئێمە بە هەموو شتێك زانا بووین .

كە دیارە ئیبراهیمیش لەگەڵ (لووط) چوون بۆ شام، وە ئەو كاتە نەچوونە لای فەلەسطین ، ڕەنگە چووبنە ئەو شوێنەی كە ئێستا پێی دەگوترێ : سوریا.

٢) هەر لە سوورەتی (الأنبياء) ئایەتی (٨١)دا، دەفەرموێ : ﴿ وَلِسُلَيْمَـٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَـٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَـٰلِمِينَ ﴿٨١﴾ ﴾، واتە: وە بایەكی هەڵكردوو ، وەك گەردە لوولمان بۆ سولەیمان دەستەمۆ كردبوو، بە فەرمانی ئەو بەرەو ئەو سەرزەمینە دەڕۆیشت ، كە پیتو پێزمان تێخستبوو .

دیارە سولەیمانیش لە فەلەسطین نیشتەجێ بووە ، لە قودسی ئێستا ، ئنجا دیارە بایەكە هەڵی كردوە لە فەلەسطینەوە چووە بۆ شوێنێكو لەوێوە دووبارە گەڕاوەتەوە بەرەو فەلەسطین.

٣) لە سوورەتی (الإسراء)دا ، خوا دەفەرموێ : ﴿ سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَـٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَـٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ ﴾، واتە : دوورییە لە كەموكووڕیی

بۆ ئەو خوایەی کە شەوڕۆی بە بەندەکەی خۆی کرد (بە شەو سەفەری پێ کرد)، لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقصا ، کە لە دەوروبەریدا بەرەکەتو پێزمان داناوە .

کە دیارە مەبەست پێی فەلەسطین و قودسە .

هەڵبەتە لێرەدا ڕایەکی دیکەش هەیە ، پێویستە ئەوەش بزانین :

(دکتۆر محمد توفيق صدقي) هێناویەتی کە ئەویش بێگومان لە کتێبی دیکەوە هێناویەتی دەڵێ : {جاء في كتاب الأصول البشرية صفحة (٨٨) لمؤلفه لينج ، أن يُوسِيفُوس المؤرخ اليهودي الشهير نقل عن مانيثو هذه الرواية المصرية القديمة التي ملخصها أن موسى بعد أن هزم فرعون مصر (الّذي فرَّ إلى بلاد الحبشة) حكم مصر ١٣ سنة، وبعد ذلك عاد إليه فرعون هو وابنه ومعهما جيش عظيم فقهروه وأخرجوه منها إلى بلاد الشام)[1] واتە : لە کتێبی (الأصول البشرية)دا لە لاپەڕە (٨٨)دا هاتوە کە هی نووسەر (لینج)ە دەڵێ : (يُوسِيفُوس) (کە مێژوونووسێکی بەناوبانگی جوولەکەیە) لە (مانیثو)وە (کە دیارە ئەویش مێژوونووسێکە) ئەم ڕیوایەتە میسرییە لەمێژینەیە دەگوازێتەوە ، کە کورتەکەی ئەوەیە : مووسا ﷺ دوای ئەوەی فیرعەونی میسر دەشکێنێ، وە فیرعەون ڕادەکات بۆ وڵاتی حەبەشە، مووسا سێزدە (١٣) ساڵ حوکمی میسر دەکات، بەڵام دوای ئەو ماوەیە فیرعەون و کوڕەکەی و سوپایەکی مەزنیشیان لەگەڵ دەبێ ، دەگەڕێنەوە، وە مووساو ئەوانەی لەگەڵیدان دەیانشکێنن، وە ئەوان (مووساو گەلەکەی) دەچن بۆ وڵاتی شام.

هەڵبەتە ئەوەش ڕیوایەتێکە، بەڵام ئێمە لێی دڵنیا نین ، لەبەرئەوەی ئایەتەکان زیاتر ئەوە دەگەیەنن کە واپێدەچێ یەکسەر بەنی ئیسرائیل کە لە دەریای سوور پەڕیونەوە ، چوونە دەشتی سینا ، نەك دوایی گەڕابنەوە میسرو حوکمڕانییان کردبێ لەوێ، بەڵام ئەگەر گریمان ئەو ڕیوایەتەش ڕاست بێ ، لەگەڵ قورئاندا هەر دژ ناوەستێ ، چۆن ؟ با تەماشا بکەین :

١) (مجلة المنار، ج ١٦، ص ٤٤٦ و ٤٤٧)، وە (تفسير القرآن الحكيم) بەرگی (٩) لاپەڕە (٨٤ و ٨٥).

١) لە سووڕەتی (الإسراء)دا ، خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ : ﴿ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾ ﴾،
واتە : فیرعەون ویستی لەسەر زەمین دەریان بکات، بەلاّم ئێمە خۆیو ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون ، تێکڕایانمان خنکاندن، وە دوای وی بە گەلی مووسامان گوت : لەسەر زەوی نیشتەجێ بن، هەر کاتێك بەڵێنی ڕۆژی دوایی هات، ئەوە هەمووتان پێکەوە ڕاپێچ دەکەین (هەمووتان دەپێچینەوەو دەتانهێنین) .

٢) وە لە سووڕەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ : ﴿ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە : فیرعەونو داروودەستەکەیمان لە نێو چەند باغو بێستانو کانیو سەرچاوەیەك وەدەرنا، وە لە نێو چەند خەزنەو جێگاو ڕێگایەکی زۆر خۆشو باش، وە بەو شێوەیە کردمانە میراتی بەنی ئیسرائیل .

چۆنیەتی تێك نەگیرانی ئەو ئایەتانەش ، لەگەڵ ئەو ڕیوایەتە مێژووییەدا بەم شێوەیە :

ئەگەر بەنی ئیسرائیل چووبنە میسرەوەو حوکمڕانییان تێدا کردبێ، ئەوە دیارە، بەلاّم ئەگەر نەشچووبنەوە میسر کە دەستیان بەسەر ئەو شتانەدا گرتبێو ماوەی سێزدە (١٣) ساڵ حوکمڕانیی بکەن ، مادام دوایی ئەو میراتو پاشماوانەی کە لە فیرعەونو داروودەستەکەی بەجێ ماون ، بەنی ئیسرائیل لێیان بەهرەمەند بووبن، ئایەتەکان ئەو واتایە هەر دەگەیەنن .

٣) هەروەها لە سووڕەتی (الدخان) ئایەتەکانی : (٢٥ تا ٢٩) دا ، خوا دەفەرموێ :

﴿ كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا

فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَۖ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: چەندیان باغو بێستانو کانیو سەرچاوە بەجێ هێشتن ! وە چەندان کشتوکاڵو جێگاو ڕێگای باش ! وە نازو نیعمەتێك کە تێیدا خۆشگوزەران بوون، ئاوا بەو شێوەیە ، وە کردمان بە میراتی گەلێکی دیکە، {کە گەلی (بنو اسرائیل)ە وەك لە سوورەتی (الشعراء)دا هاتوە : ﴿ كَذَٰلِكَ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ ﴾} .

پاشان دەفەرموێ : ﴿ فَمَا بَكَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ نە ئاسمانو نە زەوی بۆیان نەگریان، وە چاوەڕێشیان نەکرا.

کەواتە : قورئان لەگەڵ ئەو ڕیوایەتە لە مێژینە میسرییەشدا دەگونجێ ، کە (د. محمد توفیق صدقي) هێناویەتی .

هەروەها ئەوەی قورئان فەرموویەتی : لەگەڵ ئەو ڕایەشدا دەگونجێ ، کە لە هەمان ڕیوایەتدا هاتوە ، کە دەڵێ : فیرعەون سوپاکەیەکەی لە ڕووباری (نیل)دا خنکاون ، نەك لە دەریای سووردا ، (دەریای سوور)یش ئەوکاتە (بحر القلزم) یان پێ گوتوە ، چونکە خوا ﷻ لە ئایەتەکاندا وشەی (یم) بەکاردێنێ، نەك وشەی (بحر) ، وە وشەی (یم)یش وێڕای مانای دەریا (بحر) مانای ڕووبار (نهر)یش دەگەیەنێ ، با تەماشا بکەین :

١/ لە سوورەتی (طه)دا دەفەرموێ : ﴿ إِذۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلتَّابُوتِ فَٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ فَلۡيُلۡقِهِ ٱلۡيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأۡخُذۡهُ عَدُوّٞ لِّي وَعَدُوّٞ لَّهُۥۚ وَأَلۡقَيۡتُ عَلَيۡكَ مَحَبَّةٗ مِّنِّي وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: (ئەی مووسا !) یاد بکەوە کاتێك سروشمان بۆ دایکت کرد ، ئەوەی کە بۆمان سروش کرد (یانی : پەیامان بۆ نارد ، خستمانە دڵی) کە مووسا بخە نێو تابووتێك (سندووقێکی دارەوە ، کە ئاوی تێنەچێ) وە دوایی تابووتەکە بخە نێو (یم)ەوە ....

ئنجا (یـم) دەگونجـێ کـە مەبـەسـت پێـی ڕووبـاری نیـل بـێ، وە دەشگونجـێ مەبـەسـت پێی دەریا بێ، بـەلاّم بێگومـان لێـرەدا مەبـەسـت پێـی ڕووبـاری نیلە، چونکە کۆشکی فیـرعەون لەسـەر ڕووبـاری نیـل بـووە، وە لـە دەریـای سـوور دوور بووە، کـەواتە : (یم) هـەرچەندە لە بنـەڕەتـدا هـەم مانای ڕووبار دەگـەیەنـێ هـەم مانای دەریـا، بـەلاّم لـێرەدا بـە مانای ڕووبـارە .

٢/ ئنجـا لـە سـووڕەتی (القصص)دا بـەهـەمان شێوە، دەفـەرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: وە سـروشمان بۆ دایکی مووسا کـرد کە شـیـری بدەیـە ، ئنجا ئەگـەر مەترسـییت لێـی هـەبوو ، فڕێی بدە نێـو (یـم)ەوە .

کـە بێگومـان مەبـەستی پێ ڕووبـاری (نیـل)ە .

٣/ ئنجا لە درێژەی بـەسـەرهـاتەکەدا ، لە سووڕەتـی (طـه)دا دەفـەرموێ : ﴿ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴿٧٨﴾ ﴾، واتـــە : فیــــرعەون بـــە خــۆیو بــە سـەربازەکـانیەوە ، شــوێنیان کـەوت ، (شـوێنی مووسـاو گــەلەکەی کـەوت) ، وە لـە (یم)دا ئـەوە داپیۆشـین ، کـە داپیۆشـین، (یـانـی : ئـاو داپیۆشـین)، کـەواتـە : (یـم) هـەم دەگونجـێ مەبـەست پێی دەریای سـوور بـێو، هـەم دەشگونجێ مەبـەسـت پێی ڕووبــاری نیـل بـێ .

٤/ وە لە درێـژەی بـەسـەرهـاتەکەی (القصص)یشدا لە ئـایەتی ژمـارە (٤٠)دا ، هـاتوە دەفـــــەرموێ : ﴿ فَأَخَذْنَـٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَـٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾، واتـە: خـۆیو سـەربازەکـانیمان گـرتو فڕێمـان دانە نـاو (یـم)، کـە دیسان دەگونجـێ مەبـەسـت پێـی ڕووبـاری نیـل بـێ ، وە دەشگونجێ مەبـەست پێی دەریای سـوور بـێ .

ئنجا ئاشکرایە کە دایکی مووسا تابووتەکەی لە ڕووباری نیل هاویشتوە ، کەواتە : هەر کام لە : (بحر) و (نهر) ، (یم)میان پێ دەگوترێ .

بەڵام لە تەوراتدا دەڵێ : بەنی ئیسرائیل کە لە میسر دەرچوون ، یەکسەر چوونە دەشتی سینا، وە بە دیارییکراویش دەڵێ : فیرعەون و سوپاکەی لە دەریای سووردا خنکاون ، واتە : تەورات لەگەڵ ئەو ڕیوایەتە لە مێژینە میسرییە دا ـ ئەگەر گریمان ڕاست بێ ـ تێکدەگرێ، چونکە لە تەوراتدا دەڵێ : یەکسەر چوونە دەشتی (سینا)، وە بە دیارییکراویش دەڵێ : فیرعەون و داروەستەکەی و سوپایەکەی لە دەریای سووردا خنکاون ، وەك :

١ – لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ١٣، ص ١٥٨)دا دەڵێ : (إِنَّمَا اقْتَادَ الله الشَّعْب عَبْر صَحْرَاء البَحْر الأَحْمَر..)، واتە : بێگومان خوا ئەو گەلەی (واتە: گەلی بەنی ئیسرائیل)ی بە بیابانی دەریای سووردا ، پەڕاندەوە .

٢ - هەروەها لە (إصحاح)ی (١٥)دا لە لاپەڕە (١٦٣)ی هەمان سەرچاوە دا دەڵێ : (ثُمَّ ارْتَحَلَ مُوسى بإِسرَائِيل مِنَ البَحْر الأَحْمَر وَتَوَجَّهوا نَحْو صَحْرَاء شور...)، واتە: دوایی مووسا بەنی ئیسرائیلی هەڵگرت و گواستنیەوە، پێشیان کەوت لە دەریای سوورەوە ، وە ڕوویان کردە بیابانی سوور (کە مەبەست پێی بیابانی دەشتی سینایە).

٣ - وە لە (إصحاح)ی (١٦) لە لاپەڕە (١٦٣)دا دەڵێ : (ثُمَّ انْتَقَلَتْ كُلّ جَمَاعَة إِسْرَائِيل مِنْ إِيلِيمَ حَتَّى أَقْبَلُوا إِلى صَحَرْاء سِين الوَاقِعَة بَيْنَ إِيلِيم وَسِينَاءَ، وَذَلِكَ فِي اليوم الخَامِس عَشَر من الشهر الثاني بَعْدَ خُروجهِم مِنْ أَرْض مِصر)، واتە: دوایی هەموو ئەو کۆمەڵی بەنی ئیسرائیلە ، لە ئیلیمەوە دەرچوون ، هەتاکو ڕوویان کردە بیابانی سین ، کە دەکەوێتە نێوان ئیلیم و سیناوە ، ئەویش لە ڕۆژی (١٥)ی مانگی (٢) لە دوای دەرچوونیان لەسەر زەمینی میسر .

مەبەست ئەوەیە کە ئەوەی کە لە قورئاندا هاتوە، هەم لەگەڵ ئەوەدا دەگونجێ کە لە پەیمانی کۆندا هاتوەو، هەم لەگەڵ ئەو ڕیوایەتە میسرییە کۆنەش دا دەگونجێ ، کە پێشتر هێنامان .

# چۆنیەتی دەربازبوونی بەنی ئیسرائیل لە دەریای سوور

با سەرنجی چەند سوورەتێکی دیکە بدەین، کە چۆن باسی دەربازبوونی بەنی ئیسرائیلو خنکانی فیرعەونییەکان دەکەن، کە زیاتر تیشك دەخەنە سەر ئەو بابەتە :

١) خوای پەنهانزان لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرمویّ: ﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ وَجُنُودُهُۥ بَغۡيٗا وَعَدۡوًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾، واتە :

بەنی ئیسرائیلمان بە دەریادا تێپەڕاند ، وە فیرعەونو سەربازەکانی لە ڕووی دەستدرێژیو سنوورشکێنییەوە ، شوێنیان کەوتنو زوڵمیان لیّ دەکردن ، هەتا کاتێك کە فیرعەون خەریکی خنکانیّ بوو ، گوتی : بڕوام هێنا ، کە جگە لەو پەرستراوەی بەنی ئیسرائیل ئیمانیان پیّ هێناوە ، هیچ پەرستراوی دیکە نین، وە من لە ملکەچانو گەردن کەچانم . (خوا دەفەرمویّ) : ئا ئێستا ئیمان دێنی ! کە پێشتر سەرپێچییت دەکرد ، وە لە خراپەکاران بووی ، ئەمڕۆ جەستەکەت دەرباز دەکەین ، تاکو بۆ خەڵکی دوای خۆت ببی بە نیشانەو ببی بە پەند ، وە بێگومان زۆر لە خەڵکی لە ئایەتەکانی ئێمە بیّئاگان.

کە دیارە ئەمە ئیعجازێکی هەواڵیی (إعجاز خبري)یشی تێدایە ، چونکە تاکو ئێستاش جەستەی فیرعەونی مووسا لە مۆزەخانەی میسر هەڵگیراوە، وە بەڵێنی خوای پەروەردگار هاتۆتە دی .

٢) وە لە سوورەتی (طـه)دا ، خوای پەروەردگار ئاوا باسی دەربازبوونی گەلی مووسای کردوە ، دەفەرمویٚ : ﴿ وَلَقَدْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِي الْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَافُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِ فَغَشِيَهُم مِّنَ الْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُ وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾ ﴾، واتە: ئێمە سروشمان بۆ مووسا کرد ، (وەحییمان بۆ نارد) کە بە شەو بەندەکانم سەفەر پێ بکە، وە لە دەریادا ڕێیەکیان پێشان بدە، {واتە: گۆچان لە دەریا بدە ـ وەك لە ئایەتەکانی سوورەتی (الشعراء)دا هاتوە ـ با شەق ببێ} وە ڕێیەکی وشك ، نە مەترسیی ئەوەت هەیە کە پێت بگەن، وە نە مەترسیی خنکانیشت هەیە ، ئنجا فیرعەون بە خۆیو سەربازەکانیەوە شوێنیان کەوت ، بەلاّم لە نێو (یم)دا شتێك هاتە سەریان کە هاتە سەریان (کە مەبەست خنکانیانە) ﴿ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُ وَمَا هَدَىٰ ﴾، وە فیرعەون گەلەکەی خۆی گومڕا کردو، ڕێنمایی نەکردن .

٣) وە لە سوورەتی (الشعراء) ئایەتی : (٥٢ تا ٦٦)دا دەفەرمویٚ : ﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰؤُلَاءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَائِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَاذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَاهُم مِّن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَاءَى الْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَابُ مُوسَىٰ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّا ۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْبَحْرَ ۖ فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ الْآخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا الْآخَرِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾، واتە:

وە وەحییان بۆ مووسا کرد ، کە بە شەو پێش بەندەکانم بکەوە . وە بیانبە چونکە بێگومان ئێوە ڕاوەدوونراون {واتە: دارودەستەی فیرعەونو سوپایەکەی شوێنتان دەکەون} فیرعەونیش ناردی بۆ شاران ، جارچییان جاریانداو خەڵکیان کۆکردەوە ، گوتیان : ئا ئەوانە کۆمەڵێکی کەمی نابووتو بێدەسەلاتن، وە ئەوانە زۆر ڕقی ئێمەیان هەڵساندوە، وە ئێمە خەڵکێکی زۆریشینو گەلێك وریاینو زۆر پڕ چەكو گورجو گۆڵین . سەرەنجام ئەوانمان لەنێو باغو کانیو سەرچاوەکانیان وەدەرنان ، (واتە: فیرعەونو داروەدەستەکەی) وە لە نێو ئەو خەزنەو سەروەتو سامانو ئەو جێگاو ڕێگا پڕ عەیشو نۆشەی کە تێیدا بوون، وە دەرمانتنان، ئاوا بەو شێوەیە ، وە کردمان بە میراتی بەنی ئیسرائیل ، {واتە : لە دوای ئەوان دامان بە بەنی ئیسرائیل، بەپێی ئەوەش دەبێ لێی بەهرەمەند بووبن}، وە ئەوانیش شوێنیان کەوتن دەمەو ڕۆژهەلات ، ئنجا کاتێك دوو کۆمەڵەکان لێك وەدەرکەوتن ، هاوەڵانی مووسا گوتیان : ئێمە دەگیرێین (دەمانگەنێ) ، مووسا گوتی: نەخێر، من پەروەردگارم لەگەڵم دایەو ڕێنماییم دەکات، وە سروشمان بۆ مووسا کرد کە : گۆچانەکە لە دەریادا بدە ، ئەویش لێیدا، وە بوو بە دالانێك کە ئەملاولای وەك کێوی مەزن بوون ، (چونکە دیارە ئاوەکە بەستوویەتی) ، ئنجا ئەوانی دیکەمان وەنیزیك خستن ، وە مووساو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ، هەموومان دەرباز کردن ، پاشان ئەوانی دیکەمان هەموویان خنکاندن .

٤) وە لە سوورەتی (الدخان)دا دەفەرموێ : ﴿ فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَاتْرُكِ الْبَحْرَ رَهْوًا إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە : (بە مووسامان گوت : ) بە شەوێ پێش بەندەکانم بکەوە (سەفەری شەویان پێبکە) چونکە ئێوە ڕاوەدوونراون (ئەوان شوێنتان دەکەونو ئەگەر ڕۆژبێ، دەتانبینن) ، وە دەریایەکە بە کراوەیی بەجێ بهێڵە، چونکە ئەوان سەربازانێکن دەخنکێن، (واتە: کە گۆچانت لە دەریاکەدا ، لێی گەڕێ ، با هەر کراوە بێ ، کە ئێوە دەربازبوون ، گۆچانی لێ مەدە وێکبێتەوە، بەڵکو لێی گەڕێ ، با هەر کراوەبێ ، وە ئەوانیش یەکسەر بەدوای ئێوەدا تێی بکەن، وە کاتێك کە هەموویان هاتنە نێو دەریا ، خوای باڵادەست بۆخۆی دەریایەکە وێك دێنێتەوەو هەموویان دەخنکێن) .

**مەسەلەی هەشتەم** : کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ الْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ بِمَا صَبَرُوا ﴾، واتە: وە وشەی هەرە چاکی پەروەردگارت بۆ بەنی ئیسرائیل هاتە دی ، بەهۆی خۆڕاگرییانەوە ، ئنجا ئایا ئەو وشە چاکە کامەیە ؟ وا پێدەچێ ئەوە بێ کە خوای بەخشەر لە سووڕەتی (القصص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ ۝٥ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ ۝٦ ﴾، واتە: وە دەمانەوێ چاکە بکەین لەگەڵ ئەوانەدا کە لە زەوی دا چەوسێنراونەتەوە، وە بیانکەینە پێشەواو حوکمڕانو بیانکەینە میراتگر، وە لە زەوییدا دەسەڵاتیان پێ بدەین، وە پێشانی فیرعەونو هامانو سەربازەکانیان بدەین، ئەوەی کە لێی دەترسان .

کوردەواریی خۆمان دەڵێن : (ئەوەی بترسێ ناخەلسێ) ئەوەی کە لێی دەترسان ، ئەوە بوو کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو خەڵکەی کە دەیانچەوسێننەوە ، لێیان ڕاپەڕنو شۆڕشیان لە دژ بکەن ، وە حاڵەتێك بێتە ئاراوە ، کە تووشی زەرەرو زیان بن ، وە ئەو بەڵێنەی خوای دەرووکەرەوە هاتە دی ، واش پێدەچێ ئەو وشە هەرە چاکەی پەروەردگار ، مەبەست پێی بڕیارو بەڵێنی خوا بێ ، کە بە وشە موبارەکەکانی ، فەرموویەتیو ، بە باشترین شێوە بۆ بەنی ئیسرائیل هاتۆتە دی .

**مەسەلەی نۆیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُ وَمَا كَانُوا يَعْرِشُونَ ﴾، وە هەرچی کە فیرعەونو گەلەکەی دروستیان کرد، بە کارامەییو لێزانیی ، وێرانمان کرد ،

وشەی : (صُنْع) بریتیە لە هەر شتێك کە مرۆڤ بە کارامەییو لێزانییو وەستایی بیکات، بۆیە (صانِع) کەسێکە کە شتێك دروست دەکات بە کارامەیی،

(وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ) ئەوەش كە وەك سەقفو سەربانو ساباتی دروستیان دەكرد، كە دەگونجێ وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا ، مەبەست ئەو كۆشكو قەڵاو تەلارو بینایانە كە لە شارەكان بنیاتیان دەنان ، وە هەم ئەو كەپرو ساباتانە بن ، كە وەك هاوینە هەوار دروستیان دەكردن ، واتە: هەم ئەوەی كە بۆ ژیانی زستانەو بۆ كاتی بارانەو، هەم ئەوەی بۆ كاتی هاوینەهەوار ، دروستیان دەكرد ، هەموویمان كاول كردو ڕماندمان .

هەڵبەتە لێرەدا خوای كاربەجێ ، دوو شتان دەفەرموێ :

یەكەم : كە بەنی ئیسرائیل بەڵێنی خوایان بۆ هاتە دی، وە خوا دەستەڵاتی پێدان لەسەر زەوی .

دووەم : بە پێچەوانەشەوە : فیرعەونو داروودەستەكەی كە زوڵمو ستەمیان لێدەكردن ، خوای باڵادەست موڵكوماڵو حاڵو خانووبەرەو كەپرو ساباتی لێ ڕووخاندنو لێی تێكدان ، دیارە ئەمەش یاسایەكی خوایە ، كە هەمیشە خوای پەروەردگار وەك یاسایەك لەگەڵ چەوساوان دایەو ، دژی ستەمكارو چەوسێنەرانە، چونكە دوو ئایەتەكەی (القصص) بە ژمارە (٥ و ٦) ، خوای كاربەجێ یاسایەكی خۆییان تێدا دەخاتەڕوو كە : لەگەڵ چەوساوانەو دژی چەوسێنەرانە .

كەواتە : سەرخستنی چەوساوان ، سوننەتو یاسایەكی خوایە ، ویستی خوایان لە پشتە ، هەروەك لە بەین بردنی ستەمكارانیش دیسان ویستی خوایە ، واتە : ویستی خوا لە دژی ستەمكارانە ، وە پاڵپشتی چەوسێنراوانە ، بەڵام دیارە چەوسێنراوانیش دەبێ بەرخۆدان بكەن ، خەبات بكەن ، خۆ ماندوو بكەن ، تێبكۆشن ، نەك دەستەو ئەژنۆ دابنیشنو ، دەست بە خۆیان دا بەردەنەوە ، چەوساوانێك كە تێبكۆشنو خۆ ماندوو بكەن ، بێگومان خوای باڵادەست لە پشتیانەو سەریان دەخات ، چونكە خوای پەروەردگار ئەم سەرزەمینەی بۆ ئەوە دانناوە كە فیرعەونو فیرعەونییەكان تەراتێنی تێدا بكەنو ، خەڵك بكەنە كۆیلەی خۆیان، بەڵكو خوا ئەم سەرزەمینەی داناوە، تاكو خەڵكی تێدا تاقی بكرێتەوە ، ئنجا دیارە بە كوفرو ئیمان خەڵك

دەتوانن لەم سەرزەمینەدا ژیان بەسەر بەرن، بەلاَم بە ستەمکاریی‌و دابەشبوونیان بۆ ستەمکارو ستەملێکراو (ظالم و مظلوم) هاوسەنگیی ژیان تێکدەچێ، بۆیەش شەریعەتی خوا ڕێگای داوە ، کە مرۆڤەکان ئەگەر ڕەغبەتیان لە کوفر بێ ، کوفر هەڵبژێرن ، وەك دەفەرموێ : ﴿فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴿٢٩﴾﴾ الكهف ، واتە : کێ دەیەوێ با ئیمان بێنێ‌و کێ دەیەوێ با کافر بێ ، بەلاَم شەریعەتی خوا ڕێی نەداوە ، کە خەڵك زوڵم بکات‌و نەیفەرموە : ((فَمَنْ شاءَ فَلْيَظْلِمْ وَمَنْ شاءَ فَلْيَعْدِلِ))، بۆچی ؟ چونکە وەك زانایانی ئیسلام گوتوویانە: (قَدْ يَدُومُ الْمُلْكُ مَعَ الْكُفْرِ ، وَلاَ يَدُومُ مَعَ الظُلْمِ) حوکمڕانیی بە کوفرەوە بەردەوام دەبێ ، (ئەو هەموو دەوڵەتانە کافرن‌و ، چ بەلاَشیان نیەو حوکمڕانیی‌و دەسەلاَتیان بەردەوام‌و سەقامگیرە) بەلاَم لەگەڵ ستەم دا حوکمڕانیی بەردەوام نابێ ، ئەوە ولاَتی مسوڵمانان تەماشا دەکەین ، چونکە هەر کامێکیان دیکتاتۆرێك خۆی لەسەر فەرز کردووەو ستەم دەکات، شۆڕشی لە دژ دەکرێ‌و ئاژاوە پەیدا دەبێ‌و ئاشووب پەیدا دەبێ ، بۆیە خوا هەم بە ئیرادەی گەردوونیی و قەدەریی (الإدارة الكونية والقدرية)و ، هەم بە ئیرادەی شەریحی‌و فەرمانیی (الإرادة الشرعية والأمرية)ی خۆی ڕێی لە کافربوون نەگرتوە ، دەبێ مرۆڤەکان ڕێیان هەبێ ، کە کوفر هەڵبژێرن ، یان ئیمان هەڵبژێرن ، چونکە بەبێ ئەوە ناگونجێ تاقیبکرێنەوە ، بەلاَم تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان ، پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە زوڵم بکەن ، بەڵکو زوڵم لە یەکدی کردنیان ، دەبێتە هۆی تەنگ بە یەکدی هەڵچنین‌و تێکچوونی سەر زەوی ، بۆیە شەریعەتی خوا ڕێگا بە هیچ جۆرێك ڕێ بە ستەم نادات، لە حاڵێکدا کە ڕێگا دەدات خەڵك کوفر هەڵبژێرن، وە خوا جەبری لە بەندەکانی نەکردوە ، بۆ ئەوەی ئیمان بێنن ، هەرچەندە بێگومان ئیمانی خۆشدەوێ‌و ڕقی لە کوفرە ، وەك فەرموویەتی : ﴿...وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡۗ... ﴿٧﴾﴾ الزمر .

# دەرس وپەندەکانی بەسەرهاتی

# مووسا (علیه السلام) و فیرعەون

ئنجـا بـا بـزانین چ دەرس‌و پەندێـك لـە بەسەرهـاتی مووسـاو فیـرعەون وەردەگیـرێ ، ئێمـە دەتـوانین بـە لای کـەمـەوە نـۆ (٩) دەرس‌و پەنـد لـە بەسەرهاتی مووسـاو فیـرعـەون وەربگـرین :

## ١/ خـواپەرسـتیی‌و دادگـەریی لەلایەك، وە شـیرك‌و کـوفرو سـتەم لـە لایـەکی دیکەوە، پێکـەوە پەیوەسـتن :

واتـە : ناگونجـێ خەڵکـێك بـە ڕاسـتیی خـواپەرسـت بـێ‌و ، دادگـەر نـەبێ ، بەتایبەتی حوکمڕانانی خواپەرست ، ناگونجێ دادگـەر نەبن ، هـەرکەسێك کە خـوا پەرسـت بـێ : لـە خـودی خۆیـدا ، لەگـەڵ مـاڵ‌و منداڵەکـەی دا ، لەگـەڵ ئەوانەدا کە دەسـتەڵاتی بەسـەریاندا هـەیە ، بەندایەتییـەکەی بـۆ خـوا وای لـێ دەکات کە دادگەر بێ ، ئەهلی ئینصاف بێ ، وە چاوی لە ستەم نـەبێ .

بەڵام شـیرك‌و کوفر ، هەمیشـە وا لە خاوەنەکەی دەکـات، کە سـەر بۆ سـتەم بکێشـێ ، مەگـەر چوارچێـوەی بـۆ دانـرابێ ، وەك ئێسـتا لـە وڵاتـانی ڕۆژئـاواو ڕۆژهـەڵات دا هـەیە ، گـەر سیسـتەمێك هەبـێ کە دەسـتیان بگـرێ‌و لەمپـەریان لەبـەردەمـدا دروسـت بکـات، ئەگـەرنا شـیـرك‌و کـوفر کـاتێك دەچـێتە دڵ‌و دەروونی مرۆڤـو ، لـە عەقـڵ‌و ناخیـاندا جێگیـر دەبـێ ، ڕێگـای گوناهـو تـاوان‌و زوڵـم بـۆ خاوەنەکـەی ئـاچـووغ‌و تەخـت دەکـات ، بـە پێچـەوانەی ئیمـان‌و بـەندایەتیی کـردن بـۆ خـواوە ، ئیمـان‌و بەندایـەتیی بـۆ خـوا ، دەسـتی مرۆڤـ دەگـرێ ڕێگا دەگـرێ لـەوە کـە سـتەم بکـات ، بۆچـی ؟ دەڵـێ : ئـەو مـرۆڤـە

مرۆڤێکی وەك تۆیە ، ئەویش بەندەی خوایە وەك تۆ ، خوا لێت دەپرسێتەوە ! بەڵێ ئیمان وا لە مرۆڤ دەکات کە دەستی نەچێتە زوڵمەوە ، ئەگەر لەگەڵ ئیمانەکەیدا ڕاست بکات، بەلام ئەگەر هەر بە درۆو بە ڕواڵەت خۆی بە مسوڵمان‌و بە ئیماندار لە قەڵەم بدات ، ئەوە قسەمان لەوە نیە .

ئنجا ڕەنگە یەکێك بڵێ : ئەدی بۆچی ئەو وڵاتانە موشریك‌و کافریشن‌و ستەمیش ناکەن ؟

١ - دەڵێین : هەڵبەتە ستەم هەر هەیە ، لەنێو خۆشیاندا ستەم هەر هەیە ، ئەدی ئەوە ستەم نیە، کە هەندێکیان پڕن‌و لەسەریان ڕژاوەو ، زۆربەشیان قڕن‌و گەلێکیان لەبەر بڕاوە ؟ کەسە زۆر سامانداروکانیان ڕەنگە بە ژمارەی پەنجەکانی دەستێك ، یان هەر دوو دەست بژمێردرێن، لە زۆربەی لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا : خاوەنی (٩٠ ٪)ی موڵك‌و ماڵ‌و سەروەت‌و سامانی ئەو وڵاتەی خۆیانن‌و ، (٩٠ ٪)ی خەڵکەکەش خاوەنی (١٠ ٪) یە، ئەدی ئەوە زوڵم نیە ؟

٢ - ئنجا وێڕای ئەوەو سەرباری ئەوەش : ئەوانە کاتێك لە سنووری وڵاتەکانیان دەچنە دەر ، هەموو شتێك بۆخۆیان ڕەوا دەکەن ، لە وڵاتانی ئیسلامیی‌و غەیرە ئیسلامیی دا ، وەك دەزانین : لە ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست‌و زۆربەی دنیادا ، ئەوان بنکەی سەربازییان لێ داناوەو ، دەیانەوێ کلتووری خۆیان‌و سیاسەتی خۆیان لەسەر ئەو میللەتانە فەرز بکەن ، ئەدی ئەوە زوڵم نیە ؟ ئەوانە هەندێك بەهایان هەن لە نێو وڵاتەکەی خۆیاندا پێوەیان پابەندن ، بەلام لە دەرەوەی سنووری وڵاتەکەی خۆیان دا ، ئەو بەهایانە ناناسن، وە بە شێوەیەکی دیکە مامەڵە دەکەن .

بەڵێ : هەمیشە شیرك‌و کوفر وا لە خاوەنەکەی دەکات ، کە لە سنوور دەربچێ‌و ستەم بکات ، وە مافی ئەوانی دیکە پێشێل بکات ، بۆیە خوا لە سوورەتی (القصص)دا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ فِرۡعَوۡنَ عَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡۚ

﴿إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٤﴾﴾، واتە: بێگومان فیرعەون لە زەویدا خۆی بە بەرز گرت، وە خەڵکەکەی کردە بەش بەش، هەندێکی دەچەوساندنەوە: کوڕەکانی سەردەبڕین و، ئافرەتەکانیانی دەهێشتنەوە، بێگومان ئەو خراپەکار بوو.

## ٢/ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) دژی ستەمکاران بوونو، لەگەڵ ستەمدیدەکان بوون:

وەك پەندێك هاتوە دەڵێ: (لِكُلِّ فِرعَونٍ موسى) واتە: بۆ هەموو فیرعەونێك مووسایەك هەیە! ئەگەر تەماشای مێژووی پێغەمبەران بکەین، هەمیشە دوژمنانو ناحەزانی پێغەمبەران، خۆسەپێنو خۆ بەزلگرەکان بوون: ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ ...﴿٨٨﴾﴾ الأعراف، دەستڕۆیشتووە خۆ بەزلگرەکان، گوتیان: ... وە بە پێچەوانەوە شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلاَمُ) هەمیشە چەوساوە بوون: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ ... ﴿٣٣﴾﴾ سبأ، ئەوانەی کە چەوسێنرابوونەوە، گوتیان: .... بەڵێ: هەمیشە خەڵکی ڕەشو ڕووتو خەڵکی داماوو، چەوسێنراوە، شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) بوون، بۆچی؟ چونکە:

یەکەم: موڵكو سامانی حەرامو دەسەڵاتی حەرام، دەستو پێی نەگرتوون، ئیمان بێنن.

دووەم: ئازادیی و سەرفرازیی و بەختەوەریی خۆیان، لەو پەیامەی پێغەمبەراندا بینیوەتەوە، کە هیچ جیاوازیی نەکردوە لە نێوان مرۆڤەکان دا، وە ڕێگای نەداوە زوڵم لە یەکدی بکەن، وە گوتوویەتی: دەبێ پێکەوە تەبابن.

**٣/ مووساو هارٍوونی برای صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، بە دەستی خاڵیی - بە رواڵەت - بەگژ فیرعەوندا چوونەوە:**

کە وەك خوای باڵادەست لە سوورەتی (طـه)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ ﴾، کێیان لەگەڵدا بووە؟ بێگومان کەس، بەڵکو بەدەستی خاڵیی چوون: مووسا خۆی و گۆچانەکەی، هارٍوونی برای گۆچانیشی پێ نەبووە، بەڵام ئایا بێ پشتیوان بوون؟ بێگومان نەخێر، ﴿ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفۡرُطَ عَلَيۡنَآ أَوۡ أَن يَطۡغَىٰ ﴿٤٥﴾ ﴾، (مووساو هارٍوون) گوتیان: خوایە! دەترسین کە یەکسەر پرکێشییمان بکاتێ، یاخود دوای ئەوەی پەیامەکەی پێ دەگەیەنین، یاخیی بێ، وە سزامان بدات، خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ لَا تَخَافَآۖ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: (خوا) فەرمووی: مەترسن، من لەگەڵتانم دەبیستم و دەشبینم.

کەواتە: خوای پەروەردگار پشتیوانیان بوو، بۆیەش سەرکەوتن، ئنجا ئێمەش ئەگەر وەك پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە راستیی پشتمان بە خواوە بدەین، وە پشتمان بە خوا قایم بێ، سەرکەوتووو سەرفراز دەبین، چونکە خوای بەرزو مەزنمان لەگەڵ دەبێ، کە دیارە کەسێکیش بە راستیی پشتی بە خوا قایم بێ، بەراستیش پابەندیی بەرنامەو شەریعەتی خوای پەروەردگار دەبێ، بە ئەندازەی ئەوە کە لە خوا دەترسێ، خوای پەروەردگار، دوژمن و ناحەزەکانی لێ دەترسێنێ، بەو مانایە کە بابای بڕواداری ڕاست و ساغ، سامی دەچێتە دڵی بەرانبەرەکانیەوە، بە مەرجێك بە ڕاستی بەندەی خوا بێ و، لەگەڵ خواد ڕاست و ساغ بێ.

## ٤/ خـوا بـەنـدەی خـۆی لە یـاد ناکـات :

وەك لە سووڕەتی (طه)دا دەفـەرموێ : ﴿ قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتـە : (خـوا) فـەرمووی : مەترسێن مـن لەگـەڵتـانم دەبیسـتمو دەبینـم ، یانـی : هـەموو قسـەکـانی ئێـوەش‌و بـەرانبـەرەکانیشـتان دەبیسـتم، وە هـەموو شـتێکیشتان دەبینـم، بگرە نێو دڵیشتان دەبینم .

ئنجـا بێگـومان خـوای پەروەردگـار وەك چـۆن مشـووری پێغەمبـەرانی خواردووەو ، لەگەڵیان بووەو سەرپەرشـتی کـردوون، دیـارە خـوای بـە بـەزەیـی تەنیا پەروەردگاری پێغـەمبـەران نیـەو ، تەنیـا پشـتیوانی ئـەوان نیـە ، بـەڵکـو خـوای پەروەردگـار فـەرموویـەتـی : ﴿ ٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴿٢٥٧﴾ ﴾البقـرة ، واتـە : خـوا دۆسـتو پشـتیوانی ئەوانەیـە کـە ئیمـانیان هێنـاوە .

## ٥/ زانیـاریی ڕاسـتەقینـە ، مرۆڤ بـە ئەنجام دەگـەیەنـێ :

بـەڵگـەمان چیـیە ؟ خـوا لـە سـووڕەتی (الأعراف)دا دەفـەرموێ : ﴿ وَأُلۡقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾، واتـە : جادووگـەرەکـان خرانـە کڕنووشـەوە، وەك بڵێی بـەبێ ویسـتی خۆیان بوو، کاتێـك ئەو موعجـیزانەی مووسـا ﷺیـان بینـی، ئەوەنـدە بەقووڵـیی قەناعەتیـان هـات ، یەکسـەر سـەجدەیـان بـرد ، چـونکە خۆیـان خـاوەن پیشـەی جادووکـردن بوون، دەیـانزانی سنووری جـادوو تـا کـوێ بـڕ دەکـات ، ئنجـا کـاتێك موعجیزەکـەی مووسـایان بینـی، زانیـان کـە ئـەوە هیـچ پەیوەنـدیی بـە جـادووەوە نیـە، بۆیـە وەك بەدەسـت خۆیـان نەبـێ وابـوون ، کـە یەکسـەر لـەپەوڕوو خرانە کڕنووشـەوە .

بـەڵـێ هـەمیشـە زانیـاریی ڕاسـتەقینەو قـووڵ خاوەنەکـەی بـە ئەنجـام دەگـەیەنـێ ، بـە پێچـەوانەی زانیـاریی سەرکـێڵ‌و کـەم‌و کـورت، بۆیـە زانایـەك قسـەیەکی جـوان دەکـات ، دەڵـێ : (دەریـای زانسـت بـە پێچـەوانەی دەریاکـانی دیکـەیە، خەڵـك لە قوڵاییەکـەیەوە دەربـازی دەبێ‌و، لە لێوارەکانی دا دەخنکێ).

بەڵـێ ئـەوانـەی کـە زانیـاریی کـەمو کـورتیان هـەیە دەربـارەی ئیسـلام ، تەماشـا دەکـەی خۆیـانو خەڵکـیش عاسـێ دەکـەن ، وە دنیـا لـە خەڵـکی تـەنگ دەکەنو دەیکەنە چەرمی چۆلەکـە ، وە حاڵەتێـك بـە خۆوە دەگـرن کە ئایینـی پـێ ناشـیـرینو پـێ کـرچو کـاڵو کـەمو کـورت دەکەوێتـە بـەرچـاوی خەڵـك، لەبـەرئـەوەی قـووڵ تـێ نەگەیشـتوون ، بـەڵام ئەوانـەی کە قـووڵ دەبنـەوە لـە ئیسـلام داو شـارەزا دەبـن : ڕێ بۆ خەڵکی فـراوان دەکـەن .

هەڵبـەتە ناڵێـین : زانایـانی قووڵ تێگەیشـتوو لـە ئیسـلام ، حـەڕام بـۆ خەڵـك حـەڵاڵ دەکـەن ! بـەڵام بێگومـان : ئـەوە کـە تـۆ وابزانـی : ئیسـلام تـەنیا یـەك بۆچوونی فـیقـهییـە ، زۆر جیـاوازە لەوە کە بزانی : نەخێر ، وێڕای ئەو بۆچوونە فیقـهییە ، پێنـج شـەش بۆچوونی دیکـەش هـەنو ، ئیسلام هـەر ئەو بـاریکە ڕێیـە نیـە ! بـەڵکـو پێـنج شـەش ڕێـی دیکـەش هـەن ! بۆیـەش یەکـێك لـە زانایـانی تابیعـین دەڵـێ : (مَـا سرَّني لَـو أَنَّ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ لَمْ يَخْتَلِفُـوا ، لأَنَّهُـم لَـو لَـمْ يَخْتَلِفُـوا لَـمْ تَكُنْ رُخْصَـة)[1] ، واتـە : حـەزم نەدەکـرد کـە هـاوەڵانی پێغـەمبـەر ڕاجیـاییان نەبووایـە ، چونکـە بەهـۆی ئـەو ڕا جیـاییەیـانەوە ، سنووری بازنـەی شـەریعـەت بۆ خەڵـك فـراوان بـووە .

بەڵـێ ئـەوە لە کوێ کـە تۆ هـەموو خـەڵك لـە قوللـەی قـاف بکێشـیو بڵـێی : ئیسـلام تەنیـا فـلان نامیلکـە ، فلان ئیجتیهـادو بۆچـوونە ، تـەنیا قسـەی فـلان زانـا ! وە ئەوە لە کوێ بڵـێی : نەخێـر ، ئەوە یەك جـۆرە تێگـەیشـتنە دەربـارەی ئیسلام، بـەڵام خەڵکی دیکەش هـەیە تێگـەیشـتنی دیکـەی هـەیە ، دەربـارەی ئـەو ئایەتو فەرمایشـتانە ، دەربارەی ئەو حوکمە شـەرعییانەی کە زیاتر لە بۆچـوونێك هەڵدەگرن ، ئەگەرنا شـەریعەت لە بابەتـە گـەورەو گرنگەکـانی ئیـمانو عەقیـدەو حەڵاڵ و حەڕام دا : نوقتـەی خستۆتە سەر پیت، بـەڵام فیقه بریتیە لە بۆچوونو تێگـەیشـتنی زانایـان ، بۆیـە بـەهـۆی فیقهـی فراوانـەوە ، بـەهـۆی تێگـەیشـتنی فراوانـەوە لـە ئیسـلام ، مرۆڤـ عـەقڵو دڵـی فـراوان دەبـێو ، ئەخـلاقی فـراوان دەبـێ ، وە ئیسلامیش بۆ خەڵك فراوان دەخاتە بەرچـاوو ، سـەغڵەتیـان ناکـات .

---

١) روح المعاني ، للآلوسي ، ج ٣ ، ص ١٦٤ .

## ٦/ هـەر کەس خـوا شـتی تایبـەتی پێشـان بـداتو ئیمان نەهێنـێ، بــە تونــدیی سـزای دەدات :

هـەر کەسـێك خـوای پەروەرگـار بـەڵگـەی لەسـەر تەواو بکات ، وە بیانوو بـڕاوی بکات، دوایی ئیمان نەهێنـێ ، سـزای سـەختتـرە لە هـی خەڵـکی دی، وەك خـوا لـە سووڕەتی (الأعراف)دا دەربارەی گەلی فیـرعەون دەفـەرموێ: ﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٣٦﴾ ﴾، واتـە: تۆڵـەمــان لــێ ســتاندنەوە لـە دەریــادا نغرۆمـان کـردن (بۆچـی) چونکـە بێبـڕوا بـوون بــە ئـایەتەکـانی ئێمــە ، ئـایەتەکانمانیــان بــە درۆ دەزانــی ، وە لـێیـان بـێ ئـاگا بوون .

کەواتـە : بـە ئەندازەی ئەوە کە بـەندە شـتی پێشــان دەدرێ ، لـە لایـەن خــواوە، لێپرسـینەوەو سزاشی قورسـتـر دەبـێ ، بۆیــە دەبـێ مرۆڤـ لەخــۆی وریــابــێ ، بــە ئەنــدازەی ئــەوە کــە شــارەزاتر دەبـــێ ، زیــاتر دەســتی دەگــاتە زانیـاریی شـەرعـیی‌و زیـاتر بـەرچـاوی ڕوون دەبێتـەوە ، دوایـی ئەگـەر لایــدا ، ســزایەکەی سـەختـتـر دەبێ ، هـەر بۆیـەش سـزای زانایـانی لادەر ، سـەختـتـرە لە هی خەڵـکی عـەوام ، هـەروەك پلـەو پایـەشـیان بـەرزتـرە لـە هـی خەڵکی دیکـە .

## ٧/ خـوا بـە صـەبرە، بـەڵام بـە زەبـرە :

چونکە خوا لە سووڕەتی (الزخرف)دا باسـی فیـرعەون‌و داروودەستەکەی دەکات ، دەفـەرموێ : ﴿ وَمَا نُرِيهِم مِّنۡ ءَايَةٍ إِلَّا هِيَ أَكۡبَرُ مِنۡ أُخۡتِهَاۖ وَأَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡعَذَابِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: هیچ نیشـانەو موعجیـزەیەکـمان پێشـان نـەدان، مەگـەر لە هـی دەسـتە خوشـکەکـەی (واتە: لـەوەی پێشــێ گـەورەتر بـوو) وە ســزامان دان ، بۆئەوەی بگـەڕێنـەوە .

بەڵام دوایی کە هەر نەگەڕانەوە ، بینیمان خوای باڵادەست چی لێکردن ! بە دەردێکی بردن کەم کەسی بەو دەردە بردوە ، کە هەمووی پێکەوە لە دەریادا نغرۆکردن .

## ٨ / لە ئەنجامی خۆڕاگریی دا، مرۆڤ شایستەی سەرخران دەبێ:

وەك خوا لە ئایەتی (١٣٧)ی سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ : ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟ ﴿١٣٧﴾ ﴾، واتە: وشەی هەرە چاکی پەروەردگارت لەسەر بەنی ئیسراپیل هاتەدی ، بەهۆی خۆڕاگرییانەوە .

وەك پێشتریش باسم کرد لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتەکەدا : هەم لە پەیمانی کۆندا، وە هەم لە قورئانیشدا دەردەکەوێ ، کە بەنی ئیسراپیل پرتەو بۆڵەی زۆریان لەسەر مووسا ﷺ کردوە، هەم لەو کاتەدا کە لە میسر بوون، وە هەم دواییش کە کەوتوونەتە دەشتی سیناو شام، زۆر پرتەو بۆڵەیان کردوەو بێزارییان دەربڕیوە، بەڵام دیارە بایی ئەوەندەش خەڵکی چاکیان تێدا هەبووە ، کە خوای بەخشندە لەبەر ئەوان چاوپۆشیی لە پرتەو بۆڵەو بێهێزیی ئەوانی دیکەش بکات .

## ٩/ گەلانی طاغووت پەرست ، لەگەڵ طاغووتەکاندا سزا دەدرێن:

با تەماشا بکەین : جارێ ئەوە دیارە کە خوای دادگەر گەلی فیرعەونی لەگەڵ فیرعەوندا خنکاندو نغرۆی کردن، وەك دەفەرموێ : ﴿ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٣٦﴾ ﴾الأعراف.

بەڵام با تەماشا بکەین بزانین خوای دادگەر بۆچی ستەمکاران و شوێنەکەوتووەکانیان پێکەوە سزا دەدات ؟ خوا لەوبارەوە دەفەرموێ :

﴿ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْـَٔاخِرِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾ الزخـرف ، واتـە : (فیـرعەون) داوای لێـکردن زۆر بـە خێرایی بە دەنگیەوە بێن‌و بە دەستیەوە بێن ، ئەوانیش بە قسەیان کرد، (ئەوە واتایەکی، واتایەکی دیکەی : وای لێکردن کە نەفام‌و نەزان‌و عەقڵ سووك بن ، ئەوانیش بە قسەیان کرد) لەبەرئەوەی کۆمەڵێکی لادەرو لاڕێ بوون ، کاتێك ئێمەیان تووڕە کرد ، تۆڵەمان لێ ستاندن ، هەموویانمان نغرۆ کردو خنکاند لە ئاودا ، وە کردمانن بە پێشین‌و بە پەند بۆ خەڵکی دیکەی کە بە دوای واندا دێن .

ئنجا ئایا فیرعەون چۆن خەڵکەکەی وا لێکرد، کە عەقڵیان سووك بێ‌و نەزان‌و کەودەن بن ؟

لە وەڵام دا دەڵێین : بەو جۆرە قسانە خەڵکەکەی ئیغفاڵ کردووەو کڵاوی لەسەر ناون ، وەك لە سووڕەتی (الزخرف)دا خوا دەفەرموێ : ﴿ وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ مَهِينٌ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: فیرعەون لە نێو گەلەکەیدا جاڕیدا، گوتی : ئەی گەلەکەم ! ئایا موڵکی میسر هی من نیە، وە ئەم ڕووبارانە بە ژێر (کۆشکەکەی) مندا نارۆن ، ئایا نابینن، چ ماڵ‌و موڵك‌و سەڵتەنەتێکم هەیە ، یان ئایا من چاکترم لەوەی کە سووکە {مەبەستی پێ مووسا عليه السلام بوو ، (حاشای مووسا)} وە خەریکە نەزانێ تەنانەت قسەش بکات‌و ، مەبەستی خۆیشی دەربڕێ (کە ئەوەشی درۆ بووە) ، دەبوایە بازنەی زێڕی

لـەدەســـت دابــان ، یاخــود فریشـــتەی لەگـەڵـدا هـاتبــانو هـاودەمــی بوونـایــە ، (یـانــی : مـادام بــازنەی زێــڕی لـە دەســتدا نیــنو فریشـــتەی لەگـەڵـدا نیــن ، کـەواتــە : دیــارە ڕاست ناکات) .

تەماشــا بکــەن ! فیـرعــەون بــەو قســە ســووكو ســادانە ، کــڵاوی لەســـەری گـەلەکـەی ناوە، ئنجا خەڵکێـك ئـاوا بـە ئـاسـانیی کـڵاویان لەسـەر بنـرێو ئـاوا هـەڵخەڵەتێـنرێـن ! هـەر بۆ ئەوە باشن لەگـەڵ فیـرعەوندا سـزا بـدرێن، هـەڵبــەتە ئەوەش دەرسو پەندێکی گـەورەی تێدایە کـە خەڵـك دەبــێ وریابــێ ، بــە قسـەی لووسو شـیـرینو ، خـۆشو بۆشـی سـتەمکـارانو حوکمڕانـانی سـتەمکـارو لاڕێ ، فریـو نەخــواو کـڵاوی نەچـێتە ســەر، ئەگـەرنا دوایـی ئـەو سـزاو تۆڵـەیەی خــوای دادگــەر چ لـە دنیــاو، چ لـە دواڕۆژدا کە بـە مـل ئـەو حوکـمڕانە سـتەمکـارەدا دێ، بـە مـل شـوێنکەوتووەکـانیشــی دا دێ ، کە ئـاوا عـەقـڵو ویسـتی خۆیـان تەسلیمی ئەو کــردوە ، وە ئـاوا ڕێشـمەی خۆیـان وە دەســت وی داوە ، لـە حاڵێکـدا کـە خــوا وای دروســت کــردوون ، دەیــانتوانی خـــاوەن ویســـتو عەقــڵو هەســـتو نەســتی خۆیــان بـن .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەوە بەسەرهاتی مووسا ﷺو گەلەکەی دەست پێ دەکات ، واتە : بەسەرهاتی مووسا لەگەڵ فیرعەون و داروودەستەو گەلە ستەمکارەکەی فیرعەون دا کۆتایی هات، وە ئەم دەرسەمان لە چوار (٤) ئایەت پێکدێ ، ئایەتەکانی : (١٣٨ تاکو ١٤١ ) لەو چوار ئایەتەدا خوای بەرزو مەزن بە ڕستەیەك باسی پەڕاندنەوەو دەربازکردنی بەنی ئیسرائیل لە دەریای سوور دەکات ، لەسەر ڕای بەهێزتر ، وە یەکسەر دوای ئەوە باسی هەڵوێستێکی سەیرو زۆر خراپی بەنی ئیسرائیل دەکات ، کە بریتیە لە داواکردنیان لە مووسا ﷺ کە بتێکیان بۆ پەیدا بکات، پەرستراوێکیان بۆ پەیدا بکات، وەك چۆن ئەو خەڵکەی کە بەلایاندا ڕەت بوون ، بتیان هەبوون ، کە کەنعانییەکان بوون ، دیارە مووساش زۆر بە توورەیی وەڵامیان دەداتەوەو بەرپەرچی داوایەکەیان دەداتەوە، وە چاکەو نیعمەتەکانی خوا لەسەریان ، دەخاتەوە یادیان ، کە یەکێك لەو چاکەو نیعمەتانەی خوا بریتی بووە ، لە هەڵبژێردرانیان بەسەر گەلانی ڕۆژگاری خۆیاندا، بۆ هەڵگرتنی پەیامی خوا، وە نیعمەتێکی دیکەشیان بریتی بووە، لە دەرباز کرانیان لە چنگی فیرعەون کە کوڕەکانی دەکوشتن و ئافرەتەکانیشی دەهێشتنەوە .

﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ (١٣٨) إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ (١٣٩) قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ (١٤٠) وَإِذۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُقَتِّلُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ (١٤١) ﴾

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە (پاشــان) بــەنی ئیســرِائیلمان لـە دەریـا تێپەڕانـد ، ئنجـا بــە لای کۆمەڵێکـدا ڕەتبوون ، خۆیـان بۆ پەرستنی چەند بتێکی خۆیان تەرخان کردبوو، (بـەنی ئیسرِائیل) گوتیـان : ئەی مووسـا ! پەرسـتـراوێکـمان بـۆ دانــێ ، وەك چـۆن ئەوانـە پەرسـتــراویان هـەن ، گـوتی : ئێـوە کۆمەڵێکن نەفـامیـی دەکـەن (١٣٨) مسۆگـەر ئـەو حالەی ئەوانـەی تێدان ، بێ پایەو مایــەیەو ئـەوەی ئەنجامیشــی دەدەن ، پـووچو بۆشــە (١٣٩) (مووسـا) گوتـی : ئـایا جگـە لە خـوا ، پەرسـتـراوێکی دیکەتـان بـۆ پەیـدا بکـەم ، لـە حاڵـێکدا کـە ئــەو بـەســەر جیهـانییــان (ی ڕۆژگــاری خۆتــان)دا هـەڵـیبــژاردوون (کــە پەیــامو بـەرنامـەی خـوا هـەڵبگـرن) ؟! (١٤٠) وە یـاد بکـەنـەوە کـە لـە دارو دەسـتـەی فیـرعەون ، قوتـارمان کردن ، کە بــە خراپـتـرین شـێوە سـزایان دەدان : کـوڕەکانتـانیـان دەکـوشـتـو ئـافرەتەکـانتـانیـان بـە زینـدوویی دەهێشـتـنەوە ، وە لەوەشـدا تاقیکردنەوەیـەکی مەزنــی پەروەردگـارتـان بۆ ئێـوە هـەبـوو (١٤١) )) .

## شیکردنـەوەی هـەندێك لە وشـەكان

(وَجَـٰوَزۡنَا) واته تێمانـپـەڕان، پەڕاندمانەوە (أَي تَجَاوَزَ جَوْزَهُ، وَجَوْزُ الطـريقِ : وَسَطُهُ، جَاوَزَ الـموْقِعِ وَالطـريقَ: خلَّفَهُ) دەڵـێ : (تَجَاوَزَ) لـەوەوە هـاتوە، واتـه لـه (جَوْز)ی تێپەڕانـد ، جا دەڵـێ : (جَوْزُ الطـريق) واتـە: نێوەڕاسـتی ڕێگـا، وە (جَاوَزَ الـموْقِع وَالطـريق) واتـە: ڕێیـەكە، یاخود شوێنەكەی بـەجێ هێشـت.

(يَعۡكُفُونَ) (العُكـوفُ : الإقْبَـالُ عَلَـى الشَّـيءِ وَمُلاَزَمَتُـهُ عَلَـى سَبِيلِ التَعْظِـيمِ لَـهُ)، (عكـوف) بریتیـە لـەوەی ئینسان ڕوو لە شتێك بكاو بـەری نەداو لەگەڵی بـێ، بـە شـێوەی بـە گەورەگـرتن، (وَفِـي الشَّرْعِ: هُوَ الإِحْتِبَـاسُ فِـي الـمسْجدِ عَلَـى سَبيلِ القُرْبَـة) (إعتِكـاف): لـەڕووی شـەرعەوە ، بریتیـە لـە مانـەوە لـە مزگـەوت بـە شـێوەیەك ، كە بتـەوێ لە خـوا نـزیك ببیـەوە، بـەهۆی ئەو مانـەوەیـەوە.

(أَصۡنَامٍ) (الصَّـنَمُ: جُثَّـةٌ مُتَّخَذَةٌ مِنْ فِضَّةٍ أَوْ نُحَاسٍ أَوْ خَشَبٍ ، تُعبد للتقرُّب إلى الله)، (صَنَم) بریتیـە لە پەیكـەرێك كە لـە زیـو ، یـان لـە مـس ، یـان لـە تەختـە ، یـا لە هـەر شتێكی دیكە دروست دەكرێ ، وە لە جیاتی خـوا دەپرسـترێ ، بۆ خـۆ نیزیك خسـتنەوە لە خـوا .

(مُتَبَّرٌ) دەڵـێ : (التَّـبْرُ: الكَسْـرُ وَالـهَـلاَكُ) واتـە : تێكشـكـانو لەبـەین چـوون (تَـبَرَهُ وَتَبَّـرَهُ) هـەردووكـی بـە مانـای (كَسَرَهُ)ە ، واته : تێكی شـكاند .

(وَبَـٰطِلٌ) ، (البَاطِـلُ نَقِيضُ الحَقّ) (بَاطِل) پێچـەوانەی هەقـە، واتـە: پـووچو بـۆش، (وَهُـوَ مَـا لاَ ثَبَـاتَ لَـهُ عِنْدَ الفَحْصِ عَنْهُ) ئـەویش ئەوەیـە كـە چەسپاویی نیـە، وە نێـوەڕۆكێكی نیە، كاتێك كە دەیپشكنی ، هیچی لەباراندا نیە، هیچ نێوەڕۆكێكی نیە.

(يَسُومُونَكُمۡ) ، (السومُ أَصْلُهُ : الذّهـابُ فِي ابْتِغَاءِ الشَّـيءِ ، سُمْتُ كَذَا : ذَهَبْتُ وَابتَغَـيْـتُ) ، ئەسـڵی (سـوم) بریتیـە لـەوە كـە تـۆ بـە دوای شـتێكدا بچی، ئنجا دەگوتـرێ : (سُمْتُ كَذَا) واتـە : ڕۆیشـتمو داوام كـرد .

## مانـای گـشـتـی ئـایەتەکـــان

دیــاره ئێمـــه پێشتــــریش باســــمان کــرد، لێـــره بــــه دواوه خـــوا ﷻ باســـی بەسەرهاتەکـانی مووسـاو هـاڕوونی بـرای صـەڵاتو سـەلامی خـوایان لەسـەر بێ ، دەکـات، لەگـەڵ وەچـەی ئیسـرائیل، دیـاره کـه خـوای پەروەردگـار لـه ئـایەتـەکـانی پێشێدا ، باسی ئەوەی کـرد کـه فیـرعەونو گەلەکـەیو دارودەسـتەکەیو سوپایەکـەی هەموویـان لە دەریـای سـووردا خنکـادن نغـرۆ کـردن .

ئـنجـا دەفـەرموێ : ﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ ﴾ وە بـەنی ئیسرائیلـمان بـه دەریـای سـووردا تێپەڕانـدو پەڕاندمانـدنـەوە ﴿ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ ﴾، بـه لای کۆمەڵێکدا ، بـه لای خەڵکێکدا تێپەڕین ، کە لەسـەر چەند صـەنەمو بتێکـی خۆیـان دانیشـتبوون، وە ئـەو بتانەیـان دەپەرسـتو لـەلایان دەمانـەوەو بـه مەزنیـان دەگـرتنو پەرستشـیان بۆ ئەنجـام دەدان، ﴿ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ ﴾، گوتیـان : ئـەی مووسـا ! پەرسـتـراوێکـیش بـۆ ئێمـه دابنـێ ، وەك چۆن ئـەوان چەنـد پەرسـتـراوێکیان هـەن ، ﴿ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴾، فـەرمووی : بێگومـان ئێـوه کـۆمەڵێکن نەفامیـی نەکـەن، یانی چی ؟! ئێستا پێتان وشك نەبۆتـەوە، تـازە خـوا ﷻ لـه دەریـا دەربـازی کـردوون ، ئـەوە دوژمنەکـەتان فـەوتاوە ، ئـەو خـوا پەروەردگارەی کە ئێوەی دەربـاز کـردوە ، ئێستا دەتـانەوێ بتو صەنەمێك بپەرستنو ، بیکەنـه هـاوبـەشی خـوا ؟! ئێـوە نەفـامیی دەکـەن ، ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، بێگومـان ئـا ئـەوانە ، ئـەو حاڵەتـەی کـه تێیـدان لـه

بەیـن دەچـێ ، دەفەوتـێ، وە ئـەوەش کـە دەیکـەن پـووچو بـێ پـایەو مایـەیە، بـێ ئەنجامە ، نە لە دنیـاو نە لـە دوارۆژدا سـوودێکی نیـە .

ئنجـا هـەر لەسـەر سەرزەنشـتەکەی خـۆی بـەردەوام دەبـێ، ﴿ قَالَ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَـٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، فـەرمووی : ئـایـا بێجگـە لـە خـوا ﷻ پەرسـتـراوێکی دیکـەتان بـۆ پەیـدا بکـەم، لـە حاڵـێکدا کـە خـوا ئێـوەی هەڵـبژاردوە بەسـەر جیهانییـاندا ؟ واتـە: جیهـانییانی سـەردەمی خۆتـان، لـە نێـو هەموو جیهانییـاندا ئێوەی هەڵبژاردوە، پەیامی خۆی بەو پێغەمبەرە پایە بـەرزانە داوە کـە مووسـاو هـاروونی برایـەتی (صـەڵاتو سـەلامی خـوایان لەسـەر بێ) لـە نێـو ئێـوەدا ڕەوانـی کـردوون ، ئەوە پێـگەو پایەیـەکی زۆر بـەرزە ، قـەدری بزانـن .

ئنجا خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَنجَيْنَـٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ﴾، وە بیخـەنەوە یـادی خۆتـان ، کـاتێك کـە دەربازمـان کـردن لـە دارودەسـتەی فیرعـەون ، کـاتێك کـە سـزایەکی خراپیـان پـێ دەچێشـتن، سـۆغرەو بێگاریـان پێ دەکـردن .

ئنجا نـموونەیـەك لەو سزا خراپە کە پێیـان چێشـتوون ، دەیـخاتە ڕوو : ﴿يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ﴾، دیارە خوێنراویشـەوە (يَقْتُلُونَ أَبْنَآءَكُمْ ) لـە شـوێنـی دیکـەش دەفـەرموێ : ﴿وَإِذْ نَجَّيْنَـٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ ﴾ البقرة ، هـەروەها خـوێنراویشـتەوە (يَذْبَحُونَ أَبْنَآءَكُمْ ) جا دیارە ئەگـەر بـە قیـرائەتـی (يَقْتُلُونَ، يَذْبَحُونَ)ە بـێ ، واتە : کوڕەکانتانیان دەکوشـت ، یـان سـەریان دەبـڕین ، بـەڵام ئەگـەر بـە قیـرائەتی (يُقَتِّلُونَ، يُذَبِّحُونَ )ە بـێ ، واتـە: زۆریـان

دەکوشتن‌و ، زۆریان سەردەبڕین ، زۆر بە خەستیی ، ئنجا ﴿ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡ ﴾، وە ئافرەتەکانیان دەهێشتنەوە ، دیارە بۆ خزمەت‌و بۆ ڕابواردن ، وە بە زۆرییش پیاوان‌و کوڕان جێگای مەترسیین ، کە سبەینێ دەبنە پیاو، وە سوپا پێکدێنن هێزو پێزیان هەیە، وە دەتوانن شۆڕش بکەن ، ئافرەتان کەمتر ئەوەیان لە تواناد‌ا هەیە ، بە حوکمی ئەو سروشتەی کە خوا لەسەری خوڵقاندوون ، زیاتر بە لای نەرم‌و ناسکیی‌و بە لای سۆزدان، ﴿ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴾، وە لەوەش دا تاقیکردنەوەیەکی مەزن ، لە پەروەردگارتانەوە بۆ ئێوە هەبووە ، ﴿ بَلَآءٞ ﴾، دەگونجێ بە مانای تاقیکردنەوە بێ ، وە دەشگونجێ بە مانای نیعمەت بێ، چونکە ﴿ بَلَآءٞ ﴾، وێڕای بەڵاو گرفتاریی کە مرۆڤی پێ تاقی دەکرێتەوە .

بۆ چاکەو نیعمەتیش بەکاردێ ، یانی : نیعمەتێکی مەزنی پەروەردگارتان بوو ، کە ئاوا دەربازی کردن .

دەشگونجێ ﴿ وَفِي ذَٰلِكُم ﴾ ، مانایەکەی ئاوابێ : لەوەدا کە فیرعەون ئاوای لەگەڵدا دەکردن ، ئەو سزاو ئەشکەنجەدانە، ئەوە بەڵایەك‌و ناخۆشییەکی مەزنی پەروەردگارتان بوو ، کە بەسەری هێنا بوون ، دیارە ئەویش هەر بێ حیکمەت نەبووە ، کەواتە : هەر چۆن بێ ئێوە دەبێ چاکەکانی خوای پەروەردگار بێننەوە بەرچاوی خۆتان ، وە بزانن کە خوای بەخشەر چی بۆ کردوون، وە ئێوەش لە قەدەر چاکەکانی خوا ، لەگەڵ خوادا مامەڵە بکەن ، ئەگەر لە قەدەر پایەی بەرزو بێ وێنەی خواش مامەڵە ناکەن‌و ، لەبەر پەروەردگارێتیی ، ناپەرستن، کە هەر ئەو شایستەی پەرسترانە، بە لای کەمەوە : وەفاتان هەبێ بۆ چاکەکانی‌و ، لەبەر ئەوە بیپەرستن ، کە چاکەی لەگەڵتان کردوە !

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ ﴾، وە بەنی ئیسرائیلمان لە دەریای سوور پەڕاندەوە، مێژووزانان دەڵێن: ئەو دەریایە دەریای سوورە، کە کاتی خۆی بە دەریای سوور گوتراوە (بحر القلزم)، بەڵام ئێستا پێی دەگوترێ: (البحر الأحمر)، هەڵبەتە پێشتریش گوتمان: وشەی (یم) (نهر)یش و (بحر)یش دەگرێتەوە، چونکە (یَم) بە ئاوی زۆر دەگوترێ، چ هی ڕووبار بێ، چ هی دەریا بێ، بەڵام کە لێرەدا وشەی (بحر) هاتووە، مەبەست پێی دەریای سوورە، نەك ڕووباری (نیل)، وە لە هەموو ئایەتەکانی دیکەش دا هەر وشەی () بەکارهێنراوە:

١ / لە سوورەتی (طه)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِي فَٱضۡرِبۡ لَهُمۡ طَرِيقٗا فِي ٱلۡبَحۡرِ يَبَسٗا لَّا تَخَٰفُ دَرَكٗا وَلَا تَخۡشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ مَا غَشِيَهُمۡ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾ ﴾.

٢ / وە لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ وَجُنُودُهُۥ بَغۡيٗا وَعَدۡوًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ یونس.

٣ / وە لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ : ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ
إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ
قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ
وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم
مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآ
إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ فَٱنفَلَقَ
فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ
وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ الشعراء.

کە وەك دەبینین لەو سێ کۆمەڵە ئایەتەی سوورەتەکانی : (طه) و (یونس) و (الشعراء) دا بە وردیی باسی ئەو پەڕینەوەیە کراوە ، بەڵام لێرەدا ــ لە (الأعراف)دا ـ هەر بە کورتیی بە ئاماژە بۆ کردن ، باسکراوە، شایانی باسیشە ئێمە لە دەرسی پێشووتردا بە تەفصیلێ ئەو ئایەتانەمان هێناوەو تەفسیرمان کردوون، وە مانا لێکدانەوەی وردو ڕوونو درێژیشیان لە کاتی تەفسیرکردنی ئەو سوورەتانەدا دەبێ ، واتە: تەفسیرکردنی سوورەتەکانی (یونس و طه و الشعراء) خوا پشتیوان بێ ، ئەگەر تەمەن باقی بێ.

وە شایانی باسیشە لە (پەیمانی کۆن )دا باسی چۆنیەتی ئەو پەڕینەوەیە کراوە ، بۆ وێنە : (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس ، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح : ١٤، ص : ١٦٠) لە ژێر ناوونیشانی: (عمود السحاب بين الفريقين)دا، بەم شێوەیە هاتوە :

(وَانْتَقَلَ مَلاك الله الذِي كانَ يَتَقَدّم عَسْكَر إِسْرَائيل إلى المؤَخَّرَةِ خَلفهم، وكذلك انتقل عمود السَّحاب من أمامهم ووقف وراءهُم، فدخل بين عسكر المصريين وعسكر الإسرائيلين، وصار العمود ظلاماً حالكاً على المصريين

وضياء على بني إسرائيل ، فلم يقترب أحدهما من الآخر طوال الليل) ، واتە : وە فریشتەی خوا کە لە پێش سوپای ئیسرائیل بوو، چوو بۆ لای دواوەیانو لە پشتیانەوە دەڕۆیشت، هەروەها هەورێکیش وەك کۆڵەگەیەك، وەك لوولەیەك لە پێشیانەوە دەڕۆیشت ، دوایی کەوتە پشتیانەوەو ، کەوتە نێوان سوپای میسرییەکانو سوپای ئیسرائیلیەکان (واتە جوولەکەکان) وە ئەو هەورە عەمودییە بۆ میسرییەکان بوو بە تاریکییەکی ئەنگوستە چاوی ڕەش، بەڵام بۆ بەنی ئیسرائیل (گەلی مووسا) بوو بە ڕووناکییەکی زۆر، وە هیچ کامیان لەوی دیکە نیزیك نەکەوتەوە ، بە درێژایی شەوگار .

واتە : بە درێژایی شەوگار کە بە نێو دەریادا ڕۆیشتوون ، کە هەر خوا دەزانێ ماوەی چەند کیلۆمەتر بووە، ئەو هەورە کە دیوی میسرییەکانی تاریك بووەو دیوی بەنی ئیسرائیلی ڕووناك بوو، کەوتبووە بەینیان، وە بەیەك نەدەگەیشتن .

دیارە ئەوە لە پەیمانی کۆندا هاتوە ، ئنجا چەندی ڕاستەو چەندی ڕاست نیە ؟ گرنگ ئەوەیە ئەگەر ڕاستیش نەبێ، زیانێك نادات، وە ئەگەر ڕاستیش بێ ، ئەوە دیارە وردەکاریی و بەرچاوڕوونیی زیاتر دەداتە شەرحو تەفسیری ئایەتەکە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ ﴾، بەنی ئیسرائیلمان لە دەریا پەڕاندەوە ، چۆن پەڕیونەوە ؟ پەیمانی کۆن وردەکاریی زیاتری تێدایە ، وە وەك گوتم : ئەگەر ڕاستیش نەبێ ، هیچ زیانی نیە ، چونکە هیچ شتێکی تێدا نیە ، کە لەگەڵ دەقی ئایەتەکەدا تێك بگیرێ .

**مەسەلەی دووەم :** کە دەفەرموێ : ﴿ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴾، ڕستەی : ﴿ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ ﴾، دیارە وشەی : (أَتَى) بە ﴿ عَلَىٰ ﴾، تەعەددا ناکات بۆ (مفعول)، بەڵام لێرەدا بۆچی فەرموویەتی: ﴿ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ ﴾؟ بۆ ئەوەی (أتوا) مانای (مَرّوا) بگەیەنێ ، شارەزایانی زمان گوتوویانە : {ضُمن (أتوا) معنى (مرُّوا) على قَوم} واتە : (أتوا) مانای (مرُّوا)ی خراوەتە نێو ،

یانی : بەلایاندا تێپەڕین ، بەسەریاندا گوزەریان کرد .

کەواتە: لە جیاتی ئەوەی خوا ﷻ دوو ڕستان بەکاربێنێ، یەك ڕستەی بەکارهێناوە، واتە: چوونە لایانو بەلاشیاندا ڕەت بوون : (فَأَتوا قَوْمَاً وَمَرُّوا عَلَيْهِم) لە جیاتی ئەوە، خوای کاربەجێ یەك ڕستەی بەکارهێناوە ، بەهۆی (تعدّی) پێکردنی : ﴿ فَأَتَوْاْ ﴾، بە ﴿ عَلَىٰ ﴾ بۆ لای (مفعول) ، ئەگەرنا (أتی) پێویستی بە پیت نیە (حرف) : (أتی محمدٌ) .

ئنجا ئایا ئەو قەومە کێ بوون ؟!

خاوەنی (التحرير والتنوير) دەڵێ : (والقوم هم الكَنْعَانِيون ويقال لهم عند العَرَبِ العَمَالِقَةُ ويعرفون عند متأخري المؤرخين بالفنيقيين)(١) ، واتە : گەلی کەنعانییەکان بوون کە لەلای عەرەبەکان پێیان دەگوتن : (عمالقة) واتە زۆر گەورەو بەکەلەش ، وە لەلای مێژوو زانەکانی دوایی بە (فنیقیین) ناسراون .

کە دەفەرموێ : ﴿ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ ﴾، خوێنراویشەتەوە : ﴿ يَعْكِفُون ﴾، ئنجا ئایا ئەو بتانەی کە پەرستوویانن ، چی بوون ؟!

دیسان خاوەنی (التحرير والتنوير) دەڵێ : {وقد كان البقر يعبد عند الكنعانيين، باسم (بَعْل)} واتە : مانگا لەلای کەنعانییەکان دەپەرسترا بە ناوی (بَعْل) وەك لە سوورەتی (الصافات)دا هاتوە.

ئنجا ئایا چییان گوت : کاتێك بەلای ئەو گەلەدا تێپەڕین کە بتیان دەپەرست ؟ کە بەپێی ئەوەی ڕابرد ، دەبێ بتەکە مانگا بووبێ ، یان لە شێوەی مانگادا بووبێ ، ﴿ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ ﴾، گوتیان : ئەی مووسا ! وەك چۆن ئەوانە چەند پەرستراوێکیان هەن، ئێمەش با پەرستراوێکمان هەبێ ، دیارە مووساش ؑ زۆر تووڕە دەبێ ، ﴿ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴾

---

١) ج : ٩ ، ص (٨).

فەرمووی : ئێوە کۆمەڵێکن نەفامیی دەکەن، واتە: نەفامییەکەتان هۆکاری ئەوەیە کە هاوبەش بۆ خوا ﷻ پەیدا بکەن .

کەواتە: هەمیشە نەفامیی بەرانبەر بە خوا، چاك خوا نەناسینو چاك قەدری خوا نەزانین، ئەوە دەبێتە مایەی هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردن :

١/ چاك خوا نەناسین .

٢/ چاك نەناسینی دروستکراوەکان ، کە هیچ شتێك لە نێو دروستکراوەکاندا لە ڕیزی خوا ﷻدا نیە، تا بیهێنیە ڕیزی خوا .

٣/ چاك خۆنەناسین .

٤/ چاك لە دین دا شارەزا نەبوون .

٥/ چاك لە مرۆڤ شارەزا نەبوون .

لە ڕاستییدا وشەی ﴿ تَجۡهَلُونَ ﴾ واتە: نە خوا دەناسن، نە خۆتان دەناسن، نە دروستکراوەکان دەناسن، نە لە دین دا شارەزا بوون، بۆیە نەفامیی واتان لێدەکات کە ئەو داوایە بکەن .

هەڵبەتە لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین ، کە هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان کە بەداخەوە چەمكو واتای (إلـه)یان ، لەگەڵ چەمكو واتای : (خالق) و (رب) لێك جیانەکردۆتەوە ، تووشی جۆرێك لە سەراسیمەیی بوون، گوتوویانە : باشە گەلی بەنی ئیسرائیل، گەلی مووسا ﵇ چۆن داوایان کردوە کە بەدیهێنەرێکی دیکەو پەروەردگارێکی دیکە بپەرستن ؟ وایانزانیوە گەلی مووسا کە گوتوویانە :

﴿ ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا ﴾ یانی : بەدیهێنەرێکمان بۆ پەیدا بکە (اجعل لنا خالقاً) ! کە لە ڕاستیی وانیەو هەرگیز بەنی ئیسرائیل داوایان نەکردوە بەدیهێنەریان بۆ دروست بکات، چونکە بەس یەك بەدیهێنەر هەیە، بەس خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارەو خاوەنی هەموو کەونو کائیناتە، کە ئەوە شتێکی سەلمێنراوە ، چونکە (إلـه) واتە : پەرستراو، کەواتە : گوتوویانە : پەرستراوێکمان بۆ دابنێ ، کە ئێمە بەهۆی پەرستنی ئەو پەرستراوەوە ، لە خوا نیزیك بکەوینەوە ، نەك

بەدیهێنەرو پەروەردگارێکمان بۆ دابنێ ! وەك هەندێك لە توێژەرەوان ــ خوا لێیان خۆش بێ ـ گومانیان بردووە بە پێویستی نازانم ئاماژەیان پێ بکەم .

**مەسەلەی سێیەم:** مووسا ﷺ لەسەر سەرزەنشتو سەرکۆنەکردنی گەلەکەی خۆی بەردەوام دەبێ ، وە شتیان زیاتر بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، بێگومان ئا ئەوانە ئەو حاڵەتەی کە تێیدان ، لەبەین دەچێ ، هیچ پایەو مایەیەکی نیە، وە ئەو کردەوەیەش کە دەیکەن پووچە ، نە سوودی دنیای هەیە، نە سوودی قیامەتی هەیە ، چەند سەیرە لەبەر مانگایەك بپاڕێیەوە ، کە مانگا دروستکراوی خوایە ، هەرچۆن بێ مرۆڤ لە سەرووی مانگاوەیە ! لە دارو بەردێك بپاڕێیەوە ! لە ئەستێرەو مانگو خۆرێك بپاڕێیەوە ! لە ڕووەکێك ، لە مشکێك ، لە مارێك ، وەك لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هەیە ، بەڕاستی ئەوە حاڵەتێکی بێ پایەو مایەیە ، حاڵەتێکی بێ دەرەنجامو بێ ئاکامە، وە ئەو کردەوەیەش بریتیە لە کردەوەیەکی پووچو بۆشو هیچ سوودێکی نیە .

وشەی (مُتَبَّرٌ : مُكَسَّر ، مُهْلَك) وەك پێشتریش باسمان کرد ، یانی : ئەو حاڵەتەی کە ئەوانەی تێدان ، لەبەین چووەو تێکشکاوە ، دەگوترێ : (تَبَّرَهُ وَتَبَرَهُ) واتە : (كَسَّرَهُ ، وأَهْلَكَهُ) شکاندیو فەوتاندی .

کە دەفەرموێ : ﴿ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، پێشتر باسمان کرد : باطڵ پێچەوانەی هەقە ، چونکە (حق) یانی : چەسپاو (باطل) یانی : شتی نەچەسپاو بۆشو بێ نێوەڕۆك ، کاتێك لێی ورد دەبیەوە ، دەزانی کە هیچ چەسپاوییەکی نیە .

کە دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، یانی (باطِلٌ عَمَلُهم) کردەوەکەیان پووچە، بۆشە، هیچ نێوەڕۆکێکی نیە، واتە: حاڵەتی بت پەرستیی دەوامو داهاتووی نیە ، وە کاری بتپەرستییش ، خاوەنەکەی هیچ سوودێکی لێ نابینێ.

لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هاتوە : ﴿عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ خَرَجْنَا مَعَ

رَسولِ اللَّهِ ﷺ قِبَلَ حُنَيْنٍ فَمَرَرْنَا بِسِدْرَةٍ، فَقُلْتُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ اجْعَلْ لَنَا هَذِهِ ذَاتَ أَنْوَاطٍ كَمَا لِلْكُفَّارِ ذَاتُ أَنْوَاطٍ، وَكَانَ الْكُفَّارُ يَنُوطُونَ سِلاحَهُمْ بِسِدْرَةٍ وَيَعْكُفُونَ حَوْلَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اللَّهُ أَكْبَرُ! هَذَا كَمَا قَالَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ لِمُوسَى ﴿ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞ﴾، إِنَّكُمْ تَرْكَبُونَ سَنَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُم﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٩٥٠) وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٧٠٢) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين}، واتە: ئەبو واقیدى لەیسى دەیگێڕێتەوە دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەرەو حونەین چووین، بەلاى درەختێك دا تێپەڕین، گوتم: ئەى پێغەمبەرى خوا! ﷺ با ئێمەش درەختێكمان هەبێ پەڕۆیانى پێ هەڵبواسین، وەك چۆن كافرەكان (ذَاتَ أَنْوَاط) (خاوەن هەڵواسراوەكان)یان هەیە، {درەختێك بووە شتیان پێ هەڵواسیوە بۆ پیرۆزیىو دوایی لە دەستو ملى خۆیان پێچاوە، بە حیساب بۆئەوەى شیفایان بۆ بێ}، پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى: (اللَّهُ أَكْبَر)! واتە: خوا گەورەترە، ئەوە وەك ئەوە وایە كە بەنى ئیسرائیل بە مووسایان گوت: ﴿ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞ﴾، پەرستراوێكمان بۆ دابنێ، وەك چۆن ئەو گەلە پەرستراویان هەن، (ئنجا فەرمووى): بێگومان ئێوە بەدواى ڕێو شوێنى ئەوانەى پێش خۆتان دەكەون.

واتە: كاتێك كە لە قورئانو سوننەت لادەدەن، بەدواى ڕێو شوێنى ئەوانەى پێش خۆتان دەكەون، وەك چۆن ئەوان داروبەردو پەڕۆوپاڵو شمەك ئێسكو پڕوسكیان پەرستوە، ئێوەش ئەو شتانە دەپەرستن، لە كاتێكدا كە لە قورئانو سوننەت لادەدەنو، لە جادەى شەریعەت و خوا بەیەكگرتن لادەدەن.

<u>**مەسەلەى چوارەمو كۆتایی**</u>: مووسا عليه السلام لە كۆتایی دا دەڵێ: ﴿قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٤٠ وَإِذۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُقَتِّلُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ﴾.

لە بەرانبەر ئەم دوو ئایەتەدا سێ هەڵوەستە دەکەین :

هەڵوەستەی یەکەم : کە مووسا ﷺ دەفەرموێ : ﴿أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، یانی : ئایا جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکەتان بۆ بخوازم، بۆ پەیدا بکەم، لە حاڵێکدا کە ئەو ئێوەی بەسەر جیهانییاندا بەرز کردۆتەوە ؟ واتە : بەسەر جیهانییانی سەردەمی خۆتاندا .

بۆیە جوولەکە کە ئێستا دەڵێن : (نحن شعب الله المختار) بەهەڵەدا چوون ، چونکە هەڵبژێردراوی نێو گەلانی ڕۆژگاری خۆیان بوون ، بەڵام دوای هاتنی پێغەمبەرانی دیکە، لە دوای مووسا ، دەبوایە بە دوای ئەو پێغەمبەرانە بکەونو، وە ئەو پێغەمبەرانە بەڕاست بزانن ، وێرای مووسا ﷺ ، بۆ وێنە: عیسا ﷺ هەروەها پێغەمبەرانی دیکەش ، بە تایبەتی موحەممەد ﷺ کە پێغەمبەری کۆتایی یەو پێغەمبەری هەموو بەشەرە .

هەڵوەستەی دووەم : خوای پەروەردگار قسەکە لە مووسا ﷺ وەردەگرێو ، خوا ﷻ بۆخۆی ڕوویان تێدەکاو دەفەرموێ : ﴿وَإِذْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ﴾، یاد بکەنەوە کاتێك کە ئێمە دەربازمان کردن لە شوێنکەوتووانو داروودەستەی فیرعەون کە سزایەکی زۆر خراپیان پێ دەچێشتنو زۆر بە خراپیی لێتان دەخەفتان ، سزاتان پێ بچێژن ، ﴿يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ﴾، زۆر بە سەختیی کوڕەکانتانیان دەکوشت ، لە شوێنی دیکە دەفەرموێ : سەریان دەبڕین ، وە ئافرەتەکانیشتانیان دەهێشتەوە ، وە لەوەدا تاقیکردنەوەیەکی مەزن هەبوو لە پەروەردگارتانەوە بۆ ئێوە ، کەواتە : غەیری خوا پەرستراوی بە هەق نیە، وە تەنیا خوا شایستەی پەرسترانە .

پاشان سەربارەش خوا ئێوەی هەڵبژاردوە بەسەر گەلانی سەردەمی خۆتاندا، کە پەیامی خوا بەیەکگرتنو بەندایەتیی بۆ خوا ، هەڵبگرن .

وە لـە سـوغرەو بێگـارو ئـازارو ئەشـکەنجەو قەلاچـۆکردنی داورودەسـتەی فیـرعـەون دەربـازی کـردوون، وە لـە سـووکـایەتیی کـردن بـە ئـافرەتەکـانتان کـە دەیانهێشـتنەوە بۆ خـزمەتو بـۆ پـێ ڕابواردن ، دەربازی کردوون، کەواتـە: هـەموو ئەوانە دەبێ هاندەرتـان بن، بۆ ئەوەی تەنیا خـوا بپەرسـتنو تـەنیا بـەندایەتیی بۆ خـوا بکەن ، وە چاوتـان لە بتو صـەنـەم پەرسـتیی نەبـێ .

<u>هەڵوەسـتەی سـێیـەم</u> : وشـەی ﴿بَلَآءٌ﴾ لێـرەدا چەنـد مانایـەك هەڵـدەگـرێ :

أ) تاقیـکردنەوەی خـوا بۆیـان ، بەو ئـازارو نارەحەتییـەی بەدەسـت فیـرعـەونەوە دەیانچێشـت .

ب) تاقیـکردنەوەی خـوا بۆیان ، بـەوە کە دەربـازی کـردن لـەو بـەڵاو گرفتارییـو دەردەسـەرییـانەی ، کە فیـرعـەون بەسـەری هێنـابـوون .

ج ) تاقیـکردنەوەی خـوا بۆیـان بەوە کە مەشـقو ڕاهێنـان (تدریب و تمرین) یـان پێدەکات، چونکە خـوای کاربەجێ هەر کـات ویسـتی ئەرکێـك بـە کەسـێك یـان کۆمەڵێـك بسـپێرێ ، تاقییـان دەکاتـەوەو ڕایـان دەهێنـێ، وەك فەرموویـەتی : ﴿وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ ... ﴾ البقـرة ، واتـە : یـاد بکـەوە کاتێـك پەروەردگاری ئیبـراهیـم بە چەنـد ئەرکێـك تاقـی کـردەوەو ، ئەویش تـەواوی کـردنو بـە تـەواویـی ئەنجـامی دان ، فـەرمووی : بۆ خـەڵکی دەتکەمـە پێـشـەوا ...

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شازدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان شـەش (٦) ئـایەت دەگـرێتە خۆی، ئایەتەکـانی : (١٤٢ تاکـو ١٤٧)، دیـارە لـەو شـەش (٦) ئـایەتەدا ، خـوای بـەرزو بـێ وێنـە ، باسی ڕووداوێکـی یەکجـار مەزنو سـەرسووڕهێنـەر لە ژیانی مووسادا دەکات، کە بریتیـە لـە بـەڵێنگـە (میقـات) بۆ دانـانی پـاش چـل (٤٠) شـەو، کە بچـێ بـۆ شـوێنێکی دیارییکـراو ، گفتوگـۆ لەگـەڵ خـوای بـەرزو مەزنـدا بکـات ، بـەرنامەی ژیـانی خـۆیو گەلـەکەی لێوەربگـرێ ، کـە تـەوڕات بـووە ، دیـارە مووسـا هـاڕوونی بـرای (عَلَيْهِمَـا السَّلَام) لـە شـوێنی خـۆی دادەنـێو ڕێو شوێنی بۆ دیـاریی دەکات ، کە چۆن مامەڵە لەگەڵ خەڵکەکەدا بکات .

ئنجـا کـاتێك مووسـا ﷺ پاش چـل (٤٠) شـەوو ڕۆژەکە دەگاتە شـوێنی دیارییکـراو، وە قسـە لـە خزمـەت خـوادا دەکـات، داوای لێدەکـات کـە خۆی پێشـان بـداو ببینێـ ! بـەڵام خـوا ﷻ پێـی دەفەرمـوێ : ناکـرێ بمبینێـ ! بـەڵام تەماشـای ئـەو چیایە بکە، ئنجا ئەگەر چیایەکە خۆی بۆ دەرکەوتنـی مـن گـرت ، تـۆش دەتـوانی بمبینـی ، بـەڵام کـاتێك خـوا ﷻ بۆ چیایەکە دەرکـەوت ، وردو خـاش بوو، وە مووسـاش بێهـۆش کـەوت .

ئنجا پاش هاتنـەوەی هۆش خـۆی ، داوای لێبـوردنی لـە خـوا کـردو خـوای بـە پـاك گـرت ، خـوای بـەرزو مەزن پێی فەرمـوو : کـە لە نێو خەڵکیدا (لە نێو مرۆڤایەتیی دا) ، بـە پێدانی پەیامی خۆیو ڕاستەوخـۆ فەرمایشـت لەگـەڵ کردنـی دا ، هـەڵیبـژاردووە ، پێویسـتە شوکرانە بژێـر بـێ، وە بـە تونـدییو مەحکەمیـی پەیـامی خوا بگرێ .

ئنجـا خـوای زانـا باسـی ئـەوەی کـردوە کـە چـەند لـەوحێکی بـە مووسـا داون، ئـامۆژگارییو وردەکاریی لەبارەی هـەر شـتێکەوە ، کـە بۆیان پێویسـت بـێ ، خسـتۆتە نێـو دوو توێیـانەوە ، پاشـان خـوای پەروەردگـار پێـی ڕاگـەیاندوون کـە : بـا وریـابنو

کەسانێکی خۆبە زلگرو کەللەڕەقو هەمیشە لە ناهەق خەفتاوو ، پشت لە هەق کردوو ، بە بڕواهێنان لە ئایەتەکانی خوا لایان نەدەن ، واتە خوای دادگەر وایان لێدەکات ، بەهۆی ئەو سیفەتانانەوە ، کە هەیانن، چونکە شایستەی ئیمان هێنان نین .

وە لە کۆتاییدا خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ کە : بێبڕوایان بە ئایەتەکانی خواو بە دیداری دوا ڕۆژ ، کردەوە باشەکانیان هەڵدەوەشێنەوە، وە بە پێی کردەوە خراپەکانیان سزا دەدرێن .

﴿ وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ
لَيۡلَةٗۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ
ٱلۡمُفۡسِدِينَ (١٤٢) وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ
قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا
تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ
تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (١٤٣) قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ
بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ (١٤٤) وَكَتَبۡنَا لَهُۥ فِي
ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ
قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ (١٤٥) سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ
يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا وَإِن
يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ
ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ (١٤٦) وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا
وَلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ
(١٤٧) ﴾ .

# مانای وشـە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە گفتێکی سـێ شـەوییمان بـە مووسـادا، پاشـان بـە دە شـەوی دیکـە تـەواومان کردو، کاتی دیارییکراو (بۆ دیدار)ی پەروەردگاری بوو بـە چل شـەوی تـەواو (کە لـە کۆتایی ئەو چل شـەوەدا گفتوگۆی لە خزمەتدا بکات)، وە مووسـا بـە هـارۆونی بـرای گـوت : لـە نێـو گەلەکـەمدا جێنشـینم بـە ، وە چاکسـازیی بکـەو ، بـەدوای ڕێبـازی خراپەکـاران مەکـەوە ﴿١٤٢﴾ وە کـاتێك مووسـا هـاتە بەڵێنگـە (کـاتو شـوێنی دیارییکراو)مان ، وە پەروەردگاری دواندی، گوتی : پەروەردگـارم ! خـۆتم پیشـان بـدە ، با بتبینم ؟ (خوا) فەرمووی : هەرگیز (لەم ژیانەدا) نامبینی، بەڵام تەماشای چیایەکە بکە ، ئنجا ئەگەر لە شوێنی خۆی بـە چەسپاویی ما، ئەوە تۆش دەمبینـی ، ئنجا کاتێك پـەروەردگاری بـۆ چـیایەکە دەرکـەوت ، وردو خـاشو تـەختی کـرد ، وە مووسـاش بـە بێهـۆشـیی کـەوت، وە کاتێك وەهۆش هاتەوە ، گوتی : پاکیی بۆ تۆ (خـوایە !) بـۆ لای تـۆ گـەڕامەوە، وە من یەکەمینی بڕوادارانـم ﴿١٤٣﴾ (خـوا فەرمووی : ) ئەی مووسـا ! مـن تـۆم بە پێدانی بەرنامەکانمو ئاخاوتنم بەسەر خەڵکدا ، هەڵبژاردوە، دەجا ئەوەی پێم داوی بیگرەو ، لە سوپاسگوزاران بـە ﴿١٤٤﴾ وە لە لەوحەکاندا لـەبارەی هـەر شـتێکەوە (کە بـۆ ئەوان لەو ڕۆژگارەدا پێویست بوو بێ) ، ئـامۆژگـارییمان بۆ نووسی ، وە وردەکاریی هەر شتێك (کە پێویستیان بێ ، بۆمان نووسیو پێمان گوت : ) بە توندیی بیگرە ، وە فەرمان بە گەلەکەت بکە کە باشـترینی بگرنو (کاری پێ بکەن) ، بێگومان لەمەودوا مەنزڵگای لە ڕێ دەرچووانتن پێشان دەدەم (و دەتانکەمە میـراتگریان) ﴿١٤٥﴾ لەمەودوا ئەوانـەی بـە ناهـەق لـە زەوی دا خـۆ بـە زل دەگـرن لـە (بـڕوا پێهـێنانی) ئایەتەکـانم ، لادەدەم ، وە ئەوانە ئەگەر هەرچی نیشـانەیە، ببیـنن ، بڕوایان پێ ناهێنـن، وە ئەگەر ڕێی ڕاسـتو بە ئامانج گەیەنـەر ببیـنن ، نایگـرنەبەر، بـەڵام ئەگـەر ڕێـی سەرگەردانکـەر ببیـنـن ، دەیگرنەبەر، ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە کە بڕوایان بـە ئایەتەکـانمان نـەهێناو ، لێیـان بێ ئـاگـا بوون ﴿١٤٦﴾ وە ئەوانەی بڕوایان بـە ئـایەتەکـانمـانو بـە دیـداری دواڕۆژ نەهێنـا، کـردەوە چاکەکـانیان هـەڵوەشـانەوە، ئـایا هـەر بـە پێـی ئـەوەی کـە کردوویانـە ، سزاو پاداشـت نادرێنـەوە ؟ ﴿١٤٧﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَوَٰعَدۡنَا ) : (الوَعْدُ يَكونُ في الخَيْرِ والشَّرِّ ، و فِي الخَيْر أَكْثَر)، (وَعْد) لە خێریشدا بەكاردێ لە شەڕیشدا، بەلاّم زیاتر بۆ خێرو چاكە بەكاردێ ، دەڵێ وەعدی پێداوە واتە: بۆ چاكە، بەلاّم بۆ خراپە (وَعِيدُ) هەیە (أوعَدَهُ) واتە : هەڕەشەی لێكرد (وَعِيد) هەڕەشەیە (وَعْد) بەڵێندان و گفت دانە ، بۆ شتی باش ، (موعد و میعاد) دەگونجێ چاوگ بن ، وە دەشگونجێ ناو بن .

(مِيقَٰتُ ) : (الميقَاتُ: الوَقْتُ المضْرُوبُ لِلْشَيءِ، وَالوَعْدُ الَّذِي جُعْلَ لَهُ الوَقْت)، (مِيقَات) بریتیە لە كاتێكی دیاریكراو بۆ شتێك، وە بەڵێنێك كە كاتێكی بۆ دیاریكراوە ، پێی دەگوترێ : (مِيقَات).

(ٱخۡلُفۡنِي ): (خَلَفَ فُلاَنٌ فلاَنَاً، إذا قَامَ بِأَمْرٍ عَنْهُ) كە دەگوترێ : (خَلَفَ فُلاَنٌ فلاَنَاً) واتە : لە شوێنی ئەو دانیشتوە ، وە لە جیاتی ئەو بەكارەكە هەڵساو ئەنجامی دا.

(تَجَلَّىٰ ) : (أَصْلُ الجَلْوِ: الكَشْفُ الظاهِرُ، تَجَلَّى الشيءُ : انْكَشَفَ)، (جلو) دەڵێ : بریتیە لە دەركەوتنێكی ئاشكرا ، وە (تَجَلَّى الشيءُ : انْكَشَفَ) ئاشكرا بوو، دەركەوت .

(دَكّٗا ) : (الدَكُّ : الدَقُّ ، وَقَدْ دَكَّهُ ، إِذَا ضَرَبَهُ وَكَسَرَهُ ، حَتَّى سَوّاهُ بالأَرْض) ، (دَك)، واتە: (دَق)، (دق)یش، واتە: وردكردن، وردو خاش كردن، ئارد (دقيق)یش بۆیە پێی دەگوترێ : (دقيق) چونكە وردو خاش كراوەو گەنمە هاڕدراوە ، (وَقَدْ دَكَّهُ) ئەگەر لێی بداو بیشكێنێ ، تاكو لەگەڵ زەویدا تەختی دەكات ، پێی دەگوترێ : (دَكّ) ، وەك خوا دەربارەی دواڕۆژ دەفەرموێ : ﴿إِذَا دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ دَكّٗا دَكّٗا ﴿٢١﴾﴾ الفجر، واتە: كاتێك كە زەوی تێك دەشكێنرێو تەخت دەكرێو وردو خاش دەبێ .

(وَخَرَّ مُوسَىٰ) : (خَـرَّ) ، واتــه : (سَـقَـطَ) یـانـی : لــەپەوڕوو کـەوت ، ﴿وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾، واتـه : مووسا به بێ هۆشیـی کـەوت .

(صَعِقًا) : (الصاعِقَة : هِيَ الصَّوْتُ الشَّـدِيدُ مِنَ الجوِّ ، ثُمَّ قَدْ يَكونُ فِيهـا نـارٌ فَقَـط ، أَو عَـذَابٌ أو مَـوْتٌ، وهِـيَ فـي ذاتهـا شـيءٌ وَاحِـدٌ، وهـذهِ الأَشْـيَاءُ تَأْثِيـرَاتٌ مِنْهـا)، (صـاعِقَة) بریتیـه له دەنگێکـی بـەهێـز کـه لـه ســەرێـوە ، یـان لـه هـەواوە دێ ، ئنجا جاری وا هـەیە کـە بـەس ئـاگـری تێدایـە، وە جـاری وا هـەیە دەبێتــە هـۆی ســزاو مــەرگ ، وە لـە ڕاســتییدا (صـاعِقَة) یـەك شــتە، بــەڵام شتەکــانی دیکـە دەرەنجامو کاریگـەریی ئەون ، بۆیـە لە قورئـاندا بـە مانای مردنیـش هـاتووەو ، بـە مانای ئـاگـریش بـەکارهـاتوە ، وە بـە مانـای ئـەو دەنگـە بـەهـێزەش کـە لەســەرێوە دێت، هــاتوە .

(أَفَاقَ) : (الإفَاقَـةُ: رُجُـوعُ الفَهْـمِ إِلـى الإِنْسـانِ بَعْـدَ السُّـكْرِ أو الجُنـونِ أو القُـوَّة بَعْـدَ المـرَضِ)، وشـەی (أَفَـاقَ) واتـە: هاتەوە هـۆش، دەڵـێ : (إِفَاقَة) ئەوەیـە کـە ئینسـان هۆشی بـۆ لا بگـەڕێتــەوە ، دوای ئـەوەی کـە ســەرخۆش بـووە، یـان دوای ئـەوەی کـە شێت بووە، وە هێزو پێزی بۆ بگـەڕێتـەوە ، دوای ئەوەی کـە نـەخۆش بـووە، دەڵـێ : (إِفَـاقة)ەی بۆ هـات، واتە: هێـزو پێـزی هاتەوە بـەر .

(سُبْحَانَكَ) : ئەسڵـی وشــەی (تَسْبِیح) لـە (سَبَحَ) ەوە هــاتوە : (السَّبْحُ: الـمرُّ السَّرِيعُ فـي الـمـاءِ، أو فـي الهَوَاءِ) (سَبَحَ) یانـی : تێپەڕینـی خێـرا لـە ئـاودا یاخـود له هەوادا، وە (تَسْبِیح) واتـه: بـە دوورگـرتن، بــە دوورگـرتنـی خــوا لـە هەرچـی کەموکوڕیی هەیە، لە هـەرچی هەڵەو پەڵـە هەیە .

(ٱلْأَلْوَاحِ) : کـۆی (لـوح)ە، دەڵێ : (اللَّـوْحُ: وَاحِـدُ ألـوَاحِ السَّفِينَـةِ ، ومـا يُكْتَبُ فِيـهِ مِنَ الخَشَبِ ونَحْـوِهِ)، (لَـوْح) بــە یـەکێك لـە تەختەکـانی کـە کەشــتییان لـێ دروسـت دەکـرێ (أَلــوَاحُ السَّـفِينَةِ) دەگـوتــرێ ، وە هـــەر شــتێك کــە نووســینی لەســـەر بنووسرێ، ئنجا تەختـە بـێ ، یان بـەرد بـێ ، یان هـەرچی بـێ .

(ٱلرُّشۡدِ ) : (الرَّشَدُ والرُّشْدُ: خِلاَفُ الغَيِّ، ويُستعمَلُ استعْمَالَ الهِدَايَة) هەردوو وشەی (رشَدُ) و (رُشْدُ) پێچەوانەی (غَيِّ)ن و ، وەك هیدایەت بەكاردێن ، واتە : سەرڕاستیی ، یاخود ڕێگای ڕاست گرتن، هەروەك چۆن (غِوَايَة أو غَي) واتە : سەرگەردانیی و سەرلێشێوان .

(ٱلۡغَيِّ ) : (الغَيُّ : جَهْلٌ مِنْ اعْتِقَادٍ فَاسِد) ، (غَيّ) نەفامییەكە كە لە ئەنجامی بیرو بڕوایەكی هەڵەو خراپەوە پەیدا دەبێ .

(حَبِطَتۡ ) : (أَصلُ الحَبْطِ مِنَ الحَبَطِ، وَهُوَ أن تُكثِر الدَابة أَكْلاً حَتَّى يَنتَفِخَ بَطْنُها) واتە: وشەی (حَبِطَت) لە ڕیشەوە لە (حَبَط)ەوە هاتوە، ئەویش ئەوەیە كە ئاژەڵێك لەوەڕی زۆر بخوات ، تاكو ورگی دە ئاوسێ و دوایی وەزعی تێك بچێ (إذاً : حَبِطَتْ أعمَالُهُم ، أي : بَطَلَت وذَهَبَت ، وبطُولِها : ذَهاب ثَوابِها وبطُول الأَجْرِ عَلَيْها) كەواتە : (حَبِطَتْ أعمَالُهُم) یانی: كردەوەكانیان هەڵوەشانەوەو لاچوون ، كە دیارە مەبەست لە هەڵوەشانەوەشیان ، نەمانی پاداشتیانە لەسەر كردەوەكانیان .

## مانـای گـشـتـی ئـایـەتـەکـــان

پاش دەربازبوونی بەنی ئیسرائیل، وە بوونیان بە خاوەنی ئیدارەو ئیرادەی خۆیان ، کە تەنیا لەو کاتەدا بۆیان دەگونجا ژیانو گوزەرانی خۆیان بە پێی بەرنامەی خوا ڕێك بخەن، وەك چۆن مسوڵمانان بە قیادەی پێغەمبەری خاتەم (موحەممەد) ﷺ دوای ئەوەی کە چوون بۆ مەدینە، ئنجا خوای کاربەجێ شەریعەتی بۆ ناردنە خوار، پێشتر ئەو سوورەتانەی کە لە مەککە هاتوونەتە خوار ، کە (٣/٢) قورئان پێکدێنن، زیاتر ئەوانەن کە باسی ئیمانو عەقیدەو، بوون ناسییو ، خواپەرستییو ، ڕەوشتو ئاکاری بەرزو پەسەندو ، بەسەرهاتی پێغەمبەرانو ئەوانە دەکەن، بەڵام کە چوونە مەدینە ، ئەمجار بەرنامەی حەڵاڵو حەرام ، کە چی بکەنو چۆن بکەن ؟ ئەوەیان بۆ دابەزی .

بە هەمان شێوە بەنی ئیسرائیلیش کاتێك لەبەردەستی فیرعەون بوون ، شەریعەتییان بۆ پیادە نەدەکرا، شەریعەت بڵێ : وا بکەنو فیرعەون بڵێ : نەخێر نابێ وابکەن ! بۆیان جێبەجێ نەدەکرا، وەك چۆن مسوڵمانان لە مەککە بێدەسەڵات بوونو شەریعەتیان بۆ پیادە نەدەکرا، بەڵام کاتێك بەنی ئیسرائیل لە چەنگی فیرعەون دەربازیان بووو بوونە خاوەنی خۆیان ، با لە بیابانێکیش دابێ ، مادام خاوەنی ئیدارەو ئیرادەی خۆیان بوون ، ئەو کاتە شایستەی ئەوە بوون کە بەرنامەیان بۆ دابەزێنرێو پیادەی بکەن ، بۆیە خوای زاناو کارزان ئەو کاتە بەرنامەی بۆ دابەزاندن .

خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗ ﴾، وە بەڵێنێکی سی (٣٠) شەوییمان بۆ مووسا ﵇ دانا، وە بە دە (١٠)ی دیکەش تەواومان کردن ، بۆیە بەڵێنگەی پەروەردگاری چل شەوی تەواو کرد .

واتە: ئەو کاتو شوێنەی کە دەبوو مووسا ﵇ بە خزمەت خوای پەروەردگار بگاتو ، لە خزمەتی دا قسە بکاتو ، خوای بە بەزەیی پەیامی خۆی پێ ڕابگەیەنێ ،

وە تەوڕاتی پێ بدات ، كە لەسەر لەوحەكان نووسرا بوو ، ئەوە دوای چل شەو بوو، ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾، وە مووسا بە برایەكەی خۆی هاڕوونی گوت : لە شوێنی من لە نێو گەلەكەم دابە ، وە چاكسازیی بكەو ، بە دوای ڕێبازی خراپەكاران مەكەوە .

دیارە مووسا ﷺ دڵی خەبەری داوە ، كە خراپەكارانێك هەن لە نێو بەنی ئیسرائیلدا ، ڕەنگە كێشەو ئاشووبو ئاژاوەیەك دروست بكەن ، كە ئەوە بوو وەك دوایی باسی دەكەین : سامیریی هەڵیخەڵەتاندن ، وە گۆلكێكی زێڕی بۆ دروستكردن و گوتی : ئەوە پەرستراوی ئێوەیە، دیارە مووسا ﷺ دڵی خەبەری دابووە كە شتێك دەبێ ، بۆیە بە هاڕوونی برای گوتوە : لە شوێنی من بە ، لە نێو گەلەكەمدا، وە چاكسازیی بكەو، بە دوای ڕێبازی خراپەكاران مەكەوە .

﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَ﴾، خوا ﷻ باسی ئەو بەسەرهاتە زۆر گەورەو گرنگو سەرسوڕهێنەرە دەكات، كە لە ژیانی مووسادا ﷺ بووە ، دەفەرموێ : ئنجا كاتێك مووسا ﷺ هاتە بەڵێنگەی ئێمە (ئەو كاتو شوێنەی ئێمە بۆمان دیاریی كردبوو)، وە پەروەردگاری فەرمایشتی لەگەڵدا كرد ، گوتی : پەروەردگارم ! پێشانم بدە ، تەماشات بكەم ، (واتە : خۆتم پێشانبدە ، با بتبینم)، ﴿قَالَ لَن تَرَىٰنِي﴾، (خوا) فەرمووی : بە تەئكید نامبینی ، هەرگیز نامبینی ، (واتە : لەم ژیانە دنیاییەدا) ، ﴿وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِي﴾، بەڵام تەماشای ئەو چیایە ، ئەو كێوە بكە ، ئەگەر لە شوێنی خۆی مایەوەو خۆی ڕاگرت ، ئەوە تۆش دەتوانی بمبینی {واتە : بەو جەستە بێهێزە ، بەو چاوانە ، بەو حاڵەی تۆ لە دنیادا هەتە ، وە هەموو مرۆڤەكان هەیانە ، كە خوای كاربەجێ ئەو شێوەو پێكهاتەیەی بەس بۆ ئەوەی تاقی بكرێنەوە ، پێیداون ، نەك بۆ ئەوەی خوای پێ ببینن، یان بۆ ئەوەی كە

ڕاستییەکانی هەموو پێ بزانن، بەڵکو ئەو جەستەیە هەر بایی ئەوەندەیە کە پێی تاقی بکرێنەوەو تا ڕاددەیەك دەرکی شتەکان بکەن } .

﴿ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ﴾، خوای زاناو توانا ویستی شتێك پێشانی مووساو غەیری مووساش بدات ، كە بۆچی ناتوانن خوا ببینن ؟ لەبەرئەوەی كە توانایان نیەو تەحەمولی دەركەوتنی خوای بەدیهێنەر ناكەن، دەفەرموێ : ئنجا كاتێك پەروەردگاری بۆ چیایەكە دەركەوت ، وردو خاشی كرد ، وە مووساش بێهۆش كەوت .

كەواتە : ئەگەر چیایەكی سەخت نەتوانێ بەرگەی دەركەوتنی خوای پەروەردگار بگرێ ، بەرگەی ئەوە بگرێ ، كە خوای بەرزو مەزن خۆی پێشانبدا ! ئەی مرۆڤ ! تۆ لە چیایەكی سەخت زۆر بێهێزتری ، چۆن دەتوانی ؟! بۆیە خوای بێ وێنە خۆی پێشانی چیایەكەدا ، بەڵام خۆی پێشانی مووسا نەدا .

ئنجا مووسا ﷺ تەنیا بەوە لە هۆش خۆی چوو ، كە دیمەنی چیایەكەی بینی ، كە تەحەمولی دەركەوتنی خوای نەكردو خۆی ڕانەگرت بۆ دەركەوتنی ، ئەدی ئەگەر خوای بەرزو مەزن بۆ مووسا دەركەوتبایە ، دەبوو چی لێهاتبا ؟! ئەوە تەنیا بە دیتنی دیمەنی چیایەكە كە خوا خۆی پێشانداوە ، خۆی ڕانەگرتو لە هۆش خۆی چوو، ئەدی ئەگەر ڕاستەوخۆ خوای پەروەردگاری بینیبایە ! ﴿ فَلَمَّآ أَفَاقَ ﴾، ئنجا كاتێك مووسا هاتەوە هۆش یانی : هۆشی هاتەوە لای ، دوای ئەوەی بە دیتنی دیمەنی چیایەكە لە هۆش خۆی چوو بوو، هەندێكیش دەڵێن : ﴿ وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ﴾، بە مردن لێك دەدەنەوە ، واتە: دوای ئەوەی كە مرد بوو، بەڵام واپێدەچێ لە هۆش خۆی چوو بێ‌و نەمردبێ ، بەڵێ كاتێك هاتەوە هۆش خۆی‌و عەقڵی گەڕایەوە لای ، ﴿ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ ﴾، گوتی: پاكیی بۆ تۆ، واتە: پاكیی بۆ تۆ ، ئەی پەروەردگارم ! كە بە چاوی سەر لە دنیادا ببینرێی ﴿ تُبْتُ إِلَيْكَ ﴾، من پەشێمان بوومەوە بۆ لای تۆ، گەڕامەوە بۆ لای تۆ، كە جارێكی دیكە داوای ئاوا

نەکەم، ﴿ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، وە مـن یەکەمینـی بڕوادارانـم، واتـە: یەکـەمینی بـڕوادارانم کـە خـوا ﷻ لـە دنیـادا بـە چـاوی سـەر نـابینرێ، یاخـود مـن یەکـەمینی بڕوادارانـم کە هـەرچی تۆ بیفـەرمووی ، وایـە .

دیـارە مووسـا عليه السلام یەکـەمینی بڕوادارانـی ئۆممـەتەکـەی خـۆی بـووە ، وە هـەمـوو پێغـەمبـەرێك هـەر وابـووە .

ئنجا خـوا ﷻ باسـی شـتێکـی دیکـە دەکـات : ﴿ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي ﴾، (خـوا) فـەرمووی : ئـەی مووسـا ! من تۆم بەسـەر خەڵکدا هـەڵبژاردوە ، بـەهـۆی پەیامەکـانی خۆمـەوە، کە بـە تۆم داون، ﴿ وَبِكَلَٰمِي ﴾، وە بەهـۆی فەرمایشـتی خۆمـەوە لـەنێو هـەموو خەڵکـدا تـەنیا تـۆم هـەڵبژاردوە ، ڕاستەوخـۆ فەرمایشـتت لەگەڵا بکەمو بتـدوێنم ، ﴿ فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾، دەجـا ئـەوەی پێمـداوی ، وەریبگـرە، وە لە شـوکرانە بژێرانو سـوپاسـگوزاران بـە، یـانـی : قـەدری نیعمـەتی خـوا بزانـە ، کەمـت وەرنەگـرتوە ، تاکـو داوای هـی دیکـەش بکـەی ! ئـەوەی کـە بـە تـۆم داوە ، بـە کەسـم نـەداوە ، بـەتایبـەت ئـەوە کـە خـوا ڕاستەوخـۆ فەرمایشـتی لەگـەڵ مووسـا عليه السلامدا کـردوە ، هـەڵبـەتە پێغـەمبـەری خـاتەمیش خـوای پەروەردگـار لـە شـەوی (المعـراج)دا فەرمایشـتی لەگـەڵدا کـردوە، بـەڵام مووسـا عليه السلام دیـارە وەك عـادەت ، چـەند جـار فەرمایشـتی لەگـەڵ خـوای کـارزان دا کـردوە ، نـەك تەنیـا یەکجار ، وەك پێغـەمبـەری خـاتەم موحەممەد ﷺ، وە دەشـگونجێ سـیفەتێك لـە کەسـێکدا هەبـێ ، کە کەسـێکی لەوی چاکتـر بـێ ، بـەڵام ئـەو سـیفەتێکی هەبـێ کە لە چاکتـرەکـەدا نەبـێ، بۆیـە دەگونجـێ سیفەتێك لە بەسـەرداهەڵبـژێرراو (مفضـول)دا هەبێ ، لـە باشـتـر (أفضـل) دا نەبـێ ، دەنا پێغـەمبـەری خـاتەم ﷺ، بـە تەئکید لە مووسا گـەورەتـرەو سـەرووەری پێغـەمبـەرانە ، بـەڵام خـوای پەروەردگـار ئـەو سـیفەتەی تایبـەت کـردوە بـە مووسـاوە عليه السلام، کـە وەك گـوتـم بـە بـەردەوامیـی هـەر کـاتێك پێویست بوو بـێ ، خـوای بـێ هـاوتـا فەرمایشـتی لەگەڵـدا کـردوە .

ئنجا خوا دەفەرموێ : ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ ﴾، {دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین ، ئەو لەوحانە چی بوون ؟} ﴿ ٱلْأَلْوَاحِ ﴾، کۆی (لوح)ە، (لوح)یش واتە : تەختە ، ئنجا تەختە بەرد بێ ، تەختە دار بێ، هەرچی بێ، واتە : لە لەوحەکاندا ئامۆژگارییمان لەبارەی هەموو شتێکەوە بۆ نووسیبوو، ﴿ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ ﴾، وە لەبارەی هەموو شتێکەوە زۆر وردەکارییمان بۆ نووسیبوو، یەکێ بۆی هەیە بڵێ : ئایا ئەو تەوراتەی کە ئێستا هەیە وردەکاریی دەربارەی هەموو شتێك تێدایە ؟ دەڵێین : دەگونجێ تەورات وەك خۆی مابێتەوە، وە دەگونجێ زۆر لە وردەکارییەکان گۆڕدرابن و نەمابن ، بەڵام ئەگەر تەورات وەك خۆشی مابێتەوە ، ئەو وردەکاریيانەی کە لە تەوراتی ئێستادا هەن، ئەوە دەربارەی هەموو شتێك بووە ، کە ئەو کاتە ئەوان پێویستیان پێیان بووە .

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ ﴾، بەهێزو بە جیددیی لەوحەکان وەربگرە، یانی : بە گرنگیی پێدانەوە تێیان بگەو کاریان پێ بکە ، ﴿ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا۟ بِأَحْسَنِهَا ﴾، وە فەرمانیش بە گەلەکەت بکە ، با باشترینی فەرمانەکانی کە لەو لەوحانەدا هاتوون ، کاریان پێ بکەن، واتە: ئەگەر باش و باشتریان هەبێ ، کار بە باشترینەکەی بکەن، بۆ وێنە: ئەگەر کەسێك قسەیەکی پێ گوتی ، بۆت هەیە پێی بڵێیەوە ، ﴿ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ﴿٤٠﴾ ﴾الشورى، بەڵام ئەگەر پێی نەڵێیەوە باشترە ، ﴿ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ﴿٤٠﴾ ﴾ الشورى ، کەواتە : ئەوان با ئیش بە باشترینەکەی بکەن ، وە هەروەها لە هەر شتێکی دیکەدا کە باش و باشتر هەبێ ، با ئیش بە باشترەکەی بکەن، ﴿ سَأُو۟رِيكُمْ دَارَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴾، لەمەودوا جێگاو ڕێگاو خانوو بەرەی لە ڕێی دەرچووەکانتاندا پێشان دەدەم ، کە مەبەست پێی فیرعەون و داروودەستەکەیەتی ، یاخود مەبەست پێی ئەو گەل و

کۆمەڵگایانەن ، کە بەنی ئیسرائیل شوێنەکانیان دەگرن ، ﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، وە بە تەئکید ئەوانەی بە ناهەق لە زەوی دا خۆ بە زل دەگرن ، لە ئایەتەکانی خۆمیان لادەدەم، واتە: ناهێڵم ئیمانیان پێ بێنن . ﴿ وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَا ﴾، وە ئەگەر هەر موعجیزەو نیشانەو بەڵگەیەك ببینن ، ئیمانیان پێ ناهێنن ، ﴿ وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ﴾، وە ئەگەر رێی راستو دروست ببینن ، نایگرنەبەر ، ﴿ وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ ٱلْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ﴾، بەلام ئەگەر رێی گومراییو سەرگەردانیی ببینن ، ئەو رێیە دەگرنەبەر.

کەواتە : کەسانێکی ئاوان کە خوا دەفەرموێ : لە ئایەتەکانی خۆم لایان دەدەمو ناهێڵم ئیمانیان پێ بێنن، چونکە شایستە نین، بەخۆیانو بەو هەموو سیفەتە خراپانەوە شایستەی ئەوە نین ، کە ئیمان بە ئایەتەکان بێنن .

لەمەشەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئینسانی ئیماندار دەبێ هەوڵبدات رازاوە بێ بە سیفەتی بەرزو جوان، ئەگەرنا ئیمان ناچێتە هەموو دڵو دەروونێکەوە ، دەبێ ئینسان دڵو دەروونی خۆی پاك بکاتەوە، دڵو دەروونی خۆی برازێنێتەوە بە سیفەتی بەرزو جوان ، ئنجا شایستەی ئەوە دەبێ کە ئیمانێکی باش لە دەروونییدا بچەسپێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنْهَا غَٰفِلِينَ ﴾، یانی : ئەو سیفەتە خراپانەیان بۆیە تێدا پەیدا بوون، کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانا، وە لە ئایەتەکانی ئێمە بێ ئاگا بوون .

کەواتە : کەسانێك کە خاوەنی ئەو سیفەتە خراپانەن ، شایستەی ئەوە نابن کە بڕوا بە ئایەتەکانی خوای پەروەردگار بێنن، وە لە ئەنجامی ئەوەدا ، خوا لایان دەدا ، لەوەی کە بڕوا بە ئایەتەکان بێنن .

﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ ﴾، وە ئەوانەی كە ئایەتەكانی ئێمە بە درۆ دادەنێن، وە دیداری دواڕۆژ بە درۆ دادەنێن ، واتە : بڕوایان نە بە ئایەتەكانی خوا هەیە، نە بەوە كە بە دیداریی خوا دەگەن ، لە دواڕۆژدا ، ﴿ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ ﴾، ئا ئەوانە كردەوەكانیان هەڵدەوەشێنەوە ، واتە : كردەوە باشەكانیان هەڵدەوەشێنەوە، كەواتە: بێبڕوایی دەبێتە هۆی ئەوەی ئینسان ببێتە سەپانی پووشێ، بێبڕوایانیش كردەوە باشەكانیان هەڵدەوەشێنەوەو بۆیان حیساب ناكرێن، چونكە ئیمان وەك بناغە وایە، دیواریش لەسەر بناغە دادەنرێ‌و كەسێك ئیمانی نەبێ ، كردەوە باشەكانی وەك دیواری بێ بناغە وانو دەڕووخێت .

هەروەها دەگونجێ بڵێین : ئیمان وەك هەوێن وایە، كردەوە باشەكانیش وەك شیر وان، شیرێك هەوێنی تێنەكرێ ، نابێتە ماستو نامەیێ.

وە دەگونجێ بڵێین : ئیمان وەك ڕووح وایەو، كردەوە باشەكانیش وەك جەستە وان، ئنجا جەستەیەك كە ڕووحی تێدا نەبێ نـاژی.

لە كۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ :﴿ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ ئایا جگە لەوەی كە دەیانكرد ، بە شتێكی دیكە سزاو پاداشت دەدرێنەوە ؟! واتە: هەر بەوە سزا دەدرێن كە دەیانكرد، ئەوانیش كردەوەكانیان خراپ بوون، بۆیە خوای كارزانو دادگەر بەو شێوەیە سزای داون .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ : ﴿ وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ ﴾، بەڵێنمان بە مووسا دا بۆ ماوەی سی (٣٠) شەو، {واتە: گوتمان: دوای سی (٣٠) شەو ، وەرە بۆ فلان کاتو شوێنە، لەوێ گفتوگۆ لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بکە} دوایی سی (٣٠) شەوەکەمان تەواو کرد، بە دە (١٠)ی دیکەش ، ئیدی کاتو شوێنی دیداری پەروەردگاری ، ماوەکەی بە چل (٤٠) شەو تەواو بوو .

زانایانو توێژەرەوانی قورئان ڕحمەتی خوایان لێ بێ ، لەبارەی ئەوەوە کە بەڵێنی گفتوگۆی مووسا لەگەڵ خوادا : (٣٠ شەو + ١٠ شەو = ٤٠ شەو)، یانی : سی (٣٠) شەو بووە دوایی دە (١٠)ی بۆ زیاد کراوەو بۆتە چل (٤٠)، زۆریان قسە کردوە، وە زۆرشتیان هێناوە ، بەڵام هەموو ئەو شتانە لە سەرچاوەکانی خاوەن کتێبانەوە هاتوون، بەتایبەت لە هی جوولەکەو نەصرانییەکانەوە، بۆیە جێی پشت پێ بەستن نین، بەڵام بۆ بەرچاوڕوونیی ، یەکێکیان بە نموونە دێنم کە (القرطبي) هێناویەتی ، وە زۆربەی تەفسیرەکانی دیکەش هێناویانە: (قَالَ ابْنُ عَبَّاس وَمُجَاهِد وَمَسْرُوق رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ : هِيَ ذُو القَعدَة وَعَشْرٌ مِنْ ذِي الحِجَّة ، أَمَرَهُ أَنْ يَصُومَ الشَّهْرَ وَيَنْفَرِدَ فِيهِ بِالعِبَادَة، فَلَمَّا صامَهُ أَنْكَرَ خُلُوفَ فَمِهِ فَاستاك، فَقَالَتِ المَلائِكَةُ : إِنَّا كُنَّا نَستَنْشِقُ مِنْ فِيكَ رَائِحَةَ المِسْكِ فَأَفْسَدْتَهُ بِالسِّواكِ، فَزِيدَ عَلَيْهِ عَشْرُ لَيَالٍ مِنْ ذِي الحِجَّة، وَقِيلَ : إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى أَوْحَى إِلَيْهِ لَمَّا استاكَ : يَا مُوسَى لا أُكَلِّمُكَ حَتَّى يَعُودَ فُوكَ إِلَى مَا كَانَ عَلَيْهِ قَبْلُ، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ رَائِحَةَ الصائِمِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ رِيحِ المِسْكِ ؟ وَأَمَرَهُ بِصِيَامِ عَشْرَةِ أَيَّام، وَكَانَ كَلامُ اللَّهِ تَعَالَى لِمُوسَى ﷺ غَدَاةَ النَّحْرِ حِينَ فَدَى إِسْمَاعِيلَ مِنَ الذَّبْحِ)[1]، واتە : عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسو موجاهیدو مەسرووق (کە دیارە ئەو دووانەیان لە

١) الجامع لأحكام القرآن : ج ٧، ص ٢٢٢ .

زانایانی تابیعـیـنن) خـوا لـێیان ڕازی بـێ، گوتوویانـە: ئـەو (٤٠) شـەوە : مـانگی (ذُو القَعِدَة) بـووە، لەگـەڵ (١٠)ی (ذِي الحِجَّة) خـوای بـەرز فـەرمانی پێکـردوە کـە مانگێك بـەڕۆژوو بـێو خـۆی یەکلابکاتەوە بۆ پەرستنی خوا، کاتێك کە مانگـەکە بـەڕۆژو بووەو هـەر خەریکی خـوا پەرستیی بووە ، تامی زاری گـۆڕاوە ، ئـەویش پێی ناخۆش بووە کـە تـامی زاری بگـۆڕێو ، ئـاوا بـە زارێکـی بـۆن گـۆڕاوەوە فەرمایشـت لەگـەڵ خـوای پەروەردگـاردا بکـات ، بۆیـە سـیواکی کردوە، (واپێدەچـێ لە ماوەی ئەو (٣٠) شـەوەدا شـتی نەخـواردبـێ) فریشـتـەکان گوتیـان : ئێمە بۆنی میسکمان لە زاری تۆ دەکرد، بـەڵام بـەو سیواك کردنەت بـۆنی زاری خـۆت تێکدا، بۆیـە دە (١٠) شــەوی دیکـەی لە مانگی (ذِي الحِجَّــة) بۆ زیاد کرا {سی (٣٠) شـەوی (ذي القعـدة) لەگـەڵ دە (١٠) شـەوی (ذِي الحِجَّة) ئـەوە چـل (٤٠)}، وە گـوتراوە : خـوای بـەرز کاتێـك مووسا سیواکـی کـرد ، وەحـی بـۆ مووسـا نـارد فـەرمووی : ئـەی مووسـا ! قسـەت لەگـەڵ ناکـەم تاکو بۆنـی زارت وەك پێشـێـی لـێ نەیەتـەوە ، ئـایا نـازانی کـە بـۆنی زاری ڕۆژووەوان لە لای من خۆشـەویسـتـتـرە لـە بۆنـی میسك ؟ وە فـەرمانی پێکـرد بـە ڕۆژووگرتنــی دە (١٠) ڕۆژی دیکـە، وە فەرمایشــت کردنـی خـوای بـەرز لەگـەڵ مووسـادا ، لە بـەرەبـەیانی ڕۆژی قوربانیـی سـەربڕین دابوو، ئەو کاتە کە ئیسـماعیل ئەو بـەرانەی بۆ نێـرراو لە سـەربـڕان لە لایـەن باییـەوە ، دەربازی بوو.

منیـش دەڵێـم : ئەگـەر ڕۆژی (١٠)ی (ذِي الحِجَّــة) بووبـێ ، کـەواتە : بۆتە سـیو نـۆ (٣٩) ڕۆژ ، مەگـەر ڕۆژی دوای سـەربڕین (النحـر) بووبـێ، چونکـە ڕۆژی (النحـر) (١٠)ی (ذِي الحِجَّة)ەیـە .

شـایانی باسیشـە کە لە سـووڕەتی (البقـرة)دا خـوا ﷻ باسـی ئـەوەی نـەکردوە ، کـە سی (٣٠) شـەو بوو بێو دوایی دە (١٠) دیکەشـی لـێ زیـاد کـرا بـێو بووبێتـە چـل (٤٠) ، بـەڵکو یەکسـەر باسی چـل (٤٠) شــەوەکە کـراوە ، وەك دەفـەرموێ : ﴿ وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ

وَٱلۡفُرۡقَانَ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿٥٣﴾﴾، واتە : وە یاد بکەنەوە (ئەی بەنو ئیسرائیل !) کە بەڵێنێکی چل (٤٠) شەوییمان لەگەڵ مووسادا دانا ، کەچی ئێوە (دوایی کە مووسا هات بۆ گفتوگۆ لەگەڵ خوادا )هەتا گەڕایەوە لاتان ، گۆلکتان پەرست ، (کردتانە پەرستراو) لە حاڵێکدا کە ئێوە ستەمتان لەخۆتان کردبوو ، کەچی دوای ئەوەش ، لەوە لێمان بوردن ، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن ، (دیارە لێبوردنەکەش بەسەرهاتێکی هەیە ، دوایی باسی دەکەین، لێرەدا بە کورتی فەرموویەتی) ، وە یاد بکەنەوە کاتێك کە کتێبو فورقانمان بە مووسادان، (واتە : تەوراتمان پێدا کە هەقو ناهەقو ، حەڵاڵو حەرامو ، چاكو خراپی لێك جیا دەکردەوە) ، بۆ ئەوەی ڕێگای ڕاست بگرن .

دیارە لە هەر کام لە ئایەتەکانی (الأعراف) و (البقرة)شدا بە ڕوونیی دەزانرێ ، کە وەرگرتنی کتێب، (واتە: تەورات) لە لایەن مووساوە هەر لەو سەفەرەیدا بووە ، کە هەتا گەڕاوەتەوە ، بەشێکی زۆری گەلەکەی دەستیان بە گۆلك پەرستیی کردوە، بەڵام بۆچی لە سووڕەتی (البقرة)دا بەس بە کورتییو ئاماژە باسکراوە ؟! وەڵامەکەی ئەوەیە کە لە سووڕەتی (البقرة)دا خوای پەروەردگار تەنیا شتەکان دەخاتەوە بیر بەنی ئیسرائیل ، ئاشکرایە کە سووڕەتەکانی قورئان بەپێی ڕیزبەندیی موصحەف نین ، بەڵکو سەرەتا سووڕەتی (الأعراف) هاتۆتە خوارێو ئەو وردەکارییانەی تێدا بوون ، بۆیە لە سووڕەتی (البقرة)دا خوای زاناو توانا بە پێویستی نەزانیوە ، ئەو درێژەیەی لە سووڕەتی (الأعراف)دا هاتوە ، لە (البقرة)دا دووبارەی بکاتەوە ، بەڵکو بەس بیری خستوونەوە .

ئنجا ئایا حیکمەتی ئەو (٣٠ + ١٠) چی بووە ؟ واتە : کە خوای پەروەردگار پێشێ فەرموویەتی (٣٠)و ، دوایی (١٠) دیکەی لێ زیاد کردوە ؟

لە وەڵام دا دەڵێین : کارەکانی خوا هیچیان بێ حیکمەت نین ، بەڵام مەرجیش نیە ئێمە هەموو حیکمەتەکان بزانین، وە دەگونجێ حیکمەتەکەی تاقیکردنەوەی بەنی ئیسرائیل بوو بێ ، کە مووسا لە ئەنجامی ئەوەدا ، دە شەوی زیادەی پێچوە، چونکە مووسا دیارە لە سەرەتای سی (٣٠) شەوەکەوە ، چۆتە کێو ، لەوێ بە تەنیا خواپەرستیی کردوە ، دوایی کە خوای پەنهانزان دە (١٠)

شەوی دیکەی بۆ زیاد کردوە ، هەڵبەتە بەنی ئیسرائیل چاوەڕێ بوون ، کە دوای سی (٣٠) شەوەکە بگەڕێتەوە بۆ لایان ، چونکە گوتوویەتی : مانگێکم پێ دەچێ ، بەلام چل شەوی پێچوە ، وە ئەو گۆلك پەرستیی یە ، واپێدەچێ لە ماوەی ئەو دە رۆژ زیادکردنەدا بووبێ، چونکە مێژوو دەڵێ : سامیریی‌و هەندێك لە ئاژاوەچییەکان گوتوویانە: مووسا هەر ڕەنگە ون بووبێ‌و نەمابێ ! با چیدیکە چاوەڕێی نەکەین ، وەرن با پەرستراوێکی دیکە بۆخۆمان پەیدا بکەین، وە گوتوویانە : مووسا چووە لە خوای خۆی بگەڕێ ، بەلام نەیدۆزیوەتەوەو ڕەنگە هەر فەوتا بێ ، ئەگەرنا ناگونجێ دە (١٠) شەوی زیادی پێ بچن ، لەو مەوعیدەی کە بۆی داناوین ! بەڵێ ڕەنگە ئەو دە (١٠) شەو زیادکردنە بۆ تاقیکردنەوەی بەنی ئیسرائیل بووبێ ، کە بەداخەوەش زۆربەیان لە تاقیکردنەوەکە دەرنەچوون .

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ : ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾، وە مووسا بە هاڕوونی برای فەرموو : لە شوێنی من لە نێو گەلەکەمدا جێنشینم بە ، وە چاکسازیی بکەو بە دوای ڕێبازی خراپەکاران‌و ئاژاوە چییان مەکەوە .

﴿ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي﴾ ، دەڵێ : (خَلَفَهُ : قَامَ بِأَمْرِ بَعْدَهُ ) (خَلَفَهُ) واتە : لە جێی ئەو کاروباری بەڕێوەبرد ، بووە خەلیفەی ، واتە : لە شوێنی ئەو کارەکانی هەڵسوڕاند.

کە دەفەرموێ: ﴿وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾، وەك پێشتریش باسمان کردوە ، دیارە مووسا دڵی خەبەری داوە ، کە لە نێو بەنی ئیسرائیلدا کەسانێکی ئاژاوە چیی‌و خراپەکار هەن ، دەیانەوێ هەتا ئەو دەگەڕێتەوە بە لارێیاندا بەرن‌و تووشی سەرگەردانیی‌و خراپەکارییان بکەن ، بۆیە فەرموویەتی : چاکسازیی بکە ، وە وریا بە بە دوای ڕێبازی خراپەکاران مەکەوە، ئەم دووە ، واتە : چاکسازیی کردن‌و نەکەوتنە شوێن خراپەکاران ، دوو کارو ئەرکی گەورەو گرنگی بەرپرسانن ، کە دەبێ لەنێو خەڵکێك دا کە بەرانبەریان بەرپرسیارن ، ئەنجامیان بدەن .

ئنجا لێرەدا شیعەی دوازدە ئیمامیی ، ئەو قسەیەی مووسا ، کردوویەتی : وە ئەوە کە مووسا هارۆونی لە شوێنی خۆی کردۆتە جێنشین، لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی تەبووکدا بە (عەلی کوڕی ئەبی طالیب)ی فەرموو : (لە جێی من بە ، وەك چۆن هارۆون لە جێی مووسا بوو) ئەوە دەکەنە بەڵگە کە (علي) (خوای لێ ڕازی بێ) لە دوای موحەممەد پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئیمامی مسوڵمانانەو خەلیفەی بە هەقە، وە ئەو سێ جێنشینەی دیکە : (أبو بکر ، عُمَر ، عثمان) خوا لێیان ڕازی بێ ، جێنشینایەتیی‌و حکومڕانییان لە (علي) داگیر کردوە !

ئنجا با تەماشا بکەین داخۆ ئەو قسەیە ئەگەر لە مەحەکی بدەین ، چەند دەردەچێ ؟ ﴿عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ، قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ لِعَلِيٍّ حِينَ خَلَّفَهُ فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ : أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى ، إِلاَّ أَنَّهُ لا نَبِيَّ بَعْدِي﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (١٥٤٧) ، وَالبُخَارِيُّ برقم : (٣٥٠٣) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٢٤٠٤) ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم : (٣٧٣١) ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (١١٥)}، واتە : سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص دەڵێ : گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بە عەلی فەرموو : کاتێك کە لە هەندێك لە جەنگەکانیدا کردی بە جێنشینی خۆی ، ( ئەو جەنگەش جەنگی تەبووك بووە ، وەك لە شوێنی دیکەدا هاتوە) ، پێی فەرموو: ئایا ڕازی نابی کە بۆ من وەك هارۆون بی بۆ مووسا، بەڵام لە دوای من هیچ پێغەمبەر نین ؟

واتە: وەك چۆن مووسا کە چووە بۆ میقاتی خوای بەرزو مەزن ، هارۆونی برای لە جێگای خۆی داناوە، منیش کە دەچم بۆ ئەو جەنگە ، تۆ لە شوێنی خۆم دادەنێم ، بەڵام لە دوای من هیچ پێغەمبەر نین، بۆ ئەوەی خەڵك وا نەزانێ کە وەك چۆن هارۆون پێغەمبەر بووەو لە جێی مووسا دانیشتوە (علي)ش وایە .

ئنجا (القرطبي) لە بەرپەرچدانەوەی ئەو قسەیەی شیعەکاندا ، قسەیەکی زۆر جوان‌و بەجێ دەکات، دەڵێ : (فَاستدَلَّ بِهَذَا الرَّوَافض وَالإِمَامِيَّةُ وَسَائِرُ فِرَقِ الشِّيْعَةِ عَلَى أَنَّ النَّبِيّ ﷺ استخْلَفَ عَلِيّاً عَلَى جَمِيعِ الأُمَّةِ، حَتَّى كَفَّرَ الصَّحَابةَ الإِمَامِيّةُ (قَبَّحَهُمُ الله) لأَنَّهُمْ عِنْدَهُمْ تَرَكُوا العَمَلَ الَّذِي هُوَ النص عَلَى

استخْلافِ عَلِيّ وَاستخْلَفُوا غَيْرَهُ بالإجْتِهادِ مِنْهُمْ، وَمِنْهُمْ مَنْ كَفَّرَ عَلِيًّا إذْ لَمْ يَقُمْ بطَلَبِ حَقِّهِ، وَهَؤلاءِ لا شَكَّ فِي كُفْرِهِم ، وَكُفْرِ مَنْ تَبَعَهُمْ عَلَى مَقَالَتِهِم، وَلَمْ يَعْلَمُوا أنَّ هَذَا استخْلاَف فِي الحَيَاةِ ، كالْوَكَالَةِ الَّتِي تَنْقَضِي بعَزْلِ الموَكِّلِ أَو بمَوْتِهِ، وَلا يَقْتَضِي أَنَّهُ مُتَمَادٍ بَعْدَ وَفَاتِهِ، فَيَنْحَلُّ عَلَى هَذَا مَا تَعَلَّقَ بهِ الإمَامِيَّةُ وَغَيْرَهُم. وَقَدِ استخْلَفَ النَّبِيّ ﷺ عَلَى المدِينَةِ ابْنَ أُمّ مَكْتُومٍ وَغَيْرَهُ، وَلَمْ يَلْزَم مِنْ ذَلِكَ استخْلاَفَهُ دَائِمَاً بالإتِّفَاق)[1] ، هەڵبەتە قسەکانی زۆر بەهێزن، هەرچەندە توندییەکی تێدایە ، کە من ڕام لەگەڵیدا نیە .

دەڵێ : ڕافیزەکان، وە شیعە دوازدە ئیمامییەکان، وە باقی دەستەکانی دیکەی شیعەکان ، بەڵگەیان بەمە هێناوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ عەلی لەسەر هەموو ئۆممەت کردوە بە پێشەوا، وە لە ئەنجامی ئەوەدا شیعەی دوازدە ئیمامیی ـ خوا ناشیرینیان بکات ـ هاوەڵانی بەڕێزیان بە کافر داناوە ! چونکە بەلای شیعەی دوازدە ئیمامییەوە ، هاوەڵان ئیشیان بەمە نەکردوە ، کە دەقە لەسەر ئەوەی عەلی لە دوای پێغەمبەر خەلیفەیە (بە بۆچوونی وان) وە هاوەڵان هەڵساون بە ئیجتیهادو بۆچوونی خۆیان ، یەکێکی دیکەی جیا لە عەلییان کردوە بە جێنشین ، وە هەر لە شیعەش هەیە کە (عەلی)یشی بە کافر داناوە ، گوتوویانە : چونکە ئەویش بە دوای هەقی خۆی نەکەوتوەو ئیشی ، بەو هەقە نەکردوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی داوە، {ئنجا (القرطبي) دەڵێ :} (وَهَؤلاءِ لا شَكَّ فِي كُفْرِهِم ، وَكُفْرِ مَنْ تَبَعَهُمْ عَلَى مَقَالَتِهِم) یانی : ئەوانە هیچ گومان نیە لە کوفریاندا ، هەروەها هەر کەسێکیش کە لەو قسەیان دا شوێنیان بکەوێ ، دیسان گومان لە کوفری دا نیە.

(بەلام دیارە ئەوە توندیی‌و زێدە ڕۆییی تێدایە ،چونکە ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت بەگشتی ، شیعە بە کافر دانانێن، بەلام بە گومڕاو سەرگەردان‌و سەرلێشێواویان دادەنێن) ، {دوایی (القرطبي) بەرپەرچیان دەداتەوە دەڵێ :} بەلام ئەوانە نازانن کە ئەوەی پێغەمبەر لەگەڵ (علي)دا کردوویەتی : جێنشین دانانە لە کاتی ژیاندا ، وەك وەکالەت ، کە هەر کاتێك وەکیل دانەر (مۆکِّل)

---

١) الجامع لأحكام القرآن : ج ٧ ، ص ٢٢٤ .

وەکیل (مۆکَّل)ەکەی خۆی لابرد، یاخود وەفاتی کرد، ئەوە کۆتایی بە وەکالەتەکەش دێ ، وە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە لە دوای وەفاتیشی هەر بەردەوام دەبێ ، بۆیە ئەوەی کە شیعەی دوازدە ئیمامیی دەستیان پێگرتووە ، پەنایان پێبردووە ، بەڵگەیان پێ هێناوەتەوە ، هەڵدەوەشێتەوە .

دوایی نموونەیەك و بەڵگەیەکی جوان دێنێتەوەو دەڵێ : (وَقَدِ اسْتَخْلَفَ النَّبِيّ ﷺ عَلَى المدِينَةِ ابْنَ أُمّ مَكْتُومٍ وَغَيْرَهُ ، وَلَمْ يَلْزَم مِنْ ذَلِكَ اسْتِخْلافُهُ دَائِماً بالإتِّفَاق) ، واتە : پێغەمبەری خوا عەبدوڵلای کوڕی ئوممی مەکتووم (کە هاوەڵێکی کوێر بووە) لە مەدینەدا لە شوێنی خۆی داناوە ، هەروەها جگە لەویشی داناوە ، بەڵام ئەوە لێی نەفامراوەتەوەو ئەوە ناگەیەنێ کە لە دوایش هەر جێنشینایەتییەکە هەر بەردەوام بێ ، ئەوە بە یەك دەنگیی هەموو زانایان وایە .

دیارە بەڵگەکەی زۆر بەهێزە، وە ئەوەی شیعە پەنایان پێبردوە ، وەك ئەوەیە کە دەڵێ : کەسێك بە ڕووباری داچوو ، دەست بۆ چڵە پووشیش دەبات !

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، کاتێك مووسا بۆ کاتی دیارییکراوو شوێنی دیاریکراوی ئێمە هات ، وە پەروەردگاری گفتۆگۆی لەگەڵدا کرد ، گوتی : پەروەردگارم پێشانم بدە تەماشات بکەم ، خوا فەرمووی : هەرگیز ناتوانی بمبینی (واتە : ئێستا لەم ژیانی دنیایەدا) بەڵام تەماشای ئەم چیایە بکە، ئەگەر لە شوێنی خۆی چەسپاو مایەوە ، تۆش دەتوانی بمبینی ، ئنجا کاتێك پەروەردگاری بۆ چیایەکە دەرکەوت ، وردو خاشی کرد، وە مووساش بێهۆش کەوت ، کاتێك هاتەوە هۆش گوتی : پاکیی بۆ تۆ ، بۆلای تۆ گەڕامەوە، وە من یەکەمینی بڕوادارانم .

لەبەردەم ئەم ئایەتەدا نۆ (٩) هەڵوەستە دەکەین :

هەڵوەستەی یەکەم : دیارە مووسا عليه السلام پاش قسەکردنی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا ، تامەزرۆیی بۆ نیزیکی لە خوا زیاتر بووە، بۆیە ئەو داوایەی کردوە، ئنجا کە ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ خوای تاك‌و پاك دا کردوە ، ئایا چۆن فەرمایشتی خوای بیستوە ؟ ئەوە هەر خوا بۆخۆی دەزانێ ، بەڵام دیارە لە ئەنجامی ئەو قسەکردنەدا ، زیاتر تامەزرۆیی بۆ پەیدابووە، بۆیە داوای کردوە کە بیشیبینێ .

هەڵوەستەی دووەم : کە مووسا فەرموویەتی: ﴿أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَ﴾، واتە: پێشانم بدە تەماشات بکەم ، واتە: وام لێبکە بتوانم بتبینم ، نەیفەرمووە خۆتم پێشان بدە ، یانی : سووچ و خەتای خۆمە کە ناتبینم‌و ، پەرچ (مانع)ی دیتنەکە لەلای منەوەی ، نەك تۆ !.

هەڵوەستەی سێیەم : کە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾، دیارە ﴿لَن﴾، بۆ جەختکردن (تأكيد)ە، وە هەندێکیش دەڵێن بۆ لابردنی شتێکە لە داهاتوودا، یانی هەرگیز (تأبيد) ، وە گوتراوە : (حَرْفٌ نَصْب وَنَفِي وَاستقْبَالٍ)، واتە : بێگومان هەرگیز نامبینی، ئنجا موعتەزیلەو ئەوانەی کە بڕوایان وایە کە خوای پەروەردگار لە قیامەتێش نابینرێ، وە لە بەهەشتیش دا ئیمانداران خوای بەرزو مەزن نابینین، ئەوەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، بەڵام بێگومان ئایەتەکە مەبەستی ئەوەیە لەم ژیانە دنیایەدا هەرگیز ناتوانی بمبینی ، نەك لە قیامەتێش، خوای پەروەردگار باسی ئێستا دەکات، وە باسی ئێرە دەکات، بە بەڵگەی ئەوەی کە دەفەرموێ : تەماشای ئەو چیایە بکە ، ئەگەر ئەو چیایە خۆی ڕاگرت‌و ، توانی بە چەسپاویی بمێنێتەوە لە شوێنی خۆیدا ، ئەگەر خۆمی پێشان بدەم ، دوای ئەوە تۆش دەتوانی بمبینی .

هەڵوەستەی چوارەم : کە دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِي﴾، ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت دەڵێن : کەواتە مەسەلەکە ئەوە نیە کە خوای بێ وێنە نەبینرێ ، بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە

کە مووسا بەرگەی بینینی خوای بەرزو مەزن و دەرکەوتنی ناگرێ ، یانی : مەسەلەکە بەرگە نەگرتن‌و نەتوانینە، نەك ئەوە کە خوا لە زاتی خۆیدا نەگونجێ ببینرێ، وەك شیعەو موعتەزیلە وا دەڵێن ، ئنجا زۆربەی هەرەزۆری مسوڵمانان بە پێی ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ ، کە دوایی هەندێکیان دێنین ، دەڵێن : خوای پەروەردگار لە بەهەشتدا لە لایەن ئەهلی ئیمانەوە دەبینرێ، هەر کەسە بە قەدەر ئیمانی خۆی ، خوای تاك‌و پاك دەبینێ .

هەڵوەستەی پێنجەم : کە دەفەرموێ : ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾، ﴿تَجَلَّىٰ﴾، یانی : (انْكَشَفَ)، کاتێك پەروەردگاری مووسا بۆ چیایەکە دەرکەوت ﴿جَعَلَهُۥ دَكًّا﴾، ﴿دَكًّا﴾، یانی : (مفَتَّتَاً)، واتە: وردو خاش بوو، هاڕدرا، یاخود سووتاو بوو بە خۆڵەمێش ، ﴿وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾، ﴿وَخَرَّ﴾، یانی (سَقَطَ) واتە : مووسا کەوت ، ﴿صَعِقًا﴾، (غَائِبَاً عَنِ الوَعِي)، واتە: لە هۆش خۆی چوو، وە بێهۆش کەوت .

هەڵوەستەی شەشەم : کە دەفەرموێ : ﴿فَلَمَّآ أَفَاقَ﴾، دەڵێ : ﴿أَفَاقَ﴾، یانی: (عَادَ إِلى الوَعِي)، واتە: گەڕایەوە هۆش خۆی، هاتەوە هۆش .

هەڵوەستەی حەوتەم : کە دەفەرموێ : ﴿قَالَ سُبْحَٰنَكَ﴾، پاکیی بۆ تۆ ، واتە: پاکیی بۆ تۆ کە بگونجێ ببینرێی لەم ژیانە دنیاییەداو، بەم جەستە بێهێزە، کە بە تەئکید جەستەی ئینسان لە چیا بێهێزترە ، ئنجا ئەگەر چیا نەیتوانی بەرگەی دیتنی خوای بەدیهێنەر بگرێ ، ئەدی جەستەی مرۆڤ ، کە زۆر لە چیا بێهێزترو بێ تواناترە ، چۆن دەتوانێ ؟ بۆیەش خوای پەروەردگار چیای بە نموونە بۆ هێنایەوە، چونکە دیارە چیا لە زیهنی بەشەردا ، لە هەموو شتێك پتەوترو سەختترە، ئنجا ئەگەر چیا بەو سەختیی‌و پتەوییە ، نەتوانێ بەرگەی دەرکەوتنی خوای پەروەردگار بگرێ ، مرۆڤ بەو جەستە بێهێزەوە ، چۆن دەتوانێ ؟

هەڵوەستەی هەشتەم : کە دەفەرموێ : ﴿ تُبْتُ إِلَيْكَ ﴾، بێگومان موعتەزیلەو شیعە بەڵگە بەوە دێننەوە دەڵێن : مادام مووسا تۆبەی کردووەو گەڕاوەتەوە ، کەواتە : هەڵەی کردوە ، کە داوای بینینی خوای کردوە ، لەبەرئەوەی خوا نابینرێ ! بەلاَم ئێمە دەڵێین : نەخێر، تۆبە مەرج نیە لە گوناهان بێ ، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ :

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ٣﴾ النصر، بەڵکو جاری وا هەیە بۆ لای خوا دەگەڕێیەوە لە طاعەتێکەوە بۆ طاعەتێکی باشتر، یاخود لە کەمتەرخەمییەوە ، یاخود لە بێ ئاگاییەوەیە، وەك من لە کتێبی (گەڕانەوە بۆ لای خوا)دا بە تەفصیلێ باسم کردوە ، تۆبەو گەڕانەوە مەرج نیە بەس لە گوناهەوە بێ بۆ طاعەت ، بەڵکو تۆبە بە پێی مەقامی ئینسانەکان دەگۆڕێ ، هەیە ئەو خواپەرستییەی کە دەیکات ، با لە لووتکەش دابێ ، بەلاَم کاتێك بەراوردی دەکات لەگەڵ پایەی بەرزی خوای پەروەردگاردا ، بە کەمی دەزانێ ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هەموو جارێ کە سلاَوی نوێژی داوەتەوە ، سێ جاران فەرموویەتی : {أَستَغْفِرُ اللَّهَ، أَستَغْفِرُ اللَّهَ، أَستَغْفِرُ اللَّهَ}[(١)] کە نوێژی پێغەمبەر ﷺ یش بە تەئکید لە لووتکەی نوێژی چاك دابووە، بەلاَم داوای لێبوردنی لە خوا کردوە، واتە : خوایە ! ئەوەی من شایستەی مەقامی بەرزی تۆ نیە، بەلاَم من هەر ئەوەندەم لە تواناداهەیەو داوای لێبوردنت لێ دەکەم لە کەمتەرخەمیی .

هەڵوەستەی نۆیەم : کە دەفەرموێ : ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، واتە: من کە یەکەمینی بڕوادارانم ، کە لەم ژیانە دنیایەدا تۆ نابینرێی ، ئنجا لەوبارەوە

١) ﴿عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلاَتِهِ اسْتَغْفَرَ ثَلاَثًا ، وَقَالَ : اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ وَمِنْكَ السَّلاَمُ تَبَارَكْتَ ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ﴾ { رَوَاهُ مُسْلِمٌ فِي الصَّحِيحِ : باب اسْتِحْبَابِ الذِّكْرِ بَعْدَ الصَّلاَةِ وَبَيَانِ صِفَتِهِ ، رقم : (١٣٦٢)} .

کە خــوای بــەرزو مــەزن لــە دوارۆژداو لــە بەهەشــت دا لــە لایــەن بڕوادارانــەوە دەبینــرێ ، چەند فەرمایشتێك هەن :

فەرموودەی یەکەم : پێغەمبــەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ تُخَيِّرُوا بَيْنَ الأَنْبِيَاءِ، فَإِنَّ النَّاسَ يَصْعَقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَأَكُون أَوَّلَ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ ، فَإِذَا أَنَا بِمُوسى آخِذٌ بِقَائِمَةٍ مِنْ قَوَائِمِ الْعَرْشِ ، فَلاَ أَدْرِي أَكَانَ فِيمَنْ صَعِقَ ، أَمْ حُوسِبَ بِصَعْقَتِهِ الأُولَى﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (١١٣٨٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم : (٢٤١١) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٢٣٧٣) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٦٢٣٧)}، واتــه : پێغەمبەران بەسەر یەکدیدا هەڵمەبژێرن (بڵێن: ئەو لەوی چاکترەو ئەو لەوی گەورەترەو ، ئەو لەوی بەرزترە) ، چونکە ڕۆژی قیامەت خەڵك بێهۆش دەبن، من سەر بەرز دەکەمەوە ، تەماشا دەکەم مووسا دەستی گرتوە بە یەکێ لە پایەکانی عەرشەوە ، ئنجا نازانم ئایا مووساش لە ڕیزی ئەوانە دابووە کە بێهۆش کەوتوون‌و، لە پێش مندا هەڵساوەتەوەو هاتۆتەوە هۆش ، یاخود ئەوەی یەکەمین جار کە بێهۆش کەوتوە لە دنیادا ، بۆی وە بەر ئەوە خراوەو ئەو بێهۆش نەکەوتوە .

فەرموودەی دووەم : ﴿عَنْ أَبِي مُوسى ﵁، قَالَ : قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ لا يَنَامُ ، وَلا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ ، وَلَكِنَّهُ يَخْفِضُ الْقِسْطَ وَيَرْفَعُهُ ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهارِ ، وَعَمَلُ النَّهارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ ، حِجَابُهُ النُّورُ (وفي رواية : النار) لَوْ كَشَفَهَا لأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (١٩٦٤٩)، مُسْلِمٌ برقم : (١٧٩) ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٥) ، وَأَبُو عَوَانَة برقم : (٣٧٩) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٢٦٦)، وَالطَّبَرَانِيُّ في (الأَوْسَط) برقم: (٦٠٢٥)} ، واتــه : ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا لە نێوماندا پێنج وشەی فەرموون (پێنج شتی پێ گوتین) : فەرمووی : بێگومان خوای زاڵ‌و پایە بەرز ناخەوێ ، وە ناشگونجێ بخەوێ ، تەرازوو نزم دەکات‌و بەرز دەکات ، کردەوەی شەوێی پێش هی ڕۆژی بۆ لا بەرز دەکرێتەوە ، کردەوەی ڕۆژێشی پێش هی شەوێ ، بۆ لا بەرز دەکرێتەوە ، پەردەی خوا ڕووناکییە (وە لە

ڕیوایەتێکدا دەفەرموێ : ئاگرە) ، ئەگەر خوا پەردەکەی لابدات ، پرشنگی ڕووی ، هەرچی لە حوکمی چەشمەندازی دیتنی خوادایە ، هەمووی دەسووتێنێ .

فەرموودەی سێیەم : ﴿عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه قَالَ : سأَلْتُ رَسولَ اللَّهِ ﷺ هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ ؟ قَالَ : نُورٌ أَنَّى أَرَاهُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٢١٤٢٩) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٤٤٢) ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم : (٣٢٨٢) وَقَالَ : حَسَنٌ ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٥٨)}، واتە : ئەبو زەڕ خوای لێ ڕازی بێ ، دەڵێ : لە پێغەمبەری خوام ﷺ پرسی : ئایا پەروەردگاری خۆتت بینی ؟ ئەویش فەرمووی : ڕووناکیی بوو، چۆنی ببینم، یان لە کوێی ببینم ؟.

دیارە (نور)، واتە : ڕووناکیی ، بەڵام ڕووناکییەك کە خوای پەروەردگاری پێ وەسف بکرێ، وەك ئەو ڕووناکییە نیە ، کە ئێمە دەیزانین و دەیبینین ، کە دیارە ڕووناکیی ماددیی جیایە ، لەو ڕووناکییەی کە خوای پەروەردگاری پێ وەسف دەکرێ ، کە بۆخۆی لە سوورەتی (النور)دا دەفەرموێ : ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ لِلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾﴾، واتە: خوا ڕووناکیی ئاسمانەکان و زەوییە ....، ئنجا ئەو (نور)ە کە خوای پێ وەسف دەکرێ، سیفەتی خوایەو دیارە سیفەتەکانی خواش ، وەك خوان ، وە خوای پەروەردگار دەربارەی سیفەتەکانی خۆی فەرموویەتی : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى ، واتە : هیچ شتێك وەك وێنەی وی (خوا) نیە، وە ئەو بیسەری بینەرە ، کە ئەوە هەم زاتی هەم سیفەتەکانی دەگرێتەوە .

فەرمـوودەی چـوارەم : ﴿عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ شَقِيقٍ ، قَالَ : قُلْتُ لأَبِي ذَرٍّ : لَوْ رَأَيْتُ رَسولَ اللّٰهِ ﷺ لَسأَلْتُهُ ، فَقَالَ : عَنْ أَيِّ شَيْءٍ كُنْتَ تَسأَلُهُ ؟ قَالَ : كُنْتُ أَسأَلُهُ هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ ؟ قَالَ أَبُو ذَرٍّ : قَدْ سأَلْتُ ، فَقَالَ : رَأَيْتُ نُوراً﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٤٦٢)}، واتـە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق (کە یەکێکە لە زانایانی تابعیین ، واتە : ئەو جیلەی کە لە دوای هاوەڵانەوە هاتوون) ، گوتوویەتی : بە ئەبو زەڕ غیفاریی (خوا لێی ڕازی بێ)م گوت : ئەگەر پێغەمبەری خوام ﷺ ببینیبایە ، پرسیارم لێ دەکرد ؟ ئەبو زەڕ گوتی : لەبارەی چییەوە لێت دەپرسی ؟ گوتی : لەوبارەوە لێم دەپرسی : کە ئایا پەروەردگاری خۆتت بینیوە ؟ ئەبو زەڕ غیفاریش گوتی : من لەوبارەوە لێم پرسی ؟ فەرمووی : ڕووناکیم بینی .

دیارە ئێمە لەبارەی بینینی خواوە ﷻ لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (الأنعام) ئایەتی : ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾﴾ دا ، بە درێژیی قسەمان کردوە ، بۆیە لێرەدا هەر بە کورتی بەسەریدا ڕۆیشتین و لەوێ باسێکی تێرو تەسەلمان لەبارەوە کردوە[١] .

**مەسەلەی چوارەم** : کە دەفەرموێ : ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّى ٱصْطَفَيْتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِى وَبِكَلَٰمِى فَخُذْ مَآ ءَاتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾، (خوا) فەرمووی : ئەی مووسا ! من تۆم هەڵبژاردوە بەوە کە پەیامەکانی خۆمم بە تۆ داون، وە بەوە کە فەرمایشتم لەگەڵدا کردووی، ئنجا ئەوەی پێم داوی ، وەریبگرە، وە لە سوپاسگوزاران بە.

واتە: ئەوەی کە پێتدراوە ، کە هەم بەرنامەو ڕێبازێکی سەربەخۆت پێدراوە ، وەك پێغەمبەرێکی خاوەن بەرنامەی تێرو تەواوو تایبەت، وە هەم ئەوە کە خوای بەخشەر بەتایبەت فەرمایشتی لەگەڵدا کردووی ، لە نێو هەموو پێغەمبەراندا

---

١) هەروەها لە دوو توێی نامیلکەیەکیش دا چاپمان کردوە ، بە ناوونیشانی (بینینی خوای بەزری مەزن لە دنیاو دواڕۆژدا ).

(عَلَيهِم الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) ، ئەوە ئیمتیازێکی گەورەیە ، بۆیە سوپاس و ستایشی پەروەردگارتی لەسەر بکە .

هەڵبەتە ئەوە جۆرێکە لە دڵدانەوەی خوای پەروەردگار بۆ مووسا ﷺ، وە بیرخستنەوەیەتی بۆ نیعمەتە گەورەکانی ، کە پێیداون، بۆ ئەوەی داوایەکەی کە کردی‌و جێبەجێ نەبوو ، زۆر لەسەر دڵی قورس نەبێ، دیارە خوا ﷻ کاربەجێیە، کاتێك کە مووسا ﷺ داوا دەکات ، خوای بێ هاوتا ببینێ ، دەزانێ ئەوە لە ڕووی زێدە ئیشتیاق‌و تامەزۆریی‌و حەزکردنیەوە بووە ، لە نیزیکی خوای پەروەردگار، بەڵام لەبەرئەوەی کە مرۆڤ هەتا لەم ژیانە دنیاییە دابێ ، بەم جەستەیەوە ، ناتوانێ بەرگەی دیتنی خوای بێ هاوتاو دەرکەوتنی بگرێ ، وەك چۆن کێوو چیا بەرگەی نەگرت، بۆیە داوایەکەی جێبەجێ نەکرا، بەڵام خوا ﷻ ئاوا دڵی دەداتەوەو نیعمەتەکانی خۆی دەخاتەوە بەرچاو، یانی : ئەی مووسا ! ئەگەر نیعمەتی بینینی خوای پەروەردگارت پێ نەدراوە ، نیعمەتی ئاخاوتن‌و گفتوگۆ لەگەڵ خوای زاڵ‌و پایە بەرزت پێدراوە، وە نیعمەتی پێبەخشرانی ، بەرنامەت پێدراوە ، کەواتە : سوپاسگوزاریی خوا بکە ، لەسەر نیعمەتەکانی ، وە بەوەندەی کە پێت دراوە ، قەناعەت بکە .

<u>**مەسەلەی پێنجەم**</u> : کە دەفەرموێ : ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا۟ بِأَحْسَنِهَا ۚ سَأُو۟رِيكُمْ دَارَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾ ، واتە : لە لەوحەکان دا لەبارەی هەموو شتێکەوە ئامۆژگارییمان بۆ نووسی بوو، وە بۆ هەر شتێك وردەکارییمان بۆ نووسیبوو، واتە: بۆ هەر شتێك کە بۆ ڕێکخستن‌و بەڕێوەچوونی ژیانی دنیایان پێویستیان بووبێ ، ﴿ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ ﴾ ، ئەی مووسا ! ئەوەی کە خوا پێیداوی لەو بەرنامەیەو پەیامە ، بە توندیی‌و بە جیددیی بیگرە ، ﴿ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا۟ بِأَحْسَنِهَا ﴾ ، بە گەلەکەشت بڵێ : کە چاکترینی بگرن، واتە : ئەگەر چاك‌و

چاکترینی تێدایە ، با کار بە چاکترینەکەی بکەن ﴿ سَأُوْرِيكُمْ دَارَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴾ ، لەمەودواش مەنزڵگای لارێیانتان پێشان دەدەم .

ئەوە دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر ، کە مەبەست پێی چییە ؟

(ٱلْأَلْوَاحِ ) : کۆی (لَوْح)ە، دەڵێ : (اللَّوْحُ : وَاحِدُ أَلْوَاحِ السَّفِينَةِ وما يُكْتَبُ عَلَيْهِ)، (لَوْح) بە یەکێك لە تەختەکانی کە کەشتییان لێ دروست دەکرێ ، دەگوترێ ، وە بە هەر شتێك کە نووسینی لەسەر بنووسرێ، ئنجا چ تەختە بێ، چ بەرد بێ ، چ ئاسن بێ ، چ چەرم بێ ، چ کاغەز بێ ، هەر شتێك بێ کە لەسەری بنووسرێ ، پێی دەگوترێ : (لوح)، ئنجا ئایا ئەو لەوحانە چەند بوون ؟ وە لە چی دروست کرابوون ؟ ماددەکەیان چی بوو ؟

لە ڕاستییدا هیچ شتێکی جێی دڵنیایی لەوبارەوە لە قورئاندا باس نەکراوە ، وە لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ کە سەرچاوەی دووەمی وەحییە ، لەوێشدا شتێك لەوبارەوە نیە ، بەڵام لەوە دڵنیاین کە ئەوەی لە تەوراتدا هاتوە دەڵێ : دوو لەوح بوون ، بە پێی ئایەتەکەی قورئان کە دەفەرموێ : ﴿ ٱلْأَلْوَاحِ ﴾ دەزانین کە قسەکەی تەورات ڕاست نیە، دووان نەبوون ، چونکە ئەگەر دووان بووان خوای پەروەردگار دەیفەرموو : (وَكَتَبْنَا لَهُ فِي اللَّوْحَيْنِ) ، بەڵام دەفەرموێ : ﴿ ٱلْأَلْوَاحِ ﴾، هەڵبەتە هەندێك لە زانایانی شارەزای زمانیش دەڵێن : جاری وایە دووانیش کۆ دەکرێنەوە ، بەڵام لێرەدا هیچ شتێك ناچارمان ناکات کە خوای زاناو شارەزا بە کۆ (جمع) هێناویەتی ، ئێمە لەخۆوە بڵێین دووانن ، بۆیە دەڵێین : بە تەئکید سێ یاخود لە سێش زیاتر بوون ، ئنجا چوار بوون ، پێنج بوون ... هتد ، ئەوەیان بۆ ئێمە دیار نیە ، بەڵام ئەوە دەزانین ، کە لە دووان زیاتر بوون.

وە قسەی تەورات لەوبارەوە ئەوەیە کە دەڵێ : {ثُمَّ نَزَلَ مُوسى وَانْحَدَرَ مِنَ الجبَلِ حَامِلاً فِي يَدِهِ لَوْحَي الشَّهَادَةِ (الوصايا العشر) ، وَقَدْ نُقِشَتْ كِتَابَةٌ عَلَى

وَجْهَـيْ كُلٍّ مِنْهُمَـا، وَكَـانَ اللّٰهُ قَدْ صَنَعَ اللَّـوْحَيْنِ وَنَقَشَ الْكِتَـابـة عَلَيْهِمَـا}[١]، واتــه : پاشــان مووســا هــاته خــوار لــه چیاكــەوەو شــۆڕبۆوه ، دوو لەوحەكــەی شەهــادەی بــه دەستــی هەڵگــرتبوون ، {دە (١٠) وەصیەتەكــان} وه لەســەر دوو ڕووی هەردووكیان نووسرابوو (هەر لەوحێك دیارە دوو ڕووی هــەبوون) ، وه خــوا بۆخــۆی دوو لەوحــەكــەی دروســت كردبــوون ، وه نووســینەكەشی لەســەر نەخــش كێشــابــوو !

ئنجا ئەوەی كه له تـەوڕات دا بــه (الوصـايا العشـر) دە ئـامۆژگـارییەكـان، یاخــود دە ڕاسـپاردەكان ناســراوه ، كه خاوەن كتێبــەكـان زۆر گـرنگییــان پێدەدەن و لـه زۆر بۆنــەدا باسـیان دەكـەن ، ئەمــە دەقەكەیــەتی وەك لـه (التفسیر التطبيقـي للكتـاب المقدس ، العهد القديم ، سفر الخروج، الإصحاح : ١٩)دا هاتوه : (الوَصايَا العشر : ثُمَّ نَطَقَ اللّٰه بجَمِيع هَذِهِ الأَقْوَال ، أَنَا هُوَ الرَّبّ إِلَهَك الَّذِي أخرجك مـن أَرْضِ مصْر دِيَار عبوديتـك، لا يكن لَكَ آلهـة أُخْرَى سـوايَ، لا تَنْحَت لَكَ تِمْثَـالاً ولا تصنَع صُورَة مَا مِمَّا فِي السَّمَاءِ مِنْ فَوْق ، وما فِي الأَرْض مِنْ تَحْت ، وَمَا فِي المـاء مِنْ أَسْفَل الأَرْض، لا تَسْجُد لَهنَّ ولا تَعْبُـدْهُنَّ ، لأَنِّـي أَنَا الـرَّبّ إِلَهَكَ إِلَـه غيـور أفتقد آثَام البَنِـين حَتَّى الجيل الثـالث والرَّابِع مِنْ مُبْغِضِـيَّ ، وَأُبدي إِحْسَـاناً نحو أُلُوف مِنْ مُحِبِّيَّ الَّذِين يطيعـون وَصـايَاي ، لا تنطق باسْم الـرَّبّ إِلَهك بَاطِلاً لأَنَّ الرَّبّ يعـاقِب مَنْ نطق باسمِهِ بَاطِلاً ، أُذكر يَوْم السبت لتُقدِّسه ، ستةَ أيام تَعمَل وتقوم لِجَمِيع مشاغلك ، أما اليوم السابع فتجعله سبتاً للرب إلهك ، فلا تَقُم فِيـهِ بـأي عَمَل أَنْتَ أَو إِبْنَكَ أو ابنتك أو عمّتكَ أو أمتك أو بَهمتك أو النـزيل المقيـم داخل أبوابك، لأن الرب قد صنع السماء والأرض والبحرَ وكلَّما فيهـا فـي ستة أيـام ، ثـم استراحَ فـي اليوم السـابع لـهذا بـارك الرب يوم السبت وجعلَهُ مُقَدَّسا، أَكْرِمْ أَبَاكَ وَأُمَّكَ لكي يطول عُمُرك فـي الأَرض الـتي يهبك إياهـا الـرب إلـهك، لاَ تَقْتُلْ، لاَ تَـزْنِ، لاَ تَسْرِقْ، لاَ تَشْهَدْ زُوراً علـى جارك، لا تَشـتهِ بَيْـتَ جَـارِكَ، وَلا زَوْجَتَــهُ ، وَلا عَبْــدَهُ ، وَلا أَمَتَــهُ ، ولا ثَــوْرَهُ ، ولا حِـمَارَهُ، ولا شَيْئـا مِمَّـا لَـهُ)[٢]،

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس ، العهد القديم ، سفر الخروج ، الإصحاح : ٣٢ ، موسى يحطم لوحي الشهادة ويطحن العجل: ص١٩٦.

٢) الكتاب المقدس ، العهد القديم : ص ١٧١ – ١٧٣ .

واتە : {دە وەسیەتەکان (یاخود دە ئامۆژگارییەکان) : ئنجا خوا بە هەموو ئەو فەرموودانە فەرمایشتی کرد : من ئەو پەروەردگارو پەرستراوەتم کە تۆی لەسەر زەمینی میسرِ سەرزەمینێك کە تێیدا کرابووی بە کۆیلە دەرمهێنای (لێرەدا خوا ﷻ ـ بە پێی تەورات ـ قسە لەگەڵ مووسادا دەکات) با جگە لە من هیچ پەرستراوی دیکەت نەبن ، هیچ بتێك مەتاشە ، وە هیچ پەیکەرێك دروست مەکە ، نە بۆ ئەو شتانەی کە لە ئاسمانن لە سەرەوە ، وە نە بۆ ئەوە شتانەی کە لە زەویدان لە خوارەوە ، وە نە بۆ ئەو شتانەی کە لە ئاودان لە خوار زەوییەوە ، کڕنووشیان بۆ مەبە ، وە مەیانپەرستە ، چونکە هەر من پەروەردگارو پەرستراوتم ، وە من پەرستراوێکم کە هاوبەشیی قبووڵ ناکەم ، وە بۆ گوناهی کوڕان دەگەڕێم هەتا پشتی سێیەمو چوارەم (واتە: ئەگەر کەسێك ئێستا گوناهی کردبێ ، تۆڵە دەستێنمەوە تەنانەت لە جیلو پشتی سێیەمو چوارەمیش)، لەوانەی کە من دەبوغزێننو ڕقیان لێمە ، وە چاکە دەکەم لەگەڵ هەزاران لەوانەی کە منیان خۆشدەوێ، ئەوانەی کە ئامۆژگارییەکانی من لە گوێ دەگرنو ، فەرمانبەرییان بۆ دەکەن ، بە ناهەق ناوی پەروەردگارو پەرستراوت مەهێنە (ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێ : سوێندی بە درۆی پێ مەخۆ) چونکە پەروەردگار سزای هەر کەسێك دەدا کە بە ناهەق ناوی ئەو بێنێ ، وە ڕۆژی شەممەت لە یاد بێ ، بۆئەوەی کە ڕۆژی شەممە بە پیرۆز بگری ، شەش ڕۆژ لە هەفتەدا ئیش دەکەیو بە هەموو کاروبارەکان هەڵدەستی ، بەڵام ڕۆژی حەوتەم دەیکەی بە ڕۆژی ئیسراحەت بۆ پەروەردگارو پەرستراوت ، وە نابێ هیچ کارێکی تێدا ئەنجام بدەی نە بۆخۆت ، نە کوڕەکەت ، نە کچەکەت ، نە کۆیلەکەت ، نە کەنیزەکەکەت، نە ئاژەڵەکەت ، نە ئەو میوانەش کە لەلای تۆ نیشتەجێیەو هاتۆتەماڵی تۆ ، چونکە پەروەردگار ، ئاسمانو زەویو دەریاو هەرچی تێیان دا هەیە ، لە شەش ڕۆژاندا دروستی کردن ، دوایی لە ڕۆژی حەوتەمدا پشووی دا، بۆیە پەروەردگار پیتو پێزی خستۆتە ڕۆژی شەممەوە، وە کردوویەتی بە ڕۆژێکی پیرۆز، ڕێز لە بابو دایکت بگرە ، بۆ ئەوەی تەمەنت درێژ بێ لە زەویدا، ئەو پەروەردگارو پەرستراوەت ، کە سەرزەوی بە تۆ بەخشیوە، قەتڵ مەکە ، زینا مەکە ، دزیی مەکە ، بە درۆ شایەدیی لەسەر دراوسێیەکەت مەدە ، وە ئارەزووی ماڵی دراوسێیەکەت مەکە ، وە ئارەزووی هاوسەرەکەی مەکە ، وە ئارەزووی کۆیلەکەی

مەکە ، وە ئارەزووی کەنزیکەکەی مەکە ، هەروەها ئارەزووی گایەکەی مەکە، وە ئارەزووی گوێ درێژەکەی مەکە (واتە : تەماعی تێمەکە) کە ببنە هی تۆ ، وە ئارەزووی هیچ شتێك مەکە ، کە هی دراوسێیەکەتە .

ئەمە ئەوەیە کە بە دە وەسیەتەکان ناسراوە ، لە پەیمانی کۆنو لە نێو تەوراتدا ، کە دیارە تەورات بەشێکە لە پەیمانی کۆن .

شایانی باسیشە ئەو چەند دێڕەی لە (پەیمانی کۆن) هێناومانەوە چەند هەڵەو پەڵەیەکی بێڕەزایان تێدان ، کە لێرەدا بە پێویستی نازانم لەبارەیانەوە بدوێمو لە بەرگی سێیەمی کتێبی : (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا کە دەبێتە کتێبی پێنجەم (الكتاب الخامس) لە چاپی دووەمی : (موسوعة : الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) دا ، بە درێژیی هەر کام : لە (پەیمانی کۆن)و (پەیمانی نوێ)م لە بێژینگ داون .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِي ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْعِظَةً ﴾، دەربارەی هەموو شتێك ، ئامۆژگارییمان لە لەوحەکان دا بۆ نووسیبوو ، واتە : هەموو شتێك کە ئەوان پێویستیان پێی بووە ، کە ژیانیان ڕێكو ڕاست بەڕێوەبچێ ، خوای پەروەردگار وەك ئامۆژگاریی لەو تەوراتەدا کە لە تەختەکاندا نووسراوە، خوا بۆی نووسیوە، ﴿ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَيْءٍ ﴾، واتە : وە وردەکاریی دەربارەی هەر شتێك کە ژیانی ئەوان ، ئەو کاتە پێویستیی پێی بووە .

کە دەفەرموێ : ﴿ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا۟ بِأَحْسَنِهَا ﴾، بێگومان هەموو ئەوەی کە خوا دەیفەرموێ ، هەر چاکە ، بەڵام چاك هەیەو چاکتر هەیە ، بۆ وێنە : با فەرز پێش سوننەت بخەن ، یاخود ئەگەر شتێك هەم چاکە هەم (فضل)ی تێدابێ ، هەم داد (عدل)، ئیش بە چاکە (فضل) بکەن، بۆ وێنە : ئەگەر زەکات فەرزە ، بەڵام سەرەڕای زەکاتیش یارمەتی هەژارو لێقەوماوان بدەن (فضل)ە، با تەنیا بە جێبەجێ کردنی فەرزەکە وازنەهێنن، بەڵکو هەوڵبدەن ئەهلی (فضل)یش بنو لە زیادەش ببەخشن .

کە دەفەرموێ : ﴿ سَأُوْرِيكُمْ دَارَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ شوێنەوارەکانی ئەوانتان پێشاندەدەین ، کە چیمان پێکردوون، بۆ ئەوەی پەندیان لێوەربگرن.

وە دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ ، کە ئێوە دەکەینە میراتگری ئەوانو، خانوو بەرەو جێگاو ڕێگاکانی ئەوان بە میرات دەگرن، وەك لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس/ العهد القديم/ سفر الخروج ، الإصحاح : ٣٣)دا هاتوە ، دەڵێ : (إحْفَظْ مَا أنَا مُوصِيكَ بِهِ ، ها أنَا طارِدٌ مِنْ قُدَّامِكَ : الأموريين والحثيين والفرزيين والحويين واليبوسيين والكنعانيين) ، دیارە ئەوانە چەند گەلێك بوون لە شامدا ژیاون دەڵێ : تۆ ئەوەی کە من ئامۆژگارییتی پێ دەکەم ، بیپارێزە ، ئەوە منیش لە پێش تۆوە هەموو ئەو گەلانە دەردەکەم ، ئوموورییەکانو، حەثییەکانو ، فەڕزییەکانو ، حوەییەکانو، یەبووسییەکانو، کەنعانییەکان .

**مەسەلەی شەشەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَـٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَـٰفِلِينَ ﴾، کە پێشتریش مانامان کرد .

کە دەفەرموێ : ﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَـٰتِيَ ﴾، لەمەودوا لە (بڕواهێنان ، بە بەڵگەو نیشانەکانم لادەدەم ، ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، ئەوانەی کە بەناهەق لە زەوییدا خۆ بە زل دەگرن .

### ئایەتەکانی خوا سێ جۆری سەرەکیین :

ئنجا لێرەدا کە دەفەرموێ : ﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَـٰتِيَ ﴾، لە ئایەتەکانی خۆم لادەدەم ، واتە : لەوە کە ئیمانیان پێ بێنن) ، (سأَصْرِفُ عَنِ الإيمان بآياتي)

ئایەتەکانی خواش ، وەك چەند جارێکی دیکەش گوتوومانە : ئایەتەکانی خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى سێ (٣) جۆرن : (الآيات المقروءة ، والآيات المنظورة ، والمعجزات) :

یەك/ ئایەتە خوێنراوەکان : خوا وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴿١٦٤﴾ ﴾ آل عمران ، یان دەفەرموێ : ﴿ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ﴿٥٩﴾ ﴾ القصص، کەواتە : بەشێك لە ئایەتەکان دەخوێنرێنەوە، ئنجا دیارە ئایەتە خوێنراوەکان ، ڕستەکانی فەرمایشتی خوان، چ ئەوانەی کە لە قورئاندا هاتوون ، چ لە تەورات ، چ لە ئینجیل ، چ لە زەبوور ، لە صوحوف ، وە هەموو کتێبەکانی دیکەی خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى.

دوو/ ئایەتە بینراوەکان : یانی دیاردە سروشتییەکان، کە هەرکامێکیان نیشانەیە لەسەر پەروەردگارێتیی خوا : وەك خوا لە سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێ : ﴿ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ یوسف، واتە: زۆر نیشانە هەن لە ئاسمانەکانو زەویدا بە لایاندا تێدەپەڕنو پشتیان تێدەکەن، واتە: پەندیان لێ وەرناگرنو سەرنجیان لێنادەن ، تاکو شوێن دەستی پەروەردگارو سیفەتەکانی خوای پەروەردگاریان تێدا ببینن ، وەك یەکێ لە شاعیرەکان دەڵێ :

وَفِي كُلِّ شَيْءٍ لَهُ آيَةٌ      تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ وَاحِدٌ

خوا لە هەموو شتێك دا نیشانەیەکی هەیە، ئەوە دەگەیەنێ کە خوا تاكو تەنیایە

سێ / موعجیزەکان : ئەو موعجیزانەی کە خوای زاناو توانا بە پێغەمبەرانی داون : وەك خوا لە سورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴿١٠١﴾ ﴾ الإسراء، واتە: ئێمە نۆ نیشانەی ڕۆشنو بەرچاومان بە مووسا دابوون، کە مەبەست پێی موعجیزەکانە.

هەروەها هەر لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَۚ وَءَاتَيۡنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبۡصِرَةٗ فَظَلَمُواْ بِهَاۚ وَمَا نُرۡسِلُ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّا تَخۡوِيفٗا ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە : وە ڕێی لێ نەگرتین کە نیشانان (موعجیزان) بنێرین ، مەگەر ئەوە نەبێ کە پێشینانو پێشووەکان ئایەتەکانی خوایان بە درۆ داناوە (بڕوایان پێ نەکردوون)، وە ئێمە حوشترێکمان بە گەلی (ثمود)دا، (لە گاشە بەردێکی گەورە، یاخود لە شاخێك هاتە دەرێ ، کە پێشتر باسمان کرد) کە مایەی بەرچاو ڕۆشنییان بوو ، (کە دەبوو بەرپێی خۆیانی پێ ببینن‌و دەبوو هەقی پێ بدۆزنەوە) ﴿ فَظَلَمُواْ بِهَا ﴾، کەچی ستەمکارانە بە درۆیان دانا ﴿ وَمَا نُرۡسِلُ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّا تَخۡوِيفٗا ﴾، وە ئێمە موعجیزەکان بەس بۆ ترساندن (ی بەندەکان) دەنێرین، کەواتە : مەبەست لە وشەی : ئایەت لێرەدا ، موعجیزەی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمَ) .

## چوار سیفەتی بنەڕەتیی بێبڕوایان بە ئایەتەکانی خوا :

ئنجا با بزانین کێ بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناهێنێ ؟ خوای کارزان بە چوار سیفەت وەسفیان دەکات :

١) ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾، ئەوانەی کە بە ناهەق لە زەویدا خۆ بە زل دەگرن، ئنجا بە تەئکید خۆبە زلگرتن هەر بە ناهەقە ، بەلام ئەوە وەسفێکی ڕوونکردنەوەیە، وەك (خوا) لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ : ﴿ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ حَقّٖ ﴿٢١﴾ ﴾آل عمران، واتە: پێغەمبەران بە ناهەق دەکوژن، دیارە کوشتنی پێغەمبەران هەر بە ناهەقە، بەلام ئەو وەسفە بۆ زیاتر دەرخستنی ئەو تاوانەیە، ئەگەرنا کوشتنی پێغەمبەران هەر بە ناهەقەو ، خۆ بە زلگرتن هەر بە ناهەقەو خۆ بە زلگرتنی بە هەقو ، پێغەمبەر کوشتنی بە هەق ، بوونی نیە .

٢) سیفەتی دووەمیان ئەوە کە دەفەرمویَ : ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا ﴾، وە ئەگەر هەر نیشانەیەكو بەڵگەیەكو هەر موعجیزەیەك ببینن ، هەر بڕوای پێ ناهێنن .

٣) سیفەتی سێیەمیان ئەوەیە کە دەفەرمویَ : ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا ﴾، وە ئەگەر ڕێی ڕاستو ڕێی بە مراد گەیشتنو سەرفرازیی ببینن ، نایگرنە بەرو نایکەنە ڕێبازی خۆیان .

٤) سیفەتی چوارەم ئەوەیە کە دەفەرمویَ : ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ ﴾، وە ئەگەر ڕێی بێ ئاکامیی‌و چارەڕەشیی‌و سەرگەردانیی ، ببینن ، دەیگرنە بەرو دەیکەنە ڕێبازی خۆیان .

ئنجا ئایا بۆچی وا دەکەن ؟ ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴾، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە ئایەتەکانی ئێمە بە درۆ دادەنێن، وە لێیان بێ ئاگان، کەواتە: لەلایەکەوە خوا ﷻ دەفەرمویَ : ئەوانەی خاوەنی ئەو چوار سیفەتە بن ، لە ئیمان هێنان بە ئایەتەکانی خۆم لایاندەدەم، پاشانیش بە دوو سیفەتی دیکە هۆکاری ئەو بڕوا نەهێنانەی ئەو جۆرە کەسانە، دەخاتەڕووو دەفەرمویَ :

١ - ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانان .

٢ - ﴿ وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴾، وە لە ئایەتەکانی ئێمە بێئاگا بوون ، لە سۆنگەی ئەو دوو هۆکارەوە ، ئەو چوار سیفەتەیان تێدا پەیدا بوون .

کەواتە: بە درۆ دانانی ئایەتەکانی خواو ، لێ بێ ئاگابوونیان ، دەبێتە مایەی پەیدابوونی ئەو سیفەتە خراپانە :

١) خۆبە زلگرتن .

٢) بڕوا نەهێنان بە نیشانەکانی خوا .

٣) نەگرتنە بەری ڕێی ڕاست .

٤) گرتنە بەری ڕێی چەوت .

پاشان ئەو سیفەتە خراپانەش جارێکی دیکە ، دەبنە مایەی ئەوە کە ئینسان بڕوا بە ئایەتەکانی خوا نەکات، وە لێیان بێئاگا بێ ، کەواتە : بڕوا نەکردن بە ئایەتەکانی خوا، وە لێی بێئاگا بوونیان ، دەبنە هۆی پەیدابوونی ئەو سیفەتانە ، وە ئەو سیفەتانەش دەبنە هۆی ئەوە کە ئینسان هیدایەتی خوا وەرنەگرێ ، واتە : لە نێوان ئەو سیفەتە خراپانەو ، وەرنەگرتنی هیدایەتی خوادا ، پەیوەندییەکی دوو سەرە هەیە ، هەر کامێکیان کاریگەریی بۆ سەر ئەوی دیکەیان هەیە ، یانی : بە ئەندازەی ئەوە کە ئینسان بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناهێنێ ، ئەو سیفەتە خراپانەی تێدا پەیدا دەبن، وە بە ئەندازەی ئەوەی ئەو سیفەتە خراپانەی تێدا پەیدا دەبن ، ئەو سیفەتانە دەبنە لەمپەرو ڕێگر لەبەردەمیدا ، کە بڕوا بە ئایەتەکانی خوا نەهێنێ ، وە هەروەها بەم شێوەیە بەردەوام یەکدی زیاد دەکەن ، هەتا سیفەتی خراپ لە ئینسان دا زیاد بن ، بێبڕوایی زیاد دەبێ ، وە هەتا بێ بڕواییش زیاد بێ ، سیفەتی خراپیشی تێدا زیاد دەبن .

**مەسەلەی حەوتەمو کۆتایی** : کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْأَخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، وە ئەوانەی کە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە ناکەن، وە بڕوا بە دیداری ڕۆژی دوایی ناکەن ، کردەوەکانیان (کردەوە باشەکانیان) هەڵدەوەشێنەوە ، ئایا تەنیا بەوە سزا نادرێن کە دەیانکرد ، هەر بەوە سزاو پاداشت نادرێنەوە ؟ واتە: لەبەر ئەوەی بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە ناکەن ، وە بڕوا بە دیداری ڕۆژی دوایی ناکەن ، کردەوە باشەکانیان هەڵدەوەشێنەوە ، چونکە ئەوە سزای ئەوەیە کە دەیکەن ، کەواتە : کردەوە باشەکانی بێبڕوایان ، هەڵدەوەشێنەوە ، چونکە وەك پێشتریش گوتم : ئیمانو عەقیدە ، دەوری بناغە دەبینێ ، وە کردەوە باشەکان

دەوری دیــوار دەبیــنن ، وە دیــواریش بـەبــێ بناغــە ڕاناوەســتــێ ، وەك خــوا لــە ســـوورەتی (الفـرقـان)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾، واتــە : وە ڕوومـان کــردە ئــەو کــردەوانەی کـە ئەنجــامیان دابوون (واتـە : کردەوە باشـەکـان) وە هـەموویانـمـان کردنـە تــۆزو خۆڵێـکی پـرش‌و بـڵاوو ، کران بـە تۆزێ بـانـان ، چونکە هـەوێنـی ئیمانیـان لەگـەڵدا نیـە ، وە دیـواری کـردەوە باشـانە ، لەسـەر بنـاغـەی ئیمـان‌و عەقیـدەی ڕاســت‌و دروســت نیــە ، بۆیــە خـاوەنەکـانیـان لـێیـان بـەهرەمەنـد نـابـن .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەڤدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسـەمان لـە حـەوت (٧) ئـایەتان پێکـدێ، ئـایەتەکـانی : (١٤٨ تاکـو ١٥٤)، وە ئەو حەوت ئـایەتە، هەموویـان باسـی یـەك بـەسـەرهـات دەکـەن ، ئـەویش بـەسـەرهـاتی گۆلـك پەرسـتیی گـەلـی مووسـایە ، کـە هـەتا مووسـا لـە دیـداری خـوا گـەڕایـەوە ، گـەلەکـەی بـە فیتـی سـامیـریـی ، کـە بابـایـەکـی فیتنـەچیو ئـاژاوەگـێڕ بـوو، گۆلـکـێکی زێڕیـان لـەو خشـڵـەی پێیـان بوو دروسـت کـرد بوو، وە دەسـتیان کرد بوو بـە پەرسـتنیی و بـەندایەتییـان بـۆ دەکـرد لـە جیـاتی خـوا، هـەرچەندە هـاڕوونی بـرای صـەڵاتو سـەلامی خـوای لەسـەر بـێ ، زۆر هـەوڵـی لەگـەڵـدابوون کە کـاری وا نەکـەن، بـەڵام بـە قسـەیان نەکـرد بـوو ، هـەر بۆیەش دوای ئەوەی مووسا دەگـەڕێتەوە ، لـە گـەلەکـەی تـووڕە دەبـێو ، سـەرو ڕیشی هـاڕوونی براشی ڕادەکێشـێ، یـانـی سـەرو ڕیشی تێـك با هـەڵـدەدا، چونکە وا دەزانـێ کە کەمتـەرخـەم بـووە .

پاشـان کە هـاڕوون پاساو دێنـێتـەوە ، وە بۆی ڕوون دەکـاتەوە کە بێ دەسـەڵات بـووەو بـێ چارە بووە، مووسـا چاوپۆشـیی لـێدەکـاتو ، دەسـت دەکـات بـە پاڕانـەوە لـە خـوا بۆ خۆیو بۆ برایەکەی ، کە لێیـان خۆش بـێ ، وە بیانخاتە ژێـر سـایەی ڕەحمـەتو بـەزەیی خۆیـەوە.

پاشـان خـوای کـاربـەجێ باسی سـەرەنجامی هـەر کام لە خراپەکارانی تۆبـە نەکـەرو خراپەکـارانێك کە دەگـەڕێنـەوەو پەشـێمان دەبنـەوە ، دەکات .

وە لـە کۆتاییشـدا باسـی نیشـتنەوەی تـووڕەیی مووسـاو ، هـەڵگـرتنەوەی لەوحەکـان دەکات، کە پێشـتـر لەوحـەکـانی فـڕێ دابوون، بـۆ ئـەوەی دەسـتی بـە تـاڵ بـێ ، تاکـو سـەرو ڕیشی هـاڕوونـی برای بگـرێ، بۆ لێپرسـینەوە لەگـەڵداکردنی، ئنجا تورەییەکەی کە دەنیشـێتـەوەو لادەچـێ ، لەوحەکان هـەڵدەگرێتـەوە .

﴿ وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِنۡ حُلِيِّهِمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌۚ أَلَمۡ
يَرَوۡاْ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمۡ وَلَا يَهۡدِيهِمۡ سَبِيلًاۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾
وَلَمَّا سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ وَرَأَوۡاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ ضَلُّواْ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا رَبُّنَا
وَيَغۡفِرۡ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ
غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا قَالَ بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي مِنۢ بَعۡدِيٓۖ أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡۖ وَأَلۡقَى ٱلۡأَلۡوَاحَ
وَأَخَذَ بِرَأۡسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِۚ قَالَ ٱبۡنَ أُمَّ إِنَّ ٱلۡقَوۡمَ ٱسۡتَضۡعَفُونِي وَكَادُواْ يَقۡتُلُونَنِي
فَلَا تُشۡمِتۡ بِيَ ٱلۡأَعۡدَآءَ وَلَا تَجۡعَلۡنِي مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ
لِي وَلِأَخِي وَأَدۡخِلۡنَا فِي رَحۡمَتِكَۖ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ
ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡمُفۡتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ
بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٥٣﴾ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي
نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾.

## مانای وشــه به وشـەی ئایەتەکـان

((وه گــەلی مووســای دوای وی (کــه چــوو بــۆ دیـــداری خـــوا لەســـەر چـیا) لــه خشڵەکەیان پەیکـەری گۆلکێکیان (بـه پەرسـتـراو) گـرت کـه (تەنیــا) بـۆڕەی هــەبوو، ئــایا نەیانـدەبینی کـه نـه قسـەیان لەگـەڵ دەکـاتو ، نـه ڕێیـەکـیان پێشـان دەدا ؟ بـه پەرسـتـــراویان گــرتو (بــەو کارەشـــیان) لــه ستەمـکـاران بـوون ﴿١٤٨﴾ وه کــاتێك لــه دەسـتیان چوو و دیـتـییـان که گومڕا بوون ، گوتیـان : ئەگـەر پەروەردگـارمان ، بـەزەیـی پێمـان دا نەیەتو لـێمان نەبـووریّ، بـه دڵنیـایی لـه زیانباران دەبیـن ﴿١٤٩﴾ وه کـاتێك مووسـا بــه تـووڕەیی‌و خەفەتــەوه (لــه ســـەفەره چـل شـەوییـەکــەی) گــەڕایەوه لای گەلەکەی ، گوتی : دوای من خراپـتـرین جێدارییتـان کـردم ، ئـایا پەلـەتان کـردو پـێش فەرمــانی پەروەردگـارتــان کەوتــن ؟ وه لەوحەکـانی فڕێـداو (قــژی) ســەری برایەکەی گــرتو بـۆ لای خـۆی ڕاکێشــا ، هـاڕوونیــش گوتــی : کـوڕی دایکــم ! خەڵکەکـه بـه بێهێزیـان زانیم‌و نیزیك بـوو بشـمكـوژن، دەجـا دوژمنـانم پـێ خـۆش مەکەو ، ڕەگـەڵ کۆمەڵـی سـتەمکارانــم مەخـه ﴿١٥٠﴾ مووسـا گـوتی : (ئــەی) پەروەردگـــارم ! لــه مــن‌و برایەکـەم ببـــوورەو ، بمانخـــه نێـو بــەزەیی خۆتـەوه ، وه تـۆ بــه بـەزەیـیتـرینــی بــه بـەزەییـانـی ﴿١٥١﴾ بـه دڵنیایی یەوه ئەوانەی گۆلکیان بـه پەرســـتـراو گـرت ، تووڕەیــیان تــووش دەبــێ لــه پەروەردگاریانـــەوه، وه لــه ژیــانی دنیـــادا زەبـــوون دەبـــن ، وه بـــەو شـــێوەیەش ســـزای درۆ هـەڵبەســـتەران دەدەینـــەوه ﴿١٥٢﴾ وه ئەوانـــەی کـــه کـــردەوه خراپەکــانیان ئەنجــامداوه ، دوایـــی پــاش ئـەو گوناهــانه گــەڕاونەوه (لای خــوا)، وه بڕوایـــان هێنـــاوه ، مسـۆگــەر پەروەردگـــارت دوای ئــەو گوناهـــانه (ی کــه تۆبـەیـــان لێکـــردوون) لـــێبوردەی بـــه بـەزەییـــه ﴿١٥٣﴾ وه کـــاتێك تـــووڕەیی مووســـا نیشـــتەوه، لەوحەکــانی هـەڵگـرتنــەوه ، کـه لـه نێویانــدا ڕێنمـاییو بـەزەیــی (خــوا) هــەبوو ، بـۆ کەسانێك کـه لـه پەروەردگاریــان دەترســن (و بۆی ملکەچــن) ﴿١٥٤﴾)) .

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(وَٱتَّخَذُوا۟) : واتە : گرتیان ، پەیدایان کرد ، بەڵام لە چییەوە هاتوە ؟ دەڵێ : (الأَخْذُ : حَوْزُ الشيءِ وَتَحْصِيلُهُ) ، (أَخْذ) بریتیە لە دەست بەسەر داگرتنی شتێكو وەدەست هێنانی، (وَالإِتِّخَاذُ: إِفْتِعَالُ مِنْهُ وَيُعَدَّى إلى مَفْعُولَيْنِ، وَيَجْرِي مَجْرَى الجَعْلِ)، (إِتِّخَاذ) (إِفْتِعَال)ە، لە (أَخْذ)ەوە، بۆ دوو (مفعول) تەعەددا دەکات، وە مانای (جَعْل) دەگەیەنێ ، (جَعْل) واتە : گێڕان .

(حُلِيِّهِمْ) : (الحُلِيُّ جَمْعُ الحَلْي ، نَحُو : ثَدْي وَثُدِيِّ ، يُقَال : حَلِيَ يَحْلَى ، وقيل الحِليَةُ والجمع : حِلِيٌّ) (حُلِيّ) کۆی (حَلْي)، (حُلِي) واتە: خەشڵ ، وەك (ثَدِي) یانی : مەمك ، وە (ثُدي) واتە : مەمکەکان ، دەگوترێ : (حَلِيَ يَحْلَى) واتە : خۆی ڕازاندەوە بە خشڵ ، خۆی دەڕازێنێتەوە ، وە هەندێکیش گوتوویانە : (الحِلية) بە خشڵ دەگوترێ ، وە کۆیەکەشی (حِليّ)یە .

(عِجْلًا) : (وَلَدُ البَقَر) واتە: بەچکەی مانگا، جا چ نێر بێ ، چ مێ بێ ، یان بەچکەی ڕەشە وڵاخ ، چونکە وشەی (البَقَر) هەم مانگا دەگرێتەوەو، هەم گاش دەگرێتەوە .

(جَسَدًا) : (الجَسَدُ كالجِسْمِ لَكِنَّهُ أَخَصُّ، وَالجَسَدُ: البَدَنُ)، (جَسَد) بە بەدەنیش هاتوە، وەك (جِسْم) وایە، بەڵام تایبەتترە لە (جِسْم)، (جَسَد) ئەوەیە کە شێوەو دیمەنێکی هەبێ ، ئەوانەی کە وێنەیان دەکێشرێ ، بە شێوەی پەیکەرێك بە (جَسَد) ناو دەبرێن .

(خُوَارٌ) : (الخوارُ مُخْتَصٌّ بالبَقَرِ)، (خوار) واتە : دەنگی ڕەشە وڵاخ ، کە پێی دەگوترێ : بۆڕە ، ئنجا بۆڕەی گا بێ ، یان هی مانگا بێ .

(سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ ) : واتــه : کەوتـــه دەســـتیان ، لێـــرەدا مەبەســـت پێـــی پەشـێمانییـه (الـنَّـدم)، دوایـیش زیـاتر ئەو وشـەیه ڕوون دەکـەینـەوە .

(أَسِفًا ) : (الأَسَفُ : أَشَدُّ الحُزْنِ) ، واته : زۆر دڵتەنگیی (أَسِفَ عَلَيْهِ : غَضِبَ) ، واتـه : زۆر لـێی تـووڕە بـوو ، وە (آسَفَهُ) (أَغْضَبَهُ) واتــه : تـووڕەی کـرد .

(فَلَا تُشۡمِتۡ بِيَ ٱلۡأَعۡدَآءَ ) : (الشَّـمَاتَةُ : الفَـرْحُ ببَلِيَّـةِ مَـنْ تُعَادِيـهِ وَيُعادِيـكَ)، (شَمَاتَة) بریتیـه لـه دڵخۆش بـوون بــه گـرفتـاریی کەسێك کە دژایـەتیی دەکـەیو دژایەتییت دەکات، بۆیـه لـه فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺدا هـاتوه ، فەرموویـەتی : ﴿اللَّهُـمَّ إِنِّـي أَعُوذُ بِـكَ مِـنْ غَلَـبـةِ الـدَّيْنِ وَشَـمَاتَةِ الأَعْـدَاءِ﴾ {أَخْرَجَـهُ النَّسـائِيّ بـرقم : (٥٤٨٨) ، عَـنْ عَبْـدِ اللهِ بْـنِ عَمْـرٍو ، قَـالَ الأَلْبَـانِي: صَـحِيح}، واتــه : ئــەی خوایــه ! پەنــات پــێ دێنــم لــه کەوتنــه بــن قــەرز، وە لــەوە کە دوژمنــم پــێ خۆشــبێ .

(أَعَجِلۡتُمۡ ) : واتـه : ئایا پەلەتـان کـرد ؟ (العَجَلَـةُ: طَلَـبُ الشـيءِ قَبْـلَ أوَانِـهِ، وَهُوَ من مقْتضَى الشَّهْوَةِ)، (عَجَلَة) بریتیـه لەوە کە شتێك داوا بکەی پێش ئـەوەی کـاتی بـێ ، ئەویش بـەهـۆی زاڵبوونی ئـارەزووەوە بـەسـەر ئینساندا ، تووشی پەلە پـەل دێ ، پێشینانیـش گوتوویانه : (شـەیتان پەلەی کـرد، چـاوی خـۆی کـوێر کـرد)، وە گـوتراوە : (مَـنِ اسـتعْجَلَ شَّـيْئـاً قَبْـلَ أَوَانِـهِ ، عُـوقِـبَ بِحِرْمَـانِـهِ) هــەر کەسێك داوای شتێك بکات ، پێـش ئـەوەی کـاتـی خـۆی بـێ ، بـه بـێ بـەشـكرانی لەو شـته سـزا دەدرێ.

(وَذِلَّةٌ ) : (الـذُّلُّ : مَا كَـانَ عَنْ قَـهْرٍ ، وَالـذِّلُّ مَـا كَـانَ بَعْـدَ تَصَـعُّبٍ وَشَـمَاسٍ) وشـەی ( ذُلّ )و ( ذِلّ )مـان هــەن ( ذُلّ ) ئەوەیــه کەسـێك بـەهــۆی دەسـەڵات بـەسـەردا ڕانـانەوە ملـی پێ کەچ کـرابـێ ، بـەڵام ( ذِلّ ) ئەوەیـه کـه دوای یـاخیی بـوون ، وە دوای ئەوەی کە عاسـێ بـووە ، ئنجا ملی پێ کـەچ بکـرێ .

(ٱلۡمُفۡتَرِينَ ) : واتــە : درۆ هـەڵبەسـتــەران ، (استـعْمِـلَ (افتـرى) فِـي القُـرْآنِ فِـي الكَـذِبِ وَالشِّرْكِ وَالظُّلْمِ) وشـەی : (إِفْتَرَى) : لـە قورئـاندا بـۆ درۆو بـۆ هاوبـەش دانـانو بۆ سـتەم بـەکارهاتوە .

(نُسۡخَتِهَا ) : (النُّسْخَةُ : اسْمُ المسـتَنْسَخِ مِنْهُ) ، (نُسْخَة) نـاوە بـۆ ئـەو شـتەی کـە نوسـخەی لەبــەر دەگیـرێتــەوە ، وەك ئێسـتا دەگـوترێ : فتۆكـۆپی لەبــەر دەكـرێ ، نوسـخە بـەرداریـی لـێـدەكـرێ .

(يَرۡهَبُونَ ) : واتــە : دەترســن ، (الرَّهْبَـةَ وَالرَّهْـبُ وَالرُّهْـبُ : مَخَافَـةٌ مَـعَ تَحَـرُّزٍ وَاضْـطـرابِ) ئـەو سـێ وشـانە (رَهْبَـة ، رَهْب ، رُهْب) بــە مانـای ترسـن لەگـەڵ خـۆپاراسـتنو ، لەگـەڵ جۆرێـك لە شـڵـەژانـدا .

## مانای گشتی ئایەتەکان

دیارە گەورەترین گرفت کە ڕووبەڕووی مووساو هاڕوونی برای بۆتەوە ، بریتی بووە لە گۆلك پەرستیی ، کە وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان ، ئەم ئایەتانە باسی ئەو کارەساتە گەورەیە دەکەن، وە باسی ئەو گرفتو کێشە گەورەیە دەکەن ، کە بۆ مووساو هاڕوونی برای (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هاتۆتە پێش لەنێو گەلەکەیان : (بەنی ئیسڕائیل) دا.

خوای زانا یەکێکی دیکە لە بەسەرهاتەکانی مووساو هاڕوون لەگەڵ گەلەکەیان دا باس دەکاتو، دەفەرموێ : ﴿ وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِنۡ حُلِيِّهِمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌ ﴾، وە گەلی مووسا ﷺ لە دوای وی (واتە: دوای ئەوەی چوو بۆ دیداری پەروەردگاری، بۆ ئەوەی کە تەوراتی لێوەربگرێو ، بۆ ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ خوادا بکات، دوای سی (٣٠) ڕۆژ کە بەڕۆژوو بوو، دوایی دە ڕۆژی دیکەشی بۆی زیاد کراو بوو بە چل (٤٠) ڕۆژو شەو، لەو ماوەیەدا گەلی مووسا لەو خشڵەی کە پێیان بوو ، پەیکەری گۆلکێکیان دروست کرد، کە بۆڕەی هەبوو، (بۆڕەی دەهات) ، زانایان گوتوویانە : ئەویش ئەوە بووە کە کونێکیان لە پشتەوەی تێکردبوو، وە یەکێکیشیان لە لای دەمی، ئنجا ئەگەر با لە پشتەوەی دەداو لە ڕێی دەمییەوە دەردەچوو ، بۆڕەی لێدەهات، ﴿ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمۡ وَلَا يَهۡدِيهِمۡ سَبِيلًاۘ ﴾، خوای پەروەردگار بە سەرزەنشتەوە دەفەرموێ : ئایا نەیاندەبینی : نە قسەیان لەگەڵدا دەکاتو نە ڕێیەکیان پێشاندەدا، واتە: پەرستراوو پەروەردگار دەبێ بتوانێ ڕێ پێشانی ئەو خەڵکە بدات ، کە دەیپەرستن ، وە دەبێ بتوانێ قسەیان لەگەڵدا بکاتو ، ڕێنماییان بکاتو ئامۆژگارییان بکات، بەڵام ئەو هیچی نەبوو، هەر بۆڕەی هەبوو، بۆیە دەفەرموێ : ﴿ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴾، بە پەرستراوییان گرت ، وە لە ستەمکاران بوون ، شتێکی زۆر بێجێو ناماقووڵیان

کرد، چونکە (ظُلْم) بریتیە لە : (وَضْع شَيء فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ) دانانی شتێك لە شوێنێك دا کە شوێنی خۆی نەبێ ، هەڵبەتە پەرستنو بەندایەتییش دەبێ تەنیا بۆ خوا بێو ، هەر خوا ﷻ ڕێنمایی بەندەکانی دەکات ، ئەوەتە خوا ﷻ لەگەڵ مووسا پێغەمبەردا دواوە ، وە لەگەڵ باقی پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دیکەدا دواوە ، بەلاّم بە شێوەی ناڕاستەوخۆ، بە شێوەی ڕاستەوخۆ تەنیا لەگەڵ مووسادا دواوە ، کەواتە : پەرستراوو پەروەردگار هەر خوایە ﷻ کە ڕێنمایی بەندەکانی دەکاتو ، ئامۆژگارییان دەکاتو ، ڕاستو چەوتیان دەخاتە بەرچاو، بەلاّم گۆلکێك کە تەنیا دەبۆڕێنێ ، ئەوە (ظُلْم)ە بیپەرستی !

﴿ وَلَمَّا سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ ﴾، وە دوای ئەوەی کەوتە دەستیان ، چی کەوتە دەستیان ؟

١) مانای ئەوەیە کە شتێکیان لێ کەوتبێتە خوارو بەربووبێتەوەو بەدەست گرتبیانەوە .

٢) پەشێمانیی هاتە دەستیانەوەو هیچی دیکەیان دەستگیر نەبوو، تەنیا پەشێمانیی نەبێ .

٣) هەندێکی دی گوتوویانە : دوای ئەوەی پەنجەی پەشێمانییان گەزی .

٤) هەندێکیش دەڵێن : ﴿ سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ ﴾، هەر تەعبیرێکە لە زمانی عەرەبیدا ، بەکاردێ بۆ پەشێمانیی ، واتە : دوای ئەوەی کە پەشێمان بوونەوە.

﴿ وَرَأَوۡاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ ضَلُّواْ ﴾، وە بینییان کە ڕێیان ون کردووەو گومڕا بوون ، ﴿ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا رَبُّنَا وَيَغۡفِرۡ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ ، بێگومان ئەگەر پەروەردگارمان بەزەیی پێمان دا نەیەتەوەو لێمان نەبووریٚ ، بە مسۆگەریی ئێمە لە زیانباران دەبین.

واتە : تازە لە دەستمان چوو ، مەگەر خوای لێبوردە لە فریامان بێو لێمان ببووریٚو بەزیی پێمان دا بێتەوەو قەڵەمی عەفوو بەسەر ئەو هەڵەیەمان دابێنێ .

﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِى مِنۢ بَعْدِىٓ ﴾، وە کاتێك مووسا گەڕایەوە بۆ لای گەلەکەی : بە تووڕەییو بە خەفەتباریی ، ﴿غَضْبَٰنَ ﴾، واتە : (شدید الغضب) یانی : زۆر بە تووڕەیی وەك (عطشان) واتە : زۆر تینوو ﴿أَسِفًا ﴾، واتە : زۆر بە خەفەتباریی‌و دڵتەنگیی ، ﴿قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِى مِنۢ بَعْدِىٓ ﴾، پێی گوتن : خراپترین جێنشینایەتیی منتان کرد، ئاوا جێنشینایەتیی من دەکەن ! ئەگەر من لە نێوتان نەبم‌و لە لاتان نەبم ، ئاوا دینداریی دەکەن‌و بەندایەتیی بۆ خوا دەکەن ؟! ﴿أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ ﴾، بۆچی پەلەتان کرد ، تاکو فەرمانی پەروەردگار دێ، واتە : تاکو من وەحییم بۆ دێ‌و دەگەڕێمەوە لاتان ، بۆ پەلەتان کرد ، خۆ هەر دەهاتمەوە بۆ لاتان ، ﴿وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ ﴾، وە لەوحەکانی ، تەختەکانی فڕێ دان ، کە هەندێك دەڵێن : زومڕووت بوون ، هەندێك دەڵێن : یاقووت بوون ، هەندێك دەڵێن : بەردی زۆر بەقیمەت بوون، بەردی بەهەشت بوون، بەڵام ئێمە نازانین، گرنگ ئەوەیە چەند لەوحێك بوون کە تەوراتیان تێدا نووسراوە بوو ، وە واپێناچێ مووسا ﷺ نووسیبنەوە ، چونکە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ ﴾، ئنجا ئایا فریشتەکان نووسیوویانەوە ؟ یان خوای پەروەردگار بە شێوەیەك کە هەر بۆخۆی دەزانێ ، ئەو نووسینەی لەسەر نەخشاندوون ؟ گرنگ ئەوەیە ئەو تەختانە کە تەوراتییان تێدا نووسرا بوو ، فڕێیدان ، بۆچی فڕێیدان ؟ نەك وەك بێڕێزیی نواندن ، بەڵکو هەر دەستی پێوە گیرابوون ، وە دەبوو دەستیشی بکرێنەوە ، بۆئەوەی لێپرسینەوە بکات لەگەڵ هاڕوون‌و ، لەگەڵ خەڵکەکەو ، لەگەڵ سامیریی دا ﴿وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ ﴾، وە سەری برایەکەی گرت ، واتە : قژی سەری گرت‌و بۆ لای خۆی ڕایکێشا، دیارە هاڕوون دەبێ قژی سەری زۆر بووبێ ، ﴿قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى وَكَادُوا۟

يَقۡتُلُونَنِي ﴾، ئەویش گوتی : (واتە : هارِوون بە مووسای گوت) ئەی کوڕی دایکم ! وا دیارە هارِوونو مووسا برای بابو دایکیی یەکدی بوون ، بەڵام لێرەدا بۆچی هارِوون دەڵێ : کوڕی دایکم ؟ بۆئەوەی عاطیفەی زیاتر بجووڵێنێو، دایکی وەبیر بێنێتەوە ، ئەو دایکەی کە بە مەلۆتکەیی خستوویەتە تابووتەوەو بە رووباری داداوەو ، دوایی هاتۆتەوە بۆ لای دایکی ، بە چ میحنەتو گرفتارییەك دایکی بەخێوی کردوە ! ئنجا هارِوون دەڵێ : منو تۆ کوڕی ئەو دایکەین ، تۆ برای منی لەو دایکە ! ﴿إِنَّ ٱلۡقَوۡمَ ٱسۡتَضۡعَفُونِي ﴾، خەڵکەکە منیان بە بێهێز زانی، دیارە هەر بە تەنیا بووەو ، بێ پشتو قوەت بووە ﴿وَكَادُواْ يَقۡتُلُونَنِي ﴾، نیزیك بوو هەر بشمکوژن ، ﴿فَلَا تُشۡمِتۡ بِيَ ٱلۡأَعۡدَآءَ ﴾، کەواتە : هارِوون نەهی لێکردوونو، ئامۆژگاریی کردوونو ڕێی لێ گرتوون، بەڵام بەقسەیان نەکردوە، وە خەریك بووە بشیکوژن، بۆیە دەڵێ : دوژمنانم پێخۆش مەکە، ﴿وَلَا تَجۡعَلۡنِي مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، وە ڕەگەڵ کۆمەڵی ستەمکارانم مەخە ، کە وەك وان حیسابم بۆ بکەی ، چونکە : من ویستم ڕێیان لێ بگرم ، وە ئامۆژگارییم کردنو ، لێیان تووڕە بووم ، {قسەکەی هارِوون ئەوانە هەموویان دەگەیەنێ} بەڵام بەقسەیان نەکردم ، بەڵکو لەبەرئەوەی کە زانیان بێدەسەڵاتمو ئەوان زۆرو من کەم ، خەریك بوو بشمکوژن ، ئنجا کە هارِوون ئاوا پاساو بۆ مووسا دێنێتەوە ، وەك گوتراوە : (العُذْرُ عِنْدَ كِرَامِ النَّاسِ مَقْبُولٌ) پاساو هێنانەوە لەلای خەڵکی بەرِێز قبوول دەکرێ ، وە مووساش بەرِێزترین کەسی سەردەمو ڕۆژگاری خۆی بووە، بەڵکو پێغەمبەران بژاردەی نێو بەشەرن ، عوزرەکەی قبووڵ کردوە ، ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِأَخِي ﴾، گوتی : (ئەی) پەروەردگارم ! لە منو لە برایەکەم خۆش بە ، ﴿وَأَدۡخِلۡنَا فِي رَحۡمَتِكَۖ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، وە بمانخە نێو بەزەیی خۆتەوە ، بێگومان تۆ بە بەزەییترینی خاوەن بەزەییانی .

ئنجـا خــوا ﷻ دەفـەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، بێگومـان ئەوانەی کە گۆلکیان گـرت بـە پەرسـتـراو ، لـە پەروەردگـاریانەوە تووڕەییـان دەگاتــێ ﴿وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، وە لـە ژیـانی دنیـادا تووشـی زەبـوونیی‌و سەرشــۆڕیی دەبــن ، ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ ﴾، وە هەر بـەو شێوەیەش ئێمـە ســزای درۆ هـەڵبـەسـتەران دەدەیـن، ئـەدی ئایـا ئەوانـەی وا نەبـــــن ؟ ﴿ وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، بـەڵام ئەوانـەی کـە کـردەوە خراپەکـانیان ئەنجـام داون ، دوایی گەڕاونەوە (دوای ئەنجام دانی ئەو کردەوە خراپانە)، وە ئیمانیان هێناوە ، (واتـە : ئیمـانێکی تازەیـان هێنـاوەتــەوە ، ئیمـانێك کـە بیانگێڕێتــەوە لـە کــردەوەی خـــراپ) ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، بێگومـان پەروەردگــارت دوای ئــەو تۆبــەو گەڕانەوەیـە ، لـێبـوردەو بـە بـەزەیی یــە .

لــە کۆتــایی دا خـــوا دەفــەرموێ: ﴿ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ ﴾، وە کـاتێـك تووڕەیــی لـە مووسـادا بێـدەنگ بـوو، وەك بڵێـی : تـووڕەیی نەفەرێکـەو قسـە دەکـات ، یـانــی : دوای ئــەوەی تـووڕەیــی‌و ڕقــەکەی نیشــتـەوە ، ﴿أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَ ﴾، لەوحەکـانی هـەڵگــرتەوە (کـە تەوراتیــان تێـدا نووسـرا بـوو) ﴿وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴾، وە لە دوو توێی ئـەو لەوحانەشـدا ، ڕێنمـایی‌و بـە بـەزەیـی خـوا هەبوو ، بۆ کەسـانێك کە ترس‌و سـامی پـەروەردگـاریـان لە دڵ دایـە .

چونکـە : ئەوەی ترس‌و سـامی پەروەردگـاری لە دڵدا نەبـێ‌و ، شـەرم لە خـوا نەکـات ، دیـارە بڕوای بـە خـوا نیـەو ، بـابـای واش نە لـە تـەوڕات بـەهرەمەنـد دەبـێ‌و ، نـە لـە غەیـری تــەوراتیـش .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

# کورتەیەک لەبارەی بەسەرهاتی گوێلک پەرستنی گەلی مووساوە

**مەسەلەی یەکەم** : خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِنۡ حُلِيِّهِمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌ ﴾، وە گەلی مووسا لە دوایی وی لە خشڵەکەیان ، پەیکەری گوێلکێکیان دروست کرد ، کە بۆڕەی دەهات .

دیارە ئەم مەسەلەی گوێلك پەرستنەو وردەکارییەکەی لە سوورەتی (طه)دا هاتوە ، لە ئایەتەکانی (٨٣ تاکو ٩٨) هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا ، لە ئایەتەکانی (٥١ تاکو ٥٤)، وە هەر لە سوورەتی (البقرة)دا ، ئایەتەکانی (٩٢ و ٩٣)دا ، ئنجا ئێمە دیارە کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (البقرة)دا ، باسی ئەو ڕووداوەمان کردوە ، وە لە سوورەتی (طه)شدا ئەگەر تەمەن باقی بێ ، قسە لەسەر لەبارەی ئەوە (١٦) ئایەتەوە دەکەین ، کە لەوبارەوە هاتوون، بەڵام لێرەشدا پوختەیەکی ئەو ڕووداوە باس دەکەین ، لەبەر ڕۆشنایی هەموو ئەو ئایەتانەدا کە لە سوورەتەکانی : (البقرة)و (طه)دا هاتوون، لە (١١) خاڵدا باسی ئەو ڕووداوی گوێلك پەرستییە دەکەین :

١/ لەو ماوەیەدا کە مووسا چوو بۆ دیداری خوا ، بەتایبەت دە (١٠) ڕۆژەکەی کە درێژ کرایەوە ، کە خوا مۆڵەتی سی (٣٠) شەوی بۆ دانابوو ، دوایی دە (١٠)

ڕۆژی دیکـە، یان دە (١٠) شـەوی دیکـەی بۆ زیاد کرا ، ئنجا لـەو ماوەیـەی دە (١٠) شـەوو ڕۆژەدا ـ بەڕای بەنـدە وەك پێشـتریش باسـم کـرد ـ ئەو مەسـەلەی گۆلـك پەرستییـە هاتۆتـە پێـش .

٢/ سـامیـریی ئەو خەڵکەی بـە گۆلك پەرستیی گومـڕا کرد ، واتە : سـامیـریی ئـەو ئـاژاوە گـێڕو فیتـنـەچیی یـە بـوو ، کـە ئـەو بەڵایـەی بەسـەر بەنـی ئیسـڕائیـل هێنـاو تووشـی ئەو چۆرتـمـەی کـردن ، چونکـە لە سـووڕتی (طه) ئـایەتی (٨٥) دا خـــــوا ﷻ دەفـــــەرموێ : ﴿ قَالَ فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِنۢ بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾ ﴾، واتـە : (خـوا) فـەرمووی : ئێمـە لـە دوای تـۆ (ئـەی مووسـا !) گەلەکـەتمـان تاقیکردەوەو تووشـی بەڵامان کردن ، وە سـامیـریی گومڕای کـردن .

٣/ مەســەلەکەش ئــەوە بـوو کـە سامیـــریی هــەموو زێـــڕو خشـڵەکـانی بـــەنی ئیسڕائیلـی خــڕ کـردۆتــەوە ، پاشــان فڕێیـداوەتـە نێـو چاڵێکـەوە کـە قاڵبـی گۆلـکێکی تێدا بـووە، وە سـەرەنجام گۆلکێکی بۆ دروسـت کردوون، واتە: پەیکەری گۆلك کە بۆڕەی هەبووە، وەك لە سووڕەتی (طه)دا هاتوە، کـە دوای ئـەوەی مووسا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) دەگەڕێتەوە بۆ لایانو ، سـەرزەنشـتیان دەکـاتو، دەڵـێ : بۆچـی واتانـکـرد ؟ دەڵێن : ﴿ قَالُوا۟ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتـــە : گوتیــان: ئێمــە بەدەســـت خۆمــان نــەبوو ، کــە بەڵێــنمان لەگــەڵ تــۆدا هەڵوەشــاندەوەو، چـاوەڕێیمــان نەکــردی ، بەڵکــو ئێمــە خشـڵو زێـڕی ئـەو خەڵکــەمان پــێ بــوو، وە لێمــان بووبـوو بــە بـار (ئــەو خەڵـکەش یانــی : فیرعـەونییەکـان کـە خشڵەکانیـان لەگـەڵ خۆیـان هێنـا بـوو، ئـافرەتەکـانیان لێیـان وەرگــرتبوون) ، ئنجـا ئێمـە ئـەو خشـڵو زێرانـەمان فڕێـداو هەرووەهـا سامیـرییش فڕێیدا (واتە: فڕێیـان داوەتەوە چاڵێکەوە ، قاڵبو پەیکەری گۆلـکی

تێدا بووە ، وە ئاگرێکی خۆشیشی کردۆتەوەو زێڕەکە لەوێ دا قاڵ بۆتەوە)، ئنجا سەرەنجام پەیکەری گۆلکێکی بۆ دەرهێنان کە بۆڕەی هەبوو، وە گوتیان : ئەوە پەرستراوتانە، وە مووسا پەرستراوەکەی خۆی لێ ونبووەو لە بیری چووە ، (نازانێ ئەوە لێرەیە ، بۆی لە چیا دەگەڕێ) .

٤/ کەواتە : پاساوی دروست کردنو پەرستنی ئەو گۆلکە ، ئەوە بووە ، کە گوایە مووسا پەرستراوی خۆی لێ بزربووە ! ﴿فَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾﴾ طـه، گوتیان : ئا ئەوە پەرستراوتانە ، مووسا پەرستراوی خۆی لێ ونبووە.

٥/ هاڕوون زۆر ناڕازی بوو، زۆر ئامۆژگاریی کردن کە کاری وانەکەن، بەڵام بەقسەیان نەکرد، وەك لە سووڕەتی (طـه)دا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾﴾، واتە : وە بە دڵنیایی هاڕوون پێشتر پێی گوتن : ئەی گەلەکەم ! ئەوە پێی تاقی دەکرێنەوە ، وە پەروەردگارتان تەنیا خوای خاوەن بەزەیی یە ، بەدوای من بکەونو فەرمانبەریی من بکەن ، (فەرمانی من جێبەجێ بکەن) گوتیان : بەردەوام دەبین لەسەر پەرستنی ، هەتا مووسا بۆ لامان دەگەڕێتەوە .

کەواتە : ئەوەی کە لە پەیمانی کۆن ، لە تەوراتدا هاتوە ، کە گوایە هاڕوون گۆلکەکەی بۆ دروست کردوون ، قسەیەکی پووچە، چونکە لە تەوراتدا لەژێر ناوونیشانی : (هارونُ يَصنع العِجْل الذَّهبي) ، واتە : هاڕوون گۆلکی زێڕیی دروست دەکات دا، دەڵێ : (وَلَمَّا رَأَى الشَّعْبُ أَنَّ مُوسى قَدْ طالَت إقامَتُهُ عَلَى الْجَبَلِ ، اجْتَمَعُوا حَوْلَ هارُونَ ، وَقَالُوا لَهُ : هَيّا ! إصْنَعْ لَنَا إلَهاً يَتَقدَّمُنَا فِي مَسِيرِنَا ، لأَنَّنا لا نَدْرِي مَاذَا أَصابَ هَذَا الرَّجُل مُوسى الَّذِي أَخْرَجَنَا مِنْ دِيَارِ مِصْرَ، فَأَجابَهُمْ هارُونُ : (انْزِعُوا أَقْرَاط الذَّهَبِ الَّتِي فِي آذَانِ نِسائِكُمْ وَبَنِيكُمْ وَبَنَاتِكُمْ وَأْتُونِي بِها ، فَنَزَعُوها مِنْ آذَانِهِمْ وَجَاءوا بِها إِلَيهِ ، فَأَخَذَهَا مِنْهُمْ

وَصَهَرَها وَصاغَ عِجْلاً، عِنْدَئِذٍ قَالُوا : هَذِهِ إِلِهَتُكَ يَا إِسْرَائِيلُ الَّتِي أَخْرَجَتْكَ مِنْ ديار مِصْرَ)[١] ، واتە : کاتێك خەڵکەکە (واتە خەڵکی گەلی بەنی ئیسرائیل) دیتیان کە مووسا زۆری پێچوو ، لەسەر چیایەکە لە دەوری هاروون کۆبوونەوە ، (وا پێدەچێ لە ماوەی ئەو دە (١٠) ڕۆژەدا بووبێ ، کە درێژ کراوەتەوە ، بۆ میقاتەکە) پێیان گوت : وەرە پەرستراوێکمان بۆ دروست بکە ، لەم ڕێیەماندا پێش خۆمانی بدەینو لە پێشمانەوە بێ ، چونکە ئەو پیاوە (مووسا) کە ئێمەی لە وڵاتی میسرِ هێنایە دەر ، نازانین چی لێهاتەوە ؟ هارونیش پێی گوتن : ئەو گوارەو زێڕانەی کە لە گوێی ژنەکانتانو کچەکانتانو کورەکانتانن ، لە گوێیان دابرِنن ، بۆم بێنن ، ئەوانیش لە گوێیان دارنینو بۆیان هێنا ، وە ئەویش لێی وەرگرتنو قاڵی کردنەوە ، وە گۆلکێکی لێ دروست کردن ، ئنجا لەو کاتەدا گوتیان : ئەی گەلی ئیسرائیل ! ئا ئەوە پەرستراوی تۆیە ، ئەو پەرستراوەی کە تۆی لە میسر دەرهێناوە .

هەڵبەتە مانای ئەوە نەبووە کە برِوایان بە بەدیهێنەر نەبێ ، بەڵام گوتوویانە : ئەو پەرستراوەی کە لە فریای ئێمە هاتوە ، ئەوە بووە .

٦/ ئنجا مووسا دوای ئەوەی ئاوا گەلەکەی دەدوێنێ : ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي ٨٦ ﴾ ، واتە : (مووسا) گوتی : ئەی گەلەکەم ! ئایا پەروەردگارتان بەڵێنێکی باشی پێنەدابوون ؟ ئایا بەڵێنی خوا زۆری پێچوو، یان ویستتان توورِەیی لە پەروەردگارتانەوە دابەزێتە سەرتان ؟ ئاوا پەیمانی منتان هەڵوەشاندەوەو ، بەڵێنتان لەگەڵ مندا نەبردە سەر ، (کە پێم گوتن : خۆرِاگربن ، تاکو دێمەوە بۆ لاتان ، هیچ مەپەرستن بێجگە لە خوا) .

ئەوانیش دیارە بەو جۆرە وەڵامیان داوەتەوە کە پێشتر گوتمان .

---

١) التفسير التطبيقي ، العهد القديم ، سفر الخروج ، الإصحاح : ٣٢، ص : ١٩٤ .

ئەمجارە ڕووی کردە هارونی بـرای : ﴿ قَالَ يَـٰهَـٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴿٩٣﴾ ﴾طـه، (مووسا) گوتـی : ئەی هارون ! کاتێك بینیت ئەوانـە گومـڕا بوون ، چ شتێك ڕێی لێگرتی کە شوێنم بکەوی ، ئایا سەرپێچییت لە فەرمـانی من کـرد ؟

دیـارە هـارونیش وەڵام دەداتـەوە ، وەك دوایـی باسـی دەکەیـن .

٧/ ئنجا مووسا بـە دەم ئەو قسانەیەوە ، ڕیش و قژی هـارونیشـی ڕاکێشـاوە ، بۆیـە هـارون لـە وەڵامـدا گـوتی : ﴿ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓ ۖ إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴿٩٤﴾ ﴾ طـــه، (هارون) گوتـی : ئەی کوڕی دایکم ! ڕیش و سـەرم، (واتـە: ڕیش و قژی سـەرم) مەگرە، ڕایمەکێشـە، من ترسـام کە دوایی بڵێـی : بەنی ئیسـڕائیلت تێکبـەرداوەو بـەش بـەش و پەرتـەوازەت کـردوون ، هـەندێکـیانت بـە گژ هـەندێکـیانەوە نـاون ، چاوەڕێـی قسەی منت نەکرد ، هـەتا بۆخـۆم دێمەوەو کێشـەکە چارەسـەر دەکەم .

دیارە لە سورەتی (الأعراف)دا ، هارون گوتوویـەتی : ﴿ قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى وَكَادُواْ يَقْتُلُونَنِى ﴾، واتە: گوتـی: ئەی کـوڕی دایکم ! خەڵـکەکە منیان بە بێهـێز بینیوە، خەریك بوو بشـمکوژن ، ﴿ فَلَا تُشْمِتْ بِىَ ٱلْأَعْدَآءَ وَلَا تَجْعَلْنِى مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، دوژمـنم پێخـۆش مەکـەو ڕەگـەڵ کۆمەڵـی ستەمکارانم مەخـە .

بەڵام لێرەدا گوتوویـەتی : ترسی ئەوەم هەبوو دوایی بڵێی : بـەنی ئیسـڕائیلـت پێك وەرکردوە پەرتـەوازەت کـردوون ، کەواتـە: لـەلایەکەوە لـەوە ترسـاوە مووسـا بڵێ : پێکت وەرکردوون، لە لایەکیشەوە ئەوان هـارونیـان بـە بێهـێـز زانیوە، وە هەڕەشەی کوشـتنیشیان لێکردوە ، هەموو ئەوانـە دیـارە هۆکـاری ئـەوەبوون کـە هـارون (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لـەوە زیـاتر کە کـردوویـەتی ، بۆی نەکرێ .

هەروەها لە (الأعراف)دا تەنیا باسی قژی سەر کراوە : ﴿ وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ ﴾ واتە: قژی سەری برایەکەی گرت ، بەڵام لە سوورەتی (طه)دا باسی ریش‌و قژیش کراوە ، بەڵام ئەو دووانە تێك ناگیرێن : لە سوورەتی (الأعراف)دا تەنیا باسی قژی سەری کردوە ، بەڵام لە سوورەتی (طه)دا باسی ریشیشی کردوە ، بۆ ئەوەی بۆمان دەرکەوێ ، کە وێڕای قژی ، ریشیشی لەگەڵ باداوە ، وە بۆ لای خۆی ڕایکێشاوە وەك سزادانێك ، دیارە وەك پێشتر گوتمان : مووسا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ) بە گشتی پیاوێکی تەبیعەت توند بووە ، بەڵام ناشڵێین : ئەو تەبیعەت توندییەی لە سنووری شەرعی بردۆتە دەرێ ، بەڵام بە لای توندیی‌و سەختیی دابووە، بە پێچەوانەی هارونەوە کە بەلای نەرم‌و نیانیی دابووە .

٨/ پاشان لە قۆناغی سێیەمدا ، مووسا ڕوو دەکاتە سامیریی‌و پێی دەڵێ : ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ ﴾ طه ، گوتی : ئەی سامیریی ! تۆ چیت کردوە ؟ یان تۆ بۆ وات کردوە ؟ دیارە ئەویش درۆو دەلەسەیەك ڕێك دەخاو ، ئێستاش لەگەڵدا بێ ، هەندێك لە توێژەروانی قورئان، یاخود زۆربەیان ، بڕوایان بەو درۆو دەلەسەیە هەیە ، کە سامیریی گوتوویەتی : ﴿ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُواْ بِهِۦ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذْتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ﴿٩٦﴾ ﴾طه ، واتە : (سامیریی) گوتی : ئەوەی کە من بینیم ئەوان نەیانبینی (من شتێکم بینی ئەوان نەیانبینی)، بۆیە من چەنگێکم لە شوێنەواری نوێنەر هەڵگرت، وە فرێمداو نەفسم ئەوەی بۆ جوان کردم (نەفسم ئەوەی بۆ ئاسان کردم) کە من بەو شێوەیە بکەم .

ئنجا ئایا ئەو (رسول)ە کێ بوو ؟ ئەو (قبضة)یە چی بوو ؟ ئەو شوێنەوار (أثر)ە چییە ؟ لە ڕاستییدا هیچیان شتێکی وایان لەسەر نیە کە جێگای

دڵنیایی بێ ، بۆیە من پێم وایە کە ئەوە هەر درۆیەکەو سامیریی بۆخۆی ڕێکی خستوە ، بۆئەوەی خۆی لە سزاو لێپرسینەوەی مووسا ﷺ دەرباز بکات .

بەڵێ وەك گوتم لە تەفسیرەکاندا هەندێ شت باسکراوە، کە لە ڕاستییدا پشت ئەستوور نیە بە هیچ بەڵگەیەك، بەلاَم با هەر ئاماژەیەکیان پێ بکەین، بۆ وێنە :

١ - (إبن كثير) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ : (قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُواْ بِهِۦ ، أي : رَأَيْتُ جِبرِيلَ حِيْنَ جَاءَ لِهَلاَكِ فِرْعَوْن، فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ، أي : مِنْ أَثَرِ فرسه)[1] واتە : {(سامیریی) گوتی: من شتێکم بینی ، ئەوان نەیانبینی} واتە : من جبریلم بینی کاتێك هات فیرعەونو دارو دەستەکەی لە بەین بەرێ، وە کە دەشڵێ : (من چنگێکم لە شوێنەواری پێغەمبەر، یان نێرراو هەڵگرت) ، واتە : لە شوێنەواری ئەسپەکەی جبریل .

کە ئەگەر بەپێی ئەم تەفسیرە بێ ، مەبەست لە (رسول) جبیریلە ، دوایی دەڵێ : (وَهَذَا هُوَ المشْهُورُ عِنْدَ كَثير مِنَ المفَسِّرِين أَوْ أَكْثَرُهُمْ)، واتە: ئەو مانایە باوە لەلای زۆر لە توێژەروان، یان زۆربەیان .

٢ - {قَالَ مُجَاهِد : (فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ): مِنْ تَحْتِ حَافِرِ فَرَسِ جِبرِيل ، قَالَ : وَالقَبْضَةُ مِلءُ الكَفّ، وَالقَبْضَةُ بأَطرافِ الأَصابِع} واتە : موجاهید گوتوویەتی : یانی لە ژێر سمی ئەسپیی جبریل چەنگێکم گرت ، وە مەبەست لە (قبضة) ئەوەیە کە پڕ بە لەپە دەست بێ ، هەروەها بەوە دەگوترێ کە بە پەنجەکانی دەست بگیرێ .

وە هەروەها گوتوویەتی : (نبذ السامري ، أي : أَلْقَى مَا كَانَ فِي يَدِهِ عَلَى حِلْيَةِ بَنِي إِسْرَائِيل ، فَانْسَبَكَ عِجْلاً جَسدا لَهُ خوار حَفِيفُ الرِّيح فيه ، فَهُوَ خوارُهُ) واتە : ئەوەی کە لە دەستی دابوو، ئەو چنگەی بەسەر

---

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير : ص ٨٥٢.

خشڵی بەنی ئیسرائیل دا کرد ، ئەو خشڵەی کە کۆیان کردبۆوە، یەکسەر بوو بە گۆلکێك کە بۆڕەی هەبوو، کە با لێی دەدا، دەبوو بە بۆڕە .

٣- هەروەها (عبد الرحمن بن ناصر بن عبد الله بن السَّعدي) هەمان شتی هێناوە لە تەفسیرەکەی خۆی : (تفسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان)دا ، وە زۆر لە توێژەرەوانی دیکەی قورئان ، خوا پاداشتیان بداتەوە، ئەو قسەیان هێناوە .

بەلاّم من پێم وایە نە ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ ، وە نە هیچ بەڵگەیەکیش هەیە لەوبارەوە، ئەدی ئایا سامیریی بۆچی وای کرد ؟ من دەڵێم : سامیرییەك بتوانێ خەڵك بۆ گۆلك پەرستیی بانگ باکات، دەشتوانێ درۆیەك بۆخۆی ڕێك بخات، وە ئەوەش هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە کە خوای پەروەردگار جبریلی بە سواری ئەسپ ناردبێ ، ئنجا ئەگەر ناردیشی ، مانای چییە کە چنگە گڵێك لە ژێر سمی ئەو ئەسپە هەڵبگرێ ؟ ئنجا سەیر لەوەدایە کە هەندێ لە توێژەرەوان گوتوویانە : ئەو ئەسپە بەسەر هەر شتێکدا ڕۆیشتبێ ،ژیانی هاتۆتە بەر !

بەلاّم من پێم وایە سامیریی کە ئەو قسانەی کردوون ، وەك بیانوو ، پاساوێك هێناونیەوە ، نەك حەقیقەتیان هەبێ ، بەڵکو درۆیەکەو کردوویەتی، وە ئەگەر ئێمە درۆ پاڵبدەینە لای سامیریی هیچ ستەمێکمان لێ نەکردوە، چونکە کەسێك گۆلك بۆ خەڵك دروست بکاتو بڵێ : وەرن بیپەرستنو ، لە جیاتی خوا بیکەنە پەرستراو درۆشی لێ دەوەشێتەوە ! بۆیە ئەو هەموو پینەو پەڕۆیەی توێژەرەوان بۆیان کردوە ، شایستەی نیە ، کە وەك گوتم : پینەو پەڕۆیەکیشە ، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە :

١) کێ دەڵێ : (رسول) واتە : جبریل ؟ خوای پەنهانزان واینەفەرمووە.

٢) پاشان تۆ بێنی ئەسپێکیشی بۆ زیاد بکەی .

٣) ئنجا خۆڵی بنی سمی ئەسپەکەشی ڕەگەڵ بخەی ، چونکە سامیریی تەنیا گوتوویەتی : ﴿ فَقَبَضۡتُ قَبۡضَةٗ مِّنۡ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ ﴾، کە

دیارە هیچی ڕوون نیە ، مەبەست پێی چییە ؟ بۆیە من باوەڕم وایە ، ئەوە هەر درۆیەکە سامیریی بۆخۆی ڕێکی خستوە .

٩/ ئنجا ئایا مووسا چۆن سزای سامیریی داوە ؟ خوا لەسەر زمانی مووسا لەوبارەوە دەفەرموێ : ﴿ قَالَ فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ﴾، واتە: دە بڕۆ تۆ لە ژیانداى دەبێ هەر بڵێی : لێم دووربن و لێتان دوور دەبم (لَا مِسَاسَ ) یانی : کەس دەستت لێ نەداو ، دەست لە کەس نەدەی ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مووسا ﷺ ئەو پیاوە فیتنەچییو ئاژاوەگێڕو فێڵبازەی بەوە سزا داوە ، کە تێکەڵ بە خەڵك نەبێو کەس نەیدوێنێو کەس نەدوێنێ ، یانی : بە پێی ئەم ئایەتە : مووسا ﷺ سامیریی نەفی کردوە .

دیارە هەندێ لە زانایان ئەو هەڵوێستەی مووسا بەرانبەر سامیریی بە بەڵگە دێننەوە ، لەسەر ئەوە کە ئەوانەی بیدعەت دەکەنو داهێنان دەکەن لە ئاییندا، دەبێ دوورییان لێ بکرێ ، وە قسەیان لەگەڵ نەکرێ، بۆ ئەوەی ئەو داهێنانو بیدعەتەی دایانهێناوە لە ئاییندا ، نەتوانن بڵاوی بکەنەوە بەنێو خەڵکدا، وە خەڵك بخەنە ژێر کاریگەریی خراپی خۆیانەوە .

بەڵام بێگومان ئەو مەسەلەیە کاتو شوێنو شێوازی خۆی هەیە، پاشان دەبێ دیاریش بێ ، کە ئایا ئەو شتە بیدعەتە یان نا ؟ نەك وەك ئێستا لەم ڕۆژگارەدا هەندێ بەناو سەلەفیی هەر کەس کە بۆچوونێکی هەبوو لەگەڵ بۆچوونی ئەوان دا نەگونجا ، نازناوی داهێنەر (مبتدع)ی لێ هەڵدەدەن، وەك ناو زڕاندن ، پاشان بڕیاری ئەوە دەدەن کە نابێ ئەو کەسە سڵاوی لێ بکرێو سەردانی بکرێو ببینرێو تێکەڵیی لەگەڵ بکرێ !! کە لە ڕاستییدا دروست نیە هەر کەسێك هەڵسا ، ئەم بڕیارە بەسەر خەڵك دا بدات ، کە گۆشەگیریی لێ بکرێو ، سڵاوی لێ نەکرێ ، وە ئەگەر ئەم جۆرە نەخۆشییە لە نێو مسوڵمانانددا بڵاوبێتەوە ، ئەوە دەبێ هیچ کاتێك چوار نەفەر سڵاو لە یەکدی نەکەن ، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە ڕۆژگاری ئێمەدا ناویان بە سەلەفیی ڕۆیشتوە : کەم وایە چوار نەفەریان پێکەوە گونجاوبن، لەبەر

ئەوەی بەرنامەیەکی ڕێك و پێك و پەیڕەو پرۆگرامێکی ئیتیفاق لەسەر کراویان نیە، هەمیشە هەر خەریکی شەڕەقسەو مشتومڕن لەگەڵ خەڵك دا ، وە هەمیشەش لەنێو خۆیان دا خەریکی دژایەتیی یەکدین و تۆمەت دەدەنە پاڵ یەکدی ، ئنجا ئەگەر بەو پێیە بێ ، دەبێ پێشێ لەنێو خۆیان دا سڵاو لە یەکدی نەکەن ، کە زۆر جاریش وا دەکەن ! بەڵام بێگومان ئەوە شتێکە خوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نە ناردۆتە خوار، وە ئەو زانایانەی ئەو قسەیان کردوە ، زانای موعتەبەرو پێشەواو چاك تێگەیشتوون لە ئایین، وە کەسانێکی ڕازاوەن بە ڕەوشتە بەرزو جوانەکان، وە زۆر بە ئینصافن، وە زۆر ساغ و سافن، ئنجا هەر کاتێك کەسانێکی وا هەموویان یەك دەنگ بوون، کە فلانکەس داهێنانی کردوە لە ئاییندا، بڕیارێکی وای لەسەر بدەن ، ئاساییە خەڵك پێوەی پابەندبێ ، بەڵام هەر سێ چوار مسوڵمان ڕاست ببنەوە ، بێ ئەوەی بۆخۆیان باش لە ئایین حاڵی بووبن ، بێنن لیستێك دروست بکەن و ناوی هەندێ خەڵکی تێ بکەن ، ئەوە هیچ نیەو ، ماڵی قەڵبەو سەر بە خاوەنیەتی ، وە ئەوانە کەسانێکن خۆیان دادەبڕن لە خەڵك ، نەك خەڵك لە کەسانی بیدعەتچیی دوور بخەنەوە، وەك گوتراوە : (تفی بەرەو سەر بۆ خاوەنی دەگەڕێتەوە) چونکە ئەگەر کەسێك قسەیەك بە یەکێك بڵێ : شایستەی نەبێ، ئەوە ئەو کەسەی قسەکەی کردوە ، بۆخۆی زیاتر زەرەر دەکات ، لەو قسەیەی کە کردوویەتی .

١٠/ ئنجا مووسا ﷺ جگە لە سزای دنیایی، هەڕەشەی سزای دواڕۆژیش لە سامیریی دەکات ، وە پەرستراوەکەشی لە پێش چاوی دەسووتێنێ : ﴿ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ ۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا ۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ﴾، وە لە دواڕۆژیش دا سزات بۆ هەیە، وە تەماشای ئەو پەرستراوەشت بکە ، کە بەردەوام بووی لەسەر پەرستنی و بە گەورەت دەگرت و بە پیرۆزت دەگرت ، ئەوە دەیسووتێنین ، دوایی خۆڵەکەشی بە دەریادا بڵاودەکەینەوەو پەرش و بڵاوی دەکەینەوە .

١١/ وە لە کۆتایی دا مووسا ﷺ بە سامیریی بە تایبەتییو بە بەنی ئیسرائیل بە گشتی دەڵێ : ﴿ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴾، واتە : پەرستراوی ڕاستەقینەتان ، (کە شایستەی پەرستنە) تەنیا ئەو خوایەیە کە زانیاریی بە هەموو شتێك هەیە .

کەواتە : هەر شتێکی دیکە بپەرسترێ، چ گۆلکی زێڕ بێ ، چ داروبەر بێ ، چ مرۆڤ بێ ، چ ئێسكو پڕووسك بێ ، چ گۆڕ بێ ، چ مانگو خۆر بێ ، چ مشكو مار بێ ، چ هەواو ئارەزوو بێ ، چ پارەو پوول بێ ... هتد ، هەرچی بێ ، جگە لە خوا شایستەی پەرستران نیە ، وە خاوەنەکەی لەسەر پەرستنەکەی عەیبدارو گوناهبارو قەرزار دەبێتەوە، بەڵکو هاوبەش بۆ خوا دانان گوناهێکە ، کە هەرگیز خوای بێ هاوتا قەڵەمی عەفووی بەسەردا ناهێنێ ، وەك لە سوورەتی (النساء) لە تەفسیری ئایەتی : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾دا، بە تەفصیلێ باسمان کردووە ، نامەوێ لێرەدا بچمەوە سەری ، خوا دەفەرموێ : بە دڵنیایی خوا لەوە نابوورێ کە هاوبەشی بۆ پەیدا بکرێ ، بەڵام جگە لەوە لە هەر کەسێك بیەوێ دەبوورێ، واتە : دەگونجێ بێ تۆبەش لە گوناهەکانی دیکە ببوورێ ، بەڵام هەرگیز ناگونجێ بەبێ تۆبەو گەڕانەوە ، لە هاوبەش بۆ خوا دانان ببوورێ، دیارە تۆبە هەموو گوناهێك دەسڕێتەوە : کوفر ، شیرك ، نیفاقو دووڕوویی، ئیلحاد، یان هەر گوناهێکی گەورە ، بە گەڕانەوە بۆ لای خوا هەر هەمووی دەبووردرێ ، بە مەرجێك مرۆڤ بڕیار بدات جارێکی دیکە نەگەڕێتەوە سەر ئەو حاڵەتەی پێشوویو ، خۆی سافو ساغ بکاتەوە بۆ لای خوای پەروەردگار .

<u>مەسەلەی دووەم</u> : کە دەفەرموێ : ﴿ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴾، واتە: ئایا نەیاندەبینی، یان نەیاندەزانی : کە

نە قسەیان لەگەڵدا دەکاتو ، نە ڕێشیان پێشان دەدات، بە پەرستراویان گرتو ستەمکار بوون .

لێرە ئاوای فەرمووە ، وە لە سوورەتی (طه)دا فەرموویەتی : ﴿ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴿٨٩﴾ ﴾، واتە: ئایا نەیاندەبینی ، کە (ئەو گۆلکە) هیچ قسەیەکیان بۆ ناگێڕێتەوە ، وە هیچ زیانو سوودێکی بەدەست نیە ؟! واتە : نە دەتوانێ زیانیان لێ دوور بخاتەوەو ، نە دەشتوانێ سوودیان پێ بگەیەنێ ، کە دیارە لە نێوەڕۆك دا هەر دەبنەوە بە یەك، چونکە ئایەتەکەی پێشێ دەفەرموێ : قسەیان لەگەڵ ناکات، وە ڕێیان پێشان نادات، یانی : ڕێی ڕاست، لێرەشدا دەفەرموێ : ئایا نەیاندەبینی : کە هیچ قسەیەکیان بۆ ناگێڕێتەوە ، واتە : ئەگەر قسەی لەگەڵدا بکرێ، وەڵامی قسەیان ناداتەوە ؟ وە هیچ زیانو سوودێکی ئەوانیشی بەدەست نیە ؟

دەشگونجێ بڵێین : مەبەست لە : ﴿وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴾، ئەوەیە : ناتوانێ زیانیان لێ بدات وەك سزادان ، وە ناشتوانێ سوودیان پێ بگەیەنێ ، وەك پاداشتدانەوە، کەواتە: پەرستراو دەبێ فەرمایشتی هەبێو ، ڕێنمایی کردنی هەبێ ، وە دەبێ توانای زیان گەیاندنو ، سوودمەندکردنی هەبێ ، ئەوەش تەنیا لە خوای تاكو پاك دا بەدی دەکرێ ، کەواتە : هەر ئەو شایستەی پەرستنە .

ئنجا ئەوەی کە تێبینی دەکرێ، ئەوەیە کە هەر کات باسی گۆلك پەرستیی دەکرێ لە قورئاندا ، وشەی (إِله) دوای (اِتّخَذُوا) یان (اِتَّخَذْتُم) نەهاتوە ، چونکە (اِتّخَذُوا) (إفتعال)ە ، لە (أَخَذَ)ەوە هاتوە ، واتە : زۆر بە گرنگیی پێدانەوە گرتی ، وە هەروەها (اِتَّخَذْتُم) واتە: بە گرنگیی پێدانەوە گرتتان ، چییان گرت ؟ واتە : بە پەرستراویان گرتو ، کردیان بە پەرستراوی خۆیان ، ئنجا بۆیە وشەی (إله) دوای (اِتّخَذُوا) یان (اِتَّخَذْتُم) نەهاتوە، چونکە لە ڕاستییدا گۆلكو پەرستراوێتیی (ألوهية)یان نەگوتوە !

بەلام سبحان الله ! خەڵك ئامادەی هەڵخەڵەتێنران و فێڵ لێکران و کڵاو لەسەرنرانیان زۆرە ، مرۆڤ کاتێك کە عەقڵ و دڵی بە نووری وەحی ڕۆشن نابێتەوە ، زۆر بە ئاسانیی فێڵی لێ دەکرێ و کڵاوی لەسەر دەنرێ ، بە تایبەتی لە ڕووی مامەڵەکردن لەگەڵ نادیارو خواو دۆزەخ و بەهەشت و ... هتددا ، تەماشا دەکەی فەیلەسووفەکانی یۆنانی ، وەك : سوقرات و ئەرستۆو ئەفلاتوون کە بە ڕای هەندێك کەس گەورەترینی عەقڵەکانی مرۆڤ بوون ! کەچی لە ناسینی خوای پەروەردگاردا تووشی هەڵەی زۆر سەیرو سەمەرە بوون ، کاتێك قسەکانیان و هەڵوێستەکانیان لەوبارەوە بەراورد دەکەی ، لەگەڵ فەرمایشت و هەڵوێستی پێغەمبەران دا ، قسەکانیان وەك قسەو بیرو بۆچوونی منداڵان دێنە بەرچاو، دیارە خوا هەر بایی ئەوەندە عەقڵی بە مرۆڤ داوە ، کە بتوانێ مامەڵە لەگەڵ جیهانی ماددیی دا بکات ، وەك دەفەرموێ : ﴿ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ ۝٧ ﴾الروم ، واتە : ڕواڵەتێك لە ژیانی دنیا دەزانن ، بەلام دەربارەی دواڕۆژ بێئاگان ، بۆیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ جیهانی نادیارو ، مامەڵەکردن لەگەڵ خوای پەروەردگارو فریشتەکان و دواڕۆژو دۆزەخ و بەهەشت و ڕووح و ئەو بابەتانەدا ، کە پەیوەندییان بە نادیار (غیب)ەوە هەیە ، واتە : بابەتەکانی بوونناسیی (Ontogy)و ، ئیمان و عەقیدەو ، خواپەرستیی و ، ڕەوشت و ئاکار ، مرۆڤ دەبێ بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، وە بۆ لای وەحی خوا ﷻ، وە وەحی بکاتە چرایەك و بەر پێی خۆی پێ ببینێ ، ئەگەرنا تووشی لادان و خلیسکان و هەڵەی سەیرو سەمەرە دەبێ ، وەك ئێمە لە بەرگی یەکەمی : (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا ، خستوومانتە ڕوو ، کە تێیدا باسی بووناسییمان کردوە ، بە ناونیشانی : (الإسلام معرفة صحيحة بالخالق والخلق) وە ئەو بەرگەمان هەموو بۆ ئەو بابەتە تەرخان کردوە ، کە بووناسیی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە چۆنە ؟ قورئان چۆن باسی خوای بەدیهێنەرو باسی بوونەوەر دەکات ؟ وە چۆن باسی مرۆڤ دەکات ؟ وە چۆن باسی ژیان دەکات ؟ وە چۆن باسی دنیاو دواڕۆژ دەکات ؟.

**مەسەلەی سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا سُقِطَ فِي أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْا أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا قَالُوا لَئِن لَّمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾، سەرەتا دەڵێین: ڕیزبەندیی کاتیی (الترتيب الزمني) ئەم پەشیمانبوونەوەیەی بەنی ئیسرائیل، پاش گەڕانەوەی مووسا بووە، بەڵام خوای کاربەجێ پێش ئەوەی باسی گەڕانەوەی مووسا بکات، باسی ئەو پەشیمانبوونەوەیان دەکات، بۆ دەرخستنی شوومی بتپەرستیی، کە هێندە سەرەنجامێکی شوومو بێخێری هەبووە، بۆیە خوای زاناو شارەزا پێشیخستوە، ئەگەرنا لە واقیعدا کە ڕووی داوە: دوای ئەوەی مووسا گەڕاوەتەوەو سەرزەنشتی کردوونو، سەرکۆنەی کردوونو، قسەی لەگەڵ کردوون، ئنجا پەشیمان بوونەتەوە.

ڕستەی (سُقِطَ فِي أَيْدِيهِمْ) واتە: پەشیمانبوونەوە، زۆر لە شارەزایانی زمان دەڵێن: پێش دابەزینی قورئان ئەم تەعبیرە بەکارنەهێنراوە، یانی: عەرەب عادەتیان نەبووە ئەم تەعبیرە بەکاربێنن بۆ پەشیمانبوونەوە، هەندێکیش گوتوویانە بەکارهێنراوە.

وە شارەزایانی زمان چەند هۆکارو تەفسیرێکیان بۆ ئەم تەعبیرە باسکردوون:

١/ هەندێ دەڵێن: بە مانای پەشیمانبوونەوە دێ، دەڵێن: واتە: لە خەمو خەفەتان دوای ئەوەی پەشیمان دەبنەوە، دەستی خۆیان دەگەزن، یانی: دەستیان خستە نێو دەمیانو گەزتیان.

٢/ هەندێکیان گوتوویانە: یانی: لەپە دەستیان پێکدادا، وەك بڵێی گوتیان: پەککو، کە ئەمە ئاماژەیەکی باوە لە نێو مرۆڤایەتیی دا، کە تەعبیر لە پەشیمانبوونەوە دەکات.

٣/ هەندێکی دی گوتوویانە: (سُقِطَ فِي أَيْدِيهِمْ) واتە: پەشیمانیی کەوتە دەستیان، یانی: تاکە شتێك کە هەڵیانگرتەوە، وەك لە کوردەواریی دا باوە،

دەڵـێن : (دە هەڵێگـرەوە !) یـان (دە بیخـۆ ! هیـچیـت بـۆ نەمایـەوە) ، یـانی : ئەوەی کە کەوتە دڵیانو کەوتە دەستیان ، تەنیـا پەشـیمانبـوونەوە بووو ڕەنـج بـە خەسـاریـی بـوو .

٤/ هەندێکیش گوتوویانە : (سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ ) واتە : وەك کەسێك کە شتێك دەکەوێتە سەر دەستیو لە دەستی بـەردەبێتـەوە هێزی نامێنـێ ، ئـاوا ئەوانیـش بـەو شـێوەیان لـێ هاتوە .

گـرنگ ئەوەیـە مەبـەسـتی خـوای کاربـەجێ لـەم تەعبیـرە ئەوەیـە ، کـە بۆیـان دەرکـەوت : هـەڵـە بوونو پەشـێمانـبوونـەوە .

پاشان چییان گوت ؟ وە ئایا لـە کێ فـێری ئەو قسەیە بوون ؟ بـە دڵنیـایی لـە مووسـاوە فێـر بـوون : ﴿ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا رَبُّنَا وَيَغۡفِرۡ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾، گوتیـان : ئەگــەر پەروەردگــارمان بـەزەیـی پێمانـدا نەیەتـەوەو، لـێمـان نەبـووڕێ ، ئەوە بێگومـان ئێمـە لە زیانبـاران دەبیـن .

**مەسـەلەی چوارەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا قَالَ بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي مِنۢ بَعۡدِيٓۖ أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡ ﴾، کاتێك مووسـا بـە تووڕەییو خەفەتبـاریی گەڕایـەوە بـۆ لای گەلەکـەی ، گـوتی : ئێـوە خراپتـرین جێنشـینایەتییتـان کرد لە دوای من ، (واتـە : ئـاوا جێنشـینایەتی مـن دەکەنو ئـاوا لـە جیـاتی مـن کـار بـەڕێـوە دەبـەن ؟) ئـایا پەلـەتان کـردو پـێش فـەرمانی پەروەردگـارتـان کەوتنـەوە، (واتـە : بۆچـی ڕانەوەسـتان تاکـو مـن دەهـاتمەوەو ، فەرمانی پەروەردگـارتـانم بۆ دەهێنان ، کە چۆن لەگـەڵ ئـەو گۆلکە زێـڕەدا مامەڵە بکـەن ؟!) .

لـێرەدا مووسا هـەر لـە سـەرزەنشـتـکردنی خەڵکەکـە بـەردەوامـەو، جارێ ڕووی نەکردۆتە سـامیـریی ، پێیـان دەڵـێ : ئـەوە گـریمان سـامیـریی کـابرایەکی فێـڵبـازو سـاختـەچیـیو قۆڵبـڕە ، هەڵسـاوە گۆلکـی بـۆ دروسـت کـردوون ، باشـە نەدەبـوو

ئارام بگرن ، تاكو من دەهاتمەوە ، نە دەبوو پێش ئەوەی ئەو گۆلكە بپەرستن ، پرس بە من بكەن ؟

دەربارەی چەمكو واتای وشە (أعجلتم) یش دەڵێین :

(العجلة : طلب الشَّيْء قَبْل أوَانه)، (عجلة) ئەوەیە تۆ داوای شتێك بكەی ، پێش ئەوەی كاتی بێ ، بۆیە وەك بنچینەیەكی شەرعیی گوتراوە : (مَنْ استعْجَلَ شَّيْئاً قَبْلَ أوَانِهِ ، عُوقِبَ بِحِرْمَانِهِ) هەر كەسێك داوای شتێك بكات ، پێش كاتی هاتنی، بە بێ بەشكرانی لێی ، سزا دەدری.

جا هەندێك لە زانایان دەڵێن : مەبەست لە : ﴿أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ﴾، واتە : ئایا پێش فەرمانی پەروەردگارتان كەوتنەوەو، ئەوەی كردتان كردتان ، بەرلەوەی فەرمانی پەروەردگارتان بزانن ؟!

هەندێكیش دەڵێن : واتە ئێوە بۆچی خێراییتان كرد لە دەست هەڵگرتن لەو عیبادەتەی من بۆم دانابوون ، وە گۆڕیتان بە گۆلك پەرستییو ، پەلەتان كردو ئارامتان نەگرت.

ئنجا دەفەرمویٚ : ﴿وَأَلْقَى الْأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُ إِلَيْهِ﴾، (ألقى) یانی : ( رَمى ) : فڕێیدا ، واتە : لەوحەكانی فڕێدا ، دیارە ئەوە لە رووی بێڕێزییەوە نەبووە ، بەڵكو لەبەر پەلەكردنی بووە بۆ لێپرسینەوە لە گەلەكەی ، بەتایبەتی هاڕوون كە جێنشینی بوو ، وە ریشو پرچی گرتوە كە بە بڕوای مووسا كەمتەرخەم بووەو، دەبووایە رێگریی لێ كردباناییە ، دیارە تا ئەو كاتەش هاڕوون هیچ پاساوێكی بۆ نەهێناوەتەوە، هەروەها بۆ ئەوەش كە خەڵكەكە بزانن ، ئەوان گوناحو تاوانێكی زۆر گەورەیان ئەنجام داوە، بۆیە دەبوو لەوحەكان دابنێ ، ئنجا لێرەدا خوای قسەی لەجێ وشەی (ألقى)ی بۆ دانانی لەوحەكان بەكارهێناوە ، كە مەرجیش نیە بە بێڕێزیی دایناین، بەڵكو ئەو وشەیە ئەوە دەگەیەنێ ، كە بە پەلە داینـاونو، چووە بۆ لایان، ﴿وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُ إِلَيْهِ﴾، وە سەری براكەی گرتو بۆ لای خۆی ڕایكێشا ، واتە : قـژی

سەری گرت، دەشگونجێ سەری گرتبێ، چونکە لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِيٓ ﴿٩٤﴾ ﴾طه، واتە: ئەی کوڕی دایکم! سەرو ڕیشم مەگرە، کەواتە: دەبێ سەری و ڕیشی گرتبێ.

هەڵبەتە ئەوەی پێویستە لێرە ئاماژەی پێ بکەین، ئەوەیە کە مووسا لە زۆربەی هەڵوێستەکانیدا پیاوێکی توندو تووڕە دیارە، بەڵام وریا بن! نەك وەك خەڵکێکی چیکڵدانە گچکە، کە تووڕە دەبێ، قسە دەپرژێنێ و سنوورەکانی شەرع دەبەزێنێ! بەڵام مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤەکان لە سروشت دا جۆراو جۆرن، مووسا بە لای توندیی دابووە، وەك تەماشای هەڵوێستەکانی دەکەین، وە هاڕوون بە لای نەرمو نیانیی و لێبوردەیی دابووە، وە ڕەنگە یەکێك لە هۆکارەکانی داواکردنی مووسا لە خوا، کە هاڕوون ببێتە وەزیری، ئەوە بووە کە زانیویەتی هاڕوون کەسێکی نەرمو نیانەو بۆ خۆی توندە، کەواتە: ئەگەر نەرمییەکەی هاڕوون هەبێ ئەو کاتە توندییەکەی مووسا هاوسەنگ دەبێ، دیارە خوای پەنهانزان بە حیکمەت ئەوەی کردوە، پێرەمێردیش لەبارەی کاربەجێیی خواوە گوتوویەتی:

کاکە خوا کاری نابەجێ ناکات تا کێو نەبینێ بەفری تێناکات

ئنجا ئایا بۆچی مووسا سروشتی ئاوا توندو تووڕەو زبر بووە؟ وەڵام: ئەگەر کەسێکی ئاوا نەبێ، کێ دەتوانێ ڕووبەڕووی فیرعەون بێتەوە، فیرعەونێك کە دەیگوت: من پەرستراوتانم، من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، وە هەڕەشەی مەرگی لە هەر کەسێك دەکرد، کە بەبێ فەرمانی ئەو کارێکی کردبایە، کەواتە: دەبێ مووسایەکی ئاوای بەگژدا بکرێ، تاکو بەرتەقای یەك بێنەوە.

دیارە هاڕوون دوای ئەمە، دەست دەکات بە پاساو هێنانەوە: ﴿قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِي وَكَادُواْ يَقْتُلُونَنِي فَلَا تُشْمِتْ بِيَ ٱلْأَعْدَآءَ وَلَا تَجْعَلْنِي مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، (هاڕوون) گوتی: ئەی کوڕی دایکم! خەڵکەکە منیان

بە بێهێز زانی ، وە خەریك بوو بشمکوژن ، بۆیە دوژمنانم پێ خۆش مەکەو، ڕەگەڵ کۆمەڵی ستەمکارانم مەخە ، واتە : وەك وان مامەڵەم لەگەڵ دا مەکە .

ئنجا ئایا (شماتة) چییە ؟ (الشماتة : الفرح ببلیة من تعادیه ویعادیک): (شماتة) بریتیە لەوەی کە تۆ دڵخۆش بی بەهۆی ئەوەی بەڵایەك کە تووشی دوژمن و ناحەزت بووە ، پێشتریش باسم کرد : کە هاروون لێرە بەم شێوەیە پاساو دێنێتەوە ، بەڵام لە سوورەتی (طە)دا دەڵێ : ﴿...إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي ﴿٩٤﴾﴾، واتە : من ترسم هەبوو کە بڵێی تۆ بەنی ئیسرائیلت پەرتەوازە کردووە ، تێکت بەرداون و چاوەڕێی قسەی من نەبووی ، لێرە لە سوورەتی (الأعراف)دا دەڵێ : منیان بە بێهێز زانیوەو خەریك بوو بشمکوژن ، کەواتە : لە سوورەتی (الأعراف)دا تەعبیری لە لایەکی مەسەلەکە کردوە ، لە سوورەتی (طە)شدا تەعبیری لە لایەکی دیکەی مەسەلەکە کردوە ، ئەگەر هەر کەسێك بە وردیی سەرنج بدات، بە پێی سیاقی ئایەتەکان بۆی دەردەکەوێ : کە بەنی ئیسرائیل بە قسەکانی سامیریی هەڵخەڵەتاون و ، هاروونیشیان بە بێهێز زانیوەو، هەڕەشەشیان لێکردوەو، خەریك بووە ، بیکوژن، ئەگەر بەردەوام بووایە لەسەر ڕێ لێگرتنیان لە گۆلك پەرستیی، وە ئەو قسەیەش هاروون لەخۆوە نەیگوتوە : ﴿...إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، واتە: من ترسم هەبوو کە بڵێی تۆ بەنی ئیسرائیلت پەرتەوازە کردوە ، وە مەبەست لە پەرتەوازە بوون ، ئەوەیە کە ئەگەر هاروون و ئەوانەی لەگەڵی دان ، بەردەوام بوونایە لە دژایەتییکردنی سامیریی و ئەوانەی ڕەگەڵی کەوتبوون بۆ گۆلك پەرستیی ، شەڕێکی نێوخۆیی بەرپا دەبوو، ئنجا هاروون لەوە ترساوە کە دوایی مووسا پێی بڵێ : تۆ ئەم دەستەڵاتەت نەبوو ، ئەو خەڵکە پێکەوە بەشەڕ بدەی و یەکدی بکوژن ، بۆچی چاوەڕێی منت نەکردوە ؟ ئنجا دیاریشە کە هاروون بەم شێوە نەرم و نیانە ، پاساو دێنێتەوە بۆ مووسای برای سەلامی خوایان لێ بێ ، مووسا قەناعەت دەکات ، چونکە وەك گوتراوە : (الْعُذْرُ عِنْدَ كِرَامِ النَّاسِ مَقْبُولٌ) واتە : خەڵکی بەڕێز کاتێ پاساوی بۆ دەهێنرێتەوە ، قبووڵی دەکات .

**مەسەلەی پێنجەم**: وەك پێشتر باسمان کرد مووسا پاساوەکەی هارِوون قبوولْ دەکات، ئنجا دەست دەکات بە پارِانەوە بۆ خۆیو برایەکەی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَلِأَخِي وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ ۖ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، گوتی: پەروەردگارم! لە منو لە برایەکەم خۆشبە، وە بمانخە نێو (بازنەی) رِەحمەتی خۆتەوە، چونکە بێگومان تۆ بە بەزەییترینی خاوەن بەزەییانی.

ئایا بۆچی مووسا ﷺ بۆ خۆیو بۆ هارِوونی برای پارِایەوە؟ چونکە بەڵێ، بێگومان ئەوان پارێزراون لە هەڵەی بە ئەنقەست، بەڵام هیچ کەس پارێزراو نیە لە هەڵەی ئیجتیهادیی، تەنانەت پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام)، وەك جاری دیکەش ئاماژەمان پێکردوە: لە چەند شوێنێك دا خوای پەروەردگار لەسەر کردەوەیەك کە پێغەمبەری خاتەم، کە گەورەو سەروەری پێغەمبەرانە، کردوویەتی، گلەیی لێکردوەو فەرموویەتی: نەدەبوو وات کردبایە، بۆ وێنە:

**چەند نموونەیەکی رِەخنەگرتنی خوا لە پێغەمبەری خاتەم (علیه السلام)**

١) کاتێك مونافیقو دڵ نەخۆشەکان کە نەهاتن بۆ جەنگی تەبووكو، داوای مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش مۆڵەتی پێدان کە نەیەن بۆ جەنگ، لە سوورِەتی (التوبة)دا، خوا پێی فەرموو: ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: خوا لێت ببوورێ، بۆچی مۆڵەتت پێدان، هەتا راستو درۆیانت بۆ لێك جیادەبۆوە؟

٢) هەروەها کە تەماشای سەرەتای سوورِەتی (عبس)دا دەکەین، خوا دەفەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ

تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَاءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّا إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ ﴾عبس ، ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ سەرگەرمی ئامۆژگاریی کردنو دواندنی سەرانی قوڕەیش دەبێ ، لەو کاتەدا (إبن أُم مكتوم) (عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتووم) کە پیاوێکی کوێر بووە ، دێ بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ نازانێ کە سەرگەرمی دواندنی ئەو زلە زلانەیە، ئەوانەش عادەتیان وابووە ، کوێرو هەژارو نەدارو کۆیلەو ئەوانە نەهاتوونە کۆڕو مەجلیسیانو قبووڵیان نەکردوە ، ئەویش دەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا ! چ ئایەتێکی دیکەت بۆ هاتۆتە خوارەوە ، فێرم بکەی ، یان چ ئەرکێکی دیکە هاتۆتە خوارەوە ، پێم بڵێی ، تاکو ئەنجامی بدەم ؟ (دیارە پێغەمبەر ﷺیش پێشی پێی فەرمووە : ئێستا مەجالم نیەو، ئەویش هەر لێی دووبارە کردۆتەوەو ، ڕەنگە ئاگای لێ نەبووبێ) کە پێغەمبەری خوا ﷺ بوارو دەرفەتی نیە ، ئنجا خوا لەبارەی هەڵوێستی پێغەمبەرەوە ، فەرموویەتی :

﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰ ﴾، ڕووی خۆی گرژ کردو لاملی لێ سووڕاند ﴿ أَن جَاءَهُ الْأَعْمَىٰ ﴾، کاتێ کوێرەکە هات بۆلای ، ئیدی لەسەر ئەوەندە ، خوای دادگەر سەرزەنشتی پێغەمبەری کردوە ، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر جارێك دەگەیشتە عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتووم دەیفەرموو : ﴿مَرْحَباً بِمَن عَاتَبَني فيهِ رَبِّي﴾[1]، واتە : سڵاو لەو کەسەی لەسەر وی ، پەروەردگارم لۆمەی کردم .

ئاشکراشە کە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری لۆمەکراوە ، هەر ئەوە بووە کە ڕووی لە عەبدوڵڵا گرژ کردوە ، بۆچی ؟ چونکە لەو کاتەدا کە سەرگەرمی قسەکردن بووە لەگەڵ ئەو نەفەرانەدا ، پرسیاری لێکردوە ! کە دیارە ئیجتیهادی پێغەمبەر وابووە لەوکاتەدا وەڵامی نەداتەوەو پشتگوێی بخات ، چونکە سەرگەرمی ئیشێکی گەورەترە ! بەڵام ئیجتیهادەکەی هەڵە بووە .

---

١) أَسباب النزول ، للواحدي : ٣٣٣، وأخْرَجَهُ الترمذي وحسَّنهُ، والحاكم صحَّحهُ وابن حبان عن عائشة قالت : أنزلت سورة (عبس و تولى) في ابن مكتوم الأعمى ... زاد المسير في علم التفسير لابن الجوزي ، ص : ١٥١٥ .

٣) هەروەها دەربارەی مەسەلەی بەدیلگرتنی دیلەکانی جەنگی بەدر ، خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ : ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ﴿٦٧﴾ ﴾ الأنفال، واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە دیلی هەبن (دیلان بگرێ) تاکو بە تەواویی دوژمنەکەی لە زەوی نەداو ، لە پەل‌و پۆی نەخات .

٤) هەروەها دەربارەی مەسەلەی نوێژکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول کە سەرۆکی موونافیقانی مەدینە بوو، خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ : ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾التوبة ، واتە : لەمەودوا نوێژ لەسەر هیچ کامێك لەوانە مەکە ، وە لە کاتی بە خاك سپاردنیشیدا ، ئامادە مەبە[1].

کەواتە: مووسا ﷺ بۆ خۆی‌و هاروونی برای دەپاڕێتەوە ، نەك لەبەر ئەوەی گوناهێکیان کردوەو زانیویانە کە گوناهە ، بەڵکو بۆ ئەوەیە ئەگەر هەڵەیەکی ئیجتیهادییان کردبێ، خوا چاوپۆشییان لێ بکات ، بۆ وێنە: مووسا ﷺ نەیزانیوە کە هاروونی برای ئەو پاساوەی هەیەو ، سەرو ریشی گرتوەو ڕایکێشاوە ، هەروەها هاروون ئەگەر لەبەر زێدە نەرمیی‌و ئارامیی کەمتەرخەمییەکی بووبێ ، بۆیە داوای لێبوردنی بۆ خۆی‌و بۆ ئەویش کرد .

**مەسەلەی شەشەم:** خوای پەروەردگار دێتە سەر باسی سەرەنجامی گۆلك پەرستیی‌و گۆلك پەرستەکان، دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُفْتَرِينَ ﴾، بێگومان ئەوانەی گۆلکیان بە پەرستراو گرت ، لەمەودوا (لە دواڕۆژدا) تووڕەیی

---

١) رواه البخاري : (٣ / ١١٠) و مسلم : (١٢١/١٧) ، زاد المسير في علم التفسير ، لابن الجوزي، ص : ٥٩٩ .

پەروەردگاریــان دەیانگاتــێ ، لــە ژیـانی دنیاشـــدا زەبـوونو سـەرشـۆڕ دەبـن ، بــەم شـێوەیە سـزای درۆ هـەڵبـەسـتەران دەدەیـن .

چونکە خـوا هاوبـەشـی نـینو ، هـەر کەسـێك هاوبــەش بـۆ خـوا پەیـدا بکـات ، مانـای وایــە درۆیــەکی بـۆ هـەڵبەسـتوە، ئنجـا ئـایا ئـەو تووڕەییـەی خــوا ، وە ئـەو زەبوونییـەی ئـەوان ، لە چییدا بـەرجەسـتە بوو ؟

أ - بە نسبەت سـامیـرییەوە ئەوە دیارە، مووسا پێی فـەرمووە : ﴿ قَالَ فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ وَإِنَّ لَكَ مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥ ﴿٩٧﴾ ﴾ طـــه ، واتـــە : (مووسـا) گـوتی : بـڕۆ تـۆ لـە ژیـانی دنیـادا ئـەوە سـزاتە کە کـەس دەسـتت لـێ نـەداتو، دەسـت لە کـەس نەدەی ، (یانی تێکـەڵی خەڵك نەبـێ ، ئـەوە بـە نسـبـەت دنیـاوە ، بـە نسبـەت دواڕۆژیشــەوە وەك هـەڕەشــە دەفـەرموێ :) وە تـۆ گفتێکیشـت لـەگەڵ دراوە کە حەتمـەن دێتــە دی .

ب - بـە نسـبــەت خەڵـکەکەوە ، خـوا لـە ئـایەتی (٥٤)ی سـووڕەتی (البقـرة)دا باسی دەکـــات ، دەفـــەرموێ : ﴿ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِنَّكُمۡ ظَلَمۡتُمۡ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلۡعِجۡلَ فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمۡ فَٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ عِندَ بَارِئِكُمۡ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾ ﴾، واتـە: وە یـاد بکـەوە کـاتێـك مووسـا بــە گەلەکـەی گـوت : ئـەی گــەلەکەم ! بێگومـان ئێـوە سـتەمتان لـە خۆتـان کـرد، بـەوەی کـە گۆلکـتان بــە پەرسـتــراو گــرت ، دەجـا پەشــێمان ببنــەوەو بگـەڕێنــەوە بـۆ لای بـەدیهێنـەرتـان ، (واتـە: گۆلـك ئێـوەی بــەدی نەهێنــاوە ، تاکـو بیپەرســتن ، خــوا ئێـوەی دروســت کـردووەو دەبــێ ئـەو بپەرســتن) بۆیـــە خۆتــان بکــوژن ، ئـــا ئـــەوە بــۆ ئێــوە چاکتــرە لـــە لای بەدیهێنـەرتـان ، ئنجا ئێـوە واتـان کـردو خـواش لـێتان خــۆش بـــوو ، بێگومـان خـوا زۆر دەگـەڕێتـەوە سـەر بـەندەکانی، وە خـوا زۆر میهرەبـانو بـە بـەزەییـە .

کە دیارە ئەوە سزای دنیایان بووە ، ئنجا بۆ چۆنیەتی ئەو خۆکوشتنەش ، وەك لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە سوورەتی بەقەرە، لە بەرگی یەك ، لاپەرە (٢١٣)دا باسمان کردوە، چەند ئەگەرێگ هەن ، بەلاَم ئێمە لەوبارەوە ئەم دوو دەقەش دێنینەوە :

١/ ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ، قَالَ : قَالَ الله تَعَالى : إِنَّ تَوْبَتَهُمْ أَنْ يَقْتُلَ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُم كُل مَنْ لَقِي مِنْ وَلَدٍ وَوَالِدٍ، فَيَقْتُلهُ بالسَّيْفِ، وَلاَ يُبَالِي مَنْ قَتَل فِي ذَلِكَ الموْطِن... فَغَفَرَ الله تَعَالى لِلْقَاتِلِ وَالمقْتُولِ﴾ {أَخْرَجَهُ النَّسائِيُّ في الكبرى ، برقم : (١١٣٢٦)، وَإِبْنُ جَرِير} ، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : خوای بەرز فەرمووی : تۆبەی ئەو گۆلك پەرستانە ئەوەیە ، کە هەر کامێکیان هەر کەسێکی بیگاتێ چ مندالێ بێ (کوڕ، یان کچ)، چ باب بێ (دایكو باب)، بە شمشێر بیکوژێ، وە گوێ نەداتێ ، داخۆ لەو شوێنەدا کێ دەکوژێ ، (خزمە ، نیزیکە ، دۆستە ، بابە، برایە، منداڵە هەر کەسێکی هەیە بیکوژێ) ، دوایی خوای دادگەر بەو شێوەیە هەم لە بکوژیش خۆش بوو، هەم لە کوژراویش خۆش بوو .

٢/ دەقێکی دیکەش لەوبارەوە گێڕدراوەتەوە : ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ، قَالَ : أَمَرَ مُوسى قَوْمَهُ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يَقْتُلُوا أَنْفُسَهُمْ ، قَالَ : وأُحْضِرَ الَّذِينَ عَبَدُوا العِجْلَ ، فَجَلَسوا وَقَامَ الَّذِينَ لَمْ يَعْكُفُوا عَلى عِبَادَةِ العِجْلِ ، فَأَخَذُوا الخَنَاجِرَ بأَيدِيهم، وَأَصابَتْهُمْ ظُلْمَةُ شَدِيدَة، فَجَعَلَ يَقْتُلُ بَعْضُهُم بَعْضا ، فَانْجَلَتِ الظُّلْمَة عَنْهُمْ وَقَدْ أَجْلَوا عَنْ سَبْعِينَ أَلْفِ قَتِيلٍ ، كُلّ مَنْ قُتِلَ مِنْهُمْ كانَتْ لَهُ تَوْبَة، وَكُلُّ مَنْ بَقِيَ كانَتْ لَهُ تَوْبَة﴾[1]، واتە : عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : مووسا ﷺ فەرمانی بە گەلەکەی کرد، ئەویش لە فەرمانی پەروەردگاری زاڵی پایە بەرزییەوە ، کە یەکدی بکوژن ، دەڵێ : ئنجا ئەوانەی کە گۆلکیان پەرستبوو، ئامادەکرانو دانران، وە ئەوانەی کە گۆلکیان نەپەرستبوو ، خەنجەریان بەدەستەوە گرت ، وە تاریکاییەکی توندیان بەسەردا هات ، ئنجا هەندێکیان

---

١) أَخْرَجَهُ الطبري في (جامع البيان) ج ٢ ، ص ٧٣، والمصباح المنير، ص ٦١.

هەندێکیان کوشت (ئەوانەی خەنجەریان بەدەست بوو ، ئەوانەیان کوشت کە گۆلکیان پەرست بوو) ئیدی کاتێك تاریکییەکە ڕەویەوە ، تەماشا کرا : حەفتا هەزار کەسیان کوژرا بوو ، هەر کامێك لەوانەی کە کوژرابوون ، بۆی بە تۆبە لە قەڵەم درا ، وە هەر کامێکیش کە مایەوە ، بۆی بە تۆبە لە قەڵەم درا ، (چونکە ئەوانیش بۆ ئەو سزایە ئامادە بوون) ، یانی : گۆلك پەرستەکان دەبووایە بکوژرێن وەك سزادان ، وە ئەوانەش کە کۆلگیان نەپەرستبوو ، ئامادەبوون کەسوکاریان بکوژن، بۆیە بۆ هەردوو لایان بوو بە تۆبەو گەڕانەوە .

بەڵام پێم وایە ئەو ژمارەیە زێدەڕۆییەکی زۆری تێدایە، چونکە حەفتا هەزار کەس زۆر زۆرەو ، ئەوە لە زێدەڕۆییەکانی جوولەکەیە .

شایانی باسە ئەو بەسەرهاتە بەم شێوەیە لە تەورات دا باسکراوە : (وَلَمَّا رَأَى مُوسى أَنَّ الشَّعْبَ غَارِقٌ فِي مُجونِهِ بَعْدَ أَن أَفْلَتَ هارُونُ زِمَامَهُمْ ، فَصاروا بذَلِكَ مَثَارَ سُخْرِيَّةِ أَعْدَائِهِم وَقَفَ فِي بَابِ المخَيَّم وَصاحَ : كُلُّ مَن يَتّبع الرَّبَّ فَلْيُقْبِل إِلى هُنَا ، فَاجْتَمَعَ حَوْلَهُ اللاَّويُّون فَهَتَفَ بِهِم : هَذَا مَا يُعْلِنُهُ الرَّبُّ إِلَهُ بَنِي إِسْرَائِيل: لِيَتَقَلَّدْ كُلُّ وَاحِدٍ سَيْفَهُ وَجُولُوا فِي المخَيَّم ذَهاباً وإِيَاباً مِنْ مَدْخَلٍ إِلى مَدْخَل ، وَاقْتُلُوا كُلّ دَاعرٍ[1] سواءً كانَ أَخَاً أَمْ صاحِباً أَمْ قَرِيْبَاً ، فَأطاع اللاَّويُّون أَمَرَ مُوسى فَقُتِلَ مِنَ الشَّعْبِ فِي ذَلِكَ اليَوْم نَحْوَ ثَلاَثَةِ آلافِ رَجُل)[2]

واتە : وە کاتێك مووسا بینی گەلەکەی لە خراپەکارییدا نقووم بووە ، دوای ئەوەی هارۆون جڵەویانی لە دەست دابوو ، (واتە : بە قسەیان نەدەکرد) بۆیە بەهۆی ئەو هەڵوێستەیانەوە بوونە مایەی گاڵتەجاڕ بۆ دوژمنەکانیان ، مووسا لە دەروازەی چادرگایەکە ڕاوەستاو بە دەنگی بەرز بانگی کرد : هەر کەسێك بە دوای پەروەردگار دەکەوێ ، با بەرەو ئێرە بێ ، لاوییەکان (کە یەکێکن لە دوازدە تیرەکان، وە لە هەموویان زیاتر گوێڕایەڵ بوون) لە دەوری کۆبوونەوە، ئەویش تێیخوڕین ، بانگی کردن ، گوتی : ئەمە ئەوەیە کە پەروەردگار پەرستراوی بەنی ئیسرائیل ڕایگەیاندوە : با هەر کامێك لە ئێوە شمشێرەکەی بە شانی دا

---

١) الدَّعَرُ والدَّعارة : الخبث والفسق ، فهو داعر و داعرة ، مختار الصّحاح ، ص ١٩١ .

٢) التفسير التطبيقي ، سفر الخروج ، الإصحاح : ٣٢ ، ص ١٩٦ و ١٩٧ .

بکـات ، وە بــە چادرگــایەکەدا بێــنو بچــن ، لـە دەروازەوە بـۆ دەروازە (دیـارە دوو دەرگــای هەبــوون) ئنجـا هــەر کەسـێك لـەو خراپەکارانەتـان بینـی (کـە گۆلـك پەرستەکــانن) بیکــوژن، بـرا بــێ ، یـان بــرادەر بـــێ ، یـان خـزم بـێ ، ئیـدی لاوییەکـانیش ئـەوەی مووسـا فـەرمانی پێکـردبوون ، جێبەجێیـان کـرد ، وە لـەو ڕۆژەدا نیـزیکەی سـێ هـەزار پیـاو لە گەلـی بـەنی ئیسـرائیل کـوژران .

هەڵبـەتە لـە پەیمـانی کـۆن دا تەنیـا باسـی سـێ هـەزار کـوژراو دەکـات، ئیـدی نازانـم ئەو حەفتـا هـەزارەی ، کـە لە عەبدوڵـلای کـوڕی عـەبباس خـوا لـە خۆیو بـابی ڕازی بــێ ، گێڕدراوەتـەوە لـە کـوێ هــاتوە ؟ مەگــەر لـە کتێبێــکی دیکـەی جوولەکـەکان دا باس کـرابێ ، ئەگەرنا لە پەیمـانی کۆنـدا ، تەنیـا باسـی سـێ هـەزار کـەس دەکات .

کە دیـارە من ئەو سـێ هـەزار کەسـەشـم پـێ زۆرە ، کـە لـەو ڕۆژەدا کـوژرابـن !

**مەسـەلـەی حەوتـەم:** کـە خـوا دەفـەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، وە ئەوانەی کە کردەوە خراپەکـانیان ئەنجـام داوە، دوایـی گـەڕاونەوەو تۆبـەیان کـردووەو ئیمانیـان هێنـاوە، بێگومان پەروەردگارت لە دوای ئەو تۆبەو گەڕانەوەیە ، زۆر لـێبوردەو بە بەزەییـە .

کــە دەفــەرموێ : ﴿ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا ﴾، وا دیـارە پێشـتـر ئیمانیـان هـەر هـەبووە ، بـەڵام ئیمانەکـەیان بـایی ئـەوە نـەبووە ، لـە گوناهـە گـەورەکان دووریان بخاتەوەو بیانپارێزێ ، کـەواتـە : مەبـەست لـەم ڕسـتەیە ئەوەیـە : (تَـابُوا عَـنِ السَّيِّئَـاتِ وَآمَنُـوا إِيمَانَـاً جدِيـداً يَمْـنَعُهُم مِـنَ الـذُّنُوبِ)، واتـە : تۆبـەیان کردو لـە گوناهـەکانو گـەڕانەوە بۆ لای خــواو ، ئیمانێکـی تازەیان هێنــا ، کە ئەو ئیمـانە تـازەیە قـەدەغەیـان بکـات ، لە هـەموو خراپەو گونـاهێك.

چونکە زانایـان دەڵـێن: بـە لای کـەمـەوە ئیمـان سـێ پلـەی هـەن :

١) ئیمانێـك کـە لای کـەمی ئیمانـە ، ئەوەیــە کـە ئینسـان لـە گوناهــە گـەورەکـان ناگێـڕێتـەوە .

٢) ئیمانێکی نێوەنجیی ، ئەوەیە کە ئینسان لە گوناهە گەورەکان دەگێڕێتەوە، بەڵام لە گوناهە گچکەکان نایگێڕێتەوە .

٣) وە ئیمانی هەرە تەواو ، کە ئیمانی ڕەها (الإيمان المطلق)ی پێ دەڵێن ، ئەوەیە کە سەرەڕای گوناهی گەورە ، خاوەنەکەی لە گوناهی گچکەش دوور دەخاتەوەو دەگێڕێتەوە ، وە وای لێدەکات سوننەتەکانیش جێبەجێ بکات .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، بێگومان پەروەردگارت دوای ئەوە لێبوردەی بە بەزەییە ، ئەم ڕاناوی (ها)یە ، (بعدها) دەگونجێ بگەڕێتەوە بۆ (توبة) ، واتە : خوا دوای تۆبەو گەڕانەوە لێبوردەی بە بەزەییە ، وە دەشگونجێ بگەڕێتەوە بۆ (سيئات) یانی دوای ئەو گوناهو خراپانەی ، کە تۆبەیان لێکراوەو خاوەنەکەیان لێی پەشێمان بۆتەوە ، ئەوە خوا لێبوردەی بە بەزەییە .

**مەسەلەی هەشتەمو کۆتایی**: خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى الْغَضَبُ أَخَذَ الْأَلْوَاحَ وَفِي نُسْخَتِهَا هُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ ﴾، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن : ئەمە نوکتەیەکی ڕەوانبێژیی تێدایە ، چونکە دەفەرموێ : دوای ئەوەی تووڕەیی لە مووسادا بێدەنگ بوو ، زەمەخشەریی وەك خاوەنی (محاسن التأويل) ، لێی خواستۆتەوە ، دەڵێ : (هَذَا مَثَلٌ ، كأنَّ الغضَبَ كانَ يُغْرِيه علَى ما فِعْلٍ ويقولُ لَهُ : قُلْ لِقَوْمِكَ كذَا ، وَأَلْقِ الألواحَ ، وَجُرَّ برأسِ أَخِيكَ إِلَيْكَ ، فترك النطق بذَلِكَ وقطع الإِغراءَ)[1]، واتە : ئەم وێنەیە وەك ئەوەیە کە تووڕەیی مووسای هان دابێ ، لەسەر ئەوە کە کردوویەتی ، وە پێی گوتبێ : ئاوا بە گەلەکەت بڵێ ، وە لەوحەکان فڕێ بدە ، وە سەرو ڕیشی براکەت ڕابکێشە، ئنجا دوایی تووڕەیی بێدەنگ بووبێت، وە ئەو قسانەی نەکردبێو وازی هێنابێ لە هاندانی مووسا،

---

١) ج ٧ ، ص ٢٥٩.

یانی: ئەمە وەك ئەوە وایە كە تووڕەیی كەسێك بىٚو، مووسا هان بدات، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ ﴾.

ئنجا دوای ئەوەی كە تووڕەیی مووسا نیشتەوە، ئەوەش هەر تەعبیرێكی ڕەوانبێژییە، وەك بڵێی: تووڕەیی لافاوێكەو هەڵساوە، یان ڕەشەبایەكە هەڵیكردوە، بەڵام دیارە تووڕەیی پێغەمبەرانی (علیهم السلام) لە هەق نەبردۆتە دەرێ، ئیمانێكی وایان هەبووە كە لە كاتی خۆشییو ناخۆشییو، ڕازی بوونو ڕازی نەبوون دا، هەمیشە خۆیان پێ كۆنترۆڵ كراوەو، بە جۆرێك مامەڵەیان كردوە، كە لە چوارچێوەی شەرع بەدەر نەبێ.

دیارە ئێمەو مانانیش بە ئەندازەی ئەوەی بەدوای پێغەمبەران دەكەوین، ئیمانێكی باشمان دەبێ، وە لەقەدەر خۆمان لەو سیفەتە بەرزانەی ئەوان بەهرەمەند دەبین، خوا بەهرەمەندمان بكاتو پشكو بەشی باشمان پێ ببەخشێ.

ئنجا دوای ئەوە دەفەرموێ: ﴿ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴾، لەوحەكانی هەڵگرتنەوە، وە لە دوو تویێی لەوحەكاندا ڕێنماییو بەزەیی هەبوو، بۆ كەسانێك كە لە پەروەردگاریان دەترسێن.

شارەزایان دەڵێن: (وَفِي نُسۡخَتِهَا) (نُسْخَة: فُعْلَة بِمَعْنَى مَفْعُولَة مثل الخُطبة) یانی (نُسْخَة)ە، (فُعْلَة)یە، بە مانای (مَفْعُولَة)، واتە: لەوەدا كە نووسرابۆوە، لە لەوحەكاندا ڕێنماییو بەزەیی خوای پەروەردگار هەبوو، وەك چۆن (خطبة) قسەیەكە كراوە، (فُعْلَة)یە، بە مانای (مَفْعُولَة).

ئایا بۆچی گوتراوە: (نُسْخَة)؟

أ / هەندێك گوتوویانە: (استنسخ مِنَ الأَلْوَاحِ المكسورة) لەبەرئەوەی دوای ئەوەی لەوحەكان شكاون، جارێكی دی مووسا ئەوەی لە لەوحەكاندا نووسرابوو، نووسیویەتەوە.

ب/ وە هەندێك گوتوویانە: (استنسخ من اللوح المحفوظ) لەبەرئەوەی كە لەبەر (لوح المحفوظ) نووسراوەتەوە.

ج/ وە هەندێك گوتوویانە: لە بنچینەدا وشەی (نسخة) شتێکە کە نووسرابێ یانی : (مکتوبة)، مادام نووسراوەتەوە ، پێی دەگوترێ : (نسخة) .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ هُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ ﴾ ، واتە : ڕێنماییە لە دنیادا ، وە مایەی بەزەیی خوای پەروەردگارە لە دواڕۆژدا ، دیارە وشەی (رهب یرهب) بۆخۆی تەعەدد ا دەکاتو ، پێویستی بە پیتی دیکە ناکات ، دەگوترێ : (رهب محمد ربَّهُ) واتە : موحەممەد لە پەروەردگاری ترسا ، وە یرهبُهُ) واتە : لێی دەترسێ .

زانایان دوو واتایان بۆ ڕستەی ﴿ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ ﴾، لێکداوەنەوە :

یەك: دەڵێن : واتە : لە پێناوی پەروەردگاریاندا دەترسان (مِنْ أَجْل رَبِّهِم يَخَافُون) ، یاخود لە پێناوی پەروەردگاریان دا ، لە سزای دۆزەخو دواڕۆژ دەترسان .

دوو : هەندێکیش دەڵێن : (یرهبون ، ضُمِّنَ معنی یخضعون ، ولهذا عُدِّي بالـلام) واتە : (یرهبون) مانای ملکەچ دەبن (یخضعون)ی خراوەتە نێو، بۆیە بە لام (ل) تەعەددای کردوە ، کەواتە : (یرهبون) مانایەکەی ئاوای لێدێتەوە : لە پەروەردگاریان ، دەترسنو بۆی ملکەچن ، چونکە وەك پێشتر باسمان کردوە : بنچینەی : ڕەگەڵ خران (تضمین) ، بۆ ئەوەیە کە وشەیەك بەکاردەهێنرێ ، لەجیاتی ئەوەی دوو ڕستە بنووسرێن ، ئەو وشە مانای دوو ڕستە دەگەیەنێ ، ئەویش لە حاڵێك دا کە کردار (فعل)ێك کە بۆخۆی (مفعول) دەخوازێو بۆ خواستنی پێویستیی بە پیت (حرف) نیە ، بە پیتێك تەعەددا بۆ بەرکار (مفعول) بکات .

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ .

# دەرسی هەژدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە چوار ئایەتان پێكدێ ، كە بریتین لە ئایەتەكانی (١٥٥ تا ١٥٨) ، خوای پەروەردگار لەم ئایەتانەدا ، باسی ڕووداوێكی دیكەی مووساو گەلەكەی دەكات ، ئەویش ئەوە بووە كە مووسا ﷺ حەفتا كەسی لە نێو گەلەكەی دا هەڵبژاردوون و لەگەڵ خۆی بردوونی بۆ دیداری خوای بەرزو بێ وێنە ، بەڵام لەوێ بوومەلەرزەیەك گرتوونی و مردوون ، یان بێهۆش كەوتوون و ، مووساش لە خوا پاڕاوەتەوە ، كە نەیانفەوتێنێ و لێیان ببووری.

پاشان لێی پاڕاوەتەوە كە لە دنیاو دواڕۆژدا چاكەیان بۆ بنووسێ و ، خوای بەرزو مەزنیش ڕایگەیاندوە : كە خوا ﷻ هەر كەسێكی بوێ ، سزای دەدات و ، بەزەیی یەكەشی هەموو شتێكی گرتۆتەوەو ، بەڵام لە قیامەتدا تایبەتی دەكات بە پارێزكارانی خۆ تەزكرەكەری بڕوادار بە ئایەتەكانی ، وە شوێنكەوتووی پێغەمبەری نەخوێندەوار موحەممەد ﷺ كە نیشانەكانی لە تەورات و ئینجیلدا دەبینن .

پاشان خوا ﷻ پێغەمبەری كۆتایی ، خۆی بە چەند وەسفێك پێناسە دەكات و ، فەرمانیشی پێدەكات كە ڕەوانەكراوێتیی خۆی بە هەموو جیهانییان ڕابگەیەنێ و ، فەرمانیشیان پێبكات ، بڕوای پێ بێنن ، تاكو سەرفرازو ڕێنمایی كراوبن .

﴿ وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَاۖ فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ قَالَ رَبِّ
لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ وَإِيَّٰيَۖ أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ
تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي مَن تَشَآءُۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَيۡرُ
ٱلۡغَٰفِرِينَ ١٥٥ وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَۚ
قَالَ عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا
لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ١٥٦ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ
ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ
يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ
عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٥٧ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ٱلَّذِي
لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ
وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ
تَهۡتَدُونَ ١٥٨ ﴾.

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە مووسا حەفتا پیاوی لە گەلەکەی بۆ دیداری ئێمە هەڵبژاردن ، ئنجا کاتێك بوومەلەرزە گرتنی (مووسا) گوتی : پەروەردگارم ! ئەگەر ویستبات پێشتر ئەوانیش‌و منیشت دەفەوتاند ، ئایا بەوە کە نەفامەکانمان کردیان ، دەمانفەوتێنی ؟ ئەمەش هەر تاقیکردنەوەی خۆتە ، کە بەهۆیەوە هەر کەسێکت بوێ ، گومڕای دەکەی‌و ، هەر کەسێکیشت بوێ ، ڕاستە ڕێی دەکەی ، تۆ پشتیوانمانی ، دەجا لێمان ببوورەو بەزەییت پێماندابێ ، وە تۆ باشترینی لێبوردانی ﴿١٥٥﴾ وە لەم دنیایەداو لە دواڕۆژیشدا چاکەمان بۆ بنووسە (و پێ ببەخشە) ئێمە بۆ لای تۆ گەڕاینەوە ، (خوا) فەرمووی : سزایەکەم تووشی هەر کەسێك دەکەم بمەوێ‌و ، بەزەییشم هەموو شتێکی گرتۆتەوە ، ئنجا (لە دواڕۆژدا) بۆ ئەوانەی دەنووسم (و تەرخان دەکەم) کە پارێز دەکەن‌و ، زەکات دەدەن ، وە ئەوانەی بڕوا بە ئایەتەکانمان دێنن ﴿١٥٦﴾ ئەوانەی دەکەونە شوێن ڕەوانەکراوو پێغەمبەری نەخوێندەوار ، ئەو کەسەی کە (پێناسەو نیشانەکانی) ئەو لەلای خۆیان لە تەوراتو ئینجیلدا بە نووسراویی دەبینن ، فەرمانیان پێدەکات بە هەرچی شتی پەسندەو ، ڕێگرییان لێدەکات لە هەرچی شتی ناپەسندە ، وە هەرچی شتی باش‌و سوودبەخشە ، بۆیان حەڵاڵ دەکاتو ، هەرچی شتی خراپ‌و زیانبەخشە ، لێیان قەدەغە دەکات ، وە ئەو بارە قورسە (ی لەسەر شانیان بووە) و ئەو کۆتو زنجیرانەی لە دەستو گەردنیاندا بوون ، لێیان لادەبات ، ئنجا ئەو کەسانەی بڕوایان پێهێناوەو ، ڕێزیان گرتووەو ، پشتیان گرتووەو ، شوێن ئەو ڕووناکییە کەوتوون ، کە لەگەڵیدا نێرراوەتە خوارێ ، ئا ئەوانە سەرفرازن ﴿١٥٧﴾ بڵێ : ئەی خەڵکینە ! دڵنیابن من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای هەمووتان ، ئەو کەسەی کە موڵکی ئاسمانەکان‌و زەوی بەس هی ویە ، جگە لەو هیچ پەرستراو نین ، دەژیەنێ‌و دەمرێنێ ، دەجا بڕوا بە خواو ڕەوانەکراوو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەکەی بێنن ، ئەو کەسەی کە بڕوای بە خواو وشەکان هەیە ، وە شوێنی بکەون ، بەڵکو سەرفرازبن ﴿١٥٨﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( وَٱخۡتَارَ ) : واتە: هەڵیبژارد ، (الإِخْتِيَارُ : طَلَبُ مَا هُوَ خَيْرٌ وَفِعْلُهُ ، وَالإِخْتِيَارُ أَخْذُ مَا يَرَاهُ خَيْراً ، وَالمخْتَارُ : فَاعِلٌ وَمَفْعُولٌ) ، (إختيار) بریتیە لەوەی شتێك كە چاكە داوا بكەیو ئەنجامی بدەی ، وە هەر شتێك مرۆڤ بە چاكی دەبینێ وەریبگرێ ، وە (مُخْتَار) بە مانای بكەر دێ ، واتە: كەسێك كە هەڵدەبژێرێ ، هەروەها بە مانای بەركار (مَفْعُول)یش یانی : هەڵبژێرراو .

(ٱلرَّجۡفَةُ ) : واتە: بوومەلەرزە ، (الرَّجْف : الإضطراب الشَّدِيد ، والإِرْجَاف إيقاع الرَّجفة قولاً وفعلاً) ، (رجف) بریتیە لە لەرزینەوەیەكی توند ، (إرجَا ) بریتیە لەوە كە هەژانێك دروست بكرێ ، بە قسە ، یان بە كردەوە .

(فِتۡنَتُكَ ) : یانی : (إختبَارَكَ وابْتَلاَؤُكَ) ، واتە : تاقیكردنەوەو جەرباندنی تۆیە .

(ٱلۡأُمِّيَّ ) : (الأُمِّيّ : الَّذِي لا يَقْرَأُ وَلاَ يَكْتُبُ ، وَالأُمّي : مَنْسوب إِلى الأُمَّة الأُمِّية) ، (أُمِّي) كەسێكە نە دەخوێنێو نە دەنووسێ ، وە (أُمِّي) پاڵدەدرێتە لای خەڵكێك كە نەشارەزان ، یاخود خوێندنو نووسینیان نیە .

(بِٱلۡمَعۡرُوفِ ) : (المعْروفُ : اسْمٌ لِكُلِّ فِعْل يُعرَفُ بالعَقْلِ أَو الشَّرْعِ حُسْنُهُ) ، واتە : (مَعْرُوف) هەرشتێكە كە بە عەقڵ ، یان بە شەرع بناسرێ ، وە بزانرێ كە شتێكی باشە .

(ٱلۡمُنكَرِ ) : (المنْكَرُ: كُلُّ فِعْل تَحْكُمُ العُقُولُ الصَّحِيحَةُ بِقُبْحِهِ ، أَوْ تَتَوَقَّفُ فِي استِقْبَاحِهِ وَاستِحْسَانِهِ العقُول ، فَتَحْكُمُ بقُبْحِهِ الشَّرِيعَةُ) واتە: (مُنْكَر) هەر كردەوەیەكە كە عەقڵە ساغەكان بڕیاری ناقۆڵاییو ناشیرینی دەدەن ، یاخود لە بە خراپ دانانی ، یان بە چاك دانانیدا ، ڕادەوەستن ، بەڵام شەریعەت حوكم دەكات ، كە ئەوە شتێكی خراپو ناقۆڵایە .

(ٱلطَّيِّبَٰتِ ) : (أَصلُ الطَيِّبِ : مَا تَستلِذُّهُ الحوَاسُّ ، وَمَا تَستلِذُّهُ النَّفسُ ، وفي الشَّـرْعِ: مَا كَـانَ مُتَنَاوَلاً مِنْ حَيْثُ مَا يَجُوزُ) واتـە : ئەسڵی (طَيِّب) هەر شتێکە کە هەستەکان چێژی لێوەرگرن ، وە نەفسی ئینسان چێژی لێوەربگرێ ، (طَيِّب) لە ڕووی شەرعەوە ، هەر شتێکە کە شەرع ڕێیدابێ ، ئەو شتە وەربگیرێ‌و بەکاربهێنرێ .

(ٱلْخَبَٰٓئِثَ ) : (الخُبْثُ والخَبِيثُ : مـا يُكْرَهُ رَدَاءَةً وَخَساسةً ، مَحْسوساً كـانَ أَو مَعْقُولاً) ، (خُبْثُ) و (خَبِيث) : هەر شتێکە کە لەبەر خراپیی نەویسترێ ، ئنجا شتێکی بەرهەست بێ ، یاخود لە ڕووی مەعنەوییەوە ، بە کەڵك نەهاتووبێ ، (الخَبَائِث جَمْعُ الخَبيث : مَا لا يُوَافِقُ النَّفسِ مِنَ المحْظُورات) واتـە : (خَبَائِث) کۆی (خَبِيث)ە ، هەر شتێکە کە موافقی سروشتی ئینسان نەبێ‌و ، ئینسان پێی خۆش نەبێ‌و پێی چاك نەبێ .

(إِصْرَهُمْ ) : (الأَصْرُ : عَقْدُ الشيءِ ، وَحَبْسُهُ بقَهْرِهِ ، وَالإِصْرُ : العَهْدُ وَالذَّنْبُ والثِّقْلُ) ، (أَصْر) بریتییە لەوەی کە شتێك گرێ بدەی ، یان حەپسی بکەی ، بەوەی کە دەستی بەسەردا بگری ، بەڵام (إِصْر) بە مانای پەیمان دێ ، بە مانای گوناه دێ ، بە مانای قورساییش دێ .

(وَٱلْأَغْلَٰلَ ) : (الأَغْلالُ : جَمْعُ الغِلِّ ، مَا يُغيِّلُّ بِهِ وَيُقَيَّدُ فَتُجْعَلُ الأَعْضاء وَسَطَهُ ، وغُلَّ فلانٌ قُيِّدَ بِهِ) ، (أَغْلال) کۆی (غِل)ە ، وە (غِل) هەر شتێکە کە مرۆڤی پێ کۆت دەکرێ ، جا چ لە گەردنی بکرێ ، یاخود لە دەست‌و پێیەکان بکرێ ، واتە: ئەندامەکان دەخرێنە نێوەڕاستیەوە ، وە دەگوترێ : (غُلَّ فلانٌ : قُيِّدَ بِهِ) واتـە : پێی بەسترایەوە .

(وَعَزَّرُوهُ ): (التَّعزِيرُ: النُّصْرَةُ مَعَ التَّعظِيم ، والتَّوْقِير وَالتَّعْظِيمُ وَالتَّأْدِيب ، وَهُوَ الضَرْبُ دُونَ الحَدِّ) ، (تَعْزِير) بریتییە لە سەرخستن لەگەڵ بە مەزن گرتندا ، وە هەروەها (تَعْزِير) بەمانای ڕێز لێگرتن‌و بە مەزن گرتن دێ ، وە بە مانای تەمبێ کردنیش دێ ، کە بریتییە لەوەی کەسێك تەمبێ بکرێ‌و سزا بدرێ ، بە سزایەك کە لە سزایەکی دیاریکراویی شەرعیی کەمتر بێ، زانایان بەو مانایەش بەکاریان هێناوە .

# مانای گشتی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار باسی بەسەرهاتی مووساو هارِوون دەکات لەگەڵ گەلەکەیاندا، واپێدەچێ ئەم بەسەرهاتە دوای سزادرانی بەنی ئیسرائیل بووبێ، ئنجا ڕەنگە مووساو هارِوون سەلامی خوایان لێ بێ، ئەوەیان بە پێویست زانیبێ، یان خوا پێی فەرمووبن: کە حەفتا کەس لە پیاو ماقووڵانو مشوورخۆرانو قسە بە دەستانی بەنی ئیسرائیل هەڵبژێرن، بۆ ئەوەی لە جیاتی گەلی بەنی ئیسرائیلو بە نوێنەرایەتیی هەموو خەڵکەکە بێن، سەرەتا دەبێ تۆبە بکەن، پاشان بێن بۆ ئەو ژوانگەیە کە خوای پەروەردگار بۆی دیاریی کردوون، دەفەرمویْ: ﴿ وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَا ﴾، وە مووسا حەفتا پیاوی لە گەلەکەی هەڵبژارد، بۆ ژوانگەی ئێمە، ﴿ فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ ﴾، ئنجا کاتێك بوومەلەرزە گرتنی، ئایا هەر کە چوون یەکسەر بوومەلەرزە گرتنی ؟! نەخێر، بەڵام قورئان وەك جاری دیکەش گوتوومانە، ئەوەی کە سیاق دەلالەتی لەسەر بکاتو، عەقڵ بتوانێ بۆخۆی دەرکی پێ بکات، دەیقرتێنێو نایفەرمویْ، ئنجا کە چوون بۆ ئەو شوێنە لەو کاتە دیاریی کراوەدا، داوایەکی بێجێیان کردوە، خوای کاربەجێش بوومەلەرزەیەکی بۆ ناردوونو بێهۆش کەوتوون، یاخود مردوون، ئەگەرنا هەر لەگەڵ چوونیان بۆ ئەو شوێنە، بۆ دیداری خوا، خوای بە بەزەیی بوومەلەرزەی بۆ نەناردوون!

بۆیە ئینسان دەبێ باش سەرنجی ئایەتەکانی قورئان بدات، نەك مانایەکیان بۆ لێکبداتەوە، کە لەگەڵ حیکمەتو دادگەریی‌و سیفەتە بەرزەکانی خوای بێ وێنەدا نەگونجێ.

ئنجا ئایا دوای ئەوە مووسا عليه السلام چی کرد ؟ ﴿ قَالَ رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ وَإِيَّٰيَ ﴾، (مووسا) گوتی: ئەی پەروەردگارم! ئەگەر ویستبات پێشتر

ئەوانیش‌و منیشت دەفەوتاند ، واتە : بایی ئەوەندە کەموکوڕییان هەبووە ، کە منیشیان پێوە بفەوتێنی ، ئەگەرنا مووسا ﷺ گوناهی بە ئەنقەستی نەکردوە ، ﴿أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ﴾ ، ئنجا ئایا بەوەی کە نەفامەکانمان کردیان ، دەمانفەوتێنی ؟ کەواتە : ئەو حەفتا پیاوە ڕیش سپی‌و قسە ڕۆیشتووە ، نەفامییەکیان کردوە ، کە شایستەی ئەوەبن ، خوای دادگەر بوومەلەرزەیان بۆ بنێری‌و ئاوا بێهۆش بکەون ، یاخود بمرن ، ئەگەرنا ئەو ئەنجامە بێ پێشەکیی نەبووە ! ﴿إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ﴾ ، ئەمەش هەر تاقیکردنەوەی تۆیە ، هەر کەسێکت بوێ ، بەهۆی تاقیکردنەوەی خۆتەوە ، گومڕای دەکەی‌و ، هەر کەسێکیشت بوێ ، ڕێنمایی دەکەی ، واتە: ویستی تۆ هیچ قەیدو بەندێکی لەسەر نیە ، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەنیە خوا لەگۆترە خەڵك گومڕا دەکاتو ، لەگۆترە خەڵك ڕێنمایی دەکات ! مووسا ﷺ مەبەستی ئەوە نیە ، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە بڵێ : خوایە ! تۆ دەستت کراوەیەو دەستەڵاتی تۆ ، وە ویستی تۆ هیچ کۆتو بەندێکی لەسەر نیە ، بەڵکو ڕەهایە ، وە هەرچی بتەوێ دەیکەی ، بەڵام خوا چی دەوێ ؟ تەنیا ئەوەی کە حیکمەتی بیخوازێ‌و شایستەی سیفەتە بەرزەکانیەتی ، وەك زۆر جاری دیکەش باسمان کردوە ، خوای کارزان ، ستەمکارانو خراپکاران گومڕا دەکات ، وەك دەفەرموێ : ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٧﴾﴾ إبراهيم ، واتە: خوا ستەمکاران گومڕا دەکات ، ئەدی کێ ڕێنمایی دەکات ؟ دەفەرموێ : ﴿وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾﴾ الشورى ، واتە: خوا هیدایەتی ئەوانە دەدات کە لە دڵەوە بەرەو خوا دەگەڕێنەوەو ، دڵیان بۆ لای خوا وەردەچەرخێنن .

ئنجا مووسا دەڵێ : ﴿أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْغَـٰفِرِينَ﴾ ، تۆ پشتیوانو سەرپەرشتیارمانی ، دەجا لێمان ببوورەو بەزەییت پێماندابێ ، وە بێگومان تۆ باشترینی لێبوردانی .

ئنجا مووسا هەر بەردەوام دەبێ لەسەر داواکارییەکانیو دەڵێ: ﴿ وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَ ﴾، وە لەم ژیانە دنیاییەدا چاکەمان بۆ بنووسە، واتە: چاکەو خێرو خۆشییمان بە قسمەت بکە، چونکە نووسین ڕەمزی بڕیار دانە، خوای بەرزو مەزنیش شتێك بڕیار بدات، دەیکات، کەواتە: ﴿ وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ ﴾، لەم دنیایەدا چاکەمان بۆ بنووسە، مەبەست ئەوە نیە خوا لەلای خۆی بینووسێ! بەڵکو یانی: بۆمان بڕیار بدەو بۆمان بکە، ئنجا ئەو چاکەیە چییە؟ بێگومان هەموو شتێك دەگرێتەوە، وەك: لەش ساغیی، تەبایی، ڕزقو ڕۆزیی زۆر، سەرکەوتن، دادگەریی نێوخۆیی، ... هتد، ﴿ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، وە لە دواڕۆژیشدا چاکەمان بە قسمەت بکە، کە دیارە مەبەست لە چاکەی دواڕۆژیش، بەهەشتی خوایە ﷻ.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَ ﴾، بێگومان ئێمە بۆ لای تۆ گەڕاینەوە، واتە: لەو هەڵەو کەموکوڕییانەی کە کردوومانن، گەڕاینەوەو پەشێمان بووینەوە، تۆش لێمان خۆشبە، وە چاکەی دنیاو قیامەتمان بە قسمەت بکە.

ئنجا خوا ﷻ وەڵامی دەداتەوە، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ ﴾ واتە: (خوا) فەرمووی: سزای خۆم هەر کەسێکم بوێ، تووشی دەکەم، بەڵام خوا سزای خۆی تووشی کێ دەکات؟ بە تەئکید تووشی ئەو کەسانەی دەکات کە شایستەی سزای خوای دادگەرن، پاکیی بۆ خوا کە شتی بە گۆترە بکات، یان لە خۆوە خەڵك سزا بدات، ئەدی خوا نەیفەرمووە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ٤٠ ﴾النساء، واتە: بێگومان خوا بە ئەندازەی قورسایی گەردیلەیەك ستەم ناکات، وە ئەگەر چاکە بێ، پاداشتی چەند بەرانبەر دەداتەوە؟ یان نافەرموێ: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ ٤٠ ﴾ الشورى، واتە: سزای خراپەیەك، خراپەیەکی وەك خۆیەتی؟ یان نافەرموێ: ﴿ مَن

جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾الأنعـام ، واتـە: هـەر كەسێك چاكەیـەك بكـات ، دە بـەرانبـەر پاداشـتی هـەیە ، بـەڵام هـەر كەسێك خراپەیەك بكـات ، تـەنیـا بـە ئـەندازەی خراپەكـەی سزای هـەیە ، وە ئەوان سـتەمیان لـێ ناكرێ ؟

ئـنجـا لەبـەرچی وایـە ؟ چـونكە وەك خـوا فەرموویـەتی : ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ ، واتـە : وە بـەزەیـی مـن هـەموو شـتێكی گـرتۆتەوە ، دیـارە لـە دنیـادا بـەزەیی خـوا هەموو شـتێكی گرتۆتەوە : كـافـرو مسـوڵمان ، باش‌و خراپ ، تـەڕو وشـك ، ژیـاندارو بـێ ژیـان ، چـونكە هـیچ شـتێك بـەبـێ ڕەحـم‌و بـەزەیی خـوا ، ناتوانـێ بـەردەوام بـێ ، بـەڵام ئـەدی لە دواڕۆژدا ؟

دەفـــەرموێ : ﴿فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَـٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴾ ، لەمـەودواو لە دواڕۆژدا (تایبـەتی دەكەم‌و) دەینووسم ، بۆ ئەوانەی كـە پارێـز دەكـەن‌و ، زەكـات لـە (مـاڵی خۆیـان) دەدەن ، وە ئەوانـەی كـە بـڕوا بـە ئـایەتـەكانی ئێمـە دێـنن .

یەكێك بـۆی هـەیە بڵـێ : زەكات لە مەدینە فەرز بووەو ئـەم سـووڕەتەش لـە مەككە هاتـۆتە خـوار ؟ دەڵێیـن : ڕاسـتە ، زەكـات بـەو شـێوەیەی كـە دەبـێ لەوەنـدە ئەوەنـد بدرێ ، وە بدرێ بـەو كەسـانەی ئـەو سـیفەتانەیـان تێـدان ، لـە مەدینـە فـەرز بـووە ، وەك پایەكی ئیسلام ، بـەڵام لە مەككەش مسوڵمانان فەرمانیان پێكراوە ، مـاڵ‌و سامانـی خۆیـان ببەخشــن ، وەك چـۆن فـەرمانیان پێكـراوە كـە نوێـژ بكـەن ، بـەڵام نـەك پێـنج نوێـژە فەرزەكان ، هەتا لە شـەوی میعـراجدا فەرز كـرا ، بەڵام بەگشـتی نوێژیان كردوە ، پاڕانـەوەیان كـردوە ، زیكریـان كـردوە ، بـە هـەمان شـێوەش مـاڵی خۆیـان بـەخشـیوە ، دیارە مەبـەسـت لە زەكـاتیش ئەوەیە كە تۆ مـاڵی خۆت‌و نەفسـی خـۆت پـاك بكـەیەوە ، لـەوەی كە پەیوەسـت بـی بـە ماڵ‌و سامانەكـەتەوەو دەسـتـت لێـی نەبێتـەوە !

ئنجا خوا ﷻ پێناسەی ئەوانە دەکات کە تایبەتیان دەکات بە بەزەیی خۆیەوە ، دەفەرمویٚ : ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ﴾، ئەوانەی شوێن ڕەوانەکرای پێغەمبەری نەخوێندەوار دەکەون ، کە بێگومان مەبەست موحەممەدە ﷺ، ﴿ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ ﴾ ، ئەو کەسەی کە پێناسەو نیشانەی لە تەوڕاتو ئینجیلدا لەلای خۆیان ، بە نووسراوی دەبینن .

ئنجا ئایا ئەو ڕەوانەکراوو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە ﷺ چی لێیان دەویٚو داوای چییان لێدەکات ؟ ﴿يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴾ ، فەرمانیان پێدەکات بە هەر شتێك کە بە عەقڵو شەرع پەسندەو ، ڕێگرییان لێدەکات لە هەر شتێك کە بە عەقڵو شەرع ، ناپەسندە ، ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ﴾ ، وە هەرچی شتی باشو سوودبەخشو خۆشو بەلەززەتە ، بۆیان حەڵاڵ دەکاتو ، هەرچی شتی خراپو زیانبەخشە ، لێیان قەدەغە دەکات ، ﴿وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ ﴾ ، وە ئەو بارە قورسەی لەسەر شانیان بووە ، (کە هەندێ شتیان لێ قەدەغە کراوەو ڕێیان لێگیراوە) لەسەر لادەبات ، چونکە ئەوە هەمووی بەهۆی گوناهو هەڵەو کەموکورییە یەکانیانەوە بووە ، کە خوا بەوە سزای داون ، بەڵام دوای هاتنی پێغەمبەری نەخوێندەوار ﷺ ئەو جۆرە سزایانە نەسخ دەبنەوەو ، ئەزموونێکی تازەی دینداریی دەست پێدەکات ، وە ئەو بارە قورسانەی خراوەتە سەر شانیان ــ بەتایبەتی خاوەن کتێبەکان ــ هەموویان لادەچن ، ﴿وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡ ﴾ وە ئەو کۆتو زنجیرو پێوەندانەی لە دەستو گەردنیاندا بوون ، لێیان لادەبات ، دیارە ئەوە تەعبیرێکی مەعنەوییە ، مەرج نیە خەڵك کۆتو زنجیری ئاسنی لە دەستو پێو گەردن دا بوو بێ ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەو عادەتو نەریتە نەفامانەیان ، ئەو کلتوورە نارێکەیان ، کە دەستو پێی گرتوون ، وەك کۆتو زنجیر ، لە هەموو ڕووەکانی سیاسیو کۆمەڵایەتییو خێزانییو ... هتدەوە ،

پێغەمبەری نەخوێندەوار ﷺ ئەو کۆت و زنجیرانە هەموویان دەپسێنێ و، لایان دەبات و ئازادیان دەکات.

﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ﴾، ئنجا ئەوانەی بڕوایان پێهێناوەو (واتە: بەو پێغەمبەرە) وە ڕێزیان لێگرتووە بەهێزیان کردوە، پشتیان گرتووەو سەریان خستوە، وە بەدوای ئەو ڕووناکییە کەوتوون، کە لەگەڵیدا نێرراوەتە خوارێ (کە قورئانە)، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾، تەنیا ئەوانەن سەرفراز.

ئنجا لە کۆتایی دا، خوا بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ بڵێ: ئەی خەڵکینە! دڵنیابن من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای هەمووتان، ئەو خوایەی کە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی بەس هی ویە.

کە دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە! واتە: بە ڕەش و سپییەوە، بە عەرەب و غەیری عەرەبەوە، بە نێرو مێوە، بە وردو درشتەوە، لە هەر شوێنێکن و بە هەر زمانێکن، من پێغەمبەرو نوێنەری کۆتایی خوای پەروەردگارم، هەڵگری دوا پەیامی خوام بۆ هەمووتان، ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، دەژیەنێ و دەمرێنێ، ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ﴾، دەجا بڕوا بە خواو ڕەوانەکراوو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەکەی بێنن، ئەو کەسەی کە بڕوای بە خواو وشەکانی هەیە، ﴿وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾، وە شوێنی بکەون ڕێی ڕاست گرتوو بن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

# باسێك لەبارەی دیاریکردنی کاتی دانانی میقاتی حەفتا کەسەکەی گەلی مووساوە لەگەڵ خوادا

**مەسەلەی یەکەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱخْتَارَ مُوسَىٰ قَوْمَهُۥ سَبْعِينَ رَجُلًا لِّمِيقَٰتِنَا ۖ فَلَمَّآ أَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّٰىَ ۖ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ ﴾، واتە: مووسا حەفتا پیاوی لە نێو گەلەکەیدا هەڵبژارد، بۆ ژوانگە (کاتو شوێنی دیاریکراویی) ئێمە، ئنجا کاتێك هەژان (ی زەوی) گرتنی (مووسا) گوتی: پەروەردگارم ئەگەر ویستبات پێشتر ئەوانیشو منیشت دەفەوتاند، ئایا بەهۆی ئەوەوە کە نەفامەکانمان کردوویانە، لە نێومان دەبەی ؟! لێرەدا زانایان دەربارەی کاتو، چۆنیەتی ئەو دیدارو ژوانگەیە، زۆریان قسە کردوون، بەڵام ئەوەندەی من سەرنجی ئەو بیست سی تەفسیرەم داوە، کە هەمیشە بۆ تەفسیرکردنی ئایەتەکان سەرنجیان دەدەم، دوو ڕام کەوتوونە بەرچاو:

یەك: هەندێك دەڵێن: هەر جاری یەکەم کە مووسا چووە بۆ وەرگرتنی لەوحەکانی تەورات، کە چل شەوی پێچووە، ئەو کاتە ئەو حەفتا کەسەی لەگەڵ بووەو لەگەڵ خۆی بردوون، بەڵام ئەم ڕایە بێهێزەو پشت ئەستوور نیە، بە هیچ بەڵگەیەکی وا کە شایانی باس بێ.

دوو : هەندێك دەڵێن : ئەوە دیدارێکی دیکەی تایبەت بووە ، وە هیچ پەیوەندیی بەو کاتەوە نەبووە ، کە مووسا چووە لەوحەکانی وەرگرتوون .

دیارە من بە گشتی ئەم ڕایەم پێ ڕاستە ، بەلاّم بەتایبەت لقی پێنجەمی ، چونکە : ئایا ئەو دیدارو ژوانگەیە بۆچی بووە ؟

لەوبارەوە پێنج ڕا هەن :

١) (طبري)و زۆربەی توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە : بۆ تۆبەکردن لە گوێلك پەرستییەکە بووە ، واتە : بۆ پەشێمان بوونەوەو پاساو هێنانەوە بووە لەلای خوا ، بەهۆی ئەوەوە گوێلکیان پەرستوە ، (طبري) لەوبارەوە گوتوویەتی : (يَقُولُ تَعَالَى ذِكْرُهُ : وَاخْتَارَ مُوسى مِنْ قَوْمِهِ سَبْعِينَ رَجُلاً لِلْوَقْتِ وَالأَجْلِ الّذِي وَعَدهُ اللّه أَنْ يَلْقَاهُ فِيهِ بِهِم لِلتَّوْبَة مِمَّا كانَ مِنْ فِعْل سُفَهائِهِم فِي أَمْرِ العِجْلِ)[1]، واتە: خوا ناوو یادی هەر بەرز بێ ، دەفەرموێ : مووسا لە گەلەکەی خۆی حەفتا پیاوی هەڵبژارد بۆ ئەو کاتە ، ئەو ژوانگەیەی کە بەڵێنی دابوو بە مووسا ، ئەو خەڵکە بێنێ بۆ پەشێمان بوونەوە ، لەوەی کە نەفامەکانیان کردیان دەربارەی گوێلك پەرستیی .

ئنجا هەر لەوبارەوە (طبري) ئەم دەقەشی هێناوە : (عَن السُّدِّيّ ، قَالَ : إنَّ اللّهَ أَمَرَ مُوسى عَلَيْهِ السَّلاَم أَنْ يأتيه فِي ناس مِنْ بَنِي إسْرَائِيل ، يَعْتَذِرُونَ إلَيْهِ مِنْ عِبَادَةِ العِجْل ، وَوَعَدَهُمْ مَوْعِداً ، فَاخْتَارَ مُوسى قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلاً عَلَى عَيْنِهِ ، ثُمَّ ذَهَبَ بِهِم لِيَعْتَذِرُوا ، فَلَمَّا أَتَوُا ذَلِكَ المكانَ قَالُوا : لَنْ نُؤْمِنَ لَكَ يَا مُوسى حَتَّى نَرَى اللّهَ جَهْرَةَ ، فَإِنَّكَ قَدْ كَلَّمْتَهُ ، فَأَرِنَاهُ! فَأَخَذَتْهُمُ الصاعِقَةُ فَمَاتُوا ، فَقَامَ مُوسى يَبْكِي وَيَدْعُو اللّهَ وَيَقُولُ : رَبِّ مَاذَا أَقُولُ لِبَنِي إسْرَائِيل إذَا أَتَيْتُهُمْ وَقَدْ أَهْلَكْتَ خِيَارَهُمْ ، لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُمْ مِنْ قَبْل وَإِيَّاي)[2]، واتە: لە سوددییەوە (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین) گێڕدراوەتەوە دەڵێ : خوا فەرمانی بە مووسا کرد : کە هەندێ خەڵك لە گەلی بەنی ئیسرائیل بێنێ بۆ دیداری ، بۆ ئەوەی داوای لێبوردنی لێ بکەن ، بەهۆی ئەوەی کە گوێلکیان

١) (جامع البيان ، ج ٩ ، ص ٧٨).
٢) (جامع البيان برقم : ١٥٠٧٣).

پەرستبوو ، وە کاتێکی بۆ دیاریی کردن ، مووساش حەفتا پیاوی بۆ خۆی هەڵبژاردن لە نێو گەلەکەیدا ، دوایی لەگەڵ خۆی بردنی ، تاکو پاساو بۆ خوا بێننەوەو داوای لێبوردن بکەن ، کاتێك چوونە ئەو شوێنە گوتیان : ئەی مووسا ! ئێمە بڕوات پێ ناهێنین ، تاکو بە ئاشکرا خوا نەبینین ، مادام تۆ فەرمایشتت لەگەڵدا کرد ، دەبێ پێشانی ئێمەشی بدەی ، ئنجا گەردەلوولێك کە ئاگری تێدابوو لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوەو هەموویان مردن ، مووساش هەڵسایەوە گریاو لەبەر خوا پاڕایەوە ، دەیگوت : ئەی پەروەردگارم ! چی لە گەلی بەنی ئیسرائیل بکەم ، چییان پێ بڵێم ، کاتێك کە چوومەوە لایان ؟ لە کاتێکدا ئەوانەی چاکەکانیان بوونو هەڵمبژاردبوون ، هەموویانت فەوتاندوون ، پەروەردگارم ! ئەگەر ویستبات منیشو ئەوانیشت پێشتر دەفەوتاند .

هەر لەوبارەوە (طبري) ئەم دەقەشی هێناوە ، لەسەر ئەو بابەتە : (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ : كَانَ اللّٰهُ أَمَرَهُ أَنْ يَخْتَارَ مِنْ قَوْمِهِ سَبْعِينَ رَجُلاً ، فَاخْتَارَ سَبْعِينَ رَجُلاً فَبَرَّزَ بِهِم لِيَدْعُوا رَبَّهُم ، فَكَانَ فِيمَا دَعَوُا اللّٰهَ أَنْ قَالُوا : اللَّهُمَّ أَعْطِنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدَاً بَعْدَنَا ! فَكَرِهَ اللّٰهُ ذَلِكَ مِنْ دُعَائِهِم ، فَأَخَذَتْهُم الرَّجْفَةُ)[(١)] ، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : خوا فەرمانی بە مووسا کرد ، کە حەفتا پیاو لە گەلەکەی هەڵبژێرێ ، ئەویش حەفتا پیاوی هەڵبژاردنو لەگەڵ خۆی بردنی بۆ دەشت ، بۆ ئەوەی لە پەروەردگاریان بپاڕێنەوە ، ئنجا لەنێو پاڕانەوەکەیانو داواکردنەکەیان دا ، گوتیان: ئەی خوایە ! شتێکمان پێ بدە ، کە پێش ئێمە نەتدابێ بە هیچ کۆمەڵێك ، وە لەدوای ئێمەش نەیدەی بە هیچ کەس ، خواش ئەم جۆرە پاڕانەوەو داوایەی ئەوانی پێ ناخۆش بوو ، بۆیە بوومەلەرزە گرتنی .

٢) هەندێکی دیکە دەڵێن: بەهۆی ئەوەوە بوومەلەرزە گرتنی ، کە گومانی خراپیان بە مووسا بردوەو لافیان لێدا کە مووسا هاروونی کوشتوە ، دیارە هاروون پێش مووسا مردوە ، وە خەڵکێکی زۆر لە بەنی ئیسرائیل گوتوویانە : ئەی مووسا ! تۆ هاروونت کوشتوە ، بۆیە خوای میهرەبان فەرموویەتی : با خەڵکێکیان بێو بپاڕێنەوە ، داوای لێبوردن بکەن .

---

١) (جامع البيان برقم : ١٥٠٧٥).

٣) وە هەندێکی دیکە گوتوویانە : ئەو بوومەلەرزەیە بۆیە ئەو خەڵکەی گرتوە ، چونکە ئامادە نەبوون واز بێنن لە تێکەڵیی لەگەڵ ئەوانەدا کە گۆلکیان پەرستوە ، نەك لەبەرئەوەی گۆلك پەرست بوون ، ئەوانەی گۆلکیان پەرستبوو ، سزای خۆیان وەرگرت ، بەڵام ئەوانە ئامادە نەبوون وازیان لێ بێنن‌و دوورییان لێ بگرن ، بۆیە خوای بالادەست ئەو بوومەلەرزەیەی لێ داون .

٤) وە لە ڕیوایەتی ژمارە (١٥٠٨٤)دا کە (طبري) هێناویەتی : (عَنِ ابْنِ عَبَّاس : أَنَّ السَّبْعِينَ الَّذِينَ اخْتَارَهُمْ مُوسى مِنْ قَوْمِهِ ، إِنَّمَا أَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ ، أَنَّهُمْ لَمْ يَرْضَوا وَلَمْ يَنْهَوا عَنِ العِجْلِ) ، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ ، گوتوویەتی : ئەو حەفتایەی کە مووسا هەڵیبژاردن لە نێو گەلەکەی دا ، بۆیە بوومەلەرزە گرتنی ، چونکە ڕازی نەبوون بە گۆلك پەرستیی ، بەڵام ڕێگرییشیان لێ نەکرد ، واتە: بێ هەڵوێست بوون .

٥) ئەو سزایە بۆ پابەندکردنیان بووە بە تەوراتەوە : (طبري) لە تەفسیرەکەی خۆی ، وە (إبن کثیر)یش لە (المصباح المنیر في تهذیب تفسیر إبن کثیر) لاپەڕە (٦٢)دا هێناویانە لە تەفسیری هەردوو ئایەتی (٥٥ و ٥٦)ی سووڕەتی بەقەرەدا ، کە لە ڕاستییدا من ئەم ڕایەم بە دڵەوە نووساو ، دەتوانم بڵێم : بەهێزترە ، لەوەی کە ئەو حەفتا کەسە بۆ مەسەلەی پاساو هێنانەوە لە گۆلك پەرستیی چووبن ، هەرچەندە ئەویش ڕوویێکی هەیەو دەچێتە دڵەوە ، بەڵام من ئەمەم زیاتر بە دڵەوە نووسا .

دوو ئایەتەکەش بەم شێوەیەن : ﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾ ، واتە : وە یاد بکەنەوە کاتێك گوتتان : ئەی مووسا ! بڕوات بۆ ناهێنین هەتا بە ئاشکرا خوا نەبینین ، ئیدی لە سزای ئەوەدا هەورە تریشقەیەك لێیدان ، کە تەماشاتان دەکرد . پاشان دوای مردنتان زیندوومان کردنەوە ، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن .

لە تەفسیری ئەم دوو ئایەتەدا ، (طبري وإبن كثير) دەڵێن : (قَالَ عَبْدالرَّحْمَن بْن زَيد بْن أَسْلَم فِي تَفْسِير هَذِهِ الآيَة : قَالَ لَهُمْ مُوسى لَمَّا رَجَعَ مِنْ عِنْدِ رَبِّه بالأَلْوَاحِ ، قَدْ كتب فِيها التَّوْرَاة ، فَوَجَدهُم يَعْبدُون العِجْل ، فَأَمَرَهُم بقَتْل أَنْفُسِهِم ، فَفَعَلُوا ، فَتَابَ اللّه عَلَيْهِم ، فَقَالَ : إِنَّ هَذِهِ الأَلْوَاحَ فِيها كِتَاب اللّه ، فِيهِ أَمْرُهُ الَّذِي أَمَرَكُمْ بِهِ ، وَنَهْيُهُ الَّذِي نَهاكُمْ عَنْهُ ، فَقَالُوا : وَمَنْ يَأْخُذُهُ بقَوْلِك أَنْتَ ؟! لا وَاللّهِ حَتَّى نَرَى اللّهَ جَهْرَةً ، حَتَّى يَطَّلِعَ اللّه عَلَيْنَا ، فَيَقُولُ : هَذَا كِتَابِي فَخُذُوهُ ، فَمَا لَهُ لا يُكَلِّمُنَا كَمَا يُكَلِّمكَ أَنْتَ يَا مُوسى؟ فَيَقُولُ : هَذَا كِتَابِي فَخُذُوهُ ؟ وَقَرأَ قَول اللّهِ تَعَالى : ﴿لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ ﴿٥٥﴾﴾ ، قَالَ : فَجَاءَتْ غَضْبَة مِنَ اللّه ، فَجَاءَتْهُم صاعِقَةٌ بَعْدَ التَّوْبَة ، فَصَعِقَتْهُم فَمَاتُوا أَجْمَعِين ، قَالَ: ثُمَّ أَحْيَاهُم اللّه مِنْ بَعْد مَوْتِهِم ، وَقَرأَ قول اللّه تَعَالى : ﴿ثُمَّ بَعَثۡنَٰكُم مِّنۢ بَعۡدِ مَوۡتِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٥٦﴾﴾ ، فَقَالَ لَهُمْ مُوسى: خُذُوا كِتَابَ اللّه ، فَقَالُوا: لا ، فَقَالَ: أَيُّ شَيءٍ أَصابَكُمْ ؟ قَالُوا : أَصابَنَا أَنا مِتْنَا ثُمّ حيينَا ، قَالَ : خُذُوا كِتَابَ اللّهِ ، قَالُوا : لا ، فَبَعَثَ اللّهُ تَعَالى مَلائِكَةً فَنَتَقَتِ الجبَلَ فَوْقَهُمْ) [1]، واتە: عەبدورەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین) لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا گوتوویەتی : مووسا دوای ئەوەی لەلایەن پەروەردگاریەوە بە لەوحەکانەوە گەڕایەوە ، کە تەوراتیان تێدا نووسرابوو ، بینی خەڵکەکە گۆلك دەپەرستن ، ئەویش فەرمانی پێکردن یەکدی بکوژن (خۆیان بکوژن) ئەوانیش وایانکرد ، خواش لێیانی قبووڵ کرد ، ئنجا مووسا فەرمووی : ئەو لەوحانە کتێبی خوایان تێدایە ، وە ئەو فەرمانەی تێدایە کە فەرمانی پێکردوون ، وە ئەو ڕێگرییەی تێدایە ، کە لێی قەدەغە کردوون ، گوتیان : ئنجا کێ تەنیا بە قسەی تۆ ئەم کتێبە وەردەگرێ ؟ نەخێر سوێند بە خوا ، هەتا خوا بە ئاشکرا نەبینین و پێمان نەفەرمویێ : ئەوە کتێبی منە وەریبگرن ، وەریناگرین ، بۆچی خوا وەك

---

١) (جامع البيان ، ج ٨ ، ص ٨٨ ، والمصباح المنير ، ص ٦٢).

قسە لەگەڵ تۆدا دەکات ، لەگەڵ ئێمەش دا قسە ناکات (زۆر لە خۆبایی‌و خۆپەسند بوون) ئنجا ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزی خوێندەوە : ﴿ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً ﴿٥٥﴾ ﴾ ، واتە: بڕوات پێ ناهێنین ، هەتا بە ئاشکرا خوا نەبینین ، دەڵێ : ئنجا تووڕەییەك لە خواوە هات ، وە هەورە تریشقەیەك ، یان گەردەلوولێك کە ئاگری تێدابوو ، پاش تۆبەکردنیان ، لێی دان ، هەموویان مردن ، ئنجا دوای مردنەکەیان ، خوا زیندووی کردنەوە ، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾ .

ئنجا مووسا پێی فەرموون : کتێبی خوا وەربگرن (واتە : پێیەوە پابەندبن).

گوتیان: نەخێر .

فەرمووی : چیتان تووش بووە ؟

گوتیان : ئەوەمان تووش بوو کە مردین ، دوایی زیندوو کراینەوە.

فەرمووی: دەجا کتێبی خوا بگرن .

گوتیان : نەخێر .

ئیدی خوا فریشتەیەکی نارد ، کێوێکی هەڵکەند ، لەسەر سەری ڕاگرتن کە پابەند دەبن بە تەوڕاتەوە ، یان نا ؟

ئنجا ـ وەك دوایی باسی دەکەین ـ ئەوانیش لەسەر لاسەرێکیان کڕنووشیان بردو بەلاو نیو ، تاکو چاویشیان لە کێوەکە بێ ، داخۆ بەسەریاندا دەکەوێ ، یان نا ؟ ئاوا هاتنە ژێر بار .

کە بەڕاستیی وەك گوتم من ئەو ڕیوایەتەم زۆر بە دڵەوە دەنووسێ ، ئنجا بە نسبەت وشەی (صاعِقَة) و (رَجْفَة) کە لە سووڕەتی (البقرة)دا باسی (صاعِقَة) دەکاتو لە سووڕەتی (الأعراف)دا باسی (رَجْفَة) دەکات ، هەندێك لە زانایان گوتوویانە : دوو بەسەرهاتی جیاوازن .

منیش دەڵێم: پێویست ناكات بڵێین: ئەوانە دوو ڕووداوی لێك جیان، چونكە هەورە تریشقە (صاعِقَة) كە دێتە خوار، دەبێتە هۆی بوومەلەرزە (رَجْفَة)، هەورە تریشقە لە ئاسمانەوە دێتە خوار، لە زەوی دەداتو، ئەو زەوییە دەلەرزێنێتەوە، كەواتە: پێویست ناكات بڵێین: دوو بەسەرهات بوون، هەر یەك بەسەرهاتە، بەڵام خوای كاربەجێ لەوێ (البقرة) سەرەتای دابەزینی سزایەكە، كە (صاعِقَة)یە، باس دەكاتو لە سوورەتی (الأعراف)دا دەرەنجامی دابەزینی (صاعِقَة) باس دەكات، كە بریتیە لە بوومەلەرزە، بەو دوو شەیە (صاعِقَة) و (رَجْفَة) تەعبیری لە سزایەك كردوە.

**مەسەلەی دووەم:** كە دەفەرموێ: ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَاءُ وَتَهْدِي مَن تَشَاءُ أَنتَ وَلِيُّنَا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ﴾، مووسا ﷺ دەفەرموێ: ئەوە هەر تاقیكردنەوەی تۆیە، كە هەر كەسێكت بوێ، گومڕای دەكەی، وە هەر كەسێكیشت بوێ، ڕێنمایی دەكەی.

ئەگەر چی جاری دیكەش ئەوەمان ڕوونكردۆتەوە، بەڵام مادام خوای پەروەردگار لێرە باسی كردۆتەوە، ئێمە ئەگەر بە درێژیش نەبێ، هەندێكی ڕوون دەكەینەوە: فەرهەنگەكانی زمان دەربارەی وشەی (فتنة) دەڵێن: (أَصْلُ الفَتْنِ إدخَالُ الذَّهَبِ النَّارَ لتَظْهَرَ جَوْدَتَهُ مِن رَدَائَتِهِ، والفِتَنَةُ بِمَعْنَى الإختبارِ وَالبَلاءِ وَ العَذَابِ لأَنَّها سَبَبُهُ)، وشەی: (فِتنة) ڕیشەكەی لە (فَتْن)ەوە هاتوە (فَتْن)یش بریتیە لەوەی كە زێڕ بخرێتە نێو ئاگر، تاكو دەركەوێ داخۆ چۆنە؟ زێڕی ساغە یاخود ناساغە و شتی دیكەی ڕەگەڵ خراوە؟ وە وشەی (فِتْنَة) بەمانای تاقیكردنەوە دێ، وە بەمانای بەڵاو، بەمانای ئازارو ئەشكەنجەش دێ، چونكە بەهۆی ئەوەوە پەیدا دەبێ، واتە: ئەو ئازارو ئەشكەنجەیە، بەهۆی ئەو تاقی كرانەوەوە پەیدا دەبێ، وەك خوای كاربەجێ بە مووسای فەرمووە: ﴿... وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا ...﴿٤٠﴾﴾ طه، واتە: تۆمان تاقیكردەوە بە چەند تاقی كردنەوەیەك، تاكو خڵتەی پێوە نەهێڵێ.

# وشەی (فِتْنَةَ) لە قورئان دا بە چەند مانایەك بە كارهاتوە

**یەکەم** : بە مانای تاقیکردنەوە دێ ، وەك لە سوورەتی (العنکبوت)دا دەفەرموێ :

﴿ الٓمٓ ① أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ② ﴾، واتە : ئەلیف ، لام ، میم ، ئایا خەڵك پێیان وایە بەوەندە وازیان لێ دەهێنرێ ، كە بڵێن : بڕوامان هێنا ، بێئەوەی تاقی بكرێنەوە ؟!

**دووەم** : بە مانای فریودان و هەڵخەڵەتاندن دێ ، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا خوا دەفەرموێ : ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ ...㉗ ﴾ ، واتە : ئەی وەچەی ئادەم ! شەیتان هەڵتاننەخەڵەتێنێ و فریوتان نەدات ، وەك چۆن بابو دایكتان (ئادەم و حەووا)ی هەڵخەڵەتاندو لە بەهەشتی وەدەرنان .

**سێیەم** : بە مانای بەڵاو گرفتاریی ، دێ ، هەر بەڵاو گرفتارییەك بەسەر ئینسان بێ ، پێی دەگوترێ : (فِتنة) ، وەك خوا لە سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ : ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ㉕ ﴾ ، واتە: لە بەڵایەك بترسن ، كە تەنیا تووشی ستەمكارەكانتان نابێ ، وە بزانن كە خوا سزای توندە.

**چوارەم** : وە بە مانای گومڕاكردن ، دێ ، وەك لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ :

﴿ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ ㊶ ﴾ ، واتە : هەر كەسێك خوا بیەوێ گومڕای بكات ، تۆ هیچ شتێكت بۆ وی لە بەرانبەر خوادا پێناكرێ .

**پێنجەم**: وە بە مانای ئازاردان ، دێ ، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ :

﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ ﴾ ، واتە: وە لەگەڵ كافراندا بجەنگن ، تاكو (فِتنة) نامێنێ ، واتە: تاكو كافرەكان توانای ئەوەیان نامێنێ مسوڵمانان ئازار بدەنو ، ئەشكەنجەیان بدەنو لە دین هەڵیان بگێڕنەوە ، یاخود خەڵكی ئازار بدەنو ، نەهێڵن مسوڵمان ببن .

لێرەدا ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە : ئەو وشە قورئانییانەی دێنە پێشمان ، دەبێ تەماشای سیاقەكەیان بكەین ، ئەگەرنا جاری وایە یەك وشەی قورئانیی بە پێنج مانایان دێ ، بۆیە دەبێ تەماشای بكەین كە لە چ سیاقێك دا هاتووە ، تەماشای وشەكانی پێشەوەو دواوەی بكەین ، ئنجا مانایەكەی زیاتر دێتە دەستو ڕوون دەبێتەوە .

لێرەدا مووسا عليه السلام كە دەفەرموێ : ﴿ إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ ﴾ ، هەندێك لە توێژەرەوان مانای وایان بۆ لێكداوەتەوە كە نەك شایستەی مووسا عليه السلام نیە ، بەڵكو شایانی مسوڵمانێكی باشیش نیە ، بەڵام سبحان الله ! نازانم چۆن شتی وایان گوتوە ؟ بۆ وێنە :

هەندێك گوتوویانە : مووسا عليه السلام لێرە دەڵێ : خوایە ! هەر بۆخۆت هەركەس بتەوێ گومڕای دەكەیو ، هەركەسیش بتەوێ ، هیدایەتی دەدەی !

بەڵام مووسا عليه السلام مەقامی زۆر لەوە بەرزترە ، ئاوا لەگەڵ خوای پەروەردگاردا قسە بكات ، بەڵكو لێرە دەگونجێ دوو مەبەست هەبن :

<u>یەك</u>: مووسا عليه السلام باسی یاسایەكی گشتی خوا دەكات ، كە بریتیە لە تاقیكردنەوەی بۆ بەندەكانی ، دەڵێ : خوایە ! تۆ بەندەكانی خۆت تاقی دەكەیەوە ، تۆ خاوەنی ئەو خەڵكەیو ، بۆ ئەوە دروستت كردوون ، كە تاقییان بكەیەوە ، وەك چۆن خوا لە چەند ئایەتێكی قورئان دا دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ ﴿٢﴾ ﴾الملك ، ئنجا مووساش عليه السلام هەر ئەوەی دووبارە كردۆتەوە .

دوو : کە دەفەرموێ : ﴿ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي مَن تَشَآءُ ﴾ ، باسی ڕەهاییو بێ نیازیی ویستی خوا دەکات ، نەك وەك جەبرییو قەدەرییو موعتەزیلەی گوتبێ ، یان وەك وان بیری کردبێتەوە ، مووسا ﷺ پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوایە ، مەبەستی ئەوەیە : خوایە ! تۆ خەڵك گومڕا دەکەی ، بەڵام لەبەرئەوەی شایستەی گومڕایین ، یان کە خەڵك ڕێنمایی دەکەی لەبەرئەوەی کە شایستەی ڕێنماییین ، یانی : لێرەدا بێنیازییو بێ باکیی خوای تاكو تەنیاو باڵادەست دەخاتە ڕوو ، دەڵێ : خوایە ! تۆ پەکت لەسەر کەس نەکەوتوە ، مادام ئەو کەسە بۆخۆی گومڕایی هەڵدەبژێرێ ، تۆش گومڕای دەکەی ، وە ئەوەش کە ڕوو دەکاتە هیدایەت ، تۆ هیدایەتی دەدەی ، بێئەوەی کە پێویستیت پێی بێ ، تاکو بتپەرستێ .

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَ ﴾ ، واتە : لەم ژیانی دنیایەدا چاکەمان بۆ بنووسە ، یانی : چاکەمان بۆ بڕیار بدە ، وە بە نسیبمان بکەو پێمان بدە ، وە لە دواڕۆژیش دا چاکەمان بە نسیب بکە ، ئێمە بۆ لای تۆ گەڕاینەوە .

وشەی (حَسَنَة) بۆ دنیاو بۆ دواڕۆژ ، بەکارهاتوە، توێژەرەوان زۆریان قسە لەوبارەوە کردوە ، بەڵام لەبەرئەوەی خوا بە ڕەهایی هێناویەتی ، هەموو شتێك دەگرێتەوە ، وەك : لەش ساغیی ، هێمنو ئارامییو ئاساییش ، ڕزقو ڕۆزیی فراوان ، زانستو زانیاریی ، عەقڵی سەلیم ، ماڵو منداڵی باش ، هاوسەری باش ، سەرکەوتن ، بەختەوەریی ... هتد ، بەڵام (حَسَنَة)ی دواڕۆژ دیاریی کراوە ، کە بریتیە لە بەهەشتی خواو ڕەزامەندیی خوا ﷻ ، کەواتە : مووسا دوعای خێرو خۆشیی دنیاو دواڕۆژی بۆخۆیو بۆ گەلەکەی کردوە ، هەر ئەوەش شایستەی مووسایە ، لەگەڵ ئەو هەموو نەفامییو نەزانییو کەللە ڕەقییەی گەلەکەی دا، بەڵام پێشەوایانێك کە خەڵك بە ڕێی خوادا دەبەن ، دەبێ ئاوا دڵسۆزو پەرۆشی خەڵك بن ، وە هەوڵی دەستەبەرکردنو دابینکردنی پێداویستییەکانیان بدەن ، وە خێرو خۆشی دنیاو دواڕۆژیان بۆ بە ئاوات بخوازن ، وەك خوا لە سوورەتی

(البقـرة) لەسـەر زاری بەندە چاکەکانی دەفـەرموێ : ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ ﴾ ، واتە: وە کەسانێکیش هەن دەڵێن : پەروەردگارمان ! لە دنیادا چاکەمان بدەیەو لە دواڕۆژیش دا چاکـەمان بدەیە ، وە لە سزاو ئـازاری ئـاگـر بمانپارێزە .

وە ئێمە لە سووڕەتی (البقـرة)دا بە تەفصیلێ تەفسـیری ئەم ئایەتە موبـارەکەمان کـردوە .

دیـارە وشـەی ﴿ إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ ﴾ ، یـانی : (إِنَّـا تُبْنَـا وَرَجَعْنَـا إِلَيْـكَ) واتـە : خـوایە ! مادام ئێمـە بۆ لای تۆ گـەڕاینـەوە ، تـۆش خێـرو خۆشـیی دنیـاو دواڕۆژمـان بـە قسـمەت بکـە .

**مەسـەلـەی چــوارەم** : دیـارە خــوای پەروەردگـار وەڵام دەداتــەوە : ﴿ قَالَ عَذَابِىٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنْ أَشَآءُ ۖ وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ ﴾ ، (خــوا) فەرمـــووی : سـزای خـۆم تووشـی هـەر کەسـێك دەکـەم کـە بمـەوێ ، وە بـەزەییەکەشـم هـەموو شـتێکی گـرتۆتـەوە ، کە دەفـەرموێ : سـزاو ئـازاری خـۆم تووشی هـەر کەسێك دەکـەم کە بمـەوێ ، لێـرەدا خـوا ﷻ باسی ڕەهـایی ویسـتو دەسـتەڵاتی خـۆی دەکـات ، کە هـەر کەسـێکی بـوێ ، سـزای دەدات ، بـەڵام بێگومـان هـیچ کەسـێك نابـێ وا بیـر بکاتـەوەو بفـامرێتـەوە ، کـە خـوا لـە گۆتـرەو بـەبـێ هـۆ ، خەڵـك سـزا دەدات ، بەڵکو حیکمـەتی ئەو ڕستەیە دەرخستنی ئەو ڕاستییەیە ، کە هیچ کەس بـۆی نیـە مافـی ڤیتـۆی هەبـێ لـە بـەرانبـەر خـوادا ، بـەو مانایـە کـە گوناهـانیش بکـاتو ، خـواش لێـی نەپرسـێتەوەو سزای نـەدات ! هـیچ کـەس هـەقی ئـەوەی نیـە ، چـونکە جوولـەکەکان ئیـددیعای وایـان زۆر کــردوە ، کـە : ئێمـە جگـە لـە چـەند ڕۆژێکـی کـەم ، ئـاگـرمان تووش نابـێ ، یـان گوتوویانـە: ئێمـە جگـە لـە ئەنـدازەی ڕۆژەکـانی گۆلك پەرستیی ، سـزا نادرێیـن ، کە هـەندێك دەڵێن : چل (٤٠) ڕۆژە ، هـەندێك دەڵێن : سـی (٣٠) ڕۆژو ، هـەندێك دەڵـێن : دە (١٠) ڕۆژ بــووە ، تـەنیا ئەوەنـدە لـە دۆزەخدا دەمێنینـەوە ، خـوای دادگـەر دەیـەوێ ئەو ئیـددیعایە هـەڵبوەشێنێتـەوە .

دیارە خوای پەروەردگار بە یەك چاو تەماشای هەموو بەندەکانی دەکات ، بەڵام بە نسبەت بەزەیی خۆیەوە ، کە دەفەرموێ : ﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ ، وە بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە ، چونکە لە دنیادا هەموو شتێك بە بەزەیی خوا بەڕێوە دەچێ ، وە ئەوە لە دنیادا هاتۆتە دی : کافر ، مسوڵمان ، بێ ژیان ، ژیاندار ، لە گەردیلە تاکو کەهکەشان ، لە ڕەحمەتی خوادا دەژین ، وە بە ڕەحمەتی خوا دروست بوون ، وە بە ڕەحمەتی خوای کاربەجێو پەروەردگاریش بەڕێوە دەچن ، بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی ، حیسابەکان دەگۆڕێن ، وەك لە مەسەلەی پێنجەم دا دەیخەینە ڕوو .

**مەسەلەی پێنجەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَوٰةَ وَالَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴾ ، واتە: بێگومان لەمەو دوا بەزەیی خۆم تۆمار دەکەمو دەینووسمو تایبەتی دەکەم ، بەوانەوە کە پارێز دەکەن ، وە زەکات دەدەن ، وە ئەوانەی کە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە دێنن .

ئنجا دوایی زیاتر پێناسەی ئەوانە دەکات کە پارێز دەکەنو زەکات دەدەنو ، بڕوا بە ئایەتەکانی خوا دێنن ، دەفەرموێ : ئەوانەی کە بە دوای ڕەوانەکراوی پێغەمبەری نەخوێندەوار ، (یان نەشارەزا بە کتێبە ئاسمانییەکان) دەکەون کە بە نیشانەکانی نووسراویی لەلای خۆیان لە تەوراتو ئینجیلدا دەیبینن ، چی بە نووسراویی دەبینن ؟ پێناسەی ئەو پێغەمبەرەو وەسفەکانی ، کەواتە: بەزەیی خوا لە ڕۆژی دوایی دا ، بۆ کەسانێك تەرخان کراوە ، کە ئەو چوار سیفەتەیان تێدان :

١/ پارێز دەکەن ، پارێز کردنو خۆپاراستن ، پێش هەموو شتێك ، دەبێ ئینسان خۆی لە کوفرو شیركو نیفاقو بێدینیی ، بپارێزێ پاشان دەبێ خوا بەیەکگرتنو تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن ، بە ساغییو ڕاستیی لە خۆیدا بێنێتە دی ، وە دوایی خۆدوورگرتن لە شکاندنی قەدەکانو نەچواندنی فەرزەکان ، لە خۆی دا بەرجەستە بکات .

٢/ زەکاتی ماڵی خواش لە ماڵو سامانیان دەدەن ، کەسانێکی بەخشندەنو دەبەخشن .

٣/ یەکێکی دیکە لە سیفەتەکانیان ئەوەیە کە بڕوا بە ئایەتەکانی خوا دێنن .

٤/ سیفەتی چوارەمو کۆتاییش ئەوەیە ئەوانە بە دوای ڕەوانە کراوی پێغەمبەری نەشارەزا لە کتێبە ئاسمانییەکان (یاخود نەخوێندەوار) دەکەون ، کە نە نووسینی زانیوەو ، نە خوێندنی زانیوە .

**مەسەلەی شەشەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ ،

وەك دەبینین خوای کاربەجێ بە دە وشە وەسفو پێناسەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەکات :

١) ﴿ ٱلرَّسُولَ ﴾ ، واتە : ڕەوانەکراو ، زانایان دەڵێن : (رسول) واتە : ڕەوانەکراوێك لەلایەن خواوە کە خاوەنی بەرنامەی تایبەتی خۆیەتی .

٢) ﴿ ٱلنَّبِيَّ ﴾ ، واتە : وەحی بۆ کراو ، کە دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ، هەم خاوەن بەرنامە بووە ، هەم وەحیشی بۆ کراوە .

٣) ﴿ ٱلْأُمِّيَّ ﴾ ، نەخوێندەوار ، نەشارەزا ، واتە : هەم خوێندنو نووسینی نیە ، هەم نەشارەزایە لە کتێبە ئاسمانییەکان ، کە من ئەو مانایەی دووەمم پێ بەهێزترە ، بۆ وشەی (أُمِّي).

٤) ﴿ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ ﴾ ، ئەوەی کە دەیبینن ، نووسراوە لەلایان لە تەوراتو ئینجیل دا ، واتە: نیشانەکانی نووسراونو ، ناوی هێنراوەو وەسفەکانی لە تەوراتو ئینجیلدا هەن ، لەلای خاوەن کتێبەکان .

٥) ﴿يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ ، فەرمانیان پێدەکات بە هەرچی شتی پەسندە .

٦) ﴿وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ ، وە ڕێگرییان لێدەکات لە هەرچی شتی خراپو ناپەسندە .

٧) ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ ، وە هەرچی شتی بە سوودو خۆشو بە تامە ، بۆیان حەلاڵ دەکات .

٨) ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ﴾، وە هەرچی شتی زیان بەخشو پیسو خراپە ، لێیان قەدەغە دەکات .

٩) ﴿وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ﴾ ، ئەو بارە قورسەی لەسەر شانیان بووە ، بەهۆی سزادرانیان لە کاتی خۆی دا ، بەهۆی شکاندنی فەرمانەکانی خواوە ، لەسەریان لادەبات .

١٠) ﴿وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ﴾ ، وە ئەو کۆتو پێوەندانەی کە دەستو پێو گەردنیان گرتوون ، دەیانپسێنێو لایان دەبات .

ئەوانە دە (١٠) وەسفی پێغەمبەری خاتەمن ﷺ ، کە خوای پەروەردگار لەم ئایەتە موبارەکەدا پێناسەی ئەویان پێدەکات .

زانایانی ئیسلام زۆر تەماشای کتێبی خاوەن کتێبەکانیان کردوە ، بە تایبەتی پەیمانی کۆنو نوی ، (العهد القديم والعهد الجديد) کە ئێستا لە کتێبێکدا بەناوی : (الكتاب المقدس العهد القديم والعهد الجديد) چاپ کراوە ، هەروەها چاپێکی دیکەی تازەتری هەیە بە ناوی : (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس) کە هەردووك پەیمانی کۆنو نوێی تێدایە ، ئنجا کە دەگوترێ : پەیمانی کۆن ، وێڕای تەورات ، کۆمەڵە کتێبێکی دیکەشی تێدان ، وە کە دەگوترێ : پەیمانی نوێ ، وێڕای چوار ئینجیلەکان ، کۆمەڵە کتێبو نامەی دیکەشی گرتوونە خۆی .

# موژدەدانی کتێبە پێشووەکان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ

زانای بەناوبانگ (رحمة الله بن خليل الرحمن الهندي) ، کتێبێکی تایبەتی لەوبارەوە نووسیوە بەناوی : (إظهار الحق) (دەرخستنی هەق) کە لەو کتێبەی دا ، لە هەردوو پەیمانی کۆن‌و پەیمانی نوێدا ، هەژدە (١٨) موژدەی دەرهێناون ، لە هەژدە (١٨) شوێندا ، ئنجا لەگەڵ ئەوەی پەیمانی کۆن‌و نوێ دەستکارییش کراون ، ئێستاش هەندێ نیشانەو سیفەت هەن ، کە لە غەیری پێغەمبەری کۆتایی ﷺ بەسەر هیچ کام لە پێغەمبەرانی دیکەدا ناچەسپن ، ئێمەش لەو هەژدە موژدەیە ، حەوتیان لێرەدا دەنووسین ، بەڵام سەرەتا پێم باشە ڕوونکردنەوەیەك بدەم بۆ بەرچاو ڕوونیی زیاتر ، دەربارەی دەستکارییکرانی کتێبەکانی پەیمانی کۆن‌و نوێ :

جوولەکەو نەصرانییەکان ئێستاش لەگەڵدابێ بەردەوامن لە دەستکارییکردنی کتێبەکانی خۆیان ، من سێ ، چوار نوسخەم لە لایە ، کە لە ماوەی جیا جیادا چاپکراون ، جیاوازیی لە نێوانیاندا هەیە ، چ جای ئەوەی کە کاتی خۆی دەبێ چەندیان لێ گۆڕیبێ ، ئنجا ئەو (الكتاب المقدس)ەی کە زانای بە ناوبانگ (رحمة الله بن خليل الرحمن الهندي) ئەم دەقانەی لێ هێناون ، لەگەڵ ئەم (الكتاب المقدس)ەی لای منە ، هەندێ وشەی جیان ، بەڵام واتا گشتییەکەیان هەر یەکە ، موژدەکانیش ئەمانەن :

**موژدەی یەکەمیان :** دەڵێ : (وَسوفَ أُقِيمُ لَهُمْ نَبِيّاً مِثْلَكَ مِنْ بَيْنِ إخوتِهِمْ وَأَجْعَلُ كَلاَمِي فِي فَمِهِ وَيُكَلِّمهُم بِكُلّ شَيء آمرهُ بهِ ، وَمَنْ لَمْ يُطِعْ كَلاَمَهُ الّذِي يَتَكَلَّمُ بِهِ باسْمِي ، فَأَنَا أَكونُ المنْتَقِمُ مِنْ ذَلِكَ)[1]، (لێرەدا

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم : سفر التثنية، الإصحاح : ١٨، ص٣٩٠.

خوا فەرمایشت لەگەڵ مووسا ﷺ دەکات ) : واتە : لەمەودوا پێغەمبەرێکی وەك تۆیان لەنێودا بەرپا دەکەم ، لەنێو برایەکانیان دا، وە فەرموودەی خۆم دەخەمە سەر زاری ، وە بە هەر شتێك کە من فەرمانی پێدەکەم ، قسەیان لەگەڵدا دەکات ، (واتە: پەیامی منیان پێدەگەیەنێ بە تەواویی) ، وە هەر کەسێك فەرمانبەریی نەکات ، بەو فەرمایشتەی کە قسەی پێدەکات بەناوی منەوە ، ئەوە من تۆڵە لەو کەسە دەستێنمەوە .

دیارە کە دەڵێ : (نَبِيّاً مِثْلَكَ مِنْ بَيْنِ إِخوتِهِمْ) ئەوان (بەنو ئیسرائیل) بوون ، کەچی ئەو دەڵێ : پێغەمبەرێکی وەك تۆ لەنێو برایەکانیاندا ، نەك لە نێو (بەنی ئیسرائیل)دا ، چونکە ئیسرائیل لەقەبی پێغەمبەر یەعقووبە ، یەعقووبیش کوڕی ئیسحاقە ، ئیسحاقیشی کوڕی ئیبراهیم ، وە ئیبراهیم دوو کوڕی هەبوون ، ئیسحاق کە لە سارا خاتوون بووە ، ئیسماعیل لە هاجەر خاتوون ، کە میسریی بووە ، کەواتە: کە دەڵێ : (مِنْ بَيْنِ إِخوتِهِمْ) لەنێو برایەکانیان ، واتە : لە بەنی ئیسحاق نیەو ، ناچنەوە سەر یەعقووب ، یانی : ئیسرائیلیی نین ، بەڵکو ئیسماعیلیین !

پاشان ئەم وەسفانەی دیکە کە فەرمووونی ، تەنیا لەگەڵ (محمد) ﷺ دا دەگونجێن : وشەی خۆم دەخەمە سەر زاری ، وە هەرچی من پێی دەڵێم ڕایدەگەیەنێ ، وە پێغەمبەرێکی وەك تۆ دەبێ ، وەك چۆن پێغەمبەر مووسا ﷺ خاوەن بەرنامەیەکی تایبەت هەبووە ، دیارە دوای مووسا ﷺ هیچ پێغەمبەرێکی خاوەن بەرنامەی تایبەت نەهاتوە ، چونکە خوا دەربارەی عیسا ﷺ لە قورئاندا فەرموویەتی : ﴿ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ ﴾آل عمران ، وە عیسا ﷺ هەر تەبەننیی تەوراتی کردوە ، دیارە داوودو سولەیمانو زەکەریاو یەحیاش ، ئەوە هەر چاکتر تەبەننیی تەوراتیان کردوە ، کەواتە: پێغەمبەرێك کە وەك مووسا ﷺ خاوەن بەرنامەی سەربەخۆ بووبێ ، تەنیا موحەممەدە ﷺ کە

پێغەمبەری خاتەمە ، وە ئەویش لە بەنی ئیسرائیل نیە ، بەڵکو لە نێو برایەکانی بەنی ئیسرائیلدا هاتوە ، کە بەنو ئیسماعیل بوونو ، گەلی عەرەبن ، کە دیارە عەرەبی بە عەرەبکراو (مستعربة)ن.

**مژدەی دووەمیان :** دەڵێ : (هم أغاروني بغير إلهٍ، وأغضبوني بمعبوداتهم الباطلة ، وأنا أيضاً أغيرهم بغير شعب وبشعب جاهل أغضبهم)[1]، واتە : (خوا دەفەرموێ :) ئەوان (واتە : بەنی ئیسرائیل) غەیرەی منیان جووڵاند ، بە شتێك كە پەرستراو نەبوو ، وە منیان تووڕە كرد ، بە پەرستراوە پڕوپووچەكانیان ، منیش ئەوان تووڕە دەكەمو غەیرەیان دەجووڵێنم بە گەلێك كە گەل نیە ، وە بە گەلێك كە نەفامە ، ئەوان تووڕە دەكەم .

كە دیارە مەبەست پێی گەلی عەرەبە ، كە عەرەب ئەو كاتە وەك گەلێك نەبوون ، بەڵكو وەك چەند تیرەیەكی پرشو بڵاو بوون ، وە لە ڕاستییدا قورئان عەرەبی كردە گەل ، وە بێگومان نەزانو نەفامیش بوون ، كە دەفەرموێ : تووڕەیان دەكەم ، واتە: بەوە كە دوا پەیامی خۆم لەنێو ئەم تیرە پرشو بڵاوانە پەیدا دەكەم ، وە غەیرەی ئەوان دەجووڵێنم ، ئەوان تووڕەیان دەكەم ، پێی قەڵس دەبن ، وە لە ڕاستییدا بەنی ئیسرئیل زۆر تووڕە بوون ، لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ لەنێو عەرەباندا هات ، كە ئەوان عەرەبیان هەر پێ گەل نەبوو ، وە پێیان وابوو كۆمەڵێكی زۆر نەفامو نەزانو دواكەوتوون ، وە تەماعی ئەوەیان هەبوو كە پێغەمبەری كۆتایی لەنێو ئەواندا بێ.

**مژدەی سێیەمیان :** (وَقَالَ : جَاءَ الرَبُّ مِنْ سِينَا وَأَشْرَقَ لَنَا مِنْ سَاعِير واستعْلَنَ مِنْ جَبَلِ فَارَان ، وَمَعَهُ أُلُوفُ الأَطْهَارِ فِي يَمْينِهِ سَنَةٌ مِنْ نَار)[2]، واتە: وە فەرمووی: پەروەردگار لە سیناوە هات ، وە لە ساعیر بلێیسەیدا ، وە لە چیاكانی فاران خۆی ئاشكرا كرد ، وە هەزاران لە پاكەكانی لەگەڵدا بوون ، وە لەلای ڕاستییەوە ، مەشخەڵێكی ئاگر هەبوو .

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس ، العهد القديم : سفر التثنية ، الإصحاح : ٣٢ ، ص ٤١٣ .
٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس ، العهد القديم : سفر التثنية ، الإصحاح : ٣٣ ، ص ٤١٥ .

دیارە مووسا ﷺ تەوراتی لە سیناوە بۆ هات ، واتە: خوا لەوێوە خۆی دەرخست ، لە ڕێی فەرمایشتەکەیەوە ، کە تەوراتە .

وە ساعیریش چیایەکە لەلای فەڵەستینو شام ، ئەم شوێنەی کە عیسای لێبووە ، ئینجیلیش لەوێ هاتوە ، جارێکی دی خوا لە ڕێی فەرمایشتەکانی لەوێوە ، خۆی بە بەندەکانی ناساندوە .

وە فارانیش بە شاخو چیاکانی مەککە دەگوترێ ، ئەوە هەر لە خودی پەیمانی کۆندا هاتوە ، دیارە قورئانیش لەوێ دابەزیوە .

وە هەزاران لە پاکانیش ، دیارە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرن ﷺ.

وە کە دەفەرموێ : وە لە لای ڕاستی مەشخەڵێکی ئاگر هەبوو ، مەبەست پێی ئەو زەبرو دەستەڵاتو هێزەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێیبووە ، وە بەو هێزو دەستەڵاتە لە دوای خۆی خەلیفە سەر ڕاستەکانی ، ئەو مەشخەڵی ئیمانو هیدایەتەیان بە دنیا بڵاو کردۆتەوە .

ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە کە (فاران) مەبەست پێی شاخو چیاو چۆڵی مەککەیە ؟ لە پەیمانی (کۆن) دا لەبارەی (إسماعیل)ەوە هاتوە : (وَكَانَ اللّٰهُ مَعَهُ وَنَمَا وَسَكَنَ فِي البَرِيةَ وَصارَ شاباً يَرْمِي بالسِّهامِ ، وَسَكَنَ برِيَة فَارَان وَأَخَذَتْ لَهُ أُمُّهُ امْرَأَةً مِنْ أَرْضِ مِصْر)[1]، واتە : (ئیسماعیل) خوای لەگەڵ بوو ، وە گەشەی کردوو، وە لە دەشتو بیابان نیشتەجێ بوو ، بوو بە گەنج ، وە تیری دەهاویشتن، وە لە دەشتو چیاو چۆڵو بیابانی فاران (کە مەککەیە) نیشتەجێ بوو ، وە دایکی ئافرەتێکی لەسەر زەمینی میسر بۆ بەهاوسەر گرت .

دیارە ئیسماعیل خێزانەکەی لە هۆزی جورهوم بوو ، کە دوای وازی لەو خێزانە هێناوە ، ئافرەتێکی دیکەی بە هاوسەر گرتوە ، بەڵام ئەویش هەر لە هەمان هۆز بووە ، ئنجا ئایا خێزانەکەی لە خەڵکی میسر هێناوە ، یان ئەوە هەڵەی پەیمانی کۆنە ؟ گرنگ ئەوەیە دەڵێ : (وَسَكَنَ بَرِيَّة فَارَان) دیارە کە

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس ، العهد القديم : سفر التثنية ، الإصحاح : ٢٢ ، ص ٥٦.

ئیسماعیل لەگەڵ (هاجەر)ی دایکی سەلامی خوایان لێ بێ، لە مەککە نیشتەجێ بوون، وە ئەمە لە تەوراتیشدا هاتوە، جگە لەوەی کە لە صەحیحی بوخارییدا هاتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردوە.

**مژدەی چوارەمیان:** (وَعَلَى إِسْمَاعِيل أَستَجِيبَ لَكَ، هُوَ ذَا أُبَارِكُهُ وَأُكَبِّرُهُ وَأُكَثِّرُهُ جِدًّاً فَسَيَلِدُ اثْنَي عَشَرَ رَئِيساً وَأَجْعَلُهُ لِشَعْبٍ كَبِير)[١]، واتە: (دیارە خوا ئیبراهیم دەدوێنێ) وە بۆ ئیسماعیل وەڵامت دەدەمەوە، من بەرەکەتی تێدەخەمو گەورەی دەکەم، وە زۆر زۆری دەکەم، بە شێوەیەك کە دوازدە سەرۆك لە وەچەی ئەو پەیدا دەبن، وە دەیکەم بە سەرۆك، یان باپیرە بۆ گەلێکی زۆر.

کە دیارە دەگونجێ مەبەست لەم دوازدە سەرۆکە، ئەو دوازدە نەقیبە بێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو ئەوسو خەزرەجدا هەڵیبژاردن.

**مژدەی پێنجەمیان:** (فَلاَ يَزُول القَضِيبَ مِنْ يَهُوذَا وَالمدَبِّرُ مِنْ فَخِذِهِ، حَتَّى يجيءِ الَّذِي لَهُ الكُلُّ وَإِيَّاهُ تَنْتَظِرُ الأُمَم)[٢]، واتە: بەردەوام یەهوزا (کە یەکێکە لە دوازدە تیرەکانی بەنی ئیسرائیل) دەستەڵاتیان دەبێو، سەرپەرشتیان دەبێ، تا ئەو کەسە دێ کە هەموویان دەبنە شوێنکەوتووی ئەو، وە هەموو میللەتان چاوەڕێی ئەو دەکەن، (کە دیارە مەبەست پێی پێغەمبەری خاتەم موحەممەدە ﷺ).

**مژدەی شەشەمیان:** (وَمَنْ يَغْلِبْ، وَيَحْفَظ أَعْمَالِي إِلى النهايَةِ، فَسأُعْطِيهِ سُلْطاناً عَلَى الأُمَم، فيرعَاهُمْ بقَضِيبٍ مِنْ حَدِيد)[٣]، واتە: وە هەر کەسێك زاڵبێو کردەوەکانی من تا کۆتایی بپارێزێ (واتە: پابەندبێ بە بەرنامەی منەوە)، ئەوە لەمەودوا دەستەڵاتی دەدەمێ، بەسەر هەموو ئۆممەتاندا، وە بە قامچییەکی ئاسن سەرپەرشتییان دەکات، (واتە: بەهێزو دەستەڵات).

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم: سفر التثنية، الإصحاح: ١٧، ص٤٦٥.
٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم: سفر التكوين، الإصحاح: ٤٧.
٣) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم: سفر التكوين، الإصحاح: ٢٦، ٢٧.

کە دیارە تاکە پێغەمبەرێکیش کە دەوڵەتی دامەزراندبێ ، وە بەهێزو دەستەڵات گەلانی دیکەی خستبێتە ژێر سایەی شەریعەتەوە ، پێغەمبەری خاتەم بووە ﷺ .

**موژدەی حەوتەمیان:** عیسا ﷺ بە شوێنکەوتووانی دەڵێ : (إنْ كُنْتُم تُحِبُّونَنِي فَاحْفِظُوا وَصايَايّ ، وَأَنا أَطْلَبُ مِنَ الأَب فَيُعْطِيكُمْ فارقْلِيط آخَر لِيَثْبُتَ مَعَكُم إلى الأَبَد ... وَالآن قَدْ قُلْتُ لَكُم قَبْلَ أَنْ يَكون حَتَّى إذَا كانَ تُؤْمِنُون)[1] ، واتە : ئەگەر ئێوە منتان خۆشدەوێ ، ئامۆژگارییەکانی من بپارێزن ، وە من داوا لە باب دەکەم (واتە : خوای پاك و بێگەرد) کە فاریقلیطێکی دیکەتان پێبدات ، بۆئەوەی تا کۆتایی ڕۆژگار بمێنێتەوە (واتە: بەرنامەکەی بمێنێتەوە ، ئنجا دوای چەند قسەیەك دەڵێ:) وە ئێستا ئەوەم پێ گوتن ، پێش ئەوەی شتەکە ببێ ، تاکو کاتێك کە بوو ، ئیمانی پێبێنن .

بەڵگەمان چییە کە (فَارِقْلِيط) ناووو سفەتی پێغەمبەری خاتەم (محمد)ە ؟

هەڵبەتە لەو چاپەی کە من لەلامە ، هی (پەیمانی نوێ) ئینجیلی یوحەننام تەماشا کرد ، لە جیاتی (فَارِقْلِيط) نووسراوە : (مُعِين) ، واتە: هاوکارو یارمەتییدەر ، بەڵام دیارە ئەو نوسخەیەی : (رحمة الله بن خليل الرحمن الهندي) پشتی پێ بەستوە ، تا ئەوکاتەش وشەی (فَارِقْلِيط) هەر مابووە .

ئنجا (رحمة الله) دەڵێ : (هَذَا اللَّفْظ (الفارقْلِيط) يُونَانِي ، وَيُكْتَبُ بالإنْكلِيزية هَكَذَا (Paraclete) أَي : (المُعَزِّي) ، وَهُنَاكَ لَفْظ آخَر يُكْتَبُ هَكَذَا (Pericltee) وَمَعْنَاهُ : رَفِيع المقَام ، سامٍ ، جَلِيل ، مَجِيد ، شَهِير ، وَهِيَ كُلّها مَعَانٍ تَقْتَرِب مِنْ مَعْنَى : مُحَمَّد وَأَحْمَد وَمَحْمُود) ، واتە: وشەی (فَارِقْلِيط) وشەیەکی یۆنانییە ، وە بە ئینگلیزیی بەم شێوەیە دەنووسرێ : (Paraclete)

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس ، العهد الجديد : إنجيل يوحنا ، الإصحاح : ١٤ ، ص ٢٢٢٢- ٢٢٢٤ .

واتە : دڵدەرەوە ، دڵخۆشکەر ، یان خەمرەوێنەوە ، وە وشەیەکی دیکەش هەیە کە بەمشێوە دەنووسرێ : (Pericltee) کە بە مانای پایە بەرزو بەرێزو خاوەن شکۆو خاوەن پایەو ناودار دێ ، کە هەموو ئەوانە مانایەکەیان نیزیك دەبنەوە لە وشەکانی : (مُحَمَّد وَأَحْمَد وَمَحْمُود)، واتە : ستایشکراوو ، سوپاسکراو ، مەدحکراو.

هەڵبەتە موحەممەد ڕەشید ڕەزا لە (تفسير القرآن الحكيم) لە بەرگی (٩) لاپەڕە (٢١٧ تا ٢٤٠)دا هەژدە موژدەکەی بە تەفصیل هێناون ، بەلاّم من ئیکتیفام بەو حەوت (٧) موژدەیە کرد .

**مەسەلەی حەوتەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ ، ئنجا ئەوانەی کە بڕوایان پێ هێناوەو پشتیان گرتوە ، یان بەهێزیان کردووەو سەریان خستوە ، وە شوێن ئەو ڕووناکییە کەوتوون کە لەگەڵی نێرراوەتە خوار ، ئا ئەوانە سەرفرازن.

کەواتە : ئەی جوولەکەو نەصرانییەکانو هەموو ئەوانەی کە ئیددیعای هەبوونی کتێبی ئاسمانی دەکەن ! ئەگەر بە تەمای سەرفرازیین ئیمان بە پێغەمبەری کۆتایی بێنن ، کە ئێستاش لەگەڵ ئەو هەموو دەستکاریی کرانو گۆڕانکارییەی لە کتێبەکانتاندا کردووتانە ، کە هەوڵتانداوە کە هەر وشەیەك بۆنی پێغەمبەری خاتەمی لێ بێ ، لایبەرن ، بە بەڵگەی ئەوەی ئەو نوسخەیەی کە (رحمة الله بن خليل الرحمن الهندي) قسەکانی لێ وەرگرتوون ، وشەی (فَارِقْلِيط)ی تێدا بووە ، کە وشەیەکی یۆنانییەو وەك خۆی هێڵراوەتەوە ، کەچی لە چاپەکانی ئێستادا بوونی نیەو ، کردوویانە بە (معين) واتە : یارمەتیدەر ، کە ئەگەر ئەم مانایەش بێ هەر موحەممەد دەگرێتەوە ، چونکە دوای پێغەمبەری کۆتایی هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نەهاتووە ، هەرچی گوتووشیەتی : من پێغەمبەرم ، درۆی کردووە و بە دانپێداهێنانی جوولەکەو نەصرانییەکانیش کەسێك نەهاتوە لە دوای موحەممەد لە دەعوای پێغەمبەرایەتییدا ڕاستی کردبێ ، کەواتە : ئەوەی ئێستاو تاکو دنیاش تەواو دەبێ وەك پێغەمبەر

ماوەتەوە ، تەنها موحەممەدە ﷺ، هەڵبەتە بۆخۆی نەماوەتەوە ، بەڵام قورئانەکەی کە موعجیزەشیەتیو بەرنامەشیەتی ، وە ڕێو شوێنو سوننەتەکەی کە بریتیە لە جێبەجێکردنی قورئانو بەرجەستەکردنی لە دنیای واقیعدا ، بەس ئەوە ماوەتەوە لەبەردەستی بەشەردا ، کە تۆ دڵنیابی بڵێی : ئەوە فەرمایشتی خوایە ، وە دڵنیابی بڵێی : ئەوە ڕێبازو بەرنامەی خوای تاکو تەنیایە ، ئەگەرنا ئەوانی دیکە ، وەك من لە کتێبی : (الإسلام كما يتجلَّى في كتاب الله) لە بەرگی سێیەم دا ، کە باسی (ئیمان بە کتێبەکانی خوا)م کردوە[1] ، کۆمەڵێك شتم لە پەیمانی کۆنو پەیمانی نوێدا دەرهێناوە ، وە لە مەحەکی عەقڵو عیلمم داوە ، هەرگیز ئەو کتێبانە ، ئەوە هەڵناگرن تۆ دڵنیابی کە کتێبی خوان ، چونکە زۆر جۆرە تەعبیرو هەڵوێستیان تێدا هەن ، کە عەقڵو مەنتیقو عیلمو واقیع ڕەفزیان دەکەن .

**مەسەلەی هەشتەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴾، بڵێ : ئەی خەڵكینە ! من ڕەوانەکراوی خوام بۆ تێکڕاتان.

ئەم ئایەتەو هاووێنەکانی ، قسەی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە بە درۆ دەخاتەوە دەخەنەوە کە دەڵێن : موحەممەد هەتا لە مەککە بوو ، چونکە بێ دەسەڵات بوو ، تەنیا باسی دەوروبەری خۆی دەکرد ، بەڵام کە چووە مەدینە ، ئنجا باسی جیهانێتیی (عالمية)ی بەرنامەکەی دەکردو ، گوتی : من پێغەمبەری خوام بۆ هەموو جیهانییان ! چونکە ئەم ئایەتە لە سووڕەتی (الأعراف) دایەو ، سووڕەتی (الأعراف)یش لە مەککە هاتۆتە خوار ، خوای بەرز دەفەرموێ : ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴾ ، بڵێ : ئەی خەڵكینە ! من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لاتان ، بۆ هەمووتان ، واتە: بە عەرەبو عەجەمەوە ، بە هەموو نەتەوەو زمانەکانەوە ، لە هەموو شوێنەکان .

---

[1]) لە چاپی دووەمی دا بە ناوونیشانی : (موسوعة : الإسلام كما يتجلَّى في كتاب الله) ئەو بابەتە کەوتۆتە کتێبی پێنجەم (الكتاب الخامس : الإيمان بكتب الله تعالى)ەوە .

وە لە ڕاستییدا زۆربەی ئەو ئایەتانەی کە جیهانێتیی (عالمیة)ی پەیامو بەرنامەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ ڕادەگەیەنن ، مەککەیین ، وە خوا جگە لەم ئایەتەی سوورەتی (الأعراف) ، لە چەندان شوێنی دیکەدا ، باسی ئەوەی کردووە ، کە موحەممەد بۆ هەموو جیهانییان ڕەوانە کراوە بۆ وێنە :

٢) لە سوورەتی (سبأ)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٢٨﴾ ﴾ ، واتە : تۆمان ڕەوانە نەکردووە ، مەگەر بۆ تێکڕای خەڵکی مـوژدەدەرو ترسێنەربی .

٣) لە سوورەتی (التكوير)دا دەفەرموێ : ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە : ئەم قورئانە جگە لە بیرخەرەوە بۆ هەموو جیهانییان ، هیچ شتێکی دیکە نیە .

٤) لە سوورەتی (القلم)دا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾ ، واتە : قورئان جگە لە بیرخەرەوە بۆ هەموو جیهانییان ، هیچ شتێکی دیکە نیە .

٥) لە سوورەتی (ص)دا دەفەرموێ : ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ ، واتە : ئەم قورئانە تەنیا بیرخەرەوەیەو شەرەف شکۆیە بۆ هەموو جیهانییان ، چونکە وشەی (ذِكْر) هەم بە مانای بیرخستنەوە دێ ، هەم بە مانای شەرەفو شکۆ دێ .

وە لە ڕاستییدا هەر کەسێك دەست بە قورئانەوە بگرێ ، شەرەفو شکۆو پایە بەرزیی پێ پەیدا دەکات ، چ لەسەر ئاستی تاك ، چ لەسەر ئاستی میللەتان ، وە بێگومان هەمیشە قورئان ئەو ڕاستییانەی کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ دا تێك هەڵشێلراون ، بیری مرۆڤیان دەخاتەوە .

٦) لە سوورەتی (الأنبياء)دا دەفەرموێ : ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ ، واتە : ئێمە تۆمان نەناردووە ، مەگەر بەزەیی خوابی ، بۆ هەموو جیهانییان .

٧) وە لە سووڕەتی (الحج)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: بڵێ: ئەی خەڵکینە! من تەنیا وریاکەرەوەو ترسێنەرێکی ئاشکرام، بۆتان.

دیارە لەم سووڕەتانەداو، لە زۆر سووڕەتی دیکەش دا خوا فەرمایشتی دیکەی فەرمووە، دەربارەی گشتگیریی پەیامی موحەممەد ﷺ کە کۆتا پێغەمبەرەو بۆ هەموو بەشەرە، بەڵام من تەنیا ئەوانەم بە نموونە هێناونەوە.

کەواتە: هەر لە مەککەوە خوای پەروەردگار ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاندوە، کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بۆ هەموو مرۆڤایەتیی هاتوە، نەك تەنیا گەلی عەرەب.

**مەسەلەی نۆیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ﴾، ئەمە پێناسەی خوای پەروەردگارە، واتە: ئەو خوایەی کە منی ناردوە بۆ تێکڕاتان پەیامبەربم و نوێنەربم، موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هەر هی ئەوە، وە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لەو، وە دەژێنێ و دەمرێنێ، کەواتە: ئەم سێ سیفەتە:

١ - خاوەنداریێتی ڕەهای ئاسمانەکان و زەوی.

٢ - تەنیا پەرستراوێتیی و شایستەی پەرستن.

٣ - ژیاندن و مراندن.

سێ سیفەتی هەرە زەق و گەورەو مەزنی ئەو خوایەن، کە منی ناردوە بە نوێنەرایەتیی خۆی، وە منی ناردوە بە ڕەوانەکراوی خۆی، بۆ لای ئێوە.

**مەسەلەی دەیەم و کۆتایی**: کە دەفەرموێ: ﴿ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾،

واتــە : دەجــا ئێمــان بێــنن بــە خــوا ، وە بــە پێغـەمبــەرو ڕەوانــە کــراوە ، نەخـوێندەوارەکەی ، کە بڕوا دێنێ بە خـواو بە فەرمایشتەکانی خوا ، وە شـوێن بکەون ، بەڵکو ڕێگـای ڕاست بگرن .

لەم ئـایەتە موبارەکەوە ئەوەمـان بۆ دەردەکـەوێ کـە ئیمـان بـە خـوای بـەرزو بێ وێنە ، واتە: ئیمان بـە بەدیهێنەرایەتیی خـوا ، بـە پەروەردگارێتیی خـوا ، بــە خاوەنداریێتیی خــوا ، وە ئیمـان بــە نـاوو سـیفەتە هــەرە بــەرزو جــوانو چاکەکانی خوا ، وە ئیمان بـە هـەموو ئـەو شـتانەی کە پەیوەندییـان بـە خـوای پەروەردگارەوە هەیە .

وە ئیمان بە خوا ، یانی : ئیمان بە پێغەمبەری کۆتـایی موحەممەد ، کە هـەم بە وشەی (رَسول) و هەم بە وشەی (نَبـّي)و ، هەم بـە وشــەی (أُمـِّي) پێناســەی کردوە :

(رَسـول) واتـە: ڕەوانـەکراو ، (نَبـّي) واتـە : هەواڵپێـدراوو وەحی بـۆ کـراو ، یـان هەواڵـدەر ، (أُمـِّي) واتـە : نەشــارەزای کتێبــە پێشـووەکـان ، واتایەکـی دیکەشـی هـەیـە ، واتە: کەسێك کە خوێنـدەواری نەبـێ ، نە بخوێنێتـەوەو نە بنووسـێ .

کـە دیـارە پێغـەمبــەری خــوا ﷺ شــارەزای کتێبــە پێشـووەکـان نـەبووە ، وە نەخــوێندەواریش بــووە ، واتــە : تـەوراتو ئینجیلـی نەخوێندوونــەوە ، وە لـە مەککەش کەسێکی وا نەبـووە ، کە پێغـەمبـەری خوا ﷺ لـەو بوارەدا سـوودی لـێ ببینێ ، چونکە کۆمەڵگـایەکی بتپەرسـت بـووە ، بـەڵـێ وەرەقـەی کـوڕی نەوفـەل شـارەزای کتێبـە پێشـووەکـان بووەو ، خوێنـدنو نووسـینی زانیـوە ، بـەڵام زۆر زوو ، دوای ئـەوەی خەدیـجـە خـوا لێـی ڕازی بـێ ، پێغەمبـەری خـوا ﷺی دەبـاتە لایو شـایەدیی پێغـەمبـەرایەتی بۆ دەدات ، وەفـات دەکـات .

وە شــوێنکەوتنی پێغـەمبــەر ﷺ واتــە : ئیمــان بــە خــوا ، وە ئیمــان بــە پێغـەمبـەری کۆتایی موحەممەد ، وە شـوێنکەوتنی پێغـەمبـەری کۆتـایی یەکسانە بە ڕێگـای ڕاسـت گـرتن ، چونکە دەفـەرموێ : ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾ ،

دەجا ئیمان بێنن بە خوا ، وە بە پێغەمبەرو ڕەوانە کراوە نەخوێندەوارەکەی ، کە بڕوا دێنێ بە خواو بە فەرمایشتەکانی خوا ، وە شوێنی بکەون ، بەڵکو ڕێگای ڕاست بگرن ، کە دیارە بە گرتنی ڕێی ڕاست ، مرۆڤ سەرفراز دەبێ .

کەواتە : دەبێ ئیمان بە خوا هەبێ ، وە هەرچی خوا فەرموویەتی ئیمانمان پێی هەبێ ، وە ئیمانمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ هەبێ ، وە بە هەرچی فەرموویەتی و کردوویەتی وەك دین ، وە شوێنیشی بکەوین ، ئنجا مانای وایە ڕێگای ڕاستمان گرتوە ، نەك تەنیا ئیمان هەر ئەوەندە بێ ، بڵێی : ئیمانم هەیە بە خواو بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، چونکە ئیمان هەم پەیوەندیی بە عەقڵەوە هەیە ، وە هەم پەیوەندیی بە دڵەوە هەیە ، وە هەم پەیوەندیی بە زمانو ، هەم پەیوەندیی بە جەستەوە هەیە ، وە بەو مانایە کە : هەرچی خوا فەرموویەتی : بە عەقڵ دەرکی بکەیو ، بە دڵ قبووڵی بکەیو ، بە زمان دانی پێدا بێنیو ، بە ئەندامەکانی جەستەش ئەنجامی بدەی ، وەك لە بەرگی یەکەمی : (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی ...)و لە بەرگی دووەمی (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) بە درێژیی باسمان کردوە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ

ameer.maktab@yahoo.com

/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

# دەرسی نۆزدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە چوار ئایەتان پێکدێ ، لە ئایەتی : (١٥٩ تا ١٦٢) سەرەتا خوای پەروەردگار ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو ، کە لە نێو گەلی مووسا (بەنی ئیسرائیل)دا ، کەسانێکی هەق خوازو ڕێگای ڕاست گرتوو هەبوون ، واتە : هەموویان لارو سەرپێچییکار نەبوون .

وە پاشان باسی دابەشکردنیان بۆ دوازدە تیرە دەکات، دوایی باسی چەند نیعمەتێك‌و چاکەیەکی ناوازەو موعجیزەی خۆی دەکات ، کە بە بەنی ئیسرائیلی بەخشیون، وەك هەڵقوڵاندنی دوازدە سەرچاوە لە تاشە بەردێکی گەورەو، سێبەر لێکردنی هەور بۆیان‌و ، دابەزاندنی گەزۆو باڵندەی شیلاقە (سماني) بەسەریاندا.

دوایش باسی ڕووداوێکی دیکەی مووسا ﷺ‌و گەلەکەی دەکات ، کە بە پێی ڕیزبەندیی کاتیی (الترتيب الزمني) وا پێدەچێ دوا ڕووداوی نێوان مووساو هارِوونی برای‌و گەلەکەیان بووبێ ، کە بریتیە لە فەرمان پێکرانیان بە چوونە نێو شارێکەوە ، کە نیشتەجێبن لەوێدا، دوایی باسی سەرپێچیی‌و لاملیی کردنی بەنی ئیسرائیل لە فەرمانەکەی مووسا ﷺ، وە سەرەنجام دابەزێنرانی سزای خوا بەسەریاندا ، دەکات .

﴿ وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ١٥٩ وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ
أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰهُ قَوۡمُهُۥٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ
ٱلۡحَجَرَۖ فَٱنۢبَجَسَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ قَدۡ عَلِمَ أُنَاسٖ مَّشۡرَبَهُمۡۚ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ
ٱلۡغَمَٰمَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ
وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ١٦٠ وَإِذۡ قِيلَ لَهُمُ ٱسۡكُنُواْ
هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ وَكُلُواْ مِنۡهَا حَيۡثُ شِئۡتُمۡ وَقُولُواْ حِطَّةٞ وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ
سُجَّدٗا نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطِيٓـَٰٔتِكُمۡۚ سَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٦١ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ
ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ
بِمَا كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ١٦٢ ﴾

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە لە گەلی مووسا کۆمەڵێك هەبوو ، کە بەهۆی هەقەوە ڕێنمایی (خەڵك)یان دەکرد، وە بە هەقیش دادگەریی یان بەڕێوەبرد (١٥٩) وە دابەشمان کردن بۆ دوازدە تیرەی قەوارەدار ، وە کاتێك گەلی مووسا داوای ئاویان لێکرد ، سروشمان بۆ مووسا کرد : کە گۆچانەکەت لە بەردەکە بدە (ئیدی کە لێیدا) یەکسەر دوازدە سەرچاوە فیچقەیان کردو لێی دەرقوڵین ، کە هەر کۆمەڵە کەسە ، شوێنی ئاو لێ خواردنەوەیانیان زانی ، وە بە هەوران سێبەرمان لەسەر کردن (لە گەرمای بیابانی سینادا) وە گەزۆو (باڵندەی) سەلوامان دابەزاندە سەرتان (وە پێمان گوتن :) لەو خواردنە خۆش‌و باشانەی پێمان داون ، بخۆن ، وە (بە لادان‌و سەرپێچییان) ستەمیان لە ئێمە نەکرد ، بەڵکو بەس ستەمیان لە خۆیان کرد (١٦٠) وە یاد بکەوە کاتێك پێیان گوترا : لەم شارەدا نیشتەجێ بن‌و ، لە هەر کوێیەك ویستتان (لە بەروبوومەکەی) لێی بخۆن ، وە بڵێن : خوایە ! گوناهەکانمان لێ فڕێدە ! وە بە ملکەچییەوە بچنە دەروازە (ی شارە)کەوە ، (ئەگەر واتان کرد) بە دڵنیایی گوناهەکانتان دەبوورین ، بۆ چاکەکارانیش (پاداشت‌و نیعمەت) زیاد دەکەین (١٦١) کەچی ئەوانەیان کە ستەمیان (لە خۆیان‌و بەرنامەکەیان‌و پێغەمبەرەکەیان) کردبوو ، ئەو قسەیەی کە پێیان گوترا بوو، بە قسەیەکی دیکەیان گۆڕی، بۆیە سەرەنجام بەهۆی ئەو ستەمەوە کە دەیانکرد ، لە سەرێوە سزامان بۆ ناردن (١٦٢))).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ) : (الهِدَايَةُ : دَلالَةٌ بلُطْفٍ) هیدایەت بریتیە لە ڕێنمایی کردنێکی پەنهانو بە شێنەییو بە لە باریی .

(أَسۡبَاطًا) : کۆی (سِبْط)ە ، (السِبْط : وَلَدُ الوَلَدِ كأَنَّهُ امْتِدَادُ الفُرُوعِ) ، (سِبْط) واتە : نەوە ، نەوەی نەوە کە درێژ دەبێتەوە، جا کوڕ بێ، یان کچ (وَالأَسْبَاطُ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ كالقَبَائِلِ مِنَ العَرَب) وە (أَسْبَاط) لە نێو گەلی بەنی ئیسرائیل دا وەك (قَبَائِل) وان لە نێو گەلی عەرەبدا ، (قَبَائِل)یش کۆی (قَبِيلَة)یە ، واتە : هۆز ، تیرە .

(أُمَمًا) : ( والأُمَّةُ: كُلُّ جَمَاعَةٍ يَجْمَعَهُمْ أَمْرٌ مَا، إمَّا دِينٌ وَاحِدٌ، أَو زَمَانٌ وَاحِدٌ، أَوْ مَكَانٌ وَاحِدٌ ، سَوَاءٌ كَانَ ذَلِكَ الأَمْرُ الجَامِع تَسخِيرَاً أو اختِيَارَاً ، وجَمعُهَا : أُمَمْ ) واتە : (أُمَّة) بریتیە لە کۆمەڵە خەڵکێك کە شتێك پێکەوە کۆیان بکاتەوە، ئایینێك، یاخود لەیەك کات دا بووبن، یان لە یەك شوێن دا، ئنجا ئەو شتە کە کۆیان دەکاتەوە، چ شتێك بێ لە ئیرادەی خۆیان بەدەر بێ، یان بە ئیرادەی خۆیان بێ ، وە کۆی (أُمَّة)یش بریتیە لە (أُمَم) .

(فَٱنۢبَجَسَتۡ) : (بجس الماءُ وانْبَجَسَ : انْفَجَرَ) واتە: ئاوەکە دەرقوڵیو تەقیەوە، (لَكِن الإنبجَاس مَا كَانَ مِنْ ضَيق، والإنْفجَارُ مِنْ وَاسع) بەڵام (إنبجَاس) بریتیە لەوەی کە لە شوێنێکی تەسکەوە بێ ، وە (إنْفجَار) ئەوەیە کە لە شوێنێکی فراوانەوە بێ ، یان (إنبجَاس) ئەوەیە کە بە کەمیی بێ ، وە (إنْفجَار) ئەوەیە کە بە زۆریی بێ .

(أُنَاسٍ) : (الأُنَاسُ لُغَة فِي النَّاس) وشەی (أُنَاس) هەر زار(لغة)ێکە بە مانای خەڵك، یانی: چ بڵێی: (ناس)، چ بڵێی: (أُناس) واتە: خەڵك .

(ٱلْغَمَٰمَ) : (الغَمُّ: سترُ الشَّيءِ، وَمِنهُ: الغَمَامُ، لكونه ساتِرَاً لضُوء الشَّمْس وَاحده غَمامة)، (غَم) بریتیە لە داپۆشینی شتێك، بۆیە بە غەمو خەفەت گوتراوە غەم، چونکە دڵی مرۆڤ دادەپۆشێ، بەڵکو جاری وایە عەقڵیش دادەپۆشێ، وە بۆیەش بە هەور گوتراوە، (غَمَام) چونکە تیشکی خۆر دادەپۆشێ، تاکەکەی (غَمامة) غمامەیە .

(ٱلْمَنَّ) : (المنّ: شَيء كالطَّلِّ فِيهِ حَلاَوَة يَسْقط عَلَى الشجَرِ) (مَنّ) وەك (طلّ) وایە، وەك ئاونگێك، شەونمێك كە شیرنایەتی تێدایە دەکەوێتە سەر گەڵای درەخت .

(وَٱلسَّلْوَىٰ) : (طائِرٌ نَحو الحَمَامَة، وَهُوَ أَطْوَل ساقاً وَعُنُقاً وَلَونهُ شَبيه بلَوْن السُّمَانِي) (سلوی) باڵندەیەکە وەك کۆتر، بەڵام لاقی درێژترو ملیشی درێژترە، وە ڕەنگی وەك ڕەنگی سومانیی وایە، کە بە کوردیی شێلاقەی پێ دەڵێن، هەرچەندە من تا ئێستاش نازانم شێلاقە چییە، بەڵام واپێدەچێ لە شێوەی کەودا بێ .

(رِجْزًا) : (أي: العَذَاب) واتە: سزا، ئازار .

# مانای گشتی ئایەتەکان

سەرەتا خوای پەروەردگار ئاماژە بەوە دەکات ، کە بەنی ئیسرائیل تەنیا خەڵکی خراپیان نەبووە ، کە گوێلك پەرستییان کردووەو ، سەرپێچیی خوایان کردوە، بەڵکو خەڵکی باشیشیان هەبووە ، دیارە هەموو گەلانیش هەروانو کەم وا هەیە هەمووی چاك بێ ، یان هەمووی خراپ بێ ، خوا دەفەرموێ :

﴿ وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ﴾، وە لەنێو گەلی مووسا عليه السلامدا کۆمەڵێك هەبوون ، بە هەق ڕێنمایی خەڵکیان دەکرد، وە دادگەرییان بەڕێوە دەبرد، یاخود بە هەق دادگەرییان بەڕێوە دەبرد، یاخود کۆمەڵگاو خەڵکی خۆیان بە دادگەرانە بەڕێوە دەبرد .

وەك دەبینین هەرچەندە خوا ﷻ زۆر سەرزەنشتو سەرکۆنەی گەلی مووسا عليه السلام دەکات ، بەڵام خوای دادگەر ، دادگەرترینی دادگەرانە ، بۆ ئەوەی خەڵك وانەزانێ بەنی ئیسرائیل هەر هەموویان خراپو لادەرو لاڕێ بوون، وە تاکو بزانن کە خەڵکی باشیشیان هەبووە، کە هەم بە هەق خەڵکیان ڕێنمایی کردوە، وە هەم بەهۆی هەقیشەوە دادگەرییان کردوە ، کە دەگونجێ بڵێین : ﴿ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ ﴾، واتە : لە ڕووی تیۆریو فیکرییەوە ، هەقیان بۆ خەڵك ڕوون کردۆتەوەو ، ڕێنمایی یان کردوون ، ﴿ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ﴾، وە بە هەقیش دادگەرییان لە نێو خەڵکدا چەسپاندوە ، بە کردەوە .

﴿ وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗا ﴾، وە دامانبڕین بۆ دوازدە تیرەی کۆمەڵ کۆمەڵ ، کە هەر کامەیان خاوەنی قەوارەیەکی خۆی بووە، ﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰهُ قَوۡمُهُۥٓ ﴾، وە وەحییمان بۆ لای مووسا نارد، کاتێك کە گەلەکەی داوای ئاویان لێکرد .

ئنجا ئایا ئەم سروشە چی بوو کە خوا بۆ مووسا ﷺ ی کرد ؟ ! دەفەرمویٚ :

﴿أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡحَجَرَ﴾، پێمان گوت : بە گۆچانەکەت لە بەردەکە بدە ، دیارە شاخێکی گەورەو دیاریکراویی لێبووە ، ئەو (أل) ئەلیفو لامە ، ئەلیفو لامی عەهدە ، واتە : دەزانریٚ کامە بەردەیە ، وەك لە کوردەواریی خۆشمان کە گوترا : کتێبەکە ، مێزەکە ، بابای دوێنراو دەزانیٚ مەبەست کامە کتێبو کامە مێزەیە ، وە دەشگونجیٚ ئەلیفو لامی جینس بیٚ ، واتە : هەر بەردێکت لیٚ هەڵکەوت ، گۆچانەکەتی لیٚ بدە .

بەڵام من زیاتر بۆ ئەوەی یەکەمیان دەچم، واپێدەچیٚ بەردێکی دیارییکراو بووبیٚ ، لە نیزیك مەنزڵگایەکەیانەوە ، وە بێگومان دەبیٚ بەردێکی زۆر گەورەش بووبیٚ ، چونکە دوازدە سەرچاوەی لیٚ هاتۆتە دەریٚ ، دیارە لەتکەچیاو بەردێکی زل بووە . ﴿فَٱنۢبَجَسَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنًا﴾، خوای کاربەجیٚ لێرەدا باسی ئەوە ناکات کە ناوی خوای هێناوەو چۆنی لێداوە، یەکسەر فەرمووی : دوازدە سەرچاوەی لیٚ هەڵقوڵین ، بەڵام هەڵقوڵینێك کە لە شوێنێکی تەسکەوە بیٚ ، یاخود بەقوەت بێتە دەریٚ، چونکە شوێنەکە تەسك بووەو سەرەتا زۆر سەخت بووە، لە شوێنی دیکەدا دەفەرمویٚ : ﴿فَٱنفَجَرَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنًا ۝٦٠﴾ البقرة ، یانی : دوایی وردە وردە شوێنەکە فراوان بووەو ، ئاوەکە بە لووزەو هاتوە ، چونکە (إنْفجَار) و (إنبجَاس) تەعبیر دەکەن لە دوو قۆناغی دەرقوڵینی ئاو، قۆناغی سەرەتاو قۆناغی دوایی ، کە کەوتۆتە سەر ڕەوتی خۆی ، دوازدە سەرچاوەی لیٚ دەرقوڵین بە ئەندازەی دوازدە هۆزو تیرە بەنی ئیسرائیل ، بۆئەوەی هەر کامێکیان سەرچاوەی خۆی دیار بیٚ. ﴿قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ مَّشۡرَبَهُمۡ﴾، وەك ڕوونی دەکاتەوە ، دەفەرمویٚ : هەر کۆمەڵە خەڵکێك لە بەنی ئیسرائیل ، هەر کام لە هۆزەکان ، شوێنی ئاو خواردنەوەی خۆیان (واتە : کانی سەرچاوەی خۆیان) دەزانیو دیار بوو ، بۆ ئەوەی تێکەڵ نەبنو لەسەر نۆرەی ئاو ، لێك خشانو زویربوونو کێشەو دەمەقاڵیی دروست نەبیٚ ، چونکە واپێدەچیٚ بە گشتی خەڵکێکی ناکۆكو ناتەبا بووبن ، بۆیە خوای دادگەرو کاربەجیٚ وای کردوە ، تاکو لەسەر ئاویش

نەیکەنە کێشەو هەراو تێکنەگیرێن . ﴿ وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْغَمَامَ ﴾، وە هەورمان بەسەرەوە کردنە سێبەر ، ئایا لە کوێ ئەو هەورە کراوەتە سێبەر ؟ دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا تیشکی دەخەینە سەر، کە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن : لە دەشتی سینا بووە ، کە بیابانێکی زۆر گەرم بووەو هیچ نواو سێبەرێکی لێ نەبووە ، ﴿ وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴾، وە گەزۆو سەلوامان بەسەرماندا باراندن .

(مَنّ) واتە : گەزۆ ، کە ماددەیەکی شیرینە ، وەك ئاونگ لەسەر گەڵای درەختەکان دەنیشێ ، وە (سَلْوى)ش جۆرە باڵندەیەکە ، لە شێوەی کۆترو کەودایە ، واپێدەچێ لە هەندێ شوێنی کوردستان شێلاقەی پێ بگوترێ ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو ناوە لە ناوچەی ئێمەدا نیە ، بۆیە تاکو ئێستا نازانم ئەو ناوە لە کوێ هاتوە ؟ جا لەبەرئەوەی نابێ هەر لەخۆوە ناو لە شتێك بنێی ، بۆیە کە ئەوان (سەلوا) ، یان (سومانی) پێ دەڵێن ، ئێمەش دەبێ هەر ئەو ناوەی لێبنێین ، چونکە ئەگەر ناوێك بۆ شتێك بەکاربێ و هەر لەو شوێنەش هەبێ ، دەبێ هەر ئەو ناوەی بۆ بەکاربهێنرێ ، وەك : ئەنتەرنێت ، ڕادیۆ ، تەلەفزیۆن ، تەلەفۆن ، لەو شوێنەی کە دروست کراون ، ئەم ناوانەیان لێ نراون ، ئێستا خەڵك هەر بەو ناوانە ناویان دێنێ ، ﴿ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ﴾، واتە : پێمان گوتن : لەو ڕزق و ڕۆزییە خۆش و بە تام و بە سوودانەی پێمان داون ، بخۆن ، ﴿ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾، وە ستەمیان لە ئێمە نەکرد ، بەڵکو ستەمیان لە خۆیان کرد ، کە سنوور شکێنیان کردو ، لاملییان کردو لەگەڵ نیعمەتەکانی خوای پەروەردگاردا مامەڵەیەکی سوپاسگوزارانەیان نەکرد ، ستەمیان لە خۆیان کرد ، زیانیان بە خۆیان گەیاند ، نەك بە ئێمە ، خوا لەوە بەرزترە بەندەکانی بتوانن بە گوناح و تاوان و لادان ، زیانی پێ بگەیەنن ، وە لەوەش بەرزترە ، کە بەندەکانی بتوانن بە چاکەو فەرمانبەرییەکەیان ، سوودێکی پێ بگەیەنن .

ئنجا دێتە سەر باسی بەسەرهاتێکی دیکەی مووسا ﷺو گەلەکەی : ﴿ وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ ٱسْكُنُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ وَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا ﴾، وە یاد بکەوە کاتێك گوترا : لەم شارەدا نیشتەجێ بن ، وە لە هەر شوێنێکی پێتان خۆشە ، لێی بخۆن ، واتە : لە بەروبوومو کشتوکاڵو دانەوێڵەو میوەجاتی بخۆن ، وە بڵێن : خوایە ! گوناهەکانمان لێ بەردەوە ، گوناهەکانمان لێ لابەرە .

دەگوترێ : (حَطَّ عنه رَحْلَه) بارەکەی لەسەر لابرد ، واتە : وەك چۆن بارێك لەسەر ئاژەڵێکە، ئاوا گوناهیش بارێکە لەسەر شانی ئێمەو قورسی کردوە ، خوایە لایبەرە .

وە پێمان گوتن : وە بە کڕنووش بردنەوە بچنە نێو دەرگاکەوە ، نێو دەروازەی شارەکەوە ، دیارە مەبەست لە کڕنووش بردنیان ئەوەنیە کە سەری خۆیان لەسەر زەوی دابنێن ، چونکە ئەگەر سەریان لەسەر زەوی بێ ، ناتوانن بڕۆن ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە بە چەمانەوەو ڕکووع بردنەوە بچنە نێو ئەو شارە ، چونکە لە قورئاندا (سجود ، سجدة) تەنیا مەبەست پێی کڕنووش بردن نیە ، بەڵکو چەمانەوەو مل نەوی کردنیش پێی دەگوترێ : (سجدة) وەك خوای پەنهانزان ، دەربارەی دایكو بابی یوسف سەلامی خوایان لێ بێ ، دەفەرموێ : ﴿ فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ٱدْخُلُوا۟ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّوا۟ لَهُۥ سُجَّدًا ﴿١٠٠﴾ ﴾ یوسف، هەڵبەتە سەریان بۆ نەخستۆتە سەر زەوی ؟! بەڵکو واتە : ڕێزیان لێگرتو سەریان بۆ چەماندوە ، وەك ڕێزلێگرتن ، وەك لە نێو هەندێ میللەتان دا ئەو ڕەفتارە بەکاردێ ، بۆ ڕێز لە یەکدی گرتنو ، وە بۆ سڵاو لە یەکدی کردن ، ﴿ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيٓـَٔـٰتِكُمْ ﴾، واتە : پێمان گوتن : ئەگەر وابکەن ، ئێمە لە هەڵەکانتان دەبوورین ، ﴿ سَنَزِيدُ

ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، وە بۆ چاکەکارانیش پاداشتو چاکە زیاد دەکەین ، بەڵام ئایا بەنی ئیسرائیل وایان کرد ؟

خوا دەفەرموێ : ﴿ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ ﴾، ئنجا ئەوانەی ستەمکار بوون ، لەوان ، ئەو قسەیەی کە پێیان گوترا بوو ، گۆڕییان بە قسەیەکی دیکە ، واتە : ئەو قسەیەی کە پێیان گوترابوو ، کە بڵێن : (حِطة) خوایە ! گوناهەکانمان لێ دابەزێنە ! پاشان بە ملکەچیی بچنە نێو دەروازەی شارەکەوە .

لە جیاتی ئەوە بکەن ، هەڵسان پێچەوانەی ئەوەیان کرد ، وە ئەو وشەیان گۆڕی بە وشەیەکی دیکە ، دەفەرموێ : ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَظْلِمُونَ ﴾، سزایەکمان لە سەرێوە بۆ ناردن، بەهۆی ئەوەوە کە ستەمیان دەکرد .

خوای دادگەر هەمیشە لە ئەنجامی خراپەکاریی مرۆڤەکاندا ، سزایان دەدات ، ئەگەرنا خوا بۆخۆی دەفەرموێ : ﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾ ﴾ النساء، واتە: خوا چی دەکات لە سزادانی ئێوە ؟ چ ئیشێکی بە سزادانی ئێوە هەیە ؟ ئەگەر سوپاسگوزاربن و ئیمان بێنن، وە خوا بۆخۆی سوپاسگوزارەو سوپاسی بەندەکانی دەکات ، ئەگەر چاکە بکەن ، زاناشە .

ئنجا سەرنج بدەن !

ئەو هەڵوێستەی بەنی ئیسرائیل چەندە جیابوو ، لەو هەڵوێستەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دوای ئەوەی مەککە ئازاد کرا ، پەروەردگار سوورەتی (النصر)ی ناردە خوار، وەك دەفەرموێ :

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ۝١ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ۝٢ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا ۝٣﴾ النصر، واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، کاتێك یارمەتیی خوا هاتو ئازادکردنی مەککە هاتە پێش، وە خەڵکت بینی پۆل پۆل هاتنە نێو ئایینو بەرنامەی خواوە (بە قەناعەتەوە، نەك بە تۆبزیی لێکرانەوە)، پەروەردگارت بە پاك بگرەو داوای لێبووردنی لێ بکە، بێگومان خوا زۆر تۆبە وەرگرە.

لە کتێبەکانی سیرەدا هاتوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێ چوونە نێو مەککەدا، لە ساڵی هەشتەم دا کە شاری مەککە ئازاد کرا، سەری بە قەرپووزی کورتانی ولاخەکەیەوە، نووساندبوو[1]، یانی: سەری زۆر نەوی کرد بوو، وەك خۆ بە کەمگریی لە بەرانبەر خوای بالادەست دا، وە وەك خاکێتیی بەرانبەر بەندەکانی خوا، کە ئەو نەهاتوە ستەمیان لێ بکاتو خۆی بەسەریاندا فەرز بکات، ئنجا ئەو هەڵوێستە لە کوێ‌و ئەوەی بەنی ئیسرائیل لە کوێ؟ کە لە جیاتی ئەوەی بڵێن: خوایە! داوای لێبووردنمان هەیە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێبووردنی کرد، وە لە جیاتی ئەوەی بە ملکەچیی‌و خۆ بە کەمگرییەوە، بچنە نێو شارەکە، دیارە حاڵەتەکەیان گۆڕی بە شتێك کە خوای پەروەردگار پێی ناخۆش بوو، بۆیە خوای دادگەر لەسەر ئەوە سزای دان.

---

١) السيرة النبويّة، د، علي محمد الصلاّبي، ص ٧٦١.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم** : کە دەفەرموێ : ﴿وَمِن قَوْمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴾، خوای پەروەردگار لێرەدا دوو وشەی بەکارهێناون : (يَهْدُونَ ) و (يَعْدِلُونَ ) دیارە هەم ڕێنمایی کردنی خەڵکیان بە هەق بووە، کە بەرەو ڕاستە شەقامی خوا ڕێیان پێشانداون، وە هەم دادگەریی کردنیشیان بە هەق بووە .

مەبەست لە : ﴿يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ ﴾، واتە : خەڵکیان شارەزا دەکرد ، وە مەبەست لە : ﴿وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴾ ، واتە : بە شێوەیەکی هەقو ڕاستیش دادگەرییان لەنێو خەڵك دا بەڕێوە دەبردو ، دادگەرانە ڕەفتاریان دەکرد ، هی پێشێیان حاڵەتی تیۆرییە، ئەوەی دوایان حاڵەتی کردەییە .

ئنجا ئایا ئەو خەڵکانەی ئەو سیفەتە باشانەیان هەبوون، هەر لە سەردەمی پێغەمبەر مووسادا هەبوون ؟ یان ئێستاش ماونو لەم سەردەمەشدا هەن ؟

هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە : مەبەست لە کاتو سەردەمی خۆیەتی ، هەندێکیش گوتوویانە ، مەبەست ئەوانەی ئێستایە .

منیش دەڵێم : هەم لە کاتی خۆی دا خەڵکی وا هەبووە ، وە هەم ئێستاش لە نێو بەنی ئیسرائیل دا خەڵکێکی وا هەیە ، کە لە هەق دەگەڕێن، وە کە هەقیان بۆ دەرکەوت ، پێوەی پابەند دەبن ، ئەویش ئەوانەن کە مسوڵمان دەبن ، وە ئەوانەیانن کە بەرگریی دەکەن لە خەڵکی ستەم لێکراوی ، فەڵەستینو غەیری فەڵەستین، وە هەڵوێست وەردەگرن لە بەرانبەر قەوارەی زایۆنیدا : خۆپێشاندان دەکەن ، وە نارەزایی دەردەبڕن، وە هاوخەمییو هاودەردیی خۆیان دەردەبڕن ، لە بەرانبەر هەر ستەملێکراوێك دا ، کە لە هەر شوێنێکی دنیادا ستەمی لێ دەکرێ ، جا ئەوانە ئەگەر مسوڵمانیش نەبن ، هەڵوێستەکەیان هەڵوێستێکی زۆر باشە ، وە بە دڵنیایی دەبێ هەموو کەسێك لەسەر هەڵوێستی باش ، سوپاس بکرێ ،

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ﴾، زانایان دەڵێن : یانی : (یرشدون الناس بالحق) واتە : ڕێنمایی خەڵك دەکەن بە هەقو ، خەڵك سەرراست دەکەن ، وە هەندێکی دیکە ئاوایان لێکداوەتەوە : (ينْتَفِعُونَ بالحَقّ ، وينفعونَ بِهِ النَّاس) خۆشیان لە هەق بەهرەمەند دەبن ، وە خەڵکیشی لێ بەهرەمەند دەکەن .

وە کە دەفەرموێ : ﴿ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ﴾، یانی : (وَيَعْمَلُونَ بِه فِي ذَاتِهِم ومع غيرهم) یان لە خودی خۆیاندا بەو هەقە ڕەفتار دەکەنو ، کاری پێدەکەن، وە بەو هەقە دادگەریی دەکەن لە نێوان خەڵکدا ، یانی : وەك چۆن بە شێوەی تیۆریی و فیکریی ڕێنماییان دەکەن ، ئەگەر دەستەلاتیان هەبوو ، بە شێوەی کردەییش دادگەرییان بە هەق لە نێودا دەچەسپێنن .

ئنجا تەنیا لێرەدا نا ، بەڵکو خوای دادگەر لە شوێنی دیکەشدا ، باسی ئەوە دەکات کە خاوەن کتێبەکان ، هەموویان وەك یەك نین ، وەك لە سووڕەتی (آل عمران)دا ، لە ئایەتەکانی : (١١٣ و ١١٤ و ١١٥)دا باسی کۆمەڵێك لە خاوەن کتێبەکان دەکاتو ، بە نۆ (٩) سیفەت مەدحیان دەکات، دەفەرموێ : ﴿ لَيۡسُواْ سَوَآءٗۗ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ أُمَّةٞ قَآئِمَةٞ يَتۡلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ وَهُمۡ يَسۡجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَأُوْلَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَلَن يُكۡفَرُوهُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾، لێرەدا نۆ (٩) سیفەتیان لێ هەڵدەدا ، کە بریتین لە :

١- ﴿ قَآئِمَةٞ ﴾، شەو هەڵدەستنەوەو بێدار دەبنو شەونوێژ دەکەن ، یان لەسەر ڕێبازی خوا ڕاستو وەستاوو نەلەخشاون .

٢- ﴿يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ﴾، ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوە ، لە کاتەکانی شەودا .

٣ - ﴿وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾، کڕنووش (بۆ خوا) دەبەن .

٤ - ﴿يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾، بڕوا بە خواو بە ڕۆژی دوایی دێنن.

٥ - ﴿وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾، فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە دەکەن .

٦ - ﴿وَيُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ﴾، پێشبڕکێ دەکەن لە ئەنجامدانی چاکەکان دا.

٧ - ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، وە ئەوانە لە چاکانن .

٨ - ﴿وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ﴾، ئەو چاکانەی کە دەیکەن ، لێیان بزر ناکرێن ، واتە : پاداشتەکانیان لێ زایە ناکرێن .

٩ - ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ﴾، وە خوا بە پارێزکاران زانایە، واتە: ئەوانە کەسانێکی پارێزکارن، دوای ئەوەی کە بە (صلاح و إصلاح) ناوزەدیان دەکات ، بە پارێزکاریش وەسفیان دەکات ، کەواتە :

یەکەم : مسوڵمانان دەبێ ئەهلی ئینصاف بن لەگەڵ غەیری خۆیان داو ، هەمیشە بە چاویلکەی ڕەش تەماشای خەڵك نەکەن ، بۆ وێنە : کاتێ تەماشای دەوڵەتانی دنیا دەکەن نەڵێن : هەموویان وەك یەکن ، نەخێر ، ئەمریکا جیایە ، فەڕەنسا جیایە ، ڕووسیا جیایە ، چین جیایە ،... هتد ، بۆیە دەبێ پۆلێن (تصنیف)یان بکەن ، پاشان حکوومەتەکانیان جیان لە میللەتەکانیان ، ئنجا خەڵکی باشیان هەیەو ، خەڵکی خراپیشیان هەیە ، هەروەها حیزبە عەلمانییەکانی دەوروبەرمان، بە هەمان شێوە ، ئینسان دەبێ ئینصافی هەبێ‌و ، هەر کەسە وەك خۆی هەڵی سەنگێنێ .

دووەم: وە پاشان ئەم ئایەتە مسوڵمانان فێری هۆشیاریی و وریاییش دەکات، کە بەهۆی ئەوەوە کە هەندێ خەڵکی چاك هەیە ، لەنێو جوولەکەو نەصرانیی یەکان دا، نابێ ئێمە بەهۆی کەسە چاکەکانیانەوە ، بە خراپەکانیان هەڵبخەڵەتێین ، بەڵکو چاکیان وەك چاك مامەڵەی لەگەڵ دا بکەین‌و ببینین‌و ، خراپیشیان وەك خراپ !!

**مەسەلەی دووەم :** کە دەفەرموێ : ﴿وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗا﴾،

وە دامانبڕین بۆ دوازدە هۆز ، کە هەر کامێکیان کۆمەڵێك بوو ، واتە: کۆمەڵێکی خاوەن قەوارە بوون ، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست حاڵەتی گلەیی‌و سەرزەنشت نیە ، چونکە دابەش بوونی بەنی ئیسرائیل بۆ دوازدە تیرەو قەوارەی جیا جیا ، لە نیعمەتەکانی خوای پەروەردگارە ، واتە : وەك چاك ئیدارەدانیان‌و بەڕێوەبردنی خۆیان ، بەش بەشمان کردن بۆ دوازدە تیرەو هۆز ، کە ئاوا باشتر بەڕێوەدەبردرێن ، ئنجا هەر تیرەو هۆزی دیارە بەرپرس‌و سەرپەرشتیارێکی هەبووە ، کە ئاوا ئاسانتر ئیشوکارەکان بەڕێوە دەبردرێن، وەك چۆن ئێستا سیستەمی فیدراڵیی هەیە ، یان سیستەمی لامەرکەزیی هەیە ، یان کە وڵات دابەش دەکرێ بۆ چەند پارێزگایەك، کە ئەمانە چەند شێوەیەکن لە شێوەکانی بەڕێوەبردنی وڵات ، نەك هەمووی وەك یەك لە یەك قاڵب بدرێ ، چونکە ئەگەر حوکمڕانیی مەرکەزیی بێ ، بە زۆر وا دەبێ کە سەری لە ستەم‌و ستەمکاریی‌و چەوساندنەوەوە دەردەچێ ، بۆیە هەرچەند دەسەڵات بڵاوتر بکرێ ، لە دادگەرییەوە نیزیکە .

ئنجا زانایان دەڵێن : کە خوا دەفەرموێ : ﴿ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗا﴾، بە پێی ڕێزمانی زمانی عەرەبی لە کاتێك دا کە ژمێرراو (معدود) نێر (مذکر) بێ ، دەبێ (عدد)یش نێر (مذکر) بێ ، کەواتە : ئەگەر بە پێی ئەوە بێ ، دەبوایە فەرمووبای : (اثني عشر أسباطاً) بۆیە لێرەدا هەندێ لە زانایان ئیشکالیان بۆ دروست بووەو ، بە چەند جۆرێك هەوڵی وەڵامدانەوەییان داوە :

١/ هەندێك گوتوویانە : ﴿ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ﴾، ژمارە (عدد)ی (قطعة)یە، کە (قطّعناهم) دەیگەیەنێ ، نەك (أَسْبَاطا) ئەگەرنا دەبووایە : (اثْنَي عَشَر)

بووایە ، ئنجا دیارە لە ژمارە (١١) بەرەو سەر (تمییز) بە تاك (مفرد) دێ، نەك بە كۆ (جمع) كەواتە : ئەگەر (تمییز)ی ﴿ أَثْنَتَيْ عَشْرَةَ ﴾ (أَسْبَاط) بووایە ، دەبوو (سِبط) بووایە ، ئاوا (اثْنَي عَشَرسِبطاً) ، بەڵام (أَسْبَاط) (حَال)ە ، وە (أمماً)یش (بَدَل)ە، هی (أَسْبَاط) یان هی ﴿ أَثْنَتَيْ عَشْرَةَ ﴾.

كەواتە : دیارە هەر (سِبط)ێك (أمة)ێك بووە .

٢/ وە هەندێكی دی گوتوویانە : لەبەر ئەوەی (أسباط) بە مانای (قبائل) دێ ، بۆیە وەك مێ (مؤنث) مامەڵەی لەگەڵ كراوە ، یانی : وەك ئەوە وایە فەرموبێتی : (اثْنَتَي عَشَرة قبیلة)، هەندێك ئاوا خۆیان لە ئیشكالەكە دەرباز كردوە .

بەڵام بە هەر حاڵ بۆچوونی زانایانی یەكەم ، زیاتر لە ڕاستییەوە نیزیكە .

## دوو تێبینی گرنگ :

١) دوزادە (سبط)ەكەی بەنی ئیسرائیل واتە : دوازدە تیرەو هۆزەكە ، لە دوازدە كوڕەكەی یەعقووبەوە وەپاش كەوتوون، وەك پێشتر باسمان كردوە : یەعقووب نازناوەكەی (إسرائیل) بووە، وەك خوا دەربارەی دەفەرمویٰ : ﴿ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُۚ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾ آل عمران، ئنجا ئەو دوازدە كوڕە ، دووانیان یوسوفو بنیامین بوون ، كە ئەوان لە دایكێك بوون ، وە دەیەكەی دیكەیان لە دایكێكی دیكە بوون ، ئنجا هەر كام لەو دوازدە (١٢) كوڕەی یەعقووب ، هاوسەرگیرییان كردوەو وەچەیان لێ وەپاش كەوتوە ، وە هەر كامێكیان بوون بە تیرەو هۆزێك .

٢) وە لە تەوراتدا هاتوە ، كە خەزووری مووسا ﵇ كە بە (یثرون) ناوی هاتوە ، وە خێزانەكەی مووسا ﵇ بە (صفُّورا) ناوی هاتوە، وە دوو كوڕیشیان بوو ون ،

کە لە پەیمانی کۆنــدا ناویان هاتوە، یەکیان ناوی (جِرشوم) بــووە ، واتــە : غەریب ، ئەوی دی ناوی (أليعازَر) بووە ، واتە: خوایە تۆ هاوکاری منی ، (إلهِي أنت عَوْنٌ لِي).

جا لە تەوراتدا دەڵێ : خەزووری مووساو هاوسەری‌و هەردوو کوڕەکەی ، لە مەدیەن چوون بۆ سەردانی مووسا، وە مووسا ﷺ زۆری ڕێز لە خەزوری گرتوە ، دەربــارەی شوێنــەکەش کە لێی کۆبوونەوە دەڵێ : (فِي الصَّحْرَاءِ حَيْثُ كَانَ مُجْتَمعَاً عِنْدَ جَبَلِ الله) لە کاتێکدا کە لەلای چیای خوا کۆبوونــەوە ، کە گفتوگۆی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا کردوە لەو بیابانەدا (ئەوە شوێنی پێکگەیشتنیان بووە) .

ئنجا دەربارەی خەزووری مووسا ﷺ کە هەندێك گوتوویانە پێغەمبەر شەعەیبە ﷺ، بەڵام ئەو قسەیە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە ، وە لە پەیمانی کۆنیشدا باسی ئەوە ناکات ، بە هەر حاڵ دەڵێ : خەزووری مووسا هەندێ ئامۆژگاریی پێغەمبەر مووسا ﷺ دەکات ، لەبەر ئەوەی دەبینێ کە لە سپێدەوە تاکو ئێوارە ، خەریکی چارەسەرکردنی کێشەی گەلەکەیەتی ، وە زۆریان پێوە ماندوە ، کە بە ڕاستیی ئامۆژگارییەکانی زۆر جوانن ، ئەگەر ڕاست بن کە لە پەیمانی کۆندا ، لە تەورات دا هاتوون ، ئامۆژگاریەکانیش پەیوەندییان هەیە بە ئیدارەکردنی کۆمەڵگاو خەڵك‌و چۆنیەتی مامەڵەکردنی بەرپرس‌و فەرماندەو سەرکردە، لەگەڵ خەڵکدا، کە بەم شێوەیە هاتوە :

{فَقَالَ حَمُو مُوسى لَهُ : إنَّ ما تَفْعَلُه لَيْسَ بالأَمْر الصائب ، اذ لابدَّ الكَلَلَ أَن يعتريك أَنْتَ وَكُل هَذَا الشَّعْبُ الَّذِي مَعَكَ ، لأَنَّ الأَمْرَ فوق طاقتك ، ولاَ يمكنك أَنْ تَتولاَّهُ وَحْدَكَ ، فَأَصْغ إلى صوتي لأُسدي لك نصيحَة ، وَلْيَكُن اللهُ مَعَك ، فَلْتكُنْ أَنْتَ ممثِّل الشَّعْبِ أَمَامَ اللهِ ، فترفع إليه دَعَواهم ، وَعَلِّمْهُمُ الْفَرَائِضَ وَالشَّرَائِعَ، وأعلنْ لَهُم الطريقَ الَّذِي يَسْلُكونَهُ، وَيستوجب عَلَيْهِم القيام به مِن أَعْمَال ، وَلَكِن اختر مِن بَيْن الشَّعب رِجَالاً معتذرِينَ خَائِفِينَ الله، أُمَنَاءَ يُبْغِضُونَ الرَّشْوةَ ، وَتُقِيمُهُمْ عَلَيْهِمْ رُؤَسَاءَ أُلُوفٍ ، و مئاتٍ ، وَ خَمَاسِينَ ، وَ عَشَرَاتٍ، فَيَقْضُونَ لِلشَّعْبِ فِي الدَّعَاوِي الصَّغِيرَةِ فِي كُلِّ حِينٍ ، أَمَّا القَضَايَا

المستعصِية فيرفعونَها إِلَيْكَ فَيخَفَفُ ذَلِكَ عَنْكَ ، إذ يشاركونَكَ فِي حَمْلِ العِبءِ...، فَاستمَعَ مُوسى إِلى نَصِيحَةَ حَميه وَنفّذ كُلَّ مَا قَالَهُ}[1] .

واتە: خەزووری مووسا گوتی : ئەوەی کە تۆ دەیکەی کارێکی ڕاست نیە، چونکە سەرەنجام تۆش ماندوو دەبیو ئەو گەلەش کە لەگەڵ تۆن ماندوو دەبن ، {تۆ فریا ناکەوی ئەوانیش زۆر جار دەبێ چاوەڕوان بکەن} چونکە کارەکە لە سەرووی توانای تۆیە ، وە ناتوانی بە تەنیا ئەو کاروبارانە هەمووی هەڵسووڕێنیو ، هەمووی بە دەست خۆتەوە بگری ، بۆیە گوێ بگرە بۆ دەنگی من تاکو ئامۆژگارییەکی چاکت پێشکەش بکەم، وە خواش با لەگەڵت دابێ :

تۆ نوێنەری خەڵك بە ، تۆ داواکارییەکانی خەڵك بۆ لای خوا بەرزدەکەیەوە ، وە بەرنامەکانو ئەرکەکانیان فێر بکە ، وە ئەو ڕێگایەی دەبێ بیگرنەر بۆیان ئاشکرا بکەو ، تێیانبگەینە ، (واتە : پەروەردەیان بکە) شارەزایان بکە ، وە ئەوەی کە پێویستە پێی هەڵسن لە کردەوەکان ، هەموویان جوان بۆ ڕوون بکەوە .

بەلام لە نێو خەڵکەکەدا پیاوانێکی بە توانا کە لە خوا بترسێن، وە ئەمیندارو دەست پاك بن ، وە ڕقیان لە بەرتیلو ڕیشوەت بێ ، هەڵیانبژێرە ، وە بیانکە بەرپرس بەسەر ئەو خەڵکەوە ، با هەندێکیان بەرپرسی هەزار کەس بن ، ئنجا هەزارەکەش دابەش بکە بۆ سەد سەد ، وە لە هەر سەد کەسێکی بەرپرسێکی بچووکتر دابنێ ، ئنجا سەدەکانیش بکە بە دوو پەنجاو هەر کەسەو بەرپرسێکی بۆ دابنێ ، پاشان پەنجایەکانیش بکە دە ، وە بۆ هەر دە نەفەرێك بەرپرسێك دابنێ ، (واتە : کۆمەڵە بەرپرسێکی گەورە گەورە ، کە هەر کامێکیان بەرپرسی هەزار کەس بێ ، لەنێو ئەوانیشدا ، لە خوار ئەوانەوە ، هەزارەکانیش بکە بە سەد سەد ، یانی : بەرپرسی سەد نەفەریی ، وە دوایی بەرپرسی پەنجا نەفەریی ، پاشان بەرپرسی دە نەفەریی) ، ئنجا هەر یەك لەو بەرپرسانە ، با چارەسەری کێشە بچووکەکان بکات ، بەلام ئەو کێشانەی کە لەوان عاسێ دەبنو بۆیان چارەسەر ناکرێن ، با بەرزیان بکەنەوە بۆ لای تۆ ، ئا ئەوە ئەرکی سەرشانی تۆ سووك دەکات ، چونکە ئەوانیش لە هەڵگرتنی ئەرکی بەرپرسیارێتیی دا بەشدار دەبن .

---

١) التفسير التطبيقي : العهد القديم ، سفر الخروج ، الإصحاح : ١٨، ص ١٦٨.

مووساش گوێی بۆ ئامۆژگارییەكانی خەزووری گرت‌و هەرچی گوتی ، هەمووی جێبەجێ كرد !

پیاوی عاقڵ بە عەقڵی خەڵك عەقڵی خۆی دەوڵەمەند دەكات ، نەك بڵێ : من پێغەمبەری خوام‌و ، ئەوە پیرە پیاوێكەو بە ساڵدا چووە، چی دەزانێ ؟ وادیارە زۆر بە چاكی گوێی بۆ گرتوە ، وە لەبەر ئەوەی قسەكانی هەق بوون ، گوێڕایەڵییشی كردوە ، وە لە ڕاستیدا بۆ ئێستاش هەر ڕاستەو ئەو قسانە ئەگەر جێبەجێ بكرێن ، هەر ڕاست‌و بەكەڵكن .

**مەسەلەی سێیەم :** كە دەفەرموێ : ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ قَوْمُهُۥٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنۢبَجَسَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ﴾، وە سروشمان كرد بۆ مووسا كاتێك گەلەكەی داوای ئاویان لێكرد ، پێمان گوت : بە گۆچانەكەت لە بەردەكە بدە ، وە دوازدە (١٢) سەرچاوەی لێ دەرقوڵین، وە هەر كۆمەڵە خەڵكێك شوێنی ئاو خواردنەوەو سەرچاوەكەی خۆیان دەزانی.

لە سوورەتی (البقرة) دا بەم شێوە هاتوە : ﴿وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾، واتە: وە یاد بكەنەوە كاتێك مووسا داوای ئاوی بۆ گەلەكەی كرد ، ئێمەش پێمان گوت : بە گۆچانەكەت لە تاشە بەردەكە بدە ، ئیدی یەكسەر دوازدە سەرچاوەی تێدا تەقینەوە ، كە هەر كۆمەڵێك كانی‌و ئاوی خۆیانیان دەزانی، بخۆن‌و بخۆنەوە لە ڕۆزیی خوا، وە خراپەكاریی لە زەویدا بڵاومەكەنەوە .

وە لە تەوراتیش دا بەم شێوەیە هاتوە : (وَلَكِن الشَّعْب كانَ ظامِئا إلى الماء فَتَذمَّروا عَلَى مُوسى ، وَقَالُوا : لِمَاذَا أَخْرَجْتَنَا مِن مِصْر لِتُميتَنَا وَأَوْلادَنا

وَمَوَاشِينا عَطَشاً ؟ فصرخَ مُوسى إلى الرَّبّ، مَاذَا أصنع بِهَذَا الشَّعْب ؟ إِنَّهُم يكادون يرجمونَنِي، فَأَجَابَهُ الرَّب، تقدم الشَّعْب وخذ مَعَك بَعْض شيوخ بَنِي إِسْرَائِيل وَبِيدك عصاك أَيْضا الَّتِي ضربت بها، أَنَا أقف هناك أَمَامَك عَلَى الصَّخْرَة فِي (حوريب) اضْرِب الصَّخْرة فينفجر منها الماء ليشرب الشعب، ففعل موسى هكذا، أمام شيوخ بني إسرائيل))[(١)]، واتە : بەڵام گەلەکە (یانی: گەلی بەنی ئیسرائیل) تینوو بوون بۆ ئاو، بۆیە بێزارییان دەربڕی‌و پرتەو بۆڵەیان لەسەر مووسا ﷵ کرد، وە گوتیان : بۆچی لەسەر زەمینی میسر ئێمەت هێنایەدەر، بۆ ئەوەی خۆمان‌و ڕۆڵەکانمان‌و ئاژەڵەکانمان لە تینوویان بخنکێنی ؟!

بۆیە مووسا ﷵ دەنگی بەرز کردەوە بۆ لای پەروەردگارو هاواری کرد، گوتی : چی لەو گەلە بکەم ! خەریکە بەرد بارانم دەکەن ؟ پەروەردگاری وەڵامی دایەوە : پێش گەلەکەت بکەوە، وە هەندێ لە ریش سپییانی بەنی ئیسرائیل لەگەڵ خۆت دا بەرە، وە ئەو گۆچانەی کە پێت لە ڕووبارەکەداو شەق بوو، لەگەڵ خۆتی بەرە، ئەوە منیش لەوێ لە پێشتەوە دەوەستم {دیارە ئەوان وا دەڵێن ! ئەگەرنا خوای پاك‌و بێ وێنە، لەوێ ناوەستێ}، لەسەر بەردەکە کە لە (حوریب)ە (کە شوێنێکە) لەوێ لەو بەردە گەورە بدەو، ئاوی لێ دەردەقوڵێ‌و، با گەلەکەت ئاوی لێ بخۆنەوە، وە مووساش وای کرد لەبەرچاوی ریش سپییانی بەنی ئیسرائیل .

## چەند جیاوازییەکی نێوان (البقرة) و (الأعراف)

## لە مەسەلەی داواکردنی مووسا بۆ ئاو پێدانی گەلەکەی دا :

١/ لە سوورەتی (البقرة)دا فەرمووی : ﴿ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ ﴿٦٠﴾ ﴾، چونکە بیرخستنەوەیە، بۆیە وشەی (إذ)ی بەکارهێناوە، واتە : یاد بکەنەوە، ئەو کاتە بێننەوە بیری خۆتان، کاتێ مووسا ﷵ داوای ئاوی کرد بۆ گەلەکەی، بەڵام لە سوورەتی (الأعراف)دا بەسەرهات گێڕانەوەیە، بۆیە یەکسەر دەست پێدەکات، دەفەرموێ : ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، سفر الخروج، الإصحاح : ١٧، (ماء الصخرة)، ص ١٦٧.

قَوْمُهُۥٓ ... ﴾، وە سروشـمان کـرد بـۆ مووسـا ، کاتێـك گـەلەکـەی داوای ئاویـان لـێکرد .

٢/ پاشـان لـە سـوورەتی (البقـرة)دا دەفـەرموێ : ﴿ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ﴿٦٠﴾ ﴾، بـەڵام لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ : ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ قَوْمُهُۥٓ ... ﴾.

کەواتـە : فـەرموودەکردنـی خـوای پەروەردگـار بـۆ مووسـا ﷺ ، لـە سـوورەتی (البقـرة)دا ، بـە پێـی ئـایەتەکـەی سـوورەتی (الأعـراف) بۆمـان دەردەکـەوێ ، کـە وەحییـەو خـوا ڕاستەوخـۆ قسـەی لەگـەڵ نەکـردوە، وەك چـۆن وەحـی بـۆ پێغـەمبـەرانـی دیکـە دەنێـرێ : ئنجـا لـە ڕێـی جبـریـل بـێ ، هـەر بیخـاتە دڵیانـەوە ، یـان جبـریل لـە شـێوەی پیاوێـك بێتـە لایـان ، گـرنك ئەوەیـە لە ڕێـی وەحییـەوە پێـی فـەرمووە، نەك ڕاستەوخـۆ فەرمایشـتی لەگەڵ کردبـێ .

٣/ ئنجا لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ : ﴿ فَٱنفَجَرَتْ ﴾، بـەڵام لە سوورەتی (الأعـراف)دا دەفـەرموێ : ﴿ فَٱنۢبَجَسَتْ ﴾، کـە پێشـتـر ئـاماژەمـان پێکـرد (انبجـاس) ئەوەیـە کە ئـاوێك لـە شـوێنێکی تەنگـەوەو بـە کەمیـی بێتـە دەرو ، فیچقە بکـات ، بـەڵام (إنفجـار) ئەوەیـە کە ئـاوێك لـە شـوێنێك بێتـەدەر ، بـە فراوانیـیو بـە زۆریـی ، کـە دیـارە ئاوەکـە سـەرەتا حاڵـەتێکی فیچقـەکردنو دەرقوڵیـن (انبجاس)ی هـەبووە ، بـە شـێوەیەکی کـەمو لـە شـوێنێکی تەسـکەوە هـاتوە ، بـەڵام دوایـی وردە وردە کـە ئـاوی پێـدا هـاتوە ، فـراوان بـووەو حاڵـەتی تەقینـەوە (إنفجـار)ی هـەبووە ، یـانی : خـوای پەروەردگـار لـەم دوو ئـایەتە موبـارەکەدا باسی قۆنـاغی سـەرەتـاو قۆناغی دوایـی ئـاوە دەرقوڵینـەکە دەکـات ، وە هیچ تێکگیـرانێکیان لە نێوان دا نیـە .

٤/ وە لـە سـوورەتی (البقـرة)دا دەفـەرموێ : ﴿ كُلُواْ وَٱشْرَبُواْ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ ﴾، بخۆنو بخـۆنەوە لـە ڕۆزیی خـوا ، بـەڵام لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا دەفـەرموێ :

﴿ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ ﴾، بخۆن لەو ڕۆزییە خۆش‌و بەتامانەی کە پێماندااون .

٥/ وە لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرمویٚ : بخۆن‌و بخۆنەوە ﴿ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ ﴾، بەلاّم لە سوورەتی (الأعراف)دا تەنیا دەفەرمویٚ : بخۆن ﴿ كُلُواْ ﴾، لەبەر ئەوەی ئایەتەکەی سوورەتی (البقرة) لە مەدینە هاتۆتە خوارو چاکەو نیعمەتەکانی خوا ﷻ وەبیر جوولەکان دێنێتەوە ، کە لەگەڵ پێشووانیان کردوونی، بۆیە هەم باسی تێر ئاو بوونیان دەکات ، هەم باسی خواردنیان دەکات، وە لە زمانی عەرەبیشدا جاری وایە (كُلْ) بۆ (إشرَبْ) بخۆوەش بەکاردێ ، بۆیە لە سوورەتی (الأعراف)دا ئیکتیفای پێ کراوە .

**مەسەلەی چوارەم** : کە دەفەرمویٚ : ﴿ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡغَمَٰمَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾، دیارە چەند جیاوازییەکی ڕواڵەتیی هەن لە نێوان ئەم ئایەتەو ، ئایەتەکەی سوورەتی (البقرة)دا :

١) لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرمویٚ : ﴿ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡغَمَامَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٥٧ ﴾، واتە : وە هەورمان کردنە سێبەر بەسەرتانەوە ، بۆچی وا دەفەرمویٚ ؟ چونکە ڕوی دواندن لە گەلی جوولەکەیە ، خوای پەروەردگار بیریان دەخاتەوە ، بەلاّم لە سوورەتی (الأعراف)دا بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە، بە شێوازی نادیار دەیهێنێ، بۆیە دەفەرمویٚ : ﴿ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡغَمَٰمَ ﴾، واتە : وە ئێمە بە هەوران سێبەرمان لەسەر کردن ، دیارە ئێمە پێشتر لە سوورەتی (البقرة)دا تەفسیری ئەم ئایەتەمان کردوە، بەلاّم لێرەدا

تیشکێکــی دەخەینـــەوە ســـەر ، چـــونکە بڕیارمـــان داوە لـــەم ســـوورەتەدا بەسەرهاتەکانی مووساو هارووناو گەلەکەیان بە درێـژیی بخـەینـە ڕوو :

خـوای پەنهانزان کە لێرەدا باسـی ئـەو سێبەرلـێکرانە دەکـاتو ، دەفـەرموێ : هـەورمان کـردنە سـێبـەرتان ، یـان بـە هـەوران سێبـەرمان لێکـردن، ئایـا ئـەو سێبـەرکردنـە لـە کوێ بووە ؟ بێگومـان لـە بیابـانی سینادا بـووە ، کـە شـوێـنێـکی زۆر گـەرمو قـاقـڕو وشـك بـووە .

شایانی باسە ئەوەندەی تەماشای قورئانم کرد : خـوای کاربـەجـێ تـەنیا لـەم دوو شـوێنـەدا باسـی هـەور کردنـە سـێبـەری کـردوە ، وە لـە تـەوراتیش دا ، ئـەو مەسـەلـەیە بـاس نەکـراوە ، بـەڵـێ لـە تەوراتـدا باسـی (عمود السحاب والنار) کراوە ، واتە: کۆڵەکـەی هـەورو ئـاگـر، بـەڵام لـە کـاتی پەڕینـەوەیان بـە دەریـای سووردا، بۆ ئەوەی ببێتە پەردە لە نێوان سوپای فیـرعەونو بـەنی ئیسـرائیـلـدا، وە ببێتە مایەی بـەرچاو ڕۆشـنیی بـۆ بـەنی ئیسـڕائیـل، وەك پێشـتـر هێنـامانو ئێستاش دووبـارەی دەکەینـەوە .

لە ژێر ناوونیشانی (عمود السحاب والنار) و (عبور صحراء البحر الأحمر)دا واتـە : دوو کۆڵەکەی هەورو ئـاگـر، پەڕینەوە لە بیابـانی دەریـای سـووردا، دەڵـێ : (وَارتَحلـوا مِـن سُكـوت وَخَيَّمُـوا فـي إشـام عَلَـى طـرف الصَّحْرَاء، وَكَـانَ الـرَّبّ يَتَـقَدّمهُم نَهـاراً فِي عمُـود السّحَاب ليهديهم فِي الطـريق وليـلاً فـي عمود نارٍ ليضيء لـهم)[(١)] ، واتە: لـە سوكـوتەوە ڕۆیشـتنو چـادریان هـەڵـدا لـە ئیشـام، لـە قەراغی بیابان ، وە پەروەردگار پێشـیان کەوتبوو بە ڕۆژ لە کۆڵەکەیەکی هـەوردا ، وە بـە شـەویش لە کۆڵەکـەیەکی ئـاگـردا ، بۆ ئەوەی ڕێیان بۆ ڕۆشن بکاتەوە .

دیـارە کـە دەڵـێ : پەروەردگـار پێشیان کەوتبـوو ، مەبـەسـت ئەوەیـە خـوای بـە بــەزەیی ئــەم دوو شـــتەی بـۆ ڕەخســاندوون ، وە دوور نیــە هــەر مەبەســتیان پەروەردگــار بــێ کــە لــە پێشـــیان بــووە، چــونکە جوولەکـەکــان زیــاتر خـــوای پەروەردگـار دەجەستێنن‌و ، وەك لە شـوێنی دیکە باسـمان کـردوە، ئـەوان خـوای بـەرز وەك خـاوەنـی جەسـتەیەك دەناسـێنن‌و باسـی دەکـەن .

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم ، سفر الخروج ، الإصحاح : ١٣، ص ١٥٨ .

هەر لەوبارەوە لە تەورات دا هاتوە دەڵێ : (وَانْتَقَلَ ملاك الله الَّذِي كَانَ يَتَقَدَّم عسكر إِسْرَائِيل إِلى المؤخّرة خَلْفَهُم وَكَذَلِكَ انتقل عمود السحاب ووقف وراءهم ، فدخل بين عسكر المصريين وعسكر الإِسْرَائِيلِيين، وَ صارَ العمود ظلاماً قَاتِمَاً عَلَى المصريين وَضِياءً عَلَى بَنِي إِسْرَائِيل ، فَلَمْ يَقْتَرِب أَحَدهُمَا من الأخر طوال اللَّيْل)[1]، واتە : فریشتەی خوا کە لە پێش سوپای ئیسرائیل بوو ، چوو بۆ لای دوایانو لە پشتیانەوە دەڕۆیشت ، هەروەها هەورێکی وەك کۆڵەگەیەك (وەك لوولەیەك) لە پێشیانەوە دەڕۆیشت دوایی کەوتە پشتیانەوە ، وە کەوتە نێوان سوپای میسرییەکانو سوپای ئیسرائیلییەکان (واتە جوولەکەکان) وە ئەو هەورە بۆ میسرییەکان بوو بە تاریکییەکی ئەنگوستە چاوی ڕەش ، بەڵام بۆ بەنی ئیسرائیل (گەلی مووسا) بوو بە ڕووناکییەکی زۆر ، وە هیچ کامیان لەوی دیکە نیزیك نەکەوتەوە، بە درێژایی شەو . {واتە ، بە درێژایی شەو کە بە نێو دەریا ڕۆیشتوون ، کە خوا بزانێ ماوەی چەند کیلۆمەتر بووە ، ئەو هەورە کە لایەکی (لای میسرییەکانی) تاریك بووەو لای بەنی ئیسرائیلی ڕووناك بوو ، کەوتبووە بەینیان وە بە یەك نەدەگەیشتن} .

٢) ئنجا کە لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ : ﴿وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ﴾، واتە: وە گەزۆو سەلوامان دامانبەزاندە سەریان .

گەزۆ خواردنێکی شیرینەو ، سەلواش جۆرە باڵندەیەکە .

بەڵام لە سوورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی : ﴿وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ ۝٥٧﴾، دیارە لە سوورەتی (البقرة)دا ، خوا جوولەکەکانی هاوچەرخی پێغەمبەر ﷺ دەدوێنێ ، وە ئەو نازو نیعمەتانەیان دەخاتەوە یاد ، کە کاتی خۆی لەگەڵ بابو باپیرانیان کردوویەتی .

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس ، العهد القديم ، سفر الخروج ، الإصحاح : ١٤، ص١٦٠ .

شایانی باسیشە لەبارەی ئەو دوو شتەوە ، زانایان شتێکی وایان نەگوتوە ، تەنیا دەربارەی (مَنّ) و (سَلْوى) گوتوویانە : (مَنّ) جۆرێکە لە شیرینیو (سَلْوى)ش باڵندەیەکە، وەك کۆترو سوێسکە .

(المعجم الوسيط) باسی (مَنّ) دەکات، دەڵێ : (المَنّ : مَادَّةٌ رَاتنْجِيَّةٌ صمْغِيَّةٌ حلْوَةٌ تُفْرِزُها بَعْضُ الأَشْجَارِ كالأَثْلِ ، وَطَلّ يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ عَلَى شَجَرٍ أَوْ حَجَرٍ يَنْعَقِدُ وَيَجُفُّ جَفَاف الصمْغِ وَهُوَ حُلو يُؤْكَلِ)[1]، واتە : (مَنّ) ماددەیەکی صەمغیی ڕاتینجیی شیرینە بە شتەوە دەنووسێ ، هەندێك درەخت دەریدەدەن ، بە تایبەت درەختی (أثل) وە شەونمێکە لە ئاسمانەوە دێتە خوار لەسەر درەخت ، یان لەسەر بەرد ، دەنیشێ ، وە وشك دەبێ ، وەك چۆن صەمغ وشك دەبێ ، وە شیرینەو دەخورێ .

هەروەها پێناسەی (سلوى)ش دەکات ، دەڵێ : (السَّلوى : هُوَ السُّمَانِي وَهُوَ طائِر صَغِير مِنْ رُتْبَة الدَجَاجِيَّاتِ جِسْمُهُ مُنْضَغِط مُمْتَلِيءٌ وَهُوَ مِنَ القَوَاطِعِ الَّتِي تُهَاجِرُ شتاءً إِلَى الحَبَشَة وَالسودَانَ وَيُستَوْطِنُ أَوْرُبة وَحَوْض البَحْرِ المتَوَسِط وَاحِدَتُهُ سَلْوَاة)[2]، واتە: (سلوى) سومانیی پێ دەگوترێ ، باڵندەیەکی بچووکە لە ڕیزی فەسیلەی مریشکانە ، وە جەستەیەکی چڕوپڕی هەیە ، وە لە جۆری بڕەرەکانە {واتە : ئەوانەی شت دەبڕنو بە دەندووکیان شت دەخۆن} ، وە زستانان بەرەو حەبەشە کۆچ دەکات، وە هەروەها بەرەو سوودان، وە لە ئەورووپا نیشتەجێ دەبێ ، وە لە لای دەریای سپی نێوەڕاست ، وە تاکی (سلوى) بریتیە لە (سلواة).

ئنجا لە پەیمانی کۆن (العهد القديم)دا لە ژێر ناوونیشانی لە بیابانی سینادا (في الصحراء سين) بەم شێوەیە باسی ئەم بابەتە کراوە، دەڵێ : (ثُمَّ انْتَقَلَتْ كُلُّ جَمَاعَة بني اسرائيل من إيليم حتى أقبلوا إلى صحراء سين الواقعة بين إيليمَ وسِيناء ، وذلك في اليوم الخامس عشر من الشهر الثاني

---

١) ص : ٨٨٨ ، ٨٨٩.

٢) ص : ٤٤٦.

بعد خروجِهِم من أرض مصـر ، وهنـاك فـي الصحراء تَذَمَّرَ بنو اسرائيـل على موسى و هارون ، و قالوا لهما : ليت الـرَبُّ أَمَاتَـنَا فِي أَرْضِ مِصْـر ، فَهُنَاكَ كُنَّا نَجْلِس حَـوْلَ قُدُورِ اللَّحْم ، نَأْكُلُ خُبْزَاً حَتَّى الشَّبَع ، وهـا أنتمـا قد أَخرجتمانا إلى هذه الصحراء ، لتُميتا كُلَّ هَذِهِ الجَمَـاعَةَ جُوعَـاً ، فَقَالَ الـرَبُّ لِمُوسـى ها أَنـا أُمْطِـر لَـكُمْ خُبْـزَاً مِـنَ السَّمَاءِ ، فَيَخْـرُجُ الشَّعْبُ وَيَلْـتَقِطُ حاجـة كُلّ يـومٍ بيومـه ، لِكَي أَمْتَحِنَهُم فأرى ، إنْ كانوا يُسْلِكونَ فِي شَرِيعَتي أم لا ؟ ...).

وه هـەر لـە درێـژەی ئـەوەدا لـە ژێـرنـاوونیشـانی : (الـمَنّ السَّلْوى)دا دەڵـێ : (فِـي ذَلِـكَ الـمَسَـاءِ أَقْبَلَـت طُيـور السَّـلْوى (السُّمَاني) وغَطَّـتِ الـمُخَيّـمَ ، وفِـي الصبَاح كَسَتْ طَبَقَـة النَّدى الأَرْضَ المحِيطَـة بالـمُخَيَّمِ ، وَعِنْدَما زالَـتْ طَبَقَـةُ النَّـدى إذا وَجْـهُ الصَّـحْراء مغَطَّـىً بشَـيءٍ رقيـقٍ كاقُشُـور مُكَتَّـلٍ كَالجَلِـيد ، وَعِنْـدَما رَآهُ بَنُـو إسْـرائيل قـالَ بَعْضُـهُم لِـبَعْضٍ (فَهُـوَ) أي مَـا هَـذا؟ لأَنَّـهُـمْ لَـمْ يَعْرِفُوا مَا هُـو ، فَقَال لَـهُم مُوسـى : هُوَ خُبْـز الـرَّب الَّـذي أَعْطَـاكُم لِتَأكُلُوه) ، واتە: دوایی هـەموو کۆمەڵی بـەنی ئیسـرائیل لـە ئیلـیمەوە گواسـتیانەوە ، بـەرەو بیابـانی سـین چـوون ، کـە دەکەوێتـە نێـوان ئیلـیمو سـینا، وە لـەوێ لـە ڕۆژی پـازدەمین دا لە دووەم مانـگی دەرچوونیـان لەسـەر زەمینی میسر ، لـەو بیابـانەدا بـەنی ئیسـرائیل دەسـتیان کـرد بـە پرتـەو بۆڵـە بەسـەر مووسـاو هـاڕوون داو پێیان گوتـن : بریـا پەروەردگـارمان ئێمـەی لەسـەر زەمینـی میسر مراندبـایە ، ئێمـە لـەوێ لــە دەوری مەنجـەڵو قابڵــەمەی گۆشـت ، دادەنیشـتین ، وە نانمـان دەخــوارد ، هــەتا تێــر دەبوویــن ، کەچــی ئێـوە ئێمـەتان بــەرەو ئـەم بیابانـە دەرهێنــا ، بــۆ ئــەوەی ئــەو هــەموو خەڵــکە لێــرە لــە برســـان بمــرێ ! پەروەردگــاریش بــە مووســای فەرمــوو : ئــەوە مـن لـە ئاسـمانەوە نانیـان بـۆ دەبارێنــم ، بـا خەڵـکەکە هــەموویان بچنــە دەرێ ، بــەشی هـەر ڕۆژە لـە کـاتی خۆیــدا بــە پێــی پێـویسـت هـەڵبگـرن ، بـۆ ئـەوەی تاقییـان بکەمـەوە، تاکـو بیـانبینـم ئـایا بـە پێی شـەریعەتی من ڕەفتار دەکەن . {واتـە : تـەنیا بـەشی ئـەو ڕۆژەی پێویستیان پێیـە هـەڵبگرنو لـێی  پاشـەکەوت نـەکەن ، ئنجا لـە پـەیمانی کۆنـدا هاتـوە ، کـە دەڵـێ : پاشـەکەوتیشـیان کـرد ، دوایـی کـرم لـێیـدا ، دیـارە مەبەستیش لە نـان (خبـز) هـەر گـەزۆیـە ، کە گـەزۆریەکی سـپی بوو} .

پاشـان دەڵـێ :

وە لـە ئێـوارەی ئەو ڕۆژەدا باڵنـدەی سەلـوا ، (سومانیی) هاتن چادرگاکەیان {واتە : ئەو شوێنەی بارگەو بنەیان لێخستبوو} هەمووی داپۆشی ، هێندە زۆر بوون ، وە لە بەرەبەیانەکەشیدا ، چینێکی شەونم سەر زەوی کە دەوری چادرگاکەیدا بوو ، هەمووی داپۆشیی ، ئنجا دوای ئەوەی ئەو چینە شەونمو ئاونگە لاچووو، توایەوە ، ڕووی بیابان وەك بەستەڵەك سپی دەرکەوت ، وە کاتێك بەنو ئیسرائیل ئەوەیان بینی ، لە نێو خۆیاندا گوتیان : (فهو) واتە : یانی : (ما هذا) ئەمە چییە ؟ چونکە پێشتر شتی وایان نەبینیبوو ، مووساش ﷺ پێی گوتن : ئەوە نانی پەروەردگارەو پێی بەخشیون ، تاکو لێی بخۆن .

٣) ئنجا کە دەفەرمویَ : ﴿ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾، واتە : (پێیان گوترا :) لەو ڕۆزییە پاكو چاكو بە سوودانەی خوا پێیداون ، بخۆن ، وە ستەمیان لە ئێمە نەکرد ، بەڵکو ستەمیان لە خۆیان کرد :

أ — یانی : کە لەو خواردنەیان پاشەکەوت کرد، ستەمیان لە ئێمە نەکرد ، بە پێی ئەوەی پەیمانی کۆن دەیڵێ ، چونکە لە قورئاندا نەهاتوە .

ب - یاخود ستەمیان لە ئێمە نەکرد ، کە هێندە پرتەو بۆڵەیان دەکرد .

ج - یان ستەمیان لە ئێمە نەکرد ، کە دوایی ڕازی نەبوونو گوتیان : ئەی مووسا ! ئێمە بە یەك جۆرە خواردن ڕازی نابین .

بەڵام لە سوورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی : ﴿ ... كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ مِن رِّزۡقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ۝٦٠ ﴾، واتە : لە ڕۆزیی خوا بخۆنو بخۆنەوە ، وە لە زەوی دا خراپەکاریی مەکەن .

کەواتە : لە (البقرة)دا باسی سەرەتا (بدایة)ی ئەو ڕووداوە دەکات ، کە بریتیە لەوەی خوا خراپەکاریی لێ قەدەغە کردوون (وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ) .

بەڵام (الأعراف)دا باسی دەرەنجام (نتیجة)ەکەی دەکات ، کە بریتیە لە هەڵسانی جوولەکە بە ستەمکاریی و لادان : ﴿ كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾.

**مەسەلەی پێنجەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ اسْكُنُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ وَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ وَقُولُوا حِطَّةٌ وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيئَاتِكُمْ ۚ سَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٦١﴾ فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ قَوْلًا غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَظْلِمُونَ ﴿١٦٢﴾ ﴾، لە سوورەتی (الأعراف) ئەم دوو ئایەتە بەپێزە ، بەم شێوە هاتوون، بەڵام لە سوورەتی (البقرة)دا ئاوا هاتوون : ﴿ وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا قَوْلًا غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾.

## حـەوت جیـاوایی لە نێـوان ئایـەتەکـانی (١٦١ و ١٦٢)ی (الأعـراف) و ئایـەتەکـانی (٥٨ و ٥٩)ی (البـقــرة) دا

لە نێوان ئەم دوو ئـایەتەی (البقـرة)و ئـەو دوو ئـایەتەی سـووڕەتی (الأعـراف)دا حەوت جیاوازیی هەن ، کە وەك پێشتـریش گوتوومانە : ئەو جیـاوازییـانە دەرخەری کۆمەڵێـك نهێنـیی دیکەن ، وە زیاتـر ڕوونکـەرەوەی مەبەسـتن ، لـە هەنـدێك لایـەنی دیکـەوە ، دیـارە سـووڕەتی (الأعـراف) پـێش سـووڕەتی (البقـرة) هـاتۆتە خـوارێ ، چونکە (الأعـراف) مەککەییـەو (البقـرة) مەدینـەییـە ، بـا تەمـاشا بکـەین :

١) لـە سـووڕەتی (الأعـراف)دا خـوا دەفـەرموێ : ﴿ وَإِذۡ قِيلَ لَهُمُ ٱسۡكُنُواْ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ ﴾، واتـە : وە یـاد بکـەوە ! کـاتێـك کـە پێیـان گوتـرا : نیشتەجـێ بـن لـەم شـارەدا.

بـەڵام لە سـووڕەتی (البقـرة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا ٱدۡخُلُواْ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ ﴾ واتـە : یـاد بکەوە ! کـاتێـك گـوتمـان : بچنـە ئـەم شـارەوە . ئـایەتەکـەی سـووڕەتی (الأعـراف) وەك بـەسـەرهـات دەیگێڕێتەوە، بـەڵام ئـایەتەکـەی سـووڕەتی (البقـرة) لەکاتی دواندنی خاوەن کتێبـەکان دا ، بەتایبـەتی جوولەکەکان ، هاتۆتە خـوارێ .

ئنجـا یەکێـك بـۆی هـەیە بڵـێ : لـەوێ دەفـەرموێ : (قِيلَ لَهُمُ )، لێـرە دەفەرمـوێ : (قُلۡنَا ) ، وە لـەوێ دەفەرمـوێ : ( ٱسۡكُنُواْ ) لـێرە دەفـەرمـوێ : (ٱدۡخُلُواْ ) ، ئەمـە چۆنـە ؟

ئێمە دەڵـێین : ڕوونکردنەوەکـەی بـەم شێوەیە : وەك گوتمان : خـوای کاربـەجـێ کە لە سـووڕەتی (الأعـراف)دا باس دەکـات، وەك بەسـەرهات دەیگێڕێتـەوە ، ﴿ وَإِذۡ قِيلَ لَهُمُ ٱسۡكُنُواْ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ ﴾، وە یاد بکـەوە ! کـاتێك کـە پێیـان گـوترا :

نیشتەجێ بن لەم شارەدا، بە کێ گوترا؟ بە بەنی ئیسرائیل، بەڵام لە سووڕەتی (البقرة)دا ڕووی دواندن لە جوولەکەکانە، دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُواْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ﴾، وە کاتێك پێمان گوتن: بچنە ئەم شارەوە، کەواتە: لە (الأعراف)دا دەفەرموێ: پێیان گوترا، بەڵام لە (البقرة)دا دەفەرموێ: بە بابو باپیرانی ئێوەمان گوت، چونکە وەك پێشتریش گوتمان: لە (الأعراف)دا بەسەرهاتەکە گێڕراوەتەوەو، لە (البقرة)دا یاد خستنەوەیەو دواندنی جوولەکەکانی مەدینەیە.

ئنجا کە لە (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ٱدْخُلُواْ﴾، بچنە نێوی و، لە (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ٱسْكُنُواْ﴾، نیشتەجێ بن، دیارە پێشتر دەبێ بچنە نێو شارەکەوە، ئنجا دوایی تێیدا نیشتەجێ دەبن.

٢) لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿وَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ﴾، وە لێی بخۆن لە هەر شوێنێك کە ویستتان، بەڵام لە سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا﴾، واتە: یەکسەر لە هەر جێیەك حەزتان کرد بە فراوانیی، لێی بخۆن، واتە: ئەوەی (الأعراف) بەس باسی خواردن دەکات، بەڵام ئەوەی سووڕەتی (البقرة) بۆمان دەردەخات: یەکسەر کە چوونە نێو شارەکە، بۆتان هەیە لێی بخۆنو بۆتان حەڵاڵەو موباحە، وە قەیدی (رَغَدًا)یشی بۆ زیاد کردوە، واتە: زۆر بە فراوانیی هیچ قەدەغەیەکتان لەسەر نیە، هیچ کۆتو بەندێکتان لەسەر نیە.

٣) لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿وَقُولُواْ حِطَّةٌ وَٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا﴾، واتە: بڵێن: خوایە! گوناهەکانمان لێ بەردەوە، وە بە ملکەچیی و کڕنووش بردنەوە بچنە نێو دەرگا.

بەلام لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ : ﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدًا وَقُولُواْ حِطَّةٌ﴾، وە بە كڕنووش بردوویی بچنە دەروازەی شارەكەوە ، وە بڵێن : خوایە ! گوناهەكانمان لێ بەردەوە ، یانی : وشەكان پێش و پاشیان پێكراوە ، گرنگ ئەوەیە خوای پەروەردگار هەردووكیانی پێ فەرموون ، پێی فەرموون : ئاوا بڵێن و بچنە ژوور ، ئنجا مادام سوورەتی (الأعراف) پێشی هاتۆتە خوارێ ، دەبێ پێشێ قسەكە بكەن ، دوایی بچنە ژوور ، بەلام لەبەر ئەوەی چوونە ژوورەكە گرنگتر بووە بۆ بیرخستنەوەی جوولەكەكان بۆ نیعمەتەكانی خوا ، چوونە ژووری دەروازەكەی پێش خستوە .

٤) لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ : ﴿نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطِيٓـَٰٔتِكُمۡۚ سَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾، واتە : گوناهەكانتان لێ دەسڕینەوە ، بۆتان دەپۆشین، وە بۆ چاكەكارانیش پاداشت زیاد دەكەین .

بەلام لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ : ﴿نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطَٰيَٰكُمۡۚ وَسَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾، واتە : گوناهەكانتان لێ دەسڕینەوە، بۆتان دەپۆشین ، وە بۆ چاكەكارانیش پاداشت زیاد دەكەین، دیارە (خطايا) و (خطيئات) كۆی (خطيئة)ن، بەلام لە (الأعراف)دا بە (جمع المؤنث السالم) هێناویەتی، لە (البقرة)ش بە (جمع التكسير) هێناویەتی، وە لە سوورەتی (البقرة)دا (و) واوی بۆ زیاد كردووە ، فەرموویەتی : ﴿وَسَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾، واتە : وە بە تەئكید بۆ چاكەكارانیش زیاد دەكەین، بەلام لە سوورەتی (الأعراف)دا (و) واوەكەی نیە ، بەلام مانایەكەی هەر وەك خۆیەتی .

٥) لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ﴾، ئەوانەیان كە ستەمیان كرد لەوان ، قسەكەیان گۆڕی ، جگە لەوەی كە پێیان گوترابوو .

بەڵام لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ : ﴿ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ ﴾، ئەوانەی ستەمیان کرد ، قسەیەکی دیکەیان کرد ، جیا لەوەی پێیان گوترابوو ، چونکە لە سوورەتی (الأعراف)دا بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە، بەڵام بۆچی وشەی (منهم)ی بەکارهێناوە ؟ بۆ ئەوەی هەم ئەوانی پێشوو، وە هەم ئەوانەی هاوچەرخیش بگرێتەوە ، کە قسە دەگۆڕن، کە خوا فەرمانێکیان پێدەکات، ئەوان دەچن شتێکی دیکە دەکەن .

٦) لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ : ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، واتە : ئنجا لەسەریەوە سزایەکمان نارده سەریان .

بەڵام لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ : ﴿ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، ئنجا لە سەریەوە سزایەکمان دابەزاندە سەر ئەوانەی ستەمیان کردبوو .

دیارە جیاوازییەکەش ئەوەیە کە (إنزال) یەکجار دێتە خوار، بەڵام (إرسال) بەردەوامیی هەیە ، یانی : وردە وردە دێتە خوار ، کەواتە : لە سوورەتی (الأعراف)دا بۆمان دەردەکەوێ ، کە مەرج نیە ئەو سزایە یەکجار دابەزیبێ ، بەڵکو پلە بە پلە ، پەیتا پەیتا بۆیان دابەزیوە، بەڵام لە سوورەتی (البقرة)دا هەمووی بە یەکجار پێکەوە باس دەکات ، واتە : لە ئەنجامی ئەوەدا سزای دابەزاندە سەریان ، بەڵام ئایا هەموو بەیەکەوە هاتوە، یان پەیتا پەیتا ؟ سوورەتی (الأعراف) ئەوەی بۆ ڕوونکردووینەوە ، کە پلە پلە بووە .

٧) لە سوورەتی (الأعراف) دەفەرموێ : ﴿ بِمَا كَانُواْ يَظْلِمُونَ ﴾، واتە : بەهۆی ئەوەوە کە ستەمیان دەکرد، بەڵام لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ : ﴿ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴾، کەواتە : ئەوانە هەم ئەهلی ستەم بوون، هەم

ئەهلی لادانیش بوون، ستەم سنوور بەزاندنە، فیسقیش لە ڕێ دەرچوونە، کە ئەوانە هەردووکیان لە خۆیاندا کۆکردۆتەوە .

ئنجا ڕەنگە یەکێك بلێ: ئایا ئەو شارە چ شارێك بووە ؟ زۆر لە توێژەرەوان گوتوویانە : (بیت المقدس) بووە ، بەلاّم لە ڕاستییدا هیچ بەلّگەیەکی لەسەر نیە، دیارە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (المائدة)دا لەکاتی تەفسیری حەوت ئایەتەکانی : (٢٠ – ٢٦) دا بە درێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە ، کە ئەمە دەقی ئایەتەکانە :﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُواْ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُواْ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُواْ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُواْ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُواْ فِيهَا ۖ فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِي وَأَخِي ۖ فَٱفْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ ۛ أَرْبَعِينَ سَنَةً ۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە :

وە یاد بکەوە ! کاتێك مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت : ئەی گەلەکەم ! چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە یاد بکەنەوە، کە پێغەمبەرانێکی تێدا ڕەوانە کردوون و گێڕاونی بە پادشا، وە ئەوەی پێیداون ، بە هیچ کام لە جیهانییانی

نەداوە ﴿٢٠﴾ ئەی گەلەکەم! بچنە سەر ئەو زەمینە پاکەوە کە خوا بۆی نووسیون، وە پاشەو پاش مەگەڕێنەوە دوا، کە سەرەنجام زیانبارین ﴿٢١﴾ گوتیان: ئەی مووسا! بەڕاستیی ئەو سەر زەمینە کۆمەڵێکی بە زەبرو زۆری تێدان، وە ئێمە هەرگیز نایچینێ، هەتا ئەوان لێی نەچنە دەر، ئنجا هەرکات لێی چوونە دەر، دەچینە نێوی ﴿٢٢﴾ دوو پیاو لەوانەی لە خوا دەترسن، وە خوا چاکەی لەگەڵ کردبوون، گوتیان: لە ناکاو لێیان وەژوور دەروازەی شارەکەیان بکەون، ئنجا هەرکات کتوپڕ لێیان بچنە ژوور، ئەوە بێگومان ئێوە سەرکەوتوون، وە ئەگەر لە بڕوادارانن، تەنیا پشت بە خوا ببەستن ﴿٢٣﴾ (گەلەکەی) گوتیان: ئەی مووسا! بە دڵنیاییەوە ئێمە هەرگیز ناچینە ئەو شارەوە، تاکو ئەوانی تێدابن، دەجا تۆو پەروەردگارت بچن لە دژیان بجەنگن، ئەوە ئێمەش لێرە دانیشتووین و چاوەڕێین ﴿٢٤﴾ مووسا گوتی: پەروەردگارم! تەنیا خۆم و برایەکەمم بە دەستە، دەجا لەگەڵ کۆمەڵی لاڕێیان و سەرپێچییکاران لە یەکمان جیابکەوە ﴿٢٥﴾ خوا فەرمووی: بێگومان لێیان قەدەغەیە، بۆ ماوەی چل ساڵ دەبێ لە زەویدا سەرگەردان ببن، دەجا تۆش خەفەت لە کۆمەڵی لاڕێیان مەخۆ ﴿٢٦﴾.

شایانی باسیشە کە لە (سفر العدد، الإصحاح: ١٣ و ١٤) لە (إستكشاف أرض كنعان) لە لاپەڕە (٢٩٨ تا ٣٠٤) بە درێژیی باسی ئەو بابەتە کراوەو، لە تەفسیری سووڕەتی (المائدة)دا هێناومانە: کە ئەمە کۆتاییەکەیەتی: (... أَمَّا أَنْتُم فَإِنَّ جُثَثَكُمْ تَتَساقَطُ فِي هَذَا القَفْرِ، وَيَبْقَى بَنُوكُمْ فِي الصَّحْرَاءِ أَرْبَعِينَ سَنَةً تُعَانُونَ مِنْ فُجُورِكُمْ حَتَّى تَبْلَى جُثَثُكُمْ فِيها وَتَحْمِلُونَ أَوْزَارَكُمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً، كُلُّ يَوْمٍ بِسَنَةٍ عَلَى عَدَدِ الأَيَّامِ الأَرْبَعِينَ الَّتِي تَجَسَّسْتُمْ فِيها الأَرْضَ، فَتُدْرِكُونَ عَاقِبَةَ ابْتِعَادِي عَنْكُم، أَنا الرَّبُّ قَدْ تَكَلَّمْتُ وَهَذَا مَا سَاعاقِبُ بِهِ هَذِهِ الجَمَاعَةِ الشِّرِّيرَةَ المتَآمِرَة عَلَيَّ فِي هَذِهِ الصَّحْرَاءِ يَفْنَوْنَ وَيَمُوتُونَ)، واتە: (خوا دەفەرمویّ بەڵام ئێوە جەستەکانتان لەم بیابانە قاقڕو دێمەکارەدا دەکەون، وە کوڕەکانتان چل ساڵ لە بیاباندا دەمێننەوە، کە باجی خراپەکاریی ئێوە دەدەن، هەتاکو ئێوە

هەموو جەستەکانتان لەم بیابانە دەڕزن ، (واتە : دەمرن‌و بە خاك دەسپێردرێن) وە گوناهی چل ساڵ هەڵدەگرن، هەر ساڵەی بە ڕۆژێك ، لە چل ڕۆژەکەی کە ئێوە چوون بۆ پشکنینی ئەو سەرزەمینەی ، کە دەبێ ئێوە تێیدا نیشتەجێ بن ، بۆ ئەوەی سەرەنجامی دوورکەوتنەوەتان لە من ، بۆتان دەربکەوێ ، من پەروەردگارم ، ئەوە قسەی خۆم کرد ، ئەمە ئەو سزایەیە کە ئەو کۆمەڵە خراپەکارە پیلانگێڕە لە دژی منی ، پێ سزا دەدەم، کە لەم بیابانەدا لەبەین دەچن‌و دەمرن .

دیارە ئەو دوو پیاوە کە خوا لەبارەیانەوە ، لە ئایەتی (٢٣)ی سووڕەتی (المائدة)دا فەرموویەتی : ﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، دوو لەو پیاوانەی کە لە خوا دەترسێن، گوتیان : لێیان وەژوور دەروازەکە بکەون ... لە پەیمانی کۆندا ناویان هاتوە ، ئەگەر ڕاست بێ ، بریتین لە : یوشەعی کوڕی نوون ، وە کالیبی کوڕی یوفەننا ، وە گوتراوە : تەنیا ئەو دووانە مانەوەو ، بەڵێنی خوایان بینی ، بەوە کە بچنە سەرزەمینی بەڵێندراو (أرض الميعاد) ، واتە : ئەو سەرزەمینەی کە لەو کاتەدا خوا بەڵێنی پێدابوون بچنە نێوی‌و تێیدا نیشتەجێ بن لەو قۆناغەی ژیانیان دا ، نەك بە هەمیشەیی ، وەك جوولەکە ئیددیعای دەکەن‌و لە تەفسیری سووڕەتی (المائدة)دا بەرپەرچمان داوەتەوە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیستەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان نۆ (٩) ئایەت لە خۆی دەگرێ ، ئایەتەکانی (١٦٣ - ١٧١) ، هەڵبەتە لەم نۆ ئایەتەدا ، کۆتا بەسەرهاتەکانی مووساو هاڕوون (علیهما السلام) ، لەگەڵ گەلەکەیاندا باسکراون ، وە ئەم نۆ ئایەتە ، دوو ڕووداوی دیکەی سەرەکیی لە ژیانی بەنی ئیسڕائیل دا دەگرنە خۆیان ، کە یەکەمیان مەسەلەی شەممە شکاندنی شارێکی جوولەکەنشینی کەنار دەریایە ، کە ژیانیان لەسەر ڕاوی ماسیی بووەو ، سەرەنجام کە ویستوویانە بە فێڵ سنوورەکانی شەرع ببەزێنن ، خوا سزای داون ، بە سزایەکی ناوازەو بێ وێنە ، کە بریتییە لەوەی گێڕاونی بە مەیموون !

بەسەرهاتی دووەمیشیان بریتییە لە ڕووداوی چیا بەسەردا بەرزکرانەوەی بەنی ئیسڕائیل ، تاکو ملکەچی تەوڕات بن !! کە بێگومان ئەو ڕووداوەی دووەم لە ڕۆژگاری مووسادا بووە .

هەروەها خوای بەرزو مەزن ، چەند مەسەلەیەکی دیکەشی لەبارەی بەنی ئیسڕائیلەوە باسکردوون .

﴿ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي
ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَۙ
لَا تَأۡتِيهِمۡۚ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ وَإِذۡ قَالَتۡ أُمَّةٞ مِّنۡهُمۡ لِمَ
تَعِظُونَ قَوۡمًاۙ ٱللَّهُ مُهۡلِكُهُمۡ أَوۡ مُعَذِّبُهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗاۖ قَالُواْ رَبِّكُمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ
﴿١٦٤﴾ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ فَلَمَّا عَتَوۡاْ عَن مَّا نُهُواْ
عَنۡهُ قُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبۡعَثَنَّ عَلَيۡهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ
ٱلۡقِيَٰمَةِ مَن يَسُومُهُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلۡعِقَابِۖ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ
رَّحِيمٞ ﴿١٦٧﴾ وَقَطَّعۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُمَمٗاۖ مِّنۡهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنۡهُمۡ دُونَ
ذَٰلِكَۖ وَبَلَوۡنَٰهُم بِٱلۡحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ
خَلۡفٞ وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَأۡخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا وَإِن يَأۡتِهِمۡ
عَرَضٞ مِّثۡلُهُۥ يَأۡخُذُوهُۚ أَلَمۡ يُؤۡخَذۡ عَلَيۡهِم مِّيثَٰقُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّ
وَدَرَسُواْ مَا فِيهِۗ وَٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَٱلَّذِينَ
يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴿١٧٠﴾ وَإِذۡ نَتَقۡنَا
ٱلۡجَبَلَ فَوۡقَهُمۡ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٞ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعُۢ بِهِمۡ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱذۡكُرُواْ
مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((وە لە بارەی ئەو شارەوە کە لە نیزیك دەریاوە بوو ، پرسیاریان لێ بکە ، کە لە شەممەدا دەستدرێژییان دەکرد ، کاتێك ماسییەکان ڕۆژی (بە گەورەگرتنی) شەممەیان ، بە خۆ دەرخستنەوە دەهاتن ، بەڵام کە لە (بە گەورە گرتنی) شەممەدا نەبوونایە نەدەهاتنە بەردەستیان ، بەو شێوەیە لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە ڕێ دەردەچوون ، تاقیمان دەکردنەوە ﴿١٦٣﴾ وە کاتێك کۆمەڵێك لە خۆیان پێیان گوتن : بۆچی ئامۆژگاریی خەڵکێك دەکەن ، کە یان خوا دەیانفەوتێنێ ، یان بە توندیی سزایان دەدات ؟ گوتیان : بۆ نەهێشتنی گلەیی پەروەردگارتان ، وە بەڵکو (ئەوانەش بگەڕێنەوەو) پارێز بکەن ﴿١٦٤﴾ ئنجا کاتێك ئەوەی بیریان خرابۆوەو پێی ئامۆژگاریی کرابوون ، لە بیریان چووەوەو فەرامۆشیان کرد : ئەوانەی ڕێگرییان لە خراپە دەکرد ، دەربازمان کردن ، وە ئەوانەش کە ستەمیان دەکرد ، بە سزایەکی بە ئێش سزامان دان ، بەهۆی ئەوەوە کە لە ڕێ دەردەچوون ﴿١٦٥﴾ وە دوای ئەوەی سنووری ئەوەیان بەزاند ، کە لێیان قەدەغە کرابوو ، پێمان گوتن : ببنە کۆمەڵە مەیموونێکی زەبوون ﴿١٦٦﴾ وە (یادبکەوە) کاتێك پەروەردگارت بە جەختکردنەوە ڕایگەیاند : کە هەتا ڕۆژی قیامەت ، کەسانێکیان لە ڕاست ڕادێنێ ، کە سزای سەختیان بدات ، بێگومان پەروەردگارت تۆڵەی خێرایە ، وە بە دڵنیاییەوە (خوا) زۆریش لێبوردەی بە بەزەییە ﴿١٦٧﴾ وە کردماننە چەند کۆمەڵێك دابڕ دابڕ لە زەویدا ، هی چاکیشیان لە نێواندا هەنو ، هی خراپییش ، وە بە خۆشییانو بە ناخۆشییان تاقیمان کردنەوە ، بەڵکو بگەڕێنەوە (سەر ڕاستە شەقام) ﴿١٦٨﴾ ئنجا پاشینێکی خراپیان لێ وە پاش کەوت ، کە کتێبیان بە میرات گرتوە (کەچی) هەر تەماعێکی کەم (یان زۆر)ی ئەم ژیانە پەستو گچکەیان لێ هەڵبکەوێ ، جەبی نادەنو دەڵێن: بێگومان لێمان دەبووردرێ (و لەسەری سزا نادرێین) ، وە بەردەوام هەتا تەماعێکیان لێ هەڵبکەوێ ، پڕی دەدەنێ ! ئەدی (لە یادیان چووە) ئایا لە کتێبەکەیاندا پەیمانێکی پتەویان لێوەرنەگیراوە ، ئەوەی تێیدایە

نەیانخوێندۆتەوە ، کە جگە لە هەق بە ناوی خواوە نەڵێن ، وە (ئایا نازانن کە مەنزڵگای دوارۆژ بۆ پارێزکاران (لە ژیانی دنیا) باشترە ؟ ئایا نافامن ! ﴿١٦٩﴾ وە ئەوانەی کە توند دەست بە کتێبەکەیانەوە دەگرنو ، پێیەوە پابەندنو ، نوێژ بەرپا دەکەن (پاداشتیان دەدەینەوە) مسۆگەر ئێمە پاداشتی چاکەکاران زایە ناکەین ﴿١٧٠﴾ وە (یاد بکەوە) کاتێك چیایەکەمان هەڵکەندو ، وەك هەورێك بەسەر سەریانەوە ڕامانگرت ، وە پێیان وابوو کە بەسەریاندا دەکەوێ ، (پێمان فەرموون:) ئەو (کتێبو بەرنامەی)ەی پێمان داون ، بە توندیی‌و جیددیی وەریبگرنو ، ئەوەی تێیدایە تێیبگەن (وە کاری پێبکەن) بەڵکو پارێز بکەن (خۆتان لە سزای خوا بپارێزن) ﴿١٧١﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ٱلْقَرْيَةِ ) : (قَرَيْتُ الماءَ فِي الحَوْضِ : جَمَعْتُهُ فِيهِ ، وَالقَرِيَةُ اسْمُ لِلْمَوْضِعِ الَّذِي يَجْتَمِعُ فِيهِ النَّاسُ وَلِلْنَّاسِ جَمِيعاً ، ويستعمل فِي كُلّ وَاحِد مِنْهُمَا) ، لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێ : (قَرَيْتُ الماءَ فِي الحَوْضِ) ، واتە : ئاوەکەم لە حەوزەکەدا کۆکردۆتەوە ، وە (قَرِيَة) ناوە بۆ ئەو شوێنەی کە خەڵك تێیدا کۆدەبێتەوە ، وە ناوی خودی خەڵکەکەشە ، کە لەو ئاوەدانییەدا کۆبوونەتەوە .

(حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ ) : (أَي قُرْبَهُ) واتە : لە نیزیك دەریا ، وەك گوتراوە : (تِجَارَةٌ حَاضِرَة : أَي نَقْداً) ، واتە : بازرگانییەکی ئامادە ، کە دەست بەدەست وەردەگیرێ ، وە دەگوترێ : (شِرْبِ مُحْتَضَرْ : يَحْضُرُهُ أَصْحَابُهُ) ، واتە: نۆرە ئاوێك کە خاوەنەکانی لێی ئامادە دەبن .

(ٱلسَّبْتِ ) : (أَصْلُ السَّبْتِ قَطْعُ العَمَل) وشەی (سَبت) لە ڕیشەدا ، واتە : نەکردنی کارێك ، یاخود وەستاندنی کار ، (وَسَبَتَ السَّيرَ : قَطَعَهُ) ، (سَيْر) لاسکی نەعلە ، ئەو لاسکەی کە لە نێو پەنجەکاندایە ، کە دەگوترێ : (سَبَتَ) یانی بڕی ، دەگوترێ : (سَبَتَ شَعْرَهُ : قَطَعَهُ) واتە : مووەکەی خۆی بڕی .

(حِيتَانُهُمْ ) : (أَسْمَاكُهُمْ) (حِيتَان) کۆی (حُوت)ە ، واتە : ماسییەکان .

(شُرَّعًا ) : (شُرَّعْ : جَمْعُ شارِعْ ، شَرَعَ الشَّيءَ : أَعْلاهُ وَأَظْهَرَهُ ، أَشْرَعَ نَحْوَهُ الرُّمْحَ : سَدَّدَهُ) ، (شُرَّع) کۆی (شارِع)ە ، (شَرَعَ الشيءَ : أَعْلاهُ وَأَظْهَرَهُ) واتە : بەرزی کردووە دەریخست ، کەواتە : (شارِع) واتە : شتێکی ئاشکراو دیار ، (أَشْرَعَ نَحْوَهُ الرُّمْحَ) واتە : ڕمەکەی بەرەو ئاڕاستە کرد .

(مَعْذِرَةً ) : (العُذْرُ : تَحَرِّي الإِنْسانُ مَا يَمْحُو بِهِ ذنُوبَهُ) ، (عُذر) بریتیە لەوەی کە مرۆڤ لە شتێك خۆی بخەفتێ ، کە گوناهی خۆی پێ بسڕێتەوە ، وە (عَذَرْتُ

مَعْذِرَةً : أطلُبُ مِنْهُ أن يَعْذِرَنِي) واتە : داوای لێ دەکەم کە لێم ببووری ، (وَأَعْذَرَ : أَتَى مَا صارَ بِهِ مَعْذُوراً ، وَقِيلَ أَعْذَرَ مَنْ أَنْذَرَ) ، واتە : شتێکی کرد بۆی ببێتە بەڵگەو پاساو ، وەك گوتراوە : (أَعْذَرَ مَنْ أَنْذَرَ) واتە : هەر کەس بەرانبەرەکەی ئاگادار کردبێتەوەو ترساندبێ ، ئەوە پاساوی بەدەستەوە نەهێشتوە .

(عَتَوْاْ) : (العُتُوّ : النُّبُوّ عَن الطاعَةِ) (عتو) بریتییە لە یاخیی بوون لە فەرمانبەریی .

(قِرَدَةً ) : کۆی (قِرْد)ە ، واتە : مەیموون .

(خَٰسِـِٔينَ ) : (خَسَئْتُ الكَلْبَ فَخَسأَ : زَجَرْتُهُ مُستهيناً بِهِ فَانْزَجَر) ، واتە : چغەم لە سەگەکە کرد ، یاخود دەرم کرد ، ئەویش سڵەمیەوە ، بە سووکیی بانگم کرد ، تێمەوە خوڕیی ، ئەویش چووە دواوە .

(وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ ) : (أَذِنْتُهُ وَأَذَنْتُهُ : أَعْلَمتُهُ تَأذَّنَ : أَعْلَم) ، کەواتە: (تَأذَّنَ رَبّكُم) واتە : کاتێك پەروەردگارتان ڕایگەیاند ، چونکە دەگوترێ : (أَذِنْتُهُ وَأَذَنْتُهُ : أَعْلَمتُهُ) واتە : ئاگادارم کردوە ، وە (تَأذَّنَ) یانی : (أَعْلَم) واتە : ئاگاداری کردوە .

(خَلْفٌ ) : (الخَلْفُ : الرديءُ وَالمتَأَخِّرُ) ، (خَلْف) یانی : شتی بەکەڵك نەهاتوو ، خراپ ، وە شتی دواکەوتوو ، شتێك کە دوا بکەوێ لە چاکەدا .

(عَرَضَ ): (العَرَضُ : مَا لاَ يَكونُ لَهُ ثَبَات) ، (عَرَض) هەر شتێکە کە نەمێنێتەوە.

(مِّيثَٰقُ ٱلْكِتَٰبِ ) : دەگوترێ : (وَثِقْتُ بِهِ أَثِقُ ثِقَةً : سَكَنْتُ إلَيْهِ وَاعْتَمَدْتُ عَلَيْهِ) ، (وَثِقْتُ بِهِ أَثِقُ ثِقَةً) واتە : بە لای ئەودا چووم ، وە پشتم پێی بەست ، متمانەم پێکرد ، (وَأَوثَقْتُهُ : شَدَدْتُهُ) واتە : توندم کرد ، (وَالوِثَاق مَا يُوْثَقُ بِهِ الشَّيءُ) ،

(وِثَاق) هەر شتێك كە شتی پێ قاییم بكرێ ، (المیثَاقُ : عَقْدٌ مُؤَكَّدٌ بِیَمِینٍ وَعَهْدٍ) ، (مِیثَاق) پەیمانێكە كە بە سوێندو بە دەست خستنە نێو دەستی یەكدی ، بەستراپێ و جەختی لەسەر كرابێ .

(وَدَرَسُواْ ) : ئەوەی كە خوێندوویانە ، (دَرَستُ العِلْمَ : تَنَاوَلْتُ أَثَرهُ بالحِفْظِ ، وَإِدَامَةُ القِرَاءَةِ) ، (دَرَستُ العِلْمَ) واتە : شوێنەواری ئەو زانیارییە كە نووسراوەتەوە ، لەبەرم كرد ، بەهۆی ئەوەوە كە زۆرم خوێندەوە ، هاتە دڵو زەینمەوە .

(يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ ) : (إِمْسَاكُ الشَّيءِ : التَعَلُّقُ بِهِ وَحِفْظُهُ)، گرتنی شتێك ، واتە : پێوە پەیوەست بوونو لەبەركردنو پاراستنی ، كەواتە : ﴿يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ ﴾ واتە : توند دەستی پێوە دەگرن .

(نَتَقۡنَا ٱلۡجَبَلَ ) : یانی : (رَفَعْنَاهُ مِنْ مَكانِهِ لِنَرْمِيَ بِهِ) واتە : چیاكەمان هەڵقەند لە ڕیشەوە لە شوێنی خۆی ، بۆ ئەوەی بیهاوێژین ، (نَتَقَ الشيء : جَذَبَهُ ، وَنَزعهُ حَتَّى يَسترخِيَ) واتە : (نَتَقَ الشيء) ڕایكێشا ، وە هەڵیقەند ، لە ڕیشەوە هێنایو لە شوێنی خۆی لابرد .

(ظُلَّةٌ ) : (الظُّلَّةُ : سَحَابَة تُظِلُّ ، جَمْعُها ظُلَل كَغُرْفَةٍ وَغُرَف) ، (ظُلَّة) هەورێكە كە سێبەر بكات ، كۆیەكەی (ظُلَل)ە ، وەك (غرفة) كە كۆیەكەی (غرف)ە ، یانی : ژوورەكان .

(وَاقِعُۢ بِهِمۡ ) : (الوُقُوعُ : ثُبُوتُ الشَّيءِ وَسُقُوطهُ ، وَالوَاقِعَة لا تُقَالُ إلاَّ فِي الشِّدَّةِ وَالمكْرُوهِ) ، (وقوع) بریتییە لەوەی كە شتێك بكەوێ بەسەر شتێكداو بچەسپێ ، وشەی (وَاقِعَة) واتە : بەڵایەك كە دێتە خوار ، ئەویش بەكارناهێنرێ ، تەنیا بۆ حاڵەتی زۆر سەختییو ناخۆشیی نەبێ .

## مانای گشتی ئایەتەکان

وەك پێشتر گوتمان : ئەم نۆ ئایەتە دوو بەسەرهاتی کۆتایی مووساو هارِوونو گەلەکەیان دەگرنە خۆیان ، بەلاَم بە پێی ڕیزبەندیی کاتیی نا ، بەلْکو خوای پەروەردگار لەم سوورِەتەدا ئەو دوو بەسەرهاتەی کردوونە کۆتا بەسەرهاتی مووساو هارِوونی برای سەلامی خوایان لێ بێ ، ئەگەرنا واپێدەچێ کۆتا بەسەرهاتی مووسا ﷺ لەگەلْ گەلەکەی ئەوەبێ ، کە لە سوورِەتی (المائدة)دا حەوت ئایەتی بۆ تەرخان کراون (٢٠ – ٢٦)، کە پێشتر ئایەتەکانمان خوێندنەوە ، لەو ئایەتانەدا خوای بەرز باسی ئەوە دەکات کە مووسا ﷺ بە گەلەکەی خۆی فەرمووە : بچنە شارێکەوەو ، لەوێدا نیشتەجێ بن ، ئەوانیش سەرپێچیی دەکەنو سەرەنجام خوای دادگەر بۆ ماوەی چل سالْ لە بیاباندا بە سەرگەردانیی هێشتنیەوە .

ئا ئەوە دیارە کۆتا بەسەرهاتی مووسا ﷺ بووە لەگەلْ گەلەکەی دا ، چونکە دوای ئەوە مووسا ﷺ لە خوا دەپارِێتەوەو دەلْێ : خوایە ! منو ئەو کۆمەلْە لارِێیە لێك بترازێنە ، کە دیارە هەم هارِوون لەوێ کۆچی دوایی دەکاتو دەمرێ ، وە هەم مووساش ﷺ دیارە دەبێ لەوێ کۆچی دوایی کردبێو مردبێ ، وە لەسەر رِای هەندێك لە توێژەرەوانو زانایان ، بەنی ئیسرائیلیش ئەو جیلەیان دەبرِێتەوەو ، دوایی جیلێکی دیکە دێن کە لە بیابان پێگەیشتوون ، نەك لە خۆشگوزەرانیيو نازو نیعمەتی زەلیلانەی ژێر دەستەلاَتی فیرعەوندا ، کە ئەوانە جەنگو جیهادیان پێناکرێ ، جەنگو جیهاد بە کەسانێك دەکرێ کە بە زبریی ژیابن ، وە لە بیابان دا ژیابن ، وە لەسەر پێی خۆیان وەستابن ، وە ژیانێکی ئازادانەو سەربەستانەیان بووبێ .

خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ ﴾ ، وە لێیان بپرسە دەربارەی ئەو شارەی کە لە نیزیك دەریاوە بوو ، ﴿ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ ﴾ ، کە لە رِۆژی شەممەدا دەستدرێژییان

دەکرد ، سنوورشکێنیان دەکرد ، سەرپێچییان دەکرد ، ﴿إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا﴾ ، کاتێك کە ماسییەکان لە ڕۆژی شەممەدا ـ کە ڕۆژی پشوویان بوو ـ زۆر بە ئاشکرا دەهاتنو خۆیان لە نێو ئاوەکەدا بەرز دەکردەوە ، ﴿وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ﴾ ، وە ئەو ڕۆژانەی کە ڕۆژی پشوویان نەبوو ، ڕۆژانی غەیری شەممە ، نەدەهاتن ﴿كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ ، ئاوا بەو شێوەیە تاقییان دەکەینەوە ، کە ڕۆژی شەممە نابێ ئیشی تێدا بکەن ، ماسییەکان دەهاتنە بەردەستیان ، وە ئەو ڕۆژانەی کە بۆیان هەبوو ، کاربکەن ، کە بریتی بوون لە ڕۆژەکانی یەك شەممە تا ڕۆژی جومعە ، ماسییەکان نەدەهاتن ، خوای کاربەجێ بەو شێوەیە تاقیکردوونەوە ، بۆ ئەوەی لە مەیدان دا حاڵی خۆیان ببینن ، ئایا شەممە دەشکێنن ، یان نا ؟ بەڵام دیارە ئەوانە خۆیان ڕانەگرتوەو ، شەممەیان شکاندوە.

پاشان دەفەرموێ : ﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ﴾، وە کاتێك کۆمەڵێکیان پێیان گوتن ، واتە : بە خەڵکی شارەکەیان گوت ، دیارە کۆمەڵێکی باشیان تێدابوون ، بەوانەیان گوتوە کە ئامۆژگاریی خەڵکەکەیان کردوە : ﴿لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا﴾ ، بۆچی ئامۆژگاریی خەڵکێك دەکەن، کە خوا فەوتێنەریانە ، (بەهۆی سەرپێچییو لادانیان لە شەریعەتی خواوە) یاخود زۆر بە سەختیی سزایان دەدات ، ئەگەر نەشیانفەوتێنێ ، ﴿قَالُوا مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ﴾ ، ئەوانەی کە ئامۆژگاریی خەڵکەکەیان دەکردو فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەیان دەکرد ، گوتیان : بۆ نەهێشتنی گلەیی پەروەردگارتانو هێنانەوەی بەڵگەو پاساوی کە ئێمە بە ئەرکی سەرشانی خۆمان هەڵساوین ، ﴿وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ ، وە بەڵکو ئەوانەش بگەڕێنەوەو پارێز بکەنو ، قسەکەی ئێمە کاریگەریی لەسەریان هەبێ ، واتە : لە دوو حاڵ بەدەر نیە : یان کاریگەریی دەبێ ، یان کاریگەریی نابێ ، ئەگەر

کاریگەریی هەبوو ، خۆیان پاراستو پارێزکارییان کرد ، زۆر باشە ، بەڵام ئەگەر کاریگەریی بۆ ئەوانیش نەبوو ، بۆخۆمان کاریگەریی دەبێ ، کە خوای پەروەردگار گلەییمان لێ نەکات ، چونکە بەڵگەو پاساومان پێ دەبێ ، کە ئێمە بە ئەرکی سەرشانی خۆمان هەڵساوین .

دیارە لەمەوە دەردەکەوێ کە ئەوانە سێ کۆمەڵ بوون : واپێدەچێ زۆربەیان شەممەیان شکاندبێ ، وە هەندێکیان شەممەیان نەشکاندوەو سەرپێچییان نەکردوە ، بەڵام بە ئەرکی ئامۆژگاریی کردنو فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە هەڵنەستاون ، کۆمەڵێکیشیان بە ئەرکی خۆیان هەڵساونو ، ئامۆژگارییان کردوە ، هەڵبەتە ئێمە دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر ، کە سەرەنجامی ئەم سێ کۆمەڵە چی بووەو چۆن بووە ؟

﴿ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ أَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴾ ئنجا کاتێك ئەوەی بیریان خرابۆوەو پێی ئامۆژگاریی کرابوون ـ کە بریتی بوو لە شەریعەتو بەرنامەی خوا ـ لە بیریان چۆوەو ، پشت گوێیان خست ، ئەوانەی ڕێگرییان لە کردەوەی خراپ دەکرد ، کە شەممە شکاندن بوو ، دەربازمان کردن ، بەڵام ئەوانەی کە ستەمیان دەکرد ، بە سزایەکی بەئێش سزامان دانو ، سزایەکی بەئێشمان بەملدا هێنان ، بەهۆی ئەوەوە کە لە ڕێ دەرچوونو لاڕێ بوون .

﴿ فَلَمَّا عَتَوۡاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنۡهُ قُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴾ ، ئنجا کاتێك یاخی بوونو سنووری ئەوەیان بەزاند کە لێیان قەدەغە کرابوو ، پێمان گوتن : ببنە کۆمەڵە مەیموونێکی زەبوون ، یاخود بە زەبوونیی ببنە کۆمەڵە مەیموونێك.

ئنجا دەفەرموێ : ﴿ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبۡعَثَنَّ عَلَيۡهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَن يَسُومُهُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ ﴾ ، وە یاد بکەوە کاتێك پەروەردگارت بە جەختکردنەوە ڕایگەیاند : کە هەتا ڕۆژی دوایی ، کەسانێکیان لە ڕاست ڕادێنێ ، کە سزای سەختیان

پێ بچێژێ ، یانی : وەك چۆن كەسێك ئاژەڵ دەلەوەڕێنێ لە لەوەڕگایەك دا ، خوا كەسێكی ئاوا لە ڕاست بەنی ئیسرائیل ڕادێنێ ، كە سزایان پێ بچێژێ ، ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ﴾ ، بێگومان پەروەردگارت سزاو تۆڵەی توندو خێرایە ، (بۆ كەسانێك كە لاملیی بكەن) ﴿وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ ، وە بە دڵنیاییەوە زۆریش لێبوردەو بە بەزەییە (بۆ كەسانێك كە ملكەچی فەرمانی خوابنو ، بۆ خوا صوڵحاوبن) ﴿وَقَطَّعۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُمَمٗاۖ﴾ ، وە كردماننە چەند كۆمەڵێكی دابڕ دابڕ لە زەویدا .

خوای پەروەردگار ئەمەی لێرەدا وەك سزا باس كردوە ، كە ئەمە جیایە لەوەی پێشی ، كە وەك نیعمەت باسی كردوەو دەفەرموێ : ﴿وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ ١٦٠﴾الأعراف ، چونكە لەوێ دەفەرموێ : كردمانن بە دوازدە تیرەو هۆز ، هەركامێكیان قەوارەی خۆی هەبوو ، ئەوە وەك نیعمەت باسی دەكات ، بەلام لەم ئایەتەدا كە ئێستا خەریكی تەفسیركردنینی ، وەك بەلا باسی دەكات ، دابڕ دابڕ بوون بۆ هۆزو تیرەی جیاواز ، مەرجیش نیە بە شێوازێكی ئیداریی ڕێك و پێك و وەك سیستمی فیدراڵیی بۆ چەند هەرێمێك دابەش بووبن ، ﴿مِّنۡهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنۡهُمۡ دُونَ ذَٰلِكَۖ﴾ ، ئنجا كە بەش بەشیش بوون : هەندێكیان چاكەكار بوون ، وە هەندێكیان لەخوار ئەوانەوە بوون ، واتە : خراپەكار بوون .

﴿وَبَلَوۡنَٰهُم بِٱلۡحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ ، ئنجا بە چاكان و خراپان ، واتە : بە خۆشییان و ناخۆشییان ، تاقیمان كردنەوە ، بەڵكو بگەڕێنەوە : لە بەرانبەر چاكەكاندا شوكرانە بژێریی بكەن و ، لە بەرانبەر خراپەكاندا خۆڕاگریی بكەن ، سەرەنجام بەندایەتیی خۆیان بۆ خوای پەروەردگار بە چاكی ئەنجام بدەن .

ئنجا دوایی دەفەرموێ : ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٞ وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَأۡخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ ﴾ ، ئنجا پاشینەیەکیان لە پاش بەجێما ، پاشەبەرەیەك کە کتێبیان بە میرات گرتوە ، کەچی هەر بەرژەوەندییەك و تەماعێکی ئەم ژیانە کەم بایەخەیان لێ هەڵبکەوێ ، جەبی نادەن و وەریدەگرن و پرِی دەدەنێ ، یانی : جیاوازیی لەنێوان حەڵاڵ و حەرام دا ناکەن ، ئنجا دوایی بۆ پاساودانەوەی ئەو رِەفتارەیان چی دەڵێن ؟ ﴿ وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا ﴾ ، وە دەڵێن : بێگومان لێمان دەبووردرێ ، چاوپۆشییمان لێ دەکرێ ، (لەسەری سزا نادرێین) ، ﴿ وَإِن يَأۡتِهِمۡ عَرَضٞ مِّثۡلُهُۥ يَأۡخُذُوهُۚ أَلَمۡ يُؤۡخَذۡ عَلَيۡهِم مِّيثَٰقُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّ وَدَرَسُواْ مَا فِيهِۗ ﴾ ، وە بەردەوام هەتا تەماعێکیان لێ هەڵبکەوێ ، پرِی دەدەنێ ! ئەدی لە یادیان چووە ، ئایا لە کتێبەکەیاندا پەیمانێکی پتەویان لێوەرنەگیراوە ؟ یاخود پەیمانی کتێبیان لێ وەرنەگیرا ، کە دەبێ کار بەو کتێبە بکەن کە (تەورِاتە) ؟ وە ئایا ئەوەی تێیدایە نەیانخوێندۆتەوەو ، شارەزای نین ، کە نابێ جگە لە هەق بە ناوی خواوە هیچ بڵێن ؟ یانی : رِەفتارەکانیان پێچەوانەی ئەوەن کە لە کتێبدا هاتوە ، ﴿ وَٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾ وە مەنزڵگای دوارِۆژیش چاکترە بۆ ئەوانەی پارێز دەکەن ، ئایا نافامن ! ئایینی خۆیان بە تۆزێك تەماعی دنیا دەدەن ، ئایا نافامن ، فەرق بە حەڵاڵ و حەرام ناکەن ، هەرچی بیگەنێ رِاپێچی دەکەن ، ئایا نافامن ! خۆتان بە خۆزگەو خەیاڵ پلاوان هەڵخەڵەتاندوە ، گوناهان دەکەن و دەڵێن : خوا لێمان خۆش دەبێ ، وەك ئێستاش هەندێك لە مسوڵمانان هەن ، کە زۆر دەردو نەخۆشیی جوولەکەو نەصرانییانیان تووش بوون ، مرۆڤ دەبێ خۆی هەبێ نەك بەتەمای چاکیی باب و باپیران و پێشینانی لێبگەرِێ ، ئەگەر کەسێك بۆخۆی خاڵیبێ ، لەو سیفەتە چاکانەی کە لەوان دا هەبوون ، گوتراوە : (کە خۆت کۆسەی ، رِیشی بابت بە تۆ چی !) ، تۆ دەبێ تۆ خۆت مشووری کردەوەی چاك بخۆی ، ئەگەر بابت کردەوەی باشی بووە ،

پێشینانت کردەوەی باشیان هەبوون ، بەتایبەتی کوڕە مەلاو کوڕە سەیدو کوڕە شێخ ، یان کەسێك کە لە لایەنێکی ئیسلامییە ، یان لەژێر ناوونیشانی سەلەفیی و صۆفیی دایە ، وە بە تەمای ئەو ناوونیشانانە ، لێیگەڕاوە ، زۆرجار کەسێك بەتەمای ئەوە لێ دەگەڕێ کە بابی شێخ بووە ، بابی مەلا بووە ، یان لەژێر فلان ناوونیشانەدایە ، یان لەگەڵ فلان لایەنەیە !! بەڵام لە ڕاستیی دا (کەس بە مەلەی بابی ناپەڕێتەوە) ، بەتایبەتی بۆ هەڵسوکەوتو مامەڵە لەگەڵ خواو بۆ قیامەت ، هەر کەسە بۆخۆی دەبێ کردەوەی باش بکات ، ئنجا بەختەوەرو سەرفراز دەبێت .

﴿ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلْكِتَٰبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴾ ، وە بێگومان ئەوانەی توند دەست بە کتێبەوە دەگرن ، (یانی : تێیدەگەنو کاری پێدەکەن)و نوێژ بەرپا دەکەن ، (ئا ئەوانە بێگومان چاکەکارو چاکسازیی کارن) ، وە ئێمە پادشتی چاکسازو چاکەکاران زایە ناکەین .

ئنجا دێتە سەر دووەم ڕووداوو بەسەرهاتو دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ ، وە یاد بکەوە کاتێك چیاکەمان هەڵقەندو بەسەریانەوە ڕامانگرت ، وەك هەور بوو ، وە پێیان وابوو ، کە بەسەریاندا دەکەوێ ، (پێمان گوتن :) ئەوەی پێمان داون ، بە توندیی بیگرن ، (ئەو تەوراتو شەریعەتەی کە مووسا ﷺ بۆی هێناون ، توند بیگرنو تێبگەنو کاری پێبکەن) وە لێی شارەزابن بەڵکو پارێز بکەن ، (یانی : لە لێپرسینەوەو سزاو جەزرەبەی خوا بپارێزرێن ، لە دنیاو دوارۆژدا .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ لَا تَأۡتِيهِمۡۚ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴾ ئەم بەسەرهاتە لە ئایەتەکانی (٦٥ و ٦٦)ی سووڕەتی (البقرة)دا هاتوە ، وە لە ئایەتی (٤٧)ی سووڕەتی (النساء)دا هاتوە ، وە لە ئایەتی (٦٠)ی سووڕەتی (المائدة)دا هاتوە ، بەلاّم وەك ئاماژەمان پێکرد ، لە سووڕەتی (البقرة)دا خوای پەروەردگار وەك بیرخستنەوە ، ڕووداکاتە جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە هاوچەرخی بوون ، دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعۡتَدَوۡاْ مِنكُمۡ فِي ٱلسَّبۡتِ فَقُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ٦٥ فَجَعَلۡنَٰهَا نَكَٰلٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهَا وَمَا خَلۡفَهَا وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ٦٦ ﴾ ، واتە: وە بێگومان ئێوە زانیوتانە ئەوانەی کە لە ڕۆژی شەممەدا ، دەستدرێژییان کردو سنوورشکێنیان کرد ، پێمان گوتن : بە زەبوونیی ببنە مەیموون ، (یان ببنە مەیموونی زەبوونو پەست) ، وە ئەوەمان کردە سزایەك کە مایەی پەند لێوەرگرتن بێ ، بۆ ئەوانەی کە لە پێشیانەوەن و ئەوانەی لە دوایانەوەن ، (واتە : ئەو خەڵکەی کە لە دەوروبەریانن ، پەندیان لێ وەربگرن) ، وە ئامۆژگارییش بێ بۆ پارێزکاران .

هەندێك لە زانایان گوتوویانە : (لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهَا وَمَا خَلۡفَهَا ) یانی : بۆ ئەوانەی کە لە پێشیانەوەن ، یانی : جارێ نەهاتوون کە بەسەرهاتەکەیان دەخوێننەوە ، پەندی لێ وەردەگرن ، وە بۆ ئەوانەش کە لە پشتیانەوە دێن ، واتە: ئەوانەی کە ڕابردوون ، کە دیارە دەبێ خوای کاربەجێ لە کتێبە پێشووەکاندا باسی کردبێ ، کە کۆمەڵێك دێن خوا بەو شێوە سزایان دەدات ،

لەبەر ئەوەی ئاوا بێ فەرمانیی خوای پەروەردگار دەکەن ، گەلەکەش هەرچەندە ئەو کاتە سزا نەدراون ، بەڵام کاتێك کە دێن ، خوا پێشتر بۆی باس کردوون ، بۆیە پەندی لێوەردەگرن .

وە لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ : ﴿ قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ ﴾ ، واتە : بڵێ : ئایا هەواڵتان پێ بدەم ، سزای کێ لەوە خراپترە لە لای خوا ؟ هی کەسێك کە خوا نەفرینی لێکردوەو لێی توورە بووە ، وە گێڕاونی بە مەیموونو بەراز ، وە ئەوانەی طاغووتیان پەرستوە ، ئا ئەوانە پێگەیان خراپترە ، وە سزایان سەختترە ، وە ئەوانە زیاتر لە ڕاستە شەقام لایانداوە .

هەروەها لە سوورەتی (النساء)یشدا باسی ئەو مەسەلەیەی بە ئاماژە کردوەو دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾ ﴾ ، واتە : ئەی ئەوانەی کتێبتان پێدراوە ! بڕوا بەوە بێنن کە ناردوومانەتە خوار ، کە ئەوەی بە ئێوەشە بەڕاستی دەزانێ ، (ئەوەی لەگەڵتانە کە کتێبی خوایە ، تەوڕاتە ، ئینجیلە ، زەبوورە ، بەڕاستی دەزانێ) ، پێش ئەوەی دەمو چاوانێك بسڕینەوە ، (واتە : ئەندامەکانیان ، لابەرین : چاوو برۆو لووتیان لێ نەهێڵین) ، یان دەمو چاوەکانیان وەرگێڕین ، بۆ پشتەوە (واتە : ڕوویان بسووڕێنین) ، یاخود نەفرینیان لێ بکەین ، وەك چۆن نەفرینمان لە هاوەڵانی شەممە کرد ، وە فەرمانی خوا هەر جێبەجێ دەبێ (واتە: کە خوای دادگەر فەرمانێکی کرد ، هیچ پەرچێك نیە بێتە ڕێو ، ئەو فەرمانە هەر دێتە جێ).

بەڵام دیارە درێژەی ئەم بەسەرهاتە، لە سوورەتی (الأعراف)دا باسکراوە ، کە ئێستا ئێمە خەریکی تەفسیرکردنینی ، ئەویش لەبەرئەوەیە کە سوورەتی (الأعراف) پێشتر دابەزیوە ، بۆیە لە سوورەتەکانی دیکەدا تەنیا ئاماژەی پێدراوە ، تەنیا وەك بیرخستنەوەی چاکەکانی خوا بۆیان ، یان سەرزەنشتکردنیان یان هەڕەشە لێکردنیان‌و ، بۆ درێژەکەی حەواڵەی سوورەتی (الأعراف) کراون .

# پوختەی بەسەرهاتی هاوەڵانی شەممە

# (أصحاب السبت)

خەڵکێکی جوولەکە کە ڕۆژانی شەممان حەڵاڵ نیە کار بکەن ، لە نیزیك دەریایەکەوە بوون‌و ، خوا بۆ تاقیکردنەوەیان (داخۆ شەممە دەشکێنن یان نا ؟) وایکردبوو کە ڕۆژانی شەممە ماسییەکان بە ئاشکرا بێن‌و بچن‌و ، ڕۆژانی دیکەش دیار نەبوون ، ئەوانیش هەڵساون بە شکاندنی حورمەتی ئەو ڕۆژە ، ئنجا ئایا شەممە شکاندنەکە چۆن بووە ؟ زانایان ڕا جیاییان هەیە :

١/ هەندێك دەڵێن : ڕاستەوخۆ ڕاوی ماسییان کردوە .

٢/ وە هەندێك دەڵێن : ڕۆژی شەممە ڕاویان دەکردن ، بەڵام ڕۆژانی دیکە دەیانخواردن .

٣/ هەندێکیش دەڵێن : ڕۆژانی شەممە تۆڕو داوو چاڵیان دادەنا بۆ ماسییەکان ، بۆ ئەوەی پێوە ببن ، وە لە ڕۆژەکانی دیکەدا بەکاوەخۆ دەیانگرتن ، واتە: بە پیلان‌و فێڵێك ئەو کارەیان کردووە ، پێشیان وابووە لە شەرع لایان نەداوە ، ئامانجەکەی خۆشیان پێکاوە !

ئێستاش با لە هەشت خاڵدا باسی ئەو بەسەرهاتە بکەین :

## ١) دەربارەی شارەکە ، کە ئایا کوێ بووە ؟

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ، قَالَ : هِيَ قَرْيَة يُقَالُ لَها (أَيْلَة) ، بَيْنَ مَدْيَن وَالطُّور﴾[١] ، واتە : عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ دەڵێ : ئەو شارە ، شاری ئەیلە بووە ، کە لە نێوان مەدیەنو چیای طوور دایە .

واپێدەچێ عەبدوڵڵاش خوا لێی ڕازی بێ لە خاوەن کتێبەکانی بیستبێ.

## ٢) دەربارەی ئەو خەڵکەی فێڵیان کردوە ، کە ئایا کێ بوون ؟

(إبن كثير) دەڵێ : (وَهَؤلاَءِ قَوْمٌ احتَالُوا عَلَى انْتِهاكِ مَحَارِمِ الله ، بِمَا تعاطوا مِنَ الأَسْبَابِ الظاهِرَةِ الَّتِي مَعْنَاها فِي البَاطِن تعاطي الحَرَام)[٢] ، واتە : ئەوانە کەسانێك بوون فێڵیان کردوە ، بۆ شکاندنی قەدەغەکانی خوا ، کە ڕاستەوخۆ نەچوون قەدەغە بشکێننو ماسیی ڕاو بکەن ، بەڵکو هەندێ هۆکاری ڕواڵەتییان ئامادە کردوون ، کە لە حەقیقەتو لە دیوی پەنهانییدا ، مانای حەڕام شکاندن بووە ، کە وەك گوتم : ڕەنگە تەڵەو تۆڕیان بۆ ماسییەکان دانابێ ، یاخود چاڵیان هەڵکەندبێ ، بۆ ئەوەی ماسییەکان لە ڕۆژی شەممەدا بێنە نێوی ، وە لە ڕۆژەکانی دیکەدا بچن بیانگرن .

لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە : ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَة رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيّ ﷺ ، قَالَ : لا تَرْتَكِبُوا مَا اِرْتَكَبَ الْيَهُودُ ، فَتَستحِلُّوا مَحَارِم اللَّه بِأَدْنَى الْحِيَل﴾[٣] ، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ئەو گوناهە مەکەن کە جوولەکە کردیان ، کە بە هەر فێڵێك قەدەغەکان بشکێنن .

---

١) جامع البيان ، رقم : (١٥١٨٣)، والمصباح المنير ، ص ٥٠٨ .

٢) المصباح المنير ، ص ٥٠٨ .

٣) رَوَاهُ ابْنُ بَطّة فِي (جُزء الخلع وإبطال الحيل) وَإِسْنَادُهُ جيد كَمَا قَالَ الحَافظ ابن كثير فِي تفسيره (ج٢ ، ص ٢٥٧) وَغَيْره.

**٣) ئنجا جێی تێبینی ئەوەیە : ئەم بەسەرهاتە لە تەوراتدا نەهاتوە ، وە لە کۆی پەیمانی کۆنو پەیمانی نوێدا نەهاتوە ، بەلاّم بێگومان زاناکانیان زانیویانەو پەنهانیان کردوە .**

بۆیە خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ لَا تَأۡتِيهِمۡۚ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٣ ﴾ ، دیارە ئەو کاتە زانایەکان بەوە ئاگاداربوونو پێی شارەزا بوون ، بەلاّم دوایی لە کتێبەکەیان دەریان هێناوەو لایانداوەو گۆڕیویانە ، وەك گەلێك شتی دیکە ، وەك خوا دەفەرمویٚ : ﴿ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦ ٤١ ﴾ المائدة ، واتە: وشەکانی خوا دەگۆڕن ، دوای ئەوەی خوا لە شوێنی خۆیدا دایناون .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴾ ، ئاوا بەو شێوەیە تاقیمان کردنەوە ، بەهۆی ئەوەوە کە لە ڕێ دەردەچوون .

هەلّبەتە ئەگەر ئینسان لە تاقیکردنەوەی خوا دەربچێ ، ئەوە بۆی دەبێتە نیعمەتو لێی بەهرەمەند دەبێ ، بەلاّم ئەگەر لێی دەرنەچێ ، بە تەئکید ئەو تاقیکردنەوەیە بۆی وەك سزادانێکە .

**٤) وە دەربارەی شەممە شکاندن ، ئەگەر چی لە تەورات دا نەهاتوە ، بەلاّم لە پەیمانی کۆندا ئەم دەقە هاتوە :**

{ فِي تِلْكَ الأَيَّام رَأَيْتُ فِي يَهُوذَا قَوْمَاً يدوسون مَعَاصِرَ فِي السَّبْتِ وَيَأْتُونَ بِحُزَم وَيُحَمِّلُون حميراً وأيضا يَدْخُلُونَ أُورْشَلِيم فِي يَوْمِ السَّبْتِ بخَمْرٍ وَعِنَبٍ وَتِينٍ وَكُلِّ مَا يُحْمل فأشْهَدت عَلَيْهِم يَوْم بَيْعِهِم الطَّعَام ، وَالصوريِّون السَاكِنُون بِها كَانُوا يأتُونَ بسمكٍ وَكُل بضاعَة وَيَبيعُون فِي السَّبْتِ لِبَنِي يَهُوذَا وَفِي

أورشليم فَخَاصَمْتُ عُظَمَاء يَهُوذَا ، وَقُلْتُ لَهُمْ : مَا هَذَا الأَمْر القَبِيح الَّذِي تَعْمَلُونه وَتُدَنِّسُونَ يَوْمَ السَّبْتِ ؟ ألم يَفْعَلُ أَبَاؤكُم هكَذَا فجلب إِلَهَنَا عَلَيْنَا كُلّ هَذَا الشَرِّ وَعَلَى هَذِهِ المدِينَة وَأَنْتُمْ تزيدُونَ غَضَبَاً عَلَى إِسْرَائِيلَ إِذْ تُدَنِّسُونَ السَّبْتَ}[1]، (نەحمییا) کە بە پێی پەیمانی کۆن ، یەکێك بووە لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل ، دەڵێ : وە لەو ڕۆژانەدا لە یەهوزا (کە شارێك بووە) کۆمەڵێکم بینی کە لە ڕۆژی شەممەدا ترێیان دەشێلا (دەگوشی) ، وە بە باوەش شتیان دەهێنا ، وە لەسەر گوێدرێژەکان باریان دەکردن ، هەروەها دەچوونە شاری ئۆرشەلیم (واتە : قودس) لە ڕۆژی شەممەدا ، شەراب‌و ترێ‌و هەنجیریان دەبرد ، وە هەر شتێکی دیکەی هەڵبگیرێ ، دەیانبرد بۆ ئەو شارە ، بۆ ئەوەی بیفرۆشن لە ڕۆژی شەممەدا ، دەڵێ : منیش لەو ڕۆژەدا کە خواردنیان تێدا دەفرۆشت ، شایەدم لێ‌گرتن ، وە خەڵکی صوور کە لەوێ نیشتەجێن ، دەڵێ ئەوانیش ماسی‌و کەلوپەلی دیکەیان دەهێنا ، کڕین‌و فرۆشتنیان دەکرد ، بۆ هۆزی یەهوزا لە شاری ئۆرشەلیمدا ، منیش لەگەڵ قسە بەدەستانی یەهوزا (کە هەم ناوی شوێنێکە ، هەم ناوی هۆزێکە لە دوازدە هۆزەکەی بەنی ئیسرائیل) شەڕە قسەو موناقەشەم کرد ، گوتم : ئەو کارە خراپە چییە ئێوە دەیکەن ؟ وە ڕۆژی شەممە پیس دەکەن‌و دەیشکێنن‌و ، کاری تێدا دەکەن ، ئەدی باب‌و باپیرانتانیش وایان نەکرد ، سەرەنجام پەرستراومان (واتە : خوای پەرستراومان) ئەو هەموو خراپەیەی بەسەر ئەو شارە داهێنا ، وە ئێوەش دەتانەوێ تووڕەیی خوا زیاد بکەن لەسەر بەنی ئیسرائیل ، بەوەی کە ڕۆژی شەممە پیس دەکەن‌و دەیشکێنن !!.

کەواتە : شەممە شکاندن‌و لەسەری سزادرانی بەنی ئیسرائیل ، شتێکی باو بووە ، بە پێی ئەوە کە لەم قسانەی نەحمییادا دەردەکەوێ .

٥) کە دەفەرموێ : ﴿وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ﴾ ، بە دوو واتا لێکدراوەتەوە :

١/ ناچنە ڕۆژی شەممەوە .

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس ، العهد القديم ، سفر نحميا ، الإصحاح : ١٣، ص ١٠٤٧و ١٠٤٨.

٢/ (لا يُعَظِّمُونَ السَّبْتَ [١] وَيَنْقَطِعُونَ عَنِ العَمَلِ تَعَبُّداً لله) ئەو ڕۆژانەی کە شەممە بە گەورە ناگرن ، وەك چۆن مسوڵمانان لە ڕۆژی جومعەدا دەست لە کارو کەسابەت هەڵدەگرنو ، خۆیان بۆ خواپەرستیی یەکلادەکەنەوە ، بەتایبەت لە کاتی نوێژی جومعەدا .

## ٦) دەربارەی شەممە لە پەیمانی کۆندا ، دەڵێ :

(شَرَائِعُ يَوْمِ السَّبْتِ : وَعَقَدَ مُوسى إجتِمَاعَاً لِكُلّ شَعْب إِسْرَائِيل وَقَالَ لَهُم : هَذِهِ هِيَ الأُمُور الَّتِي أَوْحَى الرَّبّ أَن تعطوها : ستة أَيَّام تَنْصَرِفُون فِيها إلى أَعْمَالِكُمْ ، أَمَّا السابع فَيَكونُ يَوْم رَاحَةٍ مُقَدَّساً لِعِبَادَةِ الرّبّ ، كُلّ مَنْ يَقُومُ فِيهِ بأَي عَمَلٍ يقتل ، لا تُوقِدوا نَاراً فِي بُيُوتِكُمْ فِي يَوْم السَّبْتِ) [٢] ، واتە : بەرنامەکانی ڕۆژی شەممە ، وە مووسا کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ هەموو بەنی ئیسرائیلدا کردو پێی گوتن : ئەمە ئەو کاروبارانەیە کە پەروەردگار ئێوەی ئامۆژگاریی پێکردوە کە فەرمانبەریی بکەن ، کە بریتیە لە شەش ڕۆژ لە حەفتەدا ، هەموو کاروبارەکانی خۆتانیان تێدا ئەنجام دەدەن ، بەڵام ڕۆژی حەوتەم دەبێتە ڕۆژی پشوودانو ڕۆژێکی پیرۆز بۆ پەرستنی پەروەردگار ، وە هەر کەسێك لەو ڕۆژەدا هەر کارێك بکات ، دەبێ بکوژرێ ، وە لەو ڕۆژەدا ئاگر لە ماڵەکانتاندا مەکەنەوە .

## ٧) وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی :

﴿ نَحْنُ الآخِرُونَ السابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا ، ثُمَّ هَذَا يَوْمُهُمُ الَّذِي فُرِضَ عَلَيْهِمْ (الجُمُعَة) فَاخْتَلَفُوا فِيهِ ، فَهَدَانَا اللَّهُ لَهُ ، وَالنَّاسُ لَنَا فِيهِ تَبَعٌ الْيَهُودُ غَداً ، وَالنَّصارَى بَعْدَ غَدٍ ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٧٣٠٨) ، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٨٣٦) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٨٥٥) ، وَالنَّسائِيُّ برقم : (١٣٦٧) ، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم : (١٧٢٠)} ، واتە : ئێمە دواهەمینی پێشکەوتووەکانین ، لە ڕۆژی دوایی دا ، هەرچەندە ئەوان لە پێش ئێمەدا کتێبیان پێدراوە ، بەڵام لە

---

١) وشەی (السبت) کە بە مانای شەممەیە بە (أسبت و سبوت و أسباتٍ) کۆ دەکرێتەوە .

٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس ، العهد القديم ، سفر الخروج ، الإصحاح : ٣٥ ، ص٢٠١.

قیامەتدا ، ئێمە پێشیان دەکەوینەوە ، دوایی فەرمووی : ئەمەش ئەو ڕۆژە بووە کە لەسەریان پێویست کرا (واتە : ڕۆژی جومعە) کەچی تێیدا کەوتنە ڕاجیایی ، بەڵام خوای پەروەردگار ئێمە ڕێنمایی کرد بۆ هەڵبژاردنی ڕۆژی جومعە (کە لە حەفتەدا پشووی تێدا بدەین) بۆیە خەڵکەکەی دیکە بە دوای ئێمەدا دێن ، جوولەکە بەیانی (کە شەممەیەو ، دوای جومعەیە) وە نەصارانییەکانیش دوای بەیانی ، (کە ڕۆژی یەك شەممە) .

دیارە وەك چۆن مسولمانان ڕۆژی جومعەیان کردوە بە ڕۆژی پشوودانو خۆ یەکلاکردنەوە بۆ خواپەرستیی زیاتر ، جوولەکە شەممەیان کردوە ، وە نەصرانییەکانیش یەك شەممیان کردوە ، کە بێگومان جومعە دەکەوێتە پێش شەممەو ، پێش یەك شەممەش .

**٨) (القرطبي) دەربارەی بەسەرهاتی ئەو شارە کە شەممەیان شکاندوەو ، ماسییان گرتوەو فێڵیان کردوە ، دەڵێ :**

(رُوِيَ فِي قَصَصِ هَذِهِ الآيَةِ أَنَّهَا كَانَتْ فِي زَمَنِ دَاوُد)[1] ، واتە: ئەم بەسەرهاتانەی لەبارەی ئەو ئایەتانەوە گێڕدراونەوە ، دەڵێن : ئەم بەسەرهاتە لە سەردەمی پێغەمبەر داوود دا بووە سەلامی خوای لێ بێ .

**مەسەلەی دووەم :** ﴿ وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾ ، وە کاتێك کۆمەڵێك لە خۆیان پێیان گوتن: بۆچی ئامۆژگاریی خەڵکێك دەکەن کە : یان خوا دەیانفەوتێنێ ، یان بە توندیی سزایان دەدات ؟ ئەوانیش گوتیان : بۆ نەهێشتنی گلەیی پەروەردگارتان ، وە بەڵکو (ئەوانەش بگەڕێنەوەو) پارێز بکەن .

کە دەفەرمویّ: ﴿ وَإِذْ ﴾ ، دەڵێ : {عَطْفٌ عَلَى (وَاسْأَلْهُمْ) ، أَي : وَاسْأَلْهُم إِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِنْهُم) ، واتە : وە پرسیاریان لێ بکە : کاتێك کە کۆمەڵێکیان لە

١) الجامع لأحكام القرآن ، ج ٧ ، ص ٢٤٦.

خەڵكی شارەكە بەوانەیان گوت كە ئامۆژگاریی شەممە شكێنەكانیان دەكرد ، بۆچی ئامۆژگاریی كەسانێك دەكەن ، كە خوا یەكێك لە دوو شتەكانیان لەگەڵ دەكات : یان لە بەینیان دەبات ، یان زۆر بە خراپیی‌و بە سەختیی سزایان دەدات ؟

یەكێك بۆی هەیە بڵێ : ئنجا ئایا ئەوانە چۆنیان زانیوە ، كە خوا یان دەیانفەوتێنێ ، یان سزایەكی توندیان دەدات ؟

دەڵێین : بە پێی شارەزاییان لە یاساكانی خوای دادگەرو كاربەجێ لە ژیانی مرۆڤدا ، وە (القرطبي) دەڵێ : (عَلَى غَلَبَةِ الظَّنِّ ، وَمَا عُهِدَ مِنْ فِعْلِ اللهِ تَعَالَى حِيْنَئِذٍ بِالأُمَمِ العَاصِيَةِ)[١] ، واتە : وەك گومانێكی زاڵ ، وە بەوەی كە زانراوە لە كاری خوای بەرز ، لەوكاتەدا زانراوە كە چۆن مامەڵەی كردوە لەگەڵ ئۆممەتان پێشی دا كە سەرپێچییان كردوە ، لەوەوە زانیویانە كە ئەوانە بەبێ سزا دەرباز نابن .

ئنجا ئەوانیش چۆن وەڵام دەدەنەوە ؟ ﴿ قَالُواْ مَعۡذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴾ ، واتە : ئەوانەی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەیان كردوە ، دوو پاساوان دێننەوە :

یەكەم : گوتوویانە : ئەمە وەك پاساوێك بۆ لای پەروەردگارتان ، وە خوێنراویشەتەوە : (مَعْذِرَةٌ).

دووەم : بەڵكو پارێز بكەن .

(مَعْذِرَة) لە چییەوە هاتوە ؟ (المعْذِرَة : مَصْدَر ميمي لِفعْل (اعتَذَرَ) عَلَى غَيْرِ قِيَاس ، وَمَعْنَى اعْتَذَرَ : أَظْهَرَ العُذْر ، وَالعُذرُ : السَّبَبُ الَّذِي تَبْطُلُ بِهِ المؤَاخَذَةِ بذَنْب أَوْ تَقْصِير ، فَهُوَ بمَنْزِلَة الحُجّةِ الّتِي يُبْدِيها المؤاخَذ بذَنب ، ليظهر أَنَّهُ بَرِيء مِمَّا نسِبَ إِلَيْهِ ، أَوْ متأَوِّلٌ فِيهِ ، وَيُقَالُ: عَذَرَهُ إذَا قبِلَ عُذْرَهُ وَتَحَقَّقَ بَرَاءَتَهُ ، وَيُعَدّى فِعْل الإعْتذَار بإِلى لما فِيهِ مِنْ مَعْنَى الإنهاء والإِبْلاَغِ)[٢] ،

١) الجامع لأحكام القرآن ، ج ٧ ، ص ٢٤٧.
٢) التحرير والتنوير ، ج ٩ ، ص ١٥٢.

واتە : (المعْذِرَة) چاوگێکی میمییە لە (فعل)ی (اعتَذَرَ) دروست کراوە ، بەلام بە شێوەی قیاس نیە ، وە مانای (اعتَذَرَ) یانی : پاساوی خۆی ئاشکرا کرد ، پاساویش ئەو هۆکارەیە کە بەهۆیەوە ئینسان تووشی سزا نابێ ، بەهۆی گوناهێکەوە ، یان بەهۆی کەموکورییەکەوە ، کەواتە : (عُذْر) وەك بەڵگەیەك وایە کەسێك کە بەهۆی تاوانێکەوە دەگیرێ ، تاکو ئاشکرای بکات کە بەرییە لەوەی کە پاڵدراوەتە لای ، یاخود تەئویلی کردوەو ، نەیزانیوە کە هەڵەیە ، یان تێیدا بەهەڵەدا چووە ، وە ئەگەر بەرانبەر پاساوەکەی قبووڵ کرد دەگوترێ : (عَذَرَهُ) وە وشەی (اعْتَذَرَ) بە پیتی (إِلی) تەعەددا دەکات بۆ (مفعول) چونکە مانای (إِنهاء وإِبْلاَغ) دەگەیەنێ ، گەیاندنە مەبەستو کۆتایی پێ هێنان .

کەواتە : ئەوانەی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەیان کردوە ، دوو پاساویان هێناوەتەوە :

یەکەم : گوتوویانە : ئەمە وەك پاساوێك بۆ پەروەردگارتان ، کە ئێمە بێ هەڵوێست نەبووین لە بەرانبەر ئەوانەدا کە ئەو گوناهەیان دەکرد .

دووەم : بۆ ئەوەی پارێز بکەن .

یانی : ئەگەر ئەوانیش واز لە خراپەو تاوان نەهێنن ، بەلای کەمەوە ئێمە گلەیی خوای پەروەردگار لەسەر خۆمان لادەبەین ، وە ئومێدیش هەیە ئەوانیش پارێز بکەن .

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ أَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴾ ، ئنجا کاتێك لەبیریان چوو ، (واتە : پشتگوێیان خست) ئەوەی کە پێی ئامۆژگاریی کرابوون ، یان : ئەوەی کە بۆیان نێررا بوو ، وەك ئامۆژگاریی ، ئەوانەی شەممە شکێنەکانیان قەدەغە دەکرد لە خراپە ، دەربازمان کردن ، بەلام ﴿ وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴾ ، ئەوانەی

ستەمیان کرد ، بە سزایەکی بەئێش گرتمانن ، وە سزامان دان ، بەهۆی ئەوەوە کە لاڕێ دەبوونو لە ڕێ دەردەچوون .

کە دەفەرموێ : ﴿ فَلَمَّا نَسُواْ ﴾ ، ئەوە نەبووە لەبیریان بچێتەوە ، بەڵکو دەڵێ : (أَي تَرَكوا ، النِّسيَان : التَّرْك) ، واتە: پشتگوێیان خست ، چونکە (نسيَان) وەك چۆن بە مانای لەبیرچوونەوە دێ ، بە مانای وازلێهێنانیش دێ .

کە دەفەرموێ : ﴿ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ ﴾ ، ئەوەی کە بیریان خرابۆوە ، پێی ئامۆژگاریی کرابوون ، دەڵێ : (أَذْكَرَهُ وذكَّرَهُ) واتە : بیری خستەوە ، ئنجا (أُذْكِروا وَذُكِّروا) واتە : بیریان خرایەوەو ئامۆژگاریی کران ، دەڵێ : (جُعِلُوا عَلَى ذِكْرٍ مِنَ الشيءِ) وایان لێکرد کە ئەو شتەیان لەبیر بێ .

کە دەفەرموێ : ﴿ أَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴾ ، بۆمان دەردەکەوێ کە خەڵکی ئەو شارە بوونەتە سێ بەش :

یەکەمیان : (عَصَتْ وَصادَتْ) ، ئەوانە سەرپێچییان کردووەو ڕاوی ماسیشیان کردوە لە شەممەدا ، واپێدەچێ ئەوانە زۆرینە بووبن .

دووەمیان : (نَهَتْ وَاعْتَزَلَتْ) ئەوانە ڕێگرییان لە خراپەکاران کردوە ، وە کەنارگیریش بوون لێیان ، واتە : نەك هەر بەشداریی شەممە شکاندنیان نەکردوە ، بەڵکو نیزیکیشیان نەکەوتوونەوەو ڕێگرییشیان لێیان کردوە .

سێیەمیان : (اعْتَزَلَتْ وَلَمْ تَعْصِ وَلَمْ تَنْهَ) ئەوانە کەنارگیر بوون ، شەممەیان نەشکاندوە ، بەڵام هەڵوێستیشیان لە بەرانبەر گوناهکارەکاندا نەبووە ، وەك کۆمەڵی دووەم .

ئنجا ئەوەی کە ئاشکرایە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ ﴾ ، ئەوانەی خەڵکیان قەدەغە دەکرد لە خراپە ، دەربازمان کردن .

پاشان دەربارەی کۆمەڵی دووەم دەفەرموێ : ﴿ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴾ ، ئەوانەی کە ستەمیان کرد ، بە سزایەکی بە ئێش گرتمانن ، بەهۆی ئەوەوە کە لە ڕێ دەرەچوون ، دیارە ئەوانەی کە شەممەیان شکاندوە ، سزا دراون .

بەڵام زانایان ڕاجیاییان هەیە دەربارەی دەستەو کۆمەڵی سێیەم ، کە ئەوانە : نە شەممەیان شکاندوە ، نە ڕێگرییشیان کردوە لە شەممە شکێنەکان ، دەبێ ئەوانە سەرەنجامیان چۆن بووبێ ؟

هەڵبەتە هەندێك لە زانایان گوتوویانە : ئەوانە دەرباز بوون ، هەندێکی دی گوتوویانە : ئەوانە لەگەڵ شەممە شکێنو گوناهبارەکان دا سزادراون ، چونکە بێ هەڵوێست بوون .

منیش ئەوەی بۆم دەرکەوتوە ئەوەیە : کە ئەم دەستەو کۆمەڵی سێیەمە ، نە لە ڕیزی ڕزگاربووانن ، چونکە هەڵوێستیان نەبووە لە بەرانبەر ئەو خراپەکارییەدا کە کراوە ، وە نە لە ڕیزی ستەمکارەکانیشن ، چونکە ئەوان شەممەیان نەشکاندوە ، کەواتە : خوای پەروەردگار باسی ئەوانی پشتگوێ خستوەو ئیهمالی کردوون ، وەك چۆن ئەوانیش ئیهمالییان کردوە لە فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەدا ، بەڵام زیاتر وا لە بەزەیی‌و ڕەحمەتی خوا چاوەڕوان دەکرێ ، کە ئەوانەش خوا پەروەردگار سزای نەدابن ، هەرچەندە جورئەت‌و بوێریی ئەوەشیان نەبووبێ ، فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە بکەن .

**مەسەلەی چوارەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴾ ، واتە : دوای ئەوەی کە سنووریان بەزاندو یاخیی بوون ، لەوەی کە لێیان قەدەغە کرابوو ، پێمان گوتن : ببنە کۆمەڵە مەیموونێکی ڕیسواو زەبوون .

دیارە وەك پێشتریش گوتمان : ئەوەی سووڕەتی (المائدة)ش ، مەبەست هەر پێی ئەوەیە کە لێرەدا هاتوە ، کە خوا دەفەرموێ : ﴿ قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ ۚ أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَاءِ السَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ ﴾ ، واتە : بلێ : ئایا هەواڵتان پێبدەم بە کەسێك کە سزای لەوە خراپتری لە لای خوا هەیە ؟ کەسێك کە خوا نەفرینی لێکردوەو ، لێی تووڕە بووەو ، هەندێکیانی گێڕاوە بە مەیموون و بەرازو ، طاغووتیان پەرستوە ، ئا ئەوانە حاڵیان خراپترەو لە ڕێی ڕاست گومڕاترن .

بەلام لە (الأعراف)دا هەر باسی بە مەیموون کرانیان ، کراوە ، بەلام لە (المائدة)دا فەرموویەتی : هەندێکیان گێڕدراون بە مەیموون ، وە هەندێکیان گێڕدراون بە بەراز .

لەوبارەوە (الطبري) ئەم شوێنەوارەی گێڕاوەتەوە : ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا فجعل الله مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ ، فَزَعَمَ أَن شَبَابَ الْقَوْمِ صَارُوا قِرَدَةً وَالمشِيخَةَ صارُوا خَنَازِيرَ)[1] ، واتە : عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ ، دەڵێ : خوا گێڕانی بە مەیموون و بەراز ، ئەنجا ئەو پێی وابووە کە گەنجەکانیان بوونەتە مەیموون ، وە بەتەمەنەکانیشیان بوونەتە بەراز .

منیش دەڵێم : چونکە گەنجەکان لاساییکەرەوە بوون ، وە مەیموونیش زیاتر سیفەتی لاساییکەرەوەی هەیە ، وە پیرەکانیش ئارەزووبازو بەرژەوەندیی پەرست بوون ، دیارە ئەوەش سیفەتێکی زەقی بەرازە .

وە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە : ئەوانە بە شێوەو ڕواڵەت نەبوونە مەیموون و بەراز ، بەڵکو ڕەفتارو ڕەوشتو هەڵسووکەوتیان ، وەك هەر ئەو دوو جۆرە ئاژەڵەی لێ هاتوە ، واتە : مەسخی مەعنەویی بوون ، نەك مەسخی شێوەو ڕواڵەت !

---

١) جامع البيان برقم : (١٥٢١٧).

بەلاّم من ئەو ڕایەم پێ بێهێزە ، چونکە مادام خوای زانا بە ڕوون و ڕاشکاویی دەفەرموێ : ﴿ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴾ ، واتە: پێمان گوتن : ببنە کۆمەڵە مەیموونێکی ڕیسواو زەبوون ، پێم وانیە هیچ پێویست بکات تەئویلی بکەین .

خاوەنی (مختار الصحاح)[1] دەربارەی وشەی (عَتَوا) دەڵێ : (العَاتِي : المجَاوِزُ لِلْحَدّ فِي الإِستكْبَارِ، والعَاتِي : الجَبَّار) ، (عَاتِي) واتە : کەسێك کە سنوور دەبەزێنێ لە خۆ بە زلگریی دا ، وە (عَاتِي) بە کەسێکی زۆر خۆ بە زلگرو خۆسەپێن دەگوترێ .

**مەسەلەی پێنجەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ، وە یاد بکەوە کاتێك پەروەردگارت بە جەختکردنەوە ڕایگەیاند : کە هەتا ڕۆژی دوایی ، کەسانێکیان بۆ دەرەخسێنێ کە سزای سەختیان پێ بچێژێ ، بێگومان پەروەردگارت سزاو تۆڵەی توندو خێرایە (بۆ کەسانێك کە لاملیی بکەن) ، وە بە دڵنیاییەوە زۆریش لێبوردەو بە بەزەییە .

### سێ جاران جوولەکە سزا دراون لە پێش ئیسلامدا[2]:

١/ لە ساڵی (٧٢١) پێش زایین کە (شلمناصر) پاشای بابل چوو دەوری گرتن و کردنیە دیل ، دوایی گواستنیەوە بۆ چیای (أنشور) وە سەرزەمینی بابل .

٢/ لە ساڵی (٥٧٨) پێش زایین دا ، (بُخْتَنصر) پاشای بابل دیسان گواستنیەوە لە ئۆرشەلیمەوە بۆ عێراق و هەندێ شوێنی دی ، کە لە ژێر دەستەڵاتی (بُخْتَنصر)دا بوون .

---

١) ص ٣٦٣.

٢) التحرير والتنوير ، ج ٩ ، ص ١٥٧.

٣/ لە ساڵی (٥٣٠) پێش زایین دا ، کە گەڕانەوە بۆ فەڵەستین و (بیت المقدس)یان دروست کردەوە ، بەڵام (طیطوس)ی ڕۆمانیی کە دیارە پادشای ڕۆمەکان بوو ، جارێکی دیکە دەریکردن و (بیت المقدس)یشی تێکدا ، ئەویش لە سەرەتای سەدەی دووەمی زایینی دابوو .

ئنجا دیارە مادام خوا دەفەرموێ : ﴿ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ﴾ ، کەواتە : ئەو سزایە بەردەوام دەبێ ، وە کە ئێستا دەبینین لەم ساڵانەدا جرت و فرت دەکەن ، وە دەستەڵاتێکی وەهمییان هەیە ، هەرچەندە دەستەڵاتێکی خودییش نیە ، بەڵکو بەهۆی هاوکاریی زلهێزەکانی وەك ئەمریکاو ڕووسیاو هەندێ لە وڵاتانی ئەورووپیی یەوەیە ، بەتایبەت بەریتانیا ، نابێ ئەوە ئیشکالمان بۆ دروست بکات ، چونکە ئەوە شتێکی کاتییە ، لەچاو ئەو هەموو تەمەنە درێژە ، کە لەو پەنجا ، شەست ساڵەدا قەوارەیەکیان پێکهێناوە ، ئەویش لە حاڵەتێکی زۆر ناخۆش دان ، وە شەڕو شۆڕی زۆریان کردووە هەمیشە دەستیان لەسەر دڵیانە ، کە ئەوەش لە ڕاستییدا ، جۆرێکە لە سزای خوای دادگەر لەسەریان .

ئنجا دەشگونجێ بڵێین : مادام دوایی خوا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلْعِقَابِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ، کەواتە : ئەو سزایە بۆ خراپەکارەکانیانە ، نەك بۆ هەمووان ، یانی : ئەگەر ئەوان خۆیان بگۆڕن و چاك بن ، خوای دادگەر ئەو یاسایەی خۆی دەگۆڕێ بۆیان .

**مەسەلەی شەشەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَقَطَّعْنَـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أُمَمًا ۖ مِّنْهُمُ ٱلصَّـٰلِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَبَلَوْنَـٰهُم بِٱلْحَسَنَـٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ ، وە بەش بەشمان کردن لە زەویدا بۆ چەند کۆمەڵێك ، چاکەکاریشیان لەنێودا هەن ، وە جیا لەوەشیان لەنێودا هەن ، (واتە : خراپەکارانیش) وە تاقیمان کردنەوە بە خۆشیی و ناخۆشیی ، وە بە چاکان و بە خراپان بەڵکو بگەڕێنەوە .

وەك پێشتر باسمان کرد ، ئەم دابڕ دابڕانەی کە لێرەدا باسکراوە ، ئەمە سزایە ، بە پێچەوانەی ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشوودا بوو ، کە خوا ﷻ فەرمووی : ﴿وَقَطَّعْنَٰهُمُ ٱثْنَتَىْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا ۝١٦٠﴾ الأعراف ، هی ئەوێ بۆ چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروباریان بوو ، کە ئەوە یەکێك بوو لە میکانیزمەکانی کاروبا بەڕێوەبردنیان ، وە یەکێك بوو لە نیعمەتەکانی خوا لەسەریان ، بەڵام ئەوەی ئێرە وەك سزایە.

هەڵبەتە ئێستاشی لەگەڵدا بێ ، ئەوەی خوا فەرموویەتی ، بەردەوامە لەنێو واقیعی جوولەکەکاندا ، چونکە جوولەکە تاکو ئێستاش هەر پارچە پارچەن ، وە تەنیا چەند ملیۆنێکیان نەبێ کە قەوارەیەکی زایۆنییان پێکهێناوە لەسەر زەمینی داگیرکراویی فەڵەستین دا ، ئەگەرنا زۆربەیان لە وڵاتانی دنیادا پەرتەوازە بوونو دابڕ دابڕن .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿وَبَلَوْنَٰهُم بِٱلْحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ ، وشەی (حَسَنَات) و (سَيِّئات) بە پێی سیاقێك کە تێیدا دێن ، ماناکەیان دەگۆڕێ ، کە لێرەدا بە مانای : بە خۆشییانو بە ناخۆشییان ، بە نیعمەتو بە نیقمەت ، بە چاکانو بە خراپان ، بە هاتو بە نەهات ، تاقییمان کردنەوە ، بەڵکو بگەڕێنەوە .

سُبْحَانَ اللهُ! خوای بە بەزەیی لەگەڵ ئەو هەموو خراپانەشیاندا ، هەر پێی خۆش بووە بگەڕێنەوە .

**مەسەلەی حەوتەم** : کە دەفەرموێ : ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُۥ يَأْخُذُوهُ ۚ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَٰقُ ٱلْكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ وَدَرَسُوا۟ مَا فِيهِ ۗ وَٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ .

كە دەفەرموێ : ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ ﴾ ، واتە: كەسانێكی خراپیان لە شوێن دانیشتن ، دەڵێ : (الخَلْفُ : بسكونِ اللامِ مَنْ يَخْلُفُ غَيْرَهُ فِي الشرِّ ، وبفَتْحِ اللاَّمِ ، خَلَف : فِي الخَيْرِ) ، (خَلْف) واتە : پاشینەیەكی خراپ ، بەڵام (خَلَف) واتە : پاشینێكی باش ، ئەوەی كە لە شوێنی یەكێكی دیكە دادەنیشێ ، چاكەكاریی دەكات .

كە دەفەرموێ: ﴿ وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾ ، واتە : كتێبیان هاتە دەست ، لە پێشووەكانەوە وەریانگرت ، مەبەست لە كتێب تەوراتە ، یان مەبەست هەموو كتێبەكانی خوای پەروەردگارە ، كە ناردوونی بە پێغەمبەران ، یان مەبەست پێی ، وەحی خوای پەروەردگارە بەگشتی .

كە دەفەرموێ : ﴿يَأۡخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا وَإِن يَأۡتِهِمۡ عَرَضٞ مِّثۡلُهُۥ يَأۡخُذُوهُ ﴾ ، دەربارەی وشەی (عَرَض ) یانی : (الأَمْرُ الَّذِي يَزُولُ وَلاَ يَدُوم ، وَيُرادُ بِهِ المال ، وَيُرادُ بِهِ أَيْضا ما يُعْرضُ للإِنْسانِ مِنَ الشَّهَوَاتِ وَالمنَافِع) ، (عَرَض) شتێكە دێو دەچێو بەردەوام نابێ ، وە مەبەست پێی ماڵو سامانە ، وە دەشگونجێ ئەو ئارەزووو بەرژەوەندییە كاتییانە بن ، كە بۆ مرۆڤ دێنە پێش ، واتە : ئەوانە هەر بەرژەوەندییەكیان بێتە پێش ، هەر ئارەزوویەك ، جەبی نادەن ، وە وشەی ﴿ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ ﴾ ، واتە : ژیانی كەموكورتی دنیا ، ئنجا كە واش دەكەن ، چی دەڵێن ؟ ﴿ وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا وَإِن يَأۡتِهِمۡ عَرَضٞ مِّثۡلُهُۥ يَأۡخُذُوهُ ﴾ دەڵێن : لێمان دەبووردرێ ، وەك بڵێی مافی ڤیتۆیان هەبێ ، هەڵبەتە ئەمە عەقیدەیەكی پووچی جوولەكەكانە ، كە پێیان وایە هەرچەند گوناهان بكەن ، هەر دەبووردرێن .

وەك لە سوورەتی (البقرة)دا خوا لێیان دەگێڕێتەوە ، دەفەرموێ : ﴿ وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَةٗ ﴿٨٠﴾ ﴾ ، گوتیان : ئاگرمان تووش نابێ ، مەگەر چەند ڕۆژێكی كەمی ژمێردراو .

وە لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ : ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۖ وَغَرَّهُمْ فِى دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ ، واتە : ئەمەش لە سۆنگەی ئەوەوە کە گوتیان : چەند ڕۆژێکی کەم نەبێ ، ئاگرمان تووش نابێ ، وە ئەوەی کە هەڵیان دەبەست ، گومڕای کردنو فریوی دانو لە خشتەی بردن .

هەمیشە شت هەڵبەستن لە ئاییندا ، دەبێتە هۆی فریودانو هەڵخەڵەتاندنی خەڵك ، ئەوە تایبەت نیە بە جوولەکەکانەوە ، مسوڵمانانیش ئەگەر لە ئایینەکەیان دا هەندێ شت هەڵبەستن ، کە پەیوەندیی پێیەوە نەبێ ، دەبێتە هۆی کڵاو لەسەرنانیان ، لە دواڕۆژدا بۆیان دەردەکەوێ ، کە ئەوانە بەدوای کڵاوی خوارو خەیاڵ پڵاو کەوتوون[(١)] .

دوایی دەفەرموێ : ﴿ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَٰقُ ٱلْكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ وَدَرَسُوا۟ مَا فِيهِ ۗ وَٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾، ئایا پەیمانی کتێبیان لێ وەرنەگیرابوو ، کە جگە لە هەق ، بە ناوی خواوە نەڵێن ، وە دەشیانزانیو شارەزای کتێبەکەشیان بوون ؟ ئەدی مادام وایە بۆچی ئەو درۆیانەیان بە ناوی ئایینی خواوە دەکردن ، کە دەیانگوت : هەرچەند گوناهان بکەین ، دوایی چاوپۆشییمان لێ دەکرێ ؟

لە کۆتایی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ : ﴿ وَٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ ، وە مەنزڵگای دواڕۆژ باشترە بۆ ئەوانەی پارێز دەکەن ، ئایا بۆچی نافامن ؟ واتە : نەدەبوو بۆ تەماعێکی دنیایی کەم ، خۆیان شەرمەزاری خواو خەڵك بکەن ، وە خۆیان عەیبداریی دنیاو دواڕۆژ بکەن .

---

١) شیعەی دوازدە ئیمامی لەوبارەوە بیروبۆچوونی ئەفسانەییو بێ بنەمایان زۆرن ، بەتایبەت لە بواری چاوەڕێ کردنیان لە ئیمامەکانیان بۆ شەفاعەت .

**مەسەلەی هەشتەم :** کە دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴾ ، وە ئەوانەی باش دەست بە کتێبی خواوە دەگرن ، وە نوێژ بەرپا دەکەن ، بێگومان ئێمە پاداشتی چاکەکاران‌و چاکسازیی کاران زایە ناکەین ، کەواتە : دەبووایە وابن ، دەبووایە دەست بە کتێبی خواوە بگرن ، ئنجا تەوراتە ، زەبووره ، وە هەموو کتێبەکانی دیکەش ، پاشان نوێژ بەرپا بکەن ، کە دیارە پابەند بوون‌و دەست گرتن بە کتێبی خوا ، وە نوێژ بەرپا کردن‌و پەیوەندیی توندو تۆڵ‌و گەرم‌و گوڕی بەندە لەگەڵ خوادا ، بناغەی چاکیی‌و چاکسازییە .

**مەسەلەی نۆیەم‌و کۆتایی :** خوای پەروەردگار دێتە سەر بەسەرهاتی دووەم ، دەربارەی بەنی ئیسرائیل ، دەفەرموێ : ﴿ وَإِذۡ نَتَقۡنَا ٱلۡجَبَلَ فَوۡقَهُمۡ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعُۢ بِهِمۡ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾ ، وە یاد بکەوە ! کاتێك چیاکەمان هەڵقەندو بەسەریانەوە ڕامانگرت ، وەك هەور بەسەریانەوە ، گومانیان وابوو کە بەسەریاندا دەکەوێ ، (پێمان گوتن :) ئەوەی پێمان داون ، بە توندیی بیگرن ، وە بزانن چی تێدا هەیە ، بەڵکو پارێز بکەن .

## ڕووداوی چیا بەسەردا بەرزکرانەوەی بەنی ئیسرائیل

دیارە ئەم ڕووداوە لە قورئان دا ، لە سێ شوێنی دیکەشدا هاتوە ، بەم شێوەیە :

١ - دەفەرموێ : ﴿ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۖ فَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾البقرة ، واتە : وە یاد بکەنەوە ! (ئەی جوولەکەکان) کاتێك پەیمانێکی پتەومان لێتان وەرگرت (واتە : لە پێشووەکانتان) ، وە کێوی طوورمان بەسەر سەرتانەوە بەرزکردەوە

(پێمان گوتن): ئەوەی پێمان داون (لە بەرنامەو شەریعەت) بە توندیی بیگرن و بزانن چی تێدایە ! بەڵکو پارێز بکەن . کەچی دوای ئەوە پشتتان هەڵکردو ، ئەگەر چاکەو بەزەیی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە ، لە زیانباران دەبوون .

٢ – وە دەفەرموێ : ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾﴾البقرة ، واتە: وە یاد بکەنەوە ! کاتێك پەیمانتانمان وەرگرتو (چیای) طوورمان بەسەرتانەوە ڕاگرتو (پێمان گوتن :) ئەو (بەرنامەی)ەی پێمان داون بە توندیی بیگرن و گوێ بگرن ، کەچی گوتیان : بیستمان و سەرپێچییمان کرد ! وە خۆشەویستیی گۆلك بەهۆی کوفریانەوە بە دڵیاندا خورابۆوە : بڵێ : (ئەگەر بڕواداربن وەك ئیددیعا دەکەن) ئەوە ئیمانەکەتان فەرمانتان بە خراپترین شت پێدەکات ! (کە بریتیە لە لاملیی و سەرپێچیی لە فەرمانی خوا)

٣ – وە دەفەرموێ : ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُوا۟ فِى ٱلسَّبْتِ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿١٥٤﴾﴾النساء ، واتە : وە بە دەم پەیمان لێ وەرگرتنیانەوە ، طوور (چیا)مان لەسەر سەر ڕاگرتن و پێمان گوتن : بە کڕنووش بردنەوە (واتە : بە چەمینەوەو ڕکووع بردنەوە) لە دەرگاکەوە بچنە ژوور ، وە پێمان گوتن لە (ڕۆژی) شەممەدا دەستدرێژیی مەکەن (شەممە مەشکێنن) وە پەیمانێکی پتەومان لێ وەرگرتن .

بەڵام دیارە پێوەی پابەند نەبوون .

ئنجا وەك پێشتر گوتمان : (الطور : اسْمٌ جَبَلٍ مَخْصُوص ، أَوْ اسْمٌ لِكُلّ جَبَلٍ ناوی چیایەکی تایبەتە ( وەك هەندێك لە زانایان دەڵێن : چیایەکی تایبەت

بووە کە مووسا لەسەر ئەو چیایە قسەی لەگەڵ خوای بۆ وێنەدا کردوە)، هەندێکیش گوتوویانە : وشەی (طور) ناوە بۆ هەر چیایەك .

دیارە ئەم بەسەرهاتە لە تەوراتدا باس نەکراوە ، بەڵام بێگومان ئەم بەسەرهاتەش ، لەو بەشەیە کە شێردراوەتەوە ، یان لەبیرکراوە ، بۆیەش خوا فەرموویەتی : ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴿١٥﴾ ﴾ المائدة ، واتە: ئەی خاوەن کتێبینە ! ئەوە پێغەمبەرەکەمان هاتە لاتان زۆرێك لەوەی کە لە کتێب (ی خوا کە لەلاتانە) دەتانشاردەوە ، بۆتان ڕوون دەکاتەوەو ، چاوپۆشییش لە زۆرێك دەکات (کە پێویست ناکات ڕوون بکرێتەوە) ، هەروەها دەفەرمووێ : ﴿ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ﴿١٣﴾ ﴾ المائدة ، واتە : (جوولەکەکان) وشەکان لە شوێنی خۆیان لادەدەن و دەگۆڕن ، وە بەشێك لەوەی کە پێی ئامۆژگاریی کرابوون ، لەبیریان کرد ، (یان ئیهمالیان کردو وازیان لێ هێنا) .

ئنجا دەربارەی چۆنیەتی بەرزکرانەوەی ئەو چیایە بەسەر گەلی بەنی ئیسرائیل دا ، ئەم دەقە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە :

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ : إِنِّي لأَعْلَمُ خَلْقِ اللهِ لأَيِّ شَيءٍ سَجَدَتِ اليَهُود عَلَى حَرْفِ وُجوهِهِم : لَمَّا رُفِعَ الجَبَلُ فَوْقَهُمْ سَجَدُوا ، وَجَعَلُوا يَنْظُرُونَ إِلى الجَبَلِ مَخَافَةَ أَنْ يَقَعَ عَلَيهِم ، قَالَ : فَكَانَتْ سجْدَةً رَضِيهَا الله ، فَاتَّخَذُوها سُنَّة}[1] واتە : عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : من زاناترین خەڵکی خوام لەوبارەوە کە بۆچی جوولەکەکان لەسەر لا چاوێکیان کڕنووش دەبەن ، (ئایا ئێستاش هەروان ، یان هەر ئەو کات وابوون ؟)[2] ئنجا

١) جامع البيان للطبري برقم : (١٥٢٥٥).

٢) پرسیارکردنم لەبەر ئەوەیە کە لەوبارەوە زانیاریم نیە .

ڕوونی دەکـاتەوەو ، دەڵـێ :) کـاتێك چیـایەکە بـەسـەر سـەریانەوە بـەرزکرایـەوە ، کڕنووشـیان برد ، وە تەماشای چیایەکەشیان دەکرد ، نـەوەك بکـەوێتـە خـوارەوە ، ئــەوەش کڕنــووش بردنێــك بــوو کـە خــوا پەسـندی کــرد ، بۆیــە کـردیــان بــە سوننەتێكو ، درووشـمێکی ئـایینـی خۆیـان .

هـەر (طبري) ئەم شوێنەوارەش لە قەتـادە دەگـێڕێتەوە ، دەڵـێ : (قوله : ﴿ وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَـٰكُم بِقُوَّةٍ (أي : بجدٍّ) وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ ، جَبَلٌ نَزَعَه الله مِنْ أَصْله ثُمَّ جَعَلَهُ فَوْقَ رُؤُسِهِم ، فَقَالَ : لَتَأْخُذُنَّ أَمرِي ، أَو لأَرْمِيَنَّكُمْ بِهِ)[١] ، واتــە : کـە خــوا دەفـەرموێ : یاد بکەوە کـاتێك چیاکـەمان هـەڵـقەند ، وە بـەسـەر سـەریانەوە ڕایان گـرت ، وەك هـەورێك ، وە پێیـان وابـوو بـەسـەر سـەریان دا دەکـەوێ ، (پێمـان گـوتن :) ئـەوەی پێمـان داون ، بـە تـوندیی‌و بـە جیـددیی بیگـرن ، وە بزانن چی تێدا هەیە ، بـەڵکـو پارێـزکـاربن ، (خۆتان بپـارێزن لـە سزای خــوا) دەڵـێ : ئـەوە چیایەك بـوو خـوا لـە ڕیشـەوە هـەڵیقـەنـد ، دوایـی بـەسـەر سـەریانەوە ڕایگـرت فـەرمووی : یـان فـەرمانی من وەردەگـرن ، یاخـود ئەو کێوەتان بـەسـەردا دەخـەم‌و پێتانـدا دەدەم . (دوای ئـەوە هـاتنە ژێـر بـار) .

لێـرەش بـەسـەرهـاتەکـانی مووسـاو هـاڕوونی بـرای صـەڵاتو سـەلامی خـوایان لەسـەر بێ ، لەگەڵ فیـرعەون‌و دارو دەستەو پێوەندەکانی‌و ، پاشان لەگەڵ گەلەکـەیان (بەنی ئیسـرائیـل)دا لەم سـوورەتەدا ، کۆتاییان پێهات ، کە بێگومان لە نێـو سـوورەتە مەککـەیەکاندا ، هیـچ سـوورەتێـك ئـەو هەموو پانـتـایی یەی تێدا بۆ بـەسـەرهـاتی مووسـاو هاڕوونی برای (علیهمـا السلام) وە گـەلەکـەیان تەرخـان نەکـراوە .

بۆیــە ئێمـە بــە نەفەسـێکی درێـژ ئـەو ئـایەتانەمان تەفسیــر کــردن ، تاکــو لـە تەفسیـرکــردنی سوورەتەکــانی دیکــەدا لەوبــارەوە ، هــەموو جــارێ خـوێنــەر بگـەڕێتــەوە بـۆ ئێــرە ، هـەرچــەند بێگومـان هــەر ســوورەتەش ، تــامو چــێژو کەسـایەتیی تایـبـەتی خۆی هـەیە.

---

١) جامع البيان ، للطبري ، برقم : (١٥٢٥٧).

بەلاّم وەك بینیمان خوای بەرزو مەزن هەر جارە بە شێوازێكو ، هەر جارە لە ڕوویێكەوە ، ئەو بەسەرهاتانە دەخاتەڕوو ، كە بە هەموویان دیمەنێكی تەواو دەخەنە بەرچاوی ئێمە ، ئنجا چ بەسەرهاتی هاڕوونو مووسا صەلاّتو سەلامی خوایان لەسەر بێ ، لەگەڵ فیرعەون ، وە لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا ، وە چ هەموو ئەو بەسەرهاتانەی دیكەی قورئان ، كە لە چەند سووڕەتێك دا دووبارە دەبنەوە ، كە بێگومان هیچ كام لەم دووبارە بوونەوانە ، دووبارەی ئاسایی نین ، بەڵكو هەمووی نهێنیی تازەی تێدایە ، زانیاریو تامو چێژی تایبەت بە خۆیانیان تێدایە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

ameer.maktab@yahoo.com
/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

# دەرسی بیست و یەکەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە حەوت (٧) ئایەتان پێکدێ : (١٧٢ ـ ١٧٨) ، لەم حەوت ئایەتەدا خوای زاناو توانا دوو بابەتی گەورەو گرنگ دەخاتە ڕوو :

١/ پەیمان وەرگرتنی خوا لە وەچەی ئادەم ، کە جگە لەو نەپەرستن و ، تەنیا ئەو بە پەروەردگار بگرن و ، هاوبەشی بۆ دانەنێن .

٢/ بەسەرهاتی زانایەك و سەرەنجامی شوومی ، بەهۆی دنیا دۆستیی و ئارەزوو خوازییەوە ، وە چواندنی بە سەگێکەوە ، کە هەمیشە هەناسە بڕکێیەتی و سرەوتنی نیە !

﴿ وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ
بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾
أَوۡ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشۡرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةٗ مِّنۢ بَعۡدِهِمۡۖ أَفَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ
ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿١٧٤﴾ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ
ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾
وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ
ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ
ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلۡقَوۡمُ
ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ﴿١٧٧﴾ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِيۖ
وَمَن يُضۡلِلۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٧٨﴾ ﴾.

# مانای وشـه به وشـەی ئایەتەكـان

((وە یاد بكەوە ! كاتێك پەروەردگارت وەچەی ئادەمـزادانی لە پشـتیان وەرگـرتو لەسەر خۆیانی كردنە شایەد (فەرمووی : ) ئایا من پەروەردگارتـان نیم ؟ گـوتیان : با ! شایەدییمـان دا ، (بۆیـەش وامانكـرد) نـەوەك ڕۆژی قیامەتـێ بلێن : ئێمـە لـەم (ڕاستیـی)یە بێ ئاگـا بووین ﴿١٧٢﴾ یان بلێن : بێگومان پێشـتر بابو باپیرانمان هاوبەشیان (بۆ خـوا) دانـا ، وە ئێمـەش وەچـە بووین لـە دوای وان ، ئنجا ئایا بەوەی كە ناڕاستو خراپەكارەكانمان كردوویانە ، دەمانفەوتێنی ! ﴿١٧٣﴾ وە ئاوا ئایەتەكانمان ڕوون دەكـەینەوە ، بەڵكـو بگەڕێنـەوە (سـەر ڕێی ڕاسـت) ﴿١٧٤﴾ وە بەسەرهاتی ئەو كەسەیان بەسەردا بخوێنەوە ، كە ئایەتەكانی خۆمانمان پێدابوون (و لە بەرنامەی خۆمان شارەزامان كرد بوو) كەچی (وەك كـیف) لە خۆی داڕنین‌و یەكسەر شەیتـان شـوێنی كـەوتو گـرتیو ، لـە بێ مـرادان بـوو ﴿١٧٥﴾ وە ئەگەر ویستباممان (زۆری لێ بكەین) بەو ئایەتەنە بەرزمان دەكردەوە ، بەڵام (ئازادمان كردو ئەویش) خۆی بە زەوییەوە نووساندو شوێن ئارەزووی كەوت ، وێنەی وەك وێنەی سەگە ، ئەگەر تینی بۆ بێنی ، هەر هەناسە بڕكەیەتی‌و زمانی دەردێنێ‌و ، ئەگەر وازیشی لێ بێنی ، هەر هەناسە بڕكەیەتی‌و زمانە شۆڕەیەتی ، ئەوە وێنەی ئەو كۆمەڵەیە كە بێبڕوان بە ئایەتەكانمان ، دەجا بەسەرهاتان بگێڕەوە ، بەڵكـو بیر بكەنەوە ﴿١٧٦﴾ خراپترین حاڵو باڵ هی ئەو كۆمەڵەیە كە بڕوایان بە ئایەتەكانمان نەهێناو ، ستەمیشیان هەر لە خۆیان كرد .﴿١٧٧﴾ هەر كەس خـوا بیخاتە سەر ڕێی ڕاست ، هەر ئەوە ڕێی ڕاست گرتووو ، هەر كەسێكیش گومڕا بكات ، هەر ئەوانن زیانباران (ی ڕاستەقینە) ﴿١٧٨﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ذُرِّيَّتَهُمْ ) : (الذُرِيَّةُ أَصْلُها : نَسْلُ الرَّجُلِ ، أَوِ الصِّغَارُ مِنَ الأَوْلاَدِ ، وَيُستعْمَلُ لِلْوَاحِدِ وَالجَمْعِ) ، وشەی (ذُرِيَّة) ڕیشەکەی بریتیە لە وەچەی پیاو ، یاخود منداڵانی وردو بچووك ، وە بەکاردەهێنرێ بۆ تاكو کۆمەڵ .

(فَٱنسَلَخَ مِنْهَا) : واتە : خۆی لێ دارنی ، وشەی (سَلخ) ئێمە بە کوردیی کەوڵکردنی پێ دەڵێین ، وە لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ : (السَّلْخُ : نَزْعُ جِلْدِ الحَيْوَانِ) ، ئەوەیە کە پێستی ئاژەڵ دابڕنی ، (وَعَنْهُ استعِيرَ سَلَخَتُ دِرْعَهُ) لەوەوە خوازراوەتەوە : زرێیەکەم لێ دارنی .

(فَأَتْبَعَهُ ) : یانی : (لَحِقَهُ) واتە : شوێنی کەوتو پێی گەیشت .

(ٱلْغَاوِينَ ) : کۆی (غَاوِي)یە ، کە ئەویش لە (غَيّ)یەوە هاتوە ، (الغَيُّ : جَهْلٌ عَنْ إِعْتِقَادٍ فَاسِدٍ) ، واتە : (غَيّ) بریتیە لە نەفامییەك کە بەهۆی بیروبڕوایەکی خراپەوە پەیدا بووبێ ، ئنجا (غَوِيَ : أَمْعَنَ فِي الضَّلاَلِ وَالفَرْقُ بَيْنَ الضَّلاَلِ ، وَالغِوَايَةِ أَنَّ الغِوَايَةَ نَتِيجَةُ الضَّلاَلِ كَمَا أَنَّ الرُّشْدَ نَتِيجَةُ الهِدَايَةِ) ، جیاوازیی نێوان (ضَلاَل) و (غِوَايَة) ئەوەیە کە (غِوَايَة) ئەنجامی (ضَلاَل)ە ، بۆیە من (غِوَايَة)م بە بێ مرادیی ، یان بە بێ ئاکامیی مانا کردووە (ضَلاَل)یش بە گومڕایی‌و ڕێ پێنەزانین ، هەروەك (رُشْد)یش ئەنجامی هیدایەتە ، (رُشْد) واتە : سەر ڕاستیی ، یاخود بە ئامانج گەیشتن ، بەڵام (هِدَايَة) واتە : ڕێنمایی : ئنجا کەسێك ڕێنمایی بکرێ‌و ڕێی ڕاست بگرێ ، بێگومان بە ئامانج دەگات ، وە کەسێك گومڕابێ‌و بە ڕێ نەزانێ ، بێ ئاکام‌و بێ مراد دەبێ ، چونکە زۆر لە زانایان‌و توێژەرەوانی قورئان هەردوو وشەی (ضَلاَل) و (غِوَايَة)یان بە واتایەك لێکداوەتەوە ، وە هەردوو وشەی (رُشْد)و (هِدَايَة)ش بە واتایەك ، کە لە ڕاستییدا وانیە .

(أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ) : (إِخْلاَدُ الشَّيءِ : جَعْلُهُ مُبْقَىً وَالحُكْمُ عَلَيْهِ بكونِهِ مُبْقَىً) ، (إِخْلاَدُ الشَّيءِ) ئەوەیە کە شتێك بهێڵیەوە ، وە حوکم بدەی بەوە کە بمێنێتەوە ، (وَأَخْلَدَ إِلى الأَرْضِ : أَي رَكَنَ إِلَيْها ظانَاً أَنَّهُ يَخْلُدْ فِيها) ، (أَخْلَدَ إِلى الأَرْضِ) واتە : مەیلی بە لای زەوییدا کرد ، وەك بڵێی خۆی بە زەوییەوە نووساند ، پێی وابوو کە هەمیشە تێیدا دەمێنێتەوەو لە هەمیشە ماوان دەبێ ، کە لێرەدا مەبەست لە (أَخْلَدَ إِلى الأَرْضِ) واتە : مەیلی ئەو ئارەزووانەی کرد کە لە زەوی پەیدا دەبن ، نەك ڕووبکاتە خوای پەروەردگارو ئەو هیدایەتە کە لە سەرێوە دێ .

(تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ) : (حَمَلَ عَلَيْهِ فِي الحَرْبِ حَمْلَةً ، وَحَمَلَ عَلَى نَفْسِهِ فِي السَّيْرِ : جَهَدَها فِيهِ) ، (حَمَلَ عَلَيْهِ فِي الحَرْبِ) لە کوردیدا دەڵێین : لە جەنگدا حەملەی بۆ کرد ، واتە : هێرشی کردە سەری ، وە (حَمَلَ عَلَى نَفْسِهِ فِي السَّيْرِ) واتە : خۆی ماندوو کرد لە ڕۆیشتندا ، بارێکی لەخۆی بارکرد ، بەلام ئەگەر بڵێی : (حَمَلَ عَلَيْهِ) یانی : بارێکی لەسەر بەرانبەرەکەی بارکردو هێرشی کردەسەرو ، فشاری خستە سەر.

(يَلۡهَثۡ) : (لَهِثَ يَلْهَثُ لَهَثَاً : أَدْلَعَ لِسانَهُ عَطَشا أَو لِلْحَرِّ أو للإعْيَاءِ) واتە : (لَهِثَ يَلْهَثُ لَهَثَاً) واتە : زمانی دەرکێشا ، دەردەکێشێ ، دەرکێشان ، (أَدْلَعَ لِسانَهُ عَطَشا أَو لِلْحَرِّ أو للإعْيَاءِ) سەگەکە زمانی دەرکێشا لەبەر تینوێتی ، یان لەبەر گەرما ، یان لەبەر ماندوویەتیی .

(ٱلۡقَصَصَ) : (القَصُّ : تَتَبُّعُ الأَثَرِ) وە دوای شوێنەوار کەوتن ، وە دەگوترێ : (قَصَصْتُ أَثَرَهُ) واتە : بە دوای شوێنەوارەکەی کەوتم ، وە هەواڵە شوێن هەڵگیراوەکان (قصص)یان پێ دەگوترێ .

(مَثَلًا) : (المَثَلُ يُقالُ عَلَى وَجْهَيْنِ أَحَدُهُما : المِثْلُ نَحْو شِبْه وَشَبَهٍ ، أَوْ وَصْفُ الشَّيءِ) ، (مَثَل) بە دوو واتایان دێ ، یەکیان وێنە ، وەك (شِبْه) و (شَبَه)ە ، کە

هەردووكیان بە مانای وێنەن، یاخود بە مانای وەسفی شتێك بەكاردێ، (الثَّانِي: عِبَارَةٌ عَنِ المشابَهَةِ لِغَيْرِهِ فِي مَعْنَىً مِنَ المعَانِي إذ النِدُّ لِلْمُشَارَكَةِ فِي الجَوْهَرِ، وَالشِّبْهُ: فِي الكَيْفِيَّةِ، وَالمساوِي: فِي الكَمْيَةِ، والشَّكل: في القَدر والمساحَةِ، والمثْلُ: عَامٌّ فِي جَمِيعِ ذَلِكَ، وَلِهَذَا لَمَّا أَرَادَ اللّه تَعَالى نَفِي التَّشْبِيه مِنْ كُلِّ وَجْهٍ خَصَّهُ بالذِّكْرِ، فَقَالَ: ﴿... لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ ﴿١١﴾﴾الشورى) دووەم مانای وشەی (مَثَل)، بریتیە لەوە كە شتێك بە شتێك بچێ لە ڕوویێكەوە، وەك (نِدْ) كە دەگوترێ: (هَذَا الشيءُ نِدّ لِذَاكَ الشَيء) یانی: هاوبەشیەتی لە كرۆك و نێوەڕۆكیدا، وە (شِبْهُ) كە دەگوترێ: (هَذَا الشيءُ شِبْهٌ لِذَاكَ الشَيء) واتە: لە چۆنیەتییدا، وە (مُساوِي) واتە: لەگەڵیدا یەكسانە، لە چەندێتییدا، ئەگەر بگوترێ: (هَذَا الشيءُ مُساوِي لِذَاكَ الشَيءِ) واتە: ئەو شتە لە چەندێتییدا لەگەڵیدا یەكسانە، وە دەگوترێ: (هَذَا الشيءُ شكل ذَاكَ الشَيءِ) واتە: لە ئەندازەو لە پانتایی دا، بەڵام وشەی (مِثْل) گشتییە لە هەموو ڕووەكانەوە، بۆیە خوای بەرز كاتێك ویستوویەتی وێچوونی خۆی بە شتەكان لە هەموو ڕوویێكەوە، لە خۆی دوور بخاتەوە كە وەك هیچ كام لە دروستكراوەكان بچێ، یان دروست كراوەكان وەك وی بچن، لە هیچ ڕوویێكەوە، وشەی (مِثْل)ی بەكارهێناوە، فەرموویەتی: ﴿... لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ ﴿١١﴾﴾ الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك وێنەی خوا نیە، یانی لە هیچ ڕوویێكەوە.

## مانای گشتی ئایەتەكان

لەم حەوت ئایەتەدا خوای پەروەردگار دوو بابەتی گرنگ باس دەكات ، كە پەیوەندییان بە هەموو بەشەرەوە هەیە ، ئنجا ئێمە لەبەر ڕۆشنایی ئەم حەوت ئایەتە موبارەكەدا ، سەرنجی ئەو دوو بابەتە گەورەو گرنگە دەدەین :

دیارە خوای پەروەردگار دوای ئەوەی باسی هەشت لە پێغەمبەرانی پایەبەرزی خۆی كرد لەم سوورەتەدا ، كە بریتی بوون لە (ئادەم ، نووح ، هوود ، صالح ، لووط ، شوعەیب ، مووساو هارون) صەلاتو سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ ، ئنجا خوا ﷻ ئەم دوو بابەتە دەخاتە ڕوو ، كە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی گرنگن ، سەرەتا بابەتی یەكەم دەخاتەڕوو ، كە خوا بەڵێن و پەیمانی لە وەچەی ئادەم و حەووا وەرگرتوە ، كە تەنیا ئەو بە پەروەردگارو پەرستراوو هەمەكارەی خۆیان بزانن ، دەفەرموێ : ﴿وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡ﴾ ، وە یاد بكەوە ئەی مرۆڤ ! كاتێك پەروەردگارت لە وەچەی ئادەم ، لە پشتیانەوە وەچەكەیانی وەرگرت ، وە لەسەر خۆیان كردنە شایەد ، پێی فەرموون : ئایا پەروەردگارتان نیم ؟! ﴿قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآ﴾ ، گوتیان : با ، شایەدییماندا ، واتە : شایەدیی دەدەین كە تەنیا تۆ پەروەردگارو گەورەو سەروەر ڕۆژی دەرمانی ، وە هەر تۆ خاوەنمانی ، ﴿أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ﴾ ، بۆیە ئەو ڕاستییە دەخەینە ڕوو ، نەوەك ڕۆژی قیامەتێ بڵێن : ئێمە لەو ڕاستییە بێ ئاگا بووین ، كە خوا بەندەكانی وا دروست كردوە ، بە زمانی حاڵ شایەدیی لەسەر خۆیان دەدەن ، كە تەنیا خوا ﷻ پەروەردگاریانەو ، خاوەنیانەو مشوور خۆریانە ، كەواتە : دەبێ لە دنیادا بە دوای ڕێبازو بەرنامەی كەسێكی دیكە نەكەون ، جگە لە خوا ، وە بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ شتێكی دیكەدا نەكەن ،

وەك ئەو مامەڵەیەی لەگەڵ خوادا دەیکەن ، لە هەموو ڕوویێکەوە ، ﴿ أَوۡ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشۡرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةٗ مِّنۢ بَعۡدِهِمۡۖ ﴾ ، هەروەها بۆیە ئەو ڕاستییە دەخەینە ڕوو ، نەوەك لە ڕۆژی قیامەتو هەڵسانەوەدا بڵێن : بێگومان باب و باپیرانمان پێشتر هاوبەشیان بۆ خوا دانا ، ئێمەش وەچە بووینو ورد بووین لەپاش وان ﴿ أَفَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴾ ، ئنجا ئایا بەهۆی ئەوانەوە کە ناهەقو ناڕاست بوونو لەسەر بەتاڵ بوون ، ئێمەش سزا دەدەی ؟ ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴾ ، وە ئاوا بەو شێوەیە ئایەتەکانی خۆمان ڕوون دەکەینەوە ، وە بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە ، واتە : ئاوا بەو شێوەیە ئایەتەکان ڕوون دەکەینەوە ، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بزانن کە ئاوا دروست کراون ، وە خاوەنو پەروەردگاری خۆیان بناسن ، وە ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییانەش ئومێدی ئەوەی لێ دەکرێ ، کە ئەوانەی لاڕێ بوونو ناهەق بوونو دووربوونە لە هەق ، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا .

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی بەسەرهاتی دووەم ، باسی زانایەکە ، کە خوا لە ئایینی خۆی دا شارەزای کردوە ، بەڵام ئەو وەك چۆن مار کیف لە خۆی دادەڕنێ ، یان وەك چۆن مرۆڤ بەرگو پۆشاکەکە لە خۆی دادەڕنێ ، ئاوا ئەو شارەزاییو زانستو زانیارییەی لە خۆی دارنیوە ، وە کاری پێنەکردوە ، سەرەنجامیش شەیتان گرتوویەتیو تووشی سەرگەردانییو ماڵ وێرانیی بووە ، دەفەرموێ : ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴾ ، وە بەسەرهاتی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەوە ، کە ئایەتەکانی خۆمانمان پێدابوون ، واتە : ڕستەکانی فەرمایشتی خوا ، کە مەرج نیە ڕاستەوخۆی پێیدابن ، چونکە وەحی تەنیا بۆ پێغەمبەرانە ، بەڵام مەبەست ئەوەیە خوا لە ئایەتەکانی خۆی دا شارەزای کرد بوو ، ئەم قورئانەش وەك چۆن موحەممەد لە دڵو سینەی خۆیدا کۆی کردبۆوە ، بە هەمان شێوە لەبەردەستی هەر کەسێکی دیکەشدا بێ ، دەتوانێ لە عەقڵو دڵی خۆیدا کۆی بکاتەوە ، واتە : ئەو ئایەتانە ئێستا

لەبەردەستی هەر كەسێكی دیكەشدا هەن ، ئەگەر بیەوێ بەرەو رێبازو رێنمایی خوای پەروەردگار بچێ‌و ، لە ئایینی ئیسلام شارەزا بێ ، ئەوە خوا ئاسانی كردوە بۆی ، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾ القمر ، واتە : قورئانمان ئاسان كردوە بۆ فێربوون ، ئایا كەس نیە لێی تێبگات ؟

بۆیەش وا دەڵێم ، چونكە لە پەیمانی كۆندا دەڵێ : ئەو كەسە یەكێك بووە لە پێغەمبەرانی خوا ، بەلام بێگومان پێغەمبەرانی خوا پارێزراون لە هەڵە ، بەڵكو ئەوە وێنەی زانایەكی خراپە ، ئنجا چ كەسێكی دیارییكراو بووبێ ، چ خوای كاربەجێ ئەو وێنەیەی هێنابێتەوە بەگشتی ، بۆ هەر كەسێك كە خوا شارەزای دەكات ، بەلام بە پێی زانیاریی‌و شارەزاییەكەی رەفتار ناكات ، وە زانیارییەكەی كار پێناكات ، وە سەرەنجام شەیتان دەیگرێ‌و سەرگەردان‌و بێ مراد دەبێ ، ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا ﴾ ، وە ئەگەر ویستبامان (زۆری لێ بكەین) بەو ئایەتانەی كە پێماندابوون ، وە شارەزامان كردبوو لێیان ، بەرزمان دەكردەوە ، وەك چۆن خوا فریشتەكانی وا دروست كردوە ، كە ناتوانن لە رێی خوا لابدەن‌و بێ فەرمانیی خوا بكەن ، چونكە ئینسان بە ئایەتەكانی خوا بەرز دەبێتەوە ، لە هەموو روویێكەوە ، واتە : لە ئاستێكی نزمەوە دەچێتە ئاستێكی بەرز ، لەرووی : ئیمان، خواپەرستیی ، رەوشت ، بیركردنەوە ، لە هەموو روویێكەوە ئینسان بە ئایەتەكانی خوای پەروەردگار بەرز دەبێتەوە ، ﴿ وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ﴾ ، بەلام خۆی بە زەوییەوە نووساندو شوێن ئارەزووی كەوت ، واتە : ئێمە نەمانویست زۆری لێ بكەین‌و ، ئازادمان كردو ، ئەویش بە ویستی ئازادانەی خۆی ، خۆی بە زەوییەوە نووساندو، كەوتە شوێن ئارەزووەكانی زەوی ، سەرەنجام سەری بە فەتارەت چوو .

دوایی خوای كاربەجێ وێنەیەكی بۆ دێنێتەوە ، دەفەرموێ : ﴿ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ﴾ ، وێنەی ئەو زانا لادەرە ، وەك وێنەی سەگ وایە ، ئەگەر تینی بۆ بێنی‌و راوی بنێی‌و بە دوای بكەوی ، هەر هەناسە بركەیەتی‌و زمانی دەردێنێ‌و ، ئەگەر وازیشی لێ بێنی هەر هەناسە

بڕکەیەتیو زمانە شۆڕەیەتی ، ئنجا سەگ کە هەناسە بڕکەیەتی لەبەرئەوەیە ، کە کۆئەندامی هەناسەدانی تەسکە ، واتە : زانایەکیش کە دەکەوێتە دوای مەتاعو تەماعی دنیا ، چ دنیای بێتە دەست ، یان نەیەتە دەست ، هەر چاو لە دەستو چاوبرسییە ، هەر تێر نابێ ، وە لە ڕاستییدا مرۆڤ ، تەنیا بە یادی خواو پەیوەندیی لەگەڵ خواو خۆراکی ڕووحیی ، تەسەلالای دێ ، ئەگەرنا چەندەی دنیا هەبێ ، دە هێندەی دی داوا دەکات ، هەرگیز چاوی تێر نابێ ، هەر هەست بە برسیەتییو تێنوویەتیی دەکات ، پیرەمێری شاعیریش جوانی گوتوە :

تەماع وەك ئاوی سوێری دەریایە هەر دەیخۆیتەوەو تەسەللات نایە

دیارە ئاوی سوێر تا بیخۆیەوە ، زیاتر تینووت دەبێ .

ئنجا دەفەرموێ : ﴿ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ ، ئەوەش وێنەی ئەو کۆمەڵەیە کە بێبڕوان بە ئایەتەکانمان ، دەجا بەسەرهاتان بگێڕەوە ، بەڵکو بیر بکەنەوە .

چونکە ئەگەر ئینسان بیر نەکاتەوە لە بەسەرهاتەکانو ، ئەو پەندو عیبرەتەی تێیاندایە ، وەری نەگرێ ، ئەوە مانای وایە هیچ سوود نابینێ ، هەندێ کەس کتێبان زۆر دەخوێنێتەوە ، شت زۆر دەبیستێ ، بەلام پەندی لێ وەرناگرێ ، لە بێژینگی نادات ، ڕانامێنێ کە ئەوە چ دەرسو پەندو عیبرەتێکی تێدایە ؟ ﴿ سَآءَ مَثَلًا ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ﴾ ، ئەوە خراپترین وێنەیە بۆ کۆمەڵێك کە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە ناهێنن ، وە بێگومان ستەمیشیان هەر لە خۆیان کرد ، ئەوانەی کە بێبڕوا دەبن بە ئایەتەکانی خوا ، بەو هەڵوێستەیان هەر ستەم لە خۆیان دەکەن ، خۆ ناتوانن ستەم لە خوا بکەن ، خوا زۆر لەوە بەرزترە بەندەکانی بتوانن ستەمی لێ بکەنو زیانی پێ بگەیەنن ، یاخود بە گوێڕایەڵیو چاکەیان سوودێکی پێ بگەیەنن ، وەك خوا لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ : ﴿ مَّنۡ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَاۗ وَمَا رَبُّكَ

بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ ﴾ فصلت ، هەر کەسێك چاکەیەك بکات ، سوودەکەی بۆ خۆیەتی ، وە هەر کەسێك خراپەیەك بکات ، زیانەکەی بۆ خۆیەتی .

لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِيۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾ ، هەر کەسێك خوا ڕێنمایی بکات ، هەر ئەوە ڕێنمایی کراوو ، ڕێی ڕاست گرتوو ، وە هەر کەسێك خوا گومڕای بکات ، هەر ئەوانن زیانباران .

بێگومان وەك جاری دیکەش باسمان کردوە ، خوای دادگەر نە لە گۆترە ڕێنمایی کەس دەکاتو دەیخاتە سەر ڕێی ڕاست ، وە نە لە گۆترەش کەس گومڕا دەکاتو دەیخاتە دۆزەخ ، بەڵکو بە پێچەوانەوە : خوای بە بەزەیی ئەو هەموو پێغەمبەرانەی (علیهم الصلاة والسلام) ناردوون ، ئەو هەموو کتێبەی ناردوون ، ئەو هەموو مشوورەی خواردوە لە مرۆڤەکان لەسەر زەوی ، وە ئاگاداری کردوونەوە کە :

بە دوای شەیتان نەکەون ، وە پێغەمبەرانم ناردوون ، شوێنی پێغەمبەرانی من بکەون ، بەرنامەم ناردوە کە هیدایەتی تێدایە ، شوێنی بکەون ، ئاگاتان لێ بێ شەیتان فریوتان نەدات ، نەترازێن ، نەخلیسکێن ، لە من دوور نەکەونەوە ، وە ئەگەر هەڵەیەکیشتان کرد ، بگەڕێنەوە بۆ لای منو تۆبە بکەن ، لێتان خۆش دەبم ! مانای وایە کە دەفەرموێ : هەر کەسێك خوا هیدایەتی بدات ، هەر ئەوە ڕێی ڕاست گرتوو ، وە هەر کەسێك ئەو گومڕای بکات ، کەس نیە هیدایەتی بداتو هەر ئەوە زیانبار ، واتە : بە پێی ئەو یاسایانەی کە خۆی ناردوونی ، دیارە ویستی خوا ڕەهاو بێ سنوورە ، بەڵام ویستی خوا ، بە پێی دادگەریی و حیکمەتو بەزەیی خوا کار دەکات ، وە خوا ستەم لە کەس ناکات .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم** : کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ ۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٧٤﴾ ﴾ ، ئەم سێ ئایەتە موبارەکە ڕاستە مانایەکەیان بەم شێوەیە :

یاد بکەوە ! کاتێك پەروەردگارت وەچەی ئادەمزادەکانی لە پشتیان وەرگرت {یانی پشت بە پشت (جیلٌ بعدَ جیل) لە ڕێی زاوزێوە لە پشتی یەکدی دەریهێنان} ، ئنجا لەسەر خۆیانی کردنە شایەد ، پێی فەرموون : ئایا من پەروەردگارتان نیم ؟ گوتیان : با ، شایەدییماندا کە هەر تۆ پەروەردگارمانی ، (پاشان خوا دەفەرموێ : ) بۆیەش ئەوەمان کردن ، تاکو ڕۆژی هەڵسانەوە ، (قیامەت) نەڵێن : ئێمە لەم ڕاستییە بێئاگا بووین ، هەروەها بۆ ئەوەی کە نەڵێن : بابو باپیرانی ئێمە لە پێش ئێمەدا هاوبەشیان بۆ تۆ دانابوو ، وە ئێمەش وەچەی ئەوان بووین ، ئنجا ئایا بەهۆی ئەوەوە کە ئەوان ڕێگای چەوتیان گرتبوو ، ئێمەش بەدوایان کەوتین ، دەمانفەوتێنی ؟ (دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ : ) ئاوا ئایەتەکانمان ڕوون دەکەینەوە ، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە .

# باسێك لەبارەی پەیمان وەرگرتنی خواوە لەبەندەكانی، كە تەنیا ئەو بپەرستن

زانـایان دوو ڕایـان هـەن ، دەربـارەی تەفســیركردنی ئەم ئـایەتـانە :

أ - ڕای یەكــەم : كـە ڕای زۆربـەی زانایـانی ڕۆچــوو لـە زانیـارییـ دا لەســەرە (بــە بۆچوونی مـن) ، ئەوەیـە كە خـوای كـاربـەجـێ مرۆڤەكـانی وا دروسـت كـردوون ، وەك ئەوەی فەرمایشـتی لەگەڵ كردبنو ، پێی فەرمووبـن : ئـایا من پەروەردگـارتان نیـم ؟ ئەوانیـش شـایەدییان دابـێ ، گوتـبیـان : بـا ، تـۆ پەروەردگـارمانی ، واتـە : خـوا مرۆڤەكانی وا دروسـت كـردوە ، وەك بڵـێی پەیمـانی لـێوەرگـرتیـن ، یـانی : لـێرەدا ئـەمــە وێنەیــەكە خــوا دەیـهێـنـێتەوە ، یـانــی : ئـەی مـرۆڤــەكان ! مــن پەیمـانم لـێ وەرگــرتوون ، كـە تەنیــا مـن بــە پەروەردگـارو پەرسـتـراوی خۆتـان بزانــن ! كـە ئــەو مانــایەش وەك دوایـی زیـاتر باسـی دەكـەین ، زیـاتر بــە عەقـڵو دڵـەوە دەنووسـێ ، دوایـی من چەنـدان بـەڵگـەی لەسـەر دێنمـەوە .

ب - ڕای دووەم : كە ئەویش ژمـارەیەكی زۆر لە زانایان تەبـەنـنییـان كـردوە ، دەڵێن : خـوا بـەرلـەوەی مرۆڤەكـان دروست بكـات ، لەسـەر شێوەی گـەردی گچكە ، هــەموو وەچـەی ئــادەمی لــە پشــت ئــادەم دەرهێنــاوەو دوانـدوونیو ، كردوونیــە شــایەد بـەسـەر خۆیانـەوە ، وە ئەو وتووێـژە كە خـوای پەروەردگـار لێـرەدا باسـی دەكـات ، حەقیقــەتی هەبــووە ، نــەك وێنــە بــێ ، خــوا باســی بكــات ، بــۆ ئــەوەی ئێمــە تێبگـەیەنێ ، یـانی : بـە زمـانی وتــار گوتـراوە ، نــەك زمـانی حـاڵ .

هـەڵبـەتـە زانــایان لەوبــارەوە پشــتیان بـــە چـەند فەرموودەیــەك بـەسـتوە ، كــە ڕەنگە ئەوەی سـەنەدەكـەی لـە هـەمووان بــەهێزتر بـێ ، ئـەم دەقـە بـێ : ﴿عَنِ ابْنِ

عَبَّاسٍ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ ، قَالَ : أَخَذَ اللَّهُ الميثَاقَ مِنْ ظَهْرِ آدَمَ بِنَعْمَانَ يَعْنِي عَرَفَةَ فَأَخْرَجَ مِنْ صُلْبِهِ كُلَّ ذُرِّيَّةٍ ذَرَأَهَا ، فَنَثَرَهُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ كَالذَّرِّ ، ثُمَّ كَلَّمَهُمْ قِبَلاً ، قَالَ : ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَىٰ شَهِدْنَا أَن تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَافِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوا إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّن بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٢٤٥٥) ، قَالَ الهَيْثَمِي : رجاله رجال الصحيح ، وَأَخْرَجَهُ النَّسائِي في (الكبرى) برقم : (١١١٩١) ، وَالحَاكِمُ برقم : (٧٥) وَقَالَ : صَحِيحُ الإِسْنَاد ، وَالبَيْهَقِي في (الأسماء والصفات) ص : (٣٢٧) ، وَقَالَ شُعيب الأرنؤوط : رجاله ثقات رجال الشيخين غير كلثوم بن جبر من رجال مسلم وثقه أحمد وابن معين ، وذكره ابن حبان في الثقات وَقَالَ النسائي : ليس بالقوي ، ورجح ابن كثير وقفه على ابن عباس ، وقال الألباني : هذا حديث صحيح ، بل هو متواتر المعنى كما بينته في ( الصحيحة) (١٦٢٣)} ، واتە : بێگومان خوا لە پشتی ئادەم پەیمان وەرگرت لە نەعمان (کە دۆڵێکە لە تەنیشت عەرەفە) لە ڕۆژی عەرەفاتدا ، لە پشتی ئادەمەوە هەموو وەچەیەك کە دوایی دروستی کردوە ، دەریهێنان لە پێش خۆی ، بڵاوی کردنەوە ، دوایی دواندنی فەرمووی : ئایا من پەروەردگارتان نیم ؟ گوتیان : با ، تاکو دەگاتە وشەی (الْمُبْطِلُونَ ).

بەڵام بەڕای من ئەم بۆچوونەی دووەم ، گرێو ئیشکالی زۆر دروست دەکات ، بۆیە پێم وایە هەر کەسێك باش سەرنجی ئایەتەکان بدات ، دڵنیا دەبێ کە ئەم بۆچوونەی دووەمیان ڕاست نیە ، بەڵکو ڕای ڕاست هەر ئەوەیە کە خوای تواناو زانا دەیەوێ پێمان بفەرموێ : ئەی مرۆڤەکان ! ئێوەم لەسەر سروشتێك دروست کردوە ، کە بزانن من پەروەردگارو بەخێوکەرو ڕۆزیدەرو ژیێنەرو مرێنەرتانمو ، زیندووکەرەوەتانم ، وە مشوورخۆری دنیاو دواڕۆژتانم ، وە ئێوەم وا دروست کردوە ، وەك پەیمانم لێوەرگرتبنو ، قسەم لەگەڵ کردبن ، وە ئێوەش شایەدییتان لەسەر خۆتان دابێ ، یانی : ئەو شایەدیی لەسەر خۆدانەو ، ئەو پەیمان لێ وەرگیرانە ، بە زمانی حاڵ بووە ، نەك لە دنیای واقیع دا بووبێ .

(عبد الرّحمن بن ناصر السّعدي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (تیسیر الكریم الرّحمن في تفسیر كلام المنّان)[1]، لە تەفسیری ئەوەدا کە دەفەرمویٚ :

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٓ أَنفُسِهِمْ ﴾ ، دەڵێ : (أي أَخْرَجَ مِنْ أَصْلاَبِهِم ذُرِيَّتَهُمْ وَجَعَلَهُمْ يَتَنَاسَلُونَ وَيَتَوَالَدُونَ قَرْنًا بَعْدَ قَرْنٍ) ، واتە : خوا لە پشتی مرۆڤەکان وەچەکەیانی دەرهێناوە ، وە وای لێکردوون کە زاوزێ بکەنو ، منداڵیان لێ پەیدابێ ، سەدە لە دوای سەدە .

ئنجا (عبد الرّحمن بن ناصر السّعدي) هەر لە هەمان لاپەڕەی پێشوودا ئاماژە بە ڕایەکەی دیکەش دەکات ، کە ئێمە بە بێهێزمان زانی ، ئەویش بە (قیل)ێك باسی دەکات ، دەڵێ : ( و قیل : هَذَا يَوْمٌ أَخَذَ اللهُ المِيثَاقَ عَلَى ذُرِّيَةِ آدَم حِيْنَ استَخْرَجَهُمْ مِنْ ظَهْرِهِ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِم فَشَهِدُوا بذَلِكَ ، فَاحْتَجَّ عَلَيْهِم بِمَا أَقَرُّوا بِهِ فِي ذَلِكَ الوَقْت عَلَى ظُلْمِهِم فِي كُفْرِهِم وَعِنَادِهِم فِي الدُّنِيا وَالآخِرَةِ) ، واتە : وە گوتراوە : ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە خوا پەیمانی لە وەچەی ئادەم وەرگرتوە ، کاتێك لە پشتی ئادەم دەریهێناونو لەسەر خۆیان کردوونی بە شایەد ، وە شایەدییان لەسەر خۆیان داوە ، وە خوا ئەوەی لەسەر کردوونە بەڵگە کە خۆیان ئەو کاتە دانیان پێداهێناوە ، کە ئەگەر بێبڕوابن ، مانای وایە ستەم لە خۆیان دەکەن ، وە ئەگەر سەرەخەریی بکەن ، ئەوە ستەمیان لە خۆیان کردوە ، وە ئەوەی لەسەر کردوونە بەڵگە لە دنیاو دواڕۆژدا.

بەڵام وەك گوتم : هەر کەسێك تەماشای ئایەتەکان بکات ، زۆر بە ڕوونیی بۆی دەردەکەوێ ، کە ئەو ڕایەی دووەم لەگەڵ ئایەتەکاندا ناگونجێ ، وە لە دنیای واقعیشدا ناگونجێ ، وە بە عەقڵیش دیارە کە ئەو ڕایە نەگونجاوە ، واتە : ناگونجێ مەبەستی ئەو ئایەتە موبارەکانە ، ئەوە بێ کە خوا بە شێوەی گەردی بچووك ، هەموو مرۆڤەکانی لە پشتی ئادەم دەرهێنابن ، ئنجا قسەی لەگەڵ کردبنو ، پاشان پەیمانی لێ وەرگرتبن ، دوایی شایەدییان لەسەر خۆیان دابێ ، بەڵگەشمان لەوبارەوە زۆرن :

---

[1] ) ص ٣٠٨.

١ / ئەگەر ئەوە لە دنیای واقیع دا ڕوویدابووایە ، وەك باس دەكەن ، دەبووایە ئێمە لەبیرمان بووایە ، چونکە ئەوە کارێکی زۆر گەورەیەو ، ناگونجێ لەبیر بکرێ ، ئایا هیچ کەس لەبیریەتی کە ئەو کاتە خوا وتووێژی لەگەڵ کردبێو ، کردبێتیە شایەد لەسەر خۆی ؟ بێگومان کەس بۆی نیە ئیددیعای وا بکات ، کە شتێکی وای لەبیرە .

٢ / خوای باڵادەست دەفەرموێ : ئێوەم لە نوتفە (نطفة) دروست کردوە ، ئنجا ئەگەر ئەوکاتە خوا دروستی کردباین بەبێ نوتفە ، ئەوکاتە ئەوەی کە خوا دەفەرموێ : ئێوەم لە نوتفە دروست کردوە ، دوایی لە (علقة)و دوایی لە (مضغة)و پێ بە پێ ، ئەوە ڕاست دەرنەدەچوو ، وە لەگەڵ ئایەتەکەدا تێکدەگیرا !

٣ / بێگومان بە پێی یاساکانی خوا لە ژیانی مرۆڤدا ، نابێ لە گەردێکی بچووکدا ، ژیان هەبێو عەقڵ هەبێو ، ئیرادە هەبێو ، وتووێژ بکات لەگەڵ خوای پەروەردگاردا ، چونکە شتی ئاوا بچووك ، جێی ئەو سیفەتانەی تێدا نابێتەوە .

٤ / سوودی ئەوە کە خوای کاربەجێ بەو شێوەیە پەیمانی لە مرۆڤەکان وەرگرتبێ ، ئەوەیە کە ئینسان ئەوە پەیمانەی لەبیربێ ، کەواتە : ئەگەر لەبیری چووبێ ، مانای وایە سوودەکەی دەچێتەوە هیچێ ، ئنجا هیچ کەسیش لەبیری نیە ، کەواتە : ناگونجێ ئەوە ڕاست بێ ، چونکە خوا ئەوەی بۆ حیکمەتێك کردوەو ، حیکمەتەکەش ئەوەیە ئینسان ئەو پەیمانەی لەبیربێ تاکو بەهۆی ئەو پەیمانەوە ، پابەند بێ بەوەوە کە تەنیا خوا بە پەرستراوو پەروەردگاری خۆی بناسێ ، بەڵام هیچ کەس ئەوەی لەبیر نیە ، کەواتە : سوودەکەی نەهاتە دی .

٥ / بێگومان ئەو دان پێهێنانە لەلایەن مرۆڤەکانەوە، لە کاتێکدا بووە کە نەبوون ، ئنجا کە نەبووبن ، دان پێداهێنانەکەش لە ڕاستییدا جێگای خۆی ناگرێ .

ئنجا با سەرنجی ئایەتەکان بدەین ، کە وەك گوتم : ئەگەر سەرنجی ئایەتەکان بدەین ، زۆر بە ڕوونیی دیارە ، کە ناگونجێ ئەو مانا لێکدانەوەیە ڕاست بێ :

**یەك** : خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ ، نافەرموێ : (مِن آدَمَ) ، وە دەفەرموێ : لە پشتیان ﴿ مِن ظُهُورِهِمْ ﴾ ، نافەرموێ : لە پشتی (مِنْ ظَهْرِهِ) ، وە دەفەرموێ : وەچەکەیان ﴿ ذُرِّيَّتَهُمْ ﴾ وەچەکەیان، نافەرموێ : وەچەکەی (ذُرِّيَّتَهُ) کەواتە : هەمووی بە کۆ هێناون ، نەك بە تاك ، کە بە پێی لێکدانەوەی یەکەم بێ ، دەبووایە هەمووی بە تاك هێنابانایە .

**دوو** : ئنجا خوا دەفەرموێ : ﴿ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ﴾ ، یانی : خوا هەواڵی داوە کە حیکمەتی ئەو شایەدیی دانە ئەوەیە کە بەڵگەیان لەسەر دابنێ ، وە بیانوو براویان بکات ، بەڵام بە تەئکید خوای کاربەجێ زۆر بە روونو ڕاشکاویی دەربارەی پێغەمبەران دەفەرموێ : ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ﴿١٦٥﴾ ﴾ النساء ، واتە : پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسێنەرن ، بۆ ئەوەی خەڵك لە دوای هاتنی پێغەمبەران ، بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا.

کەواتە : بەڵگەی خوا لەسەر خەڵك ، بە ناردنی پێغەمبەرانە (عَلَيهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ، هەروەها بەڵگەی خوا لەسەر خەڵك ، بەهۆی ئەو سروشتەوەیە ، کە لەسەری خوڵقاندوون ، وەك دەفەرموێ : ﴿ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الروم ، وەك دوایی فەرموودەکەش دێنین ، کەواتە : بەڵگەی خوا لەسەر خەڵك ، کە دەبێ هەر ئەو بپەرستنو ، هەر ئەو بە پەروەردگار بزانن : پێغەمبەرانن کە پەیامەکانی خوایان هێناوە ، پاشان ئەو سروشتو فیطرەتەیە ، کە خوا ﷻ بەندەکانی لەسەر خوڵقاندوە ، نەك ئەوە کە پەیمانی لێ وەرگرتوون ، لە کاتێکدا کە نەبوون .

**سێ** : کە دەفەرموێ : ﴿ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴾ ، تاکو لە قیامەت نەڵێن : ئێمە لەمە بێئاگا بووین .

کەچی ئاشکراشە ئێمە هەموومان لێی بێئاگاین ، نە ئاگامان لەوەیە کە کاتی خۆی چۆن لە پشتی ئادەم هێنراوێنە دەر ، نە ئاگامان لەوەیە کە خوا دوواندووینی ، نە ئاگامان لەوەیە کە خوا ئێمەی لەسەر خۆمان کردۆتە شایەد ، کەواتە : هیچ کەس ئەوەی لەبیر نیە ، لە حاڵێکدا کە خوا دەفەرموێ : ئەوەمان بۆیە کرد ، تاکو لە ڕۆژی دوایی نەڵێن : ئێمە لەوە بێئاگا بووین ، کەواتە : دەبێ ئەو پەیمان لێوەرگیرانە ، پەیمانێك بێ هەموومان لەبیرمان بێ ، ئەویش چییە ؟ ئەوەیە کە خوا ﷻ ئێمەی وا دروست کردوە ، بیناسین ، ئەویش ئەو سروشتەیە کە ئێمەی لەسەر خوڵقاندوە ، ئەوەش هەموومان دەیزانین ، بەڵام ئەوی دیکە ، هیچ کەس لەبیری نیە ، کەواتە : ئەوە هیچ حەقیقەتی نیە .

**چوار** : کە دەفەرموێ : ﴿ أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ ۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ ، باشە ئەو کاتە کە بابو باپیرانیان نەبوون ، ئەدی چۆن خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ئێستا ئەو پەیمانەم لێ وەرگرتن بۆ ئەوەی نەڵێن : بابو باپیرانمان لە پێش ئێمەدا هاوبەشیان بۆ خوا پەیدا کردوە ، خۆ بابو باپیران ئەو کاتە نەبوو ون !

وە پاشان کە دەفەرموێ : ﴿ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴾ ، ئەو کاتە نە هەقداران (مُحِقّون) هەبوون ، نە ناهەقان (مُبْطِلُون) هەبوون ، بەڵکو (مُبْطِلُون) ئەو کەسانەن کە دوای هاتنی پێغەمبەران نکووڵییان کردوەو لاملییان کردوە ، لەو بەرنامانەی کە ئەوان هێناویانە .

**پێنج** : وە شتێکی دیکە کە زۆر ڕوونو ئاشکرایە : ئەگەر مەبەست لە ئایەتەکە پشتی ئادەم بێ ، دیارە مرۆڤەکان تەنیا لە پشتی ئادەم لە دایك نەبوون ،

بەڵکو مرۆڤەکان لە ئادەمو حەووا پەیدا بوون ، کەچی بە هیچ جۆرێك باسی حەووا ناکرێ ، ئاشکراشە کە هیچ مرۆڤێك دروست نابێ ، مەگەر دوای پێکگەیشتنی نێرو مێ ، جگە لە ئادەم ، کە خوای پەروەردگار ڕاستەوخۆ لە خاکی زەوی پەیدای کردوە ، وە جگە لە عیساش کە خوا وەك موعجیزەیەك تەنیا لە دایکی پەیدای کردوە ، ئەگەرنا ئەوانی دیکە یاسای خوا وایە ، لە ژیانی مرۆڤدا دەبێ دایكو باب پێك بگەنو ، ئاوی هەردووکیان تێکەڵ بێو نوتفەی لێ دروست بێ ، ئەوجار ببێتە کۆرپە .

**شەش** : ئنجا خوای پەروەردگار لە چەند شوێنی قورئاندا دەفەرموێ : ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾الزخرف ، واتە : ئەگەر لێیان بپرسی : کێ دروستی کردوون ؟ دەڵێن : خوا ، کەواتە چۆنو بەرەو کوێ ، لادەدرێن ؟!

یان دەفەرموێ : ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴿٣٨﴾ ﴾الزمر ، واتە : ئەگەر لێیان بپرسی : کێ ئاسمانەکانو زەوی دروستی کردوون ؟ دەڵێن : خوا ؟

ئنجا ئا ئەمە ئەو شایەدییەیە کە داومانەو ، ئەوە بەڵگەیە لەسەرمان ، کە دیارە هەمیشە پێغەمبەران خوایان بەبیر خەڵك هێناوەتەوە ، وەك دەفەرموێ : ﴿ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ...﴿١٠﴾ ﴾إبراهيم ، واتە : ئایا لە پەیداکەری ئاسمانەکانو زەوی دا گومان هەیە ؟ ئەوە ئەو شایەدیی دانو ، لەسەر خۆکرانە شایەدیە ، کە خوای پەنهانزان هەواڵی پێداوەو، هەمووشمان دەیزانین ، بەڵام ئەوی دیکە ، وەك گوتم : کەس لەبیری نیە.

**حەوت** : بەڵگەیەکی دیکە ئەوەیە کە ئەگەر تەماشا بکەین ، خوای دادگەر دەفەرموێ : ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ ، خوای پەروەردگار ئەو پەیمان لێ وەرگیرانەی بە (آيات) تەعبیر کردوە ، (آيات)

چییە ؟ دەڵێ : (الآية : هِيَ الدَّلاَلَة الوَاضِحَة البَيِّنَة المستلْزِمَة لِمَدْلُولَه بحَيْثُ لاَ يَتَخَلَّفُ عَنْها المدْلُول) واتە : (آية) واتە : نیشانە ، ئەو ڕێنماییە ڕوونو ڕاشكاوو بێ چەندو چوونەیە ، كە دەرەنجامەكەی خۆی پەلكێش دەكاتو ، نابێ لێی دوا بكەوێ .

ئنجا ئێمە دەڵێین : كەسێك كە شتێكی لەبیر نیە چۆن دەگونجێ بە ئایەت تەعبیری لێ بكرێ ؟ بەڵام ئێمە كە دەڵێین : خوا مرۆڤەكانی وا دروست كردوون كە بیناسنو ، هەر ئەو بە خاوەنو پەروەردگاری خۆیان بزانن ، ئا ئەوە ئایەتی خوایەو ، شتێكی ئاشكراو ڕوونە ، وە بەڵگەیە لەسەرمان .

(عبد الرّحمن بن ناصر السّعدي) لە دوا دوای قسەكانیدا دەربارەی ئەوە ڕایە ، كە ئێمەش پووچەڵمان كردەوە ، دەڵێ : (فَإِنَّ هَذَا العَهْدَ وَالميثَاقَ الَّذِي ذَكروا أَنَّهُ حِينَ أَخْرَجَ اللهُ ذُرِّيَّةَ آدَم مِنْ ظَهْرِهِ حِينَ كانُوا فِي عَالم الذرّ، لا يَذْكُرُهُ أَحَدٌ وَلاَ يَخْطر بِبَال آدَمِيٍّ ، فَكَيْفَ يَحْتَجُّ اللهُ عَلَيْهِم بأَمْرٍ لَيْسَ عِنْدَهُمْ بهِ خَبَرٌ ولا عَيْن وَلا أَثَر ؟)[١] ، واتە : ئەو پەیمانو گرێبەستەی كە دەڵێن : كاتێك خوای بەرز وەچەی ئادەمی لە پشتی دەرهێناوە ، لێی وەرگرتوون ، كە لەو كاتەدا لە دنیای گەرد (عالم الذر)دا بوون ، هیچ كەس نە لەبیریەتی ، نە بە دڵی دادێ ، وە هیچ كەس ئاگای لێی نیە ، وە هیچ كەس هیچ هەواڵو شوێنەوارێكی لەبارەیەوە نیە ، ئنجا چۆن خوا ئەوەیان لەسەر دەكاتە بەڵگە ؟

دەربارەی فەرموودەكەش (جمال الدين القاسمي) كە ئەویش لە (إبن كثير)ەوە وەریگرتوە ، بۆ پشتگیری ڕای دووەم ، دەڵێ : (وَأَمَّا الأَخْبَار المرْوِيَّة فِي إِخْرَاجِ الذُّرِيَّة مِنْ صُلْبِ آدَم وَتَكْلِيمِهِ إِيَّاهُمْ وَنُطْقِهم ثُمَّ إِعَادَتِهم إِلى صُلْبِ أَبيهم ، فَغَيْرُ صَحِيحَةِ الإِسْنَاد ، وَمَا حَسُنَ مِنْها فَغَيْرُ صَرِيحٍ بذَلِك بَلْ هُوَ أَقْرَبُ إِلى أَلفَاظُ الآية كَمَا بَيَّنَهُ الحَافظ إِبْنُ كَثير)[٢] ، واتە : ئەو هەواڵانەی كە لەوبارەوە دەگێڕدرێنەوە ، كە خوا وەچەی ئادەمی لە پشتی ئادەم دەرهێناوە ، دوایی قسەی لەگەڵ كردوونو ئەوانیش قسەیان كردوەو ، دوایی گێڕاونیەوە بۆ

---

١) تيسير الكريم الرّحمن في تفسير كلام المنّان : ص ٣٠٨.

٢) محاسن التأويل ، ج ٥ : ص ٢٩٤.

پشتی بابیان ، ئەوە لە ڕووی سەنەدەوە ڕاست نین ، وە ئەوانەش کە سەنەدیان باشە (نەك ڕاست) ئەوە ڕاشکاو نین بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستە ، بەڵکو لە مانای ئایەتەکەوە نیزیکترە ، وەك ( ابن کثیر) باسی کردوە.

ئنجا (إبن کثیر) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ : (قَالَ القَائِلُونَ مِنَ السَّلَفِ وَالخَلَفِ : إنَّ المرَادَ بِهَذَا الإشْهَادِ ، إنَّمَا هُوَ فَطْرُهُمْ عَلَى التَّوْحِيدِ : ﴿ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ ﴾ ، أي : أَوْجَدَهُم شاهِدِينَ بذَلِكَ ، قَائِلِينَ لَهُ حَالاً وَقَالاً ، وَالشَّهادَةُ تَارَةً تَكونُ بالقَوْلِ ، كَمَا قَالَ : ﴿ قَالُواْ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ﴿١٣٠﴾ ﴾الأنعام ، وَتَارَةً تَكونُ حَالاً كَمَا قَالَ : ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُواْ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ﴿١٧﴾ ﴾التوبة ، أي : حَالهم شاهِدٌ عَلَيْهِم بذَلِكَ)[1] ، واتە : زانایانی پێشینو پاشین گوتوویانە : مەبەست لەو لەسەر خۆ شایەد کردنە ، ئەوەیە کە خوای کاربەجێ بەندەکانی بە جۆرێکی وا دروست کردوە ، کە لەسەر تەوحیدو خواپەرستیی بن ، وە ئەوە کە دەفەرموێ : ﴿ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ ﴾ ، وای هێناونە دی کە شایەدبن بەسەر خۆیانەوە ، وەك بە زمانی حاڵ ، ئەوەیان گوتبێ ، ئنجا شایەدییدانیش جاری وایە بە قسە دەبێ ، وەك خوا لەسەر زاری وان دەفەرموێ : ﴿ قَالُواْ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ﴿١٣٠﴾ ﴾الأنعام ، گوتیان : بەڵێ ئێمە شایەدییمان لەسەر نەفسی خۆمان دا ، وە جاری وایە بە زمانی حاڵە ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُواْ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ﴿١٧﴾ ﴾ التوبة ، هاوبەش بۆ خوادانەرەکان بۆیان نیە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە ، لە حاڵێکدا کە شایەدیی لەسەر خۆیان دەدەن ، بە کوفر ، واتە : حاڵەکەیان شایەدە لەسەر کوفرەکەیان .

---

١) المصباح المنير ، في تهذيب تفسير ابن كثير : ص ٥١١ .

ئنجا دیارە فەرمایشتی پێغەمبەریش لەوبارەوە زۆرن ، یەکێك لەو فەرموودانە ئەوەیە : ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ : النَّبِيُّ ﷺ : مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ ، كَمَا تنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ ، فَهَلْ تَرَونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ﴾ {رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم : (١٣٥٩) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٦٦٩٩) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (٤٧١٤)} ، واتە : ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : هەموو منداڵێك لەسەر سروشتی خواپەرستیی‌و خواناسیی لە دایك دەبێ ، دوایی دایك‌و بابی دەیکەنە جوولەکە ، یان دەیکەنە نەصرانیی ، یان دەیکەنە ئاگرپەرست ، (وێنە دێنێتەوەو دەفەرموێ :) وەك چۆن بەچکەی ئاژەڵ کە لە دایك دەبێ ، بە ساغ‌و سەلامەتیی لە دایك دەبێ ، ئایا هیچی دەبینن : گوێی بڕا بێ ، یاخود داغ کرا بێ ؟

نەخێر ، بەڵکو دوایی بەشەر دەستکاریی دەکات ، واتە : بەشەر لە ئەسڵی خیلقەت‌و فیطرەتیدا خواناسە ، بەڵام دوایی ژینگە دەیگۆڕی ، کە لێرەدا پێغەمبەر ﷺ باسی دایك‌و باب دەکات ، لەبەر ئەوەیە کە باب‌و دایك نیزیکترین کەسن بۆ کارتێکردنی ئینسان ، ئەگەرنا مەبەستی دەوروبەرە ، دوایی دەوروبەر دەیگۆڕێ‌و بە ئاڕاستەی خراپ‌و لاردا دەیبات .

هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ﴿قَالَ الله إِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَا أَحْلَلْتُ لَهُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم : (٧٣٨٦) ، عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ الْمجَاشِعِيِّ} ، واتە : خوا ﷻ فەرموویەتی : من بەندەکانی خۆم پاك‌و چاك دروست کردوون ، بەڵام دوایی شەیتانەکان هاتن لە دینەکەیان ، (واتە : لەو سروشتەی کە لەسەری دروست کرابوون) لایاندان ، وە ئەوەی کە بۆیانم حەڵاڵ کردبوون ، لێیان قەدەغە کردن.

کەواتە : ئەوە مانای ڕاستی ئایەتە موبارەکەکانە ، کە خوای کاربەجێ مرۆڤەکانی بە جۆرێك دروست کردوون ، کە خوای خۆیان بناسن ، وە بیپەرستن ، بە مەرجێك ژینگەو دەوروبەرو بارودۆخو دایك‌و باب لە مرۆڤ بگەڕێن ، مرۆڤ خواپەرست‌و خواناسە ، ئەوە مەبەستی ئایەتەکانە ، یانی : مرۆڤەکان بە زمانی حاڵ شایەدیيان لەسەر خۆیان داوە .

**مەسـەلەی دووەم** : کـە خـوا دەفـەرموێ : ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ ﴾ ، ئەمە بەسەرهاتی دووەمە ، زانایان دەربارەی ئەوە کە ئایا : ئەو کەسە کە خوا دەربارەی دەفەرموێ : ﴿ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا ﴾ ، کەسێکی دیارییکراو بووە ؟ وە ئایا ئەو کەسە کێ بووە ؟ ناوی چی بووە ؟ وە ئەگەر دیاریی نەکراو بووە ، چۆن خوای پەروەردگار وای فەرمووە ؟ لەوبارەوە زانایان ڕا جیاییان هەیە :

زۆربەی تەفسیرەکان دەڵێن : پیاوێك بووە لە پێش ئیسلام دا ، هەندێك دەڵێن : لە سەردەمی مووسا دابووە ، وە هەندێکیان دەڵێن : دوای مووسا بووە ، بە ناوی (بَلْعَمْ) یان (بَلْعَام بْنُ بَاعُورا) وە زۆر شارەزا بووەو ، دوعاشی قبووڵ بووە ، بەڵام دوایی زانیارییەکەی‌و دوعا قبووڵ بوونەکەی ، بۆ دژایەتی مووساو بەرژەوەندیی خۆی‌و بۆ دنیا بەکارهێناوە ، ئیدی سەرەنجام خوای دادگەر لێی تووڕە بووەو غەزەبی لێ گرتوە .

وە هەندێکی دیکەش لە زانایان دەڵێن : مەرج نیە خوای پەروەردگار مەبەستی پێی شەخسێکی دیارییکراو بێ ، بەڵکو مەبەستی پێی نموونەی زانای خراپ (عَالم السوء)ە ، وەك (أَبُو حَامِد الغَزَالي) لە کتێبە ناودارەکەی خۆی (إحياء علوم الدين)دا بە زانایانی چاك دەڵێ : (عُلَمَاءُ الآخِرَة) ، وە بە زانایانی خراپ دەڵێ : (عُلَماء الدنيا) ، (العلماء السوء) واتە : ئەوانەی کە زانیارییەکەیان بەکاردێنن بۆ وەدەست هێنانی بەرژەوەندیی دنیایی ، وە خۆیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن ، بە ئەهلی دنیا .

ئنجا با تەماشا بکەین : خـوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا ﴾ ، وە هـەواڵی ئـەو کەسـەی کـە ئـایەتاکـانی خۆمانمـان پێـدا بـوون ، بەسەریان دا بخوێنەوە ، پێشتریش باسمان کرد : ئایەتەکانی خۆمانمان پێدابوو ، واتـە : (عَلَّمْـنَاهُ آيَاتِنَا) یاخـود (عَلَّمْنَاهُ شَرِيعتنا) ئـایەتەکـانی خۆمانما فێـرکرد ، وامان لێکردبوو ، کە شارەزا بێ لە ئایین و بەرنامەو شەریعەتی ئێمە ، کە ئایەتەکـان گـرتوویانەتە خۆیان ، واتە : مەرج نیە خـوای زانـا ڕاستەوخـۆ ئایەتەکـانی پێدابن ، چونکە خـوا ﷻ ئایەتەکانی خۆی ، ئەو ڕستەو بڕگانەی کە فەرمایشتەکەی پێکدێنن ، ڕاستەوخۆ تەنیا بە پێغەمبەرانیان (عليهم الصلاة والسلام) دەدات ، ئنجا خـوای پەروەردگاریش بۆی باس نەکردووین ، کە هیچ پێغەمبـەرێك تووشی لادان و تووشـی گوناهێکی بە ئەنقەسـەت بووبـێ ، بەڵـێ هەڵەیان کـردوە ، ئیجتیهادێکیان کـردوەو تێیدا بە هـەڵەدا چوون ، وەك پێغەمبـەر یونس سـەلامی خـوای لـێ بـێ ، کـاتێك ئیجتیهادی کرد بە بۆ چوونی خۆی پێی وابوو ، ئەگـەر خەڵـکی نەینـەوا بـەجێ بهێڵێ و بچێ بۆ شـوێنێکی دیکە ، بانگەواز بکات ، ئـاسـاییە ، بـەڵام بـەبێ مۆڵـەتی خـوای پەروەردگـار ئـەو کـارەی کـرد ، دوایـی خـوا ﷻ سـزای دا ، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ ﴿٨٧﴾ ﴾الأنبياء ، واتـە : وە زەننوون کـاتێك کە تووڕە بوو لە گەلەکەی و ڕۆیشـت ، وە پێـی وابـوو کـە زەوییمـان لـێوە تەنگ نەهێناوە ، کە دەبێ هەر لەوێوە کاری خۆی بکات ، وە پێی وابوو بچـێ بۆ هەر شـوێنێکی دیکە هەر بۆی دەگونجـێ ، ﴿ فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ ﴾ ، یانی : (فَظَنَّ أَن لَّن نُّضَيِّقَ عَلَيْهِ) ، پێی وابوو کە مەیدانی کارەکەمان ، لـێوە تەنگ نەهێنـاوە ، کە دەبـێ هەر لـەوێ بـێ ، پێی وابوو کە بچێ بـۆ هـەر شـوێنێکی دیکە هـەر دەبـێ ، بـەڵام ئـەوە ئیجتیهادێـك بـوو کە نەیپێکـابوو ، بۆیـە خـوای پەروەردگـار لەسـەر ئـەوە سـزای داو ، ماسی قووتی دا .

کەواتـە : لێرەدا ﴿ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا ﴾ ، واتە : ئایەتـەکانی خۆمانمان فێر کردبوون ، وە شـارەزامان کـردبوو لە شـەریعـەت ، ئنجا ئـەو چی کـرد ؟ ﴿ فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا ﴾ ،

واتە : لە خۆی دارنین ، كە زانایان دەڵێن : (تَرَكَهـا وَأَهْمَلَهـا) وازی لە ئایەتەكان هێناو پشت گوێی خستن ، وە (خَلَعَهـا كَمَا يُخْلَعُ اللِّبَاس) لە خۆی دارنین ، وەك چۆن بەرگو پۆشاك دادەرنرێ .

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوەیە كاری پێنەكردن ، بەلام خوا ﷻ بۆمان دەخاتە قاڵبێكی وێنەیی یەوە ، وەك چۆن كەسێك پۆشاك دادەرنێ ، یان چۆن مار كیفێك لە خۆی دادەرنێو فرێی دەدات ، ئەویش بەو شێوەیە ئایەتەكانی خوای بێ هاوەڵی لە خۆی دارنین ، كە پۆشاكێك بوو جوانیان كرد بوو ، وە عەیبیان پۆشیبوو لەبەرچاوی خەڵك ، كەچی ئەو پۆشاكەكەی دارنی ، وە فرێیدا.

ئنجا كە وای كرد چی روویدا ؟ ﴿فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ ، (ف) دیارە بۆ بەدوادا هاتن (تعقیب)ە ، واتە : یەكسەر كە ئایەتەكانی لە خۆی دارنین ، ئایەتەكانی واز لێهێنان ، واتە : كاری پێنەكردن ، شەیتانیش بە دوای كەوتوو گرتی ، چونكە (تَبِعَهُ) واتە : شوێنی كەوت ، بەلام (أَتْبَعَهُ) یانی : شوێنی كەوتوو گرتیشی .

تاكە شتێك كە دەبێتە سوپەرو قەڵغانی مرۆڤ لە بەرانبەر شەیتاندا ، بریتیە لە بەندایەتیی یەكەی بۆ خواو ، دەست گرتنی بە هیدایەتی خواوە ، بۆیە كاتێك واز لە هیدایەتی خوا دێنێو ئایەتەكانی خوا پشتگوێ دەخات ، شەیتان زەفەری پێ دەبات ، ﴿فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ﴾ ، یەكسەر لە بێ مرادان بوو ، لە سەرگەردانان بوو ، پێشتر باسمان كردوە : كاتێك ئینسان گومرا دەبێ ، بێ ئاكامو ، بێ مراد دەبێ ، وە سەرگەردانو سەرلێشێواو دەبێ ، بە پێچەوانەشەوە : كاتێك ئینسان رێی راست دەگرێ ، بە ئەنجام دەگاتو بە ئاكام دەگات ، بۆیە بێمرادیی (غـواية) بەرهەمی گومراییە ، هەروەك سەرراستی (رشـد)یش بەرهەمی رێنمایی یە.

ئنجا كە دەفەرموێ : ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا﴾ ، وە ئەگەر ویستبامان بەو ئایەتانە بەرزمان دەكردەوە ، ئەوە مانای چییە ؟ ئەدی بۆچی خوای پەروەردگار نەیویست بە ئایەتەكان بەرزی بكاتەوە ؟ ئەو رستەیە ماناكەی ئاوایە : (وَلَو

شِئْنَا إِجْبَارَهُ عَلَيْهَا لرَفَعْنَاهُ بِهَا) واتە : ئەگەر ویستبامان زۆری لێ بکەین و ، بەتۆبزیی پابەندی بکەین ، بە ئایەتەکان بەرز دەبۆوە ، بەلام دیارە خوا ﷻ یاسای وایە لە ژیانی مرۆڤدا ، کە مرۆڤەکان ئازاد دەکات و سەرپشکیان دەکات ، هەڵبژاردن بە دەست خۆیان بێ ، نەك لەسەریان فەرز بکات ، چونکە ئەگەر خوا ﷻ رێی راست گرتن ، یان رێی چەوت گرتن ، لەسەر مرۆڤەکان فەرز بکات ، مانایەك بۆ ژیانی دنیا ، بۆ حیکمەتی ژیانی دنیا ، شوێنی تێیدا تاقی کردنەوەی مرۆڤەکانە ، نامێنێ .

﴿ وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ﴾ ، بەلام خۆی بە زەوییەوە نووساند ، وە شوێنی ئارەزووی خۆی کەوت .

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئینسان بە ئایەتەکانی خوای بەخشەر بەرز دەبێتەوە ، بەلام بە وازلێ هێنانی لە ئایەتەکانی خواو شوێن کەوتنی ئارەزووەکانی ، نزم دەبێتەوە ، بە هەموو شێوەیەك ، وە لە هەموو رووێکەوە ئینسان نزم دەبێتەوەو ، تووشی عەیبداریی و گوناهباریی دەبێ .

پاشان خوای بێ هاوتا وێنەیەك دێنێتەوە ، بۆ بەرجەستەکردنی حاڵی ئەو کەسە ، کە چۆنە لە تەرازووی خوادا ؟ دەفەرموێ : ﴿ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ﴾ ، وێنەی ئەو کەسە ، وەك وێنەی سەگ وایە ، ئەگەر زۆری بۆ بێنیو ، وە تینی بۆ بێنیو بە دوای بکەوی ، هەر زمانە شۆڕەیەتی و هەناسە برکەیەتی ، وە ئەگەر وازیشی لێ بێنی ، هەر زمانە شۆڕەیەتی و هەر هەناسە برکەیەتی ، واتە : ئەو زانایە خراپە کە لە دینی خوا لادەدات ، دنیای دەست بکەوێ ، هەر بە دوای دادەچێ و هەر تەماعی هەیەو ، تێر ناخوات و ، ئەگەر دەستیشی نەکەوێ ، هەر بە هەمان شێوەیە ، وەك چۆن سەگ لەبەر ئەوەی نوقسانییەکەی نوقسانییەکی زاتییە ، واتە : کە کۆئەندامی هەناسەی تەواو نیە ، وە پلەی گەرمی لەشی بەرزە ، زمانی دەردێنێ بۆ ئەوەی کە پلەی گەرمی لەشی تۆزێ دابەزێنێ ، ئنجا تۆ بە دوای بکەوی و راوی بنێی و ماندوو بێ ، هەر زمان دەردێنێ ، وە هەناسە برکەیەتی ، وە لێشی گەرێی ،

هەر وایە ، واتە : ئینسان کاتێك لە دینی خوا لادەدات ، بە هیچ شتێك تێر نابێ ، دنیای دەست بکەوێ ، یان دەست نەکەوێ ، هەر چاوبرسییو چاو لە دەستە.

پاشان دەفەرموێ : ﴿ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ، ئەوە خراپترین وەسفو وێنەیە ، بۆ کەسانێك کە بە ئایەتەکانی ئێمە بێبڕوا بوون .

بەڵێ بە ڕاستیی شوبهاندنی مرۆڤ بە سەگەوە ، خراپترین وێنەیە ، دیارە خوا ﷻ لە قورئاندا هیچ کەسی بە (سەگ) نەچواندوە ، جگە لە زانای خراپ ، هەروەها هیچ کەسێکی بە (کەر) نە چواندوە ، جگە لە زانای خراپ ، وەك لێرەدا کە دەفەرموێ : ﴿فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ﴾ ، وێنەی وەك وێنەی سەگ وایە ، لە ئایەتی (٥)ی سوورەتی (الجمعة)شدا بە زانایانی خراپ دەفەرموێ : ﴿كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا﴾ ، واتە : وێنەیان وەك وێنەی کەر وایە ، کە بارە کتێبێکی لەسەر پشتن ، بەڵام بێگومان کەر ئەگەر بارە کتێبی لێ بارکەی ، خۆی هیچ لێی بەهرەمەند نابێ ، زانای خراپیش هەرچەندە زانیاری پێ بێ ، مادام کار بە زانیارییەکەی نەکات ، وەك گوێدرێژێك وایە ، کە بارێك کتێبی لێ بارکراوە !

بێگومان ئەم مەسەلەیە زۆر جێگای هەڵوەستەو ، ڕامانە : ئەهلی عیلم دەبێ زۆر لە خۆیان وریا بن ، چونکە کاتێك لادەدەنو خراپ دەبن ، لە هەموو خەڵکی خراپترن ، هەروەك چۆن کاتێك چاکیش دەبن ، لە هەموو خەڵك چاکتر دەبن ، ئەگەر چاك بن پێغەمبەر ﷺ دەربارەیان دەفەرموێ : ﴿إِنَّ الْعُلَمَاءُ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم : (٢١٧٦٣) ، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم : (٣٦٤١) ، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم : (٢٦٨٢) ، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم : (٢٢٣) ، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم : (٨٨) ، وَالبَيْهَقِيّ في (شُعَبِ الإِيْمَان) بِرقم : (١٦٩٦)} ، واتە : بێگومان زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن ، واتە : لە پێغەمبەران بێتە خوار ، زانایانن ، کەسانێك کە زانای ڕاستەقینە بن ، چاكو ڕاستو ساغ لێی تێگەیشتبن ، وە باشیش پێوەی پابەند بن ، وە هیچ مانایەك بۆ میرات لێگرتنی پێغەمبەر ﷺ نامێنێتەوە ، ئەگەر ئینسان

هەوڵنــەدا بــاش تێبگــات لــەو عــیلمو پەیامــەی کــە پێغــەمبــەری خــوا ﷺ جێــی هێشــتوە، بــە قووڵیــی فــراوانییو ڕاســتو ســاغــییو، بـەبــێ دەمارگیـریــی بـۆ ڕای فـــلانو ڕای فیســـار، ئـنجــا کەســێك وابــێ، لــە هــەموو کەسـێك باشــتــرە، وە کەسێکــیش لابــدات، واتــە: زانـــا بــێو شــارەزا بــێ، بــەڵام لابــداتو کــار بــە زانیارییەکەی نەکـات، لـە هـەموو کـەس خراپـتــرە، بـە بەڵـگەی ئـەوە کـە خــوا تەشبیهی دەکات بە سەگەوە، وە تەشبیهی دەکـات بـە کـەرەوە، واتـە: لـە پیسییدا وەك ســەگی لێدێو، لــە نەفــامییو کـەودەنییــدا، وەك کــەر تەماشــا دەکـرێ، وەك دەڵێن: وەك سەگی پیس وایە، وە ئەگەر یەکێك کەسێکی زۆر پــێ نەفام بــێ، بە کـەری دەشوبهێنــێ، بەڵــێ بە دڵنیاییــەوە ئــەم مەسەلەیــە: دەرسو عــیبــرەتێکی گەورەی تێدایە بۆ زانایان، کە دەبــێ زۆر لە خۆیان وریــابنو، وە هــەوڵبــدەن ئـەو پایە بـەرزەی کە خـوا بۆی داناون، کە میـراتگـرێتیـی پێغـەمبـەرانەو، جێگـرایەتیــی پێغـەمبەرانە، پارێـزگاریی لـێ بکـەن، وە شـــۆڕ نەبنـــەوە بـۆ ئـەو ئـاسـتـە نزمـەی، کـە بـە ســەگو بـە کـەر بچوێنـرێـن.

لـە کۆتـایی دا خــوا دەفـەرموێ: ﴿ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، بـەسـەرهــاتان بگێــڕەوە، بـەڵکــو بیــر بکـەنــەوە، واتــە: بـەسـەرهــات گــێڕانەوە، ئەگــەر بیـرکردنــەوەی تێــدا نەبــێ، ئــەوە وەك دەڵـێن: دەبێتــە حیکــایەتی بــەر ئـاگـردان، ئـەو بـەسـەرهـاتانە خــوای پەروەردگــار کە دەیانگێڕێتــەوە، هەموویــان پەندیان تێدایە بۆ خـاوەن عەقـڵان، بـەڵام خاوەن عەقـڵان، کەی پەند وەردەگــرن؟

کـاتێــك ورد ببنــەوەو، تێفـکــرن: ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، ئینســان ئەگــەر ورد نەبێتــەوەو لــە شـــتەوە ڕانەمێنـــێو هەڵوەســـتە نەکــات، هــەروا بــە سەرکێڵــیی بـەسـەریدا بـڕواتو بـەس تەماشای ڕواڵەت بکـات، وەك بــە داخـەوە زۆر کـەس ئــاوا مامـەڵـە دەکـەن لەگـەڵ دەقـەکـانی قورئــانو ســوننەت داو، لــێیان ورد نـابنـــەوە، ناچنـە ناخیانەوە، ئـەوە لە ڕاسـتییـدا عیبـرەتو پەنـد وەرنـاگـرێ.

<u>**مـەسـەلــەی سـێیــەمو کۆتــایی**</u>: کــە دەفـەرموێ: ﴿ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِيۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾، هـەر کەسێك خوا ڕێنمایی بکـات، هـەر

ئـەوە ڕێـی ڕاسـت گـرتـوە ، وە هــەر کەسـێکیش ئـەو گـومڕای بکـات ، هـەر ئـەوان زیانبارانـن .

دیارە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ هـەر وتـارێکی داوە ، باسـی ئـەو ڕاسـتییە مەزنـەی تێدا کـردوە ، وەك لە فەرموودەیەکدا هاتوە ، کە ئەمـە دەقەکـەیەتـی : ﴿عَنْ جَابِرِ بْـنِ عَبْـدِ اللهِ ، قَـالَ : كَـانَ رَسُولُ اللَّـهِ ﷺ يَقُـولُ فِي خُطْبَتِهِ يَحْمَدُ اللَّـهَ وَيُثْنِي عَلَيْـهِ بِمَا هُوَ أَهْلُـهُ ثُمَّ يَقُولُ : مَنْ يَهْـدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَـهُ ، وَمَنْ يُضْـلِلْهُ فَلا هَـادِيَ لَـهُ ، إِنَّ أَصْدَقَ الْحَـدِيثِ كِتَـابُ اللهِ ، وَأَحْسَـنَ الْهَـدْيِ هَـدْيُ مُحَمَّـدٍ ، وَشَـرُّ الأُمُـورِ مُحْدَثَـاتُها ، وَكُلُّ مُحْدَثَـةٍ بِدْعَـةٌ ، وَكُلُّ بِدْعَـةٍ ضَـلاَلَةٌ ، وَكُلُّ ضَـلاَلَةٍ فِي النَّـارِ ، ثُمَّ يَقُـولُ : بُعِثْـتُ أَنَا وَالساعَةُ كَهَـاتَيْنِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم : (١٤٣٧٣) ، وَمُسْلِمٌ بـرقـم : (٨٦٧) ، وَالنَّسَـائِيُّ بـرقم : (١٥٧٨) ، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم : (٤٥)} ، واتـــە : جابیـری کوڕی عەبدوڵلا خـوا لـێیان ڕازی بـێ ، دەگـێڕێتـەوە ، دەڵـێ : پێغـەمبـەری خـوا ﷺ لە وتـاریـدا عـادەتـی وابـوو ، سـتایشـی خـوای دەکـرد ، وە مـەدحی خـوای دەکرد ، بـەو شێوەیە کە خـوا شایستەیەتـی ، پاشـان دەیفـەرموو : هەر کەسێك خـوا ڕێنمـایی بکات ، هیچ گومڕاکاری بـۆ نـابـن ، وە هـەر کەسێك خـوا گـومڕای بکـات ، هیچ ڕێنـمـایی کـاری بۆ نابـن ، ڕاسـتتـرین قسـە کتێبـی خـوایە ، وە باشـتـرین ڕێو شـوێن ، ڕێو شـوێنـی موحەممەدە ﷺ ، وە خراپتـرین شت پەیداکراوەکـانن (واتـە : پەیداکـراوەکـانن لە دینـداریـیـدا) وە هـەموو پەیداکـراوێکیش داهێـنـانە ، وە هــەموو داهێنـانێکـــیش گومڕاییـــە ، وە هــــەموو گومڕاییـەکـــیش لـــە ئـاگـــردایە ، دوایـــی دەیفـەرموو : مـنو هـاتنــی ڕۆژی دوایـی ئـاوایــن ، وە ئــاماژەی دەکـرد بــە هــەردوو پەنجەی (واتــە : پەنجـەی شـایەتـمانیو پەنـجەی نێوەڕاســتـی).

دیـارە پێشــتـریش باســمان کـرد ، کـە خـوا ﷻ دەفـەرموێ : هــەر کەسێك خــوا ڕێنمـایی بکـات ، هــەر ئــەو ڕێــی ڕاسـتی گـرتوە ، وە هـەر کەسێك گومڕای بکـات ، ئەوانــە لـــە زیـانبـارانـــن ، بێگـــومان خـــوا ﷻ لـەگـۆتـــرە کـــەس ڕێنمـــایی ناکـــات ، هــەروەك کەسـیش لەگـۆتـــرە سـەرگـــەردانو سـەرلـێشـــواو ناکـات ، بـەڵـکـو خـــوا ﷻ بەگوێـرەی یاسـایەکانی خـۆی مامەڵـە لەگـەڵ مرۆڤەکـاندا دەکـات ، بـــەڵام بێگـومـان هــەموو شــتێك بــە ویستی ڕەهـای خـوای بـاڵادەسـتـە ، وە هـەموو ئـەو ئـایەتـانەی کە

باسی خواستو ویستی خوا دەکەن : ﴿ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ ﴾ ، وە ﴿ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ ﴾ ، هەمووی بۆ ئەوەیە کە مرۆڤەکان بزانن : خاوەنی ئەو کەونو کائیناتە زاتێکە ، هەموو ئەو شتێکی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە ، ئەویش خوای پەروەردگارە ، وە هیچ شتێك بەبێ ویستی خوای کاربەجێ ، نابێ ، بەلاّم ویستی ڕەهای خوای زاناو تواناش ، لەگەلّ عیلمو حیکمەتو دادگەریی و ڕەحمەتو سەرجەم سیفەتەکانی دیکەی دایە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ .

# دەرسی بیست و دووەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەشت (٨) ئایەتان پێکدێ ، ئایەتەکانی : (١٧٩ ـ ١٨٦) ، دیارە لەو هەشت (٨) ئایەتەدا خوای پەروەردگار حەوت بابەتان باس دەکات ، سەرەتا ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو ، کە ژمارەیەکی زۆر لە جندو مرۆڤانی بۆ دۆزەخ وەدیهێناون ، بەهۆی ئەوەوە کە عەقڵو چاوو گوێیان ، بە باری هەق ناسییدا کار ناکەن ، وە ئەوانە وەك ئاژەڵو بگرە لە ئاژەڵ گومڕاتریش دادەنرێن .

پاشان خوا ﷻ باسی ناوە هەرە چاکەکانی خۆی دەکات ، کە تەنیا بەوان لێی بپاڕێنەوە ، وە خۆیان بپارێزن ، لە لادان لە ناوەکانیدا .

دوایی باسی ئەوە دەکات کە لە نێو بەندەکانیدا ، کەسانی ڕاستڕەوو دادگەر هەن .

ئنجا باسی ئەوە دەکات کە بێبڕوایان بە ئایەتەکانی خوا ، وردە وردە بەرەو سزای خوا پەلکێش دەکرێنو ، بێئەوەی پێی بزانن ، خوا ڕستیان لە دوا درێژ دەکات ، وە بە تەگبیری پتەوی خۆی ، زیاتر بە بیری گومڕایی دا شۆڕیان دەکاتەوە ، لە ئەنجامی ئەوەدا کە شایستەی ئەوەن ، وەك دوایی باسی دەکەین .

دوایی سەرزەنشتی بێبڕوایان دەکات ، کە بۆچی بیر ناکەنەوەو عەقڵی خۆیان بەکارناهێنن ؟ تاکو دڵنیابن کە هاوەڵەکەیان کە موحەممەدە ﷺ کە هەر لەگەڵیان بووەو ، ناسیاونەو لەنێویاندا ژیاوە ، هیچ پەیوەندییەکی بە شێتییەوە نیە ، وە تەنیا ورياکەرەوەو هۆشیارکەرەوەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەوانو ، بۆ هەموو مرۆڤایەتیی .

ئنجـا خــوا مرۆڤـەکــان هــان دەدا بــۆ سـەرنجــدانی موڵکــی فــراوانی خــوا ، لــە ئـاسـمانەکـانو زەویـدا ، وە بـۆ سـەرنـجدانـی هـەر شـتێـکی دیکە کـە خـوا دروسـتی کـردوە ، وە هـانیـاندەدا ، کە بیـر بکـەنـەوە لـەوە کـە ڕەنگـە کـاتی مەرگـیان زۆر نیزیـك بــێ ، وە پێشـیان دەفـەرموێ : ئـەدی ئەگـەر ئیمـان بـە قوڕئـان نەهێنـن ، بڕوا بە چـی دەهێنـن ؟ ئەگـەر ئەو قوڕئـانە گـەورەیە نەبێـتـە هۆی ئیمان هێنـانتـانو ، نەبێتـە هـۆی گـەڕانەوەتـان بۆ لای خــوا ، بـە چـی دیکـە دەگـەڕێنــەوە ؟! واتـە : ناگـەڕێنــەوە .

وە لە کـۆتایی دا خـوا ﷻ ڕایدەگـەیەنـێ : کە هـەر کەسێك خـوا گومڕای بکـات ، هیـچ ڕێنـماییەکـارێکــی نابـــێ ، وە لــێیان دەگـــەڕێ لـــە گێــژاوی یاخـییـبوونـــی خۆیانـــدا بخـولـێنــەوە .

﴿وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا
وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ
أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ١٧٩ وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ
فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٨٠ وَمِمَّنۡ خَلَقۡنَآ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ
يَعۡدِلُونَ ١٨١ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ١٨٢
وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ١٨٣ أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ
إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٌ ١٨٤ أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن
شَيۡءٖ وَأَنۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقۡتَرَبَ أَجَلُهُمۡۖ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ ١٨٥ مَن
يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥۚ وَيَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ١٨٦﴾

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە بــە دڵنیاییـــەوە زۆرێـك لـە جنـدو مرۆڤمـان بـۆ دۆزەخ دروسـت کـردوون ، (چونکە) (عەقڵو) دڵیـان هەن ، پێیـان تێناگـەن ، وە چـاویان هـەن ، پێیـان نـابینن ، وە گوێیـان هـەن ، پێیـان نابیسـتن ، ئەوانــە وەك ئـاژەڵن ، بگـرە گومـڕاتریشـن ، ئـا ئەوانە بێ ئـاگایانـن ﴿١٧٩﴾ وە خـوا ناوە هـەرەباشـەکـانی هـەن ، ئنجـا هـەر بـەوان لێی بپاڕێنەوە ، وە واز لەوانە بێنـن کە لە ناوەکانی (خـوا) لادەدەنو لاڕێ دەبـن ، لەمـەودوا لەسـەر ئـەوەی دەیکـەن ، سـزا دەدرێـن ﴿١٨٠﴾ وە لـە نێـو ئـەو خەڵـکەدا کـە دروسـتمان کـردوون ، کۆمەڵـێك هـەن ، بەهـۆی هـەقەوە ڕێنمـایی خەڵـك دەکـەنو ، بەهـۆی هەقیشـەوە دادگـەریی دەکـەن ﴿١٨١﴾ وە ئەوانـەی بـە ئـایەتەکانمـان بێبـڕوان بێ‌ئـەوەی بـەخۆیـان بزانن ، پەلکێشیان دەکەین (بـەرەو گونـاهی زیـاترو سـزا) ﴿١٨٢﴾ وە مۆڵەتیـان دەدەم (و ڕسـتیان بـۆ درێـژ دەکـەم) بێگومـان پـلانی مـن پتـەوو تۆکمەیـە (بـۆ سـزادانی تاوانـباران) ﴿١٨٣﴾ ئـایا (ئەوانە) بیـریان نەکردۆتـەوە (تاکـو دڵـنیابن کـە) هاوەڵەکـەیـان (موحەممـەد) هـیچ شـێتییەکی تێدانیـە ، ئـەو تـەنیا ئـاگادارکـەرەوەیـەکـی ئـاشـکرایـە ﴿١٨٤﴾ ئـایا سـەرنجیان نەداوەتـە موڵکی فراوانی ئـاسمانو زەویو ، هـەر شـتێك کـە خـوا هێنـاویەتـە دی ! وە ئـایـا (بیـریان لـەوە نەکـردۆتـەوە) کـە ڕەنگـە کـاتی فەوتانیـان نیزیك بـووبێتـەوە ، ئنجا ئـایا دوای ئەو (قورئـان)ە ، بڕوا بـە چ قسـەیـەك دێنـن ! ﴿١٨٥﴾ هـەر کەس خـوا گومڕای بکات ، هیچ ڕێنمـاییـکارێـکی نابـێ ، وە (خـوا) لـێیـانـدەگـەڕێ لە یاخیـیـبوونـی خۆیـاندا بـە سـەرگـەردانیـی بخولـێنـەوە ﴿١٨٦﴾)) .

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ذَرَأْنَا) : (الذَّرْأُ إِظْهارُ اللهِ تَعَالى مَا أَبْدَأَهُ) ، (ذرأ) بریتیە لەوەی خوای بەرز شتێکی کە دروست کردوە ، ئاشکرای بکات ، وە (ذَرَأَ اللهُ الخَلْقَ : أَوْجَدَ أَشْخَاصَهُمْ) ، (ذَرْأ) واتە : هێنانە دیو بەرجەستەکردنی شتەکان لە دنیای واقیعدا .

(قُلُوبٌ) : (جَمْعُ قَلْب وقِيلَ سُمِّيَ بِهِ لِتَقَلُّبِهِ ، وَيُعَبَّرُ بالْقَلْبِ عَنِ المعَانِي الَّتِي تَخْتَصُّ بِهِ مِنَ الرُّوحِ والشَّجَاعَةِ وَالعِلْم) ، (قُلُوب) كۆی (قَلب)ە ، (قَلْب) بۆیە ناوی لێنراوە (قَلْب) چونکە زۆر هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکات ، وە بە وشەی (قَلْب) تەعبیر دەکرێ ، لەو ماناو مەبەستانەی کە تایبەتن پێیەوە ، وەك ڕووحو ئازایەتیو زانیارییو ئەو شتانەی کە پەیوەندیی ڕاستەخۆیان بە ناخی مرۆڤو دەروونی مرۆڤەوە هەیە .

(لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا) : واتە : پێیان تێ ناگەن ، بە دڵەکانیان ، بە عەقڵەکانیان تێ ناگەن ، دەڵێ : (الفِقْهُ : التَوَصُّلُ إِلى عِلْمٍ غَائِب بِعِلْمِ شاهِد ، فَهُوَ أَخَصُّ مِنَ العِلْمِ ، وَالفِقْهُ العِلْمُ بِأَحْكامِ الشَّرِيعَةِ) ، (فِقْه) بریتیە لە گەیشتن بە زانیارییەکی نادیار بەهۆی زانیارییەکی دیارەوە ، واتە : (فِقْه) لە زانیاریی تایبەتترە ، وە (فِقْه) بریتیە لە زانیاریی بە یاساکانی شەریعەت دەگوترێ : (فَقُهَ فَقَاهَةً : صارَ فَقِيهاً) ، واتە شارەزا بوو لە شەریعەتدا ، بەلاّم ئەگەر بگوترێ : (فَقِهَ يَفْقَهُ فَقَاهَةً) واتە : (فَهِمَ) تێگەیشت ، (فَقُهَ) واتە : بوو بە شارەزا لە شەرعدا ، بەلاّم (فَقِهَ) واتە : تێگەیشت بە گشتی لە شەرع ، یان غەیری شەرع .

(كَالْأَنْعَٰمِ) : (الأَنْعَامُ : هِيَ المالُ الرَّاعِيَةُ وخُصُوصا الإِبِلُ) دەڵێ : ئەو ماڵاتەیە کە دەلەوەڕێ بەتایبەتی حوشتر ، هەڵبەتە پێشتریش باسمان کردوە کە

وشەی (الأَنْعَامُ) بۆتە زاراوەیەك بۆ چوار جۆرە ئاژەڵ : حوشتر ، ڕەشە وڵاخ ، مەڕ ، بزن .

(ٱلۡحُسۡنَىٰ ) : (مُؤَنَّثِ)ی (أَحْسَن)ە ، واتە : هەرە باش‌و هەرە جوان .

(يُلۡحِدُونَ ) : (لَحَدَ وَأَلْحَدَ : مَالَ عَنِ الحَقّ) ، (لَحَدَ وَأَلْحَد) هەردووكیان بە مانای لە هەق لایدا ، لاڕێ بوو ، دێن .

(سَنَسۡتَدۡرِجُهُم ) : واتە : لەمەودوا پلە پلە ، وە نیزیكیان دەخەین ، دەڵێ : (نَأْخُذُهُمْ دَرَجَةً فَدَرَجَةً) پلە پلە دەیانگرین ، (وَذَلِكَ إِدنَاؤهُمْ مِنَ الشَّيءِ شَيْئاً فَشَيْئاً) ، ئەویش ئەوەیە كە وە نیزیكیان بخاتەوە ، لەو مەبەستەی كە دەویسترێ وردە وردە ، بە كوردیی دەڵێین : پەلكێشیان دەكەم .

( وَأُمۡلِي لَهُمۡ ) : (الإِمْلاَءُ : الإِمْدَادُ) ، (الإِمْلاَء) واتە : ڕستن لە دوا درێژ كردن ، ﴿ وَأُمۡلِي لَهُمۡ ﴾ ، واتە : (أُمْهِلُهُمْ) واتە : مۆڵەتیان دەدەم ، وە ڕستیان لە دوا درێژ دەكەم .

( كَيۡدِي ) : (الكَيْدُ : ضَرْبٌ مِنَ الإِحْتِيَالِ ، وَقَدْ يَكُونُ مَمْدُوحاً وَمَذْمُوماً ، وَفِي المذْمُومِ أَكْثَرُ . . .) (كَيْد) جۆرێكە لە فێڵ كردن ، وە دەگونجێ باش بێ‌و ، دەشگونجێ خراپ بێ ، دەگونجێ ستایشكراو بێ ، وە دەشگونجێ زەمكراو بێ ، بەڵام بە زۆریی لە حاڵەتی خراپی‌و زەمكراوییدا بەكاردێ ، كە دەفەرموێ : ﴿إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ﴾ ، واتە : تەگبیری منو پلانی من پتەوو بەهێزە .

(مَتِينٌ ) : (مَتُنَ : قَوِيَ مَتْنُهُ فَصَارَ مَتِيْناً ، حَبْلٌ مَتِين : قَوِيٌّ) (مَتْن) واتە : پشت (مَتُنَ ) یانی : (قَوِيَ مَتْنُهُ) واتە : پشتی بەهێز بوو ، (فَصَارَ مَتِيْناً) بەهێز بوو ، وە دەگوترێ : (حَبْلٌ مَتِين) واتە : پەتێكی قایم كە نەپسێ .

(بِصَاحِبِهِم ) : (الصاحِبُ : المـلازِم إِنْسـانًا كـانَ ، أَوْ حَيْوَانـاً أَو مَكـانَاً أَوْ زَمَانَـاً) ، (صاحِب) هەر شتێك كە پەیوەست بێ بە شتێكەوە ، ئنجا مرۆڤ بێ ، یان ژیاندار بێ ، یان شوێن بێ ، یان كات بێ .

(جِنَّةٍ ) : (الجِنَّةُ : الجُنُونُ وَالجُنُونُ : حَائِلٌ بَيْنَ النَّفْسِ وَالعَقْلِ) ، (جِنَّة) واتە : شێتیی ، (جنون)یش پەردەیەكە دەكەوێتە نێوان ئینسان‌و عەقڵەكەیەوە ، عەقڵەكەی ئیش ناكات‌و لە كار دەكەوێ .

(مَلَكُوتِ ) : (الملَكوتُ : مُخْتَصٌّ بِمُلْكِ اللهِ تَعَالَى ، وَهُوَ مَصْدَرُ مَلَكَ ، أُدْخِلَتْ فِيهِ التاء ، نحو : رحموت ورهبوت) ، وشەی (مَلَكوت) تایبەتە بە موڵكی خوای بەرزەوە ، واتە : ناتوانی بۆ غەیری خوا وشەی (مَلَكوت) بەكار بێنی (مَلَكوت الله) واتە : موڵكی فراوانی خوا ، چونكە هەر خوا خاوەنی موڵكی فراوانەو ، ئەوانی دیكە تۆزێكیان هەیە ، ئەویش بە شێوەیەكی كاتیی ، ئنجا وشەی (مَلَكوت) لە ئەسڵدا چاوگی (مَلَكَ)یە ، (مَلَكَ يَمْلُكُ مُلْكا) ، دوایی (ت)ی خراوەتە سەر ، بۆتە (مَلَكوت) ، وەك (رَحِمَ ، يَرْحُمُ ، رَحْمَة ، رَهِبَ ، يَرْهَبُ ، رَهْبَة) ئەوانیش (وت)یان دەخرێتە سەر ، دەبنە (رَحَمُوت ، رَهَبُوت) ، واتە : ڕەحمەتێكی زۆر ، وە ترسانێكی زۆر .

(يَعْمَهُونَ ) : واتە سەرگەردان دەبن ، (العَمَهُ : التَحَيّرُ وَالتَرَدُّدُ ، عَمِهَ يَعْمَهُ فهوَ عَامِهٌ والجَمْعُ عُمَّهٌ) ، (عَمَهْ) بریتیە لە سەرسامیی‌و هاتن‌و چوونێك كە ئینسان بە ڕێ نەزانێ ، دەگوترێ : (عَمِهَ يَعْمَهُ) ، (عَامِهٌ) كەسێكە كە سەرگەردان بێ ، كۆی (عَامِه) ، (عُمَّه)ە .

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خوای پەروەردگـار لـەم ئـایەتانەدا چـەند ڕاسـتییەك دەخاتـە ڕوو : ڕاسـتیی یەکەم ئەوەیـە کـە خــوا ﷻ ژمارەیـەکی زۆری لـە جنــدو مرۆڤـی ئـامادەکــردوون بــۆ دۆزەخ ، بـەڵام لەبـەرچی هـەر لەگۆترە ؟ بێگومان نەخێـر ، دەفەرموێ : ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ﴾ ، بێگومان زۆرێــك لـە جنـدو مرۆڤـمان بـۆ دۆزەخ دروست کـردوون ، هەڵبەتـە ئەو جنـدو مرۆڤـانە خـوای دادگـەر لە ئەسڵـدا بـۆ ئـەوەی دروست نەکـرد بوون ، بیـانخاتە دۆزەخ ، بـەڵام خۆیان خۆمـان وا لـێکـرد کـە تەنیـا بـە کەڵـکی دۆزەخ بێــن ، بۆیــە وەك ئـەوەی لـێهـاتــوە ، کــە هــەر لـە ســـەرەتاوە خــوا بـۆ دۆزەخـی دروست کرد بن ، ئەگـەرنا لـە بنەڕەتدا خـوای بەخشـەر مرۆڤەکانی بـۆ ئـەوە دروسـت کـردوون کـە بـەندایەتیی بۆ خــوا بکـەن ، وە سـەرەنجـام ســەرفراز بـن ، وەك دەفەرموێ : ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾﴾الذاريات ، واتە : جنـدو مرۆڤم تەنیا بۆ ئـەوە دروست کردوون ، کـە بـمپەرستن ، چونکـە کە خــوایان پەرسـت ، مانـای وایـە لـە تاقیکـردنـەوەی ژیانی دنیا دەردەچـن ، وە بڕوانامـەی ئیمانداریێتـیی و بـەندایەتیــی بـۆ خــوا وەدەســت دێـنن ، وە سـەرەنجـام شـایسـتـەی ئـەوە دەبـن ، بچـنە بـەهەشــت ، کەواتــە : لـە بنــەڕەت دا خــوا بـۆ چوونــە بەهەشـــت دروســتی کـردوون ، بــەڵام بۆچـی دەفـەرموێ : زۆرێـك لـە جنـدو مرۆڤمـان بـۆ دۆزەخ دروســت کـردوون ؟ چونکە سـەرەنجـامەکەیان دەچێتــە وێ .

ئنجـا باسـیان دەکـات ، ئەوانـە کێن کـە خـوای دادگــەر بـۆ دۆزەخـی هێناونـە دی ؟ دەفـەرموێ : ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا﴾ ، کەســانێکن دڵیـان هــەن ، بــەڵام بــەو دڵانـەیان تێنـاگـەن ، ﴿وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا﴾ ، چـاویان هـەن ، پێیـان نـابینن ، ﴿وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا﴾ ، گوێیـان هــەن ، بــەڵام پێیـان نابیســتن ، هەڵبــەتە

لێرەدا مەبەست لە تێنەگەیشتن‌و نە دیتن‌و نە بیستن ، تێنەگەیشتن‌و نە دیتن‌و نەبیستنی هەقە ، یانی : مەبەست پێی حاڵەتی مەعنەوییە ، ئەگەرنا کافریش عەقڵیان هەیە ، شتی پێ دەزانن‌و ، شتی پێ تێدەگەن‌و ، چاویان هەیە پێی دەبینن‌و ، گوێیان هەیە پێی دەبیستن ، بەڵام ئەو حیکمەت‌و ئامانجەی کە بۆی دروست کراون ، بە عەقڵەکەیان ، بە دڵەکەیان ، لەوە ناگەن ، وە ئەو ڕاستییانەی پێ نابینن‌و ، نابیستن کە دەرچوون لە تاقیکردنەوەی ژیانی دنیایان ، پەکی لەسەر دەرکی ئەو ڕاستییانە کەوتوە ، بە زانینی ئەوە ڕاستییانە ، شوێنی خۆیان لە ئیعرابی ژیانی دنیادا دەبیننەوە ، دەزانن بۆچی دروست بوون ؟ لە کوێ هاتوون ؟ کێ هێناونیە دی ؟ بۆچی هاتوون ؟ بۆ کوێ دەچن ؟ بۆیە دەفەرموێ : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّ ﴾ ، ئەوانە وەك ئاژەڵن ، بەڵكو گومڕاتریشن ، بۆچی لە ئاژەڵ گومڕاترن ؟! چونکە ئاژەڵ ناتوانێ ئاژەڵ نەبێ ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ ئاژەڵ نەبێ .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴾ ، ئەوانە بێ‌ئاگان ، واتە : لە ئەنجامی لە کارخستنی عەقڵ‌و چاوو گوێیانەوە ، بێ‌ئاگا بوون، کە دیارە هەر لەوانیشەوە زانیاریی بۆ ئینسان دێ ، وەك خوای زاناو توانا لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ : ﴿ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٧٨ ﴾ ، واتە : خوا ئێوەی لە زگی دایکتان هێنایە دەر ، هیچتان نە دەزانی ، بەڵام دوایی بیستن‌و چاوەکان‌و عەقڵەکانی پێدان ، واتە : تۆ بەهۆی عەقڵ‌و بەهۆی بیستن‌و لە ڕێی دیتنەوە ، دەتوانی زانیاری کۆبکەیەوەو ، دەوروبەری خۆت‌و ببینی‌و بناسی ، وە دەرکی ڕاستییەکان بکەی ، وە لە ئەنجامی لە کارخستنی ئەوە هەستەوەرانەو ، لە کارخستنی ئەو هێزو توانایانەدا، ئینسان تووشی بێئاگایی دێ ، ئنجا کە تووشی بێئاگایی بوو ، مانای وایە لە ئاژەڵ خراپترە ، چونکە ئاژەڵ بێئاگایە ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ بێئاگا نەبێ .

ئنجا دێتە سەر باسی ڕاستییەکی دیکە ـ ڕاستیی دووەم ـ دەفەرموێ : ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَا وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ ، وە خوا ناوە هەرە جوانو پەسندەکانی هەن ، ئێوەش هەر بەو ناوە جوانو پەسندانەی لێی بپاڕێنەوە ، وە واز لەوانە بێنن کە لە ناوەکانی خوادا لادان دەکەن ، لەسەر ئەوەی کە دەیکەن ، لەمەودوا سزا دەدرێن ، یانی : وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرناچن ، چونکە دنیا شاری بێ خاوەن نیە .

ئنجا دێتە سەر باسی خستنە ڕووی ڕاستییەکی دیکە ـ ڕاستیی سێیەم ـ دەفەرموێ : ﴿وَمِمَّنۡ خَلَقۡنَآ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ﴾ ، وە لەوانەی کە ئێمە هێناومانن دی (لە مرۆڤەکانو ، لە جند ) کۆمەڵێك هەن ، کە خەڵك بەهۆی هەقەوە ڕێنمایی دەکەن ، ﴿وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ﴾ ، وە بەهۆی هەقیشەوە دادگەرییان لە نێواندا دەکەن ، واتە : لە ڕووی فیکرییەوە ، بە هەق ڕێنماییان دەکەن ، وە لە ڕووی کردەییشەوە ، بە هەق دادگەرییان لە نێودا دەچەسپێنن .

پاشان باسی ڕاستییەکی دیکە ـ ڕاستیی چوارەم ـ دەکاتو دەفەرموێ : ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ ، وە ئەوانەی کە بە ئایەتەکانی ئێمە بێبڕوان ، ئێمە لەمەودوا بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن ، پەلکێشیان دەکەین بە شێوەیەك کە پێی نازانن ، (بەرەو گوناهی زیاترو ، بەرەو سزاو ئازارێك کە لەو گوناهو هەڵەو پەڵەی خۆیانەوە پەیدا دەبێ و ، دەرەنجامی هەڵەو پەڵەکانی خۆیانن) ، کە دەفەرموێ : ﴿سَنَسۡتَدۡرِجُهُم﴾ ، پەلکێشیان دەکەین پلە پلە ، واتە : بە پێی یاسای خوای کارزان ، کە ئینسان گوناهێك دەکات ، ئەو گوناهە ئەو ئینسانە پەلکێش دەکات ، بەرەو گوناهێکی دیکە ، ئەویش پەلکێشی دەکات بۆ گوناهێکی دیکە ، وەك چۆن ئینسان کە خلۆر دەبێتەوە لە شوێنێکی لێژایی ، دوایی دەکەوێتە حاڵەتی بەردەوامیی (إستمرارية)ی ، خۆی پێناگیرێتەوە ، گوناهەکانیش

بەو شێوەیەن ، ئنجا ئەو وشەیەی ﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم﴾ ، تەعبیر لەو حاڵەتە دەکات ، کەواتە : ئینسان دەبێ لە سەرەتاوە ئاگای لەخۆی بێ ، نەخلیسکێتە نێو زەلکاوی گوناهان ، ئەگەرنا خۆی پێ ناگیرێتەوە ، ﴿وَأُمْلِي لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ﴾ ، وە ڕستیان لە دوا درێژ دەکەم ، وە بێگومان پلانو ، نەخشەی من زۆر توندو پتەوە .

ئنجا دێتە سەر باسی خستنە ڕووی ڕاستییەکی دیکە ـ ڕاستیی پێنجەم ـ ، دەفەرموێ : ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا﴾ ، ئایا ئەوانە بیریان نەکردۆتەوە ، واتە : ئەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ ژیاون بە پلەی یەکەم ، مەبەستی پێی ئەوانە ، ﴿مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ﴾ ، هاوەڵەکەیان هیچ جۆرە شێتێتییەکی تێدا نیە ، چۆنو بە چ عەقڵێك تۆمەتباری دەکەن کە شێتە ، لە حاڵێك دا کە خاوەنی گەورەترین عەقڵەو خاوەنی ڕاستترین بیروبۆچوونە ؟ وە هەموو پێغەمبەرانی خوا ، لە ڕووی عەقڵەوە لە لووتکە دابوون ، وە هەڵبژاردەی خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان بوون ، لە هەموو خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان قووڵترو بیر تیژترو هۆشیارترو وریاتر بوون ، بۆیە دەفەرموێ : هەر بیربکەنەوە بەسەو ، دەزانن هاوەڵەکەیان ئەوەی کە لە نیزیکەوە دەیناسن ، هیچ شێتییەکی تێدا نیە .

هەڵبەتە دەشگونجێ بڵێین : ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا﴾ ، تەنیا مەبەست پێی کافرەکانی سەردەمی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ نیە ، هی مەککەو دەوروبەری مەککە ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە : ئایا مرۆڤەکان بیریان نەکردۆتەوە ، کە هاوەڵەکەیان کە موحەممەدە ﷺ و مرۆڤێکی وەك خۆیانە ، ئەگەر تەماشای ژیانو سیرەو هەڵسوکەوتی بکەن ، هیچ جۆرە شێتییەكو نەفامییەکی تێدا نابینین ، ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ ، ئەو جگە لە ورياکەرەوەو هۆشیارکەرەوەیەکی ئاشکرا ، هیچی دیکە نیە .

ئنجا ڕاستییەکی دیکە دەخاتە ـ ڕاستیی شەشەم ـ ڕوو ، دەفەرموێ : ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ﴾ ، ئایا سەرنجی

موڵکی فراوانی ئاسمانەکانو زەوییان نەداوە ، وە سەرنجی هەر شتێکیان نەداوە کە خوا دروستی کردوە ، چونکە هەر شتێك کە خوا دروستی کردوە ، سەرنجی بدەی ، دەتگەیەنێ بە خاوەنەکەی ، وە ئەگەر سەرنجی موڵکی فراوانی ئاسمانو زەویش بدەی ، دەزانی ئەم دنیایە ، ئەم موڵکە فراوانە ، مشوورخۆرێکی هەیە ، کارسازێکی هەیە ، تەگبیر کارێکی هەیە ، هەڵسووڕێنەرێکی هەیەو ، دنیا شاری بێخاوەن نیە ، ﴿ وَأَنۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقۡتَرَبَ أَجَلُهُمۡ ﴾ ، واتە : ئایا سەرنجی ئەوەیان نەداوە کە زۆر نیزیکە کاتی مەرگیان (أجل) واتە : کاتی مەرگو فەوتانیان ، کاتی کۆتایی پێهاتنی ژیانی دنیایان ، نیزیك بووبێتەوە ، ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ ﴾ ، ئەدی لە دوای قورئان ، بە چ فەرموودەیەك ، بە چ قسەیەك بڕوا دێنن ، ئەگەر بڕوا بە قورئان نەهێنن ، کە دوا فەرمایشتی خوای پەروەردگارە بۆ مرۆڤەکان ، ئەدی بە چ قسەیەکی دیکە بڕوا دێنن ؟ بە ڕاستیی کەسێك مەبەستی بێ خوای بەدیهێنەر بناسێ ، خاوەنی خۆی ، ژیێنەری خۆی بناسێ ، ئەو قورئانەی لەبەردەستی دایە ، ئەو ئامانجەی دێنێتە دی ، وە کەسێك بەهۆی قورئانەوە ، خوا نەدۆزێتەوەو خوا نەناسێ ، بە هیچ کتێبێکی دیکە ، بە هیچ قسەیەکی دیکە ، ئەو ئامانجەی بۆ نایەتە دی ، واتە : لە دوای قورئان بڕوا بە چ قسەیەکی دیکە دێنن ؟ کە لێرەدا ئەمە دوو واتای هەن :

١/ ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ بالله ﴾ لە دوای قورئان ، بەهۆی چ قسەیەکی دیکەوە بڕوا بە خوا دێنن ؟

٢/ یاخود ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ بِهِ ﴾ ، لە دوای قورئان ، بڕوا بە چ قسەیەکی دیکە دێنن ، کە هیدایەتی خوای تێدابێ ؟

بۆیە لە کۆتاییدا دەفەرموێ : ﴿ مَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥۚ وَيَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾ ، هەر کەسێك خوا گومڕای بکات ، هیچ ڕێنماییکارێکی نیە ، وە لێیان دەگەڕێ لە یاخیی بوونی خۆیاندا بخولێنەوە .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم** : کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴾ ، یەکێك بۆی هەیە بڵێ : چۆنو بۆچی خوا زۆرێك لە جندو مرۆڤی بۆ دۆزەخ دروست کردوون ؟ پێشتریش لە مانای گشتی دا باسمان کرد ، کە ئەمە دەرەنجامێکە ، لە کۆمەڵێك پێشەکیی و هۆکارەوە هاتۆتە دی ، کە دەتوانین پێشەکیی و هۆکارەکان ، ئاوا ڕیز بکەین :

**یەك** : خوا ویستوویەتی دروستکراوان بخوڵقێنێ ، بۆچی ویستوویەتی ؟ چونکە خوا پەروەردگارە ، خوا بەدیهێنەرە ، یەکێك لە سیفەتەکانی خوای پەروەردگاریش ئەوەیە کە لە نەبوون (عدم) شتان وەدی دێنێ .

**دوو** : حیکمەتی خوا وای خواستوە کە بناسرێ ، وە غەیری خۆی لە نیعمەتی بوون بەهرەمەند بکات ، دیارە بەخشندەیی و بەزەیی خوا ، ئەوە دەخوازێ کە بوون بە غەیری خۆی بدات : ﴿ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾ ، پەروەردگارمان ئەو کەسەیە کە بوونی بە هەموو شتێك داوە ، دوایی ڕێنمایشی کردوە ، کە چۆن بەڕێوە بچێ .

**سێ** : ئنجا خوا ویستوویەتی وێڕای ماددەی بێ ژیان ، وە ژیانداران بە هەموو جۆرەکانیانەوە : ئاژەڵو دڕندەو زیندەوەر ، وە وێڕای فریشتە پاكو بێ هەڵەکان ، کە بێ فەرمانیی خوای تاكو پاك ناکەن : ویستوویەتی دروستکراوێك بخوڵقێنێ کە چاکەو خراپەی لە دەست بێ ، توانای بەرزبوونەوەو نزمبوونەوەی هەبێو ، توانای ڕاست ڕۆیشتنو چەوت ڕۆیشتنی هەبێ ، کە ئەویش مرۆڤە .

**چوار** : ئنجا خوا کە مرۆڤەکانی دروست کردوون ، هەروەها جندیش ، ئازادیشی کردوون ، وە زانیویەتی کە هەندێکیان بە ویستی ئازادانەی خۆیان ، کوفر هەڵدەبژێرن ، وە خوای پەروەردگاریش ئەوەی کە بۆ خۆیان هەڵیانبژاردوە ، بۆی ویستوون ، واتە : ئەوەی کە خۆیان بە ویستی ئازادی خۆیان هەڵیانبژاردوە ، کە کوفرە ، تاوانباریی و خراپەکاریی و لادانە ، خوای کارزانیش ئەوەی بۆ ویستوون ، چونکە بەبێ ویستی خوا نەیاندەتوانی ئەوە پەیدا بکەن ، وە بە پێچەوانەشەوە هەندێکیش لە جندو مرۆڤەکان ، خوا زانیویەتی کە بە ویستی ئازادانەی خۆیان ئیمان و تاعەت و چاکەکاریی هەڵدەبژێرن ، وە خوای بەخشەریش ئەوەی خۆیان هەڵیانبژاردووە ، بە ئیرادە جوزئییەکەی کە خوا پێیداون ویستوویانە ، ئەویش ئەوەی بۆ ویستوون ، وە سەرەنجام توانیویانە وەدەستی بێنن .

**پێنج** : ئەوانەی کە خوا لە ئەزەلدا زانیویەتی ، بە ویستی ئازادانەی خۆیان کوفرو خراپە هەڵدەبژێرن ، سەرەنجام تووشی سزاو تۆڵەی دادگەرانەی خوای کاربەجێ بوون ، وە ئەوانەش کە خوا ﷻ زانیویەتی ئیمان و چاکەکاریی هەڵدەبژێرن ، بە پێی یاسای دادگەرانەی خوا ، وە بە پێی کەرەم و لوتفی خوا ﷻ ، تووشی پاداشت و سوپاسگوزاریی خوای پەروەردگار بوون ، کە لە بەهەشتدا بەرجەستە دەبێ ، وەك چۆن سزاو تۆڵەی خواش ، لە دۆزەخدا بەرجەستە دەبێ .

ئنجا کە خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ﴾ ، زۆرێك لە جندو مرۆڤمان بۆ دۆزەخ دروست و ئامادە کردوون .

واتە : دوای ئەو پێشەکییانەو ، ئەو هۆکارانە ، دەرەنجامەکەی وابووە ، کە بۆ دۆزەخ بن ، نەك هەر لەڕێوە خوای کاربەجێ بۆ دۆزەخ دروستی کردبن ، بەڵکو لە بنەڕەتدا خوا مرۆڤەکان و جندەکانیشی دروست کردوون ، کە بەختەوەرو سەرفرازبن ، دروستی کردوون بەندایەتیی بۆ خوا بکەن ، کە بەهۆی بەندایەتیی کردنەوە بۆ خوا ، سەرفرازو بەختەوەری دنیاو دواڕۆژ دەبن ، بەڵام بۆ خۆیان ئەو ڕێیەیان هەڵبژاردوە .

ئنجا دوایی خوای پەروەردگار ڕوونی دەکاتەوە، کە بۆچی ئەوانە بۆ دۆزەخ ئامادەکراون ؟ دەفەرموێ : ﴿ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ﴾ ، ئەوانە دڵیان هەن ، بە دڵەکانیان تێناگەن ، چاویان هەن ، بە چاوەکانیان نابینن ، گوێیان هەن ، بە گوێیەکانیان نابیستن ، کە ئەمە ڕوونکردنەوەی هۆکاری گوناهو گومڕابوونە ، وە دواتر سزادرانیانە ، کەواتە : بۆیە خوای زاناو توانا ، بۆ دۆزەخی دروست کردوون ، چونکە بە دڵەکانیان لە هەق تێنەگەیشتوون ، وە بە چاوەکانیان هەقیان نەبینیوە ، وە بە گوێیەکانیان هەقیان نەبیستوە ، بەڵکو : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ﴾ ، ئەوانە وەك ئاژەڵن ، نا بەڵکو لە ئاژەڵیش گومڕاترن ، ئنجا کەسێك خۆی وەك ئاژەڵ لێبکات ، لە حاڵێکدا کە بشتوانێ ئاژەڵ نەبێ ، دووچاری سزای خوا دەبێ ، چونکە ئاژەڵ ناتوانێ ئاژەڵ نەبێ ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ ئاژەڵ نەبێ ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ﴾ ، بەڵکو خراپتریشن لە ئاژەڵ ، چونکە وەك گوتم : مەڕو بزن ناتوانن مەڕو بزن نەبن ، گاو مانگا ناتوانن گاو مانگا نەبن ، حوشتر ، بە هەمان شێوە ، هەروەها دڕندەکان شێرو گورگو پڵنگو چەقەڵو ڕێوی ، ناتوانن ئەو سیفەتانەی خوا پێیداون ، ئاوا نەبن ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ وەك گورگو چەقەڵو بەرازو مەیموونو گوێدرێژو ... هتد ، نەبێ ، وە دەتوانێ مرۆڤ بێ ، کەواتە : کەسێك بە ویستی خۆی سیفەتی ئاژەڵەکان لەخۆیدا پەیدا بکات ، سیفەتی دڕندان لەخۆی پەیدا بکات ، مانای وایە : لەوان خراپترە .

ئنجا بەڕاستیی کاتێك ئینسان لە بەرنامەی خوا لادەداتو لە خوا دوور دەکەوێتەوە ، هەر ئەوەندە نیە کە تەنیا سیفەتی وەك ئاژەڵێك بێ ، بەڵکو سیفەتی خراپی کۆمەڵێك ئاژەڵی لەخۆیدا دێنێتە دی :

١/ لە ئارەزوو پەرستیی دا ، وەك بەرازی لێدێ .

٢/ لە لاساییکردنەوەی خەڵك دا ، وەك مەیموونی لێدێ .

٣/ لە نەفامیی دا ، وەك کەری لێدێ .

٤/ لە پیسیی دا ، وەك سەگی لێدێ .

٥/ لە خۆڕازاندنەوەیدا ـ کە هەر خەریکی ڕواڵەتی خۆی دەبێ ـ وەك تاوسی لێدێ .

٦/ لە زۆر خۆرییدا ، وەك گاو مانگای لێدێ .

٧/ لە فێڵبازیی دا، وەك ڕێوی لێدی .

٨/ لە دڕندایەتیی دا ، وەك گورگی لێدێ .

مانای وایە مرۆڤـ کاتێك لە بەرنامەی خوادا لادەدات ، لە یەك کاتدا سیفەتی کۆمەڵێك دڕندەو ئاژەڵ لەخۆیدا دێنێتە دی ، کە بۆ ئەوان سیفەتی خراپ نیە ، چونکە سیفەتێکی سروشتی خۆیانە ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ : ئەوانە وەك ئاژەڵن ، بەڵکو خراپتریش لەوان .

دوایی دەفەرموێ : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴾ ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ، کە : بێئاگایی کە بەرهەمی پەکخستنی عەقڵو گوێو چاویانە : مایەی ماڵ وێرانییانەو ، بێئاگاییەکەیان بۆتە هۆی ماڵ وێرانییەکەیان ، کە دیارە خۆیان بە ویستی ئازادانەی خۆیان ، خۆیان بێئاگا کردوە لەو ڕاستییانەی کە دەبوو لێیان بێئاگا نەبن : بێئاگا نەبن کە کێ دروستی کردوون ؟ بۆ کوێ دروستی کردوون ؟ لە کوێوە هاتون ؟ بۆ کوێ دەچن ؟ دەبێ چۆن بژین ؟ مەبەست لە : ﴿ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴾ ، ئەوەیە ، ئەگەرنا خوای پەنهانزان لەبارەی کافرانەوە فەرموویەتی : ﴿ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ﴾ ، ڕواڵەتێك لە ژیانی دنیا دەزانن ، بەڵام لە دوارۆژ بێئاگان ، لەو چارەنووسەی چاوەڕێیان دەکات ، بێئاگان ، لەو ئەرکەی کە پێیان سپێردراوە ، بێئاگان ، لەو حیکمەتەی کە بۆی دروست کراون ، بێئاگان ، وە کاتێك ئینسان نەزانێ لە کوێیەوە هاتوە ؟ کێ هێناویەتەدی ؟ بۆچی هاتوە ؟ بۆ کوێ دەچێ ؟ هەرچەندە زانیاریی جوزئیشیی هەبێ ، بە شتەکانی دەوروبەر ، ئەوە قەرەبووی ئەو نەفامیی و بێئاگاییەی لە دوارۆژی ، بۆ ناکاتەوە .

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ : ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ ، وە خـوا نـاوە هـەر چاكو پەسندەكانی هەن ، هەر بەوان لێی بپاڕێنەوە ، وە لەوانە گەڕێن کە لادان دەکەن لە ناوەکانیدا ، لەمەودوا لەسەر ئەوەی دەیکەن سزا دەدرێن .

دیارە ناوە هەرە چاكەكانی خوا ﷻ تەنیا خوا ، وە پاشان پێغەمبەرەكەی موحەممەد ﷺ دەیانزانن ، واتە : ناوەكانی خوا تەوقیفیینو ، تەوفیقیی ، نین ، (توفيقي) واتە : خوا ئێمەی وەستاندوە لەسەر ئەو ناوانە ، وە پێغەمبەر ﷺ بە وەحی خوا ، ئێمەی وەستاندوە لەسەر كۆمەڵێك ناو ، كە خوا ئەوانە ناوەكاننی وە تەوفیقیی نین ، كە خەڵك ئیجتیهاد بكات لەخۆوە ناوێك بۆ خوا دابنێ ، بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە ؟ بەڵگەمان ئەوەیە كە : وێڕای ئەوەی خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ ، كەواتە : خوا دەبێ ناوە چاكەكانی بەیان كردبن ، وێڕای ئەوە : پێغەمبەر ﷺ یش فەرموویەتی : ﴿إِنَّ لِلّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ إِسْماً مِائَةً إِلاَّ وَاحِداً ، مَنْ أَحْصاها دَخَلَ الْجَنَّةَ ، إِنَّهُ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ﴾ {رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم : (٢٥٨٥) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٦٩٨٦) ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ} ، واتە : بێگومان خوای بەرز ، نەوەدو نۆ (٩٩) ناوی هەن ، سەد جگە لە یەكێك ، هەر كەسێك بیانژمێرێ (واتە : تێیان بگاتو كاریان پێبكات) دەچێتە بەهەشتێ ، بێگومان ئەو تاكەو تاكی خۆشدەوێ .

ئنجا (الترمذي) ئەوەندەشی لێ زیاد كردوە : {هُوَ اللّهُ الّذي لا إِلهَ إِلاّ هُوَ : الرَّحْمنُ ، الرَّحِيمُ ، المَلِكُ ، القُدُّوسُ ، السَّلامُ ، المؤمِنُ ، المهَيْمِنُ ، العَزِيزُ ، الجَبَّارُ ، المتَكَبِّرُ ، الخَالِقُ ، البَارِئُ ، المصَوِّرُ ، الغَفَّارُ ، القَهارُ ، الوهابُ ، الرَّزَّاقُ ، الفَتَّاحُ ، العَلِيمُ ، القابضُ ، البَاسِطُ ، الخَافِضُ ، الرَّافِعُ ، المعِزُّ ، المذِلُّ ، السَّمِيعُ ، البصيرُ ، الحَكَمُ ، العَدْلُ ، اللَّطِيفُ ، الخَبِيْرُ ، الحليمُ ، العَظِيمُ ، الغَفُورُ ، الشَّكُورُ ، العَلِيُّ ، الكَبيرُ ، الحَفِيظُ ، المقيتُ ، الحَسِيبُ ، الجَلِيلُ ، الكريمُ ، الرَّقِيبُ ، المجيبُ ، الْوَاسِعُ ، الحَكِيمُ ، الْوَدُودُ ، المجيدُ ، البَاعِثُ ، الشَّهيدُ ، الحَقُّ ،

الْوَكِيلُ ، القَوِيُّ ، المتِينُ ، الْوَلِيُّ ، الحَمِيدُ ، المحصي ، المبدىءُ ، المعيدُ ، المحْيِي ، المميتُ ، الحَيُّ ، القَيُّومُ ، الْوَاجِدُ ، الماجدُ ، الوَاحِدُ ، الأحَدُ ، الصَّمَدُ ، القَادِرُ ، المقْتَدِرُ ، المقَدِّمُ ، المؤخِّر ، الأوَّلُ ، الآخِرُ ، الظاهِرُ ، البَاطِنُ ، الوالي ، المتعالِ ، البَرُّ ، التَّوَّابُ ، المنتَقِمُ ، العَفُوُّ ، الرَّؤوفُ ، مَالِكُ الملْكِ ، ذُو الجَلالِ والإِكرَامِ ، المقسِطُ ، الجَامِعُ ، الغَنيُّ المغني ، المانِعُ ، الضارُ ، النَّافِعُ ، النُّورُ ، الهادي ، البَديعُ ، البَاقي ، الوَارِثُ ، الرَّشِيدُ ، الصَّبُورُ} ، واتە : (الترمذي) وێڕای ئەوەی کە لە صەحیحی موسلیمو بوخارییدا هاتوە ، نەوەدو نۆ ناویشی ڕیز کردوون ، کە دوایی باسی دەکەین ، ئەو ناوانە بە لای زانایانەوە چۆنن‌و ، تا چ ڕاددەیەك بۆ دیارییکردنی نەوەدو نۆ (٩٩) ناوەکەی خوا پشتیان پێ دەبەستری ؟!

گرنگ ئەوەیە جارێ خوای پەروەردگار دەفەرموێ : ﴿وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ﴾ ، دیارە خوێنراوەتەوە : ﴿يُلْحِدُونَ﴾وە خوێندراویشەتەوە : ﴿ يَلْحَدُونَ ﴾ ، (لَحَدَ ، يَلْحَدُ ، وَأَلْحَدَ ، يُلْحِدُ) هەردووکیان واتە : (مَالَ ، يَمِيلُ) واتە : لایدا ، خوار بووە ، لادەدا ، خواردەبێ ، (الإلحَادُ : الميل والإزورار عن الوسط ، وَمِنْهُ لَحْدُ القَبْرِ) قەبر بە دوو جۆر هەڵدەقەنرێ : بە شێوەی (لحد)و بە شێوەی (شق) ، (شق) : ئەوەیە کە لە نێوەڕاستی قەبرەکەدا گۆڕیچکە هەڵدەکەنرێ‌و جەنازەکەی تێدەهاویشترێ ، (لحد)یش بە کوردی (لا گۆڕ) پێدەڵێن ، لایەکی گۆڕەکە هەڵدەقەنرێ‌و جەنازەکەی دەخرێتە نێو ، ئنجا : (إلحاد) بریتیە لە لادان‌و لە نێوەڕاستی شتێك .

بەنسبەت ئەو فەرمودەیەشەوە کە (الترمذي) هێناویەتی‌و نەوەدو نۆ (٩٩) ناوی بۆ خوای پەروەردگار ڕیز کردوون : سەنەدەکەی‌و ڕای پسپۆڕانی سوننەت لەبارەیەوە ئاوایە : (أَخْرَجَهُ التِّرمِذِي برقم : (٣٥٠٧) ، وَابْنُ حِبَّان برقم : (٨٠٨) ، والحاكم ج١ ، ص ١٦ والبيهقي في (الصفات) ص ٥ ، البغوي برقم : (١٢٥٧) من حديث أبي هريرة ، وَقَالَ التِّرمِذي : هَذَا حَدِيث غَرِيب ولا نعلم في كثير من الروايات له إسنادٌ صحيح فيه ذكر الأسماء إلاَّ فِي هذا الحديث ، وقال الحافظ

ابن كثير في تفسيره ج ٢ ، ص ٣٠٨ ، والذي عوّل عليه جماعة الحفاظ أَنّ سَرْدَ الأسماء لله في هذا الحديث ، مدرَجٌ فيه) (ابن كثير) دەڵێ : ڕیزکردنی ئەو نەوەدو نۆ (٩٩) ناوە خوای پەروەردگار لەم فەرموودەیەدا (مدرج)ە ، (مدرج) : واتە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ نیە ، بەڵکو یەکێك لە ڕاوییەکان {ئنجا ئایا هاوەڵ (صحابي) بووە ، یان تابیعین ، یان دوایی ئەوان} ئەو نەوەدو نۆ (٩٩) سیفەتەی هەڵبژاردوون و خستوویەتە نێو فەرموودەکە ، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ نەیفەرمووە ، کە ئەوە زیاتر ڕاستە ، بۆیە زانایان زۆر پشتیان بەو نەوەدو نۆ (٩٩) سیفەتە نەبەستوە ، کە لە (سنن الترمذي)دا هاتوون .

## ئایا لادان (إلحاد) لە ناوەکانی خوای پەروەرگاردا چیەو چۆنە ؟[1]

١ / یەکێك لە جۆرەکانی لادان (إلحاد) لاڕێبوون (إنحراف) لەبارەی مامەڵەکردن لەگەڵ ناوەکانی خوادا ، ئەوەیە کە ئێمە کە ناوێك بۆ خوا بەکاربێنین ، کە لە قورئان و سوننەتدا نەهاتبێ ، وەك زۆربەی کتێبەکانی زانستی کەلام وشەی (صانِعْ) بۆ خوا بەکاردێنن ، (صانِعْ) واتە : دروستکەر ، وە وشەی (وَاجب الوُجود)ی بۆ بەکاردێنن ، واتە : بوون پێویست ، واتە : کەسێك بوونی پێویستە ، وە وشەی : هەبوو (الموجود)ی بۆ بەکاردێنن ، واتە : شتێك کە بوونی هەبێ ، وە ویستراو (المقصود)ی بۆ بەکاردێنن ، وەك هەندێك لە ئەهلی تەصەووف دەڵێن : (یا مقصود) ، وە وشەی پەرستراو (معبود)ی بۆ بەکاردێنن ، وە هەندێك ناوی دیکەش ، کە لەڕاستییدا ئەوانە هیچیان وەك

---

١) بۆ نووسینی ئەو بابەتە سوودم لە (تفسير القرآن الحكيم) بەرگی (٩) لاپەڕە (٣٧٤ تا ٣٨٢) وەرگرتوە ، هی (محمد رشيد رضا) خوا پاداشتی بداتەوە

ناوی هەرە چاکی خوا ، دروست نیە بەکاربهێنرێن ، چونکە لە قورئانو سوننەتدا نەهاتوون ، وە ناوەکانی خوای پەروەردگار ، دەبێ بەڵگەی شەرعییان لەسەر بێ ، وە بە وەحی هاتبن ، چونکە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خوادا ﷻ دوو سەرچاوەمان هەن ، یەکەم : قورئان ، دووەم : سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ، بۆیە دەبێ ناوە هەرە چاکەکانی خوا ، یان لە قورئان وەربگیرێن ، یان لە سوننەت ، هەڵبەتە لە سوننەتدا هەندێك ناو هاتوون پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خوای بەکارهێناون ، وەك : (حَنَّان ، مَنَّان ، دَيَّان) گرنگ ئەوەیە ئەو ناوانەی کە بۆ خوای بێ وێنە بەکاردێن ، پێغەمبەر ﷺ بۆی بەکارهێنابن ، یاخود خوا لە قورئاندا بەکاری هێنابن ، هەر ئەوانە ناوە هەرە چاکەکانی خوان ، ئەوی دیکە دەگونجێ بڵێی : خوای پەروەردگار (واجب الوجود)ە ، واتە : بوونی خوا پێویستە ، وە خوا دروستکەر (صانع)ی ئەم کەونو کائیناتەیە ، بەلام ناگونجێ بگوترێ : ئەوانە ناوی چاکی خوان ، یان بەو ناوانە لە خوا بپاڕێینەوە ، واتە : ناگونجێ بڵێی : (یا واجب الوجود) ، یاخود بڵێی (یا مقصود) ، یاخود (یا صانِع) ، چونکە خوا دەفەرموێ : ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَا﴾ ، هەر بەو ناوانە لێی بپاڕێنەوە ، وەك بەندایەتیی بۆ خوا ، ئەگەرنا وەك ناساندنی خوای بێهاوتاو ڕوونکردنەوەی بەدیهێنەرایەتیی خوای بەرزو مەزنو ، خاوەندارێتییو پەروەردگارێتیی خوا ، ئەگەر تەعبیرێك ، یان وشەیەك بەکاربێ ، مادام پێچەوانەی دەقێك نەبێ ، دروستە ، بەلام ناگونجێ بڵێین : ئەوانە ناوی خوان ، وە دروست نیە پێیان لە خوا بپاڕێینەوە .

٢ / گۆڕانکاریی کردن لە ناوەکاندا ، کە بریتیە لەوەی ئەو ناوانە بۆ شتێکی دیکە ، یاخود بۆ کەسێکی دیکە جگە لە خوا بەکاربهێنرێن ، لەوانەی کە لە جیاتی خوا پەرستراون ، وەك چۆن وشەی (اللات) ، وشەی (العُزَّى) ، وە وشەی (المناة) ، کە زانایان دەڵێن (لات) لە (إله)وە ی وە ، (مؤَنَّث)ی (إِلَهْ)ەو ، (العُزَّى) ، (مُؤَنَّث)ی (عَزِيز)ە ، وە (مَنَاة) (مُؤَنَّث)ی (مَنَّان)ە ، لەبەرئەوەی بتپەرستەکان بڕوایان وابووە ، ئەوانە فریشتەکانن ، یان بە کچی خوایان

لەقەڵـەم داون ، بـە مێینـەیـان لەقەڵـەم داون ، بۆیــە ئـەو وشـانەی مێینـایەتیـی بگـەیەنــن ، بـەکاریـان هێنـاون ، وە ئـەو نـاوە چاکـانەی خـوای پەروەردگاریـان لاداوەو گۆڕیـویانن‌و ، بـەکاریـان هێنـاون بۆ ئـەو بـت‌و صـەنەمـانە .

٣ / جۆرێکی دیکـە لە لادان لە ناوەکانی خـوادا ئەوەیە ، کە ئـەوەی کـە خـوای تـاك و پـاك خـۆی پـێ نـاو نـاوە ، یاخـود ئەو وەسفەی ، یـان ئـەو کردەوەیەی خـۆی پـێ وەسـف کردوە ، تـۆ بـۆی بـەکارنەهێنـی ، بـۆ وێنـە : (إسـتواء)ی لەسـەر عـەرش ، یاخـود بـەرزیـی (علـوّ) خـوا ، یـاخـود فەرمایشــت فـەرموونـی (تكلیـم) خـوا ، ئـەوەش دیسـان جۆرێکـی دیکـەیە لـە لادان ، ئێمـە پێویسـتە ئـەوەی کـە خـوا ﷻ بۆخـۆی بـەکاریهێنـاوە ، یـان پێغـەمبـەری خـوا ﷺ بـۆی بەکارهێنـاوە ، چ وەك نـاو ، چ وەك وەسـف ، چ وەك کردەوە ، دەبـێ ئێمەش بـەکاری بێنیـن ، بـەو واتـاو چەمـك‌و شـێوەیە کـە بۆ خـوا شـایسـتەیە .

٤ / لادانـی ناوەکـانی خــواو سیفەتەکـاتی خـوای بــەرز ، لـەو مانـاو چەمکـانەی کـە بۆیان دانـراون ، بە جۆرێك لـە تـەئویل کـردن ، کـە وێچوانـدن بـخـوازێ ، یاخـود پەکخســتنی سیفەتەکــانی خــوا بخــوازێ ، (فالـمشبّهـة ذهبـوا إلـى التَّجسیم والنُّفَـاةُ ذَهَبُـوا إِلـى التعطیـل) وێچوێنەرەکـانی خــوا ، سـەرەنجـام ســەریان بــە جەسـتاندنی خـوا گـەیشــتوە ، وە ئەوانـەی سـیفەتەکـانی خـوایان لـە خـوا نەفـی کــردوون ، سـەرەنجامیــان گـەیشـتۆتە پەکخســتنی خــوا لــە سیفەتەکــانی ، کـە هــەردووکیان هـەڵــەن ، چ سیفەتەکـانی خــوا ﷻ وەك سـیفەتی دروسـتکراوەکـان تەماشــا بکــەی‌و ، سـەرەنجــام خـــوا بجەسـتێنــی وەك جەســـتەیەك ، وە چ بـــە بیانــووی بــە پاکگــرتنی خــوا ، سیفەتەکــانی لــێ نەفـی بکـەی‌و سـەرەنجــام سیفەتەکانی پەك بخەی ، بۆ وێنـە (بڵـێی : خـوا زانـایـە ، بـەڵام عیلـمی نیـە ، بـە بەزەییــە ، بــەڵام ڕەحمــەتی نیــە ، تـوانـایــە ، بــەڵام توانـایــی نیـــە) وەك هـەندێك لـە ئەو پێڕو تاقمـانەی کە لایـانداوە لە ڕاستە شـەقام ، گوتـوویانە ، کـە ئەوە جۆرێکــە لە لادان لە ناوەکـانی خوای پەروەردگـاردا .

٥ / بـەشداریی پێکردنی غـەیری خـوا ﷻ لـە شـتێکدا ، کە تایبــەتە بـە خـواوە لـە نـاوەکـانی ، واتـە : بێـژەیـەك کـە تـەنیا بـۆ خـوا بـەکارهاتـوە ، بـۆ وێنــە : (أللّه ،

الرحمن ، رب العالـمين) ئەو وشـانە تەنيـا بـۆ خـوا بـەكارهاتـوون ، بۆيـە نابـێ كـەس نـاو بنـرێ : (أللّه) يـان نـاو بنـرێ بــە (الـرحمن) ، يـان نـاو بنـرێ (رب العالـمين) .

هـەندێك لە زانايان دەڵێن : دەگونجـێ وشـەی (رحمن) بـەبـێ (أل) بـۆ جگـە لـە خـوا بەكاربـێ ، چونكە (الـرحمن) واتـە : خـاوەنی هـەموو بـەزەييـەك ، كـە ئەمـە هـەر خـوايـە ، وە وشـەی (رب) دەگونجـێ بـەكاربـێ ، بـەڵام بێئـەوەی پـاڵ بدرێتـە لای (العالـمين) ، وەك پێغـەمبـەر يوسـف لـە سـوورەتی (يوسـف) ئـايەتی (٥٠)دا دەفـەرموێ : ﴿ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ﴾ ، وشـەی (رب) بـەكارهێنـاوە ، يەكەمجـار بـۆ خـاوەنی ئەو كەسـە كە هـاتوە بـۆ لای لـە سجنـدا ، كـە گوتوويـەتی پادشـا بانگت دەكـات ، گوتوويـەتی : ﴿ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ بگـەڕێوە بـۆ لای خاوەنەكـەت (رب) ، واتـە : خـاوەنو گـەورەو ، سـەركردە ، دوايـی وشـەی (رب)ی بـەكارهێنـاوە بـۆ خـوای پەروەردگار ، ﴿إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ﴾ واتە : پەروەردگاری مـن ، كە خـوايە ، بـە فێڵـی ئـافرەتەكان زانـايەو ئـاگادارە .

كەواتـە : وشـەی (رب) بــە بـێ ئـەوەی پـاڵ بدرێتـە لای (العالـمين) دروسـتە بـەكاربـێ ، وەك بـە كابانی مـاڵ دەگوتـرێ : (ربة البيت) ئـەوە دروسـتە ، بـەڵام (رب العالـمين) بـە تەئكـيد ئـەوە نابـێ ، ئـەوە بێژەيـەكـە تايبـەتە بـە خـوای پەروەردگـارەوەو ، دروست نيـە بۆ جگـە لـە خوا بـەكاربـێ .

٦ / جۆرێكـی ديكەی لادان لە ناوەكـانی خـوادا ، بـەشـداريی پێكردنی جگـە لـە خـوای بــەرزە ، لــە مانــای نــاوە تايبـەتەكــانيدا ، لەگــەڵ گۆڕينــی وشــەكە ، وەك بـەكارهێنـانی وشـەی (وسـيلة) بـۆ هـەندێك لـە بـەندە چاكەكـانی خـوا ، بـەو واتـايەی كـە لـە جياتی خـوا لێـی بپاڕێنـەوەو ، پاڕانـەوەی لـێ بكـرێ ، لەگـەڵ خـوای پاكـدا ، بـۆ جێبـەجێـكردنی كاروبـارو لابردنـی غـەمو گـرفـتو ، بـۆ دەستەبـەركردنـی ئەو داخـوازييـانـەی كە ئەو ئينسانە هـەينـی ، لە ڕێيـەكـی جيـا

لە ڕێی هۆکارەکانو ، لە ڕێی ئاسایی خۆیانەوە ، دیارە خوا لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٣٥)دا دەفەرموێ : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَـٰهِدُواْ فِى سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾[1] ، واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! پارێز لە خوا بکەن ، وە وەسیلەو هۆکار بۆ لای خوا بگرنەبەر ، وە لە پێناوی خوادا تێبکۆشن ، بۆ ئەوەی سەرفراز بن .

جا کەسێك بڵێ : وشەی (وسیلة) مەبەست پێی هەندێ لە بەندە چاکەکانی خوایە ، ئنجا پێغەمبەری خوایە ﷺ ، یان فریشتەیەکە ، یان یەکێکە لە دۆستانی خوا ، یان یەکێکە لە زانایانو پێشەوایان ، بڵێ وەسیلە مەبەست پێی ئەوەیە ، بۆیە دروستە پەنای پێ ببرێو پاڕانەوەی لێ بکرێ ، ئنجا کاتێك پێی بگوترێ : ئەوە وانیە ، ئەویش بڵێ : ئەدی ئەوە نیە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ ﴾ ، وەسیلە بۆ لای خوا بگرنەبەر ، ئەوەش وەسیلەی منە ! یاخود چاوەڕوانی شتێکی لێ بکات ، کە ئەو شتە بەس بە خوا دەکرێ ، یان ئەو شتە دەبێ لە ڕێی هۆکارە ئاساییە سروشتییەکانەوە بۆی بچی ، ئەوەش جۆرێکە لە لادان لە ناوەکانی خوای پەروەردگاردا .

٧ / بەشداریی پێکردنی جگە لە خوا ، لە مانای تێرو تەواوی ناوەکانیدا ، کە خوا ﷻ لەبەرئەوەی ناوەکانی لە تەواوییدا تەواویان کردوە ، لە لووتکەی تەواوییدان ، بۆیە بە : (ٱلْحُسْنَىٰ ) وەسفی کردوون ، واتە : هەرە چاكو پەسند ، هەرە جوان ، کەواتە : ئەگەر کەسێك وابزانێ کە کەسێکی دیکە سیفەتێکی دیکەی هەیە ، وەك هی خوا ، بۆ وێنە : زانیاریی وەك هی خوایە ، حیکمەتی وەك هی خوایە ، دەسەڵاتی وەك هی خوایە ، شیفادانی وەك هی خوایە ، سەرخستنی ، ژێرخستنی ... هتد ، ئەوە جۆرێکە لە لادان ، بەڵێ دەگونجێ بڵێی : فلانە کەسیش سیفەتی بەزەیی هەیە ، سیفەتی زانیاریی هەیە ، سیفەتی دەسەڵاتی

---

[1]) لە بەرگی چوارەمی ئەم تەفسیرەداو لەبەر ڕۆشنایی تەفسیرکردنی ئەم ئایەتەدا ، باسێکی تایبەتمان لەبارەی (وسیلة)وە کردوە .

هەیە ، بەڵام نەك وەك هی خوای پەروەردگار ، ئەگەرنا خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەمی ﷺ بەوە وەسف کردوە ، کە بەزەیی زۆرە ، وەك دەفەرموێ : ﴿...بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٢٨﴾ التوبة، واتە : بەرانبەر بە بڕواداران زۆر خاوەن بەزەییو دڵ نەرمە ، زۆر میهرەبانە ، بەڵام دیارە میهرەبانییو ، بەزەیی پێغەمبەر ﷺ بەرانبەر بە ئیمانداران‌و ، بەرانبەر بە خەڵك ، لەقەدەر خۆیەتی ، هی خوای پەروەردگاریش ، لەقەدەر خۆیەتی .

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَمِمَّنۡ خَلَقۡنَآ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ﴾ ، وە لەوانەی کە دروستمان کردوون ، کۆمەڵێك هەن کە خەڵك بە هەق ڕێنمایی دەکەن ، وە بە هەقیش دادگەرییان لە نێودا دەکەن‌و ، بە دادگەریی بەرێوەیان دەبەن ، واتە : لە ڕووی فیکریی‌و تیۆرییەوە ، ڕێنماییان دەکەن ، بە شێوەیەکی هەق بۆ ڕاستە ڕێ ، وە لە ڕووی کردەییشەوە ، ئەگەر دەسەڵاتیان هەبوو ، بەو ئەندازەیەی کە دەسەڵاتیان هەیە ، دادگەرانە لەگەڵیاندا ڕەفتار دەکەن ، وە دادگەرییان لەنێودا دەچەسپێنن .

هەڵبەتە ئەمەش گەورەترین مەدحە ، چونکە کەسێك خەڵك بەرەو هەق ڕێنمایی بکات ، وە بە هەق ڕێنماییان بکات ، بۆ ڕاستە شەقامی بە ئامانج گەیشتن ، وە کە دەستەڵاتیشی بوو ، بە کردەوەش دادگەرییان لەنێودا بچەسپێنێ ، ئەوە مانای وایە هەم لە ڕووی تیۆریی (النظري)و ، هەم لە ڕووی کردەیی (عملي)یەوە ، تێرو تەواوەو ، هەم تێگەیشتوویەو هەم پێگەیشتوویە ، واتە : لە لووتکەدایە ، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە دەفەرموێ : ﴿لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ لاَ يَضُرُّهُمْ مَن خَذَلَهم وَلا مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَاعَةُ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم : (١٩٢٠) ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم : (٢٢٢٩) وَقَالَ : حَسَنٌ صَحِيحٌ ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (١٠)} ، واتە : بەردەوام دەستەیەك لە ئۆممەتی من لەسەر هەق بە ئاشکرا دەمێننەوە ، نە ئەوانەیان کە پشتیان بەردەدەن ، زیانیان پێ دەگەیەنن ، نە ئەوانەی دژایەتییان دەکەن ، زیانیان پێناگەیەنن ، تاکو ڕۆژی دوایی دێ .

**مەسەلەی چوارەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ وَأُمْلِى لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ ﴿١٨٣﴾ ﴾ ، واتە : وە ئەوانەی کە بە ئایەتەکانمان بێبڕوان ، پەلکێشیان دەکەین ، بێئەوەی بەخۆیان بزانن ، وە ڕستیان بۆ درێژ دەکەم ، بێگومان پلانو نەخشەی من پتەوە .

دەڵێ : (الإستدراج : الإِضْلالُ شَيئا فَشَيْئا) (إستدراج) بریتیە لە گومڕاکردنی وردە وردەو ، پێ بە پێ .

کە دەفەرموێ : ﴿ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ ، واتە : بە بێ ئەوەی هەست بە خۆیان بکەن ، (مِنْ دُونِ شُعُورٍ منهم) .

کە دەفەرموێ : ﴿ وَأُمْلِى لَهُمْ ﴾ ، مانای (أُمْهِلُهُم) مۆڵەتیان دەدەم ، ڕستیان بۆ درێژ دەکەم ، وە هاوکارییان دەکەم ، ﴿ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ ﴾ ، بێگومان نەخشەو ، پلانی من زۆر بەهێزە .

هەڵبەتە لێرەدا دەبێ وریا بین ، گومانێك بە خوای پەروەردگار نەبەین کە لێی ناوەشێتەوە ، وە بە شێوەیەك ئایەتەکانی خوا مانا نەکەین ، کە شایستەی ئایەتی خوا نیەو ، شایستەی فەرمایشتی خوا نیە ، وە شایستەی پایەی بەرزی خواو ، پەروەردگارێتیی خوا نیە ، لێرەدا خوا کە دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ ، وە ئەوانەی بێبڕوان بە ئایەتەکانمان ، وردە وردە پەلکێشیان دەکەین ، بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن ، مانای وایە پەلکێشیان دەکەین بەرەو سزای خۆمان ، بەهۆی گومڕایی زیاترەوە ، بەڵام هەنگاوی یەکەم لە خۆیانەوە بووە ، ئەویش : ﴿ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾ ، بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە نەکردوە ، ئنجا ئینسان کە بڕوای بە ئایەتەکانی خوا نەکرد ، چ ئایەتە خوێنراوەکان بن ، کە قورئانە ، چ ئایەتە بینراوەکان بن ، کە دیاردە سروشتییەکانن ، چ ئەو موعیجزانە بن ، کە خوا بە پێغەمبەران

(عَلَيْهِم الصَّلاَة وَالسَّلاَم)ی داون ، وەختێك ئینسان بڕوا بە نیشانەو بەڵگەكانی خوا نەكات ، ئەوە بۆخۆی پەلكێش دەبێ بەرەو گوناهی زیاتر ، بەرەو سەرگەردانیی زیاتر ، وە پاشان بەرەو سزای خوا .

كەواتە : كە دەفەرموێ : ﴿ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم ﴾ ، ئەوە خوا باسی یاسای خۆی دەكات ، واتە : بە پێی یاسایەك كە من دامناوە : لە ئەنجامی بە درۆ دانانی ئایەتەكانی منو بڕوا پێ نەكردنیان دا ، ئەوانە پەلكێش دەكرێن بەرەو گوناح ، یاخود بەرەو سزای خوای دادگەر ، بەهۆی گومڕایی زیاترەوە ، ئنجا كە دەشفەرموێ : ﴿ وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ﴾ ، وە ڕستیان بۆ درێژ دەكەمو مۆڵەتیان دەدەم ، بێگومان پلانی من پتەوە.

ئەمە یاسایەكی خوایە ، وە خوا ڕستی بۆ هەموو كەس درێژ كردوە ، وەك لە ئایەتی (٢٠)ی سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ : ﴿ كُلّٗا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ ﴾ ، پێشێ باسی ئەهلی دنیاو ، ئەهلی دواڕۆژ دەكاتو ، دەفەرموێ : ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ﴿١٨﴾ وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ﴿١٩﴾ ﴾ ، واتە : ئەوەی ژیانی بەپەلەی دنیای بوێ ، ئێمەش بەپەلە بۆی پێش دەخەین ، ئەوەندەی كە بمانەوێ بۆ هەر كەسێك ، بەو ئەندازەیەی كە دەمانەوێ ، دوایی دۆزەخی بۆ دادەنێین ، كە بە زەمكراویی‌و بە تێشكاویی دەچێتە نێوی ، وە هەر كەسێك دواڕۆژی بوێ ، وە هەوڵێكیشی بۆ بدات كە (دواڕۆژ) پێویستی پێیەتی {یانی : چەندەی پێویستە ئەوەندە هەوڵی بۆ بداو بۆی تێبكۆشێ} ، وە ئیمانداریش بێ ، ئەوانە هەوڵو كۆششەكەیان بە سوپاسگوزارییەوە لێ وەردەگیرێ.

دوایی دەفەرموێ : ﴿ كُلّٗا نُّمِدُّ ﴾ ، هەر كامێك لە خوازیارانی دنیاو ، خوازیارانی دواڕۆژ ، ئەوانەی عەودالی ژیانی دنیاو ، لەززەتی دنیاو ، ڕابواردنی

دنیان ، با لەسەر حیسابی دواڕۆژیش بێ ، وە ئەوانەی عەودالّی دواڕۆژن ، لەگەڵ ئاگالێبوونی ژیانی دنیاشیان ، هەر کامێکیان ، هاوکاریی دەکەینو ، ئیمدادیان دەکەین {وەك لێرەش دەفەرموێ : ﴿ وَأُمْلِي لَهُمْ ﴾ ، واتە : هاوکارییان دەکەم}، ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ ﴾ ، ئەوانیشو ئەوانیش ﴿ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ﴾ ، لە شتێك کە خوا دەیبەخشێ ، نەیفەرمووە : ﴿ فَضْلِ ﴾ ، یان ﴿ رَحْمَةً ﴾ ، دەبەخشێ ، خوا لە بەخششی خۆی بە کافرو مسوڵمان دەبەخشێ ، بە عەودالانی ژیانی دنیاو ، بە عەودالانی ژیانی دواڕۆژ ، چونکە ئەگەر وانەبێ ئەو کاتە تاقی کردنەوەی خوا چۆن دێتە دی لەسەر زەوی ؟ دوایی کافرەکان دەڵێن : خوایە ! یارمەتی ئیماندارانت دا ، کە ویستیان دواڕۆژ بەدەست بێنن ، بەلام ڕێت لە ئێمە گرت ، کە دەمانویست دنیا بەدەست بێنین ، یاخود : یارمەتی ئەوانت دا ، کە بەرەو بەندایەتیی تۆ هاتن ، بەلام یارمەتی ئێمەت نەدا ، کە ئێمە بۆخۆمان پێمان خۆشبوو ، کوفرو بێبڕوایی‌و خراپەکاریی هەڵبژێرین ! مانای وایە ئەو کاتە ئەوانە بەڵگەو بیانوویان دەبێ لەسەر خوا ! بۆیە دەفەرموێ : ﴿ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ ﴾، بۆ هەر کامێکیان ڕست درێژ دەکەینو هاوکارییان دەکەین ، ئەوانیش‌و ئەوانیش .

**مەسەلەی پێنجەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ ۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾ ، ئایا بیریان نەکردۆتەوە ، {لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ : ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ ... ﴿٨﴾ ﴾الروم ، ئایا لەبەر خۆیانەوە هیچ بیریان نەکردۆتەوە} ، هاوەڵەکەیان هیچ شێتییەکی تێدانیە ، نەك هەر شێت نیە ، بەڵکو هەر هیچ شێتییەکی تێدا نیە ، ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾ ، ئەو جگە لە وریاکەرەوەو هۆشیارکەرەوەیەکی ئاشکرا هیچی دیکە نیە ، واتە : بەس بیرکردنەوەیەك لەبەر خۆوە ، ئینسان مەنتیقییانە بیر بکاتەوەو ، ڕابمێنێ لە

حاڵو باڵی پێغەمبەری خاتەم ﷺ ، هەروەها هی هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَة وَالسَّلاَم) دەزانێ کە ئەوە ڕەوانەکراوی خوایە ، وە فری بەسەر شێتێییەوە نیە ، بەڵکو لە لووتکەی عاقڵ مەندیی و هۆشیاریی و بلیمەتیی دایە ، چۆن خوا کەسێك دەکاتە نوێنەری خۆی ، کە لە هەموو کەس عاقڵتر نەبێ ؟ وە لە هەموو سیفەتێکی باش دا پێش هەموو کەسێك نەکەوتبێتەوە ؟ ئەدی دوایی چۆن بەڵگەیان لەسەر تەواو بکات ، ئەگەر پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَة وَالسَّلاَم) چ لە ڕووی جەستەییەوە ، چ لە ڕووی دەروونییەوە ، چ لە ڕووی عەقڵییەوە ، چ لە ڕووی ڕەوشتو ئاکارەوە ، چ لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە ، ناتەواوییەکیان تێدا بووایە ، دوایی خەڵك دەیانگوت : جا چۆن قسە لە فلانە کەس وەربگرین : کە عەقڵی وایە ، یان جەستەی وایە ، یان نەسەبو ڕەچەڵەکی وایە ، یاخود ڕەوشتو ئاکاری وایە ؟ بۆیە پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَة وَالسَّلاَم) لە هەموو ڕوویەکەوە لە لووتکەدا بوون ، وەك خوا لە ئایەتی (٥٩)ی سووڕەتی (النمل)دا دەفەرموێ :

﴿ وَسَلَـٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ﴾ ، واتە : وە سەلام لەسەر ئەو بەندانەی کە خوا هەڵیبژاردوون .

بەڵێ پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَة وَالسَّلاَم) گوڵبژێری خوان ، لە نێو مرۆڤایەتییدا ، سەر تۆپی مرۆڤایەتیین ، کەسانێکن کە خوا ﷻ لە هەموو شتێکدا لە لووتکەدا دایناون ، تاکو هیچ کەسێك نەبێ ، قسەیان لێ وەرنەگرێ ، تاکو ئەو پەیامەی کە خوا پێیدا ناردوون ، لێیان وەربگیرێ ، بۆیە هەندێك شت کە دەربارەی هەندێ لە پێغەمبەران باسکراوە ، من زۆر بە دووریی دەزانم لە ڕاستییەوە ، بۆ وێنە : دەربارەی پێغەمبەر ئەییووب عليه السلام کە باسی نەخۆشییەکەی دەکرێ ، گوایە کرمە ڕێز بووەو ، چیو ، چی لێ هاتوە ! ئەوە ئەسڵو بناغەی نیەو ، قورئانیش هیچ دەلالەتێکی لەسەر ناکات ، وە هیچ پێغەمبەرێك (عَلَيْهِم الصَّلاَة وَالسَّلاَم) هیچ حاڵەتێکی تووش نەبووە ، کە خەڵك لێی بسڵەمێتەوەو لێی دوور بکەونەوە ، لە هیچ ڕوویەکەوە ، بەڵێ : ئەییوب نەخۆش کەوتوەو ، گیرۆدە بووەو ، نارەحەت بووە ، بەڵام وا نەبووە قێزەون بێ و ، خەڵك لێی دوور بکەوێتەوە ، خەڵك لێی بسڵەمێتەوە ، وەك هەندێك لە کتێبی

حیکایەتان دا هاتووە ، دەبێ دڵنیا بین لەوە ، کە پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةَ وَالسَّلاَم) بەڵێ بەشەر بوون : ساغ بوون ، نەخۆش بوون ، گەرمایان بووە ، سەرمایان بووە ، سەرکەوتوونو ژێرکەوتوونو ، کوژراونو نارەحەت بوون ، بەلاّم هیچ سیفەتێکیان نەبووە ، کە کەسێك بتوانێ بیکاتە بیانوو لەبەر ئەو سیفەتەی کە لە جەستەیاندا ، یان لە عەقڵیاندا ، یان لە نەفسیاندا ، یان لە نەسەبو رەچەڵەکیاندا ، یان لە دەوروبەریاندا هەیە ، بیکاتە پەرچو لەمپەرێك لەبەردەم خۆیدا ، کە ئەو پەیامەی خوای لێ وەرنەگرێ ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ : ئایا لەبەر خۆیانەوە بیریان نەکردۆتەوە : هاوەڵەکەیان هیچ جۆرە شێتییەکی تێدانیە ، نەك هەر شێت نیە ، بەڵکو هەر پەیوەندیی بە شێتییەوە نیە ، بەڵکو وریاکەرەوەیەکی ئاشکرایە .

**مەسەلەی شەشەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ ﴾ ، ئایا سەرنجی موڵکی فراوانی ئاسمانەکانو زەوییان نەداوە ، وە سەرنجی هەر شتێکیان نەداوە کە خوا دروستی کردووە ؟

واتە : با سەرنجی دوو شتان بدەن :

یەکەم : سەرنجی موڵکی فراوانی ئاسمانو زەوی ، کە وەك پێشتر گوتمان : وشەی ﴿ مَلَكُوتِ ﴾ ، تەنیا بۆ خوا بەکاردێ ، واتە : موڵکی هەرە فراوان ، موڵکی هەرە فراوان هەر هی خوایە ، وە هەر شتێکیش کە خوا دروستی کردووە ، کەواتە : تۆ چ سەرنجی هەر شتێك بدەی ، کە خوا دروستی کردوە ، لە گەردیلە تاکو کەهکەشان ، وە چ سەرنجی تێکڕای موڵکی فراوانی خوا بدەی ، چیت بۆ دەردەکەوێ ؟ بۆت دەردەکەوێ کە ئەم دنیایە شاری بێ خاوەن نیە ، وە بۆت دەردەکەوێ کە مرۆڤ بێ حیکمەتو بە هەوەنتە نەخوڵقاوە ، وە بۆت دەردەکەوێ کە پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةَ وَالسَّلاَم) کە گوتوویانە : ئێمە نوێنەری خواین ، پەیامی خوامان هێناوە ، ڕاست دەکەن ، وە بۆت دەردەکەوێ ، کە ئەم ژیانە دنیاییە ، شوێنی تاقی کردنەوەیە ، وە قۆناغێکی دیکە هەیە ، شوێنی لێپرسینەوەو سزاو پاداشتە ، کە دواڕۆژە .

دووەم : ئنجا دوایی دەفەرموێ : ﴿ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴾ ، وە ئایا سەرنجیان نەداوە بە چاوی عەقڵو دڵ ، کە بزانن ، ڕەنگە کاتی فەوتانو مردنیان نیزیك بووبێتەوە ، ئەدی لە دوای قورئان ، بەهۆی چ قسەیەکی دیکەوە ، بەهۆی چ فەرموودەیەکی دیکەوە ، ئیمان بە خوا دێنن ؟ یاخود ئیمان بە چ فەرموودەیەکی دیکە دێنن ، ئەگەر ئیمان بە فەرمایشتی خوا نەهێنن ؟ ئیمان بە چ کتێبێکی دیکەو چ نووسراوێکی دیکەو ، چ قسەیەکی دیکە دێنن ؟ چ قسەیەکی دیکە دێتە تەرازووەوە لەگەڵ فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خوای پەروەردگاردا ؟

کەواتە : لەم ئایەتە موبارەکەدا ، خوای بێ هاوتا هەر سێ بابەتە گەورەو سەرەکییەکەی ئیمانو عەقیدەی خستوونەڕوو : خوا ناسین ، پێغەمبەر ناسین ، دیداری خوا ، واتە :

١/ خوا بەیەکگرتن .

٢/ پێغەمبەرایەتییو ئیمان بە پێغەمبەرو بە وەحی .

٣/ ئیمان بە ڕۆژی دوایی .

بۆیەش پێشێ باسی پێغەمبەر ناسین ﷺ دەکات ، هەرچەندە خواناسین لە پێشەوەیە ، چونکە لە ڕێی پێغەمبەرەوە ﷺ خوا ناسینی ڕاستەقینەمان دەستگیر دەبێ ، ئەگەرنا هەموو مرۆڤەکان خوا دەناسن ، بەڵام خواناسینی ڕاستەقینە ، وە خواپەرستیی ڕاستەقینە ، وە پەیوەندیی دروست کردنو بەندایەتیی ڕێكو ڕاست لەگەڵ خوای پەروەردگاردا ، تەنیا لە ڕێی پێغەمبەرەوە دەبێ ، بۆیە لە ئایەتی یەکەمدا دەفەرموێ : ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ ۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ ﴾ ، ئنجا دوایی دێتە سەر باسی خواناسیی ، دەفەرموێ : ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ ﴾ ، واتە :

با تەماشای موڵکی فراوانی ئاسمانەکانو زەوی بکەن ، وە هەر شتێك کە خوا دروستی کردوە ، تاکو خاوەنی موڵکی ئاسمانو زەویو خاوەنی هەموو شتێك بدۆزنەوەو بیناسن ، کە خوای بالآدەستە ، پاشان دێتە سەر باسی رۆژی دوایی : ﴿وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ﴾ ، وە ئایا بیریان نەکردۆتەوەو سەرنجیان نەداوە : کە کاتی کۆتایی هاتنی ژیانیانو کاتی گەیشتنیان بە دیداری خوا نیزیك بێ ؟! کەواتە : باسی هەر سێ بابەتە سەرەکییەکەی ئیمانو عەقیدە کراوە ، لەم دوو ئایەتە موبارەکەدا .

**مەسەلەی حەوتەمو کۆتایی** : کە دەفەرموێ : ﴿مَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِىَ لَهُۥ وَيَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ ، واتە : هەر کەسێك خوا گومرای بکات ، هیچ رێنمایی کاری نین ، وە لێیان دەگەرێین لەسەر سەرکێشییو یاخیی بوونی خۆیاندا ، سەرگەردان بنو سەراسیمە بن .

بەلآم دەبێ وریا بین ! وەك پێشتر گوتمان : خوا کێ گومرا دەکات ؟ لە ئایەتی (٢٧)ی سوورەتی (إبراهيم)دا دەفەرموێ : ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە : خوا ستەمکاران گومرا دەکات ، هەروەها لە ئایەتی (٤٤) سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ، واتە : بێگومان خوا کۆمەڵی ستەمکاران رێنمایی ناکات ، هەروەها لە سوورەتی (غافر)دا دەفەرموێ : ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾﴾ ، واتە : ئاوا خوا هەر کەسێکی زێدەرۆییکاری بە گومانی دوودڵ ، گومرا دەکات .

هەروەها لە سوورەتی (فصلت)دا دەفەرموێ : ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴿١٧﴾﴾ ، واتە : بەلآم ئێمە گەلی ثەموودمان رێنمایی کرد ، کەچی خۆیان کوێرییان هەڵبژارد بەسەر رێنماییدا .

ئــەدی ئایــا خــوا کــێ هیدایــەت دەدات ؟ دەفــەرموێ : ﴿ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ ﴾الشـــورى ، واتــە : خــوا ، هــەر کەســێك لــە نــاخــەوە (بــەرەو خــوا) بگــەڕێتــەوە ، بــەرەو خــۆی ڕێنمـایی دەکات .

هەروەها فەرموویـەتی : ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًاۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ ﴾ غافـر ، واتـە : (خــوا) ئــەو کەســەیە کــە نیشانەکانی خۆیتـان پیشـان دەدات، لە سـەرێوە ڕۆزییـتـان بـۆ دەنێـرێتـە خـوارێ ، وە تەنیـا کەسێك پەنـد وەردەگـرێ ، کە لە نـاخـەوە دەگـەڕێتـەوە (بەرەو خـوا).

کەواتە : چ گومـڕا کـردنی خـوا بۆ بـەندەکان ، وە چ ڕێنمـایی کردنی بۆ بـەندەکان ، هیـچ کامیـان لەگۆتـرە نیە ، بـەڵکو هـەمووی بـە حیساب‌و کیتـابــە ، خــوا کەسـانێك ڕێنمایی دەکات کە ئـارەزوومەنـدی ڕێنماییـن ، دڵیـان بـەرەو خـوا وەردەچەرخــێ ، وە دڵیـان بـەرەو خـوا هـەنگاو دەنــێ .

بە پێچەوانــەوەش : وە کەســانێك گـومڕاو سـەرگـەردان‌و سـەرلـێشـێـواو دەکـات ، کە ڕێ (بـەرەو خـوا) دانـاگـرن ، وە ئـارەزوویـان بـەرەو خـوا نیـەو ویسـتـە ئـازادەکـەی خۆیـان ، ئـاڕاستـەی لایـەکی دیکـە دەکەن‌و ، پشـت لە خـوا دەکەن .

بـە پێـی یاسـای خــوا : ئەوانــەی پێشــێ ڕێنمـایی دەکـرێن‌و دەسـتیان دەگیــرێ‌و ، ئەوانـــەی دیکـــەش پشـــتگـــوێ دەخرێـــن‌و ئیهمـــال دەکرێـــن‌و ، ســەرەنجــام ســەرلـێشـێواوو گـومـڕا دەبـن .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ .

# دەرسی بیست و سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە (١٢) ئایەت پێکهاتوە : (١٨٧ ـ ١٩٨) ، لەم دوازدە ئایەتەدا خوای پەروەردگار سەرەتا تێیاندا ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ ، کە پرسیاری لێکراوە لەبارەی کاتی کۆتایی هاتنی بوون (وجود)ەوە ، ئەو کاتەی دنیای تێدا کۆتایی دێ ، ژیانی سەرزەمینی تێدا کۆتایی دێ ، وە تۆماری بوونەوەر تێیدا دەپێچرێتەوە ، پێی دەفەرموێ : پێیان بڵێ : زانیاریی هاتنی (ساعة) (کاتی کۆتایی ژیانی دنیا) بەس لە لای پەروەردگارمە ، جگە لەو هیچ کەس هیچی لێ نازانێ ، وە کتوپڕیش دێ .

ئنجا خوای پەروەردگار پێی دەفەرموێ : کە ڕایبگەیەنێ : جگە لەوەی کە خوا بیەوێ ، هیچ سوودو زیانێکی خۆیشی بەدەست نیە ، چ جای هی خەڵکی ، وە ئەگەر پەنهانی زانیبایە (پێغەمبەری خاتەم ﷺ) هەموو خێرو خۆشییەکی بۆخۆی دەستەبەر دەکردو ، هەموو ناخۆشییەکی لێ دوور دەبوو ، بەڵام وا نەبووەو، پەنهانی (غیب)ی نەزانییوە ، جگە لەوەی کە خوا پێی ڕاگەیاندوە .

دوایی خوای بێ هاوتا باسی دروستبوونی هەر کامێك لە مرۆڤەکان دەکات لە یەك نەفس ، کە هاوسەرەکەیشی هەر لە خۆی ، واتە : هەر لە جۆری خۆی دروست کردوە ، کە دوای ئەوەی ئەو مێردە جۆتە لای هاوسەرەکەی (لەگەڵی جووت بووە) ، سەرەتا بە ئەندازەیەکی سووكو پاشان قورستر ئەو کۆرپەیە دروست بووە ، کە باری دایکی قورس دەکات ، ئنجا بابو دایکەکە گفتیان داوەو لە خوا پاڕانەوە ، کە ئەگەر کۆپەکەیان ساغو سەلامەت بێ ، شوکرانە بژێر دەبن ، کەچی دوایش هەرچەندە کۆرپەکەیان ساغو سەلامەت بوو ، بەڵام ئەوان هاوبەشیان بۆ خوا دانان .

ئنجا خوای کاربەجێ ﷻ بەسەر زەنشت کردنیانەوە ، دەفەرموێ : ئایا چۆن شتانێك کە بەدیهێنەر نین‌و بگرە خۆشیان بەدیهێنراون ، دەکەنە هاوبەشی خوا ، شتانێك کە نەك هەر ناتوانن ئەوان سەربخەن ، {واتە : ئەوانەی کە بەندایەتییان بۆ دەکەن ، پەرستشیان بۆ دەکەن} ، بگرە خۆشیان پێ سەر ناخرێ، وە ئەگەر بانگیشیان بکەن بۆ ڕێی ڕاست ، شوێنتان ناکەون ، کەواتە : نەك هەر ناتوانن خەڵك ڕێنمایی بکەن بۆ ڕێی ڕاست ، بەڵکو ئەگەر بەرەو ڕێی ڕاست بانگیش بکرێن ، هەر ناتوانن بێنە سەر ڕێی ڕاست ، وە یەکسانە بانگیان بکەن ، یاخود بێ دەنگ بن .

پاشان خوای بەرزو مەزن ڕایدەگەیەنێ کە : ئەو شتانەی دەیانپەرستن ، وەك پەرستارەکان بەندەی خوان ، {واتە : پەرستراوەکان وەك ئەوانەی کە دەیانپەرستن هەموویان دروستکراوی خوان} ، وە لاق‌و دەست‌و چاوو گوێیان نیە ، وە پاشان بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەفەرموێ : بڵێ : هاوبەشەکانتان بانگ بکەن با پیلانم لە دژ بگێڕن ، وە هیچ مۆڵەتیشم مەدەن ، واتە : لێتان بێ باکم .

وە لە کۆتایی دا خوا لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : بێگومان سەرپەرشتیاری من ، بەس ئەو خوایەیە کە کتێبی دابەزاندوەو ، هەر ئەویش سەپەرشتیاریی صالحان دەکات ، وە ئەو شتانەی ئێوە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە ، نە ئێوە سەردەخەن ، نە خۆشیانیان بۆ سەردەخرێ ، وە ئەگەر بەرەو هیدایەتیش بانگیان بکەی ، نابیستن ، وە بە ڕواڵەت تەماشات دەکەن ، بەلام ناتبینن ، {کە دیارە مەبەست پێی بت‌و صەنەمەکانە ، کە بە شێوەی پەیکەرو وێنە دروستیان دەکردن ، بەلام دیارە ژیانیان لەبەردانەبووو ، هیچ شتێکیشیان نە بۆ خۆیان نە بۆ کەس لە دەست نەدەهات} .

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ
ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا
عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى نَفْعًا وَلَا ضَرًّا
إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِىَ ٱلسُّوٓءُ ۚ
إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ
مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ۖ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِۦ ۖ فَلَمَّآ
أَثْقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَـٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا
صَـٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ۚ فَتَعَـٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا
يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾
وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْ ۚ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَـٰمِتُونَ
﴿١٩٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ۖ فَٱدْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟
لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَآ ۖ
أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۗ قُلِ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ
كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾ إِنَّ وَلِـِّۧىَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ ۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾
وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَكُمْ وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾
وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَسْمَعُوا۟ ۖ وَتَرَىٰهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿١٩٨﴾ ﴾.

# مانای وشــە بە وشەی ئایەتەکـان

((لەبارەی کاتی هاتنی کۆتایی (دنیاوە) پرسیارت لێدەکەن : کەی دەگیرسێتەوەو لەنگەر دەگرێ ؟ بڵێ : زانیارییەکەی لەلای پەروەردگارمە ، جگە لەو هیچ کەس کاتەکەی ئاشکرا ناکات ، (ڕووداوێکی) قورسە لە ئاسمانەکان‌و زەوی دا ، وە کتوپڕ نەبێ بەسەرتان نایەت ، پرسیارت لێدەکەن ، وەك تۆ زۆر لەبارەیەوە ئاگادار بی ! بڵێ : زانیاریی لەبارەیەوە بەس لە لای پەروەردگارمە ، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن ﴿١٨٧﴾ بڵێ : مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ ، دەنا هیچ سوودو زیانێکی خۆمم بەدەست نیە ، وە ئەگەر پەنهانم زانیبایە ، هەر لە چاکەو سوودم بۆخۆم زیاد دەکردو ، هیچ خراپەیەکیشم تووش نەدەبوو ، من تەنیا موژدەدەرو ترسێنەرم ، بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن ﴿١٨٨﴾ (خوا) ئەو کەسەیە کە لە یەك نەفس دروستیکردوون ، وە هاوسەرەکەیشی هەر لە (جۆری) خۆی گێڕاوە ، تاکو هۆگری بێ ، ئنجا کە دایپۆشی (لەگەڵی جووت بوو) سەرەتا (ژنەکە) بارێکی سووکی هەڵگرت (سکپڕ بوو) ، وە کاتی پێوە گوزەراند ، وە کاتێك بارەکەی قورس بوو (کۆرپەکەی گەورە بوو) هەردووکیان (ژن‌و مێردەکە) لە خوای پەروەردگاریان پاڕانەوە : (پەروەردگارمان !) مسۆگەر ئەگەر منداڵێکی ساغمان بدەیە ، لە سوپاسگوزاران دەبین ﴿١٨٩﴾ کەچی دوای ئەوەی منداڵێکی ساغ‌و سەلامەتی پێدان ، هاوبەشیان بۆ (خوا) دانان ، لەوەدا کە پێیداون ، بەرزیی بۆ خوا ، لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی ﴿١٩٠﴾ ئایا شتانێك دەکەنە هاوبەشی (خوا) کە هیچ دروست ناکەن‌و خۆیشیان دروست دەکرێن ﴿١٩١﴾ وە نە دەتوانن سەریان بخەن‌و ، نە خۆشیانیان بۆ سەردەخرێ ﴿١٩٢﴾ وە ئەگەر بەرەو ڕێنمایی بانگیان بکەی ، شوێنتان ناکەون ، یەکسانە چ بانگیان بکەن ، یان ئێوە بێدەنگ بن ﴿١٩٣﴾ بێگومان ئەوانەی کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە ، بەندەی وەك ئێوەن ، دەجا ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن (کە ئەوانە شتێکیان لەدەست دێ) بانگیان بکەن ، با وەڵامتان بدەنەوە ! ﴿١٩٤﴾ ئایا ئەو (بتە پەرستراو)انە لاقیان

هەن ، پێیان بڕۆن ، یان دەستیان هەن زەبریان پێوە بوەشێنن ، یان چاویان هەن ، پێیان ببینن ، یاخود گوێیان هەن ، پێیان ببیستن ؟ بڵێ : هاوبەشەکانتان بانگ بکەن ، پاشان پیلانم لە دژ بگێڕن و هیچ مۆڵەتم مەدەن ﴿١٩٥﴾ دۆستو پشتیوانی من تەنیا ئەو خوایەیە کە کتێبی دابەزاندوەو ، هەر ئەویشە سەرپەرشتی چاکان دەکات ﴿١٩٦﴾ ئەوانەی لە جیاتی وی لێیان دەپاڕێنەوە ، نە سەرخستنی ئێوەیان لە دەست دێو ، نە خۆشیان سەردەخەن ﴿١٩٧﴾ وە ئەگەر بەرەو ڕێنماییش بانگیان بکەن ، هیچ نابیستن ، وە دەیانبینی تەماشات دەکەن ، کەچی نابینن ﴿١٩٨﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ٱلسَّاعَةِ ) : (الساعَةُ : جُزْء مِنْ أَجْزَاءِ الزَّمَانِ ، وَيُعَبَّرُ بِهِ عَنِ القِيَامَةِ ، وَسُمِّيَتْ بِذَلِكَ تَشْبِيْهًا لِسُرْعَةِ حِسابِهِ) ، (ساعة) بەشێکە لە بەشەکانی کات ، وە تەعبیری پێ دەکرێ دەربارەی ڕۆژی هەڵسانەوە ، بۆیە ڕۆژی دوایی ناونراوە : (ساعة) چونکە زۆر بەخێرایی لێپرسینەوەی تێدا دەکرێ .

بەڵام من پێم وایە (ساعة) جیایەو (قيامة)ش جیایە ، (ساعة) ئەو کاتەیە کە دیاریکراوە ، بۆ تێدا کۆتایی هاتنی ژیانی دنیاو ، ئەم بوونەوەرەو هەڵدرانەوەی لاپەڕەیەکی تازە ، بەڵام (قيامة) واتە : هەڵسانەوەی مردووان لە گۆڕەکانیانو زیندووبوونەوەیان ، کەواتە : (ساعة)و (قيامة) لە یەکدی جیان .

(أَيَّانَ ) : {أَيَّانَ : عِبَارَةٌ عَنْ وَقْتِ الشيءِ ، وَيُقَارِبُ مَعْنَى (مَتى) ، قِيلَ أَصْلُهُ : أَيُّ أَوَانٍ ، أي وقت} ، (أَيَّانَ) بریتیە لە پرسیارکردن دەربارەی کاتی شتێك ، وە ماناکەی لە مانای (متى)ەوە نیزیکە ، واتە : کەی ، وە دەگوترێ لە ئەسڵدا لە (أَوَان) هاتوە ، واتە : چ کاتێك ؟

(مُرْسَىٰهَا ) : واتە : کاتی لەنگەر گرتنی ، کاتی هاتنی ، (رَسا الشيءُ يَرْسو رَسا : ثَبَتَ) ، واتە : چەسپا ، بەتایبەتی بۆ کەشتیی دەگوترێ : (رَست السَّفِينَةُ فِي المِينَاءِ) کەشتییەکە لە لەنگەرگا (میناء) واتە : لەو شوێنەی کە دەبێ لێی بوەستێ (بەندەر) لەنگەری گرت ، (وَالمرْسى : يُقَالُ للمَصْدَرِ وَالمكانِ وَالزَّمَانِ وَالمفعُولِ) ، وە (مُرْسى) بۆ چاوگو کاتو شوێنو ، هەروەها وەك بەرکاریش بەکاردێ .

(لَا يُجَلِّيهَا ) : واتە : ئاشکرای ناکات ، (أَصْلُ الجَلْوِ : الكَشْفُ الظاهِرُ ، لا يَجلوها أَي لا يَكْشِفُها ، لا يُظْهِرُها) ، کەواتە : (لا يُجَلِّيها) واتە : دەریناخاتو ئاشکرای ناکات .

(بَغْتَةً ) : واتە : كتوپڕ ، لەنەكاو ، (البَغْتُ : مُفَاجَأَةُ الشيءِ مِنْ حَيْثُ لاَ يُحْتَسَبْ) ، شتێك كتوپڕبێ ، بەبێ ئەوەی كە لەبەرچاو گیرابێ‌و چاوەڕوانیی كرابێ .

(حَفِيٌّ عَنْهَا ) : (الحَفِيُّ : العَالِم بالشيءِ) ، (حَفِيّ) بریتییە لە زانا بە شتێك ، دەگوترێ : (أَحْفَيْتُ الشارِبَ : أَخَذْتُهُ أَخْذاً مُتَنَاهِياً ، وَالحَفِيُّ : المستقْصِي بالسُّؤالِ) ، لە زمانی عەرەبیدا یەكێك دەڵێ : (أَحْفَيْتُ الشارِبَ) واتە : سمێڵم كورت كردنەوە ، واتە : زۆرم كورت كردەوە تا كۆتایی چوو ، وە (حفيٌّ) كەسێكە كە زۆر بە دوای شت دەكەوێ‌و پرسیار دەكات ، وەك كوردەوارییی دەڵێن : تا دەیگەیەنێتە مریشكە ڕەشە .

(لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ) : (السُّكونُ : ثُبُوتُ الشيءِ بَعْدَ تَحَرُّك) ، (سُكون) بریتییە لە ڕاوەستان‌و ئارام بوونەوەی شتێك ، دوای ئەوەی لە حاڵەتی جووڵەدا بووە .

(تَغَشَّاهَا ) : (غَشْيَهُ أَي سترَهُ وَأَتَاهُ ، وَالغِشاوَةُ ما يُغَطَّى بهِ الشيء ، وَكُنِّي بذَلِكَ عَنِ الجِمَاع) (غَشْيَهُ) ، واتە : دایپۆشی‌و چووە لای ، (غِشاوَة) هەر شتێكە كە شتێكی پێ داپۆشرێ ، وە لێرەدا مەبەست لە (تَغَشَّاها) ، واتە : لەگەڵی جووت بوو ، كینایەیە بۆ جیماع‌و پێكەوە جووتبوونی ژن‌و مێرد .

(فَمَرَّتْ بِهِۦ ) : (المرُور : المضيُّ والإجْتِيَازُ بالشيءِ) ، (مُرُور) بریتییە لە تێپەڕین‌و گوزەركردن بە لای شتێكدا ، یان بڕینی شتێك .

(عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ) : (مَخلُوقَات خَاضِعَات لله) واتە : دروستكراون ، وە ملكەچن بۆ خوا ، وەك ئێوە .

(يَبْطِشُونَ بِهَآ ) : (البَطْشُ : تَنَاولُ الشيء بصَوْلَةٍ) ، (بَطْش) بریتییە لە نەكاو داهاتنە شتێك ، بە زەبر .

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

ئەو ئـایەتانە بـە گشـتی باسی هـاتنی ڕۆژی دوایـی دەکـەن ، وە باسـی ئـەوە دەکەن کە پەنهـان بێجگە لە خـوا کەس نایـزانـێ ، هەروەهـا باسـی دروسـتبوونی مرۆڤ و ، دوایی باسی شـیرك و پووچیی بیرۆکەی بتپەرستیی دەکـەن .

خـوای پەروەردگار ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکاتو دەفەرموێ : ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَا ﴾ ، پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (ساعة) واتـە : کـاتی تێدا کۆتـایی هـاتنـی دنیاو ژیان ، دەڵێن : کەی لـەنگـەر دەگـرێ ؟ یاخـود کـەی دەچەسپـێ ؟ ﴿ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّي ﴾ ، بڵـێ : بێگومان زانیاریی هـاتنی کـاتی کۆتـایی ئـەم دنیـاو ژیـانە ، تەنیـا لـەلای پەروەردگـارمە ، واتـە : بێجگـە لـەو هـیچ کـەس نایزانـێ ، ﴿ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَۚ ﴾ ، هیچکەس کاتەکەی دەرناخات جگە لـەو (خـوا)، واتـە : هـەر ئـەو دەزانـێ کاتەکەی کەنگێیـە ، بێجگـە لـەو کـەس ئـاشـکرای ناکـاتو دەرینـاخـات ، ﴿ ثَقُلَتۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ﴾ ، هـاتنی کـاتی ڕۆژی دوایـیو کۆتایی هـاتنی ئـەم ژیـانی دنیـایە ، قورسـە لە ئـاسمانەکانو زەویدا ، واتە : قورسـە کە بیزانن ، یـان : هـەواڵێـکی قـورسو گـرانە ، کارەسـاتێکی گـەورەو گـرانە ، ﴿ لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا بَغۡتَةٗۗ ﴾ ، کـتـوپـڕ نەبـێ بۆتـان نایـەت ، لـەنەکـاو دێ ، بـەبـێ ئـەوەی کـە چاوەڕوانیـی بکـەن ، واتـە : چاوەڕوانییـەکی زوو ، ئەگـەرنا خەڵك وەك چاوەڕوانییـەکی درەنـگ هـەر دەزانـن کـە ئەم بوونەوەرو دنیـایە ، بـە کۆتـا دێ ، تەنانـەت مولحیـدو مادییەکـانییش بـەپێی : یاسـای دووەمـی دینـامیکـیی گـەرمیـی (القـانون الثـانـي للدینـامینیکـا الحـراري) کـە دەڵـێ : بـەردەوام گـەرمـایی لە تەنە گـەرمەکـانەوە دەگوازرێتـەوە بـۆ تەنـە ساردەکـان ، ئنجا هـەرکات یەکسان بوون ، ئـەوە جووڵەو هێـزی کـێشـندەو سووڕانـەوەی خڕۆکـەو ئەستێرەکان دەوەسـتـێ ، وە لەو کـاتەدا هـەموو شـتـێ کۆتایی پـێ دێ .

لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ : ئەگەر تاکو ئەو کاتە دنیا بەردەوام بێ‌و زانیاریی زیاتر بەرەو پێش بچێ ، دەتوانن بە وردیی بزانن : تیشکی خۆر کەی لەگەڵ گەرمیی ئەو نۆ خڕۆکەیەی بە دەوریدا دەسووڕێنەوە ، یەکسان دەبنەوە ، ئەو کاتە دەتوانن کاتی هاتنی تێکچوونی جیهان (ساعة) دیاریی بکەن ! بەڵام دەڵێین : نەخێر ... ! خوای زاناو توانا نەیفەرمووە : ئەو کاتە کە گەرمیی نێوان تەنە گەرمەکان‌و ساردەکان ، یەکسان دەبێ ، ئەو کاتە قیامەت دێ ! تاکو بگونجێ پێشبینیی بکرێ ، بەڵکو دەفەرموێ : کتوپڕ نەبێ نایەت ، ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنۡهَا﴾ ، ئەوان لە تۆ دەپرسن دەربارەی هاتنی کاتی تێکچوونی دنیاو ، ڕۆژی دوایی ، وەك ئەوەی تۆ زۆر لێی شارەزا بی ، زۆر پێی زانا بی ، یاخود وەك ئەوەی کە تۆ زۆر لێت پرسیبێ‌و زۆر بەدوایدا چووبی‌و مشوورت لێخواردبێ ، کە بیزانی ، ﴿قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ ، جارێکی دیکەش دووبارەی دەکاتەوە کە بڵێ : بێگومان زانیاریی کاتی هاتنی (ساعة) واتە : کۆتایی هاتنی دنیا ، تەنیا لەلای خوایە ، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ ، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن ، (کە بێجگە لە خوا هیچ کەس نایزانێ) ، بەداخەوە زۆرجار بەشەر زێدەڕۆیی دەکات‌و ، هەستو سۆز هەڵیدەگرێ‌و هەندێ لەو شتانەی کە تایبەتن بە خوای پەروەردگارەوە ، هەندێ لە دروستکراوەکانیان پێ وەسف دەکەن : هەیە شیفا هێنان ، پاڵدەداتە لای جگە لە خوا ، هەیە زانیاریی هەبوون بە نادیار ، پاڵدەداتە لای جگە لە خوا ، وە هەیە زانینی کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی ، پاڵ دەداتە لای جگە لە خوا ... هتد ، کە لە ڕاستییدا ئەو سیفەتانەی تایبەتن بە خوای تاك و پاکەوە ، ئەگەر جگە لە خوایان تێدا بەشدار بکرێ ، ئەوە بە شیرك‌و هاوبەش بۆ خوادانان دادەنرێ ، وەك پێشتر باسمان کرد .

ئنجا خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ : ﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ﴾ ، بڵێ : من هیچ شتێکم بۆخۆم بەدەست نیە ، نە سوود گەیاندن ، نە زیان گەیاندن ، واتە : قازانج‌و زیانی خۆشمم بەدەست نیە ، مەگەر

ئەوەی کە خوا بیەوێ ، یانی : ئەگەر سوودگەیاندن بە خۆم و ، زیان دوورخستنەوە لە خۆم بەدەست نەبێ ، مەگەر بە ویستی خوا ، چۆن هی خەڵکی دیکەم بەدەستە ؟ (مَنْ لَمْ يَكُنْ لِنَفْسِهِ فَكَيْفَ يَكونُ لِغَيْرِهِ !) کەسێك بۆخۆی نەبێ ، بۆ خەڵك چۆن دەبێ !!

هەڵبەتە بۆیە خوای کارزان وایفەرمووە ، لە حاڵێك دا پێغەمبەر ﷺ هەرگیز ئیددیعای وای نەکردووەو ، هیچ کام لە پێغەمبەرانیش بانگەشەی وایان نەکردوە ، وە هیچ بەندەیەکی چاکی خوا شتی وای نەگوتووەو نایڵێ ، چونکە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان هەندێ شتیان لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ چاوەڕێ دەکرد ، کە ئەو ئەو شتانەی لە توانادا نەبوو ، یەکێك لەوانە زانینی هاتنی کاتی ڕۆژی دوایی بوو .

﴿وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُ﴾ ، (دەفەرموێ : تۆ پێیان بڵێ) : وە ئەگەر پەنهانم زانیبایە ، هەر چاکەم زیاد دەکرد ، وە هیچ خراپەیەکم تووش نەدەبوو ، ﴿إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ ، بێگومان من بێجگە لە ترسێنەرو مژدەدەر بۆ کۆمەڵێك کە بڕوا بێنن ، هیچی دیکە نیم ، واتە : هەر ئەوەم بەدەستە کە خەڵك بترسێنم لە سەرەنجامی خراپەو لادان ، کە سزاو جەزرەبەی خوای دادگەرە ، بەهۆی خراپەکانیانەوە ، وە خەڵك دڵخۆش بکەم بە پاداشتی خوا ، بە بەهەشتی خوا ، ئەویش بۆ کۆمەڵێك کە بڕوا بێنن ، ئەگەر بڕوا نەهێنن ، دیارە ئەوەی ئیمانی نەبێ ، لە پەیامی پێغەمبەری خاتەم ﷺ ، وە لە ترساندنیو لە دڵ خۆشکردنیو لە هۆشیارکردنەوەو لە موژدە پێدانی ، بەهرەمەند نابێ ، چونکە حیسابی بۆ ناکاتو ئیعتیباری پێناکات ، ئەگەرنا لە ڕاستییدا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەموو بەشەر هاتوە ، کە مژدەدەرو ترسێنەر بێ ، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴿٢٨﴾ ﴾سباء ، واتە : تۆمان نەناردوە ، مەگەر بۆ تەواوی خەڵکی مژدەدەرو ترسێنەر بی ، بەڵام کێن ئەوانەی کە لە مژدەدانو ترسێنران ، وە لە دڵخۆشکردنو

لە هۆشیارکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بەهرەمەند دەبن ؟ ئەوانەن کە ئیمان دێنن ، کەسێك کە ئیمانی نەبێ ، لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەهرەمەند نابێ .

پاشان خوا ﷻ باسی ژیانی هەر کامێك لە مرۆڤەکان دەکات ، کە چۆن پەیدا دەبن ؟ دەفەرموێ : ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا﴾ ، خوا ئەو کەسەیە کە ئێوەی لە یەك نەفس دروستکردوە ، وە هەر لە خۆیشی هاوسەرەکەیشی دروستکردوە ، (بۆچی ؟) ﴿لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا﴾ ، بۆ ئەوەی بەهۆیەوە ئارامیی بۆ بێ و ئۆخژنی بۆ بێ و هۆگری ببێ ، واتە : هەر کامێك لە ئێوە لە یەك نەفس دروستبوون ، وە هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی دروستکردوە ، یانی : هەر کامێك لە ئێوە لە دایك و بابێك دروستبوون کە دایکەکەش ، هەر لە هەمان جۆری نەفسی بابەکە ، دروست بووە .

ئنجا خوا باسی ئەوە دەکات کە ئەو ژن و مێردە ، ئەو دایك و بابە ، چۆن پێکەوە جووت دەبن و ، دوایی چۆن ئەو کۆرپەیە پەیدا دەبێ ؟ دەفەرموێ : ﴿فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِۦ﴾ ، دوای ئەوەی مێردەکە هاوسەرەکەی داپۆشی ، واتە : پێکەوە جووت بوون ، وشەی (تَغَشَّىٰهَا ) داپۆشیی : تەعبیرێکی زۆر بە ئەدەبانەو بە نەزاکەتە بۆ حاڵەتی جووت بوون و جیماع ، کاتێك داپۆشی ﴿حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا﴾ ، ژنەکە ، دایکەکە بارێکی سووکی هەڵگرت ، (سکپڕ بوو)[١]، بەڵام دیارە سەرەتا قورس نەبووە ، ﴿فَمَرَّتْ بِهِۦ﴾ ، لەگەڵیدا ڕۆیشت ، یانی : ژیانی لەگەڵ گوزەراند ، بێ ئەوەی هەست بە بارگرانی بکات ، ﴿فَلَمَّآ أَثْقَلَت دَّعَوَا

١) وشەی : دووگیان بۆ (حامل) بەکاردێ ، بەڵام ئەگەر سکەکەی دووانە (توأم) یان زیاتریش بێ ، دەبێ بگوترێ : سێ گیان یان چوا یان پێنج گیان ! بۆیە پێم وایە وشەی : (ئاوس) یان (سکپڕ) بۆ (حامل) ئاساییە ، هەرچەندە لەسەر پێشنیاری هەندێك لە دڵسۆزان من (ئاوس)یشم بەکارنەهێناوەو بەس (سکپڕ) بەکاردێنم .

ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ ، ئنجا کاتێك بارەکەی قورس بوو ، (ئەو ئافرەتە وردە وردە کۆرپەکەی گەورە بوو ، وە سکی قورس بوو) ، هەردووکیان لە پەروەردگاریان پاڕانەوە (گوتیان :) ئەگەر منداڵێکی ساغو سەلامەتو تەندروستمان پێبدەی ، سوێند بە خوا ئێمە لە سوپاسگوزاران دەبین ، ﴿ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ﴾ ، بەڵام کاتێك کە خوا منداڵێکی سەلامەتی پێدان ، {لێرەدا صالح بە مانای سەلامەتو ساغو تەندروست دێ ، کە دەفەرموێ (صالحاً) مەبەست پێی چاکەکار نیە ، چونکە جارێ بچووکە نازانرێ کە چاکە دەکات ، یان خراپە دەکات ، بەڵام وشەی : (صالح) وەك چۆن بە ئینسانی کردەوە باش دەگوترێ بە ئینسانی جەستە باشیش دەگوترێ ، یانی : لە ڕووی جەستەییەوە ، ساغو سالمو تەندروست بوو} ، هاوبەشیان بۆ خوا دانان لەوەدا کە پێیدابوون ﴿ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ ، بەرزیی بۆ خوا لەوەدا کە دەیانکەن بە هاوبەش بۆ خوا .

ئنجا ئایا چۆنیان هاوبەش بۆ خوا دانا ؟ دیارە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر ، بەڵام لێرەدا بەپێی سیاقەکەی دەردەکەوێ کە قسە لەسەر هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانو بت پەرستەکانە ، ئەوانیش چ کە منداڵیان بووە ، چ کە ڕۆزییەکیان دەست کەوتوە ، چ کە هەر نیعمەتێکیان پێدراوە ، گێڕاویانەتەوە بۆ بتو صەنەمەکیانو ، بۆ ئەو پەرستراوانەی کە لێیان دەپاڕانەوەو پەرستشیان بۆ ئەنجام دەدان ، بۆیە دەفەرموێ : ﴿ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴾ ، ئایا شتانێك دەکەنە هاوبەشی خوا ، کە هیچ دروست ناکەن ، بەڵکو خۆشیان دروست دەکرێن ؟ یانی : خۆشیان دروستکراونو ، بەدیهێنەری هیچ شتێك نین ، کەواتە : دەبێ ئەو کەسەی کە دەپەرسترێ ، ئەو زاتە بێ کە دەتوانێ شت دروست بکاتو وەدیبێنێ ، ئەویش تەنیا خوای بەدیهێنەرە ، وە دەبێ پەرستراو (معبود) سەرپەرشتیی دروستکراوەکان بکاتو پەروەردەیان بکات ، کەچی ئەوان : ﴿ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴾ ، نەك هەر ناتوانن هیچ

شتێك بەدی بێنن‌و دروست بکەن ، بەڵکو ئەوانەی کە دەیانپەرستن : ئەگەر داوای سەرکەوتن‌و یارمەتییان لێبکەن ، ناتوانن یارمەتییان بدەن ، بەڵکو ناتوانن خۆشیان سەربخەن ، چ جای ئەوانەی کە دەیانپەرستن ، واتە : ئەوە هیچ کە ناتوانن ئێوە سەربخەن ، ناتوانن خۆشیان سەربخەن ، ﴿ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْ ﴾ ، نەك هەر ئەوەندە ، بەڵکو ئەگەر بانگیشیان بکەن بەرەو ڕێنمایی‌و ڕێی ڕاست ، شوێنیشتان ناکەون ، ناتوانن شوێنیشتان بکەون ، ﴿ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَٰمِتُونَ ﴾ ، یەکسانە چ بانگیان بکەن ، چ ئێوە بێدەنگ بن ، بۆ ئەوان هەر وەك یەکە ، چونکە ناتوانن شوێنتان بکەون .

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ﴾ ، بێگومان ئەوانەی کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە ، بەندەی وەك خۆتانن ، واتە : لەو ڕووەوە کە هیچیان لەدەست نایەت ، ئەگەرنا جاری وایە ئەو پەرستراوانە : مانگ‌و خۆرو ، ئەستێرە ، یان شتی بێ ژیان‌و بێ گیانن ، ئەدی بۆچی خوا دەفەرموێ : ﴿ عِبَادٌ ﴾ ، واتە : ئەوانیش بۆ خوا ملکەچن ، وەك ئێوە ، وەك چۆن ئێوە بۆ خوا ملکەچن ، بە شێوەیەکی ئیجباریی ، نەك بەشە ئیختیارییەکەتان کە بریتییە لە بەندایەتییتان بۆ خواو فەرمانبەریی بۆ کردنی ، بەڵکو لە بەشە ناچارییەکەدا ، کە بریتییە لەوەی : ناتوانن نەخۆن‌و نەخۆنەوەو ، نەخەون‌و سەرجەم ئەو شتانەی کە ژیان و گوزەرانتان پێیان بەردەوام دەبێ ، وەك چۆن ئێوە لەو بەشە ئیجبارییەدا ، ملکەچن بۆ یاساکانی خوا ، ئەوانیش ملکەچن بۆ یاساکانی خوا ، وە ناتوانن لە سنووری یاساکانی خوای پەروەردگار دەربچن ، ﴿ فَٱدْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ ، دەجا لێیان بپاڕێنەوە ، با وەڵامتان بدەنەوە ، ئەگەر ئێوە لە ڕاستگۆیانن ، یانی : ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن : کە ئەوانە شایستەی پەرستنن ، فەرموون : لێیان بپاڕێنەوە ، با ئەوانیش وەڵامتان بدەنەوە ! .

ئنجا خوا زیاتر پووچیی بیرۆکەی بتپەرستیی‌و هاوبەش بۆ خوادانان دەخاتەڕوو ، چونکە ئێستاش لەگەڵ دابیّ دەتوانین بڵێین : یەك لەسەر چوار (١/٤)ی دنیا بەلای کەمەوە ، بە ڕەسمیی بتپەرستە : بووزاییەکان‌و کۆنفۆشیۆسییەکان‌و هیندۆسییەکان‌و گاپەرستەکان‌و ، گەلێك خەڵك لە ولاتانی ڕۆژهەلاتی ئاسیاو ئەفریقیا ، کە ئێستاش چەندان جۆرە شت دەپەرستن ، ئەوە جگە لەوەی کە ئەگەر بێت‌و مسوڵمانانی لاڕێو پاشان نەصرانییەکان کە عیسا دەپەرستن‌و دایکی دەپەرستن‌و (روح القدس) دەپەرستن ، وەك لە تەفسیری سوورەتی (المائدة)دا بە تەفصیلْ باسمان کردوە ، کە ئەگەر بێت‌و ئەوانە حیساب بکەی ، دەتوانین بڵێین ، نیوەی خەڵکی دنیا ئێستاش جگە لە خواپەرستەو هاوبەش بۆ خوا دانەرە ، بە شێوەیەك لە شێوەکان ، بۆیە خوا زۆر بە سەختیی هێرش دەکاتە سەر بیرۆکەی بتپەرستیی‌و هاوبەش بۆ خوا دانان‌و ، خوا یەکسان کردن لەگەڵ دروستکراوەکانیدا ، کە بناغەی شیرك بریتیە لە یەکسان کردنی دروستکراوەکان لەگەڵ خوادا ، وەك لە سوورەتی (الشعراء)دا بت پەرستەکان دانپێدا دێنن‌و ، دەڵێن : ﴿ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾ ، واتە : سوێند بە خوا ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بووین ، کە ئێوەمان یەکسان دەکرد لەگەڵ پەروەردگاری جیهانەکان دا .

کەواتە : شیرك لە بنەڕەتدا بریتیە لە یەکسان کردنی دروستکراوەکان ، یان بەشیّ لە دروستکراوەکان لەگەڵ خوادا ، لە سیفەتێك لە سیفەتەکان دا ، کە تایبەتن بە خواوە ، یان لە شتیّ لە شتەکان دا کە تایبەتن بە خواوە ، یان لە کردەوەیەك لە کردەوەکانی خوادا .

ئنجا خوا بە شێوەی پرسیارکردنی نکووڵییکارانەو بە سەرزەنشتکردنەوە دەفەرمویّ : ﴿ أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَآ ﴾ ، ئایا ئەوانە لاقیان هەن، پێیان بڕۆن ؟ ﴿أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَآ ﴾ ، یان دەستیان ، هەن شتیان پیّ بگرن ؟ یان دەستیان پیّ بوەشێنن‌و زەبریان پیّ بوەشێنن ؟ ﴿ أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَآ ﴾ ، یان ئایا

چاویان هەن ، پێیان ببینن ؟ ﴿ أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ﴾ ، یاخود ئایا گوێیان هەن ، پێیان ببیستن ؟ واتە : ئەوانەیان هیچ کام نیە ، بێگومان بتو صەنەمەکان هیچ کام لەوانەیان نیە ، تەنیا وەك پەیکەرێك دروستیان کردبوون ، ئەویش نەك هەموویان بەڵکو تەنیا ئەوانەیان کە پەیکەر بوون ، چونکە لە بتپەرستەکان هەیانە مانگو خۆر دەپەرستێ ، هەیانە گڕو گیا دەپەرستێ ، هەیانە مشكو مار دەپەرستێ ، هەیانە هەواو ئارەزووی خۆی دەپەرستێ ، هەیانە پارەو سامان دەپەرستێ ، بەڵام ئەوانەی لە شێوەی پەیکەر دابوون ، واپێدەچێ خوای پەروەردگار مەبەستی ئەوان بێ ، دەفەرموێ : ئەوانە نە لاقیان هەیە پێی بڕۆن ، نە دەستیان هەیە شتی پێ بگرن ، نە چاویان هەیە پێی ببینو ، نە گوێیان هەیە پێی ببیستن ، هەڵبەتە دەستو لاقو چاوو گوێی ڕواڵەتییان هەبوو ، بەڵام بێ گیان بوون ، بێ ژیان بوون ، بێ جموجوڵ بوون ، بۆیە دەفەرموێ : ﴿ قُلِ ٱدْعُواْ شُرَكَآءَكُمْ ﴾ ، بڵێ : لە هاوبەشەکانتان بپاڕێنەوە ، یاخود بانگیان بکەن ، با هاوکارتان بن ، ﴿ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴾ ، دوایی پیلانم لە دژ بگێڕن ، نەخشەم لە دژ دابنێن ، وە هیچ مۆڵەتم مەدەنو چاوەڕێم مەکەن ، واتە : من بێ منەتو بێ باکم لەو پەرستراوانەی ئێوە ، چونکە نە خۆتانو نە پەرستراوەکانتان لە دژی من هیچتان لەدەست نایەت ، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ .

ئنجا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ ۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ ، بێگومان دۆستو پشتیوانو خۆشەویستی منو ، یارو یاوەری منو ، سەرپەرشتیارو مشوورخۆری من ، تەنیا ئەو خوایەیە کە کتێبی ناردۆتە خوار ، وە هەر ئەویش سەرپەرشتیی چاکان دەکات ، کە دیارە پێغەمبەری خواش پێشەوای چاکان بووە ، بەڵکو چاکترینی چاکان بووە ، بەڵکو هەموو پێغەمبەران سەرتۆپی باغی مرۆڤایەتیی بوون ، ﴿ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَكُمْ وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴾ ، وە ئەوانەی کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوەو بانگیان دەکەن ، نە دەتوانن سەرتان بخەن ، وە نەدەشتوانن یارمەتیی خۆیان بدەنو خۆشیان

سەربخەن ، ﴿ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَسۡمَعُواْ ﴾ ، وە ئەگەر بانگیشیان بکەن بۆ ڕێنمایی ، نابیستن ، چونکە گوێیان نیە ، ژیانیان نیە ، ﴿ وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴾ ، وە دەیانبینی تەماشات دەکەن ، بەڵام نابینن ، چونکە بتپەرستەکان چاویان بۆ دروست دەکردن ، وە بەرگیان لەبەردەکردنو ، خشڵیان بە بەردا دەکردن ، وەك ئێستا چۆن لە پێشانگای جلو بەرگو پۆشاك دا پەیکەری پیاوو ئافرەت دادەنێن جلو بەرگیان بەبەردا دەکەن ، کەسێك کە یەکەمجار بێ ، یاخود چاك تێ نەفکرێ ، وا دەزانێ بەشەرن‌و ڕاوەستاون ، خوا دەربارەی ئەو بتانە دەفەرموێ : کە تەمەشایاندەکەی ، وا دەزانی تەماشات دەکەن ، دەیانبینی تەماشات دەکەن ، بەڵام ناشبینن .

هەڵبەتە هەندێ لە توێژەرەوانیش ئەوەیان وا لێکداوەتەوە کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان تەماشای تۆ دەکەن ، بەڵام ناتبینن ، واتە : نیشانەکانی پێغەمبەرایەتییت تێدا نابینن ، چونکە چاوی دڵیان کوێرە .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم** : ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ﴾ ، دەربارەی (ساعة) پرسیارت لێدەکەن ، کە وەك پێشتر گوتمان : (ساعة) بەمانای کاتی دیارییکراوی کۆتایی هاتنی دنیایە ، وە بە پێچەوانەی تێگەیشتنی زۆر کەسەوە : (ساعة) بە مانای قیامەت نیە ، بەڵکو قیامەت قۆناغێکی دواترە ، دوای ئەوەی کە دنیا کۆتایی پێ دێو ، کاول دەبێ تێکدەچێو بەسەریەکدا دەڕمێ ، قۆناغێکی دیکە دێ ، بەو قۆناغە دەگوترێ : (قیامة) ، قۆناغی یەکەم (ساعة)یە وەك من لە کتێبی (الإسلام کما یتجلی في کتاب اللّٰه بەرگی پێنجەم ، لە باسی ئیمانو ڕۆژی دوایی دا ، بە تەفصیلی باسم کردوە .

ئنجا گەلێك لە توێژەرەوانی قورئان (ساعة) و (قیامة)یان تێکەڵ کردوە ، بۆ وێنە : ڕاغیبی ئەصفهانیی دەڵێ : (السـاعَةُ : جـزء مـن أجـزاء الـزَّمن ، وَ يُعَبَّـرُ بـهِ عَنِ القِيامَةِ) ، (ساعة) بەشێکە لە بەشەکانی کات ، وە تەعبیری پێ دەکرێ دەربارەی ڕۆژی دوایی (قیامة) ، کە لەڕاستییدا ئەمە وا نیە ، مەگەر بڵێی : ڕۆژی دوایی بە (ساعة) تەعبیری لێدەکرێ ، واتە : بە سەرەتای هاتنی ڕۆژی دوایی ، وە خوای بێ هاوتا لە سوورەتی (الزمر)دا باسی هەردوو قۆناغەکە دەکات ، دەفەرمـوێ : ﴿ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾ ، واتە : فوو بە کەڕەنادا کرا ، هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دابوو ، جگە لەوەی خوا هەڵیداوێرێو ، (و خوا نەیویستوە) ، هەموویان لە هۆش خۆیان چوون ، یان هەموویان مردن ، (ئەوە جاری یەکەمو ، فووی یەکەم بوو ، کە فوو بەکەڕەنادا

دەکـرێ)، دوایـی جارێکی دیکە فووی پێدا کرا ، یەکسەر بینیت هەموویان هەڵسانەوەو تەماشایان دەکردو چاوەڕوانییان دەکرد .

هەر بۆیەش هی یەکەم پێی دەگوترێ : (ساعة) چونکە لە کاتێکی زۆر کتوپڕدا ، وە لە کاتێکی زۆر خێرادا ئەو گۆڕانکارییە مەزنە لە بوونەوەردا دەقەومێ ، وا پێدەچێ شتێکی ئەوتۆی پێنەچێ ، بۆیە پێی دەگوترێ : (ساعة) ، ئەوەی دیکە پێی گوتراوە : (قیامة) کە ئایەتەکەش دەفەرموێ : ﴿ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴾ ، یەکسەر هەموویان هەڵسابوون چاوەڕێیان دەکرد ، کەواتە : ڕۆژی هەڵسانەوە جیایە ، لە ڕۆژی دنیا کۆتا هاتنو ، کۆتایی هاتنی ژیانی مرۆڤو جند لەسەر زەوی .

دیارە وشەی (ساعة) ئێستا وەك زاراوەیەکی باوی ئەم ڕۆژگارە ، بەشێکە لە بیستو چوار بەشی شەوو ڕۆژێك ، بەڵام ئەوە چەمکێکی باوی ئەم ڕۆژگارو سەردەمەی ئێمەیە ، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئانو لە زمانی عەرەبیدا ، (ساعة) یانی : (ساعة مِن الوقت) ، یانی : کاتێکی دیارییکراو ، لە کاتە فراوانەکە ، کە مەرج نیە بەشێك بێ لە بیستو چوار بەشی شەوو ڕۆژ ، هەروەك مەسەلەی (یوم)یش هەروەها ، وەك لە ڕابردوودا باسمان کرد .

(أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَا ؟) ، واتە : کەی دێ ، (أَيَّانَ ) بە مانای (متى) دێ ، واتە : (أيُّ آنٍ ، أي أوانٍ) دیارە پێشتر باسمان کرد ، کە لەم ئایەتە موبارەکەدا خوا ﷻ ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکاتو ، دەفەرموێ : پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (ساعة) واتە : کاتی کۆتایی هاتنی دنیا کەی دەچەسپێ ؟ یاخود کەنگێ لەنگەر دەگرێ ؟ لەنگەر گرتنەکەی کەنگێیە ؟ لێرەدا هاتنی ڕۆژی دوایی ، بە کەشتییەك چوێنراوە ، کە دوایی دەبێ لە شوێنێك لەنگەر بگرێ ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ﴿٣٨﴾ ﴾ ، واتە : خۆر دەڕوات تاکو کاتو شوێنێك کە تێیدا ڕادەوەستێو لەنگەر دەگرێ .

ئنجا خوای پەنهانزان لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا، کە هاوبەشدانەرەکان لە پێغەمبەری خاتەمیان ﷺ کردوە، دەفەرموێ: ﴿قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّيۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَ﴾، بڵێ: بێگومان زانیاریی هاتنی کاتی کۆتایی ژیانی دنیا، تەنیا لەلای پەروەردگارمە، وە بێجگە لەو هیچ کەس دەریناخات بۆ کاتی خۆی، واتە: هیچ کەس ناتوانێ کاتەکەی دەربخات، ﴿ثَقُلَتۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا بَغۡتَةٗ﴾، لە ئاسمانەکان و زەویدا قورسە، وە کتو پڕ نەبێ نایەت.

دیارە (مُرۡسَىٰهَا) پێشتریش گوتمان: واتە: شوێنی لەنگەر گرتنو چەسپاندنیەتی، یان کاتی لەنگەر گرتنو چەسپانیەتی، وە (مُرۡسَىٰهَا) بە مانای چاوگ (مصدر) دێ، وە بە مانای شوێنو کاتیش دێ، وە بە مانای بەرکاریش (مفعول)یش دێ.

دیارە کە ئەوانە ئەوە دەپرسن، خوای زاناو شارەزاش بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئاوا وەڵامیان بدەوە: ﴿قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّي﴾، (إِنَّمَا) ئامرازی چەسپاندنو کورتهەڵێنانە: (أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَات) واتە: بڵێ زانیارییەکەی تەنیا لەلای پەروەردگارمە، هیچ کەسی دیکە نایزانێ.

﴿لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَ﴾، (أَي فِي وَقْتِها) یان (عِنْدَ وَقْتِها)، لە کاتی خۆیدا دەریناخات جگە لەو، یاخود لەلای کاتەکەی دەریناخات، بێجگە لە خوا، هەر ئەو دەتوانێ دەریبخات، کە کاتەکەی کەنگێیە.

کە دەفەرموێ: ﴿ثَقُلَتۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، لە ئاسمانەکانو زەویدا، قورسو گرانە.

ئەم دوو واتای هەن:

١ / لە ڕووی پەی پێبردنییەوە ، قورسە ، وە دروستکراوەکان هیچ کامیان توانایان بەسەریدا نیە ، نە هیچ فریشتەیەکی پاكو بێگەرد ، نە هیچ پێغەمبەرێکی لە خوا نیزیك ، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە ، کە جبریل لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەپرسێ : ﴿مَتَى السَاعَةُ ، قَالَ : مَا المسْئُولُ عَنْها بأَعْلَم مِنَ السائِلِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٩٤٩٧) ، والبُخَارِيُّ برقم : (٥٠) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (١٠) ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (٤٠٤٤)}، واتە : هەواڵم پێبدە دەربارەی کاتی کۆتایی هاتنی بوونەوەر ؟ فەرمووی : پرسیارلێکراو لە پرسیارکەر پێی زاناتر نیە .

کەواتە : لە ڕووی پەی پێبردنو زانینی هاتنی کاتی دنیا تێکچوونەوە ، ئەوە پرسیارێکی زۆر قورسە ، وە هیچ کام لە دروستکراوەکان نایزانێ .

٢ / لە ڕووی مەزنییو سامو هەیبەتییەوە ، زۆر قورسە ، هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانەکانو زەویدا هەن ، ترسی ئەو ڕۆژەیان هەیە .

پاشان کە دەفەرموێ : ﴿لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً﴾، (بغتة) (أي فجأةً) واتە : کتوپڕ ، یانی : بە کتوپڕیی نەبێ ، نایەت ، کەواتە : با هیچ کەس بە تەما نەبێ ، بەهۆی زانینی هەندێ نیشانەوە ، پەی بەهاتنی کاتی ڕۆژی دوایی بەرێ ، بەداخەوە وەك هەندێ کەسی سادەو هەندێ مسوڵمانی سەرکێڵ ، کە هەندێ لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ دەزانن ، بەتایبەتی ئەو فەرمایشتانەی باسی نیشانە گەورەو بچووکەکان ، یاخود دوورو نیزیکەکانی قیامەت دەکەن ، هەر لەخۆوە پێشبینیی دەکەن ، ئەو شتە دەبێ ، فلان ساڵە وا دەبێو ئەوە دێتە دی ! کە لە ڕاستییدا ئەوە هەمووی تفەنگ بە تاریکییەوە نانە .

# سەرنجدانێکی چەند فەرموودەیەك لەبارەی کاتی کۆتایی هاتنی دنیاوە

با سەرەتا لەوبارەوە تەماشای ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەین، کە کۆمەڵێك لە نیشانە دوورو نیزیکەکانی، وە بچووك و گەورەکانی هاتنی کۆتایی هاتنی دنیاو ڕۆژی دوایی، تێدان، هەروەها باسی ئەوەشی تێدایە کە لە گەرمەی ژیان و گوزەرانی دنیادا، دنیا بەسەر خەڵکدا کاول دەبێ، واتە: بەبێ ئەوەی کە چاوەڕێی بکەن، وەك لە ئایەتەکەدا هاتوە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لا تَقُومُ السَاعَةُ حَتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ عَظِيمَتَانِ يَكُونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ دَعْوَتُهُمَا وَاحِدَةٌ، وَحَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ قَرِيبٌ مِنْ ثَلاثِينَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسولُ اللَّهِ، وَحَتَّى يُقْبَضَ الْعِلْمُ، وَتَكْثُرَ الزَّلازِلُ، وَيَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، وَتَظْهَرَ الْفِتَنُ، وَيَكْثُرَ الْهَرْجُ (وَهُوَ الْقَتْلُ)، وَحَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمْ المالُ فَيَفِيضَ حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ المالِ مَنْ يَقْبَلُ صَدَقَتَهُ، وَحَتَّى يَعْرِضَهُ عَلَيْهِ فَيَقُولَ الَّذِي يَعْرِضُهُ عَلَيْهِ لا أَرَبَ لِي بِهِ، وَحَتَّى يَتَطاوَلَ النَّاسُ فِي الْبُنْيَانِ، وَحَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ، لَيتَنِي كُنت مكانَهُ وَحَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِها، فَإِذَا طَلَعَتْ وَرَآها النَّاسُ آمَنُوا أَجْمَعُونَ، فَذَلِكَ حِينَ ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ﴿١٥٨﴾﴾ الأنعام، وَلَتَقُومَنَّ السَاعَةُ وَقَدْ نَشَرَ الرَّجُلانِ ثَوْبَهُمَا بَيْنَهُمَا فَلا يَتَبَايَعانِهِ وَلا يَطْوِيانِهِ، وَلَتَقُومَنَّ السَاعَةُ وَقَدْ انْصَرَفَ الرَّجُلُ بِلَبَنِ لِقْحَتِهِ، فَلا يَطْعَمُهُ، وَلَتَقُومَنَّ السَاعَةُ وَهُوَ يُلِيطُ حَوْضَهُ فَلا يَسْقِي فِيهِ، وَلَتَقُومَنَّ السَاعَةُ وَقَدْ رَفَعَ أُكْلَتَهُ إِلَى فِيهِ فَلا

يَطْعَمُهَا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٨١٢١) ، وَالبُخَارِيُّ برقم : (٦٧٠٤) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (١٥٧) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (٤٣٣٣) ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم : (٢٢١٨) وَقَالَ : حَسَنٌ صَحِيحٌ ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٦٧٣٤)} .

واتە : کاتی هاتنی کۆتایی دنیا نایەت ، تاکو دوو کۆمەڵی مەزن پێکەوە جەنگ نەکەن ، کوشتارێکی مەزنیان لە بەینـدا دەبێ ، وە یەك بانگەوازیشیان هەیە ، {واتە : لەسەر یەك بەرنامەن و ، هەڵگری یەك پەیامیشن} وە هەتا سی (٣٠) دەججالی درۆزن نەیەن {دەججال ، واتە : زۆر خەڵك هەڵخەڵەتێنەرو فریودەرو ، زۆر درۆزن} وە هەر کامێکیان پێی وایە کە پێغەمبەری خوایەو رەوانەکراوی خوایە ، وە هەتا زانیاریی هەڵنەگیرێتەوە (مەبەستی ئەوەیە زانیاریی شەرعیی کەم دەبێتەوە) وە بوومەلەرزە زۆر دەبن و ، کات چڕ دەبێتەوەو لەیەك نیزیك دەبێتەوە ، وە ئاژاوە زۆر ئاشکرا دەبن ، وە کوشتن زۆر دەبێ ، وە ماڵ و سامان زیاد دەبێ و بەسەرتاندا دەڕژێ ، هەتا خاوەن ماڵ خەفەت دەخوا لەوەی کێ زەکاتەکەی لێوەربگرێ ، وە تەنانەت بابای زەکاتدەر زەکاتەکەی بۆ بابایەك دەبات ، کە لێی وەربگرێ ، ئەویش پێی دەڵێ : پێویستیم پێی نیە ، وە هەتا خەڵك دەیکەنە پێشبڕکێ لە بەرزکردنەوەی خانووەکانیان دا ، (واتە : چەند قات) ، وە هەتا وای لێدێ پیاوێك بە لای گۆڕی پیاوێکدا دەڕوات و دەڵێ : خۆزگە من لە شوێنی ئەودا بووایەم ، وە (دنیا کۆتایی نایەت) هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیەت ، کە هەڵهات و خەڵك بینییان ، هەموویان تێکڕا بڕوا دێنن ، ئەوە ئەو کاتەیە کە (خوا ﷻ دەفەرموێ) : ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ﴿١٥٨﴾﴾ ، لەو کاتەدا هیچ نەفسێك ئیمانەکەی سوودی پێناگەیەنێ کە پێشتر ئیمانی نەهێناوە ، یاخود کردەوەی باشی بەهۆی ئیمانەکەیەوە ئەنجام نەداوە ، {واتە : با ئیمانیشی بووبێ ، مادام هیچ کردەوەیەکی باشی نەبووە ، ئەوەش ئەگەر ئیمان بێنێ لەو کاتەدا سوود ناگەیەنێ} ، وە دنیا کۆتایی دێ لە کاتێکدا کە دوو پیاو پۆشاکێکیان لە نێوان خۆیاندا بڵاوکردۆتەوە ، پێڕاناگەن لەیەکدی بکڕن و بفرۆشن کڕین و فرۆشتنی لەسەر بکەن ، وە پێشیان

ناپێچرێتەوە ، (یەکسەر دنیایان بەسەردا کاول دەبێ) ، وە دنیا کۆتایی دێت لە کاتێکدا کە پیاوێك شیری حوشترەکەی بردوە ، فریا ناکەوێ بیخواتەوە ، کە دنیای بەسەردا کاول دەبێ ، وە دنیا تێکدەچێ‌و ئاخیر زەمان دێ ، لە کاتێکدا پیاوێك حەوزەکەی خۆی سواغ کردوە ، فریا ناکەوێ ئاژەڵەکانی تێدا ئاو بدات ، وە لە کاتێکدا دنیا کۆتایی دێ کە یەکێك لە ئێوە پاروەکەی بۆ لای زاری بەرزکردۆتەوە ، فریا ناکەوێ بیخاتە نێو زاری .

کەواتە : ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتە موبارەکە ، یاخود ئەو وشە موبارەکە زۆر جوان ڕوون دەکاتەوە، کە دەفەرموێ : ﴿لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ﴾ کتوپڕ نەبێ ، بۆتان نایەت ، وە ئەو دیمەنانەی کە پێغەمبەر ﷺ خستنیە بەرچاو ، مانای هاتنی ئاخیر زەمان بە کتوپڕیی ، لەنەکاو ، بەبێ چاوەڕوانیی ، زۆر جوان بەرجەستە دەکات .

ئنجا لەوبارەوە کە لە دوای پێغەمبەر موحەممەد ﷺ ، هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نایەت ، وە (موحەممەد) ﷺ کۆتایی پێغەمبەرانە ، خوا دەفەرموێ : ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ...﴿٤٠﴾ ﴾ الأحـزاب واتە : موحەممەد بابی هیچ کام لە پیاوانتان نیە ، بەڵکو ڕەوانەکراوی خوایەو کۆتایی پێغەمبەرانە .

لەوبارەشەوە ئەو فەرموودەیە هەیە ، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ﴿أَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٢٢٤٤٨) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٢٨٨٩) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (٤٢٥٢) ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم : (٢١٧٦) وَقَالَ : حَسَنٌ صَحِيحٌ ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (٣٩٥٢) ، وَأَبُو عَوَانَة برقم : (٧٥٠٩) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٧٢٣٨)}، واتە : من کۆتایی پێغەمبەرانم‌و لە دوای من هیچ پێغەمبەر نین .

ئێستاش با چەند سەرنجێکی خێرا لەو فەرموودەیە بدەین :

١ / دیارە زۆر لە شارەزایانی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویانە : کە دەفەرموێ : ﴿لا تَقُومُ الساعَةُ حَتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ عَظِيمَتَانِ يَكونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ

عَظِيمَةٌ دَعْوَتُهُمَا وَاحِدَةٌ﴾ ، واتـە : دوو کۆمەڵـی مـەزن جـەنگ دەکـەن لەگـەڵ یەکدی ... ، مەبـەست پێـی جەنگـی (صفین)ە ، کـە لە نێوان عەلـی کـوڕی ئەبـو طاڵیب ، چـوارەم خەلیفـەی مسوڵمانـان خـوا لێـی ڕازی بـێو موعـاویەی کـوڕی ئـەبو سـوفیان دا ڕووی دا ، کـە لـێی یاخیـی بـوو ، کـە دیـارە هـەردوو کۆمەڵەکە مسوڵمان بـوون ، وە کـوشـتارێکی زۆر لـە نێوانیـاندا بـوو ، بـەڵام بێگومـان عەلـی لەسـەر هـەق بـووە ، وە موعاویـە لەسـەر ناهـەق بـوو ، وە بـە دەقـی فـەرموودەی پێغـەمبـەر ﷺ کۆمەڵـی موعـاویە ، بـە کۆمەڵـی یاخییـان ناسـراون ، وەك ڕۆژێ پێغـەمبـەر ﷺ بـە عەممـاری کـوڕی یاسـری فـەرموو : ﴿وَيْحَكَ ابْنَ سُمَيَّةَ ، تَقْتُلُكَ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم : (٢٢٦٦٣) واللَّفْظُ لَهُ ، وَمُسْلِمٌ بـرقم : (٢٩١٥) ، وَأَبُـو نُعَـيْم فـي (الحليـة) : ج ٧ ، ص ١٩٨ ، وَأَبُـو يَعْلَـى بـرقم : (١٦٤٥)} ، واتە : هاوار بۆ تۆ ئەی کوڕی سومییە ! کۆمەڵـی یاخییان دەتکوژن .

کـە دیـارە عەممـاری کـوڕی یاسـر ، دوایـی بـە دەسـتی سوپایەکـەی موعـاویە کوژرا ، لـە جەنگـی (صفین)دا !

٢ / وە کـە دەفـەرمـوێ : ﴿لا تَقُومُ السَاعَةُ حَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ قَرِيبٌ مِنْ ثَلاثِينَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ﴾ واتـە : دنیـا کۆتـایی نایـەت تاکـو نیزیکـەی سـی (٣٠) دەججاڵـی درۆزن دێـن ، هـەموویان گومـان دەبـەن کـە پێغـەمبـەری خـوا بـن .

دیـارە تـا ئێسـتا ژمارەیـەکـی زۆریـان هـاتوون ، یەکـێ لەوانـە (غـوڵام أحمـد قادیانیـی) ، وە زۆری دیکـە لـە سـەردەمی ئومەوییـەکـانو عەبباسییـەکـانو عوسـمانییـەکانو لـەم سـەردەمو ڕۆژگـارەی ئێمەشـدا ، جـارجـارە شـتێکی وا پەیدا دەبـێ ، چ لەنێو بازنـەی مسوڵمانـاندا ، چ لـە دەرەوەی بـازنـەی مسـوڵمانـاندا .

وە کـە فەرمووشـیـەتی : {نیزیـك بـە سـی (٣٠) کـەس} ، دەگونجـێ ئـەوە دیارییکـردنی ژمارەکـە بـێ ، دەشـگونجـێ مەبـەست پێـی خـودی ئەنـدازەکە نەبـێ ، وەك دەگوتـرێ : سـی کـەس ، یـان سـەد کـەس ، واتـە : ئەگـەر گـریمان لـە سـی کەسیش زیاتر بـوون ، لەگـەڵ فەرمایشـتەکە تێکناگیـرێ .

٣ / ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿يُقْبَضَ الْعِلْمُ ﴾ زانیاری هەڵدەگەڕێتەوە واتە : زانیاریی بە شەریعەت هەڵدەگیرێتەوە ، ئەمیش تا ڕاددەیەك لەم ڕۆژگارەدا دیارە، بە تایبەت زانیاریی قووڵو فراوان .

٤ / وە کە دەفەرموێ : ﴿وَتَكْثُرَ الزَّلاَزِلُ﴾ هەروەها زۆربوونی بومەلەرزە ، دیارە لە ئەنجامی ئەوەدا کە وردە وردە زەوی گەرمیی لە ڕۆژ وەردەگرێو ، هەناوی زەویش هەر گەرمە ، ئنجا لە ئەنجامی جموجۆڵیی نێو ناخی زەوییەوە ، هەتا پێیبچێ ، واپێدەچێ بوومەلەرزەکان زیاتربن .

٥ / وە کە دەفەرموێ : ﴿يَتَقَارَبَ الزَّمَانُ﴾ کات لە یەك نیزیك دەبێتەوە ، ئێستا بە ئاشکرا دیارە ، بەهۆی هۆیەکانی هاتووچۆوە ، وە بەهۆی تەکنۆلۆژیای مەعلوماتییو ئەنتەرنێتو کەناڵە ئاسمانییەکانو ...هتدەوە ، زەمان زۆر لە یەك نزیك کەوتۆتەوە .

٦ / هەروەها دەفەرموێ : ﴿وَتَظْهَرَ الْفِتَنُ ، وَيَكْثُرَ الْهَرْجُ﴾ ئاشووبو ئاژاوە زۆر دەبنو ، کوشتن زۆر دەبێ .

ئەوەش ئێستا شتێکی عەیانو بەرچاوە ، بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا جیهان زۆر شێواوە .

٧ / وە کە دەفەرموێ : ﴿وَحَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمْ المالُ فَيَفِيضَ حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ المالِ مَنْ يَقْبَلُ صَدَقَتَهُ ؟﴾ ماڵو سامان زۆر دەبێ ، هەتا جاری وایە کە خاوەن ماڵ خەمی دێتێ صەدەقەکەی بدا بە کێ ؟

٨ / وە کە دەفەرموێ : ﴿وَحَتَّى يَتَطاوَلَ النَّاسُ فِي الْبُنْيَانِ ﴾ خەڵك پێشبڕکێ دەکەن لە بەرزکردنەوەی خانووبەرەدا .

ئەم دووانەش هەردووکیان زۆر بە زەقی هاتوونە دی ، چەرچەندە دەگونجێ بەشێکیشیان مابێ ، چونکە مەرج نیە هەر کامێك لەوانە ، هەمووی بە یەکجار بێتەدی ، بەڵکو پلەپلە دێنەدی .

٩ / وە ئەوەش کە پیاو بە لای گۆڕێکدا بچێو بڵێ : خۆزگە من لە شوێنی ئەو بوومایە ، ﴿وَحَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ ، ليتني كُنتُ مَكانَهُ﴾

ئێستاش ئەوە هەیەو کاتی ناخۆشی وا بەسەر ئینسان دادێ، کە مەرگ بە ئاوات دەخوازێ، کە دەبینێ زوڵمێکی زۆر دەکرێ، یان دەبینێ مسوڵمانان بە ناهەق دەکوژرێن، یان بە ناوی ئیسلامەوە بە شێوەیەك ڕەفتار دەکرێ کە ئیسلامی پێ ناشیرین دەبێ، وە خەڵکێك بە نەزانیی قسە بە ئایینی پاكو بێگەردی خوای پەروەردگار دەڵێن.

بەڵام بە تەئکید ئەوەی کە نەهاتۆتە دی، ئەوەیە کە دەفەرموێ: وە هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێتەوە، کە دیارە ئەوە یەکێکە لە نیشانە دوورەکان، یان یەکێکە لە نیشانە گەورەکان کە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە کە دەفەرموێ: نیشانە گەورەکان کە دێن بە خێرایی بە دوای یەکدا دێن، وە کاتێك کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێتەوە، بە پێچەوانەی عادەتی خۆی، کە هەموو ڕۆژێ لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێ، ئەو کاتە دیارە تۆبە قبووڵ ناکرێ، وەك فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، وە ئایەتەکەی (الأنعام - ١٥٨)یش فەرموویەتی، کە پێشتر هێنامان.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا﴾، لێت دەپرسن، وەك تۆ زۆری پرسیار لە بارەوە بکەی، ئەمە واتایەکی، چونکە (حَفِيٌّ) یانی: (كثير السؤال) کەسێك کە زۆر بە دوای شتێکدا دەچێ، یاخود (حَفِي) بە کەسێك دەڵێن، کە لە شتێك دا زۆر شارەزا بێ، واتە: لێت دەپرسن، وەك تۆ زۆر شارەزای بیو، زانیارییت دەربارەی هەبێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾، بڵێ: زانیارییەکەی لەلای خوایە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، وەك لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، کە پێشتر هێنامان: ﴿مَتَى السَاعَةُ؟ قَالَ: مَا المسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَم مِنَ السائِلِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٤٩٧)، والبُخَارِيُّ برقم: (٥٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٠٤٤)}
واتە: هەواڵم پێبدە دەربارەی کاتی کۆتایی هاتنی بوونەوەر؟ فەرمووی: پرسیار لێکراو لە پرسیارکەر پێی زاناتر نیە.

**مەسەلەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ١٨٨ ﴾، لێرەدا کە دەفەرموێ: بڵێ: من بۆخۆم هیچ سوودو زیانێکم بەدەست نیە، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، وە ئەگەر پەنهانم زانیبایە، هەر لە چاکەم بۆخۆم زیاد دەکرد، وە هیچ خراپیەکم تووش نەدەبوو، من تەنیا وریاکەرەوەو دڵخۆشکەرم بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن.

## وەڵامدانەوەی پرسیارێك

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە: هەموو مرۆڤێك دەتوانێ سوود بە خۆی بگەیەنێ، وە سوود بە جگە لە خۆیشی بگەیەنێ، وە زەرەر بە خۆیشی بگەیەنێ، وە زەرەر بە جگە لە خۆیشی بگەیەنێ، لە هەندێ حاڵەتاندا، ئەدی چۆن پێغەمبەر ﷺ وا دەفەرموێ؟ زانایان دوو وەڵامیان داوەتەوە[1]:

١/ (لا يَمْلِكُ النَّفعَ والضَرَّ استقلالاً بقُدْرَتِهِ) واتە: من بە دەسەڵاتی سەربەخۆی خۆم، ناتوانم سوود بە خۆم بگەیەنم، یان زیان لە خۆم دوور بخەمەوە.

٢/ (لا يَمْلِكُ بمُقْتَضَى مَنْصب الرّسالَة نَفْعاً ولا ضَراًّ لِنَفْسِهِ بِمَنْطوقِ الجُمْلَة ولا لغيرِهِ بفهُومها الأَوْلَى، مِمَّا يعجز عنه غيره بمقتضَى بَشَريَّتهِ، كَمَا لا يَمْلِكُ عِلْمَ الغيْبِ الذي هو من شأْنِ الخَالِق) واتە: بەپێی پایەی پێغەمبەرایەتیی کە پێی دراوە، ئەو پایە پێغەمبەرایەتییە وای لێ ناکات، سوود بە خۆی بگەیەنێ، یاخود زیان لە خۆی دووربخاتەوە بۆ خۆی، هەروەها بۆ جگە لە خۆیشی، بە پێی چەمکی لە پێشتری ئایەتەکە، لەو شتانەی کە جگە لەو لە بەرانبەریاندا دەستەوسانن، واتە: هەر شتێك کە

[1] تفسير القرآن الحكيم ج ٩، ص ٤٣٤.

جگە لەو پێی ناکرێ ، وەك : سوود بە خۆ گەیاندنو ، زیان لە خۆ دوورخستنەوە ، ـ وەك بەشەر ـ ئەویش بە هەمان شێوە ئەو شتانەی بەدەست نین ، هەروەك چۆن ئەو زانیاریی بە پەنهانو بە نادیاری نیە ، کە تایبەتە بە خوای پەنهانزانەوە ، بە هەمان شێوەش وەك باقی خەڵکی دیکە : ئەو شتانەی کە بەشەر ناتوانێ وەك سوود بۆ خۆی پەیدا بکاتو ، وەك زیان لە خۆی دوور بخاتەوە ، ئەویش ناتوانێ .

واتە : لە ڕووی سوود بە خۆ گەیاندنو زیان لە خۆ دورخستنەوە ، وەك باقی مرۆڤەکان وایەو ، هیچی لەوان زیاتر نیە ، هەروەك چۆن وەك ئەوان پەنهان نازانێ ، مەگەر خوای زانا شتێکی پەنهانی پێ بڵێ ، هەروەها مەگەر خوای پەروەردگار بیەوێ سوودێکی پێ بگەیەنێ ، یاخود زیانێکی لێ دووربخاتەوە ، ئەگەرنا هیچ سوودو زیانێکی بەدەست نیە ، لەو سوودو زیانانەی بە سروشتو عادەت بەدەست بەشەر نین .

ئەوەی کە گرنگە لێرەدا ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت تێیان بگەیەنێ : کە من بەهۆی ئەوەوە کە پێغەمبەری خوام هیچ ئیمتیازێکم بەسەر ئێوەدا نیە ، کە سوود بەخۆم بگەیەنم ، سوودێك کە ئێوە ناتوانن بە خۆتانی بگەیەنن ، یاخود زیانێك لە خۆم دووربخەمەوە ، لەو جۆرەی کە ئێوە ناتوانن لە خۆتانی دووربخەنەوە وەك بەشەر ، یاخود شتێك بزانم کە پەنهانەو نادیارە ، مەگەر ئەوەی خوای بە بەزەیی بۆم بکات .

ئنجا لە سووڕەتی (یونس)یشدا هاتوە ، دەفەرموێ : ﴿ قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي ضَرّٗا وَلَا نَفۡعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە : بڵێ زیانو قازانجی خۆمم بەدەست نیە ، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ .

هەروەها لە سووڕەتی (جن)دا ، دەفەرموێ : ﴿ قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا ﴿٢١﴾ ﴾، واتە : بڵێ : من نە زیانی ئێوەو نە سەر ڕاستکردنی ئێوەو بە مراد گەیاندنی ئێوەم ، بەدەست نیە .

ئنجا فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺیش هەیە دەربارەی ئەوە کە ئەگەر خوا شتێکی پێ نەگوتبێ لە نادیارو پەنهان، نەیزانیوە، دەفەرموێ: ﴿لَو استقبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا استدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ، وَلَولاَ أَنَّ مَعِي الْهَدْيَ لأَحْلَلْتُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٩٨٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٥٦٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٢١٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٧٨٩)}، واتە: ئەو کاتەی کە ئێستا لێم تێدەپەڕێ، ئەگەر بەرەو ڕووم هاتبایە (واتە: ئەوەی ئێستا دەیزانم پێشتر زانیبام) هەدییم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، {دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ حەجەکەی بە (قران) یان (إفراد) کردوە، واتە: بە تەنیا ئیحرامی بە حەج بەستوە، چونکە حەج بە سێ جۆر دەکرێ: (إفراد) و (قران) و (تمتع)} وە ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کە قوربانیم پێیە، ئێستا ئیحرامم دەشکاند.

واتە: دەمکرد بە حەجی (تمتّع)، کە لەبەرئەوەشی بووە کە بۆ خەڵك ئاسانترە، یان ئەوەتە پێغەمبەر ﷺ نیەتی بە حەجی (قِران) هێناوە، واتە: ئیحرامی بە حەجو عومرە پێکەوە بەستوە[1].

پاشان خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کە بڵێ: ﴿إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٨﴾﴾، من تەنیا مژدەدەرو ترسێنەرم بۆ کۆمەڵێك کە بڕوابێنن.

ئەم حەقیقەتەش لە چەندان شوێن لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە، بۆ وێنە:

١) لە سوورەتی (سبأ) دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴿٢٨﴾﴾، واتە: تۆمان نەناردوە، مەگەر بۆ تێکڕای خەڵکی، مژدەدەرو ترسێنەر بی.

٢) هەروەها لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿١٠٥﴾﴾، واتە: تۆمان نەناردوە، مەگەر مژدەدەرو ورياکەرەوە بی.

---

[1] بۆ بەرچاو ڕوونبوونەوەی زیاتر دەربارەی جۆرەکانی حەج: (إِفراد، قِران، تمتّع) سەرنجی (خواپەرستیی ئیسلامیی) بەرگی چوارەم بدە.

٣) وە لە سوورەتی (الأنعام)دا ، دەفەرموێ : ﴿وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ...﴿٤٨﴾﴾ ، واتە : وە پێغەمبەرانمان نانێرین ، مەگەر دڵخۆشکەرو ترسێنەر بن .

واتە : منیش بەشەرێکم وەك ئێوە ، ئەوە نەبێ کە خوا منی کردوە بە ڕەوانەکراوی خۆی .

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَاۖ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتۡ حَمۡلًا خَفِيفٗا فَمَرَّتۡ بِهِۦۖ فَلَمَّآ أَثۡقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنۡ ءَاتَيۡتَنَا صَٰلِحٗا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحٗا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ أَيُشۡرِكُونَ مَا لَا يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴿١٩١﴾﴾ .

لەبەردەم ئەم سێ ئایەتەدا حەوت هەڵوەستە دەکەین :

هەڵوەستەی یەکەم : کە دەفەرموێ : ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ﴾ ، (أَي خَلَقَكُمْ مِنْ جِنْسٍ وَاحِدٍ ، أَو حَقِيقَةٍ وَاحِدَةٍ ، صَوَّرَهَا بَشَرًا سَوِيًّا) زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە ، واتە : لە یەك جنس ئێوەی دروستکردوە ، یاخود لە یەك حەقیقەت ئێوەی دروستکردووە ، کردوویەتی بە بەشەرێکی ڕێکوپێك .

هەڵوەستەی دووەم : کە دەفەرموێ : ﴿وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَا﴾ ، واتە : هەر لە خۆی ، هەر لەو نەفسە هاوسەرەکەیشی دروستکردوە ، تاکو بەهۆیەوە بسرەوێ‌و هۆگری بێ . کە دیارە هەندێ لە زانایان گوتوویانە : ئەوە مەبەست پێ ئادەمەو هاوسەرەکەیشی مەبەست پێی حەووایە ، بەڵام ئەگەر تەماشای سیاقی ئایەتەکە بکەین کە دەفەرموێ : دوایی ئەو دایك‌و بابە

تووشی شیرك بوون ، وە منداڵەکەیان پاڵ داوەتە لای جگە لە خوا ، بە تەئکید ئەوە لە ئادەمو حەووا ناوەشێتەوە ، هەرچەندە لەوبارەشەوە دەقێك دەگێڕنەوە کە پاڵی دەدەنە لای پێغەمبەر ﷺ ، بەڵام هەم مەتنەکەی لەگەڵ ئایەتەکان دا ناگونجێ و ، هەم سەنەدەکەیشی بێهێزە ، کەواتە : مانای ڕاستی ئایەتەکە ئەوەیە کە خوا دەیەوێ پێمان بفەرموێ : هەر کامێك لە ئێوە لە یەك نەفس دروستبوون ، وە هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بۆ دروستکردوە ، واتە : هەر کامێك لە ئێمە لە بابی خۆمان دروستبووین ، وە جۆری نەفسی دایکی هەر کامێکیشمان ، لە هەمان جۆری نەفسی بابمانە ، کە هەردووکیان نەفسی بەشەریین ، وەك لە سووڕەتی (الروم)دا خوا دەفەرموێ : ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا ...﴿٢١﴾ ﴾ ، واتە : لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە لە خۆتان هاوسەری بۆ دروستکردوون ، تاکو بەهۆیەوە ئارامییتان بۆ بێ ، کەواتە : هاوسەری هەموو پیاوێك لە نەفسی خۆیەتی ، واتە : لە جۆری خۆیەتی ، نەك لەو جیا بووبێتەوە .

دیارە ئێمە پێشتریش باسی ئەو مەسەلەیەمان کردوە ، ئێستاش فەرموودەیەك دێنینەوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا ، فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاهُ ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم : (٥١٨٥) ، وَمُسْلِمٌ بِرقم : (٣٦٣٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ} ، واتە : ئامۆژگارییتان دەکەم ، لەگەڵ ئافرەتان باش بن ، چونکە ئافرەت لە پەراسوو دروست بووە ، وە خوارترین بەشی پەراسووش بەشی سەرەوەیەتی ، ئنجا ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە ، دەیشکێنی (پەراسوو ئەگەر ئینسان بیەوێ ڕاستی بکاتەوە ، دەشکێ) ، وە ئەگەر وازی لێ بێنی ، هەر بە لاریی دەمێنێتەوە ، بۆیە لەگەڵیان باشبن ، (واتە : موداراییان لەگەڵدا بکەنو ، چاوپۆشیی لە کەموکورییان بکەن) .

ئنجا ئەگەر یەکێك بڵێ : ئەدی پێغەمبەر ﷺ نەیفەرمووە : ﴿إِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم : (١٤٦٨)} یانی : بێگومان ئافرەت لە

پەراسو دروست کراوە ، کەواتە : دیارە لە پەراسوو دروست بووە ! لە وەڵام دا دەڵێین : ئەگەر وابێ ، لە سوورەتی (الأنبیاء)شدا خوا دەفەرمویٚ : ﴿ خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٍ...﴿٣٧﴾ ﴾ ، واتە : ئینسان لە پەلە پەل دروست بووە ، دەجا کوا ئینسان لە پەلە پەل دروست بووە؟! لێرەدا یانی : ئینسان سیفەتی پەلەپەلی هەیە .

کەواتە : لەوێش کە دەفەرموێ : ﴿إِنَّ الْمرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم : (١٤٦٨)} ، واتە : لە شێوەی پەراسوودا دروستبووە ، چونکە سیاقی فەرموودەکەش دەلالەتی لەسەر دەکات ، کە دەفەرموێ : ﴿إِنَّ الْمرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ ، لَنْ تَسْتَقِيمَ لَكَ عَلَى طَرِيقَةٍ ، فَإِنِ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا اسْتَمْتَعْتَ وَبِهَا عِوَجٌ ، وَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهَا كَسَرْتَهَا ، وَكَسْرُهَا طَلاَقُهَا﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم : (١٤٦٨)} ، واتە : ئافرەت لە پەراسوو دروست بووە ، (واتە : لە شێوەی پەراسوودا دروست بووە ، نەك لە پەراسوو دروست بووبێ ، وەك پێشتر باسمان کرد) لەسەر ڕێیەکی ڕاست بۆت بەردەوام نابێ ، بۆیە ئەگەر لێی گەڕێی لەگەڵی دەگوزەرێنی لە حاڵێك دا کە لارییەکەی هەیە ، وە ئەگەر ویستیشت ڕاستی بکەیەوە ئەوە دەیشکێنی ، وە شکاندنیشی بریتیە لە تەڵاقدانی .

هەڵوەستەی سێیەم : کە خوا دەفەرموێ : ﴿ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا ﴾ ، واتە : کاتێك دایپۆشی ، کە مەبەست پێی چوونە لای و پێکەوە جووت بوونیانە .

﴿ حَمَلَتۡ حَمۡلًا خَفِيفًا ﴾ ، ئافرەتەکە بارێکی سووکی هەڵگرت ، یانی : سکپڕ (حامل) بوو .

﴿ فَمَرَّتۡ بِهِۦ ﴾ ، لەگەڵیدا ڕۆیشت ، واتە : ژنەکە ئیش و کارەکانی خۆی کردن ، بێئەوەی هەست بە بارقورسیی بکات .

﴿ فَلَمَّآ أَثۡقَلَت ﴾ ، دوای ئەوەی کە قورس بوو ، کە کۆرپەکە وردە وردە گەشە دەکات و گەورە دەبێ ، سکیشی قورس دەبێ .

﴿دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ ، لە پەروەردگاریان پاڕانەوە : ئەگەر منداڵێکی ساغو سەلیمو تەندروستمان پێ بدەی ، ئێمە سوپاسگوزار دەبین .

﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ...(١٩٠)﴾ ، کاتێك منداڵێکی ساغو سەلامەتو تەندروستی پێدان ، هاوبەشیان بۆ دانان ، لەوەدا کە پێی داون ، واتە : پەیدا بوونی ئەو منداڵەیان گێڕایەوە بۆ هەندێك هۆکاری دیکە ، جگە لە خوای پەروەردگار .

ئنجا دەگونجێ ئەوە بە شێوەیەکی پەنهانو شیرکی شێرراوە بووبێ ، وە دەگونجێ شیرکی ئاشکرا بووبێ ، ئەویش بەو مانایەی کە پەیدابوونی ئەو نیعمەتانە ، بگێڕنەوە بۆ ئەو بتو صەنەمو پەرستراوانە ، یاخود ئەو مەزارگەو پیرو چاکانە ، کە لێیان دەپاڕێنەوە ، کە هەندێ کەس دەچێت بۆ سەر پیرو چاك بۆ منداڵو پێی وایە ، ئەو پیاو چاکە منداڵی پێداوە ! کە بە تەئکید ئەوە شیرکە ، بۆیە خوا دەفەرموێ : ﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ ، بەرزیی بۆ خوا لەوەی کە دەیکەنە هاوبەش بۆی ، لە شتێکدا کە تەنیا بە خوا دەکرێ ، هێنانەدی منداڵێكو دروستکردنی هەر شتێك ، تەنیا کاری خوای بەدیهێنەرە ، کەواتە : ئەگەر جگە لە خوا ، لەو شتەدا بەشدار بکرێ ، ئەوە کراوە بە هاوبەش بۆ خوای بێهاوتاو تاكو پاك ! .

<u>هەڵوەستەی چوارەم</u> : خوا کە دەفەرموێ : ﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ ، بەرزیی بۆ خوا لەوەی کە دەیکەن بە هاوبەش ، (أي تَقَدَّسَ وَارْتَفَعَ مِنْ شِرْكِهِم أَو شُرَكَائِهِم) ، واتە : خوا پاکەو بەرزە لە هاوبەش بۆ خوادانانیان ، یاخود لە هاوبەشەکانیان ، هەردووکیان هەڵدەگرێ : لە هاوبەش بۆ خوا دانانیان ، یاخود لەو شتانەی کە دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوا .

ئێستاش پێش ئەوەی کە ئایەتەکانی دیکە سەرنج بدەین ، ئەو دەقە دێنینەوە ، کە وەك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ باسکراوە ، بەلام هەم

مەتنەکەی لەگەڵ ئایەتەکاندا ناگونجێ ، وە هەم سەنەدەکەشی بێهێزە :
﴿عَنْ سَمُرَةَ بن جُندب عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ : لَمَّا وَلَدتْ حَوَّاءُ طافَ بِها إبْلِيسُ ، وَكانَ لا يَعِيشُ لَها وَلَدٌ ، فَقَالَ : سَمِّيهِ عَبْدَ الْحَارِثِ فَإِنَّهُ يَعِيشُ ، وَكَانَ ذَلِكَ مِنْ وَحْيِ الشَّيْطانِ وَأَمْرِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم : (٢٠١٢٩) ، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم : (٣٠٧٧) ، وَالطَّبَرَانِي في (الكبير) برقم : (٦٨٩٥) ، وَالحَاكِمُ برقم : (٤٠٠٣) ، وَالبَزَّار برقم : (٤٥٨٠) ، وَضَعَّفَهُ كُلٌّ مِنَ الأَلْبَانِي وَشُعَيْب الأَرنَؤوط} ، واتە : سەمورەی کوڕی جوندب (وا پاڵدراوەتە لای گوایە) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : کاتێك حەووا منداڵی بوو ، ئیبلیس چووە لایو بە دەوریدا هاتوو چوو ، وە حەووا منداڵەکانی بۆ نەدەژیان (چۆنو لە کوێ زانرا ... ؟) ، ئیبلیس پێی گوت : ناوی لێبنێ بەندەی حارث ، {دەڵێن : (حارث) یەکێکە لە ناوەکانی شەیتان ، یان یەکێکە لە نازناوەکانی ، ئایا ئەوە چۆن زانرا ؟! ئیدی ئەو ناوەی لێناوەو منداڵەکەی بۆ ژیاوە} ، ئەوەش لە خوتخوتەو فەرمانی شەیتان بوو .

بۆیەش خوا دەفەرموێ : ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ...(١٩٠)﴾ !! بەڵام ئەوە لەڕووی سەنەدەوە هەرکام لە : ئەلبانییو شوعەیب ئەرنەئوت ، وە زۆر لە زانایانی دیکەش قسەیان لێکردووەو بە بێهێزیان داناوە ، وە ناشگونجێ لە ڕووی مەتنەوە ، ئەوە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بێ ، چونکە :

١/ جارێ ئادەمو حەووا یەکەمین مرۆڤنو خوای بەخشەر ئادەمی هەر بەدەستی خۆی دروستکردوە[١] ، وە ئادامو حەووا یەکەمین مرۆڤ بوون لە بەهەشتی خوادا بوون ، پاشان سزای داونو دواتر هاتوونە سەر زەوی ، یانی : ئەوەی کە ئێستا بۆ ئێمە نادیار (غیب)ەو دەڵێین : ئیمانی پێ دێنین :

---

١) کە دیارە ئەمە ماناو چەمکێکی هەیە، شایستەی بێ وێنەیی خوا بێ ، وە لە بەرگی سێیەمی : (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)داو ، بەرگی دووەمی : (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا باسمان کردوە .

ئەو بەهەشتەو دۆزەخو ئەو ڕووداوەی لە نێوان ئادەمو حەوواو ئیبلیسدا ڕوویداوە ، بۆ ئەوان هەمووی شتێکی بینراوو بەرهەست بووە .

٢/ ئنجا یانی چی ، لەبەر ئەوەی کە حەووا ناوی لە منداڵەکەی ناوە : (عبد الحارث) منداڵەکە ژیاوە ، ئەدی بۆچی ئەگەر ناوی دیکەی لێبنێ ناژی ، خۆ ژیانو مردنی ئینسان بە دەست خوایەو ، بە دەست شەیتان نیە ؟

٣/ ئنجا چۆن حەووا بەبێ ئاگارداری ئادەم ، ناو لە منداڵەکەی دەنێ ؟

٤/ ئنجا ئەوە حەووا ناوی لە منداڵەکەی نا : (عبدالحارث) ، ئەدی بۆچی خوای کارزان شیرکەکە پاڵ دەداتە لای هەردووکیان : ﴿ جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ﴾ ؟!

بۆیە دەڵێین : ئەو دەقە لە ڕاستییدا هەم مەتنەکەیو هەم سەنەدەکەشی ، لەوە ناوەشێتەوە پێی بگوترێ ، فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ، ڕاستییەکەشی ئەوەیە کە خوای پەروەردگار بەگشتی باسی بەشەر دەکات ، کە ئاوا لە دایك دەبن ، بەلاّم دوایی باسی ئەو کەسانە دەکات ، کە بەرەو شیركو بتپەرستیی دەچن : پێش ئەوەی منداڵیان ببێ ، لە خوا دەپاڕێنەوە کە منداڵی ساغو چاکیان پێ ببەخشێ ، دوایی کە منداڵەکەیان دەبێ ، هاوبەش بۆ خوا دادەنێنو ، هەندێ شتی دیکە دەکەنە هۆکاری پەیدا بوونی منداڵەکە ، کە دیارە ئەوە عادەتی موشریکەکان بووەو ، عادەتی هەموو مرۆڤەکان نیەو ، ئینسانی ئیماندار لە سەرەتاوە منداڵ لە خوا دەزانێ ، وە لە کۆتاییش دا هەر لە خوای دەزانێو ، شوکرانە بژێریشەو سوپاسگوزاریشە ، چونکە ئایەتەکان هەموویان قسە لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان دەکەن ، کەواتە : سیاقەکە هیچ پەیوەندیی بە ئادەمو حەوواوە ، نیە ، وە زۆر دوورە کە خوای میهرەبان ئاوا باسی ئادەمو حەووا بکاتو بفەرموێ : ﴿ فَتَعَـٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ ﴾ .

وە پاشان خوای بەرزو مەزن بە ڕاناوی کۆ باسیان دەکاتو ، دەفەرموێ :
﴿ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾ ، نافەرموێ : (فتعالى الله عما يُشْرِكان) ، بەڵکو فەرموویەتی : ﴿ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾ ، بە کۆ هێناویەتی ، کەواتە : مەبەست پێی : کۆی هاوبەش بۆ خوادانەرەکانە ، ئنجا ئەگەر بشگوترێ : بۆچی پێشێ ڕاناوی دووان بەکاردێنێ ؟ دەڵێین : لەبەرئەوەی ڕاناوەکە بۆ ژنو مێرد ، بۆ دایكو باب ، دەچێتەوە کاتێ کە کۆرپەیەکیان دەبێت ، بەڵام دوایی بە کۆ ڕوو لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان دەکاتو ، هەموو دایكو بابەکانو ، هەموو ژنو مێردە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان ، پێکەوە کۆدەکاتەوەو ، پێناسەیان دەکاتو ڕەخنەیان لێ دەگرێ .

<u>هەڵوەستەی پێنجەم</u> : ئنجا کە خوا دەفەرموێ : ﴿ أَيُشۡرِكُونَ مَا لَا يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ١٩١ ﴾ ، ئایا شتانێك دەکەنە هاوبەش بۆ خوا ، کە هیچ دروست ناکەنو خۆشیان دروست دەکرێن ؟ واتە : تەنیا بەدیهێنەر شایستەی بەندایەتیی بۆ کرانو پەرسترانە ، لە ڕاستییدا تایبەتمەندترین سیفەتی خوا ئەوەیە کە بەدیهێنەرە ، پەروەردگارە ، خاوەنە ، وە ئەوانی دیکە هەموویان : بەدیهێنراون ، وە مولکن ، وە لەبەردەستی خوای پەروەردگار دان .

<u>هەڵوەستەی شەشەم</u> : ئنجا کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ لَهُمۡ نَصۡرٗا وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ١٩٢ ﴾ ، وە (ئەو شتانەی کە دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوا) ، نە دەتوانن ئەوان سەربخەنو ، نە خۆیشیان بۆ سەردەخرێ .

مەبەست : بتو صەنەمە ، یان مەزارگەو پیاوچاکە ، یاخود هۆکارەکانی دیکەن ، هەیە دەچێ بۆ لای دکتۆرو دوای چارەسەر وەرگرتن ، چاکبوونی منداڵەکەی لە دکتۆرەکە دەزانێ ! یاخود لە دەرمانەکەی دەزانێ ، یان هەیە دەچێتە سەر مەزارگەیەكو ، منداڵی پەیدا دەبێو دوایی منداڵەکەی لە مەزارگەو پیاوچاکەکە دەزانێ ! ئەوەش هەمووی شیرکە ، تۆ دەبێ بیگێڕیەوە بۆ خاوەنە ئەسڵییەکەی ، کە هەر ئەویش ئەو هۆکارانەی وا لێکردوون ، ئەو ئەنجامەیان

لێ بێتەدی ، بۆ وێنە : ئەوەی کە ئێستا پێی دەگوترێ : منداڵی بۆڕیی ، یان بلووریی ، (طفل الأنبوب) یان ئەگەر بە فلانە شێوازە ، ژنو مێرد بەیەکەوە مامەڵە بکەن ، منداڵیان دەبێ ، هەموو ئەو هۆکارانە ، خوای بالادەست وایلێکردوونو ئەو هێزەی تێدا داناون ، کە ئەو ئەنجامەیان لێوە بەدی بێ .

کەواتە : تۆ دەبێ هۆکاری هۆیەکان (مُسَبِّب الأسباب) بناسی ، وە دەبێ دەستی خوا لە پشت هۆکارەکانەوە ببینی ، چونکە خوا وایکردوە ، کە ئەو هۆکارانە ئەو دەرەنجامانەیان لێ بکەوێتەوە ، هەر کاتێ کەسێك ئەوەی لە پشت هۆکارەکانەوەیە ، ئەوەی هێزی خستۆتە نێو هۆکارەکانەوە ، نەیبینێ کە خوایە ، ئەوە شیرکە ، ئنجا مسوڵمان وا بکات ، یان ناموسڵمان ، بۆیە با پێمان وا نەبێ کە خەڵکی موشریك کەسێکە نیشانەیەکی جیاکەرەوەی هەبێ ، وەك قۆچ ! هاوبەشدانەر (مشرك) هەر کەسێکە ئەوەی تەنیا بە خوا دەکرێ ، پاڵی بداتە لای جگە لە خوا ، وە هۆکارەکان کە خوای پەروەردگار کاریگەریی تێدا داناون ، ئەو وابزانێ کاریگەرییەکەیان سەربەخۆیەو پەیوەندیی بە خواوە نیە .

کەواتە : ﴿ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ١٩٢ ﴾، واتە : وە نە دەتوانن ئەوان سەربخەن ، نە خۆشیان بۆ سەردەخرێ ، یان نە دەتوانن پشتیوانیی لەوان بکەن ، نە پشتیوانیی خۆشیانیان بۆ دەکرێ ، یانی : پەرستراو دەبێ ئەوانەی کە دەیپەرستن ، بتوانێ سەریان بخات ، وە بتوانێ سوودیان پێ بگەیەنێ ، وە بتوانێ پشتیان بگرێو مشووریان لێ بخوات .

هەڵوەستەی حەوتەم : ئنجا کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَٰمِتُونَ ١٩٣ ﴾ ، واتە : نەك هەر بەدیهێنەر نین ، وە نەك هەر ناتوانن ئەو کەسانە سەربخەن ، کە دەیانپەرستن ، وە نەك هەر خۆشیانیان بۆ سەرناخرێ ، بەڵکو تەنانەت ئەگەر بانگیان بکەی بۆ ڕێی ڕاستیش هەر ناتوانن شوێنت بکەون ، یەکسانە بانگیان بکەی ، یان بانگیان نەکەی ، چونکە کەرو لاڵو بێ چاوو بێ هەستو بێ ژیانن ، وە هیچیان لە باراندا نیە .

کەواتە : ئەوانە هیچ شتێکیان لێ نایەت ، نە سوود بە خۆیان دەگەیەنن ، نە سوود بە جگە لە خۆیان دەگەیەنن ، نە زیان لە خۆیان دوور دەخەنەوە ، نە زیان لە جگە لە خۆیان دوور دەخەنەوە ، کەواتە : ئەوانە هیچ پاساوو بیانوویەك نیە بۆ بەندایەتیی کردنیان‌و پەرستنیان .

**مەسەلەی چوارەم** : کە دەفەرمویٚ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ ﴾ ، ئەوانەی کە لێیان دەپاڕێنەوە لە جیاتی خواو داوایان لێدەکەن ، وەك ئێوە بەندەن ، دە لێیان بپاڕێنەوەو بانگیان بکەن ، با وەڵامتان بدەنەوە ، ئەگەر ڕاست دەکەن .

کە دەفەرمویٚ : ﴿ عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡ ﴾ بە دوو واتایان مانایان کردوە :

١ - دەڵێن : (عباد) کۆی (عبد)ە ، (عبد)یش واتە : ملکەچ ، واتە : ئەوانە بەردەست‌و دروستکراوی خوان‌و ملکەچن بۆ خوا ، لەو ڕووەوە ناویان لێنراوە ﴿ عِبَادٌ ﴾ ، نەك لەو ڕووەوە کە ژیاندارو خاوەن ئیرادە بن .

٢ - دەڵێن : (عَلَى ظَنِّهِم بِها أَنَّها ذَوَاتُ شُعُورٍ) چونکە ئەوان گومانیان وابووە کە ئەوانە هەستیان هەیەو ژیانیان هەیەو ویستیان هەیە ، کەواتە بەپێی گومانی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان ، خوای زانا بە (عِبَادٌ ) ناوی هێناون : ﴿ عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡ ﴾ ، بەندەی وەك خۆتان .

هەردوو واتاکەش ڕاست‌و بێ گرێ‌و گۆڵن .

**مەسەلەی پێنجەم** : خوای کاربەجێ پرسیار دەکات‌و دەفەرمویٚ : ﴿ أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۗ قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾ ﴾ ، ئایا لاقیان هەن ، پێیان بڕۆن ؟ یان دەستیان هەن ، شتیان پێ بگرن ؟ یان دەستیان پێ بوەشێنن ؟

یان چاویان هەن ، پێیان ببینن ؟ یان گوێیان هەن ، پێیان ببیستن ؟

ئەمە یانی چی ؟ یانی ئەندامە سەرەکییەکانی جموجوڵو چالاکی مرۆڤان ، ئەو چوارەن ، دەست ، لاق ، چاو ، گوێ ، بە لاق دەڕۆن ، بە دەست شت دەگرن ، بە چاو دەبینن ، بە گوێ دەبیستن ، بەلاّم ئەو بتو صەنەمانەو ئەو پەیکەرانەی کە ئێوە دەیانپەرستن ، هیچ کام لەوانەیان نین ، کەواتە : شایستەی پەرستران نین .

ئنجا جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە لێرەدا (مُجَسِّمَة) جەستێنەرانی خوا ، ئەوانەی کە گومانیان وابووە ، خوای بێ وێنە جەستەیە : وە خوایان بە دروستکراوەکانی چواندووەو گوتوویانە : کە خوا دەفەرموێ : ئەو بتو صەنەمو پەیکەرانە ، نە لاقیان هەیە ، نە دەستیان هەیە ، نە چاوو ، نە گوێ ، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە خوا ئەو ئەندامانەی هەن ، چونکە خوا دەفەرموێ : ئەوانە ئەو ئەندامانەیان نین ، بۆیە بەکەڵکی پەرستران نایەن ، دەڵێن : چەمکی پێچەوانەکەی ئەوەیە ، کە خوا ئەو ئەندامانەی هەن ، بۆیە بەکەڵکی پەرستن دێ !!

بەلاّم لە ڕاستییدا ئەوە بۆچوونێکی زۆر پووچەڵە ، چونکە خوا دەیەوێ پێیان بفەرموێ : کە ئەو بتانە وەك خۆشتان نابن ، ئێوە خۆتان لاقتان هەیە ، پێی دەڕۆن ، دەستتان هەیە ، شتی پێ دەگرن ، چاوتان هەیە ، شتی پێ دەبینن ، گوێتان هەیە ، پێی دەبیستن ، بەلاّم ئەوانەی دەیانپەرستن ، وەك خۆشتان نابن ، چ جای ئەوەی کە بێنە ڕیزی خوای پەروەردگارەوە ، واتە : خوا نایەوێ بفەرموێ : لەبەرئەوەی ئەوانەیان نین مەیانپەرستن ، بەڵکو دەفەرموێ : ئەوانە تەنانەت لە خوار خۆشتانەوەنو ، تەنانەت وەك مرۆڤێکی ئاساییش بە توانا نین ، کە پەرستراو دەبێ لە سەرووی مرۆڤەوە بێ ، بەلاّم ئەوانە لە خوارەوەی مرۆڤیشەوەن ، کەواتە : لە ڕاستییدا ئەو قسەیەی جەستێنەرەکان (مجسِّمة) قسەیەکی پووچە .

پاشان خوا کە زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی دەفەرموێ : ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾الشورى ، واتە : هیچ شتێك وەك وێنەی وی نیە ، وە خوا بیسەری بینەرە ، یانی : هەرچی هەیە دیارە شێوەیەکی هەیە ، بەلاّم خوای تاكو پاك ، وەك شێوەی هیچ کام لەوانە نیە ، وە وەك زانایان گوتوویانە : (وَكُلُّ مَا جَرَى بِبَالِكَ ، فَاللهُ بِخِلاَفِ ذَلِكَ) واتە : هەرچی بە زەینی تۆ دا دێ ، هەرچی

بە خەیاڵی تۆ دا دێ، خوا لەوە جیایە، بۆچی؟ چونکە: بەشەر لە ڕێگای پێنج هەستەکانەوەو، بە تۆڕو شەداوی پێنج هەستەکانی، زانیاریی کۆدەکاتەوەو دەیخاتە مێشکیەوەو خەزنی دەکات: لە ڕێی چاوییەوە، دیمەنەکان دەگوازێتەوە، لە ڕێی گوێیەوە، بیستراوەکان دەگوازێتەوە، لەڕێی لوتییەوە، بۆنکراوەکان دەگوازێتەوە، لە ڕێی زارییەوە، تامکراوەکان دەگوازێتەوە، وە لە ڕێی دەستەکانیو پێستییەوە، هەست پێکراوەکانو دەست لێدراوەکان دەگوازێتەوە.

ئنجا مێشك بەو کەرستەی ئەو زانیاریانە کە بەهۆی پێنج هەستەکانەوە کۆکراونەتەوە، مامەڵە دەکات لەگەڵ واقیعی دەرەوەی خۆیدا، کەواتە: هەرچی لە مێشك دایە، هەمووی وێنەی ئەو شتانەیە، کە لە ڕێی پێنج هەستەوەرەکانەوە، کۆکراونەوە لە زەینی ئینساندا، ئەویش هەمووی سیفەتی دروستکراوەکانو شتە مادديیەکانن، بەڵام خوا ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾، کەواتە: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾، لە ڕاستییدا ڕێگا دەگرێ لەوە کە بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان، ئێمە بمانەوێ خوای پەروەردگار وێنا بکەین، یان سیفەتێکی خوای بێ وێنە وەك سیفەتی دروستکراوەکانی، یان سیفەتی یەکێك لە دروستکراوەکانی، وەك سیفەتی خوا تەماشا بکەین، بۆیە زانایان گوتوویانە: ڕێی ڕاست بریتییە لە (الإِثْبَات وَالتنْزِيه) چەسپاندنی سیفەتەکان بۆ خوا، وە بە پاکگرتنی خوا، لەوە کە وەك دروستکراوەکان بێ، بەڵام ڕێی چەوت بریتییە لە: بە لایەك دا: (التشبيه والتجسيم) وێچواندنو جەستاندن، وە بە لایەك دا: (التأويل والتعطيل) تەئویلو پەکخستن، واتە: تەئویلێك کە زمانی عەرەبی هەڵینەگرێ، تەئویلێك کە پەکمان لەسەری نەکەوتبێ، واتە: گۆڕینی مانای وشەکانو لادانیان (تغيير معاني الألفاظ وتحريفها)، وە سەرەنجام پەکخستنی سیفەتەکانی خوای پەروەردگار، ئەو دووە بەمەلاولادا، هەڵەنو، نێوەڕاستەکەیان بریتییە لە (چەسپاندنو بەپاکگرتن)، (الإِثْبَات وَالتنزيه) یانی: سیفەتەکان بۆ خوا بچەسپێنی، وەك خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵیان پێداوەو، وەسفی خوای تاكو پاکیان کردوە، بەڵام خواش بە پاك بگری، لەوەی کە هیچ کام لە سیفەتەکانی خوا بە شێوەیەك تەصەوور بکەین، کە وەك سیفەتی دروستکراوەکانی بێ.

کەواتە : مەبەست لەو ئایەتە ، پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی بتپەرستییە ، کە تەنانەت پەرستراوەکانیان ، هێندەی خۆشیان کارا نین‌و ، هێندەی خۆشیان بەهرەمەند نین ، لەو تواناو وزانەی کە بتوانن کاروباریان پێ ئەنجام بدەن .

بۆیە لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴾ ، بڵێ : هاوبەشەکانتان بانگ بکەن ، دوایی پیلانم لە دژ بگێڕن‌و ، چیتان لە دەست دێ دژایەتییم بکەن ، چاوەڕێشم مەکەن ، واتە : ئەوانە هیچ نین‌و من لێیان بێ باکم .

**مەسەلەی شەشەم** : خوا لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ١٩٦﴾ ، وە بێگومان پشتیوانی من ، خۆشەویستی من ، سەرپەرشتیاریی من ، نیزیکی من ، سەرخەری من ، سەرورەری من ، {چونکە وشەی (ولي) هەموو ئەو مانایانە دەگرێتەوە} ئەو کەسەیە کە کتێب‌و بەرنامەی دابەزاندوە (بۆ ڕێنمایی بەندەکانی)و ، هەر ئەویش سەرپەرشتیی چاکان دەکات ، هەڵبەتە ناردنەخواری کتێبیش هەر لە زیمنی سەرپەرشتیی خوای پەروەردگار دایە بۆ بەندەکانی ، کە بۆیان ببێ بە بەرنامەو ڕێباز ، وە پێی پەروەردەیان بکات‌و ژیانی تاکیی‌و خێزانیی‌و سیاسییان ، ڕێکخات ، کەواتە : کێ دەیەوێ زیاتر خوا سەرپەرشتیی بکات ، با خۆی صاڵحترو چاکتر بکات !.

**مەسەلەی حەوتەم** : خوا دەفەرموێ : ﴿وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَكُمۡ وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ١٩٧ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَسۡمَعُواْۖ وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴾، وە ئەوانەی لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە (کە بت‌و صەنەمەکانن ، یاخود پەرستراوەکانن بەگشتی ، هەرچی بن ، چ بەشەری مردوو بن ، چ بەشەری زیندوو ، چ دارو بەردو پەیکەر بن ، چ مانگ‌و خۆرو ئەستێرە ، چ هەواو ئارەزوو بێ ، چ ڕژێمێك بێ ، چ حیزبێك ، چ پارەو سامانێك ،

هەر چی بێ ، جگە لە خوا ، ئەوانەی کە لێیان دەپاڕێنەوە چاوەڕوانییتان لێیان هەیە) ، ناتوانن سەرتان بخەنو پشتتان بگرن ﴿ وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴾، وە خۆشیانیان بۆ سەرناخرێ ، لە بەرانبەر خوادا ، یانی : مەداری خۆشیانیان بۆ ساز ناکرێ ، چ جای مەداری ئێوە ساز بکەن ، واتە : هیچیان لە تواناادا نیە ، ﴿ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَسۡمَعُواْ ﴾ ، وە ئەگەر بانگیشیان بکەی بۆ ڕێنمایی بۆ ڕێگای ڕاست ، نابیستن ، ﴿ وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴾ ، ئەم ڕستەیە دوو مانای هەن :

**یەک** : وە دەشیانبینی تەماشات دەکەن ، بەڵام نابینن ، (دیارە بتپەرستەکان چاویان بۆ بتەکان دروستکردوونو ، گوێو لووتو زاریان بۆ دروست کردوون، وە بەرگو پۆشاكو زێڕو خشڵیان بە بەردار کردوونو ، نەخشو نیگاریان لەسەر کێشاونو ، جوانیان کردوونو ڕازاندوویاننەوە ، وەك پێشتر باسم کرد ، کە ئێستا هەندێ پەیکەر دادەنرێن لە پێشانگای بەرگو پۆشاك فرۆشتن دا ، وادەزانی ئەوانە بەشەرن ، تەماشات دەکەن ، بەڵام ناتبینن).

**دوو** : واتایەکی دیکەشی ئەوەیە : ئەو هاوبەش بۆ خوادانەرانە تۆ قسەیان لەگەڵدا دەکەیو ، ئەو وتووێژەیان لەگەڵدا دەکەی ، تەماشا دەکەی سەرنجت دەدەن ، بەڵام نابینن ، واتە : سەرنجت دەدەن بە چاوی سەر ، بەڵام بە چاوی عەقڵو دڵ نیشانەکانی پێغەمبەرایەتییو نوێنەرایەتیی خوای پەروەردگار لە تۆدا نابینن ، ئەگەرنا ئیمانیان پێ دەهێنای ، بەڵام بەداخەوە چاوی دڵو عەقڵیان کوێرە ، هەرچەندە چاوی سەریان دەبینێ !.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ .

# دەرسی بیست و چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەمان دا ئایەتەکانی : (١٩٩ ــ ٢٠٦) ، واتە : هەشت ئایەتی کۆتایی سوورەتی (الأعراف) دەتوێژینەوە ، دیارە لەو هەشت ئایەتەدا ، خوا کۆمەڵێك ئامۆژگاریی‌و ئاراستەکردنی گەورەو گرنگی خۆی بۆ پێغەمبەری خۆی ﷺ ، وە بۆ هەر کەسێك کە بەرێی ئەودا دەڕوات ، وە ئەرکی ئەو ئەنجام دەدا ، خستوونە ڕوو .

دیارە سەرجەم ئامۆژگارییەکان نۆ (٩) دانەن ، بە پێی سەرژمێریی‌و تێوەڕامانی من ، کە دەگونجێ کەمیش بکرێن‌و زیادیش بکرێن ، هەروەها خوای زاناو شارەزا سێ (٣) ڕاستیی گەورەش دەخاتە ڕوو ، واتە : لە دوو توێی ئەو هەشت ئایەتەدا ، خوا نۆ ئامۆژگاریی‌و ئاراستەکردنی زۆر گەورەو گرنگ بۆ پێغەمبەر ﷺ ، وە بۆ پەیڕەوانی پێغەمبەری خوا ﷺ و ، ئەنجامدەرانی ئەرکی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زانایان‌و لە پێشەوایان ، دەخاتە ڕوو ، وە پاشان سێ (٣) ڕاستیی گەورەو گرنگیش دەخاتە ڕوو .

ئنجا ئێمە هەر لە سەرەتاوە سەرژمێری ئامۆژگارییەکان‌و ڕاستییەکان دەکەین ، بۆ ئەوەی خوێنەری بەرێز بەرچاوی ڕۆشن بێ ، کە ئەم هەشت ئایەتەی کۆتایی (الأعراف) چی دەگرنە نێو خۆیان ؟ ئامۆژگارییەکان بریتین لە :

<u>ئامۆژگاریی یەکەم</u> : دەفەرموێ : ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ ﴾ ، واتە : ئەوەی ئاسانە وەریبگرە ، کە دوایی زیاتر چەمك‌و واتایەکەی ڕوون دەکەینەوە .

<u>ئامۆژگاریی دووەم</u> : ﴿ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ ﴾، وە فەرمان بە هەرچی شتی پەسندە بکە .

<u>ئامۆژگاریی سێیەم</u> : ﴿ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾، وە ڕوو لە نەفامان وەرگێڕە .

ئامۆژگـــاریی چـــوارەم : ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، هەر کاتێك کە لە شەیتانەوە خوتخوتەو دەنەدانێکت بۆ هات ، پەنا بە خوا بگرە ، بێگومان خوا بیسەری زانایە.

ئەوجار خوا دوو ڕاستی دەخاتە ڕوو :

ڕاستیی یەکەم : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُوا۟ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ ﴾، واتە : بێگومان ئەوانەی کە پارێز لە خوا دەکەن ، هەر کات لە شەیتانەوە خەیاڵێك ، وەسوەسەیەکیان تووش بوو ، خوایان دەکەوێتەوە بیر ، (یان سزاو پاداشتی خوایان دەکەوێتەوە بیر) ، یەکسەر بەرچاویان ڕۆشن دەبێتەوە ، (وە بەرپێی خۆیان دەبینن ، وە دەوروبەری خۆیان دەبینن) ، وە لە پیلانی شەیتان دەربازیان دەبێ .

ڕاستیی دووەم : ﴿ وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ ﴾ ، بەڵام برایەکانیان (واتە : برای کافرەکان کە شەیتانەکانن) ، لە گومڕاییو بێ مرادییو سەرگەردانییدا ڕستیان بۆ درێژ دەکەن ، وە کەمتەرخەمییش ناکەن ، (چییان لەدەست بێ دەیکەنو زیاتر سەریان لێ دەشێوێنن) .

ئامۆژگاریی پێنجەم : ﴿ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ۚ قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى ﴾ ، وە ئەگەر ئەوەی کە داوای دەکەن (واتە : موعجیزەیەك کە ئەوان داوای دەکەن ، یان ئایەتێکی خوێنراوە ، کە ئەوان داوای دەکەن) بۆیان نەهێنی ، {یان ئایەتێك بێنی بە دڵی ئەوان نەبێ} دەڵێن : بۆچی هەڵتنەدەبژارد ؟ ، (واتە : بۆخۆت پەیدای بکە ، ئەگەر خواش بۆت نەنێری) ، بڵێ : من تەنیا شوێن ئەوە دەکەوم کە لەلایەن پەروەردگارمەوە بۆم سروش دەکرێو وەك پەیام بۆم دەنێری ، (واتە : من هیچ موعجیزان بۆخۆم ناهێنمو لە تواناشم دا نیە ، تەنیا بە دوای ئەو بەرنامەیە دەکەوم ، کە خوا بۆی ناردووم ،

وە هیچ ئایەتانیش بۆخۆم هەڵنابەستمو ، دایاننانێم ، تەنیا بە دوای ئەوە دەکەوم کە خوای پەروەردگار بە سروش بۆم دەنێرێ .

<u>ئامۆژگاریی شەشەم</u> : ﴿هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠٣﴾﴾ ، ئەمە بەرچاو ڕوونییە لە پەروەردگارتانەوە ، وە ڕێنماییو بەزەیی یە بۆ کۆمەڵێك کە بڕوا بێنن .

<u>ئامۆژگاریی حەوتەم</u> : ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾﴾ ، وە هەر کاتێك قورئان خوێنرایەوە ، گوێی بۆ هەڵخەنو بێدەنگ بن ، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ .

<u>ئامۆژگاریی هەشتەم</u> : ﴿ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ﴾ ، وە یادی پەروەردگارت بکەوە لە دڵی خۆتداو ، بە لالانەوەو بەبێ دەنگ بەرزکردنەوە ، لە بەیانیانو ئێواران دا.

<u>ئامۆژگاریی نۆیەم</u> : ﴿وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴾ ، وە لە بێئاگایان مەبە (لە یادی خوا بێئاگا مەبە) .

ڕاستیی سێیەم : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ﴿٢٠٦﴾﴾ ، بێگومان ئەوانەی لەلای پەروەردگارتن ، (دیارە مەبەست پێی فریشتەکانن) ، خۆ بە زل ناگرن لە بەرانبەر پەرستنی خوادا ، وە خوا بە پاك دەگرن ، وە هەمیشە کڕنووشی بۆ دەبەن .

﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ١٩٩ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ
ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٠٠ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ
طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ٢٠١ وَإِخۡوَٰنُهُمۡ يَمُدُّونَهُمۡ فِي ٱلۡغَيِّ
ثُمَّ لَا يُقۡصِرُونَ ٢٠٢ وَإِذَا لَمۡ تَأۡتِهِم بِـَٔايَةٖ قَالُواْ لَوۡلَا ٱجۡتَبَيۡتَهَاۚ قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ ... فَٱسۡتَمِعُواْ
لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ٢٠٤ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ
ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ٢٠٥ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ
رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ٢٠٦ ﴾

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەوەی ئـاسانو زیادە (لە خەڵکی چاوەڕوان بکەو وەریبگـرە) و فەرمان بە هـەرچی شـتی پەسـندە بکـەو ، ڕوو لـە نەفامـان وەرگێـڕە (١٩٩) وە هــەر کـات لـە شـەیتـانەوە خوتخوتەو دنەدرانێکت بۆ هات ، پەنـا بـە خـوا بگـرە ، بێگومان ئـەو بیسـەری زانـایە (٢٠٠) بــە ڕاسـتیی ئەوانـەی پـارێز دەکـەن ، هـەر کـات خەیـاڵو خوتخـوتەیەکیان لـە شـەیتانـەوە بـۆ هـات (خـوا ، سـزاو پاداشـت) دێتـەوە یادیـان ، یەکسـەر لەبـەر چـاو ڕوونـان دەبـن (٢٠١) وە (بێبـڕوایانو گوناهکـاران) برایەکـانیان (لـە شـەیتانەکـان) لـە گومڕایی دا ، هاوکارییـان دەکەنو بۆیان زیاد دەکـەن ، ئنجـا لـەو بـوارەدا (بێبـڕوایانو شـەیتانەکانیان) هیچ کۆتاییو کەمتەرخەمیـی ناکـەن (٢٠٢) وە لە کاتێکدا نیشانەیەکیان (کە داوایان کردوە) بۆ نـەهێنی ، دەڵێن : دەبووایـە خۆت هـەڵیبژێری ! {داوای بکـەیو بیهـێنـی} بڵێ : من تەنـیـا شـوێن ئـەو (پەیـام)ە دەکـەوم ، کە لـە پەروەردگامـەوە بـۆم سـروش دەکـرێ ، ئەمـە چـەند بەڵگـەو بەرچـاو ڕوونکەرەوەیەکـن لـە پەروەردگارتانـەوەو ، ڕێنماییو بـەزەیی یە بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنـن (٢٠٣) وە هەر کـات قورئـان خـوێنرا ، گوێـی بـۆ هەڵخـەنو بـێدەنـگ بـن ، بـەڵکـو بـەزەییتـان لەگـەڵ بنوێنـرێ (٢٠٤) وە لـە دڵـی خۆتـدا (لەبـەرخۆتەوە)و بـە بـێ دەنـگ هەڵێنـانو بـە کـڕووزانـەوەو ترسـەوە ، بـەیانیـانو ئێـواران یـادی پەروەردگـارت بکەو ، لـە بێئـاگایان مەبـە (٢٠٥) بێگومـان ئەوانـەی لـەلای پەروەردگـارتن (لـە فریشـتـە نیزیکەکـان) لـە بەرانبـەر پەرستش بۆ کردنیـدا ، خۆیان بـە زل ناگـرنو ، هـەردەم بـە پـاکی دەگـرن ، وە تەنیـا کـڕنووش بۆ وی دەبـەن (٢٠٦))) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(خُذِ ٱلۡعَفۡوَ) : واتە : ئەوەی ئاسانە وەریبگرە ، (العَفْو : القَصْدُ لِتَنَاوِلِ الشيءِ) ، واتە : ئەوەیە كە تۆ بتەوێ دەست بگەیەنیە شتێك ، ﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ ﴾ : (أي مَا يَسهُلُ قَصْدُهُ وَتَنَاوِلُهُ) ، ﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ ﴾ ، واتە : ئەوەی ئاسان دێتە دەست ، ئەوە وەربگرە ، هەر ئەوەندە لە خەڵك چاوەڕێ بكە ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلۡعَفۡوَ ٢١٩ ﴾البقرة ، واتە : لێت دەپرسن : چی ببەخشن ؟ بڵێ : ئەوەی كە ئاسانەو سەغڵەتتان ناكات ، هەر ئەوە ببەخشن .

(بِٱلۡعُرۡفِ ) : (المعرُوفُ : اسمٌ لِكُلّ فِعْل يُعْرَفُ بالعَقْلِ أَوِ الشَّرْعِ حُسْنُهُ) ، (عُرْف) واتە : (مَعْرُوف) ناوە بۆ هەر كردەوەیەك ، یان بۆ هەر قسەیەك كە بە عەقڵ ، یان بە شەرع جوانیی و چاكییەكەی بزانرێ .

(يَنزَغَنَّكَ ) دنەت دەداو هانت دەدا ، (نَزَغَ بَيْنَهُمْ : أَفْسَدَ ، وَحَمَلَ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْض) ، (نَزَغَ بَيْنَهُمْ) واتە : هەندێكیانی لە دژی هەندێكیان هانداو ، بەینی تێكدان ، (نَزَغَ فُلاَنًا : طعنهُ وَنَخَسَه) هەر كەسێك بە شتێك لە كەسێك بدات ، یان نقورچكەیەك ، یان شتێكی تیژی لەلا كەلەكە بدات ، دەڵێن : (نَزَغَهُ) .

(فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ) : واتە : پەنا بە خوا بگرە ، (العَوْذُ : الإلتِجَاء إلى الغَيْرِ والتعلُّقُ بِهِ ، عَاذَ فُلانٌ بفُلانٍ ، والعُوذَة مَا يُستعَاذُ بِهِ ، الرّقيَة) ، (عَوْذ) واتە : پەنا پێبردن ، پەنا بردن بۆ لای غەیر ، وە پێوە پەیوەست بوونی ، وە (عَاذَ فُلانٌ بفُلانٍ) یانی : پەنای پێبرد ، (عُوذَة) واتە : دووعایەك كە پەنای پێ دەبردرێ ، لە دژی ئێرەیی و چاوپیسی ... هتد .

(مَسَّهُمْ ) : (المسُّ كاللَّمسِ لَكِن اللَّمْسُ قَدْ يُقال لِطلَبِ الشَّيءِ ، وإنْ لَمْ يُوجَد ، وكُلّ أذىً يَنَالُ الإِنْسان) ، وشەی : (لَمَسْ) وەك (مَس) وایە ، بەلاّم (لَمْس) بۆ داواکردنی شتێکە ، با ئەو شتە نەشبێ ، بەلاّم (مَسّ) بریتیە لەوەی کە شتێك هەبێو دەستی لێبدرێ ، وە هەر ئازارێك کە دەگاتە مرۆڤ پێی دەگوترێ : (مَسّ) .

(طَٓئِفٌ ) : (الطَّوْفُ : المشْيُ حَوْلَ الشيءِ وَمِنْهُ : الطائِف) ، هەر شتێك بە دەوری شتێکدا بسووڕێتەوە ، پێی دەگوترێ : (طَوْف) ، وە (طائِف) کەسێکە کە بە دەوری کەعبە ، یان بە دەوری هەرشتێکدا بخولێتەوە .

(يَمُدُّونَهُمْ ) : (أَصلُ المدِّ : الجَرُّ ، وَمِنْهُ المُدَّة للوَقْتِ الممْتَدِّ ، وَمِدَّةُ الجُرْحِ) ، (يَمُدُّنَهُمْ) واتە : ڕستیان لە دوا درێژ دەکەن ، یاخود هاوکارییان دەکەن ، (أَصلُ المدِّ : الجَرُّ) شتێك ڕابکێشی ، (مُدَّة) بۆیە پێی دەگوترێ چونکە کاتێکی درێژکراوەیە ، (مِدَّةُ الجُرْحِ) واتە : برینێك کە کێمو زوخاوی لێدێ .

(لَا يُقْصِرُونَ ) : (أقْصَرَ و قَصَّرَ فِي كَذَا) واتە : لەو شتەدا تەنبەڵیی کرد ، وە (قَصَّرَ عَنْهُ : لَمْ يَنَلْهُ) واتە : دەستی نەیگەیشتێ ، (قَصَّرَ عَنْهُ : كَفَّ مَعَ القُدْرَةِ عَلَيْهِ) ، واتە : دەیتوانی بیکات ، بەلاّم نەیکرد .

(لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ) : واتە : بۆچی هەڵتنەدەبژارد ؟ (الإِجْتِبَاءُ : الجَمْعُ عَلَى طريقِ الإصْطفاء ، يَعْنِي : هَلاّ جَمَعْتَها) ، (إجْتِباء) بریتیە لەوە کە شتێك کۆبکەیەوە بە هەڵبژاردن ، کەواتە : (لَوْلاَ اجْتَبَيْتَها) یانی : (هَلاّ جَمَعْتَها) ، دەبوایە کۆت کردبایەوەو هەڵتبژاردبایە .

(بَصَآئِرُ) : (جَمْعُ بَصِيرة : القُوَّةُ المدْرِكَةُ فِي القَلْب ، والبصيرةُ : العِبْرَةَ وَالحُجَّةُ)، (بَصائِر) کۆی (بَصِيرَة)یە ، (بَصِيرَة) بریتیە لەو هێزەی کە لە دڵی ئینسان دایە ، وە ئینسان شتی پێ دەزانێ ، وە هەروەها بە پەندو بە بەڵگەش دەگوترێ .

(فَٱسْتَمِعُواْ ) : (الإِسْتِمَاعُ : الإِصغاء) ، (إِستِمَاع) بریتیە لە گوێ هەڵخستن ، بە گرنگیی پێدانەوە .

(وَأَنصِتُواْ ) : واتە : (اسْكتُوا) یانی : بێدەنگ بن ، (الإِنْصات : السُّكوتُ وَالإِستِمَاع)، (إِنْصات) بریتیە لە بێدەنگ بوونو گوێ هەڵخستن .

(تَضَرُّعًا ) : واتە : بە لالانەوەو کڕووزانەوە ، (ضَرَعَ الرَّجُلُ ضَرَاعَةً : ضَعُفَ وَ ذَلَّ ، وَتَضَرَّعَ : أَظْهَرَ الضَّرَاعَةَ) ئەگەر بگوترێ : (ضَرَعَ الرَّجُلُ) واتە : ئەو پیاوە بێهێز بوو ، یاخود زەبوون بوو ، (تَضَرَّعَ) واتە : بێهێزیی و زەبوونیی و ئاتاجیی خۆی دەرخست .

(وَخِيفَةً ) : (الخِيْفَةُ : الحَالَةُ الَّتِي عَلَيْهَا الإِنْسان مِنَ الخوف) ، (خِيفَة) بریتیە لەو حاڵەتەی کە بەسەر ئینساندا دێ ، لە کاتی ترساندا .

(بِٱلْغُدُوِّ ) : (الغُدْوَةُ وَالغَدَاةُ : أَوَّلُ النَّهارِ) ، واتە : (غُدْوَة وغَدَاة) بە سەرەتای ڕۆژ دەڵێن ، واتە : پێش نیوەڕۆ ، (وَ قُوبِلَ فِي القُرْآن الغُدوّ بالآصال) ، (غُدُو) واتە : بەیانیان (آصال) واتە : ئێواران ، (وَقُوبِلَ الغَدَاة بالعَشِي) ، وشەی (غَدَاة) لەگەڵ (عَشِي) هاتوە ، وە وشەی (غُدُو)یش لەگەڵ (آصال)دا هاتوە ، هەردووکیان واتە : بەیانیان و ئێواران .

(عِندَ رَبِّكَ ) : (عِنْدَ : لَفْظٌ لِلْقُرْبِ ، فَتَارةً يُستَعْمَلُ فِي المكانِ ، وَتَارَةً فِي الإِعْتِقَاد) ، وشەی (عِنْدَ) واتە : لە لای ، وشەیەکە بۆ نیزیکیی هەڵبژێردراوە ، جاری وایە بۆ شوێنێك کە لە شوێنێك نیزیك بێ ، جاری واش هەیە لە ڕووی عەقیدەو بۆچوونەوە ، پێت وایە فلان شتە لە فلانە شتە نیزیکە .

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ .

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ : كَانُوا يَتَكَلَّمُونَ فِي الصَّلَاةِ فَنَزَلَتْ : ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ ، قَالُوا : هَذَا فِي الصَّلَاةِ﴾ {أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَة في (المصنَّف) برقم : (٨٤٦٦) ، وَإِبْنُ المنْذِر في (الأوسط) برقم : (١٣١٨) ، وَإِبْنُ خُزَيْمَة برقم : (١٧٧٥) ، وَالبَيْهَقِي في (الكبرى) برقم : (٢٧٠٧) ، وَإِبْنُ أَبِي حَاتِم برقم : (٨٧٢٨) ، وَالطَّبَرِي وغيرهم ، الإستيعاب ج ٢ ، ص ٣٧ ، صحيح لغيره} .

واتە : ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : هاوەڵان عادەتیان وابوو لە نوێژێدا قسەیان دەکرد (قەدەغە نەکرابوون) هەتا خوای بەرز ئەو ئایەتەی نارده خوار : ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ ، واتە : ئەگەر قورئان خوێنرایەوە ، گوێی بۆ هەڵخەن و بێدەنگ بن ، بۆئەوەی بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ .

گوتیان : ئەمە لە کاتی نوێژدایە .

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

ئێمە سەرەتا لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان : خوا لەم هەشت ئایەتەدا ، نۆ ئامۆژگاریی گەورەو گرنگ ئاراستەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ ، وە هەر کەسێك کە لە ڕێی ئەوەوە دەڕوات ، لە زانایان‌و میراتگران‌و جێگرانی‌و مشوورخۆرانی کۆمەڵگا ، وە سێ (٣) ڕاستیی گرنگیش ڕوون دەکاتەوە :

سەرەتا خوا دەفەرموێ : ﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾ ، واتە : ئەوەی کە ئاسانە وەریبگرە ، وە فەرمان بە هەرچی شتی پەسندو چاکە بکە ، وە ڕوو لە نەفامان وەرگێڕە .

وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین ، زانایان گوتوویانە : ئەم ئایەتە کۆکەرەوەترین ئایەتە بۆ ڕەوشت‌و ئاکاری بەرزو پەسندو جوان ، کە دیارە سەرەتا خوا فەرمان دەکات : کە لە مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا ، ئەوەندەی کە ئاسانەو پێیان دەکرێ ، هەر ئەوەندە چاوەڕوانیی بکەی ، وە ئەوەی کە بە ئاسانیی دەتوانن ئەنجامی بدەن ، ئەوەیان لێ وەربگرین‌و بەوەندە قەناعەت بکەین ، ئنجا نەك هەر خۆمان هەرچی شتی پەسندو چاکە بەپێی توانا ئەنجامی بدەین ، بەڵکو فەرمانیشی پێبکەین ، وە کەسێکیش نەفامیی لەگەڵ نواندین ، ڕووی لێ وەربگێڕین‌و پشتی تێبکەین‌و لەگەڵی نەچینە تەرازووەوە .

پاشان دەفەرموێ : ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ ﴾ ، وە هەر کاتێك لە شەیتانەوە دنەدرای ، وە خوتخوتەیەکت بۆ هات ، پەنا بە خوا بگرە ، ﴿ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ ، بێگومان خوا بیسەری زانایە ، واتە : بیسەرە داوای تۆ ، وە پاڕانەوەی تۆ دەبیستێ ، وە زاناشە ، بە پیلان‌و فێڵ‌و نەخشەی گڵاوی شەیتان ، وە پشتت دەگرێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی .

کەواتە : یەکەم لە ئامۆژگارییەکان بریتی بوو لە : ﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ ﴾ ، دووەم : ﴿ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ ﴾ ، سێیەمیان : ﴿ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾ ، چوارەمیان : ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ ﴾ ، هەر کاتێك لە شەیتانەوە دنەدرایو خوتخوتەیەکت بۆ هاتو ، هەڵپێچرای بەرەو خراپە ، ئەوە پەنا بە خوا بگرە ، بێگومان خوا بیسەری زانایە .

پاشان خوا ڕاستییەك لەو سێ (٣) ڕاستییە گەورەو گرنگانە ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴾ ، بێگومان ئەوانەی کە پارێز دەکەن ، پارێز لە چی دەکەن ؟ لە هەر شتێك کە خوا پێی ناخۆشە ، کە دیارە خوا بە گشتی دوو شتی بۆ بەندە پێناخۆشن ، کە بریتین لە : ئەو شتانەی کە لەسەری پێویست کردوون بیانچوێنێ ، وە ئەو شتانەی کە لێی قەدەغە کردوون ، بیانشکێنێ .

ئنجا ئەوانەی پارێز دەکەن ، بە جێبەجێکردنی ئەرکەکان ، وە بە خۆدوورگرتن لە قەدەغەکراوەکان ، ﴿إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ﴾ ، هەر کاتێك لە شەیتانەوە هەستێکیان گەیشتێ ، واتە : شەیتان بە دەووریاندا سووڕا ، یان دەیستێکی گەیاندنێ ، وەك دنەدانو هاندان بۆ خراپە ، ﴿تَذَكَّرُواْ ﴾ ، وە بیریان دێتەوە ، تەقوایەکە هەمیشە وایان لێ دەکات : دڵیان هۆشیارو بێدار بێ ، ﴿ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴾ ، یەکسەر بەرچاو ڕوون دەبن ، دەبینن ، واتە : پیلانو فێڵی شەیتان بە چاوی عەقڵو دڵ دەبینن ، ئەوە بە نسبەت ئەهلی تەقواوە .

ئنجا ڕاستیی دووەم ، دەخاتە ڕووو دەفەرموێ : ﴿ وَإِخۡوَٰنُهُمۡ يَمُدُّونَهُمۡ فِي ٱلۡغَيِّ ثُمَّ لَا يُقۡصِرُونَ ﴾ ، بەڵام ئەوانەی کە بێبڕوان ، برایەکانیان (کە شەیتانەکانن) یارمەتییان دەدەن ، لە گومڕاییو بێ مرادییو بێ ئاکامییدا ، ﴿ ثُمَّ لَا يُقۡصِرُونَ ﴾

، واتە : هیچ کەمتەرخەمییش ناکەن ، چونکە دەڵێ : (أَقْصَرَ يُقْصِرُ وَقَصَّر يُقَصِّر) واتە : لە شتێکدا کورتی نواند ، کە دەیتوانی بیکات ، کەواتە : ئەوان خۆیان تەسلیمی برایەکانیان کردوە لە شەیتانەکان ، وە بە کەیفی خۆیان ڕستیان بۆ درێژ دەکەن ، وە کەمتەرخەمیی ناکەن ، لە زیاتر سەرگەردان کردنوماڵوێران کردنیاندا .

﴿ وَإِذَا لَمۡ تَأۡتِهِم بِـَٔايَةٖ قَالُواْ لَوۡلَا ٱجۡتَبَيۡتَهَا ﴾ ، وە ئەگەر تۆ ئایەتێکیان بۆ نەهێنی ، لەوەی کە ئەوان بۆت پێشنیار دەکەن ، کە لێرەدا واپێدەچێ مەبەست پێی موعجیزە بێ ، یانی : ئەگەر بەڵگەو نیشانەیەکیان بۆ نەهێنی ، ﴿ قَالُواْ لَوۡلَا ٱجۡتَبَيۡتَهَا ﴾ ، پێت دەڵێن : ئەدی بۆچی خۆت هەڵینابژێری ؟ یاخود پێشنیاری ناکەی بۆ خوا ؟ یان بۆ خۆت پەیدای ناکەی ؟

ئنجا دێتە سەر ئامۆژگاریی پێنجەمو ، دەفەرموێ : ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّي ﴾ ، واتە : بڵێ : من تەنیا بە دوای ئەوە دەکەوم ، کە لە پەروەردگارمەوە بۆم سروش دەکرێو ، وەك پەیام بۆم دەنێرێ .

ئنجا ئامۆژگاریی شەشەم : ﴿ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾ ، ئا ئەمە بەرچاو ڕوونییەکانن لە پەروەردگارتانەوەو ، بەڵگە ڕۆشنەکانن لە پەروەردگارتانەوە ، وە ڕێنماییەو مایەی بەزەیی یە ، بۆ کۆمەڵێك کە بڕوا بێنن .

ئنجا ئامۆژگاریی حەوتەم دەفەرموێ : ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴾ ، وە هەر کاتێك قورئان خوێنرایەوە ، گوێی بۆ هەڵخەنو بێ دەنگ بن ، بۆ ئەوەی بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ .

واتە : لەگەڵ قورئاندا وا مامەڵە بکەن ، هەمیشە بە ئەدەبو ڕێزو حورمەتەوە گوێی بۆ بگرنو ، بە گرنگیی‌و بایەخ پێدانەوە ، وە لە کاتی خوێنرانیدا ، بێ دەنگیی‌و کشو ماتیی بە خۆوە بگرن ، بۆ ئەوەی کە لێی تێبگەنو لێی بەهرەمەند

بن ، وە سەرەنجامیش ببنە شایستەی ئەوەی کە بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ ، لەلایەن خوای خاوەن بەزەییەوە .

ئنجا دێتە سەر ئامۆژگاریی هەشتەو دەفەرموێ : ﴿ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴾ ، وە یادی پەروەردگارت بکە لە دڵی خۆتدا بە کڕووزانەوەو لالانەوە ، وە بە ترسەوەو بەبێ دەنگ هەڵبڕین بە قسە ، واتە : بەبێ ئەوەی کە تۆ دەنگ هەڵبڕیو دەنگ بەرز بکەیەوە ، ﴿ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ﴾ ، بە بەیانیانو ئێواران .

ئنجا ئامۆژگاریی نۆیەم : ﴿ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴾، وە لە بێئاگایان مەبە ، لەوانە مەبە کە لە خوا بێئاگا دەبنو هەمیشە یادی خوا بکە ، ئینسان بە ئەندازەی ئەوە کە ئاگای لە خوا دەبێ ، خواش ئاگای لێ دەبێ ، وە بە ئەندازەی ئەوە کە دڵی هۆشیارو بێدار دەبێ ، لە پیلانو فێڵی شەیتانیش ئاگادار دەبێ ، وە لێشی پارێزراو دەبێ ، قەڵغانی بەربەرەکانیکردنی شەیتان ، قەڵغانی بەرەنگاربوونەوەی فێڵو پیلانەکانی شەیتان ، بۆ ئینسانی ئیماندار ، بریتیە لە یادی خوا .

پاشان ڕاستیی سێیەمو کۆتایی دەخاتە ڕووو دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ﴾ ، بە دڵنیاییی ئەوانەی کە لەلای پەروەردگارتن (کە مەبەست پێی فریشتەکانن) ، لە بەرانبەر پەرستنی ئەودا ، خۆ بە گەورە ناگرن ، وە بە پاکی دەگرن (لە هەموو هەڵەو کەموکوڕییەك) وە هەر بۆ ئەو کڕنووش دەبەن .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

## شیکردنەوەیەکی چەمکی وشەی (عفو) :

**مەسەلەی یەکەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾ ، (العفو) وەك پێشتر گوتمان : واتە : شتی ئاسان ، ئەوەی بە سێنایی بەدەستەوە بێ ، (الرازي) دەڵێ : (أَي خُذِ الميْسورَ مِنْ أَخْلاَقِ الرِّجَال ، وَلاَ تَستقْصِ عَلَيْهِمِ)[1] ، واتە : ئەوەی کە لە ڕەوشتو ئاکاری پیاوان ئاسانە ، هەر ئەوەندە وەربگرەو چاوەڕوانیی بکە ، وە زۆریان لێ داوا مەکە ، هەتا ئەوپەڕی لەگەڵیان مەچۆ ، وەك دەڵێن : لەگەڵیان مەگەیەنە مریشکە ڕەشە ، ئنجا وشەی (عفو) لە چەند دەقێکی دیکەشدا هاتوە ، بۆ وێنە :

١/ دەفەرموێ : ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ...﴿٢١٩﴾ ﴾البقرة ، واتە : پرسیارت لێدەکەن چی ببەخشن ؟ بڵێ : ئەوەی کە لە پێویستیی خۆتان زیادە .

٢/ هەروەها لە سووڕەتی (الأعراف)دا وەك پێشتر باسمان کرد ، خوای زانا دەفەرموێ : ﴿ ...حَتَّىٰ عَفَوا۟ ...﴿٩٥﴾ ﴾ ، یانی : (حَتَّى زَادوا) واتە : زیادیان کرد لە سەرو ماڵو ، لەو کەلوپەلو شمەکانەی ، کە ژیانی دنیایان دا پێویستییان پێیانە .

٣/ هەروەها لە فەرمایشتدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿أَحْفُوا الشوارِبَ وَأَعْفُوا اللِّحَى﴾{أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٤٦٥٤) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٢٥٩) ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم : (٢٧٦٣) ، وَالنَّسائِيُّ برقم : (١٥)) ، واتە : سمێڵ کورت بکەنەوە ، وە ڕیش بەجێبهێڵن .

---

١) مختار الصحاح ، ص ٣٨٩.

کەواتــە : ﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ ﴾ واتــە : ئـەوەی کـە ئـاسـانـە ، هــەر ئەوەنـدە لـە خـەڵك چاوەڕێ بکە ، کە بـەڕاسـتیی ئەوە ڕەوشـتێکی زۆر بـەرزو جوانـە .

وە کـە دەفــەرموێ : ﴿ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ ﴾ ، (العُـرْفُ ضِـدُّ النُّكْـرِ ، وَالـمعْـرُوفُ ضِـدُّ الـمنْكَـرِ) ، (عُـرْف) دژی (نُـکر)ەو ، (معـروف) دژی (منکـر)ە ، دیـارە (عـرف) واتـە : شتی پەسندو چاك ، واتە : هەر شتێك کە بـە عەقـڵ و شـەرع بـە چـاك و پەسند بزانـرێ ، پێچـەوانەکەشـی (نُکْـر)ە ، واتـە : شــتی نەناسـراو ، کـە عەقـڵ و سروشـتی ئینسـان و شــەرع پێی نـا ئـاشــنابـێ و بــە خراپـی بزانـێ ، (مَعْروف)یش پێچـەوانەی (مُنْکَر)ە ، کە مانایان لەیەك نیزیکـە .

ئنجــا (العُـرْفُ : مَـا يُعْـرَفُ بالعَقْـلِ والشَّـرْعِ حُسْنُهُ ، الـمعْرُوفُ مِـنَ الإِحْسَـانِ) ، (عُـرْف) هــەر شــتێکە کــە بــە عەقــڵ و بــە شــەرع چاکییەکــەی بزانــرێ ، وە (مَعْـرُوف)یش ئەوەیـە کە زانـراوە لە چاکەکاریـی .

کـە دەفــەرموێ : ﴿ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾ ، یـانی : (لا تُمَـارِيهِم وَلا تُضَـيِّعْ وَقْـتَـكَ مَعَـهُمْ) واتـــە : مشتومڕیــان لەگـەڵـدا مەکـەو ، کـاتی خۆتیـان لەگـەڵ بـە فیـڕۆ مــەدە .

(النَّسَـفي) بــە جـۆرێکی دیکـە مانـای (عَفـو) دەکـات ، دەڵـێ : (ضُـمَّ العَفْـوَ كُـلَّهُ إِلَيْـكَ وَأَنْـفِقْ مِنْـهُ عَلَـى النَّـاسِ بـالعَفْوِ عَـنْهُمْ) کـە دەفـەرموێ : ﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ ﴾ ، چونکە (أل)ی جینسی لەسەرە ، واتـە : هەرچـی لێبـوردن هـەیە بیگـرە لای خـۆت ، ئنجـا لــەو لـێبوردنــە ببەخشــە بــە خەڵــك ، واتــە : ئەگــەر کەموکــوڕیی و کەمتەرخەمییـان هــەبوو ، بیانبـەخشـە لـەو سیفەتە ، بــەڵام ئەگــەر بگـوترێ : مەبەسـت ئەوەیـە کـە لـە جگـە لـە خۆتـەوە ، چاوەڕوانییـت زۆر نەبـێ و خەڵـکی تووشی سـەغڵەتیی مەکـە ، ڕاسـتـترە ، بۆچی ؟

چـونکە لـە فەرمایشـتی پێغـەمبــەر ﷺدا هــاتوە ، فەرموویـەتی : ﴿بَشِّـرُوا وَلَا تُنَفِّـرُوا وَيَسِّـرُوا وَلاَ تُعَسِّـرُوا﴾ {أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم : (١٢٣٥٥) ، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم :

(٥٧٧٤) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (١٧٣٤) ، وأبو داود برقم : (٤٨٣٧) ، وَالنَّسائِيُّ فِي (الكبرى) برقم : (٥٨٩٠)}، واتە : مژدەدەر بنو خەڵك دڵخۆش بكەنو ، مەیانسڵمێننەوەو مەیانڕەوێننەوە ، وە ئاسانكار بن وە زەحمەتخەر مەبن .

هەروەها دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەفەرموێ : ﴿مَا خُيِّرَ رسول الله ﷺ بَيْنَ أمْرَيْنِ قَطُّ إلاَّ أَخَذَ أيْسَرَهُمَا ، مَا لَمْ يَكُنْ إثْمَاً﴾ {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ : البُخَارِيُّ برقم : (٣٥٦٠) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٧٧)} ، واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز سەرپشك نەكراوە لە نێوانی دوو شتاندا ، مەگەر كامەی ئاسانترە ، ئەوەی هەڵبژاردوە ، ئەگەر گوناح نەبووبێ .

وە (المراغي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا لەبارەی هەر كام لە : ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ ﴾ ، وە ﴿ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ ﴾ ، وە ﴿ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾ەوە ، هەندێ شتی جوان دێنێ :

أ - بە نسبەت ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ ﴾ەوە ، دەڵێ : (العَفْو : هُوَ السَّهْل الَّذِي لا كُلْفَةَ فِيهِ ، أَي : خُذْ مَا عَفَا لَكَ مِنْ أَفْعَالِ النَّاسِ وَأَخْلاَقِهِم وَمَا أَتَى مِنْهُمْ وَتَسَهَّلَ مِنْ غَيْرِ كُلْفَةٍ ، وَلاَ تَطْلُبْ مِنْهُم مَا يَشُقُّ عَلَيْهِم حَتَّى يَنْفِروا) ، واتە : (عفو) بریتیە لەو شتەی كە ئاسانەو هیچ زەحمەتی تێدا نیە ، واتە : ئەوەی كە لە كردەوەی خەڵكو لە ئاكاری خەڵك ئاسان بەدەستەوە دێ ، وە ئەوەی كە بەبێ ئەوەی زەحمەتیان بخاتە سەر ، ئەنجامی دەدەن ، هەر ئەوەیان لێ چاوەڕوان بكە ، وە شتێكیان لێ داوا مەكە ، كە لە توانایاندا نەبێ بۆ ئەوەی نەیانسڵەمێنیەوە .

ب - بە نسبەت ﴿ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ ﴾ەوە، دەڵێ : (العُرْفُ : هُوَ مَا تَعْرِفُهُ النَّفْس من الخير ، وتأنس به وَتَطْمَئِنَ إلَيْهِ ، وَلاَ شَكَّ أنَّ هَذَا مَبْنِيٌّ عَلَى اعْتِبَارِ عَادَاتِ الأُمَّةِ الحَسَنَةِ ، وَمَا تَتَوَاطَا عَلَيْهِ مِنَ الأُمُورِ النَّافِعَةِ فِي مَصالِحها ، وَإِجْمَال القَوْل عَلَيْهِ : أنه اسْم جَامِعٌ لِكُلّ مَا عُرِف مِنْ طَاعَةِ اللهِ ، وَالتَقَرُّبُ إِلَيْهِ وَالإِحْسان إلى النَّاس) واتە : كە دەفەرموێ : (فەرمان بكە بە هەرچی شتی

پەسندە) پەسند (عُرْفُ) بریتیە لە هەر شتێك كە نەفس لە شتی چاك پێی ئاشنابێو هۆگری بێ ، وە دڵی پێی ئارام بگرێ ، وە ئەوەش لەسەر عادەتو نەرێتی چاكی كۆمەڵگەو خەڵك ، بنیات دەنرێ ، وە ئەوەی كە لە كاروبار سوودی هەیەو ، خەڵك لەسەری ڕێكدەكەون ، وە بەرژەوەندییان دابین دەكات ، وە كورتەی قسان دەربارەی (عُرْف) ئەوەیە : كە ناوێكی كۆكەرەوەیە بۆ هەر شتێك كە بە چاك بزانرێ ، لە فەرمانبەریی بۆ خواو ، لە خوا وە نیزیك كەوتنەوە ، وە لە چاككردن لەگەڵ خەڵك دا.

ج - بە نسبەت ﴿ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾ەوە ، دەڵێ : (وَهُمُ السُّفَهَاءُ لِتَرْكِ مُعَاشَرَتِهِم وَعَدَمِ مُمَارَاتِهِم ، وَلاَ عِلاَجَ لِلْوِقَايَةِ مِنْ أَذَاهُمْ إِلاَّ الإِعْرَاضُ عَنْهُمْ)[١]، واتە : (الجاهلین) مەبەست پێی خەڵكی نەفامە ، ئەویش ئەوەیە كە واز لە تێكەڵییان بێنی ، وە دەمبەدەمبەیان لەگەڵ نەكەی ، وە چارەسەر نیە بۆ ئازارێك كە لەوانەوە پێت دەگات ، مەگەر بەوە كە پشتیان تێبكەیو وازیان لێ بێنی .

(جَعْفَر الصادق) ڕەحمەتی خوای لێ بێ ، گوتوویەتی : (لَيْسَ فِي القُرْآنِ آيَةٌ أَجْمَعُ لِمَكَارِمِ الأَخْلاَقِ مِنْهَا) ، واتە : هیچ ئایەتێك لەم ئایەتە كۆكەرەوەتر نیە بۆ ڕەوشتو ئاكاری بەرزو جوان .

كورتەی مانای ئەم ئایەتە موبارەكەش ئەوەیە :

یەكەم : ئەوەی لە خەڵكەوە بۆ تۆ دێت ، بە ئاسانو كەمەكەی قایل بەو چاوەڕوانیی زۆرت لێیان نەبێ ، بۆ ئەوەی گلەییان لێ نەكەی ، وە دڵت بەرانبەریان پڕ نەبێ لە بوغزو گلەییو بێزارییو ناڕەزایی .

دووەم : ئەوەی لە تۆوە بۆ خەڵك دەچێ ، با تەنیا چاكەو خێر بێ ، چونكە كەسێك فەرمان بە شتی پەسندو چاك بكات ، دەبێ خۆی لە پێش خەڵكدا بیكات .

١) تفسير المراغي ، ج ٣ ، ص ١٤٧.

سێ : ئەگەر نەفامییشت بەرانبەر کرا ، پشتیان تێبکەو لەگەڵیان مەچۆ تەرازووێو ، ئەگەر ئەوان لەگەڵ تۆ نەفامیی دەکەن ، تۆ نەفامیی لەگەڵ ئەواندا مەکە .

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ ﴾ ، وە ئەگەر لە شەیتانەوە دنەدانێکت پێگەیشت ، پەنا بە خوا بگرە ، بێگومان خوا بیسەری زانایە .

وشەی (نَزْغ) بە چەند مانایەك هاتوە :

١/ بە مانای تێوەژەنین‌و نوقورچکە لێدان ، یاخود شتێکی تیژ لە کەسێك بدەی .

٢/ وە بە مانای هاندان‌و پاڵ پێوەنان‌و بەرەو خراپە.

٣/ وە بە مانای خراپەکارییش دێ .

مەبەستی ئەم ئایەتەش ئەوەیە کە تۆ کاتێك لەگەڵ خەڵك دا مامەڵە دەکەی ، جاری وایە شەیتان نارەحەتت دەکات ، وەك چۆن نەقیزەیەك لە ئاژەڵێك دەدەی ، ڕادەچڵەکێ ، شەیتانیش ئاوا دنەت دەداتو ، بەرەو خراپە هەڵت دەچوێنێ ، تۆ لەو کاتەدا پەنا بە خوا بگرە .

لەوبارەوە ئەم شوێنەوارە هەیە ، کە لە (صحيح البخاري)دا هاتوە ، شتێکی جوانە لێرەدا بیگێڕینەوە :

﴿عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ، قَالَ : قَدِمَ عُيَيْنَةُ بْنُ حِصْنِ بْنِ حُذَيْفَةَ ، فَنَزَلَ عَلَى ابْنِ أَخِيهِ الْحُرِّ بْنِ قَيْسٍ وَكَانَ مِنَ النَّفَرِ الَّذِينَ يُدْنِيهِمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، وَكَانَ الْقُرَّاءُ أَصْحَابَ مَجَالِسِ عُمَرَ وَمُشَاوَرَتِهِ كُهُولاً كَانُوا أَوْ شُبَّانًا ، قَالَ عُيَيْنَةُ لِابْنِ أَخِيهِ : يَا ابْنَ أَخِي هَلْ لَكَ وَجْهٌ عِنْدَ هَذَا الأَمِيرِ فَتَسْتَأْذِنَ لِي عَلَيْهِ ؟ فَقَالَ سَاسْتَأْذِنُ لَكَ عَلَيْهِ ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ : فَاسْتَأْذَنَ الْحُرُّ لِعُيَيْنَةَ فَأَذِنَ لَهُ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ ، قَالَ : هِيَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ ! مَا تُعْطِينَا الْجَزْلَ وَلاَ تَحْكُمُ بَيْنَنَا بِالْعَدْلِ ، فَغَضِبَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ

عَنْـهُ حَـتَّى هَمَّ أَنْ يُوقِـعَ بِـهِ ، فَقَـالَ لَـهُ الْحُـرُّ : يَـا أَمِيرَ الـمُؤْمِنِينَ ! إِنَّ اللَّـهَ سُـبْحَانَهُ قَـالَ لِـنَبِيِّهِ ﷺ ، ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾ ، وَإِنَّ هَذَا مِنَ الْجاهِلِينَ ، قَالَ فَوَاللَّهِ مَا جَاوَزَها عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ حِينَ تَلاهَا عَلَيْهِ ، وَكَــانَ وَقَّــافاً عِنْـدَ كِتَـابِ اللَّـهِ﴾ {أَخْرَجَـهُ البُخَـارِيُّ بـرقم : (٤٣٦٦)} ، واتـە : عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : عویەینەی كوڕی حیصنی كوڕی حوزەیفە ، میوانی برازایەكەی (حُـرّ بـن قیس) بـوو ، كـە لـەو كۆمەڵە خەڵكە بوون ، عومەر لـە خۆی نیزیكی دەخستنەوە ، وە زانایـان چ كـامڵ بوونایـە چ گەنـج ، ئەهلـی مەجلیسی عومـەر بـوون ، {(قُـرَّاء) واتـە : شارەزایـانی شەریعـەت ، كە دیارە ئەو كاتە تاكە كتێبی شەریعەتیش بریتی بووە لـە قورئـان و جـارێ فەرمایشتەكـانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ، لـە دوو تـوێی كتێبێكـدا كـۆ نەكرابوونـەوە ، مەگـەر ئـەوەی هـاوەڵان لەبەریـان بووبـێ} ، ئنجا عویەینـە بـە برازایەكەی خۆی گوت : ئەی بـرازام ! ئایا ڕوویـەكت هەیە لەلای ئەو حوكمـڕانـە ، مۆڵەتـم بـۆ لـێ وەربگـرەی ، تاكو بچـم بۆ لای ؟ ئەویش گوتـی : باشـە مۆڵـەتت بۆ لـێ وەردەگـرم ، عـەبدوڵـڵای كـوڕی عەببـاس دەڵـێ : (حُـرّ) مۆڵـەتی بـۆ عویـەینـە خـواست ، عومەریش مـۆڵەتی دا ، كاتێك لـێی چووە ژوورێ گوتـی : هـا ئـەی كـوڕی خەتتـاب ! سوێند بـە خـوا نـە هاوكـاریی باشـمان دەكەی ، وە نـە بـە دادگـەرانەش حوكمڕانییمان لە نێوان دا دەكـەی ! عومـەریش تـووڕە بـوو ، هەتـا ویستـی سـزای بـدات ، (حُـرّ)یـش گـوتی : ئـەی فەرمانـدەی بـڕواداران ! بێگومـان خـوای بـەرز بـە پێغـەمبەری خۆی فـەرمووە : ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾ وە ئەمە لە نەفامانە ، دەڵێ : سوێند بـە خوا عـومەر لـێی تێنـەپەڕی ، كـاتێك كە بەسـەریدا خوێنرایـەوە ، (واتـە : لـەوێ ڕاوەسـتا) وە عومـەر كـاتێك كـە قورئـان دەخـوێنرایـەوە ، زۆر دەوەستاو تێنەدەپەڕی ، (واتە : قورئانی جێبەجـێ دەكرد) .

شـاعیـریش لەوبـارەوە دەڵـێ :

خُـذِ العَـفْـوَ وَأْمُرْ بِعُـرْفٍ كَـمَا ... أُمِـرتَ وَأَعْـرِض عَنِ الجَـاهِلِـينْ

وَلِـنْ فِـي الكَـلامَ لِكُـلِّ الأَنَــامِ ... فَمُسْـتحْسَنٌ من ذَوِي الجَاهِ لِينْ

واتە : ئەوەی ئاسانە وەری بگرە لە خەڵك ، وە فەرمان بە شتی پەسند بکە ، وەك فەرمانت پێکراوە ، وە ڕوو لە نەفامان وەرگێڕە .

وە با قسەت نەرم بێ لەگەڵ هەموو خەڵکیدا ، چونکە کەسانێك کە خاوەن پێگەبن ، زۆریان لێ جوانە قسەیان نەرم بێ .

وە هەندێك لە زانایان گوتوویانە : (النَّاسُ رَجُلاَن : فَرَجُلٌ مُحْسِنٌ ، فَخُذ مَا عَفَا لَكَ مِنْ إِحْسانِهِ ، وَلاَ تُكَلِّفْهُ فَوْقَ طاقَتِهِ ، وَلاَ مَا يُحْرِجُهُ ، وَإِمَّا مُسِيءٌ ، فَمُرْ بالمعْرُوف ، فَإِنْ تَمَادَى عَلَى ضَلاَلَهِ ، وَاستعْصَى عَلَيْكَ ، وَاستمَرَّ فِي جَهْلِهِ ، فَأَعْرِض عَنْهُ ، فلعلَّ ذَلِكَ أَنْ يَرُدَّ كَيْدَهُ)[1] ، واتە : خەڵك دوو جۆرە پیاون : پیاوێك کە چاکەکارە ، ئەوەی کە لە چاکەکردنی بۆی ئاسانە ، وە بە ئاسانیی دێتە دەستت ، ئەوەندەی لێ وەربگرە ، وە زیاد لەوەی کە لە توانایدا هەیە ، لێی داوای مەکەو ، شتێکی لێ داوا مەکە ، کە سەغڵەتی بکات ، وە پیاوێك کە خراپەکارە ، ئەوە فەرمان بە شتی پەسند بکە لەگەڵیدا ، ئنجا ئەگەر لەسەر گومڕایی درێژەی کێشا ، وە لێت عاسیبوو ، لەسەر نەفامیی خۆی بەردەوام بوو ، ئەوە پشتی تێبکە ، بەڵکو فێڵەکەی بپووکێتەوە .

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ ﴾ ، ئەوانەی کە پارێز دەکەن ، هەر کاتێك لە شەیتانەوە هەستێکیان پێگەیشت ، شتێکیان بە دەوردا هات ، ئەوە یەکسەر خوایان دەکەوێتەوە بیر ، یاخود سزاو پاداشتی خوایان دەکەوێتەوە بیر ، وە یەکسەر بەرچاوڕوون دەبن ، وە چاویان دەکرێتەوەو دەبینن .

وشەی : (الطَّوْفُ وَالطَّوَاف والطَّيف بالشيء : الإِستدَارَةُ بهِ أَو حولَهُ) ، ئەوەیە کە شتێك بسووڕێنی ، یان لە دەوری شتێك بسووڕێی ، وە خوێنراویشەتەوە : (إِذَا مَسَّهُمْ طَيْفٌ مِنَ الشَّيْطانِ) .

---

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير ، ص ٥٣١.

ئنجا (مَسَّهُمْ : أي ألَمَّ وَاتَّصَلَ بِهِم لِيَحْمِلَهُم بوَسوستهِ عَلَى المعْصِيَة) ، (مَسَّهُمْ) واته : پێیانگەیشت ، وه لێیان نیزیکەوتەوه ، بۆ ئەوەی کە بە دنەدانو خوتخوتەکەی ، هانیان بدات بۆ سەرپێچیی .

وشەی : ﴿تَذَكَّرُواْ﴾ : زانایان بە چەند جۆرێك مانایان کردوه :

١/ (تَذَكَّرُوا مَا أَمَرَ اللّٰهُ بِهِ وَنَهَى عَنْهُ) ئەوەیان هاتەوە بیر کە خوا فەرمانی پێکردوەو خوا قەدەغەی کردوه .

٢ / یاخود (تَذَكَّرُوا اللّٰه) خوایان هاتەوه یاد .

٣ / یاخود (تَذَكَّرُوا عِقَابَ اللّٰهِ وَثَوابَهُ) سزاو پاداشتی خوایان هاتەوه یاد .

٤ / یان (تَذَكَّروا وَعْدَهُ وَوَعِيدَهُ) گفتی خواو هەڕەشەی خوایان هاتەوه یاد .

٥ / یاخود لە یەك کاتدا هەموویان ، هەم خوای پەروەردگار ، هەم سزاو پاداشتی ، وه هەم گفتو هەڕەشەی و ، هەم بەهەشتو دۆزەخ ، هەموویان هاتنەوه یاد .

کە دەفەرموێ : ﴿فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ﴾ (أي فَإذَا هُم أُولُوا بَصِيرَةٍ ، عَلَى أن يَربَؤا بأَنْفُسِهِم أَنْ تُطِيعَ الشَّيْطَان) واته : دەبنە خاوەن بەڵگەیەكو خاوەن دڵو دەروونێکی ڕوونو ڕۆشنو خاوەن زانینێك ، کە لە خۆی نەوەشێنێتەوە فەرمانبەریی شەیتانەکان بکات .

کە خوا دەفەرموێ : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ﴾ ، ئەوانەی کە ئەهلی تەقوان بەو شێوەیەن ، دەتوانین وێنە بۆ ئەوە بێنینەوه ، بە بابایەکی ساغو پاكو بەهێزو وەرزشکار ، کە بێگومان بەرهەڵستیی (مَناعة)ی هەیە لە بەرانبەری نەخۆشیی و میکرۆب... هتددا ، بە پێچەوانەشەوە : بابای پیسو پۆخڵو ئیهمال ، بەرهەڵستیی وای نابێ لە بەرانبەر میکرۆبو نەخۆشییدا ، وه تووشی دەردەداریی دێ .

ئنجا لەوبارەوه کە شەیتان هەمیشە لەگەڵ ئینساندا خەریکە ، وه ئینسان دەبێ زۆر لەخۆی وریا بێ ، لەوبارەوه چەند فەرموودەیەك هەن بۆ وێنە :

**یەکەم** : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إلاَّ وَقَدْ وُكِّلَ بِهِ قَرِينُهُ مِنَ الْجِنِّ ، وَقَرِينُهُ مِنَ الملائِكَةِ ، قَالُوا : وَإِيَّاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟! قَالَ : وَإِيَّايَ ، وَلَكِنَّ اللَّهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَلا يَأْمُرُنِي إلاَّ بِخَيْرٍ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٣٦٤٨) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٢٨١٤) ، وَأَبُو يَعْلَى برقم : (٥١٤٣) ، وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم : (٦٥٨) ، وَالبَزَّار برقم : (١٨٧١) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٦٤١٧) ، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي (الكبير) برقم : (١٠٥٢٢) ، وَالشاشِي برقم : (٨٢٤) وَقَالَ : حَسَنٌ ، وَالدَّيْلَمِي برقم : (٦١١٥)} ، واتە : هیچ کامێك لە ئێوە نیە ، مەگەر هاودەمێکی لە جند ، وە هاودەمێکی لە فریشتان لەگەڵ دایە ، گوتیان : تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ فەرمووی : منیش ، بەڵام خوای بەرز یارمەتی منی داوە لە دژی ، جندەکەم مسوڵمان بووەو ، جگە لە خێرو چاکە ، فەرمانم بە هیچ شتێکی دیکە پێناکاتو هانم نادات .

**دووەم** : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿إنَّ لِلشَّيْطانِ لَمَّةً بابنِ آدَمَ ولِلمَلَكِ لَمَّةً ، فَأَمَّا لَمَّةُ الشَّيْطانِ : فَإيعادٌ بالشَّرِّ وتَكذِيبٌ بِالحَقِّ ، وَأَمَّا لَمَّةُ المَلَكِ : فَإيعادٌ بِالخَيْرِ وتَصْدِيقٌ بِالحَقِّ ، فَمَنْ وَجَدَ ذَلِكَ فَلْيَعْلَمْ أنَّهُ مِنَ اللهِ فَلْيَحْمَدِ اللهَ ، وَمَن وَجَدَ الأُخرَى ، فَلْيَتَعَوَّذْ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجيم ، ثُمَّ قَرَأَ : ﴿ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ ...﴾ (٢٦٨) البقرة﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم : (٢٩٨٨) ، ضَعَّفَهُ الألباني في (ضعيف الجامع) برقم : (١٩٦٣) ، وفي (المشكاة) برقم : (٧٤) ، ثُمَّ صَحَّحَهُ في هداية الرواة (٧٠) ، (النصيحة : ٣٤) ، صحيح موارد الظمآن (٣٨)} ، واتە : ئینسان هاندەرێکی شەیتانیی هەیە لە دەروونییدا ، وە هاندەرێکی فریشتەییشی هەیە (هەم شەیتان هانی دەداو ، هەم فریشتەش هانی دەدا) هاندانی شەیتان ، بریتیە لەوەی کە هەڕەشەی لێدەکا بە خراپە ، کە بڕوا بە هەق نەهێنیٚو بە درۆی بزانێ (بۆ وێنە : مەبەخشە ئەگەرنا هەژار دەبی ، جیهاد مەکە ! ئەگەرنا تووشی بەڵا دەبی ، کۆچ مەکە ! ئەگەرنا ماڵوێران دەبی ... هتد) ، بەڵام هاندانی فریشتە بریتیە لەوەی کە بەڵێنی پێدەدا بە چاکە ، وە هانیشی دەدا کە بڕوا بە هەق بێنێ ، ئنجا هەرکەسێك ئەوەی بینی لە دڵیداو

هەستی پێکرد ، ئەوە بابزانێ لە خواوەیەو لەڕێی فریشتەکانەوەیە ، (خوای پەروەردگار ئیلهامی چاکەی خۆی دەنێرێ لەڕێی فریشتەکانەوە) وە با ستایشی خوای لەسەر بکات ، وە هەر کەسێك هەستی بە هاندەری دووەم کرد (کە بریتیە لەوەی شەیتان هانی بدات بۆ چرووکییو ، بۆ بڕوا نەهێنان بە هەق) ئەوە با پەنا بە خوا بگرێ لە شەیتان ، واتە : بڵێ : (أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ) دوایی پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ... ﴾ .

لێرەدا بەباشی دەزانم قوڵە نەزیلەیەك بگێڕمەوە کە (محمد رشید رضا) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەیهێنێ ، ئەویش لە یەکێك لە دۆستە نیزیکەکانی خۆی هێناویەتی بە ناوی (الشیخ عبدالغني الرافعي الفقیه الصوفي) دیارە ئەو شێخە پیاوێکی باش بووە ، کە هەم شارەزا بووە لە (فیقە)داو هەم لە عیرفانو تەصەوفی پابەند بە قورئان سوننەتەوەدا ، دەگێڕێتەوە دەڵێ : جارێك لە تەرابلوس[2] لە نێو باغێکدا بووم ، وە کەسی لێنەبوو ، تەنیا کچێکی جوان بەرچاوی نەصرانیی لەوێ بوو ، (دیارە کچەکە خۆی لێ نیزیك خستۆتەوە ، وەك بڵێی هانی داوە کە ئەویش لێی نیزیك بکەوێتەوەو خراپەی لەگەڵدا بکات ، هیچ کەسیشی لێ نەبووە ، کچەکەش زۆر جوانو بەرچاوو بووە ، ئەو پیاوەش دەڵێ : کاتێك کە لێی نیزیك کەوتمەوە، (هەڵبەتە ئەوە نەبووە بەتەمابێ خراپەی لەگەڵ بکات) ، دەڵێ : لە دڵم دا ئەم ئایەتە دەخوێنرا : ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا ٣٢ ﴾الإسراء ، واتە توخنی زینا مەکەون ، چونکە گوناهێکی زۆر گەورەو ناقۆڵایە ، وە ڕێگایەکی زۆر خراپە ، دەڵێ : بەردەوام بە شێوەیەك لە سینەمدا ئەو ئایەتە دەخوێنرا ، بۆخۆم گوێم لێبوو ، وام هەست دەکرد کە ئافرەتەکەش گوێی لێیە ، ئیدی دەڵێ : لێی دوورکەوتمەوە ، کە دووریش کەوتمەوە ، لە سینەمدا ئایەتەکە هەر دەخوێنرا .

---

١) تفسیر القرآن الحکیم، ج ٩ ، ص ٤٦٥.

٢) (طرابلس) شارێکە لە لوبنان.

ئنجا (محمد رشيد رضا) دەربارەی هەڵوێستی خۆشی باس دەكات ، دەڵێ : ئەوەی بۆ یوسوف هاتۆتە پێش ، بۆ ئەو پیاوچاكەش هاتۆتە پێش ، بەلام خۆی لێ دوور گرتوە ، دەڵێ : بۆ منیش هاتۆتە پێش .

منیش دەڵێم : بێگومان هیچ كەس بە پلەی پێغەمبەران ناگات ، بەلام هەر كەس لەقەدەر خۆی ، ئەوەی كە بۆ یوسوف هاتۆتە پێش ، بۆ بەندەش چەند جارێك هاتۆتە پێش ، بەلام خوای بە بەزەیی پاراستوومی ، وە ناشڵێم : ئازایەتیی خۆم بووە ، چونكە ئەوەی ئێستا دەیزانم ئەو كاتە نەمزانیوە ، بەتایبەتی كاتێك كە لە قۆناغی نێوەندیی و ئامادەیی لە شاری سلێمانیی دەمخوێند ، لە تافی لاوێتیی دابووم و شارەزاییەكی واشم نەبوو ، بەلام خوای پەروەردگار لوتفی لەگەڵدا كردووم و پاراستوومی .

**مەسەلەی چوارەم** : كە دەفەرموێ : ﴿ وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِي ٱلْغَيِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴾ ، خوای پەنهانزان لە ئایەتی پێشوودا ڕایگەیاند كە : ئەوانەی كە ئەهلی تەقوا بن ، هەر كاتێك وەسوەسەیەكی شەیتانیان گەیشتێ ، وەك شتێك لە دەوریان هەڵاتو بە دەوریاندا هات ، یەكسەر بە حوكمی ئیمانو تەقوایەكەیان ، خوایان دەكەوێتەوە بیر ، بەهەشتو دۆزەخ ، سزاو پاداشتی خوایان دەكەوێتەوە بیر ، وە بەرچاویان ڕوون دەبێو ، چاویان شتەكان دەبینێ ، بە چاوی عەقڵو دڵ پیلانو فێڵی شەیتان دەبینن‌و خۆی لێ دەپارێزن ، ﴿ وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِي ٱلْغَيِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴾ ، بەلام برایەكانیان ، یانی : گوناهباران كە برای شەیتانەكانن ، {یان برایەكانیان لە شەیتانەكان} هاوكارییان دەكەن لە گومڕایی‌و سەرگەردانیی‌و بێمرادییدا ، وە پاشان هیچ كەمتەرخەمییش ناكەن .

(الطَّبْرَي) ئەم شوێنەوارەی هێناوە ، دەڵێ : (عَنِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا : ﴿ وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِي ٱلْغَيِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ ﴾ ، قَالَ : لاَ الإِنْسُ

يُقْصِرُونَ عَمَّا يَعْمَلُونَ مِنَ السَّيِّئَاتِ ، وَلاَ الشَّيَاطِين تُمْسُك عَنْهُمْ)[1] ، واتە : عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ ، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ : وە برایەکانیان لە گومڕاییو سەرگەردانییدا ، هاوکارییان دەکەنو کەمتەرخەمیی ناکەن ، دەڵێ : نە مرۆڤەکان کەمتەرخەمیی دەکەن لە ئەنجامدانی کردەوە خراپەکان دا ، وە نە شەیتانەکانیش دەستیان لێ دەگرنەوە ، لە زیاتر دنەدانو هاندانیانو پاڵ پێوەنانیان بەرەو زەلکاوی گوناهو تاوانو خراپە .

ئنجا هەر (طبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا ، هەندێ قسەی زۆر جوان دەکات لەوبارەوە ، دەڵێ : (وَإِنَّمَا هَذَا خَبَرٌ مِنَ اللّهِ عَنْ فَرِيقَي الإِيْمَانِ وَالكُفْرِ ، بِأَنَّ فَرِيقَ الإِيْمَانِ وَأَهْل تَقْوَى اللّهِ ، إِذَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَان تَذَكَّرُوا عَظَمَةَ اللّهِ وَعِقَابَهُ ، فَكَفَّتْهُم رَهْبَتُهُ عَنْ مَعَاصِيهِ ، وَرَدَّتْهُم إِلَى التَّوْبَةِ وَالإِنَابَةِ إِلَى اللّهِ مِمَّا كَانَ مِنْهُمْ زَلَّةً .

وَأَنّ فَرِيقُ الكَافِرِينَ يَزِيدُهُم الشَّيْطَانُ غَيًّا إِلَى غَيِّهِم إِذَا رَكِبُوا مَعْصِيَةَ مِنْ مَعَاصِي اللّهِ ، وَلاَ يَحْجِزهُم تَقْوَى اللّهِ ، وَلاَ خَوفُ المَعَادِ إِلَيْهِ عَنِ التَّمَادِي فِيهَا وَالزِّيَادَةِ مِنْهَا ، فَهُوَ أَبَدًا فِي زِيَادَةٍ مِنْ رُكُوبِ الإِثْمِ ، وَالشَّيْطَانُ يَزِيدُهُ أَبَدًا ، لاَ يُقْصِر الإِنْسِيُّ عَن شَيءٍ مِنْ رُكُوب الفَوَاحِش ، وَلاَ الشَّيْطَانُ مِنْ مَدِّهِ مِنْهُ)[2] ، واتە : ئەمە هەواڵێکە لە خواوە ، دەربارەی هەر دوو کۆمەڵی ئیماندارو کافر ، یان ئەهلی ئیمانو ئەهلی کوفر ، ئنجا کۆمەڵی ئیماندارو ، کۆمەڵی خاوەن پارێز لە خوا ، کاتێك شەیتان دەیانخلیسکێنێو هەڵەیەك دەکەن ، یەکسەر مەزنیی خواو سزای خوایان دەکەوێتەوە بیر ، وە ئەوە دەیانگێڕێتەوە ، وە ترس لە خوا دەیانگێڕێتەوە لە سەرپێچیی خوا ، وە ڕوویان پێ وەردەچەرخێنێ ، بەرەو گەڕانەوە بۆ لای خوا ، لەو گوناهو هەڵەیەی کە کردوویانە ، یاخود خەریك بووە بیکەن .

---

١) جامع البيان للطبري ، رقم : (١٥٤٨٧).

٢) جامع البيان للطبري ، رقم : (١٥٤٨٧).

بەڵام کۆمەڵی کافران ، شەیتان هەر زیاتر گومڕاو سەرگەردانو بێمرادیان دەکات ، هەر زیاتر لە بێمرادیی و بێئاکامیی و سەرگەردانیی و ماڵ وێرانیی بۆیان زیاد دەکات ، وە کاتێك سەرپێچییەك دەکەن لە سەرپێچییەکانی خوا ، تەقواو پارێز لە خواو ، ترس لە ڕۆژی دوایی ، نایانگێڕێتەوە لە گوناهان ، وە لەوە کە زیاتر درێژە بە گوناهان بدەنو لەسەریان بەردەوام بنو ، لێیان زیاد بکەن ، بەڵکو هەمیشە ئینسانی بێبڕوا لە زیادکردندا دەبێ ، لە سواربوونی گوناهانو ، ئەنجامدانی گوناهان ، وە شەیتانیش هەمیشە هەر بۆی زیاد دەکات .

کەواتە : نە مرۆڤەکە لە ئەنجامدانی هیچ کام لە گوناهە ناقۆڵاو خراپەکان کەمتەرخەمیی دەکات ، وە نە شەیتانیش لە هاوکارییکردنیو ، زیاتر دنەدانیو هاندانییدا ، کەمتەرخەمیی دەکات .

**مەسەلەی پێنجەم** : دەفەرموێ : ﴿ وَإِذَا لَمۡ تَأۡتِهِم بِـَٔايَةٖ قَالُواْ لَوۡلَا ٱجۡتَبَيۡتَهَاۚ قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّي ... ﴾ ، وە ئەگەر تۆ نیشانەیەکیان بۆ نەهێنی ، (لەوەی کە ئەوان داوای دەکەن) دەڵێن : دەبوایە هەڵیبژێری ، بڵێ : من تەنیا شوێن ئەوە دەکەوم کە لەلایەن پەروەردگارمەوە بۆم سروش دەکرێ ، (بۆم دەنێردرێ) .

دیارە مەبەست لە (آیة) وا پێدەچێ موعجیزە بێ ، چونکە زۆرجار کافرو موشریکەکان ، داوایان لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکرد ، کە موعجیزەیەکیان بۆ بێنێ ، وەك موعجیزەی پێغەمبەرانی پێشوو .

وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئایەتێك بێ بە دڵی ئەوانو ، تەعبیر بکات لەو شتەی کە ئەوان پێیان خۆشە ، واتە : دەگونجێ مەبەست پێی ڕستەکانی قورئان بێ ، دەفەرموێ : ئەگەر ئایەتێکیان بۆ نەهێنی ، کە ئەوان بە دڵیانە ، دەڵێن : بۆچی خۆت هەڵینابژێری ؟ بڵێ : من تەنیا شوێنی ئەو پەیامە دەکەوم ، کە لەلایەن پەروەردگارمەوە بۆم دێ .

وشەی (ٱجۡتَبَيۡتَهَا) دەڵێ : (جَبَى العَامِلُ المَال يَجْبِيهِ وَجَبَاهُ وَيَجْبُوهُ : إِذَا جَمَعَهُ لِلسُّلْطَانِ القَيِّم عَلَى بَيْتِ المَالِ) ، واتە : ماڵو سامانی کۆکردەوە بۆ ئەو حوکمڕانەی کە سەرپەرشتی خەزێنەی دەوڵەت دەکات .

کەواتە : ﴿لَوۡلَا ٱجۡتَبَيۡتَهَا﴾، یانی (لَوْلاَ جَمَعْتَها) ، دەبوایە کۆت کردبایەوە ، یاخود (لَوْلاَ اخْتَرْتَها) ، دەبوو تۆ هەڵیبژێری و بیهێنی .

ئنجا خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ : ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّي﴾، واتە : بڵێ : خوا چیم بۆ بنێری و پێبدات ، بەس شوێنی ئەوە دەکەوم ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدەبی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا لە لووتکەدا بووە ، وە ئەدەبی زۆر لەوە بەرزتر بووە ، کە شتێك لە خوا داوا بکات ، چونکە خوای بەرزو مەزن بۆ خۆی کاربەجێیەو زانایەو ، حیکمەتو زانیاریی و میهرەبانیی خوا ، سنووریان نیە ، کەواتە : پێویست ناکات شتێکی بۆ پێشنیار بکات ، خوا بۆخۆی دەزانێ چی بە پێغەمبەری خاتەم بدات ، چ لە ئایەتە خوێنراوەکان ، وە چ لە موعجیزەکان ، ئنجا کە موعجیزەی بەرهەستی بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ نەداوە ، لەبەر ئەوە بووە کە موعجیزە بەرهەستەکان لەگەڵ وەفاتکردنی پێغەمبەرەکاندا ، مەفعوولیان نەماوەو ڕۆیشتوون . ئنجا گۆچانی مووسا بووە ، زیندووکردنەوەی عیسا بووە ، حوشترەکەی صالح بووە ... هتد ، بەلام لە سۆنگەی ئەوەوە کە پێغەمبەری خاتەم بۆ هەموو بەشەر نێردراوە ، بە پانایی زەمینو بە درێژایی زەمان ، دەبووایە موعجیزەکەی بەردەوام بێ ، کە بەردەوامیش بێ ، نەدەبوو موعجیزەکەی بەرهەست بێ ، وەك گۆچانەکەی مووسا ، بەڵکو دەبوو موعجیزەیەکی وابێ ، کە لە دوای خۆیشی ئۆممەتەکەی ئەو موعجیزەیان لەبەردەست دابێ ، بۆیە خوای کارزان هەر بەرنامەکەی موحەممەد ﷺ کە دوا بەرنامەی خوایەو دوا کتێبی خوایە ، هەر ئەویشی کردە موعجیزەی ، کە دیارە هەتا کتێبو بەرنامەکەی بمێنێ ، موعجیزەکەشی دەمێنێ ، چونکە هەر خودی کتێبو بەرنامەکە ، موعجیزەکەیە .

هەڵبەتە پێغەمبەر خاتەم ﷺ وەك لە کتێبی : (الإِسْلاَمُ كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَابِ اللّه) لە بەرگی چوارەم دا ، بە تەفصیل باسم کردوە ، کە پێغەمبەری کۆتایی خوا ﷺ جگە لە قورئان هیچ موعجیزەیەکی دیکەی نەبووە ، کە تەحەددای بەشەری پێ بکات ، وە ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی پێ بکات ،

ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ موعجیزەی دیکەی زۆر بوون ، وەك : ئاو لەنێو پەنجەکان هەڵقوڵینو ، خواردن زیادکردنو ، بەرد لە دەستیدا تەسبیحات کردن ، باران بارین بە دوعای وی ﷺ راستەوخۆو ، گەلێ شتی دیکەش ، کە لەوێدا[1] دەقی فەرموودەکانیشم هێناون ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو موعجیزانەی پێشانی هاوەڵانی بەرێزی داون ، بۆ زیاتر ئیمان بەهێز بوونیان ، وە زۆرجار بۆ دەربازکردنیان لە گرفتو لە نارەحەتییەك ، نەك بۆ ئەوەی ئیسپاتی بکات کە خەڵکینە ! من پێغەمبەری خوام ، چونکە قورئان بەسە بۆ ئەوەی پێغەمبەرو ئۆممەتەکەی ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی موحەممەدی ﷺ پێ بکەن .

**مەسەلەی شەشەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ ، واتە : ئەم قورئانە بەڵگەو بەرچاو روونیو رێنماییو بەزەیی یە لە پەروەردگارتانەوە بۆ کۆمەڵێك بیانەوێ بڕوابێنن ، بەڵام ئەگەر نەیانەوێ ، لەسەری ناچار ناکرێن .

﴿ بَصَآئِرُ ﴾یش کە کۆی (بصیرة)یە ، بە مانای بەڵگە دێ ، وە بە مانای بەرچاو روونیی دێ ، وەك خوا فەرموویەتی : ﴿ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ ﴾ ، واتە : ئینسان بینەری خۆیەتی ، یاخود لەسەر خۆی زۆر چاك ئاگادارە ، ئاگاداری هەواڵو حاڵی خۆیەتی .

دەربارەی ریشەی وشەی (بَصِيرَة) و (بَصائِر) گوتراوە : (البَصَرُ حَاسةُ الرُّؤيَةِ ، وَأَبْصَرَهُ : رَآهُ ، وَالبَصِيرُ ضِدّ الضَّرِيرِ ، وبَصُرَ بهِ : عِلْم : ﴿ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ ﴿٩٦﴾ ﴾ طـه ، والتَبَصُّر : التَأَمُّلُ وَالتعَرّف ، والتَبْصِيرُ التَّعْرِيفُ والإِيْضاح ، وَالمبْصِرَةُ : المضِيْئَة ، وَمِنْهُ قولـه تعالى : ﴿ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَٰتُنَا مُبْصِرَةً ﴿١٣﴾ ﴾

---

١) لە بەرگی پێنجەمی کتێبی ناوبراودا، کە لە چاپی دووەمی دا ، بۆتە کتێبی حەوتەم : (الكتاب السابع) .

النمل ، أَي تَجْعَلُهُم بُصَرَاءَ)[١] ، (بَصَر) هەستی بینینە ، وە (أَبْصَرَهُ) واتە : بینی ، و (بَصِير) پێچەوانەکەی (ضَرِير)ە ، (بَصِير) واتە : بینەر ، (ضَرِير) واتە : کوێر ، وە (بَصُرَ بِهِ) واتە : زانی ، کە دەفەرموێ : ﴿بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا بِهِ ﴿٩٦﴾﴾ طـە ، واتە : ئەوەی من بینیم ، ئەوان نەیاندی ، (یان ئەوەی من زانیم ئەوان نەیانزانی) ، (التَبَصُّرُ) واتە : (التَأَمُّلُ والتَعَرُّف) ، واتە : تێوەڕامانو ناسین ، وە (تَبْصِير) واتە : (التَعْرِيف والإِيضاح) ، ناساندنو ڕوونکردنەوە ، (وَالمبْصِرَةُ : المضِيئَة) واتە : ڕۆشن ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ ءَايَاتُنَا مُبْصِرَةً ﴿١٣﴾﴾ النمل ، واتە : کاتێك نیشانە گرنگەکانی ئێمەیان بە ڕوونیی بۆ هاتن ، یاخود : دەیانکاتە بەرچاو ڕوون ، وە ڕێیان پێشان دەداو ، بەرچاویان ڕوون دەکاتەوە .

لێرەدا خوا دەفەرموێ : ﴿هَٰذَا بَصَائِرُ مِن رَّبِّكُمْ﴾، ئەوانە بەرچاو ڕوونیین ، یان بەڵگەن ، یاخود ڕێ پیشاندەرن ، لە پەروەردگارتانەوە ، ﴿وَهُدًى﴾ ، وە ڕێنماییین ﴿وَرَحْمَةٌ﴾ ، وە بەزەییین ﴿لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ ، بۆ کۆمەڵە کەسانێکی ئیماندار .

کەواتە : ئیمان یەکسانە بە بەرچاو ڕوونیی ، ئەویش دەبێتە مایەی ڕێنمایی ، ئەویش دەبێتە مایەی بەزەیی ، واتە : بەهۆی ئیمانەوە ، ئینسان بەرچاو ڕوونیی بۆ پەیدا دەبێ ، وە لە ئەنجامی بەرچاو ڕوونییدا ، ئینسان بەرپێی خۆی دەبینێو ، ڕێنمایی دەکرێ بۆ ڕێی ڕاست ، وە لە ئەنجامی گرتنی ڕێی ڕاستدا ، دەبێتە شایستەی بەزەییو میهرەبانییو لوتفو کەرەمی خوا ، واتە : لێرەدا خوای پەروەردگار دەیەوێ بە کافرەکان بفەرموێ : کە ئەگەر بتانەوێ ئیمان بێنن ، پێویستتان بە هیچ شتی دیکە ناکات ، دوای قورئان ، ﴿هَٰذَا بَصَائِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾، ئەم (قورئان)ە بەڵگەو بەرچاو ڕوونییو

١) مختار الصحاح : ص ٦١ و ٦٢.

رێ ڕۆشن کەرەوەیە لە پەروەردگارتانەوە ، وە ڕێنماییەو مایەی بەزەییە بۆ کەسانێك کە بیانەوێ ئیمان بێنن ، بەڵام ئەگەر کەسانێك نەیانەوێ ئیمان بێنن ، ئەوە وەك پێشینان دەڵێن : (کەسێك بە تۆبزیی بنێری بۆ مازووان ، لە داری هەڵناڕوانێ) ، واتە : تەماشای درەختەکە ناکاتو دێتەوە دەڵێ : مازووم نەهێناون ، چونکە درەختەکە مازووی پێوە نەبوون ، چونکە تەماشای دارەکەی هەر نەکردوە .

هەروەها پێشینان گوتوویانە : (ئەگەر دز دزبێ ، تاریکەشەو زۆرن).

**مەسەلەی حەوتەم** : خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ ، وە هەر کاتێك قورئان خوێنرا ، گوێی بۆ هەڵخەنو بێ دەنگ بن ، بۆ ئەوەی بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ .

دەڵێ : (الإِستمَاعُ أَبْلَغُ مِنَ السَّمْعِ ، لأَنَّهُ إِنَّمَا يَكونُ بقَصْدٍ وَنِيةٍ وَتَوْجيه الحَاسَّة إِلى الكَلامِ لإِدْرَاكِهِ ، الإِنْصاتِ : السُّكوتُ لأَجْلِ الإِستمَاعِ حَتَّى لاَ يَكونَ شاغِلاً عَنِ الإِحَاطة بكُلّ مَا يَقْرَأ)[1] واتە : (إِستمَاع) زێدەڕۆییو مانای زیاتری تێدایە لە (سَمْع) ، (سَمِعَ) واتە : بیستی ، بەڵام (استمَعَ) ماناکەی بەهێزترە ، چونکە (إِستمَاع) بە نیەتەوە دەبێ ، وە بە ئامانجدارییەوە دەبێ ، وە بەوە کە هەستی بیستنت ئاراستەی قسەکە بکەی ، بۆ ئەوەی لێی تێبگەی ، (إِنْصاتِ)یش بریتیە لە بێ دەنگیی بۆ ئەوەی گوێ بگری ، تاکو هیچ شتێك نەبێتە هۆکاری ئەوە کە ئینسان ئەوەی دەخوێنرێ ، لێی تێنەگات .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی گوێگرتن بۆ قورئان فەرموویەتی : ﴿مَا أَذِنَ اللّٰهُ لِشَيءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ يَتَغَنَّى بِالقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٩٨٠٤) ، وَالبُخَارِيُّ برقم : (٧٠٤٤) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٧٩٢) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (١٤٧٣) ، وَالنَّسائِيُّ برقم : (١٠١٧) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٧٥٢)} ، واتە خوا نەیبیستوە ، یاخود گوێی هەڵنەخستوە بۆ هیچ شتێك ، بە ئەندازەی ئەوە کە گوێبیستی پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش بووە ، کە دەنگی بە قورئان لاراندۆتەوە .

١) تفسير القرآن الحكيم ، ج ٩، ص ٤٧١.

هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ﴿لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ ، برقم : (٧٠٨٩)} واتە : هەر کەسێك دەنگی خۆی بە قورئان نەلارێنێتەوەو ، بە دەنگی خۆش قورئان نەخوێنێ ، لە ئێمە نیە .

هەڵبەتە هەرکەسە لەقەدەر خۆی ، کەسی وا هەیە خوای میهرەبان وای خوڵقاندوە ، لە بنەڕەتەوە دەنگی خۆشە ، بەڵام دەبێ ئینسان ئەو کاتەی کە قورئان دەخوێنێ ، هەوڵبدات بە دەنگی خۆش قورئان بخوێنێ ، بە پێی توانای خۆی ، وە بە شێوەیەك بیخوێنێ کە لەگەڵ ویقارو ڕێزو حورمەتی قورئاندا بگونجێ‌و ، بە پێی توانا دەنگی خۆی پێ بلارێنێتەوە .

وە کە دەفەرموێ : (مَا أَذِنَ اللهُ لِشَيءٍ ، أَي استَمَعَ أَو سَمِع) ، واتە : خوا نەیبیستوە ، وە گوێی نەگرتوە بۆ هیچ شتێك ، بە ئەندازەی ئەوە کە پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش قورئان دەخوێنێ ، بە دەنگ لاراندنەوەوە .

ئنجا هەر لەوبارەوە کە حوکمی گوێگرتن بۆ قورئان چۆنە ؟ زانایان زۆر شتیان گوتوە ، بەڵام ئێمە لەژێر سەرباسێکدا ، بەناوی (حوکمی گوێگرتنی مرۆڤ بۆ قورئان خوێندن) باسەکە دەتوێژینەوە :

باسێك دەربارەی :

# حوکمی گوێگرتنی مرۆڤ بۆ قورئان خوێندن

پێشەوای توێژەروانی قورئان (الطبري) لەوبارەوە ، ئەم شوێنەوارە دێنێ : {عَنْ سَعِيد بْن جُبَيْر يَقُولُ فِي قَوله : ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ ، قَالَ : الإِنْصاتُ : يَوْمَ الأَضْحى ، وَيَوْمَ الفِطر ، وَيَوْمَ الجُمُعَةِ ، وَفِيمَا يَجْهَرُ بِهِ الإِمَامُ مِنَ الصَّلاَةِ}[1] ، واتە : سەعیدی كوڕی جوبەیر لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا كە دەفەرموێ : {ئەگەر قورئان خوێنرا ، گوێی بۆ هەڵخەنو بێدەنگ بن ، بۆ ئەوەی خوا بەزەییتان لەگەڵ بنوێنێ ، یان بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ} گوتوویەتی : گوێگرتن بۆ خوێندنی قورئان ، ڕۆژی جەژنی قوربانە ، وە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانە ، وە ڕۆژی جومعەیە ، وە ئەو كاتەیە كە پێشنوێژ (إمام) دەنگ بەرز دەكاتەوە بە قورئان خوێندنەكەی .

واتە : ئەو نوێژانەی كە دەنگیان پێ بەرز دەكرێتەوە ، لەو كاتانەدا ، دەبێ گوێ بۆ قورئان خوێندن بگیرێ .

وە لە (صحيح مسلم)دا ئەم دەقە هاتوە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ﴿إِذَا قَرَأَ الإِمَامُ فَأَنْصِتُوا﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم : (٤٠٤) ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (٨٤٧)} واتە : ئەگەر پێشنوێژ قورئانی خوێند ، بێدەنگ بنو گوێ هەڵخەن .

(محمد رشيد رضا) لە تەفسیرەكەی خۆی دا[2] دەڵێ : (حَكَى ابْنُ الْمنْذِر الإِجْمَاع عَلَى عَدَمِ وُجُوب الإِستِمَاع وَالإِنْصاتِ فِي الصَّلاَةِ وَالخُطْبَة ، وَذَلِكَ لأَنَّ إِيْجَابَهُمَا عَلَى كُلّ مَنْ يَسْمَعُ أَحَداً يَقْرَأُ ، فِيهِ إِحْرَاجٌ عَظِيم ...) .

١) جامع البيان ، للطبري ، رقم : (١٥٥٤١).

٢) تفسير القرآن الحكيم ، ج ٩، ص ٤٧١.

کەواتە : هەرچەندە ڕواڵەتی ئایەتەکە کە پێویست بوونی گوێگرتن ، دەگەیەنێ ، هەروەها ئەو شوێنەوارانە کە دوایی هەندێکی دیکەشیان دێنین ، مانا ڕواڵەتییەکەیان ئەوە دەگەیەنێ ، کە لەسەر مرۆڤ پێویست بێ هەر کات دەنگی قورئاڵت خوێندنی بیست گوێ بگرێ ، بەڵام (محمد رشید رضا) دەڵێ : ئیبنو لموندیر یەکدەنگیی زانایانی هێناوە لەسەر ئەوە ، کە پێویست نیە گوێ هەڵبخرێو بێدەنگیی بکرێ ، نە لە نوێژدا بۆ قورئان خوێندن ، نە لە کاتی وتاردا ، چونکە فەرزکردنی گوێگرتنو بێدەنگ بوون ، لەسەر هەر کەسێك کە گوێی لێیە قورئان دەخوێنرێ ، سەغڵەت کردنێکی مەزنی تێدایە .

هەڵبەتە مەبەستی ئەوەیە هەر کات وتاربێژ وتاری دا ، یان قورئان خوێندرا ، بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا ، هەر کات لە بڵندگۆیەکەوە بیستت ، کەسێك قورئانی خوێند ، ئەگەر ڕواڵەتی ئایەتەکە وەربگری ، دەبێ فەرزبێ لە شوێنی خۆت دابنیشیو بێدەنگ بیو ، هیچ ئیشێك نەکەی !

بەڵام دەڵێ : ئەوە سەغڵەتکردنێکی گەورەی تێدایە ، بەڵام ئایا گوێگرتن لەسەر نوێژکەرەکانیش فەرز نیە ؟ دیارە وەك دوایی باسی دەکەین ، ڕای زیاتری زانایان وایە کە بەنسبەت ئەوانەوە ، پێویستە ، چونکە ئەوان هەر ئیشەکەیان بریتیە لە نوێژکردنەکە ، وە ئەوانەی کە دانیشتوونو گوێ لە وتاربێژ دەگرن ، نابێ بە شتی دیکەوە بخافڵێن ، هەر دەبێ گوێ هەڵخەن ، بەڵام ئەوە خەڵکی دیکەی دەرەوەی مزگەوتو ، خەڵکی دیکەی غەیری نوێژکەر ناگرێتەوە ، چونکە مایەی سەغڵەتییە بۆیانو ، ئیسلامیش خوا سەغڵەتکردنی تێدا دانەناوە :

﴿ ... وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ...﴿٧٨﴾ ﴾ الحج .

ئنجا با تەماشای ئەو چەند فەرمایشتەش بکەین :

١) ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ : أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ انْصَرَفَ مِنْ صَلَاةٍ جَهَرَ فِيهَا بِالْقِرَاءَةِ ، فَقَالَ : هَلْ قَرَأَ مَعِي أَحَدٌ مِنْكُمْ آنِفًا ؟ فَقَالَ رَجُلٌ : نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، قَالَ : إِنِّي أَقُولُ مَا لِي أُنَازَعُ الْقُرْآنَ ؟ ، قَالَ : فَانْتَهَى النَّاسُ عَنِ الْقِرَاءَةِ مع رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِيمَا جَهَرَ فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ بِالْقِرَاءَةِ مِنَ الصَّلَوَاتِ ، حِينَ سَمِعُوا ذَلِكَ مِنْ

رَسـولِ اللّـهِ ﷺ﴾ {أَخْرَجَهُ مَالِك برقم : (١٩٣) ، وَأَحْمَد برقم : (٧٩٩٤) ، وَابْنُ أَبي شَيْبة ، برقم : (٣٧٧٦) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، برقم : (٣١٢) وَقَالَ : حَسَنٌ ، وَالنَّسائِيُّ ، برقم : (٩١٩) ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (٨٤٨) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (١٨٤٣)} ، واتە : ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکیان نوێژێکی کردوە ، کە دەنگی تێدا بەرزکردەوە (جا نوێژی شێوان بێ ، نوێژی خەوتنان بێ ، نوێژی بەیانی بێ ، ئەو سێ نوێژەن کە دەنگیان تێدا بەرز دەکرێتەوە) ئنجا دوای ئەوەی کە لە نوێژەکەی بۆوە ، فەرمووی : ئایا هیچ کامتان ئێستا قورئانتان لەگەڵ من خوێند ؟ پیاوێك گوتی : بەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا ! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : گوتم : (واتە : لە دڵی خۆمدا گوتم) بۆچی کە کاتێ قورئان دەخوێنم ، یەکێکی دیکەش قورئان دەخوێنێ ! دەیەوێ پێشم بکەوێتەوە ، یاخود قورئانەکەی لەگەڵم تێکدەگیرێ ! ئنجا دەڵێ : دوای ئەوە خەڵك لەو نوێژانەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی تێدا بەرز دەکردنەوە وازیان لە قورئان خوێندن هێنا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ .

بەڵام دیارە لە نوێژە پەنهانەکاندا حوکمەکەی جیایە ، وەك لە فەرموودەکانی دیکەدا دێ .

٢) ﴿عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ صَلَّى بِنَا رَسولُ اللَّهِ ﷺ صَلاَةَ الظُّهْرِ ، أَوِ الْعَصْرِ ، فَقَالَ : أَيُّكُمْ قَرَأَ خَلْفِي بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى؟ ، فَقَالَ رَجُلٌ : أَنَا وَلَمْ أُرِدْ بِهَا إِلاَّ الْخَيْرَ ، قَالَ : قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ بَعْضَكُمْ خَالَجَنِيهَا﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم : (٩١٣)} ، واتە : عیمرانی کوڕی حوصەین ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ ، یاخود نوێژی عەسری بۆ کردین ، (دیارە دوای ئەوەی کە سلاوی داوەتەوە) فەرمووی : کامەتان لە دوای منەوە سووڕەتی (الأَعْلَى)ی خوێند ؟ پیاوێك گوتی : من ، وە هیچ مەبەستێکم نەبوو جگە لە چاکە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : زانیم کە یەکێکتان لەگەڵ مندا دەیخوێندو ، ناکۆکیی دەکرد ، یان پێشبڕکەی دەکرد .

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی ئەوی بیستوەو ، ڕەنگە خەریك بووبێ لێی تێکەڵ بێ .

٣) ﴿عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصامِتِ ، قَالَ : صَلَّى بِنَا رَسولُ اللَّهِ ﷺ الصُّبْحَ ، فَثَقُلَتْ عَلَيْهِ الْقِرَاءَةُ ، فَلَمَّا انْصَرَفَ ، قَالَ : إِنِّي أَرَاكُمْ تَقْرَءُونَ وَرَاءَ إِمَامِكُمْ ، قَالَ : قُلْنَا : يَا رَسولَ اللَّهِ ، إِي وَاللَّهِ ، قَالَ : لا تَفْعَلُوا إِلا بِأُمِّ الْقُرْآنِ ، فَإِنَّهُ لا صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِها﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٢٢٧٢٣) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (٨٢٣) ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم : (٣١١) ، وَقَالَ : هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ ، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم : (١٧٨٥) قَالَ شعيب الأرنؤوط : إسنادُهُ قَوِي} ، واتە : عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردین ، قورئان خوێندنەکەی لەسەر قورس بوو ، کاتێك سڵاوی دایەوە فەرمووی : ئایا ئێوە نابینم هەندێکتان لە پشت پێشنوێژەوە (لە پشت پێشەوایەکەتانەوە) قورئان دەخوێنن ؟ دەڵێ : گوتمان : با ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستە ، فەرمووی : دەجا وا مەکەن ، مەگەر (أُمُّ القُرآن) (واتە : سوورەتی فاتیحە) چونکە هەر کەسێك سوورەتی فاتیحە نەخوێنێ ، نوێژەکەی بەرناکەوێ ، (واتە : لەگەڵ ئیمامدا نابێ قورئانی دیکە بخوێنرێ ، جگە لە سوورەتی فاتیحە) .

٤) ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ : مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيها بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَهِيَ خِدَاجٌ ، (ثلاثاً) غَيْرُ تَمَامٍ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٧٨٢٣) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٨٧٦) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (٨٢١) ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم : (٢٩٥٣) ، وَالنَّسائِيُّ برقم : (٩٠٩) ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (٨٣٨) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٧٧٦)} ، واتە : ئەبو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : هەر کەسێك نوێژ بکات (أُمِّ القُرآن)ی تێدا نەخوێنێ {یەکێ لە ناوەکانی سوورەتی فاتیحە بریتیە لە (أُمِّ القُرآن)} ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە ، نوێژەکەی ناتەواوە ، نوێژەکەی ناتەواوە ، {دواییش بۆ دڵنیایی فەرمووی : } (غَيْرُ تَمَامٍ) نوێژەکەی ناتەواوە .

هەر بۆیەش زۆر لە زانایان جگە لە (أبو حنيفة) ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ، ڕایان وایە کە لە هەموو ڕکاتێکدا فەرزە سوورەتی فاتیحە بخوێنرێ ، ئەگەرنا ئەو نوێژە بەرناکەوێ .

ئنجا یەکێك لە ڕاوییەکان کە واپێدەچێ فارس بووبێ ، کە ئەو سەرچاوەی من لێمەوە هێنا ناوەکەی نەهێنابوو ، دەڵێ : (فَقُلْت : يَا أَبَا هُرَيْرَةَ ! إِنِّي أَحْيَانَاً

أَكونُ وَراءَ الإمَامِ ، فَغَمَزَ ذِراعِي ، وَقَالَ : إقْرَأْ بِهـا يـا فَارِسِيُّ! فِي نَفْسِـك ، فَإِنِّي سَمِعْت رَسولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ : قَالَ اللَّهُ : قَسَمْتُ الصَّلاةَ بَيْـنِي وَبَيْـنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ ، فَنِصْفُهَا لِي ، وَنِصْفُهَا لِعَبْدِي ، وَلِعَبْدِي مَا سألَ...)[1]، ئەو ڕاوییـە کە دیارە لە نەتەوەی فارس بووە ، دەڵێ : گوتم : ئەی ئەبو هورەیـرە ! من جاری وایە لە پشت ئیمامەوە دەبم ، ئایا سوورەتی فاتیحە هەر بخوێنـم ؟ دەڵـێ : ئەبو هورەیـرەش دەستی گەیاندە قۆڵـمو گوتی : ئەی فارسـیی ! لـە دڵـی خۆتـدا بیخوێنـە (یانـی : لەبەرخۆتەوە بیخوێنە ، بـە دەنگی نـزم ) ، گوێم لە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بوو ، دەیفەرموو : خوا فەرموویەتی : نوێژم لە نێوان خۆمو بەندەکەمدا کردۆتـە دوو نیوە : نیـوەی بۆ منـەو نیوەی بـۆ بـەندەکەمـە ، وە بـەندەکـەم هـەر شـتێکم لـێ داوا بکات ، پێـی دەدەم ، کە ئەمـە دەقی فەرموودەکـەیە :

﴿عَنْ أَبي هُرَيرَةَ ﷛ ، قَـالَ : سَـمِعْتُ رَسـولَ الله ﷺ يَقُـولُ : قَـالَ اللهُ تَعَالـى : قَسَمْتُ الصَّلاَةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ ، وَلِعَبْدِي مَا سالَ ، فَــإِذَا قَــالَ الْعَبْــدُ : ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ ، قَــالَ اللهُ تعالــى : حَمِـدَني عَبْـدِي ، وَإِذَا قَـالَ : ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ، قَـالَ الله تعالـى : أَثْنـى عَلَيَّ عَبـدِي ، فَإِذَا قَـالَ : ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ ، قَالَ : مَجَّدَني عَبْـدِي (وَقَـالَ مَـرَّةً : فَـوَّضَ إلَـيَّ عَبْـدِي) فَـإِذَا قَـالَ : ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ ، قَالَ : هَـذَا بَيْنِـي وَبَيـنَ عَبـدْي ، وَلِعَبـدِي مَاســأَلَ ، فَــإِذَا قَــالَ : ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ ، قَــالَ اللهُ : هَـذَا لِعَبْـدِي وَلِعَبـدِي مَـاسـالَ﴾{أَخرَجَـهُ مُسْـلِمٌ : (١٩٠٤)} ، واتـە : ئەبـو هورەیــرە خــوا لێـی ڕازی بـێ ، دەڵێ : گوێـم لـە پێغەمبــەری خــوا ﷺ بــوو

---

١) أحكام القرآن ، لابن العربي ، ج ٢ ، ص ٣٦٥.

دەیفەرموو : خوای بەرز دەفەرمویٚ : نوێژم لە نێوان خۆمو بەندەکەم دا کردوە بە دوو بەش ، وە بەندەکەم هەر شتێك کە لێم داوا بکات ، دەیدەمیٚ کاتێك بەندە گوتی : ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، خوا دەفەرمویٚ : بەندەکەم ستایشی کردم ، وە هەرکات گوتی :﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ، خوا دەفەرمویٚ : بەندەکەم مەدحی منی کرد ، وە هەرکات گوتی : ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ ، خوا دەفەرمویٚ : بەندەکەم منی بە خاوەن شکۆو پایە بەرز وەسف کرد ، {وە جارێك فەرمووی : بەندەکەم ئیشوکاری خۆی بە من سپارد}، وە هەر کات گوتی : ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ ، خوا دەفەرمویٚ : ئەوە لە نێوانی منو بەندەکەم دایەو ، بەندەکەم هەر شتێکم لیٚ داوا بکات ، بۆی دەبیٚ (واتە : مادام منی بەو مەدحو وەسفانە وەسف کرد ، لەوەو دوا هەر شتێکم لێداوا بکات دەیدەمیٚو پێی دەبەخشم) وە هەرکات بەندە گوتی : ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ ، خوا دەفەرمویٚ : ئەوە بۆ بەندەکەمە ، وە بەندەی من هەر شتێکم لیٚ داوا بکات ، پێی دەبەخشم .

مەبەستی ئەوەبووە کە لەبەرخۆیەوە بیخوێنیٚ ، کە گوتوویەتی : (فِي نفسك) واتە : لەبەرخۆتەوە بیخوێنەو دەنگی پیٚ هەڵمەهێنە ، مادام ئیمام دەنگ بەرز دەکاتەوەو ، تۆش لە پشت ئیمامی .

٥) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا ، وَإِذَا قَرأَ فَأَنْصِتُوا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٢٤٢٩٥) ، وَابْنُ أَبي شَيْبَة ، برقم : (٧١٣٥) ، وَالبُخَارِيُّ ، برقم : (٦٥٦) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (٤١٢) ، وَأَبُو دَاوُدَ ، برقم : (٦٠٥) ، وَابْنُ مَاجَهْ ، برقم : (١٢٣٧)} ، واتە : پێشەوا بۆیە دانراوە کە چاوی لێبکریٚو بە دوای ئەودا جووڵە بکریٚ ، ئنجا

ئەگەر چووە ڕکووع ، ئێوەش بچنە ڕکووع ، وە ئەگەر کڕنووشی برد ، ئێوەش کڕنووش بەرن ، وە ئەگەر قورئانی خوێند ، ئێوە بێدەنگ بن .

بە پێی ئەو فەرموودەیە بێ لە کاتێدا کە ئیمام قورئان دەخوێنێ ، دەبێ ئەوانەی کە لە پشتیەوە نوێژ دەکەن ، قورئان نەخوێنن ، نە فاتیحەو نە غەیری فاتیحە .

ئنجا ئایا ئەو فەرموودانە چۆن پێکەوە دەگونجێن ... ؟

دیارە زانایان ڕاجیبیایان هەیە لەوبارەوە ، بەڵام بە بۆچوونی من ، ئاوا ئەو فەرموودانە بەیەکەوە دەگونجێنو کۆدەکرێنەوە ، کە بگوترێ :

ئەوەی کە لە پشت ئیمامەوە نوێژ دەکات ، لەو نوێژانەدا کە دەنگیان پێ بەرز دەکرێتەوە ، جگە لە سوورەتی فاتیحە ، ناخوێنێ ، بەڵام لەو نوێژانەدا کە بە دەنگی نزم دەخوێندرێن ئەوە نوێژکەر بۆی هەیە ئەوەندەی فریای دەکەوێ ، بخوێنێ ، وە لە فەرموودەکەشدا باسی سوورەتی (الأعلى) کراوە ، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : کامەتان خوێندی ؟ هەرچەندە دەڵێ : نوێژی نیوەڕۆ ، یان عەسر بووە ، بەڵام واپێدەچێ ، ئەو کەسە بە دەنگی بەرز خوێندبێتی ، مادام پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێبووەو ، زانیویەتی کامە سوورەتەیە ؟ بۆیە پرسیویەتی ، دیارە لەبەرئەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ ئینکاریی لێکردوە ، ئەگەرنا کە سوورەتی (الأعلى)ی خوێندوە ، حەتمەن سوورەتی فاتیحەشی هەر خوێندوە ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ باسی سوورەتی فاتیحەی نەکردوە ، کە بۆچی خوێندوویەتی ؟.

ڕاجیایی زانایانیش لەوبارەوە بەم جۆرەیە :

١) بوخاریی‌و شافیعیی ، وە مالیك لە ڕیوایەتێکدا دەڵێن : هەر چۆنێك بێ دەبێ سوورەتی فاتیحە هەر بخوێنرێ ، واتە : ئەوان ڕایان وایە لەو سێ نوێژانەدا کە دەنگیان پێ بەرز دەکرێتەوە ، وە لە دوو نوێژەکان دا ، کە دەنگیان تێدا نزم دەکرێتەوە ، کە نیوەڕۆو عەسرن ، دەبێ سوورەتی فاتیحە لەلایەن مەئموومەوە هەر بخوێنرێ ، بەڵام بێگومان لەبەرخۆیەوە .

٢) بەڵام ئەبو حەنیفە دەڵێ : نوێژخوێن (مأموم) لە دوای ئیمامەوە بە ڕەهایی هیچ قورئان ناخوێنێ ، نە فاتیحەو نە غەیری فاتیحە ، نە لەو نوێژانەدا کە دەنگیان پێ بەرز دەکرێتەوە ، وە نە لەو نوێژانەش دا کە دەنگیان تێدا نزم دەکرێتەوە .

٣) بەڵام مالیکییەکانو حەنبەلییەکان دەڵێن : نوێژخوێنان لەو نوێژانەدا کە دەنگیان پێ نزم دەکرێتەوە ، فاتیحە دەخوێنن ، هەروەها غەیری فاتیحەش ، چونکە بە گشتی گوتوویانە ، بەڵام لەو نوێژانەدا کە دەنگیان پێ بەرز دەکرێتەوە ، ناخوێنن .

**مەسەلەی هەشتەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾ ، وە یادی پەروەردگارت بکە لە دڵی خۆتدا (لەبەرخۆتەوە) بە کڕووزانەوەو بە ترسەوە ، وە بە بێ دەنگ هەڵێنان ، بە بەیانیانو ئێواران ، وە لە بێ ئاگایان مەبە .

دیارە کە دەفەرموێ : ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ ﴾ ، یادی پەروەردگارت بکە خاوەنی کتێبی (مُخْتَارُ الصِّحَاح) گوتوویەتی : (الذِّكْرُو الذِّكْرَى وَالذُّكْرَةَ : ضِدُّ النِّسيَانِ)[1] ، واتە : هەرکام لە : (ذِكْرو ، ذِكْرى ، ذُكْرة) دژی لە بیرچوونەوەن ، کەواتە : (ذِكْر) یانی : لە بیربوونو بیرهاتنەوە .

وە دەگوترێ : (واجْعَلْهُ مِنْكَ عَلَى ذُكْرٍ وَذِكْرٍ) واتە : ئەو شتەت لە بیر بێ ، وە زیکر بە مانای ناوبانگو دەنگۆی چاك دێ ، وە دەگوترێ : (ذَكَرَهُ بَعْدَ النّسيَانِ) دوای ئەوەی کە لە بیری چووبوو ، وە بیری هاتەوە ، وە دەشگوترێ : (ذَكَرَهُ بلسانِهِ وبقَلْبِهِ) بە زمانیو بە دڵی باسی کرد ، کەواتە : وشەی (ذکر) هەم بۆ ئامادەبوونی شتێك لە زیهنو لە دڵدا ، وە هەم بۆ وەبیر هاتنەوەی شتێك کە پێشتر لە زیهنو دڵدا بووەو ، دوایی لە بیر چۆتەوە ، بۆ هەردووکیان هەر بەکاردێ .

---

١) ص: ٢٠٦.

كە دەفەرموێ : ﴿فِي نَفْسِكَ﴾ ، یانی : (سِرًّا) بە پەنهانیی ، دوعا دەبێ بە پەنهانیی بێ ، نەك بە هاوار هاوارو دەنگ بەرزكردنەوە .

كە دەفەرموێ : ﴿تَضَرُّعًا وَخِيفَةً﴾ ، واتە : بە كڕووزانەوەو بە ترسەوە ، یانی : بە خۆ بە بچووك زانینو خۆزەبوون كردن ، لە بەرانبەر خوای بێ نیازو جێی نیازداو ، ئاتاجیی پێشاندان ، وە بە هەست كردن بە ترسو شەرمو ڕێزەوە ، پاڕانەوە بكرێ .

كە دەفەرموێ : ﴿وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ﴾ ، واتە : بەبێ دەنگ بەرزكردنەوە .

وە ﴿بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ﴾ ، واتە : بەیانیانو ئێواران ، جا (غدو) ، (غَدَا يَغْدُو غُدُواً) دەگونجێ چاوگ بێ ، وە دەشگونجێ كۆ بێ (غُدو) كۆی (غَدْوَة) بێ ، (غَدْوَة) واتە : بەیانی (غدو) واتە : بەیانییەكان ، هەروەك (آصال) كۆی (أصِيل)ە ، واتە : ئێوارە ، (آصال) واتە : ئێوارەكان ، هەروەها (عَشِي)یش كە زیاتر لەگەڵ (غُدوّ)دا دێ ، (عَشِيّ) كە كۆی (عَشيّة)یە ، واتە : ئێوارەو (غُدوّ) كە كۆی (غَدوة)یە ، واتە : بەیانی .

شایانی باسە : بنچینەی گشتی لە زیكرو یادی خوادا ، پەنهانییە ، بەڵام بە دەنگی بەرزیش لە كاتی خۆیدا دروستە ، لە هەندێ حاڵەتی هەڵاوێردراودا ، لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە كە پێشتریش هێناومانە :

﴿عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رَفَعُ النَّاس أَصْوَاتَهُم بالدُّعَاء فِي بَعْض الأَسْفَار ، فَقَالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ : (يَا أَيُّها النَّاسُ ! ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ ، فَإِنَّكُمْ لا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبَاً ، إِنَّ الَّذِي تَدْعُونَهُ سَمِيعٌ قَرِيب ، أَقْرَبُ إِلى أَحَدِكُمْ مِنْ عُنُقِ رَاحِلَتِهِ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (١٩٥٣٨) ، وَالبُخَارِيُّ برقم : (٢٨٣٠) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٢٧٠٤) ، وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (١٥٢٦) ، وَالنَّسائِي في (الكبرى) برقم : (٧٦٧٩) ، وَأَبُو يَعْلَى برقم : (٧٢٥٢)} ، واتە : ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە ، دەڵێ : لە یەكێك لە سەفەرەكاندا ، خەڵك دەنگیان بەرزكردەوە بە پاڕانەوە ، پێغەمبەر ﷺیش پێی فەرموون : ئەی خەڵكینە ! ئاگاداری خۆتان بن ، یان خۆتان ئەزیەت

مەدەن ، چونکە ئەوەی ئێوە لێی دەپاڕێنەوە نە کەڕە ، نە نادیاریشە ، ئەوەی لێی دەپاڕێنەوە بیسەرەو ، لە یەکێکتان نیزیکترە لە ملی ولاخەکەی .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴾ ، ئەمە جەخت کردنەوەی زیکرکردنی بە دڵە ، چونکە زیکری زمان بەبێ دڵ ، بە تەئکید غەفڵەتە .

ئنجا ئەگەر تەماشای ئەم ئایەتە بکەین ، دەبینین شەش ئەدەبی تێدان بۆ زیکرکردن ، بەم شێوەیە :

# شەش (٦) ئەدەب بۆ زیکری خوا کردن

١/ دەبێ زیکری خوا بە پەنهانییو لە دەروونی خۆت دابێ ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ :﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ ...﴿٢٠٥﴾ ﴾، بە پەنهانییو لەبەرخۆتەوە یادی پەروەردگات بکە .

٢/ دەبێ یادی خوا بە کڕووزانەوەو لالانەوەوە (بالتضرّع) بێ ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ تَضَرُّعًا ﴿٢٠٥﴾ ﴾ ، (تَضَرّع) ئەوەیە کە ئینسان بکڕووزێتەوە بلالێتەوەو ، ئاتاجیی خۆیو زەبوونیی خۆیو بچووکیی خۆیو نیازمەندیی خۆی ، لە بەرانبەر خوای پەروەردگاردا دەرببڕێ .

٣/ دەبێ زیکری خوا بە ترسەوە بێو ، بە هەست کردن بە مەترسییەوە لە سزادران بێ ، بەهۆی هەڵەو پەڵەکانتەوە ، (مَعَ الخَشْيَةِ والإجلال)، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿ وَخِيفَةً ﴾ .

٤/ دەبێ یادی خوای بەرزو مەزن ، بە بێدەنگ هەڵێنانو دەنگ بەرزکردنەوە بێ ، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿ وَدُونَ ٱلْجَهْرِ ﴾ .

٥/ دەبێ زیکری خوا ، وێڕای دڵ بە زمانیش بێ ، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ ﴾ وە با دەنگ بە گوتن بەرزنەکرێتەوە ، ئنجا ئەگەر خوا نەیفەرمووبایە : ﴿ وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ ﴾ ، بەبێ دەنگ هەڵێنان بە گوتن ، وە وشەی (بالقول)ی لەگەڵدا نەبووایە ، وا تەصەووڕ دەکرا : کە ئەگەر هەر لەبەرخۆتەوەو بە دڵ یادی خوا بکەی هەر تەواوە ، بەڵام کە دەفەرموێ : ﴿ وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ ﴾ ، واتە : بە دەنگ زیکر بکەو بە دڵیش ، بەڵام بەبێ دەنگ هەڵێنان .

٦/ دەبێ ئینسان بۆ یادی خوا کاتی گونجاو هەڵبژێرێ ، بەتایبەت بەیانیان‌و ئێواران ، کە دوو کاتی زۆر گونجاون ، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی : ﴿ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْأَصَالِ ﴾ هەندێکیش دەڵێن مەبەست لە : ﴿ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْأَصَالِ ﴾ ، واتە : لە بەیانییەوە تاکو ئێوارێ ، وە لە ئێوارێ هەتا بەیانی ، واتە : هەمیشە خوات لە یاد بێ .

<u>مەسەلەی نۆیەم</u> : کە دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢٠٦﴾ ﴾ ، بێگومان ئەوانەی لای پەروەردگارتن ، خۆبە زل ناگرن لە بەرانبەر پەرستنیدا ، وە بە پاکی دەگرن ، وە کڕنووش تەنیا بۆ ئەو دەبەن .

(إِبْنُ كَثِير) قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ : {وَإِنَّمَا ذَكَرَهُمْ بِهَذَا لِيُتَشَبه بِهِم فِي كَثْرَةِ طَاعَتِهِم وَعِبَادَتِهِم ، وَلِهَذَا شَرَعَ لَنَا السُّجُودُ هاهُنَا ، لَمَّا ذَكَرَ سُجُودَهُمْ لله عَزَّ وَجَلَّ ، كَمَا جَاءَ فِي الحَدِيث : ﴿أَلاَ تَصُفُّونَ كَمَا تَصُفُّ الملاَئِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا ، يُتِمُّونَ الصُّفُوفَ الأُوَلَ وَيَتَرَاصُّونَ فِي الصَّفِّ﴾[1]}

---

١) أَخْرَجَهُ ابْنُ أبي شَيْبَة برقم: (٣٥٣٩)، وَأَحْمَد برقم: (٢١٠٠١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٣٠)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٦٦١)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٨١٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٩٩٢)، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (١٥٤٤)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٢١٥٤).

(المصباح المنیر، ص ٥٢٣) ، واتە : بۆیە خوا فریشتەکانی بەو وەسفە باس کردوە ، وەك دەفەرمویٚ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ ﴾ ، تاکو چاویان لیٚ بکریٚ لە زۆری فەرمانبەرییو بەندایەتیی بۆ خوادا ، هەر بۆیەش لێرەدا کڕنووش بردنمان بۆ دانراوە ، چونکە باسی کڕنووش بردنی فریشتەکان کراوە بۆ خوای زاڵی پایەدار ، هەروەك لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە کە دەفەرمویٚ : ئایا ڕیز نابن ، وەك چۆن فریشتەکان لەلای پەروەردگاریان ڕیز دەبن ، ڕیزەکان تەواو دەکەن ، ئەوانەی یەکەمو دووەمو... هتد وە لە ڕیزەکاندا پاڵ وێك دەدەن ؟.

ئنجا کە دەفەرمویٚ : ﴿ عِندَ رَبِّكَ ﴾ ، (الآلوسي) دەڵیٚ : (وَهُمْ مَلاَئِكَةُ الملأَ الأَعْلَى ، فَالمرَادُ مِنْ العِندِيةِ : القُرْبِ مِنَ اللهِ تَعَالى بالزُّلْفَى والرِّضا لاَ المكانِيةِ لِتَنَزُّهِ اللّهِ تَعَالى عَنْ ذَلِكَ ، وَقِيلَ : المرَادُ عِنْدَ عَرْشِ رَبِّك)[1] ، واتە : مەبەست لە ﴿ عِندَ رَبِّكَ ﴾ ، فریشتەکانی سەرەوەن ، وە مەبەستیش لە ﴿ عِندَ ﴾ نیزیکییە لە خوای پەروەردگار ، نیزیکی مەعنەوییو ئەوە کە خوا لێیان ڕازییە ، نەك نیزیکیی شوێن ، چونکە خوای بەرز پاکە ، لەوە کە شوێنێکی دیاریکراوی هەبیٚ ، وە گوتراویشە : مەبەست لەلای بارەگاو عەرشی پەروەردگارە .

منیش دەڵێم :

هەڵبەتە خوا هەواڵی پێداوین کە لە سەرەوەی عەرشە ، وە لە سەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی ، بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە ، ئنجا ئەگەر بڵێین : خوای پەروەردگار پاکە لەوە کە شوێنی هەبیٚ ، بەو واتایە کە وەك شوێنی دروستکراوەکان ، ئەوە ڕاستە ، بەلاّم کە بگوتریٚ : خوای بیٚ وێنە پێی نەفەرمووین : کە لەسەر عەرشە ، یان لە سەرەوەیە ، ئەوە وا نیە ، چونکە خوای بەرزو مەزن لە چەندان ئایەتدا هەواڵی پێداوین ، کە لە سەرەوەی

١) روح المعاني، ج ٩ ، ص ٢٠١ .

دروستکراوەکانیەتی ، وە لەسەر عەرش و بارەگای خۆیەتی ، بەڵام بەو چەمك و واتایە کە بۆ خوا شایستەیە ، نەوەك بەو چەمك و واتایە کە دێتە زەینی ئێمەوە .

کە دەفەرموێ : ﴿لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ﴾ ، کەواتە : ئێوەش لە بەرانبەر بەندایەتیی کردن بۆ خوادا ، لە بەرانبەر پەرستنی خوادا ،خۆ بە زل مەگرن .

وە کە دەفەرموێ : ﴿وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ﴾ ، واتە : هەر خوا بە پاك دەگرن و هەر بۆ ئەویش کڕنووش دەبەن ، کەواتە : ئێوەش هەر کڕنووش بۆ ئەو ببەن .

# کورتە باسێک لەبارەی سەجدەکانی قورئان خوێندنەوە

بە پشتیوانی خوای پەروەردگار لە پێنج خاڵدا ، ئەم کورتە باسە پێشکەش دەکەین :

**یەکەم : ژمارەی سەجدەکانی قورئان :**

لەوبارەوە زانایان بە لای کەمەوە ، پێنج ڕایان هەن :

ڕای یەکەم : هەندێك دەڵێن : سەجدەکانی قورئان ، ئەو شوێنانەی کە سەجدەیان تێدا دەبردرێ ، شازدە شوێنن ، شازدە شوێنەکەش بە پێی ڕیزبەندیی موصحەف ئەمانەن :

١) سووڕەتی (الأعراف) ئایەتی (٢٠٦) .

٢) سووڕەتی (الرعد) ئایەتی (١٥) .

٣) سووڕەتی (النحل) ئایەتەکانی (٤٩ و٥٠) .

٤) سووڕەتی (الحجر) ئایەتی (١٥) .

٥) سووڕەتی (الإسراء) ئایەتەکانی (١٠٧ و ١٠٨) .

٦) سووڕەتی (مریم) ئایەتی (٥٨) .

٧) سووڕەتی (الحج) ئایەتی (١٨) .

٨) سووڕەتی (الحج) ئایەتی (٧٧) .

٩) سووڕەتی (الفرقان) ئایەتی (٦٠) .

١٠) سووڕەتی (النمل) ئایەتەکانی (٢٥ و ٢٦) .

١١) سووڕەتی (السجدة) ئایەتی (١٥) .

١٢) سوورەتی (ص) ئایەتی (٢٤) .

١٣) سوورەتی (فصلت) ئایەتەکانی (٣٧ و ٣٨) .

١٤) سوورەتی (النجم) ئایەتی (٦٢) .

١٥) سوورەتی (الإنشقاق) ئایەتی (٢١) .

١٦) سوورەتی (العلق) ئایەتی (١٩) .

ڕای دووەم : زۆربەی زانایان دەڵێن : پازدە (١٥) سەجدە لە قورئاندا هەن ، لەو پازدە شوێنەدا دەبێ سەجدەی قورئان خوێندن ببردرێ ، وە تەنیا سوورەتی (الحجر)یان لاداوە .

ڕای سێیەم : کە ڕەنگە لە ڕووی بەڵگەوە بەهێزتر بێ ، دەڵێ : چواردە سەجدەی قورئان خوێندن لە قورئاندا هەن ، کە هەموو ئەوانەی باسمان کردن دەگرێتەوە ، جگە لە سەجدەی دووەمی سوورەتی (الحج) دیارە ئەوەی سوورەتی (الحجر)یشی لەگەڵ نیە .

ڕای چوارەم : دەڵێ : یازدە (١١) سەجدەی قورئان خوێندن هەن ، وەك لەم دەقەدا هاتوە : ﴿عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ : سَجَدْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ إِحْدَى عَشْرَةَ سَجْدَةً ، لَيْسَ فِيهَا مِنَ المفَصَّلِ شَيءٌ : الأَعْرَافُ ، وَالرَّعْدُ ، وَالنَّحْلُ ، وَبَنِي إِسْرَائِيلَ ، وَمَرْيَمُ ، وَالْحَجُّ (سَجْدَةٌ) ، وَالْفُرْقَانُ وَسُلَيْمَانُ (سورَةِ النَّمْلِ) ، وَالسَّجْدَةُ ، وَص ، وَسَجْدَةُ الْحَوَامِيمِ﴾ {أَخْرَجَهُ إِبْنُ مَاجَهْ برقم : (١٠٥٦) ، قَالَ الأَلبَاني : ضَعِيف ، وَأَخْرَجَهُ أَيْضا البَيْهَقِيّ في (الكُبْرَى) برقم : (٣٥٢١)} ، واتە : ئەبو دەرداء دەڵێ : لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ یازدە سەجدەم بردن، کە لە سوورەتە کورتەکان هیچیانی تێدا نەبوون ، ئەوانیش : ئەعرافو ڕەعدو نەحلو بەنی ئیسرائیل (واتە : سوورەتی الإسراء) وە مەریەمو حەجو فورقانو سولەیمان (واتە : سوورەتی النمل) وە سەجدەو ، صادو ، سەجدەی حەوامیم مەبەستی پێ سوورەتی (فصّلت)ە ، بەڵام دیارە ئەلبانیی بە فەرمودەیەکی لاوازی داناوە .

رای پێنجەم : دەڵێ : ئەوانە هەموویان جگە لە سوورەتی (الحجر)و دووەم سەجدەی سوورەتی (الحج)و سێ سەجدەکانی (المفصل) واتە : سوورەتە کورتەکان ، جا بە پێی رای سێیەم بێ ، دە (١٠) شوێنن .

بەڵام وەك پێشتر باسمان کرد ، زۆربەی زانایان لەسەر ئەو رایەن کە ئەو پازدە (١٥) شوێنەن کە سەرەتا هێنامانن ، لەمەشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە کە رایەکی ساغ بووەوە نیە لەوبارەوە ، بۆیە ئەگەر کەسێك گوتی : دەن ، یان یازدەن ، یاخود چواردەن ، یان پازدەن ، یان شازدەن ، دەبێ بەلامانەوە ئاسایی بێ ، مادام زانایان تێیدا کەوتوونەتە راجیاییەوە ، مانای وایە مەجالی تێدایە .

**دووەم : لە کاتی سەجدە بردندا چی دەگوترێ ؟**

پێغەمبەری خوا ﷺ چەند دەقێکی لێ گێردراونەوە ، لەوبارەوە :

١) ﴿سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ فَأَحْسَنَ صُورَتَهُ ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ ، وَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٧٢٩) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (١٨٤٨) ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم : (٣٤٢١) وَأَبُو دَاوُدَ برقم : (٧٦٠) وَالنَّسائِيُّ في (الكُبْرَى) برقم : (٧١١) ، وَالبَيْهَقِيُّ في (شُعَب الإيمان) برقم : (٣١٣٣) ، وَإِبْنُ حِبَّانَ برقم : (١٩٧٧) ، وَإِبْنُ خُزَيْمَة برقم : (٥٦٣) ، وَأَبي عَوَانَة برقم : (١٦٠٧) ، وَأَبي يَعْلَى برقم : (٥٧٤) وَالبَزَّار برقم : (٥٣٦) ، وَصَحَّحَهُ كل من الألباني وشعيب الأرنؤوط والأعظمي) ، واتە : رووی من کڕنووشی برد ، بۆ ئەو کەسەی کە بەدی هێناوەو ، وێنەی کێشاوە بە جوانترین شێوە ، وە بیستنو دیتنی تێدا دروستکردوون ، پاکییو بەرزیی بۆ خوای باشترینی بەدیهێنەران .

٢) ﴿اللَّهُمَّ احْطُطْ عَنِّي بِهَا وِزْرًا ، وَاكْتُبْ لِي بِهَا أَجْرًا ، وَاجْعَلْهَا لِي عِنْدَكَ ذُخْرًا﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم : (٥٧٩) ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (١٠٥٣) ، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم : (٥٦٢) قال الألباني : حَسَن} ، واتە : خوایە ! بەم سەجدەیە گوناهم لێ هەڵوەرێنە ، وە پاداشتم بۆ بنووسە ، وە بیکە بە توێشوو بۆم لەلای خۆت .

٣) ﴿اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدَ سَوادِي ، وَبِكَ آمَنَ فُؤَادِي ، اللَّهُمَّ ارْزُقْنِي عِلْمًا يَنْفَعُنِي ، وَعَمَلاً يَرْفَعُنِي﴾ {أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبي شَيْبَة فِي (المصنف) برقم : (٤٤٠٦)} ، واته : خوایه ! جەستەی من ، (کەلەشی من) بۆ تۆ کڕنووشی برد ، وه دڵی من ئیمانی بە تۆ هێنا ، خوایه ! زانستێکم پێ ببەخشە ، کە سوودم پێ بگەیەنێ ، وه کردەوەیەکم پێ ببەخشە ، کە بەرزم بکاتەوە .

شایانی باسە ئەم دەقە (موقوف)ە ، لەسەر (إبن عمر)و ، (مرفوع) نیە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەڵام بەدوور دەزانرێ (إبن عمر) خوا لێی ڕازی بێ لەخۆیەوەو بەبێ بیستن لە پێغەمبەرەوە گوتبێتی .

## سێیەم : حوکمی سەجده بردنی قورئان خوێندن :

دیارە لەوبارەشەوە زانایان ڕاجیاییان هەیە ، بەڵام با تەماشای چەند فەرموودەیەك بکەین :

١) ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ فَيَقْرَأُ سُورَةً فِيهَا سَجْدَةٌ فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ مَعَهُ ، حَتَّى مَا يَجِدُ بَعْضُنَا مَوْضِعًا لِمَكَانِ جَبْهَتِهِ فِي غَيْرِ وقت الصَّلاةِ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم : (٥٩٢) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٥٧٥)} ، واته : پێغەمبەر ﷺ سوورەتێکی دەخوێند سەجدەی تێدا هەبوو ، سەجدەی دەبرد ، ئێمەش لەگەڵیدا دەچووینە سەجده هەتا یەکێك لە ئێمە شوێنی چنگ نەدەکەوت ، بۆ ئەوەی نێوچەوانی لەسەر دابنێ (مەجلیسێك بوو یان شوێنێك بووه) ، لەکاتی غەیری نوێژیشدا ، (واته : ئەوه نەبووه ، کە لە نوێژدا قورئانەکەی خوێندبێ‌و سەجدەی بردبێ .

٢) ﴿عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ ، قَالَ : رَسولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ ، اعْتَزَلَ الشَّيْطانُ يَبْكِي يَقُولُ : يَا وَيْلَتَا ! أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ ، فَلَهُ الْجَنَّةُ ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ ، فَأَبَيْتُ فَلِي النَّار﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٩٧١١) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٨١) ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (١٠٥٢) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٢٧٥٩) ، وَالبَيْهَقِي برقم : (٣٥١٦) ، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم : (٥٤٩) ، وَأَبُو عَوَانَة برقم : (١٩٤٥)} ، واته : کاتێك ئادەمزاد ئایەتی سەجده دەخوێنێ‌و کڕنووش دەبات

بۆ خوا ، شەیتان دوور دەکەوێتەوەو دەگریەت ، دەڵێ : هاوار بۆ من ! ئادەمزاد فەرمانی پێکرا بە کڕنووش بردن ، کڕنووشی برد ، وە بەهەشتی مسۆگەر کرد ، منیش فەرمانم پێکرا بە کڕنووش بردن ، سەرپێچییم کردو ، بەشم ئاگرە .

٣) ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسولَ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ عَامَ الْفَتْحِ سَجْدَةً ، فَسَجَدَ النَّاسُ كُلُّهُمْ مِنْهُمُ الرَّاكِبُ وَالساجِدُ فِي الأَرْضِ حَتَّى إِنَّ الرَّاكِبَ لَيَسْجُدُ عَلَى يَدِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم : (١٤١٣) وَضَعَّفَهُ الأَلباني}، واتە : عەبدوڵڵا کوڕی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ جارێك لە ساڵی حەج کردنیدا ئایەتی حەجی خوێند ، کە سەجدەی تێدا بوو ، خەڵك هەموو سەجدەیان برد ، هەبوو سواربوو ، هەشبوو لەسەر زەوی بوو ، لەسەر زەوی سەجدەی برد ، ئەوەی کە سواربوو جاری وا هەبوو، لەسەر دەستی سەجدەی دەبرد .

پێش ئەوەی بێینە سەر ڕای زانایان ، لەوبارەوە شتێك باس دەکەین ، زانایان دەڵێن : سەجدەی قورئان خوێندن ، سێ هاندەرو پاڵنەری هەن ، کە بریتین لە :

<u>**یەکەم**</u> : لەبەر ئەوەی خوای زاناو شارەزا فەرمانی کردوە بە کڕنووش بردن ، بۆیە دەبێ فەرمانی خوا جێبەجێ بکرێ .

<u>**دووەم**</u> : لە هەندێك شوێن دا کە باسی سەجدەی قورئان خوێندن کراوە ، باسی ئەوە کراوە کە کافرەکان ئامادەنین بۆ خوا کڕنووش ببەن ، لەبەرئەوە کە ئەوان کافرنو ئامادەنین کڕنووش ببەن ، کە ئێمە ئیمانداریـن ، دەبێ کڕنووش بەرین ، بۆ ئەوەی پێچەوانەی ئەوان بجوڵێینەوە .

<u>**سێیەم**</u> : یان لەبەر ئەوەیە کە خوای کارزان لەو شوێنانەدا ، کە سەجدەی قورئان خوێندنیان تێدا دەبردرێ ، باسی سەجدە بردنی پێغەمبەران دەکات ، یاخود باسی سەجدە بردنی فریشتەکان دەکات ، ئێمەش دیارە دەبێ چاو لە پێغەمبەران بکەینو ، چاو لە فریشتە پاكو بێگەردەکان بکەین .

## دەربارەی ڕاجیایی زانایان

ئەحمەدو مالیكو شافیعیی دەڵێن : سەجدەی قورئان خوێندن فەرز نیەو ، سوننەتە .

بەڵام ئەبو حەنیفە دەڵێ : سەجدەی قورئان خوێندن فەرزە .

بەڵگەی ڕای جەماوەری زانایان کە (ئەحمەدو مالیكو شافیعیی)یان لە نێودان ، ئەم دەقەیە : ﴿أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَرَأَ سَجْدَةً وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَنَزَلَ فَسَجَدَ وَسَجَدَ النَّاسُ مَعَهُ ، ثُمَّ قَرَأَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى فَتَهَيَّأَ النَّاسُ لِلسُّجُودِ ، فَقَالَ : عَلَى رِسْلِكُمْ إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَكْتُبْهَا عَلَيْنَا إِلاَّ أَنْ نَشَاءَ﴾ {أَخْرَجَهُ مَالِك برقم : (٤٣٣) بَاب مَا جَاءَ فِي سُجُودِ الْقُرْآنِ} ، واتە : عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ ، ئایەتێکی خوێند ، ئایەتی سەجدە بوو ، لە مینبەر دابەزیو سەجدەی بردو ، خەڵکیش لەگەڵیدا سەجدەیان برد ، دوایی لە جومعەیەکی دیکەدا ، ئایەتێکی سەجدەی خوێندو ، خەڵك خۆیان ئامادە کرد ، بۆ ئەوەی سەجدە ببەن ، عومەر گوتی : خەڵکینە ! ڕاوەستن ، بێگومان خوای زاناو شارەزا لەسەری پێویست نەکردووین ، مەگەر خۆمان بمانەوێ .

واتە : شتێکی پەسندەو باشە ، ئەگەر بیکەین خێرمان هەیەو ئەگەر نەشیکەین گوناهمان ناگاتێ ، ئەوەش بە ئامادەبوونی هاوەڵانی بەڕێز بووە ، کەواتە : یەکدەنگیی هاوەڵانی لەسەر دروستبووە .

ئەبو حەنیفەش بەڵگەکەی ئەوەیە ، کە دەڵێ : خوای باڵادەست فەرمانی کردوە بە سەجدە بردن ، فەرمان (أمر)یش بە ڕەهایی فەرزبوون دەگەیەنێ ، هەروەها ئەو فەرموودەیەی بە بەڵگە دێنێتەوە : ﴿عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ ، قَالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ ، اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي يَقُولُ : يَا وَيْلَتَا ! أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ ، فَلَهُ الْجَنَّةُ ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ ، فَلِي النَّارُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم : (٩٧١١) ، وَمُسْلِمٌ برقم : (٨١) ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم : (١٠٥٢) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم : (٢٧٥٩) ، وَالبَيْهَقِي برقم : (٣٥١٦) ، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم :

(٥٤٩) ، وَأَبُو عَوَانَة برقم : (١٩٤٥)} ، وە هەروەها ئەوەش بە بەڵگە دێنێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ سەجدەی قورئان خوێندنی بردوەو لەسەری بەردەوام بووە .

بەڵام جەماوەری زانایان ئاوا وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن :

١ - هەرچەندە صیغەی ئەمر بۆ فەرزبوونە ، بەڵام كردەوەی عومەر ئەو دەلالەتە هەڵدەوەشێنێتەوە ، یەكدەنگیی هاوەڵانیشی لەسەر دروستبووە ، كەواتە : هەرچەندە صیغەی ئەمر بۆ پێویستبوون (وجوب)ە ، بەڵام مادام بەڵگەیەكی بەهێزتر هەبێ ، یاخود ڕێگر (مانع)ێك هەبێ ، كە ئەو دەقە ئەوە بگەیەنێ، ئەوە هەڵدەوەشێتەوە .

٢ – بۆ فەرمایشتەكەش دەڵێن : پێغەمبەر ﷺ مەبەستی پێ هەواڵدانە بە سەجدە بردنێكی پێویست .

٣ - بۆ بەردەوامبوونی پێغەمبەریش ﷺ لەسەر سەجدە بردن ، دەڵێن : بەردەوامبوونی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە شتێكی باشو پەسندە ، بەڵام مەرج نیە واجببوون بگەیەنێ .

بە هەر حاڵ بەڵگەكانی ئەبو حەنیفەش بەهێزن ، بەڵام وەڵامەكانی جەماوەری زانایانیش بەهێزن ، واش پێدەچێ كە ڕای جەماوەری زانایان ڕاستتر بێ ، بەتایبەتیش كە هەندێ جار سەجدەبردنی قورئان خوێندن ، جۆرێك لە سەغڵەتییو ئیحراجبوونی تێدا دەبێو ، هەموو شوێنێك هی ئەوە نیە ، سەجدە ببەی ، مەگەر بە شێوەیەكی دیكە – بە ئاماژە - سەجدەكە ببردرێ.

## چوارەم : چۆنیەتی سەجدە بردنی قورئان خوێندن ؟

دیارە لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ (الجامع لأحكام القرآن)ی (القرطبي) كە لەوبارەوە دەڵێ : (وَلاَ خِلاَفَ فِي أَنَّ سُجُودَ القُرْآنِ يَحْتَاجُ إِلى مَا تَحْتَاجُ إِلَيْهِ الصَّلاَةُ مِنْ طَهارَة حَدَث وَنَجَس وَنِيَة وَاستقبَال قِبْلَةٍ ووَقْتٍ ، إلاَّ مَا ذَكَرَ البُخَارِيُّ عَنِ ابْن عُمَرَ أَنَّهُ كانَ يَسْجُدُ عَلَى غَيْرِ طَهارَةِ ، وَذَكَرَهُ ابْنُ المنْذِر عَنِ الشَّعْبِي ، وَعَلَى قَوْل الجُمْهُور هَلْ يَحْتَاجُ إِلى تَحْرِيم وَرَفْعِ يَدَيْنِ عِنْدَهُ وَتَكْبير وَتَسْلِيم؟ اخْتَلَفُوا فِي ذَلِكَ : فَذَهَبَ الشافِعِيّ وَأَحْمَد وَإِسْحَاق إِلى أَنَّهُ يُكَبِّرُ وَيَرْفَعُ

لِلْتَكْبِيرِ لَهَا ، وَمَشْهُورُ مَذْهَبِ مَالِكٍ أَنَّهُ يُكَبِّر لَهَا فِي الخَفْضِ وَالرَّفْعِ فِي الصَّلاَة ، واخْتُلِفَ عَنْهُ فِي التَّكْبيرِ لَهَا فِي غَيْرِ الصَّلاَةِ ، وَبالتكْبيرِ لِذَلِكَ ، قَالَ : عَامّةُ الفُقَهاء ، وَلاَ سَلامَ لَها عِنْدَ الجُمْهُور ، وَذَهَبَ جَمَاعَةٌ مِنَ السَّلَفِ وَإِسْحَاق إِلى أَنَّهُ يُسَلِّمُ مِنْها ، وَعَلَى هَذَا المذْهَب يَتَحقق أَنَّ التكْبير فِي أَوَّلِها لِلإِحْرَام ، وَعَلَى قَوْل مَنْ لاَ يُسَلِّمُ يَكُونُ لِلْسُجُودِ فَحَسْب ، وَالأَوَّلُ أَوْلَى؛ لِقَوْلِهِ عَلَيْهِ السَّلاَم : (مِفْتَاحُ الصَّلاَةِ الطُّهُورُ ، وَتَحْرِيمُها التَّكْبِيرُ ، وَتَحْلِيلُها التَّسْلِيمُ)[١] ، وَهَذِهِ عِبَادَةٌ لَها تَكْبِيرٌ ، فَكانَ لَها تَحْلِيلٌ كَصَلاَةِ الجنَازَةِ بَلْ أَوْلَى ، لأَنَّها فِعْلٌ وَصَلاَةُ الجنَازَةِ قَوْلٌ ، وَهَذَا اخْتِيَارُ ابْنُ العَرَبِي)[٢] ، واتە : ڕاجیایی نیە لەسەر ئەوە کە سەجدە بردنی قوڕئان خوێندنیش ، پێویستیی بە هەموو ئەو شتانەیە کە نوێژکردن پێویستیی پێیانە ، لە پاکیی لە بێ نوێژیی ، وە لە شتی پیس ، وە لە ئامادەبوونی نیەت ، وە لە ڕووکردنە قیبلە ، لەوە کە کاتەکەشی گونجاو بێ ، (واتە : لەو کاتانەدا نەبێ ، کە نەهی کراوە ، لە نوێژ تێداکردنیان) جگە لەوەی کە بوخاریی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە باسی کردوە ، کە جاری وا هەبووە بەبێ ئەوەی کە دەستنوێژیشی هەبێ ، سەجدەی قوڕئان خوێندنی بردوە ، هەروەها (ابن المنذر) لە (الشعبي)ەوە (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین) ئەوەی گێڕاوەتەوە کە دەستنوێژ هەبوونی بە مەرج نەگرتوە ، بۆ سەجدەی قوڕئان خوێندن ، ئنجا لەسەر قسەی جەماوەری زانایان : ئایا سەجدەی قوڕئان خوێندن پێویستیی بە (الله أكبر)ی تەحریم هەیە ؟ وە پێویستیی بە دەست بەرزکردنەوە هەیە ، لە کاتی سەجدە بردندا ؟ وە پێویستیی بە سەلامدانەوە هەیە ؟ لەوبارەوە ڕاجیایی هەیە :

شافیعیی‌و ئەحمەدو ئیسحاق ڕایان وایە کە دەبێ (الله أكبر)یش بکات‌و دەستیش بەرز بکاتەوە لە کاتی (الله أكبر) کردنەکەدا ، بۆ سەجدەبردن .

بەڵام ئەوەی لە مەزهەبی مالیکدا زیاتر زانراوە ، ئەوەیە کە ئەگەر لە نوێژ دابێ ، چ کە دادەبەزێ بۆ سەجدەبردن ، چ کە هەڵدەستێتەوە ، دەبێ (الله أكبر) بکات .

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠٠٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٦١٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣) وَقَالَ: هَذَا الحَدِيث أَصَحّ شَيء فِي هَذَا الباب، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٧٥).

٢) ج ٧ ، ص ٢٨٨ .

بەڵام لەوبارەوە ڕاجیایی هەیە ، کە ئەگەر لە غەیری نوێژ دابێ ، ئایا (اللە أکبر)ی دەوێ ؟ یان نا ؟ بەڵام بۆ ئەوە کە دەبێ (اللە أکبر) بکرێ ، بۆ کاتی چوونە سەجدەی قورئان خوێندن ، زۆربەی شەرعزانان ڕایان وایە ، کە بەڵێ ، وە زۆربەی زانایانیش ڕایان وایە کە سەلام دانەوەی ناوێ ، وەك سەجدەی قورئان خوێندن ... وە هەندێ لە زانایانی پێشینیش ، وە ئیسحاقیش لەنێویاندایە ، ڕای وایە کە دەبێ سڵاویشی لێ بداتەوە ، ئنجا ئایا سڵاوێك یان هەردووکیان ؟ لەوەشدا دیسان ڕاجیایی هەیە .

وە بەپێی ئەو ڕایە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە (اللە أکبر)ی یەکەم بۆ دابەستنیەتی ، وە لەسەر قسەی ئەوانە کە دەڵێن : سڵاوی لێ ناداتەوە ، (اللە أکبر)ەکە ، تەنیا بۆ چوونە سەجدەیە ، ئەگەرنا پێویستە (اللە أکبر)ێك بکات بۆ دابەستن ، ئەوجار بۆ نزمبوونەوەش (اللە أکبر)ێکی دیکە بکات ، بەڵام ئەوەی یەکەمیان باشترە {واتە : (اللە أکبر) بکات بۆ ئەسڵی دابەستنی سەجدەکە ، وە (اللە أکبر)ی دووەمیش بۆ نزمبوونەوە) چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : پاكو خاوێنیی دەستپێکردنی نوێژە ، وە (اللە أکبر) کردن لە خۆ حەرامکردنی غەیری نوێژە (واتە : قسەکردنو خواردنو خواردنەوە ... هتد) وە ئەو هەڵسوکەوتانەی کە لە نوێژدا قەدەغەن ، بەهۆی سڵاودانەوەوە ، حەڵاڵ دەبن {واتە : کە سڵاوت دایەوە ، کە پێی دەگوترێ (تحلیل) هەڵسوکەوتە ئاساییەکانت بۆ حەڵاڵ دەبنەوە) .

ئنجا کڕنووشبردنی قورئان خوێندنیش عیبادەتێکە (اللە أکبر)ی هەیە ، کەواتە : دەبێ سڵاودانەوەشی هەبێ (واتە : وەك چۆن تەحریمی هەیە دەبێ تەحلیلیشی هەبێ) وەك نوێژی جەنازە ، بەڵکو لە پێشتریشە ، چونکە نوێژی جەنازە قسەیە ، بەڵام سەجدەبردنی قورئان خوێندن ، کردەوەیە ، ئەوەش بژاردەی (إبن العربي)ە . (کە یەکێکە لە زانا گەورەکانی مەزهەبی مالیکیی) .

## پێنجەمو کۆتایی : کاتی سەجدە بردن :

(قرطبي) لەوبارەوەش دەڵێ : (وَأَمَّا وَقْتُهُ فَقِيلَ : يَسْجُدُ فِي سائِرِ الأَوْقَاتِ مُطْلَقًا ، لأَنَّها صَلاَةٌ لِسَبَبٍ ، وَهُوَ قَوْلُ الشافِعِي وَجَمَاعَة ، وَقِيلَ : مَا لَمْ يُسْفِرِ

الصُّبْحُ ، أَوْ مَا لَمْ تُصْفِرِ الشَّمْسُ بَعْدَ العَصْرِ ، وَقِيلَ : يَسْجُدُ بَعْدَ الصُّبْحِ وَلاَ بَعْدَ العَصْرِ ، وَهَذِهِ الثلاَثة الأَقْوَالِ فِي مَذْهَبِنَا)[1] ، واتە : کاتی سەجدەبردنی قورئان خوێندن ، گوتراوە : لە هەموو کاتەکاندا بۆی هەیە سەجدە ببات ، بە ڕەهایی ، چونکە وەك نوێژێکە کە بۆ هۆکارێك دەکرێ (کە دەچیە نێو مزگەوتەوە : نوێژی دەستنوێژ دەکەی ، یان نوێژی سڵاوی مزگەوت دەکەی ، مادام هۆکارێکی هەیە بۆت هەیە نوێژ بکەی ، لەو کاتانەش دا کە نەهی کراوە لە نوێژ کردن)[2] ئەوەش قسەی شافیعیی‌و کۆمەڵێك لە زانایانە ، وە ڕایەکی دیکەش هەیە گوتراوە : مادام بەرەبەیان سپیەتیی دەرنەکەوتبێ ، لە کاتی خۆرهەڵاتندا ، یان مادام لە دوای نوێژی عەسر ، خۆر زەرد هەڵنەگەڕابێ ، (واتە : خەریکی ئاوا بوون نەبێ) لەو دوو کاتانەدا دروست نیە ، هەروەها ڕایەکی دیکە هەیە دەڵێ : لە دوای نوێژی بەیانی دروستە سەجدەی قورئان خوێندن ببردرێ ، بەڵام لە دوای نوێژی عەسر دروست نیە سەجدەی قورئان خوێندن ببردرێ ، وە ئەم سێ قسەیە لە مەزهەبی ئێمەدا هەن ، (واتە : مەزهەبی مالیکدا) .

منیش پێم وایە هەر کاتێك ئینسان قورئانی خوێند ، دیارە سەجدەکەشی دەبردرێ ، مەگەر شوێنەکەی گونجاو نەبێ ، یان کاتەکەی گونجاو نەبێ .

لێرەش دا کۆتایی بە تەفسیری ئەم سوورەتە موبارەکە دێنین ، لە کاتێکدا کە وەزعی فەلەستین‌و عێراق‌و جیهانیی ئیسلام یەکجار ئاڵۆزو ناخۆشە ، خوا دەرووی خێر لە هەموو لایەك بکاتەوە .

١٣ / ٧ / ٢٠١٤

١٥ رمضان / ١٤٣٥

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) الجامع لأحكام القرآن ج ٧، ص ٢٨٨.

٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان خۆم زیادم کردوە ، بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست .

# سەرچاوەکان

١) تفسير الطَّبَرِي الْمُسمى جامع البيان في تأويل القُرآن ، لأَبي جَعفَر محمد بن جرير الطَّبَرِي، تحقيق: هاني الحاج، عماد زكي البارودي، خَيْرِي سعيد، المكتبة التوفيقية، ٢٠٠٤ القاهرة.

٢) المِصبَاحُ الْمُنِير في تَهْذِيب تفسير ابن كثير للإِمام الجليل عِماد الدِّين أَبي الفِداءِ إِسْماعيل بن عُمَر بن كَثير القرشي الدمشقى، إِعداد جماعَة مِنَ العُلَمَاء، بإشراف الشيخ صَفي الرحمن المباركفوري، دار السلام، الطبعة الثانية (١٤٢١هـ - ٢٠٠٠ م).

٣) التفسير الكبير أَو مَفَاتيحُ الغَيْب للإِمام فَخْرَالدِّين محمد بن عُمَرَ بن الحسين بن الحسن ابن علي التميمي البكري الرازي الشافعي، حَقَّقَهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ وَخَرَّجَ أَحَاديثهُ عِماد زكي البارودي المكتبة التوفيقية.

٤) الجامع لأحكام القُرآن، تفسير القُرطُبي لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القُرطُبي، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ عِماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية.

٥) أَحْكَام القُرْآن ، لأبي بَكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، راجع أصولهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ محمد عبدالقادر عطا، الطبعة الأولى (١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م).

٦) فتح القدير، الجامع بين فني الرواية و الدراية من عِلم التفسير (تفسير الشوكاني) تأليف: الإمام العلامة محمد بن علي بن محمد الشوكاني، تحقيق: عبدالرزا الْمَهدي، دار الكتاب العربي، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

٧) زاد المسير في علم التفسير: لابن الجوزي .

٨) روح المعاني: للآلوسي .

٩) تفسير القاسمي الْمُسمى محاسن التأويل، تأليف: علامة الشام محمد جمال الدين القاسمي، دار الفكر الطبعة الأولى (١٣٩٨هـ - ١٩٧٨م).

١٠) تفسير المراغي ، تأليف أحمد مصطفى المراغي ، دار الفكر ، بيروت.

١١) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام الْمَنان ، تأليف: العلامة الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي، تحقيق: عبدالرحمن بن معلا اللويحق مؤسسة الرسالة، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

١٢) صفوة البيان لِمَعَاني القُرآن، تأليف: الشيخ حسين محمد مخلوف الطبعة الثالثة.

١٣) صفوة التفاسير، تأليف: العلامة محمد بن علي الصابوني، مكتبة الهداية، أربيل/ العراق، الطبعة الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م).

١٤) تفسير القُرآن الحكيم الشهير بـ (تفسير المنار) تأليف: محمد رشيد رضا، دار المعرفة، الطبعة الثالثة.

١٥) الأساس في التفسير، تأليف: سعيد حوى، دار السلام، الطبعة الثانية (١٤٠٩ هـ - ١٩٨٩م).

١٦) في ظِلال القُرْآن، تأليف: سيد قطب دار الشروق، الطبعة الشرعية الخامسة والعشرون (١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م).

١٧) التفسير الْمُنير في العَقِيدة والشَّرِيعَة والْمَنْهَج، تأليف: الأستاذ الدكتور وهبة الزحيلي، دار الفكر الطبعة الثالثة (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥م).

١٨) التحرير والتنوير، محمد الطاهر بن عاشور .

١٩) الميزان ، محمد حسين الطباطبائي .

٢٠) تفسير الشعراوي ، محمد متولِّي الشعراوي .

٢١) تفسير نمونه ، ناصر مكارم شيرازي .

٢٢) الكاشف ، محمد جواد مغنية .

٢٣) التفسير التوحيدي ، د. حسن الترابي .

٢٤) مُفرَدات ألفاظ القُرآن، تأليف: العلامة الراغب الأصفهاني، تحقيق: صفوان عدنان داوودي، دار القلم، الطبعة الثالثة (١٤٢٣ هـ - ٢٠٠٢م).

٢٥) الإستيعاب في بيان الأسباب .

٢٦) أسباب النزول ، للنيسابوري .

٢٧) لُباب النقول في أسباب النزول، للإمام الحافظ جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي خَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ عبدالرزاق الْمَهْدِي، دار الكتاب العربي (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٦م) ، (أسباب النزول) للنيسابوري .

٢٨) مختار الصِّحاح ، للرازي .

٢٩) المعجم الوسيط، دار الدعوة، الطبعة الثانية.

٣٠) الْموطأ للإمام مالك بن أنس برواية يحيى بن يحيى الليثي، تحقيق: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار المعرفة، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨ م)، (أسباب النزول) للواحدي.

٣١) الْمُسنَد للإمام أحمد بن محمد بن حنبل، الناشر مؤسسة قرطبة، القاهرة، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأنؤوط عليها.

٣٢) صَحِيح البُخَارِي للإمام أبي عبدالله محمد بن إسماعيل البُخَارِي، تحقيق: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار الْمعرفة، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٣٣) صَحِيح مسلم للإمام الحافظ مسلم بن الحجاج النَّيسابوري، حقوق أصولُهُ و خَرَّجَ أَحاديثهُ على الكتب الستة: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار المعرفة، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٤) سُنَن أبي داود للإمام أبي داود سُليمان بن الأشعث السجستاني، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٥) سُنَن التِّرمِذِي للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة التِّرمِذِي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٦) سُنَن النَّسَائي للإمام أبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب بن علي الشهير بـ(النَّسَائي)، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨م).

٣٧) سُنَن ابْنُ مَاجَهْ، للإمام أبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني الشهير بـ (ابْنُ مَاجَهْ)، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨ م).

٣٨) سُنَن الدار قُطني، للإِمام الحافظ علي بن عُمر الدار قُطني، تحقيق: مجدي بن مَنصور بن سي الشورى، دار الكتب العلمية، الطبعة الثانية (١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣ م).

٣٩) الْمُستَدرَك على الصحيحين للإِمام الحافظ أبي عبدالله الحاكم النَّيسابوري ، تحقيق : صالح اللحَّام ، دار ابن حزم ، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٠) صَحِيح ابْنُ حِبَّان للإِمام أبي حَاتِم محمد بن حِبَّان الخُراساني، تحقيق: حقوق أصولُهُ وخَرَّجَ أَحاديثه: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار الْمعرفة، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٤١) الْمُعجم الكبير للحافظ أبي القاسم سُليمان بن أحمد الطَّبَرَاني، حَقّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ حمدي عبدالمجيد السلفي، مكتبة الأصالة والتُّراث، الطبعة الأولى ( ١٤٣١هـ - ٢٠١٠ م).

٤٢) سُنَن الدَّارمي للإِمام أبو محمد بن عبدالرحمن بن الفضل بن بهرام الدَّارمي، حَقَّقَهُ وَشَرَحَ ألفَاظَهُ وَجُمَلَهُ وَعَلّقَ عَلَيهِ وَوَضَعَ فَهارسَهُ: الأستاذ الدكتور مصطفي ديب البغا، دار المصطفى، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٣) مشكاة المصابيح، تأليف: محمد بن عبدالله الخطيب التبريزي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٤) إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل، تأليف: محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٥) السراج الْمُنير في ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير، للحافظ جلال الدين السيوطي، العلامة محمد ناصر الدين الألباني، رتبهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ: عصام موسى هادي، دار الصديق، الطبعة الثانية (١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م).

٤٦) السنن الكبرى تصنيف: الامام أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب النسائي، تحقيق: دكتور عبدالغفار سليمان البنداري ، وسيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية بيروت — لبنان، الطبعة الاولى (١٤١١ هـ - ١٩٩١ م).

٤٧) سلسلة الأحاديث الصحيحة، تأليف: مُحَمَّد ناصر الدّين الألباني، رحمه الله، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض ، الطبعة الأولى.

# نێوەڕۆک